# مەسنەوی مەعنەوی

جەلالەددین موحەممەدی ڕۆمی ناسراو بە (مەولانای ڕۆمی)

## بە شێوەی هۆنراوەی کوردی

وەرگێڕاوی:

عەبدوسەلام مودەڕیسی (خانی)

دەفتەری ئەووەڵ هەتا چوارەم



بسم الله الرحمن الرحیم

# مەسنەوی مەعنەوی ١

« دەفتەری ئەووەڵ هەتا چوارەم »

هۆنراوەی :

**مەولەوی جەلالەددین موحەممەدی بەلخی**

وەرگێران بۆ سەر هۆنراوەی کوردی :

**عەبدوسسەلام مودەرریسی (خانی)**

سرشناسه : مولوی ، جلال الدین محمد بن محمد ٦٠٤- ٦٧٢ ق
عنوان قراردادی : مثنوی . کردی
عنوان ونام پدید آور : مثنوی معنوی / هونراوه ی / جلال الدین محمد بن محمد بلخی رومی
وه رگیران بو سه ر هونراوه ی کوردی عبدالسلام مدرسی .( خانی)
مشخصات نشر : ارومیه – حسینی اصل ١٣٩٤ مشخصات ظاهری : ٢ج
شابک دوره : ٠-٠٦٥-٢٤٩-٦٠٠-٩٧٨ جلد اول : ٦-٠٦٣-٢٤٩-٦٠٠-٩٧٨
وضعیت فهرست نویسی : فیپا
موضوع : شعر فارسی – قرن ٧ ق – ترجمه شده به کردی موضوع : شعر کردی – قرن ١٤ ترجمه شده از فارسی
شناسه افزوده : مدرسی عبدالسلام ١٣٢٦ مترجم
رده بندی کنگره : ١٣٩٤ ٤ ک ٣٨ آ/ ٥٣٠٠ PIR
رده بندی دیویی : ١/٣١ فا ٨ شماره کتابشناسی ملی : ٤١٥٨١١٩

## شناسنامه کتاب

نام کتاب : مثنوی معنوی جلد اول
مؤلف : مولانا جلال الدین محمد بلخی رومی
مترجم : عبدالسلام مدرسی ( خانی)
سال چاپ : اول ١٣٩٥
تیراژ : ١٠٠٠ دوره
ناشر : مؤسسه انتشاراتی حسینی اصل

شابک دوره : ٠-٠٦٥-٢٤٩-٦٠٠-٩٧٨
شابک جلد اول : ٦-٠٦٣-٢٤٩-٦٠٠-٩٧٨

قیمت دوره ٢جلدی : ٧٠٠٠٠ تومان

مراکز پخش : / شوینی دابه شکردن :



ایران/ ارومیه : خیابان طالقانی مؤسسه انتشاراتی حسینی اصل
تلفن : ٠٤٤٣٢٣٥٢٤٠٣ / ٠٩١٤١٤٠٠٩٠٣ entesharathoseini@yahoo.com



کوردستانی عیراق : سوران / کومه لگای فه رهه نگی ئه حمه دی خانی
شه قامی بارزانی به رامبه ر یاریگا ٠٧٥١٢٤٩٠٩٠٧

## پێشکێش بە

مەقامی بەرزی عیلمی خوا لێخۆشبوو، بابی بەڕێزم؛

**ئوستاد مەلا موحەممەدسالحی مودەڕریسی جولەمێرگی خانی**



عبدالسلام مدرسی(خانی)

# ناوەرۆک

**دەفتەری چوارەم ........................................................................ ٦١٠**

به یارمەتی خودای تەوانا و بێهەواڵ

**پێشەکی وەرگێڕ**

ئـارەزووم بــوو مــن کــە داداری جیهــان — مــاوەیــێکم پــێ عــەتــا کــاتن ئــەمــان

تــا بنووســـم نامـــەیێک مـــن یادگـــار — هـــەر بمێنـــێ تـــا بمێنـــێ رۆژگـــار

ئـــارەزوومـــی لـــوتفی حـــەق هێنایـــە دی — ئـارەزووی خـۆم ئاشـکرا لـەو خوایـە دی

تـازە نـامرم تـا جیهـان بـێ بـەر قـەرار — چونکـە چانـدم مـن گـەلێـک تـۆوی وتـار

تـازە نـامرم تـا لـە ژێـر ئاسـمان زەوی — چونکـە نووسـیم مـن کیتـابی مـەسـنەوی

رەنجـی زۆرم دی بـە رۆژ و مانـگ و سـاڵ — مـەسـنەویم تـا کـردە کـوردی ئـەی هـەواڵ

بــەرقــەرار و جاویــدان تــا بێــت کــورد — بـای فـەنـا تـاکـو نـە لـەرزێنێـت کـورد

کـاخی نـەزمی کـوردی مـن وام بـردە سـەر — قـەت بـە بـاو بـاران نـایبێـتن کـەسـەر

هێنــدە کــاخی نــەزمــی کــوردیم بــردە ژور — دیـار دەکـا بـۆ یـار و بـۆ ئـەغیـار لـە دوور

تا هـەچی هـەیبێ لە دڵ عیشق و ئـەوین — پاشــی مــەرگــم بــۆم بنێــرێ ئافــەریــن*

زۆر لەمێژبوو ئارەزووم بوو کە مەسنەوی مەعنەوی مەولەوی جەلالەددین موحەممەد بنی موحەممەدی بەلخی بە هۆنراوەی کوردی وەرگێرم بەڵام ئیشتیغال بە تەدریس دە مەداریسی دەوڵەتی مانیع لە ئەنجامی ئەو کارە بوو تا رۆژی حەوتەمی خەرمانانی ساڵی ۱۳۷۷ کۆچی هەتاوی کە یەک ساڵم مابوو بازنیشەستە بم ئەو کارەم شرووع کرد و لە تاریخی ۲۵ گوڵانی ۱۳۸۵ بە لوتف و عینایەتی خوداوەند ئەو کارەم تەواوکرد...

ئەجری جەزیلم لە خوا داوایە چووکان لە گەوران هیوایان وایە

و ئەمن وام بیر دەکرد کە هەر وەکوو ئەسڵی خوار و خێچ و کەج و موعوەج وەک دار و بەرد و ئەمسالی وان بۆ ئەوە کە راست و هەموار و موستەقیم و ساف و دڵخواز بن ئیحتیاجیان

*(مەفاهیمی قسمەتێک لەئەشعاری سەرەوەم لە شاهنامەی خوالێخۆشبوو حەکیم ئەبولقاسمی فیردۆسی وەرگرتووە)

بەدەسگا و وەسائیلی مەخسووس هەیە. وەک دەبینین کە بەردی مەعدەن بۆ ئەوە کە ساف بکرێن و بۆ زینەت و جوانی ئیستیفادەیان لێ بکرێ دەبێ بە وەسیلەی دەسگای مەخسووس ئەو کارە بکرێ. و هەر وەها ئەو دار و دەرەختانەی کە لە دارستان و لە جەنگەڵان دەیانبڕن بۆ ئەوە کە ساف و تەراز بکرێن و بە سووڕەتی دڵخواز ئیستیفادەیان لێ بکرێ بە دەسگای مەخسووس و لە کارگای مەخسووس ئەو کارە ئەنجام دەدرێ... هەروەها خوو و خسڵەتی ئینسانانیش کە خواری و خێچی و کەجی و ئیعویجاجیان تێدایە؛ ئیحتیاجیان بەوە هەیە کە بە وەسیلەی ئیرشاد و ڕێنموونی تەوەسسوتی ئەشخاس و وەستاکارانی مەخسووس لە کەجی و ئیعویجاج نەجات بدرێن و بتوانن بە ڕێگای ڕاست و موستەقیمدا بڕۆن...

ئەووەڵین کەسانێک کە ئەو کارەیان بە عۆهدە گرت و ئەنجامیاندا، پێغەمبەرانی خودا بوون کە دە توولی حەیاتی پڕسوودی خۆیان بیلائینقیتاع و بێپسانەوە مەشغووڵی ئەنجام دانی ئەو وەزیفە گرینگە بوون و بە دوای واندا ئەولیا و عورەفا و سوڵەحا و عولەما، ئەو کارەیان ئیدامەدا. جەنابی مەولانا یەکێک لەو ئینسانە باشانە بوو کە وەزیفەی ئیرشاد و ڕێنموونی(کما هو حقه) بە عوهدە گرت کە دە نوسراوەکانی ئەو عالیجەنابە ئاشکرا و دیارە. یەکێک لە نوسراوەکانی ناسراوی حەزرەتی مەولانا کە ڕازاوە بە ئیرشاد و ڕێنموونیە و لە لایەن ئەهلی فەن مەقامی بەرز و والای پێدراوە بە نێوی مەسنەوی مەعنەوی، دە حەقیقەتدا شایستەیە کە بڵێین لە لیحازی شۆق و نوورانییەت وەک ڕۆژی ئاسمان وایە، کە هەرکەس ڕۆژی ئاسمان مەدح و ستایش بکا دە حەقیقەت و نەفسولئەمردا بینایی چاوەکانی خۆی مەدح و ستایش دەکا و هەرکەس ڕۆژی ئاسمان مەزەممەت بکا دە حەقیقەتدا نابینایی خۆی سابیت دەکا. جا، مەسنەوی وەک ئەو ڕۆژە وایە هەرکەسێک ئەوی مەدح و ستایش بکا سابیت دەکا کە بینادڵە و هەرکەسێک مەسنەوی مەزەممەت بکا، سابیت دەکا کە لە بینایی دڵ مەحروومە و کوێردڵە و دەتوانم بڵەم کە...

گەر لە نێو یەک لای تەرازوو بێ زەوی   بێ لە لای دیکەی تەرازوو، مەسنەوی
لای زەوی دەڕوا، هەتا لای لامەکان   لای کە لێی‌تی مەسنەوی ناخوا تەکان

و لە ئاخیردا بە موقتەزای (من لم یشکرالمخلوق لم یشکرالخالق) شایستەیە کە لە نووسەری شەرحی جامیعی مەسنەوی جەنابی ئوستاد کەریمی زەمانی تەشەککور و سپاس‌گوزاری بکەم چون ئەو شەرحە کە دە واقیعدا جامیعە، ئەهەممی مەئاخیز و مەنابیع و مەراجیعی من

بووە بۆ وەرگێڕانی تەواوی ئەبیات و خولاسەی داستانەکانی مەسنەوی (جزاه الله خیراً و کثرالله امثاله)... و هەروەها لازم دەزانم کە تەشەککور بکەم لە هاوسەری بەڕێزم خانم زوبەیدە ی کەریمی کە دە تەشویق کردنی من نیهایەتی بەزلی عینایەتی بە خەرجدا، تا ئەمن بتوانم ئەو کارە ئەنجام بدەم و ئەنجام دانی ئەو کارانەی داخیل و دەرەوەی مەنزڵ کە زیاتر بە من مەربووت بوون، بە عوهدەی خۆی گرت و فیکری منی لەو ڕێگایە ئاسوودە کرد، و ئەگەر زەحمەماتی وی نەبا، تەواو بوونی ئەو کارە غەیرە مومکین بوو، تەوفیقی ویم لە هەردوو دونیا داوایە... و بە وەزیفەی خۆم دەزانم کە لە بەڕێزان حاج ملا موحەممەدی ئەکرادی موعەللیمی ئەدەبییاتی عەرەب و عەلی هادی میاوەق ئوستادی موسەللەمی فەننی عەرووز و قافییە کە تا ئاخیرین لەحزە لە تەشویق کردنی من غافڵ نەبوون و جمهوری دارا، کە دە سەفحەئاراپی کامپیوتێری و پرینت کردن و ئامادە کردنی تەواوی ئەو کتێبە بۆ چاپ، زەحمەماتی شاقق و شایانی زیکری تەقەببول کرد، نیهایەتی تەشەککور و سپاس‌گوزاری بکەم...(شکرا لله سعیهم) ئومێدوارم کە ئەو ئەسەرە مەوریدی تەئییدی تەبعی عاشقانی حەقیقەت و مەعاریفی مەسنەوی قەرار بگرێ...

ربنا لا تواخذنا ان نسینا او اخطانا..
و اخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمین..

مەسنەویم نووسی بە چەندین ساڵ ئەمن — هەرچی خۆشی بوو لە خۆم کرد تاڵ ئەمن
مەعنەویم چا کرد لە بۆ خۆم باڵ ئەمن — دوور بخەم تا خۆم لە خۆشی ماڵ ئەمن
جیفەیی دونیام نەویست وەک داڵ ئەمن — نەم دەویست هیچ حوببی باب و کاڵ ئەمن
نەم دەکرد یەک زەڕڕە ناڵەناڵ ئەمن — ڕەنجی وا زۆر کردی زۆر خۆشحاڵ ئەمن

چونکە باغی مەسنەویم بوو مەنزەرە
جێگە بۆ پاکان و چی پێغەمبەرە

ئاخیرەت زاهیر دەبێ ئاخر یەقین — دێتە بەرچاوت هەچی کردت لە ژین
تێدەگەی ئەودەم ئەوەی کردت چ نین — هەرچی چاندت ئێستە وەختە بۆ چنین
جا منیش ئەی شەهریاری موڵک و دین — بۆم ڕەوایە لارەمل بم هەم غەمین
بۆم ڕەوایە من بگێرم گەرمەشین — بۆم ڕەوایە دوور لە خۆم کەم عەیش و ژین

چونکە سەرمایەم لە بۆ عوقبا نییە
هیچ ئومێدم غەیری لوتفی خوا نییە

تا لە مەحشەردا نەبم من دەس بەتاڵ — تا لە مەحشەردا نەبم ئەفسوردە حاڵ
تا لە مەحشەردا نەکەم من ناڵەناڵ — تا لە مەحشەردا نەبم من سەر بەتاڵ
تا نەپێوم قوڕ لە دەرگای بێهەواڵ — تا لە مەحشەردا نەڕێژم ئەشکی ئاڵ
تا نەبم من کاتی جواب و سوال لاڵ — تا نەبم نێو ئارەقەی شەرمان شەلاڵ
تا لە لای یەزدان نەبم من سەرنەوی
بۆیە نووسیم من کیتابی مەسنەوی

تا لە مەحشەردا نەبم من شەرمەزار — تا لە شەرمان سوور نەبێ ڕووم وەک هەنار
تا نەبم وەک تەیری بێباڵ پەست و خوار — تا نەبم من شەرمەزار لای کردگار
تا نەبن ئەشکم لە سەر ڕوومەت قەتار — تا نەگریێم و نەکەم داد و هەوار
تا نەکەن ئەعزام عەیبم ئاشکار — تا نیهان بێ هەرچی هەم بێعەیب و عار
مەسنەوی دێنم بە دوو دەستانی خۆم
تا شەفاعەت کا لە لای یەزدان لە بۆم

بۆیە نووسیم من بە کوردی مەسنەوی — تاکو کوردان بەهرە وەر بگرن لەوی
تاکو کوردان پێشەوا بن سەرزەوی — بۆ هەموو ئەخلاقی جوان و موستەوی
تا بە دەس کوردان چرا بێ مەسنەوی — تا نەجات دەن کەجڕەوان و مونزەوی
تا بە نووری ئەو چرایەی مەسنەوی — ڕێ نیشانی گومڕەهان دەن مەعنەوی
جا هەچی بۆی بێ لە لای حەق ڕائیحە
پاشی مەرگم بۆم بنێرێ فاتیحە

تا نەبێ بۆ خولق و خووی کوڕدان زیبان — تا بە خووی باش پڕ بکەن کوردان جیهان
تا بە خولقی باش بکەن کوردان ژیان — تا لە حاستی کوڕد نەوی بن چی چییان
تا بە خووی باش خووی خەشین کەن زۆرنییان — تا بە خووی باش بن لە دونیا جاویدان
تا لە بۆ خۆشی هەیانبێ ئیتمینان — تا موئەییەد بن لە جن و ئینسییان

مەسنەوی بگرن بە دەس خۆ وەک چرا
رەهنەما بن بۆ هەمو کەس وەک برا

ئارەزووم بوو لوتفی حەق تەنهاو و بەس
ئارەزووم بوو لوتفی خوام من بێتە دەس

ئەو خودای بۆ بێنەوایان بوو بە کەس
ئەو خودایەی خالقی هەرچی کە هەس

ئەو خودای چاکی نەکرد دونیا عەبەس
ئەو خودای کردی بەدەن بۆ ڕووح قەفەس

ئەو خودایەی لوتفی وی بۆ جەم هەوەس
لوتفی وی داوا دەکەن میر و عەسەس

خان و خانی لای خوداوەند خۆ گەدان
لوتفی یەزدان عامە بۆ باش و بەدان

**عبدالسلام مدرسی(خانی)**

## مەدحی حەزرەتی موحەممەد ـ علیە الاف التحیە و السلام ـ

ئەیئەتۆ جێو مەجلیست سەرعەرشی حەق
ئەی بە قامکت مانگی ئاسمان بوو، بە شەق

ئـەی بەیـەک گۆشـەی کـڵاوت تێـک شـکا
ئـاخرین قوڵلـەی سـەمائی حـەو طەبـەق

ئـەی لـە حاسـتی جـوانی خوڵق و خـوویی تـۆ
ڕۆژی پـڕ شـۆقی سـەماوات بـێ شـەبەق

یوسوف و مووسا کەجوان بوون زیاد لـەحەد
لات لەشەرمان سوورەڕوویان وەک شـەفەق

ئـــەرزی خـــاکی و ئاســـمانی وا بڵێنـــد
بـۆ توفـەیلیت شـاد و خۆشـن پـڕ ڕەمـەق

تـــا لـــەژێر ئاســـتانی تـــۆبێ جـــەبرەئیل
شادە ڕووگەش ڕوونـە دەوری بێ غەسـەق

بـۆ گـەدایی دێنـە بـەر دەرگـات شـەهان
خـــۆ دەزانـــن بـــۆ گـــەدایی موســـتەحەق

شـــاد دەکـــاتن لـــوتفی تـــۆ بێچارەگـــان
قـەهری تـۆ، ئـەمما دەکـا، بـەد، موحتـەرەق

ئـەی مـوطیعی تـۆن سـتێرە و ئاسـمان
ئـەی لـەوەش زیـاتر کـەبوو، نێو باسـمان

ئـەی لـە ئاسـمانان هـەموو، تـۆ چوویـە سـەر
ئـەی لـەلای یـەزدان ئـەتۆ بـووی موعتەبـەر

جـێ تەجـەللی زاتـی بـێ هـەمتای ئـەتۆ
ئـەی لـەلای تـۆ، نـووری تـاو دیتـی زەرەر

ئـەی لـەبۆ خزمـەت بـەنووری تـۆ هـەتاو
بـوو، موهـەییا، بەسـتی بـۆ خزمـەت کەمـەر

ئەی لەدەستت بـوون موسـەببیح وردەبـەرد
ئـەی بـە بـێ پـا هاتـە خزمـەت تـۆ شـەجەر

بـەو هەناسـەو بـەو نەفـەس گـەر هـات لـەتۆ
سوبحی کازب ڕۆی نـەما، دەرهـات سـەحەر

ئەی لەبەر تۆی چا دەکردهەر دوو جیهان
ئـــەو خودایـــەی کردگـــاری دادگـــەر

تۆ نەبی بووی ئەی موحەممەد ئەو دەمەی     دیار نەبوو، نێو چوار عەناسیر بولبەشەر
بەس ئەوەندە تێدەگا زانست، کە تۆ     یەک بەشەر هەی چاکترینی گیان لەبەر

ئەی بە بوونت تاقی کێسرا بوو خەراو
چۆم لە ساوە وشک بوو، نەی‌ما، چ ئاو

ئەی بەتۆ بوو دڵ مونەووەر وەک چرا     ئەی لەعەیب و عار وجودت دوور کرا
ئەی موجەسسەم بووی لە عیسمەت‌دا، ئەتۆ     ئەی شەفاعەت بۆ گوناهکار پێت درا
ئاسمان و خاک نەبوون گەر تۆ هەبووی     ئەی بەخەڵقت گەنجی حەق بوو، ئاشکرا
چەرخی‌گەردوون مات لە خوڵق‌وخوویی تۆ     خوڵقی تۆ لای حەق عەزیمی نێو نرا
بۆت زریێ بوو ((یعصمک الله)) ئە تۆ     ((ینصرک اللات))ت سپەر وەختی هەرا
چونکە تۆ بووت، ئەو زریێە و، ئەو سپەر     تۆ شکەستت تا ئەبەد لێ دوور خرا
ئەی مەلائیک بۆ مەدەد زۆر هاتنەلات     وەختی جەنگ و مەعرەکەو، دەعوا و، میرا
ئەی بوتان یەک یەک دەیانکرد سەر نەوی     ئەو دەمەی کە، نێوی تۆ، لای وان برا

ئەی نیشانەی پەرچەمت لەولاک بوو
ئەی ئەتۆ جێت سەرسەری ئەفلاک بوو

بەس ئەتۆی مەقسوود لەخیلقەت لاسیواک     ئەی جیهان و ئاخیرەت سەر جەم فیداک
تا بە خووی خۆی خوا ئەتۆ زینەت بدا     تۆی هەتیو بێ باب دەکرد یەزدانی پاک
تا مورەببیت هەر خوداوەند بێت و بەس     تۆی‌دەکرد مەحرووم لەحوبب ومیهری داک
تا کو نەت بێ عیشقی غەیری خوا ئەتۆ     لایدەبرد لات دایک و باب ئەو خوایی تاک
وەک‌لەمووسای‌ویست‌لەتوورخوا خەلعی‌نەعل     تا لەغەیری خوای نەبێ ئەو لا، چ چاک
شەو ڕەشی وەرگرت لەتوڕرە و پەرچەمت     ڕۆژ گەشی وەرگرت لەڕووت، بوو تابناک
گەر وەکوو هەی خوا ئەتۆ زاهیر بکا     مانگ و ڕۆژ خۆ ون‌دەکەن زوو دەچنە لاک
قەت نەبو مەئیووس لەلوتفی تۆ چ کەس     چەشنی دۆستان بوو ئومێدیان پێت عیداک

ئەی لە بۆت سەنگەر بوو تاری عەنکەبووت
ئەی هەمووی هەر ڕەحمەتە هەرچی کە بووت

ئەی ئەتۆی مەخسووس بە لوتفی کردگار     ئەی عوقاب هات بۆ نەجاتی تۆ لە مار
بەرخی بریان بوو، لەسەر سفرەت تەعام     رازی سەممی موهلیکی کرد ئاشکار
ئەی ئەوەی دونیای هەموو چا کرد، بە(کن)     نێوی تۆی گەڵ نێوی خۆی ئەو کردە یار
هەر کەسێکی تۆ، لە بۆ وی بووی موطاع     خۆی موطاعی وی دەکوت پەروەردگار

ئەو دەمەی ئەعدا لەدووت بوون هەلوە داو — خـالقی کـول بـۆ، پـەنات تـۆی بـردە غـار
زوو لەبەر دەر چاکی کرد، یەک لانە، کۆتر — عەنکـەبووتیش چـاکی کـرد هـەو داوو، تـار
جـا بـەوان دوو، کـردی زاتـی بـێ نـەزیر — چـاوی ئەعـدای تـۆ لـەوێ بێ نـوور و تـار
تـۆ لـە بـۆ خـۆت ئیفتیقـارت کـردە تـاج — گـەنجی دونیـات تـۆ لـەلا، بـێ ئیعتیبـار

ئـەی ریکابـدارت لـە میعـراج جـەبرەئیل
ئەی نەبوو وەک تۆ لەبۆ حەق کەس خەلیل

ئـەی لـە دونیـادا، لەباشـی بـێ نـەزیر — ئەی لەتۆ بوون مانگ و ئەنجوم موستەنیر
ئەی لەژێر پێی ئەسپی تۆ ئەو، عەردە، گەرد — بـۆ بلّینـدی لیـت سـەماوات موسـتەعیر
قەهری تۆ گەر بەرد، دەکاتن ورد و خاش — لـوتفی تـۆ بـۆ یـار و بـۆ ئـەحباب حـەریـر
ئـەی بـەلوتفت دووزەخـیش بێ تـین دەبێ — بـت هـەوێ تینـی دەبـێ زۆر زەمهـەریـر
ئـەی بـە عیـزز و گـەورە بیـت جەففەلقەلـەم — ئەی لەبۆ تۆ عەرش و کورسی بوون سەریر
چـون قەبوولـە لای خوداوەنـد، ویسـتی تـۆ — لـوتفی تـۆ داوا دەکـەن چووکـەو، کـەبیـر
چونکـــەلوتفت بـــۆ برینـــان مەرهەمـــە — بێنـە لات ئـارام دەبـن جـانی و شـەریـر
ئیبلیســیش چونکــە لــوتفی تــۆی دەوێ — بۆیـە مـاوە، تـاکو بـۆی، بـێ، دەسـتگیر

لوتفی تۆ لای هەر کەسێ بگرێ قەرار
گەنجی دونیای ئەو لەلا، بێ ئیعتیبار

تـا لـە ژێـر ئـەو ئاسـمانەی بـێ زەوی — تـا، وەنەوشـە و شـەنگەبی، بـن، سـەرنەوی
تـا دەداتـن تـاوی ئاسـمان زینـدەگـی — تـا دەدا حـادی بـە وشـتر خۆشـرەوی
ئارەزوویـان لـوتفی تـۆ، بـو و، بـاش و بـەد — تـاکو بـۆ یـان بـێ نـەجاتی ئـوخرەوی
ئـەی لـە بـۆ تـۆ بـوو موعـەللیم کردگـار — بووی لـە بۆ جـەمعی علووم تـۆ موحتـەوی
تـۆ شـەفیعی بـۆ خـەرابی شـەرمەزار — تا، لە دەرد و ئێش نەجات دەی زوو، ئەوی
قـەت لـەریگای تاعـەتی تـۆ، لا نـەدا — تاعـەتی شـەو، نیـوە شـەو، یـا بـێ خـەوی
ئـەی ئـەتۆ بـووی ((مارمیـت اذرمیـت)) — ئەی ئەتۆ ی کرد، ئەو خودای بالا، قەوی
تـۆ، کەگـەنجت بـوو، لـەلا، بـێ ئیعتیبـار — خۆت لەزێڕ و گەنج دەکەی زۆر مونزەوی

ئەی لە حاستی جوودی تۆ خۆ، زۆر کەمە
ئاسمان و عـەردی خـاکی و، چـی چەمـە

ئەی ئەتۆ، نێو ت شە فای دەرد و غەمە — ئـەی ئـەتۆ خـووت مەشقە بۆ ئەو عالەمە
ئەی ئەتۆی کرد، خوا، بە خەتمی مورسەلین — ئـەی وجـوودت دەسـتگیری ئادەمـە

ئەی لەحاستی نووری بێ پایانی تۆ     نووری تاوو، مانگ و ئەستێران، شەمە
ئەی موحەممەد دانە میمێکت ئەتۆ     بۆ هەموو ئەو خەڵقی دونیا خاتەمە
ئەی لە بۆ، زەخمی دەروونی کەج ڕوان     پەیرە وی لێت چاکترینی مەڵحەمە
ئەی لە ژێر فەرمانی تۆن عەرد و سەما     ئەی ئومێدمان تۆی لە مەحشەر دا، ئەمە
ئەی زەبان کۆتا، لە مەدحی تۆ، تەواو     گشت زەبان مەدحت بکەن هێستا، کەمە
ئەی ((ابیت عند ربی))ت، بوو وتار     بۆت دەهات لای خوا، غەزا و، ئاو، دەمدەمە

ئەی، بەموددەسسیر ئەتۆ، دەکرای خیتاب
ئەی بە بێ مەکتەب ئەتۆ، خوێندت کیتاب

ئەی لە دونیا تاق و بێ هەمتایی تۆ     ئەی لە ئاخیر دا، شەفیع لای خوایی تۆ
ئەی موخاتەب بووی بە ((اقرا)) نێو حیرا     ئەی هەموویان ئە نبیا لەدوایی تۆ
ئەوەڵا بوو سینە کەت بۆ رازی حەق     ئەی ((الم نشرح)) دەهات بۆ لایی تۆ
ئەی لەبەر تۆی کوت خودا، ((ماودعک))     ((ماقلی))ی، کوت چونکە بوو شەیدایی تۆ
شەرقی لوتفی زاتی بێ هەمتا، دەبووی     چونکە ((یشری نفسە)) سەودایی تۆ
چون بە لوتفی حەق ئەتۆ رازایەوە     خۆ، لە هەرچی رەنجە، بێ پەروایی تۆ
ئەی عەسای مووسا لە حاستی موعجیزەت     دانە موویەک بوو لە سەد هەودایی تۆ
گەر لە کاتی بیم عیسای بردە سەر     چوارەمین ئاسمان خودای زانایی تۆ

بەس بە خۆشی تۆی دەبرد، تا لامەکان
نەک لە ترس و نەک لەبیم، بەڵ، کن فکان

ئەی بە میعراجت دەبوون خۆشحال مەلەک     ئەی‌بەتۆ بوون موفتەخەر یەک‌یەک فەلەک
ئەی بە((اسری))کردی میعراج خوا بەیان     ئەی لەئاسمان چوویە سەر،لای خوایی تەک
ئەی بەکاروان لات دەنا شک لەو عرووج     ئەی نەبوو، تەرد ید کە ((اللە معک))
بەو عرووجەت ئاسمانان تۆ گەڕای     نەک وەکوو یونوس کەچوو، بۆ نێو سەمەک
ئەی ئەتۆ مەحبووبی حەق‌بووی زیاد لەحەد     ئەی بەنێوی خوات دەبوو شیرین حەنەک
ئەی ئەوەی دەستی بەتۆ گرت بووی‌نەجات     ئەی ئەوەی لای ناوەعەهدی تۆ ((هلک))
ئەی بەیەک لەحظەت دە پێوا، ئاسمان     ئەی نەناسرای تۆ، بە حیسسی موشتەرەک
بوون عەجایب لەو عرووجەت ئاشکار     ئەی لەبۆ باش و لە بۆ بەد، تۆ، مەحەک

ئەی لەحەد زیاتر لە سیدرە چوویە سەر
ئەی موقەددەر بوو،بە قەدری تۆ، قەدەر

ئەی بەعیلمت جەهلی دوون چۆ، نێو نەمان
ئەی بەحیلمت کفر و خۆد خواهی چەمان
ئەی لەحاستی جوودی تۆ بەس یە ک نەمە
بە خشیشی ئاسمانی شینی وەک کەوان
ئەی لەحاستی عیلمی تۆ، لەو ح و قەڵەم
طفلی نەو پان هیچ کە نازانن ئەوان
ئەی لەحاستی سەبری بێ پایانی تۆ
سەبری ئەییوب زۆر عەجوول و ناتەوان
ئەی لەکاتی گەرمی وەک ((ناری لظی))
هەوری بالای سەر لە بۆ تۆ سایەبان
ئەو دەمەی ڕێی طووری مووسا گرتەبەر
جێت ئەتۆ، سەرعەرش و کورسی و لامەکان
ئەو دەمەی عیسا بە سواری کەر دەڕۆی
تۆ بە بوڕڕاقت، دەپێوا، ئاسمان
تۆ ئومێدی بۆ قە تیس و بێنەوا
ئەی لەگەڵ حەق گفتوگۆت کرد، بێ زەبان

ئەی لە سیدرە چوویە سەر تا ئینتیها
ئەی لە تۆیان بۆ دەهات نوور ئەنبیا

نەم دەکرد مەدحی نەبی من بۆ هەوا
نەم دەویست بەو مەدحە بم ساحەب نەوا
وەک زوهەیری نیم بکەم مەدحی هە ریم
تا بگا پێم سەروەت و ماڵ و کەوا
بەس زەخیرە ی ئاخیرم بوو، ئارەزوو
بۆیە مەدحم کرد موحەممەد من ئەوا
بۆیە مەدحم کرد ئەمن خە یرە لبەشەر
چونکە مەدحی وی لە بۆ، دەردان دەوا
چون ئومێدم بوو، بە مەدحی وی، ئەمن
بۆیە کردم مەدحی وی بەو، موحتەوا
من لە بو خۆم کردە تۆشە مەدحی وی
تا ببینێ، بۆ شەفاعەت من ڕەوا
خاکی بەر پێی بۆ کلی چاو، ڕووگەمە
تا نەبێ ڕووگەم وەکوو، وشتر حەوا
گەرچی پەروەندەم لە طاعەت خالیە
خۆ کوتم مەدحی ڕەسووڵی پێشەوا

هیچ زەخیرەی خانی بۆ عوقبا نیە
غەیری ئەو مەدحەی نەبی چی لا، نیە

**عبدالسلام مدرسی ـ خانی ـ**

**۱۳۸۷/۰۹/۲۲**

بسم الله الرحمن الرحیم

گوێ دە نەی چۆن شیوەن و غەوغا دەکا ‏ بۆ بەیانی دەردی دووری وا دەکا[1] (١)

من لە نەیزار بووم و بریانم لە بن ‏ من کە گریام بۆم دەگریان پیاو و ژن (٢)

لەت دەکەم سینەم لەبەر دەردی فیراق ‏ تا بەیان کەم شەرحی دەردی ئیشتیاق (٣)

هەر کەسێکی دوور لە ئەسڵی خوی کەوێ ‏ وەسڵی ئەسڵی خۆی لە ئاخردا دەوێ[2] (۴)

هەر گرووهێک چوومە لای ناڵان بووم ‏ هاونشینی شاد و بەدحاڵان بووم (۵)

بەس بەزەن بوو هەر کەسێک بۆ یاری من ‏ نەیدەزانی باتن و ئەسراری من (۶)

سیرڕ و ناڵەی من یەکن لێک نینە جوێ ‏ کوا دەکەن دەرکی حەقیقەت چاو و گوێ؟ (٧)

مورتەبیت پێک جیسم و ڕووح بێگانە نین ‏ چاو لە بۆ بینینی ئەو جانانە نین (٨)

ئاورە ئەو دەنگی نایە با، نیە ‏ فاقیدی وی بمرێ بوونی چا، نیە (٩)

ئاوری عیشقە کە کەوتە نێو نەی ‏ جوششی عیشقە دەبینی تۆ لە مەی (١٠)

نەی ئەنیسی عاشقێکە دوور لە یار ‏ نەی دەکاتن دەردی عاشق ئاشکار (١١)

ژەهر و تریاکی وەکوو نەی کوا هەیە؟ ‏ دەرد و دەرمانی وەکوو نەی هەر نەیە (١٢)

بۆن دەکا نەی باسی مەخوی عاشقان ‏ باسی عیشق و ڕەنجی مەجنوون بێئەمان (١٣)

غەیری مەدهۆشمەحرەمی عیشق هیچکەس ‏ بۆ زبانیش مشتەری هەر گوێیە بەس (١۴)

عومری زۆرم من لە غەمدا بردە سەر ‏ پڕ لە دەرد و ڕەنج و میحنەت بوو جگەر (١۵)

گەرکو عومرم چوو لە دەس باکم نیە ‏ تۆ بمێنە چەشنی تۆ پاکم نیە (١۶)

تینووە ماسی لە دەریای خوای سەمەد ‏ بێبەشان لەو رزقە، خەستەن تا ئەبەد (١٧)

کوا دەزانن حاڵی دلدار بێدڵان؟ ‏ لەو قسانە بەس بکەین با، ئەی فلان[3] (١٨)

---

[1] گوێ دە، تۆ گریان و ناڵەی ئەو نەیە ‏ دەردی هیجران و فیراقی زۆر هەیە

[2] عاقبەت ئەو وەسڵی ئەسڵی خۆی دەوێ (مصرع دوم)

[3] حاڵی پوختە کوا دەزانێ شەخسی خام؟ ‏ لەو وتانە بەس بڵەێن با وەسسەلام

ـتکە زەنجیر ئەی کوڕم ئازاد بە — بەس ئەسیری ماڵی بێ بنیاد بە (١٩)
ـەرکو دەریا تۆ بڕێژیە جەڕڕەیەک — خۆ لە خۆی قەت زێدە نابا زەڕڕەیەک (٢٠)
ـێ جەڕەی چاوی حەریس قەت پوڕ دەبێ؟ — کوا سەدەف قانع نەبێ پوڕ دوڕ دەبێ؟[1] (٢١)
هەر کەسێکی عاشقی ئەو نوور بوو — ئەو لە هەرچی حیرس و عەیبە دوور بوو (٢٢)
ـد ببە ئەی عیشقی خۆشڕەفتاری مە — ئەی تەبیبی دەردی ناهەنجاری مە (٢٣)
ئەی دەوا بۆ دەردی جیسم و ڕووحی مە — ئەی لە نێو دەریای مەسائب نووحی مە (٢٤)
عیشقە باعیس جیسمی خاکی چۆ سەما — کێو بە سورعەت ڕێ‌کەوت کەوتە سەما (٢٥)
ـێوی تووری بەس ئەوین هێنایە جۆش — توور مەست‌بوو کەوت مووسی چوو لەهۆش (٢٦)
ـەر موافق با لەگەڵ من لێوی یار — سیرڕی زۆرم من دەکردن ئاشکار (٢٧)
هەرکەسێکی بوو لە هاو ئەزمان جودا — بێ‌زبانە با هەشی بێ سەد نەوا (٢٨)
ـوڵ کە ڕۆیشت و گوڵستان هیچ نەما — بولبولیش ما، مات و حەیران بێ نەوا (٢٩)
ئەسڵی کار مەعشووقە عاشق پەردەیە — ژین لە بۆ مەعشووقە عاشق مردەیە (٣٠)
گەر نیگای عاشق نەکا هیچ کات ئەوین — تەیرە عاشق پەڕڕ و باڵی هەڵوەرین (٣١)
عەقڵی جوزئی چۆن لە بۆ من دێ بە کار؟ — گەر نەبینم من لە پێشم نووری یار (٣٢)
عیشق دەیوێ تا حەقیقەت کا بەیان — چون لە نەینووک‌دا حەقیقەت بوو عەیان (٣٣)
ئەو دڵەی ئاوێنەکەت نەسڕی لە ژەنگ — بۆیە ظاهیر نابێ لەودا هیچ ڕەنگ (٣٤)
ـستانێک دێت ئێستا گوێ دەیە — مەطڵەبی وی شاملی حاڵی مەیە (٣٥)

***

**حیکایەتی عاشق بوونی شا بە کەنیزێک و کڕینی شا ئەو کەنیزەیە...**

**خولاسەی داستان..**

پاشایەک بە قەسدی ڕاو دەگەڵ خزمەتکارانی خۆی لە شار دەرکەوت و لە ڕێگا کەنیزێکی زۆر جوانی دی و عاشقی بوو و تەسمیمی گرت کە بە پووڵێکی زۆر بیکڕێ و دەگەڵ خۆی بەرێ. ئەو کارەی ئەنجامدا زۆری پێ‌نەچوو کە کەنیز نەخۆش بوو، شا، زۆر تەبیبی لە لای خۆی کۆکردنەوە ئەو تەبیبانە هەموویان موددەعی بوون کە بە دانش و فەننی خۆیان ئەو کە نیزە موداوا دەکەن و لە ڕووی غروور و خودخواهی ویست و ئیرادەی خودایان نادیدە گرت،

[1] گوزەڵەی چاوی حەریس کوا پوڕ دەبێ؟

هەر بەو عیللەتە هەرچەند تەلاشیان کرد حاڵی ئەو نەخۆشە خەرابتر بوو. شا لە هەموو عیلەل و ئەسبابی تەبیعی نائومێد بوو و ناچار ڕووی لە دەرگای خوداوەند کرد و دە وەختی دوعا و ئیلتیماس خەوی لێ‌کەوت و دە خەودا پیرێکی موڕشید بەوی کوت تەبیبی حازق کەسێکە کە، سبەی، دێتە لای تۆ. سبەینەی ئەو شەوە ئەو تەبیبەی پەیدا کرد و ئەوی بۆ موداوا هینا لای کەنیزی نەخۆش. تەبیب موعایەنەی کرد و بە فەڕاسەت حاڵی بوو کە عیللەتی نەخۆشی ئەو کەنیزە عەواملی جسمانی نیە بەڵکە ئەو نەخۆشی عیشقە، و ئەو عاشقی کابرایەکی زەڕگەرە کە ماڵی لە سەمەرقەندە. شا بە دستووری ئەو تەبیبە عیددەیێکیی بۆ سەمەرقەند نارد تا ئەو کابرا زەڕگەرە بێننە دەرباری شا و کاتێک کە ئەو زەڕگەرەیان دەگەڵ خۆ هینا، شا طبقی دەستووری تەبیب ئەوی دا بە کەنیز. هەتا شەش مانگان زۆر بە خۆشی دەگەڵ یەکتریان ڕابوارد، بەلام پاش تەواو بوونی ئەو ماوەیە، تەبیب بە ئیشارەی خوداوەند ژەهرێکی دا بە زەڕگەر کە جوانی و جەززابییەتی وی کەم بوو و لە پێش چاوی کەنیز کەوت. ئەو دەستوورەی خوداوەند وەک دەستوورێک بوو کە دای بە ئیبراهیم تا منداڵی خۆی ئیسماعیل سەر ببڕێ و بە کوشتنی ئەو کوڕیژگە بە دەستی خزر شەبیهە جا بویە ئەو کارانە ڕەمز و ڕازێکیان تێدایە کە لە دایرەی ئەفهامی عادی خارجە...

پادشایەک بوو لە دەورانی قەدیم — دین و دونیای دا بەوی ئەو خوای‌کەریم (٣٦)
ئەز قەزا ڕوژێک لە ئەسپی بوو سووار — ئەو لەگەڵ ئەفرادیمەخسووس بۆ شکار (٣٧)
شا لە ڕێگا دی کەنیزێک زۆر جووان — بۆ غولامی ئەو کەنیزە، شا بە گیان (٣٨)
شا کە عیشقی بەو کەنیزە دەربڕی — پووڵی زۆری دا کەنیزی پێ کڕی (٣٩)
ئەو کەنیزەی گەر کڕی جا دوایە شا — ئەو کەنیزە زۆر نەخوش بوو ئەز قەزا (٤٠)
یەک‌کەری بوو نەی‌بوو پاڵان یەک نەفەر — بووی کە پاڵان هات گورگ و بردی کەر (٤١)
هەی‌بوو یەک‌کەس گۆزە ئاوی هیچ نەبوو — بۆی کە هات ئاو، لێی‌شکا ئەو گۆزە زوو (٤٢)
حوکمی شا بوو، کێ تەبیب بوو زوو دەهات[1] — پێی کوتن شا ئێمە هەر دوو دەن نەجات (٤٣)
سەهلە دەردم گیانی گیانی من ئەوە — دەردە دارم ژین و مانی من ئەوە (٤٤)
هەر کەسێک بێت و نەجات‌دا گیانی من — بوو نەسیبی، گەوهەر و مەرجانی من[2] (٤٥)
پاکی کوتیان غەم لە خۆت تو دوورکەوە — تێ‌دەکۆشین بۆ نەجاتی پێکەوە (٤٦)

---

[1] حوکمی شا بوو هەرچی دوکتور بوو دەهات (مصرع اول)

[2] بۆ نەسیب بەو گەوهەر و مەرجانی من (مصرع دوم)

هەر یەکێکن وەک مەسیحی عالەمێک ... بۆ هەموو دەردان لەلای مە، مەڵحەمێک (۴۷)
چون لە کیبران ویستی حەقیان هیچ نەووت ... بۆیە چاویان زوو بە عەجزی خۆ کەووت (۴۸)
تەرکی (انشاء) قەسوەتم لێی بوو موراد ... نەک وشەی ظاهرجووان مەعنی فەساد (۴۹)
زۆر هەنە (انشاء) ناڵێن هیچ زەمان ... گیانی (انشا)ش بۆ قەرینی گیانی وان (۵۰)
هەرچی کردیان تا دەواکەن ئەو نەخۆش ... زۆر نەخوشتر زێدەتر بوو جێی پەرۆش (۵۱)
زۆر زەعیف بوو ئەو کەنیزە لێو بەبار ... ئەشکی خوێنی چاوی پاشاش جویبار (۵۲)
ئەز قەزا لە سکەنجەبین سەفرادە بوو ... ڕۆنی بادام بۆ یبووسەت چا دەبوو (۵۳)
ئەو هەلیلەش هەر رەوانی لێبڕی ... ئاو، وەکوو نەفت بۆ مەدەد بۆ ئاگری (۵۴)

**ظاهر بوونی عەجزی تەبیبان لە موعالەجەی کەنیز و ڕووکردنی پاشا بە دەرگای خوداوەند و دیتنی پاشا، وەلی دە خەودا...**

شا کە چاوی وا بە عەجزی وان کەووت ... پێ پەتی ئەو ڕووی دەکردە مزگەووت (۵۵)
شا لە مزگەوت ڕوو بەرەو میحراب دەچوو ... جێی سجوودی پڕ لە ئاوی چاو دەبوو (۵۶)
گەر وەهۆش هات ئەو لە غەرقابی فەنا ... دەستی پێکرد بۆ خوداوەند ئەو سەنا[1] (۵۷)
کەمترینی بەخششت بوونی منە ... من بڵەم چی؟ تۆ دەزانی چی وەنە[2] (۵۸)
ئەی هەمیشە بۆت پەنام بردوە ئەمن ... جارەکی دیش ڕێم غەڵەت کردوە ئەمن (۵۹)
بێت کوتم تۆ گەرچی زانیم من سیرت ... چی دە دڵتا بێنە سەفحەی ظاهرت (۶۰)
چونکە ئەو ناڵەی لە ناخی دڵ دەهات ... خوا لە بەحری لوطفی خۆی بەو، دا خەڵات (۶۱)
کاتی گریان خەو لەبۆ وی کرد ظهوور ... دی دە خەودا پیرە مێردێک هاتە ژوور (۶۲)
پێی کوت ئەی شا تۆ لە دەردان بووی نەجات ... یەک غەریبی مەش سبەینێ دێتە لات (۶۳)
کاتی ئەو هات ئەو تەبیبی حازقە ... ڕاستی بگرە چون ئەمین و سادقە (۶۴)
سحری موتڵەق تو دەبینی لەو عیلاج ... قودرەتی حەق تۆ دەبینی لەو میزاج (۶۵)
ڕۆژ کە هات و وەعدە هاتە بەر نەزەر ... ڕۆژی ئەختەرسۆز لە مەشریق هاتە دەر (۶۶)
شا لە کۆشک و کاخی خۆی بوو منتەزیر ... تا ببینێ چی نشانیان دا بە سیر (۶۷)
دیتی شەخسێک فازل و پڕ مایە بوو ... ئەو هەتاو بوو جێگەشی نێو سایە بوو (۶۸)

---

[1] گەر لە غەرقابی فەنا ئەو هات وەهۆش ... ئەو لە مەدحی ئەو خودایە هاتە جوش
[2] کەمترینی بەخششت مولکی جیهان ... من بڵەم چی؟ چون دەزانی تۆ نیهان

ئەو لە دوور هات زەرد و باریک وەک هیلال     ون لە چاوان بوو، هەبوو، هەروەک خەیاڵ (٦٩)
وەک نەبێ وایە، لە ڕووحدا جێی خەیاڵ     چاو جیهانێک بەو دەسووڕێ ئەی هەواڵ (٧٠)
سوڵح و جەنگی وان بە چی بوو؟ یەک خەیاڵ     فەخر و نەنگیشیان خەیاڵ ئەی‌با کەماڵ (٧١)
ئەو خەیالاتەی کە داوی ئەولیان     عەکسی جوانانن لە بێستانی خودان (٧٢)
ئەو خەیالاتەی کە شا، دیبووی لە خەو     ڕاس دەبینرا جا، لە ڕووی میوانی ئەو (٧٣)
شا کە میوانی لە دوور چاو پێ‌کەووت     پێش لە دەربان ڕووبەڕووی وی، ڕێ‌کەووت (٧٤)
هەردوو بەحری سابح و مەللاح بوون     هەر دووگیانیش لێک دەدروان بێ دروون (٧٥)
شا کوتی مەعشووقی من تۆ بووی بەڵام     کار سەبەب بو کار دەبێ ئەی خوش مەرام (٧٦)
ئەی ئەتۆ بۆم مستەفا من وەک عومەر     بەس لە بەر خزمەت بە تۆ بەستم کەمەر[1] (٧٧)

## ویستنی ڕعایەتی ئەدەب لە خوداوەندی وەلیی‌التوفیق لە هەموو حاڵێک‌دا و بەیان کردنی وەخامەتی زەرەر و زیانی بێ‌ئەدەبی...

لەو خودایەن ویست کە بن‌داتێ ئەدەب     بێ‌ئەدەب نەدرا بەوی هیچ لوطفی ڕەب (٧٨)
بێ‌ئەدەب تەنها نە بۆخۆی هەر بەڵا     بەڵکە ئاور ئەو لە عالەم بەر دەدا (٧٩)
ڕزق و ڕوزی هات لە ئاسمان بۆ زەمین     بێ‌سەرێشە و بێ‌فروش و بێ‌کڕین (٨٠)
بوون لە نێو ئەفرادی مووسا چەند کەس     بێ‌ئەدەب کوتیان ئەدی، سیر و عەدەس؟ (٨١)
زوو بڕا جا، ڕزق و ڕۆزی ئاسمان     ماوە ڕەنجی زەرع و بێڵ و داسمان (٨٢)
ویستی عیسا جارەکی دی تا خودا     بۆی دەناردن ئەو لە ئاسمانڕا غەزا (٨٣)
بێ‌ئەدەب دیسان دەبوون هەروەک گەدا     زوو دەیان‌برد چی لە سەرسفرەی دەما (٨٤)
ویستی عیسا جا لە وان و پێی کوتن     ئەو غەزایە و هەر هەیە تاکوو هەبن (٨٥)
کافری گەر، بەدگومان بی یا حەریس     ئەو دەمەی تۆ بی لە سەر سفرەی ڕەئیس (٨٦)
**چون تەمەعکار بوون سیفەتیان وەک گەدا     دەرکی ڕەحمەت زوو لەوان قایم کرا** (٨٧)
ئیشکە ساڵی دێ، زەکاتیان گەر نەدا     گەر، زینا بوو، دێ لە هەرلا ڕا بەڵا (٨٨)
چی بەسەر تو دێ لە دەردان یا لە ئێش     هەر بەخۆت باعیس دەبی بۆت دێتە پێش (٨٩)
هەرکەسێکی بوو لە گەڵ دوست بێ‌ئەدەب     ناپیاوە ڕێ‌گری مەردانی ڕەب (٩٠)
بوو ئەدەب باعیس، فەلەک پڕ نوور بوون     بەو فریشتان پاک لە پیسی دوور بوون (٩١)

---

[1] هەر لە بەر خزمەت بە تو، بەستم کەمەر(مصرع دوم)

هەر ئەدەب باعیس بوو ڕوژیش گەر گرا    هەر ئەدەب باعیس بوو، شەیتان دەر کرا (٩٢)

**ملاقات کردنی پادشا دەگەڵ تەبیبی ئیلاهی کە دەخەودا مزگێنی ملاقاتی وی پێدرابوو...**

ئەوەڵای کـرد دەسـت و گرتیەباوەشـی    وەک ئـەوین، دای، نێـو دڵ وگیـان جێگەشی (٩٣)

ماچی کردجـا دەسـت و نێـو چـاوانی وی    لێـی دەپرسـی جـێ ورێ ونیشـانی وی (٩٤)

دەستی گـر ت وبردیـەژوور جا وای دەووت    مـن بەسـەبرم گـەنجی زۆرم دەس کـەووت (٩٥)

بێیـدەکوت ئـەی دافعـی هـەرچی حـەرەج    تـو کلیـدی بـۆ هـەموو خوشـی وفـەرەج (٩٦)

ئـەی لقـات بـۆ هەرسـوئالێک بـوو جـەواب    لابـەری موشـکیل ئـەتۆی (مـن کـل بـاب) (٩٧)

تـو دەزا نـی ئەودڵـەی مـن چـی دەوێ    دەسـتگیری ئەوکەسـەی دەقـو ڕێ کـەوێ (٩٨)

زۆر بـەخێرێی[1] ئـەی پەسـەندیدەی خـودا    گـەر نـەبی تـو دێـن قـەزا و تـەنگی فـەزا (٩٩)

ئەوکەسـەی نـەی وێ کـەتۆ بـی سـەروەری    ئەولــەئاخردا دەچــن ریشەوســەری (١٠٠)

چـون تـەواوبوو مـەجلیس و سفرەی کـەڕەم    دەستی گـرت و بـردی ئـەو بۆ نێـو حـەرەم (١٠١)

شـەرحی دەردی ئـەو نەخوشـەی بـۆ دەدا    جـا لەپاشـان ئـەو نەخوشـەی بـردە لا (١٠٢)

ڕەنـگ وڕوو هـەم نـەبزو قـاڕووڕەی دەدی    بیستیشـی چـەن عـەلا مـا تـی دەدی (١٠٣)

ئـەوکوتی دێ لەودەوایـەی وان عـەزاب    ئـەوعیمارەت نـا، کـە، هیچ بەڵکەم خـەراب (١٠٤)

بـێ خەبـەر مـا بـوون لـە ئـەحواڵی دەروون    دەردی بیمـار هـیچ نـەبوو بـۆ وان ڕوون (١٠٥)

چـاوی لـێ کـرد، ون لـەوی بـوو ئاشـکار    ماجـەرای ئـەمما نـەکوت بـۆ شـەهریار (١٠٦)

کـوا دەکـەن سـەودا و سـەفرا وا نـەزار؟    بـۆنی دووکـەڵ دیـار دەکـا لـەو نـەوعی دار (١٠٧)

دی لەناڵــەی وی کــەلاوازی دڵــە    جیســمی ســالم، ئەوهــەبێ وازی دڵــە (١٠٨)

عاشــقی ظاهرلەگریــــە و زاری دڵ    هـیچ نەخوشـی نـین وەکـوو بیمـاری دڵ (١٠٩)

دەردی عاشـق زۆر لـەدەردی دی جـودا    عیشــقە ئوســتوڕلابی ئەســراری خــودا (١١٠)

عاشـقی گـەربێ حـەقیقی یـا مـەجاز    عاقیبـەت دەنـداتێ بـۆ ئەسـڵی، جـەواز (١١١)

مـن لـەبۆ عیشـق، چـی بڵـەم شـەرح وبـەیان    هەرکەگەیمەعیشــق، لاڵــم بــێ زەبــان (١١٢)

گەر زبان بۆ شەرحی مەطلەب ڕوون کەرە    عیشـقی بـێ ئـەزمان بـەڵام لـەو، ئـەنوەرە (١١٣)

---

[1] - زۆر بەخێرێی (مصرع اول)

گەر قەڵەم دەینووسی مەتڵەب توندو زوو — هەر کەگەییەعیشق ئەودوولەت دەبوو (١١٤)
شەرحی عیشق وعاشقی نەی زانی کەس — شەرحی عیشق وعاشقی لای عیشقەبەس (١١٥)
بۆ وجوودی ڕۆژدەلیل هەر ڕۆژەبەس — بۆ دەلیلت ڕوو لەوی کە، نەک لەکەس (١١٦)
گەرچی سایەبۆ وجوودی ڕۆژ نیشان — ڕۆژ نەبێ خۆ سایەنابێ هیچ زەمان (١١٧)
سایەخەو دێنێ لەبۆت وەک داستان — ڕ ۆژ کەدەرهات لەت بوومانگی ئاسمان (١١٨)
کیمیای وەک ڕۆژلەدونیا دانیە — ڕۆژی گیان بۆ وی زەمان و جا، نیە (١١٩)
ڕۆژلەخارج دا ئەگەرچی یەک تەنە — ئی وەکوو وی خۆ دەزیهنان زۆر هەنە (١٢٠)
ڕۆژی گیان خارج لەئەرزوئاسمان — بویەوەک وی نین دەزیهنان هیچ زەمان (١٢١)
کوا دەزیهنان ڕۆژی والەجێی دەبێ؟ — ڕوژی والەچون تەسەوور پێی دەبێ (١٢٢)
چون لەڕووی ئەو شەمسی دین بوو باسمان — سەرنەوی بوو شەمسی چوارەم ئاسمان (١٢٣)
بوو بەوا جب چون دەکوترا، نامی تو — تابەیان کەم شەممەیەک ئەنعامی تو (١٢٤)
گیانی من داوێنی ئەو دەم بادەدام — بۆی کراسی یووسفی چوو بۆ مەشام (١٢٥)
تۆ بەحەققی سوحبەتی چەن ساڵەمان — بۆم بەیان کە، حاڵی خوش لەوحاڵەمان (١٢٦)
تازەمین وئاسمان خەندان بێ — عەقڵ وڕووح ودیدە، سەدچەندان بێ (١٢٧)
چۆن بکەم مەدحی، کەکەوتم نێو فەنا؟ — بووم، بەکەودەن، عاجزیشم بۆسەنا (١٢٨)
هەرقسێکی گەرلەهۆش چوو، بێ بڵێ — گەروەهۆش هات دێ لەبەر،وی هەر،هەڵێ (١٢٩)
من بڵەم چی؟یەک ڕەگم نەی ماوەهۆش — مەدحی یارێک وەک وی نەیدی قەت چ کۆش (١٣٠)
شەرحی هیجری ئەوکەسەی دڵ بۆی دەرێ — بابمێنێ، هەستەئێستا لێی گەڕێ (١٣١)
پێیکوتم موحتاجی ڕۆژیم بم دەیە — تەنگەکات جا بم دەیەتا هەل هەیە (١٣٢)
سۆفی ئیبنولوەقتەئێستاچادەکەم — ئەودەڵێ وا، نەک سبەینێ وا دەکەم (١٣٣)
تۆ مەگەرسۆفی نەبووی و پیاوی باش — چون دەگۆڕێ هەست بەنیست،بخرێتەپاش[1] (١٣٤)
پێم دەکوت پوو شیدەخۆشتر سیرڕی یار — زیمنی داستان گوێ هەڵێخەجارو بار (١٣٥)
وا لەخوشەگەرکورازوسیرڕی یار — بێ لەنێوگوفتاری خەڵکی ئاشکار (١٣٦)
ئەوکوتی مەکشووف و ظاهر بێکەمی — بۆم بەیان کە ئەی ئەمن نەم، تۆ، یەمی (١٣٧)
پەردە لادە چی حەقیقەت بوو بڵێ — من لەگوڵزار نامەوێ خۆ هەرچڵێ (١٣٨)
من کوتم جا،گەربەیان کەم بیخ و بن — تو دەچی هیچ، دەوروبەر پاکی دەچن (١٣٩)

---

[1] چۆن دەگوری (بوون) به (نا) بخریته پاش (مصرع دوم)

تۆ بەقەد خۆت ئارەزووت کە، ئاشکار    چونکەناکا، حەملی کێو، کایەک چجار (١٤٠)
جاو لەرۆژ کەچەن موفیدو روون کەرە    بێتەپێش کەم بەودەسووتێ یەک سەرە (١٤١)

فیتنە هەم[1] ئاشووب و خۆێنرێزی مەکە    زێدەباسی شەمسی تەبریزی مەکە (١٤٢)
بەسکەباسی شەمسی، بەحری بێ بنە    تۆ تەواو کەداستانی ئەوژنە (١٤٣)
پێیکوت ئەی شا چۆل کەئەلحان ماڵەکەت    کەس نەمێنێ غەیروقەوم وکاڵەکەت (١٤٤)
کەس لەپێشخانان نەدا گوێ بۆ وتان    تا بپرسم لەو کەنیزە چەن شتان (١٤٥)

**خەڵوەت کردنی وەلی لەگەڵ پاشا بۆ پەیداکردنی عیللەتی نەخۆشی کەنیز...**

ماڵ خاڵی بوو نەما، دەو دا، چ کەس    هەر تەبیب و ئەو نەخۆشە، مان و بەس (١٤٦)
پێی دەپرسی شارەکەی تۆ کوێ یەکوێ    چون عیلاجی خەڵکی هەرجێ جوێ یەجوێ (١٤٧)
کێ یەخزمت پێم بڵێ لەوشارەدا؟    کێ رەفیقت؟ بۆم بڵێ لەوبارەدا (١٤٨)
نەبزی گرت ولێی دەپرسی یەک بەیەک    لێی دەپرسی هەروەها، جەوری فەلەک (١٤٩)
هەرکەسێکی بچتەلا قی وی دڕوو    پێی لەسەرچوک دادەنی ئەو ڕوو بەڕوو (١٥٠)
ئەوبەنووکی دەرزی دەڕوا نێ لەخار    گەرکو نەی دی، تەڕدەکا جێی خار، بەزار (١٥١)
گەر درووی پێ وا، بەموشکیل بێتەدی    ئەودڕووی دڵ چۆن دەبینی تو ئەدی.؟ (١٥٢)
گەرکو دیبایان درووی دڵ ناکەسان    نەی دەبوو هیچ دڵ چ غەم هەر بۆ نیشان (١٥٣)
یەک درووی دانا لەبن کلکی کەرێ    هەڵبەزی کەرتا درووی ئەو بۆ دەرێ (١٥٤)
هەڵبەزی زیا تر درووی چۆ بەندەنی    عاقڵێک بێ تا دروو ی لێ هەڵکەنی (١٥٥)
کەر،لەبەردەفعی دروو هەم دەرد وئێش    جووتەدەیهاویشت لەپاش و،گازلەپێش[3] (١٥٦)
ئەو حەکیمەبوو تەبیبێک بێ میسال    دەستی دا با ئەولەکوێ دەی کرد سوئال (١٥٧)
ئەوکەنیزەهەربەشکڵی داستان    لێی دەپرسی حاڵ و وەزعی دوستان (١٥٨)
ئاشکرا دەیکوت قسەی خۆی بۆ حەکیم    جێ ومەکان وگەورەکان، دۆستی قەدیم (١٥٩)

[1]- فیتنە و و (مصرع اول)

[3]- کەر لەبەر دەفعی دڕوو هەم ئێش وکین    هەر بەجوو تەی کرد لەعاقڵ سەد برین

ئەولەلا یەک گوێی دەدا داستانی وی    فکروهۆشیشی نەبز هەستانی وی (١٦٠)
تابزانێ نێوی کێ هات نەبزی وی    لێ دەدا تن زیا دلەحەدد ی خوی قەوی (١٦١)
باسی دوستی شاری وی یەک یەک دەکرد    جالەپاشان نێوی شاری دی دەبرد (١٦٢)
پێی دەکوت پاش وەی لەشارت چوو یەدەر    تو لەکام شار زێدەژینت بردەسەر؟ (١٦٣)
نێوی شارێکی دەبردو تێ پەڕی    ئەو نەنەبزی تێک دەچوو، نە، ڕەنگ پەڕی (١٦٤)
گەورەکا ن وشارەکا نیش یەک بەیەک    لێی دەپرسی ئەولەجێ ونان و نەمەک (١٦٥)
شار بەشار وماڵ بەماڵ کردی سوئال    نەبز ورەنگی تێک نەچوو بەو قیل و قال (١٦٦)
نەبزی سالم دوو ر لەئا فەت بێ گەزەند    تا کو پرسی لەوسەمەرقەند چەشنی قەند (١٦٧)
نەبزی لێیدا، ڕەنگی سوورو زەر دەبوو    چون سەمەر قەند جێگەبۆزەڕگەر دەبوو (١٦٨)
چون تەبیب لەو ڕازەئا گاداردەبوو    ئەسلی دەردی وی لەبو ئا شکا ر دەبوو (١٦٩)
لێیدەپرسی لەو مەحەللەو ڕێگەکەی    غاتفەری سەرپول کوتی ئەوجێگەکەی (١٧٠)
پێیدەکوت زانیم چتە، نەت بێ هەراس    لەو عەزابەزوو ئەمن دەت کەم خەلاس (١٧١)
دوور لەغەم ئا سوو دەخاطربەکەمن    ئەو نەخوشیەت دەردەهێنم بۆ لەبن (١٧٢)
دەم وێ باری غەم لەباتت هەڵگرم    من لەبۆ تۆ سەد لەبابت چاترم (١٧٣)
تو بەهۆش بە، ئەوسوڕەی بۆ کەس مەڵێ    (شا)ش بپرسێ لێت، مەڵی بۆ وی بەڵێ (١٧٤)
گەر کو دڵ بێ مەقبەرەی ئەسراری تو    دێنەدی بۆت هەرچی بۆی خواستاری تۆ (١٧٥)
وای دەفەرموو سەر و ڕێ عالەم نەبی    ڕاز داران زوو مەڕا میان دێتەدی (١٧٦)
چونکەدانە، ون لەژێر خاک وگڵە    سیرڕی وان چی؟گیایی شینەهەم گوڵە (١٧٧)
زێڕوزێویش گەر لەچاوان ون نەبان    تەربیەت بۆ وا ن چلۆن بوو ژێری کان؟ (١٧٨)
لو طف ووەعدەی ئەوتەبیبەبوو وەها    ئەو نەخۆشەترس و لەرزی هیچ نەما (١٧٩)
زۆرهەنەوەعدەی حەقیقی دلپەسەند    زۆر هەنەوەعدەی مەجازی ڕیشخەند (١٨٠)
وەعدەیان ئەهلی کەڕەم گەنجی ڕەوان    وەعدەیان ناکەس ئەدی؟ ڕەنجی ڕەوان (١٨١)

## پەیداکردنی وەلی ڕەنجی کەنیز و عەرزکردنی بە پێشگای شا...

ئەو لەپاشان چوو لەبۆ لای شای بەهۆش    زۆر کەمی پێ کوت لەڕەنجی ئەونەخۆش (١٨٢)
پێیدەکوت ئەو بۆ عیلاجی وی بەسە    حازری کەین ئێمە زۆر زوو ئەو کەسە[1] (١٨٣)

---

[1]- حازری کەین ئێمە لێرە ئەو کەسە (مصرع دوم)

زەرگەری دەعوەت بکە لەو شاری دوور    تۆ فریو دە ئەو بە پارچە و زێڕی سوور (١٨٤)

**ناردنی پادشا قاسیدان بۆ سەمەرقەند بۆ هێنانی زەڕگەر..**

بەڕێی کرد دوو نەفەر قاسید ئەوان    عادڵ و ئوستاد و ماهر، کارزان (١٨٥)

سەمەر قەند هەردووقاسید بێ وچان    هاتنە لای ئەو زەرگەری زۆر زۆر جووان (١٨٦)

تۆ وەستای ماهرو بامەعریفەت    ئەی لەتۆمەعرووف بووەنێو هەم سیفەت (١٨٧)

سوڵتان شا، هەرفەقەت بوزەڕگەری    تۆی دەوێ ئەوچونکەتۆ زۆرماهری (١٨٨)

بێنەبگرەئەو خەلا تەی زێڕوزێو    بێ یەلای گەر، چاک دەکا، ئەوتۆ بەخێو (١٨٩)

زێڕگەرفرسەتە، ئەوهە، هەڵە    بێ ژن ومنداڵ دەچوو کردی پەلە (١٩٠)

زەڕگەرکەوتەڕێ زۆر زۆر بەتاو    نەی دەزانی شا لەبۆی داناوەداو (١٩١)

ئەسپی باش دەبوو زۆر توند هەلات    نەی دەزانی خوێنبهای بوو ئەوخەلات (١٩٢)

بەسەد خۆشی و ئومێدچووی بۆ سەفەر    تۆ بەدەستی خۆت خۆڵت کرد وەسەر (١٩٣)

ک ومال وعیززەتی ئەو هاتەبیر    نەی دەزانی ئەوکەهاکا،کەوتەبیر[1] (١٩٤)

گەڵ کو پیاوی زەڕگەیەجێ    ئەو تەبیبە بردیە لای شا جێ بەجێ (١٩٥)

بۆ لای شا دەیان بردزۆر بەناز    تا بسوو تێ ئەولەسەرشەمعی طەراز (١٩٦)

کەدیتی، زۆر لەبۆی تەعزیم کرد    مەخزەنی زێڕی بەوی تەسلیم کرد (١٩٧)

تەبیب دەیکوت بەشا، ئەی سەروەرم    لێم گەڕێ ئەو کیژەبۆ زەڕگەربەرم (١٩٨)

ڵی، پاک نەخۆشی هەڵوەری    ئاوی وەسلی، ئاوری دەردی لا بەری (١٩٩)

بەوی شا ئەوکەنیزەی ماڕوو    هەردوو،تەبدیل بوون بەیەک گوڵ بێ دڕوو (٢٠٠)

دەتی شەش مانگ لەگەڵ یەک بوون‌تەواو    تاکەنیز، نەی ما نەخۆشی هەربەناو (٢٠١)

پاشان شەربەتێکی چادەکرد    دای بەزەڕگەر، زەڕگەری رسوا دەکرد (٢٠٢)

نەخوش بوو هیچ جەماڵی پێ نەما    گیانی کیژیش دەردی دووری لێ نەما (٢٠٣)

چونکەپیس وناحەزو ڕەنگ زەردبوو    وردەوردەئەو دڵی لێ سەرد بوو (٢٠٤)

عیشقەکی بوونی بەخاطر ڕەنگەبەس    ئەونەعیشقەئاخری هەرنەنگەبەس (٢٠٥)

سەد بری با هەر لە ئەووەڵ با وەها    نەک لەئاخرتووشی ئەو جوور،حاڵەبا (٢٠٦)

خوێن دەگریا،بوون بەجوگەچاوی وی    ڕوومەتی جوان دوژمنی خوێناوی وی (٢٠٧)

---

[1] - کەوتەبیری گەورەیی هەم ملک ومال چوو لەبیری ئەو کەهاکا کەوتەچال

دوژمنــی طــاووس فەقــەت بــا ڵ ویــەڕە زورلەشـــــایان قــــاتڵی وان هەرفـــــەڕە (٢٠٨)
ئــەوکوتی ئــەو ئاســکەمە، بۆنــافی مــن ڕشــتی ئەوســەیبادەخوێنی ســافی مــن (٢٠٩)
ئـەی، مـن ئـەو ڕێویـەی لـەچۆل دەکراشکار ســـەربڕا لەو،چونکەپێســـتی دێ بـــەکار (٢١٠)
ئــەی مــن ئەوفیلــەی کەلێــدا فیلــەوان خوێنی وی ڕشت، بەس لەبەر دوو ئێسکیجوان (٢١١)
ئەوکەسـەی ئـەمنی دەکوشت بـەس بو هـەوا وا نــەزانی خــوێنی مــن دەڕوا ئــەوا (٢١٢)
لەمنەئـەو ڕو خـو سـبەینی هــەر لــەوە خوێنی وەک من چۆن لەبیر کەس دەچتەوە (٢١٣)
گــەرچی دیــوار زۆر درێــژە ســێبەری ســێبەری وی عاقیبــەت دێ بــۆ بــەری (٢١٤)
کێوەدونیـــا بانگـــەکاروباری مـــە دەنـگ دەهێنێ بانـگ و هـەم هـاواری مـە (٢١٥)
ئـەو قسـەی کـرد و لەپاشـا ن زوودەمـرد ڕەنـج وعیشـقی ئەوکـەنیزەی پـاک دەبـرد (٢١٦)
چونکەعیشـــقی مـــردوان نیتـــی دەوام چونکـــەمردو تازەنایـــەت بوســـەلام (٢١٧)
عیشقی زیندو هـەم دە ڕووح دا هـەم دە چاو لەحظەلەحظە زیاد لە خونچـەی، پڕ لە ئاو (٢١٨)
عیشـقی ئـەو زینـدوت بـوێ، چـون باقیـە لــەو شــەڕابی خــۆش بــەگیانت سـاقیە (٢١٩)
عاشـــقی ئەوکــەس بەجـــەمعی ئـــەنبیا بـەس بـە عێشقی وی وەدەسیان هـات کیـا (٢٢٠)
تــو مــەڵێ مــن نیمــەڕێ لای شــەهریار چـون لەگـەڵ چاکـان گـەلێ ئاسـانەکار[2] (٢٢١)

**بەیان کردنی ئەو مەطڵەبە کە کوشتن و ژەهردان بە پیاوی زەڕگەر بە ئیشارەی ئیلاهی بوو نەک بە خاطری نەفس و فیکری فاسید...**

زەڕگــەری کوشــت ئەوحەکیمەهەرتــەنێ بــێ ئــەوەێ ترسـی هــەبێ یـاچی دەنــێ (٢٢٢)
نەی دەکوشت ئەو تا کو شا لێی بێ ڕەزا ئــەمری حــەق بــوو وا موقەددەربووقــەزا (٢٢٣)
ئەوکوڕێژگوکـــەی، خزرگـــەرنی بـــڕی قــەت نــەبوو مــەعلووم لەعالــەم دا سـوڕی (٢٢٤)
ئەوکەسـەی، وەحیوجـەوا بـی بـێ، لەحـەق هـەرچی بـی لـێ ئـەو ڕەوایەوموسـتەحەق (٢٢٥)
ئەوکەســەی فــەرمانی وی فــەرمانی حــەق بـوکژێ حەققە، دەستی وی دەستانی حـەق (٢٢٦)
هـەروەک ئیسماعیل سـەرت بو پێش بەرە شــاد و خەنــدان تــۆ بــدە زوو ئەوســەرە (٢٢٧)
تــا گیانــت شــاد بمێنــێ تــا ئەبــەد وەک گیـانی پـاکی ئەحمـەد گـەڵ ئەحـەد (٢٢٨)
ئەودەمـەی عاشـق دەبـێ خـۆش بـێ غوبـار گـەربکوژری ئـەو بەدەسـتی شەخسـی یـار (٢٢٩)

---

[1]- ئێستەمن وام وەک منی ئەو دێ بەسەر خوێنی وەک من چۆن دەبێ بڕوا هەدەر؟
[2]- تومەڵێ من نیمەڕێ لای شا چ جار چون لەگەڵ پاکان گەلێ ئا سانەکار

...ی. شا لەبەر شەهوەت نەکرد    وەک کەسێک بەبەدگومانی لا دەبرد (٢٣٠)
...ەبینت وابی کەئەوئالوودەبوو    ساف وسادق ئەو لەنەنگ ئاسوودەبوو (٢٣١)
...ەردوعەزابەی چەشنی کێو    بویەتاکوکوورە، لا با خڵطی زێو (٢٣٢)
... دەکرێن ئیمتیحان عالی و نەوی    تا، وەکول بێ زێڕ، کەفیشی سەرکەوی (٢٣٣)
...ەبووبا کاری وی ئیلهامی حەق    ئەو سەگی دڕ، نەک بەشاهی موستەحەق (٢٣٤)
...ەحیرس و هەم لەشەهوەت بوو،بەدوور    چاکەکەی وی چەشنی بەد کردی زهوور (٢٣٥)
...ەدەریادا خزر کەشتی شکاند    لەوشکانەزۆردروستی، خۆی نووانـد (٢٣٦)
...ی مووسا ئەو هەموونوورەی هەبوو    وابوو نەی دی، تۆکەکوێری ڕێ مەچوو (٢٣٧)
...ی گول پێی مەڵێ خوێنی ڕەوان    مەستی عەقڵەپێی مەڵێ شێتەو، لەوان (٢٣٨)
...ەڵمان کوشتنی ئەو، ویستبا    کافرم گەرنێوی ویان لێم بیستبا (٢٣٩)
... دەلەرزێ گەرمەدح کەن فاسقان    مەدحی وان جێگای گومان، بۆسادقان (٢٤٠)
...وو ئەو شایەکی، ئاگاه بوو    خاسەبوو ئەو خاسەلای ئەڵلاه بوو (٢٤١)
...کەسێکی شاهی وا لێی بگرێ گیان    ئەودەباتە چاکترین جێگا و مەکان (٢٤٢)
...ی زەڕگەر بووکە کوژرا ئەو بە ژەهر    لوطفی موطڵەق چونکە قەت نابێ بە قەهر (٢٤٣)
... دەگرێی وچۆن دەلەرزی چاو منال    لێی دەدەن دەرزی و دایکی خوشحال (٢٤٤)
...ەئەوەندەی لێی ستاندی وێت دەدا    ئەو شتانەی فکری ناکەی پێت دەدا (٢٤٥)
... قیست کرد لەخوت بەدبەختییە    چاک لەمەطڵەب تێ بفکرە، وەختییە (٢٤٦)

**حکایەتی کابرای بەققاڵ و طووطی و ڕۆنڕشتنی طووطی دە دوکان دا...**

**خولاسەی داستان..**

بەققاڵێک طووطیەکی جوان و دەنگ خۆشی هەبوو و دەگەڵ مشتەریان قسەی خۆشی دەکرد. و ئەوانی مەشغووڵ و سەرگەرم دەکرد و هەرکات کە بەققاڵ لە دوکان دەچۆ دەر، طوطی ئاگای لە دوکان دەبوو. ڕۆژێک طوطی دەدوکان دا هەڵفڕی و شووشەکانی ڕۆنی گوڵانی ڕژاند. بەققاڵ وەختێک کە گەڕاوە دوکان و دیتی کە ڕۆنەکان دەنێو دوکاندا ڕژاوون تووڕەبوو و زەربەیەکی ئەوەندە مەحکەمی لە سەری طوطی دا کە بە تەواوی تووکی سەری ڕژا و هەتا چەند ڕۆژێک لە قسەکوتن و دەنگ هەڵێنان خۆی پارازت. ماوەیەک گوزەرا تاکو ڕۆژێک کابرایەکی سەرتاس لە قەراغ دوکان ڕابرد لە ناکاو طوطی وەقسە هات و لەکابرای پرسی مەگەر ئەتو ڕۆنت لە شووشە ڕشتووە؟ جەماعەت لەبیستنی ئەو قسەیە و موقایەسەی طوطی پێکەنین چونکە طووطی قیاسی نادروستی کردبوو و تاسی خۆی دەگەڵ طاسی ئەو کابرا وەک یەک فەرز کردبوو.

بووی بەقاڵێک طووطی یەک ئەو بوو، ئەوا     نەغمەخوان و ڕەنگ سەبز و خوش نەوا (٢٤٧)
ئەو لە دووکان دا دەبوو وەک پاسەوان     خۆش زبان بوو جا، دەگەڵ سەودا گەران (٢٤٨)
ئەو دەگەڵ خەڵکی کە دەدوا، شادبوو     نەغمەخوانی کردبا، ئوستاد بوو (٢٤٩)
ئەو لەلایەک چوو لەلای دی هەڵدەنیشت     هەرچی شووشەڕۆنی گوڵ بوو پاکی ڕشت (٢٥٠)
هاتەدووکان جا، لەماڵێ ڕا بەقاڵ     دادەنیشت ئەو باوقار وەک بێ خەیاڵ (٢٥١)
دی ڕژاوەڕون بەدووکان هەم لیباس     وای لەسەردا، سەردەبوو بێ تووک وتاس (٢٥٢)
چەندڕوژان هیچ قسەی ئەسڵەن نەووت     پیاوی بەقاڵ بۆی دەسووتا بێ نەووت (٢٥٣)
دەیکوت ئەو جا، ڕای دەکێشا ڕیشی خۆی     سەدبریبا هاتبا سەر ئیشی خۆی (٢٥٤)
خۆزگەبشکابایەدەستم ئەو دەمە     گەرکودەم دا من لەسەرئەوخۆش دەمە (٢٥٥)
بۆفەقیران هەدیەهەم نەزری دەدا     بێتەگوفتار تاکو طووطی خۆش سەدا (٢٥٦)
ئەولەپاش سێ ڕۆژوشەوناڵەوگرین     چوو لەدووکان دادەنیشت زۆر زۆر غەمین (٢٥٧)
ئەونیشانی دا گەلێ ئەشیای عەجیب     تاوەدەنگ بێ هەڵنەنیشێ واغەریب (٢٥٨)
کردی دەروێشێک بەلای وی دا گوزەر     چونکەطاس بوو مووی نەما بووهیچ لەسەر (٢٥٩)
طووطی فەورەن هاتەگوفتاروبەیان     بانگی دەروێشی دەکرد ئاهای فلان (٢٦٠)
ئەی کەچەڵ بۆبووی کەچەڵ؟ شووشەت شکاند؟     هەرچی ڕۆنی بوو لەشووشانت ڕژاند؟ (٢٦١)
لەوقیاسەحازرین زور پێکەنین     ئەوبەچاوان خەڵکی وەک خۆی پێ دەدین (٢٦٢)
کاری پاکان توقیاسی خوت مەکە     گەرچی شێر وشیر نوسینیان یەکە (٢٦٣)
بویەعالەم زوربەیان گومڕا دەبوون     چون لەئەبدال کەم کەسان ئاگا دە بوون (٢٦٤)
هەروەکوو خۆیان دەبینن ئەنبیا     هەروەکوو خۆیان دەزانن ئەولیا (٢٦٥)
جادەڵێن ئێمەوئەوان وەک یەک بەشەر     بوهەموومان بێ خەوی وخوراک زەرەر (٢٦٦)
چونکەکوێرن کوا دەزانن فەرقی وا؟     فەرقی بەینی وان هەیەبێ ئینتیها (٢٦٧)
هەردووجوورزەنبوور دەخون یەک جوورغەزا     یەک دەدا هەنگوین وئیدیش سەم دەدا (٢٦٨)
هەردووجوورئاهوودەخون ئاووگیا     چاولەیەک تەرس ولەیەک عەنبەرجیا (٢٦٩)
هەردووقامیش بوون لەیەک جێ تێرلەئاو     یەک دەبێ خاڵی، دەوی دیش شەکری خاو (٢٧٠)
خۆ شەبیهی وا لەزۆرن بێ ژمار     فاسیلەی زۆریان هەیەئەی هووشیار (٢٧١)
هەن بەخۆراک پیس لەبۆ وان دێ بەدی     نووری حەق دێ لەوغەزا بۆ ئیدەی (٢٧٢)
هەن بەخۆراک چادەکەن بوخل وحەسەد     هەن بەخۆراک چادەکەن عیشقی ئەحەد (٢٧٣)

ئەرزی پاکن ئەنبیا و ئەولیا ‌ ‌ ‌ شۆرەکاتن فاسقان و ئەشقیا (٢٧٤)

وێک بچن دووشت ڕەوایەبێ خیلاف ‌ ‌ ‌ ئاوی تاڵ وئاوی شیرین هەدوو ساف (٢٧٥)

ئەوکەسەی تام و مەزەی لێ بێ عەیان ‌ ‌ ‌ تاڵ و شیرین زۆر لە لای وی لێک جییان (٢٧٦)

ظاهیری ئیعجاز و سیحری دی بەیەک ‌ ‌ ‌ چون لەلای وی بوو مەرام لەو دوو،کەڵەک (٢٧٧)

ساحیرانی عەسری مووساهێندەپەست ‌ ‌ ‌ وەک عەسای مووسا عەسایان گرتەدەست (٢٧٨)

ئەوعەسا تا ئەوعەسا فەرقی گەلەک ‌ ‌ ‌ ئەوعەمەل تائەوعەمەل ڕێگا فەلەک (٢٧٩)

لەعنەتی حەق ئەوعەمەل بەدوایەتی ‌ ‌ ‌ ڕەحمەتی حەق ئەوعەمەل مەبنایەتی (٢٨٠)

چەشنی مەیموو ن وایەکافر بۆ عیناد ‌ ‌ ‌ طەبعی ئینسان ئافەتێکەنێو نهاد (٢٨١)

چاو لەمەیموون هەرچی ئینسان چا دەکا ‌ ‌ ‌ هەرکەدیتی جێ بەجێ ئەو، وا دەکا (٢٨٢)

وایٚ دەزانی کاری وان فەرقی نییە ‌ ‌ ‌ کوا دەزانێ بێ شعوور فەر قیان چیە؟ (٢٨٣)

کاری پاکان ئەمری حەقەو بۆخودا ‌ ‌ ‌ کاری ناپاک بۆعینادەوبۆهەوا (٢٨٤)

با مونافیق وەک موافیق نوێژ بکا ‌ ‌ ‌ بۆ عینادە نوێژی وی، تا گێژ بکا (٢٨٥)

بۆ نوێژ و ڕۆژو و هەم حەجج و زەکات ‌ ‌ ‌ موئمین و دووڕو و لە بازی بورد و مات (٢٨٦)

عاقیبەت موئمین بەرەندەی بازییە ‌ ‌ ‌ هەرمونافیق مەرگەئەودا خوازییە (٢٨٧)

گەرچی یەک بازی دەکەن هەردووکییان ‌ ‌ ‌ زۆر لەیەک دوورن لەیەکتر زۆرجییان (٢٨٨)

هەرکەسە، بۆجێومەقامی خۆی دەچێ ‌ ‌ ‌ هەرکەسە، بەدوای مەرامی خۆی دەچێ (٢٨٩)

گەر بڵەی موئمین بەدووڕوو خۆش دەبێ ‌ ‌ ‌ گەرمونافیق بەوبڵەی بێ هۆش دەبێ (٢٩٠)

نێوی موئمین هەرلەزات مەحبووب دەبوو ‌ ‌ ‌ نێوی دوو ڕوو هەرلەزات مەحجووب دەبوو (٢٩١)

میم و واو ومیم ونوون هەرحەرفەبەس ‌ ‌ ‌ لەفزی موئمین ظاهیرەن هەروەسفەبەس (٢٩٢)

گەرمونافیق بەوبڵەیٚ ئەو نێوی پەست ‌ ‌ ‌ وا دەزانێ عەقرەبێک هات جەرگی گەست (٢٩٣)

چون مونافیق هەرلەدووزەخ چادەبوو ‌ ‌ ‌ بۆیەزەوقی دووزەخی دەودادەبوو (٢٩٤)

گەرمونافیق پیسەبۆخۆی نەک بەحەرف ‌ ‌ ‌ ئاوی دەریا تاڵەبۆخۆی نەک بەظەرف (٢٩٥)

حەرف ومەعنی ظەرف وئاوون بێ خیلاف ‌ ‌ ‌ (عندەام الکتاب)بووبەحری ساف (٢٩٦)

بەحری تاڵ وبەحری شیرینی جیهان ‌ ‌ ‌ وا لەنێویان(برزخ لایبغیان) (٢٩٧)

تو بزانەئەسڵی وان یەک کانی یە ‌ ‌ ‌ تێپەڕەڵێیان دەگەی بەو بانی یە (٢٩٨)

هەرمەحەک تەعیین دەکا بۆزێڕ عەیار ‌ ‌ ‌ بێ مەحەک میقداری زێڕ بێ ئیعتیبار (٢٩٩)

گەر خودا داینا دەگیانی کەس مەحەک ‌ ‌ ‌ لێی عەیانەکام یەقینەوکامەشەک (٣٠٠)

ورکەپووشکێک بچتەزاری هەرکەسێ تاکو دەردێ ئەو کەسە هیچ ناحەسێ (٣٠١)
نێو هەزارپارووفەقەت یەک ورکەکا حیسسی زیندوو جێ بەجێ دەرکی دەکا (٣٠٢)
حیسسی دونیا پللەکانە بو جیهان حیسسی دینی پللەکانی ئاسمان (٣٠٣)
حیسسی دونیا ساغیەتی وی لای طەبیب حیسسی دینی ساغیەتی وی لای حەبیب (٣٠٤)
حیسسی دونیاساغیەتی ساغی بەدەن حیسسی دینی ساغیەتی ویرانی تەن (٣٠٥)
رێ وطەریقی رووح، تەن ویران دەکا جالەپاشا ن خۆی گەلی خەندان دەکا (٣٠٦)
هەرلەبەرگەنج ماڵی خۆی ویران دەکا هەربەئەوگەنج جوانی سەدچەندان دەکا (٣٠٧)
ئاوی گرت وجوگەشی کرد جوگەماڵ جالەپاشان تێیدەکرد ئاوی زوڵاڵ (٣٠٨)
پێستی قەڵشاند تیرەکەی هینایەدەر جا لەپاشان پێستی تازەی هاتەسەر (٣٠٩)
یەک قەڵای گرت وخرای کرد کوللی شار چاکی کرد جا هەرلەوێ سەد بورج و بار (٣١٠)
کێ لەکاروباری یەزدان تێدەگا؟ ئەو وتانەی کرد، زەروو رەت، ئیقتیزا (٣١١)
زیددی یێکن کاری یەزدان جاروبار دین دەکا ئەشخاس بەحەیرانی دوچار (٣١٢)
نەک وەها حەیران لەحەق بێزاربێ بەڵکەغەرق ومەستی دوست و یار بێ (٣١٣)
ئەو کەسەی رووی کردەحەق رووی کردەیار ئەوکەسەی روویکردەخەڵق،خۆی بوو نیگار (٣١٤)
تو تەماشای هەر دوو لا کە زور دەقیق بەڵکەناسیت حەقق و ناحەق ئەی رەفیق (٣١٥)
زۆر هەنە ئینسان وەکو شەیطان وان تۆ مەدە دەستت بەدەستی هیچ لەوان (٣١٦)
دەردەهێنێ دەنگی طەیران بێتەڕاو تا فریودا، ئەوبەڕەندان، بێنەداو (٣١٧)
ئەوبەڕەندە، دەنگی جنسی خۆی کەبیست دێتەخوارێ دێتەداوی سەر،بەنیست (٣١٨)
تافریوداسادەلەوحان شەخسی پەست ئەو قسەی چاکان دەکا چی هاتەدەست (٣١٩)
کاری پاکان هەرسەلاحی عالەمە کاری نا پاک هەرفریوی مەردو مە[1] (٣٢٠)
شێری کارتون بۆ گەدایی چاکرا بوو موسەیلیم بەولەقەب ئەحمەد درا (٣٢١)
بوموسەیلیم بۆی لەقەب کەززاب ما بۆ موحەممەد چاو(اولوالالباب) ما (٣٢٢)
وەک شەرابی ئەو خودایەن ئەولیا بادە چی؟ گەند و عەزابی ئەشقیا (٣٢٣)

---

١ - کاری پاکان هەر سەلاح و گەرمییە کاری ناپاک حیلەیە و بی شەرمییە

**داستانی ئەو پاشای جوولەکە، کەبەخاطری تەعەسسوب، مەسیحی دەکوشتن..**

**خولاسەی داستان...**

دەنێو جوولەکان داپاشایەکی زۆر زاڵم هەبوو کەزۆر رق و کینەی لە مەسیحیان بوو ئەو بەنیە مووسا و عیسای کە حەقیقەتەن هەر دوو شوعلەی یەک چرا و دەگەڵ یەک موتتەحید بوون. لە ڕووی تەعەسسوب، موخالیفی یەکتر دەزانین و خەریک بوو کە دین و ئایینی مەسیحیان لە بەین بەری. ئەو پاشایە وەزیرێکی کارزان و زیرەکی هەبوو کە دەکاری موهیم دا یارمەتی دەدا. وەزیر دەیزانی کە ئیمان و عەقیدەی خەڵکی ناکرێ بە زوڵم و زۆر لابرێ بەڵکە بەت زوڵم و زۆر شەدیدتر بێ عەقیدە و ئیمان محکەمتردەبن، بەو خاطرە حیلەیێکی چا کرد کە پاشاش پێی باش بوو. فێڵەکە بەو جوورەبوو؛ پاشای ڕازی کرد وا بڵاوکاتەوە کە وەزیر تەقەبولی بەئایینی مەسیحیان هەیە، جا، دەبێ دەست و دم و گوێی ببڕێ و لەبارەگا دەرکرێ کاتێک کە ئەو نەقشە ئەنجام درا و وەزیر دەست و دم و گوێی بڕا، لەبارەگای شا دەرکرا. مەسیحیان ئەویان پەنادا و ئیعتیمادیان پێ کرد و کەمکەمە وەزیر دەنێو مەسیحیاندا قودرەت و نفووزی پەیدا کرد، وەک موعەللیم و ڕاهنەمایەک دەنێووان‌دا ناسراو ئەوانیش دڵ و گیانیان پێ ئەسپارد. وەزیر بە پنهانی دە فکری نەقشە و طەرحی فیتنە و فەساد بوو عاقیبەت وەزیر بۆ سەرانی هەریەک لە دوازدەگرووهی مەسیحییەت طومارێکی بەجودا ئامادەکرد کە مەفهوومی هەریەک دەگەڵ ئەوی دی موتەناقیز بوو، لەپاشان وەزیر بۆ خەڵوەت چۆ ئەشکەوتێک و هەرچەند موریدەکانی داوایان لێ کرد کە لە خەڵوەت بێتە دەر ڕازی نەبوو و نەهاتە دەر لە پاشان ڕوئەسای هەریەک لەو دوازدە گرووهانەی بو لای خوی دەعوەت کرد و بەهەریەک بەوێن نامەی خلافەت و جێ نشینی‌دا و تەئکیدی کرد کە ئەتو جێنشینی منی، نەک کەسێکی دیکە و ئەگەر کەسێکی دیکە ئیددیعای ئەو مەقامە بکا کازب و دروزنە و دەبێ نابوودی بکەی وەزیر پاش ئیجڕای ئەو تەرحە ئیختیلاف سازکەرە دە خەڵوەت‌دا خۆی کوشت، جا لە پاش مەرگی وی ڕوئەسای ئەو دوازدە گرووهانەی مەسیحی دەگیانی یەکتر بەربوون و کوشتارێکی زۆر عەزیم شرووع بوو جا، بەو جوورە عیددەیێکی زور لە مەسیحیان بە دەستی یەکتری کوژران و مەقسوودی شای زاڵم حاسڵ بوو ...

پادشایەک جوولەکەی زاڵم هەبوو — هەم بەعیسا هەم بەیاری وی عەدوو[1] (۳۲۴)

دەورەتی عیسای نەبی بوو ئەوزەمان — گیانی عیسا وگیانی مووسا یەک گیان (۳۲۵)

حیس بوو پاشا جا، لەلای خۆی بۆخودا — ئەو دوویارەی ئەو دەکردن لێک جودا (۳۲۶)

پێی دەکوت وەستا بەخێڵەدوستی خۆم — تۆ فلان شووشەلەمەنزڵ بێنەبۆم (۳۲۷)

---

۱- پادشایەک بوو لەنێو جوان زۆر مەدار — هەم بەعیسا هەم بەیاری وی نەیار

خێلەدەیکوت لەودوو شووشەکامەیان     بۆتی بێنم بۆم بکەشەرح وبەیان (٣٢٨)
پێیدەکوت وەستا کەئەودووشووشەنین     خێلی لابە تۆ مەبە، قەت زێدەبین (٣٢٩)
دەیکوت ئەی وەستا بەسم ئەزیەت بکە     پێیدەکوت وەستا تو یەکیان لەت بکە (٣٣٠)
شووشەیەک بوو،ئەو بەچاوی دووی دەدی     چون شکاندی نەی دەدی شووشەی دەدی (٣٣١)
یەک شکا جا، هەردووشووشەون لەچاو     خێل دەبێ پیاوگەرتەعا دول، چوو لەناو (٣٣٢)
کین و شە هوەت دیارەپیاوی خێل دەکەن     کین وشەهوەت رووح گێژوگێل دەکەن (٣٣٣)
شەخسی بەدبین چاوی نابینێ هونەر     چاو لەدڵ ڕا زۆری پەردەدێنەسەر (٣٣٤)
گەرلەخەڵکی، قازی بەرتیل وەرگرێ     غەیرەمومکین بەوعەداڵەت سەرگرێ (٣٣٥)
شا لەکینەی جوولەکانەی بوو وەها     خێل ودووبین هەرپەنا بەخواپەنا (٣٣٦)
سەدهەزاران موئمینی کوشت ئەولەعین     چونکەپشتم من لەبۆمووساوو دین (٣٣٧)

### فێڵ فێرکردنی وەزیر بە پاشا

بووی وەزیرێک کافر و هەم حیلەگەر     زۆر بەڕاحەت ڕام دەبوو بۆی خیرەسەر (٣٣٨)
دەیکوت ئەلحان کێ مەسیحیەوا دەکا     مەزهەبی خوی ئەولەشا ئیخفا دەکا؟ (٣٣٩)
تۆ لەکوشتاری مەسیحیان بەسکەبەس     دین کەڕەنگ وبۆی نییەظاهیر لەکەس[1] (٣٤٠)
چونکەئەسرارمەعنەوینەو نادیار     ظاهروباطن موخالیف جاروبار (٣٤١)
شاکوتی تۆپێم بڵێ تەکبیرچییە؟     چارەبۆئەومەکرو ئەو تەزویرچییە.؟ (٣٤٢)
لەوجیهانەتا نەمێنێ عیسەوی     کەس لەبۆعیسا نەبینێ پەیڕەوی (٣٤٣)
دەیکوت ئەی شا زووکەلەت کەلووتی من     ببڕەدەستم گوێم دەرێنەتو لەبن (٣٤٤)
جالەپاشان بمبەبن داری نەمان     یەک شەفاعەت کالەبۆمن ئەوزەمان (٣٤٥)
تو لەبۆوە جێگەیەک کە ئیختیار     ڕێی عبوور بێ بۆ عموومی کوللی شار (٣٤٦)
تو لەپاشان دەرکە من بۆ شاری دوور     تا قەراردەم من لە نێویان شەڕڕ و شوور (٣٤٧)
جا دەڵێم پاشان کەبەدزی عیسەویم     تو دەزانی ئەی خودایا من کەچیم (٣٤٨)
چونکەشازانی چییەئیمانی من     بۆ تەعەسسوب ویستی بگری گیانی من (٣٤٩)
دەم هەویست ون کەم لەشا ئایینی خۆم     دینی شام ظاهیر دەکرد نەک دینی خۆم (٣٥٠)
چون لەلای شا بوون عەیان ئەسراری من     بێ ڕەواج وپووچ دەمان گوفتاری من[1] (٣٥١)

---

[1]- کوشتنی وان بەسکە بۆ تۆی سوودنییە     دین کەنیتی بۆن. عەطروعوود نییە

[illegible] کۆتی من حیس دەکەم تۆی حیلەگەر — ئەودڵـــەی مـــن لەودڵـــەی تۆباخەبـــەر (٣٥٢)

[illegible] بــەدڵ زانــیم ودیــتم حــاڵی تــۆ — تــازەگوێ نــادەم بــەقیل وقــالی تــۆ (٣٥٣)

[illegible] ـــەبووبا،گیانی عیســـا یـــاری مـــن — وردی کردبــوو ئەوتەنــەی زۆر زاری مــن (٣٥٤)

[illegible] ـــەرێی عیســـادەدەم گیــانم، ســـەرم — غـــەیری عیســـاکوا ئومێـــدم ســـەروەرم؟ (٣٥٥)

[illegible] ـــەرێی عیســـا دەدەم گیــانم بـــەلاّم — عیلمـــی دینـــی وی دەزانـــم مـــن تـــەمام (٣٥٦)

[illegible] ـەلای مـن حەیفەزۆرئـەو دینـی پـاک — گەرلەنێوئەشخاســـی نـادان بـێ هـــیلاک (٣٥٧)

[illegible] ـــد هـــەم لەبۆعیســـا ســـپاس — چونکەئێمـــەدینی حـــەقمان کردپـــاس (٣٥٨)

[illegible] ـــەدینی جووڵـــەکانم بوونـــەجات — لەوخودایـــەدینی عیســـام بـــوو خـــەلاّت (٣٥٩)

[illegible] ـــری عیســــــییەوفەرمانی وی — گــوێ دەنــە، ئەســراری دینــی جــوانی وی (٣٦٠)

[illegible] جی کوتبـووی شـا هـەمووی ئـەنجام دەدا — خـەڵقی دیـش سەرسـام دەمـان لـەو کـارەدا (٣٦١)

[illegible] ـــەو هاتەنێوقـــەومی مەســـیح — دەسـتی پـێ کـرد ئەوبـەتـەبلیغ زۆرفەسیح (٣٦٢)

**قەبووڵ کردنی مەسیحیان مەکری وەزیر...**

[illegible] هەزاران جـــا مەســـیحی لایـــی وی — کۆدەبـــوون وپـــاک دەبوونـــە، لایـــی وی (٣٦٣)

[illegible] بـــەیان کـــردن بەتەفســیل وردێـــژ — باسـی ئینجیـل باسـی زوننـار هـەم نـوێژ (٣٦٤)

[illegible] بـــەظاهیر ڕەحمـــەتی دینـــی مەســیح — ئـەو بــەباطن نەقمــەتی دینــی مەسـیح (٣٦٥)

[illegible] ـتیان چــەن نەفــەر یــاری ڕەســوول — تابــەیان کــا چۆنەمــەکری نەفســی غــوول (٣٦٦)

[illegible] دەدڵدا دادەنـــێ ئـــەو وەسوەســـە.؟ — چۆن دەکا تێکەڵ بە طاعـەت مەخمەسـە؟ (٣٦٧)

[illegible] طاعـــەتیان نەپرســـی لەونـــەبی — عــەیبی ظاهیریــان نەپرســی. چــۆن دەبــی (٣٦٨)

[illegible] نەفسیان چـاک دەناسی مـوو بـەموو — چەشـــنی ناســـینی گـــوڵانی نێـــو دڕوو (٣٦٩)

[illegible] ـەحابـەی وا بـەهۆش هـەرکـو ئـەوان — پەندی ویان بیست مات وسەرگەردان دەمان (٣٧٠)

**پەیرەوی کردنی مەسیحیان لەوەزیر...**

[illegible] مەسـیحی پـەیرەوی وی پـاک تـەواو — خـۆ زەعیـف، قـەول وقـەراری سسـتە خـاو (٣٧١)

[illegible] ـەبوو گـــەر عیشـقی وی تێـــدا نـــەبی — ئـــەو لـــەلایان نـــائبی عیســـا نـــەبی (٣٧٢)

---

- شا لەسیرڕ و ڕازی من بوو باخەبەر — جا وتارم بوو لە لای وی بێ سەمەر

ئەو گورگ بوو، ها تبوو نێو پێستی مەڕی     هەرچی موئمین با بەعیسا، دەی دڕی[1] (٣٧٣)
ئەی خوداباسەد هەزاران دان وداو     بۆ وەکوو مە تەیری تەمما ع دانراو (٣٧٤)
لەحزەلەحزەدێتەپێمان داوی نوێ     بازو سیمورغیش ببین، لێک نینەجوێ (٣٧٥)
تۆنەجاتت داین لەداوی زۆر بەچین     داوی دی هەن ئێمەبۆلای وان دەچین (٣٧٦)
دەغڵ ودانی تێ دەکەێن حەمبارمان     ئێمەبۆخۆن ون دەکەین ئەو دەغڵ و دان (٣٧٧)
خۆ بە دیققەت فکری ئەو هەن قەت نەکرد     گەرکو مشکە هاتو دەغڵی پاک دەبرد (٣٧٨)
مشکەتا ئەنباری مەی لێدا لەغەم     دەغڵی بردو جا پڕی کرد ئەو لەغەم (٣٧٩)
تۆلەئەووەڵ فکری مشکی، چا، بکە     جا، لەپاشان دەغڵ ودان دەو دا بکە (٣٨٠)
گوێ دەئەو فەرمایشەی سەدری سدوور     (لا صلاه تم الا بالحضور) (٣٨١)
گەرکو مشکی دز لەئەنبارن نییە     گەنمی ئەعمال بۆلەنێو بارن نییە (٣٨٢)
کاری چا کی کەم لەڕۆژدا پێن دەبێ     بۆکەهاتەنێو دڵن بێ شوێن دەبێ (٣٨٣)
زۆرستێرەی ئاگرینیش دێنەدڵ     دڵ قەبووڵیەبێ ئەوەی کا هیچ سڵ (٣٨٤)
جا، لەزوڵمەت دا دزێک دێ زۆرنیهان     دا دەنێ قامک لەسەر ئەستێرەکان (٣٨٥)
یەک بەیەک خامووش دەکا ئەستێرەکان     تاکو نەیبێ هیچ چرایەک ئاسمان (٣٨٦)
با لەڕێشمان دا هەبێ داوو کەمین     تۆ لە گەڵمانی لە بۆیە بێغەمین (٣٨٧)
وەختی خەو تۆ ڕووح لەتەن ئازاد، دەکەی     نەقشی ئەزهان لا دەبەی بەرباد، دەکەی (٣٨٨)
خۆ هەمووشەو ڕووح لەزیندان دێتە دەر     ئەو، لەئەحکا م هەم لەگوفتار بێ خەبەر (٣٨٩)
شەخسی مەحبووس شەولەزیندان بێ خەبەر     شەولەدەوڵەت بێ خەبەر،شا،تا سەحەر (٣٩٠)
بێ خەیاڵەهەم لە سوود و هەم زیان     بێ خەیاڵەوکەسەیا لەوفڵان (٣٩١)
حاڵی عارف بێ خەویش لەو حاڵەیە     چاوی دڵیا ن دائمەن ئاواڵەیە (٣٩٢)
بێ عەلاقەن خۆ لەکەسبی جاە و ماڵ     وەک قەڵەم وان نێودەسی خوای بێ هەواڵ (٣٩٣)
ئەوکەسەی نەیدیوەدەستی نووسەران     وا دەزانێ ئەو قەڵەم بۆخۆگەڕان (٣٩٤)
حاڵێ عا رف زۆرکەمی کردحە ق بەیان     خەڵکی دیکەش وا، لەخەودان زۆرگران (٣٩٥)
گیا نی عارف چۆ تەسەحرای بێ میسال     جیسم وڕووحی وی دەکردشاد زولجەلال (٣٩٦)
بت هەوێ گەردێنەوەجێی خۆ بەغار     چۆنی بت وێ تۆ، دەکەن وا کاروبار (٣٩٧)
ئەو خودایەی سوبحی ڕوون زاهیر دەکا     سووڕەتی زاهیر بەئەڕواح کرد عەتا (٣٩٨)

---

[1]- ئەو، لەباتین دابوو دەججالی لەعین     ئەی خودا کۆمەک بکە(انت المعین)

...حەکی کەمونبەسیت بوو چۆن دەڕۆی؟ جارەکی دی دیتەوەنێو جێی خۆی (٣٩٩)
...سیی گیان عاری لەزینی تەن دەکا وایەمانای خەولەبۆ مردن بڕا (٤٠٠)
...ەوەتاجارەکی دی نێو بەدەن خوا بە پێ بەند لێکی بەستن ڕووح و تەن (٤٠١)
...ڕۆژهات ئەو لەمێرگ ومێر غو زار دەردەکا جا لەو دەکاتن تەن بەبار (٤٠٢)
...گەوەک ئەسحابی کاف ئاگای لەڕووح بایەوەک کەشتی کەحیفزی کردنووح (٤٠٣)
...ەوشیاری وهۆشی پڕلەئێش هەم نەجاتی بایە دڵ هەم چاو و گوێش (٤٠٤)
...ئەسحابی کەهف ئەلحان هەنە وان لەلای تۆ هەن لەکوللی ئەزمەنە (٤٠٥)
...گەڵ وی یارلەگەڵ وی هەم سروود چاوکەنەی دی گوێ کەنەی بیست جاچسود؟ (٤٠٦)
...ەیلی کوت خەلیفەوا، ئەتۆی؟ ئەوکەسەی مەجنوون گرفتاربوولەبۆی (٤٠٧)
...ی وەک تۆزۆرهەنەوجوانتر لەتۆش ئەوکوتی تۆچونکەمەجنوون نی خەمۆش (٤٠٨)
...سێکی مالّی دونیای یاربێ گەربنووی چاترلەوەی وشیاربێ (٤٠٩)
...حەق وشیار نەبێتن گیانی مە بۆمەوشیاری چیە؟ زیندانی مە (٤١٠)
...ن لەبەرڕەنجی خەیالآت و زەرەر نەفع وترسی مالّ لەدەس چوو نی هەدەر (٤١١)
...ەفایەولەو لەتافەت دیتەد ەر ڕێی سەماوات لەو دەگیرێ بۆسەفەر (٤١٢)
...کەسەی کەبووخەیالآتی،دەخەو دایەدائیم، نەک دەخەودا هەر بەشەو (٤١٣)
...دەخەودا دێو دەبینێ میسلی حوور ئیحتیلامی بەودەبێ (ام الفجور) (٤١٤)
...چەقاندی تۆو لەئەرزی شۆرەکات هەرووهۆش هات دی خەیاڵەو لای هەلآت (٤١٥)
...خەودبەهرەی سەرێشەوقالبی پیس تا خ لەبۆنەقشی خەیالّی چوو لەکیس (٤١٦)
...ەغری تەیرێک سایەی کەوتەئەرز سایەوەک وی هەلفڕی ڕووی کردەبەرز (٤١٧)
...قێک دێ تاکو سێبەرکاشکار تا کودەتوانێ لەدووی دەڕوا بەغار (٤١٨)
...لی تەیری سایەدی، ئەوبێ خەبەر ئەسلی سایەی ئەونەهاتەبەرنەزەر (٤١٩)
...نیشانەی گرتەسێبەر وەک مەبەست تیرداوێ تاکوسایەی بێتەدەست (٤٢٠)
...ر دانی عومری وی خالّی دەما ئەولەسایەی ڕاوی سایەی پشت چەما (٤٢١)
...سێبەری حەق گەرکو ئاگای بێت لەو دێ نەجاتی وی لەسایەو وهەم و خەو (٤٢٢)
...سێبەری حەق تۆبزانەئەوکەسە پشت بەدونیا هەرخو دا بۆ وی بەسە (٤٢٣)
...ەنی وی بگرەزووتر بێ گومان تانەجاتت بێ کەها ت ئاخرزەمان (٤٢٤)
...ف مدالظل) مەقسوود ئەولییان چون دەلیلی نووری ڕۆژی کێن؟خودان (٤٢٥)

بـــێ دەلیلـــــی وا نـــــەبی تۆرێبــــووار (لااحـــب الافلـــین )بـــۆت بـــێ شـــیعار[1] (٤٢٦)
تۆلەســـــایە، ڕوو بـــــەرەو ڕۆژ لا بـــــدە دامــەنی شــا شەمســی تــەبریز بــا بــدە[2] (٤٢٧)
جەشــن و ســوورت گــەر نــەزانی کوێیــەجێی خۆحیســامەددین دەڵــێ پێــت کوێیــە ڕێــی (٤٢٨)

گــەر حەســـەد بگــرێ لــەتۆڕێگای گــەروو نێوحەســـەد شــەیتان کــردی زۆر غلــوو[3] (٤٢٩)
چـون حەسـوودبوو بوولەگـەڵ ئـادەم عـەدوو چـی سـەعادەت بوولـەدە ستێ وی دەچـوو (٤٣٠)
گەردەنــەنین، وەک حەســادەت پرخەتــەر خــۆش بــەحاڵی وەی فرێیداپشــتی ســەر (٤٣١)
بەس جەسەد بوو مەنزڵ و جێگای حەسەد گەر حەسەد بێ پیس دەبێتن بەو جەسەد (٤٣٢)
گـەرچی خـا نـوو بۆحەسادەت بـوو جەسـەد زۆرتــەمیزی کــرد تــەنی پاکــان ئەحــەد (٤٣٣)
(طهرابیتـــــــی.)بـــــــەیانی پاکیـــــــە گـــەنجی نوورەئـــەو تەلەســـمی خاکیـــە (٤٣٤)
گەربەشەخسـی بـێ حەسـەدتۆبی حەسـوود ڕەش دەبێ دڵ، غـەیری ئەوهـە، نیتەسـوود (٤٣٥)
تۆلـــەژێرپێی ئـــەوڵیایان خــــاک بــــە تۆحەسادەت وەک مـە، چاڵ کە، چاک بـە (٤٣٦)

**بەیان کردنی حەسادەتی وەزیر...**

ئـەو وەزیـرەی وا حەسـوود و هێنـدە پەسـت هـەر بـە هیچێ گوێ و لـووتی دا لەدەست (٤٣٧)
بەوئومێـــــدەتاوەکوو زەهـــــری حەســـــەد بچتـــەنێو گیـــانی مەســـیحی بـــێ مـــەدەد (٤٣٨)
لووتی خۆی هەرکەس بڕی بەس بۆحەسەد خۆی دەکابێ لووت وگوێ ئەوشەخسی بەد (٤٣٩)
ئـــەو هـــە لووتەگەربـــەوی بکرێـــت بـــۆن بـۆن لـەبۆلای خـۆی ببـا لـووت هـەرچلۆن (٤٤٠)
ئـەو کەسـەی دیـن بـۆن نـەکا، لـووتی بـڕا بـــۆنی ڕاســـتی هـــەر وەبـــەر دینـــی بـــڕا (٤٤١)
گــەربکا بــۆن شــوکری کامیــل گەرنــەکا لـــووتی دەڕوا ناســـپاس بـــوو چونکـــەوا (٤٤٢)
شـــوکری شـــاکر کـــە، لـــەبۆ وی بەندەبـــە تــۆ لــەلای وی بمرەجــا هــەر زیندەبــە (٤٤٣)
وەک وەزیرتـــۆ ڕێ گـــری ئیمـــان مەبـــە مــەنعی تاعــەت بۆخــودای مــەننان مەبــە (٤٤٤)
ناسـیحی دیـن بـوو بـەزاهیر ئـەو وەزیـر ئـــەو بـــەفێڵ داینـــا لەنێولووزینـــە ســـیر (٤٤٥)

---

[1]- ( لا احب الافلین)ت بێ شیعار( مصرع دوم)
[2]- تۆ لە سایە، ئەسڵی ڕۆژت بێ مەبەست دامەنی شا شەمسی تەبریز بگرە دەست
[3]- گەر حەسەد هات و لەڕێت دا، بۆدڕوو خۆ حەسەد شەیتان، دەویدا کرد غلوو

### ئاگادار بوونی ئەشخاسی وشیاری مەسیحی لە مەکری وەزیر...

ئەهلی زەوقیش گەر قسەی وی لەو دەبیست    وای دەزانی باشە پاشان نەی دەویست (٤٤٦)

ژێرلەتیفەی وی بەئەغرازتێکەڵاو    قەندی ژەهراوی دەخستە نێو گوڵاو (٤٤٧)

زاهیرەن دەیکوت لەڕێی حەق چوست بە    ئەو لە مەعنا وای بە ڕووح کوت سوست بە (٤٤٨)

گەرچی زێو،تازەوسپی زۆرجوان وگەش    بەو،دەبن دەست و لّیباس زۆر پیس و ڕەش (٤٤٩)

گەرچی ئاوور سوورە وەک نووکی کەوێ    ڕەش دەبێ بەو،هەرشتێکی وێکەوێ (٤٥٠)

ڕوون و جوانە لەو حەوایە بەرقی نوور    کوێر دەکا چاو، گەر بنۆڕی لەو لەدوور (٤٥١)

هەرکەسێکی دوور لەعیلم و زەوق بوو    چی وەزیر کوتبای لە ئەستۆی تەوق بوو (٤٥٢)

موددەتی شەش ساڵ وەزیری دوورلەشا    بوو لەبۆئەتباعی عیسا جان پەنا (٤٥٣)

دین ودڵیان پاک بەوی ئەسپاردخەڵق    ئەمروحوکمی وی لەبۆخەڵق،کاردی حەڵق (٤٥٤)

### پەیامی شا بە نهێنی بۆ وەزیر...

بوو لە نێو پاشا و وەزیردا زۆر پەیام    شا بەوی وەعدەی دەدا (موحیبی العظام) (٤٥٥)

بۆ وەزیری نووسی شا ئەی با وەفا    وەختە ئێستا، لەو دڵەم لابەی جەفا (٤٥٦)

ئەو کوتی مەشغووڵی ئەوهەم شەهریار    دینی عیسا کەم، بە فیتنە عەیب دار (٤٥٧)

### بەیان کردنی دوازدە سیبتی مەسیحیان...

قەومی عیسا چون بیوونە چەند بەش    بوو ئەمیریان دەو زەماندا جووت شەش (٤٥٨)

هەرگرووهێک بۆ ئەمیرێک بوو تەبەع    عەبدی میری خۆی دەکرد ئەو، بۆ تەمەع (٤٥٩)

ئەو دووازدە حاکمانە و قەومی وان    بوونە بەندە بۆ وەزیری بەد نیشان (٤٦٠)

موعتەبەر بوو لای هەموو، گوفتاری وی    هەرهەموویان پەیڕەوی ڕەفتاری وی (٤٦١)

هەر ئەمیرێک ئەمری ئەو پێ کردبا    بمرە حەتمەن ئەو دەبایە مردبا (٤٦٢)

### دەستکاری کردنی وەزیر ئەحکامی ئینجیل...

چاکی کردتۆماربەنێوی هەریەکێک    نەقشی هەرتۆ مار خیلافی مەسلەکێک (٤٦٣)

حوکمی هەریەک بوو خیلافی حوکمی دی    زۆر عەیان بوو لەو کەسەی تۆماری دی (٤٦٤)

ئەولەیەکیان ئەمری کرد بەڕەنج و جووع    زیربنای ڕەنج تۆبەیە و شەرتی ڕجووع (٤٦٥)

ئەو دەیەکیاندا کوتی بێسوودە ڕەنج　　ڕێی نەجات تەنها و بەس ئیعتایی گەنج[1] (۴۶۶)
ئەو دەیەکیا ن داکەجووع وجوودی تۆ　　شیرکی تۆیەخۆ دەگەڵ مەعبوودی تۆ (۴۶۷)
غەیری تەسلیم و تەوەککول، مەکر و داو　　هەم دەغەم دا هەم دەشادی هەن تەواو (۴۶۸)
بوو دەیەکیان دا کەواجب خزمەتە　　گەرنەبێ خزمەت تەوەککول توهمەتە (۴۶۹)
بوو دەیەکیان ئەمرو نەهیی زۆرهەنە　　بۆ عەمەل نین شەرحی عەجزی ئێمەنە (۴۷۰)
تاکو عەجزی خۆن بناسین، جا، لەوان　　قودرتی حەق باش بنا سین ئەو زەمان (۴۷۱)
بوو دەیەکیان، تۆکەخۆت عاجیزمەکە　　کفری نیعمەت عەجزەئەوباریزمەکە (۴۷۲)
قودرەتی تۆ قودرەتی خوایە لەلات　　نیعمەتی قودرەت خودا دای وەک خەڵەڵات (۴۷۳)
بوو دەیەکیان لابەئەو دوو بۆ چتە؟　　چون بەهەرچی بەستەبی بۆتۆ، بتە (۴۷۴)
بوودەیەکیان بایسێ دائم با شەمع　　چون نەزەر وەک شەمعەبۆ چی؟بۆجەمع (۴۷۵)
گەرلەخۆت فکرو خەیاڵت کرد بەدوور　　چوولەدەستت شەمعی وەسڵی پڕلەنوور (۴۷۶)
بوودەیەکیان، بوگژەنەت بێ غەم بەبار　　تاعیوەز بێ بۆ نەزەر یەک سەدهەزار (۴۷۷)
چون لەکوشتن شەمعی گیان زۆرڕوون دەبێ　　گەرسەبووربی لەیلەکەت مەجنوون دەبێ (۴۷۸)
گەربەزوهدی خۆی کەسێ دونیای نەوێ　　دێ بەدووی وەک سێبەرێک وەدوای کەوێ (۴۷۹)
بوودەیەکیان هەرچی پێی دای خوایی تۆ　　شیرینی کردوگوواڕا لایێ تۆ (۴۸۰)
هەرچی لای خوا هات لەبۆ تۆ ڕەحمەتە　　وامەزانەئەولەبۆتۆ زەحمەتە (۴۸۱)
بوو دەیەکیان دا لەویستت تێ پەڕە　　چونکەتەبعت چاکی ناوێ بەدفەڕە (۴۸۲)
ڕێی وشوێنی دینی جوێ جوێ سادەنە　　هەریەکەی بۆمیللەتێک وەک گیان وەنە (۴۸۳)
گەرکو لازم بایەخوا، با، ڕێ نموون　　گاوروجووش خۆلەحەق ئا گا دەبوون (۴۸۴)
بوو دەیەکیان دا کەویستی وا، خودا　　ڕزق ورۆزی ڕووح لەژینی دڵ بدا (۴۸۵)
زەوقی باتین گەرلەدەستی تەبع چێ　　دوور لە سوودە شۆرەکاتە وێدەچێ (۴۸۶)
بووپەشیمان هەرچی چوو،بەدوای هەوا　　بۆی خەسارەت هات لەو بەیع و شیرا (۴۸۷)
دوای هەوا چوون با بەزاهیر سادەبێ　　ڕەنجی زۆری دوایەئەو لێ چادەبێ (۴۸۸)
موشکل و ئاسان لەیەکیان جیاکەوە　　تابینی ئەودوو وە، وەدواکەوە (۴۸۹)
بوودەیەکیان دا بەمورشید بگرەدەس　　عاقیبەت بین مورشیدە نەک قەوم وکەس (۴۹۰)
عاقیبەت میللەت هەموویان بیستیان　　بەس بەمورشید بوو نیا زو ویستیان (۴۹۱)

[1] ئەودەیەکیان دا کوتی ڕەنج هیچ نیە　　ڕێی نەجاتیش غەیری جوود گەنج هیچ نیە

عاقیبەت بینی نەوایەدەست باف — بێ سەبەب نەبوەدەدین دا ئیختیلاف (٤٩٢)
بوو دیەکیان تۆی لەمورشید بێ نیاز — عارفی هەم مورشیدی ئاگا بەراز (٤٩٣)
تۆ وەکوو پیاوان ئەسیری کەس مەبە — تۆلەدەریاگەوهەری، قەت خەس مەبە (٤٩٤)
بوودیەکیان ئەسڵی دینان هەریەکە — هەرچی دووی دی خێڵەبەقسەی وی مەکە (٤٩٥)
ئەوەتۆماریک کوتی سەدچۆن یەکە؟ — شیتەفکری وا دەکا تۆ وامەکە (٤٩٦)
ئیتیحادی قەولی وازید هەر محاڵ — چۆن دەبن یەک، شەکری شیرن و ژەهری تاڵ (٤٩٧)
تاکو وادی ژەهروشەکری تەی دەکەی — بۆنی وەحدەت کوا لەبۆ تو دێت کەی؟ (٤٩٨)
دەزانێ تۆ ماری دەنووسی زۆر فەسیح — ئەوەزیری دوژمنی دینی مەسیح (٤٩٩)

**بەیان کردنی ئەو مەتڵەبە کە ئەو ئیختیلافە دە زاهیر دایە نەک دە حەقیقەتی ڕێگادا...**

حوبیەک ڕەنگ بوونی عیسا بێ خەبەر — تەبعی عیسای هیچ نەبوو ئەوبێ بەسەر (٥٠٠)
قەبی سەد ڕەنگ بچتەخمخانەی دڵی — سادەهەمیەک ڕەنگ دەبێ ئەو، وەک گوڵی[1] (٥٠١)
حەنەیەک ڕەنگی وەها دڵ بێ مەلال — بەڵکەمیسلی ماسی و ئاوی زولال (٥٠٢)
گەرچەئیشکی دا هەزاران ڕەنگ هەنە — بەینی ماسی و ئیشکەتی زۆرجەنگ هەنە (٥٠٣)
بێ بەماسی هەم بەدەریام کرد شەبیە — بۆمەسەل بوو ئەو خودایەی وانەزیە (٥٠٤)
چۆن دەهەستی بەحروماسی سەد هەزار — دێتەسەجدەبۆخودای پەروەردگار (٥٠٥)
تەرەلەو بارانی ڕەحمەت دێتەخوار — چادەبن بەو، بەحرو دوڕی شاهوار (٥٠٦)
پرتەئاسۆی حەق هەڵات تاوی کەرەم — تاکو فێرکا جوود بە هەوران و بە یەم (٥٠٧)
سووری تاوێ کەوتەسەرخاک وگڵی — تا زەمین جێی دا بە دانە، نێو دڵی (٥٠٨)
هەرچی چاندت تۆلەنێو قەلبی زەمین — بێ خیانەت وێت دەدا خاکی ئەمین (٥٠٩)
ەوخودایەهات ئەمانەت بۆزەمین — چونکەتاوی حەق لەویدا نووروتین (٥١٠)
تەحەق فەرمان نەیەت نایەت بەهار — خاک ناکا هیچ لەسیرڕان ئاشکار (٥١١)
دی جەمادات ئەوخودایەی دادگەر — هەم ئەمانەت هەم سەدا قەت، هەم خەبەر (٥١٢)
ئەو بەفەزڵی خۆی جەماد ئا گا دەکا — ئەو بەقەهری، عاقڵان رسوا دەکا (٥١٣)
دوورلەفەهمن سیرڕی حەق، هیچ جوێ نییە — کەس نیەمن پێی بڵەم، هیچ گوێ نییە (٥١٤)
هەربەمەیلی وی دەبێتن گوێ و چاو — بەر بەمەیلی وی دەبێ یەشمی بەناو (٥١٥)

---

[1] سادەو و یەک ڕەنگ دەبێ ئەو وەک گوڵی (مصرع دوم)

کیمیاسازەخودا کیمیاچیە؟ موعجیزەبەخشەخودا، سیمیا چیە؟ (۵۱۶)
ئەوسەنای دەیکەم ئەمن، تەرکی سەنا چو ن سەنا بۆ بوون دەلیلەنەک فەنا (۵۱۷)
بوون نەبێ با قەت لەڕاستی بوونی وی کوێرەهەم ڕەش،بوون لەحاستی بوونی وی (۵۱۸)
کوێرنەبایەچۆن دەبوو بگرێ قەرار ئەولەحاستی تینی تاوی کردگار (۵۱۹)
گەرعەزا داریش نەبا یەڕەش نەبوو وەک سەهۆڵ سەردی لەبۆ تەن بەش نەبوو (۵۲۰)

**بەیانی زیانی وەزیر لەو مەکرەدا...**

هەروەکوو شا، غافڵ ونادان وەزیر ئەو دەگەڵ حەق کردی دەعواو دار و گیر (۵۲۱)
دوژمنی کرد ئەودەگەڵ ئەوخوای عەزیم بەس بە(کن) چاکی دەکرد،چی بووعەدیم (۵۲۲)
عالەمێکی زۆردەبینی گەر خودا چاوەکانی تۆ بەخۆی بینا بکا (۵۲۳)
گەرچی دونیا، لات وەهایەبێ بنە خۆ، لەحاستی قودرەتی وی هەرونە (۵۲۴)
ئەو جیهانە حەبسی گیانی ئێوەیە بچنە سەحرایەک کە خۆشی پێوەیە (۵۲۵)
ئەو جیهانە دێ بنی، ئیدیکە نا بۆ جیهانی دی حیجاب، دونیای فەنا (۵۲۶)
هەرچی نێزەی فیرعەوون بووی لێی شکا بەس بەیەک مووسا بەدەس وی یەک عەسا (۵۲۷)
تیببی جالینووس ئەگەربێ سەد هەزار خۆلەحاس عیساو دەمی وی وەک قومار (۵۲۸)
دەفتەری ئەشعار ئەگەربێ سەد هەزار خۆ لەحا ستی قەو لی ئوممی وینە، عار[1] (۵۲۹)
گەر لەڕێی خوا وا لەنەمرێ ئەوکەسە ئەو کەسە ئینسان نیە خار و خەسە (۵۳۰)
زۆردڵی وەک کێو لەجێی خۆی هەڵدەقەند زۆر پەڕەندەی زیرەکیشی خستەبەند (۵۳۱)
کێ بەعەقڵی، لای خودا ڕێگای هەیە؟ دڵ شکاوەلای خودا جێگای هەیە[2] (۵۳۲)
زۆرکەسیش هەن دەوڵەمەندو هووشیار مەسخەرەن بۆدوور لەفام و شێت وهار (۵۳۳)
چۆن دەبی بۆشێت وهاران مەسخەرە؟ خاکی بەرپێی وان ببی تۆ، یەک سەرە (۵۳۴)
چون ژنەی بەد کار لەخوا بوو شەرمەزار مەسخی کردو،کردیەزو هەرەی نامدار (۵۳۵)
بوون بەزوهرەگەرمەسخ بێ بۆ ژنێ بوون بەخاکو قوڕ عەنوود چی نێو دەنێ (۵۳۶)
ڕووح ویستی تۆبەرێ بۆئاسمان خاک وخۆڵت هەڵبژارد تۆبۆژییان (۵۳۷)
خۆت مەسخ کرد چونکەچووی بەدوای هەوا بەووجوودەی وا مەلەک دەی ویست ئەوا (۵۳۸)

---

[1]- خۆلەحاستی قەولی ئەحمەد نەنگ وعار (مصرع دوم)

[2]- کوا بەعەقڵی، عاقڵان ڕێیان هەیە؟ دڵ شکاوا ن لای خودا جێیان هەیە

ئەو دوو مەسخەزۆرجودانەو لێک بەدوور یەک بەخۆڵ و یەک بەزوهرەی پڕ لەنوور (٥٣٩)
فکری ناسینی ستێران تۆدەکەی تۆلەئادەم ڕووگەبوو، چیت دیوەدەی؟ (٥٤٠)
تۆلەلای خۆت ئادەمیزادی ئەدی بۆچی پەستیت تۆوەکوو مەردی دەدی؟ (٥٤١)
بەس بڵێ من عالەمێکی قڕ دەکەم ئەو جیهانەی من بەقودرەت پڕدەکەم (٥٤٢)
گەرجیهان یەک سەر، بەفر بێ پێکەوە هەرکەتاوی وێ کەووت دەت وێتەوە (٥٤٣)

ڕەحمی زۆرە، جەورم بەخشەکردگار لەو وەزیرە و سەد وەزیر و سەد هەزار[1] (٥٤٤)
فکری فاسید عەینی وی حیکمەت دەکا عەینی ژەهراو، بی هەوێ شەر بەت دەکا (٥٤٥)
ئەهلی تەردید ئەو دەکا ئەهلی یەقین ئەو مەحەببەت چا دەکا بی وێ، لەکین (٥٤٦)
ئەزی ئیبراهیم دەکێشێ ئەو لەنار ڕووح دەکا ئیمەن بەترسی بێ ژمار (٥٤٧)
بەسەبەب سووزی خودا سوڕما سەرم چەشنی (لائەدری) خەیاڵ دەوروبەرم (٥٤٨)

**مەکر و حیلە سازکردنێکی دیکەی وەزیر، بۆ گومڕا کردنی خەڵکی...**

ئەو وەزیرە مەکرەکی دی دادەنا چوو دەخەڵوەت پەند و وەعزی لا دەنا (٥٤٩)
بوو مریدان زەمزەمەپەیدادەبوو چوو دەخەڵوەت چڵ شەوان دەو دا دەبوو (٥٥٠)
حا لەشەوقی وی خەڵق دێوانەبوون بۆ فیراقی وی لەخۆبێگانەبوون (٥٥١)
بوون و زاری و فغانیان کرد ئەویش بوو لەرەنجی خەڵوەتی، دال وحەشیش (٥٥٢)
ئەو وەزیریان کوت بەبێ تۆ نینە نوور دیارە کوێر دەڕوا بەبێ چاو ساغ چ جوور (٥٥٣)
تۆبەرمەردایەتی وخاتری خودا قەت نەکەی زیاترلەوەی لێن بی جودا (٥٥٤)
ئێمەمندالین ودایەنمان ئەتۆی بەوهە، خۆشین چونکەلا یەنمان ئەتۆی (٥٥٥)
پێکوتن ئەوگەرچی دۆست گیانی منە تا کو فەرمان دێ لەبۆم جێم قوژبنە (٥٥٦)
جی ئەمیر بوو بۆشەفاعەت هاتەلای چی مرید بوو بۆشەناعەت هاتەلای (٥٥٧)
جۆ. بەبێ تۆئێمەچی مان هات بەسەر ئێمەبێ تۆ وەک هەتیوین بێ پدەر (٥٥٨)
تۆ لەئێمەت گرت بەهانە، نایەدەر ئاهی سەردن بۆ نەسیب و، خۆڵ وەسەر (٥٥٩)
هەرهەمووی خۆش بوون لەبۆن گوفتاری تۆ دەرسی حیکمەت بوو لەبۆن، ڕەفتاری تۆ (٥٦٠)
تۆ بەخاتری خوا جەفامان بەس بکەی کار کەچابوو بیکەئەورۆ، نەک سبەی (٥٦١)

---

[1] - لەو وەزیرە هەم لە ئیدی سەد هەزار ( مصرع دوم)

چـــۆن دڵــــبت ڕازی دەبـــێ تاکوموریـــــد دوورلـەتۆ بـن دوور لـە تـەعلیمی موفیـد؟ (۵۶۲)
بـێ تـۆ وەک ماسـین لـە ئیشـکی دا قـەرار بەنـدی جـۆی وەسـڵت، وەلابــە بێتــەخوار (۵۶۳)
ئـــەی وەکـــوو تـــۆ، لـــەو زەمانەکـــەس نییـــە کۆمەکت بەو خەڵقە، قەت قەت بەس نییە (۵۶۴)

**دەفع کردنی وەزیر مریدان لەگفتوگۆ...**

پێیکـوتن ئـەی تـابیعینی قـەو ل و، بـەحس پـەیڕەوی پەنـدی زبـان و گـوێ، نـە فـەحس (۵۶۵)
گــوێی زاهیــر تــۆ ببەســتە بــەو مــەبێ بەنــدی چــاوی دڵ وەلا بــە، ئــەو دەبــێ (۵۶۶)
تـۆ ببەسـتە گـوێی سـەرت ئـەو بەدفـەڕە گەرببیسـێ گـوێی سـەرت گـوێی دڵ کـەڕە[1] (۵۶۷)
لانــــەنێی گەرتۆحەواســــــی زاهیـــــری لــەو خیتابــەی (ارجعــی) دەکرێــی بــەری (۵۶۸)
تـــاکو وشـــیاربی و عـــەقڵت بـــێ لەســـەر چۆن لەڕازی خـەو ئـەتۆ دەت بێ خەبـەر؟ (۵۶۹)
قـــەول وفیعلـــی ئیمەســـەیری زاهیـــری سەیری با تین، ئاسمان جێی سەر سەری (۵۷۰)
حیسســـــی زاهیرهەرلـــــەزاهیر هاتـــــەدی چاو لەڕووح کە چۆن لە سەر دەریا دەچی؟ (۵۷۱)
سەیری جیسمی کەوتە سەر ناسووت و خاک جێی لـە نێـو دەریـایی مـەعنا، ڕووحـی پـاک (۵۷۲)
چـون لــەڕێی ناسـووت عـومرت تێپــەڕی جـار لـەکێو و جـار لـە دەریـا جـار بـەڕی (۵۷۳)
چـۆن وەدەس دێنـی ئـەتۆ، ئـاوی حـەیات؟ چۆن لە دەریا و مەوجی وی دەت بێ نـەجات؟ (۵۷۴)
مـەوجی خـاکی وەهـم و فـەهم و فکـری مـە مـەوجی ئـاو، مـەحوو فـەناوو سـوکری مـە (۵۷۵)
تـاکو لێرەمەسـت ببـی مەسـت نـی لـەوێ لێرەمەسـت بی جامی وێـت دەس ناکـەوێ (۵۷۶)
گفتوگـــۆیی زاهیـــری هـــەروەک غوبـــار ماوەیـــەک خـــامووش ببەئـــەی هووشـــیار (۵۷۷)

**تیکرار کردنی مریدان کە لە خەڵوەت وەرە دەر...**

پـــاکی کوتیـــان ئـــەی حـــەکیمی چارەســـاز بـەس فـەریب و بـەس جـەفامان دەبـەناز (۵۷۸)
بارلـــەبار بـــەر تـــۆ بـــەتوانای، دا بنـــێ بـــۆ زەعیفـــان کـــاری موشـــکیل، لابنـــێ (۵۷۹)
دانـــی هەرتـــەیرێک بـــە ئەنـــدازەی ئـــەوە کـوانێ هــەنجیر دانــی کــۆترە یــا کــەوە؟ (۵۸۰)
گەرلـــەباتی شـــیر بەمنـــداڵ نـــان بـــدەی گیـان دەسـێنی لـەو لـەباتی گیـان بـدەی (۵۸۱)
لـــــەو منالەهــــــەرکو هاتـــــەدەر ددان هــەر بــەخۆی تالــب دەبــێ بخــوات نــان (۵۸۲)
گـەرکو جووجکـەی بـاڵ نـەهاتوو هـەڵفڕێ تـــۆدەبینی چـــۆن پشـــیلەدەی دڕێ (۵۸۳)

---

[1]- گەر نەبەستی گوێی سەرت گوێی دڵ کەڕە( مصرع دوم)

ـاڵی هاتـەدەر دەفـڕێ تـەنێ — بـێ ئـەوەی کەیارمەتیشـی هـیچ دەنـێ (٥٨٤)
خـامووش دەکـاتن ئـاوری نـەفس — نـوتقی تـۆ حـاڵین دەکـاتن بـاش و نـەحس (٥٨٥)
ـەهۆشـە، چونکـە ویژەرمـان ئـەتۆی — بـەحرە بـەرمان چونکـە ڕێبـەرمان ئـەتۆی (٥٨٦)
تـۆین خـاک چاکـە، نـەک فەلـەک — ئـەی بـەتۆرِوون بـوو سـیماک تاکوسـەمەک (٥٨٧)
ـەک تاریکـەبێ تـۆ، ئـەی عـەزیز — ئەی بەبێ تۆ قەدری ئاسمان هیچ پەشیز (٥٨٨)
ـاسـووت بـەزاهیر، ئەکبـەرە — ڕووح کەپاکـە، ئـەو لەمـەعنا لـەو سـەرە (٥٨٩)
زاهیـر فەقـەت بـۆ جیسـمەبەس — خۆلەحاستی مەعنی،جیسم، هەر ئیسمەبەس (٥٩٠)

**ب دانەوی وەزیر کە لەخەڵوەت نایەمە دەر...**

ـەو حوججـەتی خۆکـەم بکـەن — پەنـدی مـن بگـرن لـەنێو دڵ جـەم بکـەن (٥٩١)
ـەبم نـابێ مـن بـم جێـی گومـان — بـا بەعـەرزیش، مـن ببێـژم ئاسـمان (٥٩٢)
کـەمیـل هـەم ئـەمن، ئینکـا ر بـۆ؟ — گەرنـەبم وا، ئەزیـەت و ئـازار بـۆ؟ (٥٩٣)
ـەن قـەت لـە خـەڵوەت بێمـە دەر — چـون بـەحا لـی دڵ خـەریکم، نـەک بەسـەر (٥٩٤)

**گرتنی مریدان لە خەڵوەتی وەزیر...**

ـوتیـان مـونکیرت نـین، ئـەی وەزیـر — پـاک مریـدین، تـۆش لـەبۆمان، بوویـە، پیـر (٥٩٥)
ـڕیت ئەشـکی چاومـان دیتـەخوار — ئـاەو ناڵـەن دێ لـەگیانی بـێ قـەرار (٥٩٦)
ـندالّ، دوژمنـی داکـی نییـە — لای، خـەراب فـەرقی دەگـەڵ چـاکی، نییـە (٥٩٧)
ـنگین دیـارەمیزراب دەسـتی تـۆن — ناڵـەناڵن دێ، بـەمیزراب، نـەک بـەخۆن (٥٩٨)
ـک نـەیێن، ئـەو نـەوای مـە، دێ لـەتۆ — ئێمـەوەک کێـو، ئەوسـەدا ی مـە، دێ لـەتۆ (٥٩٩)
ـەترەنجین ودانـراوین، لـەلات — بـەس بەدەسـتی تـۆن خودایـا، بردومـات (٦٠٠)
ـت دا جیسـم وگیـان وتـارو پـوود — چـۆن لـەحاس تـۆ، ئێمەئیزهارکـەیێن، وجـوود (٦٠١)
ـخۆ نـین باهەبیشـین هەربـەناو — تـۆ، وجـوودی موتڵـەقی پنهـان لـەچاو (٦٠٢)
ـیرین، شـێری سـەرئاڵای پـەڕۆ — گـەرهو جـوومیش کـەن، بەبایە، نـەک بـەخۆ (٦٠٣)
ـەی وان و، بایـەنادیار — یـا ئیلاهـی نادیارمـان بـێ بـەیار (٦٠٤)
ـتۆبووی، بـادو بـوودت دا، بەمـە — هـەرئـەتۆبووی دات وجـوود بـەو، عالەمـە (٦٠٥)
ـنـەی هەرنـەبوو بـوون دات وجـوود — عاشـقی خـۆت کـردن و کردیـان سـجوود (٦٠٦)
ـتی ئینعـامی خـۆت مەگرەلەمـە — نوقـڵ وبادەوجـامی خـۆت، مـەگرە، لەمـە (٦٠٧)

تۆکـــەبگری کـــێ هەیـــەداوا بکـــا؟ — نـەقش گـەڵ نـەققاش چلـۆن دەعـوا بکـا؟ (٨
کـــردەوەی مەتۆمـــە هێنەبەرنـــەزەر — سـێبەری ئـەلتافی خـۆتن بێنەسـەر (٩
پێش لـەبوونمان پێش تـەقازا پێش لەویست — چـی نـەمان کوت، لـوتفی تۆپـاکی دەبیست (٠
زەعفـی نەقشـان لای نـەقاش ولای قەڵـەم — وەک جـەنینی بەستەدەسـتەن هـەم قـەدەم (١
عـاجزن عالـەم لەحاسـتی قـودرەتی — وەک لـەحاس دەرزی، پـەڕۆ، هـەم سووڕەتی (٢
جـار شـەیتان جـار ئـادەم چادەکـا — جـار شـادی جـارو بـار غـەم چادەکـا (٣
کـێ لـەحاس وی باسـی خێـرو شـەڕدەکا؟ — کـێ لـەحاس وی باسـی نـەفع و زەڕ، دەکا؟ (٤
تۆلـەقوڕئان وەرگرەتەفسـیری بـەیت — خـوا وتوویـە(مارمیـت ا ذ رمیـت) (٥
تیـر کـەبا وێـن، تیـر هـاوێژ نـین، ئەمـە — تیرهـا وێـژ هەرخودایـە، ئـەو دەمـە (٦
خۆنەجەبرەئـەو وتـەم جەبیارییـە — زیکـری جـەبیا ریـم کـەکرد بـۆ زارییـە (٧
شـیوەن وزاریـن دەلیلـی ئیزتیـرار — خەجڵـەت و زاریـن دەلیلـی ئیختیـار (٨
گەرنەبایەبۆخـەتاکار ئیختیـار — بۆپەشـیمانەوخەجا ڵـەت، تۆبـە،کار؟ (٩
بۆموعـەللیم ئەزیـەتی شـاگرد دەکـا؟ — بۆلەسـەودا فکـری هـات وبـرد، دەکـا؟ (٠
گەربڵـەێ ئوستا د لەجـەبری بـێ خەبـەر — مـانگی حـەق لای هـەوری زۆری هاتەسـەر (١
گەرببیسـی جـوابی مـن بۆئـەو نـەزەر — دەس بـەدین دەگـری لـەکفرێ دێـەدەر (٢
گەرنەخۆش بی، و بی، لەبەر ئیش بێ قەرار — ئـەو دەمـەکامل دەبـی، تـۆ هووشـیار (٣
گـەر نـەخۆش بـی شیوەن وزاری دەکـەی — تۆبـە، خوایـە، خـۆش بـەلێم، جاری دەکـەی (٤
دێتەبـەرچاووت ئـەوەی کـردت خـەرا ب — دەت هـەوێ، پاشان کـەبێی بۆ ڕێی سـەواب (٥
سوێن دەخـۆی کـە، مـن گوناەئیـدی نەکـەم — غـەیری تاعـەت بۆخـودا چیـدی نەکـەم (٦
جا یـەقین بـوو گـەر نـەخۆش بی ئـەی بـرا — بـەودەبینی ڕەمـزو ئەسـراڕ، وەک چـرا (٧
دردەداران بـوون لەئەسـراڕ بـا خەبـەر — بـێ تـەفا و ەت لاق کەبێشـێ یـا نەسـەر (٨
هەرکەسـێ وشـیارترە پـڕ دەرد تـرە — هەرکەسـێ زانـا ترەڕەنـگ زەرد تـرە (٩
کوانێ گریەت؟گـەر دەنـا سـی جـەبری وی — کوانێ زەنجیر؟گـەرتۆ بەستەی سـەبری وی (٠
چـۆن بـەزەنجیر بەسـتراو، شـادی دەکـا؟ — چـۆن ئەسـیرێک حیسـی ئـازادی دەکـا؟ (١
گـەردەبینی دەسـت و پێتیـا ن بەسـتووە — پیـاوی شاشـت وا، لـەلای سەرنوسـتووە (٢
عـاجزا ن تـۆهیچ دەمـێ ئـا زار مەکـە — چـو نکـەوا نین تـۆش ئـەوان خـەمبار مەکە (٣
تـۆ کەجـەبری ویـت نـەدیوەهیچ زەمـان — هـیچ مـەڵێ دیتـت بڵـێ نـاوو نیشـان (٤

ـــەی کـردم بـەکارێک بـت هـەوێ    قودرەتی خۆت دەت هـەوێ لـەو دەرکـەوێ (۶۳۵)
ــ ــە هـەرکـارێ کـە نـەتویـسـت و کـر    دەبیەجـەبری جـا دەڵـەی کـردی خـودا (۶۳۶)
ــ ێ دۆیــ جەبردبوگشـت ئـەنبیـ    کـاری ئـا خـر جەبرەبۆگشـت ئەشـقیا (۶۳۷)
ـی ـەی بـوو کـاری عوقبـای. هـەڵبژارد    کـێ دەنـێ بـوو کـاری دونیای،هـەڵبژارد (۶۳۸)
جـ ـ یەرـنـدەدفڕێ بـۆلای جینسـی خـۆ    گیان ـە پێش و تـەن لـەدووی دێ،سـەربەخۆ (۶۳۹)
جـۆنکەجینســی کــافران ســیجین بــوو    سـیجنی دونیـا لای ئـەوان شـیرین بـوو (۶۴۰)
ـەنـ جـۆ ن جینســی عیللیــین بــوون    زۆربەشـادی ڕوو بـەعیللیین چـوون (۶۴۱)
تەۆقـــە. خـۆ. قـەت تـەواو نـابێ بـەڵام    بـا تـەوو کـەین داسـتانی ناتـەمام (۶۴۲)
ۆێ دەکـوت جـا. ئـەووەزیرەی. بوو.تـەنێ    ئـەی مریـدان راسـتەقەولم. گـوێ. دەنـێ (۶۴۳)
حـەزرەتی عیسـا ئـەوای مـن کـرد نیـدا    تالـەیارو قـەوم وکـەس مـن بـم جـودا (۶۴۴)
ڕۆۆ بـــەدیوار دابنیشـــەهەرتەنێ    وەک ئـەوەی بە.گـەر، وجـوودیش، لا دەنـێ (۶۴۵)
ـن ـەوەی پاش.حـەققی گفتـارم نیـە    مـن لـەوەی پـاش،گفتوگۆ، کـارم نیـە (۶۴۶)
ـودێ. ئـەی دۆسـتان مـردم ئـەمن    کـۆچ لـەبۆچوارەم سـەما،کردم ئـەمن (۶۴۷)
تـ ـەدونیـد نەسـوتیـە وەک حەتـەب    یـا لـەجورم و یـا لـەڕەنج و یـا عەتـەب (۶۴۸)

### نائومێدکردنی وەزیر مریدەکانی لە شکاندنی خەڵوەت...

ـن ـەوەی پـێش هـۆ دەدەم. عیسـا دەبـێ    ئاسـمانی چـوارەمم، جێگـا دەبـێ (۶۴۹)

### وەزیر هەریەک لەئەمیرەکان دەکاتەجێ نشینی خۆی بەسوورەتی جودا جودا..

ئـەو ـەپاشـان بـانگی کـردن گشـت ئـەمیر    دانەدانەبیسـتیان چـی ویسـت وەزیـر (۶۵۰)
یـەک بەیـەک دەیکـوت بـەوان میرانـە، جـا    جـێ نشـینم بـەس ئـەتۆی، ئیدیکـە، نـا (۶۵۱)
ئەۆتـەمیری دی، هـەموو تـابیع بـەتۆن    وای دەکـوت عیسـا،کەوان ڕاجیـع بـەتۆن (۶۵۲)
هەر ئـەمیرێک گەرلەفـەرمان دەربچـێ    ئـەو ئەسـیرکە، یانـە، یـا، بـێ سـەربچێ (۶۵۳)
تـ کـو مـاوم تۆمـەڵێ، ئەوهـە، بەکـەس    تـا کـو نـەمرم حـوکمی وا، مەکرەبـەدەس (۶۵۴)
تـکو نـەمرم تۆئـەوە، ئیزهـار، مەکـە    بۆئـەوەوی تـۆ بـێ بەشـا، ئیسـرار، مەکـە (۶۵۵)
بگرەئەوتۆمارەئـــەحکامی مەســـیح    یـەک بەیـەک بـۆ ئوممـەتی بیڵـێ فەسـیح (۶۵۶)
وێـدەکوت ئـەو، بـەو ئەمیرانـەجودا    تـۆی بەتـەنیا نـائبی دینـی خـودا (۶۵۷)
زۆرعـەزیزبوون ئـەو ئەمیرانـەی، لـەلا    ئەوبەهـەموان وەک یـەکی دەسـتووردەدا (۶۵۸)

هەریەکەی تۆ مارەکی ئەو دا، بەدەست / زیدی یەکتربوون لەمەفهووم و، مەبەست (۶۵۹)
بوون هەمووتۆمار لەگەڵ یەک مختەلیف / هەروەکوو شکڵی حرووف (یا)تا(ئەلیف) (۶۶۰)
زیدی یەک بوون حوکمی گشت تۆمارەکان / من لەپێش دا، نەو عی زیدم کرد بەیان (۶۶۱)

### خۆکوشتنی وەزیر دەخەڵوەت دا..

چل شەوی دیکەش دەخەڵوەت دا دەنیشت / خۆی دەکوشت پاشان وەزیری بەد سریشت (۶۶۲)
هەر کەعالەم بوون لەمەرگی باخەبەر / بوو بەمەحشەر، خەڵکی خۆڵیان کرد وەسەر (۶۶۳)
زۆرجەماعەت هاتنەسەرقەبری بەشین / ئێقەدا دڕین موو ڕنین و ڕوو ڕنین (۶۶۴)
نەی دەزانی کەس کەچەندەن، غەیری ڕەب / هەرلەکوردوتورک ڕۆمی، تاعەرەب (۶۶۵)
خاکی قەبری ویان وەسەر کردجوان وپیر / دەردی ویان دی دەردی خۆیان چوو لەبیر (۶۶۶)
ئەوجەماعەت تاکو یەک مانگی ڕەبەق / ئەشکی چاویان، ئەرزی خاکی کرد شەفەق[1] (۶۶۷)

### ویستنی ئوممەتی حەزرەتی عیسا لەفەرمان ڕەوایان کەکامەتان جێ نشینن...

پاشی مانگێک خەڵکی کوتیان کام ئەمیر / ئەی ئەمیران جێ نشینەبۆ وەزیر؟ (۶۶۸)
تا لەجێی وی دا بنیشێ و بێ ئیمام / دەس بەوی بگرین بەدەس بگرێ زیمام (۶۶۹)
چونکەڕۆژ ڕۆی جەرگی ئێمەداغ کرا / ناعیلاجین تا، لەجێی دانێین، چرا (۶۷۰)
چون لەبەرچا ومان نەماوەوسڵی یار / جێ نشینێک، لازمەبۆیادگار (۶۷۱)
گوڵ کەڕۆی،گوڵشەن نەما، وێران، تەواو / کێ دەدا، بۆنی گوڵان؟تەنیا گوڵاو (۶۷۲)
چون بەچاوان ئێمەنابینین خودا / جێ نشینی ئەوخودایەن ئەنبیا (۶۷۳)
ئیشتیبا م کرد نائیبم کوت ئەنبیا / لای مەنووبیان هەر یەکن لێک نین جیا (۶۷۴)
دوون،جودانە، تاکوسووڕەت، بێ لەلات / بوون بەیەک لای وەی لەسووڕەت بووی نەجات (۶۷۵)
تۆدەبینی،گەر دوو چاومان هەن لەسەر / تۆبنۆڕە، نووری چاو،گەردیتەدەر (۶۷۶)
گەرچی چاومان ئاشکرایە دوونە دوو / نووری ئەو دوو چاوە فەرقی هیچ نەبوو (۶۷۷)
گەرلەیەک جێ دابنێی، دوو پێنج چرا / سووڕەتی وان لێک جودانە، ئاشکرا (۶۷۸)
گەر بەدیققەت تۆ بنۆڕی نووری وان / نوور، هەریەک، با چراش بن هەشت و دوان (۶۷۹)
گەر ئەتۆ ببژێری بۆن، سەد سێوو بێ / گەربکوشرێن سەد، دەچێ یەک دیتەجێ (۶۸۰)

---

[1]- ئەرزی خاکی بوو بەئەشکی وان شەفەق (مصرع دوم)

[illegible] قیسمەت وئەعداد، نین ... خۆلەمەعنا تەجزییەو ئەفرادنین (٦٨١)
[illegible] یاردەگەڵ یاران خۆشە ... ڕوو کەمعنا چونکەسووڕەت سەرکەشە (٦٨٢)
[illegible] سەرکەش وەلا بەتۆ، بەڕەنج ... ژێر لەوی وەحدەت دەبینی چەشنی گەنج (٦٨٣)
[illegible] گەر، لوتفی حەق ئەو لادەبا ... کەسرەت و سوو ڕەت، دەداتەدەستی با (٦٨٤)
[illegible] نیشان بەهەرقەلبی، بەسیر ... ئەولەبۆلای خۆدەبا قەلبی، فەقیر (٦٨٥)
[illegible] بووین ئێمەیەک جەوهەر،هەموو ... سەرنەبوو،پێ هەم نەبوو، ئەوسەرهەموو (٦٨٦)
[illegible] ئێمەگەو هەرێک بوو وەک هەتاو ... پاک وخاڵیس ساف وبێ غەش چەشنی ئاو (٦٨٧)
[illegible] خالیس، چونکەهاتەنێوجەسەد ... چەشنی سایەی کۆ نگرە، چا بوون عەدەد (٦٨٨)
[illegible] ەنیق بێنەوخەراکەکۆنگرە ... فەرق ودوویی، تۆلەنێوان، لابەرە (٦٨٩)
[illegible] کوت بێ ئەوەی دڵخوابێ ... زۆردەترسێم گەرکەسێک گومڕابێ (٦٩٠)
[illegible] تیغە، وەک پۆ لایی تیژ ... بێ سپەرتۆ، لا دە، لەو، وەک بایی تیژ (٦٩١)
[illegible] تەتۆلەڕاس شەمشیری وا ... بۆ بڕین خۆ تیغ کەناکا هیچ حەیا (٦٩٢)
[illegible] زیندەم نەکوت لەومەبحەسە ... تا نەفام ئەزیەت نکا، چون نا کەسە (٦٩٣)
[illegible] من، تا تەواو کەم داستان ... لەو وەفادارییەش کەبوویان ڕاستان (٦٩٤)
[illegible] مەرگی ئەو وەزیرە،گشت ئەمیر ... ویستییان یەک جێ نشین بێ بۆ، وەزیر (٦٩٥)

## ئیختیلافی ئەمیران لە جێنشینیدا...

[illegible] ئەمیر هەستاوو ڕا وەستا، لەپێش ... پێشی قەومی با وەفا هەم، دڵ بەئێش (٦٩٦)
[illegible] ئەو، جێ نشینم بۆوەزیر ... حاڵی حازر من لەعیسام موستەنیر (٦٩٧)
[illegible] من ئەئەوتۆمارەبەس ... جێ نشینی ئەو منم نەک هیچ کەس (٦٩٨)
[illegible] ئەمیری دی، دەهات وهەروەها ... بۆخەلافەت وەک وی دەیکرد ئیددیعا (٦٩٩)
[illegible] ئەویش تۆماری خۆی بەو، دا نیشان ... لێک بڕق دا چوون وەکوو دوو مار، ئەوان (٧٠٠)
[illegible] نەی دەدی بەستیان قەتار ... بوو بەدەستیان، تیرو شیری، تا و دار (٧٠١)
[illegible] کەی شیرێک وتۆمارێک،بەدەست ... کەو تنەگیانی یەک وەکوو فیلانی مەست (٧٠٢)
[illegible] ەسیحیان چابوو شەڕبۆجێ ونێو ... سەرئەوەندە،کەوتە، عەرزی بوو، بەکێو (٧٠٣)
[illegible] ەڕاست وچەپ وەکوو سێلاو دەهات ... تۆزبەری تا سمانی گرت وبۆقەلات (٧٠٤)
[illegible] کانی چاندبوونی ئەو وەزیر ... بوو بەئا فەت، بۆ سەرانی گشت ئەمیر (٧٠٥)

هەرکەسێ کوژرا ئەگەر ئیمانی بوو — پاشی کوشتن ڕووحی پاک وجوانی بوو (۷۰۶)
کوشتن ومردن کەنەقشن بۆبەدەن — وەک عو سارەی میوە، سوڕ زاهیر دەکەن (۷۰۷)
ئەوکەسەی هەی بێ کەماڵ،ئاوی هەنار — ئەوکەسەی نەی بێ کەماڵ، هەرنەنگ وعار (۷۰۸)
پاشی مردن با کەماڵ، پەیدا دەبێ — ئەوکەسەی نەی بێ کەماڵ، رسوا دەبێ (۷۰۹)
ڕووکەمەعنا، لا بە، سوورەت ڕاپەڕە — چون لەبۆسوورەت فەقەت مەعنا، پەڕە (۷۱۰)
هاونشینی ئەهلی مەعنا، بە، هەتا — هەم فەتا بی لایقیش بی، بۆعەتا (۷۱۱)
نێو بەدەن گەر نەی بێ گیانی مەعنی دار — وەک دەکالان دا هەبێ، شەمشیری دار (۷۱۲)
زۆربەقیمەت تا لەنێو کالان دەبێ — بێتەدەر ئەو،بەس لەبۆسووتان، دەبێ[1] (۷۱۳)
تۆبەتیغی دار، مەڕۆجەنگ وهەرا — چاک بنۆڕەبانەبێ کارت خەرا (۷۱۴)
تیغ کەدار بوو، نەت هەو ێ، ئەولا بەرە — گەرکوئەلماس بوو بەشادی، پێش وەرە (۷۱۵)
تیغی ڕاستی بەس لەکا رگای ئەولیان — دیتنی وان، بۆ تۆ عەینی کیمیان (۷۱۶)
وا دەڵێن زانا بەبێ شەکک ویەقین — شەخسی زانا ڕەحمەتەن لیلعالەمین[2] (۷۱۷)
گەرهەنا ر دەکڕی ئەتۆ، خەندا نەکەی — تاعەیان بێ بۆت، لەخەندە، دانەکەی (۷۱۸)
خۆش بێ خەندەی ئەو هەنارە چون لەزار — سیرڕوڕازی دڵ، دەکا تن، ئاشکار (۷۱۹)
پێکەنینی لالە، خۆڵی بێ وەسەر — چون لەزاری وی، ڕەشی دڵ دێتەدەر (۷۲۰)
شاد دەبێ باغ،گەرکومیوەی، چاک بێ — پاک دەبی، تۆگەررەفیقت، پاک بێ (۷۲۱)
گەردڵت وەک بەردی خاراو، مەڕمەڕە — هەربەساحەبدڵ، بگا ئەو،گەو هەرە (۷۲۲)
حوببی پاکان تۆ دە نێودڵ، دا بنێ — حووببی غەیری پاک لەدڵ دا، لا بنێ (۷۲۳)
نا ئومێدی جورمەلوتفی، حەق جەلی — تۆبەڕێی ناحەق مەڕۆ زۆرهەن وەلی (۷۲۴)
دڵ ئەتۆ بۆ لایی ئەهلی دڵ، دەبا — تەن، ئەتۆ بۆحەبسی ئا وو گڵ دەبا (۷۲۵)
تەغزییەی دڵ کە، لەکی؟ئاواڵی خۆت — تۆلەخۆشبەخت بتهەوێ ئیقباڵی خۆت (۷۲۶)

**تەعزیمی سفەتی پێغەمبەر(علیەالصلاە والسلام)کە دەئینجیل داباسی کرابوو...**

بوو دەئینجیل ناوی پاکی مستەفا — سەروەری پێغەمبەران، بەحری سەفا (۷۲۷)
بوودەئینجیل باسی شکڵ و ڕەنگی وی — باسی خواردن، باسی ڕۆژو جەنگی وی (۷۲۸)

---

[1]- بێتەدەر گەر، بەس لەبۆسووتان دەبێ (مصرع دوم)
[2]- شەخسی زانا (رحمەللعالمین) (مصرع دوم)

...یەک بوون هەرمەسیحی بۆ سەواب    گەردەیان دی نێوی وی تێدا، کیتاب (٧٢٩)
...ی بەجێ ماچیان دەکرد جا نێوی وی    سەرلەبۆتەعزیمی وی دەکرا، نەوی (٧٣٠)
... گرووهەی نێوی ویان لابوو، عەزیز    دوورلەجەنگ ودوورلەکوشتاروگوریز (٧٣١)
...ری میران و وەزیردووربوو، لەوان    جان پەنای وان نێوی ئەحمەد،بوو کەمان (٧٣٢)
...وو. نەسلی وان بەئەژمارو عەدەد    نووری ئەحمەد بوو بەیاریان هەم مەدەد (٧٣٣)
...ک گرووهی دی مەسیحی، چووک بوو    نێوی ئەحمەدیان گەلێ، پێ سووک بوو (٧٣٤)
... گرووهە، بوون زەلیل و زۆرحەقیر    هەربەئەو فیتنەی کەسازی کرد، وەزیر (٧٣٥)
...ن وحوکمی وان سەراسەرلێک درا    هەربەتۆمار، ئاووری وان، هەڵکرا (٧٣٦)
...ێ ئەحمەد بوو قەڵایەک، زۆرحەسین    چۆنەئا خۆ، زاتی ئەو( ڕووحەلئەمین) (٧٣٧)
...ێ ئەحمەد وەک قەڵایەک مەحکەمە    هەرچی بیڵەم مەن، بەزاتی وی، کەمە (٧٣٨)

## حیکایەتی پاشایەکی دیکەی جوولەکە لەبۆ نابوود کردنی دینی عیسا(ع) تەلا شی دەکرد..

...ی پاشای قاتڵی واکەم نەزیر    گەرسقووتی کرد، لەمەکری ئەو وەزیر (٧٣٩)
...بەکی دی هەرلەنەسلی ئەوجووە    بۆمەسیحی کوشتن ئەو، وەک وی چووە (٧٤٠)
...ی دووهەم چۆن بوو چۆنی کرد خرووج    ڕوو کەسوورەی(والسما ذ ا ت البروج (٧٤١)
...دەتێکی پیسی داناشای یەکەم    شای دووەم وەک وی دەکرد بێ زیادو کەم (٧٤٢)
...کەسێکی عا دەتی پیس، دا بنێ    چوو دەدەریای لەعن و نەفرین، تا بنێ (٧٤٣)
...ک دەمردن پاشەوان سوننەت، دەما    پیس دەمردن پاشەوان لەعنەت، دەما (٧٤٤)
...ی وا پیس هەرکەسێکی لێدەبێ    تا ئەبەد هەرخوڵقی وانی پێدەبێ (٧٤٥)
...قێ وباتڵ ئا وی شیرنەو ئا وی سوێر    حەقق وباتڵ چاوی ساغەو چاوی کوێر (٧٤٦)
...ز ئەوانەی ساڵحن میراتی وان    خوا، بە( اورثنا الکتاب) کردی بەیان (٧٤٧)
...یری شو علەی گەوهەری ئەحمەد نەبێ    چیان نیازبوو عا شقانی حەق؟ دەبێ؟ (٧٤٨)
...نکەشوعلەتابیعن بۆگەوهەران    شوعلەبەدوای گەوهەرانن، چۆن گەڕان (٧٤٩)
...ردەسوورێ نووری ڕۆژێ بێتەژوور    چونکەبورجی ڕۆژ دەگۆڕێ، وایەنوور (٧٥٠)
...رکەسێ مەربووت بەیەک ئەستێرەیە    سەعدەیا نەحسەئەویش بەو گوێرەیە (٧٥١)
...عی گەر زوهرەبێ، ئەوشاد شاد    عیشق وخۆشی و شادمانی بوو مراد (٧٥٢)
...ربێ مرریخی خوێن ڕێژ یاری وی    هەرشەڕوبوختان وفیتنە،کاری وی (٧٥٣)

غـەیری وانـیش زۆرسـتێرەن، نـەک بـەتاق — دوورلەسـەعد ودوور لەنـەحس وئیحتیـراق (٧٥٤)
ئاسـمانی دیـن دەوان دا خـوول دەخـۆن — غـەیری ئـەو حەوتـەی کەمـەعرووفن لـەبۆن (٧٥٥)
دائیمـــەن نـــووری خودایـــان لێـــدەدا — ئیتتیســـال و ئینفیســـا لیـان، لـێ جـــودا (٧٥٦)
هەرکەسـێکی تـا لعـی بـێ لـەو نجـووم — بـەو دەسـوو تـێن کـافران، کـاتی ڕجـووم (٧٥٧)
قـەهری مـرریخ کـوا بەقـەهری خـوا دەگـا؟ — قـەهری مـرریخ بـێ دەوامـەو بـێ بـەقا (٧٥٨)
نـووری پاکـان دوور لەنەقسـەهەم زەوال — ئـەو لـەنێو دوو قـامکی حـەیی لا یـەزال (٧٥٩)
نـووری والـەی ئـەو خـودا یـەدا بەشـەر — هـەرچی سالْح بـوو وەری گـرت، نایەسـەر (٧٦٠)
ئـەولیبا یـان نـووری خوایـان لا هەیـە — پشـت بـەدونیا نـووری وایـان لا هەیـە (٧٦١)
هەرکەسـێکی نـەی بـێ گەرعیشـقی خـودا — ئەو لەفەیزی نوو ر ی حەق بێ بەش کرا (٧٦٢)
هـەرچی جوزئـە، ڕوو بـەکول دەڕوا یـەقین — هـەروەکوو بولبـول بـەگوڵ هـەیتی ئـەوین (٧٦٣)
ڕەنگـێ حـەیوان هـەر لـەزاهیر، ئـا شـکرا — ڕەنگـی ئینسـا ن هەرلـەباتین، دیـارکرا (٧٦٤)
ڕەنگـی پاکـان هـات لەخمخانـەی سـەفا — ڕەنگـی ناپـاک جێـی لەجـەنزاری جـەفا (٧٦٥)
ڕەنگـی خوایـەڕەنگی وا جـوان و لـەتیف — لـەعنی خـوا یـەبۆنی ڕەنگـی وا کەسـیف (٧٦٦)
هـــەرچی ئـــا وی بـــوو لەدەریایـــەجودا — دەچتـــەجێی خـــۆی وایـــەقانوونی خـــودا (٧٦٧)
ئـــاوی شـــاخان ڕوو بـــەدەریا دێتـــەخوار — گیان کەدەرهات دەچتەلای وەحدەت بەغار (٧٦٨)

**حیکایەتی شایەکی دیکەی جوولەکە کە لەبۆ نابوودی دینی عیسا تەلاشی دەکرد...**

**خولاسەی داستان..**

پاشایەکی دیکەی جوولەکە ویستی کە مەسیحییەت و مەسیحیان بە تەواوی نابوود بکا و بەو خاترە ئاگرێکی عەزیمی هەڵکرد و بوتێکی لە قەراغ وی دانا و فەرمانیدا کە هەموو سەجدە بۆ ئەو بوتە بەرن هەر کەس فەرمانی وی ئیتاعەت کردبا، لە ئاگر، نەجاتی دەبوو، دەنا دەئاگری داویشت. مەئموورانی شای زاڵم ژنێکی مەسیحیان دەگەڵ منداڵی ساوای هینا، ژن سەجدەی بۆ بۆ ئەو بوتە نەبرد، بۆ ئەوە کە دایکەکە تەسلیم بکەن منداڵەکەیان دەئاگر هاویشت. هینده‌ی نەمابوو کە ئەو دایکە بە خاتری میهرەبانی و مەحەبیەتی دایکایەتی سەجدە بۆ بوت ببا و منداڵە خۆشەویستەکەی لە داوی هیلاکەت نەجات بدا، بەڵام منداڵ دەنێو ئاگردا بانگی کرد کە ئەی دایە خۆت ڕاگرە چونکە ئاگر کار لە من ناکا، بەڵکەم وەک ئاوێکی سارد وایە وەختێک کە مەسیحیان ئەو قسەیان بیست، وەک پەپوولە خۆیان بە ئاگر دادا و دەچون بۆ نێو ئاگر و

دەنێو ئاگردا دەریایان دەدی کە هیچ زیانیان پێ نەدەگەیشت. شای نەفام زۆر بە قەهر و کین ـنگی ئاگرەکەی کرد کە بۆچی ناسووتێنی؟ بەڵام ئاگر جوابی داوە کە ئەمن مەئمووری خودام نە مەئمووری تۆ، هەر کات بەمن دەستوور بدا کە بسووتێنە جێبەجێ دەسووتێنم و هەرکات بە من دەستوور بدا کە سارد و مولائم بە، فەورەن وا دەبم، دە واقیعدا ئەمن سەگی دەرگای بەروەردگارم، لەبۆ وی دەوەڕم و لەبۆ وی کلک تەکان دەدەم، دەو کاتەدا زبانە و بڵێسەی ئاگر ـۆ لای شا بڵێند بوو و ئەوی دەگەڵ مەئموورەکانی سووتاند.

ـەزجووەی چاو، چۆنی ئینساف لادەنا ئەو لەلای ئاگر بوتێکی دا دەنا (٧٦٩)
ئەوجێ سەجدەی بۆ بتی برد،بووی نەجات ئاگرەجێی ئەوکەسەی سەجدەی نەبات (٧٧٠)
جـون بوتی نەفس، لەو موجازاتی نەدی هەرلەوی ڕا یەک بوتی دی هاتەدی (٧٧١)
ـ یکەنەفست، بۆ بوتانی، بێ ژمار ئەژدەها نەفسە، بوتانی دیکەمار (٧٧٢)
ـە ـ ـۆ ئاسن نەفسە، بوت چی؟ئەو لەهەب ئاو دەسێنێ لەو لەهەب شادی و تەرەب (٧٧٣)
ـەرەوئاسن کەی بەئا و ساکین دەبن؟ ساحیبانی ئەودوو کەی ئا مین دەبن؟ (٧٧٤)
ـوت قوڕاوەبابزانن کوللی کەس مەنبەعیش بۆئەوقوڕاوەنەفسەبەس (٧٧٥)
ـەبوتەی دەس ساز سێلا وی قوڕاو نەفسی بوت ساز کانی ێێکەزۆرپڕاو (٧٧٦)
ـ ـەردێک سەد جەڕان لەت لەت دەکات ئاولەکانی دێت وکەم ناکا چکات (٧٧٧)
ـوت شکاندن سادەیەو ئاسان و سەهل گەرنەفس سادەبزانی جەهلەجەهل (٧٧٨)
ـەرئەبیت وێ سووڕەتی نەفس ئەی جەوان دووزەخی حەو دەرکەبۆی کردی بەیان (٧٧٩)
ـەرنەفس مەکرێک وهەر مەکرێک، لەوان غەرقی کردن زۆرلەفیرعەونی زەمان (٧٨٠)
ـەجودای مووساومووسات، بێ ئومید بانەچێ ئیمان بەفیرعەونی عەنید (٧٨١)
جـی خوداو ئەحمەد، دەڵێن ئەو زیادبکە خۆت لەبووجەهلی بەدەن، ئازاد بکە (٧٨٢)

**وەقسەهاتنی منداڵ دەنێو ئاور دا و تەشویق کردنی خەڵکی بۆ خۆ دە ئاور هاویشتن ...**

ـەو جووە هینای ژنێک منداڵی لا بردیەلای بوت ئاووریش خۆش دایسا (٧٨٣)
ـی ستاند منداڵ و خستیەئاگری ژن دەترسا چۆن کەئیمان ڕاگری (٧٨٤)
ـەی هەویست ژن، تاکو سەجدەی باتە، بوت بانگی کرد منداڵ کە(انی لم امت)[1] (٧٨٥)

---

[1] - دەی هەویست ژن تاکو سەجدەی باتەبوت بانگی کرد منداڵ کە(انی لم امت)

خۆشەجێگام دایەگیان بۆلام وەرە — گەرچی زا هیر جێگەشم نێو ئاوورە (٧٨٦)

نارحیجابەبۆنەفامی بێ وورە — ڕەحمەتە، هاتوەلەبۆن ئەوئاوورە (٧٨٧)

دەی وەرەدایە، ببینەکاری حەق — تا ببینی چۆنەژینی یاری حەق (٧٨٨)

ئاو ببینەزاهیری ئاوور، وەرە — لەو جیهانەی ئا و، بەزاهیر، ئاوورە (٧٨٩)

سیرڕی ئیبراهیم ببینەدا وەرە — تۆ لەنێو ئا وور گوڵی دڵخوا بەرە (٧٩٠)

زۆر دەترسام ئەو دەمەی ئەمنت دەبوو — زۆر دەترسام ئەودەمەی کەوتم لەتوو (٧٩١)

بۆ نەجاتم من لەنێو زیندانی تەنگ — هاتمەدونیای خۆش هەواوخۆش ڕەنگ (٧٩٢)

تەنگەدونیا وەک ڕەحیم ئەلئان لەلام — من لەنێو ئا وور کەدیتم ئەوسەلام (٧٩٣)

دیم کەنێو ئەو ئاگرەیەک عالەمە — یەک بەیەک زەڕڕاتی وی عیسا دەمە (٧٩٤)

ئەو جیهانەی من لەنێویم ئەوحەقە — ئەجیهانەی زاهیری زۆر جێ لەقە (٧٩٥)

تۆ، وەرەدایەبەحەققی دایەتی — چاوکەئاوور، نێتی هیچ گەرمایەتی (٧٩٦)

تۆ، وەرەدایەکەشانست هاتووە — تۆلەنێونار دەوڵەتت بۆچابووە (٧٩٧)

قودرەتی ئەو بەد نیهادت دی، وەرە — تابیبنی قودرەتی خوای لەو سەرە (٧٩٨)

پێت دەکێشم چونکەدەم وێ خۆشی تۆ — من لەخۆشیان لێرەنیمەهۆشی تۆ (٧٩٩)

تۆ، وەرەجا خەڵکی دیکەش بانگ بکە — تۆلەسەر سفرەی خودا، بەربانگ بکە (٨٠٠)

ئەی موسەڵمانان هەمووتان زوو وەرن — خۆش بەڕاستی ئەوهەیە، لەززەت بەرن (٨٠١)

وەرنەئێرەئەی موسەڵما نان بەغار[1] — چون دەنەفعی ئێرەدایە، سەد بەهار (٨٠٢)

بانکی کرد عالەم بەعام نەک تا ق وجووت — لەو نیدایە، غیرەتی عالەم بزووت (٨٠٣)

عالەمیش پاشان هەموو بێ ئیختیار — پیاوو ژن لێکرا دەهاتنەنێو نار (٨٠٤)

بەس بەعیشقی خوا دەچون، نەک زۆری کەس — چون ئەوەی شیرین دەکا تاڵ، خوایەبەس (٨٠٥)

مەنعی خەڵکیان کرد مەئموور، بەسسەبەس — با نەیەن بۆنێو ئاوور، قەت چکەس (٨٠٦)

ڕووسیا بوو هەم خەجاڵەت ئەو جووە — بوو پەشیمان، دی کەئابڕووشی چووە (٨٠٧)

چون بەئیمان زێدەتر عاشق دەبوون — بۆفەنای تەن، زێدەتر سادق دەبوون (٨٠٨)

لەو دەهاڵا مەکری شەیتان خوا شوکر — ڕوو ڕەشی خۆی دی بەچاوان خوا شوکر (٨٠٩)

چەندە ئازار و عەزابی خەڵکی دا — کۆ وەبوو، دەیدا بەوی زاتی خودا (٨١٠)

ئەوکەسەی دەی ویست کەئابڕووی خەڵق با — هەربەدەس خۆی ئابڕووی خۆی، دابەبا[1] (٨١١)

---

[1]- وەرنەنێو ئا وورموسەڵما نان بەغار ( مصرع اول)

**خوار مانەوەی زاری ئەو کابرایەی کە نێوی حەزرەتی موحەممەدی بە مەسخەرە زیکر دەکرد.**

**خولاسەی داستان**

کابرایەک دە زەمانی پێغەمبەریدا(س) نێوی موحەممەدی(ص) بە مەسخەرە و زار خوار کردنەوە زیکر دەکرد. عاقیبەت وای لێهات کە زاری بە خواری مایەوە، لەو کارە ناحەزەی خۆی پەشیمان بۆوە و لە مەحزەری رەسوولی خودا، مەعزەرەتی خواست و تەڵەبی لێبووردنی لێکرد و کوتی ئەمن لە بارەی تۆدا نارەوام کوتووە دەحاڵێکدا، ئەمن لایق بەوەمە کە نارەوام لەبارەدا بکوترێ ئەمن پڕرووییی و بێشەرمیم کردووە، لێم خۆش بە و مەوریدی عقووبەتم قەرار مەدە...

ـی خـوارکرد تـا بەئەحمـەد کـا، قومـار — یـەک نەفـەر ئـەو زار و لێـوی مـاوەخوار (٨١٢)

ـەت وپێیکوت ئەی موحەممەد خۆش بە لێم — ئـەی بـەتۆ،لوتفی خـودا مـن جورمـە، پـێم (٨١٣)

ـ ئـەتۆم کـرد مەسخەرەچون بـووم نـەفام — مـن دەبێ تەسخور کرێم لای خاس و عام (٨١٤)

ـەرخودا،بی وێ کەسـێ ریسـوا بکـا — وادەکـا، پـیس باسـی پیـاوی خـوا بکـا (٨١٥)

ـەوکەسـەی خـوا، بـی هـەوێ ون کـا، سـوڕی — عـەیبی هـیچ کـەس ناڵێ بۆ غـەیرەو کوڕی (٨١٦)

ـەر خـودا بـیوێ کەسـێ یـاری بکـا — وادەکـا ئـەو ،تـاکو زۆر زاری بکـا (٨١٧)

ـۆش بـەحاڵی چـاوێ ئـاوی بـۆ رژانـد — خۆش بـەحاڵی ئـەو دڵـەی خـۆی بـۆ پژانـد (٨١٨)

ـەینـە ئـاخری گریـان و شـین — زۆر موبارەک، ئەوکەسەی بوو، دووایی بین (٨١٩)

ـێ جـاری دەوری دائـم سـەوزو شـین — رەحمـەتن دێـن ئـاوی چـاوان چـین بـەچین (٨٢٠)

ـۆش وەکـوو دۆڵاب بناڵـەوچاو گـرین — تـاکو سـەحنی گیـانی تـۆ بێ سـەوز و شـین (٨٢١)

ـکو رەحـم و پێبکـەن ئێـوە هـەموو — هـەربخۆێنن (ارحمـوا ) تـا (ترحمـوا) (٨٢٢)

**پادشای جوولەکە ئەو ئاوورە سەرزەنیش دەکا...**

ـێ دەکردەئـا ووری، شـا، پێـی د ەووت — بـۆچی تـەبعت وا لەسـووتاندن کـەووت؟ (٨٢٣)

ـۆچی ناسـووتێنی؟ کـوا خاسـییەتت؟ — یـا لەبـەختی ئێمەگۆڕانییـەتت؟ (٨٢٤)

ـۆ لـەتۆ ئاووڕپـەرەسـت، نـایبێ، نـەجات — بۆئـەدی وا، خواپەرەسـت دەرچـوو لـەلات؟ (٨٢٥)

---

- ئەوکەسەی دەی ویست کە ئابڕووی دیکەبا — بەس دەس خۆی ئاوی ڕووی خۆی دا بەبا

هیچ وەخت ئاوور، ئەتۆ سەبرت نییە    بۆچی ناسووتێنی بێژە بۆچییە؟ (۸۲۶)
شەعبەدەم دی، یانەهۆشم چوو، لەپڕ؟    چۆنەناسووتێنی ئاوور، وا، لەگڕ؟ (۸۲۷)
سیمیایەیانەجا دووت لێکرا    یا لەبەختی ئێمەساردیت پێدرا (۸۲۸)
پێیدەکوت ئاگر، ئەمن ئەوئاگرم    بێ یەپێشم من بەتینم دەت گرم (۸۲۹)
تێک نەچوو تەبعم خیسالم گەو هەرم    تیغی خوام دەبڕم بڵێ پێم سەرووەرم (۸۳۰)
پێشی دەرگا چاو سەگانی تورکەمەن    چاپلووسی چۆن لەبۆ میوان دەکەن (۸۳۱)
گەرکوو بڕوا، تاکو بچتەنێو تەلار    سەگ بەوی حەملەی دەکەن دێوانەوار (۸۳۲)
نیم لەسەگ کەمتر ئەمن بۆ بەندەگی    خواش لەتورکێک کەم نییەبۆزیندەگی (۸۳۳)
ئاگری تەبعت کەکردی تۆ غەمین    تین و سۆزی کێ دەدا بەو؟ شاهی دین (۸۳۴)
ئاگری تەبعت ئەگەرشادی دەکا    کێ بەتۆشادی دەدا غەیری خودا؟ (۸۳۵)
خوایەخۆش بەلێم، بڵێ وەختی غەمان    غەم بەئەمری خوایە بوونی یانەمان (۸۳۶)
خوا کە، بیوێ عەینی غەم شادی دەکا    یا ئەساڕەت عەینی ئازادی دەکا (۸۳۷)
باوو خاک وئاوو ئاوور بەندەنە    لای مە مردوون لای خوداوەند زیدەنە (۸۳۸)
مەحزەری خوا، جێی هەمیشەی نوێژی نار    چەشنی عاشق ڕۆژو شەو ئەو بێ قەرار (۸۳۹)
بەردو ئا سن لێک بدەی نار چا دەبێ    هەربەئەمری خوایەنار پەیدادەبێ (۸۴۰)
بەردی نەفس وئاسنی شەهوەت جووت نەبن    چۆن ئەوان تەولیددەکەن وەک پیاووژن (۸۴۱)
بەردو ئاسن عیللەتی ئاوور، بەلام    تۆبنۆڕەژوورتریش ئەی خۆش مەرام (۸۴۲)
عیللەتی ئەسبابی زاهیر، مەعنەوین    بێ سەبەب ئەسبابی زاهیر هیچ نین (۸۴۳)
گەرسەبەب هات ئەنبییای کرد ڕەهبەری    چاکترەئەو زۆر، لەوانەی زاهیری (۸۴۴)
عیللەت و ئەسبابی زاهیر، پەیڕەوون    بۆحەقیقی هەرچی ویستی وەک ئەوون[1] (۸۴۵)
عەقڵەمەحرەم بۆسەبەب زاهیر، کەبێ    بۆحەقیقی مەحرەمی وی کێ؟ نەبێ (۸۴۶)
ئەو سەبەب نێوی لەنێو فارس ڕەسەن    چاکرابۆچاڵی دونیا ئەو بەفەن (۸۴۷)
گەرچەرخ سوو ڕا، دەسوو ڕێ، ئەوڕەسەن    کێ بوو سووڕاندی چەرخ، دادەی بڵەن (۸۴۸)
زۆردەدونیادا سەبەب هەن زۆر زەمان    تۆدەدونیا قەت مەزانەهیچ لەوان (۸۴۹)
خاڵی و حەیران مەبە، تۆمیسلی چەرخ    تا لەبێ مەغزی نەسووتێی چەشنی مەرخ (۸۵۰)
ئەمری حەق بوو گەرکو ناروبا، دەبوون    مەستی عیشقی کردگارو بادە، بوون[1] (۸۵۱)

---

١- گەر سەبەب هات زاهیری بوو، پەیڕەوە    بۆ حەقیقی هەرچی ویستی هەر ئەوە

ـ‌ێ حیلم وناری خەشمیش ئەی جەوان　　هەرلەحەق دێن گەر نەزەرکەی تۆلەوان (٨٥٢)

ـ ئەمری حەق ئەگەر ئاگا نەبا　　بۆچی قەومی عادی ئەو کرد زوو جودا (٨٥٣)

**ـاستانی بای کە دەزەمانی هوود(ع) قەومی عادی نابوودکرد...**

**خولاسەی داستان**

ـەم داستانە بەو جوورە هاتووە؛ هوود و قەومەکەی هاتنە سەحرا، سەرپەنایەکیان بۆخۆیان ـە قوڕ چاکرد، ئەو بایە کە دەگەیشتە وان نەرم و مولایم و شادی هێنەر بوو و ئەگەر ـەگەیشتە قەومی عاد وەها توند و بە شیددەت دەبوو کە وشتری بە سوار و کەژاوە دەفڕاند و ـە ئەعەزیدا دا و نابوودی دەکرد. عورەفا هوود بە نیشانە و مەزهەری تەوحیدی زاتی و ـەسمائی دەزانن و هەر لەبەر ئەوە(ابن عربی) فەسسی دەهەم لەکتێبی بەنرخ و پڕ لە سوودی ـسووس‌الحکم)ی بە نێوی ئەو پێغەمبەرە نام‌گوزاری کردووە چوونکە دەو فەسسەدا ـە ئەحەدییەتی ئەسمائی و سیفاتی و ئەفعالی باس دەکا...

ـوون خەتی کێشا لەدەوری موئمینان　　بۆ شنەبا،گەرگەیشتەئەو مەکان (٨٥٤)

ـەکێکی گەر لەخەت خاریج ببا　　تیکەتیکەگۆشتی وی دەی برد با (٨٥٥)

ـەروەکوو شەیبانی شوان دەوری مەڕان　　جغزی کێشا دەرنەیەن تا بۆگەڕان (٨٥٦)

ـەیەن گو رگان بکەن مەڕ تارو مار　　چونکەجومعان ئەدەچوو بۆنوێژبەغار (٨٥٧)

ـیچ گورگێک قەت نەهاتەنێو خەت　　هیچ مەڕێکیش دەرنەچوو لەو جغزەقەت (٨٥٨)

ـێ حیرسی گورگ و مەڕ، ئەی خۆش نەزەر　　وا دەزینـدانی وەلی دا، دەس بەسەر (٨٥٩)

ـەروەهەبای ئەجەل بۆعارفان　　نەرم وخۆشەوەک نەسیمی یووسفان (٨٦٠)

ـوور ئیبراهیمی هیچ ئا زار، نەدا　　چۆنی ئازار دا کەبوو دۆستی خودا؟ (٨٦١)

ـێ ئەهووەت بێ زەرەر بۆ، ئەهلی دین　　غەیری وانی برد هەتا قەعری زەمین (٨٦٢)

ـەوجی دەریا چۆن لەژێر ئەمری خودا　　ئەهلی مووساو ئەهلی قیبتی کرد جودا (٨٦٣)

ـک بەبۆقاڕوون کەئەمری پێ گەیی　　خۆیو تەخت و گەنجی بردەبن زەوی (٨٦٤)

ـەرگەیشتەنێو قوڕێ عیسا دەمی　　بوو، بەتەیرێک هەڵفڕی هەرئەو، دەمی (٨٦٥)

ـێرەتەسبیحت بوخاری ئاووگڵ　　بۆمەلی جەننەت لەسافی و سیدقی دڵ (٨٦٦)

---

- مەست و خۆشی عیشقی خواو و بادە بوون (مصرع دوم)

کێوی تـوور دی، نـووری مووسا هاتـەڕەقس | بـوو، بەسـۆفی کامیـل و دووربـوو لەنـەقس (۸۶۷)
کێـو ببێتەسـۆفی کامیـل هـیچ عەجـەب | جیسـمی مووساشـی لـەخۆڵ چـاکرد ڕەب (۸۶۸)

**تەنز و ئینکارکردنی پاشای جوولەکە و قەبووڵ نەکردنی نەسیحەتی دۆستانی نیزیکی خۆی...**

شـا کـەدیتی ئەوهـەموو کـاری عـەجیب | زێـدەکردی تـەنز و ئینکـاری غـەریب (۸۶۹)
ناسیحان پـێ یـان دەکـوت ئیـدی بەسـە | بەسـکەئینکارکردنی ئەومەبحەسـە (۸۷۰)
ناسـیحانی دەستەبەستەخسـتەبەند | زوڵمـی زۆرکـرد چـەن بـەرا بەرچەنـد چەنـد (۸۷۱)
کـار کەگەییـەئێرەبانگی بۆدەهـات | ئـەی خەباسـەت قـەهری ئێمەهاتـەلات (۸۷۲)
چـل گـەزان ئـا وور لەپاشـان چۆحـەوا | دەوری جـوانی گـرت وسـووتان یـەک نـەما (۸۷۳)
ئەسـڵی وان ئـاووربوو ئـەووەڵ بۆیـەوا | چـوون لـەبۆلای ئەسڵی خۆیـان بـوو هـەوا (۸۷۴)
ئەوگرووهـە هەرلـەئاوور چـابیوون | عاقیبـەت جـوزء، ڕوو بـەکول بـوو ڕێ نمـوون (۸۷۵)
ئاوورێـک بـوون بەودەسـووتان موءمنـان | عاقیبـەت سـووتان بـەوی خۆیـان نـەمان (۸۷۶)
ئەوکەسـەی بـوو(امەالهاویـە)[1] | هاویـەبۆی بـوو، بەجێگەوزاویـە (۸۷۷)
دایکـی منـداڵ قـەت لەبـەر وی ناسـرەوێ | وایـەقانوون ئەسـڵ فـەرعی خـۆی دەوێ (۸۷۸)
ئـا وی حەوزێ،گـەرچی ئـەو زیندانییـە | بـا دەبـا ئەوچونکەئـەو، ئەرکانییـە (۸۷۹)
ئـاو، لەزینـدان دەردەهێنـێ کـەم کەمـە | ئـەودەبا، بـۆ مەعـدەنی خـۆی، ئـەو دەمـە (۸۸۰)
هـەر وەهایەئـەو هەناسـەش بۆگییـان | کـەم کەمـەدەدزی لەزینـدانی جیهـان (۸۸۱)
تا سعوود کا بچتـە لای خـوا لـەفزی پاک | کوێی لە بۆ دیاری کرا، ئەو چاک چاک (۸۸۲)
نەفسـی پـاکن بێـت، لاێ حـەق، جێـی مەیـە | ڕۆژی مەحشـەر ئێمەمەسـتین لـەو مەیـە[2] (۸۸۳)
جالەپاشـان دێ لـەبۆن، پاداشـی زیکـر | چەنـد بـەرا بـەر، ئێمەنـەن بـووهیچ، فیکـر (۸۸۴)
پێن دەڵێ حـەق زێدەکـەن زیکـری خـودای | تـاکو زێـدەن پـێ بـدا، لـەو هـەی کـەدای (۸۸۵)
چونکەچۆسـەر زیکـر، ڕەحمـەت دێتـەخوار | زیکـری خـوا کـە، دائیمـەن نـەک جاروبـار (۸۸۶)
ڕووحی ئینسان دەی وێ جێیەک بەو سیفەت | چێشـتبی ئـەو، لـەو مەکانـە، مەعریفـەت (۸۸۷)

---

[1]- هەرکەسێکی ئەسڵی وی بوو هاویە( مصرع اول)

[2]- دیاری ئێمەڕۆژی مەحشەرئەوهەیە(مصرع دوم)

هەر کەسەی چاوی لەجێیەک کردووە        چون زەمانێک لەعززەتی لەو، بردووە (٨٨٨)
ـەیلی جینسی هەربەجینسە زۆر عەیان        مەیلی جوزئی هەربەکوللەئەی جەوان (٨٨٩)
ـا. لەگەڵ جینسێک وەهابێ سازگار        گەیەئەوجینس، بێ بەجوز ئی نادیار (٨٩٠)
جینسی ئێمەنینەدیارە، نان و ئا و        بوو ن بەجینس وزێدەیان کردووینە، چاو[1] (٨٩١)
جینسی ئێمەنینەدیارەئاوو نان        پاشی خواردن بوون بەجینسی مە، ئەوان (٨٩٢)
جینسی ئێمەغەیری جینسی خۆی بوێ        یا شەبیهی جینسی خۆی ئەو دەس کەوێ (٨٩٣)
جینسەکی کەبوو شەبیە، ئەو عاریەت        عاریەت نیتی، دەوا م و عاقیبەت (٨٩٤)
گەرتەیر وەدوای،سەفیرو دەنگ، کەووت        جینسی خۆی ئەو گەر نەدی کردی ڕەووت (٨٩٥)
ـەخسی تینوو گەربچێ بەدوای سەراب        گەرگەیشتێ، هەڵدێ دەی وێ، ئەو شەراب (٨٩٦)
گەرگەدا، شادەبەزێڕی بێ عەیار        گەرمەحەک هات ئەودەبێ غەمبار وزار (٨٩٧)
تۆنەبێ گومڕا بەزێڕی بێ عەیار        تۆلەڕێی ڕاست لا نەدا قەت فیکری خوار (٨٩٨)
چاکی نووسیوەکەلیلەئەو مەبەست        ئەویخوێنەتامەبەستت بێتەدەست[2] (٨٩٩)

**بەیان کردنی تەوەککول و پێشنیهادکردنی وەحشیان بە شێر کە جەهد و تەلاش نەکا..**

**خولاسەی داستان**

لە مێرگ و مێرغوزارێکی سەرسەبز و باسەفا، وەحشیان دەناز و نیعمەتدا دەژیان ئەمما شێرێک لەو دەور و بەرە بوو کە ژیانی وانی تاڵ کردبوو، ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو حەیوانانە لە دەورەی یەک کۆبوونەوە و چوونەلای شێر و پێیان کوت ئەی پادشا ئەتۆ، هەموو ڕۆژێ بەزەحمەتێکی زۆر یەکێک لە ئێمە ڕاو دەکەی و ئێمە هەمیشە دەترس و لەرز داینە و ئەتۆش دە ڕەنج و تەلاش. ئەلئان بە تۆ پێشنیهاد دەکەێن کە هەموو ڕۆژێ بەقەیدی قورعە یەکێک لە حەیوانان لەنێو خۆمان هەڵدەبژێرین و بۆ تۆی دەنێرین تا ببێتە خۆراکی تۆ، بەو کارە هەم ئێمە ئاسوودە دەبین هەم ئەتۆش لە ڕەنج و عەزابی ڕاو ئاسوودە دەبی. وەحشیەکان پاشی ئەو قەول و قەرارە بە تەعەههودی خۆیان وەفایان کرد، تاکو ڕۆژێک قورعە بە نێوی کەروێشک دەرهات. ئەو لە دۆستانی خۆی ویست کە کەمێک وەدرەنگی بخەن، تا فێڵێک بەکار بێنێ و بۆ هەمیشە هەموویان لە شەڕڕی شێر ڕاحەت بکا. ئەوان قەبووڵیان کرد جا

[1]- هەروەک ئاو و نان کەجینسی ئێمەنین        بوون بەجینسی مە و بەوان دوو زیاد دەبین

[2]- ئەو بخوێنە تاکوو بەهرەت بێتەدەست (مصرع دوم)

ئەوجار کەروێشک زۆر بە ئارامی و لەسەرخۆ، لەلانەی شێر نیزیک بۆوە دیتی کە زۆر توورەیە و لەبۆ مەعزەرەت ویستن کوتی ئەی پادشا ئەمن کەروێشکێکم بۆ هێنابووی، لە ڕێگادا شێرێکی دیکە لێی وەرگرتم و بردی، شێر کە ئەوهەی بیست زۆر پەشۆکا و ئاڵۆز بوو و لە کەروێشکەکەی ویست کە بیباتە جێی ئەو شێرە تەجاوەزکارە. عاقیبەت شێرەکەی بردە سەربیرێک. شێر وەختێک کە لە بیرەکەی نۆڕی، عەکسی خۆی دەئاودا دی و پێی وابوو کە شێری ڕاستییە لەوێیە. جا لە پاشان فەورەن خۆی دەبیرەکە هاویشت تا دەگەڵ شێر بە شەڕبێ کە دەنەتیجەدا شێرەکە دەبیردا خنکا.

عیددەیەک وەحشی لەجێ یەک سەبزەزار | بوون لەترسی شێری وێ غەمباروزار | ۹۰۰
هێندی خواردن شێرلەوان ڕۆژو شەوان | بۆجەهەننەم ئەولەوەڕگە، بۆئەوان | ۹۰۱
هاتنەلای شێرودەیان کوت وا بەشێر | خۆدەبێ دائم لەئێمەتۆ بێ تێر | ۹۰۲
غەیری جیرەی خۆت لەبۆڕاوێ مەیە | تا لەئێمەتاڵ نەبێ ئەو سەوزەیە | ۹۰۳

**جواب دانەوەی شێر بە وحووش و فائیدەی تەلاش...**

پێی کوتن ئەو،باشەگەرنەوبێ چ فێڵ | دیو مە، دیمەن ساف و، باتین زێدەلێڵ | ۹۰۴
من هیلاکی کارو فێڵی عالەمم | مارو دوپشک، زۆ ر ببوونەهاودەمم | ۹۰۵
دوژمنێکی زۆر قەوی من نەفسی خۆم | پیسترینی دوژمنانەئەو لەبۆم | ۹۰۶
بیستی گوێم ( لایلدغ المومنین) کەئەو | قەولی پێغەمبەربەگیان ودڵ نەخەو | ۹۰۷

**تەرجیح دانی وەحشیان تەوەککول لەسەر تەلاش..**

گشتی کوتیان ئەی حەکیمی باخەبەر | ئیحتییات سوودی نییەهیچ لای قەدەر | ۹۰۸
ئیحتییات سوودی هەبێ، شووروشەرە | هەرتەوەککول چاکە، بیکەبێ زەرە | ۹۰۹
گەڵ قەزا تۆ، قەت نەکەی دەعوا بکەی | چون یەقەت دەگرێ قەزا گەروا، بکەی | ۹۱۰
تۆ دەبێ بمری لەحاستی حوکمی حەق | تا نەیەت قەت بۆ تۆ قەهری خوای فەلەق | ۹۱۱

**تەرجیح دانی شێر کۆشش وتەلاش لەسەر تەوەککول وتەسلیم...**

شێرکوتی باش، گەر تەوەککول ڕەهبەرە | خۆتەلاشیش سوننەتی پێغەمبەرە | ۹۱۲
ئەی موسەڵمان، وای دەکوت پێغەمبەرت | گەڵ تەوەککول تۆببەستە، وشترت | ۹۱۳
ڕەمزی (الکاسب حبیب اللّە) ببێ | جا بەبێ کۆشش تەوەککول کوا دەبێ؟ | ۹۱۴

### تەرجیح دانی حەیوانات تەوەککول لەسەرتەلاش وکۆشش...

حـەڵکی کوتیـان کارنیشـانەی زەعفـی خـەڵق　　تـا پەیاکـەن لوقمـەنانێک پـڕ بەحـەڵق (٩١٥)

ـیچ کەسـێک وەک تـەوەککول چـا نییـە　　چەشـنی تەسـلیم بـاش، دەدونیـادا نییـە (٩١٦)

ـەبـەردەرد چوونـەلای دەردو بـەڵا　　زۆر لەبەرمار،چوونـەزاری ئـەژدەها (٩١٧)

ـیـن لەبۆئینسـانی فێـڵ بـاز بووبـەداو　　هـەر لـەبۆخۆی کەوتـەداوو بـوو بـەڕاو (٩١٨)

ـرکـی بەسـت ودوژمنیشـی بوولـەماڵ　　وابـوو فێڵـی فیرعـەوون، ئـەی بـا کـەماڵ (٩١٩)

ـەدهەزاران زێـدەتر کوشـتی منـاڵ　　تاپـەیا کـا ئەوکەسـەی گـەڵ وی، لـەماڵ (٩٢٠)

ـوێن نەخۆشـن چـاوی ئێمـەو چـاوی تـۆ　　تـۆ دەچـاوی دۆسـت فـەنا کـەچاوی خـۆ (٩٢١)

ـۆی وی بۆچـاوی مـە(نعـم العـوض )　　تـۆ بـەچاوی وی دەبینـی گشـت غـەرەز (٩٢٢)

ـکو منـداڵ پێـی نـەگرت وڕێ نـەڕۆی　　نەی بووئەسپێ غـەیری ئەستۆی بابی خۆی (٩٢٣)

ـێی کـەگرت و قـودرەتی ئەوهاتەدەست　　ڕەنج ومیحنەت دەرکی خۆشیان لەودەبەست (٩٢٤)

ـینی خـەڵکی پـێش لـەبوونی دەست وپێ　　هـەم وەفایـان هـەم سـەفایان بـوو بـەجێ (٩٢٥)

ـتی ئـەمریان پـێ کـرا تـا بێنـەخوار　　خەشم وحیرس وخۆشی لێیان بوون بەبار (٩٢٦)

ـاڵ ومنـداڵی خودانەوشـیرخواه　　دەی کـوت (الخلـق عیـال لـلالاه) (٩٢٧)

ـەخودایـەی لەوسـەما، بـاران بـدا　　سـەهلەبۆوی گـەر بەڕەحمـەت نـان بـدا (٩٢٨)

### دەبارەی تەرجیح دانی شێر تەلاش و کۆشش لە سەر تەوەککول...

ـێرکوتی باشـەبەلام خـوای بەنـدەگان　　خـۆی، لـەژێرپێی دادەنـاین یـەک نـەردەبان (٩٢٩)

ـەپلەتابەرەوسـەربان بچـین　　لێـرەدا ڕێگـا لەبۆجـەبری چنـین (٩٣٠)

ـۆکـەپێت سـاغەلەبۆخۆت لـەنگ دەکـەی　　دیارەدەستت خۆت لـەبۆبێ چـەنگ دەکەی؟ (٩٣١)

ـەر مـەڕەی، ئاغـا وەدەسـتی، بەنـدەدا　　دیارەمەتڵـەب، بـێ بـەیان و بـێ ئـەدا (٩٣٢)

ـێک مەڕەو، بێڵ، دەس ئیشا ڕەی زاتی وی　　فکـری دوارۆژ، ئـەمری خـوای بـا لا ونـەوی (٩٣٣)

ـەربـەدڵ بـت وێ ئیشـاراتی خـودا　　بەوئیشـارات بـا وەفـابی و گیـان فیـدا (٩٣٤)

ـەو نیشـانی تـۆدەدا ئەسـرا ری خـۆ　　هـەم لەسـەر تـۆ لا دەبـا، ئـەو، بـاری تـۆ (٩٣٥)

ـیلێـک دێ، تۆدەکـا مـەحموولی خـۆ　　قابلێـک دێ تۆدەکـا مـەقبوولی خـۆ (٩٣٦)

جـا بەئـەمری حـەق ئـەتۆ، قابیـل دەبـی　　وەسڵی ویت ویست، تۆ بەوی واسیل دەبی[1] (۳۷

سـەعیی شـوکری نیعمـەتی وی قـود رەتـە　　جـەبری بوونـت ناشـکوری بەونیعمەتـە[2] (۳۸

شـوکری قـودرەت، قـودرەتی تۆزیـاد دەکـا　　جـەبری نیعمـەت نیعمـەتت بـەرِ بـاد دەکـا (۳۹

جـەبری تـۆ نوسـتن، لـەرِێ گـادا، مـەنوو　　تانـــەبینی ئـــەودەرودەرگا، مـــەنوو (۴۰

جـەبری بـۆچی تـۆ دەنـووی لێرەولـەوێ؟　　بالــەژێر داری بــەریت خــەو لێکــەوێ (۴۱

تاتـــەکان دا بـــا، لـــک ودارو بـــەری　　بـــا برێـــژێ میوەبـــا، دەورو بـــەری (۴۲

جەبر،نوسـتن بـوو، لـەلای کـی؟رێ گـران　　تـەیری بێ بـاڵ کـەنگێ دەی بێتن، ئـەمان (۴۳

گەرئیشـارەی خـوا ببینـی وەک خەسـان　　وادەزانـــن تۆکەســـی زۆر نـــا کەســـان (۴۴

ئەوکەمەعەقڵـەش، لەسـەرتۆ، دەچتـەدەر　　ســەرکەعەقڵی پــێ نەما،کلکــە، نەســەر (۴۵

ناسپاســـی چونکەبووهەرنـــەنگ وعـــار　　ئـــەودەباتن ناســـپاس تاقـــەعری نـــار (۴۶

هەردەگـەڵ کـار، خۆتـەوەککول دێ بـەکار　　تـــۆو بچێنـــەتۆ، ئومێـــدبێ کردگـــار (۴۷

**دووبارە تەرجیح دانی وەحشییان تەوەککول لە سەر کۆشش و تەلاش...**

وەحشـــییان دەنگیـــان هـــەڵێنا پێکـــەوە　　بـۆ سـەبەب بـێ کـارە؟ دادەی، وێکـەوە (۴۸

ســـەدهەزاران زێـــدەبۆچی پیـــاو ژن؟　　بوو سەبەب، ئەمما لەژین بێ بەش دەبن؟ (۴۹

ســـەدهەزاران زێـــدە، قـــەرنیش ڕادەبـــرد　　زۆرلەئەشـخاس مـەکرو فێڵیـان زۆردەکـرد (۵۰

شەخســـی زانـــا مـــەکروفێڵی وای دەکـــرد　　کێـوی هەڵقەنـدو لـەجێی خـۆی لا دەبـرد (۵۱

وەسـفی مـەکری وانـی واکـرد زولجـەلال　　(لتـــــزول منـــــەاقلال الجبـــــال ) (۵۲

غـەیری ئـەو قیسـمەت کـەخواکردی دیـار　　نـــەی تـــوانی زێـــدەکا، ئـــەو ڕاوو کـــار (۵۳

خـەڵکی دیتیـان چـوو هـەدەر تـەکبیرو کـار　　مـــا بەتـــەنها کـــارو حـــوکمی کردگـــار (۵۴

کەســـب وکـــار، نێوونیشـــانە، هەرشـــیعار　　هەرخـــەیا ڵ و وەهمەئیـــدی هـــیچ کـــار (۵۵

[1]- ئەودەمە، قەولت دەبێ قەولی خودا　　بەو دەگەی ، جا نابی قەت تۆ لەوجودا

[2]- جەبری بوونت ناسپا سی نیعمەتە(مصرع دوم)

**تەماشا کردنی عیزرائیل لە پیاوێک و هەڵاتنی ئەو پیاوە بۆ بارەگای سولەیمان و ئیسباتی تەرجیح دانی تەوەککول لە سەر تەلاش و کۆشش و کەم بوونی قازانجی کار و تەلاش...**

**خولاسەی داستان**

ڕۆژێک وەختی چێشتان پیاوێک هاتە بارەگای سولەیمانی نەبی دەحاڵێکدا کە لە ترسان ڕەنگی چرژابوو. سولەیمان(ع) لێی پرسی بۆچی وا پەشۆکاوی؟ پیاوەکە جوابی داوە ئەلئان کە دەهاتم عیزرائیلم دی کە زۆربەتووڕەیی تەماشای منی کرد. سولەیمان(ع) کوتی: ئەلئان چت لە من دەوێ؟ ئایا ئەمن کارێکم لە دەست دێ؟ پیاوەکە کوتی بە با دەستوور بدە کە ئەمن هەڵگرێ بمباتە جێگایەکی دوور لە هیندوستان بەڵکەم عیزرائیل نەتوانێ بێتەوێ و گیانم بگری سولەیمان(ع) دەستووری بەبا دا کە ئەو پیاوە بەپەلە بۆ هیندوستان ببە، ڕۆژی دوایە وەختێک کە حەزرەتی سولەیمان ئیجازەی ملاقاتی بە خەڵکیدا عیزرائیل هاتە بارەگای حەزرەتی سولەیمان ڕووی لە عیزرائیل کرد و پێی‌کوت بۆچی بە تووڕەیی تەماشای ئەو پیاوەت کرد؟ مەگەر دەت ویست کە ئەوی لەمردن بترسێنی و ئاوارەی هیندوستانی بکەی؟ عیزرائیل کوتی بە خودا ئەمن بەتووڕەیی تەماشای ئەو پیاوەم نەکرد، بەڵکەم لەڕووی تەعەججوب و سەرسوڕمان تەماشای ویم کرد، چونکە خوداوەند بەمنی دەستوور دابوو کە گیانی ئەو پیاوە هەر ئەورۆ لە هیندوستان بکێشم، ئەمنیش لەو مەوزووعە سەرم سوڕمابوو کە چۆن مومکینە ئەورۆ ئەو پیاوە خۆی بگەیەنیتە هیندوسان. بە خۆم کوت ئەگەر سەدباڵیشی هەبێ ناتوانی ئەورۆ خۆی بگەیەنیتە هیندوستان، بەڵام وەختێک کەخۆم گەیاندە هیندوستان دیتم کە ئەو پیاوە لەوێیە، جا، هەر لەوێ ڕووحم کێشا جا کەوابوو دیارە کە تەقدیر لە تەکبیر باڵاترە..

پیاودکی باش وەختی چێشتان هات بەغار    لای سولەیمان شاو نەبی پەر وەردگار (٩٥٦)
ئەو لەترسان لێو کەبوود بوو ڕەنگ زەرد    جا، سولەیمان لێیدەپرسی، چیتەدەرد؟ (٩٥٧)
پێیکوت عیزرائیل منی وا کرد غەمین    چونکەنۆڕی لێم بەقەهرو زۆر بەکین (٩٥٨)
پێیدەکوت پێت خۆشەئەلئان چۆن ببا    ئەو کوتی دەستوور بەبا دەمن ببا[1] (٩٥٩)
تا کوهیندوستان ئەمن با هەڵگری    بەڵکەگیانم بێ سەلا مەت، نەی گری (٩٦٠)
بۆیەمەنفووربوو فقرلای عامی خەڵق    چونکەلوقمەی حیرسەویستیان پڕ بەحەڵق (٩٦١)

---

[1] - ئەوکوتی دەستوور دەبا بێ من ببا (مصرع دوم)

ترسی فەقری بۆمیسال وەک ئەو هەراس — حیرس وکۆشش چەشنی هیندوستان بناس (٩٦٢)
وای بەبا دەستووردەدا، جا ئەو چەلە — ئەوبەهیندوستان ببە، زوو کەپەلە (٩٦٣)
رۆژی دوایەکاتی باری عام درا — وای بەعیزرائیل دەکوت شا ئا شکرا (٩٦٤)
لەوموسەڵمانەت لەبۆنۆری بەقەهر؟ — تاکوژینی تاڵ ببێ لێی بێ بەژەهر (٩٦٥)
ئەوکوتی من کەی بەقەهرم کرد نەزەر؟ — من سەرم سوڕ ما کەدیتم لەوگوزەر (٩٦٦)
خوا بەمن دەستووری دا ئەوڕۆ ئەتۆ[1] — بگرەگیانی وی لەهیندوستان، بڕۆ (٩٦٧)
من کوتم گەر هەی بێ باڵ و پەڕ، سەدان — دوورەئەوڕۆ گەربگا، هیندوستان (٩٦٨)
کاری دونیا،هەرهەموویان وەک یەکە — تۆقیاسی کاری دیکەش لەوبکە (٩٦٩)
غەیرەمومکین گرلەبەر خۆمان هەڵێین — یا لەحەق بدزین و ناحەق بەوبڵێین[3] (٩٧٠)

**دووبارە تەرجیح دانی شێر، کۆشش و تەلاش لە سەر تەوەککول و بەیان کردنی قازانجی کۆشش و تەلاش.**

شێر کوتی باشە، ڕەوایە خۆ بەڵام — ئەنبیا و موئمین تەلاشیان کرد تەمام (٩٧١)
ئەنبیا هەم، موءمنان کردیان تەلاش — خوا بەوانی دانەتیجەی زێدەباش (٩٧٢)
کاری وان دائم هەموو یان بوون لەتیف — هەرچی بیکاتن زەریف ئەو بوو زەریف (٩٧٣)
تەیری گەردوونی دەکەوتەداوی وان — نەقسی وانیان لا دەبرد، تیبقی زەمان (٩٧٤)
تۆسەباتت بێ لەکۆشش وەک چییا — بەس لەڕێگای ئەنبیاوو ئەولیا (٩٧٥)
گەڵ قەزا شەڕ ئیشتیبایە، نەک جیهاد — چونکە جەهدیش هەر قەزا دای مە، بەداد (٩٧٦)
کافرم من گەر لەڕێی دین یەک نەفەر — تاکو ئەڵئان کردبێتی هیچ زەرەر (٩٧٧)
بۆ دەبەستی تۆ سەرت؟ ئێشی نییە — کارە جەوهەر، پەندە، ئی پێشینییە[4] (٩٧٨)
جێی خەراپی ویست ئەوەی دونیای دەویست — حاڵی خۆشی ویست ئەوی عوقبای دەویست (٩٧٩)
چارەجۆیی کەسبی دونیا، نا بەحەق — چارەجۆیی تەرکی دونیا، مستەحەق (٩٨٠)

---

[1]- خوا بەمن دەستووری دا ئەوڕۆ کە، تۆ (مصرع اول)

[3]- گەر لەبەرخۆمان هەڵێین هەرزۆر محاڵ — گەر لەحەق بدزین لەبۆمان دێ وەباڵ

[4]- خۆ سەرت ساغە لەبۆ دەی بەستی تۆ؟ — هەر بەکارە شادی دێتەدەستی تۆ

چارەواباشــــەکەزیندان کـــــون بکـــا نـــەک ببەســـتێ ئەکونـــەو ڕێ ون بکـــا (٩٨١)
ئێمـــە زینـــدانین لـــە دونیـــادا، ئـــەتۆ کـون بکـە زینـدان نـەجات دە، زووکـە خـۆ (٩٨٢)
حـوببی دونیـا، یـەعنی غافـڵ بـوون لـە حـەق نـەک ژن و منـداڵ و زێـڕ و پـووڵی شـەق (٩٨٣)
مـاڵی دونیـا گـەر لـەڕێی دیـن دا بـبێ (نعـم مـال صـالح ) پێیکـوت نـەبی (٩٨٤)
ئـاو دەکەشـتی دا هیلاکـی کەشـتییە ئـا و لـەژێر کەشـتی لـەبۆوی پشـتییە (٩٨٥)
چونکـەحوببی مـاڵ لەقـەلبی دەرکـەووت ئەوسـولەیمان هەربـەخۆی مسـکین ئـەووت (٩٨٦)
گـۆزە گـەر ئـاوی نـەبێ و بەسـرا، دەوی دێتـە سـەرئـاو گـەر دە دەریایـەش کـەوی (٩٨٧)
دڵ هـەوای دەروێشـی گەرتێـدا دەبـێ جێـی لەسـەر ئـاوی جیهـان بۆچـا، دەبـێ (٩٨٨)
گەرچـی دونیـا هـەر هـەمووی مـوڵکی وییـە خـۆ لـەلای چـاوی دڵـی وی هـیچ نییـە (٩٨٩)
چـاک ببەسـتە زاری دڵ نـەی بـێ چ کـون تـۆ پـڕی کـە، ئـەو بـەبای دێ (مـن لـدن) (٩٩٠)
هەرسـێ حـەقێن دەردو دەرمـان و تـەلاش مـونکیریش جەحدی بەجەهدەنەک بـەلاش (٩٩١)

**سابیت بوونی تەرجیح دانی جەهد لەسەر تەوەککول...**

لەودەلیلانـەی دەکـوت شـێر زۆر، ئـەوان چونکە جەبری بوون لە جوابدان دا دەمان (٩٩٢)
چەقەڵ وکەروێشـک و ڕێـوی هـەم غـەزال جـەبریان لانـا هـەموو، هـەم قیـل وقـال (٩٩٣)
شـێرو وەحشـی بەسـتییان عەهـدو قـەرار عەهدوپـەیمان بەرقـەرار بـێ وپـا یـەدار (٩٩٤)
سـەهمی هـەرڕۆژێک بـەبێ دەر دو جـەفا بـێ لـەبۆوی تیبقـی(العهـد وفـا)[1] (٩٩٥)
هەرکەسـێکی قورعەبـەر وی،کـەوتبا ئـەودەبوو چـوو بـا لەبۆشـێر چەشـنی بـا (٩٩٦)
وای دەکوت کەروێشکی نۆبەی بەرکەووت زۆری تـا کـەی،تا کـو لێـوان، سـەرکەووت (٩٩٧)

**بە خەراب زانینی وحووش، درەنگ چوونی کەروێشک بۆ لای شێر...**

وەحشـــی کوتیـــان زۆر لەمێژەئێمـــەوا بەس لـەڕێی عەهدو وەفا بووین گیان فیدا (٩٩٨)
تـا کـو بـەد نـاوت نـەکردووین زوو بچـوو تـاکو شـێر لـێن توورەنـەبوە، زوو کـەزوو (٩٩٩)

**جوابی کەروێشک بە وەحشیان...**

پێیکـوتن مۆڵـەت بـدەن یـاران بـەمن تابـەفێڵم مـن نـەجات دەم هـەرچی بـن (١٠٠٠)

---

[1]- بێ تەقازا بێ لەبۆی وەختی غەزا (مصرع دوم)

تابـــەفێلم گیـــانی ئێـــوە، دەم، نـــەجات     تـــا ئیـــرس بـــێ بـــۆ ئـــەوەی کەدوایـــەهات (۱۰۰۱)
هەرپەیەمبـــــــەر، هەرکەهاتەنێوخـــــــەڵق     ئوممـــەتی خـــۆی ڕێنمـــوو نـــی کـــرد بەحـــەق (۱۰۰۲)
ئـــەو لەئاســـمان دیتبـــووی ڕێگـــەی نـــەجات     چەشـــنی ڕەشکێنەی لـــەچاو، بـــەرچاو، دەهات (۱۰۰۳)
چووکـــەوەک ڕەشـــکێنەبوو لای خـــەڵقی دی     گـــەورەیی ڕەشـــکێنەخۆ کـــەس نـــەی دەدی (۱۰۰۴)

**ئیراد گرتنی وەحشیان لە قسەکانی کەروێشک...**

وەحشـــی کوتیـــان بگرەگـــۆی تـــۆ، ئـــەی نـــەفام     تۆنەڵـــەی زیـــاتر لـــەخۆت، قـــەت هـــیچ کـــەلام (۱۰۰۵)
فکـــــــــری وا بێهوودە،گەورەترلـــــــــەتۆ     نـــەی دەکـــرد تـــۆ، بـــۆچی کـــردت ســـەربەخۆ؟ (۱۰۰۶)
خودپەســـــەندی، یانـــــەبۆن دێتـــــی قـــــەزا     ئـــەی دەنـــا بـــۆچی دەبـــی بـــەو هـــەی ڕەزا؟ (۱۰۰۷)

**جواب دانەوەی کەروێشک بە وەحشیان...**

پێیکـــوتن، حـــەق، وای بـــەمن ئیلهـــام کـــرد     بـــۆ زەعیـــف، فکـــری قـــەوی ئینعـــام کـــرد (۱۰۰۸)
چاو ئەوەی حەق فێری مێش هەنگوینی کرد     کـــا مەشـــێر بوو،کـــاری وا ڕەنگینـــی کـــرد (۱۰۰۹)
پـــڕ لەهـــەنگوین، چـــەن هـــەزارماڵ چـــا، دەکـــا     لێی وەکـــرد حـــەق، دەرکـــی دانیش، وا، دەکا[1] (۱۰۱۰)
وای بـــەکرمی پیلـــەفێرکرد خـــوا هونـــەر     کامـــەفیل بـــوو لەوهونـــەردەربێنێ ســـەر؟[2] (۱۰۱۱)
ئـــا دەمـــی خـــاکی کەحـــەق دانـــایی کـــرد     تـــا لەحەوتـــەم ئاســـمان ئاگـــایی کـــرد (۱۰۱۲)
ســـەرنەوی بـــوون جـــا لەڕاســـتی وی مەلـــەک     ئـــەو، بـــەکوێری چـــاوی ئەوهـــەی کەوتەشـــەک (۱۰۱۳)
زاهیـــدێکی چـــەن هەزارســـاڵ خـــوای پەرســـت     خـــوا لـــەبۆی دەم بێـــن، چاکرد دووری خست (۱۰۱۴)
تـــا لـــەعیلمی دیـــن نـــەبێ ئـــا گـــا و ڕەشـــید     تانەســـووڕێ ئەولـــەلای قەســـری مەشـــید (۱۰۱۵)
بووبـــەدەم بـــێن عیلمـــی حـــیس بۆســـاحەبی     تـــاکو لـــەو عیلمـــی بلێنـــد پاراونـــەبی (۱۰۱۶)
گەوهـــــەرێکی دادەنـــــا دڵمـــــان خـــــودا     ئـــەو بـــەدەریا هـــەم بەئـــەفلا کـــێ، نـــەدا (۱۰۱۷)
ســـووڕەتی زاهیـــر وەلانـــێ، تـــا کـــو کـــەی     تـــۆ لەمـــەعنی گیـــانی خـــۆت خـــاڵی دەکـــەی؟ (۱۰۱۸)
گەربەشـــەرئەوبێ،کەدەی کـــەی تۆنـــەزەر     ئەحمەدوبوجـــەهل هـــەردووک بـــوون بەشـــەر (۱۰۱۹)
نەقشـــی دیوارخۆبەچەشـــنی ئـــا دەمـــە     تۆلەســـووڕەت چـــاک بنـــۆڕەچی کەمـــە؟ (۱۰۲۰)
گیـــانی کـــەم، ئەوسووڕەتی نەخشین و جـــوان     تۆیـــەیا کە،گەوهـــەری کـــەمیابی گیـــان (۱۰۲۱)

---

[1] - دەرکی عیلمی لێ وەکرد حەق وا دەکا (مصرع دوم)

[2] - هەرچی فیل بوو لەو هونەر، بوو بێ خەبەر (مصرع دوم)

شێر دەدونیا دا هەمووبوون خوارو پەست     گەرسەگی ئەسحابی کاف وای هاتەدەست (١٠٢٢)
کام زیا ن بۆساحەبی نەقشی نەفوور     دێ کەگیانی غەرقی بەحرێک بێ،لەنوور؟ (١٠٢٣)
یوسفی سوورەت غەیرەمومکین لای قەڵەم     عالم وعادڵ لەبۆوی بوون عەلەم (١٠٢٤)
مەعنەوینەعالم وعادڵ هەموو     جێ ومەکان وپاش وپێشیان بۆ نەبوو (١٠٢٥)
تێکێ داوێ سەربەدەن لای لا مەکان     خۆفەلەک جێی نابێ لێی بێ ڕۆژی گیان (١٠٢٦)

## زیکرکردنی عیلم و دانیشی کەروێشک و بەیانی فەزیلەت و مەنافعی عیلم و دانیش...

ئەو قسانەنیانەپایان ئەی ڕەفیق     باسی کەروێشک گوێ دەیەتۆ، زۆردەقیق (١٠٢٧)
لابەگوێی کەرگوێیەکی دی بێنەسەر     کوا دەفامێ ئەو وتانەگوێی کەر؟ (١٠٢٨)
چاو لەکەروێشک و لەفێڵی چاو چاو     چۆنی شێر گرت چۆنی شێربرد خستەداو (١٠٢٩)
خاتەمی مولکی سولەیمان عیلمەعیلم     بۆجیهانی سوورەتی،گیان عیلمەعیلم (١٠٣٠)
بەس بەدانیش بۆ ئەسیری ئادەمی     خەڵقی بەحرو شاخ و دەشت ونێو چەمی (١٠٣١)
جەشنی مشکێ لەو دەترسێن شێر وبەبر     هەر لەبەر وی، بۆ نەهەنگ دەریایە قەبر (١٠٣٢)
هەر لەبەر وی، ون لەچاو بوون، دێو، پەری     تاکو هەریەک توانی گیانی دەربەری (١٠٣٣)
دوژمنی ئینسان گەلێکن، نادیار     عاقڵ ئەو کەس بوو کەبوو پەرهیزکار (١٠٣٤)
هەم شەیاتین هەم فریشتە، پیس و پاک     دێننەنێو دڵ وەسوەسەو ئەفکاری چاک (١٠٣٥)
گەر بچی نێو جۆگە، تۆ بۆ غوسڵی تەن     گەردرووپەک بێ، لەنێو ئاو چۆ بەدەن (١٠٣٦)
با درووی نێوئاوبچووک بێ و نادیار     بچێتەتەن گەر، بۆدەبێ ئەو ئا شکار؟ (١٠٣٧)
ئەوپەرێشانیەی لەوەحی و، وەسوەوەسە     باعیسی وی، زۆرکەسن نەک، یەک کەسە (١٠٣٨)
حەوسەلەت بێ تاحەواست بێ عیوەز     تا ببینی وان و، بێتەجێ غەرەز (١٠٣٩)
تۆدەزانی ئەودەمە، چیت کردووە     کێت وەلانا کێ پەنات، بۆبردووە (١٠٤٠)

## دەبارەی ویستنی وحووش لەکەروێشک سیڕو فکری وی...

یانی کوتیان وەحشی ئەی کەروێشکی چوست     بۆن بەیان کەفەهم و دەرکی خۆت دروست (١٠٤١)
تۆدەگەڵ شێردیارەگەردەعوادەکەی     بۆن بەیان کەفکری خۆت، چۆن وادەکەی؟ (١٠٤٢)
دەرک وفەهم وهۆش دەکا، زیاد مەشوەرەت     کۆمەکی عەقڵن عقوولیش سەد کەرەت (١٠٤٣)
وەی دەکوت ئەحمەد بە ئێمە هەر بکەن     مەشوەرەت ( المستشار موءتمن) (١٠٤٤)

## مەنع کردنی کەروێشک ڕاز و سیڕڕی خۆی لەوان ...

ئەوکوتی ڕاز، نابێ بکرێن ئاشکار — چون لەجێی یەک، تاق وجووت دێن جارو بار (١٠٤٥)
گەرلەڕووی پاکی بڵەی تۆ، ڕازی خۆ — زوودەبی غەمگین لەتۆ، دەمسازی تۆ (١٠٤٦)
بۆبەیانی سێ شتان لێو لێک مەدە — زێڕومەزهەب سێهەمیشیان مەقسەدە (١٠٤٧)
زۆرەدوژمن بۆئەوان سێ، دوژمنیش — دێتەبۆسە، منتەزیر، بۆکوشتنیش (١٠٤٨)
گەربەیەک یادوونەفەربێڵەی تەواو — هەرسوڕێک تێپەڕلەدوو بوو، بوو بڵاو (١٠٤٩)
گەردووسێ مەل تۆببەستی پێکەوە — تۆلەعەرزیان دابنێ، جا، ویکەوە (١٠٥٠)
چۆن دەکەن سەر بەستەگەڵ ێێک مەشوەڕەت — ڕێ لەخەڵکی ون دەکەن ئەووەڵ کەڕەت (١٠٥١)
مەشوەڕەت سەربەستەبوو کردی نەبی — جوابی وەرگرت بێ وە،کەس ئاگابیی (١٠٥٢)
نێو میسال دەی کردمەڕامی خۆی، زهوور — تاکودوژمن بێ لەمەتڵەب زۆر، بەدوور (١٠٥٣)
جوابی خۆی ئەو، وەردەگرت زیمنی میسال — دوژمنیش حاڵی نەبوو چی بوو سوئال (١٠٥٤)

## داستانی مەکر و فێڵی کەروێشک...

ساعەتێک کەروێشک لەچوون،کردی درەنگ — جالەپاشان ڕێ کەووت لای شێری جەنگ (١٠٥٥)
چون غەزای شێر چوو لەبۆلا ی شێردێر — نارەتەی تێکەڵ بەپێکۆڵ کرد شێر (١٠٥٦)
پێیدەکوت من زوو کوتم کە خوێریە، پیاو — سستەقەولی، عەهدو پەیمان نا تەواو (١٠٥٧)
فێڵی وان نەی هێشت بەمەتلووبم بگەم — دای فریووم چەرخی گەردوون دەمبەدەم (١٠٥٨)
تێدەماجا،ئەوئەمیری بێ شعوور — نەیدەدی چون پاش وپێشی خۆی، بەنوور (١٠٥٩)
ڕێگەساف و، وا لەژێر وی زێدەداو — هەروەکوو خاڵین لەمەعنی زێدەناو (١٠٦٠)
لەفزو ناو، هەر دوو، وەکوداون، ئەوان — ڕەڵمی ئاوی عومری ئێمە، لەفزی جوان (١٠٦١)
ئەو فلان ڕەڵمەی کەئا و،لێیدەرکەووت — زوو پەیای کە،گەر ئەووت تۆبەرکەووت (١٠٦٢)
مەنبەعی حیکمەت دەبێ، حیکمەت تەڵەب — نابێ محتاج ئەو بەتەحسیل و سەبەب (١٠٦٣)
هەر دەبێتەلەوحی مەحفووزشەخسی چاک — عەقلی وی دەگرێ رزق لای ڕووحی پاک (١٠٦٤)
عەقڵەبۆئینسان موعەللیم، ئەو وەڵێ — عەقڵەبۆشاگردی وی پاشان، بەڵێ (١٠٦٥)
عەقڵ، وەک جەبریل دەڵێ ئەی ئەحمەدا — بچمەپێش کەم، ئاگرم تێ بەردەدا (١٠٦٦)
تۆ ئەمن لێرەبهێڵەجا، بڕۆ — حەددی من هەئێرەیەتەنها بڕۆ (١٠٦٧)
هەرکەسێک تەنبەڵ بوو نەی کرد شوکرو سەبر — هەرئەوەی پێدەکرێ بگرێ لاقی جەبر (١٠٦٨)

خۆی نەخۆش کرد هەرچی جەبری خوازەئەو ... بەو نەخۆشیەجێی لەگۆر،بۆسازەئەو (١٠٦٩)
خۆت نەخۆشکەی، دێ بەدووی دا، دەردوغەم ... تا کو دەمری، وای پەیەمبەرکوت بەجەم (١٠٧٠)
جەبر، یەعنی بەستنی ئەشیای شکاو ... یانەوەسڵی ئەو ڕەگەی بوو بێ، پساو (١٠٧١)
تۆ لەخۆت چون نەت شکاند لەوڕێگەیێ ... بۆدەبەستی پێت و، خەندەت دێ بەکێ؟ (١٠٧٢)
هەرچی لەو ڕێ پێی شکا هەم خوا ر بوو ... خوا لەبۆی نارد بوڕاق و،سوار بوو (١٠٧٣)
حەملی دینی کردو مەحموول دوایەبوو ... قابلی فەرمان و، مەقبووڵ دوایەبوو (١٠٧٤)
تاکو ئەلئان بۆی دەهات فەرمان لەشاە ... ئێستەئەوفەرمان دەدا بۆسەرسپاە (١٠٧٥)
تا بەحاڵ ئەستێرەدەیکرد لەوئەسەر ... بۆستێران ئێستەمیرە ئەو لەسەر (١٠٧٦)
گەرکو موشکیل بۆتۆبێتەپێش نەزەر ... دیارەشەککی تۆ، لە(انشق القمر) (١٠٧٧)
تازەکەئیمان، بەدڵ نەک هەر زەبان ... تۆ هەوای تازەت کەدانا نێو گییان (١٠٧٨)
گەرهەوابێ تازە، ئیمان ژێر گڵە ... ئەوهەوایەقفڵی دەروازەی دڵە (١٠٧٩)
بۆهەوات تەئویل کرد تۆ حەرفی بیکر ... خۆتکەتەئویل تۆ چکارت دا بەزیکر (١٠٨٠)
تۆدەکەی تەئویلی قورئان بۆهەوا ... مەعنی ئەسڵی ویت، لەدەسدا چوو حەوا (١٠٨١)

## تەئویلی ناڕەوا و ناحەزی مێش...

مێش لەسەریەک چیلکەکاوو، میزی کەر ... چەشنی کەشتیبان هەڵی هینا بوو سەر (١٠٨٢)
مێش کوتی پێم کەشتیەو دەریایە، من ... زۆرلەمێژەفکری والەم، لایە، من (١٠٨٣)
چاو لەدەریا چاو لەکەشتی چاولەمن ... ئەهلی ڕای و،کەشتیوان،کەشتیم لەبن (١٠٨٤)
ێنی خوڕی قایق لەسەر دەریایە، مێش ... زیاد لەحەددی گەورەئەوبۆ، هاتەپێش (١٠٨٥)
**خۆلەلای مێش نیتی هیچ حەد، میزی کەر ... چاوی حەق بین لازمە، بەو کا، نەزەر** (١٠٨٦)
**حیسسی مێش تەعیین دەکا دونیایی وی ... حیسسی مێش تەعیین دەکا دەریایی وی** (١٠٨٧)
گەربەنا حەق هەرکەسێ تەئویل کا ... مێشە، وەهمی میزی کەر، تەسویر، کا (١٠٨٨)
گەربەمەیلێ خۆی نەکا تەئویل، مێش ... بەو هوما ی خۆشی دەبێ تەبدیل، مێش (١٠٨٩)
هەرچی وا تیژبین ببێ، ئەو مێش نییە ... ڕووحی خاریج سووڕەتە، سوو ڕەت چییە؟ (١٠٩٠)

## نارەتەی شێر لە درەنگ هاتنی کەرویشک...

هەروەکوو کەروێشک کەشێری کرد هیلاک ... کوانێ قەددی ئەودەبێ، وەک ڕووحی پاک؟ (١٠٩١)
شێر بەقەڵسی و، تووڕەیی دەیکوت منم ... هەرلەڕێی گوێ، بەستی چاووم، دوژمنم (١٠٩٢)

فکری جەبریان بوومنی خستەدەداو — تیغی داریان زامی خستمە نێو هەناو (١٠٩٣)
من لەوەی پاش نابێ فێڵی وان بێژم — دەنگی غوول ودێوە، دەنگیان دێتەگوێم (١٠٩٤)
ئەی دڵهەڵیان درە، جا، وا وەرە — غەیری پێست نین، پێستەکەشیان، لابەرە (١٠٩٥)
پێست یانی ئەو وتانەی ڕەنگ بەڕەنگ — نەقشی سەرئاون، دەچن زوو، نەک درەنگ (١٠٩٦)
هەر چی لەفزەپێستە، مەعنی کاکڵە — نەقشە لەفز و، مەعنی گیانی کامڵە (١٠٩٧)
عەیب پۆشەپێست لەبۆکاکڵی خەراب — کاکڵی باشی خوا، لەچاوان کرد غیاب (١٠٩٨)
گەرلەئاو دەفتەر، قەڵەم چابێ لەبا — هەرچی بینووسێ، دەبێ فەو ڕەن فەنا (١٠٩٩)
گەرلەنەقشی ئا و، بت وێ تۆ دەوام — هەربەحەسرەت دەیگەزی دەستت، مودام (١١٠٠)
با دەخەڵکی دا هەوایەوئارەزوو — بێ هەوا بۆی دێ پەیامی حەق بەزوو (١١٠١)
چەندەخۆشن جا، پەیامی کردگار — چون لەئەووەڵ تا کوئاخر پایەدار (١١٠٢)
قەولی شایان وەک مەقامیان بێ دەوام — ئەنبیا قەول ومەقامیان مستەدام (١١٠٣)
چونکەشایان دای بەوان قودرەت هەوا — ئەنبیایان دای بەوان قودرەت خودا (١١٠٤)
نێوی شایان جێی لەسەرپووڵ ودراو — نێوی ئەحمەد جێ لەنێو دڵ پێ دراو (١١٠٥)
نێوی ئەحمەد نێوی جوملەی ئەنبیا — سەدکەهات نابێ نەوەت، قەت لەوجیبا (١١٠٦)

**هەروەها دووبارە بەیان کردنی مەکر و فێڵی کەروێشک...**

زۆرلەچوون کەروێشک، خۆی تەءخیرکرد — ئەودەگەڵ خۆی مەکری خۆی تەقریرکرد (١١٠٧)
پاشی زۆرتەئخیرتوند چوو ئەو، بەگوڕ — تابەگوێی شێر ڕا گەیێنی یەک دوو سوڕ (١١٠٨)
چاو کەچەندەگەورەیەدونیایی عەقڵ — چاو چپان وبێ بنەدەریایی عەقڵ (١١٠٩)
سووڕەتی مە، وا دەدەریای زاتی حەق — وەک لەسەرئا وێ بچێ، توندتوند تەبەق (١١١٠)
تا نەبوو پڕ، هەر لەسەر دەریایەما — غەرقی دەریابووکەئەو، پڕ بوو لەما (١١١١)
نادیارەعەقڵ و، زاهیر عالەمێ — سووڕەتی مە، مەوجی یەم، یا لەو نەمێ (١١١٢)
هەرچی سووڕەت بێ، وەسیلەجووردەکا — بەو وەسیلەیەم لەخۆی زۆر دووردەکا (١١١٣)
تا نەبینێ دڵ ئەوەێ ڕازان دەدا — تا دەلایل ڕوون نەبێ بۆیان خودا (١١١٤)
توند دەچووبەدوای ئەسپ ئەسپیش لەبن — وای دەزانی ئەسپی بن خۆی لێبووەون (١١١٥)
وای دەزانی ئەسپەکەی وی، ون بووە — ئەسپەکەی وی توند ئەوی، هەڵگرتووە (١١١٦)
دادوفەریادی دەکرد ئەو دڵ پەرێش — تاپەیا کائەسپەکەی خۆی دڵ بەئێش (١١١٧)

کێ دزی لێم ئەسپەکەم،کوا کێ بووکێ؟ ئەی ئە وەت چیە،کاکەگیان ژێر ڕان و پێ (١١١٨)
ئاریێ ئەسپت ئەوهەیەکوا ئەسپەکە؟ تۆهەبێ هوشت لەوی، زوو بەس بکە (١١١٩)
گیان لەبەرنیزیکیەون بوو، لەچاو تۆش وەکوو خوم، لێوئیشک و زگ پڕاو (١١٢٠)
کەی دەبینی سەوزوبۆروسوور،ئەتۆ؟ تانەبینی پێش ئەوان سێ، نوور،ئەتۆ (١١٢١)
چون دەرەنگان ون بوو بیرو هۆشی تۆ ڕەنگ هەموو،بۆنووردەبوون، ڕووپۆشی تۆ (١١٢٢)
چون دەشەودا هەر چی ڕەنگەنادیار وادیا رە نووردەکا ڕەنگ ئاشکار (١١٢٣)
نوورئەگەرزاهیرنەبێ، ڕەنگ نادیار دێ لەبۆ ڕەنگی خەیاڵ، مەعنی بەکار (١١٢٤)
نووری زاهیر دێ لەڕۆژێ، یاسوها نووری مەعنی دێ، لەئەنواری عولا (١١٢٥)
نووری چاوان دێ لەنوری دڵ تەواو نووری دڵ سەرچاوەیەبۆنووری چاو (١١٢٦)
مەنشەئی نووری دڵیش نووری خودا ئەولەنووری عەقڵ وحیس پاک وجودا (١١٢٧)
چون دەشەودا نوورنییەڕەنگت نەدی جا بەزیددی نوور نووربۆت دێ وەدی (١١٢٨)
نووربەعیس تا ببینی ڕەنگ ئەتۆ زیددی نوورەڕەنگ، دەزانی سەربەخۆ (١١٢٩)
بۆیەبۆمەی چادەکردخوا دەردو غەم تا بەزید خۆش بێ دڵن، تەن بێ ئەلەم (١١٣٠)
نادیاران هەربەزیددان، بوون دیار نادیا رە، چونکەبێ زید کردگار (١١٣١)
چون لەئەووەڵ نووردەبینی دوایەڕەنگ زیدبەزید پەیدا دەبێ وەک ڕۆم وزەنگ (١١٣٢)
جا، دەناسی تۆبەزیددی نوور، نوور زید بەزید مەعلووم دەبێ وەختی زهوور (١١٣٣)
**زید لەبۆنووری خودا دەس ناکەوی تا بەزید پەیدا بکەی تۆزاتی وی** (١١٣٤)
لاجەرەم چاومان لەدیتنی وی بەدوور (وهویدرک ) چاولەمووسا وکێوی توور (١١٣٥)
شێرەسوورەت مەعنی بۆ وی بیشەیە بیر، لەبۆدەنگ و قسان وەک ڕیشەیە (١١٣٦)
دەنگ و گوفتاردێن لەفکروبیر، بەس بەحری بیر جێگای نەبوو مەعلووم، لەکەس (١١٣٧)
کاتێ مەوجی ئەوقسانەت دی، لەتیف بەحرێ وی بۆت ئاشکرایەهەم شەریف (١١٣٨)
چونکەمەوجی بیر لەدانیش ڕا دەهات ئەو بەدەنگ ولەفزی، سوورەت کرد خەڵات (١١٣٩)
جا، لەلەفز، سوورەت دروست بوو دوایەمرد مەوج،خۆی تێکەڵ بەدەریایەدەکرد (١١٤٠)
هەرلەبێ سوورەت بوو سوورەت هاتەدی جارەکی دیش دەچتەوەبۆلایی وی (١١٤١)
جا، هەموودەم بۆتۆمەرگ و رجعەتێک مستەفا فەرموویە، دنیا ساعەتێک (١١٤٢)
بیری ئێمەتیری خوایەلەو حەوا لەوحەوا، نامێنێ دەچتەلای خودا (١١٤٣)
لەحزەلەحزە، ئەوجیهانەبوو نووێ بێ خەبەر ئێمەین کەنا بینین جووێ (١١٤٤)

عـــومر، دەڕواتـــازەدێ، وەک جۆگــەئاو | وەک ئەبـــەد بۆنێوجەســەد، بینرابــەچاو (١١٤٥)
تونـــد کەدەڕوادێتەبــەرچاو وەک ئەبـــەد | هــەروەکووپۆلوێک بســووڕێ زیــاد لەحــەد (١١٤٦)
گەرسـەری دار ئاوری گـرت و دات تـەکان | دێتەبەرچاوخــەتتی مومتــەد، ئــەی فــلان (١١٤٧)
تـوولی مـوددەت، بـەس بـەچاوی ئا دەمـە | نـەک لـەلای وەی خـەڵقی کـرد ئەوعالەمـە (١١٤٨)
کــوانێ دانـــا، لەوســـوڕەهیچ تێـــدەگا؟ | هەرحیسـا مـەددین، ئـەویش نامـەی خـودا (١١٤٩)

## هاتنی کەروێشک بۆلای شێر و تووڕە بوونی شێر لەوی...

شــێر، لەقەڵســی ئــاگرێکی بــەربوو، تــێ | دیتــی کەروێشــکیش لــەدوور ڕا، والــە، دێ (١١٥٠)
ئەوبــەبێ تــرس ولــەرز هەڵــدێ لــەڕێ | زۆربەتونــدی زۆربــەتیژی و تــووڕەدێ[1] (١١٥١)
چـون بـەترس ولـەرز هـاتن، جێـی گومـان | لادەبـــا شـــک، هـــاتنی وەک قارەمـــان (١١٥٢)
هەرکـــە گەییـــە ئاســـتانە و بارەگـــا | بـانگی کـرد شـێر ناخەلـەف ئـەی بێ حـەیا (١١٥٣)
مـن کـەزۆرم گـا دڕیـن، وەختـی غـەزەب | مـن کـەزۆرم فیلـی نێـر کـردن، ئـەدەب (١١٥٤)
چووکـە کەروێشـکێک چییـە گـەرکو ئـەوا | ئـەمری مـن فـەرمانی مـن ژێـر پـێ بـدا؟ (١١٥٥)
تـۆ خـەوی کەروێشـک و غەفڵـەت لابـەرە | نارەتـەی شـێر گـوێ دەیـە تـۆ، ئـەی کـەرە (١١٥٦)

## مەعزەرەت کوتنی کەروێشک...

پێیدەکوت کەروێشک ئەمان عوزرم هەیە | تۆلــەدەریای بەخشیشــت عــەفووم دەیــە (١١٥٧)
شێرکوتی بـەو عـوزری چـی؟ دا دەی نـەفام | ئێســـتەوەختەوا درەنـــگ تۆدێـــەلام؟ (١١٥٨)
بەوخیلافـــەت چاکـــەببڕن ئەوســـەرەت | خۆلەئەحمـــەق نـــابێ ببێـــن مـــەعزەرەت (١١٥٩)
عــوزری ئەحمــەق زۆرلــەجورمی پیســـترە | عــوزری ئەحمــەق زەهــری عیلمــە، ئــاگرە (١١٦٠)
دوورلــەعیلم وعەقڵــەعوزری تــۆ، لــەبۆم | هێندەکـــــــەرنیم،تافریوی تۆبخـــــــۆم (١١٦١)
دەیکـوت ئـەی شـا تۆمـەڵێ ئەوچووکەیـە | عـوزری مـەزلوومی وەکـوو مـن گـوێ دەیـە (١١٦٢)
خاســـەبۆخاتری زەکـاتی جـاهی خـۆت | دەرمەکـــە، گومڕالەبـــەردەرگاهی خـــۆت (١١٦٣)
چاولـــەدەریا، ئـــاوی هـــەر جـــۆ، لادەنـــێ | هەرخـەس وخاشـاک، لەسەرسـەر، دادەنـێ (١١٦٤)
نـــابێ دەریـــا کـــەم کـــەکردی ئەوکـــەرەم | خۆبەبەخشـــیش نـــابێ دەریـــا زیادوکـــەم (١١٦٥)
شێرکوتی من وەختی خۆی، بەخشیش دەکەم | مـن کـراس دەبـڕم بەقـەد، بـێ زیادوکـەم (١١٦٦)

---

[1]- ئەوبەبێ ترس و لەرز هەڵدێت و دێ    زۆر بەتیژی و توند و تووڕە، گەیێەجێ

پێیدەکوت ببێ کەنەی بێ، جێی لوتف     دادەنێم سەر، پێشی ئەژدیهای عونف[1] (١١٦٧)

وەختی چێشتان من دەهاتم چەشنی با     گەڵ ڕەفیقم تاکو بێینەلای شا (١١٦٨)

بۆتۆ یەک کەروێشکی دیکەم پێ هەبوو     ناردیانین بۆتۆ و ەحشی دوو بەدوو (١١٦٩)

کاتێ هاتین شێرەکی دین هاتەڕێ     ویستی بگرێ ئێمە، هەردووک جێ بەجێ (١١٧٠)

من کوتم بۆشاهی شاهان چیاکرین     ئێمەهەردوو بۆوی عەبد و نۆ کەرین (١١٧١)

پێی کوتم ئەو شاهی شاهان کامەکەس؟     تۆلەلای من لەو وتانەبەسکەبەس (١١٧٢)

من ئەلێرەئێوەهەردوو لەت دەکەم     دوایەبۆخۆم شایەکەت بۆیەت دەکەم[2] (١١٧٣)

پێم دەکوت تۆلێم گەڕێ تا جارێ دی     دەچمەلای شا، بەودەڵێم هەرچیم کەدی[3] (١١٧٤)

پێی کوتم دۆستت گرەو، دانێ لەلام     گەر نە، قوربانی دەبی تۆ، یەک کەلام (١١٧٥)

زۆر بەبێ سوودی لەبەر پاڕامەوە     دۆستمتی ئەستاندم بەتەنیا مامەوە (١١٧٦)

دۆستی من بوو سێ ئەوەندەی من کەهەم     هەم بەلوتف وخوڵق وخووی و تەن بەجەم (١١٧٧)

ئەزەشێربەستی لەمە، ڕێگایی مە     هەڵوەشا پەیمانەکەو سەودایی، مە (١١٧٨)

تازەجیرەت قەت نەیەت بۆنێو خەیاڵ     پێت دەڵەم حەق گەرچی حەقیش تاڵەتاڵ (١١٧٩)

گەر ئەتۆجیرەت دەوێ ڕێ پاک کەوە     شێر لەڕێگا لابەرە، لێی ڕاکەوە (١١٨٠)

**جواب دانەوەی شێر بە کەروێشک و ڕێکەوتن دەگەڵ وی ...**

شێر کوتی یاڵڵەوەرە، دا کویەجێی؟     پێش کەوەتۆ، پێم نیشا ن دەجێی وڕێی (١١٨١)

ئەویش و سەد وەکوو ویش کەم ئەدەب     گەردرۆ کەی بۆعەزابت خۆت سەبەب (١١٨٢)

ڕێ کەوت ئەو وەک قەڕاووڵ کەوتەپێش     تابباشێرئەولەبۆجێی دەردو ئێش (١١٨٣)

چوو بەرەوبیرێک گەلێک قووڵ وبەئاو     بیری قووڵی کردبوو، بۆشێر بەداو (١١٨٤)

شێر وکەروێشک، هەردووچوون نیزیکی بیر     ئاوی بن کای پێ دەڵێن کەروێشکی ژێر (١١٨٥)

ئاودەباتەدەشت دەگەڵ خۆی پووشکەکا     زۆرعەجەب کا، ئەوچلۆن کێوێک دەبا (١١٨٦)

مەکری وی بوو واکەشێری خستەداو     چووکەکەروێشکێک،کەشێری کرد ڕاو (١١٨٧)

مووسییەک فیرعەون دەباتەڕوودی نیل     دەیکوژێ بەوخۆی ولەشکر زۆر زەلیل (١١٨٨)

---

[1] - پێی دەکوت ببێ کەنەی بێ جێێ ڕەحم     دادەنێم سەر،تاکو، بۆتۆبیمەلەحم

[2] - تۆو ڕەفیق وشایەکەت دەدڕم ئەمن     داوی ژینی ئێوەهەڵدەبڕم ئەمن

[3] - بچمەلای شا، بەو بڵەم هەرچیم کەدی (مصرع دوم)

مێشەکۆرێک چۆن دەکا، نەمروود هیلاک | چۆن سەری لێ لەت دەکا، بێ ترس وباک (١١٨٩)
چاولەوەی کردی بەدوژمن ئیعتیبار | چاو لەوەی کەگەرحەسوودی بوو بەیار (١١٩٠)
چاو لەفیرعەون،گوێ دەدا هامانی ئەو | چاو لەنەمروود گوێ دەدا شەیتانی ئەو (١١٩١)
گەرچی دوژمن پێت بڵێ وەک دۆستان | بۆت جەهەننەم چادەکا، نەک بۆستان[1] (١١٩٢)
گەرکوقەندت پێ بدا، لات بێ بەژەهر | گەرکو لوتفت پێ بکا، لا ت بێ بەقەهر (١١٩٣)
گەرقەزا هات چاوی حەق بین کوێر، دەبێ | هەردەبینێ زاهیری و بێ خێر، دەبێ (١١٩٤)
گەروەهات لێ هات ئەتۆ زاری بکە | زیکرونالەورۆژو، بۆباری بکە[2] (١١٩٥)
تۆبەناڵین بێژەئەی دانای نیهان | تۆلەبەردی مەکری پیس بم دەئەمان (١١٩٦)
بأ بەدیش بم مەن لەدەرگا لامەنێ | تۆلەبۆمە، شێر لەبۆسە، دا مەنێ (١١٩٧)
سووڕەتی ئا وور بەئاوی خۆش مەدە | سووڕەتی ئاوێ بەئا وور تۆش مەدە (١١٩٨)
لەوشەڕابی قەهر چۆن مەستی دەدەی؟[3] | زۆربەنەبوان سووڕەتی هەستی دەدەی (١١٩٩)
مەستی یەعنی چاو نەبینێ هیچ حەق | پەشمی لا وەک یەشم و ، گەوهەر بەردی ڕەق (١٢٠٠)
مەستی یەعنی حیس لەحەق بێ بەش کراو | دارەگەز وەک دارەسەندەڵ، بێتەچاو[1] (١٢٠١)

**داستانی هودهود و سولەیمان لە بارەی ئەوەدا کە ئەگەر قەزا بێت چاوی ڕوون و تیژبین دەبەسترێت...**

**خولاسەی داستان**

لە بیابانەکی کە سەراپەردەی حەزرەتی سولەیمانی لێ هەڵدرا بوو، تەواوی پەڕەندان بە حزووری وی شەڕەفیاب بوون. هەر یەک لە پەڕەندان لە حزووری ئەو پێغەمبەرە شەریفە لەبارەی هونەر و کارزانی و لێهاتوویی خۆی کەمێکی دەکوت. لازم بە زیکرە کە ئەو تەعریف و مەدحە بەخاتری خۆ بەزل زانین نەبوو تاکو نۆبە گەیشتە هودهود و کوتی هونەری مەن ئەوهەیە کە لە بڵیندایی ئاسمانڕا ئاوەکانی بن عەرزی دەبینم و دەزانم کە

---

[1]- گەرچی دوژمن دۆستانەت پێ بڵێ داوە، نەک دان ، تۆ لەبەر وی هەرهەڵێ
[2]- گەر وەهات لێ هات لەحەق داوا بکە ناڵەهەم تەسبیح و ڕۆژ و جا بکە
[3]- لەوشەڕابی قارچۆن مەستی دەدەی؟ ( مصرع اول)

سەرچاوەکەیان کوێیە و چ ڕەنگن. جا لەبەر ئەوە کە ئەفرادی لەشکرت ئیحتیاجیان بە ئاو دەبێ، ئەمن دەگەڵ خۆت بەرە تا ئەو جێگایانەی کە ئاویان هەیە نیشانیان بدەم سولەیمان(ع) بەو پێشنیهادە موافەقەتی کرد. لەو کاتەدا کە زاغ ئاووری حەسادەتی بەشیددەت، دایسا ڕووی کردە سولەیمان و پێیکوت ئەی پادشا ئەو هود هودە خۆهەڵدەکێشێ و قسەکانی بێ پایە و دوور لە حەقیقەتن چونکە ئەو باڵەندەیە ئەگەر ڕاست دەکا وەکوو دەڵێ وایە، ئەدی بۆچی داوی لەبن کەمێک لەخۆڵێ دا نەدی؟ هودهود جوابی داوە کوتی ئەگەر درۆ بکەم سەرم ببڕن کە ئەمن لەبڵیندایی ئاسماندا و لەژێر خۆڵدا دەبینم بەو شەرتە کە قەزای ئیلاهی چاوی عەقڵم نەبەستی...

بۆسولەیمانیان کەهەڵدا بارەگا  چی تەیربوو، هات لەبۆخزمەت بەشا (١٢٠٢)
هاوزمان ومەحرەمی رازیان دەدی  هاتنەپێشی، چونکەدڵخوازیان دەدی (١٢٠٣)
مەل هەموویان تەرکیان کرد جیکە جیک  گەڵ سولەیمان دوان وەکوو دۆست و شەریک (١٢٠٤)
هەم یەکن هەم خزمی یەکترهاوزمان  حەپسەبۆپیاو، بوون لەگەڵ نامەحرەمان (١٢٠٥)
وا دەبێ زۆر، هیندوتورکی هاوزمان  وا دەبێ زۆر هەردوو تورکن لێک جودان (١٢٠٦)
وەک زمانی مەحرەمی هیچ وانییە  هاودڵی چاتر، لەهاوئەزمانییە (١٢٠٧)
بێ ئیشارە ونوتق ونووسین ئەی فلان  سەدهەزاران دێ لەدڵ لەفز و بەیان (١٢٠٨)
هەرچی مەل بووهەریەکەی ئەسراری خۆی  هەم هونەرهەم دانیش وهەم کاری خۆی (١٢٠٩)
بۆسولەیمان یەک یەکەی، تەوسیف کرد  تانیشان دا کاری، خۆی تەعریف کرد (١٢١٠)
نەک لەبەر فەخروتەکەببورلایی شای  بەڵکەبۆیە، تاکو ڕێدا بچتەلای (١٢١١)
گەرکو بەردە، ویستی بکرێ ئەوکەسێ  زوو هونەرزاهیردەکا، ئەو یەک دوو سێ (١٢١٢)
گەرلەکڕیاریشی دی، ئەوعارونەنگ  خۆی شەل وبێ حاڵ دەکا، هەم کەڕ و لەنگ (١٢١٣)
نۆبەتی هوهود گەیشت وپیشەکەی  هەم بەیانی هۆش وبیرو ئیشەکەی (١٢١٤)
ئەو بەشای کوت کام هونەر لام چووکترە  موختەسەردەیڵەم ئەتۆش لێم وەرگرە (١٢١٥)
شابەوی کوت ئەوهونەرتان کامەیە  ئەوبەشای کوت ئەوهونەرمان ئەوهەیە (١٢١٦)
من لەسەرهەوران کەنۆڕیم بۆنەوی  ئا و دەبینم جا لەژێرتەختی زەوی (١٢١٧)
جێی وعومق ورەنگی ویم دێ بەرنەزەر  گەرلەخاکی یالەبەردی دێتەدەر (١٢١٨)

---

[1] ـ مەستی یەعنی حیس فەقەت هەر ئیسم و ناو  دارەگەز وەک دارەسەندەڵ، بێتەچاو

ئەی سولەیمان تا کو ئا وتان دەسکەوێ　　بۆسەفەرتان ئێوەمنتان هەردەوێ (۲۱۹

جا سولەیمان پێی دەکوت ئەی چاک ڕەفیق　　لەوبیابانەی کەبێ، ئاوی عەمیق (۲۲۰

**تەعنە لێدانی زاغ لە ئیددیعای هودهود...**

زاغ حەسەدگرتی کەدیتی وا دەڕۆن　　ڕووی دەشاکردوکوتی پاکی درۆن (۲۲۱

خۆئەدەب وایەلەلای شا دەنگ و باس　　هیچ نەبێ بەخسسوس درۆیەک دوورلەڕاس (۲۲۲

گەرهەبووبای ئەوبەدائیم ئەونەزەر　　بۆچی نەی دی داو کەمێکی خۆڵ لەسەر؟ (۲۲۳

بۆدەداو دا گیری کردوبوو بەپەند　　بۆقەفەس بۆی بوو بەجێگاو حەپس وبەند؟ (۲۲۴

ڕووی دەهود هودکرد سولەیمان پێی دەووت　　بۆخیلافت کرد لەئەووڵ وا چەووت (۲۲۵

چۆن دەڵەی مەستم کەتۆخواردووتەدۆ　　تۆلەلای من، لێدەدەی لافی درۆ (۲۲۶

**جواب دانەوەی هودهود بە تەعنەی زاغ ...**

ئەوبەشای کوت من فەقیرم هەم گەدا　　تۆقسەی دووژمن مەبێ، خاتری خودا (۲۲۷

گەرنەبێ وا،ئەوقسەی دەیڵەم،وەرە　　دادەنێم سەر،تۆش ببڕەئەوسەرە (۲۲۸

چونکەزاغیش مونکیرەحوکمی قەزا　　عاقڵیش بێ ڕوو ڕەشی دەرگای خودا (۲۲۹

تا دەتۆ دابێ نیشانەی کافران　　بۆکەسافەت، تۆدەبێ جێگەو مەکان (۲۳۰

من دەبینم داو کەبش بم لەوفەزا　　گەرنەپۆشی چاوی عەقڵی من قەزا (۲۳۱

گەرقەزا هات دانیشیش نایەت بەکار　　ڕۆژدەگیرێ ومانگ دەبێتن تار تار (۲۳۲

لەوقەزایەکەم نییەخۆ،کاری وا　　هەر قەزایەزاغ مونکیر بوو قەزا (۲۳۳

**داستانی ئادەم(ع) و بەستنی قەزا، نەزەری وی لە موڕاعات کردنی نەهیی سەریح و تەرکی تەئویل...**

بولبەشەرکە(علم الاسما) بەگە　　سەدهەزاران عیلمی ئەو نێو هەرڕەگە (۲۳۴

ئیسم و ئەسڵی هەرشتێ لێی بوو عەیان　　ئەسڵ وفەرعی گشتی ئەشیای نەقشی گیان (۲۳۵

چی لەقەب دای هیچ تەغییری نەکرد　　سست نەبوو هەرچی، بەچوستی نێو دەبرد[1] (۲۳۶

مۆئمینی ئاخر، لە ئەووەڵ دا، دەدی　　کافری ئاخر، لەبۆوی هات وەدی (۲۳۷

---

[1]- چی لەقەب دای ئەو بەبێ گۆڕین دەما　　سست نەبوو هەرچی کەچوستی نێو دەنا

بـۆی گشـت ئەشـیا، لـە دەم زانـا بـێ — سـیرِی ڕەمــزی (علــم الاســما) بێـــ (١٢٣٨)
بـۆی گشـت ئەشـیا لـەلای مـە، زاهیـری — نێـوی گشـت ئەشـیا لـەلای خـالق سـیرِی (١٢٣٩)
- ری موسـا نێـوی لای وی بـوو عەسـا — نێــوی لای خـــالق نــرا بـــوو، ئــەژدەها (١٢٤٠)
ـۆ عومـەر، نێـوی ئـەلێرە، بـوت پەرەسـت — گـەرچی مـوئمین نووسـرابوو، نێـو ئەلەسـت[1] (١٢٤١)
ئەوئـــــتەی کەئێمـــــەناومان نامــــەنی — لای خــودا بــوو، گەرسـەعید بوویـا دەنــێ (١٢٤٢)
ئەوەمـەنی بـووی سـوورەتێک کـاتی عـەدەم — لای خـــودا مـــەجوودبوو بـــێ زیــادو کــەم (١٢٤٣)
ئێمـان، چـون بـوو حەقیقـەت لای خـودا — حـــال و وەزعــــی ئێمەهەربـــەو بەســـترا (١٢٤٤)
بـۆ ئەئینسـا ن حـەق دەنـێ بۆعاقیبـەت — نــەک وەکــوو نێوێـک دەنـێن بۆعارییــەت (١٢٤٥)
جـۆی ئـادەم چـون بـەنوری خـوای دەدی — ڕووح و ڕەمزی ناوی گشت ئەشیای دەدی (١٢٤٦)
چونکـە نـووری خـوای دەویـدا دی مەلـەک — چوونە سەجدە چی مەلەک بوون یەک بەیەک (١٢٤٧)
ــن کــەنێوی وا دەبـــەم ئـــەوئا دەمــە — تاقیامــەت گــەر کومــەدحی کــەم کەمــە (١٢٤٨)
ـــەو هەمووزانســـتەهەرکوهات قـــەزا — فــەهمی یــەک نــەهیی لــەوی بــوو ئیشــتیبا (١٢٤٩)
ـ خـــوواکردی بەنەهیـــەک لـــێم حـــەرام — یانەتـــــەئویلی بکـــــەم بۆخۆم،لـــــەلام (١٢٥٠)
ئەوەـەدڵ تــەئویلی پــێ ئەرجــەح دەبــوو — زۆربــەحیرەت، زوو لــەبۆ گــەنمــی دەچــوو (١٢٥١)
ـغـــەوان کـــەچوو دەلا قـــی وی درِوو — دز بەفرســەت هــات و کــالای بــردو چــوو (١٢٥٢)
جۆن لەحیرەت بووی نەجات وهات وەهۆش — دیتــی دز بردوویەهــەرچی بــووی لــەکۆش (١٢٥٣)
ربنـــا اناظلمنـــا )ی کـــوت بـــەئاه — یــەعنی ون بــوو لــێم چــرا، هــەم شـاهرِاه (١٢٥٤)
ئەوقــەزا یــەرۆژی زۆرگــەش رەش دەکــا — شێرلەجورئەت چەشـنی مووش بێ بـەش دەکا (١٢٥٥)
گەرقـــەزا هـــات وئــــەمن داووم نــــەدی — مـــن بەتـــەنیا نیمـــەوا هـــەن ئیـــدەدی (١٢٥٦)
حۆش بەحا لی وەی کەباش بوو کا ری ئەو — زولمـــی لانـــا دەســـتی کـــردە، زاری ئـــەو (١٢٥٧)
گەرقـەزا دەورەت، وەکووشـەو رەش بکـات — هـــەر قەزایەعاقیبـــەت دەتـــدا، نــــەجات (١٢٥٨)
گەرقـــەزا بۆگیـــانی تـــۆ دەردان دەدا — ئەوقەزایـــــەدەرد دەداو دەرمـــــان دەدا[2] (١٢٥٩)
گەرقـــەزا تـــۆ ســـەد کـــەرەت ئاوارەکـــا — ئەولـەجێی چـاک هەڵـدەدا بـۆت بارەگـا (١٢٦٠)
تۆبـــــەلوتفی خـــــوا بزانەترســــــی وا — تـــا لـــەمولکی ئیمـــەنیت دانـــێ، خـــودا (١٢٦١)
ئــەو وتــە، قــەت دوایــی نایــەپێم وەیــە — داســتانی شـێر و کەروێشـک گـوێ دەیـە (١٢٦٢)

---

1- گەرچی موئمین نێوی وی بوو، نێو ئەلەست (مصرع دوم)

2- ئەوقەزایەگیان دەداو دەرمان دەدا (مصرع دوم)

**لاق کێشانەوەی کەروێشک لە شێر، کاتێ کە گەیشتە نیزک بیر...**

چونکەشێر، کەروێشکی لای بیر دی پەرێش    پێــی لەبۆدوایەدەکێشـــێ و ناچتـــەپێش    (٦٣-

پێیـدەکوت تۆبـۆچی پێـت، بـۆدوا، دەبـەی؟    ڕامەوەســـتەپێش بـــڕۆ تـــۆ، بەســـکەدەی    (٦٤-

جــوابی داوەکــوانێ دەســـتم کــوانێ پــێم؟    گیـان دەلـەرزێ،کوا دڵـم مـن مـاوەپێم؟    (٦٥-

تـۆ تەماشـای ڕەنگـی ڕووم کـە چەنـدەزەرد    خۆلـــــەڕەنگم ئاشـــــکرایەئێش ودەرد    (٦٦-

چونکەحـــەق سـیمای موعـــەرریف دادەنـا    چـاوی عـارف غـەیری سـیما ی لا دەنـا[1]    (٦٧-

خۆ، لەڕەنگ وبۆن دەکەی تۆمـەعنی کەسپ    دەنگـی ئەسـپان بـۆدەلیلی بـوونی ئەسـپ[2]    (٦٨-

هەرشـتەی دەنگـی خسووسـی خـۆی هەیـە    تـا بزانـی دەنگـی کـەر، یـا دەرکەیـە    (٦٩-

پیاولەژێرئـــەزمان ونـــە، قـــەولی نـــەبی    بێ کوتن چۆن جەوهەری مەعلووم دەبی؟    (٧٠-

ڕەنگـی ڕوو حـا ڵـی دەروون زاهیـر دەکـا    مەرحەمـەت کـە، تـا دڵـت جـێم، بـۆ وەکـا    (٧١-

ڕەنگی ڕوی سوور، بۆسەبەب بۆزیکری شوکر    ڕەنگـی ڕوی زەردبۆسـەبەب بـۆ سـەبرونوکر    (٧٢-

هاتـەلام ئـەو هـەی کـەدەبڕێ دەسـت وپـا    ڕەنگـی ڕوو وقـووەت لـەجێی خـۆی، لادەبـا    (٧٣-

ئەوشـتەی دەشکێنی گشـت شـت، گەییـەمن    دەردەهێنـــێ هـــەرچی دارە، ئەولـــەبن    (٧٤-

گەییـەمن ئەوهـەی لـەوی بـوون گشـت مـات    ئـا دەمـی هـەم جانـەوەر، جامیـد، نـەبات    (٧٥-

تازەئـــەجزان ئـــەو هـــە، کوللییـــات لـــەوی    ڕەنگ زەردبوون گشتییان بوون مات لەوی    (٧٦-

ئـــــەوجیها نەجارشـــــــادەجارغەمین    چـــاو لەبێســـتان جـــارێ ڕووتـــەجار شـــین    (٧٧-

چـــاو لـــەتیرێژ، دێتـــەدەر وەک ئـــاگری    ســـەرنەوی ئـــەو،ون دەبـــێ خۆنـــاگری[3]    (٧٨-

ئەوســـتێرانەی دەکـــەن ڕوون ئاســـمان    هەردەسـووتێن دەمبـەدەم وەک سـووتمان[4]    (٧٩-

مانـگ لەئەسـتێران کـەزیاتر بـووی جـەماڵ    بـوو لەبـەرتـەب زەردو بایـک وەک خـەیاڵ    (٨٠-

چـــاو لەعـــەرزی ســـاکن ووا بـــا ئـــەدەب    بوومەلەرزەخســـــتیەلەرزەلەرزی تـــــەب[5]    (٨١-

زۆرلـــەکێوان بەوبەلایـــەی کـــۆن زەمـــان    ووردو خـاش بـوون، بوونـەتۆزوخۆڵ، نـەمان    (٨٢-

ئەوهەوایـەی چەشـنی ڕووح، پـاک و لـەتیف    گەرقـەزا بـی وێ،دەبـێ پـیس و کەسـیف    (٨٣-

---

[1]- چونکەسیمای خوا موعەرریف ناو دەنا   چاوی عارف غەیری سیمای ڕاو دەنا

[2]- ڕەنگ وبۆنەڕێ نموونە، بۆدەروون  سوبحی سادق بۆنیشانەی ڕۆژی ڕوون

[3]- ڕۆژی ئاسمان دێتەدەر وەک ئا گری  ماویەک پاش،ون دەبێ خۆنا گری

[4]- موبتەلای سووتاندنن وەک سووتمان (مصرع دوم)

[5]- بوومەلەرزەچۆنی خستەلەرزی تەب (مصرع دوم)

جەشنی رووحەئا وەکی خۆش وزولاڵ ئەو لەگۆماو زەردو تیرەو تفت و تاڵ (١٢٨٤)
بۆ گرێکی بای غروور دەبیاتەسەر بایەکی دی، دێ، لەبن، دەی باتەدەر (١٢٨٥)
حالّی دەریا ئیزتیرابی دانیشان یەعنی گۆڕان حالّی دەریا، بێ وچان (١٢٨٦)
چەرخی سەرگەردان کەبەدوای حەق دەچێ حالّی وەک منداڵەکانی خۆی دەچێ (١٢٨٧)
جار لەخوارو جاروەسەت، جارجارسەروو سەعد ونەحسیان دیارکرابوو، بۆهەموو (١٢٨٨)
تۆکەجوزئیی و لەکوللان تێکەلاو حالّەتی هەر مونبەسیت تۆبێنەچاو (١٢٨٩)
چونکەکوللییات هەیانە، ئێش ودەرد چۆن نەیان بێ جوزئی وانیش ڕوویی زەرد؟ (١٢٩٠)
خاسسەجوزئێکی لەئەزداد چاکراو وەک لەجەمعی باوو ئاگر خاک و ئاو (١٢٩١)
هیچ تەعەجوب، مەڕ لەبەرگورگی هەڵێ گەرکو مەڕ عاشق بەگورگی بێ، بەڵێ (١٢٩٢)
تاکو ئەزداد دۆستی یەک بن ژین هەیە بوو خیلافیان،مەرگەئەودەم شین هەیە (١٢٩٣)
لوتفی خوابوو کردی شێرو گۆڕەخەر دۆستی یێک،ئەودوژمنانەی قەستەسەر (١٢٩٤)
چونکەدنیا هەم نەخۆشەودیلی ڕەب گەرنەخۆش بمرێ وفەنا بێ هیچ عەجەب (١٢٩٥)
زۆری بۆشێرکوت،ئە،لەوپەندانەجا پێیدەکوت من بۆیەلەدوا، مام وەها (١٢٩٦)

## پرسیاری شێر لەلاق کێشانەوەی کەروێشک ...

شێربەوی کوت تۆلەئەسباب هەر ئەوە بێژەلاقت بۆچی کێشا پشتەوە؟ (١٢٩٧)
پێیدەکوت ئەو، شێر لەنێو ئەوبیرەدا محکەمەجێگای و نیتی هیچ بەلا (١٢٩٨)
ژین دەبیردا ئینتیخابی عاقڵە چوون دەخەڵوەت دا سەفای قەلب ودڵە (١٢٩٩)
تاری بیر چاتر لەتاریکا یی خەڵک[1] دەرنەچوو ئەو کەس کەچوو بەدوایی خەڵک (١٣٠٠)
شێرکوتی من دەیکوژم بۆپێش وەرە تۆتەماشای بیرکەداخوا حازرە؟ (١٣٠١)
پێیدەکوت سووتاندمی ئاوری بەئێش تۆ مەگەر،بمکەی، لەباوەش،بچمەپێش[3] (١٣٠٢)
تابەپشتیوانی تۆجا،ئەی ئەمیر چاو هەڵێنم، چاک بنۆڕم، من لەبیر (١٣٠٣)

---

[1] - تاریکی بیر چاک لەتاریکایی خەڵک (مصرع اول)

[3] - . بیمەپێش (مصرع دوم)

**تەماشا کردنی شێر لە بیر و دیتنی عەکسی خۆی و کەرویشک دەئاوێ دا ...**

چونکەشێربۆی بووپەنایەک وەک قەڵات | ئەولەبۆ لای بیر بەتوندی چوو هەڵات (١٣٠٤)

چوون لەسەربیر،هەدوو چاویان کردلەئاو | عەکسی شێروعەکسی کەروێشک هاتەچاو (١٣٠٥)

عەکسی خۆی شێر،وا، دەنێو ئاودا، دەدی | شێرو کەروێشکی قەڵەو، ئەو، لا، دەدی (١٣٠٦)

چون دەئاو دا، دوژمنی دی شێری میر | جێی دەهێشت کەروێشک و خۆی هاویشتە بیر (١٣٠٧)

بیرەکی هەڵقەندوبۆخۆی تێکەووت | زوڵمی خۆی بوو والەبۆ وی، ڕێکەووت (١٣٠٨)

زوڵمی زاڵم، بوو بەبیرێک، تەنگ وتار | وادەڵێن زانابەعام، نەک سێ و چار (١٣٠٩)

هەرچی زاڵمتربێ، بیری قووڵترە | عەدڵەوای کوت، تۆش لەبۆ، وی، گۆی گرە (١٣١٠)

ئەی ئەوەی تۆ، بیر لەزوڵمێ چادەکەی | تۆلەبۆخۆت دا دەنێی داو، وادەکەی (١٣١١)

دەوری خۆت وەک کرمی پیلە، مەیتەنە | گەرتۆبیرت ویست بەقەد خۆت هەڵقەنە (١٣١٢)

وا مەزانەدوژمنی ناکا زەعیف | سوورەیی (نەسر) ی بخوێنەتۆ زەریف (١٣١٣)

گەرتۆ فیل بی ودوژمنیش تۆی دی وهەڵات | کەیفەری (تەیرەن ئەبابیل )بەڵکەهات (١٣١٤)

گەر زەعیفی عەرزی، بی وێتن ئەمان | دیتەغەوغاو دەنگ سپاهی ئاسمان (١٣١٥)

گەربرینداری بکەی تۆ ئەو بەدان | خۆددانی خۆت دەهینی، تۆ، وەژان (١٣١٦)

شێر دەبیردا خۆی دەدی چو ن بووی، مەنی | نەی دەزانی خۆیەتی یا دوشمەنی (١٣١٧)

عەکسی خۆی وا دی کەدوشمەن بوو لەبۆی | لاجەرەم شەمشێری کێشا ئەولەخۆی (١٣١٨)

زۆرلەزوڵمان تۆدەبینی نێو کەسان | خەسڵەتی تۆن و دەوان دان ئەی فڵان[1] (١٣١٩)

وانیشانی دا وجوودیان هەستی تۆ | هەم نیفاق وزوڵم و هەم بەد مەستی تۆ (١٣٢٠)

تۆئەوەی کەخۆت بریندار وا دەکەی | جێ لەبۆلەعنەت لەخۆت،خۆت چادەکەی (١٣٢١)

گەرعەیان با، لێت و دیبات،چەن بەدی | دوژمنی خۆت،خۆت،دەبووی،نەک ئیدەدی (١٣٢٢)

حەملەبۆسەرخۆت دەکەی، سادەی ئەتۆ | چەشنی ئەوشێرەی کەحەملەی کردەخۆ (١٣٢٣)

خەسڵەتی خۆت چۆنەگەروات بێتەدەس | تێدەگەی ناکەس ئەتۆی نەک هیچ کەس (١٣٢٤)

شێر لەقەعری بیردامەعلووم بوو بۆی | ئەو شتەی پێی وابووغەیرە،عەکسی خۆی (١٣٢٥)

هەرکەسێک دانی زەعیف، بێنێتەدەر | چەشنی شێری خواربینی دێ، بەسەر (١٣٢٦)

ئەی ئەوەی دیتت لەڕووی یاران بەدی | عەکسی خۆتەتۆ، دەوانت دا،کەدی[1] (١٣٢٧)

---

١- خەسڵەتی تۆن ودەیان بینی دەوان (مصرع دوم)

گـوێ بـدەچاک بـەو وتـەی پێغەمبـەری موءمینـــان ئـــا وێنەنـــە، بۆیـــەکتری (١٣٢٨)
دبنی شووشەی کەبوود، پێش چاوی خۆت ڕەنـگ کـەبوود، زاهیردەبـێ عالـەم لـەبۆت (١٣٢٩)
گـەرکوکوێرنی ئەوکەبوودیـەت تۆکـە، دی هەرلەخۆتە،بـەد ئـەتۆی نـەک ئیـدەدی (١٣٣٠)
گەرکو موئمین هیچ بەنووری خوای نەدی غـەیبی مـوئمین چـۆن لـەبۆ وی دێ وەدی (١٣٣١)
نـاوری قـەهری خـوات بـدیبا،تۆ ئەگـەر نەی دەکرد بۆت فەرقی باش و بەدنەزەر (١٣٣٢)
کەمکەمـــەتۆ ئـــاو بـــەئاوور دا بکــــە تـــــاکو نارت،بێ،بــــەنوور،تۆ وا،بکـــــە (١٣٣٣)
ئـەی خـودا پێیــدا بکــەئا وی تــەهوور نـاری عالـەم تـا کـو گشـتی بـێ بـەنوور (١٣٣٤)
ئـاوی دەریاگشــت لەژێرفــەرمانی تــۆن ئـا وو ئـاوور هـەردوو ملکـی جـوانی تـۆن (١٣٣٥)
گـەر ئیـرادەت بـێ، دەبـێ ئـا وور بـەئاو نــەت هــەوێ وا، ئاو،بــەئاوور دیتــەچاو (١٣٣٦)
ئــەی خودایـــا تۆبەئیمـــەت دا، تەڵــەب بۆنـــەمانی زوڵم،عـــــەدڵی تۆســـــەبەب (١٣٣٧)
ـێ تەڵـەب دات، تـۆ، تەڵـەب، بـەو عالەمـە بـێ ژمـارو حـەد عـەتات دا، تـۆ بەمـە (١٣٣٨)

**مزگێنی بردنی کەروێشک کە شێر دەبیر کەوت...**

چونکەکەروێشک مەرگی شێری دی بەچاو ئەولـەبۆلای وەحشـییان تونـد هـات بـەتاو[2] (١٣٣٩)
هەرکـەدیتی شـێر دەبیـردا مـرد، بـەزار ئەوبـــەڕەقس وشـــادی هاتـــەمێرغوزار[3] (١٣٤٠)
هـات بەچەپڵـەچون خـەڵاس بـوو لەوبـەڵا شاد،بەڕەقســـین، وەک لکـــی دارو گـــەڵا (١٣٤١)
چـون گەڵاولک هەردوو ئازاد بوون لەخاک سـەربڵیند بـوون، بـوون ڕەفیقی بـایی پـاک (١٣٤٢)
چـون گـەڵا هـات ولـەزگ، لـک، هـا تـەدەر ئەوبەبـــەژنی دار، دا، چــــوو تاکوســـــەر (١٣٤٣)
گشت جەوانەو لک دەکەن شوکری خودا نەغمـەخوانی گشـت گـەڵایان لێـک جـودا (١٣٤٤)
ئەسڵ وڕیشـەی مـەی بـەخێوکرد(زولعـەتا) تـاکو،بۆدار، محکـەم وڕاسـت چـۆ حـەوا (١٣٤٥)
ڕۆح کەزیندانین،لـــــەنێوئاوو گڵـــــن گـەر لـە ئـاو گـڵ نـەجات بـن، شـاد، دڵـن (١٣٤٦)
گیان لەعیشقی زاتی حەق گشت دیتەڕەقس چەشنی بەدرن دوورلەعەیبن دوور لەنەقس (١٣٤٧)
جا لەخۆشـیان دیتەڕەقسـین جیسـمی وان حـــاڵی گیانیــــان، ناتوانین،کـــەین، بـــەیان (١٣٤٨)

---

1- عەکسی خۆتەتۆ دەرووی وانت دەدی. (مصرع دوم)

2- چونکەکەروێشک شادبووچون بووی نەجات  زوولەبۆلای وەحشییان تادەشت هەڵات

3- تالەوەرگە، ئەو بە شادی هات بەغار (مصرع دوم)

چاو لەکەروێشک، چۆنی ئەو شێر خستەبەند ‌ ‌ ‌ نــەنگ بۆشـێرێک کەکەروێشـک،کردیەپەند (۳۴۹)

بەوهــەموو نەنگـەی کەهــەیتی زۆرعەجـەب ‌ ‌ ‌ دەی هــەوێ ئـەو فـەخری دینی بێ لەقـەب (۱۳۵۰)

ئـەی تـۆ ئـەو شـێرەی لـەنێو بیـری بـەدەن ‌ ‌ ‌ نەفسی کەروێشـک، خـوێنی ڕشتی ئـەی ڕەبـەن (۱۳۵۱)

نەفسی کەروێشکت لەسەحرای خۆش هەوا ‌ ‌ ‌ تــۆش دەبیـــری قیــل وقــال دا مــاوی وا (۱۳۵۲)

هــات لــەبۆلای وەحشـییان شـێرگیر بــەتاو ‌ ‌ ‌ مـــــژدەدەن، مزگێنــــی دەر، وا هاتــــەلاو (۱۳۵۳)

مژدەمژدەئـــەی گرووهـــی خـــۆ ش ژیـــان ‌ ‌ ‌ لەوســـــەگی دووزەخ نــــەما،ناوو نیشـــــان (۱۳۵۴)

مژدەمژدەئەوعــــــەدووی کـــوللی گییـــــان ‌ ‌ ‌ لێـی دەکێشـا، قـەهری خـالق گشـت ددان (۱۳۵۵)

ئەوکەســـەی پەنجـــەی بەزۆرســـەر،دا،دەدا ‌ ‌ ‌ گەسکی مـەرگیش چەشنی پووشکەی ڕا ، دەدا (۱۳۵۶)

**کۆبوونەوەی وەحشیان لە دەوری کەروێشک و مەدح و ستایش کردن لەوی...**

کۆوەبـــوون وەحشـــی هـــەموویان ئەودەمـــە ‌ ‌ ‌ بـــوو بـــە شـــادی و پێکـــەنین و هەمهەمـــە (۱۳۵۷)

دەو رەیـان دا، ئـەو لـەنێو یـان چەشـنی شـەم ‌ ‌ ‌ سـەجدەیان بـرد بـۆ ئـەوی گشـتیان بەجـەم (۱۳۵۸)

تۆفریشـــتەی یـــا پـــەری جـــوان ودلێـــر ‌ ‌ ‌ یانـــــــەعیزڕائیلی بۆشـــــــێرانی نێـــــر (۱۳۵۹)

تـۆ هـەچی هـەی، گیـانی مـە، قوربـانی تـۆ ‌ ‌ ‌ زاڵمـت کوشـت خۆشبێ دەسـت وگیـانی تـۆ (۱۳۶۰)

خـوا دەتـۆی دا کـرد زهـوور ئـەو قودرەتـە ‌ ‌ ‌ ئـا فـەرین بـەو دەسـت وبازووی تـۆ هەتـە[1] (۱۳۶۱)

بۆن بـەیان کـە، چۆن تۆ شێرت خستەداو؟ ‌ ‌ ‌ زاڵمـــی وات چـــۆن بەمـــەکران کـــرد ڕاو؟ (۱۳۶۲)

بۆن بـەیان کـە، چـون وتـەت، دەرمانـە، بـۆن ‌ ‌ ‌ بـــۆن بـــەیان کە،مەڵحـــەمی گیانانـــەبۆن (۱۳۶۳)

بـــۆن بـــەیان کـــە زوڵمـــی ئەوغـــەددارەبۆن ‌ ‌ ‌ زۆربرینمـان هـەن لـەگیانمان نـوێ وکـۆن[2] (۱۳۶۴)

پێیکـوتن پێـی دام تـەوان خـوای دووجیهـان ‌ ‌ ‌ کـوا دەنـا وەک مـن لـەدونیا نـا تـەوان؟[3] (۱۳۶۵)

نـــووری دا ، دڵ قووەتیشـــم هـــات لـــەوی ‌ ‌ ‌ نووری دڵ بـوو دەسـت و پێمـی کـرد قـەوی (۱۳۶۶)

هەرخۆدایــــــەعیززەت وزیللـــــــەت دەدا ‌ ‌ ‌ لـەوخو دایەیـەک غـەنی بـوو یـەک گـەدا[4] (۱۳۶۷)

خـۆ، بەنـەو بـەت، خـوا دەدا، تـەوفیق نیشـان ‌ ‌ ‌ بـــەو کەســـەی ئـــەهلی یەقینـــەیاگومان (۱۳۶۸)

تـۆ، بـــەمولّکی نـــەو بـــەتی، شـــادی مەکـــە ‌ ‌ ‌ ئـەی ئەسـیری نەوبـەت، ئـا زا دی مەکـە (۱۳۶۹)

---

[1]- خوا دەجۆی تۆی دا، ڕەوان کرد ئا وی وا ‌ ‌ ئا فەرین بەودەست و بازووت، مەرحەبا

[2]- بۆن بەیان کەزوڵمی ئەوغەدداری هار ‌ ‌ چون برینن هەن لەگیانن، سەد هەزار

[3]- پێتکوتن خوا کۆمەکم بوو، وا لە، کەم ‌ ‌ کوا دەنا وەک من لەدونیا هێندەکەم؟

[4]- هەرلەحەق ڕا دێ هەچی تەفزیلەخۆ ‌ ‌ هەرلەحەق ڕا دێ هەچی تەبدیلەخۆ

...ەی مولکی لەنەوبەت ژوور تره — جێی لەحەوتەم ئاسما ن زۆر،دوورتره (۱۳۷۰)
... جی زۆری نەو بەتە، شای باقییە — مولکی دائیم، ژینی رووح،گەڵ ساقییە (۱۳۷۱)
...ی گەرئەوشەرابەی بەد سیفەت — دیتەدەستت تۆشەرابی مەعریفەت[1] (۱۳۷۲)
...ن ئەو دوژمنەی بوو ن ئاشکار — نەفسی دووژمن ماوەپیستر نا دیار[2] (۱۳۷۳)

**تەفسیری (رجعنا من الجهاد الاصغر الی الجهاد الاکبر)...**

...بۆیەکوشتنی وا عەقڵی کەس؟ — کوانێ کەروێشک پێی دەکوژرێ شێری نەفس؟ (۱۳۷۴)
...خەئەو نەفسەدووزەخ ئەژدیها — کوا بەدەریا کەم دەبێ دووزەخ وەها؟ (۱۳۷۵)
...ەر، وی کەن حەووت دەریا بەجەم — سۆزی وی نابێت خۆ، یەک زەررەکەم[3] (۱۳۷۶)
...ی دڵ ڕەقی وەک دارو بەرد — دێتەنێو دووزەخ خەجاڵەت ڕەنگ زەرد (۱۳۷۷)
... حەنەم بەوهەمووخورد و غەزا — بێ قەرارەتاکو بۆی دێ، وا، نیدا (۱۳۷۸)
...بۆیە؟ جواب دەدا هێستاکەنا — ماوەئاورو تین وسۆزی دات دەنا (۱۳۷۹)
...ێکی بردە نێو خۆ، کردی مات — نارەتەی (هل من مزید)ی هەر دەهات (۱۳۸۰)
... دەدا دەستووربەوی ساکین ببێ — ئەودەمی ساکین دەبێ زوو جێ بەجێ (۱۳۸۱)
...جوزئی دووزەخەئەو نەفسەمان — تەبعی کوللان خۆ، دەجوزئان دا، دەمان (۱۳۸۲)
... خودایەمەرگی نەفسی بوو بەدەس — غەیری خوا پێی ناکرێ ئەو کا رەکەس[4] (۱۳۸۳)
...س بۆ نێو کەوان نەک پێچ پێچ — ئەوکەوانەی نەفس، تیری خوارو خێچ (۱۳۸۴)
...کوو تیر دەربچووتۆ لەوکەوان — چو ن کەوانان ڕاس چوونەدەر، لەوان (۱۳۸۵)
...ی زاهیر، شکەستم دا هەڵات — با لەچەنگی داخلیش خۆم دەم نەجات (۱۳۸۶)
...ەوجیهادەی ئەسغەرە هاتینەوە — وایـن لەئەکبەر دا، بەسۆزو تینەوە (۱۳۸۷)
...ەحەق ویستم تەوان وعیززو لاف — تا بەدەرزی هەڵقەنم من کێوی قاف[5] (۱۳۸۸)
...ێری لەشکر کوژ مەزانەشێری باش — ئەوهەشێرە نەفسی خۆی کرد وورد و خاش (۱۳۸۹)

---

1- لابنێ گەرئەو شەرابە ،یەک زەمان — دیتەدەستت تۆشەرابی جاویدان
2- دوژمنی نەفس ماوەپیستر نادیار(مصرع دوم)
3- گەر وەسەر، وی کەن هەموو دەریای جیهان — زەررەیەک نابێت، تینی وی نیهان
4- بەس خودایەمەرگی نەفسی بوو بەدەس — غەیری خوا ناگرێ کەوان بۆ وی بەدەس
5- قووەت وتەوفیق لەحەق دا وا، دەکەم — کێوی قاف جاەمن دەدەزی ڕا دەکەم

**هاتنی قاسیدی ڕۆم بۆلای ئەمیرولموئمینین عومەر(خودای لێ ڕازی بێت) و دیتنی ئەو قاسیدە کەراماتی حەزرەتی عومەر(خودای لێ ڕازی بێت)...**

**خولاسەی داستان**

قاسیدێکی پادشای ڕۆم بۆلای حەزرەتی عومەر وەڕێ کەوت. ئەو کابرایە زۆری ڕێگای ناهەموار و پڕ پێچ و خەمی وەپشت سەردا تا گەیشتە مەملەکەتی موسەڵمانان و لەوێ لەکاخی حەزرەتی عومەر پرسیاری کرد کە پێی نیشان بدەن، جوابیان داوە کە عومەر(رض) کاخی نییە، تەنها کاخی وی گیانی ڕووناکی وییە. ئەو دەخانوویەکی بێئالایش و ئاڕایش ژیان دەباتە سەر. ئەی قاسید ئەتۆ چۆن دەتوانی کاخی باتینی وی ببینی، دەحاڵێکدا کە پەردەیەک پێش چاوی تۆی گرتووە و ناهێڵێت ئەتۆ ئەو کاخە باتینەببینی؟ ئەو جار قاسیدی مەملەکەتی ڕۆم پرسیار دەکا کە جێگای حەزرەتی عومەر(رض) بەو نیشان بدەن. عاقیبەت ژنێکی سەحرانشین پێی دەڵێ عومەر لە ژێر هۆودارەدا ڕاکشاوە. قاسیدەکە دەگاتە نیزیک ئەو جێگایە بەڵام ناتوانی کە زیاتر بچتە پێش، چونکە هەیبەتی حەزرەتی عومەر دێتە دەدڵی و سام دەیگرێ و بە خۆی دەڵێ .ئەمن زۆرم شا و ئەمیر دیون و لە هیچیان ترس و واهیمەیێکم نەبووە، بەڵام ئەوەچبووە؟ کە ئەو پیاوە وا بە سادە و بێئالایش دەژی، ئەمنی وا موتەحەییر و سەرسام کردووە؟ بە هەر حاڵ قاسید ئەوەندە ڕادەوەستی تا حەزرەتی عومەر لە خەوهەڵدەستی و قاسید سەلامی لێدەکا و حەزرەتی عومەر بانگی دەکا و لەلای خۆی دایدەنێ. قاسیدی ڕۆم دەبارەی ڕووح وگیان سوئالی لێ دەکا کە حەزرەتی عومەر جوابی دەداتەوە. ئەو گوفتوگۆ عیرفانیە دەزیمنی ئەبیات دا بە تەفسیل بەیان کراوە...

لای عومەرهات قاسیدێکی قەیسەری     تامەدینەچۆلی زۆر، دا، پشت سەری[1]     (١٣٩٠)
هات کوتی قەسری خەلیفەم دەن نیشان     من لەوێ میوان دەبم یەک دووشەوان     (١٣٩١)
خەڵکی کوتیان خۆعومەرقەسری نییە     گیانی ڕووناکی عومەر، قەسری وییە     (١٣٩٢)
گەرچی نێوو شوهرەتی زیاترلەمیر     ئەودەسابات دا دەژی چەشنی فەقیر     (١٣٩٣)
ئەی برادەر چۆن دەبینی قەسری وی؟     بەو هەمووموویی چاوی دڵ لێیدەرکەوی     (١٣٩٤)
چاوی دڵ تۆپاک لەعەیب وموو، بکە     جابەقەسری باتینی وی ڕوو، بکە     (١٣٩٥)
هەرکەسێکی نەی بێ قەلبی وی، هەوا     زوو دەبینێ بارەگاو وەجهی خودا     (١٣٩٦)

---

[1]- قاسیدێکی شاهی ڕۆم هات لای عومەر     تامەدینەڕێی درێژی گرتەبەر

جون موحەممەدپاک لەدوودو، ناربوو وەجهی خوای لێ، هەرچێ چووبا دیاربوو (١٣٩٧)
جون ڕەفیقی وەسوەسەی بەدخواهی تۆ کوا لەجێی وەجهی خودا ئاگاهی تۆ؟ (١٣٩٨)
هەرکەسێکی دەرکی قەلبی وازکرا ئەو، دەهەر شت، ڕۆژدەبینێ ئاشکرا (١٣٩٩)
نێو خەلایق ئاشکرایەکردگار چەشنی مانگی نێو ستێران ئەو، دیار (١٤٠٠)
گەر لەسەرچاو دابنێی دوو قامکی خۆ لەوجیهانەهیچ نابینی ئەتۆ (١٤٠١)
با نەبینی، ئەو جیهانەهەرهەیە قامکی نەفسی شوومە، چەشنی پەردەیە (١٤٠٢)
گەرلەسەرچاو لابەری قامکان ئەتۆ زوو دەبینێ ئەودەدمی دڵخوازی خۆ (١٤٠٣)
ڕێدەکوت ئوممەت بەنووح کوانێ سەواب؟ جوابی داوەپشتی (واستغشوا ثیاب) (١٤٠٤)
جون سەروو ڕووتان بەخۆتان بەستووە خۆو لەدیدی باتینی دوور خستووە (١٤٠٥)
ئادەمی هەردیدە، عالی یا نەوی ئەوهەدیدە،گەر ببینی خوا بەوی (١٤٠٦)
کوێر بێ ئەوچاوەی نەبینێ ڕوویی یار دووربە، لەویارەی نەبێ ئەو پایەدا ر (١٤٠٧)
جۆنکەقاسیدبیستی لەفزی پڕ سەمەر زێدەموشتاق بوو بەدیداری عومەر (١٤٠٨)
هێندەموشتاق بوو ببینێ ڕووی عومەر دی کەئەسپ وزین لەدەستی چۆتەدەر (١٤٠٩)
تاپەیا کا ئەونموونەی ڕۆژگار هەربەپرسین ڕێ دەچوو دێوانەوار (١٤١٠)
پیاوی والەتۆ بڵەی بوو بێ، چجار لەو جیهانەچەشنی ڕووح بێ، نادیار؟ (١٤١١)
**تاپەیای کاوبەندەگی کا،دووی کەوت[1] سەرکەوت ئەوکەس کەکاتێ نەسرەوت** (١٤١٢)
دی ژنێک، ئەوقاسیدەئاوارەیە پێیدەکوت حومبەر، لەبن هۆو دارەیە (١٤١٣)
ئەولەبن هۆو دارەخورما عەردی ڕەق نوست،لەسایە،چاو،لەسایەی زاتی حەق (١٤١٤)

**پەیداکردنی قاسیدی ڕۆم ئەمیرالموءمنین عومەر(رض) دەحاڵێکدا کە لە بن دار خورمایەک نوستبوو..**

هاتەوێ،دیتی،عومەر، وێستا،لەدوور لەرزەلەرزی وێکەووت ئەمما، چجوور (١٤١٥)
ئەولەلایەک هەیبەتی هات نێو دڵی لایەکی دی حاڵی خۆش بوو وەک گوڵی (١٤١٦)
ترس وخۆشی هەردوو زیددی یەکتری دی کەقەلبی ئەدووزیددەهەلگری (١٤١٧)

[1]- تاپەیای کاو خزمەتی کا، دووی کەووت ( مصرع اول)

ئەو بەخۆ ی کوت شام گەلێک دیون ئەمن ‌ ‌ ‌ زۆربەڕێزبووم من لەلای شاهی مەزن (١٤١٨)
من لەشاهان نەمبوو هیچ ترس وهەراس ‌ ‌ ‌ هەیبەتی ئەو پیاوەهۆشمی کردخەڵاس[1] (١٤١٩)
چوومەجەنگەڵ زۆرلەلای شێروپڵەنگ ‌ ‌ ‌ تێک نەچووقەت،لێم،لەبەر،وان هیچ ڕەنگ (١٤٢٠)
زۆرشەڕوجەنگ وهەرایان چوومەمن ‌ ‌ ‌ ئەودەمانەش چەشنی شێران بوومەمن (١٤٢١)
زۆربڕینم کردلەخەڵکی و بووم برین ‌ ‌ ‌ دڵ قەویتربووم لەخەڵکی من یەقین (١٤٢٢)
بێ سیلاح ئەوپیاوەنوستوەسەرزەوی ‌ ‌ ‌ من لەسەرتا پێم دەلەرزی،بۆ لەوی؟ (١٤٢٣)
ترسی حققەترسی خەڵکی وانییە ‌ ‌ ‌ ژەندەپۆشێک ترسی وا لەی لانییە (١٤٢٤)
هەرکەسێکی ترس وتەقوای خوایی بوو ‌ ‌ ‌ هەرچی ئینس وجیننەلەو پەروایی بوو (١٤٢٥)
دەس بەسینەئەو وتانەش فکری ئەو ‌ ‌ ‌ ساعەتێک پاشان عومەرهەستا لەخەو (١٤٢٦)

## سەلام کردنی قاسیدی ڕۆم لە ئەمیرولموئمینین(رض)...

بۆعومەرئەوکردی تەعزیم وسەلام ‌ ‌ ‌ قەولی پێغەمبەر( سەلام قەبل الکلام) (١٤٢٧)
پاش(علێک) ئەوبانگی بۆلای خۆی دەکرد ‌ ‌ ‌ دای دەنا لای خۆی و ترسی لادەبرد (١٤٢٨)
بانەترسێ ئەوکەسەی ترسا لەحەق ‌ ‌ ‌ خۆادەدا ڕۆزیەک بەوی، بەومستەحەق (١٤٢٩)
هەرکەسێک ترسا لەوی،ئیمەن دەکا ‌ ‌ ‌ هەردڵێک ترسا لەوی چیمەن دەکا (١٤٣٠)
هەرکەسێک ترسی لەغەیری خوانییە ‌ ‌ ‌ دەرسی تەشجیع بۆ وی هیچ هیچ چا نییە (١٤٣١)
ئەو دڵەی ترساوی،وی،زۆرشادکرد ‌ ‌ ‌ خاتری،وێرانی وی ئاباد کرد (١٤٣٢)
**پێی دەکوت پاشان کەلامی زۆردەقیق ‌ ‌ ‌ باسی وەسفی پاکی حەق (نعم الرفیق)** (١٤٣٣)
باسی لوتفی خوا دەگەڵ ئەبداڵ کرا ‌ ‌ ‌ تا مەقام وحاڵ لەوی بێ، ئا شکرا (١٤٣٤)
حاڵ وەکوو دیداری جوانی تازەبوو ک ‌ ‌ ‌ ئەو مەقامەش خەڵوەتە، گەڵ نازەبووک (١٤٣٥)
شاد بەدیدار شاه، هەروا غەیری شاش ‌ ‌ ‌ وەختی خەڵوەت هەربەتەنها شاهی باش (١٤٣٦)
عام وخاس زاهیر لەوان، دیداری بووک ‌ ‌ ‌ وەختی خەڵوەت شا بەتەنیا یاری بووک (١٤٣٧)
سۆفی زۆریان هەن، لەنێو دا، ئەهلی حاڵ ‌ ‌ ‌ کەم لەوان ئەهلی مەقامن، نەک محاڵ (١٤٣٨)
بۆی بەیان کردچەندەجێ،چوو،گیانی وی ‌ ‌ ‌ چەن سەفەرچوو، ڕووحی پاک وجوانی وی (١٤٣٩)
بۆی بەیان کردئەو زەمانی بێ زەمان ‌ ‌ ‌ ئەو مەقامەی بوو کەئیجلالی نیشان (١٤٤٠)
ئەوفەزایەی نێو ئەوی سیمورغی ڕووح ‌ ‌ ‌ زۆرلەمەوبەر دیتی پەروازو فتووح (١٤٤١)

[1]- هۆشمی برد بەڕاس ( مصرع دوم)

خۆڵـەڕاس پـەروازی ڕووح ئافـا ق، چـووک زیاد لەویست وحیرسی شەخسی چاوچنووک[1] (١٤٤٢)
چـون عومەرئەوقاسـیدەی دی یـاری حـەق دی کـــەگیانی تـــالبی ئەســــراری حـــەق (١٤٤٣)
شـێخی کامیــل بووعومـــەر ئـــەو قاســـیدی حــــــــازرو ئامادەبۆئیرشــــــــاد دەدی (١٤٤٤)
چونکەقاســــید قـــابلی ئیرشـــــاد بــــوو مورشـیدی ویـش زۆربەئیرشـاد، شـاد بـوو (١٤٤٥)

**پرسیار کردنی قاسید لە ئەمیرولموئمینین(رض)..**

وایـــدەکوت قاســـید بـــەمیری ڕاســـتکار گیـــان لـــەباڵا،پێم بڵـــێ چـــۆن هاتـــەخوار (١٤٤٦)
تەیری بێ حەد، چۆنی جێ بوو نێو قەفەس جـــوابی داوەهەربەئـــەمری (کـــن)بووبـــەس (١٤٤٧)
چی عەدەم بێ گـەرچی نەی بێ عـەقڵ و هۆش هەر بە ئەمری(کن) بـە فـەوری دیتـە جۆش (١٤٤٨)
گەربـە(کـن)فـەرمان درا بـۆ گشـت عـەدەم هەربەسـەربۆلای وجـوود دێـن نـەک قـەدەم (١٤٤٩)
گـەر لـەبۆ مـەوجوود ، بـێ ، ئـەمری خـودا ئەو لە مەیدانی عـەدەم ئەسپ ، لینگ دەدا (١٤٥٠)
ئەو بەگوێی گوڵ رازی کوت خەندانی کرد ئـەو بـە بـەردی کـوت، عـەقیقی کـانی کـرد (١٤٥١)
خـوا بەجیسمی ئا یـەتێک کوت،بوو بـەگیان وای بـــەڕۆژ کـــوت تـــاکو نـــووری داجیهـــان (١٤٥٢)
جـــارەکی دی خـــوا بـــەڕۆژ فـــەرمان دەدا ڕەش، دەبـــێ تاریـــک دەبێ،نوور،لـــەو جـــودا (١٤٥٣)
چـی بەهـەوران کـوت دەگریـەن وا بـەزار؟ ئەشـکی عـەترا ویـان لـەچاوی دیتـەخوار؟ (١٤٥٤)
چـی بـەگوێی خـاک ڕا گەیانـد،داخوا،خودا؟ وا موراقیـــب ماوەخـــامووش بـــێ ســـەدا (١٤٥٥)
هەرکەسـێکی هـەی بـێ تەردیـدو گومـان خـــوادەڵێ بەگوێی،موعەممایـــەک نیهـــان (١٤٥٦)
تـــاکو زینـــدانی ببـــێ نێـــو دوو گومـــان کێهەئـــــەنجام دەم، دەڵێ،ئەو،لـــــەو دووان (١٤٥٧)
خوالـەبۆی تـەرجیح دەدا یـەک لا، لـەوان ئینتیخـابی یـەک دەکـا، ئـەو جـا، لـەوان (١٤٥٨)
تـاکو نـەیبێ هۆشـی گیانـت قـەت گومـان تۆ،بە،پەنبـەی قـەت مەیاخنـەگوێی گیـان (١٤٥٩)
تاکوتێبگەی،تۆموعـــــەممای کردگـــــار تـــاکو پێبگـــەی تۆبەســـیرڕو ئاشـــکار[2] (١٤٦٠)
جێی سرووش و وەحیی حەق بەس گوێی گیان وەحیـــی گوفتارەنـــەوەک گفتـــی زبـــان (١٤٦١)
چاو و گوێی گیان غـەیری حێسسی زاهیرین گوێی عەقڵ و گوێی گومان خۆ،لێک بەرین (١٤٦٢)
جـــەبرەباعیس گەرعیشـــق ســـەبری نییـــە ئەوکەســـەی عاشـــق نییەجـــەبری نییـــە (١٤٦٣)

---

[1]- زیادلەئافاق یەک یەکەی پەروازی وی زیاد لەویستی تامع و داخوازی وی
[2]- تا موعەممای کردگار، تۆ، تێبگەی تا بە سیرڕ و جەهری وی تۆ پێبگەی
تاکو تێبگەی تۆ، موعەممایانی وی تاکو پێبگەی ئاشکرا و پنهانی وی

کـوانێ جـەبرە؟بوون دەگـەڵ خوایـە، ئـەوە　　مـانگی ئاسـمان بـێ هەور،چاردەشـەوە (۴۶۴)

گـەرکو جـەبریش بـێ، نەجـەبرە بۆعـەوام　　بـۆ خـەواس جـەبرە، نەئـەممارەی نـەفام (۴۶۵)

جـەبری خاسان،لەوکەسـانەبوو عـەیان　　چـاوی دڵیـان ئـا وەڵای کردخـوا، لـەوان (۴۶۶)

غـەیبی داهاتو،لـەلای وان ئاشـکرا　　باسـی ڕا بـوردو لـەلای وان بـێ بـەها (۴۶۷)

زۆری فەرقەجـەبری وان وئیختیـار　　قەترە،گەوهەر،نێوسـەدەف،نەک زاری مـار (۴۶۸)

قـەترەتا بارانـە، گـەورەو چووکەنـە　　نێـو سـەدەف دا، دوڕڕی قـورس وسـووکەنە (۴۶۹)

تـەبعی خاسـان تـەبعی نـافی ئـاهوان　　خـوێن بـەزاهیر، باتینیشـی موشـکی جـوان (۴۷۰)

تۆمـەڵێ ئەومایـە، خـوێن بـوو دوورلـەناف　　چـۆن کەچۆ،ناف،ئەو،دەبێتەموشـکی سـاف؟ (۴۷۱)

تۆمـەڵێ چاو،مس،کەچەندەکـەم بـەها　　چـۆن دەبـێ زێـڕ گەردەگـەڵ ئیکسـیر خـرا (۴۷۲)

ئیختیـارو جـەبری تـۆ تـەنیا خـەیاڵ　　بۆخەواسـان نـووری زاتـی بـێ هـەواڵ (۴۷۳)

چاولـەنان کەئەولەسەرسـفرە،جەماد　　نێوبـەدەن هـات،چۆن دەبێتـەرووحی شـاد (۴۷۴)

نـان لەسـەر سـفرەکەنابێتەگیان　　گیـان بەکۆمـەک خـوا دەکـا بـەگیان، نـان (۴۷۵)

حـەق بەهـەر دووکیـان موحیتـە، ئـەی فلان　　چۆنـەداخوا قـودرەتی ئـەوگیانی گیـان؟ (۴۷۶)

ئـادەمی گۆشـتی، کەهـەیتی عـەقڵ وگیـان　　لـەت دەکـا کێـو هەروهالـەش بـەحرو کـان (۴۷۷)

زۆری گیـانی کووهکـەن، شـەقی حەجـەر　　زۆری گیـانی گیـان لـە(انشـق القمـر) (۴۷۸)

دڵ سـەری هـەنبانی ڕاز گـەرواز دەکـا　　گیـان بەرەوعەرشـی خـودا پـەروازدەکا (۴۷۹)

**ئادەم ئیشتیبای خۆی بە خۆی نیسبەت دەدا و دەڵێ (ربنا ظلمنا) و شەیتان گوناهی خۆی بە خودا نیسبەت دەدا و دەڵێ (بما اغویتنی) ...**

تـۆ تەماشـای کـاری مـەوکاری خـودا　　کـاری ئێمـەش وەک حەقیقـەت ئاشـکرا (۱۴۸۰)

کـاری خـەڵکی گـەرکو نـەی بـێ ئیعتیبـار　　تـۆ مەپرسـە، باشـە پیسـە چۆنـە کـار (۱۴۸۱)

هەرخودایـەخالقی ئـەفعالی مـە　　هەرنیشـانەی خـەڵقی حـەق، ئـەعمالی مـە (۱۴۸۲)

ڕوویـی وێـژەر یابەحەرفـەیا غـەرەز　　غـەیرەمومکین بێ، لەیـەک دەم دوو عـەرەز (۱۴۸۳)

یابەمـەعنی یابەحەرفـە ڕووی، تـەواو　　چونکەیەک دەم نەی دی پاش وپێش بەچاو (۱۴۸۴)

ئـەو زەمانـەی تـۆدەبینی پێشـی خـۆت　　کـوا دەبینـرێ ئەوزەمانـە، پـاش لـەبۆت؟ (۱۴۸۵)

لـەفزو مـەعنی نـین دەیـەک دەم دا، گیـان[1]　　چـۆن دەیـەک دەم چـا دەکـا هـەردووکیان؟ (۱۴۸۶)

---

[1]- لەفز و مەعنی نین دەیەک دەم بۆ گیان ( مصرع اول)

حەق بەهەردووکیان موحیتەئەی فلان     مەنعی خوا ناکا، لەکارسووک وگران (١٤٨٧)

ییدەکوت شەیتان (بما اغویتنی)     کردی کاری خۆی نیهان دێوی دەنی (١٤٨٨)

ییدەکوت ئادەم (ظلمنانفسنا)     ئەو لەکاری خۆی کەقەت غافڵ نەما (١٤٨٩)

جون گوناهی خۆی بەخۆی نیسبەت دەدا     شامیلی حاڵی دەبوولوتفی خودا (١٤٩٠)

ینی تۆبە، وای بەئادەم کوت مەگەر     من دەتۆم دا چا نەکردئەوەدەردەسەر؟ (١٤٩١)

بەگەرنەت دی قەزای من بوو ئەوە؟     وەختی عوزرت بۆچی لێت ون بووئەوە؟ (١٤٩٢)

حوابی دا ترسام کەمن، بم‌بی‌ئەدەب     خوا کوتی پاداشی تۆ، بێ، لوتفی ڕەب (١٤٩٣)

بحتیرامت بێ، دەبینی ئیحتیرام     قەند بدەێ هەڵوا دەبەی، ئەی خۆش مەرام (١٤٩٤)

تەییبات لایق بەکێنە؟ تەییبین     دیارەسوودی،دۆست کەشاد کەی باغەمین (١٤٩٥)

یەک میسالم بۆبڵێ ئەی دڵ، دیار     تابزانی فەرقی جەبرو ئیختیار (١٤٩٦)

جۆ کەلەودەستەی دەلەرزێ سەر بەخۆ     هەروەها دەستێک کەدەی لەرزێنی تۆ (١٤٩٧)

هەردوو لەرزین، چاکراوی خوا یی ناس     نارەوایەگەرکولێکیان کەین قیاس (١٤٩٨)

تۆبەشیمانی کەدەستت دا، تەکان     قەت پەشیمان نابێ لەرزۆک هیچ زەمان (١٤٩٩)

ی عەقڵە، عەقڵی جوزئی حیلەگەر     تا فریو دا ئەو زەعیفی بێ بەسەر (١٥٠٠)

ی عەقڵی گەردورو مەرجان بێ     وەک ئەوەی نابێ کەباسی جان بێ (١٥٠١)

ۆری فەرقەباسی گیان وباسی دی     هیچ شەرابت وەک شەرابی گیان نەدی (١٥٠٢)

ی عەقڵی ئەودەمەی بوو ئیعتیبار     بوو عومەرگەڵ بووجەهل هەمرازویار (١٥٠٣)

جون عومەرعەقڵی لەڕێی گیان لادەدا     بوو بەبووجەهل بولحەکەم لەوحوکمەدا (١٥٠٤)

ئەو بەنیسبەت عەقڵی جوزئی کاملە     گەرچی ئەونیسبەت بەگیان زۆرجاهیلە (١٥٠٥)

ی عەقڵ وحیس سەبەب بوویا ئەسەر     باسی گیانی‌بێ بەسەر،لەوبێ خەبەر (١٥٠٦)

نووری گیان هات ونەما ئەی موستەزی     لازم ومەلزووم و نافی وموقتەزی (١٥٠٧)

جونکەبینا چاک دەبینێ چاوی وی     نای هەوێ ئەوهیچ دەلیلێکی قەوی (١٥٠٨)

**تەفسیری (و هو معکم اینما کنتم )...**

جارەکی دی ڕوون لەداستان کردەوە     هەر دەوی داین نەک لەبیرمان بردەوە (١٥٠٩)

جــــەهلی ئێمـــــە، هەروەکووزینـــــدانی وی عیلمــــــــی ئێمە،کاخەیائـــــــــەیوانی وی (١٥١٠)
گەردەخـــەودابین هــەموو مەســتی ئــەوین گــەرکو وشــیاربین لــەژێر دەســتی ئــەوین (١٥١١)
گــەر بگریــەین، هــەوری پڕزەڕقــی ئــەوین ئــەو دەمــەی گــەر پێکــەنین بــەرقی ئــەوین (١٥١٢)
جــەنگ ودەعوامــان نیشــانەی قــەهری وی ســوڵح وعوزریشــمان نیشــانەی میهــری وی (١٥١٣)
لـــەو جیهانـــەبا بـــزانین ئێمـــەچین وەک ئــەلیف هیچی نییــە، وەک وی دەچین (١٥١٤)

**سوئال کردنی قاسید لە عومەر(رض) لە عیللەتی موبتەلابوونی ئەرواح بە ئاو و قوڕی ئەجساد...**

سیرڕوحیکمەت چی بوودەیکوت ئەی عومــەر ڕووحــی واســاف جێــی لــەنێوقوڕ تەنگەبــەر (١٥١٥)
ئـــاوی ســـافی چـــاو دەنێوقـــوڕدا ونـــە ڕووحــی ساف بەستەی لەشە، ئەو دوژمنە (١٥١٦)
جـــــوابی داوەبەحســــەکەت زۆرجالبـــــە لای تـــــۆ مەعنی،حەرفــــەبۆ وی قالبـــــە (١٥١٧)
حەپســی مــەعنیت کردوخســتەنێو قەفــەس خســتەزینداني حــرووف تۆبــای نەفــەس (١٥١٨)
تاکو،نـــەفعت پـــێ بگـــا، وات کـــردووە دوورلەنـــەفعی،کوانێ نـــەفعت بـــردووە؟ (١٥١٩)
ئەوکەســـەی قـــازانج ونـــەفعان چادەکـــا هـــەرچی دەیکـــا، چـــا،دەزانێ جا،دەکـــا (١٥٢٠)
ســـەدهەزاران ســـوود دەوەێـــدا بەرهەمـــە ســـەت هـــەزاران لای یـــەکێکی وان کەمـــە (١٥٢١)
ئەوکەمـــەی گوفتـــاری تۆ،ســـوودی هەیـــە کـــوللی عالـــەم چـــۆن بڵـــێن بـــێ بەهرەیـــە؟ (١٥٢٢)
تۆکـــەجوزوی،کاری تۆســـــوودی هەیـــــە بـــۆدەبێ پێـــت وابـــێ کـــول بـــێ بەهرەیـــە؟ (١٥٢٣)
تـــاکو نـــەی بـــێ ســـوود،مەڵێ تـــۆهیچ وتـــار هـــەی بـــوو بیڵـــێ شـــوکری زاتـــی کردگـــار (١٥٢٤)
تۆقی ئەستۆی هەرکەسێک شو کری خـودا ڕوویــی تــرش وگــژ لەشــوکری خــوا جــودا (١٥٢٥)
ڕووتــرش بــوون گەربێتەشــوکر و بــەس چەشــنی سرکەشــوکرێ ناکــاهیچ کــەس (١٥٢٦)
ســـرکەبیوێ جێـــی لـــەنێو دڵ دا ببـــێ پێــی بڵــێ، تێکــەڵ بەشــەکری بــا ببــێ (١٥٢٧)
موشــکیلەمەتڵەب بەشــێعران بــێ ئــەدا قۆچــــەقانی کــــەم نیشـــــانان لێـــدەدا (١٥٢٨)

**دەبارەی ئەو مەتڵەبە کە (من اراد ان یجلس مع الله فلیجلس مع اهل التصوف) یەعنی هەر کەس بیهەوێ دەگەڵ خودا دابنیشێ دەبێ دەگەڵ ئەهلی تەسەووف دابنیشێ...**

چون لەعیرفان خواردی قاسید یەک دوو جام چـوو لـە بیـری ئـەمر و فـەرمان و پـەیام (١٥٢٩)
زۆرعەجـــەب،ما،قودرەتی خـــوای دی وەهـــا هەرگەیشتەئێرەقاســـــید بـــــوو بەشـــــا (١٥٣٠)
ئـاوی سـێڵاو هاتـە دەریـا بـوو بـە، یـەم بووبەکشـت وکـاڵ لەمــەزرا دەنکـی کـەم (١٥٣١)

هەرکەنانی جامیدی خواردگیان لەبەر     نانی بێ گیان،گیانی گرت و با خەبەر (١٥٣٢)
ێوو داریش چون فیدایی نار،بوون     جوان مونەووەر، بوون کەچی، زۆرتاربوون (١٥٣٣)
جاو، لەبەردی،کل،کە،هاتەچاوەکان     زیاد دەکا ئەو نووری چاوی دیدەبان (١٥٣٤)
خۆش بەحاڵی وەی کەخۆی،خۆی دا نەجات     نێووجوودی دائیمەن زیندوودەهات (١٥٣٥)
ێ بەحاڵی وەی ڕەفیقی ناکەسە     ئەولەنێو دەریای ژیان چەشنی خەسە (١٥٣٦)
ا بەقورئانی خودات ڕەفتار بێ     تا کورووحی ئەنبیا ت بۆیار بێ (١٥٣٧)
جۆنکەقورئان وەسفی حاڵی ئەنبیا     ماسیانی بەحری پاکی کیبریا (١٥٣٨)
ەرکو قورئان تۆبخوێنی نەک بەدڵ     ئەنبیا ت، دیوون، لەوانت،کرد،سڵ (١٥٣٩)
ەرکوبخوێنی بەدڵ تۆلەوقەسەس     تەیری گیانت تەنگەبۆ،وی، نێو قەفەس (١٥٤٠)
ەیرەکی کەنێوقەفەس زیندانییە     فکری دەرچوونی نەبێ نادا نییە (١٥٤١)
ڕۆح لەزیندانی قەفەس گەر بوو ڕەها     ڕابەری شایستەبۆ، وین ئەنبیا (١٥٤٢)
ەس لەڕێی دین، دێن، دەڵێن پێن ئەنبیا     ڕێی نەجاتی ئێوە، دین،دیاری کرا (١٥٤٣)
ەس لەڕێی دین، بوو، نەجاتمان لەوقەفەس     ڕێی نەجات بوون هەربەتەنیا دینەبەس (١٥٤٤)
خۆت نەخۆش کە، زارو لاواز،ناتەوان     تانەمێنی بۆت لەشوهرەت هیچ نیشان[1] (١٥٤٥)
وهرەت وئاوازەبەندی محکەمە     کوا لەڕێی دین ئەو لەبەندی،دی،کەمە؟ (١٥٤٦)

**داستانی تاجرێکی کە تووتی پێی کوت کاتێ کەبۆ تیجارەت چوویە هیندوستان وەڵامی من بە تووتیەکانی هیندوستان ڕابگەیەنە...**

**خولاسەی داستان..**

تاجرێک تووتیەکی جوانی دەقەفەس دا ڕاگرتبوو. ڕۆژێک ویستی کە بۆ تیجارەت بچێتەهیندوستان. پێش ئەوە کە وەڕێ کەوێ تەواوی ئەهلی خانەوادەی بانگ کرد و بە هەر یەک لەوانی کوت لەو سەفەرە چت بە دیاری بۆ بێنم؟ هەر یەکەی شتێکی لێ ویست کاتێ کە نۆبە گەیشتە تووتی، پێی کوت ئەتۆ چجوورە دیاریەکت دەوێ؟ تووتی پێی‌کوت: کاتێ کە گەیشتیە هیندوستان و تووتیەکانی وەکوو منت دیتن حاڵ و وەزعی منیان بۆ بەیان کە و پێیان بڵێ کە قەزای ئاسمانی ئەمنی دەقەفەس هاویشتووە و لە ئێوە کۆمەکی دەوێ و پێیان بڵێ ئایا ڕەوایە کەئێوە بە خۆشی و سەلامەتی هەڵفڕن و ئەمنیش بە تەنیا و غەمگین دەگۆشەی

---

[1]- خۆت نەخۆش و ناتەوان کە، زار، زار     تا لە شوهرەت خەڵکی بتکەن بەرکەنار

قەفەس دابم؟ تاجر چۆ هیندوستان و دەگەڵکوو وەڵامی تووتیەکەی بە تووتیەکانی هیندوستان ڕاگەیاند. یەکێک لە تووتیەکان لە سەرلکی داریَ کەوتە عەرزی و مرد. تاجر لەکوتنی ئەو وەڵامە پەشیمان بوو. کاتێ کەبۆ وڵاتی خۆی گەڕاوە ئەو دیاریانەی کە وەعدەی دابوون دای بە ساحەبەکانیان و لە ئاخردا تووتی پێی‌کوت ئەدی دیاری من کوا؟ تاجر پێی‌کوت ئەمن لەوە کە وەڵامی تۆم ڕاگەیاند، پەشیمانم. تووتی پێی‌کوت بۆ پەشیمانی؟ تاجر پێی‌کوت کاتێ کە ئەو وەڵامەی تۆم ڕاگەیاند، یەکێک لە تووتیەکان جێ‌بەجێ مرد و کەوتە عەرزی. لەو کاتەدا تووتیەکەش لەرزی و دەنێو قەفەس دا کەوت. تاجر لە شیددەتی نارەحەتی یەقەی خۆی دادەدڕی و دەگەڵکو لە قەفەس هینایە دەر هەڵفڕی و خۆی نەجات دا ...

تـــووتی یێکـــی بـــوو لەشـــارێک تـــاجرێ — نێوقەفـــەس بـــوو نەیدەهێشـــت بێ‌بـــۆ‌دەرێ (١٥٤٧)

کـــاتێ تاجرویســـــتی بـــــڕوا بۆســـــەفەر — تـــا بـــەرەو هیندووســـتا ن ئـــەو بچتـــەدەر (١٥٤٨)

چـی غـوڵام بـوو‌چی کـەنیز بـوو، پێیـدەگۆت — چـــت دەوێ بیڵـــێ هـــەتا بێـــنم لـــەبۆت (١٥٤٩)

هەرکەســـە، دەیکـــوت هـــەچێکی ویســـتبا — تـــــاجریش قـــــەولی دەدا چـــــی بیســـــتبا (١٥٥٠)

ڕووی لـەتووتی کـرد کـوتی وەک دووسـتان — چـــت لـــەبۆبێنم کـــەچووم هیندووســـتان (١٥٥١)

پێیـدەکوت تـووتی کـەتووتیت دیـن، لـەوێ — تـــــۆبڵێ حــــــاڵم بەوان‌ئەوهـــــــەم دەوێ (١٥٥٢)

تـــۆبڵێ، پێیـــان فـــڵان تـــووتی لـــەلام — وا‌قـــەزای ئاســـمان ئـــەوی خســـتۆتەدام[1] (١٥٥٣)

بـووی سـەلام بۆتـان ودەی ویسـت یارمـەتی — پێـی نیشـان دەن ڕێـی نـەجات لەونەکبـەتی (١٥٥٤)

کـــوا ڕەوایـــــەمن بـــــەدەردی ئیشـــــتیاق — لێرەبمـــــــرم، وا، لــــــەهیجران وفیـــــراق؟ (١٥٥٥)

کـــوا ڕەوایـــــەمن لەبەنـــــدی وا‌گـــــران؟ — واش لەخۆشـــــی دان ئێـــــوە، کـــــوا بـــــران؟ (١٥٥٦)

کــوا مەگـــەر، وایـــە وەفـــایی دۆســـتان؟ — مـن لـە حـەپس و ئێـوە جێتـان بۆسـتان؟ (١٥٥٧)

بێننـــەبیرتان ئـــەی عـــەزیزان ئـــەمنی زار — گـەر سـەبووحی وخـوارد لـەنێوان مێرغـوزار (١٥٥٨)

یار‌موبـا رەک بووکـــەکردی یـــادی یـــار — خاســـــــەلەیلی یادبکـــــا، مــــەجنوونی زار (١٥٥٩)

ئـەی ئەوانـەی گـەڵ بـوتی خـۆو، بردەسـەر — چـا ولـەمن کـەن، شـەربەتم خـوێنی جگـەر (١٥٦٠)

تۆ‌بـەیادی مـن وەخـۆ، یـەک جـامی مـەی — گـــەرکو دەت وێ‌تۆ‌بـــەدادی مـــن بگـــەی (١٥٦١)

یـــا بــــەیادی ئەوغەریبــــەی بـــێ نـــەوا — پـــــاش وەخواردن‌تۆبڕێژە‌چی‌کــــــە، مــــــا (١٥٦٢)

کـوانێ سـوێندو کـوانێ پـەیمان وقـەرار؟ — کـوانێ وەعـدەی لێوی‌قەنـد‌دای، چەنـدجار (١٥٦٣)

گەرخەراپــــەم کـــرد، بۆیـــە، دوور‌خــــرام — فـەرقی ئێمـەو فـەرقی تـۆچی ئـەی چـرام؟ (١٥٦٤)

---

[1]- وا، لەزیندانی منە کەوتۆتە دام (مصرع دوم)

...ەدی کەی تۆلەکاتی قەهروجەنگ    زۆرلەلام خۆشترلەهەرچی دەنگی چەنگ (١٥٦٥)

...ی جەفای تۆ،زۆر،لەدەولەت چاترە    ئینتیقامی تۆلەگیان بالا ترە (١٥٦٦)

...ەلوتفت تۆکەقەهرت بوو، وەها    ماتەمت،وا، چۆنە، شادیت، داخوا (١٥٦٧)

...ەتیفی کوا کسێک زانی کەچی؟    شیرنە جەورت کوا، شتێ، وەک وی دەچی؟ (١٥٦٨)

...ەترسام من لەناڵەناڵی خۆم    تا بەلوتفی کەم نەکا جەوری، لەبۆم (١٥٦٩)

...ەعیشقی قەهرو لوتفی سادقم    زۆرعەجەب،من چۆن بەدوو زید عاشقم (١٥٧٠)

...ەخارستان،بچم بۆ چیمەنێ    سوێن دەخۆم بۆخار دەگێرم شیوەنێ[1] (١٥٧١)

...ەجەب ئەوبولبولەی وەیکات زار    تا کو بخوا،خارو گوڵ نێو مێرغوزار (١٥٧٢)

...ەڵێم بولبول نەهەنگی ئاگری    ئەولەعیشقان تاڵ بەشیرن دەی گری (١٥٧٣)

...ەکول عاشق دەبوو،هەرکوللەئەو    عاشقی خۆیتی،حەقیقەت، نەک بەخەو (١٥٧٤)

**سیفەتی بالی بالندانی عقولی ئیلاهی...**

...تی گیان هەروەکوو تووتی قەفەس    کوانێ مەحرەم بوو بەتەیران کامەکەس؟ (١٥٧٥)

...نێ تەیرێکی زەعیفی بێ گوناە    باتنی وی، بوو سولەیمان و سوپاه؟ (١٥٧٦)

...ر بنا لێ بێ گلایەوبێ سپاس    دێتەغەوغا ئاسمانێ، نەی بوو باس (١٥٧٧)

...دەمەی سەدنامەهەم پەیکی خودا    جوابی یارەب،شەست لەبیەیکی خودا (١٥٧٨)

...تیبای چاتر لەتاعەت لایی حەق    خۆ لەڕاستی کفری، ئیمان بێ شەبەق (١٥٧٩)

...حزدلەحزەئەودەبا میعراجی خاس    دادەنێ سەرتاجی وی سەد،تاجی خاس (١٥٨٠)

...وورەتی سەرخاک و گیان سەرلامەکان    لامەکانێک فەوقی وەهمی سالیکان (١٥٨١)

...ەکانێک دوورلەفام بێ ئەی هەواڵ    چا نەکا هەردەم لەبۆ،تۆ، یەک خەیاڵ (١٥٨٢)

...و بەدەستی وی مەکان ولامەکان    وەک بەهەشتی،بووی،بەدەس،چوار،جۆی ڕەوان (١٥٨٣)

...مکە، لەو باسەئەتۆ،شەرح وجەواب    بەس، خودا تەنیا دەزانێ ڕێی سەواب (١٥٨٤)

...ینەوەسەرئەسڵی مەتڵەب دووستان    باسی تەیرو تاجرو هیندووستان (١٥٨٥)

...وی تاجر لێی قەبووڵ کردئەوپەیام    هەم بەتووتیان ڕا گەیێنێ لەو سەلام (١٥٨٦)

---

1- چەشنێ بولبول من دەگێرم شیوەنێ ( مصرع دوم)

### دیتنی پیاوی تاجر تووتیەکان لە بیابانێکی هیندووستان و گەیاندنی پەیامی تووتیەکەی خۆی بەوان...

کاتێ چۆ هیندووستان جێگایی دوور
زۆری تووتی دین لە سەحرا جوور بە جوور

ڕادەوەستاوپێیکوتن تاجرتەمام
چی لەلای بوو،هەم سەلام و هەم پەیام

یەک لەتووتیان دەستی کردەلەرزەلەرز
بێ نەفەس ما،دەرچووگیانی کەوتەعەرز

بوو،پەشیمان، بۆ،کوتم من ئەو خەبەر
بۆچی باعیس بووم هیلاکی گیان لەبەر؟

خزمی ئەوتووتیەی منەداخوا ئەوە
یانەیەک ڕووح بوو لەبۆ،دووان، پێکەوە؟

بۆچی وام کرد بۆگەیاندم ئەو پەیام؟
بۆ، ئەوەم سووتاند بەقەولی وەک نەفام؟

ئەو زبانەچەشنی بەردو ئاسنە
ئاووری، لێ چا دەبێ ئەو لەو کونە

بەردو ئاسن لێک مەدەبێهوو دەتۆ
قەت لەڕووی نەقڵ و لەڕووی لاف و درۆ

چون جیهان تاریک و هەر لاش پەنبەزار
تۆ لەنێو پەنبەبزانەچۆنەنار

زاڵم ئەوقەومەن کەچاویان نایەێێک
بەو وتان، سووتاندیانن عالەمێک

یەک قسەی بەد،یەک جیهان وێران دەکا
چەققەڵی مردوو وەکووشێران دەکا[1]

گیان لەئەسڵی خۆی هەموو عیسا دەمە
بۆ برین یەک دەم، دەمێکیش مەڵحەمە[2]

گەرحیجابی گیان لەنێوان لا بچێ
قەولی هەرگیانێک وەکووعیسا دەچێ

گەرکو بت وێ تا وتەت بێ وەک شەکەر
تۆبەسەبرت حیرس وخۆشی دەرکەدەر

شەخسی زیرەک، سەبرەبۆ وی،ئیشتیبا
لای منالیش غەیری هەڵوا، ئیشتیبا

ئەوکەسەی سەبری هەبوو گەردوونە جێی
ئەوکەسەی هەڵوایی خوارد هەر دوونە جێی[3]

### تەفسیری قەولی فریدالدین عطار(قدس اللەسرە...):

تو صاحب نفسی ای عاقل میان خاک وخون می خور
کە صاحب دل اگر زهر خورد، آن، انگبین باشد

شەخسی کامیل نابێ، بۆوی، هیچ زیان
گەرکو بخوات ژەهری قاتل ئەو عەیان

چونکەسالم ما، لەپارێز بووی نەجات
تالبی مسکین لەتەب، دا، تازەهات

---

[1]- عالەمێکی، یەک وتار وێران دەکا
زۆرلەڕێوی مردوو وەک شێران دەکا

[2]- گیان لەئەسڵی خۆی هەموو یان پاک پاک
جار لەبەن ئازادو جارجار بەندی خاک

[3]- هەرکەسێ سەبری هەبوو جێی لای سەرە
هەرکەسێ هەڵوایی خوارد جێی پاش دەرە

وی بەخواهانی جەدەل کوت مستەفا   تۆ،دەگەڵ مەتلووب نەکەی کێشەوهەرا (١٦٠٥)
گەڵ هەوا ی نمروود مەڕۆ،بۆ،نێو نار   بووی بەئیبراهیم، بڕۆ،ئەو دەم بەغار (١٦٠٦)
چونکەنازانی دەدەریادا مەلە   خۆت بەدەریا دا مەدە، نەیکەی پەلە (١٦٠٧)
ئەولەبن یەم،گەوهەری دینێتەدەر   چی زیان بێ لا دەچێ،سوود دیتەسەر (١٦٠٨)
شەخسی کامیل خاک بەدەستی زێڕ دەکا   شەخسی ناقیس زێڕبەدەستی پووشکەکا (١٦٠٩)
چون قەبوولی خوایەپیاوی ڕاستی وا   بۆهەمووکار دەستی وی دەستی خودا (١٦١٠)
دەستی ناقیس دەستی شەیتان و جنە   چون دەبەندی داوو، مەکرا ن، دا، ونە (١٦١١)
بوو بەزانست لایی کامیل،جەهل، سەهل   شەخسی ناقیس لای وی زانست بوو،بەجەهل (١٦١٢)
چی نەخۆش بخوا نەخۆشی زیاد دەکا   کاملیش کفری هەبێ، دین، یاد، دەکا[1] (١٦١٣)
ئەی پیادەی گەڵ سووار دەعوا دەکەی   زەحمەتەسەردەر بەری بۆ،وادەکەی؟ (١٦١٤)

**تەعزیم کردنی ساحیران لە حەزرەتی مووسا(ع) کە دەستوورت چیە؟ ئەووەڵ ئەتۆ عەسا داوێی یا ئێمە؟**

**تەمسیل**

ئەبیاتی سەروو تەفاوەت و مقایەسەیە لە نێوان مورشیدانی کامیل و مونتەهی و سالکانی ناقیس و موبتەدی بە عەمەل هاتووە، جا لە بۆ میسال دەئەبیاتی داهاتوودا بە قەزییەی حەزرەتی مووسا(ع) و ساحیران ئیشارەکراوە. ساحیران لە دەورانی فیرعەون دەستیان کرد بە دەعوا و موجادەلە، لەگەڵ حەزرەتی مووسا(ع) ئەمما بە خاتری موراعاتی ئەدەب بە حەزرەتی مووسایان پێشنیهادکرد کە ئەووەڵ ئەو موعجیزەی خۆی زاهیربکا، ئەمما حەزرەتی مووسا قەبووڵی نەکرد و کوتی ئەووەڵ ئێوە شرووع بکەن. هەر ئەوەندە ئیحتیرامە و ئەدەبە کە ساحیران نیسبەت بە حەزرەتی مووسا قائیل بوون بۆ سەبەب کە دینی ڕاستی و ئیمانی واقعی وەدەست بێنن. ئەمما بەخاتری دەعوا و عینادیان دەگەڵ حەزرەتی مووسا، دەست و پێیان بە برین چوو...

ساحیرانی عەهدی فیرعەونی لەعین   کردیان کێشە، دەگەڵ موسا بەکین (١٦١٥)
خۆبەلام ویستیان کەمووسا پێش کەوی   ساحیران قەدریان دەنا یەک یەک لەوی (١٦١٦)
چونکەکوتیان هەرچلۆن تۆپێت بوو باش   باوێ ئەووەڵ تۆعەسات و ئێمەپاش (١٦١٧)
پێیکوتن مووسا، تەعاروف لابنێن   مەکری خۆتان ئێوەئەووەڵ دابنێن (١٦١٨)

---

[1] - چی نەخۆش بخوا لەبۆ وی تاوو تین   کفری کامیل، عاقیبەت بۆی بوو ،بەدین

هەربەوەندەقەدرە، دینیان پێ کرا — بەس بەدەعوا دەست وپێشیان لێ بڕا[1] (۶۱۹)
چونکەزانیان ساحیران حەق هەر ئەوە — دەست و پێ یان بەو عیناد دا، پێکەوە (۶۲۰)
لوقمەهەم نوکتەلەبۆ کامیل حەڵاڵ — تۆکەکامیل نی مەخۆ، هەرلاڵ بەلاڵ (۶۲۱)
چونکەتۆ گوێی،ئەوزەبان،نەک جینسی توو — خوابەگوێی دەستوور وەهادا (انصتوا ) (۶۲۲)
گەرمناڵ هات تازەبۆ،دونیای نووێ — ماوەیێک بێ دەنگەسەرتاپای گووێ (۶۲۳)
لازمەبەینێک ببەستێ لێوی خۆ — هیچ نەڵێ تافێردەبێ ئەوگوفتوگۆ (۶۲۴)
گەرکو نەی بێ گوێ لەوەختی خۆی مناڵ — لاڵ دەکا خۆی ئەو،لەدونیا لاڵ لاڵ (۶۲۵)
بۆکەڕێ،زگماک هەوەڵ چون گوێ نییە — لاڵە، فکری بۆ وتارو،دوێ، نییە (۶۲۶)
چونکەئەووەڵ لازمەگوێ بۆ وتار — تۆ لەڕێی گوێ فێربەگوفتار، وایەکار (۶۲۷)
هەربەدەرکان ئێوەوارد بن بەماڵ — هەرلەڕێی عیللەت تەڵەب کەن شیرن وتاڵ (۶۲۸)
نوتقەکی کەنەی بێ بەگوێ هیچ نیاز — هەربەتەنها،نوتقی خوا ی دانایی ڕاز (۶۲۹)
ئەو،لەئوستاد،بێ نیازە، خالقە — بۆهەمووعالەم پەنایە، لایقە (۶۳۰)
غەیری خالق هەم لەسەنعەت هەم مەقال — تابعی ئوستادوموحتاجی میسال (۶۳۱)
لەو وتانەگەرنەبی بێگانەتۆ — ئەشک ودەڵقت بێ لەجێی وێرانەتۆ (۶۳۲)
چونکەئادەم هەربەئەشکان بووی نەجات — تۆبەکاران ئەشکی تەریان هەردەهات (۶۳۳)
هەربەگریان هات ئادەم سەر زەوی — تا لەگریان ولەناڵین نەسرەوی (۶۳۴)
ئەو لەجەننەت سەر،سەری، ئاسمانی حەوت — وردە،وردە،بۆعوزرئەوڕێ دەکەوت (۶۳۵)
گەرئەتۆ پشت ونیژادی ئادەمی — وەک ئەوی و دۆستانی وی، بە، بێ کەمی (۶۳۶)
بیکەنۆغڵ،ئاوری قەلب وئا وی چاو — جوانەبێستان هەربەهەورو نووری تاو (۶۳۷)
کوا دەزانی چەندەخۆشەئاوی چاو؟ — وەک نەدیتکان[2]، تۆ،بەدووی نان هەڵوەداو (۶۳۸)
گەرلەنان خاڵی بکەی هەنبانەکەت — بۆت لەگەو هەرپڕدەکا خوای بانەکەت (۶۳۹)
شیری شەیتان بەس بدەمنداڵی گیان — تا ڕەفیق بی، گەڵ فریشتەی ئاسمان (۶۴۰)
گەربەپیس،تۆ،ڕووحی خۆت کەی تار تار — تۆڕەفیقی دێوی پیسی نابەکار (۶۴۱)
لوقمەیێکی زیاد دەکا نووروکەماڵ — لوقمەیێکەدێ وەدەس لەو ڕێی حەڵاڵ (۶۴۲)
نەفتەکی کە، بێت و، خامووش کا چرا — کوانێ نەفتە؟ ئا وە، وایە، ئەی برا (۶۴۳)

[1]- هەر بەوەندە قەدرە دینیان پێ کرێ — هەر بە دەعوا دەست و پێی وانیان بڕێ
[2]- وەک گەدایان (مصرع دوم)

ـیـ وحیکمەت چادەکەن لوقمەی حەڵاڵ ... عیشق ورەئفەت، چا دەکەن لوقمەی حەڵاڵ (١٦٤٤)
ـەلوقمەت، تۆحەسەد، دی یانە، دام ... غەفڵەتی هینا، بزانەئەو حەرام (١٦٤٥)
چۆن دەبێ، گەنمی بچێنی و، جۆیی، بەر؟ ... چۆن لەماین دیتەدونیا جاشەکەر؟ (١٦٤٦)
ـنە. تۆوە،خۆ، بەری، وی، فکروبیر ... لوقمەبەحرەگەوهەرێ وی فکر وبیر (١٦٤٧)
ـردنی لوقمەی حەڵاڵ لێی دێ وەدی ... مەیلی چوون بۆ لای خوداو دونیایی، دی (١٦٤٨)

**بیاوی تاجر ئەوەی کە، لە تووتیەکانی هیندووستان دیتبووی بۆ تووتیەکەی خۆی دەگێڕێتەوە...**

ـش کڕین تاجر گەڕا وەخۆشحاڵ ... زۆر بەخۆشحاڵی گەڕاوە، هاتەماڵ (١٦٤٩)
ـغولامان هەرچی وەعدەی دا بوو، دای ... بۆکەنیزهەدیەی، دەدا،چی با ش بوولای (١٦٥٠)
تووتی پێیکوت کوانێ هەدیەی من ئەدی؟ ... هەرچی دیتت پێم بڵێ، وەک ئیدەدی (١٦٥١)
ـبی دا،لای وان پەشیمانم کەچووم ... دەیگەزم قامکان ودەستی خۆم دەجووم (١٦٥٢)
ـەبەرچی بۆ م گەیاندی ئەوپەیام؟ ... بۆگەیا ندم من وەکووشێت ونەفام؟ (١٦٥٣)
ـیکوت ئەی خواجە، پەشیمانی لەبۆ؟ ... بۆبەڕق دا چووی وغەمناکی ئەتۆ؟ (١٦٥٤)
ـبی داوە،دەردی تۆم من کرد بەیان ... بۆگرووهێک،تووتی وەک تۆ،بوون ئەوان (١٦٥٥)
ـەتووتیان دەردی تۆی ئیحساس کرد ... زوو،زراوی چوو، دەلەرزی کەوت ومرد (١٦٥٦)
ـپەشیمانم کەبۆچیم کوت ئەوە؟ ... خۆبەلام بێ سوود،پەشیمان بوونەوە (١٦٥٧)
ـڕوتێکی گەربەیانی کرد زەبان ... چەشنی تیرێکە دەری کرد ئەو،کەوان (١٦٥٨)
ـەرێ، ڕا،ناچێتەجێی، لێی، هاتەدەر ... پێشی سێڵاو تۆ دەبێ بگری لەسەر (١٦٥٩)
ـگری دونیا یەک، لەسەرچاوەی،کەهات ... هیچ عەجەب نابێ خەراکا،گەروڵات (١٦٦٠)
ـئەسەر،بۆ،کار، لەپشتی پەردەنە ... خالقی وان خوا،تەنێ نەک بەردەنە (١٦٦١)
ـنی مەخلووقی خودان کاروئەسەر ... گەرچی زاهیر، ئێمە، بووینە کارگەر (١٦٦٢)
ـی هاوێشت زەید، بۆ،عەمر، وەک خەدەنگ ... عەمری ڕاو کردتیر،بۆخۆی، وەک پەلەنگ (١٦٦٣)
ـبرین، دەرد،موددەتێکە، دوایەبەس ... خالقی دەرد غەیری یەزدان هیچ کەس (١٦٦٤)
ـی تیرهاوێژ ئەگەرمرد ئەودەمە ... سەهمی عەمری، تا ئەجەل دەردو غەمە (١٦٦٥)
ـبەئێشی ئەو برینەی تیر، کە، مرد ... زەیدەقاتڵ چونکەتیری دەر،دەکرد (١٦٦٦)
ـش ودەردان تۆبدەنیسبەت بەوی ... خالقی کول گەرچی خوای باڵاو نەوی (١٦٦٧)

وایەچاندن هەم نەفەس،داوو جیماع    گشتی چاکراوی خودایی موستەتاع (۶۶۸)
ئەولییایان قودرەتی پێدان خودا    تا وەگێرن تیر، لەرێ، گەر بوو رەها (۶۶۹)
گەروەلی بی وێ دەبەستی رێی سەبەب    چۆنی ویست ئەو بۆی دەبەستێ دەستی رەب (۶۷۰)
خەرقی عادەت ئەو دەکا،بەو،فەتحی باب    تانەسووتێن هیچیان، سیخ وکەباب (۶۷۱)
چی لەقەلبان وزبانان ئەو کەبیست    ئەو وتارەی مەحو،کرد، چۆنی کەویست (۶۷۲)
گەرتۆ دەت وێ عیللەت وبورهان وەها    تۆ بخوێنەئا یەتی(اوننسها ) (۶۷۳)
تۆ،بخوێنەئایەتی (انسوکم)وو    تابیبنی قودرەتی وان موو بەموو (۶۷۴)
چون بەتەزکیرو بەنیسیان قادیرن    سەرهەمووقەلبانی خەڵکان قاهیرن (۶۷۵)
گەربەنیسیان ئەو ببەستێ رێی نەزەر    کار لەدەستی نایە،با،هەی،بێ هونەر (۶۷۶)
مە سخەرەو کرد ئێوەئەهلی با کەماڵ    تاکو (انسوکم )بخوێنە،ئەی هەواڵ (۶۷۷)
پادشاهی جیسمی ئێوەشای وڵات    شای دڵان ساحەبدڵە، وەک رۆژهەڵات (۶۷۸)
چی عەمەل بێ، فەرعی دیتن تۆبناس    بۆیە، رەشکێنەخولاسەی کوللی ناس (۶۷۹)
بانەکەم چیدی ئەمن باسی حەزان    چونکەرازی نینەساحەب مەرکەزان (۶۸۰)
چون فەرامۆشی وزانین دەستی وێن    چون بەدەستی وینەغەم هەم پێکەنین (۶۸۱)
لا دەبا، بەو، حەق، لەقەلبی روون وتار    پاک وپیسان هەرشەوەی، چەن سەدهەزار (۶۸۲)
حەق،بەرۆژ قەلبان دەکا پرپر لەبیر    نێوسەدەف ئەوودادەنێ دورری مونیر (۶۸۳)
بەوهەمووئەفکاری پێشووی جوانی خۆی    چون هیدایەت بوودەنا سێ گیانی خۆی (۶۸۴)
دێن لەبۆلات سەنعەت وئادابی خۆت    تاکو،وەیکەن دەرکی ئەسبابان لەبۆت (۶۸۵)
شوغڵی ئاسنگەرنەچوو، بۆ،زەرگەری    خولقی خۆش ئەخلاق نەچۆ،بۆ، بەدفەری (۶۸۶)
رۆژی قیامەت سەنعەت وخوو،بێ،کەمی    دێن لەبۆلای ساحەبی خۆ،وەک گەمی (۶۸۷)
سەنعەت وخوو، پاشی وشیار بوون لەخەو    دێن لەبۆلای ساحەبی خۆیان بەدەو (۶۸۸)
سەنعەت وبیر،پاک وپیسیان پا ش خەوێ    دەچنەجێ یەک پێش خەوێ، بوو، بوون لەوێ (۶۸۹)
هەروەکووکۆترانی پەیکی نامەبەر    دێننەوەبۆشارەکەی خۆیان خەبەر (۶۹۰)

## بیستنی ئەو تووتیە حەرەکاتی تووتیەکانی هیندووستان و مردنی ئەو تووتیە دەقەفەسدا..

وەزعی ئەو تووتیەی کەبیست تووتی قەفەس    زوو دەلەرزی کەوتەعەرزی بێ نەفەس (۶۹۱)
خواجەکاتێ دیتی تووتی وا بەچاو    راپەری ئەوتوند لەعەرزی دا کڵاو (۶۹۲)

هەر کەتاجرتووتی وا دی ڕا پــــەڕی  هەربــەگریان ئەویەقــەی خــۆی دادڕی (١٦٩٣)
..یکوت ئەی تووتی نەجیب وخۆش سەدا  چیت بەسەرهات بۆچی تۆکەوتوی وەها؟ (١٦٩٤)
..ئەسەف بۆتەیری خۆش ئا وازی مـن  سەدئەسـەف بۆهەمـدەم وهـەمڕازی مـن (١٦٩٥)
..ئەسەف بۆتەیری خۆش ئا هەنگی من  ڕاحـەتی مـن بـاغی مـن هـاودەنگی مـن (١٦٩٦)
..ر سولەیمان تـەیرەکی والـەی هـەبا  بـێ نیـاز بـا ئـەو، لەتـەیری دی دەبـا (١٦٩٧)
..ئەسەف بۆتەیری ئاسا ن هاتەدەست  زوو لەدەستم چـوو لـەوی چا وم دەبەست (١٦٩٨)
..ی زەبـا ن، زۆرت لـەبۆمن بووزیـان  زۆرغـەمت تـۆدان بـەمن هـەر وەک چییـان (١٦٩٩)
..نی هـەم ئـاووری تۆ،ئـەی زەبـان  بـەس تۆئـاور، بەردەخەرمـەن بـێ ئـەمان (١٧٠٠)
..ن لەدەستت ناڵـەوو غـەوغا دەکـا  گـەرچی هـەرچی پێی بڵـەێ ئـەو وا دەکـا (١٧٠١)
..ی زەبان هەم گـەنجی بێ پایانی تۆ  ئـەی زەبـان هـەم دەردی بێ دەرمـانی تـۆ (١٧٠٢)
..سریوەو فێڵـی تـەیرا نـی ئـەتۆ  هــەم ڕەفیقــی ڕۆژی هیجرانــی ئــەتۆ (١٧٠٣)
..ئـەمانم پێ دەدەی ئـەی بێ ئـەمان  تۆلەبۆقــەتلم بەدەســتت گــرت کــەمان (١٧٠٤)
..یری گیانمـت هەڵفرانـد ڕۆی،دوور، زۆر  بــەس بخۆ،تۆ،لەولەوەڕگــەی زوڵــم وزۆر (١٧٠٥)
..عیلاجی مــن کــە، یــا، دادم بــدە  یــا لەئەســبابی فــەرەح یــادم بــدە (١٧٠٦)
..ئەسەف من چوولەدەستم سوبحی ڕوون  نووروخۆشـی وهـەرچی شـادی بـوون چـوون (١٧٠٧)
..ئەسەف چوو تەیری خۆش پەروازی من  ئەوپەڕیـدەی دەشـت وسـەر،هەورازی مـن[1] (١٧٠٨)
..قی ڕەنجانــەنادان تــا ئەبــەد  هەســتە(لا اقســم)بخوێنــەتا(کبــد) (١٧٠٩)
..تۆ،بـووم، نـەبوو بـۆ مـن کەبـەد  تا لـەجۆت بووم ساف بووم، من بێ زەبەد (١٧١٠)
..ـەبۆ بینینە،ئــەوەدادو ئەســەف  دوورلــەخۆبوون وجــودایی بــوون هــەدەف (١٧١١)
..ی حـەق بـوو کـەتووتی مـرد ئـەوا  کــوا دڵــی تێیــدا نــەبێ عیشــقی خــودا؟ (١٧١٢)
..ی غیـرەت یـەعنی غـەیری عالەمـە  ئەوکەســەی، وەســفی بکــا، دونیا،کەمــە (١٧١٣)
..کی مــن بریـا، ببـا دەر یـا هــەتا  مــن نیســاری یــاری جــوانم کردبــا (١٧١٤)
..کەم ئەی تەیری هۆش سەرشاری من  دیلمــانجی فکــرو هــەم ئەســراڕی مــن[2] (١٧١٥)
..ی خۆشــی یانــەڕۆژی دەردوئــێش  هــەرچی بـا دەیکـوت لـەبۆمن ئەو،لـەپێش (١٧١٦)
..ی یێکــی دێ لــەوەحیی، دەنگــی وی  پـێش وجوودبوو،بـا نـەبووبێ ڕەنگـی وی[1] (١٧١٧)

---

١- چوونەدەستم هەرچی بووداخوازی من (مصرع دوم)
٢- تەرجومانی فکرو هەم ئەسراڕی من (مصرع دوم)

بـــاتنی تۆ،تـــووتی وای تێـــدا ونـــە ‌ ‌ ‌ عەکســی وی دیارەلــەچی پیــاوو ژنــە ٧١٨)
لا،دەبـا شـادی، لــەتۆ،تۆش شــاد شــاد ‌ ‌ ‌ تۆقەبوولتــەزولمی وی، وەک عــەدڵ وداد ٧١٩)
ئـەی ئـەوەی سـووتاندی گیـانی بـۆ بـەدەن ‌ ‌ ‌ گیـانی سـووتاند،زینەتی دا جیسـم وتـەن ٧٢٠)
مـن دەسـووتام، دەیهـەوێ سـووتاو چکـەس؟ ‌ ‌ ‌ تــا بــەمن ئــا ور،بــدا، ئەوخاروخــەس ٧٢١)
چونکـــەقابیل بـــەو فتیلـــە، ئـــاگرە ‌ ‌ ‌ ئــەو فتیلــەی دەگــرێ ئــا گــر، وەرگــرە ٧٢٢)
ئەی‌ئەسەف‌ئەی‌وای‌ئەسەف‌ئەی‌سەد‌ئەسەف ‌ ‌ ‌ ون بـوو مـانگم چەشـنی دوورِی نێـو سـەدەف ٧٢٣)
چـی بڵـەم مـن، دڵ کـەپرپڕ بـوو لـەنار ‌ ‌ ‌ خـوێن دەرێـژێ شـێری توورەی هیجری یار ٧٢٤)
گەر بە وشیاری کەسێک بێ توند و مەست ‌ ‌ ‌ چۆن دەبێ گەر بگرێ جامێک ئەو بەدەست ٧٢٥)
شـێری مەسـتی نـاکرێ وەسـف وبـەیان ‌ ‌ ‌ زیـاد، دەکـا ئـەومێرغوزاری زۆر جـووان ٧٢٦)
فکــری قافیــەمن دەکــەم، دڵــداری مــن ‌ ‌ ‌ پێـێم دەڵـێ فکـرت بیـێ دیـداری مـن ٧٢٧)
فکــری قافیــەتۆ مەکــەوەک هــیچ کــەس ‌ ‌ ‌ قافییـەی دەوڵـەت لـەلای مـن تـۆی وبـەس ٧٢٨)
فکــری حــەرفان لانــێ تــۆ، بــۆلای قــەراغ ‌ ‌ ‌ چونکەحـەرفان وەک درِوون،بـۆ دەوری بـاغ ٧٢٩)
حـەرف ودەنـگ وگفت هەرسێ تێـک دەدەم ‌ ‌ ‌ تابــەبێی وان هەمــدەمت بــم دەمبــەدەم ٧٣٠)
ئەوسـورەی کـردم لــەئا دەم مـن نیهـان ‌ ‌ ‌ پێت دەڵەم ئەو،ئەی، تۆ، ئەسراڕی جیهان ٧٣١)
ئەو سورەی کە، نەم دەکو ت من، بۆخـەلیل ‌ ‌ ‌ ئەوغەمـەی کـەبێ خەبـەر لـەو جـەبرەئیل ٧٣٢)
ئەوسورەی کـە، قـەت مەسیح نـەدوا، لـەوی ‌ ‌ ‌ خوا بەبێ (ما)نەی دەویست قەت دەرکەوی ٧٣٣)
(مـا)دەلۆغـەت مـەعنی وی ئیسبات ونـەفی ‌ ‌ ‌ مـن کەئیسـبات نیمـەهیچ،بێ زات ونـەفی ٧٣٤)
ئەودەمـــە،من هــەم وجــوودم بــێ فــەنا ‌ ‌ ‌ مـن وجـوودی خـۆم لەبۆیـەکردە(نـا) ١٧٣٥)
هـــەرچی شـــایەعەبدەبۆ،بەردەی دەخـــۆ ‌ ‌ ‌ خـەڵکی مـردوون گشـتی بـۆمردەی دەخـۆ ١٧٣٦)
هـــەرچی شایەپەســتی پەســتی خۆیــەتی ‌ ‌ ‌ هـەرچی خەڵکـە، مەسـتی مەسـتی خۆیـەتی ١٧٣٧)
خـۆی دەکـا سـەیبا د، لەبۆتـەیران بـەڕاو ‌ ‌ ‌ تالـــەناکاو ئەوئـــەوان بێخیتـــــەداو ١٧٣٨)
عاشـق ومەعشـووق کـەدڵیان وەک یەکـە ‌ ‌ ‌ هەردووعاشق هەردوومەعشووق نەک یەکە ١٧٤١)
عاشـــق ومەعشـــووق هـــەردوو عاشـــقن ‌ ‌ ‌ هەردوومەعشـــووقن لـــەعیقش ســـادقن ١٧٤٠)
تینــوان گــەر،وان بــەدووی ئــاو دا،دەوان ‌ ‌ ‌ هـــەروەهاش ئـــاو تالیبـــەبۆ تینـــوان ١٧٤١)
چونکەعاشــــقەئەو،ئەتۆ،دەنگت نەیـــــە ‌ ‌ ‌ گـوێی کەکێشـای چـی بڵـێ تـۆ گـوێ دەیـە ١٧٤٢)
بەنـــد کەســـێلاو،چونکەئەو گەربێتەســـەر ‌ ‌ ‌ تێـک دەداو، وێـران دەکـا چـی بێتەبـەر ١٧٤٣)

---

١- پێش وجوود بوو گەرچی نەن دی ڕەنگی وی (مصرع دوم)

ـن چباکم بێ کەویرانی دەبێ؟ / ژێری ویران،گەنجی سوڵتانی دەبێ (١٧٤٤)
ـەرقی حەق دەی وێ کەزیاتر بێت غەرق / چەشنی مەوجی بەحری گیان نەی بێت فەرق[1] (١٧٤٥)
ـێ تەفاوەت خۆشەدەریا ژێرو سەر / کامەخۆشترتیری وی یا خۆ سپەر؟ (١٧٤٦)
ـێ گرفتاری دەداوی وەسوەسە / گەربەلاهات و بڵەی تۆ بەو بەسە (١٧٤٧)
ـەرمورادت شیرنەچەشنی شەککەرە / بێ مورادی و،ویست،مورادی دڵبەرە (١٧٤٨)
ـەجمەکی وی خوێن بەها بۆسەدهیلال / خوێنی عالەم لەو حەلاڵ بێ قیل وقال (١٧٤٩)
ـەد بەها،هەم خوێن بەهامان هاتەدەست / ئێستەوەختەگیان فیدا کەین بۆمەبەست (١٧٥٠)
ـەی ژیانی عاشقانی گیان نیسار / تۆدڵی وان هەرلەلای خۆت دەقەرار (١٧٥١)
ـە هەویست تا من وەدەس بێنم دڵی / ئەوبەهانەی گرت ولای دا،رووی گوڵی (١٧٥٢)
ـن کوتم خۆغەرقی تۆ نە، عەقڵ وگیان / پێی کوتم تۆبرۆ، مەڵێ بۆم داستان (١٧٥٣)
ـن لەفیکروبیری تۆ مام، بێ خەبەر / دۆستی خۆت ئەی خێل چلۆن هات بەرنەزەر؟ (١٧٥٤)
ـەی گران جان تۆ منت دی زۆر بەپەس / چونکەهەرزا ن تۆ منت کەوتۆتەدەس (١٧٥٥)
ـەرکەسێ هەرزان کڕی هەرزان دەدا / گەوهەرێک تیفلێک بەدانێک نان دەدا (١٧٥٦)
ـەرقی عیشقێکم لەوی غەرقن هەموو / عیشقی ئەووەڵ عیشقی ئاخیرهەرچبوو (١٧٥٧)
ـوختەسەرکردم ئەمن مەتڵەب بەیان / چون دەسووتێن گشتی، ئەفهام وزەبان (١٧٥٨)
ـۆی دەریام مەقسەدە، گەر،لێو بڵەم / (لا) بڵەم (الا) م مەرامە، پێو بڵەم (١٧٥٩)
ـونکەشیرنم،دێمە،بەرچاو ترش وتفت / بۆیەماتم چونکەگەنجم گەنجی گفت (١٧٦٠)
ـ کۆشیرین بوونمان لەو دووجیهان / با، دەپەردەی رووترش دابێ نیهان (١٧٦١)
ـەو. وتەی چون نابێ بۆ هەرکەس بڵەم / من لەسەد سیرڕی (لدن) یەک، بەس بڵەم (١٧٦٢)

**تەفسیری قەولی حەکیم: به هر چه از راه وامانی چه‌کفر، آن حرف و چه ایمان، به هر چه از دوست دور افتی چه زشت آن نقش و چه زیبا.**

**و دەبارەی قەولی پێغەمبەر(ص): ان سعدا لغیورو انی اغیر من سعد والله اغیر منی و من غیرته(حرم الفواحش ما ظهر منها و ما بطن)..**

ـۆیە.عالەم وان بەغیرەت، چون خودا / وا لەغیرەت دا لەپێش هەموا ن، دا (١٧٦٣)
ـەک گیان ئەو،ئەوجیهانەش وەک بەدەن / باش وبەد،ئەبدان،لەگیان را، دێن، دەبەن (١٧٦٤)

---

[1] - زیندەدەی وێ غەرقی حەق ون بێ دەوی / چەشنی مەوجی بەحری گیان باڵا و نەوی

هەرکەسێ (عـین الیقـین) محرابـی، بـێ ئەولـــەبۆئیزهاری ئیمـــان نـــابی، بـــێ (١٧٦٥)
هەرکەسێ‌بێ، قەننـــەداری شـاهی خـۆی زۆر،زیانەگـــەرتیجارەت کـــا، لـــەبۆی (١٧٦٦)
هەرکەسێ بۆشـا، ئـــەنیس وهەمدەمـــە دابنیشـــێ گەرلـــەلای دەرکـــە، کەمـــە (١٧٦٧)
گـەرکو بتـوانی کـەماچ کـا دەسـتی شـاه گـەرکوماچ کـا لاقـی شـا بـۆ وی گونـاه[1] (١٧٦٨)
گـەرچی سـەر دانـان لەسـەرلاق خزمەتـە خۆلەحاسـتی مـاچی لاق یـەک زیللەتـە (١٧٦٩)
کابرایـەک غیرەتـی خـوای،دێ بەسـەر پـاش ئـەوەی،دیتی،بچێ، بـەدوای ئەسـەر (١٧٧٠)
غیرەتـی حـەق بۆمەسـەل وەک گەندمـە کـایی خەرمـەن غیرەتـی ئەومەردمـە (١٧٧١)
هـەرچی غیـرەت بـێ لەحـەق ڕا دێ وەدی فـــەرعی وینـــەغیرەتی خـــەڵکی دەدی (١٧٧٢)
باسی غیـرەت بـەس بێ، دەردی دای بـەمن یـاری چـەن دڵ باسی ئـەو کـەم وای بـەمن (١٧٧٣)
مـــن دەنـــاڵم چونکەناڵـــەی خۆشـــەلا دوو جیهـــان بۆناڵـــەوو غـــەم بـــێ بهـــا (١٧٧٤)
چـۆن نـــەناڵم مـــن لەبەردەســـتانی وی؟ چونکەنیمـــــەمن لـــــەنێو مەســـــتانی وی (١٧٧٥)
چـۆن نـەناڵم وەک شـەوی زۆرتـارورەش؟ چون لەوەسڵی ڕوویی ڕۆژی نەم بوو بـەش (١٧٧٦)
هـــەرچی ناخۆشـی لـــەوی بـێ خۆشـەلام مـــن بـــەیاری دڵ شـــکێنم گیـــان فیـــدام (١٧٧٧)
مــــن بــــەدەردورەنج وئێشــــم عاشــــقم تـــاکو شـــادبێ پـــێم ئـــەمن شـــای ســـادقم (١٧٧٨)
ڕەش دەکەم چاوم بەسورمەی خاکی غـەم تـــاکو دەریـــای چـــاو بەگەوهەرپڕبکـــەم (١٧٧٩)
ئـــاوی چـــاوان گەرلەبـــەر،وی بێتـــەخوار ئـــــــاو مەزانەگەوهەرێکەشـــــــاهوار (١٧٨٠)
مـن شکایەت چۆن لـەگیانی گیان دەکـەم؟ تـــاکو،فێر،بن لـــێم ئـــەمن گریـــان دەکـــەم (١٧٨١)
دڵ کـوتی مـن بەوشـکاوم نـەک خـەنیم بـــەو نیفاقـــەی سســـتی وی مـــن پێکـــەنیم (١٧٨٢)
ئـــەولیبا، فـــەخریان ئـــەتۆی مـــن وایـــەپێم ئـەی تۆسـەدری مـەجلیس و بەردەرکـەجێم (١٧٨٣)
خۆ،لەمـــەعنا بـــێ تـــەفاوەت ســـەدر و خـــوار (مـا)و(مـن)هیچ،گـەردیار بـێ ڕوویـی یـار (١٧٨٤)
ئـەی نـەجات بـووی تۆلەحەپسی(مـا)و(مـن) ئـەی لەتیفـەی ڕووح دەپیـاودا هـەم دەژن (١٧٨٥)
پیاووژن چـون یـەک ببن ئـەو یـەک ئەتۆی گـەر نـەمێنن یـەک یەکە، ئەو،تـەک ئـەتۆی (١٧٨٦)
(مـــا)و(مـــن)یاپیاووژن،تۆ،چـــات کـــرد تا لەمـەخلووق خـۆت نیشان دەی وات کـرد (١٧٨٧)
ئـــەو مـــن وتۆیانەگـــەربوون یـــەک گییـــان غـەرقی جانـان بـوون هـەموویان هیچ نـەمان (١٧٨٨)
ئەوهەموو،هـەن،تۆش وەرەئـەی ئـەمری(کن) وەسـفی تـۆ نـاکرێ بەغـەیری(مـن لـدن) (١٧٨٩)
کـوانێ جیسـمێک گـەرببینێ ڕوویـی تـۆ؟ بێتـــەفیکری شـــادی وغـــەم، خـــوویی تـــۆ (١٧٩٠)

---

[1]- گەرکو لاقی ماچ بکا، بۆ وی گوناه. ( مصرع دوم)

ێ کەگیرۆدەی غەمانەو پێکەنین — چۆن دەبینێ خوای سەماوات وزەمین؟ (١٧٩١)
ئەوکەسەی بەستەی غەمانەو پێکەنین — ئەوبەوان دوو،عادەتی کردوەبەژین (١٧٩٢)
اغی بێ پایانی عیشقە،ئەی عەزیز — غەیری شادی وغەم لەوێن، میوەی لەزیز (١٧٩٣)
ئەدووحاڵەعاشقی، چاترلەوان — شین وشاداب،بێ بهار وبێ خەزان (١٧٩٤)
تۆزەکاتی ڕوویی جوانی خۆبدە — شەرحی گیانی پارەپارەتۆ، بدە (١٧٩٥)
هەم بەعیشوەهەم کریشمەی خۆی،گوڵم — داغی تازەی دادەنایەسەردڵم (١٧٩٦)
ئەوحەلاڵ بێ گەرچی مەرگی،پێم، دەچێشت — من حەلاڵم کوت منی توند جێ دەهێشت (١٧٩٧)
گەرلەناڵەی خاکیان هەڵدێتی بەغار — بۆدەڕێژی غەم لەسەرغەمناک بەبار؟ (١٧٩٨)
ئەی ئەوەی وەک ڕۆژ،بەیانان، دێیەدەر — عاممەنەفعت بۆجەمادو،ڕووح لەبەر (١٧٩٩)
بۆ،بەهانەت گرت لەیاری گیان فیدا؟ — ئەی جیهان بۆقەندی لێوت، کەم بەها (١٨٠٠)
ئەی لەبۆدونیایی کۆن تۆگیانی نوێ — بۆفیغانی جیسمی بێ گیان هەڵخە، گوێ (١٨٠١)
بێ گوڵ لا بە، ئەتۆخاتری خودا — باس کەبولبو ل چۆن لەگوڵ ئەو بوو جودا؟ (١٨٠٢)
خۆ لەشادی وغەم نییەقەت جۆشی مە — خۆ،خەیاڵ باعیس نییە، بۆ هۆشی مە (١٨٠٣)
ح ەتێکی دیکەیە، ئەونادرە — تۆ،مەبەمونکیر، کەحەق زۆرقادرە (١٨٠٤)
تۆقیباسی وا، لەئینسان قەت مەکە — چاو لەجەورو چاو لەئیحسان قەت مەکە (١٨٠٥)
هەرچی جەورەیانەئیحسان حادیسە — هەرچی حادیس بێ دەچێ،خوا واریسە (١٨٠٦)
بەیانی، بوو حیسامەددین لەلام — خوا پەنای بێ سەروەرم عالیمەقام (١٨٠٧)
حۆ پەناهی عەقڵی کولل وگییا ن ئەتۆی — گیانی گیان وڕوون کەری مەرجان ئەتۆی (١٨٠٨)
دێ لەئێمە،نووری ڕووت،ئەنگوت بەیان — مەی سەبووحیمان بەدەس گرت وەک گییان (١٨٠٩)
ەوشەڕابەی داتەمن تۆبوو مە، مەست — چۆن بەبادەی ڕەز،دەچێ هۆشم لەدەست؟ (١٨١٠)
دەبۆجۆشش گەدایی جۆشی مە — چەرخی گەردوونیش گەدایی هۆشی مە[1] (١٨١١)
ئێمەمەستی بادەنین ئەومەستی،مە — تەن بەئێمەهەستە،نەک بەو هەستی، مە (١٨١٢)
ئێمەمێش هەنگوین وقالب چەشنی مێو — خانەخانەن کرد زانست بچتەنێو (١٨١٣)

## رجووع بە حیکایەتی خواجەی تاجر...

لەوهەبەسکەباسی خواجەجا،بڵێ — چی بەسەرهات پیاوی واباش دا، بڵێ (١٨١٤)

---

1- چەرخی گەردوون جایگاهی هۆشی مە (مصرع دوم)

خواجەسووتابوو دەگریا، زار زار ... هاتەرانی کوت لەسەت زیاتر هەزار (۵
جار،تەناقوز جار، ناز وجار،نیاز ... جارِحەقیقەت ویستی وی بوو جار،مەجاز (۶
ئەوکەسەی نیزیکەقووم بێ، بۆ،نەجات ... چەنگ لەبۆهەرپنج وگیایەک ئەودەبات (۷
بەڵکەیێکیان ئەو نەجات دا لەوخەتەر ... دەست وپێی خۆی لێک دەدا تا بێتەدەر[1] (۸
خۆشەلای یار ئەوپەشێوی خاترە ... کۆششی بێ سوود لەخەوتن چاترە (۱۹
هەرکەسێکی شا، بێ ئەوبێ کار نییە ... زۆرعەجەب ناڵەی ئەوەی، بیمارنییە (۲۰
بۆیەفەرمووی،وا،خوداوەند ئەی فلان ... هەردەمەی مەشغوولی کارێک خوای جیهان (۲۱
بەوتەریقەهەرخەریک بە، تۆ، بەکار ... تاکو مردن قەت نەبی بێکار چجار (۲۲
تادەمی مردن کەژین پنهان دەبێ ... لوتفی حەق شامیل بەتۆی سوڕ زان دەبێ (۲۳
هەرچی بیکا گیانی پیاوان باژنان ... ئەو دەزانن چاوو گوێی پاشای گییان (۲۴

**فڕێدانی پیاوی تاجر تووتی لە قەفەس و هەڵفرینی تووتی مردوو...**

لەوقەفەس پاشان فڕێدا بۆ دەرێ ... هەڵفڕی سەردار،تووتی چۆ،سەرێ (۸۲۵
تووتیەکی مردوو وەهای پەرواز کرد ... چەشنی ڕۆژ،زوو،ڕووی بەرەو، هەورازکرد (۸۲۶
خواجەحەیران ما لەکا ری تووتیەکەی ... لێی عەیان بوو،دوایە،ئەسرار،یەک یەکەی (۸۲۷
ڕووی لەوی کردوکوتی ئەی عەندەلیب ... لەوبەیانی حاڵی خۆت بن بێ نەسیب (۸۲۸
ئەو،لەوێ چی کردفێربووی تۆ لەوی ... فێڵی وات کرد ئێمەسووتاین سەرنەوی (۸۲۹
جوابی داوەئەو بەکرداروا وتی ... لابنێ تۆدەنگی خۆش و دۆستی (۸۳۰
دەنگی خۆشت بوو،کەتۆی خستۆتەبەند ... خۆی مراندتووتی کەبۆ من بێ بەپەند (۸۳۱
یەعنی ئەی موتریب، لەبۆعالەم تەواو ... بمرە، وەک من تانەجاتت بێ لەداو (۸۳۲
دانەبی،تەیران دەخۆن تۆ،خۆشحاڵ ... خونچەبی،دەت بەن لەبۆ خۆیان منال (۸۳۳
دانەون کە،تۆ،بەکوللی،داو بە ... خونچەون کە، گیایەکی بێ ناو بە (۸۳۴
هەرکەسێکی جوانی ڕووی خۆی دا نیشان ... دێن بەلا، بۆ، وی وەکووتیر، بۆنیشان[2] (۱۸۳۵
فێڵ ومەکروکینەیی دەورو بەری ... چەشنی ئا وی مەشکەدەرژێن بۆسەری (۱۸۳۶

---

[1]- دەست و پێی خۆی لێکدەدا، بۆ حیفزی سەر (مصرع دوم)

[2]- هەرکەسیکی ئاشکراکا جوانی خۆی ... سەت قەزای بەد بەڵکە زیاتر دێن لەبۆی

[illegible] بۆحەســـــادەت دەیـــــدڕن ‌ ‌ ڕۆژگاری،دۆســـــتەکانی دەی بـــــڕن (١٨٣٧)
[illegible]ـەی غافــڵ لەچانــدن، مابــەهار ‌ ‌ کـــوا دەزانـــێ قیمـــەتی چیـــەڕۆژگار؟ (١٨٣٨)
[illegible]ـتی حــەق پشــت وپــەناهی ئێمەیــە ‌ ‌ چــون هــەزارا ن لــوتفی بۆڕووحــان هەیــە (١٨٣٩)
[illegible]ـەت دەس کـەوێ ئـەو جـووڕ پـەناه ‌ ‌ ئــاو و ئــاور بــۆت دەبــن هــەردوو ســپاه (١٨٤٠)
[illegible]ـەبوو دەریـا لـەبۆ مووسـا و نـووح؟ ‌ ‌ دوژمنــی وانــی نــەکرد ئەوقــەبزی ڕووح؟ (١٨٤١)
[illegible] نــار نــەبوو قەلعــەو پــەنا؟[1] ‌ ‌ نەیدەســووتاند قــەلبی نــەمرووديش دەنــا؟ (١٨٤٢)
[illegible] بـەحیای کێـو نـەکرد،تابێ ئـەمان؟ ‌ ‌ دوژمنـــانی دووی، بەبـــەردان ڕاونـــەنان؟ (١٨٤٣)
[illegible]ـت ئـەی یـەحیا وەرەبـۆلام بـەغار ‌ ‌ تاپـــەنات بـــم مـــن لەشەمشـــیری کوفـــار (١٨٤٤)

**[illegible]ناوایی تووتی لە خواجە و هەڵفڕینی وی...**

[illegible] دووپەندی، دا بەخواجە،خۆش مـەزاق ‌ ‌ دوایـــەپێی کـــوت (الســـلام والفـــراق) (١٨٤٥)
[illegible]ـی کـوت خـوات دەگـەڵ بـێ تـۆبڕۆ ‌ ‌ پێت نیشان دام ڕێگەیەک نوێ و باش ئەتۆ (١٨٤٦)
[illegible]ـخۆی کـــوت ئەوەپەنـــدی منـــە ‌ ‌ ڕێــی وی دەگــرم باشــە، ئــەو قەنــدی منــە (١٨٤٧)
[illegible] مـــن کەمترلـــەتووتی بێ،چیـــە؟ ‌ ‌ گیــان مــو بــار ەک پــێ نــەبێ خــۆهیچ نیــە (١٨٤٨)

**[illegible]بانی تەعزیمی خەڵک و مەشهوور بوون لەنێو جەماعەت ...**

[illegible]ـەس وایەبـــەدەن، بۆگیـــان دڕوو ‌ ‌ ئەوبەمـــەدداحان فریـــو دەدرێ چـــزوو؟ (١٨٤٩)
[illegible]ـی بـەو مـن دەبـم هـەمڕازی تـۆ ‌ ‌ یــەک دەڵــێ بــەومن دەبــم گیانبــازی تــۆ (١٨٥٠)
[illegible]ـێ وەک تـــۆ دەدونیـــادا نیـــە ‌ ‌ وەک تۆگـــەنجی بـــاش لـــەبونیا دا، نیـــە (١٨٥١)
[illegible]ـی عالـەم هـەموو ژێـر دەسـتی تـۆ ‌ ‌ گیــان لــەبۆگیانت هــەموو دەربەســتی تــۆ (١٨٥٢)
[illegible]ـدێ عالـــەم هـــەموو تالـــب بـــەون ‌ ‌ خــۆی بــەزۆردەگرێ و دەکــا زووخــۆیی ون (١٨٥٣)
[illegible]ـرئەو،چـەن هـەزارا ن وەک ئـەوی ‌ ‌ خســـتەنێو جۆ،دێـــو زەلیـــل وســـەر نـــەوی (١٨٥٤)
[illegible]ـحی خـەڵکی وەک غـەزای خـۆش زاهیـرە ‌ ‌ تۆمەخۆڵـــەو،کوا غەزا؟ئـــەو ئـــا ووره (١٨٥٥)
[illegible]ـری خـــۆش، نادیـــا رە، ئـــاووری ‌ ‌ دووکـــەڵی زاهیـــر دەبـــێ ئـــەوئاخری (١٨٥٦)
[illegible]ـەی ئــەو مەدحــەناکالێم ئەســەر ‌ ‌ بۆتـــەماع چـــۆن وادەکـــا ئـــەو حیلەگـــەر (١٨٥٧)

---

١- بۆ خەلیل ئاوور نەبوو پشت و پەنا؟ (مصرع اول)

گەرئـەوەی مـەدحت دەکـا هـەجووت بکـا    دڵ دەسـوووتێ وەک بـەئا وور،پـووش وکـا (۱۸۵۸)
گـەرچی زانیشـت ئـەوەی هـەجویتی کـرد    چـون تـەماعی بوو،بـەڵام هیچـی نـەبرد (۱۸۵۹)
ئەو،ئەسـەر،جێ گیـر لەقـەلبت چـەن زەمـان    وایەمـەدحیش، زووکەبیکـەئیمتیحان[1] (۱۸۶۰)
چەنـدرۆژان هـەردەمێنێ ئـەو ئەسـەر    تـافریودا ئەوگیانـەی خـۆڵ وەسـەر (۱۸۶۱)
چونکەشـیرین بوومـەدح دەی بـێ زەواڵ    هەردەمێنێ،زەم،کـەبوو ئـەو تفـت وتـاڵ (۱۸۶۲)
هـەروەکوو دەرمـانی بەدتامەهـەجوو    هـەرچی خـواردی حاڵـەتی وی تێـک دەچـوو (۱۸۶۳)
تـامی شـیرین کـەم دەمێنـی ئـەی هـەواڵ    زۆرلـەوی زیـاتردەمێنێ تـامی تـاڵ[2] (۱۸۶۴)
گـەرچی ئەوچووحاسـڵی وی،ریشـەدار    زید بەزیـد مـەعلووم دەبێ وەک ڕاست وخـوار (۱۸۶۵)
گەرلەحـەد زیـاتربخۆی تۆشـەکری خـۆش    نشـتەرت لازم،کـەلێت دێ سـۆ وجـۆش (۱۸۶۶)
مـەدحی زۆرەچادەکافیرعـەون هـەزار    خـۆت بەزۆر،مـەگرەبژی تۆ،زۆرهـەژار (۱۸۶۷)
بەندە،بـە، تۆ،قـەت ئەتۆسـوڵتان مـەبـە    گـۆ، بـە، لێـت دەن، قـەت ئـەتۆگۆچان مەبە (۱۸۶۸)
گـەر نەکـەی وا، هـەر کەنـەت مـا تۆجـەماڵ    جێت دەهێڵن دۆست ودەی کەن ئاش بەتاڵ (۱۸۶۹)
ئەوگرووهـەی کـەفریویان دا ئـەتۆ    ئێسـتەبت بیـنن دەڵـێن شـەیتانەخۆ (۱۸۷۰)
**هەرکـەدیتیانی لـەلای دەرکـە، دەڵـێن    چاو،لەقـەبری هاتـەدەر، مـردو، هـەڵێن** (۱۸۷۱)
هـەڕوەکوو،بێ موو،خـودا نـاوی بکـەن    تـا بەفێڵی،والـە، بـێن، ڕاوی بکـەن (۱۸۷۲)
چـون لەبـەدنامی کـەدەرهات ڕیشـی وی    عارەبۆشـەیتان بچـی وەدوای کـەوی (۱۸۷۳)
دیتـەلای ئینسـان شـەیتان بۆشـەڕی    چـی بـەتۆدا،چون وەکـوو،وی بەدفـەڕی (۱۸۷۴)
تاکوئینسـان بـووی شـەیتان بـوو لـەدووت    تادەگەڵ وی مەی وەخۆن هەردوو بەجووت[3] (۱۸۷۵)
چـون لـەخووی شـەیتان تۆ،بـووی، پایـەدار    زوو لەبەرتۆهەڵدێ،ئەو،ئەی،نابـەکار (۱۸۷۶)
کـۆ وەبـوون ئـەودەم هـەموو مـەدداح لـەلات    هـیچ نـەمان لات کـاتێ تـۆ،وات لێـدەهات (۱۸۷۷)

**تەفسیری (ماشاءالله کان)...**

ئـەو هەموویـەم کوت لـە بۆ تۆشـەی سـەفەر    ڕەحمـی خوامـان گـەر نـەبێ هیچـین، هـەدەر (۱۸۷۸)
گـەر نـەبێ لـوتفی حـەق وخاسـانی حـەق    گەرفریشـتەش بـێ دەبـێ ئـەو ڕەش وەڕەق (۱۸۷۹)

---

[1] - ئەوئەسەرجێ گیرلەقەلبی تۆدەبێ  وایەمەدحیش ،حاڵەتی وای خۆ دەبێ

[2] - هەرچی شیرن بێ دەچێ زووتامی وی  ئەو ئەسەر، دەروا، دەمێنێ نامی وی

[3] - تا شەڕابی وی، وەخۆن هەردوو، بەجووت (مصرع دوم)

ئەی خودا ئەی لوتفی تۆموشکیل گوشا     ئەی لەدەرگای تۆگەدانە، هەرچی شا (١٨٨٠)
تۆبەزەندەت ئێمە کردوەڕێ نموون     زۆر،لەعەیب و نەقسی ئێمە ون دەبوون (١٨٨١)
قەتردینێک عیلمی بەئێمەت دا ئەتۆ     تێکەڵی،کە، تۆ دەگەڵ دەریایی خۆ (١٨٨٢)
قەتردینێک زانست بەڕووحی من کەدات     لەوهەوایەوجیسمی خاکی دە، نەجات (١٨٨٣)
پێش ئەوەی خاک ئەولەخۆی دا ون بکا     پێش ئەوەی، با،ئەوبەری وەک پووشکەکا (١٨٨٤)
گەرچی،با،بی،با،بەلام تۆ قادری     گەرلەوی بستێنی دیسان، وەی گری (١٨٨٥)
قەترەیێکی بۆهەوا چوو یانەما     ئەولەگەنجی ڕەحمەتت دەڕوا،چما؟ (١٨٨٦)
گەرنەمێنی یانەسەدجار بێ عەدەم     گەرتۆبت، وێ دێ بەسەرئەونەک قەدەم[1] (١٨٨٧)
سەدهەزاران زید، زید ئیمحا، دەکا     جارەکی دی حوکمی تۆ ئەو چا،دەکا (١٨٨٨)
ئێن لەدونیایی عەدەم بۆلای وجوود     لەحزلەحزە، دەستەدەستەوەک جنوود (١٨٨٩)
حەفکرو عەقڵی هەرکەس کاتی شەو     دەچتەدەریای بێ بن وپایانی ئەو (١٨٩٠)
ڕۆژی بەیانان گشت ئەوەی، بوو،باسیان     سەرلەدەریا دێننەدەر،وەک ماسیان (١٨٩١)
ئەوهەمووگیایەوگەڵا، کاتی خەزان     گشتی دەمرن دەچنەنێودەریای نەمان (١٨٩٢)
قەل ڕەشی پۆشی،دەگریازار زار     نێو گولستان تا نەمێنی سەبزەزار (١٨٩٣)
دیتەوەفەرمانی حەق بۆلای عەدەم     هەرچی خواردت بیدەوەبێ زیادوکەم (١٨٩٤)
هەرچی خواردت وەی دەوە ، ئەی مەرگی ڕەش     داروگیابێ،یانەگوڵ بێ خۆش وگەش (١٨٩٥)
ئەی براگیان بێنەسەر،هۆش،جا روبار     چون دەتۆ دان، دائیمەن پایزو بەهار (١٨٩٦)
جۆو لەباغی دڵ کەشینەوخۆش چەمەن     پڕلەخونچەوگوڵ،لەسەروو یاسەمەن (١٨٩٧)
هێن گەڵا هەن،نادیارە،لک لەدار     هێندەگوڵ هەن کاخ و سەحرا نادیار (١٨٩٨)
ئەوتەی سەرچاوەکەی عەقڵی کولە     بۆنی وی گو لزارە، سەروە، سونبولە (١٨٩٩)
گوڵ نەبێ،چۆ ن دێت بۆنی، خۆشی وی     مەی،نەبێ، چۆن تۆ دەبینی جۆشی وی (١٩٠٠)
بۆن لەبۆ،تۆ،ڕەهنەمایەو ڕەهبەرە     تۆدەبا ئەوجێی،بەهەشتەوکەوسەرە (١٩٠١)
چاو،نەخۆش با،بۆن دەوای ئەوچاوەبوو     چاو بەبۆنێک چاوی یەعقووب چۆن وەبوو (١٩٠٢)
دیارەبۆنی بەد،کە،چاو تاری دەکا     بۆنی یووسوف چاو،کە،چاویاری دەکا (١٩٠٣)
تۆکەیوسوف نی برۆ یەعقووب بە     وەک ئەوی تۆ،ناڵەکە، ومەحبووب بە (١٩٠٤)
گوێ دەئەوپەندەی حەکیمی غەزنەوی     تا لەجیسمی کۆنە، تۆ،نوێت دەس کەوی (١٩٠٥)

---

[1]- گەرتۆ بانگی کەی بەسەردێ نەک قەدەم (مصرع دوم)

نـــاز لـــەجوانان جوانـــەنازی ناحـــەزی     وا بزانـــــــەمارەدیتو دەت گـــــــەزی (۰۶)
ناحەزەبۆناحـــــەزان ئیزهـــــاری نـــــاز     کـویری چـاو ئـێش مەرگـەبۆ،وی داخـواز[1] (۰۷)
تۆلـەلای یوسـوف نەکـەی ئیزهـاری نـاز     هــــەروەکوو یــــەعقووب بکە،ناڵـــەونیاز (۰۸)
مــەعنی مــردن بوو،لــەلای تــووتی نیــاز     تـۆش لەفـەقران بمرەئـەمما نـەک بـەڕاز (۰۹)
گیـانی نوێـت تـا پـێ دەدا عیسـا دەمـی     تۆش وەکوو خۆی باش دەکا ئەوبێ کەمی (۱۰)
کـوا بــەهارا ن گیـا لەبــەردان دیتــەدەر؟     خـاک وخـۆڵ بـە، گـوڵ، لەهـەرلا، دێتەسـەر (۱۱)
زۆرلــــەمێژەبووی بەبـــــەردو، مـــــاوی،وا[2]     ئیمتیحـــان کـــە،خۆڵ بی،چـــۆنی داخـــوا (۱۲)

**داستانی پیری چەنگی کە لەزەمانی حەزرەتی عومەر(رض) لە وەختی فەقیری و پیری لە قەبرستاندا بۆ خودا ساز لێدەدا ..**

**خولاسەی داستان..**

لە زەمانی حەزرەتی عومەر(رض) خانەندەیێکی موسیقی‌زان هەبوو، کە دەنگی خۆشی وی وەک دەمی ئیسرافیل گیانی وەبەر مردووان دەهینا و شادی هێنەربوو. ئەو کابرایە تەمەنی خۆی لەو ڕێیەدا سەرف کرد و کەم‌کەم بە فری پیری بە سەروڕووی‌دا باری و لەبەر باری گرانی تەمەن، پشتی چەما و برۆکانی بەسەر چاوەکانی‌دا شۆڕ بوونەوە. دەنگی خۆشی ناخۆش بوو و هیچ کەس خەریداری دەنگ و سازی وی نەبوو و ئەو بە تەنهایی لە فەقیری و پیری و زەعف و ناتەوانی‌دا غەرق بوو، تا ئەو جێگایە کە ئومێدی لە خەڵکی بڕا و فەقەت بە خوداوەند ئومێدەوار ما. جا لەبەر ئەوە شەوێک چۆ قەبرستانێکی بێ دەنگ و لە بیرچۆوە(قەدیم) لە دەوروبەری مەدینە و بەخۆی کوت لەوەی‌پاش فەقەت بۆ خودا ساز لێدەدەم تا قیسمەتی خۆم لە دەریای بێ ئینتیهای ڕەحمەتی خودایی بەعینوانی دەستموزد وەربگرم. ئەو کابرایە لە لێدانی موسیقی‌دا غەرق بوو، و ئەوەندەی موسیقی لێدا کە ماندووبوو و سەری لەسەر عەرزی دانا و خەوی لێکەوت، لەو حاڵەتەدا خوداوەندی موتەعال ئیرادەی فەرموو کە خەلیفەی موسەڵمانان یەعنی حەزرەتی عومەریش(رض) چۆ خەوێکی قورس و گران، حەزرەتی عومەر، تێگەیشت

---

[1]- ناحەزە، نازان بکەن خۆ،ناحەزان     کوێر کە ئێشا چاوی وی ،بۆ ،وی خەزان

[2]- زۆرلەمێژەبووی بە،بەر، تۆ ، ماوی، وا (مصرع اول)

کە ئەو خەوە بێ‌مەوقیعە کە لەبۆ وی پێش هاتوە، حەتمەن پەیامێکی لەگەڵدایە. سەری لە سەر بەنج دانا و خەوی لێکەوت. دەو خەوەدا دەنگی غەیبی بە گوێی گیانی وی ڕاگەیاند کە هەر ئەمشان هەستە برۆ بۆ قەبرستانی مەدینە و ئیحتیاجی یەکێک لە بەندەگانی نیزیکی من بە جێ بێنە و حەوسەد دینار لە بەیت‌المال هەڵگرە و بیدە بەوی، کە ئەو میقدارە حەقی ئەوەیە کە بۆ خودای ساز لێداوە. حەزرەتی عومەر(رض) لە خەوی گران هەستا و ڕێی قەبرستانی گرتە بەر هەر کە گەیشتە وێ، دەور و بەری قەبرستان گەڕا و هەموو لایەکی بە دیققەت تەماشاکرد تا ئەو بەندەی نیزیکی خوداوەند پەیدا بکا، بەڵام هەرچەند زیاتر تەماشای کرد و زیاتر گەڕا هیچکەسی نەدی، مەگەر نەوازەندەیێکی پیر کە چەنگەکەی لە ژێر سەری دانابوو و بە خۆی کوت ئایا دەبی بەندەی نیزیکی خوداوەند ئەوهەبێ؟ ئایا نەوازەندەیێکی بۆر و فەقیر و نوستو لەسەر خۆڵ، ئەو بەندەیە کە دەخەودا بەوی سفارش کراوە؟ قانع نەبوو، دووبارەگەڕا، و زیاتر تەماشای کرد، بەڵام هیچکەسی نەدی. عاقیبەت بە فەڕاسەت تێگەیشت کە ئەو پیری چەنگیە هەمان کەسە، کە دەخەودا بەوی سفارش کراوە. دەو حاڵەدا، لە ناکاو حەزرەتی عومەر(رض) پشمی و پیری چەنگی بە دەنگی ئەو پشمینە لە خەو ڕاپەڕی و لەگەڵکو چاوی بە حەزرەتی عومەر(رض) کەوت ترسا، چونکە پێی وابوو کە ئەو دارۆغەیە دەیهەوێ کە ئەوی تەنبێ بکا، بەڵام حەزرەتی عومەر(ڕض) ئارامشی بەوی دا و پەیامە غەیبیەکەی پێکوت و لە پاشان کیسەزێڕەکەی وێدا. پیری چەنگی بەشیددەت گریا و لەوە کە لەتەمەنی خۆیدا بۆخاتری خۆشحاڵی مەجالیس سازی لێداوە پەشیمان بۆوە و تۆبەی کرد و تێگەیشت کە فەقەت دەبێ بۆ خوداوەندی موتەعال ساز لێبدرێ...

نە ئەوەت بیستوە لە دەورانی عومەر؟ — موتریبێک بوو خۆش سەداو و خۆش هونەر (١٩١٣)
ـەی بەدەنگی خۆشی وی بێهۆش دەبوو — خۆش کەبیسبای سەدبەرابەرخۆش دەبوو (١٩١٤)
ـەتی هەرمەجلیسێ بوودەنگی وی — قیامەتی بەرپا دەکرد ئاهەنگی وی (١٩١٥)
جەشنی ئیسرافیل کەسووری لێدەدا — هەرچی مردو بێت گیانی پێدەدا (١٩١٦)
ـەئیسرافیل هەی بوو یاری وا — دەردەهات فیل باڵی، دەنگی بیستبا (١٩١٧)
ـەناڵی سازی ئیسرافیل کەهات — گیان دەکا بۆ ئێسکی مردووی کۆن خەڵات (١٩١٨)
ـغمەیی باتین، هەیانە، ئەنبیا — ژین دەدا، بۆ تالبی، ئەوبێ بەها (١٩١٩)
جۆن دەبیسێ نەغمەیی واگوێی حیس؟ — چون بەزوڵمان گوێی حیس زۆربوونەجیس (١٩٢٠)
ـدەمی گوێی لێ نییەنەغمەی پەری — چون لەئەسرا ری پەری، ئەوبووبەری (١٩٢١)

نەغمەیی پەریان یا نەغمەی بەشەر     قەت وەکوو نەغمەی دلان ناکەن ئەسەر
هەردوو،زیندانینە، جندۆ کەو، بەشەر     وان دەزیندانی جەهل دا، دەس بەسەر
(مەعشەرەلجین) سووڕەیی ڕەحمان زوو     تۆبخوێنە،(تستطیعوا تنفزوو )
ئەونەوایانەی دەروونی ئەولیا     پێن دەڵێن ئەووەل کەئەی ئەجزایی (لا)
خۆت لە( لا)ی نەفیی وەلانێ زووکەزوو     لەو خەیاڵەو،وەهمە،بۆلای حەق بچوو
ئەی لەنێو کەون وفەساد، دەرزین هەموو     هیچ لەگیانی جاویدانتان،چا نەبوو
لەو،نەوایانە،بڵێم،شەممێک ئەگەر     گیان هەموویان سەرلەقەبران دێننەدەر
گوێ بەرە،نیزیک،کەئەو،لێت، دوور،نییە     خۆ،بەڵام، دانێ، بەتۆ،دەستوور نییە
چەشنی ئیسرافیلەوەختیان ئەنبیا     مردوان دەگرن، لەوان، ژین وبەقا
گیانی دڵ مردوان لەنێو قەبری بەدەن     دێن، بەدەنگی وان، بەجێ دێڵن، کەفەن
ئەو دەڵێ قەت دەنگی وای لێنایە،کەس     زیندو کردن کاری دەنگی خوایە، بەس
ئێمەمردین وبەکوللی (نا )دەبووین     دەنگی حەق هات وهەموومان، ڕا، دەبووین
گەرحیجاب بێ، یا، نەبێ،ئەمری خودای     ئەودەدا هەرچی بەمەریەم خۆی،کەدای
ئەی لەدونیا خۆت ڕزاند چی تارو پوود     وەرگەڕێ بەو دەنگی دۆست بۆلای وجوود
دەنگی والەدەنگی خوایەبێ گومان     با لەعەبد اللّەنەقڵ بێ ئەو بەیان
خوا کوتی بەو، من زبان وچاوی تۆم     ڕق، حەواسم، هەم ڕەزای خۆش ناوی تۆم
(یسمع ویبصر) بەمن،ئەودەم ئەتۆێ     ساحەبی سوڕ(نا) کەسوڕ سەرجەم ئەتۆی
گەروجوودی تۆلەبۆخوا بێ هەموو     بۆ جەزای تۆ خوا دەبێ بۆت موو بەموو
جاردەڵەم تۆ، جار دەڵەم تۆش، هەرمنی     ڕۆژم وەدەیدەم بەدونیا ڕەوشەنی
من دەهەرچی خۆم تەجەللی کەم کەمێک     حەل دەبێ بەوموشکیلاتی عالەمێک
گەرکو تاریکێێکی ڕۆژ پێی لا نەچێ     لەفزی ئێمە ڕوون دەکا ئەو جێ بەجێ
خوا هەموو ئەسمای بەئا دەم فێردەکرد     ئادەمیش خەڵکی لەئەسما تێردەکرد
بگرەنووری خوا لەئادەم یا لەخۆی     مەی لەخوم بێ، یا کەدوو،وەک یەک دەخۆی
ئەوکەدوویەشاد، لەگەڵ خوم،بوونە، یێک     نەک وەکووتۆ شاد بەبەژنی ڕێک وپێک
خۆش بەحاڵی وەی منی دی،کوت نەبی     خۆش بەحاڵی، دی، ئەوەی ئەمنی دەدی
وەک چرایێک گەربەیێک شەم هەڵکرا     شەم دەبینێ ئەکەسەی، دیتی چرا
هەروەها ،گەر،نوور بچێ تاسەد چرا     ئاخری وەک ئەووەڵی دیاری کرا

یـا لـەئا خـر وەرگرە،یاشـەمعی گیـان    بـێ تـەفاوەت هەریـەکن هـەردووکیان (١٩٤٩)
لەوچرایـەی ئـاخری تۆبگرەنـوور    یالـەوان شـەمعی کـەبوون، دەورانـی دوور (١٩٥٠)

**دەبارەی ئەو حەدیسە کە..(ان لربکم فی ایام دهرکم نفحات الا فتعرضوا لها )**

تەرجەمـەی ئـەو حەدیسـە: (حەقیقەتـەن خوداوەنـد دەتوولی رۆژگارِی ئێوەدا زۆر دەمـی بـۆن خۆشی هەنە، خۆتان دەمەعرەزی وان قەرار بدەن)...

وای رەسـوول کـوت زۆرنەسـیمی خـوا هەنـە    دێـن، بـەدائیم، ئـی وەکـوو وان کـوا هەنـە؟ (١٩٥١)
قـەدری بگـرن فرسـەتە، ئـەوقاتی وا    وەرگـرن بـەگیان ودڵ نـەفحاتی وا (١٩٥٢)
ئەونەسـیمە، هـا تـە، لاتـان، دوایـەڕۆی    هـەرچی ویسـتی پێیـدەدا گیـان، دوایـەڕۆی (١٩٥٣)
یـەک نەسـیمی دیکـە، دێـت، وشـیار بـە    ئەولەدەسـتی خـۆت مەدە،پڕ،بار،بـە (١٩٥٤)
گیـانی ئـاور بـەو نەسـیم خـامۆش دەبـێ    گیـانی مردووبەونەسـیم،پڕجۆش دەبـێ (١٩٥٥)
تـازەگی هـەم جۆششـی توو‌بایـە، وا    قـەت چ حـەیوان جۆششـی لێنایـە،وا (١٩٥٦)
گەرکـەووت بـا سـەرزەوی هـەم ئاسـمان    عـەرزی چی؟ئاسمانی چـی؟دەت دی،نـەمان (١٩٥٧)
هـەم لەترسـی ئەودەمـەی بـێ ئینتیهـا    مـەنعی حـەملی ئەو،ئەمانـەت بـوون وەهـا (١٩٥٨)
ئـەی دەنـا(اشـفقن منهـا) بۆدەبـووو؟    بۆلەترسـان خـوێنی دڵیـان جـۆ دەبـوو؟[1] (١٩٥٩)
جوورەکی دیـم دوێ شـەوێ مـن هاتەدەست    یـەک دوولوقمـەم خـوارد، مـن، ڕێمیـان دەبەست (١٩٦٠)
بـۆگرەو، بـۆ، لوقمـە،لوقمانی گیـان    لوقمـەبڕوا، تاکولوقمـان هـەی بـێ ژیـان (١٩٦١)
تۆلەبەریـەک لوقمـەوابووی دڵ پـەرێش    لاقـی لوقمـان چـاو دڕووی تێدا،بـەئێش (١٩٦٢)
لاقـی وی تێیـدا دڕووێک،نادیـار    چـون تەمـەعتان زۆرەنـەو دیوە،چجـار (١٩٦٣)
هـەردڕووت دیوەلـەلات خورمایـەتۆ    چـون لەفـەهم و جـوودی بـێ سـەر مایـەتۆ (١٩٦٤)
گیـانی لوقمـان بـۆ خـودا گـوڵزار بـوو    لاقـی گیـانی بـۆ برینـدار کـرد، دڕوو؟ (١٩٦٥)
ئوشـترە، ئـەو جیسـمە، خـۆراکی دڕوو    ێێک لـە نەسلی مستەفا لـەو سوار دەبـوو (١٩٦٦)
هـەر،گوڵن ئـەی وشـترەلێت بـوون بـەبار    بـۆنی وان گـوڵ چادەکـەن گوڵزارهـەزار (١٩٦٧)
ئـارەزووی تۆدائیمـەن هـەر دڕکـوداڵ    چۆن لـەدوڕوان دێتەدەس،گوڵ،سوورو ئاڵ؟ (١٩٦٨)
ئـەی ئـەوەی لـەدوایی ڕێـی حـەق هـەڵوەدا    چـەن دەڵـەی تۆکـوا گوڵسـتان،کوا کـوا؟ (١٩٦٩)
بێـتێ ئـەوەی تـۆ ئەودڕوویـەی بێنیـەدەر    تـارە، چـاوت چـۆن دەکـەی ئـەوەدەم،گوزەر؟ (١٩٧٠)
ئـادەمێکی ئەوجیهانەتەنگـەبۆی    بۆدڕووێـک،چۆن دەبـێ ون بـێ لـەخۆی؟ (١٩٧١)

---

[1] - بۆ لە ترسان خوێنی دڵیان جۆگە بوو؟ (مصرع دوم)

جوابی داوەشێر فەرمووت تۆ بەمن[1] | پێیدەکوت تۆسەردەکێشی یانە، بن؟ (٢٩٨٩)
جوابی داوەئێستەکلکی چادەکەم | پێیدەکوت تو، بەردەکلکی چاوەکەم (٢٩٩٠)
من بەکلکی شێر هەناسەم ها تەسەر | من بەکلکی شێر گیانم هاتەدەر (٢٩٩١)
شێر دەبا کلکی نەبێ،ئەی شێر ساز | نووکی دەرزی نەی دەهێشت بۆمن، چ واز[3] (٢٩٩٢)
جێیەکی دی گرت دەللا ک، بۆکوتان | بێ تەڕەحوم بێ ئەوەی گوێ دا،وتان[4] (٢٩٩٣)

کردی هاوارِ کوێ دەکێشی ئەوچەلە؟ | جوابی داوەگوێ دەکێشم ئەو هەلە (٢٩٩٤)
پێیدەکوت با گوێی نەبێ شێر ئەی حەکیم | گوێ بەجێ هێڵە، لەگەڵ من بە،ڕەحیم (٢٩٩٥)
جێیەکی دی گرت و دەرزی بردەنێو | کردی هاوار بانگی کرد ئەی خۆش نێو (٢٩٩٦)
کامەعوزووت جاری سێ،کرد ئیختیار | جوابی داوەزگ دەکێشم یادگار (٢٩٩٧)
پێیدەکوت جا، شێر، ورگی با نەبێ | شێری کامیل لێرەبا قەت چانەبێ (٢٩٩٨)
ما عەجەب لەو کارە، دەللاکی زەمان | تا درەنگ ئەو قامکی ما بوو ژێر ددان (٢٩٩٩)
دای لەعەرزی دەرزی وەستای بێ قەرار | کردی هاوار کێیەدیبی وا، چجار (٣٠٠٠)
چۆن دەبێ شێر نەی بی ورگ و کلک و سەر؟ | شێری وای خۆ چا نەکردخوای داد گەر (٣٠٠١)
دەردی تاعەت تۆ قەبووڵ کەئەی برا | تا لەدەردی نەفسی خۆبی تۆ ڕەها (٣٠٠٢)
ئەوکەسەی لای ناوو،نەی ویست ئەو وجوود | بردیان مانگ و سەما و ڕۆژ، بۆی سجوود (٣٠٠٣)
هەرکەسێ فەرمان نەبا،بۆ نەفسی گەور | دەبنەفەرمانبەر لەبۆ وی ڕۆژو هەور (٣٠٠٤)
هەر دڵێکی شەمعی عیشقی بوو لەناو | قەت زەرەرنادا بەوی گەرمای هەتاو (٣٠٠٥)
خوا لەبۆئەسحابی کاف ئاوای دەووت | تاو لەڕاست و هەم لەچەپ وێیان کەووت (٣٠٠٦)
جوان و شاداب وەک گوڵی لێدێ دروو | گەرچی جوزئە، ئەو لەبۆ لای گوڵ کەچوو (٣٠٠٧)
چۆن لەلات تەعزیمی زاتی خوا دەبێ؟ | خۆت لەخاک کەمتر بزانە، وا دەبێ (٣٠٠٨)
مەعنی تەوحیدی خودا فێر بوونی عیلم | خۆت بسوو تێنی لەعیشقی خوا، بەحیلم (٣٠٠٩)
دەتهەوێ ڕوون بی، بەچەشنی نووری گەش؟ | بەردەئاگر دەو، وجوودەی تارو ڕەش (٣٠١٠)

---

[1]- جوابی داوەتۆکوتوتە،شێر بەمن (مصرع اول)

[3]- نووکی دەرزی نەی دەهێشت بۆمن چ واز (مصرع دوم)

[4]- بی تەڕەحوم نەی دەدا گوێ بۆ ،کوتان (مصرع دوم)

خـۆت دەحـەق فـانی بکـە، وەک ئـەولیا وەک دەبێـتن مـس، فـەنا نێوکیمیـا (٣٠١١)
چـون گرفتـاری بـە(مـا) و(مـن) تۆسـەخت بەودووانـەنابی قـەت تـۆ خۆشـبەخت (٣٠١٢)

**ڕۆیشتنی گورگ و ڕێوی دەخزمەت شێردا بۆ ڕاو..**

**خولاسەی داستان...**

شـێرێک دەگـەڵ گـورگ و ڕێـوێکی چوونـە ڕاوێ و گایـەکی وەحشـی و بزنـەکێوێیک و کەررووێشکێان ڕاو کرد، ئەو وەختە شێر بە گورگی دەستوور دا کە حەیواناتی ڕاو کراو دەبەینی خۆیاندا تەقسیم بکا... گورگ کوتی گای وەحشی بۆ شێر، بزنەکێوی بۆ من و کەروێشک بۆ ڕێوی... شێر لەو تەقسیمە نارەحەت بوو، چونکە موتەوەججیە بوو کە گورگ دە مەحزەری شاهانەی وی لە (من) و (تۆ) و قیسمەتی (من) و قیسمەتی (تۆ) قسە دەکا، دەحاڵێک دا کە ئەونێچیرانە فەقەت تەوەسسوتی شێر ڕاو کراون، جا لەبەر ئەوە بۆ موجازاتی گورگ پەنجەیێکی محکەم و قەوی لەگورگ دا و فەورەن کوشتی، و لە پاشان ڕووی دەڕێوی کرد و پێیکوت ئەو حەیوانانە تۆ تەقسیم بکە، ڕێوی کە حاڵ و بەسەرهاتی گورگی دیبوو، ترسا و کوتی... لێرەدا تەقسیم مانای نییە ئەو حەیوانانە هەموو ئی جەنابی شانە، و ئێمە سەهمێکمان نیە ئەو گا گەورە بۆ نەهاری جەنابی شا و ئەو بزنە بۆ عەسرانە و ئەو کەروێشکە بۆ شام، شێر وەختێک دیتی کە ڕێوی وەک گورگ قسە لە(من) و (تۆ ) ناکا، و ئیزهاری وجوود ناکا، خۆشحاڵ بوو و حەیواناتی ڕاوکراوی بەوی بەخشین و کوتی لەوەی پاش ئەتۆ ڕێوی نی، بەڵکە ئەتۆ هەر منی . ئەو داستانە نەفی وجوودی مەجازی و مەحو بوونەوەی وی دەوجوود و هەستی حەقیقیدا تێدایە...

شێر و گورگ و ڕێوی هەرسێ بوون بەیار چوونەشـاخی تـا بکـەن ڕاوو شـکار (٣٠١٣)
تـا کوببنەکۆمـەکی یێکتـر لـەڕاو تـا ببەسـتن سـەخت و مەحکـەم بەنـد وداو (٣٠١٤)
چوون گەڕان هەر سێ لەشاخ و دەشت و دۆڵ تـا کـوبگرن ڕاوی زۆر، زۆر تونـدو تـۆڵ (٣٠١٥)
نـەنگی زانـی شـێر، دەگـەڵ وان بـێ ڕەفیـق لـوتفی فـەرموو، بـوو دەگـەڵ وان هەمتـەریق (٣٠١٦)
چـون لەبۆشـای والـە، لەشـکر زەحمەتـە بـوون دەگـەڵ خـەڵکی بـەڵا م خۆ، ڕەحمەتـە (٣٠١٧)
مـانگی وا، ئەسـتێرەبۆ وی نـەنگ و عـار مانـگ لـەنێو یـان، تـا هـەیان بێ،بـەو،ویقار (٣٠١٨)
ئـەمری (شـاورهم) دەهـات بۆکێ؟ڕەسـووڵ گەر چی ڕایی وی لـەلای هەرکـەس قەبووڵ (٣٠١٩)

ێـو تـەرازوو زێـرو جـۆ هــەردوو ڕەفیـق          ئاســـمان و عەرزەبـــەینی وان، تـــەریق[1] (۳۰۲۰)
ڕۆح وقالــب پێکــەوەن ئێســتا ئــەوان          مــوددەتێکیش ســەگ دەبێتەدەرکــەوان (۳۰۲۱)
ــەو گرووهە،هەرلەگــەڵکو گەینــەکێو          گورگ و ڕێوی بوون لـەدووی شێری بەنێو (۳۰۲۲)
کەوتەدەسـیان گـاوو کـەر وێشـک و بـزن          گرتنـــی هەرســێکییان شــێری مـــەزن (۳۰۲۳)
ـەر کەسێکی چـوو بـەدووی شێری قـەوی          ئــەودەبێ دائــیم کــەبابی دەســکەوی (۳۰۲۴)
ـردیـان بۆجەنگــەڵێ هەرســێ کــەلاک          کوشـتەوو مەجرووح،تێکـەڵ خـوێن بـەخاک (۳۰۲۵)
ـورگ ورێـوی بــوو تــەماعی وان ئــەوا          تـا کوقیسـمەت کا، ئـەوان سێ، عـەدڵی شا (۳۰۲۶)
ـۆی عـەیان بـوو شێر تـەماع و فکـری وان          زوو دەبــوو ئاگــا لـــەفیکری ئـــەو دووان (۳۰۲۷)
ـوکەســەی بــۆڕاز ئــەمیر و شـێر بــوو          چــاک دەزانـــێ دڵ کــەچی تێدایـــەزوو (۳۰۲۸)
ـەی دڵەی موعتاد بە فیکری پیس و باش          تۆ لـەلای وی قـەت نەکەی فیکری بـەلاش (۳۰۲۹)
جـۆن خەبـەر دار بـوو لـەدڵ ئـەو شـەهریار          هـــیچ کـــەناڵێ تـــا نـــەبێ تۆشـــەمەزار (۳۰۳۰)
ـێر کـەدیتی ئـەو دەمـی وەسواسـی وان          قـەدری لێنـان نـەی دەکـرد هـیچ باسـی وان (۳۰۳۱)
حـۆ بـەڵام دەیکوت لـەلای خـۆی بێ سـەدا          تـــۆ ســـەزاواری ســـەزایی ئـــەی گـــەدا (۳۰۳۲)
دەزانـــن ڕایـــی مـــن کـــافی نییـــە؟          وادەزانـــن بەخشـشـــم وافـــی نییـــە؟ (۳۰۳۳)
ـەقڵ و ڕاتـان هـات لەعـەقڵ و ڕایـی مـن          هـات لەهەدیـەو بەخشـش و ئیعتـایی مـن (۳۰۳۴)
ـەت لەدەسـتی نـەقش نایـەت هـیچ فیکـر          بەڵکەنــەققاش بــەو دەداتــن فیکروزیکــر (۳۰۳۵)
بـۆمن چـۆن دەکـەن وا، فکـری عـار؟          ئـەی هــەمووتا ن، نــەنگی خــەڵکی ڕۆژگـار (۳۰۳۶)
ـخوداوەنـــد بـــەد گومانن،بــــەدگومان          وەک مونــافق موســتەحەققن بۆنــەمان (۳۰۳۷)
ـن دەکـەم ڕاحــەت لــەعارتان ئاسـمان          تــــــاکوبۆعیبرەت ببێتەداســــــتان (۳۰۳۸)
ـەرچی فیکـری وای هـەبوو شـێر، پێکـەنی          پێکــــــەنینی شــــــێر،تۆناکا خـــــەنی (۳۰۳۹)
ـاڵی دونیـــا بۆخوداوەنـــد، زەردەیـــە          مـــاڵی دونیـــا بـــۆ دییانـــەت، جەردەیـــە (۳۰۴۰)
ـۆ فـــەقیر بـــی چاترەنـــەک ماڵـــدار          دادەنـــێ زەردەی خـــودا داو،ئاشـــکار (۳۰۴۱)

**ئیمتیحان کردنی گورگ لـە تـەرەف شێر و کوتنی شێر کە ئـەی گورگ وەرە پێش و حەیواناتی ڕاوکراو لە بەینی ئێمەدا تەقسیم بکە...**

ـێر کوتی ئـەی گورگـە، لێمـان بـەش بکـە          تـۆ بەعـەدڵی خـۆت ئێمـەش گـەش بکـە (۳۰۴۲)

---

[1] - نێو تەرازوو بۆرەفیقی زێڕ، جۆ          بێنیهایەت لێک بەدوورن ئەو دوو ،خۆ

تۆ لەجێی من کاری تەقسیم بگرەدەست — تا نیشا ندەی نائیبی بۆ شێری مەست (٣٠٤٣)
پێیکوت ئەی شا،گا، لەبۆ تۆ، بەستەئەو — گەو رەیە، گۆشت و بەزە، زۆر،خەستەئەو (٣٠٤٤)
قیسمەتی میش با ببێ، بزنی وەسەت — بگرەڕێوی تۆش کەروێشک، بێ غەڵەت (٣٠٤٥)
شێرکوتی ئەی گورگەچیت کوت مەیکەکەم — چۆن دەڵەی تۆ( ما) و(تۆ) ئەمنیش کەهەم؟ (٣٠٤٦)
چۆن دەڵێ من هەم، لەلام،گورگی نەفام؟ — لای منی شێر، شا لەجەنگەڵ شاهی عام (٣٠٤٧)
بانگی کرد تۆ،دا وەرەپێش دم، هەراش — هاتەپێش لێیداو کردیووردوخاش (٣٠٤٨)
چون نەبوو، بۆ گورگ، مەغزی فکری پاک — بۆ موجازات شێر، زوو کردی هیلاک (٣٠٤٩)
چون منت دیتو، نەچوو تۆ، خۆت لەیاد — بۆیەگیانت وا، بەخواری دا بەباد (٣٠٥٠)
چونکەلای من خۆت نەکرد مەحوو فەنا — والەچاکەمن سەرت لێکەم جودا (٣٠٥١)
(کل شیءهالک) ئیللا خودا — تا ( فەنا فی للا )نەبی نات بێ بەقا (٣٠٥٢)
هەرکەسێک گەر کودەحەق دا فانییە — (کل شیءهالک ) بۆ وی نییە (٣٠٥٣)
(لا) نییەئەو چون دە( ئیللا) دا هەیە — هەرچی فانی بوو دەحەق، هەروا هەیە (٣٠٥٤)
هەرکەسێک لای حەق بکا، ئیزهار، وجوود — بوو بە(لا)جا، هەڵوەشا، لەو تارو پوود (٣٠٥٥)

**داستانی ئەو کەسەی کە، لە دەرکی دۆستی خۆی دا، لە داخلدا دۆستەکەی کوتی کێیە؟ جوابی داوە:(منم). پێیکوت چونکە ئەتۆ(تۆی) دەرکەت لێناکەمەوە، هیچکەس لە ڕەفیقانم ناناسم کە ئەو(من) بێ...**

**خولاسەی داستان...**

شەخسێک هات لە دەرکی ماڵی دۆستی خۆی دا، دۆستەکەی لە نێو ماڵەوە پرسی کێی؟ جوابی داوە:(منم). دۆستەکەی پێیکوت...بگەڕێوە. چونکە ئەتۆ هێستا خام و ناتاگای و قسە لە(من) دەکەی و ئیددیعاش دەکەی کە عاشقی... ئەو شەخسە گەڕاوە و موددەتی یەک ساڵی تەواو لە فێراقی یار، شار و دیاری خۆی بەجێ هێشت. پاشی یەک ساڵ گەڕاوە بۆ دەرکی ماڵی دۆستەکەی و لە دەرکەی دا دۆستەکەی لە داخلی ماڵەوە پرسی کێی؟ جوابی داوە ئەو کەسەی لە پشت دەرکەش ڕاوەستاوە هەر ئەتۆی... دۆستەکەی پێی کوت ئەڵێان کە(ئەتۆ)، (منی) وەرە ژوور... ئایا دەزانی پارەکە بۆچی بە تۆم ڕێنەدا کە بێیە ژوور؟ چونکە دوو(من) دەیەک ماڵدا جێیان نابێتەوە....

یەک دەهات و دەرکی یاری لێدەدا — پێیدەکوت یار،کێی ئەتۆ وا، بێ سەدا؟ (٣٠٥٦)

جـوابی دا، (مـن) پێـی دەکـوت ڕێگانییـە     لێرەجـێ بۆشەخسـی نـا ئاگـا نییـە (٣٠٥٧)
هـەرچی نـا ئاگایەسـەهمی هـەر فیـراق     هـەرچی نائاگـا یەسـەهمی هـەرنیفاق (٣٠٥٨)
ـوددەتی یەکسـاڵ لـەیاری مـا، بـەدوور     سـووت لـەهیجران و فیـراق ئـەمما چجـوور (٣٠٥٩)
ـــوو بەئاگا،هاتـــەوەبۆلایی یـــار     هاتەئـەو دەرکـەی کەلێـدا سـاڵی پـار (٣٠٦٠)
ـۆربەحورمـەت دای لەدەرکـە، ئـەو چەلـە     تانـەڵی ئـەو،گفتی بێهـوودەو پەلـە (٣٠٦١)
ـنگی کـرد یـار،کێ لەدەرکـەی وا دەدا؟     جـوابی داوەهەرئـەتۆی ئـەی خـۆش سـەدا (٣٠٦٢)
جـۆن منـی، پێیکـووت وەرە، زوو، بـێ وچـان     جێگـەیان نـابێ لـەماڵێک دوومنـان (٣٠٦٣)
ـجنـەدەرزی گـەر دەزوو،دوو،بـوو سـەری     دەچیـــەدەرزی گەرلەدوویی،بی،بـەری (٣٠٦٤)
ـەردەزوو هـەیتی بـەدەرزی،ئیرتیبات     نەک بەوی مـەڕبووت (جمل سم الخیاط ) (٣٠٦٥)
ـێ دەکـا بـا ڕیـک بـۆ دەرزی جەمـەل     غـەیری میقـرازی ڕیـازات و عەمـەل (٣٠٦٦)
ـستی حـەق، لاوازدەکـا جیسـم وهـەوا     چـون محـاڵ مـومکین دەکـا ئـەمری خـودا (٣٠٦٧)
جـون نەخۆشـان چـا دەکـا دەرمـانی وی     چـون چەمووشـان ڕام دەکـا، فـەرمانی وی (٣٠٦٨)
ـەکمـەهوو، ئەبرەس،کـەهیچن لای خـودا     چاو،بـەمردوو ژینـی نـوێ ئـەو چـۆن دەدا (٣٠٦٩)
ـۆ عـەدەم کـەمتر لـەمردوو دیارەئـەو     وەختـی ئیجـاد چـاو کەچـەن بێچارە،ئـەو (٣٠٧٠)
ـل یـوم هـو فـی شـا ن ) ئـەی فـلان     خـۆ بـەدائیم کاردەکـا خـوای دووجیهـان (٣٠٧١)
ـەمترین کـاری خـودا ئـەی مـونکیران     ڕێ دەکا،ڕۆژانەئـەو، سـێ لەشـکران (٣٠٧٢)
ـوا لەپشـتی بـاب دەنێـرێ یـەک لـەوان     بـۆڕەحیمی دایکـەکانی میهرەبـان (٣٠٧٣)
ـ لەئـەڕحام لەشـکرێک بـۆ خاکـدان     دێ،هـەتا پـڕ کـا لـەنێرو مـێ جیهـان (٣٠٧٤)
ـێ لـەخاک ڕا لەشـکرێک بـۆلای ئەجـەل     تـا ببینـێ هـەر کەسـێک جـوانی عەمـەڵ (٣٠٧٥)
ـەت تـەواونابێ وتـەی وا، ئـەی سـەدیق     بێینەوەسـەر باسـی کـێ؟ ئـەو دوو ڕەفیـق (٣٠٧٦)

### سیفەتی تەوحید

ـبیدەکوت چـون هـەر(منـی)تـۆ بێـرەژوور     نـەک بەچەشـنی خـارو گـوڵ لێکتـر بـەدوور (٣٠٧٧)
ـوون بەیێک،هـەودا، لەپێشـدا،زێدەبوون     خۆ، لە(کن) دا لێک جودا نین کاف و نوون (٣٠٧٨)
ـت دەکێشن کاف و نوون هـەر وەک کەمەند     چاو عـەدەم مـەو جوود دەکـەن دەیخـەن لەبەند (٣٠٧٩)
گـەر بـەزاهیر دووکەمەنـدن کـاف ونـوون     گـەر ئەسـەر زاهیـر دەکـەن، ئێکن،نـەدوون (٣٠٨٠)
ـی. لـەبۆ ڕێگایـەدووبن یانـەچوار     وەک مقەسـت دوولێـوە ئـەمما ئێکـەکار (٣٠٨١)

وەک لەشوشتن دا، شەریک بن دوو نەفەر ‌ ‌ ‌ زۆر موخـالیف کـاری وان دێ بەرنـەزەر (٣٠٨٢)
یـەک کراس دەشوات و دەیدا تن لـەئاو ‌ ‌ ‌ یـەک دەری دێنێـت، وشـکی کـا بـەتاو (٣٠٨٣)
ئـەو کراسـەی، وشـکی دیسـا ن خستەئاو ‌ ‌ ‌ کـاری وان وەک کـاری دووزیـد دێتـەچاو (٣٠٨٤)
بـا بـەزاهیر بـن لەگـەڵ یێـک موختـەلیف ‌ ‌ ‌ هەمدڵن،هـەمکار، لەگـەڵ یێـک موحتـەلیف (٣٠٨٥)
بـا بـەزاهیر موختـەلیف بـن ئـەنبیا ‌ ‌ ‌ رێی هـەموویان هەریەکە، لێک نین جیبا[1] (٣٠٨٦)
موستەمیع گـەر گوێ نـەدا گفتاری حـەق ‌ ‌ ‌ بـا نـەڵێم بـۆ وی ئـەمن ئەسراری حـەق (٣٠٨٧)
گـەر چـی مـەعنی زۆر لەئـەلفاز زیـاترە ‌ ‌ ‌ گـەر بـەیان بکـرێ لـەبۆتۆ چـاترە (٣٠٨٨)
گەرلەبۆئیرشـاد نـەبـی تـۆ داخـواز ‌ ‌ ‌ مـن بـەگفتی والەناکـەم لێـو واز (٣٠٨٩)
بـۆ هیدایـەت شـەرحی سیرڕی دا،زەبـان ‌ ‌ ‌ خـۆ، دەنـا جێی رەمـزو ئەسرارِ نێـو گییـان (٣٠٩٠)
دێـن دەڕۆن بـێ دەنـگ و بـێ تیکراربـوون ‌ ‌ ‌ موسـتەحەققی(تحتها الانهـار) بـوون (٣٠٩١)
خـوا نیشـانی گیـان بـدەتۆ ئـەو مـەقام ‌ ‌ ‌ بـێ حـرووف زاهیـر دەبـێ لـەو سـور،تەمام (٣٠٩٢)
تـا کوچاکـا گیـان، لەسـەر، بۆخـۆی قـەدەم ‌ ‌ ‌ رێکەوێ ئەو،روو بەڕووی عەرسـەی عـەدەم (٣٠٩٣)
عەرسـەیێکی زۆر وەسـیع، بـێ مونتـەها ‌ ‌ ‌ ئـەو لـەبۆ دونیـایی سـوورەت موقتـەدا (٣٠٩٤)
زۆر لەسـوورەت ووسـعەتی زیـاتر عـەدەم ‌ ‌ ‌ هەرلەبۆیـە، بـوو خـەیاڵ ئەسـبابی غـەم (٣٠٩٥)
لـەو جیهانـەزۆر وەسـیعتر بـوو خییـاڵ ‌ ‌ ‌ بۆیەلـەو دا مانـگ دەگـۆڕێ وەک هـیلال (٣٠٩٦)
ئەو جیهانەی کەسرەت و، هەم حیسس و، ڕەنگ ‌ ‌ ‌ دیتەبـەر چاوچەشـنی زینـدان تاروتـەنگ (٣٠٩٧)
تەنگەچونکەهـەیتی تـەرکیب و عـەدەد ‌ ‌ ‌ حیس وەلای تەرکیب دەکێشێ، و ک مەدەد (٣٠٩٨)
پاشـی سـوورەت حاڵـەتی تەوحیـدەخۆ ‌ ‌ ‌ وەحـدەتت گـەر تـۆدەو ێ بـۆ لای بـڕۆ (٣٠٩٩)
ئـەمری(کـن) چـابوو لەحـەرفی نـوون وکـاف ‌ ‌ ‌ زاهیـرەن دوو، یـەک لـەمـەعنی بێ خـیلاف (٣١٠٠)
قـەت تـەواو نـا بـێ وتـەی وا، ئـەی دلێـر ‌ ‌ ‌ بـا بـزانین چیـان بەسـەرهات گـورگ وشێر (٣١٠١)

**شێر، گورگ تەنبێ دەکا چونکە لە تەقسیمدا بێ ئەدەبی کردبوو...**

شـێر هروژمـی بـردو کوشـتی گـورگی پـیس ‌ ‌ ‌ پێیـدەکوت چـون لێرەنـا بـن دوو رەئـیس (٣١٠٢)
ئینتیقامـان گـرت لـەتۆ ئـەی گـورگی پیـر ‌ ‌ ‌ چـون نـەمردی بـێ وتـار تـۆ لای ئـەمیر (٣١٠٣)
جا،لەپاشـان ڕووی دەرێـوی کـرد شـێر ‌ ‌ ‌ تـۆ بەشـی کـە، بـا بخـۆین ئەوڕۆکـە، تێـر (٣١٠٤)
کـردی تـەعزیم و کـوتی ئـەی شـەهریار ‌ ‌ ‌ گـا لـەبۆ چێشـتانتە، بـۆ م کـردی دیـار (٣١٠٥)

[1]- ئیختیلافی ئەنبییایان مەسلەکە ‌ ‌ ‌ عاقیبەت ڕێگای هەموویان هەریەکە

بۆ نەهارت تۆ بخۆ تەنها، بزن — بەس بەتۆ شایستەیە، ئەی شای مەزن (٣١٠٦)
شام کەهات کەروێشک، بخۆ تۆ ئەوچەلە — تا لەبۆ شا ئەو ببێتەشەو چەلە (٣١٠٧)
شێر بەڕێوی کوت ئەریٚ ئەی عەدڵ وداد — قیسمەتی والەی بەتۆ کێ داوەیاد؟ (٣١٠٨)
تۆ لەکێ فێربوویەقسمەت، والە، باش؟ — جوابی داوەمەرگی گورگی دم هەراش (٣١٠٩)
شێرکوتی بەو چون فەنای من بووی ئەتۆ — هەرسێ نێچیر باڵەبۆ تۆ بن برۆ (٣١١٠)
چونکەگۆڕای بووی بە( من ) ئەی ڕێوی ژیر — چۆن عەزاب و ئەزیەتی تۆم دێتەبیر؟ (٣١١١)
سەید و (من) بۆتۆ لەئەووەڵ تابنێ — جا،لەحەوتەم ئاسمان پێت، دا بنێ[١] (٣١١٢)
چون لەبۆ تۆ بووبەعیبرەت گورگی پەست — چۆن بەتۆ ڕێوی بڵەم؟ (نا) شێری مەست (٣١١٣)
وای دەکوت عاقڵ بزانەمەرگی یار — عیبرەتەبۆ ئەوکەسەی،بێ، هووشیار (٣١١٤)
ڕێوی دەیکوت دەردی شێر هاتبایەمن — چون لەپێش دا گورگی بانگ کرد دوایەمن (٣١١٥)
گەرلەئەووەڵ وای بەمن کوتبا کەزوو — تۆ بەخش کە،من کەگیانم دەردەچوو (٣١١٦)
جا، دەکەم من شوکری یەزدانی وەدوود — چون لەپاش خەڵکی منی هینا وجوود (٣١١٧)
تابیبین حوکمی زاتی کردگار — سەرئەوان پێشینییان، بۆ ئیعتیبار (٣١١٨)
تا لەحاڵ ووەزعی گورگانی لەپێش — چەشنی ڕێوی گیان نەجات دەین،بێ، پەرێش (٣١١٩)
ئوممەتی مەرحوومە، بۆیەی پێیکوتین — ئەو ڕەسوولی سادق و حەقو ئەمین (٣١٢٠)
ئێسکو مووی گورگانی پێشوو،چاو، چاو — تابیبتەپەندو عیبرەت، بۆت تەواو (٣١٢١)
شەخسی عاقڵ ئەو وجوودەی لا دەبا — چونکەبیستی قەومی عادی برد با (٣١٢٢)
گەرلەکیبر وگەر لەنەخوەت لا نەدا — خەڵکی دی دەگرن لەوی عیبرەت، جودا (٣١٢٣)

## تەهدید کردنی حەزرەتی نووح، قەومی خۆی کە دەگەڵ من ئیختیلاف مەکەن چون ئەمن گیانی بەشەریم نەماوە و زیندەگی و ژیانی من بە خودایە...

نووح کوتی من نیمە(من) ئەی سەرکەشان — من بەحەق زیندوومە ئێستا، نەک گیان (٣١٢٤)
چون نەما بۆمن حەواسی بولبەشەر — خوا لەبۆمن بوو بەگوێ و فەهم و بەسەر (٣١٢٥)
من کەمن نیم ئەو هەناسەش هەرلەوە — کفرە، مونکیر،گەربڵێ،دێ لەو دەوە (٣١٢٦)
گەر بەزاهیر ڕێوییەئەو ڕێوییە — عەینی شێرەنەک بڵەێن، هەر وەک وییە (٣١٢٧)
گەربەزاهیر، هیچ حەقیقەت نینەپێت — نارەتەی شێر خۆ بەدائیم دێتەگوێت (٣١٢٨)

---

[١] - سەیدو من هەردوولەژێر فەرمانی تۆ — جا، لەحەوتەم ئاسمان ژوور تر بڕۆ

حـــەزرەتی نـــووح گەرنـــەبا شـێری خـــودا بۆتـــوانی ئـــەو جیهانێـــک لێـــک بـــدا؟ (٣١٢٩)

ســـەت هـــەزاران شـــێر بوو،تـــاقی تـــەنێ ئاوورێـک بـوو، عالـــەمیش وەک خەرمـــەنێ (٣١٣٠)

چون لەخەرمـەن هیچ نـەبوو بۆ وی زەکات کەو تەخەرمـەن ئاوورێک نـەی بوو نـەجات (٣١٣١)

هـەرچی لای ئـەو شـێرەنەی بێـتن ئـەدەب چەشـنی گـورگی لێـک وەکـاتن زارو لـەب (٣١٣٢)

چەشنی ئەو گورگەی دەکووژێ شێری چووست (فانتقمنـــا مـــنهم)و، بـــۆ وی دروســـت (٣١٣٣)

گورگی غـەرقی خوێن دەکرد دوو دەستی شێر ئەحمەق ئەو کەس بوو کە بوو لای شێر دلێر (٣١٣٤)

گەربرینـــدار بـــێ بـــەدەن دەرمـــان هەیـــە کـوانێ دەرمـان بـۆ دڵ و ئیمـان هەیـە؟[1] (٣١٣٥)

گەیمـــەئێرەمات و حـــەیرا ن مـــا، قەڵـــەم قـــووەتی فـــەهمم نـــەما، تـــا هـــیچ بڵـــەم (٣١٣٦)

کـەم بخـۆ تـۆ، کـەم بچـوو بـەدوای هـەوا فکـری حیلـەت قـەت نـەبێ،با، لای خـووا (٣١٣٧)

(مــــا)و (مــــن) ئێوەلــــەخۆتان لا بــــدەن ملّکـی خوایە،گشـت وەدەسـتی خـوا بـدەن (٣١٣٨)

وەک فـەقیر هەرکـەس لـەبۆ ڕێی ڕاس چوو شێروسـەیدی شـێر، لـەبۆ وی بـوو هـەموو (٣١٣٩)

چون لەهـەرچی عـەیب و نەقسەئەو بـەدوور بـــێ نیبازەئـــەو لـــەماڵ و زێـــری ســـوور (٣١٤٠)

گشـــت کرامـــاتی لـــەدونیاو گشـــت ڕاو هەرلـــەبۆ بەنـــدانی ئـــەو شـــایەن تـــەواو (٣١٤١)

بـــۆ عموومەســـوود، هـــەموبۆ شـــا نییـــە خـۆش بـەحاڵی ئەوکەسـەی زانـی چییـە (٣١٤٢)

ئەوکەسـەی چـاکی دەکـرد هـەر دووجیهـان بـــێ نیبازەئـــەو لەســـوودی هـــەردووان (٣١٤٣)

دڵ لـەفکری بـەد بەدوورکـە، لای خـودا تـــا لـــەدەرگای وی نـــەبی تـــۆ ڕوو ســـیيا (٣١٤٤)

چون دەبینـێ سیرڕ وئـەفکار هـەر چی بوو هـەروەکوونێو شـیری خـالیس، تـاری مـوو (٣١٤٥)

ئـەو دڵـەی کـە، غـەیری خـوای تێـدا نییـە چـۆن لەسـیرڕ و غـەیب ئـەو ئاگـا نییـە؟ (٣١٤٦)

سیرڕی ئێمـەی بـێ گومـان لێبـوو عـەیان چون لەموئمین سیرڕی موئمین بوو بـەیان (٣١٤٧)

فـــەقری ئێمەگـــەر بداتەبەرمەحـــەک چـاک دەزانـێ کـام یەقینـە، کامەشـەک (٣١٤٨)

گـەرکوگیانی بـۆ مەحـەک بـۆزێڕو زێـو چـاک دەزانـێ کـام جووانـەکام دزێـو (٣١٤٩)

**دانانی پادشایان، سۆفییان ڕووبەڕووی خۆیان تاکو چاویان بەوان ڕووناک بێ...**

عـــادەتی شـــایانی پێشـــوو بـــوو وەهـــا هـەرچی بیسـتوویە، لـەبیر خـۆی بـا نـەبا (٣١٥٠)

دەسـتی چـەپیان ڕا دەوەسـتان پاڵـەوان چون دەلا ی چەپ دا دەبێ دڵ ئەی فلاَن (٣١٥١)

جـا، لـەلای ڕاس، ڕا دەوەستان نووسـەران چـون بەدەسـتی ڕاس دەنووسـن، سـەروەران (٣١٥٢)

---

[1]- بۆبرینی سەربەدەن، دەرمان هەیە کوا لەبۆ ئی سەردڵ وئیمان هەیە؟

ــــۆفییان جێیــان لەگــەڵ شــا ڕوو بــەڕوو    چونکــەئا وێنــەی گییــان ســۆفین، هــەموو (۳۱۵۳)
قـەلبی خۆیان پاک دەکرد بەو زیکرو فیکر    تا قەبووڵ کا، ئەو دڵەی ساف،نەقشی بیکر (۳۱۵۴)
هـەر کەسێکی جـوان لـەفیترەت بـوو وەلـەد    ڕوو بــەڕووی، نــەینووک لازم تــا ئەبــەد (۳۱۵۵)
عاشـــقی نەینووکـــەدائیم، ڕوویـــی جـــوان    باعیســـی تـــەقوای دڵ و ســـافی گییـــان (۳۱۵۶)

**هاتنی میوان بۆ لای حەزرەتی یووسوف (ع) و تەقازا کردنی حەزرەتی یووسوف هەدیە و دیاری لەوی..**

**خولاسەی داستان ...**

یەکێک لە دۆستانی قەدیمی حەزرەتی یووسوف(ع) بۆ دیتنی وی هات حەزەتی یووسوف لە بارەی برایەکانی زۆر شتی بۆ گێڕاوە و تەوزیحی دا کە چۆن بەستیان و دەچاڵاویان هاویشت... و لە پاشان حەزرەتی یوسوف(ع) لێی پرسی بڵێ بزانم چیت بە دیاری بۆ هیناوم؟ دۆستە دێرینەکەی پێیکوت زۆر لە مێژبوو بیرم لەوە دەکرد کە چ شتێکت بۆ بێنم کە قابیل بەتۆبێ؟ عاقیبەت هاتە فکرم کە چاکترین دیاری بۆ تۆ ئاوێنەیە، جا، لەپاشان دەستی دەگیلفان نا و ئاوێنەیێکی هینا دەرێ و بە حەزرەتی یووسوفی پێشکێش کرد و تەقازای لێکرد کە دەو ئاوێنەدا ڕووی جوانی خۆی تەماشا بکا..

هـات لـەدووڕرا یێـک لـەیاری میهرەبـان    بــوو بــەزەیفی یووسـوفی سـددیقی جــوان (۳۱۵۷)
چونکەدۆست بوون کاتێ هەردوو بوون مناڵ    خۆشەویسـتی یـەکتری بــوون دوو هــەواڵ (۳۱۵۸)
پێیـدەکوت ئـەو چیـان بەسـەرهینا ی بـرا    هـەر وەکووشـێر چـۆن بـەوان زەنجیـر کـرا (۳۱۵۹)
قـەت لـەبۆ شـێر تـۆق و زەنجیـر نـەبوەعار    بــێ گلایــەم مــن لــەحوکمی کردگــار (۳۱۶۰)
[illegible] بەزەنجیرشـێر دەبێـتن خـوارو پەسـت؟    با،دەئەسـتۆی دا ببـێ هـەم لاق و دەسـت[1] (۳۱۶۱)
پرسـی حـاڵی وی لەحـەبس و بیـری تـەنگ    جـواب دا وەک مانـگ لـەئاخیر زەردەڕەنـگ (۳۱۶۲)
مـانگ لـەئاخر گـەرچی پشـتی کووڕو خـوار    چـاردەخۆ دێ، نـوری بگـرێ ژوورو خــوار (۳۱۶۳)
دێرەدەئاوونـــگ گەربکــــەی وردو بــــڵاو    قــووەتی دڵ زیــاد دەکـات و، نــووری چــاو (۳۱۶۴)
جـۆ. کەگـەنمی چـۆن دەڕێـژن نێـو خـاک    دێ لـەخاک ڕا خووشـەگەنمی جـوان و پـاک (۳۱۶۵)
جـارەکی دی ئەودەکـەن ورد ورد لــەئاش    زیـاد دەکـا نان،گیـان و قیمـەت، زێـدەباش[2] (۳۱۶۶)

---

[1] - شێر کەدیتت بەستەیی زەنجیرەئەو    خۆ لەبۆ زەنجیر چاکەر، میرەئەو

[2] - گەرلەئاشیان کردو کردیان وردو خاش    قیمەتی زیاتر لەوەی بوو پێش ئاش

ورد دەبێ نان کاتێ هاتەژێر ددان ‌ ‌ ‌ جا دەبێتەعەقڵ و فام وهۆش و گیان (٣١٦٧)
کاتێ گیانیش مەحوی عیشقی دین بوو ‌ ‌ ‌ شادەزاریع چونکەکیشتی شین بوو (٣١٦٨)
ئەووتارەچونکەدوایی نایە، تۆ ‌ ‌ ‌ ڕووکەباسی یووسوف ودۆستی بڕۆ (٣١٦٩)
پاش وتاری زۆرپێیکوت ئەی فلان ‌ ‌ ‌ چیت لەبۆمن هەدیەهینا، دۆستی گیان؟ (٣١٧٠)
گەربەبێ دیاری، بچی دیداری یار ‌ ‌ ‌ وەک بچی ئاش هیچ نەبێ گەنمت لەبار (٣١٧١)
خوا بەخەڵکی وا دەڵێتن ڕۆژی حەشر ‌ ‌ ‌ دا نیشان دەن،کوانی دیاری ڕۆژی نەشر؟ (٣١٧٢)
هاتنەلامان ئێوە تەنها و بێ نەوا ‌ ‌ ‌ وەک (خلقناکم) لەئەووەڵ بوون، ئەوا (٣١٧٣)
کوانی دیاری ڕۆژی ڕەستاخیزتان؟ ‌ ‌ ‌ تا لەبۆتان،بێ بەدەستاویزتان (٣١٧٤)
یا ئومێدی بازگەشت و لا نەبو ‌ ‌ ‌ وەعدەکەی ئەو ڕۆکە،پێتان وا نەبوو؟ (٣١٧٥)
گەرپەزیرایی خودا تۆ مونکیری ‌ ‌ ‌ تۆ لەمەتبەخ، بەس دەبێ مشکی،بەری (٣١٧٦)
تۆ کەمونکیر نی پەزیرایی خودا ‌ ‌ ‌ دەرکی وی چۆن دێی، بەدەستی خاڵی وا؟ (٣١٧٧)
کەم بخۆ تۆ کەم بچوو بەدوایی خەو ‌ ‌ ‌ هەدیەبێ،با، کاتێ چوویەلایی ئەو (٣١٧٨)
کەم بنوو تۆ، ڕوو لەدەرگای خوا بکە ‌ ‌ ‌ بەربەیانان ڕەحمی خوا داوا بکە (٣١٧٩)
کەمکەمەتۆ خۆت تەکان دەوەک جەنین ‌ ‌ ‌ تا ببەخشێ پێت حەواسی تیژبین (٣١٨٠)
تالەدونیای وەک ڕەحیم تەنگ بێ یەدەر ‌ ‌ ‌ بێی لەبۆدونیای بەرین تۆ بێ کەسەر (٣١٨١)
گەر لە(ارض اللّه) بت وێ تۆ خەبەر ‌ ‌ ‌ ئەو مەکانە،گەروەلی پێی نایەسەر (٣١٨٢)
چۆن دەبی دڵ تەنگ لەجێگای وا بەرین؟ ‌ ‌ ‌ چۆن لەجێگەی وا، دەبێتن دڵ غەمین؟ (٣١٨٣)
چون لەدونیا دا ئەسیری بۆ حەواس ‌ ‌ ‌ چۆن لەئاخیردا دەبی تۆ وەک خەواس؟ (٣١٨٤)
چونکەوەختی خەو لەحیس،تۆ بووت نەجات ‌ ‌ ‌ هەرچی دەردو میحنەتەدەرچوولەلات (٣١٨٥)
تۆلەکاتی خەو دەبێ گیانت ڕەها ‌ ‌ ‌ دائیمەن ئازادەگیانی ئەولیا (٣١٨٦)
ئەولیا ئەسحاب کەهفن ئەی نەفام ‌ ‌ ‌ هەم لەخەودا هەم لەسووڕان هەم قیام (٣١٨٧)
بێ تەکەللوف وەردەگێرێ خوا، ئەوان ‌ ‌ ‌ جا ر بەڕاست و جار بەچەپ، بێ هیچ زیبان (٣١٨٨)
بوو لەڕاس مەقسوود، هەرکارێ جووان ‌ ‌ ‌ بوو لەچەپ مەقسوود، سەرگەرمی جیهان (٣١٨٩)
کاری خوایەهەرچی دەیکەن ئەولیا ‌ ‌ ‌ چەشنی دەنگی مونعەکیس بووی نێو چیا (٣١٩٠)
خێروشەڕت بیست لەدەنگی کێو ئەگەر ‌ ‌ ‌ کێو لەهەردوو خێرو شەڕ بوو، بێ خەبەر (٣١٩١)

**میوان بە یووسوفی کوت ئاوێنەم بە دیاری بۆ هێناوی تا هەر کات کە چاوت لێکرد و ڕووی خۆت دەوی‌دا دی ئەمنت وەبیر بێتەوە..**

کێتی دیاری خۆی دەویست یووسوف لەوی    ئەو لەشەرمان زوو سەری خۆی کرد نەوی (٣١٩٢)
جوابی داوەفکری دیاریم بوولەسەر    لایقی تۆم هیچ نەهاتەبەرنەزەر (٣١٩٣)
دانەیێک من،چۆن لەبۆ لای کان، بەرم؟    قەترەیێک من چۆن لەبۆ عوممان، بەرم؟ (٣١٩٤)
گەرلەبۆ تۆ دیاری بێنم گیان و دڵ    وەک لەبۆ شا،دیاری بێنم لۆچی گڵ (٣١٩٥)
من لەحەمبار دا، هەمە، ئەشیا کەسیر    غەیری جوانی تۆ لەدونیا، بێ نەزیر (٣١٩٦)
لایقی تۆم لا، فەقەت ئاوێنەیە    بۆ دیاری تۆم لەلا،بێ وێنەیە (٣١٩٧)
تا ببینی ڕوویی جوانی خۆت بەوی    ئەی لەحاستت مانگی ئاسمان، سەرنەوی (٣١٩٨)
خۆیەئا وێنەم ئەمن هینا وەبۆت    تا کویادم کەی کەدیتت ڕوویی خۆت (٣١٩٩)
ئەو لەجیب هینایەدەر ئاوێنەجا    خۆشە بۆ جوان، چاو لە ئاوێنەی بکا (٣٢٠٠)
هەرفەنایەبوو بەئا وێنەی وجوود    زوو فەنا بەتا ببەی تۆ زێدەسوود (٣٢٠١)
بوو فەنا،ئاوێنەیە،بۆچی؟بۆ وجوود    ئەسخییا ئا وێنەیان تەنیایەجوود (٣٢٠٢)
نەخسی برسی چاک دەزانێ قەدری نان    دەستەچیلەچاک دەدا ئاوور نیشان (٣٢٠٣)
گەرکو زاهیر بێ لەهەرجێ نەقسی کار    ئەو دەبێ ئاوێنەبۆ کار ئاشکار (٣٢٠٤)
گەربەبێ خەییات لیباس ئامادەبا    چی هونەربا،بۆ دروون دەیبرد، با (٣٢٠٥)
خۆیەرێک و پێک نینەهیچ دار    تانیشانی مەی بدا، نەجار کار (٣٢٠٦)
چاو، سنخچی ڕوو دەکاتەکامەجێ؟    دەچتەجێیەک گەر شکا بێ دەست و پێ (٣٢٠٧)
گەرنەبێ کەس قەت نەخۆش و دەردەدار    جوانی شوغڵی تیب، دەبێ چۆن ئاشکار؟ (٣٢٠٨)
خۆیەمس وا کەم بەهایەو خوا ڕو پەست    تاکو قەدری کیمیا مان، بێتەدەست (٣٢٠٩)
کەس بەنەقسەگەر کەماڵ پەیدا دەبێ    وەک حەقارەت عیززەتی تێدا دەبێ (٣٢١٠)
ڕێد.دەکاتن زید دی خۆی زاهیر، یەقین    سرکەبێ،زاهیر دەبێ چاک ئەنگەبین (٣٢١١)
هەرکەسێکی زانی کام شت عەیبەبۆی    تێدەکۆشێ تا کو لابا عەیبی خۆی (٣٢١٢)
دوور دەمێنێتن لەزاتی بێ هەواڵ    ئەو کەسەی پێی وایەهەیتی زۆر کەماڵ (٣٢١٣)
هیچ دەردێکی خەراپی وەک غروور    خۆ دەگیان دا هێستەنەی کردوەزهوور (٣٢١٤)
خۆ لەچاوودڵ دەبێ خوێن بێتەدەر    تا غروور وکیبر دەرکەی تۆلەسەر (٣٢١٥)
دەردی شەیتان بوو بەتەنها هەرغروور    کوا کەسێکی، بێ لەدەردی وا، بەدوور؟ (٣٢١٦)

گەربــــەزاهیر زۆرفـــــەقیرەو ســـــەرنەوی — ئـــاوی ســـــافە، پـــەین و پاڵـــەزێری وی (٣٢١٧
گـــەرکولێکی دەن بکـــەن ئـــەو ئیمتیحـــان — ڕەنگی پیسی دەگرێ ئەودەم، ئاوی جـوان (٣٢١٨
جۆگەتێیـدا زۆر شـتی پـیس، ئـەی جـەوان — گـەرچی زاهیـر دیتەبـەر چـاو ئاوی جـوان (٣٢١٩
پیـــری ڕێگـــا، شـــارەزا، ئاگـــا بـــەحاڵ — جۆیی نـەفس و تـەن دەکا ئـەو، جۆگـەماڵ (٣٢٢٠
جۆگەخۆی (نا) کێ بوو جۆگەی پاک دەکرد؟ — ئەوکەسـەی سـوودی لـەعیلمی خـوا دەبـرد (٣٢٢١
چـون چـەقوو پێی نـابڕێ قـەت دەسکی خۆ — بـــۆ برینـــی والــــە لای جـــەڕراح بـــڕۆ (٣٢٢٢
کـۆ، دەبـن سـەرهەربرین مـێش و مەگـەس — تـــا برینـــی خـــۆی نـــەبینێ هـــیچ کـــەس (٣٢٢٣
بـوو مـوڕادی مـن لـەمێش ئـەفکاری تـۆ — بـــۆ بـــرینیش وەزع وحـــاڵی تـــاری تـــۆ (٣٢٢٤
گـــەرکو دەرمـــان کـــا، برینـــت پیـــری ڕێ — لا دەچێـــتن دەردو ئێشـــت جـــێ بـــەجێ (٣٢٢٥
تـــــابزانی تۆ،کــــەچابوو ئـــــەو بـــــرین — تیشکی دەرمـان بـوو لـەوێی دا بـوو یـەقین (٣٢٢٦
ڕووکـە ئـەو دەرمـانی پیـر هینـای لـەبۆت — تـۆ کـەچابووی هەربـەوی چـابووی، نـەخۆت (٣٢٢٧

**موڕتەد بوونی کاتبی وەحی بەو عیللەتە کە تیشکی وەحی وەوی کەوتبوو و دەیکوت کە وەحی بۆ منیش دێ...**

**خولاسەی داستان**

پێش ئەوەی کە حەزرەتی عوسمان(رض) ببێتـە کاتبی وەحی شەخسێکی دی عوهدەداری ئەو شـوغڵە بـوو و هـەر وەخـت کـە کـەلیماتی وەحـی بـۆ پێغەمبـەر(ص) نـازڵ دەبـوون، حـەزرەتی پێغەمبـەر(ص) ئـەو کـەلیماتی موبـارەکی وەحـی دەخوێندنـەوە، ئـەویش عـەینی ئـەوی دەنووسـی کەم‌کەمـە، ئـەو کاتبـە دوچـاری غـروور و خـوودبینی بـوو، و پێـی وابـوو کەئـەو هـەموو کـەلیماتی جـوان و عـالی دەقـەلبی وی‌دا نـەقش دەبەسـتن... بـەو خـاترە بـە خـۆی کـوت ئـەمن دەگـەڵ پێغەمبەر(ص) چ فەڕقێکم هەیە؟ هەم ئەو وەحی بۆ دێ هەم ئەمن. عاقیبـەت دەستی کرد بـە عیناد و دوژمنی دەگەڵ حەزرەتی موحەممەد(ص) خوداوەندی موتـەعال زەربـەیێکی بـە ڕووحی ئەو کاتبە وارید کرد کە هیچ شتێک لەو کەلیماتانەی کە دەیزانی لەبیری نەما. هەر دەت‌کوت کـە قـەت کەلیمەیـەکیش فێـر نـەبووە و نـەی‌تـوانی کـە ببێتـەکاتبی وەحـی. حـەزرەتی موحەممەد(ص) پێی‌کوت ئەی ئیخلالگەر، ئەگەر پێت وابو کە وەحی بۆ تۆ نازڵ دەبێ،'بۆ چی وات بەسەر هات ؟

نووسـەرێک بـوو پـێش لەعوسـمان زێـدەباش — زۆرلەبۆنووســینی وەحیـــی کـــرد تـــەلاش (٣٢٢٨)

هـەرچی وحیـی خوێنـدبا بـۆ وی نـەبی ‌ ‌ وای دەنووسـی ڕاس، خیلافـی هـیچ نـەبی (٣٢٢٩)
تیشـکی وحیـی دای لەقـەلبی وی دەمـێ ‌ ‌ زۆری دانیش دەس کەووت ئەو نەک کەمێ (٣٢٣٠)
عەردروست ئـەو دانیشـەی ئەحمـەد کوتی ‌ ‌ بـوو بـەگومڕا ئـەو، بەوەندەحیکمـەتی (٣٢٣١)
هـەر چـی دەیڵێ ئـەو ڕەسوولی نـوور خـواز ‌ ‌ قـەلبی مـیش تێیـدا هەیەلـەو سـیرڕ وڕا ز (٣٢٣٢)
تیشـکی فیکـری دای لەقـەلبی ئەحمـەدی ‌ ‌ قـەهری حـەق بۆگیانی کاتیـب هـات بـەدی (٣٢٣٣)
هـەم لەنووسـین هـەم لـەدین ئـەو دەرکـرا ‌ ‌ بـوو بـەدوژمن، بۆنـەبی و دیـن ئاشـکرا (٣٢٣٤)
ـستەفا پێیکـوت ئـەتۆ کـافر ئـەدی ‌ ‌ بۆچی ڕەش بووی؟ گەر لە خۆت نوورت دەدی (٣٢٣٥)
گەربـا ی سـەرچاوەیی ئـەو خـوا ی لەسـەر ‌ ‌ بـۆ دەبـێ ئـاوی ڕەشـت بـڕوا لەبـەر؟ (٣٢٣٦)
چونکەهـەیبوو زێـدەکیبر و زۆر غـروور ‌ ‌ زۆرلەتۆبـەکردنێ مـا بـوو بـەدوور (٣٢٣٧)
گەرچی دەی ویست تۆ بەکا، ئەمما غروور ‌ ‌ بۆ سەبەب دائیم کەدوور بێ ئەو لەنوور (٣٢٣٨)
گـردی ناڵـە، ناڵەسـوودی بـەو نـەدا ‌ ‌ تـا سـەری وی لێـوەکرد تیغـی خـودا (٣٢٣٩)
کـوت و زەنجیـرە، غـروور لای کردگـار ‌ ‌ زۆرکەسـن بەسـتەن بەبەنـدی نادیـار (٣٢٤٠)
دی غـروورو کیبـر لـەو، ڕێگـای دەبەسـت ‌ ‌ تـا هـو ناڵـەی زاهیـری ئـەو چوولەدەسـت (٣٢٤١)
حـوا دەڵـێ زەنجیـر دەکـەم کـافر تـەواو ‌ ‌ هـیچ لـەوان زەنجیـر نـابینرێن بـەچاو (٣٢٤٢)
پشتی وان سـەد، دا دەپۆشـم چـاوی وان ‌ ‌ پـاش و پێشـی وان سـەددە،ئەی جـەوان (٣٢٤٣)
ڕەنگی وەک سەحرا دەچێ خۆ سەددی وا ‌ ‌ نادیـار ئـەو سـەددە،ناوی بـوو قـەزا (٣٢٤٤)
شـهیدی تـۆ سـەددی ڕوویـی شـاهیدە ‌ ‌ مورشـیدی تـۆ سـەددی ڕوویـی مورشـیدە (٣٢٤٥)
کـافرانیش زۆرهەنەموشـتاقی دیـن ‌ ‌ بـوو بەبەنـدی وان غـروور وکیبـرو کـین (٣٢٤٦)
بەنـدی پنهان ئـەو بـەڵام بێ حـەد قـەوی ‌ ‌ بەندی ئاسن کوا قەوی بوو، وەک ئەوی؟ (٣٢٤٧)
بەنـد کەئاسـن بێ،دەبـێ، لێـت بـێ جـودا ‌ ‌ بەنـدی غـەیبی کـەس نییـەبیکا دەوا (٣٢٤٨)
ئەگەر بەشەخسێک زەرگـەتێک، بێ و پێوەدا ‌ ‌ دیتـەدەر، ژەهـری کەدەسـتی تێـوەدا (٣٢٤٩)
گـەربرینێک بـوو بـەڵام بـۆ نێـو وجـوود ‌ ‌ کـوانێ دەرمـان بـۆ وی دەیبێـتن چ سـوود؟ (٣٢٥٠)
ـەو وتارەگـەرچی زۆر دوورەو درێـژ ‌ ‌ بـەس بکـەم با،کـەس نـەبێ تـا، گێـژ و وێـژ (٣٢٥١)
ـ ئومێـد وگێـژ مەبـە، خـۆت شـاد کـە ‌ ‌ تـۆ لـەدەگای زاتـی حـەق فـەریاد کـە (٣٢٥٢)
ـەی خودایـا تـۆ ئومێـدی عـەفوی، بـۆن ‌ ‌ ئـەی تـەبیبی تـۆ لـەبۆ ناسـۆری کـۆن (٣٢٥٣)
تەکسی حیکمـەت، ئـەو شـەقی گومڕاکرد ‌ ‌ خودپەسـەندی وای لەگشـت خـود خـواەکرد (٣٢٥٤)
حیکمـەتی حـەق جاریـیـەبۆت ئـەی بـرا ‌ ‌ حیکمـەتی حـەق هەرلەئەبـدال پێـت درا (٣٢٥٥)

مەسکەن وخانووت ئەگەر پڕ بوو لەنوور ‌ ‌ ‌ نووری جیرانە، لەدرزێک، هاتەژوور (۲۵۶)
شوکری خوا کە، قەت مەبە، مەغروور ئەتۆ ‌ ‌ ‌ کیبرو خود خواهی و غروور لادە، لەخۆ (۲۵۷)
سەت ئەسەف لەوعارییەزۆر بوو غەمین ‌ ‌ ‌ چونکەزۆری دوور کرد ئوممەت لەدین (۲۵۸)
من غولامی ئەوکەسەم پێی وایەئەو ‌ ‌ ‌ ماوە تەنها، دوور لەسفرەی خوا یەئەو (۲۵۹)
زۆری پێ ویستەکەتا سالیک دەگا ‌ ‌ ‌ بەو مەقامەی پێیدەگا دۆستی خودا (۲۶۰)
گەرچی ئا سن سوور دەبێ، خۆ سوور نییە ‌ ‌ ‌ ئاگرەئەو سووردەکا، لەو دوورنییە (۲۶۱)
گەرکو ماڵێک ڕوون دەبێت و پڕ لەنوور ‌ ‌ ‌ نوور،نەئی ماڵ، نووری ڕۆژەدێتەژوور (۲۶۲)
هەر دەرو دیوار دەڵێ نوور ئی منە ‌ ‌ ‌ نوور لەخۆمە،نووری غەیری من،ونە (۲۶۳)
جا،دەڵێ ڕۆژ، وا، بەوان ئەی نالەبار ‌ ‌ ‌ گەرغڕووبم کرد، دەبێ حەق ئاشکار (۲۶۴)
وا دەڵێن سەبزە لەخۆبووین،ئێمەشین ‌ ‌ ‌ هەرلەخۆمان هەن بوو شادی و پێکەنین (۲۶۵)
وا دەڵێ هاوین کەئەی سەو زانی لاو ‌ ‌ ‌ خۆو،دەبینن من کەڕۆیشتم لەلاو[1] (۲۶۶)
چاو بەدەن پێی وایەبۆخۆی جوانەوا ‌ ‌ ‌ بێ خەبەربوو ڕووح لەوی پنهانەوا (۲۶۷)
پێیدەڵێ ڕووح، کێی ئەتۆ ئەی خاکدان؟ ‌ ‌ ‌ یەک دوو ڕۆژان تۆ بەمن دەت بێ ژییان (۲۶۸)
نازو عیشوەت لەوجیهانەیێ سەمەر ‌ ‌ ‌ حەوسەلەت بێ، تا لەتۆ، من دێمەدەر (۲۶۹)
چادەکەن بۆت گۆڕ،ڕەفیق، نیزیک و دوور ‌ ‌ ‌ دەتکەنەخۆراک لەبۆچی؟ مارو موور (۲۷۰)
دەگرێ لووتی، بۆگەنیووت بێ، لەبۆی ‌ ‌ ‌ ئەوکەسەی دەیکرد فیدای تۆگیانی خۆی (۲۷۱)
هەر بەڕووحەهەرچی گوێیەونوتق وچاو ‌ ‌ ‌ هەر بەئاگر بوو کەجۆشش کەوتە، ئاو (۲۷۲)
هەر وەکوو ڕووح بۆسەبەب بۆ ژیانی من ‌ ‌ ‌ تیشکی ئەبدال وایەبۆسەرگیانی من (۲۷۳)
گەرلەسالیک لابدا مورشید دووچاو ‌ ‌ ‌ مردووەئەو گەرچی زیندووبێ، بەناو (۲۷۴)
دادەنێمەسەر زەوی بۆیە، سەرم ‌ ‌ ‌ تاکوشاهیدبێت ڕۆژی مەحشەرم (۲۷۵)
ڕۆژی مەحشەر توند دەلەرزێ دارو بەرد ‌ ‌ ‌ شاهیدی حاڵی مەیە، ئەوکاتەعەرد (۲۷۶)
چی زەوی، هەی بێ خەبەر، دەیلێت زوو ‌ ‌ ‌ دێتەگفتو گۆلەوێ عەردو دڕوو (۲۷۷)
فەلسەفی گەر لەو، وتەسەر بابدا ‌ ‌ ‌ پێی بڵێ، ئەو سەرلەدیوار بابدا (۲۷۸)
نوتقی ئاووقووڕ وەها، هەم نوتقی گڵ ‌ ‌ ‌ زۆرعەیانەلای ئەوانەی ئەهلی دڵ (۲۷۹)
فەلسەفی کەمونکیری حەننانەیە ‌ ‌ ‌ ئەو لەحاڵی ئەولییا بێگانەیە (۲۸۰)
جا دەڵێ ئەوفکری پووچی خەڵکی، چاو ‌ ‌ ‌ چا دەکا بۆیان خەیاڵی پووچ و خاو (۲۸۱)

---

[1]- جا دەڵێ هاوین بەوانەی سەوزو شین ‌ ‌ ‌ من کەڕۆیشتم دەگێڕن گەرمەشین

کفــرو ئیلحــاد بــوو بــەباعیس تاکوئــەو — هەرخــەیاڵی مــونکیری کــا، ڕۆژو شــەو (٣٢٨٢)
فەلســەفی گــەرمونکیرە، دێــوی مەریــد — ئەوهــەمان کــات،بوو، لــەبۆ دێوێــک موریــد (٣٢٨٣)
خــۆت ببینـــەتابینی جـــنن و دێـــو — شـــێتی،بۆیەتۆ گەزیوتـــە، هـــەردوولێو (٣٢٨٤)
هەرکەسێ هـەیبێ لـەدڵ شـەکک و گومـان — ئــەو لــەدونیا فەلســەفی، ئــەمما نیهــان (٣٢٨٥)
بــاش دەکــا ئــەو ئیعتیقادی،جــارو بــار — فەلســەفی دێ، ڕەش دەکــا ڕووی تــار تــار (٣٢٨٦)
ئــەی موســەڵمان(الحــذ ر) لــەو خەســڵەتە — عالــەمێک گــەورە، دەخــۆت دا، تــۆ هەتــە (٣٢٨٧)
گشــتی حــەفتادو دوو میللــەت هــەن لــەتۆ — (الحــذر) خۆیــان کــەزاهیر کــەن لــەتۆ (٣٢٨٨)
ئەوکەســەی بــەو حاڵەتــەی ئیمــان دەبــێ — ئەولەترســان وەک گــەڵا، لــەرزان دەبــێ (٣٢٨٩)
تــۆ بەشــەیتان و بـــەئیبلیس پێکـــەنی — چــاک دزانــی چونکــەخۆت، ئیــدی، دەنــی (٣٢٩٠)
گــەربکا گیــان بــاتنی خــۆی ئاشــکار — دێ لەئـــەهلی دین،گـــەلێ هـــاوارو زار (٣٢٩١)
زێڕی مەغشووش زۆر لـەدووکان دا جـووان — چــون بەدوورەئــەو لەبــەردی ئیمتیحــان (٣٢٩٢)
لا مەبەپـــــەردە، لەســـــەرعەیبن،خودا — کـــاتی ئیمتیحـــان لەبۆمان،بە،پـــەنا (٣٢٩٣)
وێک دەچن شەو،زێڕی قەلب و زیڕی باش — ڕۆژ کــەهات مــەعلووم دەبێ باش و،بــەلاش (٣٢٩٤)
زێــڕی خــالیس وا بــەزێڕی دی دەڵــێ — ئــەی ڕیاکــار لێگــەڕێ بــا ڕۆژ هــەڵێ (٣٢٩٥)
ســەت هــەزاران ســاڵ ئیبلیســی لــەعین — بــوو بەئەبــدال و ئــەمیری مــوئمینین (٣٢٩٦)
چونکــەکردی ئــەو لەســەرئادەم غــروور — خــوا دەری کــردو، لەڕەحمــەت بــوو بــەدوور (٣٢٩٧)

**دوعا کردنی بەلعەمی باعوور کە مووسا و قەومەکەی لەو شارە بە بێمرادی بگێڕەوە...**

بەلعــەمی بــاعوور لای خــەڵکی جیهــان — هێندەمەحبووب بوو، وەکوو مووسای زەمان (٣٢٩٨)
هــەر لــەبۆوی ســەجدەیان خــەڵکی دەبــرد — ئــەو مــەریزی، هەربــەجادوو چــا دەکــرد (٣٢٩٩)
ئــەو لەسەرمووســای دەکــرد کیبــر وکــەماڵ — وا ی بەســـەرهات هەروەکووبیســـتووتەحاڵ (٣٣٠٠)
بەلعـــەم وئیبلیســـی زۆر تێـــدا جیهـــان — بــێ تــەفا وەت هــەم عــەیان و هــەم نیهــان (٣٣٠١)
ئەودووانــەی زێــدە مەشــهوو رکــرد ئــیلاه — تــا بــبن ئــەو دوو لەســەر ئیــدی گــەواه (٣٣٠٢)
خــوا فەقــەت ئــەودوو دزەی، داوون لــەدار — گـــەرچی زۆرن دز، دەقـــەهری کردگـــار (٣٣٠٣)
خـــوا بەزاهیرئەودووانـــەی دا لـــەدار — گەرچی کوشتەی قەهری حەق زۆر،،بێ ژمار (٣٣٠٤)
تــا کــو حــەددێک نــازەنینی ئــەی بەشــەر — ترسی خوات بێ، پێت لەحەد با، نەچتەدەر (٣٣٠٥)
ســەربکەی گەر،گــەڵ لــەخۆت زیاد، نــازەنین — دێــی لەحەوتــەم ئاســمان بــۆ ژێــر زەمــین (٣٣٠٦)

| | | |
|---|---|---|
| بـاس کـران، عـاد و سـەموودی ئەشـقیا | تـا بزانـی چـەن عـەزیزن ئـەنبیا | (۳۳۰۷) |
| ئەونیشـانەی خەسـف و قـەزف و سـاعیقە | بۆبـەیانی عیـزی نەفسـی ناتیقـە | (۳۳۰۸) |
| با فیـدای ئینسـا ن ببـێ حـەیوا ن، بەگشـت | با فیدای هۆش، بێت ئینسان، ورد، درشت | (۳۳۰۹) |
| هۆش،یـەعنی عـەقڵی کـوللی هووشـیار | هۆشـی جـوزوی هۆشـە ئـەمما زۆر نـەزار | (۳۳۱۰) |
| گشـتی حـەیواناتی وەحشـی نێـو چییـا | پەسـترن لـەو هـەی دەگـەڵ ئینسـا ن ژییـا | (۳۳۱۱) |
| خـوێنی وان حـەیوان لـەبۆ ئینسـا ن حـەڵاڵ | کـاری ئینسـان چـون نـەبوو بـۆوان کـەماڵ | (۳۳۱۲) |
| عیـزز ەتـی وەحشـی لەبۆیەهاتـەخوار | چـون موخـالیف بـوو بەئینسـان ئـەو نـە، یـار | (۳۳۱۳) |
| چۆن دەبێ عیززەت لـەبۆت ئـەی هووشیار؟ | گەریکـەی تـۆ، وەک کـەری وەحشـی فیـرار | (۳۳۱۴) |
| نـابێ کـەر بـوگزی کەهـەیتی ئـەو سـەلاح | گـەر کـو وەحشـی بێ، دەبێ خـوێنی مـەباح | (۳۳۱۵) |
| گـەرچی نیتـی عـیلم و زانسـت هـیچ کـەر | کوا، لەکوشـتن بوومـەعاف لای خـوای، لەسـەر؟ | (۳۳۱۶) |
| جـا ئەگـەر وەحشـی ببێـتن ئـادەمی | چـۆن دەبێ مـەعزوور لەکوشـتن ئـەودەمی؟ | (۳۳۱۷) |
| لاجـەرەم خوێنیـان حـەڵاڵ بـوو کـافران | هـەر وەکـوو وەحشـی بـەتیر و خەنجـەران | (۳۳۱۸) |
| خـوێنی ژنیـان ومناڵیشـیان حـەڵاڵ[1] | چونکەلایانـدا وەلـەو عـەقڵی کـەماڵ | (۳۳۱۹) |
| گەرکوعـەقڵێک ڕووی دەزاتـی خـوا نییـە | مەرتەبـەی وی مەرتەبـەی حەیوانییـە | (۳۳۲۰) |

**ئیعتیماد کردنی هاڕووت و ماڕووت بە پاک و مەعسسووم بوونی خۆیـان و تێکـەڵاوی دەگەڵ خەڵکی دونیا و کەوتنی وان دەفیتنە...**

| | | |
|---|---|---|
| هەروەکوو هاڕووت و، وەک ماڕووتی وەخت | چـون غروویـان بـوو چلۆن بـوون تیرەبـەخت | (۳۳۲۱) |
| زۆربـەپاکی خـۆ، هـەیا ن بـووو ئیعتیمـاد | ئیعتیمـادی کەڵ،بەشـێریان چـوو لـەیاد | (۳۳۲۲) |
| گـەرچی وایەئـەو بەشـاخ زۆر کاردەکـا | شـێر ئـەوی دەدڕێـت و تـارو مـار دەکـا | (۳۳۲۳) |
| وەک دڕووی جووشکی کەهـەی بێ زێدە شاخ | دەیکوژێ شێر، جا لەدەشت بێ یا لە شاخ | (۳۳۲۴) |
| گەربـەتووفان دار،دەکـەن گریـان و شـین | هـەرچی گیـا بـێ بـەو دەبێـتن شادو شـین | (۳۳۲۵) |
| ڕەحمـی کـرد بـەگیای زەعیـف ئەوتونـد بـا | باقـەویش بـی دڵ، نـەبی مـەغروور،با | (۳۳۲۶) |
| کـوا تەبـەر، ترسـی هەیـەزۆربێت دار؟ | لـەت دەکـا دار، بـا بـبن چەنـدین هـەزار | (۳۳۲۷) |

---

[1]- خوێنی ژنیان و مناڵیان بوو حەڵاڵ (مصرع اول)

ـبڕێ ئەو هیچ گەڵایەک هیچ وەخت     ئەو فەقەت دەبڕێت داری زێدەسەخت (٣٣٢٨)
ـوا دەترسێتن لەداری زۆر، نار؟     کوا کە، مەڕ، زۆر بێ، دەکا، قەسساب فیرار؟ (٣٣٢٩)
حو ـەحاستی مەعنی سوورەت زۆر زەبوون     بەس بەدەس مانایەچەرخی نیلگوون (٣٣٣٠)
ـینەبەرچاو چەرخی دۆلابی، ئەتۆ     عەقڵدەیسووڕێتی ئەو نەک سەر بەخۆ (٣٣٣١)
ـردیش و سووڕانی جیسمی وەک سپەر     بەس بەڕووحە، ئەی فڵانەی خۆش نەزەر (٣٣٣٢)
ـ بەمەعنای بایە، دیتن، نەک بەخۆ     چەشنی چەرخێک بێ ئەسیری ئاوی جۆ (٣٣٣٣)
حەرزو مەدد ودەخل و خەرجی ئەونەفەس     دێ، لەکێ ڕا؟ هەرلەگیانی پڕ هەوەس (٣٣٣٤)
ـردەکا ئەوجیم جارجار حاو دال     جار دەیکا سوڵح وجار جارەش جیدال (٣٣٣٥)
حارەکی ناردی خودا ئەوبا،وەها     کردی بۆسەرقەومی عاد، وەک ئەژدەها (٣٣٣٦)
ـەرهەمان با، جارەکی بۆموئمینان     کردی سازش هەم موڕا عات هەم ئەمان (٣٣٣٧)
ـدەکوت مەعنا خودایە،شەیخی دین     بەحری مەعنای خوایی (ڕب العالمین) (٣٣٣٨)
ـمان و عەرزو هەرچی بێ دەوان     خۆ لەنێو ئەوبەحرە، وەک یەک پووشکەکان (٣٣٣٩)
ـقس و حەملەی پووشکەیێکی بوو لەئاو     هەرلەئاوە، کاتێ مەوواج دیتەچاو (٣٣٤٠)
ـی هەوێ ئارام بکا پووشکەی سەراو     ئەو دەکێشێ بۆ قەراغ و بۆ دەراو (٣٣٤١)
ـۆ وەسەت گەرجارەکی دی بێتەوە     وەک گییای دەم بایی توند لێی دێتەوە (٣٣٤٢)
ـەو وتارەدوایی نایەئەی فڵان     باس کەوەهاڕووت و ماڕووتی زەمان (٣٣٤٣)

**پاشماوەی داستانی هاڕووت و ماڕووت و عەزابی وان دەچاڵاوی بابلدا...**

ـەر لەژووڕا دیتبایان ئەو دوو وان     چی گوناهی کرد با خەڵکی جیهان (٣٣٤٤)
ـستی خۆیان زۆر بەکین و ڕق دەگەست     جا، لەحاستی جورمی خۆیان چاو دەبەست (٣٣٤٥)
ـکی خۆی ناحەز لەنەینووک دی یەکێ     ڕووی دەسووڕاند وبەڕق داچوو لەکێ؟ (٣٣٤٦)
ـکەدی عەیبی کەسێ ئەهلی غروور     ئاگری دووزەخ دەوی دا کرد زهوور (٣٣٤٧)
ـوێ نابوو غیرەتی دین ئەوغروور     هیچ لەخۆی نانۆڕی مەغروور، قەت چجوور (٣٣٤٨)
ـر دەبێ بۆغیرەتی دین یەک نیشان     ئاگری وی شین دەکاتن یەک جیهان (٣٣٤٩)
حـ بەوانی کوت ئەگەرڕوون و گەشن     قەت مەنۆڕن لەو کەسانەی ڕوو ڕەشن (٣٣٥٠)
ـکری خوا کەن ئەی سپا هو نۆکەران     چونکەنەو بوو، شەهوەتی خۆش مەنزەران (٣٣٥١)
ـەر بەئێوەی دەم ئەوەی من دامەوان     دەردەکات ئێوە، ئەلێرەئاسمان (٣٣٥٢)

عیســـــمەتی وا گــــەردەئێوەدا هەیـــــە    تیشـکی پـاکی حیفـزی مـن بـوو،وا هەیـە (۵۳--
هەرلەبـەرمن بـوو کـەبوون پـاک ئێـوە، وا    قـەت نـەبێ پیـرۆز بەسـەرتان دێـو، بـا (۵۴--
هــەروەکوو دی کــاتبی وەحیــی ڕەســوول    ئـەو دەخۆیـدا حیکمـەت و نـووری ئوسـوول (۵۵--
خـۆی دەکـردە هەمنـەوای تـەیری خـودا    دەنگـی تـەیری دیکـە، ئـەو دەیکـرد ئـەدا (۵۶--
گــەر بــەدەنگی تــەیر، تۆدانــا دەبــی    کـوا لەقەسـتی تـەیر تـۆ ئـا گـا دەبـی؟ (۵۷--
فێـر ببـی گـەر دەنگـی بولبـول سـەر،چڵان    کـوا دەزانـی چـی دەڵـێ ئـەو گـەڵ،گوڵان؟ (۵۸--
گــەرکو بــش زانــی گومانــەیا قییــاس    وەک لـەلێوان تێدەگا،کـەڕ، بـاس و خـواس (۵۹--

**ڕۆیشتنی کابرایەکی کەڕ بۆ عەیادەتی جیرانەکی نەخۆش..**

**خولاسەی داستان...**

خەبـەریان دا بـە کابرایـەک کـە گوێی لـە هـیچ نـەدەبوو کـە جیرانەکـەت نەخۆشـە. ویسـتی کـە وەزیفەی جیرانەتی بەجێ بێنێ و بچیتە عەیادەتی. بەڵام بە خۆی کوت ئەمن بـەو گوێی عـەلیل و کەڕ کوا لە قسەی ئەو نەخۆشە حاڵی دەبم؟مەخسووسەن ئەو نەخۆشـە ئەوەنـدە نەخۆشـە کـە ناتوانێ بەسوورەتی وازیح و ئاشکرا قسـەبکا. بـەڵام چارە نیـە و دەبێ وەزیفـەی جیرانـەتی بـەجێ بێنم و بە عەجەلە بچمە لای ئەو نەخۆشە. فکری کرد و چارەیێکی بـەو جـوورە دۆزیـەوە. دەچـم و تەماشای لێوی ئەو نەخۆشە دەکەم هەر دەگەڵکوو لێوی بزووت مەقسوودی وی حاڵی دەبم و هەروەها چەن سوئالێکی لێدەکەم...جا ئەگەر وا بێ هیچ ئیشـکالێکم نیـە و دەبێ فـەورەن بـڕۆم... جا ئەو کابرا کەڕە لە لای خۆی چەن سوئالێکی بەو جـوورە تـەنزیم کـرد بـەوی دەڵـەم چۆنی؟ ئەویش بێ گومان دەڵێ... باشم. ئـەمنیش پێـی دەڵێم خـوا شـوکر. لـە پاشـان لێیدەپرسـم چیـت خـواردووە؟ ئـەویش یـا دەڵێ... شـەربەت یـا دەڵێ ئاشی ماشـم خـواردووە، ئـەمنیش پێـی دەڵێم نۆشی گیانت. ئەو جارە پێیدەڵێم کامە پزشـک نوسخەی بۆ نووسیوی؟ ئەویش بێگومان یەکێک لە پزشکان نێو دەبا. ئـەمنیش پێـی دەڵێم قـەدەمی موبارەک بێ. خولاسـە لـەو جـوورە سـوئال و جوابی فەرزی لـە لای خـۆی تـەنزیم کرد و بـە عەجەلـە چـوو بـۆلای نـەخۆش. کاتێ ئـەو کابرا کەڕە چوو بۆلای نەخۆش لێی پرسی چۆنی؟ نەخۆش جوابی داوە دەمرم. کابرای کەڕ کوتی خـوا شوکر. کاتێ کە نەخۆش شوکر و سپاسی لەو کابرا کەڕە بیسـت زۆر نارەحـەت بـوو و بـە خـۆی کوت ئەو کابرایە قسەی بێمەعنا دەکا یا بـە ڕاستی دوژمنـی منـە؟ کابـرای کـەڕ پرسـی چیـت خواردووە؟ نەخۆش جوابی داوە ژەهرم خواردووە. کابری کەڕ کوتی نۆشی گیانت. نـەخۆش لـەو

جوابە زۆر نارەحەت بوو. کابرای کەڕ پرسی کامە پزشک ئەتۆ موعالەجە دەکا؟ نەخۆش جوابی داوە عیزرائیل. کابرای کەڕ کوتی... قەدەمی بەخێر. ئەمن تەجرەبەم کردووە ئەو پزشکە بێتە سەر هەر نەخۆشێک چاک دەبێتەوە. کابرای کەڕ لە پاشان زۆر بە خۆشحاڵی لە ماڵی ئەو نەخۆشە هاتە دەر و لەوە کە وەزیفەی جیرانەتی بەجێ هێناوە شوکری خودای کرد و لەلایەکی دیکەشەوە کابرای نەخۆش زۆر غەمگین و دڵ شکاو بوو دەیکوت... عەجەبا.. ئەمن دەمزانی کە ئەو کابرایە ئەمنی خۆش ناوێ بەڵام نەمدەزانی تا ئەو ئەندازە کە مەرگی من بە ئاوات بخوازی و لە پاشان دەستی کرد بە جنێو دان بەو کابرا کەڕە...

ی بەیەک کەڕکوت یەکێک زۆر زۆر بەهۆش     ئێستە جیرانت دەجێی کەوتوە نەخۆش (٣٣٦٠)

ڕ بەخۆی کوت کوا بەگوێی وا زۆرگران؟     من دەزانم چی دەڵێتن ئەوجەوان (٣٣٦١)

ن نەخۆشەو دەنگ زەعیفەو ناتەوان     لازمیشە من بڕۆم بۆ لای ئەوان (٣٣٦٢)

ەزبیبنم لێوی وی کەمکەم بزووت     زوو دەکەم بۆ خۆم قیا س لەو لێوو لووت (٣٣٦٣)

ەر بڵەم چۆنی ئەتۆ ئەی جاری من     ئەو دەڵی باشم گەلێ ئەی یاری من (٣٣٦٤)

دڵەم شوکر. دەی ئەدی چیت خوارد باش؟     ئەو دەڵی شەربەت، ویا خێر ئاشی ماش (٣٣٦٥)

دڵەم باش. بۆت ببێ با نۆشی گیان     کامەدوکتوور دێتەلات؟ بێژێت فڵان (٣٣٦٦)

ن دەڵەم جا، زۆرمبارەک پێیەئەو     چون شەفا، هەم تەندروستی پێیەئەو (٣٣٦٧)

نبحانمان کرد ئێمەلەو قەدەم     بچتەهەرجێ دەردەچێ لەو، دەردو غەم (٣٣٦٨)

جوابی فەرزی بۆخۆی کرد قییاس     چوو لەبۆ لای ئەو نەخۆشەی پیاوی خاس (٣٣٦٩)

کوتی چۆنی؟ کوتی مردم، نەخۆش     چونکەشوکری بیست لەکەڕ، زۆر بوو پەرۆش (٣٣٧٠)

کری چی؟ بۆ مەرگی کردم ئا رەزوو؟     کەڕ قییاسی کرد ئەمما ئا وەژوو (٣٣٧١)

چیت ئەدی خوارد؟ جوابی داوەژەهری مار     نۆشی گیانی پێدەکوت، بوو شێت و هار (٣٣٧٢)

ی پێم کامەدوکتور دێتەلات؟     تا عیلاجت کا، لەئێش، بت دا نەجات (٣٣٧٣)

ی دەکوت عیزرایلم بۆ دێ، بەسە     پێی دەکوت زۆر پێ مبارەک، ئەوکەسە (٣٣٧٤)

ەدەر کەڕ زۆر بەخۆشی و شادمان     شوکری خوای کرد هیچ گلایەم سەر نەمان (٣٣٧٥)

ەخۆش کوت ئەوهە، بۆمن دوژمنە     نەمدەزانی مەعدەنی ڕەنجی منە (٣٣٧٦)

خۆشەدەی هەویست تا سەت جنێو     ڕێ بکا بۆ ئەوکەڕەی ئەزمان دزێو (٣٣٧٧)

ک ئەوەی خواردوویەخۆراکی خەراب     قەی دەکا، تا بەس ببینێ ئەوعەزاب (٣٣٧٨)

ی غەیز، هەر ئەوهەیە، تۆ قەی مەکە     خۆت ئەتۆ بێ بەش لەلوتفی حەی، مەکە (٣٣٧٩)

چونكەنـەی بـوو هـیچ سـەبرو هـیچ قـەرار　　هـــەرجنێوی هاتـــەدڵ، دەیكـــوت بـــەزار (۳۳۸۰
بـا بڵـەم هـەر چـی كـوتی، بـەو، بـەد ئـەدا　　چون نەخۆش بووم ئەو دەمەی جوێنی ئەدا (۳۳۸۱
چون عـەیادەت دڵ دەكا شاد نـەک غـەمین　　دوژمنـی كـرد نـەک عـەیادەت كـەڕ یـەقین (۳۳۸۲
تـــاببینێ دوژمنـــی خـــۆی زۆر نـــەزار　　تـــا كـــو بگـــرێ قـــەلبی ناپـــاكی قـــەرار (۳۳۸۳
زۆر كەسـن تاعـەت دەكـەن زۆر بـۆ خـودا　　تـا كوخـۆ ش بـێ خـوا لـەوان ڕۆژی جـەزا (۳۳۸۴
زۆرگوناهەتاعـــەتێک بـــێ بـــۆ ســـەواب　　وایـــدەزانی باشـــەئەمما بـــوو خـــەراب (۳۳۸۵
وایـــــدەزانی كەڕ،كــــەچاكی كـــــردووە　　نەیـــدەزانی ئـــا بـــڕووی خـــۆی بـــردووە (۳۳۸۶
كــەڕ كــوتی زۆر ڕاحــەتم لــەو نــاوەمن　　حـــەقی جیـــرانیم بـــەجێ هینـــاوەمن (۳۳۸۷
ئـــا گرێكـــی كـــردەوەزۆر پـــر خـــرۆش　　كەوتـەنێوی، هـەم لـەبۆ خـۆی، هـەم نـەخۆش (۳۳۸۸
ئاگرێكتـــان كـــردەوە لـــەو(ئەلحـــەزەر)　　جـورمی خۆتـان زێـدەكرد خۆڵتـان وەسـەر (۳۳۸۹
وای بـەڕێكێک كـوت نـەبـی ئاخرزەمـان　　نـۆێژ بكـەنۆێژت نـەكرد تـۆ، ئـەی جـەوان (۳۳۹۰
(اهـــدنا) دەنـــوێژ دا واجـــب كـــرا　　تـا نـەبین غافـڵ دەنـوێژ دا، ئـەی بـرا (۳۳۹۱
قـەت نـەبێ نۆژێـک كەدەیكـەم ئـەی خـودا　　چەشـنی ئـەونۆێژەی كـەدەكرێ بـۆ ڕیـیا (۳۳۹۲
بـەو قیاسـەی كـەڕ كـەكردی ئـەو سـەفەر　　سـوحبەتی چـەن ساڵەیان بـوو بـێ سـەمەر (۳۳۹۳
ئەوقیاسـەگەر كـو دەیكـا حیسـی پەسـت　　كـوا لـەوەحیی دوورلـەفام، چـی دێتەدەسـت؟ (۳۳۹۴
گـەر دەبیسـێ گۆێچكەكـەی حیسـست كـەلام　　گیانەكەی تۆ، كەڕ بوو گۆیی وی، وەسسـەلام (۳۳۹۵

**ئەوەڵین كەس كە دەبەرابەر نەفس دا بە قیاس ئیستیدلالی كرد شەیتان بوو...**

ئەوكەسـەی ئـەووەڵ قیاسـی كـرد ئـەدا　　ئیبلـیس بـوو ڕوو بـەڕووی گفتـی خـودا (۳۳۹۶
ئـــەوكوتی ئـــاگر لـــەخاک زۆر چـــاترە　　ئەسڵی وی خـاک ئەسڵی مـن چـاو، ئـاگرە (۳۳۹۷
باقیـاس كـەین فـەرع، بۆسەرئەسڵی خـۆی　　ئەولەزوڵمــەت مــن لــەنار خــاڵق ئــەتۆی (۳۳۹۸
حـەق كـوتی ئەنسـاب لـەلام بـێ ئیعتیبـار　　مـن لـەلام بـەس زوهـدو تـەقوا، دێن، بـەكار (۳۳۹۹
كــوانێ تــەقوا، ئیرســی دنیــای فانییــە؟　　ڕووحە جێی وی ، قەت نەسەب جێی وای نییە (۳۴۰۰
بەڵكەتــەقواو زوهـــد، ئیرســـی ئـــەنبیا　　وارســـی ئـــەو ئیرســـەگیانی ئـــەتقیا (۳۴۰۱
چـاو كـوڕی بووجـەهل مـوئمین بـوو عـەیان　　ئەو كوڕەی نووح بوو لەزومرەی گومڕەهان (۳۴۰۲
چـاو لەوەیكـەبوو لـەخاک چـەن ڕووگەشـە　　تۆ لەنار بووی چا و لەڕووت كەچەن ڕەشە (۳۴۰۳
ئەوقیاســـات، ڕۆژی هـــەوری، یاشـــەوێ　　باشـــەتا قوبڵـــە، وەدەســـتی تـــۆ كـــەوێ (۳۴۰۴

ڕۆژ کەڕوون بێ،کەعبەزاهیر بێ،ئەگەر     هەرقیاسێک ئێمەبیکەین بێ سەمەر (۳۴۰۵)
لا نەدا ڕووی تۆ لەکەعبە، قەت قیاس     هەرخودا زانایەکام شت خاسەڕاس (۳۴۰۶)
تۆ ببیسی دەنگی تەیری خوا، ئەگەر     زاهیری، تۆ تێدەگەی لەو دەنگەهەر (۳۴۰۷)
جا، قیاسان چا دەکەی ئەودەم لەخۆت     گشت خەیاڵ ئەودەم دەبێ، مەوجوود لەبۆت (۳۴۰۸)
ئیستیلاحاتێک لەبۆئەبدال هەیە     کوا خەبەردا ڕێک لەوان ئەقوال هەیە؟ (۳۴۰۹)
ر هیری دەنگی تیوور فێر بووی ئەتۆ     سەت قیاسا ن چادەکەی لەو، سەر بەخۆ (۳۴۱۰)
ێک نەخۆش چۆن بوو لەبەر کەڕ دڵ شکاو     کەڕ، لەلای وابوو کەچاکەی کرد تەواو (۳۴۱۱)
کاتبی وەحی، کاتێ بیستی دەنگی تەیر     وای دەزانی بۆ شەریک بۆ وەحی خەیر (۳۴۱۲)
ـەکی لێدا لەوی کوێری دەکرد     تاکوقەعری دەردو مەرگی ئەو دەبرد (۳۴۱۳)
ـەر لەبۆتۆ هات لەفەیزی یەک وەلی     تۆ نەبی مەغروور لەو حاڵەی جەلی (۳۴۱۴)
گەرچی وەک هاڕووت وماڕوت پاک بن     یەک لەدۆستانی خودای بێ باک بن (۳۴۱۵)
گەڵ خەراپان هەربنای چاک دا بنێن     جا،غروورو خود پەسەندی لا بنێن (۳۴۱۶)
ـت لەناکاو نەت گرێ خوا ی دووجیهان     بێی، سەرەو بن بۆ زەوی لەو ئاسمان (۳۴۱۷)
ـەردووکوتیان ئەی خودا تۆ، سەرەوەری     کێ هەیە، بێ حیفزی تۆ خۆی، دەر بەری؟ (۳۴۱۸)
ئەو هەیان کوت قەلبی وانیش لێیدەدا     چۆن دەبین بەد، ئێمەواباش، خۆش ئەدا (۳۴۱۹)
ئیزتیراب و وەسوەسەی ئەو دوومەلەک     بوون بەباعیس تا بەجێ بێڵن فەلەک (۳۴۲۰)
جا دەیان کوت،ئەدوو، ئەی ئەڕکانییا ن     بێ خەبەرلەو پاکییەی ڕووحانییان (۳۴۲۱)
جا دەکەین لێرەگەلێک پەردەی جووان     بۆزەوی دێین، هەڵدەدەین خێوەت بەوان (۳۴۲۲)
ـەم عیبادەت هەم عەداڵەت کارمان     کاتی شەو، دەفڕینەوەبۆ ئاسمان (۳۴۲۳)
ـت نەپاکی بین، نموونەی گشت زەمان     تاکو بێنین بۆ زەوی ئەمن و ئەمان (۳۴۲۴)
جۆن قیاسی ئاسمان دەکرێ لەعەرد؟     نادروستەوەک قیاسی خۆش،لەدەرد (۳۴۲۵)

## دەبارەی ئەو مەتڵەبەدا کە ئینسان حاڵ و مەستی خۆی بە نەزانان نەڵێ ...

جـ کەبەو قەولەی سەنائی گوێ بدەی     دانێ سوڕ لەو جێیە تۆخواردووتە، مەی (۳۴۲۶)
گەرکوڕێ ون کا لەمەیخانان مەست     مەسخەرەی منداڵ دەبێ و ئەشخاسی پەست (۳۴۲۷)
ـەو بەلادا دێ، لەڕێ بۆسەرزەوی     پێکەنینی شێت و منداڵ دێ،بەوی (۳۴۲۸)
ـیەئەو بەو جوورە، منداڵیش لەدوو     بێ خەبەر منداڵ کەزەوقی مەی چبوو (۳۴۲۹)

خەڵک،منداڵ،غەیری وەی مەستی خودا    بالغ ئەو کەس بوو نەچوو بەدوای هەوا (۳۴۳۰)
لەعب و لەهوی بەو جیهانەی کوت،خووا    ئێوەمنداڵ، ڕاستەقەو لی خوا، ئەوا (۳۴۳۱)
تا بچی بەدوای هەوا منداڵی تۆ    بێ فەنا بوون چۆن دەبێ باش حاڵی تۆ؟ (۳۴۳۲)
وەک مناڵ نیزیکی یێکتربن ئەگەر    خۆ،لەبەرشەهوەت نییەئەی بێ خەبەر (۳۴۳۳)
بۆ قومارەگەرکوکاری وا دەکەن    هەربەتەقلید کاری وا بڕوا دەکەن (۳۴۳۴)
خەڵکی دەعوایان وەکوو دەعوای مناڵ    چون لەسوود و نەفع و مەعنی، بوو بەتاڵ (۳۴۳۵)
شەڕ دەکەن منداڵ، بەچی؟ شەمشیری دار    قەسدی وان بۆ یەکتری نایەت بەکار (۳۴۳۶)
ئەسپی وان، نەی، یانەداریک گوڵگوڵە    ئەو لەلای وان وەک بوڕاق و دوڵدوڵە (۳۴۳۷)
وان لەژێر باری گران دا پشت خوار    وا دەزانن بوون لەسەرئەسپان،سووار (۳۴۳۸)
حەوسەلەت بێ، تاکو عەبدی باشی خوای    نۆ،فەلەک ژێر پێ دەنێ دەڕواتەلای (۳۴۳۹)
دەچتەلای وی ڕووحی پاکان و مەلەک    لەوعرووجەی ڕووح، دەلەرزێ گشت فەلەک (۳۴۴۰)
وەک منالان بوون لەدا مێنتان سووار    وادەزانن ئەسپە، دوایەدێتەخوار (۳۴۴۱)
هات(ان الظن لایغنی) لەحەق    کوا گومان ئینسان دەبا، بۆ، نۆ تەبەق؟ (۳۴۴۲)
کام لەدوو زەن غاڵبە، جێی ئیعتیبار    هیچ دەلیل بۆرۆژی ڕوون نایەت بەکار (۳۴۴۳)
بت هەوێ ئەسپت ببینی گەرئەتۆ    چاکەئەسپێک تۆ،لەدووپێت، هەر، بەخۆ (۳۴۴۴)
فکرو،وەهم و،حیسس و، دەرکی ئێوەگشت    وەک نەیەک وان، مەرکەب و،منداڵ لەپشت (۳۴۴۵)
ئەهلی دڵ گشت بوون لەعیلمی خۆسووار    عیلمی ئەهلی تەن، لەخۆیان بوو بەبار (۳۴۴۶)
عیلمی ئەهلی دڵ، لەبۆیان بوو بەیار    عیلمی ئەهلی تەن لەبۆیان بوو بەبار (۳۴۴۷)
خوا ووتوویە(یحمل اسفارە) و    بارە، ئەو عیلمەی نەبێتن گەرلە(هوو) (۳۴۴۸)
گەرنەبێ عیلمێک لەحەق بێ واسیتە    بێ دەوامەچەشنی ڕەنگی ماشیتە (۳۴۴۹)
گەربەخۆشی باری دانیش کەی لەتەن    دا دەنێن پێت بارو، شادیت وێدەدەن (۳۴۵۰)
باری دانیش تۆ مەکێشەبۆهەوا    تا لەدانیش سوار ببی تۆ، بۆ حەوا (۳۴۵۱)
تا لەدانیش تۆببی، ئەودەم سووار    جا، لەپاشان باری کۆڵت دێتەخوار (۳۴۵۲)
کوا، نەخۆی گەرجامی(هوو) دەت بێ نەجات؟    ئەی لە(هوو) بۆت غەیری لەفزی(هوو)نەهات (۳۴۵۳)
وەسف وئەلفاز چا دەکەن هەر دووخەیاڵ    ئەو خەیاڵەش باعیسەبۆچی؟ ویساڵ (۳۴۵۴)
کوا دەلیل گەربۆی نەبێ مەدلوول هیچ؟    گەر نەبێتن جاددە، نابێ غوول هیچ (۳۴۵۵)
نێوی بێ مانا،ئەتۆدیتووتەکەی؟    یا لەگاف و لامی گوڵ، گوڵ لێوەکەی (۳۴۵۶)

بیەمەعنای نەبێتن هیچ ناو ... مانگ لەئاسمان، نەک لەنێو جۆگەو دەراو (٣٤٥٧)
مەعنا و ناو بت وی بێیەدەر ... پاک کەوەخۆت تۆ، لەئەوسافی بەشەر (٣٤٥٨)
ناهێلی لەبۆئاسن چ ڕەنگ ... تۆش بەڕەنج ئا وێنەبە، نەت بێ، چ ژەنگ (٣٤٥٩)
ف بکەخۆت تۆ لەگشت ئەوسافی خۆت ... تا ببینی زاتی پاکی سافی خۆت (٣٤٦٠)
ەنێو قەلبت علوومی ئەنبیا ... بێ کیتاب و بێ موعەللیم، ئووستا (٣٤٦١)
ئەحمەد، هەن، لەنێوان ئوممەتم ... زۆر کەسی هاو گەوهەرو هاو هیممەتم (٣٤٦٢)
بەنووری خوا دەبینێ گیانی وان ... وەک دەبینم من ئەوان بەو نووری جوان (٣٤٦٣)
ئەحادیس هیچ نەبوون موحتاج ئەوان ... چونکەجێی وان بوو لەلای ئاوی ژیان (٣٤٦٤)
گفتی بولوەفا تۆبێنەیاد ... بێ سەواد بووم شەو، سبەی بووم باسەواد (٣٤٦٥)
میسالت ویست لەزانستی نیهان ... داستانی ڕۆم و چین کە، تۆ، بەیان (٣٤٦٦)

**داستانی موبارەزەی ڕۆمیان و چینیان لە بارەی عیلمی نەققاشی.**

**خولاسەی داستان...**

خەڵکی چین و ڕۆم لەسەر مەهارەت و لێهاتوویی لە هونەری نەققاشی دەگەڵ یەکتر بەحس و گفتوگۆیان دەکرد. هەریەک لەوان خۆی تەعریف دەکرد، پاشای وەخت ویستی کە بەو بەحس و ڕەجەزخوانیە خاتیمە بدا و هونەری وان ئیمتیحان بکا... نەققاشانی چین لە پاشایان ویست کە خانوویەکیان دەئیختیار بنێت، تا هونەری خۆیان دەوێدا دەمەعرەزی نمایش قەرار بدەن. شا، خانوویەکی دەئیختیاری چینیان و خانوویەکیشی دەئیختیاری ڕۆمیان قەراردا، بەڵام ڕۆمیان هیچیان لە شا وەرنەگرت، بەڵکەم دەرکی خانوویەکەیان بەست و مەشغووڵی پاک و خاوێن کردنی دیواری خانوویەکە بوون... چینیان هەموو ڕەنگێکیان بە ئوستادی و مەهارەتێکی زۆرەوە بەکار هێنا... و تەرکیباتی دڵبەزیر و جالب و جوانیان چاکرد و لە دیوار جوانترین نەقشیان کێشا... کاتێ کە تەواو بوون لە خۆشحاڵیان دەهۆڵ و ئەنواعی مووسیقایان لێدا... پاشا چوو تەماشای کاری نەققاشانی چینی کرد لە دیتنی ئەو نەقشە جوانانە زۆر شاد بوو... لە پاشان چۆ کارگەی ڕۆمیان هەر لەگەڵکو گەیشتە وێ پەردەیان لادان... لە ناکاو سەحنەیێکی حیرەت ئەنگێزی دی کە زۆرجێگای تەعەججوب بوو. تەوای نەقش و تەساویری ڕەنگین و جوان و ئەفسانەیی چینیان لە سەر دیواری وەتاغی ڕۆمیان مونعەکیس و نەقشی بەستبوو. پاشا لە دیتنی ئەو سەحنەیە حاڵەتێکی مەخسووسی بۆ پەیدا بوو...کە مەعریفەت و زانیاری ڕۆمیان باعیس بوو کە کاری جوانتر بە وجوود بێت و مەجزووبی کاری وان بوو...

باشترین نەققاش ئێمەین، ئەهلی چین — ڕۆمی کوتیان ئێمەباشین، ئێوەچین؟ (٣٤٦٧)

شا، کوتی لەو بارەدەو کەم ئیمتیحان — چاترین نەققاش تا کو بێ عەیان (٣٤٦٨)

چینیان وڕۆمیان بەحسیان دەکرد — لەو وتانەڕۆمیان مەکسیان دەکرد (٣٤٦٩)

چینی کوتیان بۆن بکەیێک جێ دیار — جێگەیێکیش ڕۆمی لێی بن دەس بەکار (٣٤٧٠)

بوون لەوێ دوومال هەر دوو ڕوو بەڕوو — هەر یەکەی چۆماڵەکی لەو دووانەزوو (٣٤٧١)

چینی زۆریان ویست لەشاهەنشاەڕەنگ — دەرکی گەنجی بۆ وەکردن بێ درەنگ (٣٤٧٢)

دەرکی گەنجی ڕەنگ، سبەینان وازبوو — جادەیان برد چینی، چی دڵخواز بوو (٣٤٧٣)

ڕۆمی کوتیان بۆمەنایەت ڕەنگ بەکار — باشە، بۆمە، تا وەلا بەین، ژەنگی تار (٣٤٧٤)

دەرکەیان بەست وتەمیزیان کرد ماڵ — ساف وەکوو ڕووی جوان کەنەیبێ هیچ خاڵ (٣٤٧٥)

ڕەنگ هەموو دەکرێن لەبۆبێ ڕەنگی بانگ — ڕەنگ و بێ ڕەنگی وەکوو چن؟ هەورو مانگ (٣٤٧٦)

گەرلەهەوران تۆدەبینی نووری جوان — یا لەمانگەیا لەڕۆژی ئاسمان (٣٤٧٧)

چینی کاتێ بوون لەکاری خۆ تەواو — بوو بەشادی وهەڵپەڕین و قاوەقاو (٣٤٧٨)

هاتەوێ،شا، دیتی نەقشی جوانی وان — سوڕ دەما عەقڵیش لەکاری وا جووان (٣٤٧٩)

جالەپاشان چوو لەبۆلای ڕۆمیان — پەردەلا چوو ها تەڕوو،جا،عەزمیان (٣٤٨٠)

عەکسی ئەو تەسویرو ئەو کرداری زۆر — بوو لەسەردیواری سافی جوان، نەبۆر (٣٤٨١)

لێرەجوانتر بوو، ئەوەی دیتی لەوێ — مات دەبوو چاو، چی نەما بوو دەرکەوێ (٣٤٨٢)

من مەڕامم سۆفی، ڕۆمی بۆمیسا ل — بێ کیتاب و دەرس و بەحس و قیل وقال (٣٤٨٣)

قەلبی خۆیان زۆرتەمیز و ساف کرد — حیرس و ئا زوکینەیان لەو، لا دەبرد (٣٤٨٤)

ئەو سەفای ئا وێنە، بێ شک هەردڵە — نەقشی سەر دڵ، نەقشی بەردە، نەک گڵە (٣٤٨٥)

سوو ڕەتی بێ سووڕەتی، بێ حەددی غەیب — دڵ بەمووسای دا کەدەستی نایەجەیب (٣٤٨٦)

سووڕەتی وا کوا دەبێ، جێی وی فەلەک؟ — یا نەعەرش و یانەکورسی یا سەمەک (٣٤٨٧)

چون ئەوان مەحدوودو مەعدوودن بەعام — حەد لەبۆئاوێنەیی دڵ (نا) بەڵام (٣٤٨٨)

عەقڵی جوزئی لێرەهیچ نایەت بەکار — دڵ بەدەستی خوایە، یاخۆی کردگار (٣٤٨٩)

عەکسی هەرنەقشێک وەهایەتا ئەبەد — هەردڵەجێی، با عەدەد، یا بێ عەدەد (٣٤٩٠)

تا ئەبەد هەرنەقشی بێ بۆ سەردڵان — بێ قسوور زاهیر دەبێ هەر وەک گوڵان (٣٤٩١)

پاک نەجاتی بوو لەبۆن و، هەم لەڕەنگ — ئەو دەبینێ چاکی لەخوا، بێ درەنگ (٣٤٩٢)

سۆفی نەقش و قیشری عیلمی لا دەنێ — پەرچەمی (علم الیقین) جێی دا دەنێ (٣٤٩٣)

ییر.لــەدەس چــوو ڕەوشــەنایی کەوتــەدەس    قــوربی بــەحری ئاشــنایی کەوتــەدەس (٣٤٩٤)
ەردنێکی خـەڵکی گشت لێی بـوون هـەراس    پێکــەنینی دێ بــە وی ســۆفی بــەڕاس (٣٤٩٥)
کــەس بەقــەلبی ســۆفی نابــاتن زەفــەر    دور،ســەلامەت، بــا ســەدەف بێنــێ زەرەر (٣٤٩٦)
ەخسی عارف گەر وەلای نا، فیقە و نەحو    دایـدەنا، خـۆ ئـەو لـەجێی وان فـەقرو مـەحو (٣٤٩٧)
ەقشی هەشت جەننەت دەبن بێ شک دیار    لــەو دڵانــەی بــۆ خوداوەنــد بــوون بــەیار (٣٤٩٨)
ـەرش و کورسی هـەم خەلا،هەرسیفرە،لای    ئەوکەســەی دانیشـت لـەجێی زاتـی خـودای (٣٤٩٩)

**پرسیاری پێغەمبەر(ص) لە زەید کە ئەوڕۆ چۆنی و چۆن هەستای؟ و جواب دانەوەی، وی کە: (اصبحت موءمنا یا رسول الله)...**

ژی بەزەیــدی کــوت ســبەینێک مســتەفا    (کیــف اصــبحت) ئــەی ســەحابی باوەفــا (٣٥٠٠)
بیدەکوت بووم عەبدی موئمین، مستەفاش    لێیدەویســت نیشــان لــەبۆ ئیمــانی بــاش (٣٥٠١)
بیــدەکوت تینــووم کــەڕۆژهات تاکوشــەو    شــەو لەعیشــق وســۆز،نایەت هــیچ خــەو (٣٥٠٢)
ــن لــەڕۆژو شــەو لەهەردوو،چوومــەدەر    چەشــنی نــووکی نێــزە کــون کــاتن ســپەر (٣٥٠٣)
گەیمەجێیــەک، ئەوکــەجێگای وەحدەتــە    ســەت هــەزاران ســاڵ، وەک یــەک ساعەتە (٣٥٠٤)
خۆ ئەبەد هیچ گەڵ ئەزەل لێک نین جیبا    عــەقڵی جــوزئی ڕێــی نییــەبۆ جێــی ئــەوا (٣٥٠٥)
کــوا نیشــا نــەت بــۆ ئــەوە؟ دا، بێنــەبۆم    هــەم نیشـان لـەو جێگەیـەی بێ وێنە، بۆم (٣٥٠٦)
جــوابی دا خــەڵکی دەبیــنن ئاســمان    مــن دەبیــنم والــە، عــەرش و، عەرشــیان (٣٥٠٧)
جۆن دەبینێ بوت پەرەست،بو ت، ئا شکرا    وا بەهەشــت و دووزەخــیش لــێم دیــارکرا (٣٥٠٨)
ەن دەناسم خـەڵکی یـەک یـەک باش باش    وەک دەناســم گــەنم وجــۆ لێکتــر لــەئاش (٣٥٠٩)
جەننــەتی هــەم دووزەخــی هــەردوو دیــار    بوون لەلای من چەشنی ماسی و چەشنی مار (٣٥١٠)
ڕۆژ وزەنگــی ڕۆژی بــوونی ئــەو دووان    ڕۆژی ڕەش بــوون وســپی بــوونی ڕووان (٣٥١١)
ێن لەپێش بوون گەرچی عەیبی بێ هەزار    چــون ڕەحــیم جێــی بوو،لەخــەڵکی نادیــار (٣٥١٢)
ــیش لــەدایک بــوون دەزانــێ کردگــار    کامەتیرەبەختەکامــــــەش بــــــەختیار (٣٥١٣)
دایکەتــەن،جا، حــەملی وی بــوو،تفلی گیــان    مردنــی تــەن، بــوو، بــەدەردی زایمــان (٣٥١٤)
مونتـەزیر ئـەرواحی پێشـووی چـوون لـەیاد    چۆن لـەدایکی خۆی دەبێ ئـەوگیانی شاد؟ (٣٥١٥)
ـنگ دەکەن ڕەش، ئەو، وەکوومـەڕوو ڕەشە    گشــت ســپی هاواردەکــەن (نــا) ڕوو گەشــە (٣٥١٦)
گــەر کوهاتــەنێو جیهــانی گیــان، وجــوود    هەڵــدەگیرێ ئیختیلافــی (بــیض وســوود) (٣٥١٧)
گــەر کــو زەنگــی بێت،دەبیــەن زەنگیــان    گەرســپی بێ، ڕۆمــی دەبیــەن وەک گیــان (٣٥١٨)

تا نەبوو ئەو، موشکیلاتی عالەمە — ئەو کەسەی نەبوان دەناسێ، زۆر کەمە (٣٥١٩)
کۆمەکی وی نووری خوای تەنها دەبێ — چون بەنووری خوا، لەشت ئاگا دەبێ (٣٥٢٠)
ئەسڵی ئاوی نوتفە،ساف ودوور لەڕەنگ — کەوتەنێوی، عەکسی ڕۆم و عەکسی زەنگ (٣٥٢١)
ئەحسەنەتتەقویم، لەڕەنگ جا، چا دەبێ — نیسفی دی جێی ئەسفەلەو، ریسوا دەبێ (٣٥٢٢)
ئەووتارەبێ بنە، نابێ تەواو — داستانی زەید بێژە،خاسەلاو (٣٥٢٣)
ڕۆژی ڕەش بوون وسپی بوونی ڕووان — یەک بەشکڵی تورک و ئیدی هیدووان (٣٥٢٤)
تا ڕەحیم بۆتورک و هیندوو جێی قەرار — کێ دەزانێ کام قەوی بوو کامەزار؟ (٣٥٢٥)
گشتی عالەم وەک لە مەحشەر ئێستە بن — من هەموویان باش دەبینم پیا و ژن (٣٥٢٦)
هەربڵەم؟ یاخێر نەکێشم هیچ نەفەس — لێوی خۆی گەست مستەفا،یانی کەبەس (٣٥٢٧)
یاڕەسوول اللّەبڵەم من سیڕڕی حەشر؟ — ئاشکرا کەم تا لەدونیا ڕۆژی نەشر؟ (٣٥٢٨)
لێم گەرێ،من تاکو پەردان لابەرم — تا وەکووڕۆژ تیشکێ باوێ،گەوهەرم (٣٥٢٩)
تا بگرێتن لەداخی من هەتاو — تا نیشا ن دەم کێیەباش و کێ خەراو (٣٥٣٠)
تانیشا ن دەم ڕۆژی مەحشەر ئاشکرا — زێڕی باش و زێڕی غەش،هەروەک چرا (٣٥٣١)
دووزەخی گشتیان براوەدەستیان — با نیشان دەم ڕەنگی کفری پەستیان (٣٥٣٢)
تا نیشان دەم من لەهەر لا، نووری حەق — چەشنی نووری مانگی دائیم پڕ شەبەق (٣٥٣٣)
تا نیشان دەم فکری بەد کاران ئەمن — تا نیشان دەم قودرەتی یاران ئەمن (٣٥٣٤)
دووزەخ وجەننات و بەرزەخ، نێویان — تا نیشان دەم من بەبەد کارا ن عەیان (٣٥٣٥)
تا نیشان دەم حەوزی کەوسەر زۆر بەجۆش — هەم لەڕوو دەن هەم ببیسن دەنگی خۆش (٣٥٣٦)
من لەسەر کەوسەر دەبینم تینووان — با بڵەم یەک یەک لەوان ناوو نیشان (٣٥٣٧)
شان بەشانی خۆم دەبینم من ئەوان — نارەتەی وان من دەبیسم بێ گومان (٣٥٣٨)
ئەهلی جەننەت من دەبینم بەختیار — یەکتری دەگرن دەباوەش جارو بار (٣٥٣٩)
من دەبینم دەستی یێک زیارەت دەکەن — هەم لەلێوان ماچ مووچ غارەت دەکەن (٣٥٤٠)
کەڕ دەبووگوێم من لەدەنگی ئای وای — هێندەناکەس دەنگی حەسرەت دێ، لەلای (٣٥٤١)
چون دەترسێم من کەئەزیەت بێ، نەبێ — لەووتانەبەسبکەین،با بەس ببێ (٣٥٤٢)
لەو وتانەی زەید کوت سەرخۆش ومەست — تا نەبێ، گرتی گریبانی بەدەست (٣٥٤٣)
پێیدەکوت تۆ بەسکەئەسپت گەرم بوو — عەکسی(حەق لایستحی)هات شەرم چوو (٣٥٤٤)
هاتەدەر ئاوێنەکەی تۆ لەو غیلاف — کوا دەکەن ئاوێنەهەم میزان خیلاف؟ (٣٥٤٥)

چـــاو لەئاوێنـــەو تـــەرا زووکـــە، ئـــەتۆ ‌ ڕاســـــتەکاری وان وناکــــەن قــــەت درۆ (۳۵۴۶)

کــاری ئاوێنـــەو تـــەرازوو هـــێن دەقیـــق ‌ گەربکـەی خزمـەت بـەوان زۆر ئـەی ڕەفیـق (۳۵۴۷)

دابپۆشـــــــن ئێوەبـــــــۆمن ڕاســـــــتی ‌ قـەت مـەڵێن هـەرچی حەقیقـەت خواسـتی (۳۵۴۸)

ێنی دەڵێن تۆ خۆت دەکەی ریسوا چجوور ‌ فێـــڵ لەئاوێنـــەو تـــەرازوو زۆر بـــەدوور (۳۵۴۹)

جـاو، مـەقاممان وا،لـەلا ی خـوا، باشـکرا ‌ تـــا حەقیقـــەت بـــێ بەئێمـــە، ئاشـــکرا (۳۵۵۰)

گەرنـــەبین وا،ئێمـــەبۆچین ئـــەی جـــەوان؟ ‌ کـــەی دەبـــین ئاوێنـــەبۆڕووی زۆرجـــووان (۳۵۵۱)

دا بپۆشــــــەتۆ بــــــەلام ئاوێنەکـــــەت ‌ بەس زهوور کا، نووری حەق لەو سینەکەت (۳۵۵۲)

ڕنید، دەیکوت چۆن لەباوەش جێی دەبێ؟ ‌ ئـــەو هـــەتا وەی، ژیـــن و مـــردن پێیـــدەبێ (۳۵۵۳)

ەت دەکا ئەو با وەشان بێ چەند و چوون ‌ کـوا لەحاسـتی وی دەبن،عـەقڵ وجنـــوون (۳۵۵۴)

یێیـدەکوت گــەر دابنێـی قامکـت دەچـاو ‌ تـــا ردەبینـــی ئـــەو جیهانـــەبێ هـــەتاو (۳۵۵۵)

ـوو بەپـەردەی مانـگ قامکـت، چـۆ سـەری ‌ بـــۆ خـــودا وەنـــد بۆنیشـــانەی ســـاتیری (۳۵۵۶)

تـا بپۆشـــێ ئـــەو جیهانـــە، نوقتەیـــەک ‌ ڕەش بکـــا ئەوڕۆژەڕوونـــە، ســـەقتەیەک (۳۵۵۷)

یـــو ببەســـــتە، بـــەحر، بێنەبەرنـــەزەر ‌ چـۆن ئەسـیری کـرد خـودا ئەو،بۆبەشـەر (۳۵۵۸)

جەشـنی کـانی سەلسـەبیل و زەنجـەبیل ‌ وان لـەژێر حـوکمی بەهەشـتی زۆر جـەلیل (۳۵۵۹)

جـوار جـۆی جەننـەت ئەسـیری ئێمەنـە ‌ خوایـــەکاری وایـــە، زۆری ئێمـــە، نـــە (۳۵۶۰)

ەدەســـتی ئێمـــەدا، ڕێـــی هـــەرچووار ‌ وەک سـیحر بـێ سـاحری، نـاکری چجـار (۳۵۶۱)

هـەروەکوو دووچـاوی ئینسـان هـەردووان ‌ وان لـەژێر حـوکمی دڵ و فـەرمانی گیـان (۳۵۶۲)

گـەر کـو بـی وێ، ڕوو دەکاتـەژەهری مـار ‌ گــــەرکو بــــی وێ ڕوو دەکاتـــەئیعتیبار (۳۵۶۳)

گــــەرکو بــــی وێ ڕوو دەکاتەدیــــدەنی ‌ گـەر کـو بـی وێ دەچتـەلای پووشـیدەنی (۳۵۶۴)

جـو لـەکوللی و چـاو لـەجوزئی جـا، دەکـا ‌ هـەرچلۆن دڵ بـی هـەوێ چـاو، وا، دەکـا (۳۵۶۵)

ەدەستی ئا دەمـین هـەر پێنج حـەواس ‌ دڵ چلۆنی ویست،دەڕۆن بێ دەنگ وباس (۳۵۶۶)

ەرتەرەف دڵ گەر لەوان پێنج، بی هەوێ ‌ بێ گومـان ئـەوپێنج حـەواس زوو دەچنـەوێ (۳۵۶۷)

ـەژێر فـەرمانی دڵ، دان دەسـت وپـا ‌ وەک دەدەســتی حـــەزرەتی مووســا عەســا (۳۵۶۸)

ـی هـەوێ دڵ (پـا) بەفـەوری دێتـەڕەقس ‌ یـا دەچێ بۆلای کـەماڵ، نـەی بێ چ نـەقس (۳۵۶۹)

کـەبی وێ زوو دەکـاتن دەس، حیسـاب ‌ یـا دەنووسـی هەرهـەمان دەس،یـەک کیتـاب (۳۵۷۰)

ەدەســـتی دڵ دوو دەســـتی زاهیـــری ‌ ئـــەو لـــەداخل، تـــەن غـــولامی بـــەردەری (۳۵۷۱)

ـی هـەوێ گـەر بۆعـەدو دەس مـار دەبێ ‌ بـــی هـــەوێ گـــەر بۆڕەفیـــق ئـــەویار دەبـــێ (۳۵۷۲)

بـی هـەویٚ گەر،کـەچکی خـۆراک خواردنـە — بـی هـەویٚ گـەر،گورزە، قورسـە، دەە مەنـە (٣٥٧٣)
چـی دەڵێـتن دڵ بەئـەعزا، ئـەی عەجـەب — لـەو ویسـا لـە، نـا دیـاریش، بـوو سـەبەب (٣٥٧٤)
پێـنج حـەواس بـۆدڵ وەهـا بـوون سـەرنەوی — وەک سـولەیمان مۆرەکـەی، دابـیٚ بـەوی (٣٥٧٥)
پێـنج حیسسـی زاهیـری مـەقهووری ویـن — پێـنج حیسسـی بـاتینی مـەئمووری ویـن (٣٥٧٦)
دەە حـەواس وهـەر چـی هـەن ئـەعزایی تـەن — یـەک بەیـەک فـەرمانی دڵ ئیجـرا دەکـەن (٣٥٧٧)
تـۆ سـولەیمانی، جیهـان وەک دیلەکـەت — بـۆ پـەری و دێـو، بێنـە ئەنگوسـتیلەکەت (٣٥٧٨)
گـەر لـەموڵکت مـەکرو حیلـەهیچ نـەبا — چۆن سەدیو، گوستیلەکەی تۆ دیٚ و دەبا؟ (٣٥٧٩)
دەگـری پاشـان ئـەو جیهانەئیسـمی تـۆ — دووجیهان مەحکوومی تۆ، وەک جیسمی تۆ (٣٥٨٠)
گـەر کوگوسـتیلەی لەدەسـتت دێـو بـرد — پادشـاهیت چـوو لەدەس،بـەختت کـەمرد (٣٥٨١)
بۆتـۆ ئـەودەم حەسـرەت و هـاوار و داد — هەرهەیـەبیٚ شـک هـەتا(یـوم التنـاد) (٣٥٨٢)
فێڵـی خـۆت تۆ،گەرنەهاتـە، بەرنـەزەر — چـۆن لەئاوێنـەو تـەرازوو، دەچیـەدەر؟ (٣٥٨٢)

**موتتەهەم کردنی لوقمان لە لای ئەرباب بە وەسیلەی غولامان، کە ئەو میوە باشانەی دەمان هینا ئەو خواردوویە.**

**خولاسەی داستان**

لوقمان دەگەڵ عیددەیەک لە غولامان دەخزمەتی ئەرباب دابوون، ئەرباب غولامەکانی خۆی بۆ میوە لێکردنەوە دەناردنە باغ، لوقمانیش یەکێک لەوان بوو، و بە ڕەنگی ڕەشی دەنێو وان دا دیاربوو، غولامەکان لەو میوەی لێکراوە میقدارێکیان دەخوارد، کاتیٚ کە ئەرباب لەو مەوزووعە حاڵی بوو... پێیان کوت کە لوقمان میوەکانی خواردووە... ئەرباب لە لوقمان تووڕە و نارەحەت بوو کاتیٚ کە لوقمان لەعیللەتی نارەحەتی ئەربابەکەی حاڵی بوو... چوو بۆ لای وی و پێیکوت... ئـەی ئـەربابی مـن بەنـدەی خیانـەتکار لـە دەرگـای خوداوەنـد هـیچ ئومێـدێکی نیـە و قەبووڵمـە کە بـە تۆ خیانـەت کراوە و لـەبۆ کەشفی ئـەو خیانەتـە هـەموومان ئیمتیحـان بکـە. دەسـتوور بـدە کـە ئـاوێکی گـەرم بێـنن و هـەمووەمان لـەو ئـاوە بخوێنـەوە و لـە پاشـان دەسـتوور بدە کە هەمومان لە سەحرایەکی دوور و درێژ غار بدەین، لەو کاتەدا خایین و خادیم لێک جیا دەبن... ئـەرباب ئـەو پێشـنیهادەی لوقمـانی قـەبووڵ و ئیجـرای کـرد، کاتێـک کـە هەریـەک لـەو غولامانە کەمێکی ئاوی گەرم خوادەوە و دەستیان بە غاردان کرد، حاڵـەتی تەهـەووع و ڕشانەوە بەسـەر واندا غاڵـب بـوو و بـە ناچـار ڕشانەوە غولامـەکان کـە میوەی باغیـان بـەدزی خواردبـوو

بە وەسیلەی ڕشانەوە هەمو میوەکەیان هیناوە، بەڵام ئەو دەم، ئەوەی کە لە زاری لوقمان هاتەدەر فەقەت ئاوی ساف بوو... مەولانا دەو داستانەدا ئاشکرا دەکا کە چۆن ڕۆژی قیامەت ئەو کارانەی کە بە دزی کراون ئاشکرا دەبن... و لەتایف و نیکاتی مەعنەوی بە بەیانێکی جوان ئەدا دەکا کە دەزیمنی ئەشعار بەیان دەکرێن...

ـوو لـەلای ئـەربابی خۆی،لوقمـان، غـولام دیـار لـەنێو بەنـدانی دی، وەک سـوبح وشام (٣٥٨٤)

ـــاردنی بۆبـــاغ، ئەوبەنـــدانی خـــۆی تـا کـو میـوەی خـۆش و بـاش بێـنن لـەبۆی (٣٥٨٥)

ـۆنــەنێو بەنــدان، لوقمــان وەک توفــەیل پـر لـەڕاز، تاریـک ڕوو، هەرچەشـنی لـەیل (٣٥٨٦)

ـەرچی میــوەی کــۆ وەدەکــرا، هــەرغولام زوو دەیـــــان خوارد،کامەمیوە،با،بـــــەتام (٣٥٨٧)

ـتی کوتیـان، کـاری لوقمـان نـەک ئەمـە تووڕەبـوو ئـەرباب لـەلوقمان ئـەو دەمـە (٣٥٨٨)

ـت لەخواجەی کرد سوئاڵ،لوقمان سەبەب جـوابی بیسـت لوقمـان،کوتی زۆر بـا ئـەدەب (٣٥٨٩)

ـــەروەری مـــن دیـــارەخۆ، لای کردگـــار عەبـدی خـائین دوور لەقـەدرەو، ئیعتیبـار (٣٥٩٠)

ـمتیحـان کـە، ئێمـە، ئـەی شـای بـا دەمـاغ تێـر کــە، ئێمـــەتۆ لـــەئاوی گـــەرم وداغ (٣٥٩١)

ـەپاشـــان ئێمـــەبۆ ســـەحرا بـــەرە غـار دەدەیـن و تـۆش لـەدووما ن سوار وەرە (٣٥٩٢)

ـ. تەماشـــای کـــاری بـــەد کـــردار کـــە چـــاو لـــەکاری (کاشـــف الاســـرار) کـــە (٣٥٩٣)

ـا لـەبۆ هـەموانی هینـا ئـاوی گـەرم خواردیان گشت،هەم لەترسان هەم لەشەرم (٣٥٩٤)

ـیکوتن،زۆرتونـــد هـــەڵێن دەو دەشـــتەدا کێڵگـەبێ یـا خێـر بـەیار، هەرچەشـنی بـا (٣٥٩٥)

ـت لـەبۆ هـەموان ڕشـوو، هەرچەنـدەبوون ڕای دەدا ئـــاوی ڕشـــوو، میـــوەی دەروون (٣٥٩٦)

ـنی لوقمان هات ڕشووی وی،ڕاس لـەناف هیچ نەبوو میوەی لەگەڵ، بەس ئاوی ساف (٣٥٩٧)

حیکمـــەتی لوقمـــان دەکـــا،زاهیر عیـــووب چۆنــەداخوا حیکمــەتی (ڕب الغیـــووب )؟ (٣٥٩٨)

ـۆژی زاهیربـــوونی گشـــت ئەســـراڕو ڕاز دیتــەڕوو ئـەو هـەی، نـەبووی،بۆی، داخـواز (٣٥٩٩)

ـەرلـەتی کـرد ئـاوی داغ جـەرگ و، هـەناو پـــەردەلادەدرێن و، عـــەیبان دیتـــەچاو (٣٦٠٠)

ـیـــەئاگر، بـــۆ عـــەزابی کـــافران چـون بـەئاگر، بـەرد، دەکـرێ ئیمتیحـان (٣٦٠١)

ـەۆ دڵـەی وەک بـەردی ئێمەچەنـد چەنـد زۆر بەخۆشین پێدەکوت نـەی گـرت پەنـد (٣٦٠٢)

ـۆ برینـی کـۆن دەوای تونـد دانـی سـەر بـۆ ددانـی سـەگ بـوو قابیـل، کەللەکـەر (٣٦٠٣)

ـخبیثـــات للخبیثـــین) حیکمەتـــــە پـیس لـەبۆپیس بـاش لـەبۆ بـاش، بابەتـە (٣٦٠٤)

ـەرڕەفیقت ویسـت ئـەوا، تـۆ دیاربـە مـەحوی شـکڵ و هـەم سـیفاتی یـار بـە (٣٦٠٥)

ـت. هـەوێ نـوور، موستەعیددی نـوور بـە دەت هـەوێ دوور، خـود پەسـەند بـەو دوور بـە (٣٦٠٦)

بت هەوێ گەر تا لەزیندان بی نەجات     سەجدەبەو، نیزیک بەوە تۆ لەو خودات (۶۰۷

**پاشماوەی داستانی زەید، دەجوابی حەزرەتی ڕەسوول(ص)...**

ئەو وتارە بێ بنە،تۆ هەستە، زەید     لەوبوراقی ناتیقەت، دە، بەند و قەید (۶۰۸

ناتیقەگەر، ڕوون بکا کارانی عەیب     لەت دەکاو، دەدڕێنێ، ئەو، پەردانی عەیب (۶۰۹

کاتی مردن دێنەڕوو ئەسرار و ڕاز     ئەو وتانەئێستەنین هیچ جێی نیاز (۶۱۰

تۆ لەبۆ لای ئەو وتانەبەس بڕۆ     هەرکەسەی شادەبەبیرو ڕایی خۆ (۶۱۱

حەق ئومێدی وایەمەئیووس بێ، نەجات     وەرنەگێڕێ ڕوو لەتاعەت یەک سەعات (۶۱۲

بەو ئومێدەلای خودا جێیان دەبێ     چەند ڕۆژێک لای خودا ڕێیان دەبێ (۶۱۳

دەی هەوێ حەق ڕەحمەتی خۆی بۆعمووم     بۆ عموومی پاک و پیس و زەنگ و ڕووم (۶۱۴

بۆ ئەمیرو بۆ ئەسیر، دەیوێ، خودا     تا هەیان بێ گشتی وان خەوف و ڕەجا (۶۱۵

ئەو ڕەجا و خەوفە، دەبێ، بن پەردەبن     تا لەبن ئەو پەردەیە، پەروەردەبن (۶۱۶

گەر کوبدڕێ پەردە،کوا خەوف و ڕەجا؟     کوا لەبۆغەیب،کەڕڕو فەڕڕو ئیبتیلا؟ (۶۱۷

لا ی وەها، بوو یەک جەوانی لێوی جۆ     هەر سولەیمانە، ئە،ئەو سەیبادەخۆ (۶۱۸

گەر سولەیمانەلەبۆ تەنیایەئەو     گەرنەبوو،بۆچی وەکوو وی وایەئەو؟ (۶۱۹

مات و حەیران ما بوو هەرلەو فیکرەدا     تا سولەیمان جارەکی دی بۆ وە، شا (۶۲۰

دێو هەڵات و ترس و لەرز، جەرگی پژاند     تیغی بەختی،خوێنی ئەو دێوەی ڕژاند (۶۲۱

هاتەقامکی ئەو چەلەش، ئەنگوشتەری     کۆ وەبوو، بۆی، لەشکری دێوو پەری (۶۲۲

خەڵکی هاتن تا ببینن وەزع و حاڵ     بوو لەنێو وان، ئەو کەسەی ساحەب خەیاڵ (۶۲۳

هەرلەگەڵکو دی لەدەس وی خاتەمە     هیچ نەما فکرو خەیاڵی ئەو دەمە (۶۲۴

دێ،خەیاڵ ئەودەم کەشت پۆشیدەبێ     جستوجۆ ئەو دەم دەبێ نا دیدەبێ (۶۲۵

ئەو شتەی نادیارەبۆوی دێ خەیاڵ     هەر کەحازر بوو، خەیاڵ دەڕوا لەماڵ (۶۲۶

گەرکوبێ باران نەبێ ئاسمانی نوور     چۆن دبێتن عەردی تار لەگیا بەدوور (۶۲۷

(یوءمنون بالغیب)با بۆم بێتەدەست     من دەریچەی ئەوجیهانەم بۆیەبەست (۶۲۸

گەر دەریچەو لێوەکەم، وەک ڕۆژی سوور     چۆن بڵەم من ( هل تری فیهافطور)؟ (۶۲۹

جستو جۆکەن تالەدونیای زێد هەتار     هەرکەسێک دەڕوا لەبۆجێیەک بەغار (۶۳۰

موودەتێک مەعکووس دەبن جا، کارو بار     دز، دەدا، ئەو جارەدارۆغەلەدار (۶۳۱

| | | |
|---|---|---|
| تا زەمانێک شا هوعالی هیمەتێ | دەبنەعەبد ی عەبدی خۆیان، موددەتێ | (٣٦٣٢) |
| بەندەگی خۆشەکەغائیب بێ جەناب | بەندەگی خۆشەلەژێر پەردەی غیاب | (٣٦٣٣) |
| کوا ئەوەی لای شا دەکاتن مەدحی شا | وەک لەغەیبەت کاڵەوی شەرم وحەیا؟ | (٣٦٣٤) |
| یەک دەکا حیفزی حدوودی مەملەکەت | دوور لەشاهو دوور لەسایەی سەڵتەنەت | (٣٦٣٥) |
| قەت لەبۆدوژمن سەری ناکا نەوی | ڕشوەیا بەرتیل کار نا کا لەوی | (٣٦٣٦) |
| دوورلەشا، ئەو حیفزی مەرزو بووم، دەکا | هەروەکوو حازر وەفا دارەبەشا | (٣٦٣٧) |
| ئەو لەخەڵکی دی عەزیز تر لایی شا | کاتی حازر بوون گیانیان کرد فیدا | (٣٦٣٨) |
| نیوەزەڕڕە، غائیبانەحیفزی کار | چاترەتا بێ بەحازر سەت هەزار | (٣٦٣٩) |
| تا لەدونیای، تاعەتت مەحموودە، تۆ | پاشی مردن تاعەتت مەڕدوودە، تۆ | (٣٦٤٠) |
| جونکەچاتر بوو لەزاهیر، غائیبی | لەو وتانەچاکەبەسکەی، بەس ببی | (٣٦٤١) |
| ـەو وتانەبەس بڵێ تۆ ئەی برا | خوا دەکا عیلمی (لدن) خۆی ئاشکرا | (٣٦٤٢) |
| بەسسەبۆڕۆژ، ڕوویی ڕوونی بێ گەواە | بۆشەهادەت نابێ هیچ شت وەک ئیلاە | (٣٦٤٣) |
| ـا) دەڵێم وئاشکرا دەیکەم بەیان | هەم خوداوەند هەم فریشتەو عالیمان | (٣٦٤٤) |
| ـاهیدن خوا هەم فریشتەو عالیمان | هیچ خودا نین غەیری ئەو خوای جاویدان | (٣٦٤٥) |
| گەرگەواهی داخودا، کێ بوو مەلەک؟ | تا ببێ ئەو بۆگەواهی موشتەرەک | (٣٦٤٦) |
| تیشک وپرشەنگی جووانی ئەوهەتاو | کوا دەبینن ئەو،دڵ و چاوی خەراو؟ | (٣٦٤٧) |
| چەکچەکی کوا تاقەتی نووری هەتاو؟ | کوا لەدەستی دێ، لەتاو بڕوا، بەتاو؟ | (٣٦٤٨) |
| ـۆشەهادەت گشت فریشتەوەک مەە، وان | بوون نیشانەی ڕۆژی ڕوونی ئاسمان | (٣٦٤٩) |
| گشت فریشتەنووریا ن وەر گرت لەتاو | سەرزەعیفان نووری خۆیان کرد بڵاو | (٣٦٥٠) |
| ـانگی نوێ یا حەو شەوەیا چاردەشەو | وان، فریشتەقەدرو جێیان لایی ئەو | (٣٦٥١) |
| هەرلەباڵی نووری وان، سێ، یانەچوار | مەرتەبەی شۆق وشوعاعی وان دیار | (٣٦٥٢) |
| ـالی وان وەک بالی عەقڵی ئینسان | ئەو فریشتانە لەیێکتر زۆر جییان | (٣٦٥٣) |
| ـۆ ڕەفیقی هەر کەسێ،باش یا خەراو | یەک فریشتە چەشنی وی دیاری کراو | (٣٦٥٤) |
| جاو زەعیفێک نووری مانگ بۆ وی عەدوو | پێشڕەوی، وی بوون ستێرە، ئەو لەدوو | (٣٦٥٥) |

**پێغەمبەر(ص) بە زەید دەفەرمووێ کە لەوە زیادتر لە بارەی ئەو ڕازە، مەدوێ...**

| | | |
|---|---|---|
| ـێ دەکوت ئەحمەد کە( اصحابی نجووم ) | شەمعی ڕێی پاکان و بۆ شەیتان ڕجووم | (٣٦٥٦) |

هەرکەسێک هەبێت چاوی پڕ تەوان — دەگرێ نووری ڕۆژی چوارەم ئاسمان (٣٦٥٧)

کوا نییا ز تا مانگ و ئەستێرەی دەدی؟ — بێن شەهادەت دەن کەڕۆژمان چۆن دەدی (٣٦٥٨)

مانگ دەڵێ بەو هەورو سایەو عەردی تار — من بەشەر، دێ وەحیی بۆم، لای کردگار (٣٦٥٩)

من لەخیلقەت چەشنی ئێوەم،تارو ڕەش — وەحیی ڕۆژم، وای ئەمن کردروون و گەش (٣٦٦٠)

من هەمەزوڵمەت بەنیسبەت کردگار — نووری من ڕوونا ک دەکا ئەنفاسی تار (٣٦٦١)

من زەعیفم، تا کوتاقەت بێنی تۆ — تاقەتی نووری خودا کوا دێنی تۆ؟ (٣٦٦٢)

شەهدو سرکە،لێک دەدەن،ئەی زۆر،بەهۆش — تاکودەرمان کەن بەوی جەرگی نەخۆش (٣٦٦٣)

کاتێ چابووی و، نەبوو ی تۆهیچ غەمین — سرکەلابە،تێر بخۆ تۆ ئەنگەبین (٣٦٦٤)

گەرلەتەختی دڵ نەما،کیبرو هەوا — جێیەبۆ ڕەحمان (علی العرش استوی) (٣٦٦٥)

گەرکو دڵ پەیدابکا، ئەو ڕابیتە — خوا لەسەردڵ حاکیمەبێواسیتە (٣٦٦٦)

ئەو وتارەدوایی نایەکوانێ زەید؟ — تابڵەم بەو، هیچ نەڵێ، بێ شەرت و قەید (٣٦٦٧)

## گەڕانەوە بۆ داستانی زەید...

چوو لە دەستان زەید و نەی‌ما دەنگ و باس — جێگە کەوشانی بەجێ هێشت پێ خوواس (٣٦٦٨)

کێی ئەتۆ؟خۆ زەید، بۆخوێ خوێ نەدی — کوا ستێرەڕۆژکەلێیدا،دێ وەدی؟ (٣٦٦٩)

هیچ لەوت دەس ناکەێ نێوو نیشان — یانەپووشکێک(کا) لەڕێگای کەهکەشان (٣٦٧٠)

بوون حەواس وناتیقەی تابانی مە — مەحوی عیلم و دانیشی سوڵتانی مە (٣٦٧١)

حیسس وعەقڵی وان ، بەهەرجوورێک هەبوون — مەو جێ سەرمەوجن (لدینا محضرون) (٣٦٧٢)

شەو کەهات ئەو جارەوەک جارانی دی — ئەو ستێرەی نادیاربوو ن، دێن وەدی (٣٦٧٣)

خوا بەبێ هۆشان دەدا دووبارەهۆش — حەڵقەحەڵقەعیلم و دانیشیان لەگۆش (٣٦٧٤)

جا، بەچەپڵەوهەڵپەڕین دێنەسەنا — زۆر بەئارام (ربنااحییتنا) (٣٦٧٥)

ئەو هەمووئێسکی رزیوی بوون بەخاک — دەبنەوەئینسانی جوان و سواری چاک (٣٦٧٦)

دێن لەنێو دەریا ی عەدەم بۆلای وجوود — ڕۆژی مەحشەر پاک و پیس هەروەک جنوود (٣٦٧٧)

خۆت لەگێژی داو، سەرت با دا،ئەدی — نێو عەدەم بۆ بات نەدا سەر،وا،ئەدی؟ (٣٦٧٨)

وات دەکوت تۆ، تاکوجێگات بوو عەدەم — کێ دەبا، من لێرەبۆ،بوون،یەک قەدەم؟ (٣٦٧٩)

کارو سونعی خوا، مەگەرنازانی تۆ؟ — چۆنی کێشا موویی نێو چاوانی تۆ؟ (٣٦٨٠)

تاکوکێشای تۆلەنێو ئەنواعی حاڵ — هیچ نەبوو فیکرو گومانت هەم خەیاڵ (٣٦٨١)

ـەدەم دائیم لەبۆحەق بەندەیە    کارکە، ئەی دێو، چون سولەیمان زیندەیە (٣٦٨٢)

ـب دەکاتن دێو (جفان کالجواب )    کوا لەدەستی دێ کەنەیکا، یا جەواب؟ (٣٦٨٣)

ـرس ولەرزی خستەقەلبی تۆ، عەدەم    خۆی، عەدەم لەرزی لەحەق هەردەمبەدەم (٣٦٨٤)

ـێ بەرماڵ، گەرکو زۆرسەودا دەکەی    هەرلەترسان تۆتەلاشی وا دەکەی (٣٦٨٥)

ـەرشتێکی عیشقی خوای تێدا، نەبێ    گەرکو خۆشیش بێ ئەتۆ پێت وا، نەبێ (٣٦٨٦)

ـێن دانەغەیری عیشقی زاتی حەق    ئا وی ژینت دا وەتۆ، بەرمست و شەق (٣٦٨٧)

ـەڵای عالەم، فەقەت خاک و مەمات    سەت کەرەت بۆجێی گومان ئاوی حەیات (٣٦٨٨)

ـ نەوەد، بن ئەو گومانانە، نەسەد    شەو بڕۆ دەڕوات شەو، دائیم ئەبەد (٣٦٨٩)

ـۆ شەوەی تاریک تەڵەب کە، ڕۆژی ڕوون    پێشەوا ت با عەقڵ بێ، ئەی با فنوون (٣٦٩٠)

ـۆخۆشی شەو کەبەدبوو نا وەکەی    ئاوی ژین تاریکەخۆ، سەرچاوەکەی (٣٦٩١)

ـەی عەزیزم سەرلەغەفڵەت هەڵبڕە    ئەو کراسەی غەفڵەتت تۆ دا دڕە (٣٦٩٢)

ـقی مردووو، خەو لەگەڵ یێک بوون بەیار    خواجەنوست وهات دزو بوو،دەس بەکار (٣٦٩٣)

ـۆ دەزانی دوژمنانی تۆچنە؟    ئاگری، دائیم بەخاکی، دوژمنە (٣٦٩٤)

ـوژمنی مندالّی ئاوو ئاوە،نار    هەر وەکوو بەگیانی ئاگر، ئاو، نەیار (٣٦٩٥)

ـیکوژێ ئاو، ئاگری، دەیخا لەکار    دوژمنی مندالّی ئاوە،چونکەنار (٣٦٩٦)

ـەیری شەیتان، شەهوەتم مەقسوود لەنار    چونکەشەهوەت بۆگوناهان بوو بەیار (٣٦٩٧)

ـاگری زاهیر،دەبێ خامووش بەئاو    نار ی شەهوەت ڕێیەبۆدووزەخ تەواو (٣٦٩٨)

ـری شەهوەت کوا دەبێ خامووش بەئاو؟    چونکەتەبعی دووزەخی بەو نار، دراو (٣٦٩٩)

ـۆ عیلاجی ناری شەهوەت غەیری دین؟    چارەغەیری دین هیچی دیکەنین (٣٧٠٠)

ـووری حەق خامووش دەکا ئەو ئا گرە    نووری ئیبراهیم بەڕەهبەر، وەرگرە (٣٧٠١)

ـ لەناری نەفسی وەک نەمروودی هار    تۆ نەجات دەی جیسمەکەی وەک پووش و دار (٣٧٠٢)

ـری شەهوەت چووی بەدووی،کوا کەم دەبێ؟    گەربەدووی وی دا نەچووی،چا، کەم دەبێ (٣٧٠٣)

ـا لەسەرنار، دا بنێی تۆپووش و دار    کوا دەبینی بمرێ ئا گر، نەی بێ کار؟ (٣٧٠٤)

ـەرلەسەرنار، دا نەنێی دار،نار مرد    چونکەتەقوا، ئاوی بۆلای، نار برد (٣٧٠٥)

جۆن دەکاتن نار، ڕووی زۆر جوا ن ڕەش؟    لەو کەسەی (تەقوی القلوبی ) بوو، بەبەش[1] (٣٧٠٦)

---

[1]- چۆن دەکاتن نار ڕووی زۆر جوان تار؟    لەو کەسەی تەقوا لقلووبی ، بێ شیعار

### ئاگر گرتنی شار، دە ڕۆژگاری حەزرەتی عومەر(رض)

تەمسیل

دە ڕۆژگاری حەزرەتی عومەردا شار ئاگری گرت کە بەردی وەکوو داری وشک دەسووتاند ساختومان و هێلانەی باڵەندان و پەڕ و باڵیان دەئاگردا دەسووتا... ئاگر ئەوەندە توند و تیژ و تووڕە بوو کە نیوەی شاری داگرتبوو تا ئەو ئەندازە کە ئاو نەیتوانی ئەو ئاگرە خامووش بکا... چونکە هەر لە گەڵکو دەچۆ پێش بۆ پاشەوە دەگەڕاوە، و موتەحەییر ما... هەرچەند جەماعەت مەشکی ئاو و سرکەیان بە سەر ئەو ئاگرەدا، دەکرد هیچ تەئسیری لێنە دەکرد، بەڵکەم توند و تیژی ئەو ئاگرە زیادتر دەبوو. چونکە ئەو ئاگرە لە عالەمێکی دیکە کۆمەک دەکرا. جەماعەت بە ناچار هاتنەلای حەزرەتی عومەر و عیللەتیان، لێ پرسی. حەزرەتی عومەر کوتی ئەو ئاگرە شتێکە کە لە بوخل و تەماعی ئێوە هەستاوە. ئاو و سرکەیێکی کە بە سەر ئەو ئاگرەدا دەکەن بێفایدەیە. ئەو کارە بێهوودەیە مەکەن و لەجیاتی وی بڕۆن کۆمەک بە فەقیران بکەن... جەماعەت کوتیان ئێمە جەوانمەرد و بەخشەندەین و هەمیشە کۆمەکمان بە فەقیران کردووە حەزرەتی عومەر کوتی ئەو بەخشیشە کە ئیددیعای دەکەن هەموو لە بەر ڕیبایە، نەک لە بەر خودایە... لە ئیحسان و بەخشیش دا دوو شت دەبێ موڕاعات بکەن یەکیان ئەوەیە کە، ماڵ نەدەنە دەستی غەیری موستەحەق. چونکە ئەو کارە وەک ئەوەیە کە تیغ بە دەستی زەنگی مەست بدەن... دووهەم ئەوەیە کە فەقەت بەخاتری ڕەزای خودا ئیحسان بکەن نەک لەبەر خاتری ڕیبا...

| | |
|---|---|
| ئاگرێک هەڵبوو لەدەورانی عومەر | بەو دەسووتا،وشک و تەڕ هەم دا ڕو بەر (٠٧ |
| هاتەنێو ماڵ و منداڵ و کشت وکاڵ | بۆی نەما باڵەندە، لانەو، پەڕ و باڵ[1] (٠٨ |
| هەرلەشوعلەی، وی دەسووتا نیسفی شار | ئا و دەترسا کاتێ دەیدی هێزی نار (٠٩ |
| ئاوو سرکە،جا،بەقاپ و مەنجەڵان | ڕژتەسەر ئاگر، تەواوی عاقڵان (١٠ |
| چونکەئاگر زۆر لەڕق بوو، زیا د بوو | کۆمەکی وی بەس خودا ی، با داد بوو (١١ |
| عالەمیش بۆلای عومەر هاتن بەغار | بۆ بەئاو ئێستاکەچارەی نایەنار؟ (١٢ |
| ئەوکوتی ئەو ئاگرەی ئێستا هەیە | شوعلەیێکی ناری زوڵمی ئێوەیە (١٣ |
| چۆن بەئا و خامووش دەبێ ئەو ئا گرە؟ | جوودو بەخشیش زۆر لەئا وێ چاترە (١٤ |

[1]- جا نە هیللانە دەما، نە پەڕڕ و باڵ

خـەڵکی کوتیـان ئێمەئـەهلی بەخشیشـین — خـۆ، لـەبوخلیش تـۆدەزانی بـێ بەشـین (٣٧١٥)
ـەو کـوتی ئـەو بەخششـە، هـەر عادەتـە — بەخشش‌ـێکی بۆخـودا بـێ، بابەتـە (٣٧١٦)
ـەخشش و کـرد، بـەس لـەڕێی کیبـرو هـەوا — نـەک بـەخاتر تـرس و تـەقوایی خـوا (٣٧١٧)
ـی دونیـا قـەت مـەدە، دەسـتی خەسـان — جا،سلاحیش قـەت مـەدە، دەس نـا کەسـان (٣٧١٨)
ـێک جیبیا کـە، ئـەهلی دیـن و ئـەهلی کـین — چاکـەبۆلای دۆسـتانی خـوا، بچـین (٣٧١٩)
هەرکەسێک بۆقـەومی خـۆی ئیسـار کـرد — وایـەلای نـادان کـەچاکی کـار کـرد (٣٧٢٠)

**تف کردنی دوژمن دەڕووی حەزرەتی عەلی (کرم الله وجهه) و فڕێدانی حـەزرەتی عـەلی شەمشیرەکەی خۆی...**

**خولاسەی داستان**

حەزرەتی عەلی(کرم الله وجهه) ڕۆژێک دەگەڵ یەکێک لە پاڵەوانانی عەرەب دەمەیدانی جەنگ موبارەزەی دەکرد... دەو جەنگەدا حـەزرەتی عـەلی، ئـەوی لـە عـەرزی دا... تیغـی لـە کـالان هەڵکێشا تا کاری وی تەواو بکا... دەو کاتەدا پاڵەوانی شکەست خوردە لە ڕووی تووڕە بوون و نائومێدی تفـی دەڕووی نـوورانی ئـەو پیـاوە مەزنـە کـرد، چونکـە موتمـەئین بـوو کـەکاری وی تەواوە و ئومێدی بە ئیدامەی ژیان نەمابوو. بەڵام بە پێچەوانەی ئەو ئینتیزارە دیتی کە ئەو حەزرەتە شمشیرەکەی خۆی فڕێدا سەر عـەرزی و نەی کوشت... ئەو پاڵەوانە ئەو سەحنەی زۆر جالب و عەجیب هاتە بەرچاو و موتەحییر و سەرسام ما، کە بە ناچار لێی پرسی... ئەتۆ کە شەمشیری تیـژ و جەوهـەر دارت هـەبوو و ئـەمنیش دەچـەنگی تـۆدا ئەسـیر بـووم بـۆچی نەت‌کوشتم؟ حـەزرەتی عـەلی (کرم الله وجهه) جوابی داوە کە شێری خـودا دەڕێی حـەق دا جەنگ دەکا هیچ کات بە خاتری تووڕە بوون و ئینتیقام و تۆڵە ئەستاندن، هیچ کـەس نـاکوژێ. بەڵکەم ئەو فەقەت بۆ خاتری ویست و ڕەزای خودا کار دەکا.

ـێ لەحەیـدەر فێربـە ئیخلاسـی کـار — دوور لەعـەیب و عـار ەشـێری کردگـار (٣٧٢١)
ـەوانێکی دەجـەنگێک دا شکەسـت — زوو لەبۆشەمشیری خۆی ئـەو بـرد دەست (٣٧٢٢)
**ـەوتفی هاویشـتەڕووی جـوانی عـەلی — ئیفتیخاری گشت نـەبی، هـەم گشت وەلی** (٣٧٢٣)
ـەوتفی هاویشـتە ڕوویـەک هێنـدە، جـوان — بـردی سـەجدە، بـۆ وی مـانگی ئاسـمان (٣٧٢٤)
ـێدەنا شەمشـیر، عـەلی، زوو سـەرزەوی — یـانی نـاکووژم لـەوەی پـاش مـن ئـەوی (٣٧٢٥)
ـەحـەیرا ن پاڵـەوان گـەر وای دەدی — بـۆ بـەبێ مـەوقیع، ئـەوی بەخشـی ئـەدی؟ (٣٧٢٦)

پێیــدەکو ت تیغــت لــەمن کێشــا ئــەتۆ    بــۆچی نــەت کوشــتم فرێـت دا ســەربەخۆ؟    (٧٢٧-
چیـت لەمــەرگی مــن ئــەتۆ چـاتر دەدی؟    تــاکو لادەی ڕووت، لــەلام، بــۆلای دەدی    (٧٢٨-
چیــت لــەمن دی تۆ،ڕقــت وا نیشــتەوە؟    بــەرقی ڕق هــەڵبوو، دەچــوو بــۆ پشــتەوە    (٧٢٩-
عەکسـی ئەوهــەی،تۆ کەئــەوجوورەت دەدی    شــوعلەیێکی ئــەو دەقــەلبم کــرد وەدی    (٧٣٠-
تــۆ ئــەوی دیتـت لــەژوور کــەون ومــەکان    زۆر لــەگیان چاتر،ئــەتۆ پێــت دام گیــان    (٧٣١-
بۆشــەجاعەت شــێری زاتــی خــوای ئــەتۆ    بۆمــــورووەت زاتــــی بــــێ هــــەمتای تــــۆ    (٧٣٢-
بـۆ سـەخاوەت هـەوری مووسـای تـۆ بـەدەس    لـەودەهات نـان و تـەعام بۆگشـت کـەس    (٧٣٣-
دێ لەهەوران گەنم و،خەڵکیش ئەو بەجەهد    پوختەوو شیرین دەکەن هەرچەشنی شەهد    (٧٣٤-
قەومی مووسا، هـەوری مووسـای بووبەگـەنج    چون تەعامیا ن خوارد لەوی بێ دەردو ڕەنج    (٧٣٥-
ئەوکەسـانەی بـوو غـەزای گـەرمیان تـەعام    بۆهــــەموویان ڕەحمــــەتی وی بوو،بــــەعام    (٧٣٦-
تــاکوو چــل ســاڵ هــەردەوامی بــوو وەهــا    کـەم نـەبوو یـەک ڕۆژ، لـەوان لوتـف وعـەتا    (٧٣٧-
تــا لەبەرپەســتی و خەسیســی ویســتیان    چــی وەکــوو پیــواز ونیســکی بیســتییان    (٧٣٨-
ئوممــــەتی ئەحمــــەد کــــەوان والا مــــەقام    تــا ئەبــەد بۆیــان دەبێــتن ئــەو تــەعام    (٧٣٩-
چــون (ابیــت عنــد ربــی) کــوت نــەبی    (یطعــم یســقی ) کینایــەت لــەو دەبــی    (٧٤٠-
تــۆ بــەبێ تــەئویل قبــووڵ کەئــەو خەبــەر    تاکوبێتــەنێو گــەروو چەشــنی شــەکەر    (٧٤١-
چونکەتــەئویل ڕەددی نیعمــەت کردنــە    ئــەو حەقیقــەت دوور، لەمەیــدان بردنــە    (٧٤٢-
مــونکیری وەی کــوا لــەلای کــێ عاقڵــە؟    عــەقڵی جــوزئی پێســتە، کــوللی کاکڵــە    (٧٤٣-
خۆت کەتەئویل، نەک ئەحادیس و خەبەر    نــەک لــەگوڵزار تــۆ لەمــەغزت دێ زەڕەر    (٧٤٤-
ئــەی عــەلی عــەقڵی ئــەتۆ، ســەرتا قــەدەم    لــەو شــتەی دیتووتــە، بێــژە، بۆمەکــەم    (٧٤٥-
تیغی حیلمت گیانی مـەی واز کـرد چـاک    ئــاوی عیلمــت خــاکی ئێمــەی کــرد پــاک    (٧٤٦-
ئەوســورانەغەیری خــوا، نایــەن لەکــەس    چون بـەبێ شەمشیر،کوشتن لـەو بـوو بـەس    (٧٤٧-
خاڵقێکــــە بــــێ وەســــیلە چادەکــــا    چـۆنی ویسـت ئـەو تـا ببەخشـێ وا دەکـا    (٧٤٨-
سەت هەزاران دای بەهۆش، شت جوێ جووێ    بێ خەبـەر بـوون لـەو دوو چـاو و دووگووێ    (٧٤٩-
پـێم بڵـێ ئـەی بـازی عەرشـی خۆشـکار    ئێســــتەچیت دی تۆلــــەزاتی کردگــــار؟    (٧٥٠-
ئـەو سـوڕانەی بـوون لـەچاوی تۆعـەیان    بــــوون لــــەچاوی حــــازرانی دی نیهــــان    (٧٥١-
یــەک دەبینــێ مــانگی جــوانی ئاسـمان    یــــەک بــــەتاریکی دەبینێــــتن جیهــــان    (٧٥٢-
یانەســێ مانگــان دەبینــێ یــەک نەفــەر    هەرسێ کەسیان، بوو ن لەیێک جێ موستەقەڕ    (٧٥٣-

چاوو گوێی هەرسێکیان بێ نەقس و عەیب بۆ بەتەنیا هەرلەتۆ مەعلووم بوو غەیب؟ (٣٧٥٤)
سیحری چاوەئەو هەیا لوتفی خەفی؟ بۆ تۆ نەقشی گورگە، بۆ م وەک یووسفی (٣٧٥٥)
گەرکو عالەم بن لەدونیا بێ ژمار کوا دەبن ئەسراری عالەم ئاشکار؟ (٣٧٥٦)
سوڕ کە، زاهیر، ئەی عەلیی مورتەزا ئەی لەپاش( سوء القضا) بۆم بووی ڕەزا (٣٧٥٧)
یا بڵێ تۆ هەرچی عەقڵت دی عەیان یانەدەیکەم هەر چی دیتم من بەیان (٣٧٥٨)
دای لەمن نوورت چلۆن پنهان دەکەی؟ نووردەدەی وەک مانگی بێ ئەزمان، دەکەی (٣٧٥٩)
گەر لەئاسمان بێتەگفتار بۆمە، مانگ ئەودەکا شەو ڕەو، لەبۆڕێی ڕاست بانگ (٣٧٦٠)
بەو دەڵێ ڕێگایی ئەسڵی دەشت و کێو دەنگی مانگ غاڵب دەبێ سەردەنگی دێو (٣٧٦١)
گەر بەبێ گفتار ببێ مانگ ڕێ نموون بێتەگفتار، نوورەئەو، بێ چەند وچوون (٣٧٦٢)
ئەی عەلی خۆ،دەرکی شاری عیلمی تۆ چەشنی تیشکی ڕۆژی ڕوونی حیلمی تۆ (٣٧٦٣)
ئەی عەلی چون دەرکی عیلمی، واز، بە هەر گوزەرگای ئەهلی عیلم و ڕاز، بە (٣٧٦٤)
واز ببە، ئەی دەرکی ڕەحمەت تا ئەبەد بارەگای بۆ (ما لەکفوا احد) (٣٧٦٥)
گشت هەوا وو، زەڕڕە، بۆخۆی مەنزەرە دەر نەبێ واز، کێ دەزانێ ئەو درە؟ (٣٧٦٦)
واز نەکا گەر دەرکەیێکی دیدەبان فکری کەس بۆ دەرکەناچێ بێ گومان (٣٧٦٧)
دیدەبان ئەودەم کەدەرکە، واز دەکا تەیری ئوممێد مەیلی بۆ پەرواز دەکا (٣٧٦٨)
غافڵێک گەنجی لەیێک وێرا نەدی توند دەچووبۆ لایی وێرانەی دەدی (٣٧٦٩)
تۆ لەدەروێشێک تەلا، پەیدا دەکەی جا، لەدەروێشی دەدی داوا دەکەی (٣٧٧٠)
تا ئەبەد، زەن گەر بەدووی حەق دا کەوێ ڕێتمەوونی گەرنەبێ دەس ناکەوێ (٣٧٧١)
تا لەغەیبێ ڕا نەیەت بۆ تۆ، چبۆن غەیری لووتی ڕوو دەبینی تۆچلۆن؟ (٣٧٧٢)

## سوئال کردنی ئەو پاڵەوانە کافرە لە حەزرەتی عەلی (کرم الله وجهه) کە بۆچی کاتێک بە سەر مندا پیرۆز بووی شەمشیرەکەت فڕێدا؟

بێژەبۆم تۆ ئەی ئەمیرەلموئمنین تا ببزوێ گیانی نێو تەن، وەک جەنین (٣٧٧٣)
بۆ جەنین گەر نۆبەهات گیان بێتەبەر تا و دەکا کۆمەک بەوی بێ دەردەسەر (٣٧٧٤)
کاتێ وەختی هات کەگیان بگرێ جەنین تاو دەبێ، بەو ئەو دەمە، یارو مو عین (٣٧٧٥)
ئەوجەنینەدێتەجونب وجۆش بەتاو بەوجەنینەگیان دەبەخشێ تاو، بەتاو (٣٧٧٦)
ئەوجەنینەچی لەئەستێرەی دەدی نەیدەدی، تارۆژ لەوی داو، بێتەدی (٣٧٧٧)
کامەڕێگا، ڕێی تەماسی ئەودووە چۆن ڕەحیم جێی ڕۆژی ڕوون و ئەو بووە؟ (٣٧٧٨)

دوور لەحیسسی ئێمە ڕێ ، هەن نادیار | زۆر هەنە ڕێگا لەبۆ ڕۆژ، بێ ژمار (٣٧٧٩)
یەک لەوان ڕێ دێتەدەس زێڕ قووت لەوی | یەک لەوان ڕێ،بەردەبێ یاقووت لەوی (٣٧٨٠)
یەک لەوان ڕێ چا دەکاتن لەعلی سوور | یەک لەوان ڕێگا، دەداتە،ناڵ نوور (٣٧٨١)
یەک لەوان ڕێ، چا، دەکا میوەی بەتام | یەک لەوان ڕێ، دڵ دەداتەدوور لەفام (٣٧٨٢)
بێژەبۆم ئەی بازی باڵ نوورانی تۆ | ئەی لەشا فێر بووی هەچی دەیزانی تۆ (٣٧٨٣)
بێژەبۆم ئەی بازی عەنقا گیری شا | تێک شکێنی لەشکرانی، بێ سپا (٣٧٨٤)
تۆ بەزاهیر یەک، بەمانا سەت هەزار | بێژەبۆم ئەی من لەبۆ بازت شکار (٣٧٨٥)
چۆن لەجێی قەهرێ دەبێ ڕەحمەت وەها؟ | کێیەوا، مۆڵەت بداتەئەژدەها (٣٧٨٦)

**جواب دانەی حەزرەتی عەلی (کرم الله وجهه) کە سەبەبی شەمشیر فڕێدان لەو حاڵەتەدا چبوو**

پێیدەکوت من شەڕدەکەم بۆ خوا دەکەم | عەبدی خوامەنەک لەبەرخۆم وا دەکەم (٣٧٨٧)
شێری خوامەنیمەمن شێری هەوا | شاهیدەبۆدینی من کارم ئەوا (٣٧٨٨)
( مارمیت اذرمیت )چاو چاو | من وەکووتیغ، لێدەریش تەنها، هەتاو (٣٧٨٩)
من بەدونیایەم نەدا، قەت هیچ وەلام | غەیری زاتی حەق عەدەم، بوو، گشت لەلام (٣٧٩٠)
سێبەرێکم سایەداری من هەتاو | دەرکەوانم، دەرکەوانی شای بەناو (٣٧٩١)
چەشنی تیغم پڕلەمەرجانی ویسال | ناکوژم زیندوو دەکەم کاتی قیتال[1] (٣٧٩٢)
کوا لەبۆلای خوێن دەبا تیغم هەوا؟ | هەوری من کوا (با) لەجێی خۆی لا دەبا؟ (٣٧٩٣)
کێوی حیلم و سەبرو داد م من نە(کا) | کوا لەجێی خۆی لا دەبا کێو توند ( با )؟ (٣٧٩٤)
ئەوکەسەی بایەک لەجێی خۆی لادەبا | کایە، زۆریش ناموافق دێن، با (٣٧٩٥)
بای غەزەب شەهوەت تەماع ئەی خۆش نەزەر | لادەدەن هەرسێ لەڕێگا، نوێژ نەکەر (٣٧٩٦)
من کەکێووم ئەو وجوودەم وا، بەوە | من کە(کا) بم با، ببا، من، با، بەوە (٣٧٩٧)
من بەغەیری بای خودا نابزووم لەجێم | غەیری عیشقی خوا نەبێ، من نیمەپێم (٣٧٩٨)
بوو غەزەب، بۆ من غولام، بۆ شا ئەمیر | من لغاوم کرد غەزەب، کردم ئەسیر (٣٧٩٩)
تیغی حیلمی من بڕی ئەستۆێ غەزەب | چەشنی ڕەحمەت هات لەبۆمن قەهری ڕەب (٣٨٠٠)
غەرقی نوورم گەرچی سەقفم بوو خەراب | بوو مەگوڵشەن گەرچی ئێستام (بووتوڕاب) (٣٨٠١)

---

[1]- گیان دەدەم گیان نا گرم کاتی قیتال (مصرع دوم)

کاتێ دیم زاهیر بوو بۆم غەیری خودا — خۆم لەتیغ و شەڕ دەکرد زۆر زوو جودا (٣٨٠٢)
تا (احب للە) بۆ من بێ بەنام — (ابغض للە)بۆمن بێ مەرام (٣٨٠٣)
تا کو ئیمساکم لەبۆخوا بێ ئەمن — بەخششم بۆ غەیری خوا نا بێ ئەمن (٣٨٠٤)
بوخلی من بۆخوا،عەتام بۆخوا یە، بەس — گشت لەبۆخوام، نیمەعەبدی هیچکەس (٣٨٠٥)
من بەبێ تەقلید لەبۆخوا وا دەکەم — من بەچا وی خۆم دەبینم،جا،دەکەم (٣٨٠٦)
ئیجتیهاد و جوستو جۆم من لا دەنا — ئەمری حەققم پێشەوای خۆ،دادەنا (٣٨٠٧)
گەرکو دەفڕم من دەبینم کوێیەجێم — گەر گەڕام، کوێ بێ، مەدار مەعلوومەلێم (٣٨٠٨)
من دەزانم کوێ دەچم گەرهەم بێ بار — مانگم و، تا و ڕا بەرم، بۆم بوو بەیار (٣٨٠٩)
زیندەبۆخەڵکی نەڵێم لەو باسە، با — چونکەجۆگێک کوانێ یەک دەریا دەبا؟ (٣٨١٠)
با ببێژم من بەئەندازەی عقوول — ئەوهەچاکە، چونکەبوو کاری ڕەسوول (٣٨١١)
من لەئەغراز حوڕ، گەواهی حوڕ ئەتۆ — گوێ دەیە، ئەی بەندەناهێنێ دووجۆ (٣٨١٢)
گەرکوشاهید بەندەبێتن هیچ جار — شەرع نادا بەوشەهادەت ئیعتیبار (٣٨١٣)
گەرشەهادەت دەن، لەبۆت بەندان، هەزار — لای شەریعەت نیتی قەدرو ئیعتیبار (٣٨١٤)
عەبدی شەهوەت لای خوداوەندی قەدیر — کەمترەئەو، زۆر لەعەبدێکی ئەسیر (٣٨١٥)
چون بەلەفزێک ئەودەبێ ئازاد حاڵ — عەبدی شەهوەت،شیرنەژینی، دوایەتاڵ (٣٨١٦)
عەبدی شەهوەت ئەو دەمە،دەبێ،نەجات — گەرکولوتف و فەزلی یەزدان بۆ وی هات (٣٨١٧)
کەوتەچاڵا وێک کەقوولو، بێ بنە — جورمەبۆخۆی کردی،جەبرو زۆر، نە (٣٨١٨)
جێی قوولی دی،بەچاو، خۆی خستەوێ — قەت تەناف بۆچاڵی وا دەس نا کەوێ (٣٨١٩)
زیدەلەوباسەنەڵێم، با، هیچ خەبەر — چونکەبەردیش،بەو دەبێ خوێن، وەک جگەر (٣٨٢٠)
گەرنەبۆ خوێن یەک جگەرکوا سەختەئەو؟ — بەڵکەسەرگەردانە، زۆر بەدبەختەئەو (٣٨٢١)
ئەودەبێ خوێن کاتێ خوێن بۆی،سوود نییە — خوێن ببەئەودەدەم کەخوێن مەردوود نییە (٣٨٢٢)
چون گەواهی بەندە، نیتی ئیعتیبار — عادڵ ئەوکەس عەبدی دێو نا بێ چجار (٣٨٢٣)
چون بوو(ارسلناک) شاهید، هەم نەزیر — بوو بەسەر دونیا و( مافیها) ئەمیر (٣٨٢٤)
چونکەئازادم غەزەب، نامبەستێ دەس — لێرەهەن تەنها سیفاتی خوا و بەس (٣٨٢٥)
چون خودا ئازادی کردی، دا، وەرە — ڕەحمەتی وی زۆر لەقەهری زیاترە (٣٨٢٦)
دا،وەرە،ئێستا خەتەر، بۆتۆ، نەما — بەرد بووی،تۆی کردەگەوهەر،کیمیا (٣٨٢٧)
تۆ لەخارستانی کفری بووی ڕەها — تۆگوڵی ئێستا، لەگوڵزاری خودا (٣٨٢٨)

بــێ تــەفاوەت تــۆمنی، ئــەمنیش ئــەتۆم — تــۆ عــەلی بــووی، نــاکوژم ئێســتاکەخۆم (٨٢٩-

تــۆ گونــا هــت بــوو بەتاعــەت لای خــودای — تۆ، بەیەک ساعەت هەموو ئاسمان گەڕای (٨٣٠-

زۆر موبــارەک بــوو گونــاهی پاڵــەوان — دڕکــودالْ،لێی هاتــە دەر،بــەر گــی گــوڵان (٨٣١-

چاو،گونـاهی کـرد عومـەر، قەسـتی ڕەسـووڵ — ئەوگوناهــــەبردی بۆدەرگـــای قـــەبووڵ (٨٣٢-

چـاو، بەسـیحری سـاحیران، فیرعـەونی وان — بردنـــی بۆبارەگـــا، بـــۆ عـــەونی وان (٨٣٣-

گەرنــەبا، ســیحر ونــەبا، ئینکــاری وان — چـۆ ن دەبـوو فیرعـەون، بـەیاری غـاری وان (٨٣٤-

چۆن دەیان دی، ئەو عەسایەو، موعجیزات؟ — مەعسـیيەت بـۆ تاعـەت و مایـەی نـەجات (٨٣٥-

خــوا لەئەســتۆی نــا ئومێــدی دا بــڕی — ژەنگــی عیســیانی لەدڵ،عاســی ســڕی (٨٣٦-

چونکــەدەیگۆڕێ خــودا وەنــد، ســەییئات — تــا کــو دەبنەتاعــەت و مایــەی نــەجات (٨٣٧-

بۆیەشـــەیتا ن دەرکـــرا تـــاکو ئەبـــەد — تـا بماسـێت و، دوو لـەت کـا، ئـەو حەسـەد (٨٣٨-

چــا دەکــا بۆمــان گونــاه،دێو، وای دەوێ — ئێمەبۆســەرچاڵ بــەرێ، بــن خاتــەوێ (٨٣٩-

دی نەتیجــــەی ئـــــەو گناهەتاعەتـــــە — ئەودەمـــەبۆی، ناموبـــارەک ســـاعەتە (٨٤٠-

جـــا،وەرەتێو، دەرکـــی عـــیلمم کـــردەوە — ئــەو تفــەی تــۆم، مــن لــەبیرخۆ، بــردەوە (٨٤١-

بـۆ جـەفا گـەر، دیـاری واباش مـن دەدەم — بـۆ بـەدان مـن، دادەنـێم سـەر، دەمبـەدەم (٨٤٢-

بـۆ وەفـا گـەر، چـی دەدەم،مـن ئـەی فـلان؟ — مـن دەدەم بـەو مولـک و گـەنجی جاویـدان (٨٤٣-

**خەبەردانی حەزرەتی ڕەسوول(ص) بە ڕکابداری حەزرەتی عەلی (کرم الله وجهه) کە عەلی بە دەستی تۆ شەهید دەبێ**

**خولاسەی داستان...**

ڕیوایەت کراوە کە حەزرەتی ڕەسوول(ص) بە ابن مولجـەم دەفـەرمووی ڕۆژێـک دێ کە ئـەتۆ عەلی شەهید دەکەی، ابن مولجەم دەچتە لای حەزرەتی عەلی و پێیدەڵێ پێش ئەوەی کە ئـەو حادیسـە ناخۆشـە بێتـە دی، ئـەتۆ ئـەمن بکووژە، تـا ئـەمن لـەو گوناهـە مـەحفووز بـم... بـەڵام حەزرەتی عـەلی (کـرم اللەوجهـە) بـەوی فـەرموو، چونکە کوشتنی من بە دەستی تۆ حـەتمی و موقـەددەر کراوە، ئـەلئان کوشتنی تۆ بەدەستی مـن قیساسی پـێش جینایەتـە، جـا، لەبـەر ئـەوە نـاتوانم ئـەتۆ بکـووژم... دووبـارە ابـن مولجـەم خـۆی هـاو پشـتە سـەر پێـی حـەزرەتی عـەلی و بە ئیسـرار داوای لێکـرد... بـەڵام حـەزرەتی عـەلی فـەرمووی.. بڕۆ .. قەڵـەمی قـەزا و قـەدەر ئـەو مەتڵەبەی نووسیوە و هیچ چارە نییە و دەبێ تەسلیمی قەزا و قەدەر بین...

تـــابزانی مـــن چجـــوور پیاووم،ئـــەوەم — بـــۆ عەدووشـــم لـــوتفی مـــن نابێتەســـەم (٨٤٤-

وایدەکوت ئەحمەد لەبن گوێی نۆکەرم ئەو کەدەبڕێتن لەئەستۆی من، سەرم (٣٨٤٥)

وایدەکوت ئەحمەد لەرێی وەحیی خودا گەر سەری من ئەو لەتەن دەیکا جودا (٣٨٤٦)

کوشتنی خۆی ئەو لەمن دا وا دەکا تا بەدەستی وی نەکوژرێم وا، دەکا (٣٨٤٧)

من کوتم مەرگم بەدەس تۆ حەتمییە گەڵ قەزاوو گەڵ قەدەر چارەنییە (٣٨٤٨)

کەوتە، سەرپێم ئەو،کوتی پێم، ئەی کەریم دوولەتم کە، تۆ بەخاتر، خوای ڕەحیم (٣٨٤٩)

با نەکووژم من ئەتۆ،گیانم ئەتۆی با نەسووتێ گیانی من، بۆگیانی خۆی (٣٨٥٠)

من کوتم بەو تۆ بڕۆ (جف القلم) بەو قەڵەم زۆر بوون سەرووبن، شاو عەلەم (٣٨٥١)

من لەتۆناکەم گلایە، قەت چجار تۆ کەنایکەی، بەڵکەدەیکا کردگار (٣٨٥٢)

ئالەتی حەق تۆیو، فاعیل دەستی حەق ئالەتی حەق چۆن بدەم بەر مست و شەق؟ (٣٨٥٣)

ئەوقیساسەبۆچییەدەت وێ ئەدی؟ خوا دەزانێ پێیدەکوت، نەک ئیدەدی (٣٨٥٤)

گەر بەکاری خۆی بکا حەق ئیعتیراز ئیعتیراز لێی چادە بێ باغ وڕیاز (٣٨٥٥)

ئیعتیراز بۆکاری خۆی لەودێت وبەس چونکەلوتف و قار بەوی بوون، نەک بەکەس (٣٨٥٦)

ئەو جیهانەی پڕ حەوا دیس، میر، ئەوە مالیکی ئەملاک و، هەم تەدبیر ئەوە (٣٨٥٧)

گەر وەسیلەی خۆی خوداوەند، لا دەنێ زۆر لەوی چاتر لەجێی وی، دادەنێ (٣٨٥٨)

ئایەتی ناسیخ لەمەنسووخ چاترە ئەو وتارە،تۆ بەگوێی دڵ، وەر گرە (٣٨٥٩)

گەرخوداوەند یەک شەریعەت لا دەنێ لا دەبا گیا، گوڵ لەجێی وی دادەنێ (٣٨٦٠)

ناسیخە بۆ کار و باری ڕۆژ، شەو چاو، چلۆن ڕووناک دەکاتن عەقڵ ، خەو (٣٨٦١)

ئەو چەلە، ڕۆژ دێت و شەو مەنسووخ دەکا حاڵەتی شەو بەو دەسووتێ چەشنی کا (٣٨٦٢)

گەرچی شەو تاریکەهەم بێ تاوو تین زۆر لەوی تاریکترە، جێی ئاوی ژین (٣٨٦٣)

ئەو بووباعیس تا کو ڕوون بن،عەقڵو فام یەک سکووت بۆ باعیسی دەنگ و کەلام (٣٨٦٤)

خوالەئەزداد،زیددی دی،پەیدا دەکا لەو دڵەی ڕەش، نووری دائیم چا دەکا (٣٨٦٥)

جەنگی ئەحمەد باعیسی سوڵح ونەجات سوڵحی ئێستاکەش لەوی ڕا،بۆ مەهات (٣٨٦٦)

سەت هەزاری زێد ەکوشتن مستەفا تا بژی دونیا لەژێر سوڵح و سەفا (٣٨٦٧)

ک، لەداران بۆیەدەبڕێ، باغەوان چوون لەبۆ دارو،لەبۆ میوەن، زیان (٣٨٦٨)

باغەوان باغی لەبۆیەکرد، بژار تاکوجوان بێ باغ و، میوەی،بێ بەبار (٣٨٦٩)

زۆر دەکێشیتن، ددانی بەد، تەبیب تا نەجاتی بێ، لەدەرد و ڕەنج، حەبیب (٣٨٧٠)

زێدەبوون پاش نەقسە، تا بێتن دەنا جێی شەهید والایەچونکەبوو فەنا (٣٨٧١)

گەرشەهید حولقوومی رزقی لێ بڕا — رزق ورۆزی و شادی ئەودەم پێ بڕا (٣٨٧٢)
گەر لەحەیوان یەک نەفەر ببڕێت حەڵق — زیاد دەبێ ئەو چون دەبێتە جوزوی خەڵق (٣٨٧٣)
تۆ قیاسی حەڵقی ئینسان کە، لەوی — گەر کو ببڕێ، چی دەبێ ئەو دەسکەوی (٣٨٧٤)
حەڵقی سووەم خوا دەدا، بەو ئەو دەمە — غەیری نوورو شەربەتی خوا ی، بۆکەمە (٣٨٧٥)
گەر بڕا حەڵق،شەربەتی، خۆراکەئەو — ئەو گەروویەی،گەر فەنای خوای پاکەئەو (٣٨٧٦)
بەس بکەکەم هیممەتی تۆ، ئەی فڵان — تاکو کەنگێ تۆدەژی تەنها، بەنان؟ (٣٨٧٧)
تۆ کەنەتبێ میوەیێک، وەک دارەبێ — نەنگ وعارە، بت هەوێ نانی سپی (٣٨٧٨)
گەر بەبێ نان گیانی حیس سەبری نەما — تا مست،بێ زێڕ، بگرەکیمییا (٣٨٧٩)
بۆ نەزافەت گەردەکەی تۆ جوستو جۆ — وەرمەگێڕەرووت لەکارگای ڕەختشۆ (٣٨٨٠)
گەرکو ڕۆژووی لێ شکاندی نان، ئەتۆ — زوو شکەستەبند، بگرەژوور بڕۆ (٣٨٨١)
گەرشکەستەبەن، بەمەیلی خۆی بکا — ساغ بزانە،نەک شکاو، هەرچی شکا (٣٨٨٢)
گەرتۆبشکێنی ئەوی، خوا پێت دەڵێ — چایکەوە،گەر پێت کرا، وەک ئەووەڵێ (٣٨٨٣)
جا، شکاندن حەققی ئەوکەس بوو، ئەگەر — چاک بکا هەرچی شکا بێ دەردەسەر (٣٨٨٤)
ئەو کەسەی خەییاتە، زانی جا، بڕی — چی فرۆشت ئەو، زۆر لەوی چاتر کڕی (٣٨٨٥)
یەک دەکا ماڵی خەراب . بۆ وا دەکا؟ — زۆر لەوی چاتر، لەجێی وی چادەکا (٣٨٨٦)
گەرسەرێکی خوا،لەیەک تەن کرد جودا — سەت هەزاران زێدە،خوا، بەو، سەر دەدا (٣٨٨٧)
دای نەنابا گەر لەبۆجانی قیساس — گەر قیساس تێیدا نەژی بان، عام وخاس (٣٨٨٨)
کێ لەدەستی، وا، دەهات، تا وەک مەڕی — ئەو ئەسیری حوکمی حەق بێ سەربڕی (٣٨٨٩)
چونکەمەعلوومەلەلای زانای بەسیر — هەرچی قاتڵ بێ، ئەسیری خوا ی قەدیر (٣٨٩٠)
حوکمی تەقدیر تۆقە،هەرکەس هات لەبۆی — وا دەبێ دەبڕێ سەری منداڵی خۆی (٣٨٩١)
جا، کەوا بوو،تۆ مەکەلۆمەی،بەدان — تۆش لەڕاستی حوکمی حەق بووی ناتەوان (٣٨٩٢)

**تەعەججوب کردنی ئادەم (ع) لە گومراهی ئیبلیس و تەکەببور و غرووری ئادەم لە حاستی وی**

ئیبلیسی دیت ڕۆژێک،بولبەشەر — زۆر بەچاوی سووک کردی لەو،نەزەر (٣٨٩٣)
خۆی بەزۆرتر گرت لەئیبلیسی دەنی — ئەو بەکارو باری ئیبلیس پێکەنی (٣٨٩٤)
تێی خوڕی،دەو، غیرەتی حەق، ئەی سەفی — تۆ کەنازانی لەئەسڕاڕی خەفی (٣٨٩٥)
خۆی وەکوو ئەووەڵ ئەگەر،ئەو، لێ بکا — کێو لەبن دەردێنی سووک،وەک پووشکە،کا (٣٨٩٦)
بێ هەوێ سەت ئادەمان ڕیسوا دەکا — سەت بلیسی نۆ موسەڵما ن چا دەکا (٣٨٩٧)

دەیکوت ئادەم، تۆبە،ئەی خوا،لەو نەزەر تازەنابێ فکری والەم، بێتەسەر (٣٨٩٨)

ئەی پەناهی بێ پەناهان (اهدنا) ئیفتیخاری هیچ نییە، عیلم وغینا (٣٨٩٩)

قەلبی ئێمەتۆ لەڕێی ڕاس لا مەدە ئەو بەلای نووسی قەڵەم، پێێن دا مەدە (٣٩٠٠)

دوورلەگیانی ئێمەکە(سوء القضا) دوور مەکە، ئێمەلەئیخوانی ڕەزا (٣٩٠١)

خۆچ ژەهرێک چەشنی دووریت تاڵ نییە گەر نەبێ یاریت، لەبۆما ن حاڵ نییە (٣٩٠٢)

مالی دونیا تا گری بەردا،دەدین جیسمی ئێمە ڕووت دەکا، گیان وەک جەنین (٣٩٠٣)

هەرچی پێ، پەیدای دەکا دەس، لا ی دەبا گیان نەبوو سالم،کەلوتفی خوا نەبا (٣٩٠٤)

گەرنەجات دا گیانی خۆی لەو سەختییە بۆ وی مایەی میحنەت و بەدبەختییە (٣٩٠٥)

گیان کەوەسڵی گیانی گیانی چوو لەکیس کوێر و کەڕ ما، تا ئەبەد تەنیاوو، پیس (٣٩٠٦)

وەسڵی تۆ، بۆگیان نەبێ،گیان بەردەیە گیانی زیندوو تۆی نەبێ،لا، مردەیە (٣٩٠٧)

گەر لەبەندان تۆدەدەی، تا نەو، تەشەر لایقی بۆ تانە،تۆ، ئەی خوای لەسەر (٣٩٠٨)

گەر ببێژی تۆ بەمانگ و ڕۆژ تار یا ببێژی تۆ، بەبالای سەرو، خوار (٣٩٠٩)

یا بەعەرش و چەرخ بێژی، تۆحەقیر یا بەکان وبەحر بێژی، تۆ، فەقیر (٣٩١٠)

خۆ بەنیسبەت گەو ڕەیی تۆ، بوو ڕەوا هەر بەتۆ لایق بوو کامیل کەی فەنا (٣٩١١)

چون لەنوقسان و خەتەر، تۆی پاک پاک تۆ، بە نەبوان بوون دەدەی، ئەی خوایی تاک (٣٩١٢)

خوا، لەدەستی دێت هەم بوون هەم نەبوون ئەو کەسەی دەبڕێ دەزانێ،چاک دروون (٣٩١٣)

ـەر دەدا ئاگر، دەباغ، فەسڵی خەزان جارەکی دی، ڕەنگ دەکا، باغ و ڕەزان (٣٩١٤)

ڕنەدەر، ئەی گشت سووتاو،تازەبێ جارەکی دی باش و، باش ئاوازەبێ (٣٩١٥)

چاوی کوێری نەرگسی چێ کردەوە ئەوگەرووی نەی، چەشنی خۆی لێ کردەوە (٣٩١٦)

چونکەسانع نین ومەسنووعین، بەعام غەیری قانع بوون نەڵێین، با هیچ کەلام (٣٩١٧)

گشت لەدەرگای تۆ، دەکەین گریان وزار گەردەرن کەی،ئیبلیسین،نابەکار (٣٩١٨)

گیان لەئەهریمەن، نەجاتی بۆیەهات گیانی ئێمەت چون لەکویری دا، نەجات (٣٩١٩)

بەری تۆ، بۆ ئەوەی بێ،گیان لەبەر کوێر، بەبێ ڕابەر، دەژی پڕ، دەردەسەر (٣٩٢٠)

خۆش ونا خۆش بێ تۆ هەرچی بێ، لەلام ئاگرە، ئینسان دەسووتێنێ، تەمام (٣٩٢١)

ئەوکەسەی ئاگر پەناهو پشتییە ئەو مەجووسی، پەیڕەوی زەرتوشتییە (٣٩٢٢)

غەیری حەق دەڕوا، هەمووشت بێ کەمی فەزلی حەق بارانە، دەڕژی، دائیمی (٣٩٢٣)

**پاشماوەی داستانی حەزرەتی عەلی(کرم الله وجهه) و سەرفی نەزەرکردنی وی لە دوژمنی خۆی**

ڕوو کەوە، بۆ لای عەلی و،لای دوشمەنی ... چۆن بەلوتقی وی دەبوو، دوشمەن خەنی (۳۹۲۴)
دەیکوت ئەو دوشمەن، دەبینم ڕۆژوشەو ... قەت ئەمن نابم بەکین و قەهر لەو (۳۹۲۵)
چونکەمردن خۆشەبۆم، وەک ئەنگەبین ... بۆیەمەرگم مەن دەوێ بۆدوایەژین (۳۹۲۶)
بۆژییانی جاویدان، مەرگم حەلاڵ ... نیعمەتی دونیا، کە، نا، ئیدیکەماڵ (۳۹۲۷)
زاهیری مەرگە، بەباتین زیندەگی ... مەرگەزاهیر، باتینی پایەندەگی (۳۹۲۸)
چاو، ڕەحیم، جێگای جەنین لەودێتەدەر ... لەوجیهانەگوڵ دەکات و دێتەبەر (۳۹۲۹)
چونکەعاشق بووم بەمردن ئاشکرا ... نەهیی(لاتلقوا) لەبۆمن ناردرا (۳۹۳۰)
چونکەنەهیی، دێ، لەوەی خۆش کات حاڵ ... کوا نەهی دێ، بۆشتێکی تفت وتاڵ؟ (۳۹۳۱)
دەنکەکی کە،تاڵەکاکڵ و پێستی وی ... تفت وتاڵی نەهیە، کەوتەدەستی وی (۳۹۳۲)
دەنکی مردن زۆر لەبۆم شیرین بووە ... (بل هم احیاء ) لەبۆمن هاتووە (۳۹۳۳)
بم کوژەتۆ، ئەی ڕەفیق، چون لائیمی ... قەتلی مەن تێیدایەژینی دائیمی (۳۹۳۴)
مەرگی مەن تێیدا یە، ژینم ئەی فلان ... دوورلەمەوتەن بم ئەمن تا چەن زەمان؟ (۳۹۳۵)
گەر نەبا جێگای فیراق دونیایی دوون ... نەی دەکوت ( انا الیەراجعون ) (۳۹۳۶)
ڕاجیع ئەو کەس، هاتەوە، بۆشاری خۆی ... بێتەلای وەحدەت، دەگەڵ کێ؟یاری خۆی (۳۹۳۷)

**هاتنی ڕیکابداری حەزرەتی عەلی (کرم الله وجهه) کە بۆ خاتری خودا بم کوژە و لەو قەزییە نەجاتم بدە**

هاتەوەبۆلای عەلی، زوو، بم کوژە ... با، نەبینم ئەو دەم و کاتەی،گژە (۳۹۳۸)
بم کوژەتۆ،گەردەنت ئازا، دەکەم ... خۆم لەدونیاو دین،لەبۆریسوا، دەکەم؟ (۳۹۳۹)
مەن کوتم گەرکوللی عالەم بی هەوێ ... بت کوژێ، هەرکەس کەبێ و،تۆی دەس کەوێ (۳۹۴۰)
موویەکت، ناکرێ بەدەستی وانە، لەت ... چون قەڵەم بۆ تۆی وەها، نووسیوەخەت (۳۹۴۱)
مەن شەفیعی تۆمە، تۆش نەت بێ، چ غەم ... بەندەبۆ تەن نیمە، ئاغای ڕووح کە هەم (۳۹۴۲)
ئەو تەنەی مەن قیمەتی دینار نییە ... بێ بەدەن قیمەت گەلێکە، دیار نییە (۳۹۴۳)
خەنجەرو شەمشیری مەن، ڕەیحانی مەن ... مەرگی مەن باغ و گوڵ و بێستانی مەن (۳۹۴۴)
ئەو کەسەی وا،خۆی دەکاتن، پایەماڵ ... کوا تەماعی بۆ ئەمارەت، یانەماڵ؟ (۳۹۴۵)
ئەو بەزاهیر بۆ مەقامی کرد تەلاش ... تا، بەشایان دا نیشان، ڕێگایی باش (۳۹۴۶)
تا ئەمارەت،گیانی دی لەو بێتەدەر ... تا بدا، نەخلی خەلا فەت، لەو سەمەر (۳۹۴۷)

**بەیانی ئەو مەتڵەبە کە پێغەمبەر(ص) فەتحی مەککە و غەیری مەککەی بە خاتری مەحەببەتی دونیا نەبوو چونکە فەرموویەتی (الدنیا جیفه)**

کۆششــی ئەحمــەد لەفــەتحی مەککــەدا — کــوانێ بــۆنی حــوببی دونیایــەدەدا؟ (٣٩٤٨)
ئەو کەسەی لەو گەنجی، هەرحەو ئاسمان — بەســتی چاوودڵ،بــەڕۆژی ئیمتیحــان (٣٩٤٩)
ـێ تەماشــای وی، لــەحۆ ریــان و گیــان — پــڕ دەبــوو ئافــاقی هەرحــەو ئاســمان (٣٩٥٠)
ـۆ وی جوانیــان کــرد خۆیان،حۆرییــان — قــەت نــەبوو مــەیلی بەکــەم یــا زۆرییــان (٣٩٥١)
ـەئیجلالی خــودا وەنــد پــڕ دەبــوو — غەیری حەق بۆلای کەسی دی، ئەو نەچوو (٣٩٥٢)
جێی نــەبی مورســەل دەنێــو مــان دا، نییــە — هــەم مەلــەک هــەم ڕووح لــەجێگای وا، نییــە (٣٩٥٣)
ـێکــوت ئەحمــەد، ئیمەچەشــنی زاغ(نــا) — مەســتی ڕەنگرێــژین و، مەســتی بــاغ ( نــا) (٣٩٥٤)
جونکەگشــتی،گەنجی ئــەفلاک و عقــوول — چەشنی پووشکێک ها تە،بەرچاوی ڕەسوول (٣٩٥٥)
ـوڵکی شــام ومــوڵکی مەککــەیاعیراق — خــۆ لــەبۆ وی، قــەت نــەبوو، جێــی ئیشــتیاق (٣٩٥٦)
ـەرمونافیق فیکــرو زەننــی وا دەکــا — فکــری وا، پــیس ئــەو لــەخۆی ڕا چــا دەکــا (٣٩٥٧)
ـۆشــەیێک زەر، دابنێــی گــەرپێش چــاو — زەر، دەبینــی ئــەو دەمــە، نــووری هــەتاو (٣٩٥٨)
ـت بکەشوو شەی ڕەش و زەر چەند جار — تــا دەبــێ مــەعلوو م لــەتۆ ســوارو غوبــار (٣٩٥٩)
ـۆری ســـواری گرتووەتـــۆزو غوبـــار — تــۆز لــەلای تــۆ دیتەبــەرچاو وەک ســووار (٣٩٦٠)
ـێی شــەیتان تــۆز، کــەدەیکو ت ئــەو گڵــە — کــوا لــەمن چاتر،کــەڕووم،نار، وەک گوڵــە؟ (٣٩٦١)
ـ ببینــی تــۆ عــەزیزا نــت بەپەســت — تۆ ئەوەت میرا ت لەشەیتان کەوتەدەست (٣٩٦٢)
ـەرنــەبی منــداڵی شــەیتانی نــەجیس — دا بڵــێ میراتــی وا، چــۆن دیتــەکیس؟ (٣٩٦٣)
ـن کەنیمــە، حــەق خــووازم، شــێری خــوا — شێری خوا ئەو کەس، لەسوورەت بوو ڕەها (٣٩٦٤)
ـێری دونیــا ڕاوو هــەم شــادی دەوێ — شــێری مــەولا، مــەرگ و ئــازادی دەوێ (٣٩٦٥)
جۆن دەمــردن دا، دەبینــی ســەت وجــوود — ئەو وجوودەی خۆی دەبەخشێ زۆر،بەجوود (٣٩٦٦)
ـەرگی باشــــان،گەنجەبۆیان،ڕەحمەتە — بــۆ بــەدان ڕەنــج و عــەزا ب و، زەحمەتــە (٣٩٦٧)
ـت دەقورئا ندا، کەئەی قەو می یەهوود — ســادقان مــەرگیان دەبێتەگــەنج و ســوود (٣٩٦٨)
ـ رەزووی ســوودی جیهــان زۆر دڵگــرە — ئــا رەزووی مــردن لــەوی زۆر چــاترە (٣٩٦٩)
ـەی یــەهوود بــۆ حیفــزی ئــابڕوو وابکــەن — مردنــی خۆتــان لەحــەق داوا بکــەن (٣٩٧٠)
ـەک یەهوودیش، نەی بوو جورئەت بۆ، ئەوە — کــاتێ ئەحمــەد پەرچــەمی بوو،دەســتەوە (٣٩٧١)
ـێکــو ت ئەحمــەد گــەر ببێــژن وابــەزار — گشــتێ دەمــرن چــی یــەهوودی بــێ، بــەزار (٣٩٧٢)

جـا، یـەهوود، دایان،گـەلێ مـاڵ و خـەراج     بـا نـەبین، ریسـوا، لـەدونیا، ئـەی سـیراج
ئـەو وتارەقـەت بنـی، نایـەت وەدی     دەس،دە، دەستم چونکـەچاوت دۆستی دی

**کوتنی حەزرەتی عەلی (کرم الله وجهه)بە تەڕەفەکەی خۆی کە کاتێ تفت دەڕووی من کرد نەفسی من تەکانی خوارد و ئیخلاسی عەمەل نەما و بۆ مانعی کوشتنی تۆ**

وای (امیرالمـوئمینین) کـوت بـەو جـەوان     ئـەو دەمـەی شـەڕمان دەکرد ئـەی پاڵـەوان
کـاتێ هاویشـتت تـۆ، تـف، بـۆ ڕوویـی مـن     نـەفس جـوولا، بـوو، پەڕێشـان خـوویی مـن
نیـوە بـۆ حـەق نیوەکـەی دی بـۆ هـەوا     خـۆ، شـەریک بۆکـاری حـەق نـابێ ڕەوا
چـاکراوی دەسـتی زاتـی خـوا ی ئـەتۆ     عەبدی مـن نی،عەبدی بێ هـەمتا ی ئـەتۆ
لەت،کەنەقشـی حـەق، بەئـەمری کردگـار     چاکەشووشـەی یار،لێـدەی بـەردی یـار
کـافر ئەوهـەی بیسـت و نـووری کەوتـەدڵ     خـاچ وزەننـاری فڕێـداو، خسـتەگڵ
پاڵـەوان دەیکـوت کـەوام زانـی ئـەتۆش     بۆ هەوا، ژێر پێ دەخـەی زوو،عـەقڵ و هۆش
تـۆ تـەرا زووی زاتـی پـاکی کردگـار     چـی تـەرا زوو بـن بـەتۆ دەکـرێن عـەیار
خـۆ نیـژادو ئەسـڵ وژینـی مـن ئـەتۆی     خـۆ چـرای ڕوونـاکی دینـی مـن ئـەتۆی
مـن غـولامی ئـەو چرایـەم چـاو تەڵـەب     تۆچرات ڕوون[1]بوو لەوی، ئەی خۆش نەسەب
مـن غـولامی مـەوجی ئـەو دەریـایی نـوور     گـەو هـەری وای ئـەو، کـە، وا،هینـا زهـوور
پـێم بڵـێ بێـژم شـەهادەت چـۆن بـەزار؟     تـۆ لـەلای مـن بەرگوزیـدەی ڕۆژگـار
قـەومی وی تـەقریبی پـەنجا کـەس دەبـوو     بـوون موسـەڵمان تـاق و لـۆق و دوو بـەدوو
ئـەو بـەتیغی حەوسـەلە، زۆر زێدەحـەڵق     کردنـی ئـازاد لـەتیغی تیـژی خـەڵق
تیغـی ئاسـن تیـژە، نـەک وەک حەوسـەلە     حەوسـەلەدێنـێ زەفـەر، بـێ هـیچ پەلـە
سەت ئەسەف،بەو یەک دوو لوقمەی نان خورا     ئـەوچرای حیکمـەت لـەمن خـامووش کـرا
دەنکەگـەنمیک ڕۆژی ئـادەم ڕەش دەکـا     یـا، زەنـەب بـەدری لـەنوور بێ بـەش دەکا
چـاو لـەدڵ کە،چـەن تـەمیزەو چەنـدەپاک     مـانگی وی‌چـۆن تێـک دەدا یـەک‌مستەخاک[1]
نـانی مـەعنا،خواردنی وی زۆر،بەسـوود     نـانی سـووری چادەکـا، کێشـەو جحـوود
وەک دروو ی شین گـەرکو وشـتر دەیخـوا     سـوودو نـەفع و لـەززەتی بـەو دا خـوا
گـەردڕوو، شـینی نـەما، بـۆ خاروخـەس     بـێ خـوا وشـتر، کـەبۆ وی،کەوتـەدەس

[1]- چاو لە دڵ کەچەن تەمیزە و نەرم و نۆڵ     مانگی وی چۆن تێک دەدا یەک مستەخۆڵ

ـەت دەکا، لەو، وشترە، لێوو لەتەر     چونکەبۆتەتیغ، ئێستا گوڵشەکەر (٣٩٩٦)
ـانی مەعنا وەک دڕووی شین وایەلام     بێ بەسووڕەت، وشکە، ئەستوور، دوورلەتام (٣٩٩٧)
ـیتی ئەوەش تۆ نانی مەعنات خوارد لەلام     عادەتت بوو، نازەنینەی خۆش کەلام (٣٩٩٨)
ـتۆ دەخۆی ئەو وشکەچەشنی خاری شین     پاش ئەوەی مەعنا دەبوو تێکەڵ بەتین (٣٩٩٩)
ـێک ورەق،بوو تێکەڵاوی خۆڵەپۆت     ئێستەئەی وشتر تۆ لەو گیا، لادەخۆت (٤٠٠٠)
ـتێکەڵاوی خۆڵەپۆت بوو، لێم وتار     بگرەسەرچاوەی کەئا وبوو لێڵ و تار (٤٠٠١)
ـت دەکا دووبارەساف، ئەو کردگار     ساف دەکا ئەو کەس،کەکردی لێڵ و تار (٤٠٠٢)
ـەس بەسەبر و حەوسەلە کار چا دەبێ     چۆن لەلای خوا مەسڵەحەت بێ وا، دەبێ (٤٠٠٣)

---

**تەواوبوو جلدی ئەووەڵی مەسنەوی شەریف بە سووڕەتی هۆنراوەی کوردی بە قەڵەمی عبدالسلام مدرسی (خانی) لله الحمد و المنه...**
**تاریخی شروع ٧/٦/ ١٣٧٧ کۆچی هەتاوی / تاریخی پایان ١٣/ ٢ / ١٣٧٩ کۆچی هەتاوی**

بسم الله الرحمن الرحیم

مووددەتێک من مەسنەویم تەعتیل بوو
زۆر دەچوو تا خوێن بەشیر تەبدیل بوو

بەختی تۆ گەر نەیبێ منداڵ کوا دەبێ؟
شیری شیرین چۆن لەخوێنی چادەبێ

چون حیسامەددین گەڕا وەهاتەلان
هاتەوەلامان کەچووبوو ئاسمان

بۆحەقایق چونکەچووبۆ ئاسمان
بێ بەهاری وی نەپوشکووت خونچەمان

گەرلەدریایی غەمان ئەو بووی نەجات
سازی شێعری مەسنەوی من دەنگی هات

مەسنەوی بۆگەردی ڕووح کەبووشەوە
ڕۆژی ڕەحمەت من دەسم پێکردەوە[1]

دەفتەری دووم،من کەدەس پێکردو وە
ساڵی هیجرەت شەشسەدوشەستودووە

بولبولێک بوو لێرەڕۆیو بوو بەباز
تاکو ڕاوکا، ئەو مەعانی دڵخوواز

قۆڵی شا جێی دائیمی ئەو باز بێ
بۆعموم ئەو دەرکە، دائیم باز بێ

ئافەتی ئەو دەر،هەوایەو شەهوەتە
دوور لەوان دوو، پڕ لەخۆشی و لەززەتە

مەنعی دونیای دی دەکەن زاروگەروو
زار ببەستە تا بزانی تۆ چبوو

زار، ئەتۆلام چەشنی زاری دوو زەخی
ئەی جیهان تۆش لام بەچەشنی بەرزەخی

نووری جاویدان قەراغ دونیای گەزاف
تۆقەراغ جۆی خوێن، دەبینی شیری ساف

گەر لەدونیا ڕێ بڕۆێ بێ ئیحتیات
شیرەکەی تۆ خوێن دەکاتن ئیختیلات

یەک قەدەم ئادەم دەچووبۆزەوقی نەفس
فیرقەتی جەننەت لەبۆی، بۆتۆقی نەفس

چی مەلەک بوو هەڵدەهات لەو زۆر بەتاو
ئەو لەبۆنانێک ڕژاندی ئاوی چاو

ئەو گوناهەگەرچی بوو یێک دانەموو
خۆ بەڵام ئەموو لەنێو چاو، شین دەبوو

بولبەشەربوو، چاوی نووری خوای قەدیم
موو، دەچاوی وا، وەکوو کێوی عەزیم[2]

کردبای ئادەم هەمان دەم مەشوەرەت
بۆ نەدا مەت نەیدەکوت هیچ مەعزەرەت

چونکەدووعەقڵ،گەر دەگەڵ یێک جووت بن
دەردەهێنن قەول و فێعلی بەد، لەبن

---

[1] -مەسنەوی کە، سەیقەلی ئەرواح بوو / بازگەشت بەو، ڕۆژی ئیستیفتاح بوو

[2] بولبەشەر بۆ چاوی حەق ڕەشکێنەیە / کێوەموو ، نێو چاوی وا ، بێ وێنەیە

گەر دەگەڵ نەفس، نەفسەکی دی بێ بەیار — عەقڵی جوزئی تازەنایەت لەو چکار (٢١)
تا ئومێد بووی گەر لەتەنهایی ئەتۆ — تۆ لەبۆ ژێر سێبەری مورشید بڕۆ (٢٢)
یاری خوایی تۆ بڕۆ پەیدا بکە — وا بکەی گەر،خوا لەبۆ تۆ کۆ مەکە (٢٣)
گەرلەخەڵوەت چاوفەقەت لەخوا دەکەی — مورشیدێک تۆفێردەکا،جا، وادەکەی (٢٤)
چاکەخەڵوەت بێ لەئەغیار نەک لەیار — بۆزمستان باشەباڵتۆ، نەک بەهار (٢٥)
گەر دەگەڵ عەقڵ عەقڵەکی دی بووبەیار — زیاد دەبێ نوور،ڕێ دەبێ چاک ئاشکار (٢٦)
نەفس ئەگەر نەفسی دەگەڵ بێ شاد دەبێ — ون دەبێ ڕێ کاتێ زوڵمەت زیاد،دەبێ (٢٧)
چاوی تۆیەیاری تۆ ئەی ڕاو کەر — تۆ،نەهێڵی تۆزوخۆڵی بچتەسەر[1] (٢٨)
چاو لەتۆزوخۆڵ تا هەیبێ ئەمان — تۆزوخۆڵ باچانەکا، گەسکی زەبان (٢٩)
جونکەموئمین، موئمینە، ئا وێنەکەی — جوان و سافە سوورەتی بێ وێنەکەی (٣٠)
یار، ئاوێنەی گیانەوەختی غەم — لێڵ نەکەی ئاوێنەکەی گیانت، بەدەم (٣١)
لانەدا تا ڕووی لەگوفتاری تۆیار — هیچ مەڵێ تۆ، هەربەبەستە، لێوو زار (٣٢)
چاو لەخاک کە،گەر بەهاری بێ بەیار — چادەبێ لەو،گوڵ گەلێک، چەن سەد هەزار (٣٣)
چاوکە، لەودارەی بەهاری بوو بەیار — بەوهەوای خۆش، بووبەگوڵ، سەرتاکوخوار (٣٤)
جون لەپاییز، دی خیلافی خۆیی یار — خستیەسەرخۆ، لێفە، نوست تا هات بەهار (٣٥)
ڕایدەکوت.. بۆمن بەلایە، یاری بەد — هەردەنووم گەر ئەو لەلام بێ، تا ئەبەد (٣٦)
گەر وەکووئەسحابی کاف، من زۆر بنووم — چاکترەبۆم زۆرلەدەقیانووسی شووم (٣٧)
تاکو وشیار بوون، تەلەف بوو عومری وان — خەو لەبۆوان بوو بەسەرمایەی گران (٣٨)
خەو، دەگەڵ دانیش ببێ، وشیاریە — بوو ن دەگەڵ نادان، بەڵام بیماریە (٣٩)
ـانگی بەهمەن کۆدەبن زاغ و کەلاغ — ون دەبن بولبول، نەما چون گوڵ، لەباغ (٤٠)
گەر نەبێ گوڵزار، بولبول چۆن دەڵێ؟ — ئەو دەمەوشیاریەگەر ڕۆژ هەڵێ (٤١)
ڕۆژی جوان،تۆتەرکی ئەوگوڵشەن دەکەی — ژێرزەوی ئەمماگەلێ ڕەوشەن دەکەی (٤٢)
ڕۆژی زانست قەت غرووب ناکا لەکەس — مەشریقی وی گیان و عەقڵە، ئیدی بەس (٤٣)
خاسسە،ڕۆژی سابتی ساحەب کەماڵ — ڕوون کەرە، ئەو ڕۆژو شەوهەم مانگ و ساڵ (٤٤)
نەتڵەعی ڕۆژ جێت بێ گەر، ئەسکەندەری — جا لەبۆ هەرجێ بچی تۆ، سەرووەری (٤٥)
جا لەبۆ هەرجێ بچی مەشریق دەبێ — مەشریقیش بۆمەغریبت عاشیق دەبێ (٤٦)

---

[1]- چاوی تۆیە یاری تۆ ئەی پیاوی ڕاو    تۆزو خۆڵی با نەچێتە نێو، چاو

حیسسی خوففاشت لەبۆمەغریب هەڵات ... حیسسی دورپاشت دەچێ بۆڕۆژ هەڵات (٤٧
ڕێی کەرانەریی حیسسی زاهیری ... کەر دەکەی ئازار بەڕێی وان ڕابری (٤٨
پێنج حیسسی زاهیری،مس،دوورلەنوور ... پێنج حیسسی دیکەهەن وەک زێڕی سوور (٤٩
گەرکو لەو بازاڕ،ئەتۆ هیچ ماهیری ... چۆن دەبی بۆمس، وەکوو زێڕ مشتەری؟ (٥٠
حیسسی زاهیر دێ لەزوڵمەت بۆی غەزا ... حیسسی گیان بۆ وی، غەزا دێ لای خودا (٥١
ئەی ئەوەی بووی مەحرەمی ئەسراڕی غەیب ... چەشنی مووسا بێنەدەر،دەستت لەجەیب (٥٢
ئەی سیفاتی ڕۆژی ڕوونی مەعریفەت ... ڕۆژی ئاسمان هەر بەتەنیا، یەک سیفەت (٥٣
جارهەتاوی، جارو بار دەریایی تۆ ... جار کێوی قاف و، جار عەنقایی تۆ (٥٤
تۆ لەهەرچی من کوتم باڵا تری ... ئەی لەوەهمان زیاد، لەزیادیش، زیا تری (٥٥
ڕووحی کردەیاری عیلم و عەقڵ،ڕەب ... بێ نییاز لەو، لەفزی تورکی یاعەرەب (٥٦
دوور لەنەقشی هەم بەنەقشی ئەی خودا ... هەم موشەببیهەم مووەحید، مات ما (٥٧
لەو موشەببیەجار مووەحید چادەکا ... جارمووەحید، نەقش،ئەوگومڕا دەکا (٥٨
جار دەمەستی دا دەڵێ پیت، بولحەسەن ... ئەی حەبیبی نەرم و ناسک کەم تەمەن (٥٩
جار، نەقشی خۆیی وێران جا، دەکا ... هەرلەبەر تەنزیهی زاتی خوا دەکا (٦٠
چاوی زاهیر مەزهەبی وی، ئیعتیزال ... چاوی باتین سوننی مەزهەب، بۆویسال (٦١
مەسخەرەن بۆحیس، ئەهلی ئیعتیزال ... خۆ،نەسوننین،بەڵکەبوون ئەهلی زەلال (٦٢
پەیڕەوی حیس بوو، ئەوەی موعتەزیلی ... گەر دەڵێ سوننیم درۆیەو جاهلی (٦٣
ئەو کەسە، سوننی،کەحیسسی لادەنا ... چاوی عەقڵی خۆی، لەجێی حیس دا دەنا (٦٤
گەر خودای مومکین بوو دیبا، چاوی سەر ... خۆ دەبوو مومکین ببا، بۆ گاوو کەر (٦٥
غەیری حیسسی زاهیریت تۆ، گەر، نەبا ... حیسسی دیکەت گەر ئەتۆ هیچ هەر، نەبا (٦٦
چۆن بەنی ئادەم موکەڕڕەم وا دەبوو ... چۆن بەحیسسی موشتەرەک لای خوا دەبوو؟ (٦٧
ناموسەووەر، یاموسەووەر، بەو بڵەی ... باتڵە، تا سووڕەتت بێ لەو گڵەی (٦٨
نا موسەووەر، یا موسەووەر، لای ئەوە ... گشتی مەغزە،پێستی ئەو دەرخستەوە (٦٩
گەر تۆکوێری،کوێر لەسەروی، هیچ حەرەج ... چاو کەبێ، بڕۆ (صبرمفتاح الفرج) (٧٠
لادەبا سەبر، هەرچی پەردەی بێت چاو ... جوان دەکا، سینەو دەکا شەرحی تەواو (٧١
گەر تۆ ئاوێنەی دڵت بێ ساف و پاک ... زۆر دەبینی نەقشی غەیری ئاوو خاک (٧٢
تۆ دەبینی نەقش و نەققاش ئەودەمە ... تۆدەبینی فەڕش و فەڕڕاش، ئەو دەمە (٧٣

نێوخەیاڵم چون خەلیلم یار بوو    ئەو بەمەعنا بوت شکەن، بوت بوو، بەڕوو[1] (٧٤)
خواشوکرئەو،دەم کەیار بوو ئاشکرا    گیان خەیاڵی خۆی دەدی هەر وەک چرا (٧٥)
خاکی دەرگای تۆ،منی شەیدا دەکرد    تێر لەڕەحمەت خاک بەسەرخۆم دا دەکرد (٧٦)
من کوتم باش بم، پەزیرای ڕەنج، ئەزم    گەر نەبم باش،مەسخەرەی زۆرناحەزم (٧٧)
چارەوایەمن کەبنوارم لەخۆم    تا نەبێ تەحقیرو تەوهین، هیچ لەبۆم (٧٨)
ئەو جوانەدەیهەوێ جوانی و جەماڵ    کوا جەوان دێنێ لەبۆخۆی پیرەزاڵ؟ (٧٩)
ـش،باش دێنێ لەبۆخۆی ئەی فلان    تەییبات بۆ تەییبینە، بێ گومان (٨٠)
هەرشتەی بۆخۆی شتێکی جەزب کرد    گەرم گەرمی بردو،سارد ساردی دەبرد (٨١)
باتلان باتڵ دەبەن بۆلایی خۆ    ساڵحان،ساڵح دەکەن هەمتایی خۆ (٨٢)
ناریان بۆخۆ دەکێشن ئەهلی نار    جەننەتیش دەی وێ، دەگەڵ باش بێ بەیار (٨٣)
چاو ببەستی تۆ، دەبێ غەمگین و زار    چاو بەبێ نووری جیهان نابێ قەرار (٨٤)
ئەو غەمە، دەبێ لەبۆ لای نوور،چاو    تا بگاتن ئەو بەنووری ڕوونی تاو (٨٥)
گەربەچاوی واز، ببێ غەمگین و زار    چاوی دڵ بەسراوە، وەیکە، تۆ بەغار (٨٦)
دا بزانە چاوی دڵ چی لێت دەوێ؟    دەیهەوێ ئەو، نووری بێ حەد، بێتەوێ (٨٧)
گەرفیراقی ئەودوونووری بێ دەوام    ئەزیەتت کا،چاو هەڵێنەموستەدام (٨٨)
خۆ فیراقی ئەو دوونووری پایەدار    زۆردەدا ئازار، ئاگات لێبێ یار (٨٩)
گەر کو بانگم کا، دەنۆڕم چاک لەخۆم    ناحەزم یالایقم بۆ وێ بڕۆم؟ (٩٠)
گەر وەدووی ناحەز کەوێتن یاری جوان    وا دەکا تا، مەسخەرەی کابێ گومان (٩١)
دەمهەوێ ڕووی خۆم ببینم بێ درەو    من چ ڕەنگم چەشنی ڕۆژم یانەشەو (٩٢)
نەقشی گیانی خۆم دەویست من زۆر جار    کەس نەبوو نەقشم دەویدا بێ دییار (٩٣)
من کوتم ئاوێنەکاری وی ئەدی؟    وانییەتا ئەسڵی هەرشت بێتەدی؟ (٩٤)
زاهیری ئەشیا دەدا، نەینووک نیشان    قیمەتی نەینووکی باتین زۆر گران (٩٥)
ڕوویی یار نەینووکی باتین ئەی جەوان    ڕوویی ئەو یارەی کەبێتن لەو جیهان (٩٦)
دڵ، ببێ کوللی فەقەت نەینووکی تۆ    ڕووکە، دەریاچونکەنایەت سوود لەجۆ (٩٧)
هەرنیاز عەبدی لەبۆلای خوایی برد    مەریەمیش، ئێش، ژێری دارخورمایی برد (٩٨)
چاوی تۆ،چون بۆدڵی من بوو بەچاو    ئەو دڵەی نادیدەکەم بۆچاو،تەواو (٩٩)

---

[1]- چون لەقەلبم نشتەجێ بوو فکری یار    ئەوبەسوورەت بوت، بەمەعنا کردگار

تـــــۆم دەدی ئاوێتـــــەیی کوللی،لـــــەبۆم مـن لـەچاوی تـۆ بـوو دیـتم نەقشـی خـۆم (١٠٠)

مـن کـوتم خـۆم دیتـەوە، ئـاخیر، ئـەمن لـەو دووچـاوی، دیـم ڕێـی زاهیـر، ئـەمن (١٠١)

پێیکـوتم وەهم،ئـەو هـە، هـەر فیکرەوخـەیاڵ خـۆت جوداکەلـەو خەیاڵەئـەی هـەواڵ (١٠٢)

نەقشی مـن دەو چاوی تـۆ، وای کـرد نیـدا مـن ئـەتۆم‌و،تـۆ منـی،لێـک نـین‌جـودا (١٠٣)

چـۆن دەچـاوی ڕوونکـەری وا بـێ زەواڵ بۆحـەقایق چـۆن دەچێـتن ڕێـی خـەیاڵ؟ (١٠٤)

گـەر دەچاوی غـەیری مـن تۆنەقشی خـۆت دی،خەیاڵـــەبێ بەقایەئـــەو، لـــەبۆت (١٠٥)

هەرکەسـێ سـورمەی نـەبوونی خسـتەچاو یانەمەسـت بووئەوبەعەکسـی دێـو، تـەواو (١٠٦)

چـاوی وی خانـەی خەیاڵەهـەم عـەدەم ئەونـەبوونان،بوون، دەبینـێ لا جـەڕەم (١٠٧)

چاوی مـن چـون دیتـی سورمەی بێ زەواڵ بوو،بەخانـەی بـوون، نەخانـەی هـیچ خـەیاڵ (١٠٨)

گەربەقەدیـەک مـووت جیهـان لاموعتەبـەر سـەختەبۆ تـۆ فـەرقی گەوهەرکـەی لەبـەر؟ (١٠٩)

گەوهەروبـەر، ئەودەمـە، لێـت بـوون، عـەیان گەرخـەیاڵی خـۆت فڕێـدەی ئـەی فـلان (١١٠)

یـەک حیکایـەت گـوێ دەیە،ئـەی زێڕ نـاس تـــابزانی کـــام عەیانـــە،کام قییـــاس (١١١)

**دیتنی یەک نەفەر مانگی نوێ هەر بەخەیاڵ، دەزەمانی حەزرەتی عومـەر رەزای خـودای لێبێ...**

**خولاسەی داستان**

ئەووەڵی مانگی ڕەمـەزان بـوو. خـەڵکی بۆ دیتنی مـانگی نوێ هاتبوونە سـەرکێو. لە ناکاو یـەک نەفەر لە نێو ئەو خەڵکە بە حـەزرەتی عومـەری کوت ئـەمن دەحاڵی حازردا مانـگ لـە ئاسمان دەبینم. حەزرەتی عومەر(رض) چاوی لە ئاسمان کرد، بەڵام مانگی نەدیت. ڕووی دەکابرا کرد و کوتی ئەوەی کە ئەتۆ بە شکڵی مانگ دەیبینی مانگ نیە، بەڵکەم خەیاڵی پووچی تۆیە. چونکە ئەمن بە ئەحواڵی ئەستێران زۆر لە تۆ واردترم، ئەگەر باوەڕیش ناکـەی سـەری قامکت تەڕکە، بـە سـەر برۆکانـت دابکێشـە، ئـەو کابرایـە وای کـرد، زۆر بـە تەعەججوبـەوە موتەوەججیـە بـوو کە مانگ دیار نیە، حەزرەتی عومەر(رض) کوتی یەک دانـە مـووی برۆکانـت بـوو خـوار ببـۆوە و ئەتۆ پێت وابوو کە ئەو دانە موویە مانگی نوێیە.

مـــانگی ڕۆژوو، هـــات لـــەدەورانی عومـــەر چوونەســـەرکێو، زۆربەتونـدی چـەن نەفـەر (١١٢)

تـــاکو مـــانگی نـــوێ ببیـــنن لـــەو ســـەرە یـــەک لـەوان دەیکـوت عومـەر، دیـتم وەرە (١١٣)

چون لەئاسـمان نەیـدی مـانگی نـوێ عومـەر پێیـــدەکوت مـــانگی خـــەیاڵت هاتەســـەر (١١٤)

ئـــــــــمانم زۆر لـــــــــەتۆچاتر دەدی    مـــانگی نـــویْ مـــن بـــۆچی نـــابینم ئـــەدی؟ (١١٥)
ـەرکـــە،دەس بـــی کێشەســـەر هـــەردوو بـــڕۆ    جـــا، لـــەمانگی نـــویْ بنـــۆڕە، چـــاک ئـــەتۆ (١١٦)
ـــەربرۆی تـــەرکرد، نەیـــدی ئـــەو قەمـــەر    پێیدەکوت وُن بوو لەمن مانگ،ئەی عومەر (١١٧)
ـێکوت ئاریْ مـووی بـرۆت بـوو، بۆکـەمان    تیـری هاویشـت بـۆت کـەنابووی ناوگومـان (١١٨)
ـووێـــەکی کـــەج،کردی گـــومڕا ئەونەفـــەر    زۆر بەناحـــەق دەیکـــوت ئـــەو دیـــتم قەمـــەر (١١٩)
ـوویی کـەج گەرپـەردەیی گـەردوون دەبـوو    چۆن دەبیْ گەرکـەج بیْ ئـەجزای تۆهـەموو؟ (١٢٠)
ـاس کـــەوە ئـــەجزات بەدەســـتی ڕاســـتان    لانـــەدەی ئـــەی ڕاســـت ڕەو،لـــەو ئاســـتان (١٢١)
چـۆن تـەرازووی، هـەر تـەرازوو ڕاس دەکـا    گـــەر خـــەراپیش بـــیْ، تـــەرازوو بـــاس دەکـــا (١٢٢)
ـەرکەســـــێکی بـــــۆڕەفیقی ناکەســـــان    چوو لەدەستی عەقڵ و، سووک ما،وەک خەسان (١٢٣)
حۆت شەدید نیسبەت بەگشت کوففار بکە    خـــاک بەسەردۆســـتایەتی ئـــەغیار بکـــە (١٢٤)
ـــۆ لەســـــەرئەغیار، وەک شەمشـــــێربە    شـــێربە، نـــەک چەشـــنی ڕێـــوی پیربـــە (١٢٥)
ـــەبێتن لێـــت جـــودا هـــەم دوور،یـــار    چـون لـەبۆگوڵ دائیمـەن دوژمـن بـوو خـار (١٢٦)
ـک ســـــپەندەر،بەردەگورگان ئـــــاگری    چون عـەدووی یووسوف دەبوون نـەک یاوەری (١٢٧)
ـیـانی بابـــات پێـــدەڵی شـــەیتان هـــەتا    ئـــەو بـــەفێلان تـــۆ لـــەبۆلای خـــۆی ببـــا (١٢٨)
ـی دەدا شـــەیتان لـــەڕێی ڕاس،ئـــادەمیش    هەربـــەفێڵ مـــاتی دەکـــرد ئـــەو عالـــەمیش (١٢٩)
ـۆر لەشـــــەترەنج مـــــاهیرو زانایەئـــــەو    تـــۆ نەکـــەی شـــەترەنج بـــەچاوی نیوەخـــەو (١٣٠)
چـۆن لەشـەترەنج زۆردەزانـیْ فـەننوفووت    وەک خـەس وخاشـاک بگرێـت نێوگـەرووت (١٣١)
ـوگـــەرووی تۆخـــەس دەمێنـــیْ زۆرســـاڵ    خـەس بـەمانای حـوببی جـاەو حـوببی مـاڵ (١٣٢)
ـە خـەس و خاشاکەچون بـوو بیْ سـەبات    نێوگـــەروو، بـــۆ مـــانعی ئـــاوی حـــەیات (١٣٣)
ـوژمنـــی زۆرزان کـــەماڵی تـــۆ دەبـــا    ڕێ گرێکـــەڕێ گرێـــک بـــۆ خـــۆ، دەبـــا (١٣٤)

**دزینی مارگیر، مارێک لە مارگیرێکی دیکە...**

**خولاسەی داستان**

دزێک مارێکی لە مارگیرێک دزی و لە ڕووی نەزانی و نەفامی ئەو مارەی زۆر بە قیمەت دەزانی. **ئەو مارە بەو دزەیەوەدا و کوشتی، مارگیر کە جەسەدی ئەو دزەی دی، ناسی و کوتی** بەڵێ، ماری دزراوی من بوو کە ئەو دزەی کوشت و ئەمنیش لەو بەڵا گەورەیە نەجاتم بوو. دەحاڵێکدا، وەختێک کە مارەکەی لیْدزیم زۆر نارەحەت بووم و دوعام دەکرد کە خودایا

مارەکەم پەیدا کەمەوە. بەڵام ئەڵئان شوکری خوا دەکەم کە ئەو دوعایەی لێ قەبووڵ نەکردم. ئەمن پێم وابوو کە قەبووڵ نەبوونی دوعایەکەم بە زیانی منە، بەڵام ئەڵئان دەبینم کە هەمووی سوود و قازانجە...

یەک نەفەر دز، ماری مار گیری دزی | پێیدەکوت زۆر باشە، بەو عەقڵی کزی (٣٥)
مارگیربۆ خۆی نەجاتی بوو لەمار | مار کوشتی ئەو دزەی خۆی، زار زار (٣٦)
مارگیر دیتی و ناسی زۆرچاک | دەیکوت ئەو گیانی،بەمارم بوو هیلاک (٣٧)
من بەگیان و دڵ لەحەق داوام دەکرد | مارەکەم تابێتە دەس، من وام دەکرد (٣٨)
خواشکور،چون ئەدوعا، مەردوود بوو | وام دەزانی ئەو زیان بوو، سوودبوو (٣٩)
زۆردوعا هەن هەم زیانن هەم هەلاک | قەت ئەوا ن نابن قەبووڵ لای خوایی پاک (٤٠)

## ئیلتیماس کردنی رەفیقی حەزرەتی عیسا(ع) لە حەزرەتی عیسا بۆ زیندوو کردنەوەی ئێسکان

### خولاسەی داستان

پیاوێکی نەفام بوو بەهاوڕێی حەزرەتی عیسا، داوای لە حەزرەتی عیسا کرد کە ئیسمی ئەعزەمی فێرکا، تا ئەویش بتوانێ مردووان زیندووکاتەوە. حەزرەتی عیسا پێی‌کوت لەو بارەدا هیچ مەڵێ و هیچ داوا مەکە. چونکە ئەو کارە بۆ تۆ نابێ، کابرا نەفامەکە کوتی کەوایە ئەتۆ ئیسمی ئەعزەم لە سەر ئەو مردووانە بخوێنە تا زیندوو ببنەوە. کاتێک کە حەزرەتی عیسا ئیسرارِ و ئیلحاحی ئەو کابرایەی دی ڕووی دە بارەگای خودا کرد و کوتی خودایە ئەوە، چ ڕازێکە کە ئەو کابرا نەفامە دەغەمی نارەحەتی خۆی‌دا نیەو دەربارەی نەخۆشی باتینی خۆی بیرناکاتەوە. بەڵام دەو حاڵەدا بە ئیسرارِ لەمن داوا دەکا کە مردووان زیندوو بکەمەوە. عاقیبەت حەزرەتی عیسا(ع) بە فەرمانی خودا دوعایەکی خوێند و ئێسکان بەو دوعایە ڕووحیان هاتەبەر، لە ناکاو شێرێکی ڕەش و توڕە لەو نێوەدا هاتە دەر و ئەو کابرا نەفامەی لەت و پەت کرد.

هات دەگەڵ عیسا نەفامێک بۆ ڕەفیق | ئێسکی زۆری دی، لەقووڵکێک زۆرعەمیق (١٤١)
پێیدەکوت تۆیاری ئیسمی ئەعزەمی | گیان دەدەی خۆ، بەو، بەئێسکان بێ کەمی (١٤٢)
ئیسمی ئەعزەم پێم بڵێ ئەی تاجی سەر | ئێسکی کۆن، تا گیانی تازەی بێنمەبەر (١٤٣)
پێیدەکوت بێ دەنگ بە،کاری تۆنییە | کاری ئەنفاس و، وتاری تۆنییە (١٤٤)
یەک نەفەس لازم،لەبۆ وەی، هێندەپاک | تێنەگا، وەک، وی فریشتەو ئینسی خاک (١٤٥)

زۆردەکێشی یەک نەفەس بێ، پاک بێ تائەمینی مەخزەنی ئەفلاک بێ (١٤٦)
گەرعەسای مووسات بەدەستی خۆ دەدی ڕازی دەستی حەزرەتی مووسا ئەدی؟ (١٤٧)
دێکوت ئەو گەر لایقی ئەسرار نیم تۆ بخوێنەناو،لەسەر ئیسکی ڕەمیم (١٤٨)
ێدەکوت عیسا کەئەی دانای ڕاز بۆ نەفام،بۆ کاری وا بوو داخوواز؟ (١٤٩)
بۆچی فکری خۆی نییە؟بیمارەخۆ بۆ غەمی گیانی نییە؟ مندارەخۆ (١٥٠)
ئەو جەنازەی خۆی کەمردوو بوو، نەدی دەیهەوێ زیندوو بکا، مردووی دەدی (١٥١)
خوا کوتی بەد بەخت،بەدبەختی،دەوێ چون دڕووی چاند، هەردڕووی با دەسکەوێ (١٥٢)
ەو جیهانەهەرچی چاندی تۆوی خار قەت لەنێو گوڵزار نابێ ئەو دیار (١٥٣)
گەرگوڵێک بگرێ بەدەس، ئەو خاردەبێ گەربچێ بۆلایی یارێک،مار دەبێ (١٥٤)
ەخسی بەدکار کیمیا، بۆ ژەهرومار[1] بەرخیلافی کیمیای پەرهیز کار (١٥٥)

## سفارش‌کردنی سۆفی بە خادیم لە بارەی ئاگا لێ بوون لە حەیوان و لاحەولە کووتنی خادیم

### خولاسەی داستان...

یەکێک لە سۆفیان لە سەفەرێکی دوور و درێژ و پڕ دەرد و ڕەنج گەیشتە خانەقایەک و شەوێ لەوێ ماوە. لە ئەووەڵێ ڕاهات کەرەکەی لە سەر ئاخوڕ بەستەوە، و لەپاشان چۆ حەلقەی زیکری سۆفیان. پاش ئەوە کە زیکر تەواو بوو.سفرەی غەزایان ڕاخست کە عادەتی سۆفیان وایە... لەو کاتەدا سۆفی موسافیر کەرەکەی وەبیر هاتەوە. خادیمی بانگ کرد و پێی‌کوت.. بڕۆ بۆ ئەو کەرە فەقیرە بەستەزمانە کاوجۆ ئامادە بکە تاکو شەوێ برسی نەمێنێتەوە. خادیم لەو سفاریشە نارەحەت بوو و کوتی: (لاحول و لاقوه الابالله) ئاخر ئەوە، چ سفاریشێکە، ئەمن بۆ خۆم لەو کارە سابیقەی توولانیم هەیە و بۆخۆم دەزانم کە چدەکەم... سۆفی کوتی ئەی خادیم کەرەکەی من پیرە و ددانەکانیشی کول و سست بوونە، جا لەبەر ئەوە جۆیەکەی بۆ تەڕ بکە تا بتوانێ چاکی بجوێت. خادیم کوتی (لاحول و لاقوه الا بالله) ئەتۆ ئەمن فێر دەکەی؟ دەحاڵێک دا تەواوی کەر داران تەرزی حەیوان بەخێو کردن لە من فێر دەبن... سۆفی کوتی کەرەکەی من ڕێیەکی زۆر دوور و درێژی پێواوە و چونکەکورتانی زۆر لەسەر پشت ماوەتەوە، پشتی

[1]-کیمیایە بەد نیهاد بۆ ژەهر و مار (مصرع اول)

برینداربووه ئەگەر زەحمەت نەبێ کەمێک مەڵحەمی لەسەر برینەکەی دابنێ... خادیم کوتی (لاحول و لا قووه الا باللە) زۆری لەسەر مەڕۆ تا ئەلئان هەزاران میوانمان بۆ هاتووه و هەموویان ڕازی ڕۆیشتوونه... سۆفی کوتی ئاوێ بده بەو کەره زبان بەستەیه، بەڵام ئاگات لێ بێ ئاوەکەی شیره و تێن بێ. چونکه بە ئاوی سارد نارەحەت دەبێ... خادیم کوتی (لاحول و لاقوه الا بالله) لەو قسه منداڵانەی تۆ، ئەمن خەجاڵەتی دەکێشم... سۆفی کوتی کەم کا دەگەڵ جۆ تێکەڵ بکە... خادیم کوتی(لاحول....) ئەی سەرووەری من ئەو قسە زیادیانە مەکە چونکە ئەوانەی ئەتۆ دەیانڵێی هەموویان دەزانم. سۆفی کوتی بەرپێی کەرەکەم چاک خاوێن کەوه و ئەگەر جێگای تەڕبێ کەمێک خۆڵی ئیشکی لێ برێژه هەتا نەخۆش نەبێت... خادیم کوتی (لاحول و....) بابە گیان هێندەم پێ مەڵێ. سۆفی کوتی... ڕنەکێک بەره پشتی کەرەکەم ڕنەک بکە. خادیم کوتی (لاحول و....) گیانەکەم کەمێک حەیا بکە. پێم کوتوی کە ئەوانە هەموان دەزانم... خادیم بە ڕوویەکی جیددی لە جێی خۆی هەڵستا و بە سۆفی کوت ئەوه دەچم کاوجۆ ئامادە دەکەم.. .و ڕێکەوت، لە ڕێگا تووشی چەند نەفەر ئەفرادی بێکار بوو، دەگەڵ وان دەستی بە قسان کرد و قەول و قەراری کاوجۆی لەبیر چوو.. سۆفی لەبەر ماندووبوون خەوی لێکەوت و خەونی هاتەران پاتەرانی دی، مەسەلەن دەخەودا دیتی کە، کەرەکەی بە دەست گورگێکی هار گرفتار بووه، ئەو گورگە بێ وچان حەملەی پێدەکا... سۆفی زۆر پەرێشان لەو خەوەڕا پەڕی وکوتی (لاحول ولاقوه الا بالله) ناکا مێشکم خەراب بوو بێت... کە ئەو خەیاڵاتانە دەبینم. دووبارە دەخەودا دیتی کە، کەرەکەی هەر دەڕوا و بەلادا دێ و جارجار دەقووڵکێک دەکەوێ... دیارە کە ئەو خەیاڵاتە دەگەڵ واقعییەت بێ‌ئیرتیبات نەبوو... چونکە لەو کاتەدا کەرەکەی وی لە شیددەتی برسیتی زۆر دەعەزاب دابوو و بە زبانی حاڵ دەیکوت خودایا با جۆ نەبێ، کەمێکم کا بۆ بەڕێ بکە... سبەینێ کە لە خەو هەڵستان خادیم بە عەجەلە خۆی گەیاندە ئاخور و فەوڕەن کورتانی لە سەر پشتی کەرەکە دانا و وەکوو کەرداران نەقیزەی دەکەرەکە وەژاند تا هەڵێ و سۆفی پێی وانەبێ کە، کەرەکەی نارەحەتە، سۆفی سواری کەرەکەی بوو... وەڕێکەوت بەڵام کەری بەستەزمان تاقەتی ڕێ ڕویشتنی نەبوو. دۆستەکانی سۆفی کەدیتیان کەرەکەی زۆر نارەحەت و پەرێشانە، وەکوو کەر ناسی شارەزا ئیزهاری نەزەریان دەکرد، کاتێک موتەوەججیەبوون کە ناتوانن هیچ عیلاجێک لەو کەره بکەن بە سۆفیان کوت... ئەوه، چ جووره نەخۆشیەکە؟ مەگەر ئەتۆ نەبووی کە دوێنێ دەت کوت کەرەکەم زۆر بە تاقەت و چالاکە؟ سۆفی کە لەو واقعییەتە ئاگادار بوو و عیللەتی نارەحەتی کەرەکەی دەزانی پێیکوتن... بەڵێ ئەمن بووم کە وام دەکوت بەڵام کەرێک کە دەشەوێ دا

خۆراکی (لاحول و لاقوه الا بالله) بێ تەواوی شەوێ مەشغووڵی زیکری خودا دەبێ، و سبەنێش دەچتە سەجدە.

یــەک نەفەرسـوْفی گـران بووکـاری وی — خانەقایــەک، شــەو بــوو میهمانــداری وی (١٥٦)

چـوو کـەری خـۆی بەستەوەسـەر ئـاخوڕی — هاتـــەکۆڕی زیکـــری حـــەیی قـــادری (١٥٧)

جامۆراقیــب بــوو دەگــەڵ یــارانی خــۆی — بـوون دەگـەڵ یـاران دەبـوو دەفتـەر لـەبۆی (١٥٨)

دەفتــەری سـۆفی لەحــەرفان زۆر بــەدوور — دەفتـــەری وی، قـــەلبی ســـافی،پڕلەنوور (١٥٩)

زادی زانایانەئاســــــــاری قەڵـــــــەم — زادی ســـــۆفی بوو،بەئاســـــاری قـــــەدەم (١٦٠)

هەروەکووڕاوکـەر بـەدووی شـوێن دا دەچـێ — ئـــەو دەبینـــێ شـــوێنی ئاهوو،جـــا،دەچێ (١٦١)

شــوێنی ئــاهوو ڕەهنـــەما یــی ڕاو کـــەرە — موددەتێکە،دوایـــــە، نـــــافی ڕەهبــــــەرە (١٦٢)

گەرکوشـوکری شــوێنی کـردو کەوتــەڕێ — ئـــەو بەمەقســـوودی دەگاتن،گەییـــەجێ (١٦٣)

بـۆنی نـاف گـەر تـۆ لـەبۆلای خـۆی بـەری — چاترەتـــا شـــــوێنی پێ،تـــۆ هـــــەڵگری (١٦٤)

ئـەو دڵـەی بـێ، مەتلـەعی ئەسراڕی ڕوون — جەننەتـــــەبۆعارف و، دەرکـــــان وەبـــــوون (١٦٥)

بــۆ تــۆ ئــەو، دیــوارە، بــۆ عــارف دەرە — بـــەردەبۆ تــۆ، بــۆ عــەزیزا ن گــەو هــەرە (١٦٦)

هــەرچی دیتــت تــۆ، دەنــەینووک ئاشــکرا — پیـر دەخشـت دەبینـێ، زێـدەش،وەک چـرا (١٦٧)

پیرئەوانــەن پــێش ئــەوەی دونیــا هــەبێ — گیــانی وان ئــەودەم، دەهەســتی دا هــەبێ (١٦٨)

پێش بـەدەن، پیر، عـومری زۆری بردەسـەر — پـێش زڕاعــەت هاتەدەســتی وی، ســەمەر (١٦٩)

پێش بـەدەن گیانیـان هـەبوو، پیـران هـەموو — پێش لەبەحریش گەو هـەرو دوڕیان هەبوو (١٧٠)

مەشـوەڕەت بـوو کـاتێ بـۆ ئیجـادی خــەڵق — گیانی وان نێو بەحری قودرەت تاکو حەڵق (١٧١)

گــەر مەلــەک مــانع بوو،خــەڵقی ئــادەمی — پێکــەنین پیـــران، بەڕیشـــیان ئـــەودەمی (١٧٢)

بــوو ن لەئەشـیا باخەبـەر وەک ئێسـتەهەن — پـێش ئـەوەی ڕووح بێتـەنێو بەنـدی بـەدەن (١٧٣)

پــێش ســەماوات چـــی ســـتێرەبوو،ئەوان — دیتبوویــان زۆر عــەیان، پــێش دانــە، نــان (١٧٤)

بــێ دەمــاغ ودڵ، هــەیان بــوو بیــرو ڕا — ســەر دەکــەوتن، بــێ ســپاەو بــێ هــەرا (١٧٥)

فکــرە، بــۆ وان هـــەرچی دەیبینێــت چــاو — گــەرچی بـۆ ئـەغیار، ڕوئیـەت بـوو، تـەواو (١٧٦)

بیــر لـــەبۆ مـــازی و موســـتەقبەل دەبـــێ — گـەر لـەوان ڕەد بوون،موشـکیل حـەل دەبـێ (١٧٧)

نێـو تـرێ ڕووح، ئاشـکرا دەیـدی شـەراب — ڕووح لەمەعدووم زۆر شتی دی، بێ حیساب (١٧٨)

ڕووح دەیــدی شــت،بەبێ قەید،ئــەی فــڵان — بــاش و ناباشــی دەدی پــێش بــوونی کــان (١٧٩)

پــێش ئــەوەی چاێ،ترێ،خواردیــان مــەی — عارفـان مەسـت بـوون هەموویان،ئەودەمـەی (١٨٠)

جا،دەهـــاوین دا، دەبیـــنن مـــانگی دەی — ژێـــری نـــووری ڕۆژ، دەبـــین ســـایەکەی ۱)
نێـو تـرێ، پاکـان، دەبیـنن ئەسـڵی مـەی — نێـو فـەنای خـالیس دەبیـنن، ئەسڵی شـەی ۲)
ئاسـمان سـووڕا لـەدەو ری وان، مەسـت — ڕۆژ کراســـی زێڕ،لـــەوانی هاتەدەســـت ۳)
گـەر لەوان،یـەک جـێ ببینـی تـۆ،دوو یـار — هەم یەکن هەم زیاد لەیەک، شەشسەد هەزار ۴)
بۆمیسـال تیعـدادی وان وەک مـەوجی یـەم — مـــەوجی دەریا،بایـــەدەیکا زیـــادو کـــەم ۵)
ڕۆژی گیانـان گـەرچی بـوو یـەک دانـەنوور — زۆردەبـــوو کـــاتێ لەئەبـــدان هاتـــەژوور ۶)
دانەیـــەک ڕۆژ دیتەبـــەرچاو نـــەک دووان — شەخسی بەنـدی نێو بەدەن، هـەیتی گومـان ۷)
ڕووح کەهـــەیبێ تەفرەقـــە، حەیوانیـــە — نەفســـی واحیـــدبێ ئەگـــەر، ئینســـانیە ۸)
چـون بەسـەروان ناردی نووری خـۆی خـووا — چـۆن دەبـێ پـەخش و بـڵاو بـێ، نـووری وا؟ ۹)
یارەکـــەم ئاســـوودەبەتۆ،یەک زەمـــان — تاکـەمێک مـن جـوانی ڕاسـتی کـەم بـەیان ۰)
کـوا بـەیان دەکـرێ جـەماڵی حـاڵی وی؟ — هـــەردوو دونیا،ئینعیکاســـی خـــاڵی وی ۱)
گەربـەیان کـەم وەسـفی خـاڵی جـوان بـەزار — دەیهـــەوێ تا،تـــەن لـــەمن کـــا تـــارو مـــار ۲)
شـادمانم چەشـنی مێـرووی نێـو خـەیان — چـون لـەخۆم زیـاتر دەبـەم بـاری گـران ۳)

**وازهێنان لەتەقریری مەعنای حیکایەت بە عیللەتی تەمایولی گوێگر، بەبیستنی زاهیری سووڕەتی حیکایەت...**

کـوا دەهێڵـێ تـا بـەیان کـەم خـوای فەلـەک — هـەرچی لازم بـوو کەبیڵـەم یـەک بەیـەک؟ ۴)
کـەف دەکـا دەریـا گـەلێک زۆر،جاروبـار — جـەزری بـۆ دێ، دوایەمەد،ئـەی هووشـیار ۵)
گـوێ دەمن،تـۆ، داخـووا مـانیع چبـوو؟ — موسـتەمیع قـەلبی لـەبۆ جێـی دیکـەچوو ۶)
چـوو لـەبۆ لای سـۆفی میـوان، فیکـری وی — ئەوخەیاڵـــە، بـــوو بـــەویردو زیکـــری وی ۷)
بێینـەوە،با، سـەر ئـەوەی کـە، خواسـتان — تـا بـەیان کـەێن حاڵ،بـەبێنووی داسـتان ۸)
ســـووڕەتی زاهیـــر مەزانـــە، ســـۆفییە — وەک منـاڵان مێـوژو گـوێزت بۆچییـە؟ ۹)
جیسـمی ئێمـەمێوژو گـوێزە، ئـەی فـڵان — گـەرکو مـەردی،لادەتۆ، لـەو هـەردووان ۰)
گەرلـــەوان دوو لانـــەدەی،لوتفی خـــودا — تۆ لە هەر نۆ ئاسمانان لا دەدا[1] ۱)
گـوێ دە، ئێستەسـووڕەتی داسـتان جـا — لێـک جوداکـە، چاک،بـەڵام، تـۆ دان و کـا ۲)

---

[1]- لادەبا (مصرع دوم)

**گومان بردنی کاروانچیان،کە کەری سۆفی نەخۆشە...**

حەڵقەیی سۆفیانی زیکری قادری        چون بەخۆشی و شادی گەییەئاخری (۲۰۳)

ـــفرەیان هینا لەبۆ میوانی خۆ        هاتە بیری، ئەو دەمە، حەیوانی خۆ (۲۰۴)

ی بەخادیم کوت لەبۆ ئاخورِ بڕۆ        جێ بەجێ کە،تۆ لەبۆ کەر، کا و جۆ (۲۰۵)

جـوابی دا (لاحول...)قەولی وا، چنە؟        زۆرلەمێژەئەو هە، هەر کاری منە (۲۰۶)

ـیـ:کوت جۆی تەر کە، دوایەبۆی بەرە        چونکەپیرەو کول ددانە،ئەو کەرە (۲۰۷)

جـوابی دا(لاحول....)چیت کوت سەروەرم؟        من لەبۆ ئەوکارە بۆ جەم، ڕەهبەرم (۲۰۸)

ـیـدەکوت کورتا ن لەپشتی لا بنێ        سەربرینی پشتی، مەلحەم دابنێ (۲۰۹)

جـوابی دا (لاحول...)ئەی حیکمەت مەدار        چەشنی تۆمیوان لەبۆم هات سەتهەزار (۲۱۰)

ی ڕۆیشتن لەلامان گشتییان        چونکەمیوان زۆر عەزیزە،وەک گییان (۲۱۱)

ـیـ:کوت ئاوی دەیە، وەک شیر، گەرم        جوابی دا (لاحول....)گفتت بۆ مە، شەرم (۲۱۲)

ـیـ:کوت تۆ کەم دەگەڵ جۆ،کا،بکە        جوابیدا (لاحول ...) تۆ کۆتا بکە (۲۱۳)

ـیـدەکوت لابەلەبەر پێی،ورکەبەر        جێی کەتەڕ بوو خۆڵی ئیشکی کە، وەسەر (۲۱۴)

جـوابی دا (لاحول ....)تۆش هەروا بڵێ        قاسیدی باش کەم دەگەڵ وی،جا، بڵێ (۲۱۵)

ـیـ:کوت تۆبۆم ڕنەک کە، پشتی کەر        جوابی دا (لاحول ....)بەسسەئەی پەدەر (۲۱۶)

حـەیاشان توند دەچوو خادیم،هەتا        کاو جۆ بێنێ لەبۆ کەر ئیبتیدا (۲۱۷)

ـەر کەچۆ دەر ئاخوڕی ئەو چوو لەبیر        نوست سۆفیش هەروەکوو کەروێشکی پیر (۲۱۸)

ـبەبۆلای چەن نەفەرئەو باشی پەست        پێکەنی بەو پەندی سۆفی چەشنی مەست (۲۱۹)

ـکەسۆفی خەستەبوو، زوو، ڕاکشا        خەونی زۆری ئەو، وەبەر چاو ڕا خشا (۲۲۰)

ی کەری وی، بوو ئەسیری گورگی هار        جارپشت و جار ڕان دەگرێ بەزار (۲۲۱)

ـەو خەیاڵەنەی دەما،سەبرو قەرا ر        ئەی عەجەب،خادیم،لەبۆناکا دیار؟ (۲۲۲)

ی چەلێکیش گەر کەری ما،بێ ڕەوت        جار دەچاڵێ،جار دەقوولکێکی کەوت (۲۲۳)

ـبەجوور دەی دیت ناخۆش واقیعە        فاتیحەی دەخوێند یا والقاریعە (۲۲۴)

ـدەکوت یاران نین،چارەم چییە؟        خانەقابەسراوە دەرکەی، کەس نییە[1] (۲۲۵)

ـڕوبار دەیکوت کە ئەی خادیم، لەبۆ؟        زۆر دەگەڵ ێێک نانوخوێن خواردوونە خۆ (۲۲۶)

ـبەلای من غەیری چاکەی قەت نەدی        ئێستە بۆچی، بوو لە بۆم دوژمن ئەدی؟ (۲۲۷)

---

[1] - خانەقا بەسراوە، ئێستا کەس نییە(مصرع دوم)

بێ سەبەب نابێ عەداوەت ئەی برا　　خۆ دەنا، هەمجینس دۆستن،ئاشکرا (٢٢٨)

جار دەیکوت ئادەمی،وازۆر ئەمین　　کەنگی زوڵمی کرد لەئیبلیسی لەعین (٢٢٩)

ئادەمی چی کرد لەمارو دووپشک؟　　داری ژینی وی دەکەن وا، زوو، وشک[1] (٢٣٠)

عادەتەبۆ گورگ، هەڵدەدڕێ جەسەد　　ئادەمیش تێیدا دەبێ زاهیر، حەسەد (٢٣١)

جار دەیکو ت زۆر گوناهەزەننی بەد　　بۆ بەدۆستم بەد گومان بم، زیا د لەحەد؟ (٢٣٢)

جاردەیکوت بەدگومانیش،ئیحتیات　　گەرنەبێ تۆ بەدگومان، نات بێ نەجات (٢٣٣)

سۆفی کەوتە، نێو خەیاڵ و وەسوەسە　　کەر لەبرسان کەوتەدەردو، مەخمەسە (٢٣٤)

ئەوکەری بێچارە،ما، نێو خۆڵ و بەرد　　پەت پساو،کورتان خوار،پرئێش و دەرد (٢٣٥)

پێی نەبوو بڕوات و، شەو ما، بێ گیا　　سوڕ دەما سەر، کەرکەئەوشەو چۆن ژیا (٢٣٦)

کەر هەمووی شەوزیکری خوای کرد ئەیخودا　　جۆ نەبێ با،بۆم بەڕێ کە، لۆچێ کا (٢٣٧)

بەوزبانی حاڵ دەیکو ت ئەو کەرە　　سەرەوەرم سووتام، نەجاتم دە، وەرە (٢٣٨)

کەوتەدەرد و ڕەنج کەر، زۆر بێ حیساو　　چەشنی تەیری خاک، بەدەس ئەمواجی ئاو (٢٣٩)

هیچ نەحەجمی، ئەو شەوە، کەر،تا سەحەر　　چونکەگرتی ئەو شەوە(جوع البقر ) (٢٤٠)

ڕۆژکەهات خادیم دەهات، بۆ لایی کەر　　جێ بەجێ کورتانی ئەو هاویشتەسەر (٢٤١)

چەشنی کەرداران، نەقیزەی تێوەژاند　　بەد سیفەت،لەو کەر، کەمێکی خوێن ڕژاند (٢٤٢)

کەر لەئێشی ئەو نەقیزە، توند دەڕۆی　　کوا زبان تا کەر بێژێ حاڵی خۆی؟ (٢٤٣)

هەردەگەڵکووسۆفی سواربووو،ڕێ کەووت　　زۆرکەڕەت ئەوکەر،بەعەردی دا کەووت (٢٤٤)

یارمەتی دەر،دی کەکەرنەیماوەڕەوت　　پێی نەخۆشبوو،چونکەکەر،زوو،زوو،دەکەوت (٢٤٥)

یەک نەفەرهات گوێی دەگرت و، بای دەدا　　یەک تەماشای زاری وی کرد بێ سەدا (٢٤٦)

یەک لەژێر ناڵ جوستوجۆی کرد، ورکەبەرد　　وای دەزانی یەک،دەچاوی دایەدەرد (٢٤٧)

گشتی کوتیان ئەو کەرەبۆ کەوتەخۆڵ　　سۆفی نەتکوت ئەو کەرەی من توندو تۆڵ؟ (٢٤٨)

جوابی دا (لاحول)گەر بێ شامی کەر　　ڕۆژ لەڕێ ڕۆیین،ئەوالەی دێ بەسەر (٢٤٩)

چونکەگیای کەر شەو دەبوو (لاحول) هەر　　شەو لەزیکرو ڕۆژ دەکەوتە، سەجدەکەر (٢٥٠)

زۆر لەئینسانان هەنەئینسان دەخۆن　　گەرسەلامیش کەن، سەلامی وان، درۆن (٢٥١)

قەلبی ئینسان، ماڵە بۆ شەیتان ، ئەتۆ　　قەت فریوی شەخسی وەک شەیتان مەخۆ (٢٥٢)

هەرکەسێ بخوا فریوی شەخسی بەد　　وەک کەری سۆفی بەسەردێ تا ئەبەد (٢٥٣)

---

[1]- ئادەمی چی کرد لەمارو دوو پشک؟　　وا ، بەئێش دەیکەن لەژنین دا بێ پشک

هەرکەسێ شەیتان لەکار، داوەر بکا     یانەدۆستی بەدنیهاد یاوەر بکا (٢٥٤)
ئەو لەڕێگای دین و سەر پردی سیرات     وەک کەری سۆفی، فەقەت لاتەی دەبات (٢٥٥)
گوێ مەدەتۆ، مەکرو حیلەی یاری بەد     تۆ لەڕێ ئیمەن مەڕۆ، هەن داو،سەد (٢٥٦)
تۆ ببینەدێوی فێڵباز سەت هەزار     تۆش ئەی ئادەم ببینەدێو، دە، مار (٢٥٧)
هەربەفێڵ ئەوپێت دەڵێ ئەی گیانی دۆست     تا جوداکالێت،وەکووقەسساب پۆست (٢٥٨)
هەربەفێڵ دەر دێنێ پۆستت ئەی فلان     وای لەوەی، خواردی فریوی دوژمنان (٢٥٩)
دادەنێ ئەو سەر لەژێر پێی تۆ،هەتا     چەشنی قەسساب بت کوژێتن، ئەی فەتا (٢٦٠)
تۆ وەکوو شێر ڕاو بکە،تەنیاو بەس     نەک قەبووڵ کەی نازو عیشوەی هیچ کەس (٢٦١)
دوور کەوەتۆ، لەوکەسەی هەیبێ، جەفا     بێ کەسێ چاتر لەخزمی بێ وەفا (٢٦٢)
تۆلەمولکی خەڵکی، قەت خانەی مەکە     کاری خۆت کە، کاری بێگانەی مەکە (٢٦٣)
جیسمی خاکی تۆ، لەلات بێگانەیە     غەم دەخۆی بۆ وی، لەلات دوڕ دانەیە (٢٦٤)
گەربەجیسمی خۆت بدەی تۆ،چێشتی چەور     تۆ لەڕووح وگیانی خۆت کردووتە،جەور (٢٦٥)
ڕۆژی مردن بۆگەنیوی دێ، بەدەن     گەرچی جێگای بێ لەنێو موشکی خوتەن (٢٦٦)
تۆ لەدڵ دەموشک،نەک لەو جیسمی خاک     موشک، یانی زاتی خوای بێ باک و پاک (٢٦٧)
ئەو مونافیق، موشکی دانا سەر بەدەن     ڕووحی دانا ئەو، لەنێو ئەشغاڵی گەن (٢٦٨)
ئەو بەزاهیر نێوی خوای برد،گیانی وی     بۆگەنیوی فکری بێ ئیمانی وی (٢٦٩)
فکری دووڕوو، وەک گیای نێو مەزبەلە     سەر مەبال، جێگای گوڵانە،ئەو چەلە (٢٧٠)
عاریەت بوو گیا لەجێی وا بێ گومان     مەجلیسی دۆستانەیە، جێگای گوڵان (٢٧١)
تەیبیات دێن بێ گومان بۆ تەیبین     دێن خەبیسات بۆخەبیسین ئەی ئەمین (٢٧٢)
لابەکینە،چونکەگومڕاهان،بەکین     قەبری وان،لای قەبری کین داران،یەقین (٢٧٣)
ئەسڵی کینە دووزەخە، جا، کینی تۆ     جوزئی ئەو کوللەو،عەدوو بۆ دینی تۆ (٢٧٤)
تۆ کەجوزئی دووزەخی،بت بێت هۆش     چونکەکول د ەگرێت جوزئی خۆی لەکۆش (٢٧٥)
تاڵ بەتاڵان بێ گومان مولحەق دەبێ     چۆن قسەی باتڵ قەرینی حەق دەبێ؟ (٢٧٦)
غەیری فیکرو بیر، نی، تۆ، ئەی برا     مابەقی، هەر، ئێسک و ڕەگ بوو، پێت درا (٢٧٧)
گەر کوبیری تۆ گوڵە، تۆش گوڵشەنی     گەر دروو بێ، تۆ دەبێ بۆسووتەنی (٢٧٨)
گەرگوڵاو بی، تۆش لەسینەو سەردەدەن     گەرکو میزبی، تۆ لەجێی پیس،دەردەدەن (٢٧٩)
چاو لەعەتتار ئەو دەسو ندووق دا، چڵۆن     دایدەنا لای یێک، ئەوەی باشەو بەبۆن (٢٨٠)

ئەو لەلای یێک، جینسی وەک یێک، دا دەنێ    جـوا ن دەبـێ سـوندوق، لەئـەووەڵ تـا بنـێ (٢٨١)

شەکرو عوود تێکەڵ دەگەڵ یێک بن ئەگەر    ئـەو دەکـا لێکیـان جـودا، بـێ دەردەسـەر (٢٨٢)

هەرکە سوندووقچان شکان گشت گیان ڕژان    پـاک و پیس تێکـەڵ بـەیێک بوون، ئەو زمان (٢٨٣)

خوابـــەڕێی کـــردن کیتـــاب و ئـــەنبیا    تـــا جـــودا کـــەن، ئـــەتقیا وو ئەشـــقیا (٢٨٤)

پـێش ئـەوەی خـۆ، ئوممـەتی واحیـدەبووین    خـۆ، لەحەیسـی پـاک و پـیس، نادیـدەبووین (٢٨٥)

زێـــڕی بـــاش وغەش،لـــەدونیا بـــوو، ڕەوان    چون هەموو جێ شەو بوو، ئێمەش شەو ڕەوان (٢٨٦)

تـــاکو ڕۆژی ئـــەنبیا، هـــات لـــەو شـــەوە    بـانگی کـرد سـافی وەرە،غـەش دەرکـەوە (٢٨٧)

فـەرقی ڕەنگـان چـاو دەزانـێ ئـەی فـلان    لـەعل و بـەردان چـاو، دەناسـێ بـێ گومـان (٢٨٨)

گەو هـەرو خاشـاک، دەکـا چـاو، لێک جیـا    بۆیـەخاشـاک کەوتـەناو چـاو، ئـەی کییـا (٢٨٩)

دوژمنـــــی ڕۆژن، دەغـــــەڵکارانی خـــــاو    عیشـقی ڕۆژی بـوو، بـەڵام زێـڕی تـەواو (٢٩٠)

چونکـــــەڕۆژ ئاوێنـــــە، بۆتـــــەعریفی وی    تـــــــابیبینێتن شەریف،تەشـــــــریفی وی (٢٩١)

قیامـەتی نـاو بـرد، بـەڕۆژ خـوای کردگـار    چـون دەڕۆژدا، زەردو سـوور، دەکـرێن دیـار (٢٩٢)

ڕۆژ،ســـیڕی ئـــەولییای ئـــەو خوایەیـــە    ڕۆژ لەحاسـتی مـانگی وان، وەک سـایەیە (٢٩٣)

ڕۆژ نیشـــانەی نـــووری پنهـــانی وەلـــی    وەسـفی سـەتتا رییـەتی، شـەو کـرد جـەلی (٢٩٤)

بۆیەفـــەرمووی ئـــەو خودایـــە(والضـــحی)    والضـحی، بـوو نـووری قـەلبی موسـتەفا (٢٩٥)

یـا لەبۆیـەی کـوت خوداوەنـد(والضـحی)    چـون نیشـانێک بـوو، لـەنووری موسـتەفا (٢٩٦)

ئـەی، دەنـا فـانی لەبۆسـوێن، کـوا دەبـێ؟    چـۆن فـەنا،لایق بەسـوێندی خـوا دەبـێ؟ (٢٩٧)

(لااحـــب الافلـــین) ی کـــوت خـــەلیل    چۆن فەنای ویست، ئەو خودا وەندی جەلیل (٢٩٨)

وەسفی سـەتتا رییـەتی، سوێن بوو،بەشـەو    یانەجیسـمی جـوانی خـاکی، زاتـی ئـەو (٢٩٩)

ڕۆژی ئەحمـەد هەرکـەڕوونی کـرد فەلـەک    وای بەجیسـمی شـەو دەکـوت ماودعـک) (٣٠٠)

چـون بـەدائیم وەسـڵی زاتـی خـوا دەبـوو    بـۆ عیبـارەت (مـاقلی) لـەو چـا دەبـوو (٣٠١)

چـون عیبـارەت خـۆی نیشـانەی حاڵەتـە    حـاڵ بەچەشـنی دەس، عیبـارەت ئالەتـە (٣٠٢)

پینـەچی زەڕگـەر وەسـیلەی وێ بـدات    وەک بچێنـێ تـۆو لەعـەردی شـۆرەکات (٣٠٣)

وەک وەسـیلەی پینـەچی، لای بـەرزی گـەر    یا لـەپێش سـەگ کـاو، ئێسـک پێشی کـەر (٣٠٤)

چـاو (انـاالحق)هـات لەمەنسـوور،نوور بـوو    چـاو (انااللـە) هـات لەفیرعـەون،زوور بـوو (٣٠٥)

چـاو عەسـای نێـو دەسـتی مووسـا،بووگەواە    ئـەو عەسـای نێـو دەسـتی ساحیر بـوو تـەباە (٣٠٦)

بۆبەعیسـا گـوێی نەدایـە، هـیچ بـەیار    پێـی نـەکو ت ئـەو ئیسـمی پـاکی کردگـار (٣٠٧)

نەقسی عیللەت بوو لەلای نادانی کەر — بەر،لەگڵ دەی کوانێ ئاوُر دیتەدەر؟ (٣٠٨)
دەست و ئەبزار چەشنی بەردو ئاسنە — جووت دەبێ، بێ، جووت کەشەرتی هاتنە (٣٠٩)
بێ شەریک وبێ وەسیلەهەریەکە — خۆ دەئەعداد شەک دەبێ ئەو بێ شەکە (٣١٠)
گەر دەڵێن دوو، یانەسێ، یازێدەیە — عاقیبەت وەک یێک دەڵێن یەک، گوێ دەیە (٣١١)
گەرکوخێلی لابچێ،یەکسان دەبن — یەک پەرەست و باش و پاک، ئینسان دەبن (٣١٢)
تۆ کەیەک گۆی، وا لەنێو مەیدانی وی — تۆ بسۆڕی چۆنی ویست،گۆچانی وی (٣١٣)
گۆیی گۆچان،ئەو دەمەی،بوو دوور، لەنەقس — گەربەزەربی دەستی شا،ئەو بێتەڕەقس (٣١٤)
ئەو قسانەگوێ دەیە، ئەی خێلی خاو — تۆ لەڕێی گوێ، چاک دەوا کە، نەقسی چاو (٣١٥)
چون کەلامی باش، لەقەلبی تارو ڕەش — دیتەدەر دەڕوا، لەبۆلای، نووری گەش (٣١٦)
مەکری شەیتان،جێی لەنێو دڵ، پێدرا — کەوشی کەج بۆلاقی کەج، دیاری کرا (٣١٧)
گەر،بەتیکرار، حیکمەتت تۆ بێتەدەس — بێ دەوامە،گەر نەبی تۆ، ئەهل وکەس (٣١٨)
گەربەنووسین حیفزی حیکمەت کەی ئەتۆ — یا بەلاف بێلەی لەبۆ دۆستانی خۆ (٣١٩)
ڕوو لەتۆ ئەو وەردەگێڕێ،ئەی شەڕووڕ — لەت دەکا زەنجیرو دەڕوا، زێدەدوور (٣٢٠)
تۆ کەنەخوێنی، بەڵام بت وێت، عیلم — دیتەلای تۆ سەربەخۆ عیلم زۆر بەحیلم (٣٢١)
بێ دەوامە، ئەو لەلای هەر ناکەسێ — وەک لەگوندێک دا، لەماڵێک، تاووسێ (٣٢٢)

بازێکی تیژباڵ کەحەمایەت کراوی شا،بوو ڕۆژێک لەکاخی شایانەهەڵات وچوو بۆماڵی پیرەژنێک،کەمەشغووڵی ئارد دابێژتن بوو، ئەو بازە جوانەی گرت و لەڕووی دڵسۆزی بێ مەورید و نامەعقووڵ شاباڵ و نینۆکی ئەو بازەی بڕین، لەلایەکی دیکەشەوە، شا زۆر نیگەرانی ئەو بازەی خۆی بوو،وبۆهەمووجێگایەک دەچوو بەڵکەبتوانێ پەیدایکاتەوەولەدرەنگ وەخت دا یانی کاتی ڕۆژ ئاوا بوون، گەیشتەماڵی پیرەژن، وبازەکەی خۆی بەحاڵێکی زۆر ڕیققەت باروناخۆش پەیدا کرد، شا، دڵی بەحاڵی ئەو بازەسووتا، وبەئاخ و داخەوەپێیکوت.. ئەوەجەزای تۆ کەلەکاخی شایا نەهەڵاتی و بۆماڵێکی چووکەو موحەققەرپەنات هینا.

نەک وەکوو بازێک لەلای شای کرد فیرار — لای ژنێکی پیری ئاردابێژ بەغار (٣٢٣)
بۆ مناڵان دەیهەویست چاکا غەزا — بازی جوان و باش نیژادی، دی،لەلا (٣٢٤)
پێی دەبەست و باڵەکەی کۆتا دەکرد — دەیبڕی نینۆک و قووتی،کا، دەکرد (٣٢٥)
پێیدەکوت.. تۆ بووی دەدەستی ناکەسان — باڵ و نینۆکت درێژ بوونە، وەسان (٣٢٦)

دەستی نـا ئـەهلا ن ئـەتۆ بیمـار دەکـا     بێـــرەلای دایکت،کـــەتۆ تیمـــار دەکـــا (٣٢٧)

خۆشەویستی وایــەلای، شەخسـی نـەفام     خـــۆ نـــەفام دەڕوا،لـــەڕێگا کـــەج،مودام (٣٢٨)

بۆ گەڕان، شا، عومری ڕۆژێک چوو هەدەر     مـــاڵی ئـــەو پیـــرێ ژنـــەی جا،گرتەبـــەر (٣٢٩)

دی لــەناکاو،باز لــەنێو تــۆز،زۆر غــەمین     شـا، لـەبۆ وی جـا دەگێـڕا گەرمەشـین[1] (٣٣٠)

پێیدەکوت هەرچەند ئەوەت،بۆ بوو جەزا     چونکەنـەت بوو،تـۆ لـەبۆمن هـیچ وەفـا (٣٣١)

چۆن‌بەهەشتت،هێشت،لەدووزەخ‌بووت‌قەرار؟     غـــافڵی (لایســـتوی اصـــحاب نـــار) (٣٣٢)

ئەوهەیەپاداشی هەرکـەس شا ی خـەبیر     جـێ بهێڵــێ، بچتــەماڵی یــەک فــەقیر (٣٣٣)

بـاز پـەڕو بـاڵی دەدا، بـن دەستی شـاه     بێ زبـان دەیکـوت کـەمن کـردم گونـاه (٣٣٤)

غــەیری پاکــان گەرنــەبا بۆتــۆ پــەناه     ڕوو لـەکێ کا،غـەیری تـۆ، ساحەب گوناه (٣٣٥)

لـوتفی شـا، گیـان بـۆ جینایـەت، ڕادەنێ     جا لەجێی وی هەرچی باش بێ، دا دەنێ[2] (٣٣٦)

بـەد مەکـە، تـۆ چونکـەکاری چـاکی مـە     ناحـــەزەلای یـــاری جـــوان و پـــاکی مـــە (٣٣٧)

وا دەزانـــی خزمـــەتت کـــرد زۆر،ئـــەتۆ     بوویــە، پەرچەمــداری زوڵــم وزۆر، ئـەتۆ (٣٣٨)

چونکـەزیکری خـوا، لـەبۆت دەسـتوور بـوو     تـۆ دڵـت بـەو زیکـرە، زۆر مـەغروور بـوو (٣٣٩)

تـۆ ڕەفیقـی گفتـو گـۆی خـۆت دی،خـوودا     بەوگومانە، بوون لەحـەق زۆر،کەس جودا (٣٤٠)

گــەر دەگــەڵ شا،دابنیشــی ســەرزەوی     خـۆ ت بناسـە،با ئـەدەب بـە، لای ئـەوی (٣٤١)

دەیکوت ئەی شا،من پەشیمان بوو مەوە     تۆبە،تۆبـــە،من موســـەڵمان بوومـــەوە (٣٤٢)

گەرکەسێکی مەست وقودرەتمەند،کـەی     لێـی قـەبووڵ کە،گەرکوکـەج کا،ڕێگەکـەی (٣٤٣)

بانـــەبێ نینۆک،ئەگـــەر تـــۆم بی،بـــەیار     پەرچـەمی ڕۆژ، لادەبـەم، دەیکـەم بـەتار (٣٤٤)

بـا نـەبێ باڵ،دەستی تـۆم گـەر بێ لەسـەر     چەرخی گەردوون نا یـەڵم، هـەیبێ ئەسەر (٣٤٥)

گـەر بـەمن قـووەت بـدەی،کێو ڕا، دەکـەم     گـەر قەڵـەم دەی، لەشکران ئیمحا دەکـەم (٣٤٦)

من لەپێشکە،کەم کـەنیم، ئـەی بـا جـەماڵ     مـوڵکی نـەمروودی دەکـەم وێـران بـەباڵ (٣٤٧)

وەک ئـەبابیل بـا زەعیـف بـم، ناتـەوان     دوژمنیشـــم فیلـــی ســـەنگین و گـــران (٣٤٨)

من کە یێک سججیل باوێم ئەی شەفیق     کاری وی چاتر، لەچەن سـەت، مەنجـەنیق (٣٤٩)

چاو لەمووسا،بووی دەشەڕ دا، یەک عەسا     دوژمنـی وی، بەنـدی ژینـی بـەو، پسـا[3] (٣٥٠)

---

[1] - شا،لەبۆ وی جا ،دەگێڕا،شین ،چ شین (مصرع دوم)

[2] - لوتفی شا،گیان بۆجینایەت دیل دەکا     چونکەشا، ناباش، بەباش تەبدیل دەکا

[3] - بەندی ژینی فیرعەوون، بەس بەو ،پسا (مصرع دوم)

هەر کەسێکی کۆمەکی تۆی هاتەدەست لەو جیهانەکەس ئەوی نادا، شکەست (٣٥١)
تیغی تیژی، نووح، لەحەق داوا،دەکرد کاری تیغی، مەوجی یەم، ئیجرا،دەکرد (٣٥٢)
ئەی موحەممەد گوێ مەدە،نەیرِوی، زەوی چاو لەمانگ کە، لەت کە، نێوچاوانی وی (٣٥٣)
تا بزانن سەعد و نەحسی بێ خەبەر دەور، دەوری تۆیە ئێستا، نەک قەمەر (٣٥٤)
دەوری تۆیەئێستە، چون مووسای کەلیم ئارەزووی بوو، بێ لەدەوری تۆ، موقیم (٣٥٥)
کاتێ مووسا، دەوری جوانی تۆی، دەدی جا،لەبۆی سوبحی تەجەللی بوو،وەدی (٣٥٦)
ئەو کوتی یارەب،چ دەورێ،گەو رەیە رەحمەتی چی؟ رِوئیەتە، ئەو دەورەیە (٣٥٧)
ئەی خودا مووسات، لەنێو دەریا، دەدی دابنێ تا،دێت،دەوری ئەحمەدی (٣٥٨)
وای بەمووسا کوت خدای داناو نیهان بۆیەرِێگای ویم، بەتۆدا، من،نیشان (٣٥٩)
تاکو لەو دەورە، بەدووربی، ئەی کەلیم رِا نەکێشی لاق، درێژەزۆ رگلیم (٣٦٠)
من بەبەندەم،نان دەدەم، بەخشەندەمە تا تەماع،گریان بکا،ئەوبەندەمە (٣٦١)
چاو لەدایێک،خۆی منال وشیار دەکا تا بەوی خۆراک بدا،ئەو کار، دەکا (٣٦٢)
زۆر،بەبرسی و بێ خەبەرنووست، ئەومنالْ شیری مەمکی، ژین لەدایکی کرد، بەتالْ (٣٦٣)
گەنجی رِەحمەت بووم و،مەخفی، پرِ لەسوود ئوممەتی مەهدیم ئەمن هینا وجوود (٣٦٤)
ئەو کەراماتان نشانی تۆدەدا تا تەماحت بێ دەوان دا،وەک گەدا (٣٦٥)
زۆربوتی ئەحمەد، دەدونیا دا، شکاند تا کو خەلْکی، ئەو، بەزاتی خوا، گەیاند (٣٦٦)
گەر نەبایەکۆششی ئەحمەد لەبۆت بوت‌پەرەست‌بووی،تۆش‌وەکووئەجدادی‌خۆت (٣٦٧)
ئەوسەرەی تۆی،دا لەسەجدەی بوت،نەجات تاعەیان بێ حەققی وی سەرجەم لەلات (٣٦٨)
گەرشوکرکەی چون لەبوت، تۆی دا نەجات ئەو بوتەی قەلبیش لەلای تۆلادەبات (٣٦٩)
چون لەسەجدەی بوت نەجات بوو ئەو سەرە تۆش بەقووەت ئەو بوتەی دلْ، لابەرە (٣٧٠)
شوکری دین تۆ بۆیەناکەی وەک چکەس چونکەئیرسی بابە، مفتت، هاتەدەس (٣٧١)
پیاوی میرات کوا دەزانێ قەدری مالْ؟ رِۆستەمیش چاو،مفتەکەو تە، دەستێ زالْ (٣٧٢)
گەربگرێنم بەجۆش، دێ رِەحمەتم دیتەدەس ئەو شەخسی گریا، نیعمەتم (٣٧٣)
من دەبەخشم بەو کەسەی داوا، بکا گەر نەبەخشم، غەیرەمومکین وا، بکا (٣٧٤)
رِەحمەتی من بۆئەوەی گریا بەزار چون بەگریان رِەحمەتی من دیتەخوار (٣٧٥)

**هەڵواکڕینی شێخ ئەحمەدی خزروویە(قدس اللەسرەالعزیز ) بۆتەڵەبکاران بەئیلهام لەحەق..**

**خولاسەی داستان...**

یەکێک لەمەشایخی تەریقەت (ئەحمەدخزروویە)کەبەجەوانمەردی ومەردانەگی مەعرووف بوو،بەعیللەتی کۆمەک بەفەقیران، زۆر دەست تەنگ بوو،بەڵام بەو حاڵەشەوە، لەدەوڵەمەندان قەرزی وەر دەگرت ودەیدا بەفەقیران،تا ئەودەمەکەشێخ وەختی مردنی هات،ساحەب قەرزان، بەپەلەهاتنەماڵی وی تا قەرزی خۆیان وەر بگرن. هەموویان زۆر بەتووڕەیی تەماشای ویان دەکرد، شێخ بەخۆی دەکوت ئەو بێچارانەچەندەنیسبەت بەلو تفی خودا بەدگومانن. وا دەزانن کەخودا ناتوانێ کەقەرزی. وان بداتەوە،لەو کاتەدا منداڵێکی هەڵوافرۆش کەلەقەراغ خانەقا، دەڕۆیشت بانگی بۆهەڵوا دەکرد.شێخ ئیشارەی کردەخادیم کەبڕۆهەموو هەڵوایەکەی لێبکڕەوبۆئێرەی بێنە.خادیم جێ بەجێ چوو هەموو هەڵوایەکەی کڕی.وهینایەخانەقا،شێخ بەساحەب قەرزەکانی کوت وەرن هەڵوا بخۆن .ئەوانیش هاتن هەموو هەموو لوایەکەیان خوارد تا زەرفی هەڵوا خاڵی بوو،پاش تەواو بوونی هەڵوا منداڵەکەقیمەتی هەڵوایەکەی لەشێخ داوا کرد.بەڵام شێخ کوتی ئەمن پووڵم نیە، وچەند ساعەتی دیکەدەمرم، منداڵەکە نارەحەت و دەستی کرد بەشین و گریان، و لەڕووی تووڕەیی و نارەحەتی زەرفی هەڵوای بەعەردی دا دا. ساحەب قرزەکان، لەو وەزعە، زۆر نارەحەت بوون وئیعترازیان لەشێخ گرت،بەڵام ئەو زۆر ڕاحەت و ئاسوودەبوو ودەت کوت کەهیچ مەسئەلەیەک دەکار دا نیە.وەختی نوێژی عەسر کەهات لەناکاو خادیم زەرفێکی هیناولەپێش شێخی دانا.شێخ دەستی بۆزەرفەکەبرد وپووڵێکی بەئەندازەی خۆی وتەڵەبی منداڵی هەڵوا فرۆش لەو زەرفەهەڵگرت ودای بەوان وکوتی ئەوەبەخششی خودایەبەخاتری گریانی ئەو منداڵە.جا،لەپاشان بەوەزع و حاڵێکی ئارام بەپێشوازی مردن چوو .

یەک نەفەرشێخ زۆرقەرزداربوو بەخەڵک ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ زۆرجەوانمەرد و بەدڵ بوو، زۆربەکەڵک ‏(٠٦)‏-
قەرزی وەرگرت زۆر لەپیاوی دەوڵەمەند ‌‌ خەرجی بێچارانی کرد ئەو دڵپەسەند ‏(٠٧)‏-
خانەقای چاکرد،بەوام، بۆ ئەسدیقا ‌‌ بۆ خودای،دا،گیان و ماڵ و خانەقا ‏(٠٨)‏-
وامی وی خو ا، بۆی لەهەرجێ،را دەنارد ‌‌ بۆ خەلیل،خوا خیزو خۆڵی کردەئارد ‏(٠٩)‏-
وای نەبی کوت، هەن لەنێو بازار دا ‌‌ دوو فریشتەوا دەکەن، دائیم دوعا ‏(١٠)‏-

ئەی خودایا هەرکەسێک بەخشەندەیە    بەو عیوەز دە، گەرخەسیس بوو، مەیدەیە (٣٨١)
خاسسەئەو کەس،کردی گیانی خۆی فیدا    ئەو گەرووی خۆی کردەقوربانی خودا (٣٨٢)
وەک سمایل دایدەنا، بۆ کارد سەر    لەو گەروویەهیچ، چەقوو ناکا، ئەسەر (٣٨٣)
جا، شەهیدان بۆیەزیندوون، جاویدان    تۆ وەکوو کافر، مەنۆڕە،قەت لەوان (٣٨٤)
خوا لەجێی ئەوگیانە،بەو دای گیانی دی    قەت غەم و ڕەنج و عەز ابی هیچ نەدی (٣٨٥)
زۆرساڵان قەرزی وەرگرت شێخی پیر    وەک وەکیل دەیدایەهەر کەس،با، فەقیر (٣٨٦)
تووی چاند ئەو، تاکو ڕۆژی مردنێ    تا لەکاتی مردنی،میری،دەنێ (٣٨٧)
عومری شێخی هەرکەگەییەئاخری    ئەو نیشانەی مردنی،دی،زاهری (٣٨٨)
وامدارن کۆ دەبوون لا ی شێخ، تەواو    شێخ وەکوو شەم،هەردەسووتا، بوو بەئاو (٣٨٩)
نا ئومێد بوون قەرز داران ئەودەمە    زۆر گران بوو باری وان، باری غەمە (٣٩٠)
شێخ بەخۆی کوت زۆر ئەوانەن، بەدگومان    خوا مەگەرنیتی بداتن قەرزی وان؟ (٣٩١)
یەک منالّ هەڵوافرۆش، غەو غای دەکرد[1]    تاکو بفرۆشیت هەڵوا، وای دەکرد (٣٩٢)
شێخ ئیشارەی کرد، لەخادیم ئەو دەمی    تۆ لەمنداڵ بکڕەهەڵوا، سەرجەمی (٣٩٣)
تابخۆن هەڵوا،تەڵەبکارانی من    با تەماشام کەن وەکوو یارانی من (٣٩٤)
هاتەدەر خادیم، لەماڵ بێ وەقفە، زوو    تا کو بکڕێ ئەو بەزێڕ،هەڵوا هەموو (٣٩٥)
پێیدەکوت،بۆکوللی هەڵوات چەن،دەمێ    دای جەواب زیاد بێ لەنیودینار،کەمێ (٣٩٦)
پێیدەکوت (نا) زۆرەبۆسۆفیان ئەوە    نیسفی دینار باشەتۆش هەردەس کەوە (٣٩٧)
زەرفی هەڵوای ئەو لەپێش شێخ دا دەنا    تۆش ببینەڕەمزو ڕازی (شەیخەنا) (٣٩٨)
شێخ بەوانی کوت وەرن ئەی باش هەواڵ    بۆ تەبەڕروک،جابخۆن هەڵوای حەلاڵ (٣٩٩)
هەرکە، زەرفی ئەو منالّە، بوو بەتاڵ    کردی داوای پووڵ، لەشێخی با کەماڵ (٤٠٠)
شێخ کوتی من نیمەتا وێت، دەم، درەم    وا قەرزدارم، دەڕۆم بۆ لای عەدەم (٤٠١)
زەرفی هەڵوا ی دا لەعەرزی ئەومناڵ    زۆر غەمین بوو کردی گریەو ناڵەناڵ (٤٠٢)
دەستی کردەشین و واوەیلا مناڵ    سەت بریبا پێم شکابا،سەر،بەتاڵ (٤٠٣)
سەت بریبا من لەلای نار، بایە، جێم    نەک لەبۆ ئەو خانەقا، هاتبایە، پێم (٤٠٤)

---

1- یەک منالّیش بانگی بۆ هەڵوای دەکرد (مصرع اول)

سۆفیانی زگ زلی، زۆر مفتەخۆر    بەدسیفەت، هەم وەک پشیلەن ڕووی شۆر (٤٠٥)
جا،لەشینی ئەو منالەباش و بەد    کۆ وەبوون،خەڵکی لە دەوری،زیاد لەحەد (٤٠۶)
هاتەپێش شێخ ڕادەوەستا چۆ، گڕی    تۆ دەزانی من کەوەستا م دەمکوژی (٤٠٧)
گەر بەدەس خاڵی بڕۆم بۆلای ئەوی    ئەو لەمن دەستێنی ژینی سەرزەوی (٤٠٨)
ئەو تەڵەبکارانی مونکیرهەر یەکەی    وای بەشێخ کوت بۆ لەمندال، وا دەکەی؟ (٤٠٩)
ماڵی ئێمەت خوارد،بێژەتاکو کەی؟    بۆ لەسەر ئەو زوڵمە، زوڵمی دیش دەکەی؟ (٤١٠)
تا کوعەسرێ،هەرگری منداڵ،زار    شێخ لەوی نەنواڕی تا ئەو دەم، چ جار (٤١١)
شێخی ئاسوودەلەئازارو خیلاف    سوورەتی مانگی دەبردە، بن لحاف (٤١٢)
ئەودەگەڵ خواخۆش،دەگەڵ مەرگ،شادکام    بێ خەیاڵ بووئەولەگفتی خاس و عام (٤١٣)
ئەوکەسەی ڕازی لەوی بێتن گییان    ئەو لەبەد ئەخلاق نابینێ زییان (٤١٤)
ئەو کەسەی گیان ماچ بکاتن چاوی وی    کوا فەلەک دەتوانی بێنێ ناوی وی؟ (٤١٥)
ئاسمانی ڕوون،کە،مانگی بێ لەسەر    کوا وەڕینی سەگ، دەبێ بۆ وی زەرەر؟ (٤١۶)
سەگ وەزیفەی خۆی دەکاتن،لوورەلوور    مانگ وەزیفەی خۆی دەکاتن پەخشی نوور (٤١٧)
کاری خۆی ئەنجام دەداتن هەرکەسێ    کوا دەکا لێڵ ئاوی ساف و جوان، خەسێ؟ (٤١٨)
خەس بەسەرئاو دا دەچێتن بێ عەزاب    ئاوی سافیش ڕێ دەچێ بێ ئێزتیراب (٤١٩)
مستەفا مانگ لەت دەکا نێوەی شەوێ    بوو لەهەب کینەی دەدڵ دا، نا سرەوێ (٤٢٠)
گیانی دا،عیسا بەمردوان چەند چەند    جوو،لەداخان مووی سمێڵی هەڵدەقەند (٤٢١)
کوابەگوێی مانگی دەگا قەت دەنگی سەگ؟    خاسسەئەومانگەی کەبێ لای خوا،بە،بەگ (٤٢٢)
شا، لەسەرجۆ، مەێ دەخواتن تا سەحەر    ساز لەدەنگی بۆق دەیکا بێ خەبەر (٤٢٣)
حەق دەگەییەئەومنالە، بەش ببا    هیممەتی شێخ خستیەزیندان ئەوسەخا (٤٢٤)
تا بەمنداڵ هیچ کەسێک هیچ شت نەدا    زیاد لەوەی قودرەت بەپیران دا خودا (٤٢٥)
وەختی عەسرێ هاتەژووری خادیمێک    جام لەسەردەس،ناردبووی ئەو،حاتەمێک (٤٢۶)
دەوڵەمەندێک بوو خەبەر دار ئەو لەپیر    نارد ی هەدیە، تاکو بۆی بێ، دەستگیر (٤٢٧)
لایەکی جام چوارسەت دینار بوو    نیسفی دینار نیو، وەرەق نادیار بوو (٤٢٨)
هات خادیم زۆری شێخ تەعزیم کرد    جامی دەستی خۆی بەوی تەسلیم کرد (٤٢٩)
هەرکەلای برد شێخ لەسەرجام پەردەکە    خەڵکی دیتیان لەو،کەرامەت یەک یەکە (٤٢٨)
ئاهو ناڵەی وان دەهات ئەوجارەزوو    ئەی ڕەئیسی شێخ و شاهان، ئەو، چبوو؟ (٤٣١)

بێژەبۆمـــــان ســــیرڕوڕازی وی چبــــوو؟ ئــەی ڕەئیســـی شــێخ و پاشـــایان،هەموو (٤٣٢)
تــۆ ببەخشــەئێمەزۆرمان کــرد خـــەتا عــادەتی گــەو ران، لەئــەووەڵ، بــوو، عــەتا (٤٣٣)
چەشنی کویران، ڕێ نموونمـان بـوو عەسا بـێ گومـان دەشکێن بـەوی، شووشـەو چـرا (٤٣٤)
وەک کـەڕان هێسـتاکەنەن بیسـتوەخیتاب چادەکـەین بێخـود، قیاسـان بـۆ جـەواب (٤٣٥)
کاری مووساش هیچ نەبوو بۆمان، بەپەند بـوو لـەڕەددی خزری،ئـەو ڕوو زەرد،چەنـد (٤٣٦)
گـەر کـو چـاوی کردبـا، مووسـا، لەسـەر ئاسمانی لـەت دەکـرد هـەر یـەک، نـەزەر (٤٣٧)
دوژمنی چاوت بـوو ئـەی مووسـای زەمـان چاوی مشکی ئاش ، کە بوو ئەو، هیچ نەزان (٤٣٨)
شێخ کوتی دیم زۆر عەزاب لێو ، جا ئەمن گـەردەن و ئـازا دەکـەم هـەروا ، ئـەمـن (٤٣٩)
بۆیەواهات چون لەحەق، مـن، دەم خوواست خـواش، نیشـانیدا بـە مـن ، ڕێگایی ڕاست (٤٤٠)
حـەق کـوتی ئـەو پووڵـە گـەرچی زۆر کەمـە دام ، لـە بـەر گریـانی منـداڵ ، ئـەو دەمـە (٤٤١)
تـا نـەگرێێت، تیفلــەکی، هــەڵوا فــرۆش بەحری ڕەحمەت ،زەحمەتە،گەر بێتە جۆش (٤٤٢)
ئـەی براگیــان تیفــل، یــانی چــاوی تـۆ هـەر بـە گریـان ، ویسـت دەبێتـە ڕاوی تـۆ (٤٤٣)
بـت هــەوێ گەرخەلعـەتی وات، وێ بـدەن بـا بگرێێـت، تیفلـی چـاوُت، سـەر بـەدەن (٤٤٤)

**شەخسێک زاهیدێکی ترساند کەکەم بگری،تاکوێر نەبی ..**

**خولاسەی داستان...**

زاهیدێک زۆر دەگریا،دۆستەکەی پێیکوت هێندەمەگری چونکەبۆ چاوت زەرەرە زاهید پێیکوت بەو چاوانەم یاخودا دەبینم یا نا بینم،ئەگەر جەماڵی خودا نەبینم، بۆ کوێر بوونی چاوانم غەم ناخۆم .

وای بەزاهیـد کـوت ڕەفیـق و، یـاری گیـان کـــەم بگرێی،چـــون دەبینێ،چـــاو زیـــان (٤٤٥)
جـــوابی داوە،غـــەیری دوو حاڵ،نینـــەحاڵ یـــادەبینێ چـــاو، یـــان، نـــا، ئـــەو جـــەماڵ (٤٤٦)
گـەر ببینـێ نـووری حـەق،چی بۆم،غەمـە؟ بـۆ ویسـالی حــەق، دووچـاو،خۆ زۆرکەمـە (٤٤٧)
چاو،کەنـەی دی حـەق، بڵـێ بـەو،تۆ بـڕۆ کـوێر ببــێ بــا، چــاوی وا، دوورکەلــەخۆ (٤٤٨)
تـۆ کەعیسـات لایـە، بـۆ چـاو غـەم مـەخۆ چەپ مـەڕۆ،چاو پێت دەدا ڕاس،سەر بـەخۆ (٤٤٩)
چونکەعیســا ی ڕووح دەگــەڵ تــۆ حــازرە لــەو تەڵــەب کەکۆمــەکت، بــاش ناســرە (٤٥٠)
کــاری جیســمی پــڕ لەئێســک،ئەی فــڵان دامــەنێ ســەر قــەلبی عیســا هــیچ زەمــان (٤٥١)
چەشـنی ئـەو نـادانی بـوو، نێـو داسـتان باســـی ویمـــان ئێمـــەکرد،بۆ ڕاســـتان (٤٥٢)

زینـدەگی جیسـمت لەعیسـا قـەت نـەوێ ویستی فیرعـەو نیت لەمووسا قـەت نـەوێ (٤٥٣
کـەم لەسـەر دڵ دابنـێ فکـری مـەعاش ژیـن خـودا دیـاری دەکـاتن نـەک تـەلاش (٤٥٤
خێوەتێکە،تـەن، خـودا دای ئـەو بـەڕووح[1] یـا وەکـوو کەشـتی کەتێیـدا بێـت نـووح (٤٥٥
تورکـەمان بێ،خێـوەتی ئـەو دێتـەدەس خۆشەویستی یـەک نەفـەربێ،بۆ وی بـەس (٤٥٦

## داستانی زیندوو بوونـەوەی ئێسکان بـە تـەواوی بەوەسیلەی دوعـای حـەزرەتی عیسـا (علیه‌السلام)..

نێوی خوای خوێند حەزرەتی عیسا لەسەر ئێسکی کۆن چون ویستبووی کابرای لەچەر (٤٥٧
حوکمی حەق پاش ویستنی کابرای نەفام سـووڕەتی ئێسـکانی، زینـدوو کـرد تـەمام (٤٥٨
شـێرەکی ڕەش هاتـەدەر، زوو، ناگـەهان هـەر بەپـەنجێک جێ بـەجێ کوشتی جـەوان (٤٥٩
لێیوەکرد سەر،مێشکی وی ڕشت شێری ڕەش مێشکی گوێزی پووک،لەمـەغزی نەیبوو بەش (٤٦٠
گەرکومـەغزی بـا و، شـکا بـا، ئـەودەمی بـۆ بـەدەن نەقسـە، لـەبۆ وی، هـیچ کـەمی (٤٦١
پێیدەکوت عیسا لـەبۆ زووت لـەت دەکرد جـوابی داوەچـون ئـەتۆی ئەزیـەت دەکـرد (٤٦٢
پێیدەکـوت عیسـا لـەبۆ خوێنت نـەخوارد؟ جـوابی دا ئـەو رزقـەخوا بـۆمی، نـەنارد (٤٦٣
زۆرکەسیش هەن چەشنی ئەو شێرەی ژیان نەیدەخوارد نێچیری خۆی جێی هێشت جیهان (٤٦٤
حیرسـی وی کێو،قێسـمەتی وی،کەم،لـەکا دەوڵەمەنـدە، خـوا لـەلای خـۆی دوور دەکـا (٤٦٥
کـاری دونیـات سـادەکرد،بۆن ئـەی خـودا تـۆ نـەجاتمان دە، لـەکاری نـاڕەوا (٤٦٦
دیتەبـەرچاو لوقمـە، ئـەمما داوە، ئـەو تـۆ نیشـانمان دە، چلـۆ ن دات نـاوە، ئـەو (٤٦٧
شێر کوتی مـن گـەر ئـەوەم کـردوە، شکار نـەک لەبـەر خواردن،فەقـەت بـۆ ئیعتیبـار (٤٦٨
گـەر کـوڕۆزیم بـا، لـەنێو دنیـا، ئـەمن بـۆ لـەنێو مـردوان دەبـووم ئێسـتا، ئـەمن (٤٦٩
وا جـەزای وەی،ئـاوی سـافی کەوتەدەسـت میزدەجۆ،کـا،وەک کەروحـەیوانی پەسـت (٤٧٠
گـەر بزانـێ قیمـەتی ئـەو ئـاوە، کـەر خۆلـەجێی لاق، دا دەنـێ، دەو جۆگـە، سـەر (٤٧١
ئـەو وەدەس دێنـێ، وەهـا پێغەمبـەرێک میـری ئـاوی زینـدەگانی پـەروەرێک (٤٧٢

[1]- تەن وەکوو خێوەت ،خودا ،دای ،ئەو بەڕووح (مصرع اول)

چۆن دەبێ نەمری و، نەڵێ ئەو پیاوی خاو؟    گیانی تازەم، پێ بدە، ئەی میری ئاو (۴۷۳)
لەو سەگی زیندوویی نەفست دوور کەوە    زۆرلەمێژەدوژمنی گیانت ئەوە (۴۷۴)
خاک بەسەر ئەو ئێسکانەی،کەئەوان    مانعی سەگ بوون بکاتن ڕاوی گیان (۴۷۵)
سەگ کەنی،بۆعاشقی ئێسکانی تۆ    چەشنی زێرو، خوێن مژی حەیوانی تۆ (۴۷۶)
خۆ نەچاوە،چاو کەبینایی نییە    وەختی ئەزموون،غەیری ریسوایی نییە (۴۷۷)
وا دەبێ،دەبێ خەتا،زەنن و گومان    کوا گومانەکوێر لەڕێ دێ، بێ وچان؟ (۴۷۸)
چاوە، تۆ شیوەن دەکەی، بۆ ئیدەدی    بۆ لەبۆ خۆت شیوەنێ ناکەی، ئەدی؟ (۴۷۹)
گەرهەور، گریا، دەبێ گیا، سەوزو شین    ڕوونترەشەم، گەر بکا گریان و شین (۴۸۰)
ڕووکەجێ یەک، شین و گریانەلەوێ    چونکەتۆ لایقتری شینت، بوێ[1] (۴۸۱)
بۆ فیراقی بێ دەوامە، شینی وان    بێ خەبەر، لەو لەعلی جاویدانی،کان (۴۸۲)
چون لەسەر دڵ، نەقشی تەقلید، سەد، دەبێ    تۆ بەئاوی چاو،وەلابەسەد، لەجێ (۴۸۳)
چونکەتەقلید کردی چاکە، سەرنەوی    کا، بەتەقلید، گەرچی وەک کێو بێ، قەوی (۴۸۴)
کوێر، کەتووڕەو، زۆر قەڵەو بێ،وەک چییە؟    پارچەگۆشتێکە،کەهیچ چاوی نییە (۴۸۵)
گەربڵێ گوفتار لەموو باریکتر    قەلبی وی بۆ سیڕ، لەقیڕ تاریکتر (۴۸۶)
مەستە،مەستی گفتی خۆیتی ئەو،بەڵام    زۆر بەدوورە،ئەو لەمەی،ئەی خۆش مەرام (۴۸۷)
چەشنی جۆیە، ئاوی خۆی ناخوات، جۆ    ئا و بەڕێبواران دەدا جۆ، نەک بەخۆ (۴۸۸)
ئاو دەجۆگە، بۆیەناگریێتن قەرار    چونکەجۆ،ئاو ناخووات، ئەی هووشیار (۴۸۹)
چەشنی نەی ئەو شیوەن و زاری دەکا    بۆ فریوە، نەک لەبەر باری، دەکا (۴۹۰)
گەر بەسۆز دەیڵێ موقەللید، چەن حەدیس    بۆ تەماعەوادەکاتن، ئەو خەبیس (۴۹۱)
زۆربەسۆز دەیڵێ حەدیسی سۆزناک    کوا ئەدی سۆزی دڵ و دەرمانی پاک؟ (۴۹۲)
بوون موحەقیق گەڵ موقەللید، لێک جودا    ئەووەڵی داوودە، دووەم بوو، سەدا (۴۹۳)
سۆزی دڵ بوو مەنبەعی گوفتاری وەی    ئەی موقەللید قەولی خەڵکی، تۆدەڵەی (۴۹۴)
گوێ مەدەبەو گفتی تێکەڵ زاریە    گا، دەبابار، ناڵەناڵ ئی گاریە (۴۹۵)
جا موقەللید هەیتی پاداش و سەواب    شین بگێڕیش هەیتی موزد، ڕۆژی حیساب (۴۹۶)
کافرو موئمین دەڵێن هەردوو،خودا    خۆبەڵام فەڕقیان گەلێکەو لێک جودا (۴۹۷)

---

۱- ڕووکەجێ یەک، گەر دەگرێین، زاهیری    چون بەگریان، تۆ گەلێک ،لایقتری

بانــگ دەکــا ســواڵکەر، لــەبۆنان کردگــار     هــەر بــەدڵ خــوا ی بانــگ دەکا،پــەرهیزکار (٤٩٨
گـــەرکوزانیبای گەدا،ئـــەو گفتـــی خـــۆی     زیــادو کــەم نەیبوو،بــەها، ئــەودەم لــەبۆی (٤٩٩
زۆرلــەمێژەخوای لــەبۆ نــان بانــگ دەکــا     وەک کــەرێکی هــەلگرێ قورئــان، بــەکا (٥٠٠
گفتــی لێــوی گــەرکو دا بــای نــووری دڵ     جیسمی وی ورور، دەبــو هــەر چەشنی گــڵ (٥٠١
نێــوی شــەیتان دێ دەجــادوو دا، بــەکار     دەتهــەوێ کــەم،تۆ لــەنێوی کردگــار؟[1] (٥٠٢

**خوراندنی کابرایەک لە تاریکی شەودا، شێرێک،کەپێی وابوو گایەکەی،ویە..**

**خولاسەی داستان...**

کابرا یەکی دێهاتی گایەکەی خۆی لەتەویلەلەسەر ئاخورِ بەستەوە، شەو کەدا هات شێرێک هاتە تەویلە و گایەکەی کوشت ولەجێی وی لێی نوست ئەو کابرای دێهاتی بێ خەبەرلەهەموو شتێک،هەرلەو شەوەدا، هات کەسەر لەگایەکی بدا. وەک عادەتی هەمیشەی خۆی دەستی بەسەرپشتی شێرەکە، دا، دەهینا بەو خەیاڵەکەئەوەگایەکەی خۆیەتی. شێریش بەزبانی حاڵ بەخۆی دەکوت..ئەگەر تاریکایی شەو نەبا وئەمنی دیبا بێ گومان لەترسان گیانی دەدا .

چۆ تەویلە،گای دەخوارد شێر، زێدەچوست     پاشخواردن هەر لەجێی خۆی لێی دەنوست (٥٠٣
ســاحەبی گــا، چــۆ تەویلـــە،لایی گــا     ئـــەو بەشـــەو دەویســـت،گا پەیـــدا بکـــا (٥٠٤
دایــدەنا دەســتی لەســەر ئــەعزایی شــێر     جــار لەپشــت و جــار لــەژوورو،جار لــەژێر (٥٠٥
شــێر کــوتی گــەر ئێستە، ڕووناک بــا،وڵات     جــێ بــەجێ گیــانی لەترســان دەر دەهــات (٥٠٦
وا کـــەدەخورێنێ ئـــەمن،کابرای دیهـــات     چــون شــەوە،پێی وایــەگای ویــم، وا دەکــات (٥٠٧
حەق دەڵێ ئەی کوێری مــەغروور ، ڕووکە ڕوو     کێــوی تــوور لــەت بــوو بــەنێووم،وا نــەبوو؟ (٥٠٨
گـــەر کوقورئانمـــان لـــەبۆکێو ناردبـــا     لەت دەبوو ئەو جا دەرِۆی هەرچەشنی با (٥٠٩
گــەر لــەمن کێــوی ئوحــود بێ،باخەبــەر     زۆر لــەکانی خــوێن لــەوی ڕا، دێنــەدەر (٥١٠
تــۆ لــەدایک و بــاب، نێومــت، بیســتووە     بۆیـــــــــەتۆغافڵ،منت وا، ویســــــــــتووە (٥١١
گــەر بــەبێ تەقلیــد ئــا گــا بــی لــەڕاز     لا مــەکان بــۆت، جــێ و مــەکانی، دڵخــوواز (٥١٢
گــوێ دەیــە، بــەو داســتانەی بــۆت دەڵــەم     تـــا بنووســـێ ئافـــەتی تەقلیـــد، قەڵـــەم (٥١٣

---

[1]- نێوی شەیتان ساحرێک چاو، چا دەکا     کێ لەنێوی حەق کەمی داوا دەکا؟

**فرۆشتنی سۆفیان کەری سۆفی موسافیر بۆ خۆشی وشایی ..**

**خولاسەی داستان...**

یەکێک لەسۆفیان لەڕێگایەکی دوورڕا هاتەخانەقایەک، فەورەن کەرەکەی بردەتەو.یلەولەسەر ئاخورێ بەستیەوە،وکەمێکی ئاوو گیا بۆدانا، وبۆخۆشی چوو بۆلای سۆفیەکانی دیکە. سۆفیەکان کەبرسی و فەقیر بوون تەسمیمیان گرت کەکەرەکەی وی بفرۆشن وبەقیمەتی وی مەجلیسێک تەشکیل بدەن وتێر بخۆن . کەر فرۆشا و مەجلیس ئامادەبوو غەزا خورا شادی و هەڵپەڕکەدەس پێکرا، لەشیددەتی هەڵپەڕکەو ڕەقس و سەماو سەماعی سۆفیان تەپو تۆز هەمووجێ یەکی داگرتبوو..سۆفی موسافیریش کەلەهەموو شت بێ خەبەر بوو . لەو هەموو شادی و خۆشیەسەری سوڕ مابوو. بەچەپڵەو هەڵپەڕین چوو بۆنێو شایی سۆفیان.لەپاشان شایی کەمکەم،کەنیزیک بوو تەواو بێ یەکێک لەسۆفیان بەئاهەنگێکی دڵنشین دەیخوێندەوەکە..(خربرفت وخربرفت وخربرفت ) یانی کەرڕۆیشت کەرڕ ۆیشت.وسۆفیەکانی دی لێکرا ئەو جوملەیان دووپات دەکردەوەسۆفی موسافیرکەلەهەمووشت بێ خەبەربوو دەگەڵ ئەوان ئەو شیعرەی بەشەوق و شووروهەیەجانێکی زۆرزیاتر، بەگیان و دڵ دووپات دەکردەوە.. عاقیبەت مەجلیس بەئاخر گەیشت وشەو تەواوبوو، وبوو بەڕۆژ، سۆفیەکان ماڵ ئاوایان لێک کرد وڕێی خۆیان گرتەبەر.سۆفی موسافیر بۆئیدامەی سەفەرچۆ تەویلەتا وەسایل وبارو بنەی لەسەر پشتی کەرەکەدابنێ و وەڕێ کەوێ .بەڵام زۆری تەعەججوب کرد کەکەرەکەی دەتەویلەدا نەدی، لەبەر ساویلکەیی وخۆش خەیاڵی بەخۆی کوت..حەتمەن خادیمی خانەقا ئەو بەستەزمانەی بردوەکەئا وی بدا کاتێک کەخادیم هات وسۆفیش موتەوەججیەبوو کەخەبەرێک لەکەر نیەبەنیگەرانی پێیکوت.. ئەدی کەرەکەکوا؟خادیم چاوێکی لێکرد. وەک چاو لێکردنی عاقڵ لەنەفام و پێیکوت .کێهەکەر؟ سۆفی کوتی هەرئەوکەرەی کەدوێنێ شەوێ بەتۆم ئەسپارد خادیم سوێندی خوارد و کوتی بەخودا دوینێ شەوێ ئەمن لەو مەوزووعەئاگاداربووم وچەند جاریش لەنێو مەجلیس دا، هاتم وئەو مەوزووعەم بەگوێی تۆکوت. بەڵام ئەتۆ ئەوەندەلەشادی وخۆشی وسەماو سەماع دەورت گرتبوو کەلەهەمووسۆفیانی حازر لەمەجلیس بەئیحساستر ئەو ئاهەنگەت دوو پات دەکردەوە(خربرفت و خربرفت و خربرفت) ئەتۆ کەغەفڵەتت کردو گوێت نەدامێ ئەمن، چ گوناهێکم هەیە؟ وەختێک کەسۆفی ئەو

بەسەرهاتەی بیست لەزەرەرو زیانی تەقلید، تێگەیشت وبەداخ و حەسرەت دەیکوت ( ای دو سەد لعنت برین تقلید باد) یانی ئەی دوو سەت جار لەعنەت لەو تەقلیدە.

هات لەبۆ یەک خانەقا سۆفیەک لەدوور زوو کەری خۆی بۆتەویلە، بردەژوور (٥١٤
هەر بەدەستی خۆی بەوی دا ئاووگیا نەک وەکووسۆفی کەباسی ڕا برا (٥١٥
ئیحتیاتی کرد، نەکا، تا ئیشتیبا گەرقەزا هات، ئیحتیات خۆ، لا دەبا (٥١٦
سۆفیان هیچیان نەبوومالْ، زۆر فەقیر (کاد فقر یحتوی کفرا مبیر) (٥١٧
گەر کەسێکت دی فەقیری خستیەبەند تۆ نەکەی بەو پێکەنی، ئەی دەوڵەمەند (٥١٨
سۆفیان چون بێ نەوا بوون و، نەدار بۆ هەموویان کەر فرۆشتن، بوو،بەکار (٥١٩
گەر نیازت بێ، دەبێ، مندار موباح زۆر فەسادیش هەن، بەناچار بوون سەڵاح (٥٢٠
پاش ئەوەی سۆفیان فرۆشتیان ئەو کەرە هات غەزا، شەم هەڵکرابوون، یەک سەرە (٥٢١
سۆفیان کردیانەغەوغاو هەمهەمە وەختەئێستەبۆ غەزا هەم، زەمزەمە (٥٢٢
بۆگەدایی تاکوکەی کەشکۆڵ بەدەس سەبرو ڕۆژووی ڕۆژی تەشریق بەسسە،بەس (٥٢٣
هەروەکووخەڵکینەئێمەش گیاندار دەوڵەتن میوانە، ئەو،شەو،بوو بەیار (٥٢٤
بۆیەسۆفیان تووی باتڵیان دەچاند چونلەلای وان غەیری‌گیان،گیان خۆی‌نوواند (٥٢٥
چونکەسۆفی خەستەبوو، هاتبوو لەدوور دی لەسۆفیان لوتفی زۆر، ئەمما، چ جوور (٥٢٦
یەکیەکەی سۆفیان لەوی قەدریان دەنا سۆفیان زۆریان بەوی کرد ئیعتینا (٥٢٧
ئەوکوتی، چون لوتفی وانی دی نەکەم گەر نەکەم من ئێستەشادی کەی دەکەم (٥٢٨
پاش غەزا خواردن سەماع، دەس پێکرا خانەقا پڕ بوو، لەتۆز، وُن بوو چرا (٥٢٩
تۆزی ڕەقس و هەڵپەڕین، غەوغای دەکرد شەوق و زەوقی سۆفیان بوو، وای دەکرد (٥٣٠
جار بەچەپڵەلاق بەعەردیان، دا دەدا جار بە، ڕوویان،تۆزی عەردیان، ڕا دەدا (٥٣١
زۆر درەنگ سۆفی دەگاتە، ئارەزوو بۆیەدەخوا زۆر،کەنا خوا، زوو بەزوو (٥٣٢
غەیری سۆفیەک تێری خوارد ئەو،نووری حەق خۆی بەدوورکرد ئەولەنەنگی مستەحەق (٥٣٣
کەم لەسۆفیان هەن کەوا، وارەستەنە غەیری وانیش موحتەرەم بەو دەستەنە (٥٣٤
گەر سەماع هات و لەلا ی ئا خر کەووت موتریب ئاهەنگێکی غەمگینی دەووت (٥٣٥
دەستی پێکرد..کەر کەرۆی و، کەر کەرۆی وەک ئەو ی سۆفیانی دی کوتیان لەبۆی (٥٣٦
زۆربەگەرمی هەڵپەڕین،تا بۆ سەحەر چەپڵەلێدا ن،کەرکەرۆی و، ڕۆیی کەر (٥٣٧
هەرلەڕووی تەقلید ئەو سۆفی غەمین کەر کەرۆی دەس پێدەکرد زۆر زۆر حەزین (٥٣٨

گەر تەواو بوو عەیش و نۆش و ئەو سەماع     ڕۆژ هەڵات و گشتی کوتیان (الوداع) (۵۳۹)
خانەقا چۆل بوو، دەما سۆفی تەنێ     دەیهەویست بڕواتەچۆل و،بەندەنێ (۵۴۰)
ئەو لەحوجرە، بارەکەی هینایەدەر     تاکو بیبا دای بنێتەپشتی کەر (۵۴۱)
تا بگاتەدۆستان توندتوند دەچوو     چوو تەماشای ئاخوڕی کرد، کەر نەبوو (۵۴۲)
ئەو کوتی بردوویەخادیم تاکو بەو     ئاو بدا، چون کەم بەویم ئاو داوەشەو (۵۴۳)
هات خادیم سۆفی پێیکوت کوانێ کەر؟     جوابی دا خادیم کەوس بە، ئەی بەشەر (۵۴۴)
پێیدەکوت من،کەر بەتۆم ئەسپاردووە     من لەبۆ کەر،تۆم، مووەززەف ناردووە (۵۴۵)
پێیدەکوت باسم دەگەڵ کە، مەنتیقی     چیم بەتۆ ئەسپارد، نەی دەی، ناحەقی (۵۴۶)
چیم بەتۆ ئەسپارد، ئەڵئان وێم دەوە     چیم وەتۆدابوو،ئەمانەت پێم دەوە (۵۴۷)
دەس،کەوەربگرێ شتێ،وای کوت نەبێ     ئەو دەبێ بیداتەوەدەس ساحەبێ (۵۴۸)
گەرکو ڕازیش نیی ئەتۆ ئێستا،بەوە     با بڕۆین بۆماڵی قازی پێکەوە (۵۴۹)
جوابی داوە. بووم دەدەستی سۆفیان     حەملەیان هیناو، هەمبوو ترسی گیان (۵۵۰)
بۆ پشیلان دا بنێ دڵ، یەک نەفەر     بۆدڵی وا کوا دەبێ باس و خەبەر؟[1] (۵۵۱)
بێ، لەنێو سەت برسیان یەک دانەنان     وەک پشیلێک کز، لەنێوان سەت سەگان (۵۵۲)
پێیدەکوت فەرزەن بەزوڵمیان لێت ستاند     خوێنی بەستەزمانی وەک منیان ڕژاند (۵۵۳)
بۆ نەهاتی نەت دەکوت پێم، تۆ ئەوا؟     گەر کەری تۆ، وا دەبەن ئەی بێ نەوا (۵۵۴)
تا ئەوەی بردوویە،کەر دابایەوە     یانەپووڵیان سۆفی دابا پێکەوە (۵۵۵)
لێرەبان سۆفی ئەگەر، چارەی دەهات     ئێستەچیبکەم؟ هەریەکەی چۆ، یەک وڵات (۵۵۶)
کێ ئەمن بگرم لەبۆقازی بەرم؟     ئەو بەڵایەهەر ئەتۆ هینات سەرم (۵۵۷)
بۆ نەهاتی پێم بڵەی تۆ، ئەی غەریب     هاتەپێشت زوڵمەکی وا، زۆر عەجیب (۵۵۸)
جوابی دا، وەڵڵا هێ، هاتم زۆرجار     تاکو لەو کارەت بکەم من هووشیار (۵۵۹)
ئەو دەمە، دەت کوت کەکەر،ڕۆی ئەی جەوان     زۆر دەیان کوت، تۆش بەئیحساسترلەوان (۵۶۰)
لەو وُتانەم واز دێنا چونکەمن     وام دەزانی تۆدەزانی کار، لەبن (۵۶۱)
سۆفی دەێکوت چونکەخوێندیان زێدەخۆش     بۆیەئەمنیش هەروەکوو وان هاتمەجۆش (۵۶۲)
من بەتەقلیدم لەوان،وام هات بەسەر     سەت هەزار لەعنەت بێ لەو تەقلیدەهەر (۵۶۳)
خاسسە، تەقلیدێک لەوان بێ حاسیلان     چەشنی کینەی،بووی خەلیل بۆ ئافیلان (۵۶۴)

---

[1]- بۆ پشیلان جەرگی دانێی تۆ ئەگەر     کوا لەجەرگی وا دەبێ باس و خەبەر؟

عەکسی زەوقی ئەو گرووهەدای لەمن ... بۆیە قەلبم هاتەجۆش وا، وای لەمن (۴۵)
ڕووح لەعەکسی یاری باش نەی کەی بەری ... تا لەدەریا، بێ وەسیلە، ئاو بەری (۴۶)
ئینعیکاس،تەقلیدە، ئەوەڵ جارکە هات ... بوو بە،تەحقیق گەر کو ئەوزۆرهاتەلات (۴۷)
تا نەبۆ تەحقیق لەیاران لا مەدە ... تا نەبۆ دوڕ،قەترە، ئەسداف ڕا مەدە (۴۸)
بت هەوێ گەرچاوی عەقڵ و گوێی ساف ... نەت هەوێ تۆ حرسی ئەو دونیای گەزاف (۴۹)
چونکەسۆفی کردی تەقلیدی تەماع ... عەقلی وی چوو،بۆیەهەربیستی سەماع (۵۰)
ئەو تەماعەی وی، لەخۆراک و سەماع ... نەی دەهێشت تا عەقڵ هەیبێ ئیتتیلاع (۵۱)
گەر تەماعێک با، دەنێو ئا وێنەدا ... ئەو لەدوو ڕوویی دەبا، وەک ئێمەبا (۵۲)
گەرتەماعی با، تەرازوو هیچ بەماڵ ... چۆن بەڕاس دەیکوت لەبۆما ن وەسفی حاڵ (۵۳)
ئەنبیا دایان، بەقەو می خۆ، وەلام ... من لەئێوەنامەو ێ موزدی پەیام (۵۴)
ڕەهنەمام من، مشتەری ئێوەش خودا ... خوا دەلالی دا بەمن، ئیهەر دوو، لا (۵۵)
موزدی کاری من چیە؟ دیداری یار ... گەر چی دەی بەخشی ئەبوو بەکر،چل هەزار (۵۶)
موزدی من زۆر لەو چلەی زیاتر، دەدەن ... کوا شەبیهە، بۆ شەبەە، دوڕی عەدەن؟ (۵۷)
داستانێک بۆت دەڵێم ئەی هووشمەند ... چۆن تەماع دەگرێت گوێ، دەیخاتەبەند (۵۸)
هەرکەسێ هەیبێ تەماع، ئەو لاڵ دەبێ ... چاوی دڵ،کوا ڕوون بەمولک و ماڵ دەبێ؟ (۵۹)
فکری موڵک وماڵ وزێڕو جاەو ناو ... وایەوەک وەی، مووی کەتێدا بێت چاو (۶۰)
غەیری ئەومەستەی لەحەق پاراو بێ ... قەت ئەسیری گەنج نەبێ و، خاراو بێ (۶۱)
هەرکە سێک زانی کەخوای لێدیارەئەو ... ئەو جیهانەگشتی پێ مندارەئەو (۶۲)
چونکەئەو سۆفی لەمەستی بوو بەدوور ... پێشی چاوی گرت تەماع، نەی دی، چ نوور (۶۳)
بۆتەمەعکار، سەت حیکایەت کەی بەیان ... نوکتەیێکیش ناچێتەگوێی وی، بێ گومان (۶۴)

## ناساندنی کابرای موفلیس بەخەڵکی، تەوەسسوتی جارچیانی قازی..

### خولاسەی داستان...

یەک نەفەر موفلیس وبێ نەواو،زۆر خۆر کەوتەزیندان، هەرغەزایەک کەلەبۆ زیندان دەهات لێنەدەگەڕا کەدەستی هیچ یەک لەزیندانیانی پێ بگات فەورەن دەیخوارد. زیندانیان لەدەستی وی زۆ ر دەعەزاب دا بوون، وهیچ ئومێدەکیشیان نەبوو کەلەدەستی وی ڕاحەتبن . چونکەئەو بەحەبسی ئەبەد مەحکووم ببوو،عاقیبەت چارەیەکیان دیتەوەکەدەگەڵ نومایەندەی قازی تەماس

بگرن،وشکایەتیان لەلای نومایەندەی قازی لەو کابرا موفلیسەکرد، یا ئەو کابرا موفلیسەلەزیندان بەریتەدەر،یا موقەرڕەری بۆ دیاری بکا، نومایەندەی قازی ئەوشکایەتانەی هەموو بەقازی کوت، بەفەرمانی قازی کابرای موفلیس حازرکرا، قازی پێیکوت لەئەلئان ڕا ئەتۆ ئازادی هەرئەلئا ن هەستەلەزیندان بڕۆدەر بۆماڵی خۆت .کابرای موفلیس بەبیستنی ئەو مزگێنیەخۆشحاڵ کەنەبوو هیچ،بەڵکەم دەستی کرد بەپاڕا نەوە، وەدەیکوت ..ئەی جەنابی قازی ئەو زیندانەبۆمن وەک بەهەشت وایە.. کویێ لێرەچاترەکەئەمن بچمەوێ؟ئاخر ئەمن هیچم نیە، چلۆن لێرەبڕۆم؟ وئەمن یەک نەفەر فەقیروبێ جێ وناتوانم کەخۆم ئیدارەبکەم، جا، کەوابێ ئەمن ئەلێرەبمێنمەوەچاترە،قازی لەپاش تەحقیق و لێکۆڵینەوەتێگەیشت کەبەڕاستی فەقیرو بێ جێ یە،جا لەبەر ئەوەفەرمانی دا کەئەو کابرا موفلیسەسواری وڵاغێک بکەن ولەشاردا بیگێڕن وجارچیان بەهەموو خەڵکی شاری ڕا بگەیێنن کەهیچ کەس هیچ شتێک بەقەرز، نەدا بەوکابرا موفلیسەعاقیبەت مەسئوولی ئیجرای ئەوحوکمە،وشتری یەک نەفەر کوردی دار فرۆش بەزۆر لێی وەرگرت وئەو کابرا موفلیسەی لەسەردانا، وجارچیانیش هاواریان دەکرد کەخەڵکینەهیچ شتێک مەدەنەبەو کابرا موفلیسە، پاش چەند ساعەتان ئیجرای حوکم تەواوبوو عاقیبەت کابرای موفلیسیان لەوشتر پیادەکرد،ساحەبی وشتر کەکورد بوو، بەو کابرا موفلیسەی کوت..لەسبەینێوەئەتۆ سواری ئەو حەیوانەبووی،ئێستا ئەمن لەموقابیل دا پووڵی جۆم نا وێ، لانی کەم پووڵی(کا) بدە،کابرای موفلیس پێیکوت بەڕاستی ئینسانێکی نەفامی،هەتا ئەلئان نەت زانیوەئەمنیان بۆ لەشاردا گێڕاوە؟ ئاخر ئەو هەموو هات هوتو داد و فەریادەبۆیەبوو کەبڵێن ئەمن موفلیسم و(المفلس فی امان الله) پووڵی چی و کای چی؟

یەک نەفەر موفلیس هەبوو، بێ خان ومان — مـا، لـەنێو زینـدان و بەنـدی بـێ ئـەمان (٥٨٥)
دەی خـووارد ئـەو نـانی زینـدانیان گـەزاف — ئـەو دەقـەلبی بەنـدیيان وەک کێـوی قـاف (٥٨٦)
کـەس نـەبوو جورئـەت بکـا بخـوات نـان — دەی فڕاند لەو، نان بەچوستی، ئەو زەمان (٥٨٧)
هەرکەسـێکی دوور لـەڕەحمی خـوا ببـێ — چاوگەدایـە، گـەرچی ئـەو هـەر شـا ببـێ (٥٨٨)
ئـەو لەسـەفحەی زیـن دەبوو،مـەردی کـرێن — بـۆ جەهەننـەم بەنـد، لەبەرئـەو نـان فـرێن (٥٨٩)
گـەر هـەڵێی تـۆ، بۆئومێـدی ڕاحـەتێک — دێتەپێشـی تـۆ، لـەلای تر،ئـافـەتێک (٥٩٠)
هـیچ کـونج، بـێ عـەقرەب و بـێ مـار نییـە — بـەس لەخەڵوەتگـەی خـودا، ئـازار نییـە[1] (٥٩١)

---

[1]- خەڵوەتی حەق ،هیچ لەوێ ئازار نییە. (مصرع دوم)

تـــۆ بزانـــەکونجی زینـــدانی جیهـــان  قـەت دەوێ دا،غـەیری غـەم نـابێ نیهـان (۴۲
گـەر کـونی مشـکت پـەناگا، دەس کـەوێ  پێـــی پشـــیلەئاخری هەردێتـــەوێ (۴۳
ئـــادەمی توانـــا دەبـــێ هـــەبێ خـــەیاڵ  ئـەو خەیاڵـەش گـەربێ سـاحەب جـەماڵ (۴۴
پـیس و ناحـەز بـن خـەیاڵاتیش ئەگـەر  بـەو دەسووتێ،چەشـنی مێـو ئـاگر لەسـەر (۴۵
گـــەر لـــەنێوان عـــەقرەب و مـــاران،خودا  ئەوخـەیا لـەی جـوان و خۆشـە،پێت بـدا (۴۶
مـــارو عەقرەب،ئەودەمـــە، بۆت،مونیســـە  چـون خـەیاڵت کیمیـای هـەرچی، مسـە (۴۷
سەبری شیرین چادەبێ، خۆش بێ خـەیاڵ  چـون خـەیالاٚت جـوان دەکـاتن پێس حـاڵ (۴۸
چونکەشـــادی دێ لـــەئیمانی قـــەوی  نـــا ئومێدەسســـت ئیمـــان، ســـەرنەوی (۴۹
سەبرەســەرئیمان، لــەبۆ وی تــاجی ســەر  دوورلەســەبران،بوون لـەئیمان بـێ خەبـەر (۵۰
وای دەکـــوت ئەحمـــەد کەئیماندارنییـــە  ئـەو کەسـەی سـەبری دەدڵ دا دیـار نییـە (۵۱
یـەک بـەچاوی تـۆ، دەبێ بـەد، چەشنی مار  ئـەو بـەچاوی شەخسـەکی دی، بـوو بـەیار (۵۲
چـــون خـــەیاڵت وایـــەتۆ، ئـــەو کـــافرە  دۆســت ئـەوی پـێ موئمینـە،پێی چـاترە (۵۳
هەردووحاڵـەت لـەو کەسە، چـاک دینەچاو  جـــار دەبێتەماســـی دەریـــا، جـــار داو (۵۴
نیســفی مـوئمین، نیوەکـەی دی،گەبرەئـەو  نیســفی حیرســە،نیوەکەی دی ســەبرەئەو (۵۵
خـــوا کوتویەقیســـمەتێکیان موئمینـــە  قیســـمەتێکیان کـــافرە،پێو دوژمنـــە (۵۶
چەشنی گایـەک لای چەپـەی وی،رەش رەشـە  لایەکـەی دی زۆرسـپی وەک مانـگ گەشـە (۵۷
نایێ هەوێ هیچ کەس ببینێ لایی رەشـەش  تـــالیبن عالـــەم ببیـــنن، لایـــی گـــەش (۵۸
لای برا،یوســـوف وەکووحـــەیوانی پەســـت  چاوی یـەعقووب ئـەو دەبینێ حۆری،مەست (۵۹
هەرخـــەیالی بـــەد بـــوو ئـــەو بـــەد بینـــرا  چـاوی ئەسـڵیان ون دەکـرد گشـتیان بـرا (۶۰
چـــاوی بـــاتین چـــاوی زاهیـــر، ســـێبەری  پـــــەیرەوە، بۆچـــــاوی بـــــاتین،زاهیری (۶۱
تـۆ مەکانی،ئەسـڵی تـۆش، جێـی لا مـەکان  بگرەئەودووکانە،وەیکـــــە،هۆو دوکـــــان (۶۲
غار مەدە، بۆ شـەش جیهات، چونکەجیهات  شـەش دەرە، گیـرا وە،ئێسـتا، مـات مـات (۶۳

**شکایەت کردنی زیندانیان لەلای نومایەندەی قازی لەدەست ئەو موفلیسە..**

لای وەکیلـی قـازی هـاتن ئـەهلی بەنـد  بۆشکایەت، چـون گـەلێک بـوو ن دەردمەنـد (۶۴
تۆســـــەلامی ئێمـــــەبۆقازی بـــــەرە  بێژەئازارمـــــان لەدەســـــتی ئەوکـــــەرە (۶۵
ئـــەو لەزینـــدا ن نشـــتەجێ بـــە،تا ئەبـــەد  پەسـت و بێکـار، زێـدە خـۆرە، زیـاد لەحـەد (۶۶

جەشنی مێش حازر دەبێ سەرھەر تەعام بێ ئەوەی دەعوەت کرێ، بێژێ سەلام (٦١٧)
عیجەلای وی خۆ، غەزایی شەست کەس کەڕ دەکا خۆی،گەرکەسێک بێژێت،بەس (٦١٨)
کەس لەزیندان نا خواتن لوقمەیێک گەر بەسەت فێڵ ھاتەدەستێک توعمەیێک (٦١٩)
دیتەپێش فەو ڕەن،ھەمان دووزەخ گەروو بەو دەلیلە،خوا ووتوویەپێن (کلوا) (٦٢٠)
د د ئەدەس ئەو قاتییەی، بۆن ھاتەخوار سێبەری قازین لەسەر بێ پایەدار (٦٢١)
یا دەزیندان دا، نەمێنێ،بچتەدەر یا نەدیاری کەلەبۆوی موستەمەر (٦٢٢)
ئەی بەتۆشاد، ھەم زکوورو ھەم ئیناس ئەی لەبۆمان،بەس ئەتۆ بووی موستەغاس (٦٢٣)
ھەتەلای قازی وەکیلی با ئەمەک ئەو بەقازی کوت شکایەت، یەک، بە، یەک (٦٢٤)
نگی کرد قازی، لەزیندان، ئەو نەفەر زوو، لەگەوران، کردی تەحقیق، لەو خەبەر (٦٢٥)
ھەرچی کوتبوویان لەبۆقازی، ھەموو بێ کەم و کەسری لەبۆی، سابیت دەبوو (٦٢٦)
قازی پێیکوت ئێستەئازادی، بڕۆ ڕێکەوەبۆماڵی ئیرسی بابی خۆ (٦٢٧)
حوابی دا من،جێم فەقەت ئیحسانی تۆ چەشنی کافر جەننەتم زیندانی تۆ (٦٢٨)
گەر لەزیندان تۆ دەرم کەی، سەروەرم من دەبێ وەک گیا، لەبرسان ھەڵوەرم (٦٢٩)
ھەروەکوو ئیبلیس کەدەیکوت ئەی خودا مۆڵەتم دە، تۆ ھەتا ڕۆ ژی جەزا (٦٣٠)
جونکەخۆشحاڵم لەزیندانی جیھان تا بکووژم،من منالی دوژ منان (٦٣١)
ھەرکەسێکی قووتی ئیمانی ھەبێ یا لەبۆڕێ، تۆشەیی نانی ھەبێ (٦٣٢)
ن لەدەستی وی بەفێڵان دێتمەدەر تا پەشیمان بێ،بکاتن خاک وەسەر (٦٣٣)
ر ئەوان تەھدید بەفەقری زۆر، دەکەم جارئەسیری خاڵ و زولفی بۆر، دەکەم (٦٣٤)
کەم لەنێو زیندانی وا، ئیمان ھەیە بۆ ئەوەی ئیمان ھەیە، شەیتان ھەیە (٦٣٥)
جێی لەنوێژو چێی لەڕۆژوو، بێتەدەست یەک کەڕەت دەیبا ھەموو، شەیتانی پەست (٦٣٦)
ن لەبەرشەیتان بانگی خوا دەکەم تاکو ئیمانم ئەمین بێ،وا دەکەم (٦٣٧)
یەک سەگەئەمما ھەزاران جێ، دەچێ بچتەھەرکەس ھەرئەوە، ئەک وێ دەچێ (٦٣٨)
ئەو کەسەی کە،تۆ لەتاعەت سار دەکا مەرکەزی شەیتانەئەو، ئینکار دەکا (٦٣٩)
گەر نەبووکەس دیت شەیتا ن نێو خەیاڵ تا خەیاڵ بت کا، لەنێو بەد دا شەلاڵ (٦٤٠)
حەرخەیاڵی گەردیش و جار جار دوکان جار خەیاڵی عیلم و،جار جار خان و مان (٦٤١)
تۆ نەبی غافل لەلا حەولان، چ کات بێژەلاحەو لێک،لەگیان و دڵ دەھات (٦٤٢)
قازی پێیکوت موفلیسیت سابیت بکە جوابی دا،بەندی گەواھن، یەک یەکە (٦٤٣)

پێیدەکوت ناکەم بەوان من ئیعتیماد    چون لەدەستی تۆ دەکەن هاوار و داد (۶۴۴)

تا لەدەستی تۆ، نەجاتیان بێ ئەوان    شاهیدی ناحەق دەدەن بۆت، بێ گومان (۶۴۵)

گشتی کوتیان حازرانی مەحکەمە    شاهیدی ئیفلاس و فەقری وین، ئەمە (۶۴۶)

حاڵی وی قازی لەهەرکەس ویستبا    پێی دەکوترا، موفلیسە، بڕوات، با (۶۴۷)

قازی دەیکوت ئەو بسووڕێنن لەشار    جاڕ بدەن کە، موفلیسەو زۆر نا بەکار (۶۴۸)

کۆ بەکۆ،جاڕ دەن، بکەن هەرباسی وی    ئاشکرا کەن بۆعمووم ئیفلاسی وی (۶۴۹)

کەس بەقەرزو،وا م نەدا بەو،هیچ شتێ    کەس نەدا قەرزی بەوی،تۆزێ،پتێ (۶۵۰)

فێڵ لەهەرکەس کات و،بێتەمەحکەمە    هیچ زیندان نادەمە، بەو، ئەودەمە (۶۵۱)

سابێتەلای من،کە، ئەوموفلیس بووە    پووڵ نەما، ماڵیش لەدەستی وی چووە (۶۵۲)

ئەو جیهانەحەبس و بەندی ئادەمی    بوو بەموفلیس، دێتەدەر لەو، ئەو دەمی (۶۵۳)

موفلیسی ئیبلیسی، خوا ئاشکا رکرد    زۆر دەقورئان باسی وی هاوارکرد (۶۵۴)

موفلیسە، هەم حیلەگەر،هەم بەد وتار    هاو نشینی وی نەکا هیچ کەس، چ جار (۶۵۵)

گەر لەگەڵ وی هەمنشین بی، هەم وتار    موفلیسەبێ سوودە،بۆتۆ، هەم نەیار (۶۵۶)

وەرگرا، بۆموفلیسی دڵ پڕ پەرۆش    وشتری کوردێک، فەقیری، دارفرۆش (۶۵۷)

کوردی بێچارەگەلێکی دا دکرد    جاڕچیشی ئەو بەوەعدە، شاد کرد (۶۵۸)

وشتری ویان برد، لەچێشتان، تا شەوێ    وا نەبووسوودی لەدا دی، دەس کەوێ (۶۵۹)

سواری وشتریان دەکرد ئەو هیچ نەدار    ساحەبی وشتر بەدووی وی دا،بەغار (۶۶۰)

کۆبەکۆیان ئەو لەشار گێڕا،بەغار    تا بناسن،یەک بەیەک،ئەو، خەڵکی شار (۶۶۱)

گەربەلای حەممام و بازاڕ، ڕادەبرد    خەڵکی چاویان،چاک لەشکڵی وی دەکرد (۶۶۲)

جا، دەجاڕ چی پێکەوەجاڕیان دەدا    کوردوڕۆمی، تورک و عارەب،یەک سەدا (۶۶۳)

کەس نەکا،قەرزی بداتەبەو کەسە    بێ نەوایە، وەرشکەستە،موفلیسە (۶۶۴)

هیچ شتێکی ئەو لەدونیا، دا نییە    لەوجیهانە، فێڵەبازی، وا نییە (۶۶۵)

ئاوی سافی دۆستایی لێڵ دەکا    ئەو لەهەرکەس هەڵکەوێ بۆی، فێڵ دەکا (۶۶۶)

گەر لەداد گا،پێم بڵێن چی کردووە    من کەزیندان،نادەمە، بەومردووە (۶۶۷)

خۆش دەمە،زۆر خۆر، موسیبەت پێ براو    نوێ لیباسی ژێر، لیباس ڕوو، دڕاو (۶۶۸)

گەر بەفێڵان بێ، لەبەر کا، ئەوکراس    وا دەکا تاکوفریو دا،گشت ناس (۶۶۹)

گەر وتاری حیکمەتی کوت، ناحەکیم    زینەتێکەعارییەت لای، ئەی سەلیم (۶۷۰)

ـەر دەبـەر کا،دز،لیباسـێک جـوان تـەواو — کـوانێ دەگرێ،دەسـتی تـۆ دەسـتێک بـڕاو؟ (۶۷۱)

ـەو کـەداهات ئـەو لەوشـتر هاتـەخوار — کوردەپێیکـوت شـەو درەنگە،زێـدەتار (۶۷۲)

ـتری مـن سـوار دەبـووی لـەو، تـۆ دەمـێ — جـۆم وەلانا،خـەرجی کـا،کوا؟ هەرکـەمێ (۶۷۳)

حـوابی داوەتاکوئـەلئان، چـین دەکـرد؟ — پـێم بلـێ چـی هـات عـەقلی تـۆی دەبـرد؟ (۶۷۴)

ـەپلی ئیفلاسـم گەیشتەئاسـمان — چـۆن دەبـێ نـەت بیسـتبی تـۆ، ئـەی فـلان (۶۷۵)

ـیچ دەگـوێی تـۆ دانییـەئیللا تـەماع — کـوێر دەکـات و،کـەڕ دەکـا، بـەخوا، تـەماع (۶۷۶)

ـڕۆ بەردیش جاڕی جاڕ چیانیان دەبیست — موفلیسەئەوشەخسـە، نـا مـەردی دەویسـت (۶۷۷)

ـکوشـەو وایـان دەکوت،کـوردی فـەقیر — نەی دەبیست چون بۆتەماع ئەو بوو ئەسیر (۶۷۸)

ـدراوەچاوو گوێ،مـۆری خـودا — پشـتی پـەردە، زۆرەسوورەت،زۆرسـەدا (۶۷۹)

ـی گـەیێنێتن بـەچاو،خوای بـێ هـەواڵ — عیشـوەبێ، یاشـۆخو شـەنگی، یاکـەماڵ (۶۸۰)

ـی گـەینێتن بـەگوێ، ئـەو خـوای موتـاع — وەجـدو حـاڵ بێ،یـا بەشـارەت،یا سـەماع (۶۸۱)

ـەو جیهانـەپڕ عیلاجـەو،پڕدەوا — ئـەو دەمـە،دەت بێ،کـەبت داتـێ خـودا (۶۸۲)

ـەر چـی تـۆ ئێسـتاکە، نـابینی ئـەوان — گـەر نیبـازت بێ،دەکـا حـەق،بۆت عـەیان (۶۸۳)

ـێ پەیەمبـەرکوت ..بەئێمە،کـە،خووا — بـۆ هـەموو دەردێـک چـاکی کـرد دەوا (۶۸۴)

ـعیلاجـت نادیـار، دەرمـانی وی — تـا زەمانێـک دێ لـەبۆت، فـەرمانی وی (۶۸۵)

ـبنـێ چـاو، چـارەخواز، لای لا مـەکان — چەشنی چاوی مردوو،چۆن بەدوا ی گییان (۶۸۶)

ـەرکـەزی چـابوونی دونیـا، لا مـەکان — چونکـەبێ جێگایـە، بـۆ جـێ، بـۆ جیهـان (۶۸۷)

ـالبی گـەر، بـەو خودایـەی، لـەو سـەرە — حـەق تەڵـەب کە،ئـەو وجـوودەت، لا بـەرە (۶۸۸)

ـەس وجـوودی مەعنـەوی بـۆت دێ،بەکار — ئـەو وجـوودەی زاهیـری لادەکـەنار (۶۸۹)

ـارخانـەی سـەنعەتی خوایـە، فـەنا — بـۆ ئـەوەی خـاریج لەوە،قیمەت،کـەنا (۶۹۰)

ـیـر کەئێمـە، زۆر وتـەی جـوان و دەقیـق — ڕەحمی تۆ تا زیا د بێ بۆمان ئەی ڕەفیق (۶۹۱)

ـەم ئیجابـەت هـەم دووعا، هـەر دوولـەتۆن — ئیمـەنی و ترسـیش لەتۆنـە، نـەک بـەخۆن (۶۹۲)

ـۆ لـەبۆن ئیسـلاح بکەقـەولی خـەتان — موسـلیحی تۆ،ئـەی ئـەتۆ پاشـای وُتـان (۶۹۳)

ـۆ بـەکیمیات، بـت هـەو ێ،تەبدیل دەکەی — بت هەوێ گەر،جۆگەخوێنیش، نیل دەکەی (۶۹۴)

ـاری وا جـوان و زەریـف، هـەرکاری تـۆن — دیارەئیکسـیر ی وەهـاش، ئەسـرارِی تـۆن (۶۹۵)

ـووخاکـت تـۆ دەگـەڵ یێـک لێـک دەدا — ئـا ووخـاک، تـۆ نەقشـی ئـادەم پێـت دەدا (۶۹۶)

ـیسبەتت دان، تۆ دەگەڵ یێک، خاڵ و عەم — گەل هەزارا ن فکری شادی و فکری غەم (۶۹۷)

زۆرکەست ئازاد دەکرد ئەی خوای غەفوور    فکری شادیو غەم لەویت کرد زۆر،بەدوور    ٦٩٨)
لا دەبەی،لــەو دۆســتایی قــەم و کــەس    گوڵ لەلای وی ناحەزە، وەک خارو خەس    ٦٩٩)
عالــەمی حــیس ڕەد،دەکــات و،لادەنــێ    عالــەمی مــەعنا لــەجێی وی، دا دەنــێ    ٧٠٠)
عیشــقی وی پەیــدا و مەعشــووق نادیــار    یــار لەمــەعنا، ئیبتــیلا بــەو ئاشــکار    ٧٠١)
عیشــقی زاهیر،عیشــقی مــەعنا،بێ گومــان    بــا بــەزاهیر،بێت عیشــقی ڕووی جــووان    ٧٠٢)
سوورەتێک مەعشووق بێتن، هیچ زەمان    لــەو جیهانەدانیــە، هــەم لــەو جیهــان    ٧٠٣)
گەر کو عاشق بووی بەسوورەت،ئەی لەبۆ    ڕووح کەدەرچوو نات هەوێ ئەو دەم ئەتۆ؟    ٧٠٤)
سابیتەســوورەت ئــەدی بۆنــات هــەوێ؟    بت هەوێ مەعشووقی ڕاستیت دەس کەوێ    ٧٠٥)
گەر بەمەحسووس عاشقی و شایق بەوی    هەر چی حیسسی بێ، دەبێ عاشق بەوی    ٧٠٦)
چون وەفا، ئەو عیشقەزۆر زۆر زیاد،دەکا    کوا وەفا سوورەت غەمین یا شاد دەکا؟    ٧٠٧)
کەوتەســەردیوار، نــووری تــاوی گــەش    عاریــەت بــوو نــوور لەســەر دیــواری ڕەش    ٧٠٨)
بــۆ دەبــێ مەعشــووقی تــۆبێ، ســندەگڵ؟    بــت هــەوێ مەعشــووقی ئەسڵی،تۆ بــەدڵ    ٧٠٩)
ئەی ئەوەی کردت بەعەقڵی خۆت ناز    خۆت بەزیاتر گرت لەوەی سوورەت خوواز    ٧١٠)
تیشکی عەقڵەکەو تە، سەرئەو حیسسی تۆ    عاریەت بوو زێڕ لەسەر ئەو مسسی تۆ    ٧١١)
هەر وەکوو زەڕکووبە، جوانی لای بەشەر    بۆیەمەعشووق پیس دەبێ وەک پیرەکەر    ٧١٢)
وەک فریشــــتەجوان دەبوو،ئێســـــتاکەنا    عاریــەت بــوو جــوانی لای وی هــیچ نــەما    ٧١٣)
لــێن دەســێنێ خــوا، جــووانی کەمکەمــە    نــەو نــەمامان وشــک، ئــەکاتن، دەمدەمــە    ٧١٤)
(تــــــۆ (نعمرەننکســــــــە) بڵــــــێ    بــت هــەوێ دڵ، جا لەبــەر ئێسکان هــەڵێ    ٧١٥)
چــــون جــــەماڵی دڵ جــــەماڵی باقییــــە    ئــەو لــەئاوی ژیــن دوولێــوی ســاقییە    ٧١٦)
ئــاوو ســاقی و مەســتەدڵ، هەرســێکیان    بێ غرووربی،هەرسێ، یێکن نەک جیان    ٧١٧)
وەحــدەتت قــەت بــۆ بــەیان ناکا قیا س    بەندەگی کە، قەت مەڵێ تۆزیددی راس    ٧١٨)
ســوو ڕەتــە، ئــەمما لــەلات مەعنایەئــەو    شاد دەکا سوورەت بەڵام وەک بایەئەو    ٧١٩)
مــەعنی یــەعنی هــیچ نــەمێنی (مــن)لــەبۆت    ســوورەت و مــەعنی وەلابــە،تۆ لــەخۆت    ٧٢٠)
مــەعنی نــابێ کوێرو کــەڕ کــا، تــۆ چکــات    ئەوهەمــەعنی، تــۆ لەســوورەت، دا، نــەجات    ٧٢١)
سەهمی کوێر دڵ، هەرغەم و ڕەنج و عەنا    ســەهمی چــاوی دڵ ئــەدی؟ گــەنجی فــەنا    ٧٢٢)
حــەرفی قورئــان مەعدەنــە، بــۆ کــوێر دڵان    عاشــقی گــوڵ نــین ئــەوان، لــەفزی گــوڵان    ٧٢٣)
تۆبــەدووی گــوڵ دا بڕۆگــەر هــەت بــێ چــاو    لەفزی گوڵ بێ سوودەبۆت ئەی شەخسی خاو    ٧٢٤)

گوڵ کەبێ لەفزیش دەبێ بۆی، بێ گومان    گیان کەبێ بێشک دەبێ نان بۆ گیان (۷۲۵)
لەفزی قورئا ن بۆ تیجارەت بەو دەکەی؟    مەعنی قورئان بۆ جەسارەت بەو دەکەی (۷۲۶)
بگرەمەعنا، زووکەئەلفاز لا بەرە    کاری ئەحمەد وایە، بۆ.مان را بەرە (۷۲۷)
ئەو لە مەرکووبێکی بێ‌زین سوار دەبوو    بۆ سەفەر کوترا، بەپێ ڕێبوار دەبوو (۷۲۸)
تۆکەری نەفست، بەگوڵمیخ بیخەبەند    چەندەهەڵدێ ئەو لەکارو بار، چەند (۷۲۹)
ئەودەباتن باری سەبری چۆنی ویست    جا،لەسەت ساڵ یالەسی دا،یالەبیست (۷۳۰)
کەس گوناهی کەس بەئەستۆ ناگرێ    غەیری چانراو هیچ، بەهیچکەس نادرێ (۷۳۱)
غەیری ئەو گوفتارەفکری خاو وخام    دوور دەکا لێت،فکری خاووخام، مەرام (۷۳۲)
وەک فلان کەس گەنجی هاتەدەس،بەبار    دەمهەوێ من وەک ئەوی بێ کەسب وکار (۷۳۳)
کاری بەختە، ئەوهە، ئەمما نادرە    لازمەکار تاکو قالب قادرە (۷۳۴)
کارکردن کوا دەکا تن مەنعی گەنج؟    کارکە،دائیم چونکەگەنجە،موزدی ڕەنج (۷۳۵)
تۆ نەبی قەت قەت گرفتاری ئەگەر    کردبام گەر ئەوهە یا خێر ئەوهە، هەر (۷۳۶)
مەنعی کرد بێژین ئەگەر لێن مستەفا    چون ئەگەر، مایەی نیفاقە، نەک سەفا (۷۳۷)
ئەو مونافیق زیکری شەرتی کردو،مرد    غەیری حەسرەت کەس لەزیکری شەرت،نەبرد (۷۳۸)

**مەسەل ..**

یک نەفەر خانووی دەویست بۆجێی ئەمان    پێی نیشان دا دۆست کەلاوێک نەیبوو بان (۷۳۹)
پێیدەکوت گەر ئەوهەبووبای سەقف وبان    تۆدەبوو ی جیرانم ئەو دەم بێ گومان (۷۴۰)
تۆ دەبووی ئاسوودەهەم ماڵ و مناڵ    گەر کو هەیبا، یەک وەتاغی دی لەپاڵ (۷۴۱)
جوابی داوەخۆشەلای یار، برنەسەر    چۆن بژین ئەمما لەژێر سایەی، ئەگەر؟ (۷۴۲)
تالیبی خۆشین ئینسانان هەموو    خۆشی ئەو دونیایەخۆشە، نار لەدوو (۷۴۳)
زێر خوازن گشتی ئینسان،پیرو جوان    زێری باشی بۆ نەناسرا چاوی وان (۷۴۴)
زێری خالیس نوور بەزێری غەش دەدات    بێ مەحەک تۆ، زێرنەکەی بکری، چ کات (۷۴۵)
گەر مەحەک بێ، ئینتیخاب کە، زێر ئەتۆ    بێ مەحەک، تەسلیم بەیەک زانا کە،خۆ (۷۴۶)
یا دەبێ، بت بێ، لەباتین، تۆ مەحەک    یا دەنا بۆپێش مەڕۆ، تەنها و تەک (۷۴۷)
دەنگی غوول و دێو، لەسەحرا ئاشنا    ئاشنایەک تۆدەبا بۆ لای فەنا (۷۴۸)
بانگ دەکاتن غوول دەڵی ئەی کاروان    وەرنەلای من، لێرەڕایە، ڕێ و نیشان (۷۴۹)

یەک بەیەک نێو یان دەبا غوول،ئەی فلان ‌‌ تا کو ون کارێ،لەیێک یێکەی ئەوان (۷۵۰)

هەر کەچۆ وێ، زوو دەبینێ، ئەو پەلەنگ ‌‌ عومر زایع،رێگەدوورو، رۆژ درەنگ (۷۵۱)

چی دەکوت غوول،؟دا بڵێ پێم، ئەی هەواڵ ‌‌ من مەقامم لازمە، هەم جاەو ماڵ (۷۵۲)

دەنگی واڵە،تۆمەهێڵەهیچ لەخۆت ‌‌ تا کو رەوشەن بن،گەلێک رازان لەبۆت (۷۵۳)

زیکری حەق کەدەنگی غوول ژێربەربدە ‌‌ چا و لەدونیا و دۆستی دونیا، بەر بدە (۷۵۴)

سوبحی سادق،تۆ لەکازب،جیا کەدەی ‌‌ لێک جیباکە، رەنگی کاسەو، رەنگی مەی (۷۵۵)

تاکو لەو چاوەی دەبینێت حەوت رەنگ ‌‌ چاوەکی دی، چا بکن،سەبرو درەنگ (۷۵۶)

رەنگ دەبینی غەیری ئەو رەنگانەتۆ ‌‌ زۆر دەبینی گەو هەرو دوڕ دانەتۆ (۷۵۷)

گەو هەری چی؟بەڵکەتۆ دەریا دەبی ‌‌ رۆژی روونی ئاسمان پەیما دەبی (۷۵۸)

کارگەر جێی کارگا، دەو دا نیهان ‌‌ تۆ برۆ کارگا،دەبینی ئەو عەیان (۷۵۹)

چونکەکار،وەک پەردەیەک،بۆ کارگەر ‌‌ غەیری کارنەی دی لەکارگەر،چاوی سەر (۷۶۰)

کارخانە، جێی حزووری کارگەر ‌‌ بێ خەبەر لەو،ئەو کەسەی ماپشتی دەر (۷۶۱)

تۆ وەرەنێو کارگا، یەعنی عەدەم ‌‌ تا ببینی کارو کار گەر،دەمبەدەم (۷۶۲)

کارخانەجێگەبۆ، باش دیتنە ‌‌ پشتی دەرکەپۆششە، کارگەر ونە (۷۶۳)

چوو لەبۆ لای بوو نی مەو هووم، فیرعەون ‌‌ کارخانەی ئەو خودایەی کرد ون (۷۶۴)

دەیهەویست تەغییر بدا تن، ئەو قەدەر ‌‌ تا کو بگرێ پێش قەزا، ئەو خۆڵ وەسەر (۷۶۵)

جا، قەزا فیرعەونی زۆر کرد مەسخەرە ‌‌ پێکەنی بەو فکرو بیرەی، لەو سەرە (۷۶۶)

سەت هەزاری کوشت منداڵ، بێ گوناه ‌‌ تا بگۆڕێ حوکم و تەقدیری ئیلاه (۷۶۷)

تا، نەیەت زاهیر نەبێ،مووسای زەمان ‌‌ قەتڵ و زوڵمی زێدەکرد،ئەو بێ ئەمان (۷۶۸)

کردی مووسا پاشی زۆر کوشتار، زهوور ‌‌ حازری شەڕ بوو دەگەڵ وی،بێ قسوور (۷۶۹)

**گەرکو دیبای کارگای خوای بێ هەواڵ ‌‌ نەیدەکرد فێڵ نەیدەکوشت ئەو، هیچ مناڵ** (۷۷۰)

بووی لەماڵی فیرعەون،مووسا،ئەمان ‌‌ زۆری منداڵ،غەیری وی کوشت، ئەو زەمان (۷۷۱)

وەک کەسێ وەدوایی خۆشی تەن کەوێ ‌‌ زەن دەبا، ئەو خەڵکی ناخۆشیان دەوێ[1] (۷۷۲)

ئەو دەڵێ دوژمن بەمن هەرئەوهەنە ‌‌ دوژمنی وی کەس نیەهەرئەو،تەنە (۷۷۳)

ئەو، وەکوو فیرعەونە،تەن مووسایی وی ‌‌ دوژمنێ لایە، شەقی بەدوایی وی (۷۷۴)

---

١- وا دەزانی، خەڵکی ناخۆشیان دەوێ(مصرع دوم)

دوژمنی لایەو، دەچی بەدوایی وی (مصرع دوم)

دوژمنــی وی نەفســە،نێو خانــەی تەنــە ئــەو بەخــەڵکی دیکــەبێخود دوژمنــە (٧٧٥)

**سەرزەنیش کردنی خەڵکی یەک نەفەر کەدایکی خۆی بەتوهمەت کوشت..**

کوشتی دایکی خۆی بە توهمەت‌یەک نەفەر هەم بەخەنجەر،هەم بەشەققو، مست لەسەر (٧٧٦)
یـەک نەفـەرپێیکوت کەبەدجینسـی ئـەتۆ چـۆن لـەبیرت کـرد حـەققی دایکـی خـۆ؟ (٧٧٧)
دا بڵـێ پـێم بـۆچی کوشـتت دایکـی خـۆ؟ پـێم بڵـێ چـی کردئـەو؟ کوشـتت ئـەتۆ (٧٧٨)
جـوابی داوەکـردی کارێـک عـاری وی کوشـتم ئـەو،تا خـاک بـێ سـەتتاری وی (٧٧٩)
پێیدەکوت بۆ نەت دەکوشت کابرای،کەتن؟ جـوا بـی دا، کوشـتن،دەبۆ کارم،ئـەمن (٧٨٠)
تـا نـەرێژم مـن لـەدونیا خـوێنی کـەس بۆیەکوشـتم، دایکـی خـۆم، تـەنیا و بـەس (٧٨١)
نەفسـی تۆ،ئـەو دایکەبـەد کردارەیـە جـورمی وی مەشـهوور لـەنێو ئـەو شـارەیە (٧٨٢)
نەفسـی ئـەممارەت بکووژە،تـۆ هـەتا گیـانی شـیرین،تۆنەکووژێ،ئەی فـەتا (٧٨٣)
هەر بەوی دونیایی خۆ ش، لێت بوو،بەتەنگ بەو دەگەڵ خواو خەڵقی خوا، کردووتەجەنگ (٧٨٤)
گـەربکووژی نـەفس، دوژمـن بـوو، بـەیار دوژمنـت نـابێ، لەسـەحنەی ڕۆژگـار (٧٨٥)
گـەرببێژێ یـەک نەفـەر،هیچ والـە، نـین ئـەنبیياوو ئەولیياوو،موتتـەقین (٧٨٦)
ئـەنبیيایان کوشـتبوویان نەفسـی خـۆ دوژمنشـیان زۆرهـەبوو تـۆ بێژەبـۆ؟ (٧٨٧)
گوێ،گرە،بـاش ئـەی تـۆ خواهـانی سـەواب تابیبسـی تـۆ لـەبۆ ئێـرا د جـەواب (٧٨٨)
دوژمنـی خـۆ بـوون گشـت ئـەو مـونکیران هەربـەخۆ دایـان، لـەخۆیان، خەنجـەران (٧٨٩)
دوژمـن ئەوکـەس، بیهـەوێ،خوێنت،مژێ نەک کەسێکی بیهەوێ خۆی، خۆی کوژێ (٧٩٠)
چەکچـەکی دوژمـن بەتاوێ،خۆنییـە چـون حیجـابی ویسـت، نـووری بـۆ نییـە (٧٩١)
نـووری تـاو، دەگرێـت گیـانی چەکچـەکی ڕەنجـی وی بۆتـاوێ نایەت،قـەت یـەکی (٧٩٢)
دوژمن ئەکەس بوو، کەبێ لەو، ڕا عەزاب ئـەو نـەهێڵێ تـاو بگاتـە، لـەعلی نـاب (٧٩٣)
هەرلـەبۆخۆ مانعن،گشـت کـافران نـووری ڕوونی،گـەو هـەری پێغەمبـەران (٧٩٤)
کـوا دەگیـرێ پێشـی چـاوی وا،بـەنوور؟ بەڵکـەخۆیان بـوون لـەنووری وا،بـەدوور (٧٩٥)
وەک غولامێـک،بێ لەئـەرباب زۆربـەکین خـۆی بکـووژێ تـاکو ئـەرباب کـا، غـەمین (٧٩٦)
هەڵـدەدێرێ، خـۆی لـەبان ڕا، سـەرنەوی تـا زیـانی پێبگـا، ئـەربابی وی (٧٩٧)
گـەر عـەدوو بێ بـۆ تـەبیب، ئەفسوردەحاڵ یابیێتـەدوژمنی ئوسـتاد، منـاڵ (٧٩٨)

ڕێ گـرن، تـەنها لـەخۆیان، نـەک لەکـەس     ڕێ لەعـەقڵ و گیـانی خۆیـان گـرت بـەس[1] (۴۹
ڕەختشـــوو، گـــەر کینـــەدار بێـــتن لـــەتاو     یـــا نەماســـی،بێ، بـــەڕق دا چـــێ، لـــەئاو (۰
چـــاک بنـــۆڕە، بێژەپاشـــــان تۆبـــــەمن     کا مەیان بەد بـەخت و، بـەد ئەختـەر، دەبن (
گـەر خوداوەنـد چـاکی کـردی، نـا لـەبار     تۆنـەبی هـــەم نالـــەبار هـــەم بـــەد وتـــار (۲
گـەر دڕا کەوشـت، مـەڕۆ نێـو، بـەردەڵان     عـەیبی خۆت،تـۆ زۆر مەکە،وەک،کـەر دڵان (۳
گـــەر ببێژی،بـــۆ فڵان،والایـــە، جێـــی؟     والــەنیم من،تــۆ حەســوودیت، دێــت پێــی (۴
عەیب و نەقسە،چەشنی عـەیبی دی،حەسـەد     بەڵکـــەزیاتر زۆر لەعـــــەیبی دیکەبـــــەد (۵
چونکــەخۆی کــەمتر لــەئادەم دی، بلــیس     کەوتــەنێو زیــاتر، لەســەت ئــەعمالی پــیس (۶
دەی هەویســـت ئیبلیس،تـا کـو بچتەســـەر     بەس لەسەر ئەوچوونەسەر، دی، زۆرکەسـەر (۷
دی ئــەبوو جــەهل،عار، فــەزلی ئەحمــەدی     چون حەسوود بوو، خۆی لەوی، زیاتر دەدی (۸
چـون حەسـوود بوو،بولحەکـەم، بۆ،بووجـەهل     زۆر لەئـــــەهلانی حەســـــەد،کرد نائـــــەهل (۹
نەمـدەدی مـن، لـەو جیهانـەی، پـڕ تـەلاش     هـیچ شـتێ چـاتر، لـەخوڵق و خـوویی بـاش (۰
ئـــەنبیا ی نـــاردن لـــەبۆ عالـــەم، ئەحـــەد     تـا لەسـینە، بێننـەدەر گشـتیا ن، حەسـەد (۱
چونکەکـەس نـەنگی لـەزاتی خـوا نییـە     هــیچ حەســـوود بـــۆ وی دەدونیـــا دا نییـــە (۲
گـــەر وەکووخـــۆی، ئـــەنبیا ناســـین،فڵان     بۆیەوایـــە، چـــون حەســـوودی،دێ بـــەوان (۳
گەرقـەبووڵ کـاتن کەسـێ فـەزلی ڕەسـووڵ     قـەت حەسـوود نـابێ بـەوی پاشـی قـەبووڵ (۴
یـــەک وەلـــی لازم لەهـــەر دەورو زەمـــان     تـــــا قیامـــــەت بەردەوامـــــەئیمتیحان (۵
بووی‌نەجات هەرکەس‌کەهەی بوو،خوڵقی باش     شووشـــەدڵ ئەمماشـــکا،بوو،وردو خـــاش (۶
جا،ئیمـــامی ژیـــرو زینـــدو ئـــەو،وەلی     بێ لەهەرنەسلێک، عومـەر بـێ یـا عـەلی (۷
هـادی و مەهـدی ئەوە،ئـەی بـاش یـار     هـــەم لـــەلات دا نیشـــتوە،هەم نادیـــار (۸
ئــەو وەکوونــووره، عــەقڵ جــەبریلی وی     ئـەو وەلـی کـەمتر لـەوی، قەنـدیلی وی (۹
کـــەم لەئـــەو قەندیلە،بۆمـــە، جێ،چـــرا     زۆرمـــەقام و مەرتەبـــەی نـــوور، پێـــدرا (۲۰
چونکەحەوسەت پەردەهەن بۆنووری حـەق     پـەردەکان یـەک یـەک هەیانەچـەن تەبـەق (۲۱
پشـتی هەرپـەردێک لـەبۆ قـەومێک مـەقام     ســـەف بـــەدووی سەف،ڕاکشـــاوەتا،ئیمام (۲۲
خـــەڵکی ســـەففی ئاخری،چـــاو ناتـــەوان     نـــووری ســـەففی پـــێش نـــابینن ئـــەوان (۲۳
چـون زەعیفـەچاوی سـەففی پـێش ئـەویش     نادیـار بۆی، نووری پێش وی و، ئیدەدیش (۲۴

---

[1] - ڕێ گری ، عەقڵ و گییانی خۆنە،بەس (مصرع دوم)

ـووردکی کە،گیان بەئەووەڵ سەف، دەدا ڕەنجەبۆ ئەو شەخسەخێڵەی، بەدئەدا (٨٢٥)
خێـی دەڕوا، وردەوردە،کەم دەبێ گەر لەهیچ جێ ڕا نەوەستا یەم دەبێ (٨٢٦)
ـ گرێک بۆزێڕ و ئاسن بێ ئەگەر کوا لەبۆ بێو، سێوی تەڕدەی بێ سەمەر؟ (٨٢٧)
ـێوی کاڵ دەبوێ کەگەرمای وێکەوێ نەک وەکوو گەرمای کەئاسن دەیهەوێ (٨٢٨)
دەیهەوێ ئاسن بەڵام، توند ئاگرێ تاکوگەرمای زۆر، لەئاگر، وەر گرێ (٨٢٩)
ـسنی وا،وەک فەقیری ڕەنجبەر شادو خۆشە،ئاگرو کوتکیش لەسەر[1] (٨٣٠)
حاجبی ئاگر دەبێ،بێ واسیتە دەچتەنێو ئاگر بەبێ هیچ ڕابیتە (٨٣١)
ـێ وەسیلەئاوو مندالآنی ئاو غەیرەمومکین گەر بەئاگر، بن تەواو (٨٣٢)
ـەو وەسیلەتاوەیە، یا قابڵەمە هەروەکوو پێ، کەوشە، بۆوی لازمە (٨٣٣)
یا هەوا بێ، بەینی ئاوو،ئاگری لەو هەوایە، ئا و، تینێ وەر گری (٨٣٤)
جا، فەقیر، یانی، کەسێک، بێ واسیتە زاتی وی،هەیبێ،دەگەڵ،گڕ،ڕابیتە (٨٣٥)
جا،هەمووعالەم بەدەن، هەر ئەو دڵە گەر بەدەن بێ دڵ بێ، بێکار وەک گڵە (٨٣٦)
دڵ نەبێ،تەن کوا دەزانێ گفتو گۆ؟ نەی هەوێ دڵ،کوا دەکا،تەن جستوجۆ؟ (٨٣٧)
مەنزەرەی ئاگر، کە، وابێ ئاسنە مەنزەرەی ئەو خوایەهەردڵ، تەن چنە؟ (٨٣٨)
ئەو دڵەی زاهیر لەئینسان وەک تەنە ئەو دڵەی ئینسانی کامیل، مەعدەنە (٨٣٩)
ئەووتارەلازمەشەرحی بەڵام من دەترسێم هەڵخریسکێ وەهمی عام (٨٤٠)
تا نەبێتەبەد، ئەوەی بووباش وخۆش بۆیەوام کوت چونکەمن چوو بووم لەهۆش (٨٤١)
کەو شی کەج بۆلاقی کەج،راستانەیە بۆ گەدا دەسگیرە، سەر ئاستانەیە (٨٤٢)

**ئیمتیحان کردنی پادشا،دوو غولام کە تازەی کڕیبوون..**

**خولاسەی داستان...**

پادشایەک دووغولامی کڕین،یەکیان بەزاهیر زۆر جوان و ڕێک و پێک بوو،بەڵام ئەوی دیکەزۆر ناحەزو نالەباربوو. پاشا غولامەجوانەکەی ناردەحەمام ودەگەڵ ڕەفیقەکەی وی دانیشت وبۆئیمتیحانی شەخسییەت و وەزعییەتی ڕووحی وی پێیکوت ئەو غولامەی ڕەفیقت کەزۆر جوان وڕێک و پێک خوێن شیرین وقسەخۆشەدەبارەی تۆدا نەزەری خەراپی هەیەوئەتۆ بەخەیانەتکار دەزانێت، پێم بڵێ بزانم ئەتۆنەزەرت چیە؟ غولامەناحەزو نالەبارەکەجوابی

[1]- ئاسنی وایە، فەقیری ڕەنجبەر شادو خۆشحاڵ ،ئاگرو کوتکیش لەسەر

داوەڕەفیقی من ئینسانێکی ڕاست و دروستەوتا کو ئەلئان هیچ قسەیێکی ناحەزوناشیرنم لەوی نەبیستووە، ولەپاشان سیفاتی باشی ڕەفیقەکەی یەک یەکە، بۆ ئەژمارد،پادشا پێیکوت هێندەتەعریف لەوی دەکەی کەمێکیش حاڵی خۆت بۆئیمەبەیان بکە،دووبارەکوتی.. بەڵی هەرچەند کەڕەفیقی من زۆر میهرەبان و وشیارو جەوانمەردو دادگەرە. بەڵام یەک عەیبی گەو رەی هەیە،وئەویش ئەوەیەکەهیچ خود پەسەندو مەغروور و موتەکەببیرو لەخۆڕازی نیە. بەڵکەم هەمیشەدەفیکری عەیبی خۆی دایە.ووەدوای عەیبی خەڵکی دی ناکەوێ، پادشا کەوەزعی بەجوورەدی،پێیکوت بەسکە،ئەوەندەبەزیرەکی بەبەهانەی وی تەعریف لەخۆت مەکە. ئەمن ڕەفیقی تۆش ئیمتیحان دەکەم ودەزانم وات رسوا دەکا کەئەتۆ لەو تەعریفانەکەلەویت کرد خەجالەت وشەرمەند ەبی،بەڵام غولامەناحەزەکەلەسەر نەزەرو گوفتاری خۆی ڕا وەستا وهەر لەڕەفیقەکەی خۆی تەعریف دەکرد.. غولامەجوان و ڕێک و پێکەکە، لەحەمام هاتەوە.پاشا غولامەناحەزەکەی بۆ کارێک ناردەدەر،تا غولامەجوانەکەش ئیمتیحان بکا. پاشا پێیکوت ئەتۆ زۆر جوان وقسەخۆشی بەڵام بریا ئەو عەیبانەی کەڕەفیقی تۆبەمنی کوت دەتۆدا مەوجوود نەبان. غولامەجوانەکەڕەنگی چڕژا وحاڵی تێک چوو و بەپاشای کوت کەمێکم لەو قسانە بۆبگێڕەوە، پاشا پێیکوت ڕەفیقی تۆلەسەر ئەو بیرو باوەڕەیەکەئەتۆ ئینسانێکی دووڕوو، و ڕیاکاری، غولامەجوانەکەهەر دەگەڵکوو ئەوقسانەی بیست تووڕەبوو، کەفی هەڵخڕاند و دەستی کرد بەجنێو و قسەی ناحەزبەڕەفیقەکەی خۆی،پاشا بۆی تەحەممو ل نەکرا ودەستی لەسەر زاری ئەو غولامە دانا، وپێیکوت .. بەسسە.. ئەمن بەو ئیمتیحانەشەخسییەت و وەزعییەتی تۆم ناسی، دروستەکەئەوقیافەی ناحەزو نالەبارە، بەڵام لەعیوەزدا ئەتۆ ڕووحت پیس و ناحەز و نالەبارە،جا، لەبەرئەوەبۆ هەمیشە، ئەو سەر پەرەست و ئەمیری تۆ دەبێ .

| | | |
|---|---|---|
| پادشایەک بوو کڕی ئەو،دووغولام | هاتەلا یێکیان، لەبۆ باس و کەلام | (٨٤٣ |
| دی گەلێک زیرەک دڵ وشیرین جەواب | لێوی شیرین لێی دەباری شەکری ناب | (٨٤٤ |
| ئادەمی ون بوو لەژێر پەردەی زەبان | ئەو زەبانە،پەردەیە، بۆ دەرکی گیان | (٨٤٥ |
| لاببا،با، پەردەکەی، لای دەرکەگەر | سیرڕو ڕازی ماڵ،ئەودەم، دێتەدەر | (٨٤٦ |
| گەوهەری تێدایە،یا خێر خوارو بار | گەنجی زێڕ،یاخێر،گشت دووپشک و مار | (٨٤٧ |
| یا دەوێدا گەنجە،لای گەنجیش مار | بێ نیگەهبان چونکەنابێ، گەنج، چ جار | (٨٤٨ |
| بێ تەئەممول،وایدەکرد مەتلەب ئەدا | بۆی نەدەکرا کەس بەسەت فکران ئەوا | (٨٤٩ |

جەشنی دەریا بوو لەباتین ئەو غولام    وەک بڵێی گشت گەوهەری دەریا کەلام (٨٥٠)

گەوهەری وی گەر دەبوو تابان و ڕوون    حەقق و باتیل جێ بەجێ،لێک جیا دەبوون (٨٥١)

نووری قورئان فەرقی دانا بۆ بەشەر    بەینی حەقق و باتیل و سوودو زەرەر (٨٥٢)

نووری قورئان گەربیا بۆ ن، نووری چاو    ئەودەمە، مەرکەزدەبووین بۆ سوال و جواو (٨٥٣)

چاوی خۆت خێل کرد و مانگت دوو، دەدی    وەک سوئالی شوبهە،ئەوهە، هات وەدی (٨٥٤)

چاو لەمانگی ڕوون کە،چاوت ڕاسکەوە    تا تۆ هەر یەک مانگ ببینی، جواب ئەوە (٨٥٥)

تێز؛فکرت ڕاس ببینە، نەک خوار    فکرو بیری باش،شۆقی کردگار (٨٥٦)

هەرجەوابێکی لەگوێ ڕا، بێتەدڵ    چاو دەڵێ،لەمنی ببینە، بیخەگڵ (٨٥٧)

گوێ یەواسیت، چاوەبەڵام ئەهلی ویسال    چاو، ساحەب حاڵ و گوێ یارانی قال (٨٥٨)

گوێ ببیسێ،بەو دەگۆڕێن هەرسیفات    چاو ببینێ بەو دەگۆڕێ،ئەسڵی زات (٨٥٩)

گەربەگوفتار بووت لەنار (علم الیقین)    ڕوو کەلای (عین الیقین) ڕاس، بێ لەقین (٨٦٠)

جۆن دەبێ عەینەلیەقینت دەسکەوێ؟    تۆ بسووتێ،گەر یەقینی وات دەوێ (٨٦١)

گەر ببیسێ گوێ،دبێتەچاوی چاک    خۆ، دەنا،ناگرێ لەگوێ هیچ، ڕووحی پاک (٨٦٢)

ئەو، وُتارەبێ بنە،نابێ تەمام    بێینەوەسەرباسی پاشاو دووغولام (٨٦٣)

**بەڕێ کردنی شا یەکێک لەو دوو غولامانە و پرسیاری حاڵی غایب لە حازر..**

شا کەدی، وشیارو زیرەک ئەو غولام    ئەو غولامی دی دەکرد،گاز،بۆ کەلام (٨٦٤)

ئەوغولامی وا، لەلای من زۆر عەزیز    چون گەلێک بووخەسڵەت وخووی وی تەمیز (٨٦٥)

هەرکەبۆ لای پاد شا هات،دووەمی    بۆنی پیسی لێدەهات، زارو دەمی (٨٦٦)

گەرچی تێک چوو،شا لەبەر گوفتاری وی    جستو جۆی کرد هەرلەوی، ئەسراڕی وی (٨٦٧)

بیبەدەکوت بەو شکڵ و زاری بۆ گەنیو    دوور بەلێم، دەنگت ببیسم، نەک سریو (٨٦٨)

تۆ. بەنامەدۆست یا دۆستانەبووی    نەک جەلیس و هەم نشینی خانەبووی (٨٦٩)

تا دەوا کەم بۆنی پیسی زاری تۆ    من تەبیبی حازقم، بیماری تۆ (٨٧٠)

جۆن لەبەرکێچێک،دەسووتێنم بەڕەم؟    چۆن لەسەر تۆ، لا دەدەم دەستی کەرەم؟ (٨٧١)

هەرچلۆن هەی بێژەیەک دوو داستان    ئاشکرا بێ،چەندە،عەقڵت،لەو بەیان (٨٧٢)

شا.غولامی زیرەکی نارد بۆ حەمام    تا کو خۆی خاوێن بکا، ئەو خۆش کەلام (٨٧٣)

جا.بەوی دیکەی دەکوت، تۆ زیرەکی    سەت،غولامی تۆ، لەواقیع،نەک یەکی (٨٧٤)

تــۆ وەکوودۆســتت بەئێمــەت کوت،کــەنی ئــەو بەئێمــەی کــوت کەتۆپەســت و دەنــی (۰۷۵
ئــەوکوتی،دز، نادروســت،بەد کــاری تــۆ حیـــزو، نامەردو،گـــەلێک بێعـــاری تــۆ (۰۷۶
جـــوابی داوەڕاســـتگۆیە، ئـــەو غـــولام نەمدی کەس وەک وی دروست بێژێ، کەلام (۰۷۷
ڕاســـتگۆیی، خلْقـــەتی ئـــەو ئادەمـــە هــەرچی بیلــێ ئــەو، دروســتە،بێ کەمــە (۰۷۸
غــەیری چاکــە، لــەو ڕەفیقــەم قــەت نــەدی ڕەنگەهــەم بــێ، من،بــڵام ئــەو نــا، بــەدی (۰۷۹
ڕەنگەهەم بێ، مـن گـەلێک زۆر، عـەیب و عار نادیــار بــوون لێم،بــەڵام لــەوبوون دیــار (۰۸۰
هــەر کەسێکی دیتـی عـەیبی خـۆی، بـەچاو دێ لــەبۆ ئیســلاحی عــەیبی خــۆی، بــەتاو (۰۸۱
غـــافڵن خـــەڵکی لەخۆیان،وادەکـــەن عــەیبی بــۆ یێــک، بــا نــەبووبێ، چادەکــەن (۰۸۲
نەمدەدی،ئەی بوت پەرەست قەت،ڕوویی خۆ تــۆدەبینی ڕوویــی مــن، مــن ڕوویــی تــۆ (۰۸۳
هەرکەسێکی سووڕەت وڕووی خـۆی دەدی نـــووری وی زیـــاتر لـــەنووری ئیـــدەدی (۰۸۴
گـــەرکو بمـــرێ، چـــاوی وی هەرباقییـــە چـاوی وی چـون، چـاوی خـوای خەللاقییـە (۰۸۵
غـەیری نـووری حیسسـە،ئەو نـوورەی ئـەتۆ بــەو دەبینــی جـوان سـیفات و ڕوویــی خــۆ (۰۸۶
پێیـــدەکوت شـــا،بێژەعەیبی وی تـــەمام وەک کوتی گشت عەیبی تۆ،بۆ م، ئەو غولام (۰۸۷
تـــا بزانم،تـــۆ کەغـــەمخواری منـــی کەیخــدا بــۆ مولْــک و بــۆ کــاری منــی (۰۸۸
دەیکـوت ئـەی شـا،من دەڵـێم عـەیبانی وی گــەرچی هــەم مــن یــەک لەهاوپــەیمانی وی (۰۸۹
عــەیبی وی ڕاســتی و دروســتی، هــەم وەفــا عــەیبی وی بوو،خۆشەویسـتی، هــەم ســەفا (۰۹۰
کــەمترینی عـــەیبی وی بـــوو عـــەدڵ و داد ئەو،بـــەگیان دانی،لـــەڕێی دۆستانی،شـــاد (۰۹۱
ســـەت هـــەزاران گیـــانی چاکرد،کردگـــار کـام جەوانمـەرد بـوو کەنەیـدی وا،چ جـار؟ (۰۹۲
گیان دەدا هەرکەس کەدی گیا ن چەن هـەزار بۆگیانێـــک،چۆن دەبـــێ غـــەمگین و زار (۰۹۳
گــەر لەســەرجۆگە، نــەبینی ئــا وی جــۆ تـــۆ خەسیســـی ئاوی،کوێرەچـــاوی تـــۆ (۰۹۴
دەیکوت ئەحمەد هەر کەسێک زانی یەقین گـــەرکو پاداشـــی هەیەئـــەو ڕۆژی دیـــن (۰۹۵
دێ دەچاکـەجا، لـەجێی یـەک چاکـە، بـۆی لەحزەلـەحزەزیاد دەکـا ئـەو جـوودی خـۆی (۰۹۶
دی عیوەز،بەخشـــەندە،بۆیەکردی جـــوود ترسـی لاچـوو چـون عیوەز،بـۆی بوو،بەسـوود (۰۹۷
هەر کەسێ نەیدی عیوەز،بوو چاو چنووک شاد دەبێ غـەوواس کـەدی دوڕڕی بچـووک (۰۹۸
جا،دەدونیـــادا نییـــەهیچ کـــەس بـــەخیل گــەربزانی هــەرچی دای، بــۆی دێ بــەدیل (۰۹۹
چـون سـەخاوەت کاری چاو،نەک کاری دەس[1] بووی نـەجات هەرکـەس کەئەو بینایە،بەس (۰۰

[1]- چون بەچاو دەکرێ سەخاوەت، نەک بەدەس (مصرع اول)

تەیبی دیکەی،خۆی بەزۆر ناگرێ، لەکەس   عـەیبی خـۆی پەیـدا دەکـا، ئیدیکەبـەس (٩٠١)
دۆستی خـەڵکی، دوژمنـی خـۆی ئـەو، بـەڵێ   عـەیبی کـەس ناڵێـت عـەیبی خـۆی دەڵـێ (٩٠٢)
ـ کوتی تۆ، مـەدحی دۆستت چا دەکەی   مـەدحی خـۆت مەقسـوودە،بۆیەوا،دەکەی (٩٠٣)
چـۆن ئـەویش بـۆ ئیمتیحـان دێـنم ئـەمن   عەیبـەبۆ تـۆ، گـەر سـیفاتی وا،نـەبن (٩٠٤)

**سوێند خواردنی غولام لەبارەی ڕاستی و دروستی ڕەفیقەکەی بەخاتری حوسنی زەن بوو..**

ـ کوتی ..نا، سوێن دەخۆم بەخوای عەزیم   مالیـک و قادیر،بـەڕەحمان و ڕەحـیم (٩٠٥)
ـ خودایـەی نـاردنی ئـەو، ئـەنبیا   نـەک لەبەرحاجەت،بەفـەزل و کیبریـا (٩٠٦)
ـ خـودا پاکـەی لـەخاکی وا زەلیـل   چـاکی کـردن شەهسـەوارانی جـەلیل (٩٠٧)
ـ کی کـردن لـەو میزاجـی خاکیـان   تێپـەڕین لـەو مەسـکەنی ئـەفلاکیان (٩٠٨)
ـووری سـافی چـادەکرد خـالق لـەنار   سەر، سەرووی ئەنواری دی،بۆ کرد دیار (٩٠٩)
ـووری ڕوونی، ڕوونی کردن گیان بەعام   مەعریفـەت بۆ ئادەمی، هـات لـەو تـەمام (٩١٠)
ـ.وەری گرت نوور لەئادەم،ئەو دەمی   بۆیەهەرشـیس بـوو خەلیفـەی ئـادەمی (٩١١)
ـ.ئەلـەو، نوورەگـەلێک، بەشـداربوو   بەخششـی لـەو نوورە،بۆعـام، دیـار بـوو (٩١٢)
ـانی ئیبـراهیم بـەنووری وا عـەزیم   چـۆ دەنێـو ئـاگر، بـەبێ هـیچ ترسـو بـیم (٩١٣)
چـۆن سـماییل کەوتـەنێو دەریـایی نـوور   نەیدەکرد ئەو، سەر، لەتیغی تیژ، بەدوور[2] (٩١٤)
ـانی داوود،بـوو بەشـۆقی نـوور، گـەرم   ئاسـنی وا، ئـەو لەدەسـتی،بوو بەنـەرم (٩١٥)
چـۆن سـولەیمان،نووری وا،ئارمـانی وی   جننودێـو، گشـتیان لـەژێر فـەرمانی وی (٩١٦)
چۆنکەیـەعقووب بـۆ قـەزا تەسـلیم دەبـوو   بـۆنی یوسـوف هـات، چـاوی وی،وەبـوو (٩١٧)
ـووری ڕوونـی دیـت یوسـوف بۆیەئـەو   بـوو بـەزاناو شـارەزای تـەعبیری خـەو (٩١٨)
چۆنکـەئاوی خـوارد لـەدەس مووسا،عەسـا   مـولکی فیرعەونی،بـەیێکجار،قووت دەدا (٩١٩)
ـێ.ـەنووری،واله،عیسـا، نـەردەوان   بۆیەڕۆیشـت تـاکو چـوارەم ئاسـمان (٩٢٠)
چـۆن موحەممەد،دی،لـەبۆخۆی والـە،نوور   هەربەقامکێک مانگی لەت کرد، وا، لەدوور (٩٢١)
چـۆن ئەبووبـەکر، ئایـەتی تـەو فیـق بـوو   ئـەو ڕەفیقـی شـاهی واو، سـەددیق بـوو (٩٢٢)

---

٢- دایدەنا،بۆ تیغی تیژ ،سەر،بێ قسوور (مصرع دوم)

چون عومەر شەیدایی ئەو مەعشووق بوو          چەشنی دڵ، بۆ پاک و پیس، فارووق بوو
چونکەعوسمان دیتی نووری وا،بەچاو          بوو،بەنووربەخش،ساحەبی دوو نوور تەواو
چون عەلی دەیدیت نووری والە، جوان[1]          بوو بەشێری خوا،لەمێرگی رووح وگیان
چون جونەید، دیتی،لەجوندی وی مەدەد          مەرتەبەی زیاد بوولەئەژمارو عەدەد
بایەزید چون نووری زۆری دی لەحەق          ئەو بە(قطب العارفين ) بوو، موستەحەق
چون لەشاری عیشق،کەرخی،بوو حەرەس          بۆ خەلیفەی عیشق و،رەببانی نەفەس
چوو،لەبۆ لای خوا کوری ئەدهەم،بەشاد          بوو،بەشای شایانی هەرچی عەدڵ و داد
چون لەرێی وا رەنجی زۆر کێشا،شەفیق          ئەو، لەرەو شەن بیری،بۆ رۆژ بۆ رەفیق
سەت هەزاران زیندە، پاشای بێ نیشان          سەر بڵیندن،لای خوداوەندی جیهان
وای خودا ویست، نێوی وان مەستوور بێ          تا کو نێوی وان لەزۆر کەس، دووربێ
سوێن،بەنووری واو، ئەوەی چوو باسیان          وا،لەنێو ئەوبەحرەدان،وەک ماسیان
بەحری گیان و،گیانی بەحر،گەر بەو دەڵەم          خۆ، بەوی لایق نییە، من وا، هەڵەم
بەو خودایەی چاکی کرد هەردووجیهان          شارەزاو زانا، بەهەرچی، بوونیهان
ئەوسیفاتەی هەن، لەبۆ ئەو، یاری من          سەت بەرابەر، زیندەلەو گوفتاری من
من دەزانم تۆ لەوەسفی ئەو رەفیق          باوەریت نایە، بڵەم چی؟ ئەی شەفیق
شا،کوتی تۆ، ئێستەبێژەوەسفی خۆت          باسی خەڵکی نایێ سوودی، هیچ لەبۆت
چەندەوەختەچیت بەدەس هینا ئەتۆ؟          چیت بەدەس هینا،لەبن دەریا،ئەتۆ؟
رۆژی مردن، حیسسی تۆ، باتڵ دەبێ          نووری گیانت بێت،یاری دڵ دەبێ
گەر لەقەبری، چاوی تۆ، پرکەن، لەخاک          چیت هەیەتا قەبری تۆ کا، تابناک؟
گەر لەقەبری دەست و پێ یان، لێت بری          تۆ پەرو باڵت هەیەپێی هەڵفری؟
رووحی حەیوانی زەمانێک لادەنێ          رووحی دائیم، تۆلەجێی وی، دا دەنێ
شەرتی (من جا بالحسن) نەک کردنە          بەڵکەئەو بۆبارەگای خوا، بردنە
جەو هەری تۆ یا لەئینسان، یاکەری؟          گەرعەرەزچوو چیت دەبێ بۆ خوا،بەری؟
ئەو هەموو ئەعرازی تاعات هیچ نەمان          چونکەنامێنێ عەرەز،قەت دوو زەمان

---

[1]- چونکەحەیدەر، دیتی نووری والە، جوان (مصرع اول)

قەت لەجەوهەر ناچێ بۆ جەو هەر عەرەز   لا دەبا ئەمما لەسەر جەو هەر، مەرەز (۹۴۷)
جەو هەری تەغییر دەداتن،چاک عەرەز   وەک بەپارێز،تێک دەچێ و دەڕوا،مەرەز (۹۴۸)
جەوهەری لێچادەبێ،پارێز بەجەهەد   بوو،بەپارێز زاری تاڵ، شیرین و شەهەد (۹۴۹)
پاشی چاندن،خاک دەبێتەگەنم و کا   یا دەوای موو،مووی موجەععەد،چادەکا (۹۵۰)
ئەونیکاحەی ژن،عەرەز بوو،بوو تەواو   جەو هەری منداڵ، حاسڵ بوو لەئاو (۹۵۱)
جووت بوونی گشت حەیوانات،عەرەز   جەو هەری بێچوو، مەڕامە، هەم غەرەز (۹۵۲)
چاندنی باغان، عەرەز، بوو، بێ گومان   جەوهەری چاندن،وجوودی داری جوان (۹۵۳)
هەرعەرەز بووکاری وەک کیمیاگەری   حاسڵی وی بێتەدەس گەر، جەو هەری (۹۵۴)
هەرعەرەز،بوو،پاک بکەی ئاوێنەگەر   جەو هەری جوانی و،سەفا،لەو دێتەدەر (۹۵۵)
جا، مەڵێ تۆ، زێدەکارم کرد ئەمن   جەو هەری کاران نیشان دە، هەر، چ بن (۹۵۶)
وەسفی کار، هەر بۆ عەرەز، نەک جەو هەری   کوا لەبۆ قوربان دەبێ مەڕ، سێبەری؟ (۹۵۷)
دەیکوت ئەی شا، نائومێدەلێرەعەقڵ   چونکەپێت وایە، عەرەز، قەت نابێ نەقڵ (۹۵۸)
نا ئومێدی دێنێ بۆمان ئەو وُتە   گەر عەرەز چوو، دوور لەبەعس و قیامەتە (۹۵۹)
نەقڵ و حەشری بۆ نەبێتن گەر، عەرەز   قەول و فێعلی ئێمە، بێهوودەو، غەرەز (۹۶۰)
شکڵی ئەعراز چۆنە، نەقڵی وا نییە   وایەحەشری هەر شتێکی، فانییە (۹۶۱)
نەقڵی هەرشت، لایق و هاو شانی وی   بێ گومان لایق بەمێگەل،شوانی وی (۹۶۲)
ڕۆژی مەحشەر، بۆعەرەز، سوورەت، هەیە   بۆ زهووری سوورەتان، نۆ بەت،هەیە (۹۶۳)
چاک بنۆڕە،تۆش ئاخر،بووی عەرەز   جووت دەبوون دوو نێرومێ، تۆش بووی غەرەز (۹۶۴)
چاو لەوەی کە، خانەوو،کاشانەبوو   بۆموهەندیس،هەر وەکوو ئەفسانەبوو (۹۶۵)
ئەو فڵان خانووی کەدیمان خۆش وجوان   ڕێک وپێک، دیواردەرکەو،حەوش و بان (۹۶۶)
بۆموهەندیس بوو عەرەز، هەم فکرو بیر   تا وەسیلە،بوو لەچەن جێ دەستگیر (۹۶۷)
بۆ ئەوەی کە،کارە، شوغڵە، پیشەیە   هەرعەرەز هەروا خەیاڵ، بیر، ڕیشەیە (۹۶۸)
چاک بنۆڕەلەو جیهانە،بێ غەرەز   ئەو جیهانەمەنشەئی وی بوو عەرەز (۹۶۹)
بیر لە ئەووەڵ،حاسڵی وی، دوای عەمەل   ئەو جیهانەش خیلقەتی وابوو ئەزەل (۹۷۰)
میوەئەووەڵ دێتەفکری باغەوان   پاش عەمەل زاهیر دەبن یەک یەک لەوان (۹۷۱)
گەر کوکارت کردو،چاندت دار ئەتۆ   دێتەحاسڵ فکری کردت،پار ئەتۆ (۹۷۲)
گەر لک و،ڕیشەو گەڵای، پێش میوەنە   پێش قەڕاوڵی میوەنە،ئەو دیمەنە (۹۷۳)

ئەو،سورڕەی کە، مەغزی گشت ئەفلاک بوو ئاشـکرا بـوو، حـەزرەتی (لـولاک) بـوو (٤
نـەقڵی ئـەعراز بـوو، وُتـاری شـاو غـولام وەک لەباسـی شـێرو ڕێـوی بوومـەرام (٥
گشـتی عالـەم بـوون عـەرەز، ئـەووەڵ، هـەتا هـات لـەبارەی مەتڵـەبی وا، (هـل اتـی) (٦
مەنشـــەئی چـــابوونی ئەعرازن،ســـووەر فکرەمەنشـەء،بۆ سووەر، ئەی خۆش نـەزەر (٧
عالــەمی چــاکرد بەفکرێک،عــەقڵی کـول شـایەعەقڵی کول،سـووەر، بـۆ وی ڕوسـول (٨
ئـــەو جیهانەجێگەیـــەبۆ ئیمتیحــــان جێـی سـزا دان و موجازات،ئـەوجیهان (٩
نۆکـەرت جورمێـک بکـا ئـەی شـا، ئەگـەر ئـەو عـەرەز تەبدیل بەبەنـد و، دەردەسـەر (٠٠٠
نۆکـــەری تۆخزمـــەتی تـــۆ گـــەربکات خـۆ عـەرەزبوو خزمـەتی تـۆ، بـۆ خـەڵات (
جەوهـــەرو ئـــەعراز، لێکتـــر چـــادەبن تـــەیرو هێلکـــەپێش تـــەکامول،وا دەبـــن (٠٠٢
شـــا کـــوتی بەو،باشـــە،باوابێ ئـــەدی بـۆ ئـەمن ئـەعرازی تۆم،جـەو هەرنـەدی؟ (٠٠٣
جـــوابی داوەعەقڵـــە،کردی ئـــەو نیهـــان تـــا نـــەبینریتن، بەچاوان،ئـــەوجیهان (٠٠٤
چـون ئەگـەر زاهیـر ببـێ ئەشـکالی فیکـر کـــافرو مـــوئمین دەبێ،کاریـــان زیکـــر (٠٠٥
گـەر کـو جـەو هـەر ئاشـکرا بـا،موو بـەموو نەقشـی کـوفرو دیـن، لـەنێو چاوان دەبوو (٠٠٦
کوادەمـــا بـــوت، یائـــەوەی کەبوتگـــەرە؟ کێ بوو جورئەت کا،بکا،چاک مەسخەرە؟ (٠٠٧
جــا،دەبۆ قیامـــەت، ئەئـــەو دونیـــایی مـــە کـوا قیامـەت جێـی خـەتای زۆر یاکەمـە؟ (٠٠٨
شـا کـوتی پاداشـی کـاری بـەد، لـەعام دا دەپۆشــێ،نەک لــەوەی خاســـە،بەڵام (٠٠٩
گـەر کـو زینـدانی بکـەم مـن، یـەک ئـەمیر ون دەکـەم ئەوکارلەمیران،نـەک وەزیـر (٠١٠
خـــوا نیشـــانی دا بـــەمن پاداشـــی کـــار ســـوورەتی ئـــەعمالی زۆرو،بـــێ ژمـــار (٠١١
تۆنیشـــــانم دە، نیشـــــانێک،چونکەمن چا،دەزانم،گـــەرچی کـــارزاهیر دەبـــن (٠١٢
جـــوابی داوەبـــۆ دەکـــەی لێم،پرســـییار؟ چـون دەزانـی تـۆ هـەموو شـت ئاشـکار (٠١٣
شـا کـوتی حیکمـەت لـەئیجادی جیهـان ئەوهـەبوو،عیلمی خوداوەنـد بـێ عـەیان (٠١٤
تـا خوداوەنـد عیلمـی خـۆی ئیفشـا نـەکرد ئێشـی منـداڵ بوون،لەدونیای،چا،نـەکرد (٠١٥
نـــاتوانی یـــەک زەمـــان بێکار،ئـــەتۆ بـاش یـا بـەد، لێـت دەبـێ ئاشـکار،ئەتۆ (٠١٦
تـــۆ تـــەقازای کـــار، بۆیـــەوا، دەکـــەی چون بـەکار،تۆ ڕازی خـۆت ئیفشا، دەکەی (٠١٧
جا،گلۆڵـەی تـەن، لـەکوێ،دەگرێ قـەرار؟ چـون بەدەسـتی دڵ، سـەری،لەیل و نـەهار (٠١٨
بۆیـــەبێ کـــار، هـــەردەبێ غـــەمبار بـــێ چـــون نـــەمان، خۆشـــتر لـــەوەی بێکـــاربێ (٠١٩
هـــەردوودونیا هـــەر دەزێـــن تـــا کـــو ئەبـــەد هەرسـەبەب داییک،ئەسـەر،بـۆ وی وەلـەد (٠٠٠

ئەسەربوو چا دەبێتن لەو، سەبەب  تا کوچا بێ لەوئەسەر، زۆرجێی عەجەب (۱۰۰۱)

سەبەب بەدوایی یەک،زەنجیر وار  چاوی تیژبین لازمە، ئەی هووشیار (۱۰۰۲)

ئێرە،گوفتوگۆی پاشاو غولام  تا کو دیتی شاسورێک، لەو خۆش کەلام (۱۰۰۳)

و ڕازی شا، دەدی لەو خۆش دەمە  هیچ موجازنین تا بەیان کەین،ئەو،ئەمە[1] (۱۰۰۴)

لەحەممام هاتەوەماڵ، ئەو غولام  بانگی لای خۆی کرد شای والا مەقام (۱۰۰۵)

کوت تۆ، لێت موبارەک بێ، حەمام  ئەی تۆ جوان و ناسک و، شیرین کەلام (۱۰۰۶)

بریبا هیچ لەوان عەیبان، نەبان  گەر لەبارەی تۆ، دەڵێ،دۆستت، فلان (۱۰۰۷)

دەبوو،هەرکەس کەدەیدی،ڕوویی تۆ  ئەو جیهانەی قیمەتە، یێک موویی تۆ (۱۰۰۸)

ئەی شا،چی بەمن کوت ئەو غولام  تا بزانم چۆنەفیکری ئەو نەفام؟ (۱۰۰۹)

کوت،ئەووەڵ کوتی دووڕوویی تۆ  گوڵ بەزاهیر،وەک دڕووی کوت خووی تۆ (۱۰۱۰)

بیستی ئەو لە شا، گوفتاری یار  ئەوجیهانەی ڕوو ن، بەڕق، لەو بوو، بەتار (۱۰۱۱)

گی سوور بوو، زۆ ڕکەفیشی هەڵخڕاند  مەو جی هەجوی زیاد لەحەد، ئەو تێپەڕاند (۱۰۱۲)

کەئەووەڵ ڕۆژ دەگەڵ من بوو بەیار  دیم ئەمن گوفتاری وی وەک ژەهری مار (۱۰۱۳)

نەبیسێ زێدە هەجوی یاری وی  دەستی خۆی شا، دادەنا، سەرزاری وی (۱۰۱۴)

کوتی من ئێستەناسیم تۆو،یار  تۆ گیبانت بۆ گەنیوە،یار زار (۱۰۱۵)

دەبێ دوور دابنیشی وەک ئەسیر  تۆ دەبی،ژێر دەستی وی بی،ئەو ئەمیر (۱۰۱۶)

حەدیسەزیکرەکی بێ، بۆ ڕییا  وەک لەسەر، سەر گوێلک، شین بێتن،گییا (۱۰۱۷)

بزانەسوورەتی جوان و تەمیز  خووی خەراب بێ، ئەرزیشی نابێ پەشیز (۱۰۱۸)

کو سوورەت ناحەزیش بێ و،نالەبار  خووی کەباش بێ، تۆ لەبۆی بە،گیان نیسار (۱۰۱۹)

تی زاهیر دەچێ بۆ لای نەمان  تا ئەبەد، مەعنا دەمێنێ، ئەی فلان (۱۰۲۰)

نەقشی گۆزەت،بوو، بەمەعشووق تاکوکەی  لابەنەقشی گۆزە، ئاو پەیدا کەدەی (۱۰۲۱)

سوورەتت دیت و، لەمەعنا غافڵی  دوڕ، لەئەسداف،بت هەوێ گەر عاقڵی (۱۰۲۲)

ەو جیهانەگشتی ئەسدافی بەدەن  گەر چی ژینی وان، لەبەحری گیان، دەدەن (۱۰۲۳)

هەموویان گەو هەری تێدا نییە  چاک بنۆڕەقەلبی وان، داخوا،چییە؟ (۱۰۲۴)

ەو هە،یاخێرئەوهەچی تێدا دەبێ؟  چونکەزۆر کەم گەوهەرێک پەیدا دەبێ (۱۰۲۵)

ڕەتی کێو تۆ تەماشا کەی ئەگەر  زۆرلەلەعلێک گەورەتر،دێ بەر نەزەر (۱۰۲۶)

---

- گەر بزانێ ڕازی وا شا، دوور نییە   نابێ بێژین ئێمەئەو ، دەستوور نییە

چاو،بەسوورەت دەست و لاق و،ڕیش و ڕوو  گـەورەتر بـوون زۆر لەنەقشـی چاو،هـەموو  ٢٧)
خۆ،بــەڵام تــۆ ئەو،وتــەم، لــێ وەر گــرە  چـاو لەگشـت ئـەعزای بـەدەن زۆر چـاترە  ٢٨)
هــەر بــەبیرێک گــەر لــەدڵ پەیـدا دەبـێ  سەت جیهان یەک دەم بەوی ریسوا دەبێ
جیســمی پاشـا گــەر بەسـوورەت،هەریەکە  زۆرلـەدووی ویـن، ڕۆژی سـوڵح و،مەعرەکە  ٣٠)
گــەرچی وایەســوورەتی شــاهی ســەفی  ئــەو ئەسـیر ی دانەیــەک بیــری خــەفی  ٣١)
چـون، بـەدووی بیر،خـەڵکی زۆر و،بێ ژمـار  هــەر وەکـوو سـێڵاو، بەعـەردی دا، بـەغار  ٣٢)
گەر چی ئەو بیر، چوو لەلای خەڵکی،بەڵام  دێ وەکــوو ســێڵاو، دەبــا دونیا،تــەمام  ٣٣)
جــــا بزانەهەربــــەبیر و ڕایەبــــەس  لــەو جیهانــەکارو شــوغڵی گشــت کــەس  ٣٤)
هەرچی قەسرە، هـەرچی خانو، هـەرچی شار  هــەرچی چـۆم و،دەشتە، هـەرچی کێوو،غـار  ٣٥)
بەحرو،ڕۆژو،ئاســــمان و، هــــەم زەوی  چۆن بەیەم،ماسی، ئـەوان زینـدوون بـەوی  ٣٦)
جا،لەبـەرچی خـۆت لەعـەقڵی کرد،بـەدوور  تــەن دەبینــی وەک ســولەیمان،بیر مــوور  ٣٧)
کێـو دەبینـی زۆر عـەزیم بـێ قـاڵ و قیـل  بیـر دەبینـی چووکـە،وەک مشـک، کێو،فیـل  ٣٨)
زۆر بـەچاوُت جێـی مەترسـی بـوو جیهـان  هــەم لەڕەعـدو بـەڕق و چــەرخ و،ئاسـمان  ٣٩)
ئــەی لەدونیای،بیر،کەکــەمکتربووی لەکــەر  غــافڵی تۆچەشــنی بــەردی بــێ خەبــەر  ٤٠)
ســوورەتی تـۆ، نیتــەهیچ عــەقڵ و شــعوور  تـۆ لـەڕێزی ئـا دەمـی بـووی، زۆر،بـەدوور  ٤١)
سـێبەرت پـێ شەخسـە،چون نـادانی تـۆ  وا لەئەشــخاس، بۆیەســووک دەڕوانی،تــۆ  ٤٢)
حـەو سـەلەت بێ تـاکو ئـەو بیـر و خـەیاڵ  دیتەپــەرواز، لێــک دەداتــن پــەڕو بــاڵ  ٤٣)
کێــو دەبینــی وەک خــوری لێدێت،نــەرم  تێک دەچێتن ئەو زەمینەی سەردو گەرم  ٤٤)
هــیچ ســەماوات وســتێرەو، هــیچ وجــوود  نینەئـەو دەم غـەیری زاتـی خـوای وەدوود  ٤٥)
مەقســەدی ئەســڵی لــەزیکری داســتان  تــا حەقیقــەت بــێ عــەیان،بۆ ڕاســتان  ٤٦)

## حەسوود بوونی خزمەتکارانی شا بە غولامی خۆشەویستی شا..

زۆرلەلای شا خۆشەویست بوویەک غولام  زۆرحەسوود بـوون بـەو،غولامی دی بـەعام  ٤٧)
مــوزدی وی زیاترلــەموزدی چــل ئــەمیر  قەدری وی زیاتر لە قەدری سەت وەزیر  ٤٨)
شانس و بـەختی چونکەزۆر بـوو ئـەوغو لام  ئـەو ئـەیاز و شـاەمەحموود، یـەک کـەلام  ٤٩)
پــێش ئــەوەی کــە، بێتــەدونیا ڕووحــی وان  دۆست و قەومی یێکتری بوون، ئەو دووان  ٥٠)
پێش بەدەن هەرچی هەبێ، ئەو ئەسڵەبەس  هـەرچی پاشان دێ ۆ دەبێ، دەڕوا، لەدەس  ٥١)

ـرفان وان،چاو لەکاری خوا دەکەن  مەزرەعەی ئەووەڵ، تەماشا، چا دەکەن (۱۰۵۲)
ـەر چی چاندیان عارفان،خۆ، بێ گومان  ڕۆژو شەو دائیم لەوێیە، چاوی وان (۱۰۵۳)
ـەرچی شەو تێیدا هەبێ، ئەو دێتەدەر  مەکرو فێڵان با دەبا،بێ دەردەسەر (۱۰۵۴)
ـبی زۆر بۆکی دەبێ دڵ خۆشکەرە  گەربیبینێ ئەو، سزای خوا ی لەو سەرە (۱۰۵۵)
ـەخسی مەغروور،داو لەنێو داو دادەنێ  خۆ، قەدەر داو دانەرو، داو، لادەنێ (۱۰۵۶)
ـەرکووشین بن،دوایەبرژێن سەت گییا  عاقیبەت هەرشین دەبێ،چی چاند، خودا (۱۰۵۷)
ـەرەسەرچانراو بچێنی تۆوی دی  دووهەمی فاسید دەبێ،ئەووەڵ،وەدی (۱۰۵۸)
جـندراوی ئەووەڵی بوو، ئیختیار  تۆوی دووهەم،فاسید و، بێ ئیعتیبار (۱۰۵۹)
ـیر ورای خۆت تۆلەلای دۆست،دابنێ  گەرچی بیر و ڕات لەوی ڕادێ، تەنێ (۱۰۶۰)
ـوعتەبەر،کوا غەیری کاری خوا دەبێ؟  عاقیبەت،چی ویست خودا،هەروا دەبێ (۱۰۶۱)
ـەرچی چاندت تۆ،بچێنەبۆخودا  چون لەبۆدۆستت ئەسیری،گیا ن فیدا (۱۰۶۲)
ـەفسی ئەممارەت ئەتۆ، قەت مەگرە، یار  دوور لەسوودەکاری غەیری کردگار (۱۰۶۳)
ـێش ئەوەی زاهیر ببێ ڕۆژی جەزا  دز،بەشەو،ڕیسوا دەبێتن لای خودا (۱۰۶۴)
ئەو شتانەی، دز، بەشەو هات،بردنی  ڕۆژی مەحشەر دێتەئەستۆو،گەرد نی (۱۰۶۵)
ـەرعقوول کۆمەک بەیێک کەن سەت هەزار  دابنێن داو،غەیری داوی کردگار (۱۰۶۶)
ـ ی خۆیان دێتەبەر چاو زۆرقەوی  خۆ،بەلام،با،لا دەبا، پووشی زەوی (۱۰۶۷)
ـەربڵەی تۆ کوانێ فائیدەی وجوود  دەو سوئالەت دا هەیە، زۆر نەفع و سوود (۱۰۶۸)
ئەو سوئالەت گەرکو بێ فائیدەیە  بۆ دەڵەی پێم،تۆ بەوی چاک،گوێ دەیە؟ (۱۰۶۹)
گەر سوئالت زۆری سوود،تێدا، ئەدی  ئەو جیهانەبۆ دەبێ سوو دی نەبێ؟ (۱۰۷۰)
ـەرلەیێک ڕێ نەی بێ هیچ قازانج جیهان  زۆرەسوودی وی لەڕێی دی،بێ گومان (۱۰۷۱)
ـەرشتێک تەنها لەبۆتۆی، سوودەبەس  ڕوو،دەوی کەگوێ مەدەگوفتاری کەس (۱۰۷۲)
جوانی یوسوف فائیدەی دا بوو، بەجەم  بۆ برایان نەی بوو غەیری دەردو غەم (۱۰۷۳)
دەنگی داوود هێندەخۆش و،دڵ نەواز  بێ ئەسەر بوو، بۆکەسێک بێ حاڵ و واز (۱۰۷۴)
زۆرلەئاوی ژین، خۆشتر، ئاوی نیل  خوێنەلا ی مونکیر کەدەودا بوو،زەلیل (۱۰۷۵)
ـۆ شەهید تەبدیل دەبێ، مردن، بەژین  مردنی شەخسی مونافیق،بۆ، ڕزین (۱۰۷۶)
بێژەبۆمن تۆ لەدونیا نیعمەتێک  گەر نەبێ،بێ بەش لەوی،قەت ئومەتێک (۱۰۷۷)
کوانێ سوودی ئەنگەبین،بۆگاوو کەر؟  دیار کرا خۆراک لەبۆ گشت گیان لەبەر (۱۰۷۸)

بـۆ غـەزا گـەر نەفسـی کـرد ئـەو موقتـەدا　　مورشـیدی کامیـل دەبـی ئـەو پەنـد بـدا ۷۹)
وەک نەخۆشـێک گـەر گوڵی زۆ رخـۆش دەویٚ　　وا دەزانـــی ژینـــی بـــۆدیٚ ئەو،لـــەویٚ ۸۰)
ڕزقـی ئەسـڵی ئـەو لـەبیر خـۆی،بردووە　　ڕووی دەڕزقـــی دەرد هێنـــەر، کـــردووە ۸۱)
ســـەممی دەخواو،ئەنگـــەبینش لا دەنـــی　　ئـەو لـەجێی خـۆراکی بـاش سـەم دا دەنـی ۸۲)
ڕزقـی ئەسـڵی بـۆ بەشـەر، نـووری خـوا　　ڕزقـــی حـــەیوانی لـــەبۆوی نـــارەوا ۸۳)
چـــون نەخۆشـــە،بۆیەئەو خســـتوویەدڵ　　ڕۆژو شـەو خـۆراکی خـۆی، لـەو ئـاوو گـڵ ۸۴)
ڕەنـــگ زەرد و لاق لـــەرزو، دڵ زەعیـــف　　کـــوا تـــەعامی ئاســـمانی زۆر زەریـــف؟ ۸۵)
ئـــەو غـــەزا و خـــۆراکی ئیماندارەبـــەس　　نـــا خـــواتن، ئـــەو بـــەزاری هـــیچ کـــەس ۸۶)
هـات ڕزقـی ڕۆژ لـەنووری عەرشـی گـەش　　بۆحەسـوودو، دێو،لـەدوودی عـەردی ڕەش ۸۷)
بـۆ شـەهیدان(یرزقـون)ی، کـوت خـودا　　زەرف و زار، لازم نییـــەبۆ ئـــەو غـــەزا ۸۸)
دڵ لەهـــەر یارێـک دەخـوا، یـەک غـەزا　　دڵ لەهەرعیلمێک، لـەبۆی دیٚ یـەک سـەفا ۸۹)
سـووڕەتی ئینسـا ن وەکـوو کاسـەی تـەعام　　چـــاوی مـــەعنا ئـــەو دەبینێتن،تـــەمام ۹۰)
جێگـەبۆ فێـر بوونـەبۆت، دیـداری خـەڵک　　تـۆ لەدۆسـتا ن فێـر دەبـی، تشـتی بەکـەڵک ۹۱)
دوو ســـتێرە،لێک بـــبن نیزیـــک ئەگـــەر　　بـێ گومـان لایـق بـەوان دوو،دیٚ ئەسـەر ۹۲)
پیـــاووژن نیزیـــک بـــبن لێک،دیٚ،بەشـــەر　　بـەردو ئاسـن لێـک بـدەی، گـڕ، دیتـەدەر ۹۳)
خـاک و بـارا ن گـەرکو نیزیـک بن،لـەیێک　　میوە،هـەم ڕەیحانە،هـەم گـوڵ دیٚن،گـەلێک ۹۴)
گـــەرکونیزیک بـــێ لەشـــینکە، ئـــادەمی　　شـــادو بـــێ غـــەم، دا دەنیشـــێ،ئەودەمـــی ۹۵)
گـەرکونیزیک بـێ لەخۆشـی گیـانی مـە　　چـــادەبێ چاکی،لەگـــەڵ ئیحســـانی مـــە ۹۶)
گـەر لەتـەفریح ئێمەشـادین دەسـکەویٚ　　جیســـمی ئێمـــەخواردنی ئـــەودەم دەویٚ ۹۷)
خۆ،لـەخوێن نیزیکـەجوانی ڕوویـی سـوور　　خـــوێن لـــەڕۆژ پەیـــدا دەبێ،لێیدا،کـــەنوور ۹۸)
چـاکترینی ڕەنـــگ لـــەدونیا، ســـووریە　　دیٚ لـــەڕۆژڕا،ڕەنگی ســـوور،وەک نووریـــە ۹۹)
گەرزوحـەل نیزیـک ببێ،لەو،یـەک زەوی　　شـــۆرەکاتەهیچ شـــین نـــابێ لـــەوی ۱۰۰)
قووە،دیتـــەفیعل، گـــەر بـــێ ئیتتیفـــاق　　وەک دەگـەڵ دیـو بـن رەفیق،ئـەهلی نیفـاق ۱۰۱)
مەتڵـەبی وا،گـەر بچووک،لـەو دەورەیـە　　عالـــەمی مەعنا،گـــەلێک پێی،گـــەو رەیـــە ۱۰۲)
گـــەورەیی زاهیـــر دەچێ،ئـــەوهیچ نییـــە　　گـەو رەی ئەسـڵی فەقـەت بـۆ مەعنییـە ۱۰۳)
بـــۆ مـــەقام و گـــەو رەیی،یـــاچی وچـــی　　زۆرلەبۆئیـــدی دەکەن،گـــەردەن کـــەچی ۱۰۴)
بـۆ مـەقام و،گـەو رەیـی دونیـایی دوون　　خـۆ دەکـەن خـەڵکی لـەبۆ ئیـدی، زەبـوون ۱۰۵)

جــوو لــەدەورەم گــەرچی ئێرە،مەســکەنم    من لەعیززەت گەرچی وەک ڕۆژ ڕەوشەنم (۱۱۰۶)
ڕۆژ لەئاسـمان، مەشـریقی وی، تـارو ڕەش    ڕۆژی ئێمــەنیتی مەشـریق، ڕوون و گــەش (۱۱۰۷)
مەشــریقی وی،یــانی مــەوجووداتی وی    تــــالیع و غاریب،کـــەنابێ، زاتـــی وی (۱۱۰۸)
گــەرچی ئێمــە، نــین لــەنیزیکانی حــەق    دای بەئێمـــــەنووری نیزیکان،شـــــەبەق (۱۱۰۹)
لەدووی شەمسم ئەمن دیسان،عەجەب    گەورەیی شەمسە، کەبوو، بۆ وی سەبەب (۱۱۱۰)
ڕۆژ لەسـەر ئەسـباب هـەموویان، موتتـەلیع    هەربـەوی بـوو داوی ئەسـباب، مونقـەتیع (۱۱۱۱)
هیچ ئومێـدم مـن، بەشەمسـی خـۆم نـەما    تـۆ دەکـەی بـاوەڕ بـەگفتی مـن، چ مـا؟ (۱۱۱۲)
تـۆ نەکـەی بـاوەڕ، وەلانـێم مـن هـەتاو    دوور بـوونم لـەو، وەکـوو ماسـی لـەئاو (۱۱۱۳)
ئومێـدیش بـم ئەگەر،ئەی خۆشەویست    هەرهـەتاوە، وای لـەمن کـرد،وام دەویسـت (۱۱۱۴)
چۆن دەبێ مەسنووع لەسانیع بێ جـودا؟    کـێ بەعالـەم سـوود دەدا غـەیری خـودا؟ (۱۱۱۵)
بوونی مـەوجـوودات بـەوی وابەسـتەیە    دەسـتگیری گشـت گرووهـو ، دەسـتەیە (۱۱۱۶)
هەرکەسێک دەریای بەجێگای، سوود نەدی    زیندەڕووگـــەی نوێ،لـــەبۆ وی دێنـــەدی (۱۱۱۷)
ئەوی سوێری خـوارد، لـەدەریای خـۆش ئـاو    تـا کـو کـوێری کـرد ئـاو ی سـوێر، چـاو (۱۱۱۸)
بەم دەڵـێ تـۆ، ئـاو بەدەسـتی ڕاس وەخـۆ    تـاکو چـابن هـەر دوو چـاوی کـوێری تـۆ (۱۱۱۹)
زەننـی ڕاسـتم مـن لەدەسـتی ڕاس مـوڕاد    چون بەوی دێ، باش و بەد، هەم زوڵم وداد (۱۱۲۰)
تیزەسوڕێن هـەر هەیـە، ئـەی خـۆش وتـار    بۆیــەجارجار ڕاســتە، جارجــارەش خــووار (۱۱۲۱)
عیشقی شەمسـەگەر کو ئێمـەی کرد فـەنا    ئـەو نـەبێ،چۆن کـوێر دەکـەین، بینا،دەنـا؟ (۱۱۲۲)
ئـەی زیبـا ئەلحـەق حیسـامەددین، زوو    ئــەو دەواکــەن، کــوێر ببێ،جـا، با،عــەدوو (۱۱۲۳)
تــۆ دەواو دەرمـــانی زاتـــی کردگـــار    لا دەبــەی زوڵمــەت، لەقــەلبی نـا بــەکار (۱۱۲۴)
ئـەو دەوای گـەر کـوێر لەسـەر چـاو دابنـێ    لادەبـــا، تـــاری لـــەچاوی،تا بنـــێ (۱۱۲۵)
تـۆ دەوا کـەکوێر دڵان، غـەیری حەسـوود    چون حەسوودی کردی بۆ تۆ، ئەو جەحوود (۱۱۲۶)
تـۆ حەسـوودت هـەر کەسـێ، بێـتن ئەگـەر    گیـان نـەدەی بـەو، گیـانی وی بـا بێتـەدەر (۱۱۲۷)
هـەر کەسـێکی گـەر، بـەتاوێ، بـوو حەسوود    یاغـەمین بـوو چونکـەتاو هـەیتی وجـوود (۱۱۲۸)
چـاوی کـوێرەو دەردی بـێ دەرمانـە، ئـەو    کەوتـــەچاڵی قـــووڵ، دڵـــی بریانە،ئـــەو (۱۱۲۹)
دەیهــەوێ ئینکــار بکــا، تــا وی ئــەزەڵ    دا،بڵــێ کــەی دیتەدی،ویســتی دەغــەڵ (۱۱۳۰)
بــاز، دەبــێ دووبــارەبێ، لای شــایەکەی    کوێرەبــاز، گــەر ون بکــا، ڕێگایەکــەی (۱۱۳۱)
ون بــوو ڕێگای،کەوتــەنێو وێرانــەباز    کەوتـــــەنێو کونـــــدان،بازی وا،بـــــەناز (۱۱۳۲)

ئەو سەرا سەر،نوور لەنووری خوای ڕەزا    چاوی وی کوێر کرد مەئمووری قەزا (١١٣٣
خۆڵی خستەچاوی ڕێی لێ ون دەکرد    جا،لەبۆ جێی کوندو،وێرانەی دەبرد (١١٣٤
لێی دەدەن،کوندان دەشێوێ حاڵی وی    هەڵدەکێشن توو ک و، هەم شاباڵی وی (١١٣٥
کەوتەنێو کوندان غەوغا و،وەلوەلە    باز هات تا بگرێ، جێمان ئەو چەلە (١١٣٦
حەملەیان، هەروەک،سەگان،بۆ وی،دەبرد    ئەولیباسەی بووی دەبەر،لەتیان دەکرد (١١٣٧
باز دەڵێ من کوانێ جێم ئێرانەیە؟    دام بەئێوەهەرچی جێی وێرانەیە (١١٣٨
لێرەنابێ من بمێنم،هەردەڕۆم    دەچمەوەبۆ لایی شاەنشاهی خۆم (١١٣٩
چیدی ئەی کوندان ئازارم مەدەن    لێرەنامێنم، دەڕۆم، بۆ لای وەتەن (١١٤٠
جێگەژینتان،ئەوکەلاوەی کون کونە    جێگەژینم قۆڵی شابوو، لێم ونە (١١٤١
کوند کوتی باز، فێڵەبازە، خۆش، ئەدا    خان و مانمان دەیهەوێ لێ تێک بدا (١١٤٢
دەیهەوێ بگرێت ماڵمان، ئەو، بەفێڵ    ژینی خۆش و،ڕوونمان کا، تار و لێڵ (١١٤٣
وای نیشان دا،خۆی کەنیتی هیچ نیاز    زۆر لەئێمەزێدە، هەیتی حیرس و ئا ز (١١٤٤
بۆتەماع خۆشی دەوێ ئەو، خاک و خۆڵ    دووگەمەسپێرن بەورچی شاخ و دۆڵ (١١٤٥
چونکەقۆڵی شایەجێی، لاف لێدەدا    کوا فەقیران ئەو لەلای خۆی،ڕێدەدا؟ (١١٤٦
تەیری وا چووک،کوا دەبێ،شا،یاری وی؟    تۆنەکەی باوەڕ بکەی گوفتاری وی (١١٤٧
جینسی شایە، داخوا، یاخۆ، وەزیر؟    کوا تەناسوب بەینی هەڵواو گوێزو،سیر؟ (١١٤٨
هەرچی دەیڵێ،ئەو لەمەکرو فێڵ و فەن    شا، دەگەڵ عالەم، ئەمن داوا، دەکەن (١١٤٩
زۆر عەجەب، لەو ما لیخولیای نا لەبار    زۆرعەجەب لەو لاف و،داوی شێت و هار (١١٥٠
هەرچی باوەڕکا، ئەوەی، نادانەئەو    تەیری وا کوا، لایقی شایانە،ئەو؟ (١١٥١
کەمترین کوند گەر لەمەغزی وی بدات    کوانێ یاری دێ لەشا،ئەودا، نەجات (١١٥٢
بازکوتی گەر هەرپەڕێکم، بێتەدەر    نەسلی کوند، لای شاە، دەرنا بات، سەر (١١٥٣
نەک فەقەت کوند، بەڵکەبازیش بێ، ئەگەر    حەزیەتم کا،بێ بەمایەی دەردەسەر (١١٥٤
شا، لەشاخ و دەشت و دۆڵ غەوغا دەکا    جا،لەکەللەی باز،کێوان چا دەکا (١١٥٥
لوتفی شاهەنشایەبۆمن پاسەوان    ئەو لەلای من حازرە، ڕۆژو شەوان (١١٥٦
قەلبی شایە،بۆتەجێگەی دائیمیم    گەر لەوێ لاچم،دەبێ ئەو، زۆرسەقیم (١١٥٧
گەرکو پەروازم بدا، دەستووری وی    من بەسەر دڵ دا دەڕۆم،وەک نووری وی (١١٥٨
چەشنی مانگ و ڕۆژ دەبێ، من هەڵفڕم    هەرچی پەردەی بێت ئاسما ن، دەیدڕم (١١٥٩

ـکری من بوو گشت عەقولی کرد، ڕوون ‏ ‏ ویستی من عەردو، سەمای،هینایەبوون (۱۱۶۰)

ـزم و،حەیران لەکاری من هوما ‏ ‏ تێدەگەن کوندان لەکاری من، چ ما؟ (۱۱۶۱)

ـا.کەمێکی بوم، لەزیندان،یاد کرد ‏ ‏ سەت هەزار زیندانی ئەو، ئازاد،کرد (۱۱۶۲)

ـوەێتکی من دەگەڵ کوندان گەڕام ‏ ‏ بۆیەکوندان، بوون بەبازی خۆش مەڕام (۱۱۶۳)

خۆش بەحاڵی کوندی هاو پەروازی من ‏ ‏ ئەو لەبەختی باشی زانی،ڕازی من (۱۱۶۴)

ۆرنەلای من تا بەبەخت و،ناز بن ‏ ‏ گەرچی کوندیش بن،بەچەشنی بازبن (۱۱۶۵)

هەر کەسێکی بێ، دەگەڵ شای وا حەبیب ‏ ‏ بچتەهەرجێ،قەت کەنابێ ئەو غەریب (۱۱۶۶)

هەرکەسێکی شا،لەبۆ وی بوو، دەوا ‏ ‏ گەرچی ناڵەی بێت،نابێ، بێ نەوا (۱۱۶۷)

ـگ پەرەست نیم، مالیکم من،نەک گەدا ‏ ‏ شا،لەبۆخۆی تەپڵی بازیم،لێدەدا (۱۱۶۸)

تەپڵی بازی من،نەدایی (ارجعی) ‏ ‏ خوا گەواهەبۆم، بەکوێری موددەعی (۱۱۶۹)

ـن لەجینسی شاه، نیمە، دوور، لەوی ‏ ‏ مەزهەری ویم،من کەدەگرم نوور، لەوی (۱۱۷۰)

خۆ، تەجانوس،شکڵ و زات تەنها نییە ‏ ‏ چاو مەگەر،ئاو،جینسی خاک،دەگیا نییە؟ (۱۱۷۱)

جینسی با، نار، چون بەبا،بوو ڕوون و خۆش ‏ ‏ جینسی تەبعە،خەمر،چون بەو دێتەجۆش (۱۱۷۲)

جینسی ئێمە، چون لەجینسی شا، نییە ‏ ‏ دەو وجوودی وی،وجوودمان فانییە (۱۱۷۳)

جون وجوودی ئێمەچوو، ئەو ماوەفەرد ‏ ‏ من لەژێر پێی ئەسپی وی چیم؟ تۆزوگەرد (۱۱۷۴)

بوون بەخاک جیسم وئەسەرهیچیان نەمان ‏ ‏ جێگەپێی حەق بوو لەسەر ئەوخاک نیشان (۱۱۷۵)

خاکی ژێر پێی وی بە، تۆ بۆ ئەونیشا ن ‏ ‏ تا کو بییەتاج لەسەر گەردەن کەشان (۱۱۷۶)

ـوورەت و شکڵم فریو تان، با، نەدا ‏ ‏ من بناسن پێش وتەی دەیکەم ئەدا (۱۱۷۷)

ـۆر دەبێ سوو ڕەت کەسێ، گومڕا دەکا ‏ ‏ سوو ڕەتا ن تەوهین، بەڵا م بەخوا دەکا (۱۱۷۸)

جیسم وگیان مەڕبوو ت بەێتک بوون بێ گومان ‏ ‏ جینسی ێتکتر نین دیارە، جیسم وگیان (۱۱۷۹)

گەڵ سپێنەی چاو،نووری چاوە،جووت ‏ ‏ نووری دڵ چۆ قەترەخۆێتێک، ڕووت و قووت (۱۱۸۰)

جێی سروور گورچیلە،جێگای غەم جگەر ‏ ‏ عەقڵەوەک شەمعێک لەنێوان مەغزی سەر (۱۱۸۱)

ئەوعەلاقانە، هەنە، بێ وێک چوون ‏ ‏ عەقڵی ڕوو ن، بۆ، فەهمی وا بوو، زۆر زەبوون (۱۱۸۲)

گیانی کول بۆ گیانی جوزئی،کرد،زەهوور ‏ ‏ گیان لەوی وەر گرت گەوهەر،یانی نوور (۱۱۸۳)

چاو لەمەریەم گەر چلۆن بوو کاری وی؟ ‏ ‏ چۆن مەسیحای پاک هات،بۆ،باری وی (۱۱۸۴)

نەک مەسیحایەک،کەبەحرو بەڕ،بوو جێی ‏ ‏ بەل مەسیحایەک،مەساحەت دوور بوو لێی (۱۱۸۵)

چون بەگیانی، نوور وەهادا، گیانی گیان ‏ ‏ بەوگیانەش ڕوون و ڕەو شەن بوو، جیهان (۱۱۸۶)

لـــەو جیهانـــەچا دەبـــێ دونیـــایی دی ‌ ‌ ‌ جا، قییا مـەت بـۆ هـەموو کـەس دیتـەدی ٨٧)

چـون قییامــەت زۆر هەنە،دێن،دەمبــەدەم ‌ ‌ ‌ نـــاتوانم مەحشـــەران تـــەوزیح بـــدەم ٨٨)

ئـــەو وتانـــەم ئیلتیماســـن لای خـــودا ‌ ‌ ‌ چـون جـەوابی عەبـدی خـۆی ئـەو،زوو دەدا ٨٩)

هـەر کەسێک گـەر،گازبکا،خوای لـەو سـەرە ‌ ‌ ‌ زوو جـــەوابی خـــوا لـــەبۆ وی حـــازرە ٩٠)

جـوابی وا، نـای بیسـی تـۆ تـەنها بـەگوێ ‌ ‌ ‌ گشتی ئەعزات ئەو دەبیسن جوێ بەجوێ ٩١)

**خشتە هاویشتنی یەک تەفەر تینو، لەسەر دیوار، دەجۆگەی ئاو ..**

ژێـــری دیوارێـــک بڵینـــد،جۆگێک ڕوون ‌ ‌ ‌ بـــوو لەســـەردیوار تینـــوو یـــەک،زەبوون ٩٢)

مـــەنعی وی بـــۆ ئـــاو، ئـــەو دیـــوار بـــوو ‌ ‌ ‌ ئـەو لـەبۆ ئـاو، چەشـنی ماسـی زار بـوو ٩٣)

خشـتەکی بـۆ نێـو ئـا و، ئـەو خسـتەخوار ‌ ‌ ‌ هاتەگوێی وی دەنگی ئاو، وەک دەنگی یار ٩٤)

وەک وتـاری یـاری جـوان وخـۆش کـەلام ‌ ‌ ‌ مەست دەبوو بەو، وەک شەرابی،لەعل فام ٩٥)

چونکـەدەنگی ئـاو خـۆش بـوو لایـی، لاو ‌ ‌ ‌ یەک یەکەی خشت، هەڵدەقەند، دەیخستەئاو ٩٦)

ئـاو بـەدەنگی زۆر بڵینـد، پێیکـوت، ئـەتۆ ‌ ‌ ‌ بـۆ بەخشـت پـێم دا دەدەی، دا دەی،لـەبۆ؟ ٩٧)

تینوو پێیکوت سوودی من، ئەی ئاوی جوان ‌ ‌ ‌ دوونـە، دەس هـەڵناگرم قـەت قـەت لـەوان ٩٨)

سـوودی ئـەووەڵ،دێ لـەئاو ڕا،بـۆ م،دەنـگ ‌ ‌ ‌ دەنگـی ئـاو بۆتینووان،خۆشـتر لەچـەنگ ٩٩)

دەنگـی ئـاو وەک دەنگـی ئیسـڕافیلە،دێ ‌ ‌ ‌ مـردووا ن زینـدوو دەکـا، ئـەو جـێ بـەجێ ٠٠)

یانـــەدەنگی هـــەو ری ڕۆژانـــی بـــەهار ‌ ‌ ‌ ئـــەو جیهانـــەجوا ن دەکـــا بـــەو،کردگار ٠١)

یانـــەبۆ دەروێـــش وەک ڕۆژی زەکـــات ‌ ‌ ‌ یـا نـەبۆ زینـدانی، وەک مـوژدەی نـەجات ٠٢)

یـــاوەکوو بـــۆنی خـــودا دێ،لای یەمـــەن ‌ ‌ ‌ دێ دەگاتەئەحمـــەدی ساحەب،ســـونەن ٠٣)

چەشـنی بـۆنی ئەحمـەدی سـالا ری دیـن ‌ ‌ ‌ لا ی خوداوەنـــد بـــۆ، شـــەفیعەلموزنیبین ٠٤)

یانـــەبۆنی یـــو ســـوفی وا نـــا ز دار ‌ ‌ ‌ دێ دەگاتـــەگیانی یـــەعقووبی نـــەزار ٠٥)

سـوودی دیـم، هەرخشـت لـەدیوار لابـەرم ‌ ‌ ‌ مـن لـەئاوی سـاف و،جـوان نیزیـک تـرم ٠٦)

چونکەدیوار،هەڵقـەنم گـەر خشـتی وی ‌ ‌ ‌ کەمکەمـە،دیوار دەبـێ، پەسـت و نـەوی ٠٧)

مـــووجبی قووڕبە،کـــەدیوار بـــوو نـــەوی ‌ ‌ ‌ تـــا هـــەبێ دیـــوار نـــابێ وەســـڵی وی ٠٨)

سـەجدەیە ، هەڵقەنـدنی خشـتی لـەزیب ‌ ‌ ‌ مووجیبـە بـۆ قـوڕب ( واسـجدواقترب ) ٠٩)

تـــاکو دیـــوار هەربڵینـــد و ســـەرکەشـــە ‌ ‌ ‌ ســـەر لەتـەعزیم و لەســـەجدەبێ بەشـــە ١٠)

تـا نـەبین لـەو جیسـمی خاکیمـان نـەجات ‌ ‌ ‌ غـەیرەمومکین سـەجدەبۆ ئـاوی حـەیات ١١)

جـا لەسـەر دیوار،تینـووتـر لـە گشـت ‌ ‌ ‌ پێش هـەموویان لادەبـاتن ، سند و خشت ١٢)

ـەرچی دەنگی ئاوی زیاتر خۆشەلا    هەرچی سندەی گەو رەتر بێ، لای دەبا (١٢١٣)

ـەو بەدەنگی ئاو، دەبێتن شاد و مەس    غەیری وی نابات سوود لەو دەنگە کەس (١٢١٤)

حۆش بەحاڵی وەی،کەبوو ئەو دەم،جەوان    قەرزی خۆی ئەو هیچ نەهێشتن،گشتی دان (١٢١٥)

ـەو زەمانەی، ئەو کەهەیبوو تاوو تین    ساغ و سالم،ساف و سادق، دوور لەکین (١٢١٦)

ـەو زەمانی لاوی،چەشنی باغی جوان    میوە،بێ نوقسان دەدا،مایەی ژییان (١٢١٧)

ـێوی شەهوەتەهەم تاوو تین    ئەو زەمینی تەن بەوی وا، سەو زو شین (١٢١٨)

ـاختومانێکە، بڵیند و ئاوەدان    چوار دیوار محکەمە،بێ عەیبە،بان (١٢١٩)

ـیش ئەوەی ڕۆژانی پیری بێتەلات    یەک تەنافی محکەم ئەو، دەملت،بخات (١٢٢٠)

ـت دەبێ پیر،خاکی وی وەک شۆرەکات    شۆرەکات،گیای جوانی قەت لێدەر نەهات (١٢٢١)

ـێ قودرەت،ئاوی شەهوەت، لەو بڕا    پەردەیی نەفعی، لەنێو عالەم درا (١٢٢٢)

ـۆ بڕۆی وەک یالی ئێستر هاتەخوار    ئا و لەچاوی دێتەخوار و،چاو تار (١٢٢٣)

ـۆ جرووک هەرچەشنی پشتی سووسمار    گفتو گۆ،و تامی دەدان، نایەن بەکار (١٢٢٤)

ـێ دەبێ شەو،ڕێ درێژ و،لاق شەل    کارگا،وێران، لەدەس چوو کار و هەل (١٢٢٥)

ـەیی عاداتی بەد، محکەم بووە    قودرەتی هەڵقەندنی وان،کەم بووە (١٢٢٦)

**دەستوور دانی فەرمانڕەوا بەو کابرایەکەدڕووی لەسەرڕێگا چاندووە،هەڵی قەنێ ...**

ـێک ئەوەی کە،خۆش کەلام بوو،ترش ڕوو    ئەو لەسەر ڕێگای چەقاند دانێک،دڕوو (١٢٢٧)

ـوار زۆریان مەلامەت لەو دەکرد    لابەرەتۆ، ئەودڕوو یە، لای نەبرد (١٢٢٨)

ـەو دڕوویەڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەبوو    هەرچی چووبا،ئەو دەلاقی ڕا دەچوو (١٢٢٩)

ـەو دڕوو،دەدڕا، لیباسی ڕێبوار    لاقی دەروێشا ن دەبوو بەو، زامدار (١٢٣٠)

ـێدەکوت حاکم،دەبێ لای بەی،لەوێ    جوابی دا،باش،مۆڵەتم مەن لێت دەوێ (١٢٣١)

ـ وەێنێک دەیکوت کەئەو ڕۆ، نا، سبەی    تا دڕوو محکەم دەبوو،زۆر، ڕیشەکەی (١٢٣٢)

ـکو ڕۆژێک پێیدەکوت حاکم،وەرە    بەس درۆ کە، ئەو دڕوویە، لا بەرە (١٢٣٣)

حـۆبی دا، ڕۆژمان گەلێکن، مامە،خۆ    پێیدەکوت تەئخیر مەکە، بەسسەدرۆ (١٢٣٤)

ـۆ کەوەعدەت دا سبەینێ،ئەی فلان    خۆ،کەهەر ڕۆژێک دەڕوا، دێ زەمان (١٢٣٥)

ـەو دڕوویەڕۆژ بەڕۆژ محکەم دەبێ    ئەو دڕوو هەڵقەن،تەوانی کەم دەبێ (١٢٣٦)

ـووتین دەگرێ دڕوو،جوان و زەریف    ئەو دڕووهەڵقەن دەبێ پیرو زەعیف (١٢٣٧)

ئـەو درووی هـەر ڕۆژ دەبێـتن سـەوزو شـین ‌ ‌ ‌ ئـەو درووی هەڵقـەن، دەبـێ، بـێ تـاوو تـین (۳۸-
پیردەبـی تـۆ، جـوان دەبێ،ئـەو خـاری پـیس ‌ ‌ ‌ زوو کـەتا کـو، ڕۆژگـار نـەچووە، لـەکیس (۳۹-
خەسـڵەتی پیسـت بزانـە، تـۆ، دڕوون ‌ ‌ ‌ زۆر کـەڕەت وابـو، دەگیانـت ڕا دەچـوون (۴۰-
تۆ،لەخووی خۆت، زۆرکەڕەت،بووی زامدار ‌ ‌ ‌ چونکـەبێ حیسسـی،لەلای تۆ،نادیـار (۴۱-
گـەر برینـی خـەڵکی دیکـەت دی بـەچاو ‌ ‌ ‌ خسـڵەتی پیسـت ئـەوانی خسـتەداو (۴۲-
غـافڵی ئـەمما لەئێشـی خۆت،کـەنا ‌ ‌ ‌ خـزم و بێگانەت،لـەدەرد و،ڕەنـج دەنـا (۴۳-
یـا، وەکـوو مـەردان بگـرەدەس، تەبـەر ‌ ‌ ‌ وەک عەلی،لـەو خەیبـەرە، دەر بێنـەدەر (۴۴-
یانەوەسـڵی گـوڵ کـە، تـۆ، زوو، ئـەودڕوو ‌ ‌ ‌ نـووری یـارت وەسـڵی نـار کـە،زوو بـەزوو (۴۵-
تـا بـەنووری وی خـەموو ش بـێ نـاری، تـۆ ‌ ‌ ‌ وەسـڵی ئـەو گوڵشـەن بکاتن،خـاری تـۆ (۴۶-
تـۆ وەکـوو دووزەخ،بـەڵام ئـەو موئمینـە ‌ ‌ ‌ کوشـتنی ئـاگر، بەموئمین،مومکینـە (۴۷-
دووزەخـی تەوسـیف دەکرد،سـالاری دیـن ‌ ‌ ‌ شـین دەگێڕێ،ئـەو لـەترسـی مـوئمینین (۴۸-
ئـەو دەڵێ،مـوئمین بـڕۆ لام،چەشـنی بـا ‌ ‌ ‌ چونکـەنوورت سـۆزی نـاری مـن، دەبـا (۴۹-
جـاهیلاکی نـار، نـووری موئمینـە ‌ ‌ ‌ چونکـەبێ زیـد، دەفعـی زیـد،کوا مومکینـە؟ (۵۰-
ڕۆژی عـەدڵ و داد،زیـددن،نوورو نـار ‌ ‌ ‌ نـار لەقەهرو،نوور،لـەلوتفی کردگـار (۵۱-
بـت هـەوێ گەر،تۆنـەجاتت بـێ لـەنار ‌ ‌ ‌ تۆ،بەسـەر نار،ئـاوی ڕەحمـەت بێنـەخوار (۵۲-
مەنبـەعی ئـەو ئـاوی ڕەحمەت،موئمینـە ‌ ‌ ‌ ئـا وی ژینیش،ڕووحـی پاکی،موحسـینە (۵۳-
جـا، لەبـەر وی،بۆیەهەڵـدێ نەفسـی تـۆ ‌ ‌ ‌ جینسـی تـۆ چـون ئـاگرە، ئـەو ئـاوی جـۆ (۵۴-
بۆیـەنار کـردی لەدەسـتی ئـا و، فیـرار ‌ ‌ ‌ چونکـەئاو نـابوود دەکا،گـەرمایی نـار (۵۵-
حیسـس و فیکـری تـۆ لـەئاگر چـا دەبـێ ‌ ‌ ‌ حیسس و فیکری شێخ،لەنوور پەیدا دەبێ (۵۶-
گـەر بەسـەر نـار دا بکـا ئـەو، ئـاوی نـوور ‌ ‌ ‌ قرچـەقرچی ئـاگری دێـتن لـەدوور (۵۷-
هەر کەقرچەی هات،بڵێ بەو،مەرگ و دەرد ‌ ‌ ‌ دووزەخـی نەفسـت،هەتا بـێ سەرد،سـەرد (۵۸-
تا،نەسـووتێ،تۆ گوڵسـتانت،بەوی ‌ ‌ ‌ تـا نەسـووتێ،داد و ئیحسـانت،بەوی (۵۹-
جـا، لەپاشـان هـەرچی چانـدت، بـەر، دەدا ‌ ‌ ‌ لالەهەم،نەسـرین دەگـەڵ عەنبـەر، دەدا (۶۰-
ئەوچەلـەش ئێمەلـەڕێگا، چووینـەدەر ‌ ‌ ‌ ڕێـن نیشـان دە،سـەروەرم ئـەی تـاجی سـەر (۶۱-
وام دەکوت مـن، بـۆ حەسوودی گێژ و وێژ ‌ ‌ ‌ تۆ،کـەرت چـوا رلاقـی لەنگـەو،ڕێ درێـژ (۶۲-
تێپـەڕی عـومرت، لەباشـی، بـێ بەشـی ‌ ‌ ‌ سـەهمی تۆ،هـەرکاری پـیس و، ڕوو ڕەشـی (۶۳-
چونکەڕیشـەی داری تـەن، کرمـی هەنـە ‌ ‌ ‌ تۆ،لەبۆسـووتان، ڕیشـەی هەڵقەنـە (۶۴-

ڕۆژ درەنگـــــــەڕێبوار،ئاگا ببـــــــێ     تـــــاوی عــــومریش،چی نـــــەما،ئاوابێ (١٢٦٥)

ئـــەو دووڕۆژەی تۆلـــەعومرت ماووتـــە     ســـەرفی جوودو،بەخششـــی کـــە، باووتـــە (١٢٦٦)

تۆبچێنەئـــەو کەمـــە، تـــۆ وەی لـــەلات     تا،بـــەعومری زۆر درێـــژ، بکرێی،خـــەڵات (١٢٦٧)

ئـەوچرای ڕوونـاک،خۆت بـێ غـەم نەکـەی     تـۆ پلیتـەو نـەفتی وی قـەت کـەم نەکـەی (١٢٦٨)

هەرمـــەڵێ پاشان،کەپاشـــان،چوو بـــەغار     با،لـــەکیس نـــەڕوا تـــەواوی ڕۆژگـــار (١٢٦٩)

گـــوێ لەپەندم،هەڵخە،تـــەن زیندانەهـــەر     تـــۆ لیباســـی کـــۆن فڕێـــدە،نوێ کەبـــەر (١٢٧٠)

ڕێ‌ببەخشـــە، لێـــو ببەســـتە،کەم بڵـــێ     هەرســـەخی بـــە،تۆ لەبەرخیســـەت هـــەڵێ (١٢٧١)

تەرکی شەهوەت تـەرکی لـەززەت، بووسـەخا     ئەوکەســـەی شـــەهوەت پەرەســـتەبوو فـــەنا (١٢٧٢)

حـــوود، لـــەداری جەننـــەتی ســـوبحانییە     وای بـــــەحاڵی وەی،دەدەســـــتی دانییـــــە (١٢٧٣)

عورووەتـــو لوســـقایە)، خـــۆ، تـــەرکی هـــەوا     جـــوود، دەبـــاتن ڕووحـــی ئینســـان،بۆ ســـەما (١٢٧٤)

... ری بەخشـــش،تۆ لـــەبۆلای ســـەر دەبـــا     تا،بەئەسـلی خـۆت دەگـەی،تۆ هـەر دەبـا (١٢٧٥)

یوســـوفی تۆ،ئـــەو جیهانـــەش چەشـــنی بیـــر     جـــــا، تەنافت،تاعـــــەتی ئەڵڵای،قـــــەدیر (١٢٧٦)

یوســـــوفی جـــــوان، ئـــــەو تەنافەهاتـــــەلات     بگـرەدەس بـەو،تاکو بـت بـێ تـۆ، نـەجات (١٢٧٧)

خـــوا شـــوکر، مـــن ئـــەو تەنافـــەم، وێـــدرا     فـەزل و ڕەحمـەت، هـەر دوو لێکرام،پێـدرا (١٢٧٨)

تـــا،ببینی عالـــــەمی تـــــازەی گیـــــان     عالەمێکەئاشـــــــــکرایە، زۆر نیهـــــــــان (١٢٧٩)

ئـــــەو جیهانـــــەی تۆدەبینی،فانییـــــە     ئـــــەو جیهانـــــەی نادیار،خۆ،وانییـــــە (١٢٨٠)

چۆکە،لەوکارەی،دەگـــەڵ خاک،بـــا، دەکـــا     دوور لـەفام، پێـی وایـەخاک، خـۆی،وا دەکا (١٢٨١)

ئـــەو جیهانە،پێســـتە،نایەت هـــیچ بـــەکار     ئەســـڵ و مـــەغزی وی، جیهـــانی نادیـــار (١٢٨٢)

خـاک وەکـوو مۆرێکەکـەو تەدەسـتی بـا     تـــــۆ،نیژادی بـــــا، لـــــەلات،عالی بێ،بـــــا (١٢٨٣)

چـاوی خـاکی، غـەیری خـاکی،چی نـەدی     چـــاوی بـــابین وانیە،ئـــەو چـــاوی دی (١٢٨٤)

دۆو ئەســـپ،یەکتر دەناســـن، بـــن بـــەیار     وەک بـــــەیەکتر ئاشـــــنانە،دوو ســـــوار (١٢٨٥)

چاوی زاهیـر ئەسپە، نـووری حەق،سـووار     بێ سـووار خـۆ، ئەسـپ،نایەت هـیچ بـەکار (١٢٨٦)

گەرنەکـەی ئەسـپت لـەخوویی بەد،بـەری     چـۆن دەبـێ تۆ،ئـەو لـەبۆ لای شـا،بەری؟ (١٢٨٧)

چـاوی شـا، بـۆ چـاوی ئەسـپی،ڕەهنەما     چـاوی وی بـۆ چـاوی شـا، حـەیران مـا (١٢٨٨)

چاوی ئەسپان غـەیری گیای پێ،هیچ نـین     خۆشترین شت بوو، لەلای وی، مێرگی شین (١٢٨٩)

نووری حـەق گـەربێ لـەنووری حیس،سـووار     گیـان دەبـێ مایـل بـەنووری کردگـار (١٢٩٠)

ڕێگەنازانێت،ئەســـــــــپی،بێ ســـــــــووار     ســـواربێ شـــا، ڕێ دەبـــێ جـــا، ئاشـــکار (١٢٩١)

(۳۰۹۲ ڕووکەحیسسێک،نووری حەق بێ لەو سووار — چونکـەحیس،ژێر حـوکمی نـووری کردگـار
(۳۰۹۳ نـووری حیسسـی، جـوان دەکـا،نووری خـودا — نــــوور لەســــەرنوور،هەر ئــــەوا،مانا،دەدا
(۳۰۹۴ نووری حیس، ئینسان دەبا، بۆ لایی خاک — نــووری حــەق دەی با،لــەبۆ بــالایی پــاک
(۳۰۹۵ چونکەمەحســــووس،کەمترینی عالەمــــــە — نووری حەق دەریایە، حیس وەک،شەو نەمە[1]
(۳۰۹۶ سـواری سـەر حـیس، ون لـەچاوان، نادیـار — قـەول و فیعلـی بـاش، دەکـا ئـەو، ئاشـکار
(۳۰۹۷ نـووری حـیس کـە، زۆر غـەلیزەو،زۆر گـران — ئــەو لــەنێو ڕەشــکێنەدا، دەکرا،نیهــان
(۳۰۹۸ نـــووری حیســـسیت تۆ،بەچاوت،گەرنـــەدی — نــووری دینــی چــۆن دەبینی،بەو،ئــەدی؟
(۳۰۹۹ نـووری حیس،مـەخفی بـێ، بـەو سـەنگینییە — نـووری سـاف و پـاک،چلۆن مـەخفی نییـە؟
(۳۱۰۰ ئـەو جیهانــەوا، دەدەسـتی بـایی غــەیب — ناتـــەوان و عـــاجزە، ئـــەوخوایی غـــەیب
(۳۱۰۱ جــار بڵینــدو جــارو بــار دەیکـا نــەوی — جــــار سەلامەت،جار،شـــکان دەیدا،بــــەوی
(۳۱۰۲ جـار لـەبۆ ڕاستەی دەبـا، چـەپ جـارو بـار — جارگوڵســــــتان چادەکــــــا لـــــەو،جارخار
(۳۱۰۳ چـۆن دەنووسـێ چـاو، قەڵـەم، دەس نادیـار — نادیارەسوارو،ئەســــــــپیش وا،بـــــــەغار
(۳۱۰۴ تیــر کەدەڕوا،ئــەو دەبینــی، نــەک کــەوان — ئاشــکران گیــان،ون لــەچاوان،گیانی گیــان
(۳۱۰۵ تیـــر مەشـــکێنەکەتیری شـــایە، ئـــەو — تیرهـــــاوێژ ئێمـــــەنین، ئاگایــــــە، ئـــــەو
(۳۱۰۶ (مارمیـــت اذ ر میـــت)ی،کـــوت خـــودا — ئـەو خـودا یـەی هـەر بـەوی کـار،ڕوو دەدا
(۳۱۰۷ توورەییـــــت بشـــــکێنەتۆ، مەشـــــکێنە،تیر — چـاوی تـوو ڕەخـوێن دەبینێ،چەشـنی شـیر
(۳۱۰۸ مـاچ کـەتیر جـا، ئـەو لـەبۆ لای شـا بـەرە — گەرچی ئەوتیر، تەڕ بەخۆینی تۆی، سەرە[2]
(۳۱۰۹ عالـــەمی زاهیــــر لـــەقودرەت،بێ بەشـــە — عالــــــەمی مانایـــــەزیرو سەرکەشـــــــە
(۳۱۱۰ ئێمـــــەنێچیر، کێیەســــــاحەب داوی وا؟ — گــۆیی گۆچــانین، گۆچــان بــاز کــووا؟
(۳۱۱۱ دەی بڕێـت و دەی درووی، خــەییات کـوا؟ — خــۆش دەکــا ئاگر،ئـــەدی نـــەففات،کوا؟
(۳۱۱۲ لــەحزەیــەک کافردەکــا، ســـەددیق ئـــەو — لەحزەیــەک زاهیـد دەکـا، زەنـدیق ئـەو
(۳۱۱۳ چونکـــەبۆموخلیس خەتـــەر زۆرن،لـــەداو — تـا نـەبێ خـالیس لەهەسـتی خـۆی تـەواو
(۳۱۱۴ ئــــەو لەڕێـــــدا،ڕێگریش هـــــەن،بێژمار — بووی نەجات ئەو کەس پەنای بێ،کردگار
(۳۱۱۵ موخلیســـــەگەرقەلبی نــــەبوە،پاک تـــــەواو — ڕاو کەرە،گـــەر ئێســـتەنەی گرتـــوە، چ ڕاو
(۳۱۱۶ گەرکوموخلیس،بوو،بەموخلەس،بووی نەجات — چـــون مـــەقامی ئـــەمنی پێـدەکرا، خـــەڵات

---

[1]- نووری حەق دەریایە، حیس ، بەس وەک نەمە(مصرع دوم)

[2]- ماچ کەتیر و،بیبەبۆ لای شاهی ژیر گەرچی خۆیناوی بەخۆینی تۆیە، تیر

ـبێ نـەینووک قـەت بەئاسـن ئـەی فـلان تازەنابێ‌نـــان بەگـــەنمی نێـــو خـــەیان (١٣١٧)
میوەکامیـــل‌وەک نەگـــەیوی لێنـــەهات خـــۆ‌ترێ نـــابێ بەقۆرە‌قـــەت، چ کـــات (١٣١٨)
ـحتەبـــە‌کامیل، لـــەگۆڕان دوور بـــە چەشـــنی بورهـــانی موحـــەقیق‌نوور بـــە (١٣١٩)
ـەرنـەجاتت بـێ لـەخۆت، بورهـانی تـۆ خـۆ ت فـەنا کـەی بێ گومـان سوڵتانی تـۆ (١٣٢٠)
ـسیری فـەقری کـرد، سەلاحەددین عـەیان ڕوون دەبووچـاوی دڵان بـەو، ئـەی فـلان (١٣٢١)
ـێ لـەچاوو ڕوویـــی وی فـــەقرو فـــەنا چـاوی هەرکـەس هـەیبێ گـەرنووری خـودا (١٣٢٢)
ـێ وەسیلەچەشـنی حەق‌شـێخ کـار دەکـا بۆموریـد تـەدریس، بـەبێ گوفتـار دەکـا (١٣٢٣)
ـەشـنی مێوون، دڵ بەدەستی شـێخ سـەلاح ئـەو لەقـەلبا ن مـۆر دەدا، نـەنگ و نـەجاح (١٣٢٤)
ـۆری سـەر مێـو، لـەو دەبێ گوستیل وەدی چـی دەکـا نەقشـی نـەقیم زاهیر‌ئـەدی؟ (١٣٢٥)
ـێ وەدی لـــەو زەڕگەرە‌بـــەو فکـــرو بیـــر حەلقەحەلقـــەی بیـــر لەیێکتر‌دەبنـــەگیر (١٣٢٦)
ـنگـــی کێیـــەدێ، لـــەنێو کێـــوی دڵان جـارو بـاریش نایەلـەو دەنگ‌ئـەی فـلان (١٣٢٧)
ـــتادە، ئـــەو لەهـــەرجێگا هـــەبێ دەنگـی وی، نێـو کێـوی دڵ، یـاخوا هـەبێ (١٣٢٨)
ـێـوی وایـــەدوو بەرابـــەر دەنـــگ دەدا وا دەبێ سـەت جـار دەکـا‌کێو یـەک سـەدا (١٣٢٩)
ـــەکێو دەردێنـێ ئـەو ئـاواز و قـال ســـەت هـــەزاران کانیـــاوی زۆر زولا ل (١٣٣٠)
ـەر لـەکێو دا‌کـردی لـوتفی وا، زهـوور ئـــاوی کانیـــاوان دەبێتـــەخوێنی ســـوور (١٣٣١)
ـەی لەبەرئـەو شـای موبارەک نـەعل بـوو گـەر سـەرا سـەر تـووری سینا، لـەعل بـوو (١٣٣٢)
ـنی گشـت ئـەعزایی کێـو عـەقڵ و گیـان کـوانێ ئێوە‌کـەم لەبـەردی سـەر چییـان؟ (١٣٣٣)
ـــێ لـــەگیان دەرناقوڵێ‌کانیـــاو بـــەجۆش بۆ‌بـەدەن دیارنینـــەهیچیان، ســـەوز پـــۆش (١٣٣٤)
ـجی‌نایـــەت دەنگـــی موشـــتاقی لـــەوێ یاســـەفای جامێک‌بـەدەس سـاقی لـەوێ؟ (١٣٣٥)
ـەهی غیـرەت کوان؟کوڵێنگان دەس دەنێ یـەک یەکـەی وان‌کێـوی وا‌تـا، هەڵقـەنێ (١٣٣٦)
ـکـەنووری مانـگ، وەئـەجزای کێـو کـەوێ بەڵکـەنووری مانـگ ڕێگـای بـێ لـەوێ (١٣٣٧)
ـوێ قیامـــەت کێـــو لـــەبن ڕا، ڕا دەکـــا چـــۆ ن لـــەبۆمان کێو‌ســـێبەر چادەکـــا؟ (١٣٣٨)
ـیـامەتی ڕووح‌کوا، لـە ئـی جیسمی کەمـە؟ قیامـەتی تەن‌زەخمـە، ئـی ڕووح مەڵحەمـە[1] (١٣٣٩)
ـەر ببینێـــتن بـــەدیش ئـــەو مەڵحەمـــە موحســـینەئەو، بـــێ برینـــە، بـــێ غەمـــە (١٣٤٠)
ـوش بـەحاڵی ناحـەزێ‌جوان، بۆی حـەلیف وای بـەحاڵی ڕووگـوڵێ‌لای بـێ خـەریف (١٣٤١)
ـی بێ ڕووح تـۆ لـەڕووح نیزیـک کـەوە دێتەبـەرنان، ڕووح‌نـا، خـۆ، هـەر ئـەوە (١٣٤٢)

---

[1] - قیامەتی جیسم، زەخمە، ئی ڕووح مەڵحەمە(مصرع دوم)

داری تـــاری، بـــوو بـــەیاری، ئـــاووری ‌‌ ڕوون و گـەش بـوو تـاری گشت لـەو هـەڵوەری (٤٣-

گـەر کـەلاکی کـەر بخـەیتـە نێـو خـووێ ‌‌ کەریـەتی و مـردن دەبا خـوێ جـوێ جـووێ (٤٤-

ڕەنگـی خمخانـەی خـودا یـەک ڕەنگە،هـەر ‌‌ هـەرچی چـۆ وێ،هەربەئـەو، ڕەنـگ هاتـەدەر (٤٥-

گەرلەنێوئەوخوم،بڵـــەی بـــەو، هەســـتەتۆ ‌‌ پێـت دەڵـێ ئـەو مـن خـومم، مـن نیمـەخۆ (٤٦-

مـن کـەخۆم، خوم،کـوت (انا الحق) بێژتنـە ‌‌ ڕەنگـــی ئاســـن، غـــەیری عـــەینی ئاســـنە (٤٧-

ڕەنگـــی ئاســـن مـــەحوی ڕەنگـــی ئـــاو‌ُرە ‌‌ خـــۆی بـــەئاوور دا دەنـــێ ئـــەو بـــێ ورە (٤٨-

چونکەخۆی سوور دی،بەچەشنی زێڕی کان ‌‌ دێ لـەوی دەنگـی (انـا النـار) بـێ زەبـان (٤٩-

چونکـەجوانی ئـەو لـەئاو‌ُر،بـوو بە،بـەش ‌‌ بانگی کـرد مـن ئاو‌ُرم،جوان، سوورو گـەش (٥٠-

ئـاو‌ُرم من،گـەرتۆ هـەت بـێ، هـیچ گومـان ‌‌ دەس لـەمن دە،تـاکومن کـەی، ئیمتیحـان (٥١-

ئـــاوورم مـــن ئیشـــتیبات تـــۆ لا بنـــێ ‌‌ تـۆ دەنـا ڕووی خـۆت، لەسـەر ڕوو م، دابنـێ (٥٢-

گەرخوداوەنـــــد، نووربداتـــــە، ئـــــادەمی ‌‌ بـۆی دەبـەن سـەجدەمەلاییک،ئەو دەمـی (٥٣-

لاییقەسـەجدەی بـەری بـۆ شەخسـی پـاک ‌‌ ئەوکەسەی بوو، وەک مەلاییک پاک وچاک (٥٤-

بۆمیســـاله، زیکـــری ئـــاورو ئاســـنی ‌‌ مـن کـەوام کـرد تـۆ نەکـەی پـێم، پێکـەنی (٥٥-

لاق دەدەریـا، دا مـەنێ کـەم بێـژە، لـەو ‌‌ تـۆ لەسـاحیل لێـو گـەزە، بـی بەسـتەدەو (٥٦-

گەرچی سەت وەک من نییانە، تابی بەحر ‌‌ مـن بـەزوویی دەمهـەوێ غـەرقابی بـەحر (٥٧-

بەحری وەحدەت عـەقڵ وگیانم بێ فیدای ‌‌ خـوێن بـەها بۆعـەقڵ وگیـان ئەوبـەحرە،دای (٥٨-

تـا هـەبێ پـێم مـن دەڕۆم دەو بـەحرەدا ‌‌ وەک مـراوی مـن دەڕۆم، پـێم گـەر نـەما (٥٩-

بـێ ئـەدەب حـازر، لـەغایب چـاترە ‌‌ حەڵقەگـەرچی کـەج بێ،جێگای،سـەر دەرە (٦٠-

ڕوو کەسـەرحەوز،ئەی بـەپیس تـۆ، تێکـەڵاو ‌‌ چـۆن دەبـێ پاک،دوورلەحـەوزو،دوور لـەئاو (٦١-

شەخسی پاکیش گەرلەحەوزێ دوورکەووت ‌‌ ئەوتـەمیزی بـووی بەچەشـنی نوور،کـەووت (٦٢-

پـــاک بـــوونی حـــەوزی وا بـــێ ئینتیهـــا ‌‌ پـاک بـوونی جیسـم و زاهیـر، بـێ بـەها (٦٣-

چونکەحەوزەدڵ،بـــەڵام ئـــەو نادیـــار ‌‌ ڕێـی لـەبۆ دەریـا هەیـە، بـۆ وەسـڵی یـار (٦٤-

پـــاک بـــوونی عـــارزی دەی وێ،مـــەدەد ‌‌ دیارەخـەرجیش تـا هـەبێ، کـەم دێ عـەدەد (٦٥-

ئـــاو کـــوتی، ئـــالوودە،بێرەلام بـــەغار[١] ‌‌ جـــوابی داوەمـــن لـــەئاووم شـــەرمەزار (٦٦-

---

[١]- ئا و کوتی ئەی پیس ،بێرەلام بەغار (مصرع اول)

ئۆو کوتی ئەو شەرمە، بێ من کوا دەچی؟ کوا بە بێ مـن رجس و پیسی وا، دەچی؟ (١٣٦٧)
خـــۆ لـــەئا و پنهـــان ببێ،ئالوودەگـــەر ( الحیـــاء یمنـــع الایمـــان )ە، هـــەر (١٣٦٨)
دڵ بەحەوزی تەن دەبوو تار،چەشنی خاک تـەن بـەئاوی حـەوزی دڵ بـوو جـوان وپـاک (١٣٦٩)
حـەوزی دڵ،گـەڵ حـەوزی تـەن،زۆرلێک جییان حـەو زی دڵ دێتێت سوود،ئی تـەن زیـان[1] (١٣٧٠)
بەحری دڵ گەڵ بەحری تـەن،لای یـەک ژییان بـــەینی وان بـــوو،( بـــرزخ لایبغیـــان ) (١٣٧١)
گـەر خـەرا ب بێ،یانەڕاسـت و بـاش ئـەتۆ تـــەن فرێدە،هـــەر لـــەبۆ لای دڵ بـــڕۆ (١٣٧٢)
گەرلـەلای شـایان خەتـەر بـۆ گیـان هەیـە کوا بڵێنـد هیممـەت لـەوەی، باکیـان هەیـە؟ (١٣٧٣)
شا، کەشیرین بێت وەک شـەهدو شـەکەر خـــۆ، لـەڕێی وی، خۆشــەگیانیش بێتــەدەر (١٣٧٤)
ئـــەی مەلامەتگەر،بەخۆشـــی تـــۆ بـــژی ئـەی سـەلامەت خـواز، ئـەتۆ سسـت و دژی (١٣٧٥)
گیـــانی مـــن کوورە،بـــەئاگر خۆشـــحاڵ کوورە،بەسـیـە،گەر لـەبۆ نـار،بوو بـەماڵ (١٣٧٦)
چەشـــنی کوورەوایەعیشقیش،ســـووزناک کوێرەهەرکەس،نەیـدی کوورەی،هێنـدەچاک (١٣٧٧)
گەر لەنەفس و ئا رەزووی خۆت دوور کەوی ژینـــــی دائیم،دێتەدەســـــتی تۆ،لـــــەوی (١٣٧٨)
گـەر غـەمی تـۆ شـادی هێنـەر بوو،لـەبۆت سووسـەن و عەنبـەر دەبینـی، دەوری خـۆت (١٣٧٩)
جێی مەترسی خەڵکی بۆ تۆ، خۆش و ئیشک خۆشـەدەریا، بـۆ مـراوی، نـەک مریشـک (١٣٨٠)
جارەکی دیش شێت بووم من،ئەی تەبیب ئەو چەلەش عـەقڵم لـەدەس چوو ئەی حـەبیب (١٣٨١)
حەڵقـــەکانی سیلسلەت،ســـاحەب فنـــوون یـەک یەکـەی وان چا دەکەن،نـەوعێک جنوون (١٣٨٢)
بەخششـــی هەرحەڵقـــەلێکترزۆر، جییـــان بۆیەشـــێتی مـــن دەگـــۆڕێ،زۆر زەمـــان (١٣٨٣)
جـــا،جنوون هـــەیتی فنوون،دەکرا،مەســـەل خاسســـە،گەربێتن دەبەنـدی شـای ئەجـەل (١٣٨٤)
وای لـەمن شـێتی پسـاند، زەنجیـر و بەنـد پـــێم دەدەن شـــێتانی زەنجیـــریش، پەنـــد (١٣٨٥)

**هاتنی دۆستان بۆزیندان، بۆمولاقاتی( زوالنوون) قدس سرەالعزیز ..**

**خولاسەی داستان...**

زوالنوونی میسری شـەدیدەن گرفتاری تـەلاتوم وشێواوی ڕووحی ببو تا ئەومەرحەلەکەخـەڵکی نەیان دەتوانی ئەفکارو ئەحواڵی ڕوو حی وی تەحەممول بکـەن بـەو خاترەئەو یان خستەزیندان .دۆســتانی وی زۆر نارەحــەت بـوون جــا لــەبۆ دڵــداری وی چوونەزینــدان بۆمولاقــاتی وی، دۆسـتەکانی لـەلای خۆیـان دەیـان کـوت .. زوالنـون لەکوێ؟وشـێتی لـەکوێ؟ ڕەنگەلەبـەر

[1]- تۆ تەوافی حەوزی دڵ کە،ئەی جەوان ڕوو، دەحەوزی تەن نەکەی، دێتی زییان

ئەوەکەنەجاتی بێ لەدەست ئینسانی شەڕووڕو بەد فەڕ،خۆی لەشێتی دابێ لەو قسانەگەلێکیان کوت تا گەیشتنەزیندان، ویەک ڕاست چوونەلای زوالنون. هەر لەگەڵکو لەوی نیزیک بوونەوە، بەدەنگێکی بڵیند کوتی .. ئێوەکێن؟ بۆچی هاتوونەئێرە؟ بڕۆن لەخوا بترسێن، دۆستەکانی زۆر بەئیحتیڕام پێیان کوت ..ئەی زوالنون ئێمەدۆستەکانی تۆین، وبەگیان و دڵ هاتووین،کەئەحواڵی تۆبپرسین، ودەستیان کرد بەتەعریف و تەمجید لەوی،کاتێک زوالنون .. ئەو تەعریفەزیاد لەحەددەی بیست، بەناچار ویستی کەئەوان ئیمتیحان بکات .جا هەر لەبەر ئەوەبەسووڕەتی ساختەگی دەستی کرد بەقسەی ناحەز وئەلفازی بێ ڕەبت و بێ مانا .. وبەوەش ڕازی نەبوو دەستی دا دارو بەرد،کەلێیان بدات دۆستەکانی هەر دەگەڵکوو وایان دی وەک با هەڵاتن.. زوالنون.. کە دیتی دۆستەکانی هەڵاتن، قاقا، پێکەنی، و بە مەسخەرە پێیکوتن ..تەماشا لەوانە کە، کە ئیددیعای دۆستایەتی دەکەن، بەڵام هەر دەگەڵکوو ئیحساسی ئەزیەت و ئازاریان کرد،تابیان نەهینا وهەڵاتن .

وا لــەبۆ زوالنـــونیٚ میســـری هاتـــە پـــێش — کەوتــە گێــژاوی جنـــون و ڕەنـــج و ئـــێش (٣٨٦

شـــوورو حـــاڵی وی گەیشتەســـەر فەلـــەک — خـوێی ڕژاندەسـەر دڵان ئـەو یـەک بەیـەک (٣٨٧

خـۆت لــەڕیزی پیـاوی وا چـاک دا مـەنێ — بگرەلێیــــان بـــــۆ نــــەجاتت، دا مــــەنێ (٣٨٨

کـــەس نـــەبوو، تـــا بی،ببینێ،ئیشـــی وی — چونکــەدەی ســـووتاند ئـــاگر، ڕیشـــی وی (٣٨٩

چونکـەئاگر بــەر بـــۆ ڕیشـــی عام،بەجـــەم — گرتیـــان، خستیانەزیندان،قەســـری غــــەم (٣٩٠

غـــەیرەمومکین،بوو کـــەزوالنون هـــیچ نـــەڵێ — گــەرچی عالــەم گشــت لەبــەرگفتی هــەڵێ (٣٩١

دوژمنـــی شـــایان، عـــەوامن، بـــێ گومـــان — چونکــــەنابینان عەوام،شـــاش،بێ نیشـــان (٣٩٢

چونکەفــەرمان بـــوو لەدەســـتی ناکەســـان — بۆیەزینـــــدانی کـــــرا، زوالنـــــون، وەســـــان (٣٩٣

سەت ئەسەف دەڕوا، تەنێ، شای بێ قسوور — بۆتەبازیچـــەی منـــاڵان، زێـــڕی ســـوور (٣٩٤

زێـڕی چی؟دەریـا دەنێـو یـەک قـەترەئاو — یـــا دەنێویــەک زەڕڕەپنهـــان بـــوو هـــەتاو (٣٩٥

ئـــەو هـــەتاو بـــوو خـــۆی بەزەڕڕەدانیشـــان — کەمکەمـەلای برد نیقاب،ڕووی بوو عـەیان (٣٩٦

گشـتی زەڕڕات مـەحوی وی بـوون نادیـار — عالـەمیش لـەو، مەسـت دەبـوون و،هووشـیار (٣٩٧

گـەر قەڵـەم هـات و بـەدەس غـەددار بێ — جێگەبۆمەنســـوور، دەبـــێ، ســـەر، دار بـــێ (٣٩٨

گــەر بــەدەس نـادان ببـێ، فــەرمانی کـار — دێنەکوشــــــــتن ئـــــــــەنبیایی،کردگار (٣٩٩

قــــەومی نـــادان ڕووی دەکردەئـــــەنبیا — ئێمــە، ئێــوە، شــووم دەزانــین، بــێ ڕییــا (٤٠٠

چاو مەسیحی چەن نەفام بوون چەن نەزان — لەوکەســـەی دەدرالەدار،ویســـتیان ئـــەمان (٤٠١

چـۆن بەقـــەولی وان لـــەداریان دا وەجـــوو — چـۆن لەدەسـتی دێ ئەمان،گـەر والـەچوو؟ (١٤٠٢)
ـ ـەنێو،وان بوومەسـیح بـوون بـێ عـەزاب — گەرلەنێویان چوو،عـەزاب هات بێ حیساب (١٤٠٣)
ـــر و زەرِ گـــەر زێـــدەتربوویان خەتـــەر — چونکـــەدز، زیـــاتر بـــەوانی بـــوو، نـــەزەر (١٤٠٤)
جـکەناحەزبوون حەسوود،جوان ون دەبوون — بـاش لـەداخی ناکەسـان دڵ کون،دەبـوون (١٤٠٥)
ـوفی گەرخســـتەچاڵ،فێڵی بـــرا — هـەر حەسـەد وای کرد،بـەگورگان ئـەو درا (١٤٠٦)
ـ حەسـەد باعیس بـوو یوسوف،کەوتەچاڵ — گـــورگی پنهانەحەســـەد،بێ حـــەددە،زاڵ (١٤٠٧)
جـکەیـــەعقووب دیتـی گـورگی والـــە،زاڵ — نـــەی دەهێشت،بڕواتەدەر،یوســـوف لـــەماڵ (١٤٠٨)
ـورگی زاهیـر یوسـوفی خۆ،قـەت نـەدی — گـــورگی پنهـــانی حەســـەد،ئەمما،بەدی (١٤٠٩)
ـورگی پنهـان یوسـو فـی کـرد زامـدار — هـــات (ذ هبنـــا نســـتبق ) بـــۆ ئیعتیـــزار (١٤١٠)
ـەگری گورگـان زۆرو کـەم،کوا وا دەبـێ؟ — عاقیبـــەت ئـــەو گورگەهـــەر، ڕیســـوا دەبـێ (١٤١١)
ـ ـەحەشـری حاسـیدان ڕۆژی زیبـــان — هـەر بەشـکڵی گـورگ، دەکرێ، بێ گومـان (١٤١٢)
ـەشـــری ئینســـانی تەمـــەعکاری بـــەئاز — بێ گومـان دەکرێ بەسـوورەت هەر،بـەراز (١٤١٣)
ـ ـەزانی،بۆن،لەجێگـــەی شـــەرم وعـــار — بۆگـــەنیوی دێـــت، مەشـــڕووبی، لـــەزار (١٤١٤)
ـــ گـــەنیوێکی کەمـــەخفی بوو،لـــەچاو — ڕۆژی مەحشـــەر، دیتەبـــەر چاوان،تـــەواو (١٤١٥)
ـــەوجوودەی ئـــادەمی، وەک جەنگـــەڵی — خـــۆت بپـــا ڕێزەلـــەوی گـــەر عـــاقڵی (١٤١٦)
ـ وجـــوودەن دایـە، زۆر گـورگ و بـەراز — ســـالح و ناســـاڵح و خـــوار و تـــەراز (١٤١٧)
ـ ـــەخوو،غاڵب تـــرە، ئـــەو حاکمـــە — زێـڕ لـەمس زیـاتربێ، زێـرە، ئـەو دەمـە (١٤١٨)
ـ ـ ڕەوشـــتی نێـــو وجـــوودت غاڵبـــە؟ — حەشـــری تۆ،بـــەو ســـوورەتە،بۆت واجبـــە (١٤١٩)
ـــ ڕۆ بـــار گورگێـــک دیتـــەنێو بەشـــەر — جـارو بـاریش، ڕووی جوانـە،وەک قەمـەر (١٤٢٠)
ـ ـ ـچـــێ لـــەو ســـینەبۆئەو ســـینەیە — زۆر بـــەپنهان،چی ســـەلاح و کینەیـــە (١٤٢١)
ـ ـــەوەر دەگـــرن لەئینســـان، گاووکـــەر — بـەس بەتـەعلیم،عیلم و زانسـت و هونـەر (١٤٢٢)
ـــبی ســەرکەش چـاو، دەبێـتن ڕام ڕام — چـــاو دەکا،بـــازی ورچ، بـــزنیش ســـەلام (١٤٢٣)
ـ ـەبۆ نێو سەگ لەئینسان ڕا، هەوەس — تـــاکو بـــۆ شـــوان،یانەڕاوکەر،یاحەرەس (١٤٢٤)
ـ ـ سەی ئەسحابی کاف،خوویەک لەوان — تـــا کوچـــوو بـــەدوای خودا،ڕۆژو،شـــەوان (١٤٢٥)
ـ ـ ـــەی خوویـــەک لەسـینە، دیتـــەدەر — جار،شـــەیتان،جار مەلـــەک،جار شـێرو کـەر (١٤٢٦)
ـ ـگەنێکـــــە، شـــێر لەوی،ئاگا،هەیـــــە — بـــۆدڵان ڕێـــی نادیـــار، لـــەو ڕا، هەیـــە (١٤٢٧)
ـ ـــەعارف بـــدزە، مـــەرجانی گیـــان — وا نەکەی گەر،کوا دەگەڵ سەگ لێک جییان؟ (١٤٢٨)

گــەر دزی تــۆ، بدزەئــەو دوڕی لــەتیف    گـــەر دەبـــەی بار،هـــەلگرەباری شـــەریف (٢٩)

**حاڵی بوونی موریدان کەزوالنون شێت نەبووەبەڵکەم عەمدەن وای کردووە..**

دۆســـتان کـــەحاڵی زوالنونیـــان دەبیســـت    چوون لـەبۆ زینـدان و ڕایان لێک دەویست (٣٠)
ئـــەو بەعەمـــدەن وادەکـــا، یاحیکمەتـــە؟    خـــۆ، لـــەبۆ دیـــن ڕووگەیە،هـــەر ڕەحمەتـــە (٣١)
زۆ ر بەدوورەعـــــەقڵی وەک دەریـــــایی وی    شـــێتیەتی بێـــتن، بـــەکار فـــەرمایی وی (٣٢)
خوانــەکا پــاش ئەوهــەموو نێــو بــانگی وی    هـــەو ری شـــێتی داأ بپۆشـــێ مـــانگی وی (٣٣)
ئــەو لەترسـی خـەڵکی وا، خـۆی خسـتەماڵ    ئەولەنـــەنگی عـــاقڵان بوو،شـــێت حـــاڵ (٣٤)
ئەو لەنەنگی عـەقڵی سست و،تـەن پەرست    خـۆی لەشـێتی دا،لەزینـدان،خۆی دەخسـت (٣٥)
بـــم گرن،بەنـــدم بکـــەن،لێم دەن، بـــەدار    هـــەم لەپشـــتم،هەم ســـەرم، بـــێ پرســـیار (٣٦)
چونکەبـــەو لێدانـــە، دەمبـــێ،من ژیـــان    وەک قـــەتیل گرتـــی، لـــەگای مووســـا،گیان (٣٧)
تـــاکو، بـــەو لێدانـــەبم، شـــاد، بـــێ پـــەرۆش    وەک قـــەتیلی گـــاوی موسا،شـــادو خـــۆش (٣٨)
**زەربـــی کلکی،گـــا، ســـەبەب،کوژراو،ژییا    مـــس دەکاتـــەزێڕی خالیس،کیمییـــا** (٣٩)
کوشتەهەســتا، ئاشـکرای کـرد، گشـت ڕاز    ئاشـکرای کـرد گشـت ئەوانەی،شـەڕخوواز (٤٠)
ئاشـــکرا دەیکـــوت ئەوانـــەم قـــاتڵن    خـــــەڵکی دی گشـــــتیان،لەحاڵم،غافڵن (٤١)
گـەر بکـوژرێ، جیسـمی سـەنگین و گـران    ژینـــــی دێتەدەســـــت،ڕووحی ڕاز دان (٤٢)
جەننـــەت و دووزەخ دەبینێ،گیـــانی وی    ڕاز دەزانێ،گیـــانی پـــاک وجـــوانی وی (٤٣)
ئـــەودەبینێ بەدفـــەڕی شـــەیتان ســـیفەت    داوو فێڵـــی ناکەســـی،بێ مەعریفـــەت (٤٤)
گــەر بکــووژی گـاوی نەفسـی خـۆت ئـەتۆ    تۆ،بـــەزەربی کلکـــی وی، زوو دێـــی وەخـــۆ (٤٥)
گـــاوی نەفسـی خـۆت بکـووژە، زووکـەتۆ    تاکوزینـــدووبێت، ڕووحـــت، ســـەربەخۆ (٤٦)

**گەڕانەوەبۆحیکایەتی زوالنون (قدس سرەالعزیز )..**

وای دەکوت زوالنون،کەدۆ ستان چوونەلای    ئێوەکێنـــە؟ هـــەو بێ،بـــا ترســـی خـــودای (٤٧)
جوابیـــان دا،دۆســتی تۆین،گیانمـــان فیـــدات    بـــۆ ســـوئالی حـــاڵی تـــۆ، هاتووینـــەلات (٤٨)
چـۆنی ئـەی دەریـایی عـەقڵی بـافنوون؟    بـۆ دەدەن توهمـەت، بەعـەقڵی تۆجنـوون؟ (٤٩)
دووکـــــەڵی حـــــەمام ناکا،تار،تـــــاو    زاغ شکەســـت نادات،عـــەنقای وا،بـــەناو (٥٠)
تۆقســەی خـۆت قـەت لەئێمـە، ون مەکـە    دۆسـتی تۆینـە، ئێمـە،دڵمان کـون مەکـە (٥١)
تۆ نەکەی دۆستان لەخۆت قەت دووربکەی    یـــا بـــەفێڵ،بۆ هیچکار،مـــەجبوور بکـــەی (٥٢)

ئاشکراکەرازی خۆت، ئەی شەهریار — مەی بەبن هەوران ڕووت،ئەی نامدار (۱۴۵۳)
ئیمەتوما ن خۆش دەویٚ و،زۆرسادقین — ئاشکرایەئیمەبۆ تۆ عاشقین (۱۴۵۴)
ئەزای کوت زۆر، بەزاهیر نەک بەدڵ — چەشنی شیتێک جێگەژینی بێت،گڵ (۱۴۵۵)
رایەڕی ئەو دەستی دایە، بەرد و دار — گشت لەترسی وی هەڵاتن،توند،بەغار (۱۴۵۶)
وی دەکوت ئەو،جا،بەقاقاش،پێکەنی[1] — کوا دەکەن دۆستانی وا،قەت من، خەنی؟ (۱۴۵۷)
دۆستی من نین هیچ ئەوانەی،چوون بەغار — دۆست بەگیان ودڵ، قەبووڵیەڕەنجی یار (۱۴۵۸)
چون دەبیٚ ڕاکا، لەڕەنجی دۆست، دۆست — ڕەنج مەغزە، دۆستایی، چەشنی پۆست (۱۴۵۹)
دۆست لەڕەنجی دۆست نابیٚ،بێت،غەمین — ڕەنجی دۆ ست،بۆ دۆست،مەڵحەم،بۆ برین (۱۴۶۰)
دۆست زێڕە،ڕەنج و دەردیش ئاوُرە — زێڕ،بەئاوور خۆشە،هەیتی زۆر ورە (۱۴۶۱)

**ئیمتیحان کردنی زیرەکی لوقمان بەوەسیلەی ئەربابەکەی..**

خولاسەی داستان...

لوقمان بەزاهیرغولامێکی ژێردەست بوو،بەڵام لەماناو باتین دا زانایەکی هەڵکەوتو،وتاق بوو، جا،لەبەرئەوە، ئەربابی وی لەهەموو کارێک دەگەڵ وی مەشوەڕەتی دەکرد، تا لەحیکمەت ویەندی وی سوود ببا، عادەتی ئەرباب ئەوەبوو کەهەرتەعامێکی کەبۆیان دەهینا دەستی بۆ نەدەبرد تا لوقمان کەمێکی لێنەخواردبا، ڕۆژێک خرچەیەکیان بۆئەرباب هینا،لوقمانی بانگ کرد، وقاشێکی لەخرچەکەبڕی ودای بەوی. لوقمان زۆر بەئیشتیا خواردی ئەرباب قاشێکی دیکەشی ویدا،لوقمان ئەویشی زۆربەئیشتیا خوارد،ئەرباب زوو،زوو، لەو خرچەی دەبڕی ودەیدا بەلوقمان، تایەئەژمار بوو بەحەفدەقاش، ئەرباب کەدیتی لوقمان زۆر بەئیشتیا،ئەوخرچەدەخوات، ئیشتیای چۆیە، وویستی کەشیرنایی ئەو خرچەیە، بچێژیٚ ئەرباب کەلەئاخرین قاش کەمێکی دەزاری خۆی نا،لەبەرتاڵ بوونی ئەوخرچەیە،حاڵی تێک چوو، جا،ئەرباب ڕووی کردە لوقمان و پێیکوت..تۆ چلۆن ئەو خرچەتفت و تاڵەت خوارد؟ لوقمان جوابی داوە.. ئەمن لەدەستی تۆزۆر نیعمەتم خواردووە، بۆمن زۆر جێی خەجاڵەتی و شەرمەزاری بوو کەلەبەرئەوەندەتاڵیەئیزهاری نارەحەتی بکەم .

---

[1] - ڕای وەشاند سەر ، جا ، بە قاقاش پێکەنی (مصرع اول)

چونکـــەلوقمان بەنـــدەیێکی پـــاک بـــوو ‌ ‌ ڕۆژو شـــەو بۆبەنـــدەگی چـــالاک بـــوو (۶۶۲
خۆ،بـەبێی وی نەیـدەکرد ئـەرباب، چ کـار ‌ ‌ خۆشـی ویسـت زیـاتر لەمنـداڵ و لـەیار (۶۶۳
چونکـــەلوقمان گـــەرچی بەنـــدەزاد بـــوو ‌ ‌ زۆر عـەزیم بـوو، چـون لەتـەن ئـازاد بـوو (۶۶۴
وایـدەکوت شـایەک بەشـێخێکی زەمـان ‌ ‌ لـێم تەڵـەب کـە، مـاڵی دونیـا ئـەی فڵان (۶۶۵
جـوابی داوەزۆر لـەبۆ تـۆ، نـەنگ و عـار ‌ ‌ مـــن لـــەوەی زیـــاتر بزانـــە، شـــەهریار (۶۶۶
من لـەلام دوو بەندەهـەن، زۆر، زۆر حـەقیر ‌ ‌ تـۆی لـەبۆ ئـەو هـەردوو بەنـدانم، ئەسـیر (۶۶۷
شـا کـوتی .. پـێم وا نیە،کامـەن ئـەوان؟ ‌ ‌ جـوابی داوە،یـەک غەزەب،شـەهوەت،دووان (۶۶۸
ئەوهەشایەگەرلەشـــا بێ،بـــێ نیـــاز ‌ ‌ ڕوون بکـا بـێ مانـگ وڕۆژ دونیـایی ڕاز (۶۶۹
گـەنجی بـوو ئەوکـەس، وجـوودی گـەنج بێ ‌ ‌ بـوونی بـوو ئەوکەس،کـەبوونی ڕەنـج بـێ[1] (۶۷۰
گـەرچی لوقمـان بەندەیـەک نایـاب، بـوو ‌ ‌ ئـەو لـەبۆ ئـەربابی خـۆی، ئـەرباب،بوو (۶۷۱
لـەو جیهانـەی ئـاوەژوو، زۆر وا، هەنـە ‌ ‌ زۆر لـــەلای چـــاتر لەئاوریشـــم، بەنـــە (۶۷۲
چـــاو، مـــەفازە،بۆ بیبابـــان بوو،بـــەناو ‌ ‌ نـاوو ڕەنـگ بۆعـەقڵی عالـەم،بوون بـەداو (۶۷۳
بۆگرووهێـک بـوو موعەریف،بـەس لیبـاس ‌ ‌ یـەک دەبـەرکا گەرعەبا،ئـەوعامی نـاس (۶۷۴
لای گرووهێک،موعتەبـەر، زوهـدی ریـا ‌ ‌ نـووردەبێ، زوهـدان لـەیێکتر، کـا، جییـا (۶۷۵
نـوور دەبـێ پـاک بێ،لەتەقلیدو،لەغـەول ‌ ‌ تـا بناسـێ، پیـاو، بـەبێ کردارو،قـەوڵ (۶۷۶
دەچێـەنێو قەلبان،لـەڕێگای جـوانی عـەقڵ ‌ ‌ حـاڵ زانـە،بێ نییـازە، ئـەو لەنـەقڵ (۶۷۷
عەبـدەکانی باشـی( عـەللام الغیـووب) ‌ ‌ نێـو جیهـانی گیـان ( جـەوا سیسو لقلووب ) (۶۷۸
دیێـەنێو قـەلبان ئەوان،چەشـنی خـەیاڵ ‌ ‌ ئـا شـکرا،بۆ وان دەبێ،ئەسـڕارو،حاڵ (۶۷۹
چـی، لەلایە،چوێلەکـەی،بێ تـین و تـاب؟ ‌ ‌ گـەر نـەبینن قـەت ئـەوی، بـازو عوقـاب (۶۸۰
ئـەو کەسـەی زانـی لـەڕازی،خوا کـەمێ ‌ ‌ بـێ بەهایـەبۆ وی، ڕازی عالـەمێ (۶۸۱
ئەو کەسـەی کردی لەسـەر ئـەفلاک،گوزەر ‌ ‌ کـوانی کۆسـپی،ئەولەعەردی،دیێەبەر؟ (۶۸۲
دەسـتی دا وود،ئاسـنی کرد،چەشـنی مێـو ‌ ‌ مێـو لەدەسـتی وی چلـۆ نـە،ئێوە، پێـو (۶۸۳
بـوو ئـەمیر لوقمـان، بـەڵام زاهیر،غـولام ‌ ‌ بەندەگی،پۆشـیش بـوو، بـۆ وی، ناتـەمام (۶۸۴
گـەر ئـەمیر بڕواتەجێیەک،کـەس نـەناس ‌ ‌ ئـەو دەکاتەبـەرغولامی خۆی،لیبـاس (۶۸۵
جـا، لیباسـی خـۆی دەکـا، بـەر ئـەو غـولام ‌ ‌ ئەو غـولامی خـۆی دەکـا، بـۆ خـۆی ئیمـام (۶۸۶
وەک غـولام دەڕوا بـەدووی،دا، زۆر حـەقیر ‌ ‌ تـا کونـەی ناسـێت هـیچ کـەس ئـەو ئـەمیر (۶۸۷

---

[1]- گەنجی بوو ئەوکەس ،کەبوونی مەخزەنە ‌ ‌ بوونی بوو ئەوکەس،کەبوونی، دوشمەنە

ێـنـدەڵێ،بۆ سـەر بـڕۆ، جێـت بـۆ دەبـێ   وەک غـولام، ئاگـام لەکـەو شـی تـۆ، دەبـێ (۱۴۸۸)

ــ حـەزم زۆر پـێ بڵێ،جـا، ئـەی غـولام   تــۆ لــەبۆ مــن دامــەنێ،هیچ،ئیحتیرام (۱۴۸۹)

ـەرکی خزمـەت کـەی ئەگـەر،بۆم خزمەتـە   مــن نەناسـێنی بەکـەس،بۆم حورمەتــە (۱۴۹۰)

ـۆنە،بەنـدەی زاهری،سـەر وەر،گـەلێـک   تـا نـەزانێ سـەروەرن،هیچ کـەس چـەلێک (۱۴۹۱)

جـۆی وان،تێـر بوو،لەشـاهی بـێ نییـاز   کـاری وا، بـۆ،وان دەبوو،خـۆش، دڵخـوواز (۱۴۹۲)

ــەو غولامانــەی هەوا،بەرعەکســی وان   وا دەزانـن سـەروەرن، بـۆ عـەقڵ و گیـان (۱۴۹۳)

حۆ ـــەبۆ شــا،خۆی بەزیادنەگرێ،لەکــەس   بەندە،غــەیری بەندەیی،نایــەت، لــەدەس (۱۴۹۴)

ـ ری دونیـای مەعنـەوی و، دونیـایی دوون   بـەر خیلافـی یێکترین،لێـک،دوور دەبـوون (۱۴۹۵)

ـێ ــە لوقمـان سـەر وەری، ئـەربابی وی   دی نیشـــــانەی گـــــەورەیی،نایابی،وی (۱۴۹۶)

ـ ری لوقمــــــانی دەزانی،تــــــابنێ   مەسـڵەحەت بـوو، خـۆی بەرابـەر، دابنـێ (۱۴۹۷)

ـێیەویســت ئـازاد بکـا لوقمان،بــەڵام   شـەرت بـوو، لوقمان،بـدا، موسـبەت، وەڵام (۱۴۹۸)

جۆنکـەلوقمان ویسـتی،وی، وا، بـوو، هــەتا   کــەس نــەزانێ ڕازی ئــەو شـێرو،فەتا (۱۴۹۹)

ـۆ عەجــەب نابێ،کــەڕاز،ون کەی،لەبــەد   زۆرعەجـەب،تۆ ڕاز،لەخۆت ون کەی ئەبەد (۱۵۰۰)

ـۆ لــەچاوت، ون کــە،کاری پـڕ لەسـوود   تـا نـەبینێ قـەت ئـەوی،چاوی حەسـوود[1] (۱۵۰۱)

حۆت،خە،بەنـدی داوی مـوزدی خـوای غـەفوور   خـۆت لەخۆت،بێخود،کەتا،لابـەی، غـروور (۱۵۰۲)

جـون دەدەن تریاک،بــەوەی بـێ، زامــدار   تـا لەتـەن دەربێنێ،تیـر، بـێ شـین و، زار (۱۵۰۳)

ـحـتـی مـردن،زۆر بــەئێش و دەردەتــەن   ئەو،بــەئێش مەشـغووڵە،گیانی وی،دەبــەن (۱۵۰۴)

جـۆن بەهەرشت دڵ کەمەشغووڵ کـەی ئـەتۆ   دێ، دەبـا دز، شـت لـەلای تـۆ سـەربەخۆ (۱۵۰۵)

ـەرچلۆن تـۆ، فکـرو کـار کـەی ئـەو دەمـی   دێـت،دز، لــەو جێیــە، تـۆ، خـاتر جـەمی (۱۵۰۶)

حـ.تۆ مەشـغووڵ بـە، بـەوەی، زۆر پاکەئـەو   تــا نــەبا، دز،ئەوشـــتەی، زۆر چاکەئــەو (۱۵۰۷)

ــری تـاجیر گەرکو،کەوتــە، نێــو ئــاو   دەیهـەوێ،چاکتر نـەجات دا، نـەک تـەواو (۱۵۰۸)

ـەر لـەدەس تۆ،چـەن شتێ،بوون چوونـەئاو   چاک نەجات دە،نـەت هـەوێ،تۆ، ئی خـەراو (۱۵۰۹)

## ئاشکرابوونی فەزڵ و زیرەکی لوقمان، لەلای ئیمتیحان کەران..

ـەرتــــەعامێکی لــــەبۆ وی هاتبــــا   یـەک نەفـەر چووبا، لـەدووی لوقمان، دەبا (۱۵۱۰)

ـێهەویســت بخـوات لوقمان،لـەو تـەعام   هەرچی بەرماو، با، لەوی، دەی خوارد تـەمام (۱۵۱۱)

---

[1] - تۆ لەچاوی خۆش ون کە،کارو بار   تا کو سالم بی لەدەستی چاوو زار

هەرچی بەرماوبا، لەوی دەیخوارد،بەگشت    هەرچی بەرماو، لەونەبا،گشتی دەڕشت ۵۱۲)
خواردباشی،نابەدڵ،بێ ئیشتیها    ئەوهەیە،هەمبەستەگی، بێ ئیشتیها ۵۱۳)
خرچەیێکی، بۆ دەهینا،یەک نەفەر    زوو کوتی لوقمان بابێ، تاجی سەر ۵۱۴)
لێیوەکرد،قاشێک، جا، دای، بەو ئەمین    خۆشتری خوار د،زۆر لەشیرو،ئەنگەبین ۵۱۵)
چونکەخواردی قاشی ئەووەڵ زێدەباش    قاش بەدووی قاش،وێیدەدا،تا حەفدەقاش ۵۱۶)
ماوەقاشێک،دەیکوت ئەوهەش،من دەخۆم    تا بزانم تامی خرچەی خۆم،بەخۆم ۵۱۷)
چونکەلوقمان دەیخوواتن،هێندەخۆش    ئیشتیهای هەربینەرێک دێنێتەجۆش ۵۱۸)
کاتێ خواردی تاڵ بوو، وەک ژەهری مار    هەم گەرووی گرت،هەم دەسووتا،لێوو،زار ۵۱۹)
هێندەتاڵ بوو ماوەیەک نەی ما، چ حاڵ    دوایەپێیکوت ئەی ئەتۆ وەک ڕووح،زوڵاڵ ۵۲۰)
چۆن خورا پێت،ژەهرەماری هێندەتاڵ؟    چۆن بەدەردو ڕەنجی وا بووی خۆشحاڵ؟ ۵۲۱)
مام عەجەب،لەو سەبرە، گەر بڕوا دەکەی    یا بەگیانت، دوژمنی،گەر،وا،دەکەی ۵۲۲)
بۆچی نەت هینا،بەهانە؟،وا نەکەی    بۆچی نەت کوت ناتەوانم، تا، نەکەی؟ ۵۲۳)
جوابی داوە، نیعمەتت،زۆر داوە،من    من هەموویان،زۆر بەخۆشی خواردمن ۵۲۴)
بێ ژمار ئەنعامی تۆ، هاتوون لەبۆم    شەرمەئێستا،تاڵی دەستی تۆ،نەخۆم ۵۲۵)
من کەماوم، باعیسم ئەنعامی تۆ    ئەو وجوودەی سەرکەشی من،ڕامی تۆ ۵۲۶)
گەر، بەتاڵێک دادو فەریاد،بێنمەدەر    ئەو وجوودەم،خاکی دونیای،بێ وەسەر ۵۲۷)
لەززەتی،ئەو دەستی شیرین بەخشی تۆ    لای دەبرد،تاڵی،لەخرچە،سەربەخۆ ۵۲۸)
خۆ شەویستی،زۆر تاڵ، شیرین دەکا    خۆ شەویستی،زۆر مسان، زێڕین،دەکا ۵۲۹)
خۆشەویستی،ناحەزی، زوو، ڕا دەکا    خۆشەویستی دەردو ئێشان،چا دەکا ۵۳۰)
خۆشەویستی، مردوان زیندوو،دەکا    خۆ شەویستی،شا، وەکوو، هیندوو، دەکا[1] ۵۳۱)
خۆ شەویستی وا، نەتیجەی دانیشە    تۆ لەسەر ئەو تەختە، بێ غەش دانیشە ۵۳۲)
عیشقی وا،دانیش تەواو بێ چا دەکا    نا قیسیش بێ،بۆ جەمادات وا دەکا ۵۳۳)
سەرجەماد،گەر دی،هەمان ڕەنگی کەویست    وا دەزانێ،دەنگی یاری خۆی دەبیست ۵۳۴)
دانیشی ناقیس،لەلای بێ فەرقەفەرق    ڕۆژببینێ، یا ببینێ زەرق و بەرق ۵۳۵)
نا قیسی مەلعوون دەکوت شەخسی ڕەسوول    چون لەتەئویل دا بوو،نوقسانی عوقوول ۵۳۶)
ناقیسی تەن جێگەبۆ ڕەحمی حەقە    کوا لەبۆ نەفرینی حەق ئە و لایقە؟ ۵۳۷)

---

[1] - خۆشەویستی، شا، وەکوو، هەندوو .دەکا (مصرع دوم)

ـەفـــی عەقڵە،جێگـــەبۆ نـــەفرینی حـــەق ئـــەو بەنـــەفرینی خوداوەنـــد، موســـتەحەق (۱۵۳۸)

جونکەتـــەکمیلی عـــەقڵ،هیچ دوور نییـــە خـۆ بـەڵام تـەکمیلی تـەن مەقـدوور نییـە (۱۵۳۹)

ـەرو خـود خواهیـت، لەهـەرکافر، کـەدی نەقسـی عەقڵـە، ئـەو دەکێشـێ،بۆ بـەدی (۱۵۴۰)

ـ قیسـی تـەن، تـا کوهـەیبێتن فـەرەج هـات دەقورئـان (مـاعلی الاعمـی حـرج ) (۱۵۴۱)

ـەرقی ئاسـمان، بـێ دەوامـە، بـێ وەوفـا سـابیت وزائیـــل یـــەکن،لای بـــێ ســـەفا (۱۵۴۲)

ـەرجی بەستەی نووری بەرقە، ئەو دەنی بۆیەبـــەرقیش بـــەو بـــەقا قا،پێکـــەنی (۱۵۴۳)

ـۆری بـەرقی ئاسـمان،بێ سـوودە، سـوود کوا دەبێ ئەو چەشنی بەرقی خوای وەدوود؟ (۱۵۴۴)

ـەرقی ئاسـمان ( یختـف الابصـار) ەئـەو نـووری دائـیم، بـەو بەسـەر، ئەنسـارە،ئەو (۱۵۴۵)

ـــەر کـــەفی دەریایەئەســـپی،غار دان نامەخوێنـــدن ژێـــری بـــەرقی ئاســـمان (۱۵۴۶)

حیـرس و ئازەگـــەر بەئینســـان،وا دەکـــا شەخســـی بـــەدوا ڕۆژ، نـــا بینا،دەکـــا (۱۵۴۷)

عەقڵەدەڕوانیتـــەدوا ڕۆژ، بـــێ گومـــان کـوا دەزانـێ نـەفس، دوا ڕۆژ، ئـەی فـلان؟ (۱۵۴۸)

ـەفـــەعەقڵێک،نەفس،بیکا ســـەر نـــەوی موشـتەری نەحسـە،زوحەل مـات کا، ئـەوی (۱۵۴۹)

جـاک تەماشـای نەحسـی دامـەنگیر کـە لـەو کەسـەی نەحسـی بـەتۆ دا، بیـر کـە (۱۵۵۰)

ـەر ببینـێ جـەرڕو مەددی،والەکـەس نەحسـی نامینێـت، سـەعدی دێتـەدەس (۱۵۵۱)

ـبیـەحاڵی تـــۆ دەگـــۆڕێ، کردگـــار چـون بەزیـد، چـاک زیـد، دەبێـتن ئاشـکار (۱۵۵۲)

تۆ دەترسـی ون بـێ،ڕێ، لێت،ئـەی عـەزیز بـوون دەگـەڵ باشـان،لەبۆ بـاش، زۆر لـەزیز (۱۵۵۳)

ـەتبێ بـا،دوو بـاڵ، گـەر تـۆ، خـۆش فـەڕی چـــون بەیـــەک بـــاڵ، ناتوانی،هـــەڵفڕی (۱۵۵۴)

یا ڕەهـام کـە، تـا نـەڵێم مـن هـیچ کـەلام یـــا بدەدەســـتوور،ببێژم مـــن تـــەمام (۱۵۵۵)

گـەر لـەوان دوو حوکمـە، هیچیـانم نەبیسـت حوکم،حـوکمی تۆیە،هـەرچۆ نت،کەویسـت (۱۵۵۶)

گیـانی ئیبـراهیم دەبـێ بـێ، تـا بـەنوور ئـــەو لـــەنێو ئـــاگر ببینێـــتن قســـوور (۱۵۵۷)

تـــا لـــەمانگ و ڕۆژ کەمکەم،بچتەســـەر تـا نـەبێ وا بەسـتە،وەک ئاڵقـە، بـەدەر (۱۵۵۸)

وەک خـەلیل لـەو ئاسـمانی حـەو تـەمین تێپـــەڕی جـــا، (لا احـــب الافلـــین ) (۱۵۵۹)

ـەو جیهانـەی تـەن دەبـێ، زۆر ئیشـتیبا غەیری ئەو شەخسەی لەشەهوەت، بوو ڕەها (۱۵۶۰)

**تەواو بوونی داستانی حەسادەتی ئەتڕا فیانی شا، نیسبەت بەغولامی شا...**

داســـتانی شـــاو ئـــەمیران و،حەســـەد بـەو غـولامی خـاس، بـۆ دانـیش ئەسـەد (۱۵۶۱)

ماوەنـــاقیس باســـی ســـوڵتا ن و غـــولام بێینەوەســـەر باســـی وان، بیکەین،تـــەمام (۱۵۶۲)

باغــەوانی مــوڵکی دونیــا زۆر، بــە، بــەخت     چــۆن نەناســێ،دار لــەداری دی، چ وەخــت؟ (۰۳

هــەروەکوودوو دار کــەیێکیان،تفت و تــاڵ     دارەکــەی دی میــوەکــەی خــۆش کــات حــاڵ (۰۴

چۆن دەکا ئەو،تەربیەت،وەک یەک ئەوان؟     چــۆن بەیــەک چاویــان دەبینێ،باغــەوان؟ (۰۵

چون لەدار مە قسوودی ئەسڵی هەر، بەرە     نــەک گــەڵا،یا ســەو زو شــینی و، ســێبەرە (۰۶

شــێخ بــەنووری خــوا دەبینــێ وایەئــەو     هــــەرچی کاروبـــارە، لێــــی ئاگایەئـــەو (۰۷

بــۆ خوداوەنــد،چاوی دونیــا بینــی، بەســت     ئــا وەڵــەی کــرد چــاوی ئــاخر بینی،مەســت (۰۸

خۆحەســوودان چەشــنی داری بــێ بــەرن     شــووم خەراپن،بــەد نیــژاد، بــەد گەوهــەرن (۰۹

ئــەو حەسوودان کــەف لــەزاریان، هەڵخرِانــد     کــاتێ،ون بــوون، ئــاگری فێڵیــان، هەڵگرِانــد (۰۰

تـــا غـــولامی خـــاس،ببرِن گـــەردەنی     تــا کــو راحــەت بن،حەســوودانی دەنــی (۰۱

چــۆ ن دەبــێ فــانی کــەگیانی شــاه، بــوو؟     حیفــزی وی،هــەرراس، بــەدەس، ئــەڵڵاە، بــوو (۰۲

شای لەوان ئەسرِاڕ، خەبەر دار کرد خودا     وەک ( ئــەبوو بــەکری رەبــابی)، بــێ ســەدا (۰۳

فکـــری پیســـی وانـــی شا،کرد،مەســـخەرە     مەسخەرەی کرد ئەو حەسوودا ن،یەک سەرە (۰۴

زۆر دەکــەن فێــڵ، قــەومی ناباب و خــەراب     تــا کــو بیخــەن شــا،دەنێو گــۆزەی شــەراب (۰۵

پادشـــای وا زۆرعـــەزیم و بـــێ نـــەزیر     چۆ ن لەنێو گۆ زەی دەبێ جێ، بێ ئەسیر؟ (۰۶

تــا دەداوخــەن شــا،گەلێکیان کردکەڵــەک     گەرچی فێربوون لەوهەموویان،یەک بەیەک (۰۷

نەنگەشاگرد،خۆی،لەئوســـــــتاد،بگرێ،زیاد     فــەزل و رەنجـــی ئووســـتاد، بیچێ،لـــەیاد (۰۸

کامەئوستاد؟،ئووســـتادی یـــەک جیهـــان     وەک عــەیان لــەو ئاشکرایەگشــت نیهــان (۰۹

چــون بــەنووری خــوا دەبینــێ چــاوی وی     زوڵمــــەتی جـــەهلی دەبـــاتن، تـــاوی،وی (۱۰

لــەو دڵــەی کون،هەروەکووکۆنــەی پــەلاس     چادەکــا پــەردەی لەپێش،ئــەو، زێــرِ نــاس (۱۱

پێکــەنینی دێ بــەوی، پــەردەی هــەزار     دێنەدەر،ســورِ، لــەو کونانــەی، زار هــەزار (۱۲

چونکەئوســـتاد، وای لەشـــاگرد،دی جـــەفا     پێیــدەڵێ ئــەی بــەد نیهــاد، ئــەی بــێ وەفــا (۱۳

وامەزانـــــەمن کەئوســـــتادم لـــــەبۆت     مــن بەشــاگردێک بزانــە، چەشــنی خــۆت (۱۴

تۆمەگــەرگیانت لــەمن نــەی گــرت تــەوان؟     ئــاوی عیرفانــت مەگــەر نــەم کــرد رەوان؟ (۱۵

جــا، دڵــی مــن کارخانــەی بەختــە، بــۆت     لــەت مەکــەتۆ، کارخانــەی بــەختی خــۆت (۱۶

تــۆ دەڵــەی چــەخماغ، بەپنهان،هەڵدەکــەم     دڵ لــە بــۆ دڵ، زۆرە رێیــان، خــۆ، نەکــەم (۱۷

دڵ لــەرِێی دڵ رِا، دەبینـــێ فکـــری تـــۆ     دڵ گــەوا هــو، شــاهیدەبۆ زیکــری تــۆ (۱۸

وا فەرزکــە، دڵ، لــەرووی تــۆ، هــیچ نــەڵێ     هەربــەگفتت پێکــەنی و، بێــژی، بــەڵێ (۱۹

ـۆرییا زاهیر نەبوو وا، پێکەنی      فکری پووچی تۆی دەدی،جا، پێکەنی (۱۵۹۰)
ێن جەزا، بۆئەو کەسەی بوو فێڵەباز      بۆ جەزای بەردو کڵۆ، بەر،دڵخوواز (۱۵۹۱)
ـەر دەگەڵ تۆ پێکەنی با، ئەو بەدڵ      بۆ ت دەپشکووت سەت هەزار گوڵ، بێ چقڵ (۱۵۹۲)
ـەر بەدڵ ئوستاد بکا،بۆت یەک عەمەل      موستەقیم دەڕوا هەتاو بۆ نێو حەمەل (۱۵۹۳)
ـد دەبن جا، هەم نەهار و هەم بەهار      ئەو جیهانەگشت دەبێتەسەبزەزار (۱۵۹۴)
ـەت هەزاران قومری دەخوێنن، بەدەنگ      لەو جیهانەی بێ وەفا وو، پڕ لەنەنگ (۱۵۹۵)
ـۆ گەڵای گیانت دەبینی،زەردو ڕەش      چۆنەنابینی لەپاشا، قەهری گەش؟ (۱۵۹۶)
ۆژی شا،گەر بچتەنێو قەهری عیتاب      زۆ ردەکا ڕەش،سوو ڕەتان،هەر وەک کەباب (۱۵۹۷)
ـۆ عوتارید، گیانی ئێمە، بۆ وەڕەق      لێی دەنووسێ هەرچلۆن بێن، موستە حەق (۱۵۹۸)
حوکمەکی دی ئەو دەنووسێ، سووروشین      تاکو دەرچێ،ڕوو ح لەگریان ولەشین (۱۵۹۹)
حەتی سوورو شین، نیشانەی نەو بەهار      وەک خەتی قەو س و،قوزەح بۆ ئیعتیبار (۱۶۰۰)

**ئینعیکاسی تەعزیمی پەیامی سولەیمان علیەالسلام تەوەسووتی هود هودی بچووک دەدڵی بڵقیس دا...**

ێ لەسەر بڵقیس ڕەحمەت،سەت هەزار      عەقڵی سەت پیاوانی دا، بەو، کردگار (۱۶۰۱)
ـود هودێک نامەی دەهینا بەو نیشان      ئی سولەیمان، چەندەحەرف و چەن بەیان (۱۶۰۲)
ـمەکەی ئەوخوێندەوە،تا بوو تەمام      هیچ بەقاسید نەی دەکرد،بێ ئیحتیرام (۱۶۰۳)
ـود هودی،دی،چاوو،گیان عەنقایی دی      چاو کەفی دی، دڵ بەڵام دەریایی دی (۱۶۰۴)
ـەقڵ گەڵ حیس نێو تەلەسمانی دووڕەنگ      وەک موحەممەدگەڵ ئەبووجەهلان،لەجەنگ (۱۶۰۵)
ـفران دیتیان ئەحمەد، یەک بەشەر      چون نەیاندی لەو، چ (انشق القمر ) (۱۶۰۶)
ـوی حیس بین، خۆڵی تێکەن، هیچ نین      چاوی حیس بین، دوژمنن، بۆ عەقڵ و دین (۱۶۰۷)
ـوی زاهیر بینی کوێرکوت زاتی حەق      بوت پەرەستی پێدەکوت بەو،خوا ی فەلەق (۱۶۰۸)
جون کەفی دەریای دەدی،دەریای نەدی      ئەو زەمانی حاڵی دی، لەدوای نەدی (۱۶۰۹)
ـەروەری دوا ڕۆژ، لەلای حیس بین ئەسیر      چون لەگەنجی مەعنی،حیس بین زۆر فەقیر (۱۶۱۰)
ـەڕەیەک گەر لەو هەتاو بێنێ پەیام      ڕۆژی ئاسمان،بۆ هەمان،زەڕڕە،غولام (۱۶۱۱)
ـەترەیێکی بەحری وەحدەت،بێ سەفیر      بەحری دونیا،بۆ هەمان قەترەئەسیر (۱۶۱۲)
ـستەخۆڵێک گەر ئیتاعەت کا،لەوی      بۆی دەکەن ئەفلاک هەموویان،سەر نەوی (۱۶۱۳)
خاکی ئادەم چونکەبوو،چالاکی حەق      سەجدەیان بۆ وی دەبرد،ئەملاکی حەق (۱۶۱۴)

(السما انشقت ) ئاخر بۆ چ بوو؟ چاوی یێک ئینسانی خاکی بوو، وەبوو (٦١٥
خاکی سەنگین بوو،لەنێو ئاو، نشتەجێ چا ولەخاک کە،عەرشی خستەژێری پێ (٦١٦
نەرم و نۆڵەئاو، لەخۆڕا وانییە غەیری لوتفی زاتی پاکی خوا، نییە (٦١٧
سەهلەبۆ حەق باوونار کا،ڕوو،بەژێر یا دڕووبیبێ لەگوڵ، زۆر زێدەخێر (٦١٨
حاکمێکە( یفعل اللّٰهمایشا) چا دەکاتن ئەو لەڕەنج و دەرد، دەوا (٦١٩
روو بەژێر کا،گەر خوداوەند باو و نار خوا دەیان کا،هەردووان سەنگین و تار (٦٢٠
گەرزەمین و،ئاوکا،خوا،ڕوو بەژوور تەی دەکەن هەردووکیان ئەفلاکی دوور (٦٢١
جا،یەقین بوو،تۆی (تعزمن تشا ) شەخسی خاکی تۆ دەبەی بۆ سەر سەما (٦٢٢
وا ی بەئاگرێک کوت بڕۆ ئیبلیس بە تۆ لەژێر خاک هەرخەریک، تەلبیس بە (٦٢٣
ئا دەمی خاکی وەسەر ئەفلاک،کەوە ئیبلسی ئاگرین،ژێر خاک کەوە (٦٢٤
چوار تەبع و عیللەتی ئەووەڵ کەنیم من لەکارم،بێ نەزیرم،دائیمیم (٦٢٥
کاری من بێ عیللەتە، ڕاس،موستەقیم من هەمە، تەقدیر نەعیللەت، ئەی سەقیم (٦٢٦
تێک دەدەم عادەت، ئەمن بم وێ،ئەگەر تۆزی عادەت لادەبەم، بێ دەردەسەر (٦٢٧
من بەدەریا وا دەڵێم تۆ نار، بە واش بەئاگر من دەڵێم،گوڵزار، بە (٦٢٨
من دەڵێم،کێو سووک ببێ،هەر وەک خوری ئاسمانیش گشتی بڕژێ،تا سەری (٦٢٩
من دەڵێم،با کۆ وەبن، مانگ و هەتاو ڕەش دەکەم هەردووکیان، وەک قیرەتاو (٦٣٠
ڕۆژی ڕوون من وا دەکەم نەی بێ، چ نوور وا دەکەم خوێن،بۆنی خۆشی بێ لەدوور (٦٣١
مانگ وڕۆژ هەردوو،وەکوو دووگایی ڕەش بەندکراوی خوادەبن، بێ نووری گەش (٦٣٢

**ئینکار کردنی فەلسەفی قەڕائەتی (ان اصبح ماءکم غورا)..**

**خولاسەی داستان ...**

قاریەکی قوڕئان ئەو ئا یەتەی دەخۆێندەوە(بلّێ ئەگەر ئاوی ئێوەبچتەبن عەردی و،وُن بێ کێ ئاو تان پێدەگەیەنیت وئا و تان بۆ جاری دەکا ) یەک نەفەر بەزاهیر فیلسووف بەوێدا ڕا دەبرد، هەردەگەڵکو،گوێی لەو ئایەتەبوو، کوتی ئەو هەکەزۆر موشکیل و سەخت نیە، دەچم پێمەرەو کوڵینگێک دێنم،وئاوی بەستراو جاری دەکەمەوە، شەوێ کەنووست دەخەو دا دیتی کەپیاوێکی بەتاقەت زللەێێکی محکەمی لەسووڕەتی وی دا کەهێندەتوند و محکەم بوو هەردوو

چاوی کوێر بوو . لەپاشان بەکابرای بەزاهیر فیلسووفی کوت..ئەگەر ڕاست دەڵەی بەو وەسائیل و ئەسبابەی کەهەتە، چاوەکانت چاکەوە.کاتێک لەخەو هەستا هەردوو چاوی کوێر بیوون ..

ـ:خوێنـد، قـاری لـەقورئان دا، بـەجۆش ـ (مـاءکم غـورا ) دەبەسـتم ئـاوی خـۆش (١٦٣٣)
ـ لـەژێر عـەردی ئـەمن پنهـان دەکـەم ـ چاوەکانیان،وشـک و بـێ سـامان دەکـەم (١٦٣٤)
ـیری مـن کـێ ئـاو بـەکانیاوان، دەدا؟ ـ کـێ لەدەسـتی دێ،وەهـا، غـەیری خـودا؟ (١٦٣٥)
ـەفیکی زۆر سـەفیکی،پیس و پەست ـ ڕادەبـرد، ئـەودەم بـەوێ دا،چەشـنی مەست (١٦٣٦)
ـرکە بیستی ئایـە، دەیکوت وەک پڵینگ ـ مـن دەهێـنم ئـاو بەبێڵچـە هـەم کوڵینـگ (١٦٣٧)
ـن بـەپاچ و پێمـەڕەو، تیـژی تەبـەر ـ ئا و لەبن عـەردی گـەلێک قووڵ، دێنمەدەر (١٦٣٨)
ـکەنووست دیتی دەخـەو،یێک شێرەپیاو ـ زلـلـەیێکی لێـدەدا، کـوێر بوو،لـەچاو (١٦٣٩)
ـدکوت لـەو کـانی چـاوان، ئـەی شـەقی ـ بێنـەدەر نوورێـک بـەپاچ گـەر سـادقی (١٦٤٠)
ـتی هەسـتا،دی کـەچاو ی کـوێر بـووە ـ نـووری هـەر دوو چاو،لەدەسـتی وی،چـووە (١٦٤١)
ـر کـو نـا لیبـا و، موسـتەغفیر ببـا ـ نـووری ڕۆیشـتووی دەداوە،بـەو، خـودا (١٦٤٢)
ـغفیرەت ویسـتن بـەلام، ئاسـان نییـە ـ زەوقـی تۆبـە، نـۆغڵی هـەر ئینسـان،نییە (١٦٤٣)
ـری پـیس و ناحـەز و، ڕەفتـاری وی ـ دەرکی تۆبەی بەست لەقـەلب و زاری وی (١٦٤٤)
ـ کە ڕەق بوو هێن بەچەشنی بەرد و دار ـ چـۆن لـە بـۆ تۆبـەی دەبێتـە، سـەبزەزار؟ (١٦٤٥)
ـ شـوعەیبێک،بێ دوعاکا، ئـەو لەحـەق؟ ـ بۆ ی بەخاک و خۆڵ بگۆڕێ، بەردی ڕەق[1] (١٦٤٦)
ـون نیـازو ئیعتیقـادی بـوو شـوعەیب ـ بوو بەمومکین غـەیرەمومکین،دوور لەعـەیب (١٦٤٧)
ـ موقەو قەس بۆی دوعاکرد، شاهی دین ـ بـەڕدەڵانی بـۆ دەبـوو مەزرایی،شـین[2] (١٦٤٨)
ـکسـی ئـەو کارانـەزۆرجار،ڕوو دەدا ـ زێـر دەبێتـەمس،دەبێ سـوڵحیش هـەرا (١٦٤٩)
ـبایـەک بـوو، سـەرەو بـن ئەونـەزان ـ خـاکی قابیـل ئـەو دەکاتەبـەردەڵان (١٦٥٠)
ـردڵێک سـەجدە، لـەبۆی دەسـتوور نییـە ـ سەهمی ڕەحمەت،موزدی هەر مزدوور نییە (١٦٥١)
ـت نەڵەی جورمان دەکەم تۆ بەش دەکەم ـ خـۆم لـەڕەنجی ئـاخرەت بێ بـەش دەکـەم[3] (١٦٥٢)
ـەبۆ تـۆ بـە، هـەیبێ ئـاوو تـاو ـ ڕەعـدو بـەرقی لازمەتۆبـەی تـەواو (١٦٥٣)
ـوو گـەرمای لازمـە،میوێک بگـات ـ ڕەعـدو بـەرقی لازمـە، میـوەی حـەیات (١٦٥٤)

---

1- کوا شوعەیبێک بێ هەوێ لەخوایێ پاک؟ بەردەڵان تەبدیل بکا ،بۆ وی بەخاک
2- یان موقەو قەس ،بۆ ی دوعا کرد شای دڵان بۆی بەمەزرای شین دەگۆڕا، بەردەڵان
3- قەت نەڵەی جورمان دەکەم ،تۆبەی، دەکەم خۆم لەڕەنجی ئاخیرەت ،بێ ،وەی، دەکەم

تا نەبێ،بەرقی دڵ و، هەوری دوو چاو | ئاگری تەهدید و کین، ناچێ لەناو (۶۵۵

کەی،دەبێ شین سەوزەیی زەو قی ویسا ڵ؟ | کەی دەجۆشێ ئاوی کانیاوی زوڵا ڵ؟ (۶۵۶

کەی گوڵستان ڕاز دەڵێتن،گەڵ چەمەن؟ | کەی وەنەوشە،عەهد، دەگرێ،گەڵ سەمەن (۶۵۷

کەی چنارێک واز دەکا دەس،بۆ دوعا؟ | کەی دەبێ دار،سەر تەکان دا،نێو هەوا؟ (۶۵۸

کەی شکووفەی جوانی فەسڵی،نەوبەهار؟ | بۆنی خۆشی خۆی بەدونیا کا، نیسار؟ (۶۵۹

کەی دەبێ لالە ، بەچەشنی خوێن سوور؟ | کەی دەکاگوڵ،چەشنی‌خۆی،هەرشوێن،سوور؟ (۶۶۰

کەنگی بولبول،بۆنی گوڵ،زوو زوو،دەکا؟ | چەشنی تالیب،فاختە،کووکوو، دەکا؟ (۶۶۱

کەی دەڵێ لەک‌لەک،وەها لەک‌لەک بەگیان | لەک،بەمانای،موڵکی تۆ،ئەی خوای جیهان (۶۶۲

کەی دەکا،خاک، ڕازی پنهان ئاشکار؟ | کەی دەبێ ڕوون چەشنی ئاسمان،سەوزەزار (۶۶۳

کێ دەداتن ئەو هەموو ئەشیای جوان؟ | بێ گومان،هەرخوا ی کەریم ومیهرەبان (۶۶۴

ئەو هەمووجوانی،نیشانەی کردگار | تا کو واسڵ بێ بەوی،پەرهیزکار (۶۶۵

شاد دەبێ هەرکەس کەدی ئەو شەهریار | هەرچی نەی دی قەت نەبوو ئەو هووشیار (۶۶۶

هەر کەسێکی،ڕووحی وی،کاتی (الست) | دی‌خودای خۆی،چوو لەهۆش و بوو بە مەست (۶۶۷

بۆنی بادە، لای شەرابخۆر،بوو عەیان | نەک ئەوەی نەیخوارد ئەو، قەت هیچ زەمان (۶۶۸

چونکە حیکمەت وشترێکە ،ون بووە | ئەو وەکوو، یێک ڕاهنەما، لای شا، چووە (۶۶۹

تۆ دەخەو دا،جاردەبینی خۆش،ئەدا | وادەبێ ئەو وەعدەیێک،زۆر خۆش، ئەدا (۶۷۰

تۆ مرادت دێتەجێ،هانێ،نیشان | هەرسبەینێ دێتەلای تۆ،جا، فلان (۶۷۱

یەک نیشان بوو،ئەو بەتەنها،یەک سووار | یەک نیشان، بۆ قەدری تۆ، ئەو دێتەخووار (۶۷۲

یەک نیشانەش پێکەنینی وی،کەهات | یەک نیشانەش،دەس بەسینە، ئەو لەلات (۶۷۳

یەک نیشانەش،خەونی خۆت تۆ،بۆ هەوەس | تۆ کەهەستای،ئەو نەڵێ،لای هیچ کەس (۶۷۴

بابی یەحیا،دی نیشانەی، والە، ئەو | تا کو سێ،ڕۆژ،هیچ مەڵێ،گەڵ کەس، بەدەو (۶۷۵

تاکو سێ ڕۆژ،تۆ ببەستە، زاری خۆت | بۆ نیشانەی،ئەوهە،یەحیا،دێت بۆت (۶۷۶

تاکو سێ ڕۆژ،تۆمەکە، هیچ گفتو گۆ | ئەو سکووتەئایەتی مەقسوودی تۆ (۶۷۷

تۆ نەکەی ئەو ڕازە،زووکەی ئاشکار | با،دەدڵدا،ڕازی وابگرێ،قەرار (۶۷۸

ئەونیشانانەی بەوی کوت وەک شەکەر | سەت نیشانەی دیکەدێتەبەر نەزەر (۶۷۹

ئەونیشانە،یانی چیت ویست موڵک و جاه | بێ گومان دەیدا،بەتۆ زاتی ئیلاه (۶۸۰

گەر بنا ڵێنی بەشەو، تۆ زار زار | سۆزی ناڵەت بێ سەحەر،جا، زێدەجار (۶۸۱

ـزی تۆ، بێ ئـەو نیشـا ن، تاریـک دەبـێ     گـەردەنی تـۆ، چەشـنی مـوو، باریـک دەبـێ (۱۶۸۲)
ــــ و دارایـــی دەڕێـــی،وی،دا، دەد ەی     غـەیری وی هـەرچی هـەبێ، لێـی،لادەدەی[1] (۱۶۸۳)
ـ دەدەی،هـەم خـەو دەدەی،هـەم ڕەنگی ڕوو     سەر دەدەی، هەم کزدەبی،هەر چەشـنی مـوو (۱۶۸۴)
ـەنێو ئاگر دەبی تـۆ، چەشـنی عـوود؟     چەن لەژێر تیغ دادەنێی، سـەر چەشـنی خـوود؟ (۱۶۸۵)
ـ گرفتـاری وەهـا، هـەن سـەت هـەزار     زێـــدەبۆ عاشـــق کەناکرێن،قـــەت ژمـــار (۱۶۸۶)
ـەونی والـــە، گـــەرببینی تـــۆ، بەشـــەو     شـاد دەبـی ئەودەم،کەهەسـتا ی تـۆ، لەخـەو (۱۶۸۷)
ـەڕاست و چـەپ دەکـەی تا بەڵکەئـەو     بێتەبــــــەر چاوت،کەدیتت،تۆ،دەخـــــــەو (۱۶۸۸)
ـ گـەڵای داران دەڵـەرزێ ئـەو دەڵـێ     کـوا نیشـانەی دیـم دەخەودا،ئـەو وەڵـێ؟ (۱۶۸۹)
ـ کووچـەی شـار دەڕۆی تونـد تونـد،بەغار     وەک لەدەســـتت،کردبی ئەســـپت فیـــرار (۱۶۹۰)
ـت بڵـێ یـەک، خێرەئاغـا، وا دەڕۆی؟     چیـــت ئـــەتۆ،لێ،ون بووە،وا،ڕەنجـــەڕۆی؟ (۱۶۹۱)
ـ دەڵـەی بـەو، خێرە،ئەمما،خـەیری مـن     لـەو نیشـان، بـا، کـەس نەزانی،غـەیری مـن (۱۶۹۲)
ـیشـــــــان بێژم،نیشـــــــانەم،چوولەدەس     گـــەر نیشـــان چـــوو،مردنم فـــەریاد ڕەس (۱۶۹۳)
ـ دەنۆری،باش،لەهەرکـەس بـێ سـووار     پێـــــت دەڵـــــێ مەڕوانەڵێم،دێوانـــــەوار (۱۶۹۴)
ـ دەڵـەی بـەو، مـن ڕەفـیقم،ون بـووە     مـــن بەدووی،ویـــدا،دەڕۆم، دڵ کون،بـــووە (۱۶۹۵)
ـەتی تـۆ بەرقـەرار بـێ ئـەی سـووار     ڕەحمـــەتت بـــۆ عاشـــقا ن،جێـــی ئینتیـــزار (۱۶۹۶)
ـەلا ش کـەی بـۆ ئەوەی،ویستت،ئەگەر     پێیدەگەی،وایکوت،لـەبۆ ن خـــەیرەلبەشـــەر (۱۶۹۷)
ـەناکاو،هات سـووارێک خـۆش کـەلام     تۆی لەباوەش کرد توند توند، پا ش سەلام (۱۶۹۸)
ـ دەبی،بێهـــۆش دەمێنـــی هـــەر تـــەنێ     بـێ خەبـــەر لـــەو حـــاڵ، نیفـــاقی نێـــو،دەنێ (۱۶۹۹)
ـ دەزانـــی، بـــۆچی وایـــە،بێ خەبـــەر؟     یـا لەوەسـڵی کـام نیشـان وای هـات بەسـەر (۱۷۰۰)
ـ نیشـــانە،بۆ ئـــەوەی نیشـــانی دی     چـۆن دەبـێ پەیدا،نیشـان،بۆ خـــەڵکی دی؟ (۱۷۰۱)
ـەحـەق ڕا هـەر زەمـان بـۆوی نیشـان     شەخسـی بـەدکار ناگرێـت نیشـان، بـەگیان (۱۷۰۲)
ـنی حـەق چەشـنی ماسـی دوور لـەئاو     ئەونیشـــانان، ئایـــەتی قورئـــان تـــەواو (۱۷۰۳)
ـــــــانانەی هەیانن،ئـــــــــەنبیا     خاســـی ئـــەوگیانا نەنـــە، بـــوو ن ئاشـــنا (۱۷۰۴)
ـقـــــەم نـــاقیس دەمـــا، نەمما،قـــەرار     بـــێ دڵـــم عـــوزرم قـــەبووڵ کە،هووشـــیار (۱۷۰۵)
ـزەڕڕە، کـــێ لەدەســـتی دێ، ژمـــار     خاسسەگەرعیشق،عەقڵی وی کرد تارو مار (۱۷۰۶)
ـــ و،دەبژێرم،گـــەڵای باغـــان ئـــەمن     دەنگی کـەو، هـەر وا سـەدای زاغـان ئـەمن (۱۷۰۷)

---

[1] - تۆ دەڕێی وی دا، دەبەخشی ،ماڵ ،بەجەم     هەرچی ،هەت بێ ماڵ ، زۆربێ یانەکەم

کــەس لەدەســتی نایــەوا،کا، مــن دەکــەم
سەعدو نەحسی موشتەری و کەیوان، چ جار
خۆ،بــــەڵام،زۆر کـــەم لــــەکارو باریـــان
تـــا قەزا،مــــەعلووم بیێ،ئاســـاری وی
تــالعی هەرکــەس ببــێ گــەر موشــتەری
گەر زوحـەل تـالع بیێ، بۆ، یەک،ئـەو لەبـەد
کـاری ئەسـتێرەی زوحـەل بێـژم ئەگـەر
خـوا بەئێمـەی زیکـری خـۆی دەستوور دەدا
گـەرچی پـاک و بـێ نییـازم مـن لـەزیکر
خــۆ بــەڵام عاشق،بەســوورەت یابــەوەهم
گەرخــەیاڵ نــاقیس بــێ، ئــەودەم وا دەکــا
یــەک دەڵێ،ئــاخر کەشــا، جــۆڵا نیــە

تــاکو ســالیک ئیمتیحــان کــەم زۆر،نەکــەم
نــــابژێرێن، چونکــــەزۆرن بــــێ ژمـــــار
چاکەبێژین،یــەعنی ســـوودو هـــەم زیـــان
لای ســـەعید و لای شـــەقی ئاکـــاری وی
شـاد دەبـێ، چـون دیتەدەستی، سـەر وەری
ئیحتیـــــــاتی لازمــــــــە،تاکو ئەبــــــــەد
ئــاگری دەگرێ،شــەقی،تا فــەرقی ســەر
دی،لــەنێو نــارین، بەئێمــەی نــوور، دەدا
لایقــــــی تەســـــــویرنیمەمن بـــــــەفیکر
بێ میسـال ئـەو،کوا دەکـاتن، ئێمە،فـەهم؟
ســـوورەتان ئـــەو بــــۆ خوداوەنـــد،چادەکا
ئـــەو نیـــازی قـــەت بەمـــەدحی وا نیـــە

**ئینکار کردنی مووسا (علیەالسلام) موناجاتی شوان..**

**خولاسەی داستان...**

ڕۆژێـک حـەزرەتی مووسـا گەیشتەشـوانێک کەبـەزبانی سـادە، دەگـەڵ خـودا دەدوا، مەسـەلەن دەیکوت ..ئەی خودا ئەتۆ لەکوێی؟ تا نۆکەریت بکەم .کەو شەکانت بۆ پنوو بکەم .وزولفەکانت بۆ شانەبکەم،کراسەکەت لەئەسپێ و ڕشک پاک و خاوێن بکەم، ولەشیری مەڕان تێرو تەسەلت بکەم، دەستو لاقت مـالیش بـدەم وبۆت بشێلم،وجێگای خـەوت پـاک و خـاوێن بکـەم وهـەروەها جومـەلات و عیبـاراتی دیکەبـەو مەفهوومانـەی دەکـوت تـا ئـەو وەختەحـەزرەتی مووسا (ع) لێی نارەحەت بـوو، وسـەرزەنیش وسـەکۆنەی کـرد، شـوان بـەدڵی شکاوو غـەمباری ڕێگای سـەحرای گرتەبەر ورۆیشت،لەلایەکی دیکەشەوەخودا وەند وەحی بۆحـەزرەتی مووسا نـارد، کەبەشـیددەت حەزرەتی مووسای سـەرکۆنەکرد. کـەبۆچی ئەوبەنـدەی وا مـوخلیس، ئـەتۆ لەئێمـەت جـودا کـرد. حەزرەتی مووسا(ع) ودوای شوان کەوت ودەشت و چۆل وبیابانی وەبن پێ دا .

دیتــی مووســـا شـــوانەوێڵێک وا لــــەڕێ
جێــــت نیشــــان دەتــــا کوببمەنۆکــــەرت
مــــن لیباســــت بۆبشـــۆم،بیکەم تــــەمیز

ئەو خـودای خـۆی بانـگ دەکـات و،وا دەڵێ
کاڵەکەت بدرووم و، شەی کـەم، مووی سـەرت
مـن لـەبۆت بێنم،گـەلێک شـیری لـەزیز

دەستەکەت ماچ کەم دەگەڵ دووپێ یەکان　　وەختێ خەوخاوێن بکەم بۆت،جێ ووبان (١٧٢٣)
ئەی هەموو بزنانی مەن قوربانی تۆ　　هەیهەیی مەن، یادی بێ پایانی تۆ (١٧٢٤)
ئەو قسە، بێهوودەدەیکوت ئەو شووان　　پێیدەکوت مووسا دەگەڵ کێی،ئەی فلان؟ (١٧٢٥)
جوابی داوەگەڵ ئەوەم،دای مەن وجوود　　بەس لەوی بوو عەردو،چەرخی ڕەنگ کەبوود (١٧٢٦)
پێیدەکوت مووسا ئەتۆ ئەی خیرەسەر　　نێ موسەڵمان،کافری، ئەی بێ خەبەر (١٧٢٧)
ئەو قسانەی تۆ دەکەی کفرن،هەموو　　پەنبەیێک،محکەم بنێ،تۆ نێو گەروو (١٧٢٨)
کفری تۆ دونیای هەموو ئالوودەکرد　　کفری تۆ جوانی هەموو فەڕسوودەکرد (١٧٢٩)
کەوش وکاڵەلایقی تۆن نەک خودا　　کەوش و کاڵە،چۆن دەبن،بۆ حەق ڕەوا؟ (١٧٣٠)
بەس نەکەی گەر لەو قسانەی پڕ لەشەڕ　　ئاگرێک دێت ۆ، دەسووتێن،وشک و تەڕ (١٧٣١)
گەر نەهات ئاگر،ئەدی،ئەو دوودە،بۆ؟　　ڕەش دەبووگیان،ڕووح ئەدی مەڕدوودە، بۆ؟ (١٧٣٢)
گەر دەزانی تۆ خوداوەند، داوەرە　　بۆ دەڵەی بێهوودەهێنەدە، داوەرە (١٧٣٣)
دۆستایی گەڵ نەفام بۆ دوشمەنی　　خوا، لەکارو باری وا،خۆ،بوو، غەنی (١٧٣٤)
تۆ دەگەڵ کێی، بێژە،مامت یانەخاڵ؟　　کوا بەجیسمی بوو نیاز،خوای با کەماڵ؟ (١٧٣٥)
شیر لەبۆ وەی باشە، ڕوشدی پێ،ببێ　　کاڵەبۆ ئەکەس، کەموحتاج،پێ،ببێ (١٧٣٦)
گەر دەگەڵ بەندەی خوداتە، زۆر بەجێد　　ئەوکەسانەی بوون دەگەڵ حەق موتتەحید (١٧٣٧)
ئەو کەسەی دەیکوت نەخۆش بووگیانی من　　بۆ نەهاتی تۆ،لەبۆ سەردانی مەن؟ (١٧٣٨)
ئەو کەسەی بیستی،وەهەم دیتی بەمن　　خۆ لەبارەی ویش، غەڵەت بوو،تا کوبن (١٧٣٩)
بێ ئەدەب بوونیش، دەگەڵ خاسانی حەق　　ژین لەدڵ دەبڕێ،دەکا ڕەش ڕەش وەرەق (١٧٤٠)
گەر بەپیاوێک تۆ ببێژی، فاتیمە　　گەرچی یەک جینسن،ژن و پیاو،ئەو دەمە (١٧٤١)
قەستی خوێنی تۆ دەکا، تا مومکینە　　گەر چی خۆ ش ئەخلاق،حەلیم و ساکینە (١٧٤٢)
فاتیمەمەدحەبەڵام،هەر بۆژنان　　گەر بەپیاو بێژی،وەکوو ئێشی دەبان (١٧٤٣)
دەست و پێ نیسبەت بەئێمە، موستەحەق　　ناڕەوایەدەست و پێ نیسبەت بەحەق (١٧٤٤)
(لم یلد لم یولد) ی، بۆ لایقە　　ئەو لەبۆ مندا ڵ و بابان،خالیقە (١٧٤٥)
چون وەلادەت،وەسفەبۆ ئەجسام،بەس　　هەرچی مەو لوود بێ،دەچێ ئاخر،لەدەس (١٧٤٦)
حادیسن ئەجسام،دەگۆڕێن،چون ئەوان　　موحدیسێک لازم بوو،بۆ وان بێ گومان (١٧٤٧)
ئەو کوتی.. مووسا،تۆ،بەستت زاری مەن　　ئەو قسانەم، بوونەنەنگ و عاری مەن (١٧٤٨)
ئەوهەڵیکێشا، لەپاشان،ئاخ و داخ　　ڕووی دەکردەچۆل ۆدەشت و شاخ و داخ (١٧٤٩)

**سەرزەنیش کردنی خوداوەند ی موتەعال، حەزرەتی مووسا(ع) لەبەر خاتری شوان..**

وەحیـــی بۆمووســا دەهات،جــا، لای خـــودا    عەبـــدی ئێمـــەت،تۆ لەئێمـــە،کرد جـــودا (٥٠)
مـــن ئـــەتۆم نارد،تــاکوبێی و، وەســڵ کـــەی    نـەک لـەبۆ وەی تـا کـوبێی و،فەسـڵ کـەی[1] (٥١)
چـا مەکـە، تـۆ تـا، لەدەسـتت دێ، فیـراق    بــەدترین ئەشـیا، لــەلای من،بــوو تــەڵاق (٥٢)
دام بەهەر کەس عادەتی مەخسووسی خۆی    دام بەهەرکـــەس ئیســـتیلاحێک،جوانە،بۆی (٥٣)
بـۆ وی مــەدحن ئــەو قسـانە، بـۆ تـو، زەم    بـۆ وی شـەهدن ئـەو قسـانە، بـۆ تـۆ، سـەم (٥٤)
مـــن لـــەپاکی، هـــەم لەناپاکیم،بـــەدوور    مـــن لەسســـتی هـــەم لەچالاکیم،بـــەدوور (٥٥)
مـن لەفـەرمان، هـیچ مەرامم،سـوود نییـە    ویستی من،بۆ خـەڵکی، غـەیری جـوود نییـە (٥٦)
ئیســـتیلاحی هینـــد، مـــەدحی هینـــدیان    ئیســـتیلاحی ســـیند،مەدحی ســـیندیان (٥٧)
مـــن بـــەزیکری وان نابم،پاک،چکـــات    بەڵکەزیکری من ئەوان چاک پاک دەکات (٥٨)
زاهیـری ئەشـیا لـەلای مـن، بـێ سـەمەر    بـاتینی ئەشـیا، لـەلای مـن، موعتەبـەر[2] (٥٩)
نـــازری قـــەلبم، ئەگـــەر خاشـــع ببـــێ    گـــەرچی گفـــت و،قـــەولی ناخـــازع ببـــێ (٦٠)
چونکـەدڵ جەوهـەربوو،گفتیش،بوو عـەرەز    جا،عــەرەز بــۆ تــابیع و، جــەو هەر،غــەرەز (٦١)
بەسـکەلەو ئـەلفازی،زۆر پـڕ بـێچ و خـەم    سۆزی عیشـقم هـەردەوێ،من، تـاکو هـەم (٦٢)
ئـــاگری عیشـــقی لـــەنێو دڵ، هەڵکـــە،تۆ    با،بســـووتێن گشـــت عیبارەت،ســـەر بـــەخۆ (٦٣)
لێـــک جیيان،ئـــاداب زان و، دڵ پـــەژار    حـــاڵی وانی،زانی،تـــەنها کردگـــار (٦٤)
عاشـــقی ســـووتاو،نیتی هـــیچ عـــیلاج    دێ،کـــەوێران بێت،نـــادا،هیچ خـــەراج (٦٥)
گـــەر خـــەتای کوت،تـــۆ مـــەڵێ،خاتی،بڕۆ    بـا، شـەهیدیش غـەرقی خوێن،بێ،ئـەو مەشۆ (٦٦)
بـــۆ شـــەهیدان خـــوێن لـــەئاو، بـــاڵا تـــرە    ئـــەو خەتایـــە، ســـەت لەڕاســـتی، چـــاترە (٦٧)
عـــــادەتی قوبلە،لـــــەنێو کابە،نییـــــە    گەر،بەبێ پاپۆش بێ غەوواس، باک، چییە؟[3] (٦٨)
کوا، لـە دەسـتیان دێت،مەسـتان ڕەهبـەری؟    خەرقـەپۆ شـان بـوون لـەپینان، هـەر بـەری (٦٩)

---

[1]- من ئەتۆم نارد،تاکووبێی و، یێک بکەی    نەک لەبۆ وەی تا کوو بێی و ،لێک بکەی

[2]- چاو لەزاهیر من کەناکەم قەت ،چ جار    چاو لەباتین من دەکەم لەیل و نەهار
[3]- گەرغەواس نەی بێت پاپۆش، باک چییە؟(مصرع دوم)

ـــ دەتی عیشقی،لەگشـــت دینـــان،جودا ‌ ‌ ‌ عاشـــقانیش، دیـــن و، مەزهـــەبیان،جودا (۱۷۷۰)

ـەتی گـەر مـۆری نـەبێ، هـیچ بـاک، نییـە ‌ ‌ ‌ عیشـق، نێـو دەریـای غـەمان، غەمناک،نییـە (۱۷۷۱)

**وەحیی، هاتن بۆ حەزرەتی مووسا (ع) لەبارەی مەعزەرەت ویستن لەشوان..**

ـــەرازی کـــوت بەمووســـا کردگـــار ‌ ‌ ‌ نابێ،قـــەت قـــەت،ڕازی وا بن،ئاشـــکار (۱۷۷۲)

ـەر دڵی مووسای ڕژاند،حەق زۆ ر و ُتا ر ‌ ‌ ‌ لێـــک درا بوون،کـــاری چاوو،کـــاری زار (۱۷۷۳)

ـەبەهۆش وهات وەهۆش ئەو زیاد لەحەد ‌ ‌ ‌ هـــەڵفڕی زۆر لای ئـــەزەل،چۆ لای ئەبـــەد (۱۷۷۴)

ـــێت و نـــادانم لـــەوەی زیـــاتر بڵـــەم ‌ ‌ ‌ گـــەر بڵـــەم من،زێدە،لـــەو باســـە، هەڵـــەم (۱۷۷۵)

ـەر بـەم، عـەقڵان گـەلێـک لای لادەبا ‌ ‌ ‌ گـەر بنووسـم، زۆر قەڵـەم، هـەر بـا، دەبـا (۱۷۷۶)

ـەو عیتابەی،حـــەق کـــەبۆ مووســـا،دەهات ‌ ‌ ‌ ڕوو بەدەشت و،چۆڵ،بەدووی،شوان،دادەهات (۱۷۷۷)

ـــوێنی شـوانی گرتەبەر،ئـەو هـەر بـەغار ‌ ‌ ‌ دەشـــت و چۆڵی،دادەگرت،تـــۆ زو،غوبـــار (۱۷۷۸)

ـــوێنی لاقـــی عاشـــقی شـــێواوی زار ‌ ‌ ‌ زۆر لەشـــوێنی لاقـــی شەخســـی دی،دیـــار (۱۷۷۹)

ـەوەکوو ڕوخ، ڕاس لەسـەر، ڕادێتـەخوار ‌ ‌ ‌ جـار وەکووفیـل،دادەنێ پـێ، خـێچ و خـوار (۱۷۸۰)

ـــر وەکـــوو ئەمواج،بڵیند،ئەودێتـــەچاو ‌ ‌ ‌ جـــار، بـــەزگ دەڕوا وەکووماســـی، لـــەئاو[1] (۱۷۸۱)

ـەنووسێ،حاڵی خۆ ی سەر خاک وخۆڵ ‌ ‌ ‌ چەشـــنی ڕەممال،لێدەدا،ڕەملێک،لـــەچۆڵ (۱۷۸۲)

ـەقیـەت پەیدای دەکرد،شوان هات وەدی ‌ ‌ ‌ پێیدەکوت فەرمان گەیشت،موژدەم ئەدی؟ (۱۷۸۳)

ـــم و عـادەت لابـە تـۆ وەک ئـەووەڵێ ‌ ‌ ‌ هـەرچی ویسـتی ئـەو دڵـەی تـەنگت، بڵـێ (۱۷۸۴)

ـــەکفرت، دینـــی تـــۆ، بۆنـــووری گیـــان ‌ ‌ ‌ خوا،بـــەخاتر تۆ،بـــەدونیای، دا ئـــەمان (۱۷۸۵)

ـــەی مـــەعافی حـــوکمی زاتـــی کردگـــار ‌ ‌ ‌ هـــەرچی هاتەســـەر دڵـــت،بیڵێ، بـــەزار (۱۷۸۶)

ـــکوت ئەی مووسا،لەوەی،من چوومەسەر ‌ ‌ ‌ ئێســـتەخوێنی دڵ،منـــی گرتۆتەبـــەر (۱۷۸۷)

ـــر لەســـیدرەی مونتـــەها،زۆر تێپـــەڕیم ‌ ‌ ‌ سەت هەزار ساڵ،زیا د لەوێ من هەڵفڕیم (۱۷۸۸)

ـە بەشـەللا ق، دات لەئەسـپی مـن، وەهـا ‌ ‌ ‌ ڕا پـەڕی جـا، ئـەو لەئـەفلا ک بـازدی دا (۱۷۸۹)

ـــەحرەمی ناســـووتی مـــن لاهـــووت بـێ ‌ ‌ ‌ ئافـەرین بـەو دەسـت و، بـەو بـازووت بـێ (۱۷۹۰)

ـــێ دەکـا حـــاڵم بـــەیان گوفتـاری مـــن؟ ‌ ‌ ‌ زاهیـــری حـــاڵم دەڵێ،بـــەس زاری مـــن (۱۷۹۱)

ـەقشـی نێـو نـەینووک دەزانـی، ئـی چییـە؟ ‌ ‌ ‌ نەقشـی تۆیە،نەقشـی نـەینووک،خۆ نییـە (۱۷۹۲)

ـەر کەسێک،فووکا، دەنەی، ئی کێیەفوو؟ ‌ ‌ ‌ فوولەشەخسـی فووکـەرە، ئـی نـەی نـەبوو (۱۷۹۳)

---

[1] - جار بڵیند دەڕوا ،وەکوو ئەمواجی بەحر ‌ ‌ ‌ جار بەزگ ،دەڕوا ،وەکوو ئەسماکی نەهر

بـۆ خوداوەند،گـەر دەکـەی حەمـد وسـپاس — چەشنی حەمدی نارەوای ئەو شوان،بناس (۴
مـەدحی تـۆ نیسـبەت بـەوی،باش دیتـەچاو — خـۆ بـەلاَم نیسـبەت بەحـەق،زۆر نـا تـەواو (۵
گەرلەتاعــەت تــۆ دەلّــەی مەردانــەبووی — پــەردەلا دەن تێدەگــەن تــۆ وا،نــەبووی (۶
گـەر قـەبووڵ کـا،زیکری تۆ،حـەق، ڕەحمەتـە — وەک نـــوۆیژی موستەحازە،ڕوخســـەتە (۷
موســـتەحازەنوۆیژی وی،تێکەڵ،بـــەخوێن — زیکـری تـۆش تێکـەڵ، بەتەشبیهاتی جـوێن (۸
خـوبس و پیسـی خـوێن، بەئـاو دەڕوا تـەواو — خوبسـی بـاتین، قـەت کـە نـاڕواتن بـە ئـاو (۹
ئــەو بەغــەیری ئــاوی لــوتفی کردگــار — نـابێ قەت،کەم،ئــەو لەقــەلبی نـا بــەکار (۰
خۆزگەئــەودەم تــۆ کەســەجدەت، بردبــا — فــەهمی ئـەو (سـبحان ڕبـی)ت، کردبـا[۱] (۱
ئــەی ســجوودم وەک وجــوودم نالــەبار — پـێم عـەتا کـە،باش لـەجێی بـەد، کردگـار (۲
حیلمی حـەق چاو،دای بەعـەردی چۆن ئەسـەر — پیســی لابرد،چــۆن گــوڵی کردن،بە،بــەر (۳
تــا بپۆشــێتن پەلیــدیان خــوای جیهــان — جا،لــەباتیان شــین ببێ،خونچــەی جــووان (۴
چونکــەکافر دی،لــەئیعتا ئــو، لــەجوود — زۆ رلـەخاک و خـۆ ڵ کـەمتر بوو،بەسـوود (۵
لــەو،وجوودەی، میوەوو،گــوڵ دەرنــەهات — هەرفەسـاد شـین بوولـەوی،پاک بوو،بـەمات (۶
چـون نـەبووهیچ، تیبقی ویستی وی حیساب — بــانگی کــرد( یــالیتنی کنــت تــراب ) (۷
خۆزگـە خـاک بام مـن نـە ئـەو ئینسانە بام — جێگـە بـۆ شـینبـوونی یـەک دوو دانـە بـام (۸
ڕێ،منـی چـاک ئیمتیحـان کرد،لـەو سـەفەر — چیم بـەدەس هات،کاتێ هاتم،بووم بەشـەر؟ (۹
بۆیـــەکافر دەیهـــەوێ ئەو،بێ،بـــەخاک — چـون لەڕێگا،نـەی دی،بۆخۆی،سوودی پـاک (۰
حیرســەگەر ئــەو مــەیلی دونیــا،وا دەکـا — ئیحتیــاج و،ســیدقە، ڕوو، لــەخوا دەکــا (۱
هەرگیبایــــەک ڕوو بکاتــــەلایی ژوور — دەیهەوێ،ڕوشــدی بکــا، بگرێـــت،نوور (۲
هەرکـەڕووی سـووڕاند ئـەو، بـۆ لای زەوی — وشـک بوون،یـانی نـەمان،بۆ سـەهمی وی (۳
مــەیلی ڕووحــت گــەر بــەرەو بــالاَ،بێ — عاقیبــەت جێگــات دەبــێ، والاَ ببــێ (۴
گـەر سـەرت شـۆڕ،کەی،ئەتۆ،بۆ لای زەمـین — نـای هەوێ،دۆسـتت ببـێ خـوای عالـەمین (۵

## پرسیاری مووسا(ع) لەخوداوەند ڕەمزی غالب بوونی زالمان...

وایـدەکوت موسـا،کەئەی خـوا ی عالــەمێ — ئـەی لەسـەت سـاڵ،زێدەزیکری تـۆ،دەمێ (۶
نەقشـی خـوارو خـێچ دیـم، نێو،ئاووگـڵ — وەک فریشــــتان، ئیعتیڕازم،هاتــــەدڵ (۷

---

[۱] - سەت بریبا ئەودەمەی سەجدەت دەبرد — فەهمی ئەو (سبحان ربی)ت، تۆ دەکرد

… مه‌رامت تۆ ده‌ویدا، نواندن؟ — تازه‌تۆ وی به‌د ده‌ویش دا،چاندن (١٨١٨)

…گری زوڵم و فه‌سا دیش هه‌ڵگران — ساجیدو مه‌سجوود،ده‌ستووتێنن،گران (١٨١٩)

…ـه‌کی سوورو زه‌ردی چاوان، بۆچییه؟ — شین و زاری،پیرو لاوان بۆ چییه؟ (١٨٢٠)

… ده‌زانم بێ گوما ن هه‌ر حیکمه‌ته — خۆ، به‌ڵام قه‌ستم،عه‌یان ورۆئیه‌ته (١٨٢١)

…یه‌قین بانگم ده‌کا،خامۆ ش به — رۆئیه‌تیش بانگم ده‌کا،پڕ جۆش به (١٨٢٢)

… فریشتانت له‌ڕاز ئاگا ده‌کرد — تۆ له‌بۆ ئێش، نۆشی خۆشت چا ده‌کرد (١٨٢٣)

…ری ئا ده‌م هه‌رئه‌تۆ کردت عه‌یان — بۆ مه‌لائیک، گشت موشکیل بوون به‌یان (١٨٢٤)

…ری تۆ پێمان ده‌ڵێتن ڕازی مه‌رگ — میوه‌زۆر باش پێن ده‌ڵێتن ڕازی به‌رگ (١٨٢٥)

… خوێن و نوتفه‌،جوانی ئا ده‌می — پێش له‌ ته‌کمیل بوون،ده‌بێ،بوو بێ،که‌می (١٨٢٦)

…کی ده‌شوات،له‌وح،کاتیب،بێ وقووف — تا بنووسێتن له‌سه‌روی، ئه‌و حرووف (١٨٢٧)

…ـه‌کی که‌م ته‌بدیل به‌خوێتی دڵ،ده‌کا — جا،له‌سه‌روی ڕاز ده‌نووسێتن خودا (١٨٢٨)

…حی دڵ چاک،نا س که‌،وه‌ختی شوشتنێ — ده‌فته‌ری یاد داشتی چاکی،نێو،بنێ (١٨٢٩)

…ختمانی نوێ،که‌چاکا، یه‌ک نه‌فه‌ر — نابێ هه‌ی بێ،ساختمانی، کۆن،ئه‌سه‌ر (١٨٣٠)

…ک له‌عه‌ردی لا ده‌به‌ن تا کو له‌وێ — ئاوی ساف و جوان و شیرین،ده‌ر که‌وێ (١٨٣١)

…به‌ده‌رزی ده‌گری،مندال،زار زار — چونکه‌نازانێت،ئه‌و هیچ سوودی کار (١٨٣٢)

… ده‌دا پووڵ، ده‌رزی لێده‌ن، نه‌ک منال — چون ده‌زانی ده‌رزی ده‌یکا خۆشحال (١٨٣٣)

… ده‌چێ حه‌مبال به‌دووی باران،هه‌تا — باری سه‌نگین هه‌ڵگرێ ئه‌و، هه‌ربه‌، تا (١٨٣٤)

… ده‌که‌ن حه‌مبال له‌سه‌ر باران،جه‌نگ — وایه‌کاری عارفانی زۆر زره‌نگ (١٨٣٥)

… گرانی ژێر به‌نا ی گشت ڕه‌حمه‌ته — تفت و تاڵی،پێشه‌وای گشت نیعمه‌ته[1] (١٨٣٦)

… به‌هه‌شت، پۆشش،ئه‌وه‌ی دڵ نایه‌وێ — ده‌وری دووزه‌خ، هه‌رچی دڵ ده‌یوێ، له‌وێ (١٨٣٧)

…ـه‌هو،ته‌ئینسان ده‌با بۆ نێو نار — که‌و سه‌ره‌جێی عاشقی سووتاوی زار (١٨٣٨)

…ـه‌و که‌سه‌ی زیندانه‌جێگا میحنه‌تی — لوقمه‌باعیس،یانه‌باعیس،شه‌هوه‌تی (١٨٣٩)

…که‌سه‌ی جێی ژینی ئێسته‌ی کاخه‌،خۆش — ئه‌و،له‌پێش دا،زۆر،به‌ڕه‌نجان چوو له‌هۆش[2] (١٨٤٠)

…که‌سێکی بوو به‌زێڕو زێو تاق — ئه‌و له‌که‌سبی، هه‌یبوو،سه‌برو ئیشتیاق (١٨٤١)

…وی بینا دڵ ده‌بینێ بێ سه‌به‌ب — چاوی حیس بینایه‌ئه‌و ده‌م بێ، سه‌به‌ب (١٨٤٢)

---

١- ڕاحه‌تی ده‌و ری له‌ڕه‌نج کوا خاڵییه؟ — پێشه‌وای گشت نیعمه‌تان ،هه‌رتاڵییه

٢- ئه‌و که‌سه‌ی ئێستا ده‌کاخێک دا ده‌ژی — دی ده‌پێش دا ئه‌و گه‌لێک ره‌نج و دژی

۸۴۳) گەر لەچوار تەبعان بەدوور بێ گیانی تۆ — خەرقی ئەسباب دێتەژێر فەرمانی تۆ
۸۴۴) چاک دەبینن عارفان و ئەولیبا — کانیاوی موعجیزاتی ئەنبیبا
۸۴۵) ئەوسەبەب هەرچەشنی دوکتوروعەلیل — ئەوسەبەب هەر وەک چرای ڕوون و فتیل
۸۴۶) شەو فتیلەی نوێ بخە، تۆ سەرچرا — ڕۆژ لەوانە، بێ نیازە،ئەی برا
۸۴۷) کاوو گڵ تۆ بێنەبۆما ڵ ئەی فلان — کاو گڵی ناوێت،بانی ئاسمان
۸۴۸) سەت ئەسەف ڕۆژهات وشەوچۆ،نێو تەمێ — هات حەبیبم نەی دەهێشت،بۆ من غەمێ
۸۴۹) هەربەشەو زاهیر دەبێ جوانی لەمانگ — هەر بەدەردی دڵ،بکەدڵخواز، بانگ
۸۵۰) تەرکی عیسات کردو،کەر پەروەر،دەکەی — بۆیەوەک کەر،تۆ، لەپشتی پەردەکەی
۸۵۱) تالعی عیسایەعیلم و مەعریفەت — تالعی کەرنین ئەوان ئەی کەر سیفەت
۸۵۲) ناڵەیی کەر،ڕەحمی تۆ دێنێتەجۆش — نەت دەزانی،دەی هەوێ،کەر بی،ئەتۆش[1]
۸۵۳) ڕەحمی،بەوعیسا بکەبەوکەر مەکە — تەبعی خۆت سەرعەقڵی خۆت،سەروەرمەکە
۸۵۴) با بچێ تەبعت بگریەت، زار زار — بگرەلەو،تا گیان نەکا تۆ،وامدار
۸۵۵) زۆرلەمێژەچاروێداری بەس بێ،با — چونکەچاروێدارلەدووی کەر هەڵوەدا
۸۵۶) (اخروهن) موراد هەر نەفسی تۆ — با،لەپاش بێ،بیخەپێش جا، عەقڵی خۆ
۸۵۷) ها و میزاجی کەر بووەئەو عەقڵی پەست — فکری وایە،چۆن غەزا بێنێ بەدەست
۸۵۸) ئەوکەرەی عیسا،دەبوو،هاو خووی، دڵی — جێ و مەقامی عاقڵان بوو مەنزڵی
۸۵۹) چونکەحاکم، عەقڵە،کەر بوو زۆرزەعیف — سوار قەوی بێ،کەر دەبێتن زۆر نەحیف
۸۶۰) چون زەعیفەعەقڵی تۆ ئەی کەر بەها — ئەو کەرەی لاوازی تۆ،بۆ ئەژدەها
۸۶۱) گەر لەعیسا زۆر و کەم ڕەنجووربی — تۆنەکەی قەت لەحزەیەک لەو، دوور بی
۸۶۲) چۆنی ئەی عیسای زەمان گەڵ دەردو ڕەنج؟ — خۆ دەدونیا نابێ،بێ مار،قەت،چ گەنج
۸۶۳) چۆنی ئەی عیسا لەدیداری جهوود؟ — چۆنی ئەی یوسف لەمەککاری حەسوود؟
۸۶۴) ڕۆژو شەو،وای،تۆ بەدووی خەڵکی نەفام — چەشنی ڕۆژ و شەو دەکەی عومران تەمام
۸۶۵) ئاخ لەدەس سەفرائیانی بێ هونەر — چیان لەدەستی دێت، غەیری دەردەسەر؟
۸۶۶) تۆ هەمان کاری،بکەدەیکا، هەتاو — گەڵ خەلایق باش بن جا،یا خەراو
۸۶۷) ئێمەسرکەی دین،ئەتۆش هەنگوینی دین — دەفعی سەفرامان دەکا،ئیسکەنجەبین
۸۶۸) سرکەمان زیاد کە، کەدڵ هەیبوو ئەلەم — زیاد کەهەنگوین، مەگرەڵێمان تۆکەرەم

---

[1] - دێ بەکەر،ڕەحمت کەناڵەی ویت دەبیست    نەت دەزانی کەریەتی تۆی کەر دەویست

ـستەحەق بووین ئێمەوامان هات بەسەر — خـۆڵ دەچاودا،زیـاد دەکـا،کوێری بەســەر (١٨٦٩)
ـێنـی تـۆ ئـەی کلـی زۆر زۆر تــەمیز — نالــەبار و ناحــەزان،زۆر کــەی عــەزیز (١٨٧٠)
ـ گری زوڵمـان دڵـی تـۆی کردکـەباب — تۆش بەجوملەی(اهد قومی) ت،دا جەواب (١٨٧١)
ـنی عوودی،گـەر تـۆ بگـری ئـاگری — بـۆنی خـۆش دەگرێ،جیهان، سـەرتا سەری (١٨٧٢)
ـەئــەو عــوودەی بــەئاگر کــەم ببـی — تـۆ نەئـەو ڕووحـەی ئەسـیری غـەم ببـی (١٨٧٣)
ـ دەسووتێ، گڕ، لـەکانی عـوود بـەدوور — کــوا دەبا،با،حەملەبۆســەرئەســڵی نــوور؟ (١٨٧٤)
ـەی لەتۆئاســمان هــەموویان بـا ســەفا — ئـەی جـەفات چاتر،لەخۆشـی، هـەم وەفـا (١٨٧٥)
جێکـەعاقڵ گــەر بکــاتن یــەک جــەفا — چاکترەلــەو هــەی بکــا جاهــل وەفــا (١٨٧٦)
ـــــکرایە،دوژمنی زانابی،گــــــەر — چاکترەتــا بی،بەدۆســتی شەخســی کــەر (١٨٧٧)

**ئەزیەت کردنی ئەمیر، یەک نەفەر نوستو، کەماری چووبۆ دەزاری ..**

**خولاسەی داستان...**

ئەمیرێک سواری ئەسپێک بوو، بەڕێ دا دەڕۆی،لەنا کاو،دیتی کەمارێک بۆلای زاری پیاوێک کەلەژێردارێک نوستبوو،دەخزێت، ئەسپەکەی چوار ناڵ لینگ دا تا نەهێڵێ مار بچتەزاری ئەو پیاوەنوستووەبێچارەیە، بەڵام کار لەکارترازابوو وکۆشش و تەلاش بێ فایدەبوو،ومار بۆنێو زاری کابرا ی نوستوو،خزی،ئەمیر چارەیێکی دۆزیەوەوبەبێ ئەوەی کەئەو کابرانوستووە ئاگادار بکا، لەنا کاو هوڕوژمی بردەسەر. ومحکەم بەدار و شەللاق لێیدا،کابرای نوستوو بەشێواوی لەخەو ڕاپەڕی،وبەسەرگەردا نی وپەرێشانی دەستی کرد بەهەڵاتن .وسواریش زۆربێ ڕەحمانەحەملەی پێدەکرد،تا عاقیبەت ئەوکابرایەیەنای بـۆبن دارێک برد،کەلەژێرئەودارەزۆر سێوی بۆگەنیو ڕژابوون.سوار ئەوکابرایەی مەجبوورکرد کەئەو سێوانەبخوات، تا ئەو ئەندازەکەزگی هەڵنووساو، حاڵی تێک چوو، وڕشاوەوهەر چی خواردبووی هینا یەوە، وئەومارەزەلام و خەتەرنا کەش هاتەدەر، جا، لەمردن نەجاتی بوو،ولەپاشان زۆر تەشەککورو سپاسی لەو سوارەپاک ڕەوشتەکرد.

ـ ئێک ڕۆژێـک لەئەســپێک بووســووار — دیتــی یــەک خەوتو،کــەماری دەچتــەزار (١٨٧٨)
ـ ـەجات دا شەخسـی نوسـتوو،چوو،بەغار — نــەی تــوانی ئــەو بــەڵام،دەر کات،مــار (١٨٧٩)
جێکەنــەی تــوانی بکــاتن ئــەو، چ کــار — دای لەشەخسی خەوتوو،ئەوجار، زۆر،بـەدار (١٨٨٠)
ـ ـەزەربی دار بــدا ئــەو خــۆی نــەجات — تونــد لــەبۆ ژێردارەســێوێک هەڵــدەهات (١٨٨١)
ـێوی پیس و بۆ گەنێو،زۆربوو ن لەعەرد — پێیــدەکوت بیخۆ،ئــەتۆ ئــەی دڵ بــەدەرد (١٨٨٢)

هێندەزۆری سێو دەرخوار دا،سووار | تاکوسێوی ئەو، لەزاری کەوتەخوار (۸۸۳
بانگی کرد تۆئەی ئەمیر ئاخر لەبۆ؟ | دەمکوژی،بێژەئەمن،چیم کرد لەتۆ؟ (۸۸۴
گەر دەڵەی بۆگیانی تۆ من دوژمنم | من کەناڵێم هیچ، هانێ گەردنم (۸۸۵
شانسی بەد بوو،تۆ کەدیتت ئە منی زار | خۆش بەحاڵی وەی کەنەیدیتی، چ جار (۸۸۶
بێ گوناەو بێ جینایەت،قەت وەها | کافرانیش زوڵمی واناکەن، ڕەوا (۸۸۷
خوێن لەزارم دێ دەگەڵ گوفتارەکەم | بۆموجازات،تۆحەواڵەی خوا، دەکەم (۸۸۸
هەردەمەی نەفرینی تازەی لێدەکرد | لێیدەدا سواریش، لەسەحرای توند دەبرد (۸۸۹
ئەو بەزەربی داری سواری چەشنی با | جاردەکەوت و،جار دەبا توند ڕۆیی با (۸۹۰
مەعدەپڕبوو هەم خەواڵو، زێدە سست | سەت برینی زێدە،سوار لەو دا،دەخست (۸۹۱
تا شەوێ هەر ڕێی کەوت،سوار جارو بار | تا ڕشاوەئەو فەقیرەی،زامدار (۸۹۲
ئەو ڕشاوەخواردنی هیناوەدەر[1] | دەر پەری مار،لەو،بەبێ هیچ دەردەسەر (۸۹۳
هەر کەدیتی مار لەزاری هاتەدەر | کەوتەسەجدەئەو لەبۆ ئەو خۆش نەزەر (۸۹۴
هەرکەدیتی ماری وا گەو ڕەو عەزیم | ئیش و دەردی ئەو لەبیرچوو، زۆر سەلیم (۸۹۵
پێیدەکوت تۆ جەبرەئیلی ڕەحمەتی | یاخودای تۆ،بۆ عموم جێی نیعمەتی[3] (۸۹۶
خۆشحاڵم تۆ کەکردت وا،بەمن | مردبووم و، گیانی نوێت تۆ دا،بەمن (۸۹۷
چەشنی دایکی میهرەبان تۆ بووی،لەدووم | چەشنی کەر من هەڵدەهاتم،هەردەچووم (۸۹۸
کەر لەدەس ساحەب دەکا، ڕەو،چون کەرە | ساحەبی لەدوایە، ساحەب گەوهەرە (۸۹۹
ناچێ بەدوای دا لەبەر سوودو زیان | بەڵکەتا گورکان نەخۆن، ئەو هیچ نەزان (۹۰۰
خۆش بەحاڵی ئەو کەسەی،دی ڕوویی تۆ | یانە،ناسی لێی عەیان بوو،خوویی تۆ (۹۰۱
ئەی ڕەوان پاکان ئەتۆ تەعریف دەکەن | وەک منیش،بێهوودە،تۆ تەوسیف دەکەن (۹۰۲
ئەی پەناهم ئەی ئەمیرم،ماڵ و جێم | من کەنەمکوت، جەهلی من بوو،مەگرەلێم (۹۰۳
گەر کو زانیبام منیش لەو حاڵە،کەم | نەمدەکوت بێهوودە،تا نەمبێ، چ غەم (۹۰۴
هەرسەنا ی تۆم من دەکرد دائیم،ئەگەر | زەرڕەیێک بام من لەحاڵت،باخەبەر (۹۰۵

[1]- ئەو رشاوە خواردنی گشت هاتە دەر (مصرع اول)

[2]- یا خودای تۆ ،مەعدەنی گشت ڕەحمەتی (مصرع دوم)

ـو بەلام،هـەر، زۆر بـەبێ دەنـگ و سـەدا ئـەو سـەرەی شـێواوی مـن، هـەرلێت،دەدا (١٩٠٦)
ـن سـەرم شـێواوەعەقڵم چوولەسـەر مەغزی کەم بوو، من سەرم، نەک ئێستەهەر (١٩٠٧)
ـو بەخشـەئەی جـوان و، جـوا ن کـار ئـەو قسـانەی مـن کوتم،دێـوا نـەوار (١٩٠٨)
ـ کـوتی گـەر کردبـام من،حاڵ،بـەیان دەردەچووڕووحـت ئـەتۆ هـەر ئـەو زەمـان (١٩٠٩)
ـەرکو کوتبـام مـن لەبۆت،ئەوسـافی مـار گیان لەجیسمت،جێ بەجێ، دەیکرد فیـرار (١٩١٠)
ـنەفا فـەرمووی، بڵـەم گـەر ئێسـتەمن شـەرحی حـاڵی دوژمنـی گیانتان،لـەبن (١٩١١)
ـەرەبی دڵیـان دەبـێ لـەت، پاڵـەوان فکـری کـارو ژیـن کـەنا کـەن هـیچ لـەوان (١٩١٢)
ـو نیـاز نـابێ لەقـەلبی وی،چ تـین قـودرەتی بۆنـۆێژ وبـۆ ڕۆژوش، چ،نـین (١٩١٣)
ـک پشـیلێک چۆن،کەمشـکێک (لا) دەکـا یانـەگورگێک چۆن،مـەڕێک،لای،ڕا، دەکـا (١٩١٤)
ـو حیلـەی ئێوەناکـا هـیچ ئەسـەر پێـو دەڵـێم ئـەمما چلۆن،لەو،کەن،حـەزەر (١٩١٥)
ـ سەگوفتار،وەک( ڕوبـابی)،بـەر دەدەم چەشـنی داوود،دەس دەئاسـن وەر دەدەم (١٩١٦)
ـ حـاڵ مـوکین بـێ، بـی بینی،بـەچاو باڵـدا ربێ،تـەیری بـاڵ هەڵقەنـدراو (١٩١٧)
ـەسەر دەستی ئەوان بوو،دەستی حەق دەستی ئێمەی دەستی خۆی کوت خوای فەلەق (١٩١٨)
ـستم زۆر درێـژە،من یـەقین جـێ دەهێڵـێ ئاسـمانی حـەو تـەمین (١٩١٩)
ـتی مـن سـەر ئاسمان کـردی هونـەر چـاک بنۆڕەتۆ،لـە(انشـق القمـر) (١٩٢٠)
ـحی وام کرد هەرلەبەر عـەقڵی زەعیف کـوا ڕەوایـەبۆ زەعیف،شـەرحی شـەریف؟ (١٩٢١)
ـت دەزانی،گـەر لەخەو،هـەڵبێنی سـەر چاک و باش هـەرخوا دەزانێ،نەک بەشەر (١٩٢٢)
ـحت بـوو، خواردن،لـەبۆ تـۆ هـەم فیـرار سەخت بوو،بۆت، قەی بکەی،یەک دانەجار (١٩٢٣)
ـ خۆم کرد گوێم نەدا من هیچ جنێو (ڕب یسـرلی) لـەبۆم بـوو ویـردی لێـو (١٩٢٤)
ـی عیللەت هیچ لەبۆم دەستوو ر نەبوو تـەرکی تـۆ ش،بـۆمن کـەهیچ مەقدوورنـەبوو (١٩٢٥)
ـبـەن دەمکـوت لەبـەر دەردی دەروون چـون نەفامن،قـەومی مـن کـە، ڕێ نمـوون (١٩٢٦)
ـەجدەچون نـەجاتی بـوو لـەرەنج ئـەی ئـەتۆ،بۆم بووی،هومـای ئیقبـاڵ و گـەنج (١٩٢٧)
ـدی تۆ لای خوایە، تەنها ئەی شەریف کـوا لەدەسـتم دێ،بدەم،ئـەمنی زەعیـف؟ (١٩٢٨)
ـدی تـۆ هـەرخوا دەدا،ئـەی پێشـەوا کـوا لەدەسـتم دێ، منـی وا، بـێ نـەوا؟ (١٩٢٩)
ـەر وەهایـەدوژمنایی عـاقڵان ژەهـری وان بوو،شـەربەتی شـادی دڵان (١٩٣٠)
ـتایی دوور لـەفام، ڕەنـج وزەلال گوێ،دەبـەو داسـتانی دێ،تۆ،بـۆ میسـال (١٩٣١)

**ئیعتیماد کردن بەخۆشەویستی ووەفای ورچ..**

**خولاسەی داستان ...**

کابرایـەکی بەتاقـەت بـەڕێگا دا دەڕۆیشـت، لـەناکاو دیتـی کـە ئەژدیهایـەکی گـەورەوورچێکی ڕاو کرددوە،وهێندەی نەماوەکەقووتی بدا، کابرا هاتـەپێش وزۆر قارەمانانەئەژدیهایەکەی کوشت، و ورچەکـەی نـەجات دا، ئـەو ورچـەوەختێک کەئـەو قارەمانەتیـەی لـەو کـابرا یـەدی، ئولفـەتی پێوەگرت، وبـەدوای دا دەڕۆیشـت کابرا زۆربـەڕێ دا ڕۆیشـت تـا کوماندووبوو،ولەجێگایەک بـۆ حەسانەوە، ڕاوەستا، وسەری دانا سـەر عـەرزی وخـەوی لێکەوت،وورچەکە، ئاگا داری لێدەکرد، ودەو بەینـەدا کـابرا یـەکی خێـر خـواز ئـەو وەزعـەی دی وهاتـەپێش،وکابرای قارەمـانی لەخـەو هەسـتاند،وپێیکوت ئـەو ورچـەبۆچی دەگـەڵ تۆیە؟ودەگـەڵ تـۆ، چ موناسـەبەتێکی هـە یـە؟ئاگات لـەخۆت بێ،وبەدۆسـتایەتی وی ئیعتیمـاد مەکە،کەعاقیبـەتێکی باشـی بۆتـۆ نییـە، ئـەو کـابرا قارەمانەساویلکەیەکەلەدۆسـتایەتی ورچ خۆشـحاڵ بـوو، لەقسـەی ئـەو کـابرا خێـر خـوازەدڵی ئێشا،وپێیکوت ..بـڕۆ وەدوای کـاری خـۆت کەوەکەحەسوودیت دێ،وناتوانی ببینی کەحـەیوانیکی وەها، دەگەڵ مـن بۆتەدۆسـت کابرای خێرخواز هەرچەنـد لەعاقیبـەتی ناخۆشـی دۆستایەتی ئـەو ورچـەی پێکـوت ئـەو قارەمانەساویلکەیەگوێی نەدایـە،کابرا ی خێـر خـواز بـەدڵ ئێشـی بـەڕێگای خـۆی دا ڕۆیشـت، وئـەو کـابرا قارەمانەسـەری لەسـەر عـەرزی دانـا، وخـەوی لێکـەوت،ورچیش پاسەوانی لێدەکرد،لەو بەینەدا، مێش لەسـەر ڕوومـەتی ئـەو کابرا قارەمانەهەڵنیشـتن، ئەزیـەتیان دەکرد،ورچەکەبۆ خـاتری دۆستایەتی وخزمـەت بـەو کابرا قارەمانـەچوو بـەردێکی زۆر قـورس و گەو رەی هینا، تا بەمێشەکان دا دا،ووەلی نیعمەتی خۆی ئاسوودەو ڕاحەت بکا بەردەکەی بڵیند کرد وبەسەرو ڕووی کابرای دا دا وجێ بەجێ کوشتی .

ئەژدیهایـەک گرتـی ورچێـک بیخـووات     شـێرەپیاوێک تونـدوتۆڵ چـوو،دای نـەجات (۲-۰
چـون لـەدونیای یارمـەتی دا شـێرەپیاو     دەنگـی مـەزڵوومی کەبیسـت دەڕوا،بـەتاو (۳-۰
دەنگـی مـەزڵوومان لەهەرجێگایـەبێ     شـێرەپیاو بـۆ وێ دەچن،زوو،جـێ بـەجێ (۴-۰
بۆجیهـان ئـەو شێرەپیاوانەن،سـتوون     هـەم تـەبیبن،بۆ نەخۆشـیانی دەروون (۵-۰
خۆشەویستی مـەحز و عـەدڵ و ڕەحمـەتن     وەک خـودا، بـێ عیللـەتن بـێ ڕیشـوەتن (۶-۰
گـەر بڵـەی تـۆ چیـت لەچاکـەبوو هـەدەف؟     پێت دەڵێ چون موستەحەق بوو،زۆر،تـەڕەف (۷-۰
خۆشەویسـتی بـۆ شـکاری شـێرە پیـاو     چەشـنی دەرمـان،چوو بـەدووی ئـێش، هـەڵوەداو (۸-۰

ـیـنی لەهــەرجێ بێ،دەچـــێ بــۆ وێ،دەوا ئـاو لـەبۆ لای جێـی نـەوی دێ، نـەک حـەوا (۱۹۳۹)

ـــەوی بـەئا وی ڕەحمــەت دیتەدەســت خـەمری ڕەحمـەت جا،وەخۆ،تـابی بەمەسـت (۱۹۴۰)

جـۆن لـەپێ تـا سـەر، وجوودما ن ڕەحمەتـە تۆ،نــەبی قــانع بەیێک،ڕەحمـــەت هەتــە (۱۹۴۱)

ـــەژێر پێـت تـۆ، سـەماوات،ئەی شـەجاع تــا لەســەر ئـەفلاک ببیســی تـۆ سـەماع (۱۹۴۲)

ـــــەیی وەســـواس لەگوێ،تۆبێنــــەدەر تـــا ببیســـی بانـــگ لەئاســـمانانی ســـەر (۱۹۴۳)

ـێ کەدوو چاوت لەهەرچی موویی عـەیب تـــا ببینـــی باغ،هـــەم بێســـتانی غـــەیب (۱۹۴۴)

ـــێ ئەمـــەغزو لـــووت ســـەرما، لابـــەرە سـەهمی خـۆت جا،چـاک لـەبۆنی خـوا بـەرە (۱۹۴۵)

ـــێ ئەســەفرا و تـەب مەهێڵـەهیچ ئەسـەر تــا لــەدونیات تــۆ هــەبێ،تامی شــەکــەر (۱۹۴۶)

ـــێی پاکـان بە،ئـەتۆ ئـەی خـۆش بـەیان تا حەقیقـەت وەک ئـەوان، لێـت بـێ عـەیان (۱۹۴۷)

ـــێ وجـوودەی تـەن، لـەپێی گیـان لا بـە، لا تــــاکو پـــــەرواز کـــا لــــەبۆ لای ئــــەنبیا (۱۹۴۸)

ـــەی بوخلـت تـۆ لەدەسـت و مل،کـەوە چـاوی کاڵـت ئـەو چەلـەش پرکل،کـەوە (۱۹۴۹)

ـــێ ئەکابـەی لوتف،مـەحڕووم بـی ئەگـەر بێـــژەبێچاریـــت لـــەدەرگای چارەگـــەر (۱۹۵۰)

ـــێ عمـــووم گریـــان قـــەوی ســـەرمایەیە ڕەحمـــەتی حـــەق زۆرقـــەویتر دایەیـــە (۱۹۵۱)

ـێکــــەدەگریتن بەهانــــەدا خـــــودا کـەی منـاڵ دەگری،هـەتا شـیر بـەو بـدا (۱۹۵۲)

ـــێ ئـەبۆتان خـەڵقی کـرد تیفلـی نیـاز تــا بەشــین، شــیر تــان بــدا،دانایی راز (۱۹۵۳)

ـــەق کـوتی گریـان بکـەن،من گاز،بکـەن تاکوشـــیری خۆشەویســـتیم،واز بکــــەن (۱۹۵۴)

ـــەهــــــازی بــــــاوو بارانەش،لەهـــــەور وان لـەفیکری ئێمە،یێک ساعەت، تۆ سەور (۱۹۵۵)

ـــی السـماء رزقکـم ) نــەت بیسـتووە؟ ئەی لەبۆ،لەو عـەردی پەست،خۆت خستووە؟ (۱۹۵۶)

ـــنگــی غوولـەتۆ دەکـا، مــەئیووس، وەهــا ئـــەو هـــەتا کـــو قـــەعری پەســتی، تۆدەبـا (۱۹۵۷)

ـــەر نیدایـــەک تـــۆ لـــەبۆ بـــاڵا بـــەری دێ لەباڵا،ئـــەو لەعـــــەردی بوو،بـــــەری (۱۹۵۸)

ـەر نیدایـــەک، تـــۆ بـــەری،بۆلای تـــەماح دەنگــی گورگە،هەڵــدڕین بــۆ وێ، مــەباح (۱۹۵۹)

ـــێ نـەبوو قەسـتم لـەباڵا هـیچ مـەکان لەو،بڵینـدی قەسـتی مـن لای عـەقڵ و گیـان (۱۹۶۰)

ـێ ســەروون ئەسباب و لای ژێرن،ئەسـەر بــــەردو ئاســــن لای ســــەروون،ئاگر،لەبەر (۱۹۶۱)

ـــەر وەری زاهیــر لــەژێر، بــاتین لــەژوور لای یـەکن هـەر دوو، بـەڵام لـێکن بـەدوور (۱۹۶۲)

ـــێی ســەروو دیــاری دەکا،تــەنها شــەرەف بـــا لـــەژووربێ، هەرلـــەژێرە، ناخەلـــەف (۱۹۶۳)

ـــەردو ئاســـن چـــون لـــەکار دا،ســـائیقن بـــۆ ئـــەوەی کـــەبن لـــەلای ژوور،لائـیقن (۱۹۶۴)

جونکــە،گڕ، مەقســـوود لەبـــەرد و ئاســـنە ئەڕجـــەحی گڕ،زۆرلەســـەروان،ڕەو شـــەنە (۱۹۶۵)

بـــەردو ئاســـن، ئـــەووەڵن پایانـــەنار بـــەردو ئاســـن قـــالبن خـــۆ، گیانـــەنار (٠٦٦
بـا لەپێشـبن بـەردو ئاسـن،گڕ، لـەپاش خـۆ بەنیسبەت بـەرد و ئاسن،گڕبوو بـاش (٠٦٧
گـــەرچی دارو لـــک لەپێشـــی میوەنـــە ئیفتیخـــــار بۆمیوەیــــە،بۆ دار، نــــە (٠٦٨
چـون لـەدار مەقسـوودی ئەسـڵی هەربـەرە بەر،لەئـــەووەڵ، دار لەئـــەووەڵ، لا بـــەرە (٠٦٩
ورچـــە،کاتێ کـــەو تـــەزاری ئـــەژدەها شـــێرەپیاوێک هـــات وکردی،ئـــەو ڕەهـــا (٠٧٠
فیـڵ و مـەردی پشـتی یێـک بـوون بۆیـەوا زۆر بەئاســـان کوشـــتی زۆر زوو،ئـــەژدەها (٠٧١
ئـــەژدەها زۆر دارە، بـــێ فیـــڵ و فەنـــە فـــەوقی فێڵـــی تـــۆش،فێڵی دی هەنـــە (٠٧٢
تۆ کەنۆڕیت چـاک لـەفێڵ و مـەکری خـۆت بێنەبیرت،ئـەو لـەکوێ ڕا هـات لـەبۆت (٠٧٣
هەرلـــەبالا هـــات هـــەرچی بـــوو نـــەوی چـــاو لەبالاکە،نەکـــەی قـــەت بســـرەوی (٠٧٤
ڕوون دەبـێ چـاوت کـەچاوت کـرد لـەژوور گەر چی ئەووەڵ تێک دەچێ چاوت،بەنوور (٠٧٥
هەر دووچاوُت ڕوون بەنوورکە، تەک تەکێ چاوکـــەبالا گـــەر ئـــەتۆ، نـــی چەکچـــەکێ (٠٧٦
عاقیبـــەت بینـــی نیشـــانەی نـــووری خـــۆت شـــــەهوەتت ئێســـــتەحەقیقەت،گۆڕەبۆت (٠٧٧
ئەوکەسـەی بیسـتی لەکایـە، یەک،فەقـەت کوا دەبێ وەک ئەوکەسەی دی سەت کەڕەت؟ (٠٧٨
ئـــەو بەیـــەک کایـــەوەها مـــەغروور بـــوو زۆ ربـــەخود خواهی،لەئوســـتاد،دوور بـــوو (٠٧٩
هـــەر کـــەدیتی ئـــەو هونـــەر وەک سـامری زوو لەمووســـا،لای دەدا،بایـــدا، ســـەری (٠٨٠
ئەولەمووســـا فێرببو،خـــۆ ئـــەو هونـــەر خـــۆ بـــەلام،لای نـــا موعـــەللیم پشـــتی ســـەر (٠٨١
کـــارەکی دی کـــرد مووســـا لاجـــەڕەم گیـانی وەرگرت،بـردی بـۆ دەریـای عـەدەم (٠٨٢
وا دەبـێ دانـیش کەکـەو تـە، نێـو سـەرێ ئەوســـەرەی دانـــیش دەدا،دەس،با،بـــەرێ (٠٨٣
دەدت هـەوێ تـۆ گـەر سـەرت،نەی بات،با قـــوتبی ســـاحەب ڕای، پـــەنابێ بـــۆت، بـــا (٠٨٤
گەرچی شا،بی،قەت لەوی خـۆت مـەگرەزیاد هەربەخۆشـــەچینی وی،تـــۆ خـــۆت کەشـــاد (٠٨٥
نەقشـــە،فیکرت،فکرو بیـــری وی گییـــان زێـــڕی تـــۆ مەغشووشـــە،زێڕی ویش،کـــان (٠٨٦
ئـــەو ئەتۆیـــە،تۆ دەوی دا،خـــۆت، بـــوێ ڕۆژ و شـــەو،هەربت هـــەوێ،تا دەســـکەوێ (٠٨٧
گەرنەکـــەی خزمـــەت بـــەپاکانی خـــودای چەشـــنی ورچـــی تـــۆ دەزاری ئـــەژدەهای (٠٨٨
بەڵکەئوســـــتادێک بنـــــوێنێ هونـــــەر بـــێ نـــەجات دا،تـــۆ لەکێشەو،دەردەســـەر (٠٨٩
تـــــــۆ کـــــــەبێچارەی،بگریێ، زار، زار دەسـتی چـاو سـاغ بەرمـەدە،کوێری هـەژار (٠٩٠
تـۆ لـەورچیش کەمتری،ناڵـەت نـەهات؟ ورچـــەکردی دادو فـــەریاد بـــووی نـــەجات (٠٩١
قـــەلبی ڕەقمـــان ئەی،خوداوەند،نەرم،کـــە ئاەوناڵـــەی ســـەردی ئێمـــە، گـــەرم کـــە (٠٩٢

**کوتنی یەک نەفەرکوێر، کە ئەمن دوو جوور کوێریم هەیە..**

**خولاسەی داستان...**

کوێرێک زۆر بەسۆز دەی ناڵاند، ودەیکوت ئەی جەماعەت ئەمن گرفتاری دووجوور کوێریم . یەکیان ئەوەیەکەچاوەکانم هیچ نابینن، وئەوی دیکەش ئەوەیەکەدەنگێکی زۆ رناخۆشم هەیە، جا لەبەر ئەوە، ڕەحمی بەمن بکەن .. وەختێک کەجەماعەت دیتیان بەعەیب و نەقسی خۆی ئیقرار،دەکا، ڕەحمیان پێکرد ..

ـۆر بەسـۆزکوێرێک دەیکـوت،(ئەلئـەمان)    مـن بـەدووجوورکوێرم ئـەی ئـەهلی زەمـان (١٩٩٣)

ـێـوەڕەحم و، بـێ، بـەمن ئـەی عالـەمین    مـن دەنێـو دووجوورەکـوێریم وا، غـەمین (١٩٩٤)

ـەک کوتی یەک جوورەکوێریت لام عـەیان    جوورەکـەی دی،چاکە،تۆکـەی،بۆم بـەیان (١٩٩٥)

ـێـدەکوت دەنگـم گـەلێک ناخۆشـەمن    کـوێری چـاوو،دەنگی نـا خـۆ ش، دوو دەبـن (١٩٩٦)

ـنگـی ناخۆشـم سـەبەب،بۆ غـەم دەبـێ    خۆشەویسـتی خـەڵکی بـۆ مـن کـەم دەبـێ (١٩٩٧)

ـجنەهـەرجێ دەنگـی ناخۆشـم ئەگـەر    زۆر بەقـەهرو کـین خـەڵکم دێنەسـەر (١٩٩٨)

ـحمـی زۆرم پـێ بکـەن چـون وام،ئـەمن    چـون لـەنێو قـەلبان گـەلێک دوورمام،ئـەمن (١٩٩٩)

جۆنکـەوای کـوت کـەم گلایـەی لێکـرا    ڕەحمـی خـەڵکی، خـاس و عـامی،پێکرا (٢٠٠٠)

جۆنکـەڕازی خـۆی دەکـوت ئـەو ئاشـکرا    دەنگـی ناخۆشـی گـەلێک بـۆ باشـکرا (٢٠٠١)

ـۆکەسـەی دەنگـی دڵیشـی پـیس وبـەد    دوورلـەلوتفی خـوادەبێ ئـەو، تـا ئەبـەد (٢٠٠٢)

خـۆ بـەڵام بەخشـەندە، بـێ عیللـەت دەدا    لـوتفی وی شـامیل بەشـاهان و گـەدا (٢٠٠٣)

هەرکـەخۆش بـوو دەنگی نـاخۆش و دزێـو    دڵ ڕەقـان دڵیـان نـەرم بوو،چەشـنی مێـو (٢٠٠٤)

جۆنکەناڵـەی کـافران وەک دەنگـی کـەر    هـیچ قـەبووڵ ناکـا لەوان،ئـەوخوای لەسـەر (٢٠٠٥)

ـۆ خیتـابی دەنـگ نـاخۆش (اخسـئوا)    چون بەخوێنی خەڵکوەکسەگمەست دەبوو (٢٠٠٦)

جـاو کەناڵـەی ورچ جێگـای ڕەحمەتـە    تـۆ کەناڵـەت وا نـەبێ، بـۆت زەحمەتـە (٢٠٠٧)

ـێرەڕەنجـت داوەتـۆ ئینسـانی بـاش    یانـەخوێنی بـێ گوناهـت خـوارد بـەلاش (٢٠٠٨)

ـۆ لـەکاری پـیس لادە، بـۆ قـەراغ    گـەر برینـت کـۆن ببێ،تـۆ بیکـەداغ (٢٠٠٩)

**تەواو بووحیکایەتی ورچ و،قارەمانی سا وێلکە،کەبەوەفای ورچ ئیعتمادی کردبوو..**

ـرچـەکاتێ بـوو لەئـەژدیها نـەجات    لـوتفی پیـاوی قارەمـانی،بۆ خـەڵات (٢٠١٠)

ـەک سـەگی ئەسحابی کاف،ئـەو،ورچی زار    بـوو لـەدووی ئـەو قارەمـانی نامـدار (٢٠١١)

قارەمـــانی ماندوو،داینا،ســـەر لەعـــەرد ورچـەئاگای لـەو دەبـوو، هەرچەشنی مـەرد (٢

ڕێبوارێـک هـات کـوتی بـەو قارەمـان بــۆدەبینم لات ورچـــی بــێ ئـــەمان؟ (٣

باسـی ورچ و ئـەژدیهای کـرد یـەک یەکـە پێیـدەکوت تـۆش،دڵ بـەورچی خـۆش مەکـە (٤

دۆســتایی شەخســی نـادان زۆر بــەدە تۆ،بەدۆسـتی هـیچ نـەزان، قـەت گوێ،مـەدە (٥

قارەمـــان دەیکـــوت حەســـوودە،دی،بەدی بـۆچی نەیدی،ئـەو وەفـای ورچـی، ئـەدی؟ (٦

پێیــــــــدەکوت ڕێبوار،بگرەخــــــاترم بـــا حەســــوودیش بم،لــــەورچی،چاترم (٧

دەر بکەین،ئــەو ورچە،هــەردوون، پێکــەوە خــۆت لـەداوی خۆشەویسـتی وی،کـەوە (٨

پێیـدەکوت کـارت بکـە،تۆ ئـەی حەسـوود جـوابی دا،ئەوهـەم بووکار،نـەت کـرد سـوود (٩

مـــن لەورچی،نیمەکەمتر،ئـــەی مـــەتین بـەردە، ورچـی، تـا ببم،بـۆت هـاو نشـین (٠

بیـــر لـــەتۆ کـــەم،دڵ دەلـــەرزی،وا دەڵـــێ تـۆ مـەڕۆ گـەڵ ورچەکـەت،بۆ جەنگـەڵێ (١

ئەودڵـەی مـن قـەت نەلـەرزی بـۆ گـەزاف نووری حەققەپەنـدی مـن نـەک پـووچ ولاف (٢

موئمینێکم،نـــووری خوام،بـــۆ ڕابــــەرە خــۆت لــەلای ئاتەشـکەدەی وا، لابـەرە (٣

ئـەو هەمووپەنـدەی بـەوی، دا، بـێ ئەسـەر بەدگومانی،ســەددە،بۆ عـــەقڵ و بەســـەر (٤

دەسـتی وی گـرت ئـەو بـەڵام کێشـایەوە جـا کـوتی چـووم، بـۆ سـەلاح چـون نایـەوە (٥

پێیـدەکوت لای مـن بـڕۆ، بـۆم غـەم مـەخۆ ئـەی نـەفام تـۆ بـەس بڵێ،لـەو فـەزلی خـۆ (٦

پێیدەکوت دیسان،کەنیم مـن بـۆت عـەنوود گەردەگـەڵ مـن بێ،دەکـەی تـۆ زێدەسـوود (٧

پێیــدەکوت مـــن دێ خـــەوم،لام هەسـتەتۆ ڕێبـــوار دەیکـــوت کەبێی،خۆ،بەســـتە،تۆ (٨

تـا بنـووی ڕاحـــەت دەگـــەڵ کێ؟عـــاقڵێ لای ڕەفیقـی خۆشەویسـت، سـاحەب دڵـێ (٩

لـــەو تەلاشـــەکەوتەدەریـــای وەسوەســـە ڕووی دەســـــووڕاند،تووڕەبوو،یانی بەســــە (٠

ڕنگـــەبی وێ،بمکوژێ،ئـــەو، وا دەکـــا یاگەدایـــــە، وا، لـــــەمن، داوا دەکـــــا (١

یـا قـەراری کـرد دەگـەڵ د ۆسـتان هـەتا مـــن بترســـێنن لەدۆســـتی بـــا وەفـــا (٢

چـون کەسـیف بوو،زێـدە، فکـری قارەمـان فکری باشی قەت نەکرد ئەو یـەک زەمان (٣

فکـری باشـی بـوو لـەبارەی ورچـە، بـەس وەک ئەوەی،بێ،ورچەبۆ وی قەو م و کەس (٤

دای لـــەعاقڵ توهمــــەتی زۆر، قارەمــــان ورچـــی کردەدۆســـتی بـــاش و، میهرەبـــان (٥

**کوتنی مووسا(ع) بەیەک نەفەر گوێلک پەرەست کەبۆچی دروست فکر ناکەی؟..**

**خولاسەی داستان...**

حەزەتی مووسا بەپیاوێکی کەغەرقی فکرو خەیاڵی بێ ئەساس بوو کوتی ..ئەی فلان بۆچی ئەو هەموو موعجیزەو دەلیل و بورهانەت لەمن دی، بەلام نوبووەت و حەقانییەتی منت،باوەڕ نەکرد،دەحاڵێک دا وەختێک سامری موجەسسەمەیێکی چاکرد ودەنگێکی لێوەدەر کەوت بەرابەری وی،کەوتیەسەجدەوئەوت بەخودای خۆت زانی .

ی دەکوت مووسا بەیێک مەستی خەیاڵ — ئەی دەگەڵ بیرو خەیاڵی بەد، هەواڵ (٢٠٣٦)

ـەت گومانت بوو لەبۆ پێغەمبەریم — بەو هەموو بورهان و،بەو خولقی کەریم (٢٠٣٧)

ـعجیزەت تۆ دی، لەمن چەن سەت هەزار — هەرگومانت،زیاد دەبوو، دەت کرد فیرار (٢٠٣٨)

ـسەو فکرت گەلێک کرد،وەک لەئیم — بۆیە، تانەت دا، لەسەر پێغەمبەریم (٢٠٣٩)

ـەدەریام دەر دەهینا، تۆ ز، عەیان — تا نەجات و بێ لەدەس فیرعەو نیبان (٢٠٤٠)

ـت لەئاسمان،بۆو، غەزا،چل ساڵ،تەواو — من دوعام کرد،هات لەیەک بەر، کانیاو (٢٠٤١)

ـعجیزەی دیشم گەلێک من دان،نیشان — زەڕڕەیەک لێت کەم نەبوو،وەهم و گومان (٢٠٤٢)

ـەگوێلکێکی بەجادوو،دەنگ کەهات — تۆخودای خۆت ئەو دەزانی بۆ نەجات (٢٠٤٣)

ـت سێلاو، بردی گشت ئەو هامی تۆ — بردی غەفڵەت زیرەکی زۆر خامی تۆ (٢٠٤٤)

ـەبۆ وی تۆ نەبووی هیچ بەد گومان؟ — بۆچی بردت سەجدەبۆ وی ئەوزەمان؟ (٢٠٤٥)

ـنەبوو، وەهمت،لەبەرتەزویری وی؟ — یا فەسادو سیحری،ئەحمەق گیری وی (٢٠٤٦)

ـری کێیە؟،بڵێن پێم ئەی سەگان — تا دروست کا، ئەو خودا یەک بۆجیهان (٢٠٤٧)

ـەتەزویرگەڵ ئەوی یەکدڵ دەبووی؟ — لەوهەمووئیشکالی خۆت عاتڵ،دەبووی؟ (٢٠٤٨)

ـنی (گا)خودایە،بێ گەزاف — مورسەلی میش بۆ تۆ جێگەی ئیختیلاف (٢٠٤٩)

ـەبۆ (گا) ت، برد سەجدەچون کەری — عەقڵی تۆ، بۆ،سەیدی سیحری سامری (٢٠٥٠)

ـی خۆت بەست تۆ لەنووری زولجەلال — ئەوهەجەهلەئاشکرا،عەینی زەلال (٢٠٥١)

ی بەعەقڵ و ئینتیخابی تۆ هەتە — مەعدەنی جەهلی کەمەرگت ڕەحمەتە (٢٠٥٢)

ـی دەکوت بۆت،گاوی زێڕی سامری؟ — چوون بەدووی دا،ئەحمەقانی،سەرسەری (٢٠٥٣)

ـێ هەجالبتر لەمن دیتو، بەعام — کوا دەکا حەقی،قەبووڵ،شەخسی نەفام؟ (٢٠٥٤)

ـی دەباتن باتڵان؟ هەر باتڵی — باتڵان چیان،خۆشەلا؟ هەرعاتڵی (٢٠٥٥)

ـشتەی مەیلی بەجینسی خۆی،دەکا — چۆن لەبۆ لای شێر دەچێتن، نێرە(گا)؟ (٢٠٥٦)

کوا لەگورگان عاشقی یوسوف،هەنە؟ گەر ببێتن، فێڵە، هەر بۆ خواردنە
خوویی گورگی گەرنەبێ، مەحرەم دەبێ وەک سەگی ئەسحابی کاف،ئادەم دەبێ
چون ئەبوو بەکر هات لەئەحمەد،بۆیی، بۆ[1] زوو کوتی ئەوزاتەناکا،قەت درۆ
چونکەبوو جەهل،هیچ لەحەق نەیبووخەبەر نەی بوو،باوەڕ،گەرچی دی(شق القمر)
با،بەموشتاقان نەبێژین ڕازو سوڕ عاقیبەت زاهیر دەبێ،حەق،چەشنی دوڕ
دەردی شەوقی گەرنەبێتن یەک نەفەر قەت حەقیقەت، نایە،بۆ وی بەر نەزەر
ساف کەئاوێنەی دڵت،تۆ ساف ساف جوان و پیس تا،بەو،بیینی،بێ گەزاف

**ڕۆیشتنی ڕێبواری ناسیح لەپاش پەند دانی زۆر بەدۆستی نەفامی وڕچ ..**

هەر بە(لاحەولان )لەوێ ڕۆی،ڕێبووار هیچ ئومێدی پێ نەما، بێ هووشیار
ئەوکوتی پەندم بەوی دا،زۆر بەجید بۆیەگەڵ من،ئەو نەبوو قەت موتتەحید
بۆیەدەرکی پەند بەسرا،ئەو کەسە ئەمری،(اعرض عنهم)و، بۆ وی بەسە
زیاد دەکا دەرمانی تۆ دەردانی خەڵک داستان بۆ تالیبان دێتن،بەکەڵک
کوێر فەقیر بێ،تالیبی حەق بێ،ئەگەر بێتەلات نابێ لەوی وەر گێڕی سەر
دەت هەوێ هەرسەرووەران ئیرشادکەی والەچاکەتۆ هەمووکەس،شاد کەی
ئەی موحەممەد کۆ وەبوون لات سەروەران گوێ گرت بوون،خۆشەبۆتۆ ئەوسەران
بینەیارو یاوەری دین دوور لەغەش چون ڕەئیسن،بۆ عەرەب هەم بۆ حەبەش
بەڵکەبڕوا، شوەهرەتی دین، تا تەبووک چون جەماعەت تابیعی دینی ملووک
تۆکەڕووت سووڕاند لەکوێری حەق تەڵەب غەیری ئەوهە،هیچ نەبیسراوەسەبەب
فرسەتی وا چون لەبۆم کەم دێتەپێش کات لەبۆتۆ زورە، تۆی،وەک قەوم وخوێش
کۆوەبووین ئێمەلەوەختێک والە،تەنگ بۆ نەسیحەت پێت دەڵێم من،نەک،بەجەنگ
ئەی موحەممەد کوێرەکی وا زۆر فەقیر لای خودا چاتر لەسەت شاەو، وەزیر
مەعدەنن،عالەم هەموویان بێ ژمار وا دەبێ،یەک چاترەتا سەت هەزار
مەعدەنی لەعل و عەقیقی نادیار چاکترەتا مەعدەنی مس،سەت هەزار

---

[1]- چون ئەبووبەکر،بۆی لەئەحمەد،هات ، بۆ(مصرع اول)

ـەی موحەممەدلێرە،نای بێ،ماڵ،چ سوود — دڵ دەبێ،پڕ بێ،لەعیشق و دەردو،دووود (٢٠٧٩)

مەخە، دەرکە، لەکوێری دەرد مەند — پەندی وی دە،موستەحەققە،ئەو، بەپەند (٢٠٨٠)

گەر بەتۆ مونکیر ببن،یەک دوو دەنی — تاڵ کەنابی، تۆ کەبۆ قەند، مەعدەنی (٢٠٨١)

گەر دووسێ،نادان بدەن توهمەت لەتۆ — خوا گەواهیت بۆ دەدا،تۆ غەم مەخۆ (٢٠٨٢)

ـەو کوتی ئیقراری خەڵکیم بۆچییە؟ — بۆ کەسێک شاهید بێ حەق، هیچ غەم نییە (٢٠٨٣)

جەکچەکی شاد بێ بەنووری تا و،ئەگەر — دیارەدەورانی هەتاوی،چووبەسەر (٢٠٨٤)

جەکچەکی گەر بوو بەنووری من هەژار — دیارەتاوم تاوی ڕوونی کردگار (٢٠٨٥)

ـۆنی گوڵ خۆشحاڵ بکا،قالۆچەگەر — حاڵەتی گوڵ بێ گومان لەو چۆ تەدەر (٢٠٨٦)

زێڕی مەغشووش گەر بچێ،بەدوای مەحەک — دیارەهەیتی ئەومەحەک زۆر نەقس و شەک (٢٠٨٧)

دەیهەوێ دز، شەو، نە ڕۆژ خۆ، بێ گومان — شەو کەنیم من ، ڕۆژی ڕوونم ، بۆ جیهان (٢٠٨٨)

جیادەکەم من چەشنی هێڵەگ جیا دەکا — نایەڵم ڕەدبێ لەمن یەک پووشکە(کا) (٢٠٨٩)

نایەڵم تێکەڵ ببن ئارد و کەپەک — تا نیشان دەم نەقش و نەفسان،یەک بەیەک (٢٠٩٠)

وەک تەرازووی خوام ئەمن،بۆنێو جیهان — چی گران و سووک ببێ،دەیدەم نیشان (٢٠٩١)

گای،خودا زانیوەگوێلکی هیچ نەفام — بۆ،خەریدار بۆ شتێکی بێ دەوام (٢٠٩٢)

گا، کەنیمە، گوێرەکەم بێ، موشتەری — من درووش نیم،ببمەچێشتی وشتری (٢٠٩٣)

هەرچی پێی وایەدەگەڵ من جەوری کرد — ئەو لەقەلبم تۆزو گەردی لا دەبرد (٢٠٩٤)

## خۆشحاڵ بوونی شێتێک بەدیتنی جالینووس وترسانی جالینووس ..

**خولاسەی داستان...**

ڕۆژێک جالینووس بەیەکێک لەدۆستەکانی کوت بڕۆ فلان دەرمانەم بۆ بێنەتا خۆمی پێ موعالەجە بکەم ئەویش پێیکوت ئەی ئوستادی بەڕێز ئەو دەرمانەی ئەتۆ دەت هەوێ، مەخسووسی شێتانەولایقی تۆ نییە،جالینووس پێیکوت .. مەوزووع لەو قەرارەیەکەئەو ڕۆ **دەگەدڵ شێتێک ڕوو بەڕوو بووم ماوەیەک بەخۆشحاڵی تەماشای منی کرد وبەچاوان دەگەڵ** من شۆخی دەکرد، ئەلئان فکر لەوەدەکەم کەئەگەر ئەمنیش وەکوو وی نیم بۆچی بەجوورەدۆستانەڕەفتای دەگەڵ من دەکرد..

گفتی جالینووس بەدۆستی، ئەو هەبوو — بێنەبۆمن تۆ فلان دەرمانە، زوو (٢٠٩٥)

پێیدەکوت جا،ئەی حەکیمی با فنوون — ئەو دەوایەهەر لەبۆ شێت و جنوون (٢٠٩٦)

وا مــەڵێ تــۆ زۆر بەدوورەئــەو هــە، لێــت جـوابی دا مـن دیـم لەڕێ،یـەک دانەشێت (۲۰۹۷)

شـــادمان بـــوو زۆر بەمن،وەک،ناســـیار قــۆڵی گــرتم،ڕای دەکێشـا چەشــنی،یار (۲۰۹۸)

گەرنەبامایـــە، ئـــەمن وەک وی، ئـــەدی بـۆمنی ئـەو چەشـنی دۆسـتی خـۆی دەدی؟ (۲۰۹۹)

بـۆ دهـات بـۆ لام،ئەگـەروەک وی، نـەبام؟ مــن وەکــوو وی گــەر نــەبام،لێی لادەدام (۲۱۰۰)

دۆست بن دووکەس ئەگەر بێ هیچ شەک خـۆ دەنێـو یـان دایەقـەدری موشـتەرەک (۲۱۰۱)

مەیلی جینسی خۆی دەکا، شت، تا ئەبەد ســـوحبەتی ناجینس،گۆڕەهـــەم لەحـــەد (۲۱۰۲)

**سەبەبی پەروازی پەڕەندەیەک دەگەڵ پەڕەندەیەکی دیکەکەلەجینسی یەک نەبوون ..**

**خولاسەی داستان ...**

یەک نەفەر زانا کوتی ..ڕۆژێک لەسەحرا دیتم کەزاغێک دەگەڵ لەک لەکێک بوو سـەرم سوڕ مـا، کـوتم بـەچ عیللـەت ئـەو دووانەبوونەهـەواڵ و ڕەفیقـی یـەکتر؟ داخـوا چ موناسـەبەتێکیان پێکەوەهەیە،عاقیبەت لەوبارەکۆڵیمەوە، کاتێک لەوان نیزیک بوومەوە،دیتم کەلاقی هەر دووکیان لەنگە..

یەک حەکیم دەیکوت کەدیم نێو دەشتەکی هەڵدەهات زاغێک دەگەڵ یەک لەک لـەکی (۲۱۰۳)

مام عەجەب لەو کارە، سەر سوڕ مام، ئەمن کـوا دەچـی دا ئـەو دووانـەوێک دەچـن؟ (۲۱۰۴)

چوومـەپێش ومـات مـام نـەم کرد چ دەنگ دیم کەهەردووکیان وەکوویەک بوون لـەنگ (۲۱۰۵)

خاسسە،شـابازێک کەعەرشـــە،جێی ئـــەوی بێ،بـەهاوڕێی یـەک لەکونـدی سـەر زەوی (۲۱۰۶)

یـــــــەک دەبێتەڕۆژو،عیللیینـــــــە،جێی یــەک دەبێتەچەکچەکی،سـیججینە، جێـی (۲۱۰۷)

یەک دەبێ نوور،دوور لەهەرچی عەیب وعار یـەک دەبێ کوێر،سواڵی دەرکان بۆوی کار (۲۱۰۸)

یـــەک دەبێتـــەمانگ لەژوور،پەروینـــەجێی کرمـە، ێێکێک،دائیمـەن سـەر گینـە،جێی (۲۱۰۹)

یـــەک دەبێتەیوســـوف و،عیســـا دەمـــە یەک بەچەشنی گورگە،یا وەک کەر، کەمە (۲۱۱۰)

یـەک دەچـێ پـەرواز دەکـا نێـو لا مـەکان یەک دەکادێن دا،دەنووی هەروەک سەگان (۲۱۱۱)

گــوڵ کــەدی قالۆچــە،وا بێــژێ، بەئــەو ئــەی لـەبۆتۆ هــەرچی پیســە، جێگەخــەو (۲۱۱۲)

گــەرکوبێزاری لـــەگوڵزار ئـــەی دەنـــی گوڵ،لەخۆشیان،بوون لـەنێو گـوڵزار خـەنی (۲۱۱۳)

غیرەتـــی مـــن دەردەکـــا تۆ،بێـــت دەڵـــێ ئـــەی کەســیفی بــۆ گــەنێو، لێرە،هــەڵێ (۲۱۱۴)

گەر تۆتێکـەڵ بـی دەگـەڵ مـن ئـەی دەنـی وا دەکــەن بیــر، تــۆ لەگەنجینــەی منــی (۲۱۱۵)

بولبـولا ن جێـی لایقـی وان بـوو چەمـەن خـۆ لـەبۆ قالۆچـە، نێـو گـەن،بوو وەتـەن (۲۱۱۶)

گـەر لەپیسی و گـەن،منی پاک کرد خـودا چـۆن پەلیـدی و ناحەزیم،ئـەو پێـدەدا (٢١١٧)

حۆ بڕی، لێم، ئەو ڕەگەی من بووم لەوان خـۆ خـەراب،ناگا بـەمن قـەت بـێ گومـان (٢١١٨)

یـەک نیشا ن بۆ ئا دەمی هەرئەو هەبوو سـەجدەیان بـۆ بـرد فریشـتان،هەرهەموو (٢١١٩)

یـەک نیشـانەی دیکەوابوو،ئـەو بلـیس داینـەنا سـەر، چـون مـنم پاشـاو ڕەئـیس (٢١٢٠)

گـەرکـو سـەجدەی بردبـا بـۆ وی بلـیس بـۆ فریشـتان چـۆن دەبـوو، ئـادەم ڕەئـیس؟ (٢١٢١)

هەم سجوودی گشت مەلەک میزانی وی هـەم جحـوودی ئـەو عـەدوو ،بورهـانی وی (٢١٢٢)

هـەردوو شـاهید بـوون لـەبۆ وی یـەک کفـری ئیبلـیس، ئیعتیرافـی گشـت مەلـەک (٢١٢٣)

**تەواو بوونی ئیعتیمادی قارەمانی ساویلکە بە خۆشەویستی ورچ ..**

ـان نوست،ورچەمێشـی دەردەکـرد مێش گـەڕاوە،کاری خـۆی مـێش هـەردەکرد (٢١٢٤)

ـری دەرکرد مێش لەسـەر ڕووی قارەمان مێش لەبۆجێی پێش دەهات،هـەر بێ وچان (٢١٢٥)

ـەمێشـان تووڕەبـوو، ورچـی نـەفام چوولەشـاخی بـەردەکی هینـا، زەلام (٢١٢٦)

ـەردی هینـا،دی لـەوێن هێستاکە، مـێش وان لەسـەر ڕووی قارەمان،بێ دەرد و ئـێش (٢١٢٧)

ـەردی هـەڵهینا و لێـی دان، توندو بـاش تـا لـەڕووی ئـەو قارەمان، مـێش بچنـەپاش (٢١٢٨)

ـەردوخاشـی کـرد فـەورەن،قارەمان بـۆ مەسەل،مەشـهوور لـەنێو خـەڵکی جیهـان (٢١٢٩)

ـستایی شەخسـی نـادان ئـاخ و داخ هەروەکوودۆسـتایەتی گـەڵ،ورچی شـاخ (٢١٣٠)

عەهـد و پـەیمانی زەعیفـەو بـێ بـەقا زۆر لەقـەول و عەهـدی خـۆی ئـەو بێ وەفا (٢١٣١)

ـرکێ سـوێندی خوارد،بـەو بـاوەڕ مەکـە سوێن، شکێنە، سـەت کـەڕەت چووبێ،مەکە (٢١٣٢)

چـۆن بـەبێ سـوێندیش درۆبوو،گفتـو گـۆی تۆفریـوی مـەکر و حیلـەی وی نـەخۆی (٢١٣٣)

ـسی وی میر، عـەقڵی وی هـەر وەک ئەسیر نـا دروستەسـوێن کـەدەخوا ئـەو حـەقیر (٢١٣٤)

چونکەدەشـکێنێت پـەیمان بـێ قەسـەم سوێن،دەکا وەک عەهدی خۆی بێ قەدروکەم (٢١٣٥)

ـرەیشـان زۆر دەبێ نەفسـت ئەگـەر بەنـدی سـوێندانی بخەیتەدەسـت و سـەر (٢١٣٦)

ـکمێکی یـەک ئەسـیر،بەن،کا ئەگـەر بـێ گومـان حـاکم لەبەندێ،دێتـەدەر (٢١٣٧)

ـبـەرق زەنجیـر لەسـەر وی زۆر،دەدا نەفسی ئەممار،سوێن،لەسەر سوێن خۆر دەدا (٢١٣٨)

ـفای عەهدت لەوی قـەت قـەت نـەوێ حیفزی سوێندیش قەت لەوی دەس،ناکەوێ (٢١٣٩)

ـکێعەهدت بەست ئەتۆ گەڵ یەک نەفەر قـەت ئـەتۆنابێ لەعەهـدت بچیـەدەر (٢١٤٠)

**چوونی حەزرەتی موحەممەد بۆعەیادەتی یەکێک لەسەحابیانی نەخۆش و بەیان کردنی قازانجی عەیادەت ..**

**خولاسەی داستان ...**

یەکێک لەسەحابەی پێغەمبەر(ص) نەخۆش بوو،پێغەمبەر(ص) چۆ عەیادەتی وی،تا حاڵی وی بپرسێ ودڵی بداتەوە،هەر دەگەڵ کو نەخۆش چاوی بەحەزرەتی موحەممەد کەوت دەردو ئێشی نەما و چابۆوە و شوکری خودای کرد و نەخۆشی و کەسالەتی خۆی بە مەوهیبەتێکی خودا زانی چونکەبەخاتری ئەو نەخۆشیەحەزرەتی موحەممەدی لەماڵی خۆی زیارەت کرد ..حەزرەتی موحەممەد(ص) پاش ئەحواڵپرس سوئالی لێکرد کەئەتۆ لەکاتی غەلەبەی نەفسی ئەممارەچ دوعایەکت بەزبانی خۆت کردووە؟ نەخۆش لەهەوەڵەوە، وەبیری نەهاتەوەکەچ دوعایەکی کردووە..بەڵام پاش کۆمەک وەرگرتن لەهیممەت وعینایەتی ڕەسوولی خودا وەبیری هاتەوە.کوتی ئەمن مورتەکیبی گوناهێک بووم ولەخوام داوا کرد کەعەزاب و موجازاتی ئەوگوناهەلەباتی قیامەت هەرلەدونیایەبەسەرمن بێنە.. تا لەدونیای دی ئاسوودەبم ..جا لەبۆیەگرفتاری پەرێشانی ڕووحی وجیسمی بووم ..تا کولوتفی تۆ ئەمنی لەو گرفتاری و پەرێشانیەنەجات دا ڕەسوولی خودا پێی فەرموو لەوەی پاش ئەو جوورەدوعایانەمەکە.بەڵکەهەمیشەلەخودا ی بەرزو بێ هەمتا بەو جوورەداوا بکە.. خودایا موشکیلی من ئاسان بکە. لەدونیاو ئاخیرەت هەرشتی چاکم پێ عەتا کە.

یەک لەئەسحابی ڕەسوول بیمار بوو — بەو نەخۆشیەی زۆر هەژار و زار بوو
بۆ عەیادەت هاتەلای وی موستەفا — چونکەخووی وی دائیمەن لوتف و سەفا
لای نەخۆش چوون بۆ تۆ هەیتی فاییدە — فاییدەی ویش هەرلەبۆتۆ عاییدە
فاییدەی ئەووەڵ، کەئەو شەخسی عەلیل — بەڵکەقوتبێک بێت، ئەوشاهی جەلیل
گەر نەبێ قوتب،خۆ ڕەفیقە،ڕێبووار — شانەبێ با، خۆ لەلەشکر یەک سووار
لازمەچوون لای ڕەفیقی ڕێبووار — هەرکەسێک بێ، پیادەبێتن،یاسووار
دوژمنیش چاکەی دەگەڵ کەی چاکە، بۆت — بەڵکەبیکەی تۆ، بەچاکە،دۆستی خۆت
گەرنەبێتەدۆست کینەی کەم دەبێ — چونکەبۆ کین، چاکەوەک مەڵحەم دەبێ
غەیری ئەوهەش زۆری قازانج هەن، بەڵام — من دەترسێم زۆر درێژبێتن کەلام
ئەسڵی مەتڵەب، بگرەعالەم یاری غار — چەشنی بوتگەر، تۆ لەبەردی چاکەیار

جۆنکەزۆر بن گەر لەڕێگا کاروان — دز، لەدەستی نایە، بگرێ، ڕێ لەوان (٢١٥١)

جۆنکەنابینایەقەلبت ئەی عەنوود — بۆیەنازانی جودا کەی دارو،عوود (٢١٥٢)

لەدونیا گەنج هەبێ نەت بێ، چ ڕەنج — هیچ لەوێرانا ن مەزانە، دوو رلەگەنج (٢١٥٣)

تۆ بڕۆ بەدوا یی دەروێشی فەقیر — جا،کەناسیت تۆ ئەسیر بەو، ئەو ئەمیر[1] (٢١٥٤)

جۆی قەلبت کوێر کەبێ و، نەی بێ، چ سوود — وا بزانەگەنجی تێدا گشت وجوود (٢١٥٥)

**وەحیی ناردنی حەق تەعالا بۆ حەزرەتی مووسا(ع) کەبۆ نەهاتی بۆ عەیادەتی من ..**

**خولاسەی داستان...**

ڕۆژێک لەبارەگای خوداوەند موتەعال حەزرەتی مووسا (ع) عیتاب کرا . کەئەمن نەخۆش بووم. بۆچی نەهاتی بۆ عەیادەتی من؟ حەزرتی مووسا (ع) عەرزی کرد ئەی خوداوەند. تۆ لەهەموو عەیب و نەقسێک بەدووری . نەخۆشی چیەکەئەتۆ بەوی گرفتار بی؟ ئەمن لەمەقسوودی تۆ حاڵی نابم .ئەتۆ بۆ خۆت مەقسوودی خۆت بەیان بفەرموو..خوداوەند فەرمووی ..یەکێک لەبەندەگانی خۆشەویستی من نەخۆش بووە، مەگەر نازانی کەئەو، ئەمنم؟

هات لەبۆمووسا، لەحەق ڕا،وا عیتاب — ئەی لەجەیبی خۆت دەد ی تۆ، ماهتاب (٢١٥٦)

ـود بەنووری خۆم روون کرد ئێستەبۆ — من نەخۆش کەوتم نەهاتیەلام ئەتۆ (٢١٥٧)

جوابی داوەتۆ کەپاکی بێ زیان — مەتڵەبی خۆت بیکەبۆمن،خۆ ت بەیان (٢١٥٨)

ـە جەلەش فەرمووی نەخۆش بووم زۆر،لەبۆ — نەت دەپرسی هیچ لەحاڵی من ئەتۆ (٢١٥٩)

جوابی دا، ئەی خوا،ئەتۆ نەقست نییە — بێژەخۆت جواب،مەتڵەبی تۆ هەرچییە (٢١٦٠)

ـ کوتی بەو،بەندەیەک لام خۆشەویست — زۆر نەخۆش بوو،ئەو،منم،چاکت کەبیست (٢١٦١)

گەر ببێ مەعزوور ئەو، مەعزوور منم — گەر ببێ ڕەنجوور ئەو، ڕەنجوور منم (٢١٦٢)

هەرچی بی وێ،هاونشین بێ گەڵ خودا — دابنیشی،با، لەخزمەت ئەولییا (٢١٦٣)

گەر کو دووربی، تۆ لەخزمەت ئەولییا — تۆ هیلاکی،چون لەکوللت،بووی جییا (٢١٦٤)

هەرچی شەیتان، ئەو لەپاکان، لابنێ — چون تەکی دی،ئەودەبا،سەر دابنێ[2] (٢١٦٥)

یەک وەجەب دووربی لەپاکان،یەک زەمان — مەکری شەیتان بوو لەبۆتۆ بێ گومان (٢١٦٦)

---

1- تۆ تەوافی ویت ،نەچی ،هیچ کات ،لەبیر (مصرع دوم)

2- زوو سەری دەخوات ،چون دیتی تەنێ (مصرع دوم)

**جودا کردنەوەی باغەوان، سۆفی و فەقیە و سەیید، لێکتر ..**

**خولاسەی داستان...**

باغەوانێک چۆ باغەکەی خۆی،دیتی کە،سێ نەفەر دەوێدان،ئەوسێ نەفەرانەعیبارڕەت بوون لەیەک فەقیەویەک سەییدو یەک سۆفی . باغەوان نیگەران بوو وپێی وابوو کەئەوانەدزن، بەخۆی کوت دەتوانم سابیت بکەم کەئەوانەبەباغی منیان تەجا وەز کردووە، بەڵام ناتوانم بەتەنێ دەگەڵیان ڕوو بەڕوو بم چونکەئەوان زۆرن وئەمن بەتەنێ ..ئاخری فکرەکی بەو جوورەکرد.. کەلەهەوەڵەوە، ئەو سێ نەفەرەلێک جودا بکەم ..لەپاشا ن یەک یەکەموجازاتیان دەکەم، جا بەو خاترەلێیان چۆپێش وبەڕوویەکی خۆش بەسۆفی کوت، بۆ ئەوەزۆر لەتەفریح کردن لەوباغەلەززەت ببەن برۆ لەمەنزڵی من بەڕەیەک بێنە، سۆفی جێ بەجێ هەستا وەڕێ کەوت . ودەنێو داران دا ون بوو . باغەوان لەوکاتەدا ڕووی کردەفەقیە و سەیید،وپێی کوتن ئەتۆ فەقیهی ئێمەی وئەوئاغایەسەییدە..ئێمەبەبەرەکەتی فەتوای تۆ ژیان دەبەینەسەر .. وئەو ئاغا سەییدەلەخانەدانی پێغەمبەرەولەلای هەموو مان زۆر موحتەرەمەبەڵام نازانم ئەو سۆفیەزگ زلەکێیەکەبۆتەهاوڕێی ئێوە؟ باغەوان کاتێک موتەو ججیەبوو کەقسەکانی جێی خۆیان گرت، وئەوانی نیسبەت بەسۆفی دڵ سارد کرددوە. دارێکی لەدەستان خۆشی هەلگرت، و وەدوا ی سۆفی کەوت ..و ئەوی بەتەنێ دی، وتا توانی بەداران لێیدا جا لەپاشان بەنیوەڕووح بەجێی هێشت .لەپاشان باغەوان بۆ لای فەقیەو سەیید گەڕاوە، و بەسەیدی کوت ئاغا سەیید لەمەنزڵەکەی من ناسکەنانی زۆر خۆش هەیەبرۆ بەنۆکەرەکەم بڵێ کەنانەکان دەگەڵ یەک مراوی سوور کراوەبۆمان بەڕێ کا، تا خۆمانی لێ تێر کەین، سەیید وەڕێ کەوت وفەقیەبەتەنێ ماوەلەو کاتەدا، ڕووی تێکرد و پێیکوت .. ئەی فەقیهی بەڕێز،بۆ من مەعلوو مەکەئەتۆ فەقیهێکی زۆر گەو رەو بەڕێزی، بەڵام ئەو سەییدەکێیەکەهاو ڕێی تۆ یە؟ ومەعلوومیش نییەکەواقیعەن سەییدبێت .. قسەکانی دەفەقیەدا کاری خۆی کرد باغەوان جێ بەجێ بەدوای سەیید دا ڕۆیشت هەتاتوانی لێیدا کاتێک کەباغەوان خەیاڵی لەسەییدیش ڕاحەت بوو .. هاتەوە بۆ لای فەقیەو بەسەری دا نەڕڕاند و کوتی .. ئاهای خوێری ..بەڕاستی ئەتۆ خۆت بە فەقیەدەزانی؟ بەکام دەلیل و ئیجازەئەتۆ هاتوویەباغی من؟لێرەدا فەقیە لە نەقشەی باغەوان ئاگاداربوو و تێگەیشت کەتەواوی ئەو قسەفێڵبازانەفەقەت بۆ جودا کردنی ئەو سێ

نەفەرانە لێکتر بووە جا پێی کوت ئەی باغەوان لێم بدە، بەڕاستی دەبێ چاکم لێبدەی..

ئەوەیە جەزای ئەو کەسەی کە لەڕەفیقان جودا بێتەوە

دەکردە باغەکەی خۆی باغەوان    سێ کەسی دیتن وەکوو دز، بوون ئەوان (٢١٦٧)
فەقیەوسۆفییەک، سەیدێک، شەریف    یەک‌یەکەی وان بوون لەعەهدان،زۆرزەعیف (٢١٦٨)
کوتی من حەقمەئێستا،شەڕبکەم    خۆ بەلام زۆرن ئەوا ن،من تاق و، کەم (٢١٦٩)
نم شەڕ بکەم،گەڵ سێ نەفەر    چاکەلێکیان من جودا کەم بێ خەتەر (٢١٧٠)
یەکەی وان من لەیەکتر جیا دەکەم    جا موجازاتیان لەپاشان،جا، دەکەم (٢١٧١)
فێلان،سۆفی ئەووەڵ، دوور خست    تاکویاران بەو ببن زۆر،بێر، سست (٢١٧٢)
بەسۆفی کوت بڕۆ بۆ مەنزڵم    بێنەبۆ خۆتان،بەڕێک، تۆ ئەی دڵم (٢١٧٣)
کەسۆفی وای دەکوت،جا، بەو دوویار    تۆ فەقیهی ئەوهە، سەیدە، نامدار (٢١٧٤)
فەتوای تۆ یەژین داخواز دەکەین    هەر،بەباڵی عیلمی تۆ پەرواز دەکەین (٢١٧٥)
هزادە، ئەو هەبۆ مان، ڕەهبەرە    یەک لەئەولادی ڕەسوولی، سەر وەرە (٢١٧٦)
ئەوسۆفیە،خەسیسەی،زگ پەرەست؟    وا دەگەڵ شای چەشنی ئێوە، هەیتی دەست (٢١٧٧)
گەر،لێی بدەن،لێی کەن،برین    هەفتەیەک پاشان،لەباغم خۆش بژین (٢١٧٨)
کەهیچە،گیانیشم،با بێ فیداو    خۆشەویستن ئێوەلای من،چەشنی چاو (٢١٧٩)
ەی کرد و فریوی دان ئەوان    سەختە، زۆر، دوور بوون لەیاران، ئەی جەوان (٢١٨٠)
کەڕۆی سۆفی لەوێ بوو نادیار    چوو بەدووی وی،باغەوان، جا،دەس بەدار (٢١٨١)
کوت ..ئەی سەگ ئەتۆ بێ باک،بووی    هاتیەباغم، تۆ لەلای خۆت پاک بووی (٢١٨٢)
سەید بوو یاجونەیدت ڕێنموون    کامەشێخ ڕێگای نیشاندای،ئەی زەبوون؟ (٢١٨٣)
ۆفی تەنها دیت،لێیدا،بێ حیساو    جێی دەهێشت جا،نیوەگیان و، سەر شکاو (٢١٨٤)
دیکو ت من بەشی خۆم،هات بەسەر    ئەی ڕەفیقان،ئێوەباش بن،باخەبەر (٢١٨٥)
بوو لاتان، من نەبینن،بش مرم    هەرچی بم من،لەو سەگەی، زۆر چاترم (٢١٨٦)
سەرتان هەرچی من دیتم بەچاو    وایەموزدی هەرکەسێک،بێ،پەست وخاو (٢١٨٧)
جیهانە، کێوە، گفتوگۆ، سەدا    هەرچی بیلەی، کێو بەگوێی تۆی، دا دەدا (٢١٨٨)
گەرکاری سۆفی کرد تەواو    هەرهەمان فێڵی دەکرد، بۆ دووی،دەماو (٢١٨٩)
رم، سەیید، بڕۆ بۆ لای وەتاغ    بێنەبۆمان،ناسکەنانی نەرم و داغ (٢١٩٠)
دەرکی ماڵ (قیماز) ی بانگ بکە    بێژەبێنێت،ناسکەنان ۆ قازەکە (٢١٩١)

گەر بەرێی کرد،جا،کوتی ئەی هووشیار     تۆ فەقیهی بۆ هەمووکەس ئاشکار (۲
ئەو ڕەفیقەی سەییدت پڕ ئیددیعا     کێ دەزانێ،دایکی چی کرد؟ هەرخودا (۳
چۆن لەژن،تۆ،کاری چاک داوا، دەکەی؟     چۆن بەناقیس عەقڵ،تۆ بڕوا، دەکەی؟ (۴
پشتی خۆی ئەحمەد، دەزانێ، هەم عەلی     زۆر ئەوانەی بوون لەدونیا دا، دەلی[1] (۵
ئەوکەسەی کەبەدنیژادەو،نالەبار     بەد گومانەئەو بەدۆستی کردگار (۶
هەرکەسێک،سووڕا، دەسووڕێتن،سەری     جا دەبینێ،هەروەها، دەورو، بەری (۷
هەرچی دەیکوت باغەوانی بولفزوول     خۆی وەها بوو دوور لەئەو لادی ڕەسوول (۸
گەر نەبایەئەو نەتیجەی مورتەدان     چۆن دەبا کوتبای،وەها بۆ خانەدان؟ (۹
زۆری ئەفسوون خوێندو بیستی ئەو فەقیە     چوو، بەدووی سەیید، ستەمکاری سەفیە (۰
کێ ئەتۆی هینا وەباغم ئەی کەرە؟     بۆ دزی، یارا بەرت پێغەمبەرە؟ (۱
بەچکەشێر وەک شێر دەچێتن تۆ،ئەدی     چیت‌دەچی وەک‌خەسڵەت و،خووی ئەحمەدی؟ (۲
باغەوان ئازاری دا سەیید، وەها     وەک خەواریج کردی، گەڵ ئالی تەها (۳
داغ لەدڵ بوون دائیمەن شەیتان و غوول     وەک یەزیدو شومر، گەڵ ئا لی ڕەسوول (۴
حاڵی سەیید،بوو بەلێدان،زۆ رخەراو     جا، بەخۆ ی کوت من نەجاتم بوو لەئاو (۵
تاک،کەمای،سەبرت هەبێ،وەک خاک‌وخۆڵ     چاک قەبووڵ کەزەربی زگ،تۆ وەک دەهۆڵ (۶
من شەریف ولایق و هەمدەم کەنیم     زاڵمی وا، من لەوی، هیچ کەم کەنیم (۷
گەر لەوی فاریغ بوو هات بۆ لای فەقێە     تۆفەقیهی(نا) کەنەنگی گشت سەفیە (۸
وایەفەتوات؟ دەک لەتۆ ببڕێ،دوودەس     بێیەباغم بێ ئیجازەی هیچ،کەس (۹
ڕوخسەتی وات یانەتۆخوێند،نێو وەسیت     یانەخوێندت مەسئەلەی وا، نێو موحیت (۰
پێیدەکوت جا،حەقتەلێم دە،تۆ خودا     وایەموزدی وەی، لەیاران بێ، جودا (۱

## گەڕانەوە بۆ داستانی نەخۆش و عەیادەتی پێغەمبەر (ص)..

خۆ عەیادەت هەرلەبەرپەیوەندەبەس     جا،لەپەیوەند سەت مەحەببەت دێتەدەس (۲
بۆ عەیادەت چوو ڕەسوولی بێ نەزیر     دی سەحابی وا، بەدەس مردن، ئەسیر (۳
گەر کو دووربی،تۆ لەخزمەت ئەو لیبا     دوور بوویەتۆ، لەزاتی کیبریا (۴
چون نەتیجەی هیجری یاران هەرغەمە     چۆن فیراقی ڕوویی شاهان، لەو کەمە؟ (۵

[1] -دەلی ( یەعنی دێوانە؛ شێت )

سێبەری شایان تەڵەب کە، دەی وەرە زۆر لەرۆژ،ڕوون تر دەبی، بەو سێبەرە (٢٢١٦)
نییەتت وابێ ئەگەر چووی بۆ سەفەر قەت نەبی غافڵ،لەوەی،کاتی حەزەر (٢٢١٧)

**کوتنی دەروێشێک بەبایەزید کە،کەعبە، ئەمنم لەدەوری من تەواف بکە..**

**خولاسەی داستان...**

بایەزیدی بەستامی لەموسافەرەتەکانی خۆیدا هەمیشەئینسانی خودایی جستو جۆ دەکرد لەنیوەی ڕێگادا پیرەمێردێکی نوورانی و پشت چەماوەی دیت ..کاتێک کەقسەی دەگەڵ کرد، مەعلووم بوو کەدەروێشێکی فەقیرو عەیال وارە، پیرەمێرد بەبایەزیدی کوت بۆ کوێ دەچی؟ بایەزید جوابی داوەدەچم بۆ مەککەبۆ ئەنجام دانی مەناسیکی حەج پیرەمێرد پێیکوت خەرج و مەخاریجت بۆ ئەو سەفەرە، چ پێیە؟ جوابی داوەدوو سەت درەمی زێو دەگۆشەیێکی عەبایەکەم قایم کردووە، پیرەمێرد پێیکوت پووڵەکانت بدەبەمن وحەوت جار لەدەوری من تەواف بکە، بۆ تۆ لەتەوافی حەج چاترە، بایەزید بەقسەی وی کرد ..

بایەزید بۆ مەککە،کردی یەک سەفەر تاکوئەنجام دات حەج، ئەو خۆش نەزەر (٢٢١٨)
ئەو لەهەرجێیەک دەچوو دەیکرد تەلاش تا کوپەیدا کا لەوێ ئەشخاسی باش (٢٢١٩)
کۆ، بە،کۆ، ژێر پێیدەنا، ئەقتاری شار تا پەیا کا،یەک لەدۆستی کردگار (٢٢٢٠)
خوا کوتویەبۆسەفەڕ چووی تۆ، ئەگەر تالبی ئینسانی چاک بە،لەو سەفەر (٢٢٢١)
تۆ بەدووی گەنج دا بڕۆ، سوودو زییان تابعن بۆگەنج، لەگەنجی،زۆر جییان (٢٢٢٢)
گەنمی مەقسوودبوو ئەوەی گەنمی دەچاند کا،کەهات،بۆ خۆی دەهات،وا،خۆی نوواند (٢٢٢٢)
کا،بچێنی گەنمی لێ شین نابێ خۆ شەخسی پاک و باش تەڵەب کە،جا، ئەتۆ (٢٢٢٤)
کەعبەقەستت بێ کەچووی بۆ حەج ئەتۆ گەرکوچووی،مەککەی دەبینی سەربەخۆ (٢٢٢٥)
قەست لەمیعراج بوو فەقەت دیداری یار تابیعن عەرش ومەلەک،گەربوون دیار (٢٢٢٦)

**حیکایەت ..**

ئەو موریدێک چاکی کرد یێک ساختمان چووتەماشای کرد شێخ هەرئەو زەمان (٢٢٢٧)
شێخ ویستی ئیمتیحان کا سالکی ڕەسمەوا، بۆگشت مورید و،پیرەکی (٢٢٢٨)
تۆ کولینکەت بۆچی چاکرد ئەی ڕەفیق جوابی دا تا بێتەژوور،نوور، لەو تەریق (٢٢٢٩)
شێخ کوتی بەو،فەرعەئەوهە، بەڵکەتۆ مەقسەدت بێ دەنگی بانگت بێ، لەبۆ (٢٢٣٠)

بـــا یەزیـــد زۆری ســـەفەرکردن هـــەتا ‌ ‌ ئـــەو لـــەبۆخۆی مورشـــیدێک پەیـــدا بکـــا (٠٠٣١)

پیرەکـــی دی،قـــەد، چـــەماوە، وەک هـــیلال ‌ ‌ دی،دەویـــــدا عیـــــزەت و جاەوجـــــەلال (٠٠٣٢)

چـــاوی نابینـــاو قـــەلبی ڕوون بـــوو ئـــەو ‌ ‌ چەشـــنی فیـــل، هیندووســـتانی بێتەخـــەو (٠٠٣٣)

تـــا لەخـــەو دا ئـــەو دەبینـــێ ســـەت،تەرەب ‌ ‌ کوێرونابینایـــە، بـــێ خەو،ئـــەی عەجـــەب[1] (٠٠٣٤)

دێتەبـــەر چـــاو زۆر عـــەجایب،وەختی خـــەو ‌ ‌ چـــاک دەبینـــێ دڵ،دەخـــەودا، ڕۆژو شـــەو (٠٠٣٥)

ئەو کەســەی مــەعنا، بــەبێ خەو،لەو،عــەیان ‌ ‌ مـــاچ کەدەســـتی،عارفەئەو، بـــێ گومـــان (٠٠٣٦)

بایەزیـــدلای دا دەنیشـــت،لێی پرســـی حـــاڵ ‌ ‌ دی کـــەنیتی مـــاڵ و، هـــەیتی زۆر منـــاڵ (٠٠٣٧)

پێیـــدەکوت ئـــەی بایەزیـــدی خۆشەویســـت ‌ ‌ دەت هـــەوێ بۆکوێ بچی،کوێت،تۆ، دەویست؟ (٠٠٣٨)

پێیـــدەکوت کەعبـــەم مـــورادەمن ســـبەی ‌ ‌ ئـــەوکوتی چیـــت پێیـــە، تۆشـــە، بێـــژەدەی (٠٠٣٩)

پێیـــدەکوت دووســـەت درەم، زێـــوم لـــەلا ‌ ‌ قـــایمم کـــرد مـــن لـــەبن گۆشـــەی عـــەبا (٠٠٤٠)

پێیـــدەکوت،تۆ حـــەو کـــەڕەت من،کەتـــەواف ‌ ‌ چـــاکتریش بـــی،لات لەحـــەج،با، بـــێ گـــەزاف (٠٠٤١)

پووڵـــــــەکانت،تۆ لـــــــەبۆمن دابنـــــــێ ‌ ‌ جا،حـــەجت کرد،هـــەر لەئـــەووەڵ،تا بنـــێ (٠٠٤٢)

حەججی عومرەت کرد، عومرت بۆ ئەبەد ‌ ‌ ساف بووی تۆ،ساف لە هەرچی پیس و بەد (٠٠٤٣)

بەو خودایەی تۆ ئەوت چاک دی بەدڵ ‌ ‌ چـــاکترم مـــن،لای، لـــەماڵێک، بـــەردو گـــڵ (٠٠٤٤)

گـــەرچی کەعبـــە جێیـــە بـــۆ چاکـــانی وی ‌ ‌ قـــەلبی مـــن جێـــی ڕازی بـــێ پایـــا نـــی وی (٠٠٤٥)

قـــەت نـــەچۆ کابە،خوداونـــد،هیچ کـــات ‌ ‌ بـــۆ دڵـــی مـــن غـــەیری زاتـــی وی نـــەهات (٠٠٤٦)

چون منت دی،خوات ئەتۆ دی، بێ گەزاف ‌ ‌ کابـــەیی ڕاســـتیت ئـــەتۆ جـــا، کـــرد تـــەواف (٠٠٤٧)

خزمـــەتی مـــن تاعـــەت وحەمـــدی خـــودا ‌ ‌ تـــۆ نەکـــەی مـــن کـــەی، لـــەزاتی حـــەق جودا (٠٠٤٨)

چـــاک بنۆڕەتۆلـــەمن ئـــەی خـــۆش نـــەزەر ‌ ‌ تـــا ببینـــی نـــووری حـــەق، تۆنێـــو بەشـــەر (٠٠٤٩)

ئەو قسانەی بایەزید بیست جوێ جووێ ‌ ‌ چەشـــنی حەڵقـــەی زێر،کردیـــەنێو گـــووێ (٠٠٥٠)

بایەزیـــدی زیـــاد کـــرد، ئیرشـــادی پیـــر ‌ ‌ گەییەجێیەک،ئـــەو لـــەوێ بـــوو موســـتەنیر (٠٠٥١)

**موتەوەججیەبوونی پێغەمبەر(ص) کەعیللـەتی نـەخۆش بـوونی ئەوشەخسەچاک دوعا نەکردن بووە..**

کـاتێ ئەحمـەد هـات دیتـی ئـەو نـەخۆش ‌ ‌ هەربـــەلوتف و خۆشـــی ئـــەو هینایـــەجۆش (٠٠٥٢)

چونکـــەدیتی ئەحمـــەدی ئـــەو هاتەســـەر ‌ ‌ هـــەر لـــە شـــایان ڕووحـــی تـــازەی هاتەبـــەر (٠٠٥٣)

---

[1]- ئەولەخەو ،بێ چاو دەبینێ ،سەت تەرەب ‌ ‌ هیچ کەنابینێ بەبێ خەو، ئەی عەجەب

ـەو کوتی مـن بـەو نەخۆشیەم خۆشحاڵ ... چـون دەبیـنم سـەرەوەری عالەم،لـەماڵ (٢٢٥٤)

ـن نەخۆشیم هیچ نـەما، بۆم هـات شـەفا ... چـون لـەماڵی خـۆم دەبیـنم مسـتەفا (٢٢٥٥)

ـۆ شـحاڵم مـن بـەدەردو،ڕەنج و، تـەو ... زۆر موبـارەک بێـت لـێم،من ئێشـی شـەو (٢٢٥٦)

ـوتفی خوایـەمن بـەپیری بـووم نـەخۆش ... خوا منی کرد وا، نەخۆش و جێی، پەرۆش (٢٢٥٧)

ـدی پشـتی دا بـەمن تـا کـو لەخـەو ... ڕا پـەڕم مـن،زۆر بەسـورعەت، نیوەشـەو (٢٢٥٨)

ـ نـەنووم من،شـەو تـەواوی، چەشـنی گـا ... مەرحەمـەت بوو، ئێشی زۆر دا مـن، خـودا (٢٢٥٩)

ـێشی مـن بوو، ڕەحمـی شای هینا یـەجۆش ... دوو زەخیـش بۆترسـی من،نـەی مـا خـرۆش (٢٢٦٠)

ـنجەگـەنج،پڕ ڕەحمەتـە، نـاچێ هـەدەر ... پێسـت کەقەڵشـی،مەغزی تـازە، دێتـەدەر (٢٢٦١)

ـەی بـرا، جێـی تـۆ کـەبێ،تاریک و،سـەرد ... چونکەسـەبرت بـوو لەسـەر، زۆرئـاەو، دەرد (٢٢٦٢)

ـوی ژینەئـەو قسـەم بـۆ گشـت کـەس ... وردو خـاش بـە، گـەورەبیت،تا بێتـەدەس (٢٢٦٣)

ـ دەپۆشـــن ێێکتـــری پـــایزو بـــەهار ... جا، لەبەروان،تۆ نەکەی قـەت قـەت، فیـرار (٢٢٦٤)

ـختـی غـەم داوا بکـە، زۆر سازو، بـەرگ ... عـومری زۆر داوا بکـەتۆ پاشـی مـەرگ (٢٢٦٥)

ـەرچی نەفسـی تـۆ کـوتی ئـەو هەربـەدە ... چـون خیلافـەکاری وی،بـەو،گوێ مـەدە (٢٢٦٦)

ـ لـەبۆمان هـات لەگشـت پێغەمبـەران ... گوێ بەنەفسی خۆ مەدەن،ئەی سەروەران (٢٢٦٧)

ـەشـوەڕەت بۆیەلـەکار واجـب کـرا ... تـا پەشـیمان،زۆر نـەبی تـۆ ئـەی بـرا (٢٢٦٨)

ـ ڕەوایەمەشـوەڕەت گـەڵ غـەیری عـەقڵ ... وا، لـەپیرو ئـەنبیا،بۆن بوو،بەنـەقڵ (٢٢٦٩)

ـەر کەسێکیش هەیبوو،کەم عەقڵ و شعوور ... مەشوەڕەت گەڵ ویش بکەن، نەکەن،بەدوور (٢٢٧٠)

ـەشوەڕەت گەڵ ویش بکەن،هەر بێ قسوور ... هـەرچی ویستی ئەو،نەکـەن لـەوبن بـەدوور (٢٢٧١)

ـەفسی خۆت تۆ کەم حیساب کە، ئەی فلان ... نەفسـی تۆیەشـەڕڕی کـوللی، بـێ گومـان (٢٢٧٢)

ـەر دەگەڵ نەفست بکەی تۆ مەشوەڕەت ... گـوێ مـەدەگوفتاری وی تـۆ،هیچ کـەڕەت (٢٢٧٣)

ـەر بـەتۆ فـەرمانی ڕۆژوو،نـوێژ بـدا ... فێـڵ دەکـا نەفسـت کـەوا بوو،خـۆش ئـەدا (٢٢٧٤)

ـەرشـەریکی نەفسـی خـۆت بـی تـۆ لـەکار ... گـوێ بەنەفسـی خـۆت مـەدە، بیخەکـەنار (٢٢٧٥)

ـۆسـتایی نەفسـی ئـەممارەت نـەوێ ... دۆستی چاکان بە، کەچاکەت دەس کەوێ (٢٢٧٦)

ـملەعـەقڵ، عـەقڵی کۆمـەک بـێ ئەگـەر ... نەیشـەکەرکامیل دەکـاتن نەیشـەکەر (٢٢٧٧)

ـۆر شتم دی، من لەمـەکری نەفسـی خـۆم ... نەی دەهێشت تەشخیس بمێنێ هیچ لەبۆم (٢٢٧٨)

ـەودەدا وەعـدان بـەتۆ زۆر بـێ ژمـار ... قـەت بەوەعـدەی خـۆی وەفـا ناکـا، چ جـار (٢٢٧٩)

ـومری زۆر، ئاخرنـەمان، دەیخاتـەداو ... خـۆ بەهانـەی نـەفس نـا بـێ قـەت تـەواو (٢٢٨٠)

(٠٠١ زۆر دەدا وەعدەی دەپووچ،ئەو نەفسی دوون ئـەودەکا، مـەردان، بـەجادووی،خۆی زەبـوون
(٠٠٢ جـێن مەهێڵەئـەی حیسـاٌمەددین، چ کـات تـۆ نـەبی، شـین نابێ،لێی،گیا،شـۆرەکات
(٠٠٣ چونکەنـەفرین هـات لەشەخسـی دڵ شـکاو قفڵـی دا،حـەق قـەلبی شەخسـی زۆرخـەراو
(٠٠٤ ئـــەو قەزایەهەرقـــەزا دەیکـــاعیلاج عـەقڵی خـەڵکی لای قـەزا بـوو،بێ ڕەواج
(٠٠٥ بـوو بەئـەژدیهای عـەزیم ئـەو مـاری ڕەش گەرچی کرمێک بوو، لەژین نەیبوو،چ، بەش
(٠٠٦ ژێـــری دەســـتی تۆنـــەمارو ئـــەژدیها هەردوو ژێر فەرمانی تۆن، بۆت بوون عەسا
(٠٠٧ حـوکمی(خـذ هـالا تخـف) پێـی دای خـودا تاکوئـــەژدیها بەدەســـتت،بێ عەســـا
(٠٠٨ تـۆ،( یـەدی بـەیزا )،وەدەر خـە، شـەهرییار بیـان کـە،ڕۆژی ڕوون،شـەوانی لێـڵ و تـار
(٠٠٩ وەیکوژێنـــە،تۆ لـــەدووزەخ، ئـــاگری ئـــەی بـــەقودرەت،تۆ لـــەدەریا،زیاتری
(٠١٠ فێڵەبازە،بـــەحر، زاهیـــر زۆر نـــەرم دووزەخـیش کـەم،خۆی دەدا،نیشـان،گەرم
(٠١١ زۆر بەکـــەم ئـــەو دێتەبـــەرچاوانی تـــۆ تازەلیـــل بـــێ و، بێتەژێرفـــەرمانی تـــۆ
(٠١٢ وەک سپای کوففا ر لەبەدرێ زۆر کەبوون هاتەبـەرچاوی نەبی،کـەم هـەم زەبـوون
(٠١٣ لێیدەدان،ئەحمـەد لـەوان،جا، بـێ خەتـەر گـەر بـەزۆری دیتبـان دەیکـرد حـەزەر
(٠١٤ لـوتفی حـەق بـوو گـەر ئـەوانی والـەدی تـا نەترسـێن قـەت سـپاهی ئەحمـەدی
(٠١٥ کـەم، بـەوی و،یـارانی وی نیشـان دەدا ئـەو جیهـادی زاهیـرو بـاتین، خـودا
(٠١٦ خوا لەبۆ وی جێ بەجێ کرد کاری سەهل تـابێ بـۆ کـاری موشـکیل،ئەو بەئـەهل
(٠١٧ چونکەدی لەشکر بەکەم ئەو سەر کەووت ڕێنمـوونی و،یارمـەتی خـوای بـەر کـەووت
(٠١٨ ئەوکەسـەی کۆمـەک نەکا،بـەو کردگـار ئـەژدیهای ئەودێتەبـەرچاو، سیسـەمار
(٠١٩ وای بـەحاڵی وەی کـەدیتی ئـەو لـەدوور سەت، بەیەک، بۆ شەڕ بەنازدێت وغروور
(٠٢٠ زولفـەقار، لای وی وەکووشەمشـیری دی وەک پشیلەی، شێری جـەنگی، ئـەو دەدی
(٠٢١ تاکوئەحمـەق زۆر بـەبێ بـاک بچتەجـەنگ حـەق ئـەوان بـەوجوورەداوێ،ژێری چـەنگ
(٠٢٢ تابـەپێی خـۆی بـێ لـەبۆ نێـو ئـاگری ئەو کەسـەی قـەت پەنـد لـەچاکان نـاگری
(٠٢٣ دوژمنـت دی،تـۆ بەکـەم،وەک پووشـکە،کا تـا کـو فووکـەی تـۆ لـەوی و،پـەرواز بکـا
(٠٢٤ پووشـکەکای وا، کێـو لـەبن ڕا، ڕا، دەکـا شـادەبۆخۆی،یەک جیهـان ڕیسـوا دەکـا
(٠٢٥ بـەعزەجۆگێک،ئاوی وی کـەم دێ بـەچاو حـووج دەخنکێ،بچتـە، تـێ، هـێن زۆرەئـاو
(٠٢٦ مـەوجی خـوێن لای وی خـەیانی عەنبـەرە ژێـری دەریـا وشـکەلای وی یـەک سـەرە
(٠٢٧ وشـکی دەریـا دیـت فیرعـەون،کوێر بـوو بۆیـەبێ بـاک، ئـەو لـەنێو دەریـا، دەچـوو

هـەر کـەچۆ تێو،قـەعری دەریـا جێـی وی   چـاوی فیرعـەون،چۆن دەبینـێ، ڕێـی وی (۲۳۰۸)

چـــاو دەبـــێ بینا،کـــەدی دانـــایی ڕاز   چۆن دەبێ ئەحمەق دەگەڵ حەق هەمتـەراز (۲۳۰۹)

نەخسی ئەحمـەق سـەم لـەلای وی قەندەهەر   ڕێیـەدەنگی غـوول لـەلای ئـەو بـێ هونـەر (۲۳۱۰)

ئـەی فەلـەک تـۆ، تیـژ دەبی،ئـاخر زەمـان   مـۆ لـەتم دە، هـەر کـەمێک،بم دەئـەمان (۲۳۱۱)

خەنجـەری تیـژی، ئـەتۆ بـۆ گیانمـــان   ئێشـی ژەهـری ئێمـەتۆی، ئـەی بێ ئـەمان (۲۳۱۲)

فێربـەڕەحمی ئـەی فەلـەک لـەو کردگـار   قـەلبی مێـرو، مەیدەئازار،چەشـنی مـار (۲۳۱۳)

تـۆ بـەخاتر ئـەو کـە سـەی سـووڕانی تـۆ   هەربــەوە،چون ئــەودەدا، فــەرمانی تــۆ (۲۳۱۴)

جوورەکی دی خـوول بـدە، ڕەحمێـک بـەمن   پـێش ئـەوەی تـۆ هەڵقـەنی ڕیشـەم لـەبن (۲۳۱۵)

خـاتری ئەوکـەس بەئێمـەی دا وجــوود   ئـاوو خـاکی کـرد بۆمـا ن، تـارو پـوود (۲۳۱۶)

بیکـەخاتر خـوای کـەتۆی ساف چا دەکـرد   ئـەو لـەنێوتۆ، نـووری زۆر، پەیـدا دەکـرد (۲۳۱۷)

هێنــدەجوانی ڕادەگرتـی خـوای ئەجــەل   وای دەزانـێ دەهـری، تـۆ هـەر بووی ئـەزەل (۲۳۱۸)

خـوا شـوکر لـێن بـوو عـەیان ئاغـازی تـۆ   ئــــەنبیا کوتیــــان بەئێمـــەڕازی تـــۆ (۲۳۱۹)

قەسـری حـادیس چـاک دەناسـێ ئـادەمی   کـوا دەناسـێ عەنکـەبووت زۆ رو کـەمی؟ (۲۳۲۰)

کـەی دەزانـێ عـومری باغ،مێشـوولەکەی؟   ئـەو بـەهاران دێـت و دەمـرێ مـانگی دەی (۲۳۲۱)

کرمـی نێـو دار وەختـی بـوو سست و نـەفام   کـوا دەزانـێ،دار کەکـەی بـوو نـەو نـەمام؟ (۲۳۲۲)

گەربناسـێ کرمـی نێـو دار،ئەسـڵی دار   کرمـــــەزاهیر، عاقڵە،هـــــەم هووشـــــیار (۲۳۲۳)

عـەقڵ دەگـرێ زێـدەڕەنگی جـوور بـەجوور   چەشـنی جن،ئەوبوولـەوان ڕەنگـان بـەدوور (۲۳۲۴)

بـۆ مـەقام،جنن و، مەلـەک، نـا گـەن بـەوی   تـۆ مەگـەس بـاڵی، دەچـی بـۆ لای نـەوی (۲۳۲۵)

گـەرچی دەفـڕێ عـەقڵی تـۆ بـۆ جێـی بـەرز   دانەدەخوات،تـەیری تەقلیـدت لەعـــەرز (۲۳۲۶)

عیلمـــی تەقلیـــدی قـــەلادەی گیانمـــان   عاریـەت بـوو ئـەو لـەلامان ئـەی فـلان (۲۳۲۷)

عـەقڵی جـوزئی چونکەنایـەت هـیچ بـەکار   چاکەئێمــە،خۆن بکەینــە، شــێت و هــار (۲۳۲۸)

سـوودلەهەرچیت بێ، دەگـەڵ وی بگـرەکین   تـــۆ وەخـــۆ ژەهـــرو، برێژەئـــاوی ژیـــن (۲۳۲۹)

هـەرچی تـەعریفت بکـا، جـوێن پێـی بـدە   وام بــەموفلیس ســوودو مایــە،وێی بــدە (۲۳۳۰)

جێـی مەترسـیت تـۆ، بـوێ، نـەک ئێمـەنی   تـۆ بـەبێ شـەهرەت بـژی تـا بـی، خـەنی (۲۳۳۱)

عـەقڵی ئـاخر بینـی خـۆم کـرد ئیمتیحـان   من لەوەی پاش خۆ م دەکەم شێت و نەزان (۲۳۳۲)

**دەڵقەک بەعیللەتی ئیزدیواج دەگەڵ فاحیشەیەک لەئەربابی خۆی مەعزەرەتی خواست..**

| | |
|---|---|
| وای‌بەدەلقەک‌کوت شەویک،سەیدی‌ئەجەل | فاحیشێکت ویست ئەتۆ کردت عەجەل |
| تۆ دەبوو کوتبات بەمن تا کو،ئەمن | بۆ م بهینابای یەک پاکیزەژن |
| جوابی دا من، نۆ ژنم هیناوە، پاک | بوون بەقەحبەگشتیان، من چوومەخاک |
| ویستم ئێستا، قەحبەیەک بێ مەعریفەت | تا بزانم چۆن دەبێ ئەو عاقیبەت |
| عەقڵی خۆم کرد زۆرکەرەت من ئازموون | من دەچێنم بۆ یەجا،تۆ وی جنوون |

**وەقسەهینانی یەک نەفەر زانا کەخۆی لەشێتیەتی دابوو...**

**خولاسەی داستان...**

یەک نەفەر دەیکوت دەمهەوێ شەخسێکی زانا پەیدا بکەم تا دەبارەی مو شکیلاتی ژیانم دەگەڵ وی مەشوەرەت بکەم . کابرایەک پێیکوت .لەشاری ئێمەدا فەقەت یەک نەفەر عاقڵ و زانا هەیە..ئەویش خۆ ی لەشێتیەتی داوە، ئەگەر بت هەوێ ئەوی پەیدا کەی ئەلئان ئەو لەنێو منداڵان سواری دارێک بووە، ودەگەڵ منداڵان قوماران دەکا، ئەو نەفەرەچوو لەنێو منداڵان پەیدای کرد، بانگی کرد وپێیکوت چەند لەحزەیەک ئەسپەکەت بۆلای من بێنە، عاقڵی بەزاهیر شێت بۆ لای وی غاری دا، وکوتی زوو بەقسەکەت بڵێ، چیت دەوێ؟، ئەمن ناتوانم زۆر ڕا وەستم چونکەئەسپەکەم چەمووشە ولووشکان داوێ، کابرا پێیکوت دەمهەوێ لەو. مەحەڵلەیەژنێک بێنم بەنەزەری تۆ چ، جوورەژنێک بێنم کەموناسبی حاڵی من بێ؟ عاقڵی بەزاهیر شێت پێیکوت دەواقیع دا ژن دەدونیا دا سێ نەوعن، دوونەوعیان باعیسی ڕەنج و عەزاب و نارەحەتین،نەوعی سووەمیان وەک گەنجێکەپڕ لەسەروەت و شادیە، ئەو سێ نەوعەژنانەیەک نەو عیان کامیلەن دەئیختیاری تۆ دایەوهەمووچاکەیەکی بۆ تۆ یە.. نەوعی دووهەم تەنها نێوەی دەئیختیاری تۆ دایەونیوەکەی دی دەئیختیاری تۆ دانیە، ونەو عی سووەم بەئەندازەیەک لەتۆ دوورو جودایەهەردەڵەی هیچ عەلاقەیەکی بەتۆنیە..جا ئەوەجوابی پرسیارەکانت بیست بڕۆ وەدوای کاری خۆت کەوە.. چونکەڕەنگەئەسپەکەم لوشکت لێبداو بت خاتەعەرزی .. عاقڵی بەزاهیر شێت ئەو قسانەی کوت، وبەعەجەلەچۆوەبۆ نێو منداڵان ومەشغووڵی کایەو قوماران بوو، بەڵام کابرا سەر سام وموتەحەییرلەجێی خۆی ڕاوەستابوو ولەو قسانەهیچ حاڵی نەبوو،جا لەبەرئەوەوبانگی کرد و لەبەری پاڕاوەپێیکوت وەرەبزانم مەقسوودت لەو قسانەچ بوو؟ عاقڵی بەزاهیر شێت دوو بارەغاری دا بۆ لای وی وکوتی ئەوژنەی

کەکامیلەن دەئیختیاری تۆ دایەکچێکی باکرەیەکەباعیسی شادی وخۆشحاڵی دەبێ وئەو ژنەی کەفەقەت نیوەی دەئیختیاری تۆ دایە، بیوەژنێکەکەمنداڵی نیە. وئەوژنەی کەئەسلەن دەئیختیاری تۆ دانیەبیوەژنێکەکەلەمێردی پێشووی منداڵی هەیەچونکەبەخاتری ئەو منداڵەهەمیشەمێردی پێشووی وەبیر دێتەوەجا، ئەو قسانەت بیست، خۆت لا دەکەئەسپەکەم لوشکت لێنەدا .. ئەوەی کوت و دووبارەچۆ وەنێو منداڵان ئەوکابرایەدووبارەبانگی کرد.. ئەی عاقڵی زانا پرسیارێکی دیکەم هەیەجوابی ویش بدەوەهەتا بڕۆم .. عاقڵی بەزاهیر شێت کوتی زووکەپرسیارەکەت بڵێ،کابرا لێی پرسی.. ئەتۆ بەو هەموو عەقڵ و زانستەبۆچی ڕەفتاری منداڵانە ئەنجام دەدەی؟جوابی داوەئەوخوێریانە(دەسگای حکوومەتی وەخت) خەیاڵیان وابوو کەئەمن بکەنەقازی ئەو شارەئەمن زۆرم تەلاش کرد کەئەو کارەنەکەم،بەڵام دەستیان لێنەکێشامەوە. جا ئەمنیش هیچ عیلاجم نەما، غەیر ی ئەوەهەکەخۆم لەشێتیەتی بدەم تا دەحکوومەتی زاڵم دا، نەبمەقازی..

ـەک نەفەر ویستی بچێ لای عاقڵی — تا بەشووڕا موشکلی خۆی بەو بڵێ (٢٣٣٨)
ـەک نەفەرپێیکوت دەنێو ئەو شارەدا — عاقڵێکەخۆی لەشێت ێێتی دەدا (٢٣٣٩)
ـ:ک منالان ئەو لەقامیشێک سووار — توند و تۆڵ دێت و دەچێ دەڕوا بەغار (٢٣٤٠)
ـەو لەهۆش و زیرەکی دا بێ نەزیر — جێیەشاگردی بکەن شاەو، وەزیر (٢٣٤١)
ـەورەیی وی گیان دەدا کەڕرووبیان — خۆی لەنێو ئەو شێت یەتی دا کرد نیهان (٢٣٤٢)
ـاش مەزانەهەرچی شێتەوەک پەری — سەجدەبۆ گوێلکێ،مەبەوەک سامری (٢٣٤٣)
ـەروەلی هات وبەتۆی کوت ئاشکار — غەیب و ئەسرار، بێ حیساب و بێ ژمار (٢٣٤٤)
ـەت توانی تۆ بناسی ئەو ئەگەر — وەک یەکت کرد تۆ، لەپاک و پیس نەزەر (٢٣٤٥)
ـەو وەلی گەربێتەبن پەردەی جنوون — کوا دەناسی تۆ،ئەوی، نەت بێ،فنوون (٢٣٤٦)
ـودڵای کەی چاوی قەلبی خۆت ئەگەر — خوات لەدار و بەرد، دێتەبەنەزەر (٢٣٤٧)
جـاوی دڵ گەر ئاوەڵا بێ، چاوی وا — پێی دەبینرێ زۆرلەدۆستانی خودا (٢٣٤٨)
ـەولیا ئیجرا دەکەن فەرمانی حەق — سوود دەدەن بۆ هەرکەسێک بێ مستەحەق (٢٣٤٩)
ـەقڵ نانا سێت قەت زاتی وا — چونکەئەو هەر خۆی لەشێت ێێتی دەدا (٢٣٥٠)
ـەخسی بینا،گەر دزی،لەکوێر،ماڵ — کوا دەناسێ کوێر، دزی خۆی، ئەی هەواڵ؟ (٢٣٥١)
کێرکەنا نا سێ دزی خۆی،خۆ، چ کات — گەرچی عەمدەن دز، لەڕێ، خۆی لێبدات (٢٣٥٢)

سـەگ کـەهات و گرتـی لاقـی کـوێر، زوو  کـوا دەناسـێ کـوێر سـەگی دەڕڕەنـدەخوو؟[1]

**حەملەبردنی سەگ بۆ سەر کوێری گەدا..**

سـەگ هجـوومی بردەسـەر کوێرێـک گـەدا  شـێر لـەبۆ نێچیـر دەبـا، حەملـەی وەهـا
سـەگ لەسـەردەروێش دەکـا هـاوارو بانـگ  خـاکی پێـی دەروێـش کلـە،بۆ چـاوی مانـگ
هێندەسـەگ کـردی لەسـەر کـوێر وەلوەلـە  کوێر لـەبۆ سـەگ کردی تعـزیم ئـەو چەلـە
میـری ڕاوی، تـۆ دەکـەی شـێران شـکار  زۆر لـەمن زیـاتر ئەسـیرت کـرد هــەزار
گـەر لەبۆکـەر،کردی تـەعزیم ئەوحـەکیم  نـاعیلاج بوو،پێیـدەکوت ئەو،ئـەی کـەریم
نـاعیلاج پێیکـوت ئـەرێ ئـەی نێرەشـێر  گـەربخۆی مـن کـوا دەبـی تـۆ پـێم تێـر؟
دۆسـتی تـۆ دەگـرێ لەشـاخان گۆڕەخـەر  تـۆ لەکووچــەدەگری کـوێری بـێ زەرەر
دۆســـتەکانت ڕاوی گۆڕەخـــەر دەکـــەن  تـــۆ لەکووچـــەکوێر دەگری،زۆر،بەفـــەن
کـردی ڕاوی گۆڕەخـەر سـەی هووشـیار  سـەی نـەفام دەگرێـت،کوێری بـێ قـەرار
سـەگ کـەعیلمی فێـر ببێ،دەبـێ، نـەجات  ئەو لەجەنگەڵ چی حـەلاڵ بێ ڕاو دەکات
سـەگ کــەعالم بـێ دەبـێ زۆرهووشـیار  سـەگ کـەعارف بـێ دەبـێ ئەسحابی غـار
تێگەیشــت ســەگ کێیەســالاری شــکار  نـووری مــوفهیم،بێژەپێم ئــەی کردگــار
کــوێر کـەنای ناسـێ،لەبەر چـاوی نییــە  مەسـتی جەهلــەچی لەبــەر چـاوی نییــە
خـۆچ کوێرێـک وەک زەوی، بـێ چاونییــە  دوژمنــــی خۆشــــی دەناســـێ،خاو نییـــە
قـەدری موسـای گـرت و نـووری وی دەدی  گرتـی قـاڕوون چونکەدی،لـەوزۆر بـەدی
کەوتەلـەرزین تـا هـیلاک کـا، ئـەو،دەعی  ئەمری حـەق هـات،بۆی کـە(یاارض ابلعی)
ئاووخــــاک وباوونــــاری پرخــــڕۆش  هیچ نەزان لامان، لەلای حـەق زۆر،بەهۆش
چەشــنی خــاک وبــاوو ئــاوو نــار، نــین  تـا بناسـین وەک ئـە وان، خـواو مورسـەلین
لاجــەرەم (اشــفقن منهـــا ) گشـــتییان  ڕووحـــی حـــەیوان کـــاتێ کەوتەپشـــتیان
گشــتی کوتیــان ئێمــەبێزار، لەوحــەیات  چون دەگەڵ خـەڵکی دەژین،گەڵ حـەق مـەوات
ئــادەمی دوور بــێ لەعالــەم بــوو یــەتیم  لازمــەبۆ ئونسـی حــەق، قــەلبی ســەلیم
گەرکەسێک بدزێ لەکوێرێک جینس ومـاڵ  کـــوێر لـــەداخان دەس دەکاتە،ناڵــــەناڵ
تــا دەڵــێ بــەو، دز،کەمــەگری،دز مــنم  مــن دزی تـۆم زۆر دزێکــی پــڕ فــەنم

---

[1]- سەگ کەهات وگرتی کوێری خەرقەپۆش   کوا دەناسی کوێر،سەگی بێ عەقڵ وهۆش؟

کوا دەناسێ کوێر،کەکێ،لێی کرد دزی؟ چـون لـەچاوی،نوور نییەگەش یـاکزی (٢٣٧٧)
گرەئەو،توند گەر کوتی دز، هـەرمنم تـا دەڵێ ماڵـت لـەکام جێ و، قـوژبنم (٢٣٧٨)
جـ.فشـار بـۆدز، جیهـادی ئەکبـەرە تـا دەڵێ چـیم بـرد لـەو خـان و بـەرە (٢٣٧٩)
ئـەوکلی، چـاوی دزی، ئـەووەڵ، لـەتۆ گـەرکولێی وەربگری،نـوورت دێ لـەبۆ (٢٣٨٠)
گـەر دڵان دایـان لـەدەس عـیلم و حیکـەم قـەلبی عـارف زۆری تێـدا، خـۆ، نەکـەم[1] (٢٣٨١)
جـاووگوێ،بۆ کـوێر دڵان نایـەت بـەکار کـوا دەناسـن قـەت بـەوان، شـەیتانی هـار؟ (٢٣٨٢)
تـۆ لەئـەهلی دڵ تەڵـەب کەنـەک جـەماد وەک جـەمادن،کوێر دڵان،بـێ ئیعتیمـاد (٢٣٨٣)
هـ.تەلای ئـەو شـێت نـەما، بـۆ مەشـوەرەت موشـکلی مـن بێـژەپێم، بـێ مـەعزەرەت (٢٣٨٤)
بێـدەکوت ئێسـتا بـڕۆ دەر وازنییـە ئـەورۆ ڕۆژی زیکـرو باسـی ڕاز نییـە (٢٣٨٥)
گـەر مـەکان ڕێگـای هـەبا،لای لامـەکان چەشـنی شـێخان مـن دەبـا هـەمبا،دوکان (٢٣٨٦)

**دارۆغە دەیویست کە مەستی لایەعقەل بۆ زیندان بەرێ...**

**خولاسەی داستان...**

دارۆغەنیوەشەوێک مەستەکی دی کەلەقەراغ دیواری شاردا نوستبوو.دارۆغەبانگی کرد پێم بڵێ بـزانم چیـت خـواردووە؟ مەسـتەکەپێیکوت لەوشـتەکەدەگۆزەدایەخواردوومەتەوەدارۆغەپێیکوت دەگـۆزەداچ هەیـە؟ مەسـتەکەپێیکوت هەرئەوشـتەی کەخواردوومەتەوەدارۆغـەپێیکوت چیـت خواردۆتەوە؟ مەستەکەجوابی داوە،هـەر ئەوشتەی کەدەگۆزەدایەئـەو جـواب وسوئالەلەبەینی وان دووپات بۆوە،ولەئاکام دا دارۆغەسەر سام ما ونەی توانی شەراب خواردنی وی سابیت بکا،پاش فکر کردن پێیکو ت...( ئاەئاە) بکە تا لەبۆنی زاری حەقیقەتی لێ مەعلووم بێ،بەڵام مەستەکە لـە باتی( ئاەئاە) بکا(هوهو)ی کـرد دارۆغـەپێیکوت مـن بـەتۆ دەڵێم (ئاەئـاە) بکەئـەتۆ بـۆچی( هـو هـو) دەکەی؟ لەئاخردا بەمەستەکەی دەستووردا کەوەرەبچینەزیندان، مەستەکەپێیکوت ئەگەر تـوانی بام بەڕێگا دا بڕۆم دەچوومەوەماڵی خۆم، بۆ بچمەزیندان؟..

دی لـەبن دیـواری شـار دارۆغەشـەو مەسـتەکی مـەی،بێ خەبـەر وا، چۆتەخـەو (٢٣٨٧)
پێیدەکوت چیت خوارد کەنوستی تۆ لەسارد؟ جـوابی داوەلـەو شـتەی گـۆزەم دەخـوارد (٢٣٨٨)
گـۆزەچی تێدایـەپێیکوت ئـەو چەلـە؟ جـوابی دا، ئەوهـەی کـەخواردم بـێ پەلـە (٢٣٨٩)

---

[1]- گەر کوحیکمەت هیچ دەنێو دڵ ،دانەبێ قەلبی عارف ،زۆری تێدا، با ،نەبێ

پێیــدەکوت ئەوهــەی کەخواردووتەچییــە؟
جــوابی دا ئــەو هــەی، دەگۆزەمەخفییــە
هــەردەبوون تیکــرار ئــەوجواب و ســوئال
موحتەســیب نــەی ما،تــەوانی قیــل وقــال[1]
موحتەســیب پێیکــوت بڵــێ تــۆ (ئاەئــاه)
ئــەو بــەڵام (هوهــو) ی دەکــرد بــێ ئیشــتیباه
پێیدەکوت ئاهم دەکوت هوت کوت بــەغار
جــوابی دا،شــادیم هەیــە،تۆش غــەم بــەبار
ئــاه، لەبــــەردەردو غــــەم و بێدادیـــــە
هوهــــویی مەســــتان، بــــەڵام، ئــــی شــــادیە
موحتەســـیب پێیکـــوت دەهەســـتەزووکەتۆ
بــەس ببێژەتــۆ لــەبۆ مــن فــەزڵی خــۆ
مەســـتەپێیکوت لێــک بــەدوورین لام بــڕۆ
پێیــدەکوت مەســتی وەرە، زینــدان ئــەتۆ
لێم گەڕێ ئەی موحتەسیب من نیمەحاڵ
ڕەهنــی نــادا موفلیســی ڕوو تــو ڕەجــاڵ
گــــەرکوتوانیبام لــــەڕێگا مــــن بــــڕۆم
بۆ دەبــووم وا، مــن دەچــووم بــۆ مــاڵی خــۆم
عـــەقڵ و ئیمکـــانم هەبایـــە،من ئەگـــەر
چەشنی شێخا ن دەمبوو دووکان خۆ م لەسەر

**پرسیار کردن بۆ جاری دووهەم لەو شەخسە مەزنە تا حاڵی وی ڕوونتر بێ..**

پرسیار کــەر بانگی کرد هەریــەک کــەڕەت
بێنــەلام ئــەی دار ســووا ر تــۆ ئەســپەکەت
هاتــەلای وی پێیــدەکوت تــۆ، بێــژەزوو
ئەســپەکەم زۆر سەرکەشــەزۆر تونــد خــوو
زووکــــەبیلێ تــــاکو لووشــــکت، لێنــــەدا
ئاشــــکرا بیکەســــوئالی خــــۆت، ئــــەدا
چــون لــەبۆ ئیزهــاری ڕاز، نــەی بــوو مــەجال
هەربەشــۆخی لێیــدەکرد ئــەو، وا، ســـوئال
دەمهــەوێ بێــنم ئــەمن لــەو کووچــە ژن
کــەس دەناســی تــۆ کــەلایق بــێ بــەمن؟
پێیدەکوت سێ جوورەژن هــەن بێ گومان
دووعەزابن،یــەک بــەڵام گــەنجی ڕەوان
ژن هــەمووی بــۆ تۆیە،گــەربێ، نــەوعی وا
نەو عــەکیش نیوەی لەبۆت، نیوەش جودا
نــەوعی ســێهەم بــۆ تــۆ قــەت نابێتــەژن
ئێستەبیســتت، دووربــەلێم، ڕۆیــم ئــەمن
تــا کوئەســپم هــیچ لــوو.شــکت لێنــەدا
تــۆ لەســەر عــەردی کەوی،هــەربێ ســەدا
چــۆ وەشــێخ بــۆ نێــو منــاڵان هەربــەغار
کــردی کــابرا بــانگی شــێخی دار ســووار
بێــــژەپێم تەفســــیری ئــــەو گوفتــــارەتۆ
مەقســەدی خــۆت بێــژەپێم، ئــەوجارەتۆ
هاتــەلای پێیکــوت کــەبێنی،کیژی خــاس
گشــتی بــۆ تۆیــە، لەغــەم،دەت بــێ خــەڵاس
بیوەژن،نیــوەی لــەبۆت نــەی بــێ منــاڵ
گــــەر منــــاڵی بێت،نــــابێ،بۆت بــــەماڵ
گەرلــەمێردی ئــەووەڵی هــەیبێ منــاڵ
هەرلــــەبیرو فکــــری ویــــدا، ڕۆژو ســــاڵ

---

[1]- نەیدەما دارۆغە، توانای قیل و قال (مصرع دوم)

ـۆور بەلوشکت لێنەدا تا، ئەسپەکەم　　تا نەگا، پێت ئێش و ئازار زۆ رو کەم (۲۴۱۴)
ـایو،هویی کرد شێخ و،توند رۆی　　بانگی مندالانی کرد بۆ لایی خۆی (۲۴۱۵)
ـەو چەلەش بانگی دەکرد سائیل، وەرە　　یەک سوئالم ماوەبەندت گەوهەرە (۲۴۱۶)
ـەلای پێیکوت بلێ زوو، چیت دەوێ　　چونکەمندال مونتەزیر ماون لەوێ (۲۴۱۷)
ـیکوت ئەی شا، بەوهەمووعەقڵ وئەدەب　　خۆت لەشێتی داوەبۆچی؟ ئەی عەجەب (۲۴۱۸)
ـەیان زیاترلەعەقلی کوللی تۆ　　تۆ هەتاوی، ون لەژێر شێتی لەبۆ؟ (۲۴۱۹)
ـی جەواب، حاکم وەهای دەستوور دەدا　　بیمەقازی، تا هەبم، لەو شارەدا (۲۴۲۰)
ـیکوتم نابێ، نەبێ، وا،چا نییە　　چونکەوەک تۆ هیچ کەسێک زانا نییە (۲۴۲۱)
ـقەزاوەت هەردەبێ تۆ بی و، بەس　　چونکەزانا وەک تۆ نابێتن، چ کەس (۲۴۲۲)
ـون بەشەرعیش نارەوایەنارەوا　　غەیری زانابۆن ببێتەپێشەوا (۲۴۲۳)
ـبەگێژو شێت و سەر گەردان مام　　من لەباتین هەروەکوو پێشووم، بەلام (۲۴۲۴)
ـەقلی من گەنجەو،ئەمن وێرانەمە　　گەنج ئەگەر زاهیر بکەم دێوانەمە (۲۴۲۵)
ـکەسەی کەشێت نەبوو، دێوانەئەو　　زاڵمی دیت و، نەچۆ ژێر خانەئەو[1] (۲۴۲۶)
ـێشی من جەوهەرەخۆ نەک عەرەز　　نامهەوێ پەیدا بکەم بەو هەر غەرەز (۲۴۲۷)
ـعدەنی قەندم، نەیەستان بۆ شەکەر　　شین دەبێ،نەی لێم، لەویم خۆراکەهەر (۲۴۲۸)
ـمی تەقلیدی بەوەی بێژن ئەگەر　　نەفرەتی گوێ گر،لەبۆت بێ دەردەسەر (۲۴۲۹)
ـی بۆ ڕۆژی نەوەک بۆڕەوشەنی　　وایەوەک ئەو عیلمی بۆ دونیای دەنی (۲۴۳۰)
ـی بۆ شوهرەت دەوێ لای عام و خاس　　نەک لەبەر وەی تا لەعالەم بێ خەلاس (۲۴۳۱)
ـشنی مشکێک کون دەکا دەو رو بەری　　رای دەدا نوور،کاتێ دیتی نوورسەری (۲۴۳۲)
ـنکەنەی بووئەو لەدەشتی نوور،چ ڕێ　　زولمەتی کرد بۆ تەلاشی خۆی، بەجێ (۲۴۳۳)
ـرخوداوەند بەو بداتن باڵ و پەڕ　　مشکی چی؟ ئەو وەک مەلان دەڕواتە سەر (۲۴۳۴)
ـێنەوێ گەر باڵ، ماوە ژێری خاک　　قەت کە ناگا ئەو بەجێی بالاو و پاک (۲۴۳۵)
ـی قیل و قال هەر بێ گیان دەبێ　　عاشقی ڕوویی خەریداران دەبێ (۲۴۳۶)
ـی دانیش گەرچی خۆشە، ئەو بەلام　　بێ خەریدار، مرد و ڕۆیشت ئەو تەمام (۲۴۳۷)
ـتەری من چون خودایە ئەی برا　　من دەبا، بۆسەر، کە،(اللّهاشتری) (۲۴۳۸)
خوێن بەهای گیانم، جەمالی بێ زەواڵ　　خوێن بەهای خۆم،من دەخۆم کەسبی حەلال (۲۴۳۹)

---

- دی عەسەس ئەمما نەچۆ ژێر خانەئەو (مصرع دوم)

| | |
|---|---|
| دوور کەوەتۆ، لەو خەریداری نەدار | ناکرێت یەک مستەگڵ،وەک کردگار |
| مەکرەگڵ، نەت وێت گڵ،قەت گڵ مەخۆ | ڕەنگ زەردەئەو کەسەی گڵ خۆرە،خۆ |
| دڵ بخۆ تا دائیمەن تۆ بی جەوان | ڕووت بەنووری حەق جووان، وەک ئەرغەوان |
| تیم سەزاواری عەتای وا، من، مەگەر | بێ خەفی لوتفت لەبۆم،ئەی خوای لەسەر |
| کۆمەکن کە، تا لەنەفسن بین، نەجات | پەردەلابە،ئەی لەتۆ ژین ومەمات |
| تۆ نەجاتن دە، لەنەفسی بەد سریشت | کاردەکەی وی، تاکوئێسکانمان گەیشت |
| چەشنی ئێمەی بێ نەوای نێو بەندی سەخت | کەی دەکا ئازاد، شای بێ تاج و تەخت؟ |
| قفڵی وا سەخت وگران ئەی خوایی ڕاز | غەیری فەزڵت کێ، هەیەبیکات واز؟ |
| ڕوون لەتۆیە، هەرئەتۆ ڕووگەی لەبۆن | چونکەتۆ نیزیکتری بۆ مان، لەخۆن |
| بەخششی تۆ یە، دوعاو پاڕانەوەن | بۆ یەجێی نار،بوو بەگوڵزار و چەمەن |
| کێ بەئینسانی دەدا، عەقڵ و شعوور؟ | غەیری زاتی بێ نەزیری بێ قسوور |
| چاو لەنووری پیوی چاو کە، ئەی جەوان | مەو جی نووری وی، دەگاتەئاسمان |
| پارەگۆشتێکی کەپێیکوترا زەبان | هەر وەکوو سێڵاو،لەوی حیکمەت ڕەوان |
| هاتەلای یەک کون، کەناوی بوو،بەگۆش | تا کوباغی گیان، میوەی ویش هۆش |
| شاهڕاهی باغی گیانمان،شەرعی وی | باغ و بێستانانی دونیا،فەرعی وی |
| ئەسڵ و سەرچاوەی هەموو خۆشیانەهۆش | ( تحتها الانهارتجری ) بگرەگۆش |

**تەواو بوونی نەسیحەتی پێغەمبەر(ص) بۆ نەخۆش ..**

| | |
|---|---|
| وا یدەکوت ئەحمەد، بەڕەنجوورو نەخۆش | بۆ عەیادەت کاتێ دیتی جێی پەرۆش |
| تۆ لەخۆت، دادەی، دوعات کردووەمەگەر | یانەژەهرت خواردووە،وات هات،بەسەر؟ |
| بێنەبیرت ئەو دوعای کردووتە،تۆ | وەختی ڕەنجت دی لەمەکری نەفسی خۆ |
| لوتفی تۆ شامیل بەحاڵم بێ ئەگەر | من وەبیر م دێتەوە، ئەی تاجی سەر |
| لەو حزووری نوور بەخشی مستەفا | ئەو، وەبیری هاتەوە، عەینی دوعا |
| چون لەنووری حەققە، لوتفی ئەحمەدی | ئەو وەبیری هاتەوە،سەد دەرسەدی |
| لەو دەریچەهاتەدەر، یەک دانەنوور | حەقق و باتڵ، لێک جودان، بەو، بێ قسوور |
| وای بەئەحمەد کوت، سەحابی پڕ بەئێش | هاتەبیرم ئەو دوعای کردم لەپێش |
| چونکەزۆرە، من گوناهم،بێ حیساو | دەس بەهەر پنجێکی دەگرێ، غەرقی ئاو |

ـەتۆم مـن، پێگەیشت، تـرس و وەعیـد — بــۆ گوناهکـــاران عـــەزابی زۆ رشـــەدید (٢٤٦٥)
ـەرینشـان بـووم و مـەحزوون و غـەمین — دەرکـی زینـدان بەسـترا، لـێم ئـەی ئـەمین (٢٤٦٦)
ـەمـا، مـن هـیچ سـەبرو رێـی فیـرار — یـــا ئومێـــدی تۆبـــە، بـــۆ لای کردگـــار (٢٤٦٧)
ـکو وهارووت و،وەک مارووت لەغەم — ئاهو،ناڵــــەم بـــێ، لەحــــەق داوا، بکــــەم (٢٤٦٨)
ـیــان هـــارووت مـــارووت ئاشـــکار — هەرلەترســـــان،چاهی بابیـــــل، ئیختیـــــار (٢٤٦٩)
ـبیـــــنن لێرەرەنجـــــی ئـــــاخری — عــەقڵ و هۆشـیان زۆر،وەکـوو جادووگـەری (٢٤٧٠)
ـن کـرد چاکیـان کـرد نـەک هەڵـە — رەنجــی ئاخر،زیـــاد لـــەرەنجی دووکەڵـــە (٢٤٧١)
ـی حیسابەوەسـفی رەنجـی ئـەو جیهـان — رەنجـی دونیـا سـەهلەلای وی بـێ گومـان (٢٤٧٢)
ـی.بـەحاڵی ئـەو کەسـەی کـردی جیهاد — ئـــەو بـــەدەن ئـــازار دەدا،ئەمما،بـــەداد (٢٤٧٣)
ـــ عـــــەزابی ئاخرەت،ئـــــەو لا بنـــــێ — رەنجـی تاعـەت ئـەو لەسـەر خـۆ، دا بنـێ (٢٤٧٤)
ـجـی والـەم کـرد، لەحـەق داوا، ئـەمن — رەنجـی دونیـای دی نـەبینم، تـا، ئـەمن (٢٤٧٥)
ـ کوراحـــەت بـــم لـــەدونیای دیکـــەدا — دەرکـــــی حــــــەققم،وا، بەشـــــیددەت،لێدەدا (٢٤٧٦)
ـ نـە خۆشـی، وا،لـەبۆ لای مـن دەهـات — راحـەتی مـن کەوتـە، نێـو دەریـای مـەمات (٢٤٧٧)
ـ ـەزیکر و،ویـردی خـۆم، زۆر دوور مـام — مـن لـەخۆ م و، بـاش و،بەد،مـەهجوور مـام (٢٤٧٨)
ـر کـو نـــەم دیبایەئێســـتا،ڕوویی تـــۆ — ئـەی موبـارەک زات و،خوڵـق و، خـوویی تـۆ (٢٤٧٩)
ـت دەبـوو دەپسـا لـەمن جا،بەنـدی ژیـن — لـوتفی زۆرت بـوو دەگـەڵ ئـەمنی غـەمین (٢٤٨٠)
ـ:کوت ئەحمـەد، دوعـای وا قـەت مەکـە — بەنـدی ژینـی خـۆت بـەهیچی لـەت مەکـە (٢٤٨١)
ـوانی توانائیت،ئـــەی مێرووییـــی، زار؟ — کێـوی وا سـەنگین،لەتۆ کـا، خـوا، بـەبار (٢٤٨٢)
ـێ جەواب، ئەی شاهی من، ئەی تاجی سەر — تـا زەناکـەم مـن چ کارێـک، بـێ خەبـەر (٢٤٨٣)
ـێ جیهانـە، تیهـە، تـۆش مووسا ی زەمـان — جورمە، باعیس، بۆ مە، نێو، ئـەو تیهـە، مـان (٢٤٨٤)
ـ ــەمێژ ســـاڵەلەنێو ئـــەو ڕێگـــەداین — ئێستە هـەر وەک ئـەووەڵی، یەخسیر، ماین (٢٤٨٥)
ـــەردڵی مووســـا لەئێمـــە، بـــێ ڕەزا — لـێن دەبـێ مـەعلووم، تیـە، ڕێ و، ئینتیهـا (٢٤٨٦)
ـەرەزای مووســـا نـــەبا،لیمان، چ کـــات — چـــۆن لەئاســـمانان،غەزامان،بۆ دەهـــات؟ (٢٤٨٧)
ـۆن لەبـەر، جـاری دەبـوو کانیـاوی جـوان؟ — چـــۆن لەســـەحرا،گیانمان،دەبیبوو ئـــەمان؟ (٢٤٨٨)
ـکـەئاگر بـۆن دەهـات لـەجیاتی نـان — ئـاگری تێبـەر دەبـوو لـێن، جیسـم وگیـان (٢٤٨٩)
ـکـەدوو دڵ بـوو کـەلیم بـۆ کـاری، مـە — جـار دەبـۆ دوژمـن لـەبۆن، جـار یـاری مـە (٢٤٩٠)
ـەهری وی ئـاگر دەماڵمـا ن بــەر دەدا — حیلمـی وی دەگرێـت پێشـی هـەر بـەڵا (٢٤٩١)

قەهرو خەشمت،چۆن دەبێتەسەبر و حیلم؟ خـۆ لـەلوتفت دوورنییە،ئـەی شـاری عـیلم (٤٩٩٢)
مـەدحی ئەشـخاس ڕوو بـەڕوو، زۆر، نـاڕەوا بۆیــە، زیکــرم کــرد مووســا،من وەهــا (٤٩٩٣)
کـوا دەنـا،ڕازی دەبـێ مووسـا، کـە، مـن[1] زیکری کەس کەم،من لەلات، ئی پیاووژن؟ (٤٩٩٤)
عەهـدو پـەیمانمان شـکاند،چەن جار،هـەزار عەهـدی تـۆ ئـەمما وەکـوو کێـو بـەر قـەرار (٤٩٩٥)
عەهــدی ئێمــە(کـا)، زەلیلـی بایــە، ئــەو عەهدی تۆ سابیت وەکوو کێو، وایە، ئـەو (٤٩٩٦)
گشـت لـەتۆ دا وا دەکـەین، ئـەی کردگـار بــەر قــەرار بــێ حــاڵی ئێمە،بەرقــەرار (٤٩٩٧)
خۆن،بەڕیسوا دیـوەزۆر، ئـەی شـای جیهـان زێــدەتر تــۆ هــیچ مــەمان کــەئیمتیحان (٤٩٩٨)
تــا نــەبن ئاشــکار گونــا هــی دیکــەمان ئــەی خــودایی میهرەبــان و موســتەعان (٤٩٩٩)
بـێ نیهایـەت تـۆ هەتـە، جـوانی و کـەماڵ ئێمەئــــەمما،وا، لــــەگومڕاهین شــــەلاڵ (٥٠٠٠)
بێ حـەدی خـۆت دابنـێ تـۆ ئـەی کـەریم سـەرکەجی بێ ئینتیهای یەک لۆچ لـەئیم (٥٠٠١)
لـەو کراسـەی ئێمـەبوون یـەک تـار، مـا شـارەیی بـووین ئێمـە، یـەک دیـوار، مـا (٥٠٠٢)
ئـەو کەمـەی عـومرن کەما،ئـەی خوایی داد بــاش بکەتا،بــەس ببێ،شــەیتان، شــاد (٥٠٠٣)
هــەر بــەخاتر لــوتفی خۆتەوا،دەکــەی ڕێ نمــــوونی ناکەســــی گومڕا،دەکــــەی (٥٠٠٤)
قودرەتــت زاهیــر کــەکرد،ڕەحمێ بکــە ئـەی لەئینسـان دایە،ڕەحمەت،یـەک یەکـە (٥٠٠٥)
گــەردوعامان قــەهری تــۆ زیــاتر دەکــا فێرکەئێمــەچۆن دوعاکــەین، ئــەی خــودا (٥٠٠٦)
وەک لەجەننـەت ئادەمـت، تـۆ خسـتەدەر ڕجعــەتت دا، تـا لــەدێو، نـەی بـێ، زەرەر (٥٠٠٧)
کتیــەدێو؟، زیــاتر لــەئادەم، بێــت ئــەو چۆن بەرەندەی بازی شەترەنج، پێت، ئەو؟ (٥٠٠٨)
فێـڵ هـەموویان بـوون لـەبۆ ئـا دەم، بەسـوود لەعن و نـەفرین،بوون هـەموویان،بۆ حەسوود (٥٠٠٩)
ئـەو لـەدوو سـەت کایـە،دیتی یـەک فەقـەت کۆ لەکەی ماڵێی،بـەدەس خۆی کرد لـەت (٥٠١٠)
خەرمــــەنی خــــەڵکی بــــەعام ئــــاگردەدا ئــــــاگری بۆخەرمــــــەنی وی برد،بــــــا (٥٠١١)
لەعنەتی حەق هەردوو چاوی وی دەبەست فێڵـی بـۆ دوژمـن دەدی، شـەیتانی پەسـت (٥٠١٢)
لەعنـەتی حـەق یـەعنی ئەو کـەج بین،دەکا حاسـید وخودخـواەو، هـەم پـڕ کـین دەکـا (٥٠١٣)
تـا بزانـێ شەخسـی بـەد کـردار و پـیس عاقیبـەت ئـەو، هـەر بـەدی دێـتن لـەکیس (٥٠١٤)
فێڵـی شــەترەنجی گــەلێک کــرد ئــاوەژوو عاقیبەئــەمما فەقــەت ئــەو مــات دەبــوو (٥٠١٥)

---

[1] - خۆ دەنا ڕازی نییەمووسا کە، من (مصرع اول)

گـەر ببینـێ خـۆی بـەبێ قـەد رو ڕەواج | ئێشـی ناسـۆری ببینـێ بـێ عـیلاج (٢٥١٦)
ێتنـی وا،دەردی ژوور پەیـدا دەکـا | دەردی ژووریش، شەخسی وەسڵی خوا دەکا (٢٥١٧)
ـی زان، تـا کـاتێ،بۆ دایکـان نییـە | ڕێگـەبۆ بـوونی منـاڵ، ئیمکـان نییـە (٢٥١٨)
حێـی ئەمانەقەلبـە، قـەلبیش حامیلـە | پەنـدو وەعزیش،هەربەچەشـنی قابیلـە (٢٥١٩)
بێـەبێژ یـت کـەژن، ژانـی، نییـە | یـانی ژن،هێشـتا، دەمـی زانی،نییـە (٢٥٢٠)
گرەئـەو کـەس کـەهیچ دەردی نییـە | گـەر (انـا الحـق) ئـەو بڵێ،مـەردی نییـە (٢٥٢١)
ـەو (انـا) ی کـوترا بـەبێ کـات، لەعنەتـە | ئـەو (انـا) ی کوترا،بەمـەو قیـع، ڕەحمەتـە (٢٥٢٢)
ـەو (انا) ی مەنسوور کوتی هـەر ڕەحمەتە | ئـەو (انـا)ی فیرعـەون، ئەمما،نەقمەتـە (٢٥٢٣)
ـەیر،بخوێنێت،بێ مـەو قیـع ئەگـەر | زۆر،بـەزوویی، تـۆ لـەوی بپسێنەسـەر (٢٥٢٤)
ـەرپسـان یـانی بکـووژی نەفسـی خـۆت | نەت هەوێ، چی نەفسی تۆ، ویستی لەبۆت (٢٥٢٥)
ێک لەعـەقرەب ژەهرەکـەی تـو، لابـەری | تـا لەکوشـتن ئـەو سـەلامەت بێ، سـەری (٢٥٢٦)
ەغـەنی یـەک یـەک ددانـی تیـژی مـار | تـا نـەجاتی بـێ لـەزەربی بـەرد و دار (٢٥٢٧)
ـوتفی پیرەقـاتڵی نەفسـی بـەدە | بگرەتونـد، دامێنـی وی قـەت بـەر مـەدە (٢٥٢٨)
ـونفی حەققەگـەر تـۆ بگری،ئـەو قـەوی | قـووەتی تـۆ چەنـد ەزۆر بـێ، دێ، لـەوی (٢٥٢٩)
ـا رمیـت اذ رمیـت)ەی، کـوت خـودا | هـەرچی پیر،بـی کـا، خـودا دەسـتوور دەدا (٢٥٣٠)
ـەر خودایـە دەسـتگیرە هـەم سـەبوور | جێـی ئومێـدی ئـارەزووی نیزیـک و دوور (٢٥٣١)
ـەر دەرەنگ هات لوتفی وی بۆ تۆچ غەم | هـەر کـەهات نـامێنێ بۆت، غـەم زۆروکـەم (٢٥٢٣)
ـحمـەتی وی دەگـرێ دەسـتی تـۆ وەهـا | لەحزەیـەک ناکا،لـەخۆی ئـەو،تۆ جـودا (٢٥٣٣)
ـەر ئـەتۆ بـت وێـت شـەرحی وەسـڵی،وا | چـاک نـەزەر کـە، تۆ،لەسوورەی، (والضحی ) (٢٥٣٤)
ـەر بڵـەی تـۆچی بـەدی بـێ، ئـی وییـە | ئـەو هـەهیچکات نەفسـی فـەزڵی وی نییـە (٢٥٣٥)
ـەوڕەیی سـابیت دەکـا بـۆ زولجـەلال | خۆ بـەدی وا، بۆت بڵـەم بـا، یـەک میسـال (٢٥٣٦)
ـەک نەفـەر نـەققاش کێشـای،دووعەدەد | نەقشەکی جوان،نەقشەکیش زۆر پیس وبەد (٢٥٣٧)
ـەقشـی کێشا هەم لەیووسـوف هەم لەحۆر | هـەم لـەعیفریت، هـەروەها شـەیتانی کـۆر (٢٥٣٨)
ـەقشی یوسو ف جوان و، شەیتان وا لـەپیس | یـانی نـەققاش ماهیرە،زانـا، نـەفیس (٢٥٣٩)
ـووڕەتی نـا حـەز، وەهـا نیشـان دەدا | ناحـەزی زۆر، بـەو نیشـان، ئینسـان دەدا (٢٥٤٠)
ـا کـەماڵی فـەزلی وی، پەیـدا ببـێ | مـونکیری زانسـتی وی، ڕیسـوا ببـێ (٢٥٤١)
ـەقشـی پـیس گـەر پـیس نەکێشێ،ناقیسـە | بـۆ یـە، مـەخلووق کـافرە، هـەم موخلیسـە (٢٥٤٢)

کفروئیمـــــان بۆیەهـــــەردوو شــــاهیدن بــۆ خوداوەنــد هــەردوو دائــیم ســاجیدن (٢٥٤٣)
خــۆ بــەڵام مــوئمین بەڕەغبــەت ساجیدە بـــۆ ڕەزای زاتـــی خوداوەنـــد قاســـیدە (٢٥٤٤)
زۆر بـــەئیکراه،خوا پەرەســـت،کافر بـــەڵام قــەت رەزای یــەزدان، نــەبوو،بۆ وی مــەرام (٢٥٤٥)
دێ قــەڵای شــا، یــەک نەفــەر ئاباد،دەکــا خـــۆی ئـــەمیر و حـــاکمی وێ،یاد،دەکـــا (٢٥٤٦)
یاغییەئـــەو، چـــون قـــەڵای داوا دەکـــا ئــەو قــەڵا، رووی،عاقیبــەت، دەو شــا دەکــا (٢٥٤٧)
مـــوئمین ئەمما،گـــەر قـــەڵا، ئـــاوا دەکـــا نــەک لەبــەر خــۆی بــەل بــەخاتر،خوا دەکــا (٢٥٤٨)
ناحـــەزی جـــا، ڕوو دەکاتـــەخوای ســـەمەد تۆی لەدەستت دێ،کەچاکەی، چاک و بەد (٢٥٤٩)
جــوانی ئــەمما،وا دەڵێ،ئــەی شــای جــەماڵ مـــن لەعـــەیبان پـــاک کەوە،بمبێ،کـــەماڵ (٢٥٥٠)

**وەسیەت کردنی پێغەمبەر(ص) بۆ ئەو نەخۆشە فێری دوعا کردن..**

وای بـــەبیمار کـــوت ڕەســـوولی مســـتەفا بێژەبــۆم ئاســان کــە، موشــکیل، ئــەی خــودا (٢٥٥١)
پــێن عــەتا کــە، چاک،لــەدونیای زاهیــری پـــێن عەتاکە،چاک،لـــەدونیا ئـــاخیری (٢٥٥٢)
ڕێگــەمان تــۆ پــڕ لــەگوڵ کــە، ئــەی لــەتیف مــەنزڵ و مەقسوودمان تۆی، ئەی شــەریف (٢٥٥٣)
ڕۆژی مەحشــەربانگ دەکا،موئمین،مەڵــەک ڕێــی جەهەننــەم، بۆهەموومان،موشــتەرەک (٢٥٥٤)
بێرەدادێن،کــــــــافران و مــــــــوئمنین دووکـــەڵ و ئاگر،ئـــەدی،بۆ دیـــار نـــین؟ (٢٥٥٥)
هـــا، بەهەشـــت و، بارەگـــاو،جێی ئیمـــەنی کـوانێ ڕێگـای پەسـت و نـاخۆش و دەنـی؟ (٢٥٥٦)
جـواب دەدا جـا، بەو،فریشـتەی زۆر ئـەمین تـۆ فـڵان جێـت دی، بـەباغی سـەو زو شـین (٢٥٥٧)
دووزەخ ئــەو بــووجێی عــەزابی دەردنــاک بـۆوە، ئـەمما، بـوو بـەباغێک جـوان و پـاک (٢٥٥٨)
چونکەنەفســی دووزەخــی پڕقــەهرو کــین فیتنەجۆ،هـــەم، ماجـــەڕا جـــۆ، ئـــاگرین (٢٥٥٩)
زۆر تـــەلاش و کـــرد، کـــرِدو باســـەفا ئـــاگرو خـــامووش دەکـــرد هـــەربۆخودا (٢٥٦٠)
ئـــاگری شـــەهوەت کەشـــوعلەی لێـــدەدا بــوو بەتــەقوای جــوان و، نــووری ئیهتیــدا (٢٥٦١)
ئـاگری کـین دیتــی، ئێــوە، بــوو، بــەحیلم زوڵمـەتی جـەهل، دیتـی ئێـوە، بـوو بـەعیلم (٢٥٦٢)
ئـاگری حیرسـیش، بەئیسـار، بـوو بــەدەل ئـەو حەسـوودی خار،بـەگوڵزار، بـوو بـەدەل (٢٥٦٣)
چونکـــەئێوەئاگری، بووتـــا ن لــــەجۆش هەر بەخاتر، خوا بوو کردوو، زوو، خەمۆش (٢٥٦٤)
نەفســـی نـــاری و،کردەباغێک،باســـەفا جـــا، لەوێـــدا، چانـــدتان، تـــۆ وی،وەفـــا (٢٥٦٥)
بولبــو لانــی زیکــرو تەســبیح، نێــو بــاغ خۆش دەخوێنن نێو چەمەن، جۆگەش، قەراغ (٢٥٦٦)
دەعـــوەتی داعـــی خـــوداو، لاوانـــدەوە دووزەخـــی نـــەفس و، بـــەئاو کووژانـــدەوە (٢٥٦٧)

دووزەخی ئێمە، لەبۆتان والەیە ... سەو زو شین و، پڕ گوڵ و پڕ لا لەیە (٢٥٦٨)

جێی لەبۆ ئیحسان و چاکە، بۆ، جەزا؟ ... لوتف و پاداشی گەلێک زۆری خودا (٢٥٦٩)

ئێوە نەو کوت ئێمەقوربانی خوداین؟ ... لای سیفاتی خوا لەهەستی هەر جوداین؟ (٢٥٧٠)

گەرخەراباتی، و یا دێوانەیین ... مەستی ئەوساقی و،ئەو پەیمانەیین (٢٥٧١)

هەر بەئەمرو حوکمی وی سەر، دا دەنێین ... گیان گرەو،بۆوی، نەگەوهەر، دا دەنێین (٢٥٧٢)

تا هەبێ بۆمان خەیاڵی وەسڵی یار ... بەندەگی هەم گیان فیدایی، بۆ مەکار[1] (٢٥٧٣)

حیبەکی شەمعی بەلای لێ هەڵکرا ... گیانی عاشق، سەت هەزار سووتاندرا (٢٥٧٤)

عاشقانێکی دەداخڵ خانەنە ... ڕوویی یار شەمعە، ئەوان پەروانەنە (٢٥٧٥)

دووکەجێیەک، ئەی دڵە، ڕوون، بێ گرێ ... بۆ بەلایان ئەو لەبۆ تۆ وەک زرێ (٢٥٧٦)

جێت لەنێو گیانان دەبێ، بێ دەرد و، وەی ... تا لەبادەت پڕ بکەن،وەک جامی مەی (٢٥٧٧)

گەردجێگەت، تۆ لەنێوان گیانی وان ... چەشنی مانگ با،جێت ببێتەئاسمان (٢٥٧٨)

وەک عوتارید،دەفتەری دڵ واز دەکەن ... تۆ خەبەر دار، زۆر لەسیرڕ و، ڕاز دەکەن (٢٥٧٩)

خۆت نیشان دە،دەر بەدەر، لای خزم و کەس ... تۆ کەناقیس بی، بەکامیل، بگرەدەس (٢٥٨٠)

حوزء، بۆچی خۆی، لەکول، ئەو، لادەدا ... لای موخالیف،جا، دەچێ، خۆی با دەدا (٢٥٨١)

جۆلەجینسی،چۆن لەنەو عان،خۆی نوواند ... غەیب،چۆن زاهیر دەبوو، پەردەی دڕاند (٢٥٨٢)

تا ببی تۆ، وەک ژنانی، فێڵەباز ... قەت ئەتۆ نادا نەجات خۆ، مەکرو ناز (٢٥٨٣)

جلووسی و، لەفزی خۆش، زاهیر فەریب ... دەی گری وەک زێڕ،دەی خەی تۆ دەجیب (٢٥٨٤)

گەرئەتۆ ئازار و ئەزیەت کات، شا ... چاکترە،تا بەد ئەتۆ تاریف بکا (٢٥٨٥)

ئەزیەتی شات بێ، نەوەک، شەهدی خەسان ... تا کو ببیەکەس، لەئیقباڵی کەسان (٢٥٨٦)

چونکەشاهان،زێڕ و ماڵت پێدەدەن ... ڕووحی وان،دەیکاتەڕووح و گیان، تەن (٢٥٨٧)

تۆ لەهەرجێگات کەدی، ڕووت و هەژار ... بێ گومان کردی لەدەس وەستا، فیرار (٢٥٨٨)

بەندەهەڵدێ تاکو دەی وێتن، دڵی ... ئەودڵەی کوێر و،بەدو، بێ حاسڵی (٢٥٨٩)

گەر وەکوو،دەی ویست وەستا، والەبا ... جوان دەبوو خۆی، بەو دەبوون جوان،ئەقرەبا (٢٥٩٠)

تۆ کەسەی هەڵدێ لەبەر ئوستادی خۆی ... نا ی هەویتن هیچ خۆشی، بێ، لەبۆی (٢٥٩١)

حیرفەیەک فێربوویە،تەن پەروەر،دەکەی ... تۆ ئەدی دینت دەکەی، پەروەردە،کەی؟ (٢٥٩٢)

تۆ لەدونیا سەروەتت،زۆر بێ ژمار ... گەر لەدونیا بچیەدەر،تۆ چیتەکار؟ (٢٥٩٣)

---

[1]- تا هەمان بێ فکری وەسڵی یارمان بەندەگی هەم گیان فیدایی ،کارمان

حیرفەیەک تۆ فێر ببە، بۆ ئاخیرەت   حاسڵ و مەحسووڵی وی بێ، مەغفیرەت (۲۵۹۴)
شارە، دونیای دیکەپڕ بازاڕ و، کار   وەک جیهانی ئێرەیە، پڕ کارو بار (۲۵۹۵)
لای خودا بازی منداڵ، کەسبی جیهان   کەسبی عوقبای ناو دەنا،یەزدان، ژییان[1] (۲۵۹۶)
هەر وەکوو بازی منالان بوو،دیار   لەوجیهانەی زاهیری دا، کەسب و کار (۲۵۹۷)
چادەکەن منداڵ دەبازی دا ، دوکان   سوودی وان،تەنها،فەقەت، چوونی زەمان (۲۵۹۸)
ئەو بەبرسی،شەو لەبۆ ماڵ دێتەوە   ما، بەتەنها، هیچ نەماوُن، پێکەوە (۲۵۹۹)
مەرگە شەو، جێگایە بۆ بازی جیهان   دەستی خاڵی دێیەوە تۆ، ئەی فلان (۲۶۰۰)
عیشق و جەزبەی داخلی بوو کەسبی دین   لایقی نووری خودا ، ئەودەم، دەبین (۲۶۰۱)
دەیهەوێ لێت کەسبی فانی،نەفسی خەس   کەسبی خەس تۆ نەتهەوێ ، لەو بەسکەبەس (۲۶۰۲)
نەفسی خەس گەر بیهەوێ کەسبی شەریف   مەکرو فێڵە، وا دەکاتن ئەو کەسیف (۲۶۰۳)

**شەیتان موعاویەوەخەبەردێنێ کەهەستەوەختی نوێژە...**

**خولاسەی داستان...**

حیکایەت کراوەکە موعاویە لەگۆشەیەک لەکاخی خۆی نوستبوو، تەواوی دەرکەکانی وروودی کاخ قایم کرابوون تا کەس موزاحیمی وی نەبێ،ئەو دەخەوێکی عەمیق دابوو کەلەناکاو شەبەحێک کە ئەوی لەخەو هەستاند، موعاویە بە پەرێشانی لە خەو، وەخەبەر هات، بەڵام کەسی نەدیت، بەخۆی کوت تەواوی دەرکەکانی کاخ بەستراون ئەدی ئەو شەخسە مەوهوومە لەکوێ ڕا واریدی کاخ بووە؟ وە دوای کەوُت ..عاقیبەت شەبەحێکی دیت و پێی کوت .. ئەتۆ کێی؟جوابی داوە.. شەیتان .. موعاوێە پێیکوت بۆچی ئەمنت وەخەبەر هینا؟ پێیکوت وەختی نوێژە، ئەتۆم وەخەبەر هینا تا فەورەن بچیە مزگەوت، موعاویە پێیکوت دەزانم کە ئەتۆ بەفێڵ وا دەکەی دەنا ئەتۆ تاعەت و عیبادەتی بەندەگانی خودات ناوێ، شەیتان زۆر بە فێڵبازی و چاپلووسی قسەی کرد بەڵام نەی توانی ئەوی فریو دات عاقیبەت مەقسوودی خۆی بەو جوورە پێکوت.. دەزانی بۆچی لە خەوێم وەخەبەر هینای؟ بۆ ئەوە کەبچی بۆ نوێژی جەماعەت، ئەگەر وەخەبەر نەهاتبای و نوێژەکەت چووبا، لە شیددەتی نارەحەتی دونیات لە پێش چاو تیرە و تار دەبوو، وەبێ نیهایەت نارەحەت دەبووی، و، وەکوو سێڵاو فرمیسکت لەچاو

---

[1]- کەسبی دونیای، بازی منداڵ کوت، خودا   کەسبی دونیای دیکە،ژینی نێو دەنا

دەرژا، و ئەو حاڵەتەی سۆز و حوزن و نارەحەتیە، ئەرزشی لە زۆر نوێژان زیاترە، جا ئەتۆم وەخەبەر هینا تا ئەو حاڵەتەباش و بەئەرزیشەت بەنەسیب نەبێ.

ۆم دەبیست مووعاویە، رۆژێک ئەو — هەرلەگۆشەی کاخەکەی خۆی چۆ،دەخەو (۲۶۰۴)

بەست بوونی دەرکەکانی کاخ هەموو — چون لەهاتوو چوونی خەڵکی خەستەبوو (۲۶۰۵)

یەک نەفەرهات و ئەوی وشیار کرد — خۆی لەپێش چاوی ئەویش نادیار کرد (۲۶۰۶)

دیکوت ئەو، دەرکان هەموو یان قاییمن — کێیەجورئەت کات،بێ بۆ لایی مـن؟ (۲۶۰۷)

جستو جۆی کرد ئەو لەهەرجێگەو مەکان — تا کوپەیداکا، لەوی نیوو، نیشان (۲۶۰۸)

تقیبەت پەیدای دەکرد، ئەو یەک نەفەر — ون دەکا خۆی پەردەداوێژێتەسەر (۲۶۰۹)

پیدەکوت کێی؟ زووکەبێژەنێوی خۆت — جوابی دا شەیتان،کەمەعلوومەلەبۆت (۲۶۱۰)

پیدەکوت ئەمنت لەخەو هەستان، لەبۆ؟ — پیم بڵێ،تۆ بۆچی وات کرد، بێ درۆ (۲۶۱۱)

**فێڵ کردنی ئیبلیس لەموعاویەوجواب دانەوەی موعاویەبەئیبلیس..**

پیدەکوت ئێستا کەوەختی نوێژە،تۆ — هەستەبێ وێستان،لەبۆ مەسجید برۆ (۲۶۱۲)

عجلوا الطاعات قبل الفوت) وا — کوت لەبۆ عام ئەو موحەممەد مستەفا (۲۶۱۳)

جوابی داوەمەقسەدی تۆ وا نییە — قەستی تۆ بۆ هیچ کەسێک، خێر، چا نییە (۲۶۱۴)

ێتەماڵم بۆ دزی، دز، وا دەڵێ — پا سەوانم،نیمەدز، بەخوا دەڵێ (۲۶۱۵)

ەو دزەم من،خۆ، چ کات بڕوا نییە — دز کەمانای بۆ سەواب، هیچ لا نییە (۲۶۱۶)

**دووبارە جواب دانەوەی ئیبلیس بە موعاویە..**

یکوت ئیبلیس یەک فریشتەبووم ئەمن — رێی ئیتاعەت لەو خودا یە، چووم ئەمن (۲۶۱۷)

ـ لەبۆ گشت رەهرەوان مەحرەم دەبووم — عەرشییان بۆیان،ئەمن هەمدەم، دەبووم (۲۶۱۸)

یەک ئەووەڵ هەبێ کەی دەچتەدەر؟ — عیشقی ئەووەڵ بوو لەدڵدا،دەس بەسەر (۲۶۱۹)

ەر ببینی کیشوەری رۆم، یاخوتەن — چۆن لەدڵ خاریج دەبێ،عیشقی وەتەن؟ (۲۶۲۰)

ەست بووین ئێمەهەموومان، لەو، مەیە — گشتمان عاشق دەبووین،بەو دەر گەیە (۲۶۲۱)

ەربەعیشقی وی بوو برییان نافمان — عیشقی وی چاندیان لەگیانی سافمان (۲۶۲۲)

ژی خۆشمان بوو،لەرۆژی رۆژگار — ئاوی رەحمەت خواردمان، کاتی بەهار (۲۶۲۳)

ێ وجوود ی دا بەمن، من وا دەبووم — ویستی وی گەر وانەبا،من کوا، دەبووم؟ (۲۶۲۴)

ێ حیسابم دیوەمن لوتفی خودای — زۆر گەراوم،من لەگوڵزاری رەزای (۲۶۲۵)

دەستی ڕەحمــی دادەنــا، ســەرمان چلــۆن ‌ ‌ ‌ ‌ کانیــاوی لــوتفی جــاری کــرد لــەبۆن ‌ -÷ـ۶)
کـاتێ منـداڵ بـووم و شـیرخۆر، هێـز، کـەم ‌ ‌ ‌ ‌ غەیر ی وی کێ ڕای دەژاند، بۆم لانکەکەم ‌ -÷ـ۷)
مـن لـەکێم شیر خوارد،غـەیری شیری وی ‌ ‌ ‌ ‌ بـــوو بـــەئاگاداری من،تـــەدبیری وی ‌ -÷ـ۸)
خســڵەتێکی بــێ، لــەبۆ ئینســان، لەشــیر ‌ ‌ ‌ ‌ ناچتـەدەر، قـەت ئـەو، بـەزەربی تیـر و شـیر ‌ -÷ـ۹)
گـەرعیتابێک هـات لـەلای دەریـای کـەرەم ‌ ‌ ‌ ‌ کـوا دەبەسـتێ ئـەو هـەموودەرکان بەجـەم؟ ‌ -÷ـ۰)
ئەسـڵی سـککەی، دادو لوتـف و بەخشیشـە ‌ ‌ ‌ ‌ قـەهری سـەر وی،وەک غوبـاری سەرلەشـە ‌ -÷ـ۱)
هەربـەلوتفی خـۆی بـوو، دونیـای چـادەکرد ‌ ‌ ‌ ‌ لـوتفی خـۆی شـامیل بەگشـت ئەشیا،دەکرد ‌ -÷ـ۲)
فیرقـەتی وی قـەهری گـەر، تێـدا هەیـە ‌ ‌ ‌ ‌ قـەدری وەسـڵی زاتـی وی، لـەدوا هەیـە ‌ -÷ـ۳)
ئـێش کـەبۆگیان دێ، بەفیرقـەت،بێ میسـال ‌ ‌ ‌ ‌ گیـــان دەزانێ،قـــەدری ڕۆژانـــی ویســـاڵ ‌ -÷ـ۴)
دەیکــوت ئەحمـــەد،خوا وەهالەی،فـــەرمووە ‌ ‌ ‌ ‌ خـۆ، لەخیلقـەت قەسـتی مـن ئیحسـان بـووە ‌ -÷ـ۵)
عالـــەمم چـــاکرد هـــەتا ئیحســـان بکـــەم ‌ ‌ ‌ ‌ تـا کـو چاکـەی، بـۆ هەموو،ئینسـا ن بکـەم ‌ -÷ـ۶)
نـەک لەبـەر وەی تـا کوسـوودم، پـێ بگـا ‌ ‌ ‌ ‌ پـێم عـەتا کـا، ئـا دەمـی ڕووت،یـەک عـەبا ‌ -÷ـ۷)
گـــەرچی چـــەن ڕۆژێکەئـــەمنی خســـتەدەر ‌ ‌ ‌ ‌ ڕووی جـــووانی ویم،هێشـــتا، بـــەر نـــەزەر ‌ -÷ـ۸)
ڕوویی، واجوان،قەهری وای بێ، زۆرعەجەب ‌ ‌ ‌ ‌ بۆیـەنای بێ، قـوربی وی،کـەس بێ سـەبەب ‌ -÷ـ۹)
نـا مهەوێن،ئەسباب،سـەبەب،چون حادیسـە ‌ ‌ ‌ ‌ چونکەحادیس،حادیســـێک بۆی،باعیســـە ‌ -÷٤٠)
لـــوتفی پێشـــووی ئێســـتەنەززارەی دەکـــەم ‌ ‌ ‌ ‌ هـەرچی حـادیس بێـت، دوو پـارەی دەکـەم ‌ -÷٤١)
بـا حەسـادەت کردبـی، مـــەنعی سـجوود ‌ ‌ ‌ ‌ خۆ لە عیشقێ دێ حەسادەت، نەک‌جحوود ‌ -÷٤٢)
دێ لـە عیشـقێ ڕا حەسـادەت بـێ گومـان ‌ ‌ ‌ ‌ چـون دەڵـێ دانیشـت دەگـەڵ دۆسـتم، فڵان ‌ -÷٤٣)
شـەرتی عیشـقە، بـوو ڕەقیـب، تـۆ بـی، دژی ‌ ‌ ‌ ‌ وەک لــەبۆ پشــمین دەڵــەی،تۆ زۆر بــژی ‌ -÷٤٤)
چون لەشـەترەنج غـەیری ئـەو کایـەم نەبوو ‌ ‌ ‌ ‌ چـــون کـــوتی کایـــەت بکـــە، نایـــەم، نـــەبوو ‌ -÷٤٥)
مـــن، ئەلـــەو شـــەترەنجەدۆڕانـــدم قومـــار ‌ ‌ ‌ ‌ خـــۆ م لـــەبۆ دەریـــای بەڵا،هاویشـــتەخوار ‌ -÷٤٦)
نێـو بـەڵاش ئیحسـاس دەکـەم لـەززاتی وی ‌ ‌ ‌ ‌ مـــاتی ویمـــە،ماتی ویمـــە، مـــاتی وی ‌ -÷٤٧)
مـن بـەعام وخـاس دەڵـەم جـا، یـەک سـەرە ‌ ‌ ‌ ‌ کـەس نـەجات نـابێ لـەدەس ئـەو شەشـدەرە ‌ -÷٤٨)
جوزوی شـەش‌جا،چۆن لەشـەش‌دەی‌بێ،نـەجات ‌ ‌ ‌ ‌ خاسسـەحەق گـەر،خـوار وخـێچ ئـەوچابکات ‌ -÷٤٩)
عاشـــــــقی دونیایەجێگـــــــــەی،ئاگرە ‌ ‌ ‌ ‌ بـۆ نـەجات تـەنها خوداوەنـد، دەس گـرە ‌ -÷٥٠)
کفـر و ئیمـان گـەرچی زۆر لێکتـر جـودان ‌ ‌ ‌ ‌ هـەردوو، بێ شـک، چـاکراوی،دەس خـودان ‌ -÷٥١)

**دووبارەبەیان کردنی فێڵەکانی ئیبلیس بەوەسیلەی موعاویەبۆ ئیبلیس...**

میر کوتی ئەو گفتەڕاستت کوت بەڵام بێ نەسیب و قیسمەتی تۆ لەو کەلام (٢٦٥٢)
سەت هەزاری وەک منت لا دا،لەڕێ قەلبی وانت،تۆ لەبۆ خۆ کردەچێ (٢٦٥٣)
ئاگرو نەفتی دەسووتێنی، دا ئیمی ئێقەدەدرێتن لەدەس تۆ،ئادەمی (٢٦٥٤)
کاری تۆ سووتاندنە، چون ئاگری کوا کەسێکی، تۆ بەگڕ، ئەو ناگری؟ (٢٦٥٥)
لەعنەتەبۆت،حەق کەتۆ سووزان دەکا بۆ دزا ن، تۆ ڕەهبەری هەموان دەکا (٢٦٥٦)
تۆ دەگەڵ حەق گفتو گۆت کرد ڕوو،بەڕوو من لەحاستی مەکری تۆچیم؟ئەی عەدوو (٢٦٥٧)
چەشنی دەنگی تەیرەزانستی هەتە دەنگی تەیران،چونکەبۆ وان، بۆ چەتە (٢٦٥٨)
سەت هەزار تەیری لەڕێی ڕاست لا دەنا چون دەیان بیست،دێت، دەنگی ئاشنا (٢٦٥٩)
دەنگی تەیری بیست لەژووڕا هاتەخوار کەوتەداوت، بۆ ئەسیرت، پەست و خوار (٢٦٦٠)
مەکری تۆ بوو، وای لەقەومی نووح کرد قەومی نووحی وا هەموو، بێ ڕووح کرد (٢٦٦١)
مەکری تۆبوو قەومی عادی دا بەبا نەی دەکوشتن،با، کەمەکری تۆ نەبا (٢٦٦٢)
هەرلەتۆ بوو،قەومی لووت، بوون سەنگسار کوێر ونابینا دەبوون و دەردەدار (٢٦٦٣)
مێشکی نەمروود هەرلەتۆڕا، لێکدرا هەرلەتۆڕا سوڵح و ئاشتی تێکدرا (٢٦٦٤)
عەقڵی فیرعەونی کەبوو زۆ رهووشیار هەرلەتۆ ڕا،کوێر دەبوو،نەی دی، چ جار (٢٦٦٥)
هەرلەتۆ ڕا بوولەهەب، نا ئەهل بوو هەرلەتۆ ڕا بولحەکەم، بووجەهل بوو (٢٦٦٦)
ئەی لەشەترەنج تا کوبکریی، یاد ئەتۆ کردتن مات، سەت هەزار ئوستاد،ئەتۆ (٢٦٦٧)
فێڵی سەختت زۆر لەشەترەنج برد،بەکار خەڵکی زۆرت کرد وەکووخۆت، خاکسار (٢٦٦٨)
بەحری مەکری تۆ، خەلایق قەترەیەک تۆ وەکوو کێو،جەمعی عالەم، زەڕڕەیەک (٢٦٦٩)
کێ نەجاتی دێ،لەمەکرت ئەی عەدوو؟ غەیری مەعسووم،غەرقی تووفانین،هەموو (٢٦٧٠)
زۆر ستێرەی سەعد، نەت هێشت لەو، چ ناو زۆر سپاەو،لەشکرت،کردن، بەلاو (٢٦٧١)

**دووبارە جواب دانەوەی ئیبلیس بە موعاویە...**

دێکوت ئیبلیس چاک مەتڵەب شیکەوە ئەوگرێی محکەم دراوە، بیکەوە (٢٦٧٢)
مێرو کەلبی، ئیمتیحان کرد حەق بەمن نەقد و قەلبی، ئیمتیحان کرد حەق بەمن (٢٦٧٣)
زێری قەلبی کوا لەڕێز، زێر لادەنێم سەیرەفیم، قیمەت لەسەرشت دا دەنێم (٢٦٧٤)
من دەکەم چاکان گەلێک چاک ڕێنموون من بەدان ئەمما دەکەم،هەر تەفرو توون (٢٦٧٥)
گیا لەپێش حەیوان ئەگەرمن دا دەنێم تا عەیان بێ جینسی ئەو حەیوانەڵێم (٢٦٧٦)

گورگ و ئاهوو،لێک کەبوویان،بەچکەیەک گورگـەیائاهوو دەبـێ حەتمـەن کە،شـەک ٠٧)
دابنێـی گـەر،تۆ لـەپێش وی ئێسـک وگیـا چـاک بنۆڕە،گیـای دەوێ ئـەو، ئێسـک، یـا ٠٨)
ئێسکی گەر ویست دیار دەکاتن ئەو سەگە گیای کەویست ئەو دیار دەکا، ئاهوو ڕەگە ٠٩)
قەهرو لوتفی وی دەگەڵ یێک جووت بوون هاتـەبوون،دونیایی خێـر و شـەڕی دوون ٠)
دابنـێ تۆ،گیـا، دەگـەڵ چـەن ئێسـکان دابنـێ تـۆ قـووتی نـەفس و قـووتی گیـان ١)
گـەر غـەزای نەفسـی بـوێتن، ئـەو کـەرە گـەر غـەزای ڕووحـی بوێ، ئـەو سـەر وەرە ٢)
خزمـەتی جیسـمی بکـا، ئـەو، هەرکـەرە بچتـەدەریای گیـان، بەشـی وی گـەو هـەرە ٣)
گەرچی ئەو دوو خێرو شەڕن،لێک جودان خـۆ بـەڵام هـەردوو لـەژێر حـوکمی خـودان ٤)
ئـــەنبیا تاعـــاتی خۆنیشـــان دەدەن دوژمنـان شـەهواتی خـۆ نیشـان دەدەن[1] ٥)
چۆن بگـۆڕم چـاک بەبـەد، یـەزدان کـەنیم ڕەهنمـام مـن خـالقی ئینسـان کـەنیم ٦)
مـن وەکـوو ئاوێنـەبۆ چـاکی و بـەدیم خـالقی وان هـەر خـودای زانـا و قـەدیم ٧)
چـاو، شـکاندی هینـدوو زوو ئـا وێنەکـەی چـون نیشـانی دا، ڕەشـی بـێ وێنەکـەی ٨)
خوا منی چاکرد نیشان دەم ڕاست و باش جـوان بـەجوانی، پـیس بەپیسـی دڵخـەڕاش ٩)
شـاهیدم من،کـوا لـەنێو بەنـد، شـاهیدە؟ ئـەهلی زینـدان نیم،خوداوەنـد شـاهیدە ٠)
مـن لەهـەرجێگا ببیـنم داری بـەر ئەو دەکەم چاک تەربیەت، ساحەب سەمەر ١)
داری وشـکم مـن لەهـەرجێگا کـەدی دەی بـڕم تێکـەڵ نـەبن باشـی و، بـەدی ٢)
وشـکەدار تونـد گـاز دەکـا، ئـەی باغـەوان بـێ خـەتات بـۆ سـەربڕیم تـۆ ئـەی جـەوان ٣)
وس بـە، ئـەی بـەد، پێیـدەڵێ جـا، باغـەوان وشـک بوونـت،بۆ تـۆ جورمێکـەگران ٤)
وشـکەدار بێژیـت، ڕاسـتم،نیمەخوار بـۆ بڕیمـت بـێ گونـاح، هیناتمـەخوار ٥)
باغـەوان بیژی،ئەگـەر،بای،باش و پـاک خۆزگەتەڕ بای خوارو خێچیش بای، چ باک ٦)
جـەزبی ئـاوی زینـدەگیت تـۆ کردبـا ئـاوی زینـت تێکـەڵی خۆ،کردبـا ٧)
زۆر خـەراپ و پیسـەتۆ وی ئەسـڵی تـۆ خۆ نەبوو، گەڵ داری باش قەت،وەسڵی تۆ ٨)
گـەر لـەداری بـاش پەیوەندکـەی، تۆ،تـاڵ داری تـاڵ شـیرین دەبێـت و خۆشـحاڵ ٩)

**بەشیددەت قسەکردنی موعاویە دەگەڵ ئیبلیس...**

میرکـوتی تـۆ بـەس بەهانەبێنـەبۆم نیتـەڕێگا،تۆ لـەڕێ یـەک مـن دەڕۆم ٠)

---

[1]- ئەنبیا نیشان دەدەن تاعاتی خۆ دوژمنان نیشان دەدەن شەهواتی خۆ

ـــن غـــەریب و تـــاجرم، تــۆش ڕێگــری ــ مــن لــەبۆ کووتــاڵی تــۆ نــیم موشــتەری (٢٧٠١)
ـۆری کووتـــــاڵم مـــــەدەتۆ کـــــافری ــ تۆ لـەبۆ کووتـاڵی کـەس نـی، موشـتەری (٢٧٠٢)
ـوشـتەری نـین ڕێگـران بـۆ هـیچ کـەس ــ گــەربڵێ مـــن موشـــتەریم هەرفێڵەبـــەس (٢٧٠٣)
ـەحری مەکری وی گەلێک قووڵ، بێ بنە ــ ئــەی خــودا بــم دەنــەجات لــەو دوژمنــە (٢٧٠٤)
ـووەکی دی ئەولــەمن گــەر فێـڵ بکـات ــ قـەت لـەدەس ئـەو ڕێگـرە، نـام بـێ نـەجات (٢٧٠٥)

## ناڵاندنی موعاویە لە دەست ئیبلیس و کۆمەک لە خوا، خواستن...

ـی ئــەمیر کوت،ئــاگری ژێــر دووکــەڵن ــ ئـەو قسـانە، خـوا نـەجات دە، تـۆ ئـەمن (٢٧٠٦)
ـــن بەئیســـتیدلال، نـــابم، وەک بلـــیس ــ فیتنەیەئـــەو،بۆ شـــەریف و بـــۆ خەسـیس (٢٧٠٧)
ـــا دەمێکـــی ( علـــم الاســـمایە) ئـــەو ــ چـــۆن لەحاســتی ئیبلــیس بــێ پایەئــەو (٢٧٠٨)
ـەڕەجەننـــەت ڕا، فڕێیـــدا، ســـەرزەوی ــ چـــۆ ن لەئاســـمان،هات و، کەوتـــەداوی وی (٢٧٠٩)
ـــیوەنی (اناظلمنــــا) ی ســـــەردەدا ــ فێڵــی شــەیتان نیتــی پایــان ئــەی خــودا (٢٧١٠)
ـەر قسـەی دەیکـات، شـەڕ لـەو بـوو دیـار ــ سیحرو جادووش، وُن دەوی دا، سـەت هـەزار (٢٧١١)
ـوەتی پیــاوان دەبــا ئەو،یــەک نەفــەس ــ هەڵدەگیرســـێنێ لـــەپیاوو ژن، هـــەوەس (٢٧١٢)
ـن بڵـــێ پـێم ئــەی بلیســـی فێڵــەباز ــ بۆ لەخـەو هەستاندمت، چیـت بـوو، نییـاز؟ (٢٧١٣)

## دووبارە ئیبلیس فێڵەکانی خۆی بە کار دێنێ...

ـیکـوت ئیبلـیس وایـەپیاوی بـەد گومـان ــ نایهـەوێ گـوێ داتەڕاسـتی، هـیچ زەمـان (٢٧١٤)
ـــەردڵێکی زۆر بکـــا فکـــرو خـــەیاڵ ــ قـــەت دەلیـــل ناکا،لــەفکران ئــەو بــەتاڵ (٢٧١٥)
ـــەر وُتـــاریێ نێـــو دڵـــی وا عیللەتـــە ــ تیغـی غـازی، بـێ بـەدەس دز، زیللـەتـە (٢٧١٦)
ـزبی وی بوو هیچ نەڵێ بەو، قـەت زەبان ــ شـێتیەتی بـوو، خـۆ دەگـەڵ نـادان،دووان (٢٧١٧)
ـای خـودات ناڵانـد، لـەدەس مـن، ناحـەقی ــ ناڵــەناڵت بــێ، لــەدەس نەفســی شــەقی (٢٧١٨)
ـۆ دەخـۆی هـەڵوایی زۆرزیـاتر، لەحـەد ــ دەگری تەب، تەبعت دەبێ، موختەلل و، بەد (٢٧١٩)
ـێ گونـاح، لەعنـەت دەنێـری بـۆ بلـیس ــ بـۆ چـی نـابینی لـەخۆت تەلبیسـی پـیس؟ (٢٧٢٠)
ـبـیس نـەیکرد، تـۆ خـۆت وا ت، دەوێ ــ هـەروەکوو ڕێـوی، وەدووی،دووگـەی کـەوێ (٢٧٢١)
ـۆ لــەنێو چیمـــەن دەبینـــی دووگەیـــە ــ فێڵـــەبۆ تـــۆ،وا دەزانـــی، ڕووگەیـــە (٢٧٢٢)
ـەیلی دووگـە، تـۆی لـەدانیش دوور کـرد ــ چاووعـــەقڵی کـــوێر کرد،بـــێ نـــوور کـــرد (٢٧٢٣)
ـۆشەویستی، چـاو کـوێر، گـوێ کـەڕ دەکا ــ کـــاری وا، نەفســـت لەبـــەحر و بـــەڕ،دەکا (٢٧٢٤)

تـۆ گونـاهی خــۆ ت مەزانــەهیچ لــەمن　　دەمهـەویْ دەر بێـت بـەد، ڕیشـەی لـەبن
مــن بــەدیم کــرد و، پەشـیمانم، بــەڵێ　　دەمهـەویْ مـن ئێسـتە، ڕۆژی مـیش هـەڵێ
موتتەهــەم مــاوم لــەنێو عالــەم ئــەمن　　هـەر بـەمن نیسبەت دەدەن کـار، پیاووژن
گــورگی بێچارەئەگــەر چــی برســییە　　وا دەزانن،ژیـــن بەویســـتی نەفســـییە
گـەرزەعیف بووگـورگ نـەی تـوانی،ڕەوُت　　پێیدەڵێن،خواردوویـەزۆر، بــەزگی کــەوُت

## ئیسراڕ و ئیلحاح کردنی موعاویە لە ئیبلیس کە حەقیقەت بڵێ...

پێیدەکوت میر،هـەر لەڕاستیت دێ نـەجات　　عــەدڵ و دادە،تـۆ لـەبۆ ڕێـی ڕاس، دەبـات
ڕاس بڵـێ تـا نـەت گـرن دوو چـەنگی مـن　　مــەکری تــۆ نابا،غوبــاری جــەنگی مــن
وای بـەمیر کـوت بـەو هــەموو ئـەفکارەتۆ　　چـــــۆن دەناسی،بێژەپێم،ڕاســـــتی و درۆ
میـر کـوتی ئەحمـەد، بەئێمـەی دا، نیشـان　　چـۆن دەبـێ ڕاسـتی و درۆ،بـۆ مـان، عـەیان
دەیکـوت ئـەو، شـک چادەکـانێو دڵ درۆ　　خــۆ بــەڵام ڕاسـتی،دەدا، خۆشـی بــەتۆ
دڵ،بـــەگفتاری درۆ نـــای بـــێ قـــەرار　　ڕۆن، بـەئاو تێکـەڵ بـێ، ناسـووتێ، چ جـار
گفتـی ڕاس ئـارامی دڵ، بۆعـام وخـاس　　دانەیــــەبۆ داوی دڵ، گفتـــــاری ڕاس
هـــەرزەمانێکی کـــەدڵ بـــێ، دەردەدار　　بـــێ گومـــان ناکات،تـــامی هـــیچ، زار
هــەردڵێکی بـێ لــەدەرد و ڕەنـج سـەلیم　　بـوو لـەتامی کیـزب و ڕاس، ئاگـا و عـەلیم
چونکـەئادەم مــەیلی بـۆ گــەنمی دەکــرد　　مـەیلی گـەنمی، خۆشـی قـەلبی وی، دەبـرد
مەکری خۆت کرد تۆ لەگوێی وی دا، سریو　　ژەهری تۆی خوارد،چونکەتۆ،دات، ئەو فریو
گەنم و عەقرەب هەردوو بوون لای وی عەزیز　　چونکەنـەی بووئەوەدەمە،ئـەو هـیچ تـەمیز
چون جەماعەت مەستی ویستی نەفسی خۆن　　تالیـب وخواهــانی مــەکرو فێڵــی تــۆن
هەرکەسـێک داوی هــەوای خـۆی وازکـرد　　چـاوی خـۆی ئاشـنا بـەسیرڕو ڕاز کـرد

## نارەحەت بوونی قازی لە ئافەتی قەزاوەت و جواب کوتنی جێ نشین بە وی...

قازیـــان دانا،دەگریـــا، ئـــەو بەشـــین　　جا بـەوی کـوت، بـۆ دەگریـەی؟ جێ نشین
کـــوانێ،وەختی شـــیوەن و فەریادیـــە؟　　وەختـــی شـــادی،هەم موبـــارەک بادیـــە
پێیــدەکوت ســەختەقەزاوەت کــا، گــەلێ　　بـــۆ دووزانـــای شـــارەزا زۆر، جـــاهلێ
ئەسلی مـەو زووع چاک دەزانن،دوو عـەدوو　　هـیچ لـەقازی بـێ نـەوا مـەعلووم نـەبوو
جاهیـــل وغافـــڵ لەگشـــت ئـــەحواڵی وان　　چـۆن قـەزاوەت کـا لـەگیان و مـاڵی وان؟

پێیدەکوت خەسمان لەمەوزووع باخەبەر — بێ خەبەر تۆی،شەمعی ئەمما، بۆ بەشەر (٢٧٤٩)

چۆن دەتۆ دا هیچ غەرەز پەیدا نیە — نووری چاوت عەیبی هیچ تێدا نیە (٢٧٥٠)

هەرغەرەزبوو،ئەو دووزانا، بوون نەزان — هەرغەرەز، زانستی وانی کرد نیهان[1] (٢٧٥١)

ــی غەرەزبوون جاهیلان عالم دەکا — عالمان ئەمما، غەرەز،زاڵم دەکا (٢٧٥٢)

ـشوەنەستاندن ئەتۆ بینا دەکا — حیرس و ئازیش،دیارەتۆ ڕیسوا دەکا (٢٧٥٣)

ـرزوو،ویستی هەوا، لام ناوەمن — هەرچی لوقمەی شەهوەتە، دام نا وەمن (٢٧٥٤)

ـەلبی من ئێستا، ئەوەن تێیدایەنوور — بەو دەبینم من درۆو، ڕاستی، لەدوور (٢٧٥٥)

## موعاویە، ئیبلیس مەجبوور بە ئیقرار دەکا...

ـێچ منت هەستان لەخەو پێم بێژەتۆ؟ — دوژمنی بێداری و هووشیاری خۆ (٢٧٥٦)

ـەر وەکوو تریاکی تۆ خەو هێنەری — وەک شەرابی، لادەبەی عەقڵی سەری (٢٧٥٧)

چـۆر میخ بەستوومی، تۆڕاس بێژەپێم — ڕاس دەناسم تۆ،نەکەی هیچ فێڵ لێم (٢٧٥٨)

ـن لەهەرکەس وام ئومێدەو ئینتیزار — چۆن لەدەستی دێت ئەنجام دات کار (٢٧٥٩)

ـو لەئاو تالب ئەمن بۆ ئاگرم؟ — پیاوی نامەرد بۆ سپاهی ناگرم (٢٧٦٠)

ـن وەکوو گاوران نیمە،گەر بوتی — حەق بناسم، یالەحەق بێ ئایەتی (٢٧٦١)

ـن لەپەینم ناهەوێ،قەت بۆنی موشک — من لەئا وی جۆگەناموێ، خشتی وشک (٢٧٦٢)

ـهەوێ شەیتان، کەبۆ من دوژمنە — من لەخەو هەستێنێ،چون خێری منە (٢٧٦٣)

## ڕاست کوتنی ئیبلیس بە موعاویە...

ـی زۆری ئیبلیس بردن بەکار — گوێی نەدانێ، ئەو ئەمیری هووشیار (٢٧٦٤)

پێیدەکوت ئیبلیس جا، بەدڵ و گیان — من ئەتۆم هەستاند بۆیە، ئەی فلان (٢٧٦٥)

ـەی نوێژی جەماعەت تۆ، تەمام — پشت سەری پێغەمبەری عالی مەقام (٢٧٦٦)

ـحتی نوێژی تۆبچێ گەر، ئەو دەمە — تار دەبێ دونیا، لەپێش چاوت تەمە (٢٧٦٧)

ـیژ بچێ، تۆ، هێن دەرێژی ئا و لەچاو — تۆ لەدوو چاو چادەکەی، دووکانیاو[2] (٢٧٦٨)

هەرکەسەی زەوقی هەیەبۆ تا عەتێک — نای هەوێ غافڵ ببێ لەو ساعەتێک (٢٧٦٩)

---

1- هەرغەرەزبوو ئەو دوو زانای کوێر کرد    هەرغەرەز زانستی وانی گۆڕ کرد

2- وەک لەهەوران بێتەخوار باران ، بەتاو (مصرع دوم)

دەردی وا چاترلەچـــەن ســـەت نوێژە،خـــۆ     کـوا دەگاتەسـۆزی وا،سـەت نـوێژی تـۆ (۲۰)

**ئەرزیشی ناڕەحەت بوون بۆ لە دەست چوونی نوێژی جەماعەت..**

یــەک نەفــەر ویســتی کەبچتەمزگــەوُت     دی جەماعــەت دەستەدەســتەدەر کــەوُت (۲۱)

پرسیاری کـرد لەهەرکـەس تـووش دەبـوو     بـۆ لەمەسـجید دەچنـەدەر عالـەم هـەموو؟ (۲۲)

یەک نەفەر پێیکوت کەنوێژمان کرد،چلۆن     پـێش نـەمازی کـرد پێغەمبـەر لـەبۆن[1] (۲۳)

دەتهـەوێ بـۆ کـوێ،بچی ئـەی پیـاوی خـاو؟     ئێســـــتەپێغەمبەر کــــەداویتی ســـــڵاو (۲۴)

ئـــاخی هەڵکێشـــاوو،دووکەڵ هاتـــەدەر     بۆنی خـوێن، لـەو ئاخـەهات، خـوێنی جگـەر (۲۵)

یـەک نەفـەرپێیکوت ئـەتۆ ئـەو ئاخی خـۆت     زوو بـەمن دە،نـوێژی مـیش، بـا بێ، لـەبۆت (۲۶)

پێیـدەکوت، دام ئـاخۆ، نـوێژم کـرد قـەبووڵ     پاش دوعای زۆر ئاخی لێکرد، ئەو، وسـووڵ (۲۷)

شـەو دەخـەو دا، وا لـەبۆ وی دەنـگ دەهـات     تـۆ کڕیـت، ئـاوی شـەفا، ئـاوی حـەیات (۲۸)

حورمــەتی ئــەو ئینتیخـاب و،ئـەو، وسـووڵ     بـوو، خـودا کـردی لەهـەموان نـوێژ قـەبووڵ (۲۹)

**تەواو بوونی ئیقراری ئیبلیس بە مەکری خۆی، بۆ موعاویە...**

جـا، عـەزازیل پێیـدەکوت ئـەی میـری عـام     بـا بڵـەم مـن مـەکری خـۆم، بـۆ تـۆ تـەمام (۳۰)

گــەر کونــوێژی تــۆ بچووبـا، بـێ گومــان     تۆبــەدەڵ دەت کــرد زۆر ئــاخ و فیغــان (۳۱)

ئـــاخ و ناڵەوحەســـرەت و ئـــەفغانی وا     چاکترە،زیــاتر لەســەت نــوێژ لای خــودا (۳۲)

مــن ئــەتۆم وشــیار کــرد تــا ئــاهی تــۆ     بەرنەداتەپــــەردە،ئاگر، ســــەر بــــەخۆ (۳۳)

تــا کــو ئــاهی وا ، لــە بــۆت،پەیـدا نــەبێ     تــا کــو ڕێگــات،تۆ لــەبۆ لای خــوا نــەبێ (۳۴)

مــن حەســوودم،چون حەسـوودم وادەکــەم     دوژمـــــنم،من بۆیـــــەفێڵان چادەکـــــەم (۳۵)

میرکـــوتی ئێســـتا لەقـــەولت ســـادقی     تۆبەمـــــــەکرو فێڵـــــــەبازی لایقـــــــی (۳۶)

عەنکـەبووتی، ڕاو دەکـەی مێشـان، ئـەتۆ     بـۆ دەدەی ئـازار ی مـن، مـێش نیمـەخۆ (۳۷)

ڕەنـگ سـپی بـازم، دەکـا، شـا، ڕاوی مـن     عەنکـەبووت کـەی دا دەنێـتن،داوی مـن؟ (۳۸)

بگرەمێشـــــان،تا لەدەســـــتت،دێ ئـــــەتۆ     ڕادەهــــەرچی مێشــــە،تۆ بــــۆ لایــــی، دۆ (۳۹)

گــەرکوبانگیان کــەی لــەبۆ لای ئەنگــەبین     مەکروفێڵەهـــەم درۆیـــە، خـــۆ، یـــەقین (۴۰)

تـۆ منـت هەسـتاند، خـەو بـووم ئـەو دەمـی     گێــژی ئــاوُم دی، کوتت،هــا هــا، گــەمی (۴۱)

---

[1]- پێش نووێژی کرد پێغەمبەر لەبۆن (مصرع دوم)

خۆ منت،بۆ کاری چاک بانگ کرد، چەلێک　　تـا لـەکاری چـاکترم دوور کـەی گـەلێک (٢٧٩٢)

**ساحەب مـاڵ، کـەنیزیک بـوو،دز، بگرێـت، بەعیللـەتی داد و فـەریادی نەفـەرێکی دیکە دزەکەی لەدەست دەدا ..**

**خولاسەی داستان...**

نەفـەرێک دەمـاڵی خـۆی دا،دەگـەڵ دزێـک ڕوو بـەڕوو بـوو، دز کەساحەب مـاڵی دیـت هـەڵات ساحەب مـاڵ وەدوای کـەوُت،وهێندەبـەدوای دا چـوو تـا گەیشتەچەند قـەدەمی وی و هێندەی نـەمابوو کـەبیگرێ، لەوکاتـەدا دزێکی دیکەکـەڕەفیقی ئـەودزەبوو هاواری کـرد، ئـای دز،ئـای دز ساحەب ماڵ بەو خەیاڵەکەپێی وا بوو واقیعەن دزێک لەوێیـە، وئیحتیمالـەن بـەژن و منـداڵی وی حەملەبکات، بۆ لای دەنگەکەگەڕا وە، وبەشێواوی لێی پرسی، چ خەبـەرە؟ کوا دز؟ ئەو کابرای کەهاواری کردبوو پێیکوت وەرەجێی پێی ئەو دزەت پێ نیشان بدەم،ئەو شوین و جێ پێیـەبگرە هەتا دەگەیەدزەکە، ساحەب ماڵ لەبیستنی ئەو قسەیە، زۆر تووڕەبوو، وبە توونـدی پێیکوت ئەی نـەفامی ئەحمـەق، دەڵـەی چی؟ ئـەمن دزی خـۆم پەیـدا کردبـوو، وهێنـدەی نـەما بـوو کـەبیگرم، ۆلەبەرداد و فەریادی تۆ بەجێم هێشت، تا زەئەتۆ بەمن دەڵەی جێ و شوێنی لاقی لێرەیە؟

...ک ئـەوەی چـوو،یـەک نەفەردی،دز،لـەماڵ　　دز هـەڵات و،کەوتـەدووی دز،وەک شـەماڵ (٢٧٩٣)

...دووسێ مەیـدان بـەدوو ی دا چوو،بـەغار　　ئارەقــــەی وەک جـــۆ گەپێدا،هاتـــەخوار (٢٧٩٤)

...هێنـدەغاری دا بـەدووی دز، ئـەو نەفـەر　　چـــی نـــەمابوو دەســـتی باوێژێتەســـەر (٢٧٩٥)

...ک دزی دی بـانگی کـرد، هـۆی، کـابرا　　چـاو لـەلای پشـتت، بـەلات،بۆ چـاکرا (٢٧٩٦)

...ۆکـەلای پشـتت لـەبۆ لای مـن هـەڵێ　　تـا بزانـی دۆسـتی خـۆت چـت، پێـدەڵێ (٢٧٩٧)

...ـدەکوت ئـەو، ڕەنگەلـــەو لا،دزهـــەبێ　　گـەر نـەچم مـن ڕەنگەحەملـەی کـەن بـەمن (٢٧٩٨)

حەملەکـەن بـۆ مـاڵ و بـۆ منـداڵی مـن　　گرتنـی وەی، سـوو دی کـوا بـۆ حـاڵی مـن؟ (٢٧٩٩)

...و دەکـا گـازم لەبـەر لوتـف و،کـەرەم　　گـــەر نەچم،ئاخر،لـــەبۆ مـــن، دێ نـــەدەم (٢٨٠٠)

جێکـەپێی وابـوو کـەکابرا ڕاس دەڵـێ　　جێـی دەهێشـت دز، هاتـەڕێگای ئـەووەڵێ (٢٨٠١)

...دەکوت ئەی دۆستی باش و خـۆش ئـەدا　　تـۆ لەبـەرکێت کـرد وا،بانـگ و نـەدا؟ (٢٨٠٢)

...دەکوت جێی لاقی دز، زۆر، جـوان، دیار　　بێـرەدا ڕۆ یشـتووە،پڕ نـەنگ و عـار (٢٨٠٣)

...ی شـوێنی ئـەو دزەی، زۆر بـێ شـەرەف　　تـۆ بـەدووی وی دا بچوو،بـۆ ئـەو تـەرەف (٢٨٠٤)

...دەکوت تـۆ زۆرنـەفام و بـەد ئـەدای　　مـن دزی خـۆم گرتبـوو گـەر تـۆ نـەبای (٢٨٠٥)

دەنگی‌تۆم‌بیست،جێم‌دەهێشت،دز،سەرسەری — تۆم،بەئادەم زانـــی، نەمزانی،کـــەری

بـــەس بڵـــێ بێهوودەبــۆ مـــن ئـــەی فـــڵان — گرتبـــوو م حەق،نامهـــەوێ،نام و نیشـــان

پێیدەکوت حەق ئەوهەیە‌پێم دای نیشـان — مـــن لەحـــەق زۆرشـــارەزامە، ئـــەی فـــڵان

دوژمـــنم دیتـــا، بـــەدووی خـــۆم، ڕاکشـــان — تـــۆ نـــەجاتت دا، نیشـــانت،دام نیشـــان

بـــێ جیهـــاتم تـــۆ دەکـــەی باســـی جیهـــات — بـــۆ ویســـاڵ،ئایات و بـــەیینات، نـــەهات

هەرکەسێکی کرد،لەزات مەحجووب،سیفات — غـەیری مـەخلووق،چی وەبـەرچاوی نـەهات

واسیلان چون غەرقی زاتن ئەی جەوان — قەت تەماشای هیچ سیفات، تا کەن ئەوان

گەر سەری خۆت تۆ بەری بۆ ژێری ئاو — کـوا دەبینـی ڕەنگـی ئـا وێ، تـۆ بـەچاو؟

سـەر دەرێنـی تـا ببینـی ڕەنگـی ئـاو — تـۆ لەدەسـتت دا،شـعووری خـۆ ت تـەواو

بـــۆ خەواســـان،تاعەتی عامـــە، عیقـــاب — بـۆ خەواسـان وەسـڵەتی عامـە، حیجـاب

شـــا،وەزیرێک گـــەر بکاتەموحتەســـیب — شـا، لـەبۆ وی دوژ منـە،خۆ نـەک موحیـب

بـێ گومـان کردوویـەجورمێک ئـەو وەزیـر — بێ سـەبەب نـابێ لەزینـدان کـەس ئەسـیر

ئەو کەسەی بوو هەر لەئەووەڵ، موحتەسیب — ئـــەو لـــەوێ ڕا،ڕزق و ڕۆزی بوونەســـیب

گەر وەزیر بۆ شا ببێ، ئەووەڵ، بەڵام — موحتەسیب کردن،سەبەب کاری حەڕام

شا، لەلای دەر بانگی لای خۆ ت کا ئەگەر — دوایـــە، دەرکا،ئـــەو، ئـــەتۆ، بـــۆ لایـــی دەر

بێ گومان کردووتە بەد، ئەو جارە تۆ — جەهلە، نیسبەت دەی بە جەبر، ئەو کارە تۆ

جا ببێژی قیسمەتی مـن، وا دەبوو — بـۆ لـەپێش دا دەو لـەتت، دەس دا دەبـوو؟

قیسمەتی خۆت، تۆ لەخۆت دەبڕی ، بەجەهل — زیـاد دەکـاتن قیسـمەتی خـۆ، پیـاوی ئـەهل

**داستانی چا کردنی مونافقان مزگەوتی زیرار ..**

**خولاسەی داستان...**

مونافقان لەبەرڕەقابەت دەگەڵ مزگەوتی(قبا) مزگەوتی زیراریان چاکرد، ولەپێغەمبەر یان داوا کرد کەدەوێ دا نوێژ بکا، وئیددیعایان دەکرد کەئەو مزگەو تەیان بۆ خۆراک دان بەفەقیران و پەنا دان بەبێ پەنایان چا کردووە. پێغەمبەر(ص) پێیکوتن ئەلئان خەیاڵم وایە بچمە مەنتەقەی تەبووک، و ئەگەر لەو خەزایە گەڕامەوە، دێمە ئەو مزگەوتە، پاش ئەوەی کە لە تەبووک. گەڕاوە، داخوازی خۆیان لێ دووپات کردەوە، دەو بەینەدا ئایەتی(١١٠ـ ١٠٧) سوورەتی تەوبە. نازڵ بوو، و قەست و، مەڕامی پیسی مونافقانی ئاشکرا کرد .. حەزرەتی پێغەمبەر(ص) دەستووری دا کە ئەو مزگەوتە وێران بکەن و جێگایەکەشی بکەنە ئەشغالدان .

ـەک میسالی دی دەڵـەم،بۆ کـەج ڕەوی    من لەقوڕئا ن بۆ ت دەڵەم،تۆش گوێ دەوی (۲۸۲۵)
ـەو قومـاری خـوار ی جووتەیانـەتاق    زوو شکەسـتی دان،نەبی،ئـەهلی نیفـاق (۲۸۲۶)
جـا دەکـەین بـۆ قـەدری دینـی ئەحمـەدی    مەسـجیدێک، ئـەمما مـەڕامیان بـوو بـەدی (۲۸۲۷)
ـەکرو فێڵیـان زۆر ئـەوا ن بـەر پـا دەکـرد    مەسـجیدێکی دیکـەیان، جـا، چـا دەکـرد (۲۸۲۸)
ـەرشـو سـەقف و قوببەکـەی ڕازا وەبـوو    بـۆ جـودائی مـوئمنین، لـەو نـا و ەبـوو (۲۸۲۹)
حـا لـەبۆ لای ئەحمـەدی هـاتن بـەعام    دا دەنیشـتن،زۆر،بەقەدر و ئیحتیـڕام (۲۸۳۰)
ـەی نەبی حەق،بەس لەبەرلوتف و کەڕەم    تـۆ لـەنێو ئـەو مەسـجیدەی،دانێ، قـەدەم (۲۸۳۱)
ـ موبـارەک کـا، ئـەوی، ئەقـدامی تـۆ    تـا قیامـەت خـۆش ببـێ، ئـەییامی تـۆ (۲۸۳۲)
ـەسـجیدێکەلازمەزۆر دێ،بـەکار    ڕۆژی بارانـا ن و، ڕۆژی ئیفتیقـار[1] (۲۸۳۳)
ـا غـەریب و بـێ نـەوایان بێنـەوێ    تا کو زۆر بن جێی وەها چاک، دەن هەوێ (۲۸۳۴)
ـ شـیعاری باش،گـەلێک،بۆ دیـن دەبـێ    چـون دەگـەڵ یاران،تـاڵ، شـیرین دەبـێ (۲۸۳۵)
ـاعەتێک تـۆ بێرەبـۆ ئـەو مەسـجیدە    پـاک کـەوە، ئێمەلەهـەرچێکی بـەدە (۲۸۳۶)
ـەسـجید و مەسـجیدیان جێـی لـوتفی تـۆن    بێرەلامان،ئێمەشـەو، تـۆ مـانگی بـۆن (۲۸۳۷)
ـا جـەماڵت ڕوون بکا،شـەو، ئاشـکرا    ئـەی جـەماڵت بـۆ شـەوانی تـار، چـرا (۲۸۳۸)
ـەت بریبـا، ئـەو وتـار، ئـی دڵ بیـا    تـا مـەڕامی گشـتیان، حاسـڵ ببـا (۲۸۳۹)
ـەر بـەبێ دڵ گفتـی خـۆش بێژیـت، زار    وەک ببێـتن جێـی کەسافەت،سـەوزەزار (۲۸۴۰)
ـۆ لـەدوور ڕا لـەو بنـۆ ڕەو ڕابـرە    تـۆ لـەبۆ ن و خـواردنی، دەس ڕاگـرە (۲۸۴۱)
ـردی وێـران بوویـەلوتفی بـێ وەفـا    هـەرچی پێیدا ڕۆی، کـەووت، دیتـی جـەفا (۲۸۴۲)
ـەرکەسـێکی لاقـی بـۆ ئـەو پردەبـرد    جـێ بەجێ،دەشـکێن هـەردوو، لاق و پـرد (۲۸۴۳)
ـەر لـە هـەرجێ لەشکرێکیان دا شکەست    بـوون بەباعیس،چەنـد نەفـەر ئـەفرادی پەست[2] (۲۸۴۴)
ـێ بەدەس دەگرێ سیلاح،دێ توند و تۆڵ    وا دەزانـن، ئـەو دەکـا، دوژمـن، بـەخۆڵ (۲۸۴۵)
ـەرکـەدیتی یـەک بـرین هەڵـدێ، بـەغار    دەشـکێ پشـتی تـۆ، کەئـەو کـردی فیـرار (۲۸۴۶)
ـێ:ئێمەبـەس بکـەین لـەو باسـە، بـا    مەتڵـەبن ئێمەلـەدەس دەڕوا، دەنـا (۲۸۴۷)

---

1- مەسجیدێکەلازمە،زۆر وەخت و کات    ڕۆژی فەقر و ڕۆژی بارانەی کەهات
2- بوون بەباعیس چەن کەسانێک، سست و پەست (مصرع دوم)

**فێڵ بەکارهێنانی موونافقان، تا پێغەمبەر (ص) ببەنە مەسجیدی زیرار...**

فێڵـی زۆ ریـان بـۆ ڕەسـوول، بـردن بـەکار تـــا بچێ،بــۆ مەسـجیدی فیتنـــەی زیـــرار ۰۴۸)
ئــــەو ڕە ســــوولی میهرەبــــان ونامــــدار هـەر بـەڵێ و، زەردەی لەسـەر، دوو لێوو زار ۰۴۹)
زۆ ر سپاســـی کـــرد پێغەمبـــەر لـــەوان قاسـیدانی شـاد دەکـردن، جـوابی جـوان ۰۵۰)
مـــەکرو فێڵـــی وان لـــەوی مـــەعلووم بـــوو وەک لـەنێو شـیر دا هـەبێ،زۆر زۆ ر، مـوو ۰۵۱)
مـــووی هـــەموونا دیـــدەگرتن ئـــەو، لـــەتیف شیری تەحسـین کـرد ئـەمما، ئەونـەزیف ۰۵۲)
مـەکرو فێڵیان کـرد مونـافق، سـەت هـەزار گشـــتی نادیـــدەدەگرت ئـــەو هووشـــیار ۰۵۳)
ڕاستی فەرموو بەحری ڕەحمەت، سەر وەرم موءمینـــان،بۆ یـــان لـــەخۆ یـــان چـــاترم ۰۵۴)
وەک ئـــــەمن دانیشــــتبم لای ئــــاگری ئاگرێــــک ســــووتێنەری دەو رو بــــەری ۰۵۵)
وەک پـەپوولان دێـن لـەبۆلای نـار، بـەغار دەسـتی مـن دەرتـان دەکـا، تـا نەچنـەنار ۰۵۶)
کـاتێ ویسـتی بچتـەلای مەسـجید، ڕەسـوول دەنگی حـەق هـات،گوێ مـەدەئاوازی غـووڵ ۰۵۷)
هـــەرچی کردوویانەفێڵـــە، هـــەر هـــەموو فێڵەگشـــــتی، نادروســــتە، ئـــــاوەژوو ۰۵۸)
قەسـتی وان بـوو، دینـی تـۆ نـابوود بکـەن کۆمـەکی دیـن کـۆا نەسـاڕاو، جوولەکـەن؟ ۰۵۹)
پـردی دووزەخ،جێـی بـەنای ئـەو مەسـجیدە ویسـتییان فێـڵ، لـەو خودایـەی واحیـدە ۰۶۰)
قەسـتی وان تـــەفریقی یـــاڕانی ڕەســـوول کـوا دەزانێ،قـەدری زاتـی حـەق، فـزوول؟ ۰۶۱)
تـــا لەشـــام ڕا جوولـــەکێکی بێننـــەوێ جوولـەکانیش پەنـد و وەعـزی ویـان دەوێ ۰۶۲)
پێکـوتن جـــا، ئـــەو ڕەســـوولی مورتـــەزا دێـم، بـەڵام، ئێسـتا دەچـم مـن، بـۆ خـەزا ۰۶۳)
لـــــەو خەزایەهاتمەوەگـــــەر ئەوچەلـــــە دێم دەکەم بۆ چوونی ئەو مەسجید پەلە ۰۶۴)
پـاش ئـەوەی کەچوولـەبۆ لای جـەنگ ئـەو فێڵـی فێڵبـازانی کـرد، بـێ دەنـگ ئـەو ۰۶۵)
گـەر گەڕاوە،ئەونـەبێ، نامـدادر لەجـەنگ ویسـتییان وەعـدەی وەفـا کـا، بـێ درەنـگ ۰۶۶)
خــــوا کوتی،تــــۆ بێژەئەحمەد،ئاشــــکرا زوڵمی وان، بێ باک بە، گەر جەنگیش کرا ۰۶۷)
پێیکـوتن ئـەی قـەومی زۆر ناپـاک و پـیس بـەس بڵێن،تـا پێ و، نـەڵێم، چیتـان لـەکیس ۰۶۸)
چەن نیشانەی کوت لەزۆ ر ئەسرارِی وان لێــک درا، ئـــاڵۆز دەبوو،جا،کـــاری وان ۰۶۹)
قاسـیدان ڕۆیـین لـەوێ هـەر ئـەو زەمـان ویـردی وان بـوو، هـەر پـەنا، بەخوای جیهان ۰۷۰)
بوون مونافق گشتییان موسحەف بەدەست هاتنـەلای ئەحمـەد، بەمـەکرو فێڵـی پەسـت ۰۷۱)
تـا لـەلای پێغەمبـەری خـوا سوێن بخۆن خـواردنی سـوێن، بـۆ بـەدان ڕەسـمێکەکۆن ۰۷۲)
شەخسـی فاسـید چـون وەفـاو دینـی نییـە ســـوێندوپەیمان،کوا دەزانـــێ ئـــەو چییـــە؟ ۰۷۳)

شەخسی ڕاس قەت هیچ سوێندێک ناخووا | چونکەڕوونی کرد دووچاوی وی خووا (٢٨٧٤)
عەهدو پەیمانیان دڕۆیەئەحمەقان | عەهدو پەیمانیان دروستەسادقان (٢٨٧٥)
دەیکوت ئەحمەد سوێندی کێ، بڕوا بکەم؟ | سوێندی ئێوەیا بەسوێندی خوا، بکەم؟ (٢٨٧٦)
ئەو چەلەش سوێندیان دەخوارد،وەک چەندجار | دەس بەقوڕئان،مۆری ڕۆ ژوویان لەزار (٢٨٧٧)
سوێن ئەە، بەو قورئا نی پاکی کردگار | بۆ خودان چاکرد، مەسجید، نەک زیرار (٢٨٧٨)
مەکر وفێڵ و حیلەهیچ دەو دا نییە | قەس لەویدا، غەیری زیکری خوانییە (٢٨٧٩)
دەیکوت ئەحمەد دیتەگوێم دەنگی خودا | وەک لەکێوێک مونعەکیس بێتن سەدا (٢٨٨٠)
هەر دووگوێی ئێوەی خودا کەڕ کرد هەتا | قەت نەبیسێ گوێچکەتان دەنگی خودا (٢٨٨١)
ئێستەدەنگی حەق دەبیسم ئاشکرا | بۆ سەدای وا، دیاکرا جێ، باشکرا (٢٨٨٢)
هەروەکوو موسا، لەلای دارێکی بیست | دەنگی حەق،دەیکوت بەوی، ئەی خۆشەویست (٢٨٨٣)
ئەو لەدار (انی انا اللّا) ی، هاتەگوێ | بوون دەگەڵ ئەو گفتە، نووری جوێ بەجوێ (٢٨٨٤)
جوێ بەنووری حەق نەیان ما، هێزی لەش | سوێندیان دەس پێدەکردن ئەو چەلەش (٢٨٨٥)
چون خوداوەند، ناوی سوێندی، نا، مەتاڵ | لەو مەتاڵەغازی ناکا، دەس بەتاڵ (٢٨٨٦)
ئەوچەلەش ئەحمەد، بەتەکزیبی،سەریح | پێیکوتن ئەو( قد کذ بتم ) زۆ رفەسیح (٢٨٨٧)

## فکر کردنی یەکێک لەیارانی پێغەمبەر(ص) کەبۆچی پێغەمبەر، سوڕپۆشی ناکا..

ئەبیەجێیەک یەک لەیارانی ڕەسووڵ | هاتەقەلبی،بۆ ڕەسوول نا کا قەبووڵ؟ (٢٨٨٨)
چاو چلۆن پیرانی با شەرم و ویقار | بوون بەدەس پێغەمبەری، وا شەرمەزار (٢٨٨٩)
کوا کەرەم، کوا عەیب پۆشی، کوا حەیا؟ | سەت هەزاریان، عەیب پۆشین ئەنبیا (٢٨٩٠)
تەنەبێت بەو ڕەخنە، ئەو هیچ شەرمەزار | ویستی تا لەو خۆشببێتن کردگار (٢٨٩١)
هەرچی دۆستی بێ موناففق،وا دەبێ | عاقیبەت هەر وەک ئەوی ڕیسوا دەبێ (٢٨٩٢)
شێوەنی گێڕا کەئەی دانایی ڕاز | تۆ لەقەلبم لابەرە، ئەو ئیعتیراز (٢٨٩٣)
خۆزگەدڵ وەک چاو، دەدەستم دا ببا | زۆر بەرق، ئاگرم دەدا، دەم دا بەبا (٢٨٩٤)
دەو خەیاڵ و،بیرەدا بوو،چوودەخەو | مەسجیدی وانی دەدی،پڕپەینە،ئەو (٢٨٩٥)
زۆربەپیس ئالوودەبوون بەردانی وی | دووکەڵی لێدەر دەهات سەربانی وی (٢٨٩٦)
جێ گەرووی وی دووکەڵ و، ئێش هاتەئەو | هەربەئێشی نێو گەروو، هەستا لەخەو (٢٨٩٧)
جێ بەجێ،هەستا، دەگریا،زارزار | مونکیری وای کرد لەمن، ئەی کردگار (٢٨٩٨)

حــیلم وســەبرو بوردبــاریم نــا هــەوێ — گــەر دڵــم ســاتێک، لــەئیمان دوور کــەوێ (٩
گەرلــەکاری ئــەهلی ســوورەت بی،دەقیــق — گــەن دەبینــی بــاتینی وان، ئــەی ڕەفیــق (٠
گشــتیان بــێ مــەغزوبێ عــەقڵ و شــعوور — ســادقان گشــتیان لەعــەیبان بــوون بــەدوور (
ئــەو گرووهــەزۆر تەلاشــیان کــرد هــەتا — بــێن خــەرا کــەن مەســجیدی ئــەهلی قوبــا (٢
هــەروەکوو ئەســحابی فیــل چاکیــان دەکــرد — کەعبەیەک،خواش، زووئەوی، وێران دەکرد (٣
قەســتییان بــوو کەعبــەوێران کــەن ئــەوان — باســی وانــی خــوا، دەقورئــان، کــرد بــەیان (٤
ئەوکەسەی دین، نەی بوو لای وی ئیعتیبار — هــەرعیناد و مــەکرو فێــڵ بــۆی، بــوو بــەکار (٥
دیتیــان ئەســحاب ئــەو مەســجید، دەخــەو — ئاشــکرا بــوو، بــۆ هــەموویان ســیڕڕی،ئەو (٦
گەربڵــەم خــەونی هــەموویان یــەک بەیــەک — زوویەقین مەعلووم دەبێ لای ئەهلی شەک (٧
مــــن دەترســــێم،زۆر لەکەشــفی ڕازی وان — نــا زەنیــنن، نــاز لــەوان، زۆر دێ جــووان (٨
هەربــەبێ تەقلیــد شــەرعیان کــرد قــەبووڵ — بێ مەحــەک کردیــان زێــڕی نــاب، وســووڵ (٩
حیکمــەتی قورئــان، و... بــووی، موئمینــە — خۆلەون بوو ی خۆی هەمووکەس موقینە (٠

## داستانی ئەو کەسەی کەلەوشتری وُن بووی خۆی، دەگەڕا..

وشترێک وُن کەی، ئەگەر وەدوای کەوی — گـــەر کـــو دیتت،چۆنـــەنای ناســـی،ئەوی (١
دیــار دەکــا تــۆ وشــترت لــێ ون بــووە — ئــەو لەدەســتی تــۆ هــەڵاتوە، دەرچــووە (٢
حــازری کــرد کــاڕوان، بــارو بنــە — وشــتری تــۆ دیــار نییــە، دیارە،ونــە (٣
تــۆ، بــەتینوویی،دەچی، بــەدوایی، ئــەو — کــاروان دوورکـــەوتووە، نیزیکەشـــەو (٤
زۆ رلــەجێی بــیم، ماوەماڵــت، ســەر زەوی — تــۆ، بــەدووی وشــتر، وەکێــوو، کەژ،کــەوی (٥
ئــەی موســەڵمانان، کــێ دی، وشــترێ — ئا خوری جێ هێشت، ئەو چوو بۆ، دەرێ؟ (٦
هەرکەســێک بێــژێ نیشــانەی وشــترم — مــن لــەبۆ مزگێنــی دان، بــەو حــازرم (٧
تــۆ نیشــانەی وی دەڵــەی، بــۆ هەرکەســێ — ئــەو دەمــەجا، مەسخەرەی، بــۆ هەرخەســێ (٨
یــەک دەڵــێ دیم،وشــترێک لــەو لایــە،بوو — ڕەنگــی ســوور بوو،هــا، لەبۆئەوگیایــەچوو (٩
یــەک دەڵــێ، دیــتم، بــڕا بــوو، گــوێی،وی — یــەک دەڵــی دیــم، بــەو جلــی زۆر،نــوێی،وی (١٠
یــەک دەڵــێ دیــم چــاوەکی وی پــووک بــوو — یەک دەڵی،گڕوێ بوو ئەو، بێ تووک بوو (١١
بەس،لەبــەر مزگێنی،زیــاتر زۆر لەســەد — نێــوو، نیشــانیان دەکــوت ئەشخاســی بــەد (١٢

**نیگەران بوون لەنێوان مەزاهیبی موختەلیف و ڕێگای نەجات پەیدا کردن...**

(۲۹۲۳) وەک کەسێکی زاتی حەق تەعریف بکا     هەر چلۆن ویستی، ئەوی، تەو سیف بکا
(۲۹۲۴) جوورەکی دی،شەرحی وی،دا، فەلسەفی     یەک موحەققیق،کردی قەولی وی، نەفی
(۲۹۲۵) سووەمی دێ ڕەد دەکا،گوفتاری وان     بۆ نیفاق، چوارەم،دەڵێ،گوفتاری جوان
(۲۹۲۶) یەک بەیەک نیشانەیان کردن ئەدا     تا ببێژن، شارەزاین، دەو کووچەدا
(۲۹۲۷) کاری وان باش و خەرابیان، تێکەڵین     گشتی باش بن، یا خەراب بن، وا کەنین
(۲۹۲۸) باتڵان زاهیر دەکا، حەق وەک چرای     زێڕی مەغشووش دەکڕێ، نادان، زێڕە، لای
(۲۹۲۹) گەردەدونیادا نەمێنێ، زێڕی ناب     کوا دەبێ ئەرزیش لەبۆ زێڕی خەراب؟
(۲۹۳۰) تا نەبێ ڕاس،چۆن درۆ پەیدا دەبێ؟     چی درۆ بێ،گشت لەڕاستی، چادەبێ
(۲۹۳۱) هەر بەهیوای ڕاستی تالیب،بۆ درۆن     ژەهری تێکەڵ قەن دەکەن دوایەی، دەخۆن
(۲۹۳۲) گەنمی جوان وخۆش و مەحبووب گەرنەبێ     چۆن دەبا عەللافی دووڕوو،سوود، ئەدی؟[1]
(۲۹۳۳) جا مەڵێ،تۆ گشت ئاڕا،باتڵن     بەس، بەبۆی حەق، باتڵان،بەداوی دڵن
(۲۹۳۴) جا، مەڵێ گومڕا هییە،گشتی خەیاڵ     چون خەیاڵ نابێ لەڕاستی، قەت، بەتاڵ
(۲۹۳۵) حەق شەوی قەدرە، لەنێوان زۆر شەوان     تا شەوانی دی بکا، گیان ئیمتیحان
(۲۹۳۶) شەو هەموویان قەدر، نینە، ئەی جەوان     خۆ لەقەدریش خاڵی نینە، گشت شەوان
(۲۹۳۷) نێو فەقیران، یەک فەقیری بێ نەوا     ئیمتیحان کە، باش بێ، بیکە، ڕەهنەما[2]
(۲۹۳۸) موئمینی هووشیارو زیرەک، کوا؟ هەتا     لێک جودا کا، حیزی نا مەردو، فەتا
(۲۹۳۹) ماڵی مەعیوو ب گەر دەدونیا دا نەبا     ئەبلەهان تاجر ببان، گشتیان، دەبا
(۲۹۴۰) گەرنەبێ عەیب، ماڵ ناسین،سەهلەسەهل     فەرقێ، ناکا،ئەو دەمە، نا ئەهل وئەهل
(۲۹۴۱) گەر مەتاع و ماڵ نەبن هیچ عەیب،دار     هیچ عەقڵێک بۆ تەمیزنایەت بەکار
(۲۹۴۲) هەرچی بێژێ،گشتی حەققن، ئەحمەقە     هەربێژێ گشتی باتڵ ناحەقە
(۲۹۴۳) تالیبانی ئەنبییا بوو ن بەهرەوەر     تالیبانی ڕەنگ و بۆ، کردیان زەرەر
(۲۹۴۴) ماڵی دونیا دیتەبەرچاو چەشنی مار     وا تەمیزکەچاو،کە نەی بێ هیچ غوبار
(۲۹۴۵) هیچ مەنۆڕە،تۆ ئەلەو بەیعەو، لەسوود     تۆ بنۆڕەزیانی فیرعەون و سەموود
(۲۹۴۶) ئاسمانێکی کەوا جوانەو، بەفەڕ     خوا دەفەرمووی (ثم ارجع البصر )

---

[1]- گەنمی جوان و خۆش و و مەحبووب، گەر نەبا     چۆن ئەدی عەللافی دووڕوو ، سوود، دەبا
[2]- یەک لە نێوان خەر قەپۆشانی فەقیر     ئیمتیحان کە، حەق کەبێ ، بیکە ئەمیر

یەک نەزەرقانع مەبە، لەو سەقفی نوور
زۆر بنۆڕەتۆ لەوی (هل من فطور)

چوون کوتوویەحەق لەئاسمانان، ئەتۆ
چاک بنۆڕە،وەک کەسێکی عەیب جۆ

ئەو زەمینەی تیرەهەم تار و،نەوی
چەندی لازم بوو، بنۆڕی، تۆ لەوی؟

تا لەبۆمان ساف لەناساف،جوێ کرێ
عەقڵی ئێمە، چەن دەبێ، زەحمەت درێ؟

ئیمتیحانانی زمستان و خەزان
گەرمی هاوین و، بەهاری،وەک گییان

بایی زۆر و هەو ری زۆرو بەرقی زۆر
تا کو پەیدا کەن عەواریز، فەرقی زۆر

تاکودەر خا هەرچی تێیدابێت،عەرد
بێ تەفا وەت لەعل و گەو هەر،یانەبەرد

چی دزی بێ،عەرد، زۆر بێ یانەکەم
لەو خەزانەی زاتی خوای دەریای کەرەم

جا دەڵێ دارۆ غەکەی،تەقدیر بەو
بێژەچیت برد لەو خەزانە، بێ درەو

جا دەڵێ خاک نەم دزی من هیچ لەگەنج
بۆیەدارۆغەدەدا، ئەو، زۆر شکەنج

جار دەکا،دارۆغەگەڵ وی لوتفی خۆش
جار دەدا ئا زاری وی دەی با لەهۆش

تا لەنێوان قەهرو لوتف، ئەسرار،جا
بێنەدی، بەو ئاگری خەوف و ڕەجا

لوتفی دارۆغەی خودایە، خۆ بەهار
پایزیش تەهدیدی زاتی کردگار

چوار میخی مەعنەوی زستانە، خۆ
تا کوئەی دز ئاشکراکەی خۆت، ئەتۆ

بەستی دڵ دێ، بۆ موجاهید،جارو بار
جارو بارەش ئەو بەقەبزی دڵ، دوچار

چونکە ئەو ئاو و گڵی ئەبدانمان
بوون بە دز، بۆ ڕەوشەنایی گیانمان

حەق تەعالا،گەرم و ساردو،ڕەنج و دەرد
دا یدەنا سەرجیسممان،ئەی شێرەمەرد

ترس و برسی بوون و، نەقسی ماڵ و تەن
گشتی بۆیەن تاکوگیان، زاهیربکەن

ئەو وەعید و، وەعدەدێن، بۆ ئادەمی
باش و بەد تا لێک جودا کەن، ئەو دەمی

حەقق و باتڵ،چونکەهەردوو لێک دران
زێڕی باش وبەد، دەیەک کیسەی کران

لازمەئەو دەم،ببێتن یەک مەحەک
زێڕی باش و بەد عەیان کا،یەک بەیەک

ئاشکرا بێ، بەو، هەموو فێڵ و ڕییا
باش و بەد بکرێن بەوی،بۆ ن،لێک جیا

شیربدە، ئەی دایکی مووسا،دوایەتۆ
بیخەدەریا،بێ خەیاڵ بە، غەم مەخۆ

هەرچی لەو شیرەی دەخوارد، ڕۆژی ئەلەست
چەشنی مووسای،شیرناسین،هاتەدەست

گەر تۆ بۆ تەشخیسی تیفلت،مولعی
ئەی تۆ دایکی مووسا، ئێستا، (ارضعی)

شیری دایکی،تامی تا بێ زاری وی
تا نەکا بۆ شیری بەدکار، سەرنەوی

## شەرحی قازانجی حیکایەتی ئەوکەسەی دەیهەوێ وُشتری ون بووی خۆی پەیدا بکا...

ۆشترێکت وُن دەکرد ئەی خۆش ئەدا    هەرکەسەی نیشانەیەک،لەو، پێت دەدا (۲۹۷۳)
هیچ کەنازانی لەوُشتر،جێی و مەکان    بەس دەزانێ ئەونیشانانە،خەتان (۲۹۷۴)
یەک نەفەر هیچ وشتری لێ ون، نەبوو    بۆ جیدال و مەعرەکەبەدوایی چوو (۲۹۷۵)
ۆشترم ون بوو،دەڵێ نێو عالەمێ    هەرچی پەیدای کات، پاداش دەیدەمێ (۲۹۷۶)
تا دەگەڵ تۆ وشتری پەیدا دەکا    بۆ تەماعی وشتری تۆ، وا دەکا (۲۹۷۷)
تۆ بەهەرکەس بێژی ئیشتیبان، نیشان    هەروەکووتۆ گاز دەکا،ئەو، ئیشتیبان (۲۹۷۸)
ئەو کەناناسێ نیشانەی ڕاست و خوار    قەولی تۆی کرد ئەو موقەللید، ئیعتیبار (۲۹۷۹)
گەر ببێژن ڕاس،یاوەک ڕاس، نیشان    بۆ ت یەقین حاسڵ دەبێ، تۆ بێ گومان (۲۹۸۰)
ئەویەقین بۆ گیانی ڕەنجوورت شەفا    ئەو لەبۆ ساغی و لەبۆ ڕەنگت، سەفا (۲۹۸۱)
ڕوون دەبێ چاو،لاق دەگرێ،هێزی چوون    تەن دەبێ گیان،گیان دەبێتە،ڕووحی ڕوون (۲۹۸۲)
جا دەڵەی تۆ، ڕاستەقەولت، ئەی ئەمین    ئەو نیشانانەت دروستن، زۆر یەقین (۲۹۸۳)
هەن دەوان دا، ئایەتی زیاتر، لەحەد    بۆ نەجات بوون، ئەو نیشانانەن، سەنەد (۲۹۸۴)
تۆ دەڵەی ئەو دەم نیشانەی، دا، بەتۆ    وەختێ چوونەپێش قەڕاووڵ، بە، بڕۆ (۲۹۸۵)
من بەدووی تۆ دا دەڕۆم، ئەی، ڕاستگۆ    چاک دەزانی،وشترم، لەکوێ یە،تۆ (۲۹۸۶)
ئەو کەسەی وُشتر نەبوو،هیچ ماڵی ئەو    بەس لەبەر تەقلید گەڕا،ڕۆژان و،شەو (۲۹۸۷)
ئەو نیشانانە، یەقینی زیاد نەبوو    غەیری نەقشی ناقەجۆ، چی یاد نەبوو (۲۹۸۸)
دەتەبیری ئەو هەموو سەعی و تەلاش    ئەو هەراو هوریایە،نابێ قەت بەلاش (۲۹۸۹)
گەر چی ئەو، لەو وُشترە، حەقدار نییە    وُشتری ویش،ون بوووە، لێی دیار نییە (۲۹۹۰)
تۆ تەماعەی وُشتری غەیر،چاوی بەست    چوو،لەیادی ئەو،کەچی چووبوو،لەدەست (۲۹۹۱)
ڕۆ لەدووی ساحەب شتور لێرەو لەوێ    بۆ تەماع،تا وُشتری خۆی دەس کەوێ (۲۹۹۲)
ڕاستگۆیەک کازیبێک،بۆ هەمدەمی    ئەو درۆی، وی، بوو بەڕاستی، ئەو دەمی (۲۹۹۳)
لەو بیابانەی کەوُشتر هات وەدی    وُشتری خۆ ی،دیتەوە،کابرایی دی (۲۹۹۴)
کاتێ وای دی، وُشتری خۆی هاتە، یاد    بوو بەئی خۆی، نەک بەئیدی، زێدەشاد (۲۹۹۵)
ئەو مو قەللید، بۆ موحەقیق، زۆر،بەفەن    کاتێ دیتی،وُشتری خۆی، نێو،چەمەن (۲۹۹۶)
کاتێ دیتی، ئەو دەبۆ، دڵخوایی،وی    تا کو نەیدی، هیچ نەچوو بەدوایی،وی (۲۹۹۷)
جا، لەپاشان،ڕێکەوُت،تەنهاوو،بەس    نەی دەنۆڕی غەیری ناقەی خۆی، لەکەس (۲۹۹۸)

پێیدەکوت سادق،منت، بۆ هێشت، تەنێ؟
ئەی ڕەفیقی ئاوەدانی و، بەندەنێ

جوابی داوەتا کو ئێستا بووم، نەفام
چاپلووس بووم و، تەمەعکاری، تەمام

گەربەجیسم و مەتڵەبم، من لێت جودام
من دەگەڵ تۆ هاوعەزابم، هاو مەڕام

من سیفاتی وشترم دەدزی،لەتۆ
بێ نییاز بووگیان، کەدیتی،ماڵی خۆ

تا کو نەمدیبوو، نەبووم تالیب، بەوی
سەر بڵێندەئێستەزێڕ، مس سەر نەوی

من گوناهم بوو بەتاعەت، خوایەشوکر
هەزلی من چوو،هات سەداقەت،خوایەشوکر[1]

بەو گوناهانەم گەیشتم چون، بەحەق
لێی مەدەتۆ، لەو گوناهانەم،بەشەق

تۆ کەتالیب بووی، سەداقەت،بۆ سەبەب
باعیسی سیدقی منیش، جیددو تەلەب

سیدقی تۆ باعیس بوو، کردت وا،تەلاش
بەس تەلاشم ئەمنی برد، بۆ سیدقی باش

تۆ وی خۆشبەختیم دەچاند دەو عەردەدا
من بەبێ گاریم دەزانی، کاری وا

کاری بێگاری نەبوو ئەو پڕ سەمەر
هەر لەدەنکێک سەت بەرا بەر، هاتەدەر

چوو دزێک، لای ماڵەکی، بۆ دزیەتی
کاتێ چۆ ژوور، دیتی ماڵی، خۆیەتی

ئەی موقەللید بەس بە، ئەفسوردەو غەمین
تۆ تەلاش کە، تا وەدەس بێنی، یەقین

ئەو دوو وشتر، وشترێک بوون دووکە نا
تەنگە لەفزو، زۆرە مەعنی موعتەنا

لەفز، بۆ مەعنی، هەمیشە ناتەوان
بۆیە پێغەمبەر کوتی (کل لسان)

لەفز، ئوسترلاب دەزانم، بۆ حیساو
کوا دەزانێ، قەدری ئاسمانان وتاو؟

ئاسمانێک ئەو سەمائە، لەو کەمێ
یا هەتاوێک، ئەو هەتاوە، لەو شەمێ

### لەبارەی ئەو مەتڵەبەکەدەهەموونەفسێک مەسجیدی زیرار هەیە...

کاتێ مەعلووم بوو کەئەو مەسجید نەبوو
بەڵکەداوێک بووکەدایان نا بوو،جوو

جا، نەبێ فەرمووی ئەوی وێران بکەن
ئەو، لەبۆ خاشاک، ئەشغاڵدان بکەن

چەشنی ئەو مزگەوتە، بانی ڕوو ڕەشە
دان لەسەر داو،ڕۆ بکەی، کوا بەخششە؟

پارەگۆشتێکی کەدەگرێ،ماسی ئەو
بۆ سەخاوەت کوانێ،دەکرێ، باسی ئەو؟

مەسجیدی ئەهلی قوبا،گەر بوو،جەماد
غەیری هەمتاو،کوفوی خۆی،ئەو، دا، بەباد

چون جەماد نەیکرد زوڵمی وا، قەبووڵ
ئاگری بەردا یە، ئەو مەسجید،ڕەسووڵ

چون حەقایق ئەسڵی ئەسڵان،گشتییان
چاک بزانە،زۆرەفەرقی وان، جییان

---

[1]- من گوناهم بوو بەتاعات، خوایەشوکر    هەزلی من چوو، جید، بووئیسبات، خوایە شوکر

بــۆ حــەیات و مــەرگ،وەک ئیدیکــەنین مــەرگ و ژینــی سووری،کوا وەک مەعنــەوین؟ (٣٠٢٣)
گــۆڕی ئــەو دونیــاو، گــۆڕی دی،جییــان مــن لەدەســتم نایەشــەرحی ئــەو جیهــان (٣٠٢٤)
زیــر مەحــەک کــار دابنــێ، ئــەی هووشــیار چــا نەکــەی،تا تۆش،مزگــەوتی زیــرار (٣٠٢٥)
تــۆ لەمەســـجید چاکەرانت،تەعنـــەدا چاک کەنۆڕیت، وەک ئەوان بووی بەد ئەدا (٣٠٢٦)

**حیکایەتی هیندوو، کە دەگەڵ ڕەفیقی خۆی لەسەر کارێک دەعوای دەکرد و نەیدەزانی کە بۆخۆشی ئەو کارە، ئەنجام دەدا ..**

**خولاسەی داستان...**

چــوار نەفــەر هینــدی چوونەمزگــەو تێــک ودەســتیان کــرد بــەنوێژکردن، دەوەســەتی نــوێژدا موئەززین،هاتەمزگەوت یەکێک لەو چوار نەفەرانەبانگی کرد وپێیکوت ئەرێ نوێژبووە؟ڕەفیقی وی دەنــوێژدا ئــەو قســەی بیســت، وبۆ ئەوەکەموتــەوەججیهی بکا کــەکارێکی خیلافــی ئــەنجام داوەپێیکوت ئەتۆ دەوەسەتی نوێژدا قسەت کردجا،نوێژەکەت باتڵ بوو،هیندی سووەم بەدووەمی کوت.. مامــەگیان بۆ تانەلەڕەفیقی خۆ ت دەدەی؟ نــوێژی خۆ شت باتڵ بــوو، هینــدی چوارەم کوتی خوا شوکر، کەئەمن وەکوو ئێوەبەو خەتایەگرفتار نەبووم ونوێژی من باتڵ نەبوو ..

جــوار هینــدوو، واریــدی مەســجید دەبــوون بــۆ ئیتاعــەت ڕاکیــع و ســاجید، دەبــوون (٣٠٢٧)
یــەک بەیەک جا،نوێژی خۆ یان دا دەبەست زۆر موئــەددەب کاتی نوێژ،بەستیان دەست (٣٠٢٨)
هــات موئــەززین، هاتــەدەنگیش یــەک لــەوان ئــەی موئــەززین، بانــگ دراوە،نــەبوە،یان؟ (٣٠٢٩)
هیــندوویی دووەم کــوتی جــا، بــەو کەســە نوێژەکــەت باتــڵ بــوو، چــون کــردت، قســە (٣٠٣٠)
ســـووەمی دەیکـــوت بـــەدووەم، مامـــە،تۆ بـــۆ دەدەی تانـــان لـــەوی، بیـــدە، لـــەخۆ (٣٠٣١)
جــوارەمی دەیکوت شــوکر بۆ خــوای جیهان نوێژەکــەم باتــڵ نــەکرد،من،وەک ئــەوان (٣٠٣٢)
جیرەکانیــان هــەر چــووار باتــڵ کــران زیــدەتر گــومڕا دەبــن، ئیــراد گــران (٣٠٣٣)
خــۆش بــەحاڵی وەی کەعــەیبی خــۆی دەدی جستو جۆی کرد عــەیبی خۆی،نێو ئیدەدی (٣٠٣٤)
جونکەئینســان چــاکرا، نیــوەی لەعــەیب چاکراوەنیوەکـــەی دیکـــەی لەغـــەیب (٣٠٣٥)
ســەربرینت بــێ، دە، دانــە، تــۆ لەســەر ســەر دەکــەی دەرمــان، نــەیان بێ،تــا خەتــەر (٣٠٣٦)
سەردەوا، زانینــی زەخمــی خــۆت، بەعــەیب گەر شکای، جێی ڕەحمی، بێ تەردیدو ڕەیب (٣٠٣٧)
تۆ نەبــە، بــێ بــاک، کەنــەتبوو، عــەیبی وا ڕەنگـــەڕۆژێک بێ،دەتـــۆ ش دا ئاشـــکرا (٣٠٣٨)
نەت دەبیست تۆ (لاتخافو ) ی،خوا، مەگەر؟ شـــادوبێ بـــاک دێتە،بـــەر چاوو،نـــەزەر (٣٠٣٩)

زۆرزەمانــان ئیبلــیس خــۆش نێــو ژیــا   عاقیبــەت بــوو، لای خوداوەنــد، ڕووســیا   (۰۴۰-
ئــەو لــەدونیادا گــەلێک بوو،خــۆش نێــو   عاقیبـەت، بەر عـەکس بـوو، بۆ جێی جنێو   (۰۴۱-
تـۆ، بەدووی،شـوهرەت مـەڕۆ بـێ ئیتمینـان   خـۆ ت نیشـاندە،کاتێ ترسـت،چوو لـەگیان   (۰۴۲-
تازەمـــانێکی کەڕیشـــت، دەر نــــەهات   مەسخەرەی ئـەمرەد مەکـە، تـۆ هیچ کـات   (۰۴۳-
موبتـەلا بـوو گیـانی وی، چـاو چەنـد چەنـد   کـەو تـەخوارێ ئـەو لەئاسـمان،بوو بەپەنـد   (۰۴۴-
تــۆ نەکــەوتی تــا لــەبۆ وی،بــێ بەپەنــد   ژەهری خوارد ئەو،تۆش بخۆ لەو خوایە،قەند   (۰۴۵-

**قەست کردنی تورکانی غووز، بە کوشتنی نەفەرێکی، تا یەکێکی دیکە بترسێ...**

حەملـەیان کرد،تـورکی غووز،بـۆ دێ یـەکێ   تاکوتـالآن کەن،ئـەوێ گشـت جـێ یـەکێ   (۰۴۶-
دوو نەفـەر ئـەعیانی دێ یان،کـەو تـەدەس   ویسـتیان تـا یـەک بکووژن،لـەو دووکـەس   (۰۴۷-
دەسـتیان بەسـت، تـا بکـووژن ئـەو نەفـەر   پێیکـوتن ئـەی سـەر وەران،ئـەی تاجی سـەر   (۰۴۸-
بــۆ دەکــووژن، ئێوەئــەمنی وا فــەقیر؟   بـۆ بـەخوێنم، ئێوەتینـوون، ئـەی ئـەمیر؟   (۰۴۹-
کوشـتنی من،سـوودی بۆتـان، کـوا، چییـە؟   مــن لیباســم، بــۆ بــەدەن، بــەخوا، نییــە   (۰۵۰-
یـەک کـوتی ترسـی هەبێ،دۆسـتت هـەتا   ئـەو لەترسـان زێـڕی خـۆی نیشـان، بـدا   (۰۵۱-
پێیکـوتن ئـەو، حـاڵی وەک مـن، چـا نییـە   جـــــوابی داوەزێـــــڕی زۆرە، وانییـــــە   (۰۵۲-
پێیکـوتن چـون وەهمـە، هەردووکمان،یـەکین   هــەردوو،جێی فیکروخــەیاڵ وجێـی شـەکین   (۰۵۳-
جـا کــەوابوو ئـەوبکووژن ئـەی شــەهان   تــا لەترســان زێــڕو گــەنجم، دەم نیشــان   (۰۵۴-
جـا تەماشـا کـەن لـەلوتقی خـوای جیهـان   ئێمــەهاتین بــۆ جیهــان ئــا خیــر، زەمــان   (۰۵۵-
ئـاخرینی گشــت قــەڕنان، پــێش قــڕوون   لـــەو حەدیســـی ( اخـــرون الســـابقون)   (۰۵۶-
تـاهیلاکی قـەومی نـووح و قـەومی هـوود   پێینیشاندراین، بەحری ڕەحمەت،خوای وەدوود   (۰۵۷-
تابترسێین،کوشـــتنی گشـــتیان، خـــودا   وای بــەحاڵت عەکســی وەی، گــەر کردبــا   (۰۵۸-

**بەیانی حاڵی موتەکەببیران و ناشوکران نیسبەت بە وجوودی ئەنبیا(علیهم السلام)..**

یەک بەیەک کردیان باسی عـەیب وغـەش   باسـی قـەلبی چەشـنی بـەردو،گیانی ڕەش   (۰۵۹-
باسـی سـووک زانینـی فـەرمانی خـودا   باسـی کـەم زانینـی ئـەو ڕۆژی جـەزا   (۰۶۰-
باسـی عاشـق بـوون، بەئـەو دونیـایی دوون   خوێریانــەبوون، لــەبۆ، نەفســێ، زەبــوون   (۰۶۱-
باسـی دوور کـەو تـن، لەنوکتـەی ناسـیحان   یــا هــەڵاتن تــا نــەبینرێن ســا لَیحــان   (۰۶۲-
باســی دوو ر کـــەوتن لــەیارانی خـــودا   یــا دەگــەڵ شــاهان، بەتــەزویرو ڕییــا   (۰۶۳-

یانــەبیر کــردن لــەقانیع، وەک گــەدا    یـا حەسـادەت بـێ، سـەبەب، بـۆ ئیعتیـد ا (٣٠٦٤)
گـەر قـەبووڵ کـا، هەدیـە، بێـژێ بـەو گـەدا    گــەر نــەکا، بێــژێ بــەوی مــەکرو ڕییــا (٣٠٦٥)
بێتــەنیو خــەڵکی دەڵــەی بەو،ئازمەنــد    گۆشـەگیربێ،تۆ دەڵـەی بـەو،خود پەسـەند (٣٠٦٦)
یــا دەڵـەی تـۆ، وەک مونـاقیق، ئێسـتەمن    وام خــەریکی خــەرج و منــداڵان و، ژن (٣٠٦٧)
نیمــەوەختی ســەرخوراندن، خــۆ، دەنــا    زۆ ربــەدینی خــۆم، دەکــرد مــن ئیعتینــا (٣٠٦٨)
ئــەی فلانــی، تــۆ بکــەبۆمان، دوعــا    تــاببین، ئــا خیــر، لــەیارانی خــودا (٣٠٦٩)
ئــەو قســانەت،لەنگ و لۆرن،نینەچوســت    وەک خەواڵو،چەن قسەی کرد، دوایەنوست (٣٠٧٠)
نیمــــەچارە،خۆ لەبەرخــــەرجی منــــاڵ    مــن دەبــێ دائـیم، بکـەم کەسـبی حـەڵاڵ (٣٠٧١)
کام حـەڵاڵ؟، ئـەی تـۆ لـەگومڕاهی شـەڵاڵ    غــەیری خوێنــت مــن، چ نابینم،حــەڵاڵ (٣٠٧٢)
ئــەو خوایــەی،تۆ دەدەی،ڕاحەت،بــەنان    لا دەنێی دین،دەگری تاغووت،وەک گییان (٣٠٧٣)
ئــەی ئـەوەی موشـتاقی بـۆ دونیـایی دوون    چۆنــەحاڵت، دوور،لــە(نعــم الماهــدون)؟ (٣٠٧٤)
ئــەی ئـەوەی موشـتاقی بـۆ نـازو نـەعیم    چۆن دەبێ، دوور بی، لەزاتی خوای کەریم (٣٠٧٥)
ئــەی ئـەوەی موشـتاقی بـۆ ناپـاک و پـاک    چۆ ن دەبێ دووربی، لەوەی تۆی کرد چاک (٣٠٧٦)
کــوا خــەلیلێکی کەهاتــەدەر لــەغار؟    ئـەو کـوتی ..خـوام ئەوهەیـە، کوا کردگار؟ (٣٠٧٧)
جـم لـەدونیای دوون و دونیـای دیکـەدا؟    تــا نــەزانم کــێ بــەوان دەســتوور دەدا (٣٠٧٨)
بــێ تەماشــای وەســفی زاتــی کردگــار    گەر، نەجووم نان، لەو گەرووییەم ناچتـەخوار (٣٠٧٩)
جـۆنی دەخـوا لوقمـە، بـێ دیـداری وی؟    بــێ تەماشــایی گــوڵ و گــوڵزاری وی (٣٠٨٠)
بێ ئومێـدی کردگـار، قـەت یـەک نەفـەر    نــا خــووا، لــەو چۆمەغــەیری گاوو،کــەر (٣٠٨١)
هـەرچی وەک حەیوانەحیلـەی گـەر، هەنـە    عاقیبـەت مـەعلووم دەبێ، چـون بـۆ گەنـە (٣٠٨٢)
مـەکرو فێـڵ وخـۆی، لەسـەرڕا دێنـەخوار    هــیچ کــەنامێنێ، لــەبۆ وی ڕۆژگــار (٣٠٨٣)
سـست دەبێتن مەغزو عەقڵی ویش خەریف    عومری دەڕوا و،دەستی خاڵی، وەک ئـەلیف (٣٠٨٤)
ئەوکەسـەی بێـژێ، کـەمن دەو فکـرەدام    مــەکرو فێڵــی نەفســە، وای دانــاوەدام (٣٠٨٥)
گـەربڵێ ئـەو خـوا، غـەفوورە، هـەم ڕەحـیم    مــەکرو فێڵــە، وا دەکــا نەفســی لــەئیم (٣٠٨٦)
ئــەی لەغــەم خنکــاو،چون نانــت نییــە    گـەر غەفوورەهـەم ڕەحـیم، ترسـت چییـە؟ (٣٠٨٧)

**ئیزهاری ناڕەحەتی کردنی پیرەمێردێک لە لای تەبیب بە خاتری ناڕەحەتی بەدەن و جواب کوتنی تەبیب، بەوی..**

**خولاسەی داستان...**

پیرەمێردێک چوولای تەبیبێک تا دەردەکانی بۆ دەرمان بکا، پیرەمێرد پێیکوت ئەمن لەناحیەی مەغز ئیحساسی ناڕەحەتی دەکەم .. ئاغای تەبیب بۆچی وام؟تەبیب پێیکوت بەعیللەتی پیری وای، پیرەمێردکوتی چاوەکانم تار دەبینن، تەبیب پێیکوت ئەویش بەعیللەتی پیریە، پیرەمێرد پێیکوت پشتم دێشێ،تەبیب پێیکوت ئەویش هەرلەبەرپیریەپیرەمێرد کوتی هەرچی دەیخۆم هەزم نابێ، تەبیب کوتی زەعیف بوونی مەعدەئەگەر چاک کار نەکا بەعیللەتی پیریە.. پیرەمێرد کوتی کاتێک کەنەفەس دەکێشم، نەفەسم تەنگ دەبێ، تەبیب کوتی ئەویش هەربەعیللەتی پیریە.. لەو کاتەدا پیرەمێرد زۆرتووڕەبوو، بەتەبیبی کوت .. ئەی ئەحمەق ئەتۆ،بەو هەموو ئیسم و ڕەسمەفەقەت ئەو جوملە فێر بوویەکەلەبۆ هەموو دەردێکی، بڵەی، عیللەتی وی پیریە.. تەبیب پێیکوت ئەی پیرەمێرد نەمکوت کەعیللەتی تەواوی ناڕەحەتیەکانت پیریە؟ ئەڵئان بزانەکەعیللەتی ئەو تووڕەبوونەشت هەر پیریە..

پیرەمێردێک هاتەلای دکتۆر کوتی سستەمەغزم پێم بڵێ تۆ عیللەتی
پێیدەکوت، پیری،کەتۆ وات هات، بەسەر پیرکوتی تاریک دەبینم دەو رو بەر
پێیدەکوت،پیری،کەوای، ئەی زۆ رقەدیم پیر کوتی ئێشم دەپشت،دا زۆرعەزیم
پێیدەکوت پیری کەوای، ئەی شێخی ژار پیر کوتی مەعدەم هەزم نا کا، چ جار
پێیدەکوت پیری کەمەعدەت وایەتۆ پیر کوتی ئێستا پشووم زۆر سوارە، بۆ؟
پێیدەکوت تەنگی نەفەس دێ، جاروبار دێن دەگەڵ پیری، نەخۆشی، بێ ژمار
پیرکوتی زۆر ئەحمەقی تۆ، وا دەڵەی تۆ،تەبابەت فێر نەبووی هیچ، وا،هەڵەی
ئەی نەفام، عەقڵت بەتۆ ی نیشان نەدا؟ بۆ هەموو دەردێک،دەوایەک، دای خودا
زۆر نەفام و زۆر کەرو، زۆر ئەحمەقی دوور لەعیلم و دانیشی تۆ، زۆر شەقی
پێیدەکوت دکتور، ئەی عومری تۆ شەست تووڕەبوونی وات، لەپیری هاتەدەست
چونکەئەعزائو سیفات، لاواز بوون حەو سەلەو سەبرت وەها، بێ واز بوون
گەربییسێ دوو قسان، هەی هەی، دەکا ئەو بەیەک لیوانەئاو، زوو، قەی، دەکا
غەیری ئەو پیرەی کەمەستی خوایەئەو زیندەگی تازەو تەمیزی لایەئەو
زاهیرەن پیرو دەباتین دا منال ئەنبیا ئو، ئەولیا وان، ئەی هەوال

گەر کوپەیدا نین ئەوان، لای باش و بەد بۆ دەگەڵ وانی هەیەبەد کار، حەسەد؟ (٣١٠٢)
گەر کوناناسن ئەوان، زۆر زۆر یەقین بۆ دەگەڵ وان، وا بەبوغزن،وا بەکین؟ (٣١٠٣)
گەر بزانن سابیتەڕۆژی جەزا چۆن دەدەن، خۆیان لەشەمشیری خودا! (٣١٠٤)
وای مەبینە، وەک بەڕووی تۆ، پێکەنی قیامەتی تێدایە، زۆر زۆر باتینی (٣١٠٥)
دووزەخ و، جەننەت، هەموو ئەجزایی، وی لەو، بەهەرجوور، بیر بکەی، بالآیی وی (٣١٠٦)
بیر لەهەرچی کەی دەبی ئاخر، فەنا فکرو‌بیران نابێ جێیا ن، بۆ خودا (٣١٠٧)
گەر دەزانن، کێ هەیەدەو ماڵەدا بۆ لەبەر دەرگا، دەکەن داد و سەدا؟ (٣١٠٨)
ئەبلەهان تەعزیم دەکەن، مەسجید،بەڵام دێن دەکەن تەخریبی ئەهلی دڵ تەمام (٣١٠٩)
ئەو مەجازە، دڵ حەقیقەت ئەی کەران نینەمەسجید، غەیری قەلبی سەروەران (٣١١٠)
مەسجیدی دڵ گەر هەیانەئەولیا سەجدەگایەبۆ عموم، جێگای خودا (٣١١١)
تا نەیێشێ قەلبی یەک ئینسانی باش هیچ کەسێک ناکا خوداوەند، وردوخاش (٣١١٢)
قەستییان بوو،بێنەجەنگی ئەنبیا جیسمی وانیان ئادەمی دیت، نەک جیا (٣١١٣)
تۆ هەتەئەخلاقی قەو می، چوون لەپێش چۆنەناترسی، کەبۆت بێ، دەرد و ئێش (٣١١٤)
ئەونیشانەی وان دەتۆ دا گشت دەهات تۆ لەوانی، جا، چلۆن دەت بێ، نەجات؟ (٣١١٥)

**داستانی جوحا و ئەومنداڵەی کە دەپێش جەنازەی بابی دا، دەگریا..**

**خولاسەی داستان...**

جەماعەتێک تا بووتی بابێکیان بەشان دەبرد، منداڵێک دەگەڵ ئەوجەماعەتە،بەگریان و ناڵین دەڕۆیشت، وڕووی دەتابووتەدەکرد و دەیکوت ئاخر ئەی بابی خۆ شەویستم، ئەتۆ بۆکوێ دەبەن؟دەیان هەوێ کەئەتۆ تەسلیم بەخاک بکەن،ئەتۆ دەبەن بۆ ماڵێک تەنگ و تاریک و بێ چرایە، ئەوێ ماڵێکەبێ دەرک ودیواری موڕەتتەب، وبێ حەسیر و بێ غەزایە،منداڵێکی فەقیربەنێوی جوحا کەدەگەڵ بابی، بە وێدا دەڕۆیشت وئەو قسانەی بیست، بەبابی خۆی کوت.. بابەگیان دەڵەی ئەو تابووتەدەبەن بۆ ماڵی ئێمەچونکەماڵی ئێمەش،بێ حەسیرە، بێ غەزایە، بێ چرایە.

کەوتەدووی تابووتی باوکی، یەک مناڵ هەربەگریان و، بەشین ۆ ناڵەناڵ (٣١١٦)
بابەتۆ بۆکوێی دەبەن ئەی بابی چاک؟ تۆ دەبەن ئێستا کەتەسلیم کەن، بەخاک (٣١١٧)
دەت بەنەماڵێک زۆر تەنگ و،فەقیر ئەو کەچی تێدا نییە، قالی و حەسیر (٣١١٨)

بێ چرایەئەو بەشەو، ڕۆژنان نییە | بۆ غەزاو خۆراک لەوێ، نیشان، نییە ٩

دەرکە(نا ) ڕێگا لەبۆ سەربان کە(نا ) | هیچ دراوسێ نین کەبن بۆ تۆ پەنا -٠

جیسمی تۆ، کە، ڕووگەبوو، بۆ بەحرو، بەڕ | چۆن دەبەن، بۆ ماڵەکی وا کوێروکەڕ؟ -١

ماڵەکی نا ئەمن و جێیەک، زیندەتەنگ | هیچ کەنامێنن دەوێدا،ڕوو و، ڕەنگ -٢

وەسفی ماڵی کوت، بەتەعداد و ژمار | ئەشکی خوێنینی لەچا وی هاتەخوار -٣

وای جوحا کوت، بابەگیان، واحالیمە | سوێن دەخۆ م ئەوهەی دەبەن بۆ ماڵیمە -٤

بابی دەیکوت ئەی جوحا، تۆی زۆر نەفام | وای جوحا کوت،گوێ دەنیشانان تەمام -٥

ئەو نیشانانەی کەکوت ئەو یەک بەیەک | ماڵی ئێمەوایەبێ تەردید و شەک -٦

بێ تەعام وبێ حەسیرو بێ چراغ | بێ حەسارو بێ دەرو، سەربانی ساغ -٧

زۆر نیشانەی وا هەیانن تاغییان | کوا دەبینن؟ کوانێ چاوی ساغییان؟ -٨

ماڵی قەلبێکی کەنووری لێنەدا | تاوی ڕوونی زاتی بێ هەمتای خودا -٩

تەنگ و تاریکەوەکو گیانی بەدان | دوور لەلوتف ورەحمی سوڵتانی جیهان -٠

قەت بەنووری حەق نەبوو ئەو قەلبی شاد | بەستراوە، دەرکی نیتی جێی گوشاد -١

گۆڕ،گەلێک خۆشتر لەقەلبی والە،بۆت | زووکەدوور بەتۆ،لەگۆڕی قەلبی خۆت -٢

تۆ کەگیانداری ئەرێ ئەی شۆخ و شەنگ | چۆنەناخنکێی، لەگۆ ڕی هێندەتەنگ؟ -٣

یوسوفی وەختی و، ڕۆژی ئاسمان | چاڵ و زیندا ن بەسسە، ڕووت دە، تۆ نیشان -٤

یوونست زیندان، دەبەتنی ماسییە | ڕێی نەجات، هەر زیکرە، هەر خوا ناسییە -٥

گەر نەبا زاکیر لەبۆ حەق، بەتنی نوون | حەبسی وی بوو، تا کو ڕۆژی (یبعثون ) -٦

ئەوبەزیکری حەق نەجاتی هاتەدەست | زیکرو تەسبیح ئایەتی ڕۆژی( ئەلەست ) -٧

گەرلەبیرت چۆتەوە، تۆ زیکری گیان | گوێ دەتۆ ئێستا، بەزیکری ماسیان -٨

هەرچی دی حەق بۆ خودایی، ئەو دەمە | بوو بەماسی، هەرچی دیتی، ئەو، یەمە -٩

ئەو جیهانە،یەم، بەدەن ماسی و، ڕووح | یونسی مەحرووم، لەڕووناکی سەبووح ٤٠

گەرکوزاکیر بێ، لەماسی، بووی نەجات | وانەبێ گەڕ، ماسی زوو هەزمی دەکات ٤١

زۆر دەنێو ئەو بەحرەدان ماسی گیان | وان لەدەورت، تۆ کەنەت دین، هیچییان ٤٢

خۆ دەدەن لێت، یەک یەکەی ئەو ماسیان | چاو هەڵێنە، تا ببیان بینی عەیان ٤٣

گەرکونابینێت، چاوت،ماسیان | دێتەگوێی تۆ زیکری وان، تەسبیح، یان ٤٤

گیانی تەسبیحاتەسەبرو حەو سەلە | چونکەوایە، حەو سەلەت بێ، ئەو چەلە ٤٥

چــاکترینی زیکرەســـەبرو حـــەو ســـەلە ‌ ‌ ‌ ســـەبرەبۆ شـــادی کلیلـــە، نـــەک، پەلـــە (٣١٤٦)
بـۆ بەهەشـت، پـردی سـراتە، حەوسـەلە ‌ ‌ ‌ جـوان دەگـەڵ وی دا دەبـێ، نـا حـەز لەلـە (٣١٤٧)
بـێ لەلـە، نـابێ ویسـال،ئەی خـۆش ئـەدا ‌ ‌ ‌ چـون لەلـە، نابێ،لـەجوان هـیچ کـات،جودا[1] (٣١٤٨)
کـوا دەزانێ،تـامی سـەبرێ، شووشـەدڵ؟ ‌ ‌ ‌ خاسـە،بۆ جـوانێکی وەک گـوڵ، بـێ چقـڵ (٣١٤٩)
ئارەزوو بـۆ مـەردی جـەنگی، جەنگـە، هـەر ‌ ‌ ‌ بـۆ موخەننـەس، ئارەزوو بـوو، بـەس زەکـەر (٣١٥٠)
هەرزەکـەر بـوو، بـۆ بـەدین وزیکـڕی وی ‌ ‌ ‌ زۆر لەبۆ جێی پەستی برد، ئەو فیکری وی (٣١٥١)
نیـی مەترسـە،با سەماشـی، بـێ دەدەسـت ‌ ‌ ‌ چونکەدەرسی دا بەوی یەک عیشقی پەست[2] (٣١٥٢)
گـەرچی ڕۆیشـت، زۆر لـەبۆ سـەر،نێوی وی ‌ ‌ ‌ لینـگ دەدا،ئەو،ئەسـپەکەی، بـۆجێی نـەوی (٣١٥٣)
ترسـی نـاوێ پەرچـەمی سـوا ڵکـەر، بـرا ‌ ‌ ‌ پەرچـەمی وی چونکـەبۆ نـان، هەڵـدرا[3] (٣١٥٤)

**ترسانی منداڵێک لە پیاوێکی زەلام و کوتنی ئەو پیاوە کە ئەی منداڵ مەترسە چونکە ئەمن پیاو نیم..**

دی منالێـک تـاق، زەلامێـک بـێ حـەیا ‌ ‌ ‌ زەر،دەبوو،منـداڵ، لـەبیم، وەک کارەبـا (٣١٥٥)
پێیـدەکوت ئێمـەن بـە، مـن ئـەو هـا دەبـم ‌ ‌ ‌ تـۆ لەسـەربە، مـن لـەژێر تـۆ دا دەبـم (٣١٥٦)
با زەلام بـم، مـن موخەننـەس، ئـەی کـوڕە ‌ ‌ ‌ وەک لەسـەر وشـتر ببـی تـۆ لـێم خـوڕە (٣١٥٧)
زاهیـرەن ئینسـان بـوو ئـەو، شـەیتان نـەبوو ‌ ‌ ‌ باتینـەن، شـەیتان بـوو ئـەو، ئینسـان نـەبوو (٣١٥٨)
ئەی زەلام وەک قەومی عاد،تۆی وەک دەهوڵ ‌ ‌ ‌ لێیـدەدا بـا، چـەن لکـی داران،لـەچۆڵ (٣١٥٩)
ڕێویـەک، ڕاوی کـەکرد بـوو، دای بـەبا ‌ ‌ ‌ هـات هـەتا کـو تـەپڵی نێـو خـاڵی ببـا (٣١٦٠)
چونکەنەیـدی،نێو دەهـۆڵ، ئـەو دڵخـوواز ‌ ‌ ‌ وایـدەکوت،زۆر چـاترە، لـەو هـەی بـەراز (٣١٦١)
ڕەنگـە،بێ دەنگـی دەهـۆڵ، ڕێـوی هـەڵێ ‌ ‌ ‌ عاقـڵ ئـەمما، لێیـدەدا، تـاهیچ نـەڵێ (٣١٦٢)

**داستانی تیر ئەندازێک و ترسانی وی لە سوارێک کە دەجەنگەڵ دا دەڕۆیشت**

**خولاسەی داستان...**

پیاوێکی موسەللەح بەهەیبەتی پیاوانەوترس هێنەر، کەسواری ئەسپێکی نەجیب بوو بەقەراغ جەنگەڵێک دا دەڕۆیشت، لەوکاتەدا تیر ئەندا زێک ئەوی دی، لێی ترسا، جا لەبەر ئەوەتیرێکی

[1]- چون لەلان، نابن، لەجوانان، قەت، جودا (مصرع دوم)

[2]- لێی مەترسە، چەن بڵیند بێ جێی وی ‌ ‌ ‌ چونکە دەرسی دا بەوی عیشقێک، نەوی

[3] ترسی ناوێ پەرچەمی نێو سواڵکەران ‌ ‌ ‌ پەرچەمی وان چونکە بۆ نان هەڵدران

دەکـەوان نـا، وئـەو سـوارەی نیشـانەگرت و سـێرەی لـی هـەڵگرت سـوارەکەهاواری کـرد، مەنوارەهەیکـەلی زەلام و رێـک و پێکـی مـن، ئـەمن شەخسـێکی زۆر زەعیـف و کـار لـەدەس نەهاتووەمە، چونکەدەوەختی جەنگ دا لەپیرەژنێکیش زەعیفترم، تیر ئەنداز کوتی، برۆ ئەمنیش لەترسان قیافەی تیر ئەندازانم بەخۆ مەوەگرتووە..

یـەک سـوارکاری موسـەللەح،زۆر مـەهیب    رۆی بەنێوجەنگەڵ،بەئەسـپێک،زۆرنەجیب (٦٤٣ -
تیـر هـاوێژیکی مـاهیر هـەم جـەوان    دی لەترسـان،تیری دانـا، نێـو کـەوان (٦٤٤ -
تـا کولێیـداتیر،بانگی کـرد سـووار    بـا زەلام بـم، زۆر زەعـیفم بـێ قـەرار (٦٤٥ -
تـۆ مـەنۆ رە، لـەو زەلامـی جیسـمی مـن    وەختـی جـەنگ،زیاتر لـەمن، یـەک پیـرەژن (٦٤٦ -
پێیـدەکوت گـەر زووت نـەکوتبا،تۆ بـەمن    لـێم دەدای، دەمکوشـتی دەمهینـای لـەبن (٦٤٧ -
تیغی پیاوان زۆری کوشت ئەفرادی پەست    چونکـەناپیاو بـوون و،تیغیـان،بوو بەدەسـت (٦٤٨ -
گەرلیباسـی رۆسـتەمان، تـۆ کەیتەبـەر    پیـاو نـەبی گـەر، گیـانی تـۆ زوو دێتـەدەر (٦٤٩ -
تێـر کـەگیانت، دانـی تیغـت، گیـان فیـدا    هـەرچی بێ سـەربێت، شـا، بـەو، سـەر دەدا (٦٥٠ -
مـەکرو فێڵـی تـۆ سـیلاحی تـۆ دەبـوو ن    هەربـەویش بـووی، تـۆ برینـدارو، زەبـوون (٦٥١ -
هـیچ ئەلـەو فێڵانەسـوود دەس نـا کـەوێ    تەرکی فێڵ کە،گەر تۆ خوشبەختیت، دەوێ (٦٥٢ -
چون لەمیوەی فێڵ نەت خوارد، تۆ، چ کات    فێـڵ وەلابـە، بـت هـەوێ هـەرخوا بـدات (٦٥٣ -
چـون موبـارەک نینـە، ئـەو عیلمانـە، بـۆت    خـۆت لـەگێلی دەو، لەشـووم، تـۆ لادەخـۆت (٦٥٤ -
وەک مـەلائیک بێـژە (لاعلـم لنـا )    (غیرماعلمتنـا) ئـەی جـان پـەنا (٦٥٥ -

## داسـتانی یـەک عـەرەب و رەڵـم دەجـەواڵ کـردن و سـەزەنیش کردنـی وی ئەوەسسـوتی فیلسووف..

**خولاسەی داستان...**

عـەرەبێکی سـەحرا نشین بـاری لەسـەر وشتری خۆی دانـا بـوو، ئـەوبارەعیبارەت بـوو لەیـەک جەواڵی پڕ لەگەنم ویەک جەواڵی پڕ لەرەڵم، وبۆ خۆشی لەسەر ئەودووجەواڵەدانیشـتبوو وبـەرێ دا دەڕۆیشت، لەو کاتەدا یەک نەفەر زۆر بلّێ کەبەزاهیر فیلسووف بوو هاتەپیش ولێی پرسی کەئـەو دوو جەواڵانـەچییان تێدایـە؟ عـەرەبی سـەحرا نشـین پێیکـوت یـەکیانم پرلەگـەنم کردووەویـەکیانیش پـڕ لـەرەڵم، کـابرای بەزاهیرفیلسـووف پێیکـوت.. بـۆچی رەڵمـت دەجـەواڵ کردووە؟ عەرەبی سەحرا نشین پێیکوت تا تـەعادول بەرقـەرار بێ، کابرای بـەزاهیر فیلسـووف

پێیکوت ئەتۆ دەت توانی کەگەنمەکەت دوو بەش کردبا وهەربەشەی دەجەواڵێکت کردبا،هەم بارەکەت سووکتر دەبوو هەم وُشترەکەت ڕاحەت تر وسووک تر دەیتوانی بەڕێ دا بڕوا، عەربی سەحرا نشین پێیکوت ئافەرین ئەدی ئەی حەکیم ئەتۆ بەو هەموو فەزل ودانیشەبۆچی ڕووت و پیادەبەڕێگا دا دەڕۆی؟ لەپاشان ئەو عەرەبی سەحرا نشین بەزەیی پێداهات و ویستی کەئەوی سواری وُشتری خۆی بکا، لەوکاتەدا دووبارەلێی پرسی ئەتۆ بەو هەمووعەقڵ و دانیشەو ئەو هەموو قسەجوانانە، شای یا وەزیری؟ کابرای بەزاهیر فیلسووف پێیکوت نەشام ونەوەزیر ..لەسەرو سەکتوم ڕا دیارەکەئینسانێکی عادیمە، عەرەبێ سەحرانشین پێیکوت ڕاست بڵێ،چەند وُشترو چەند گات، هەیە؟ کابرای بەزاهیر فیلسووف کوتی هیچ وُشر و گام نییە. عەرەبی سەحرانشین پێیکوت چەند جوورقوماشت دەدوکان دا هەیە؟ کابرای بەزاهیر فیلسووف پێیکوت دوکانی چی؟ ئەمن هیچ جوورەموڵکێکم نیەعەرەبی سەحرانشین پێیکوت ..زۆر چاک، ئەلئان کەهیچ جوور قوماشێکت نیە بڵێ بزانم چەندەت پووڵی نەغد هەیە؟ کابرای بەزاهیر فیلسووف کوتی ..لێم گەڕێ،پووڵی نەغد کەهیچ، حەتتا بۆ نانی شەوێش موحتاجم، عەرەبی سەحرا نشین پێیکوت ئەلئان کەحاڵ و وەزعت بەو جوورەیە، زوو لەمن دوور کەوە، چونکەدەترسم کەشوومی ونەحسی عیلم و هونەری تۆ› بۆ من بێ، وئەمنیش وەکوو تۆ بەد بەخت و بێچارەبکا ..

…یدەنا سەر وُشتری بار، یەک عەرەب — دوو جەواڵی پڕ لەدانە، تا، بەلەب (٣١٧٦)
… دەنیشت،بۆ خۆی لەسەر ئەودوو جەواڵ — لێی سوئال کرد زۆربلێ یەک،وەزع وحاڵ (٣١٧٧)
…ەو تەنی وی پرسی هینایە، وتار — زۆر شتی دی باسکرا، دەو پرسیار (٣١٧٨)
…ا لەپاشان پێیدەکوت، ئەو دووجەواڵ — ئاخنیو تن، تۆ بەچی؟ ڕاس بێژەحاڵ (٣١٧٩)
…ی جەواب،یەک پرلەگەنمە،قووتی عام — یەک جەواڵیش ڕەڵمە، نەک قووت ئەی برام (٣١٨٠)
…پێیدەکوت تۆ بۆچی ڕەڵمت کرد ەبار؟ — جوابی داوەتا جەواڵ هەیبێت، یار (٣١٨١)
…ۆ یەپێیکوت والەچابوو، گەنمەکەی — تا دەدووجی کەی ئەتۆ ئەو نیوەکەی (٣١٨٢)
… جەواڵ سووک بێت و، وُشتر سووک بار — ئا فەرینی کوت عەرەب، بەو، زۆر جار (٣١٨٣)
…ەو هەموو ئەفکاری جوانی بێ ژمار — بۆ چی والەی ڕووت و، پیادەو، دەردەدار؟ (٣١٨٤)
…حمی زۆر هات، بەو حەکیمە، ئەو عەرەب — بۆ یەسواری کرد لەوُشتر، بائەدەب (٣١٨٥)

جا، بەوی کوت ئەی حەکیمی خۆش بەیان — بێژەحـالی خـۆ ت کـەمێکی، نـەک دەیـان[1] (۰۶ -
بـەو هەمووعـەقڵ و شـعوورەت، خوا،کـەدای — ڕاس ببێـــژەپێم، وەزیـــری، یانەشـــای؟ (۰۷ -
دای جـەواب، عادیمـە، مـن هـیچ نـیم لـەوان — چـاو لیباسـم، چـاو، لـەحالّم، کـەجووان (۰۸ -
پێیدەکوت گـاو، وشـترت، تـۆ چـەن هەنـە؟ — جـوابی داوە،هـیچ لـەوان نـین، بـۆ بەنـە (۰۹ -
پێیدەکوت چەنـدەت دەدوکان دا، قوماش؟ — جـوابی داوە، کـوا دوکـان،کوا جێـی بـاش؟ (۱۰ -
بێژەمـاڵ و پـوولّی نەغـدت چەندەچەنـد؟ — تۆ کەتـەنها، ڕێ، دەڕۆی، ئـەی خۆش پەند (۱۱ -
تـــۆ لەلاتـــەکیمیای مسســـی جیهـــان — عەقڵ و عیلمت زۆرە، وەک زێڕ، ئەی فلان (۱۲ -
پێیـــدەکوت وەڵڵهـــی نیمەئـــەی جـــەوان — مـن لـەژین دا قـووتی شـەو، یـەک دانـەنان (۱۳ -
بـێ لیبـاس و پـێ پـەتی، مـن وا دەڕۆم — نـان لەهـەرجێ، پـێم بـدەن، بـۆو، لا دەڕۆم (۱۴ -
خـۆ لـەبۆ مـن لـەو هەمووفـەزل و، هونـەر — هـیچ نەبوو،تـەنها هەبوو،بـەس دەردەسـەر (۱۵ -
جـا عـەڕەب، پێیکـوت لـەلای مـن تـۆ بـڕۆ — تاکوشـوومی، هـیچ نەیـەت، بـۆ مـن، لـەتۆ (۱۶ -
عیلمی شوومت، دوورکەڵێم، تۆ ئەی نەفام — نـوتقی تـۆ شـوومەلەبۆ عالـەم، بـەعام (۱۷ -
گـەرکو بـت بیـنم لـەڕێ، لێـت لا دەدەم — گـەر دەپێشـم دابـی، خـۆم وەدوا دەدەم (۱۸ -
یـەک جـەواڵم گـەنم و، یـەکیان ڕەڵم و خیز — باشـترەبۆم،زۆر، لـەفێڵی پیـاوی حیـز (۱۹ -
ئەحمـەقی مـن زۆ رموبـارەک ئەحمـەقی — چـون دڵـم، مـەڕزوو ق و، گیـانم موتتـەقی (۰۰ -
بەت هـەوێ تۆ گـەرکو نەقمـەت کـەم ببێ[2] — تـۆ تـەلاش کـە،تا کوحیکمەت،کـەم ببـێ (۰۱ -
حیکمـەتێکی بـێ لەسـەر چـاوەی خـەیاڵ — دوو ر لەفـەیزی خوایەئـەو، ئـەی باکـەماڵ (۰۲ -
حیکمـەتی دونیا،دەکا زیاد، زەنن و، شـەک — حیکمـەتی دینـی دەبـا، تـا سـەر فەلـەک (۰۳ -
فێڵـــەبازی زیرەکـــی ئـــاخیر زەمـــان — خـۆ ی، بـەزۆ ر دەگریـت و، کەم،پێشـینییان (۰۴ -
فێڵـەبازان، زەحمـــەتی خـــۆ زیـــاد دەدەن — مـەکرو فـێڵان، زۆ ر بەخـەڵکی یـاد دەدەن (۰۵ -
سـەبرو ئیسـار و سـەخایی نـەفس و، جـوود — لا دەنـێن، گـەرچی ئـەوان،کیمیایی سـوود (۰۶ -
ئـەو هـەفکرەڕێ یـەکت لـەو دەسـکەوێ — ئـەو هـە، ڕێ یـە، شـا، ببینـی تـۆ لـەوێ (۰۷ -
ئەوهەشـایە، هـەر لـەبۆ خـۆی شـا، ببـێ — نـەک بـەزێڕ و گـەنج و لەشـکر،چا ببـێ (۰۸ -

---

[1]- جا، بەوی کوت ئەی حەکیمی خۆش قسە — بێژە حاڵی خۆت،کەمێکی، بۆم، بەسە

[2]- بت هەوێ تۆ گەر، شەقا وەت کەم بێ (مصرع اول)

تا بمێنێ شایەتی وی سەر مەدی     چەشنی عیززی مولکی دینی ئەحمەدی (٣٢٠٩)

**کراماتی ئیبراهیمی ئەدهەم (قدس اللەروحەالعزیز) لە قەراغ دەریا..**

**خولاسەی داستان...**

ئیبراهیمی ئەدهەم زیمنی سەیرو سیاحەت گەیشتەقەراغ دەریا یەکی ولەوێ دانیشت ومەشغووڵی پینەکردنی لیباسەکۆنەکەی خۆی بوو، دەوکاتەدا ئەمیرێک کەساڵانی پێشوو غولامی وی بوو، بەوێ دا ڕۆ یشت، هەردەگەڵکو چاوی پێکەوت ئیبراهیمی ناسی، بەڵام سەری سوڕ مابوو، چونکەهیچ ئەسەرێکی لەشازادەگی و سەدارەت و ئەمارەت دەویدا نەدی، بەڵکەم دیتی کەدەروێشێکی سادەوفەقیرە، جا، بەخۆی کوت ئەو حکوومەت و سەڵتەنەت و عەزەمەتە، چی لێهات؟ بۆچی هێندەخۆڵ وەسەرو پەرێشان بووە؟ئیبراهیم کەعارفێکی کامیل بوو، لەدڵی خەڵکی ئاگادار بوو، جێ بەجێ لەدڵی وی حاڵی بوو، ولەبۆ قانع کردنی وی دەرزییەکی دەدەدریا هاویشت، وزۆری پێنەچوو کەسەدان هەزار ماسی سەریان هینا دەر، دەحاڵێک دا هەر یەکەی دەرزییەکی زێڕی دەزاری دا بوو، ماسیەکان ڕوویان دەئیبراهیم کرد، وکوتیان ئەی عارفی حەقیقی تەواوی ئەو دەرزیانە ئێتۆ نەوەریان بگرە، ئیبراهیم ڕووی دەئەمیرکرد و کوتی ئەی ئەمیر حکوومەت لەسەردڵان چاکترەیا حکوومەت لەسەر تەختان؟ ئەمیر لەتەماشای ئەو سەحنەعەجیبەدوچاری هەیەجان و وەجدو شوور بوو، وکوتی وەختێک کە ماسیان لەڕووحی عارف ئاگادارن وای بەحاڵی ئەو کەسەی کەلەوی بێ خەبەرە.

ۆم دەبیست ڕۆژێک برایمی ئەدهەمی     بۆ پشوو دان، چۆ قەراغی یەک، یەمی (٣٢١٠)
ئەو لیباسی کۆنی خۆ ی پینەی دەکرد     یەک ئەمیر ئەو دەم، بەوێدا، ڕا دەبرد (٣٢١١)
ئەو ئەمیرەبەندەیەک بۆ شێخ بوو     شێخی ناسی،کەوتەسەجدە ئەو بەزوو (٣٢١٢)
چاکی نۆڕی هەم لەخەرقە،هەم لەخووی     دی نەماوە،ئەو وەکوو پێش،خوڵق و ڕووی (٣٢١٣)
بۆ ڕەهای کرد مولکی زۆرو بێ حەدی؟     بۆ چی ویستی فەقرو بەد بەختی ئەدی؟ (٣٢١٤)
مولکی زۆرو بێ حیساب چۆ ن بەردەدا؟     چۆن لەخەرقەی پینەدەدرووی، وەک گەدا (٣٢١٥)
شێخ دەبووحاڵی، لەفکری نێو دڵی     شێخ وەکووشێر، نێو دڵانیش، جەنگەڵی (٣٢١٦)
وەک ڕەجاو،خەوف،ئەو لەنێو قەلبان ڕەوان     هیچ لەوی ون نینەئەسڕاری جیهان (٣٢١٧)
حیفزی دڵ کەن ئێوەئەی بێ حاسڵان     کاتێ چوون بۆ مەحزەری ساحەبدڵان (٣٢١٨)
ئەهلی تەن لای وان ئەدەب، بۆ زاهیرە     خوا، لەوان بۆ ڕازو ئەسڕاڕ، ساتیرە (٣٢١٩)

ئـەهلی دڵ لای وان، ئـەدەب، بـۆ باتینـە    چونکەقـــەڵبی وان، بەئەســـرار، فاتینـــە    ---۲۰)
عەکسـی وانـی تـۆ لـەلای کـوێران بـەڵام    تـا وەدەس بێنـی، لـەوان جـاەو، مـەقام    ---۲۱)
تـۆ لـەلای بینـا، ئـەدەب، ناکـەی، لـەبۆی    نـاری شـەهوەت، دەسـتەچیلەی، بـۆ یـەتۆی    ---۲۲)
چـون لـەهۆش و نـووری هـادی بێ بەشـی    لای هـــەمووکوێران ئـــەتۆ وا،ڕووگەشـــی    ---۲۳)
تـۆ لـەلای بینـا دەدەی پیسـی لـەڕووت    تۆ دەگەڵ نازیش دەبی، بەو وەزعـە، جـووت    ---۲۴)
خســتیەدەریا،جێ بـــەجێ، دەرزی لـــەوێ    زۆ ربڵیند، دەیکوت کەدەرزی خۆم، دەوێ    ---۲۵)
سـەت هـەزاران زێدەماسـی خـوای غـەفوور    بـــوو بـــەلێوی وان، دەرزی، زێـــڕی ســـوور    ---۲۶)
گشـــت لـــەدەریای حـــەق هینابیانـــەدەر[1]    سـەر، کـەبگرە، شـێخ دەرزی خـوای لەسـەر    ---۲۷)
ڕووی دەوی کردو بەوی کوت ئەی ئەمیر    مـــوڵکی دڵ،چاک،یانـــەموڵکی وا،حـــەقیر    ---۲۸)
زاهیـری بـوو ئـەو نیشـانە، هـیچ نییـە    تـــۆ تەماشـــاکە، دەبـــاتین دا چییـــە    ---۲۹)
بـۆ نموونـەی بـاغ، لکـێ، بـۆ شـار دەبـەن    بـاغ و بێسـتان،کوا ئەوان،یـەکجار دەبـەن؟    ---۳۰)
خاسسـە، باغێک، ئاسمان، لـەو، یـەک چڵـە    بەڵکەئاسـمان بـۆ وی پێسـت، ئەو،کاکڵـە    ---۳۱)
گـەر کونـاچی تـۆ لـەبۆ ئـەوباغ، چ کـات    بۆ ن کەیەک گوڵ،تا زوکا مت،دوور بکات    ---۳۲)
تـــا کوئـــەوبۆ ن،جـــازبی گیانـــت ببـــێ    تـــا کوئـــەوبۆن نـــووری چاوانـــت ببـــێ    ---۳۳)
وایدەکوت یوسوف، کوڕی یـەعقووب نـەبی    دابنـــێن، بـــۆ، بـــۆن، ( علـــی وجـــه ابـــی )    ---۳۴)
هەر لەبەر ئەو بۆ نە، ئەحمەد،گاز دەکات    ڕەو شـــەنایی دا،بـــەچاوی من،ســـەلات    ---۳۵)
پێـنج حـیس لێکتـر جودانـابن، چ کـات    یەک یەکەی وان، چون لەیەک ئەسڵی دەهات    ---۳۶)
قـــووەتی یـــەک، قـــووەتی بـــاقی دەبـــێ    هەریەکـــەی بـــۆ یەکتری،ســـاقی دەبـــێ    ---۳۷)
دیتنـی چـاو زیـاد دەکـا، گفـت و بـەیان    زیـاد دەکـا گوفتـار، سـیدقی چـاو عـەیان    ---۳۸)
خۆ، سەداقەت گشت حەواس وشیار دەکا    چـی حـەواس بێ،زەوق،گەڵ خـۆی یـار دەکا    ---۳۹)

**شرووعی مونەووەر بوونی عارف، بەنووری غەیب بین...**

حیسســـەکی ســـالیک،کەبەندی وی، وەبـــێ    حیسسی دیشی، بێ گومان وەک وی دەبێ    ---۴۰)
گەرکوحیسســێک،غەیری مەحسووسـاتی،دی    گشـتی عـەیبان بـۆ هـەمووحیس،دێن،وەدی    ---۴۱)

---

[1]- لەو یەمی حەق، گشتی هینابیانەدەر (مصرع اول)

گەرلەمێگەڵ یەک لەجۆگە،بازدی دا    یەک لەدووی یەک بازدەدەن مەڕ،بێ سەدا (٣٢٤٢)
مێگەلی حیس لێخورە، تاکو بڕۆن    لەو لەوەڕگەی ( اخرج المرعی ) بخۆن (٣٢٤٣)
تا لەوێ نەسرین بخۆن، هەم وەردی سوور    تا لەباغاتی حەقایق، بچنەژوور (٣٢٤٤)
کامەحیس بۆ حیسی دی، بۆ پێشەوا    حیسەکانی دی لەبۆ جەننەت دەبا (٣٢٤٥)
حیسەکان بێژن، دەگەڵ حیسی،تۆ، ڕاز    بێ زبان و بێ حەقیقەت، بێ مەجاز (٣٢٤٦)
چون حەقیقەت، قابیلی تە ئویلەزۆر    وەک گومان، سەر چاوەیی، تەخییلە، زۆر (٣٢٤٧)
گەرحەقیقەت هات وەبەرچاوان،کەوێ    جێ لەبۆ، تەئویل، نامێنێت، لەوێ (٣٢٤٨)
گەرکوببنەعەبدی حیسست،حیسەکان    بێ نیاز نابێ لەتۆ هیچ ئاسمان (٣٢٤٩)
گەرکو دەعوا بێت، پێست، ئیکێ یە،کێ؟    مەغز، ئیکێ بێت، پێست،ئی وی دەبێ (٣٢٥٠)
گەرنیزاع بێ، بۆ ئەوەی، ئیکێ یە،کا    دانەئیکێ بێت، کا، ڕوو دەو، دەکا (٣٢٥١)
ئاسمان پێست، نووری ڕووح، مەغزی وییە    ئاسمان دیار، نووری ڕووحیش مەخفییە (٣٢٥٢)
جیسمە، زاهیر، ڕووح مەخفی نێو قەفەس    جیسم وەک ئاستین و،گیانیش چەشنی دەس (٣٢٥٣)
عەقڵ مەخفی تر لەڕووحە، ئەی فلان    حیس لەڕووح نیزیکترەزۆر، بێ گومان (٣٢٥٤)
گەرتەکانت دی، دەزانی،زیندووە    کوا لەبۆ تۆ عەقلی وی مەعلووم بووە؟ (٣٢٥٥)
تا تەکانی ڕێک و پێک لەو سەر دەدا    جونبشی باش دەگرێ، ئی بەد، بەر دەدا (٣٢٥٦)
گەرکو ئەنجام دات، دەس،کاری دروست    دیارەهەیتی ساحەبی دەس،عەقلی چوست (٣٢٥٧)
ڕووحی وەحیی، زێدەپنهان تر لەعەقڵ    چونکەغەیبەدوو رلەتەبعە، دوور، لەنەقڵ (٣٢٥٨)
ئاشکرایەعەقلی ئەحمەد،بۆ جیهان    ڕووحی وەحیی وی نەناسی هیچ گییان (٣٢٥٩)
ڕووحی وەحیی،دێت لەوێ کاری دەقیق    دەرکی ناکا،عەقلی هیچ کەس،ئەی ڕەفیق (٣٢٦٠)
جار دەبینێ شێتی، جار حەیرانەئەو    تا نەبێت وەک وی، چلۆ ن تابانەئەو (٣٢٦١)
کاری خزری گەرچی ڕێک و پێک بوو    عەقلی مووسا،زۆری پێ نا لێک بوو (٣٢٦٢)
کاری خزری دیت مووسا، نا لەبار    چونکەنەی بوو حالی وی ئەی هووشیار (٣٢٦٣)
عەقلی مووسا، بەسترا،چاو ی لەغەیب    چی لەدەس دێ،عەقلی مشکی پرلەعەیب؟ (٣٢٦٤)
عیلمی تەقلیدی دەبێ، بەس بۆ فرۆش    موشتەری گەر بێت، ساحەب شادو خۆش (٣٢٦٥)
موشتەری بۆ عیلمی تەحقیقی حەقە    دائیمەن بازاری وی،پڕ ڕەو نەقە (٣٢٦٦)
لەو فرۆشەچی نەکوت، دوو لێوی وی    موشتەری وی بوو، خودای باڵا و نەوی (٣٢٦٧)
بوون مەلەک بۆ دەرسی ئادەم، موشتەری    مەحرەمی ئەو دەرسەنین، دێوو، پەری (٣٢٦٨)

بێژەئــادەم دەرســی (انبــئهم ) بــەوان — یەک بەیەک تۆ ڕازی حەق کە،جوان بەیان (۲۶۹-
بــەو کەســەی کەزیــدەکووتا بینــە، ئــەو — ڕەنــگ بەڕەنگــە، زیــدەبێ تەمکینە،ئــەو (۲۷۰-
مشــک بێــژم چونکــەجێی نیــو خاکەئــەو — خــاک لــەبۆ مشــک، جێگــەژینی چاکەئــەو (۲۷۱-
زۆری ڕێگا هــەن بــەڵام گشت، ژێر خــاک — خــاکی کــون کــرد، زۆری ڕێگــا،کرد چــاک (۲۷۲-
نەفسی مشکی بــەس دزینــی خــۆ شــە، لا — عــەقڵی مشــکی خــوا، بەقــەد، ئیحتــاج،دەدا (۲۷۳-
چــون خــودای دانــا بەگشــت ئەســراڕ وراز — هــیچ شــتێ نــادا بــەهیچ کــەس، بــێ نیــاز (۲۷۴-
گــەر نــەبا عالــەم نیــاز مەنــد ی زەمــین — نــەی دەکــرد چــاک هــیچ ( رب العــالمین ) (۲۷۵-
گــەر بــەکێوان هــیچ نــەبا موحتــاج زەوی — بــۆچی کێــوی کــرد خــودا، ئــەو تــادی وی (۲۷۶-
ئیحتیــاج گــەرهیچ بەئاســمانان، نــەبا — حــەو ت ئاســمانی لــەبۆ چــاکرد خــودا؟ (۲۷۷-
مانــگ و ڕۆژ، ئەســتێرەکانیش بــێ ژمــار — چــون نیــاز بــوو، چــاکی کــردن کردگــار (۲۷۸-
بــۆ نیــاز بــوو، چــاکرا گــەر وا جیهــان — چەنــد، نیــاز بوون،هێندەئەســباب چــاکران (۲۷۹-
جــا نیــازی خــۆت زیــاد کەئــەی، بــەهۆش — تــا کودەریــای جــوود لــەبۆ تــۆ بێتــەجۆش (۲۸۰-
ئــەو گەدایانــەی لەســەر ڕێگــا دەبــن — چــا و نیــازی خــۆ دەڵــێن، بــۆ، تــۆو، ئــەمن (۲۸۱-
کوێری هەم شەل بوون، نەخۆشی جێی پەرۆش — تــا بەوانــەڕەحمی خــەڵکی بێننــەجۆش (۲۸۲-
کــوا دەڵێن نانمان دەنــێ ئــەی مــەردومان؟ — چــون هەمانــەماڵ و حــەمبار، خــان و مــان (۲۸۳-
حــەق بەمشــکی کــوێر نەیــدا خــۆ، چ چــاو — بــێ نیــاز بــوو چــون لــەچاو، بــۆ نــان و. ئــاو (۲۸۴-
چــون لەدەســتی دێ،بژی،خۆش،کوێرەمشــک — دوورلــەتاوو،دوور لــەچاوو،خاکی و ُشــک (۲۸۵-
بــۆ دزیــن لەوخاکەســەر دێنێتــەدەر — وا دەکــا تــا پــاک دەکــا، ئــەو خــوای لەســەر (۲۸۶-
ئــەو بەمــەل تەبــدیل دەبــێ و، پــەرواز دەکــا — زیکــری خــوای زانــا بەســیرڕ و ڕاز،دەکــا (۲۸۷-
جــا لــەگوڵزاری سپاســی زاتــی خــوا — چەشنی بولبول خۆش دەخوێنی،خۆش سەدا (۲۸۸-
ئــەی خودایــەی تــۆ لەبــەد، دامــت نــەجات — دووزەخت کرد، تۆ بەهەشتی خۆش سیفات (۲۸۹-
دا دەنێــی، نێــو دانــەپیوێک ڕەو شــەنی — دەیدەیــە ئێســکێک، بیســتن، ئــەی غــەنی (۲۹۰-
کــوانێ مــەعنی وا لــە، ڕەبتــی وی بەجیسم؟ — کــوانێ ڕەبتی فــەهمی ئەشیا، بوو، بەئیسم؟ (۲۹۱-
مــەعنی تــەیرو، لــەفز، هێلانــە لــەبۆی — ڕووح ئــاوی جاریــە، هەرجیســمە، جــۆی (۲۹۲-
جاریــەڕووح تــۆ ئــەووت پــێ، واقیفــە — توونــد دەچــێ ئــەو، تــۆ ئــەووت پــێ، عاکیفــە (۲۹۳-
گــەرتۆ نــابینی لــەنێو خــاک چــوونی ئــاو — چــین لەسەر ئاو،پووش وخاشاک دێنەچاو؟ (۲۹۴-
مــن مــەرامم لــەو خــەس و خاشــاکەفیکر — لەحزەلــەحزە، دێــن بــەفۆڕ م و شــکڵی، بیکــر (۲۹۵-

ئـاوی جـۆ گــەی فیکـر دائـیم وادەبـێ — پووش لەسەر وی، باش و بەد، پەیدا دەبێ (٣٢٩٦)
بـێ حیسـاب و بـێ ژمـار، دەو ئـاوەدان — پێسـتی میـوەی بـاغی غـەیبی ئـا وەدان (٣٢٩٧)
مـەغزی پێستان تـۆ لـەباغ کـە، جستو جـۆ — چونکـــەدیارەئاو لـــەباغ ڕا، دێتـــەجۆ (٣٢٩٨)
گــەرکو نـــابینی تـــەکانی ئـــاوی ژیـــن — تۆ تەماشای جۆ کە، چۆ ن دێن، گیایی شین (٣٢٩٩)
ئـــاو هـــەتا زۆر تربـێ وەختـــی گـــوزەر — پێســـــت زووتـــــر دێتەبەرچاوونـــــەزەر (٣٣٠٠)
ئـاوی ئـەو جۆگـە، بەتونـدی گـەر دەچێ — غـــەم لەقـــەلبی عارفان،هـــەردەردەچێ (٣٣٠١)
گــەرکو جۆگـــەپڕبوو، زۆرو، ڕۆی، بـــەتاو — خــۆ، چ نــامێنێ دەویــدا، غـەیری ئـاو[1] (٣٣٠٢)

**تەعنەلێدانی بێگانەیەک لەشێخ وجواب دانەوەی موریدی شێخ بەوی..**

تۆهمـەتی دا، وا، لەشـێخیک یـەک نەفـەر — هـەم خەراپـەو ناحەقـەو هـەم بـەد نـەزەر (٣٣٠٣)
ئـارەقی، هـــەم فێڵـــەبازو بـــەد نەفـــەس — بۆموریـدان چـۆ ن، دەبـێ، فـەریاد ڕەس؟ (٣٣٠٤)
یەک نەفەرپێیکوت ئـەدەب قـەت بەرمـەدە — زەننـی وا، بـۆ شەخسـی گەورەزۆربـەدە (٣٣٠٥)
زۆر بـــەدوورە،خۆ لـــەوی و، ئەوســـافی وی — ئیشـــتیبایەک تـــار بکـــاتن، ســـافی وی (٣٣٠٦)
ئیفتیـرای وا قـەت مـەڵێ، بـۆ ئـەهلی حـەق — وەهمـــــی تۆیـــــە، وەربگێڕەتـــــۆ وەرەق (٣٣٠٧)
وانیبەئـــەو،وابێ گەر،ئـــەی تـــەیری خـــاک — بـەحری قـولزوم، قـەت لەمنـدار نیتـی بـاک (٣٣٠٨)
قوللەتەینـــە، ئـــاوی زۆرە ئـــاوی پـــاک — ئـاوی وا نیتـی لەقـەترێک، خـۆ، چ بـاک (٣٣٠٩)
بـــۆ بـــرایم نـــەیبوو ئـــاگر هـــیچ زیـــان — بـــا بترسـێن لـــەو، هــــەموو نـــەمرووديان (٣٣١٠)
نەفسەنەمروود،عەقڵ وگیـان هەردووخـەلیل — گەیبەحـەق ڕووح،نـەفس دەی وێ هـەر دەلیـل (٣٣١١)
بـــۆ موســـافیر ڕێنمـــوون لازم دەبـــوون — چـون لەســـەحرا ون دەبـن بـێ ڕێنمـوون (٣٣١٢)
واســـیلان چـــاوو چرایـــان، بەســـــەبەس — ڕێنموونیـــان ناهـــەوێتن، خـــۆ، چ کـــەس[2] (٣٣١٣)
شەخسی واسیل گـەر دەڵێ جارجار عیلـەل — بۆیـــەتا حـــاڵی بکـــا ئـــەهلی جـــەدەل (٣٣١٤)
بەب،لـەبۆ منـداڵی چـووک (تـی تـی) دەکـا — گـەر چـی عـەقڵی هەندەسـەی گیتـی دەکا (٣٣١٥)
فـەزلی ئوسـتاد خـۆ، چ کـەم نـابێ ئەگـەر — بـێ، بڵـێ، نیتـی، ئـەلیف، زیـر و زەبـەر (٣٣١٦)
تـا کـو فێـری گفتـو گـۆی کـەی تـۆ ئـەوی — لـەو زبانـەی خـۆت، دەبێ زۆر دوور کـەوی (٣٣١٧)
تـۆ، بەتـــەبعی وی دەبـــێ، بێـــژی وُتـــار — تـا کـوفێری کـەی وُتـار، تـۆ، سێ و، چـوار (٣٣١٨)

[1]- هیچ دەوی ناگونجێ ئەودەم، غەیری ئاو (مصرع دوم)

[2]- واسیلان بوویان، فەقەت چاوو چرا — چاوی دڵیان ،چونکە نووری پێدرا

جـا، هـەموو عالـەم لـەبۆ ویـن، وەک منـاڵ ‌ ‌ ‌ پیـر، دەبـێ چـاک تێبگـا، لـەو وەزع و حـاڵ --۹)

کفـر، هـەیتی حـەددو پایـان ئـەی بـرا ‌ ‌ ‌ بـێ نیهایـەت، شـێخ و نـووری وەک چـرا[1] ---۰)

خۆ، لەحاس،بێ حەد،هـەچی مەحـدوودە(نـا) ‌ ‌ ‌ هـەرچی غـەیری حـەق بێ،ئاخر،هـەر فـەنا ---۱)

ئـەو لەهـەرجێ بێـت، کفـرو دیـن نـین ‌ ‌ ‌ مەغزەئەو چون، ڕەنگ و پێستن،کفرو دین ---۲)

ئـــەو فەنایانـــەحیجابن بـــۆ خـــودا ‌ ‌ ‌ وەک لـەژێر تەشـت،دانرێتن، یـەک چـرا ---۳)

جا، سەری سەر تـەن حیجابی ئـەو سـەرە ‌ ‌ ‌ خۆ، لەحاس ئەو سەر، سەری تەن، کافرە ---۴)

کێیـەکافر؟ کـوێر لەحاسـت ئیمـانی شـێخ ‌ ‌ ‌ کێیـەمردوو؟ بـێ خەبـەر لـەگیانی شـێخ ---۵)

گیـان یـەعنی عـیلم و ئاگـاهی و خەبـەر ‌ ‌ ‌ هەرچی زێدەی بوو خەبەر، ئەو جێی لەسەر ---۶)

گیـــانی ئێمـــەزیاد لـــەگیانی جانـــەوەر ‌ ‌ ‌ چونکـــەگیانی ئێمەزێـــدەی بـــوو خەبـــەر ---۷)

جـا لـەگیانی ئێمـە،زیاد گیـانی مەلـەک ‌ ‌ ‌ چون مونەززەه، بوون لەحیسسی موشتەرەک ---۸)

گیـانی پاکـان، زێـدەتر تـا، ئـی مەلـەک ‌ ‌ ‌ تۆ تەحەییو رنەت گرێ و، نـەت بێ، چ شـەک ---۹)

گیـانی ئـادەم چـون لـەوان زیـاتر دەبـوو ‌ ‌ ‌ سـەجدەیان بـرد، بۆیـە، بـۆ ئـادەم، هـەموو ---۰)

ئەی دەنا چۆن، ئـەمری پێدەکرێ مـەزن؟ ‌ ‌ ‌ ســـەجدەبا،بۆ چووکـــەیێکی، بـــێ وەزن ---۱)

کـــوا ســـەزاوارەلەبۆ عـــەدڵی خـــودا ‌ ‌ ‌ سـوورەگوڵ،بۆ دڕکـوداڵ، سـەجدەی بـبا؟ ---۲)

گیـان کـەکامیل بـوو، دەبـێ، بـێ ئینتیهـا ‌ ‌ ‌ گیـانی گشـت ئەشیا، لـەوی، فـەرمان دەبـا ---۳)

تـەیرو ماسـی هـەم پـەری هـەم ئـادەمی ‌ ‌ ‌ گشـت ئیتاعـەت لەو دەکەن، زۆرو کـەمی[2] ---۴)

چـی بڵـێ ئـەو، چادەکـەن ماسـیان زوو ‌ ‌ ‌ تـــابعی ویـــن وەک لـــەبۆ دەرزی، دەزوو ---۵)

**پاشماوەی داستانی ئیبراهیم (قدس اللەروحه) لە قەراغ دەریا ...**

چـون نفـووزی ئـەمری شـێخی دی، ئـەمیر ‌ ‌ ‌ ماسـی وا دیـن، کەوتـە، وەجـدی دڵپـەزیر ---۶)

دەیکـوت، ئـاه، ماسـی لەپیران،باخەبـەر ‌ ‌ ‌ وای بـەحاڵی وەی، لـەدەر، دەخرایـەدەر --۳۷)

ماسـیان ئاگـان، لـەپیر، ئێمـەش بەعیـد ‌ ‌ ‌ ئێمـە بـەدبەخت و، ئـەوان شـاد و سـەعید --۳۸)

کـردی تـەعزیم و بـەگریان جـا، دەڕۆی ‌ ‌ ‌ شـێت دەبـوو لـەو عیشـقی دەکراوە، لەبۆی --۳۹)

چیـت دەوێ تـۆ بێژەئـەی ناپـاک و بـەد ‌ ‌ ‌ تـۆ دەگـەڵ کێ،وا دەکـەی کێشەوحەسـەد؟ --۴۰)

تـۆ، بـەکلکی شـێر دەکـەی گاڵتـەو قومـار ‌ ‌ ‌ سـەرمەلائیک تـۆ دەکـەی حـەملان بـەغار --۴۱)

---

[1]- شێخ و نووری شێخ نیبانە، ئینتیها (مصرع دوم)

[2]- بۆ تیوورو ئادەمی و ،ماسی و ، پەری چون تەواو بوو، دێتەدەس وی، سەروەری

چۆن بەخێری مەحز، بێژی ناڕەوا؟     کاری وا ناحەز، مەزانە پڕبەها (٣٣٤٢)
بەد بەمانای مسسی موحتاج،کەم بەها     شێخ یانی کیمیای بێ ئینتیها (٣٣٤٣)
مس ئەگەرقابیل نەبوو، بۆ کیمیا     قەت بەمس نابێ بەمس، خۆ کیمیا (٣٣٤٤)
بەد بەمانای سەر کەشێک ئاگر عەمەل     شێخ یانی عەینی دەریایی ئەزەل (٣٣٤٥)
دائیمەن ئاگر دەترسێتن لەئاو     ئا و کەناترسێ لەئا گری هەڵکراو[1] (٣٣٤٦)
تۆ دەرووی مانگ دا دەبینی، عەیب و عار     تۆ لەجەننەت،هەڵدەکێشی دڕک و خار (٣٣٤٧)
بچیە جەننەت، خار لەوێ، پەیدا نییە     گەرکو بش بێ، غەیری تۆی، تێدا نییە (٣٣٤٨)
دەتهەوێ، تۆ ڕووی هەتا و، بگری بەقوڕ     دەتهەوێ ئیراد، لەمانگی چەشنی دوڕ (٣٣٤٩)
ئەوهەتاوەی ڕوون دەکاتن گشت جیهان     چۆن لەبۆیەک چەکچەکی،دەکرێ نیهان؟ (٣٣٥٠)
هەن عیووب،چون پیرئەوانی دی بەعەیب     ویستی پیرانەکەغەیبان،بوون بەغەیب (٣٣٥١)
گەر کو دووری، تۆ بەڕاستی یار بە     بۆ نەدامەت،چابوک و،وشیار بە (٣٣٥٢)
تا لەڕێگای وا، نەسیمێک بێ، لەبۆت     ئاوی ڕەحمەت،بۆ حەسەد مەگرە، لەخۆت (٣٣٥٣)
گەرچی دووری لەو، لەدووڕڕات،خۆش بوێ     تۆ لەهەرجێگا ببی،زوو ڕوو،کەوێ (٣٣٥٤)
گەرکەرێکی توند ڕەو، دەقوڕێ،کەوێ     لەحزەلەحزەدەیهەوێ، دەربێ، لەوێ (٣٣٥٥)
دەیهەوێ ئەو، خۆی لەقوڕ،داتن نەجات     چون دەزانێ، نابێ قوڕ،جێگای حەیات (٣٣٥٦)
زۆر لەحیسسی تۆ بەحیس تر، حیسسی کەر     چون دڵت نەی ویست،لەقوڕ،قەت بێیەدەر (٣٣٥٧)
باشەلای تۆ، ئەو قوڕەی پیس و دەنی     چونکەنات وێ،قەت لەوی،دڵ هەڵقەنی (٣٣٥٨)
وا دەکەم من چونکەزۆرم بوو نییاز     عاجزان ئازار نادا،چارەساز (٣٣٥٩)
خوا ئەتۆی گرت،کوێری کرد چاوت، غروور     هەر وەکوو کەفتاری کوێر نەت،دی، چ نوور[2] (٣٣٦٠)
ئێرەجێی کەفتار نیە، ڕاوچی دەڵێن     غار لەکەفتار،خالییە، لێرەش هەڵێن (٣٣٦١)
وا دەڵێن و دادەنێن داو،ڕا و چییان     ئەو دەڵێت،کوێر بوون،لەحاس،من گشتییان[3] (٣٣٦٢)
دوژمنی من گەر لەمن ئاگا ببا     بۆچی دەیکوت کوانێ کەفتار کوانێ کوا؟[4] (٣٣٦٣)

---

[1]- ئاو کەناترسێ لەناری هەڵکراو (مصرع دوم)
[2]- خوا ئەتۆ ی گرت ،تۆش غروورت هات وەدی     هەر وەکووکەفتاری کوێر بووی ،چت نەدی
[3]- ئەو دەڵی کوێر بوون لەحاستم گشتییان (مصرع دوم)
[4]- گەر لەمن ئاگا ببا دوژمن، چلۆن     دەیکوت ئەو، کەفتار لێرەنین ،بڕۆن؟

**ئیددیعای ئەوکەسەی کەخوداوەند ئەمن بەسەبەب گوناهم موجازات ناکا..**

**خولاسەی داستان...**

شەخسێکی نەفام وگوناهکار دەزەمانی شوعەیب دا، ئیددیعای دەکرد کە هەرچەند ئەمن زۆر خەرابکارم خوداوەند ئەمن موجازات ناکا، خوداوەند بۆ شوعەیبی وەحی نازڵ کرد کەبەو شەخسەبڵێ، ئەمن ئەتۆم زۆر موجازات کردووە بەڵام ئەتۆ تێناگەی وموجازاتەکەشت ئەوەیەکەئەمن ئەتۆم لەشیرنایی ولەززەتی دعا، مەحرووم کردووە..

یەک نەفەر دەیکوت دەدەورانی شوعەیب     خوا گەلێکی دی لەمن ئیراد و عەیب
زۆر لەمن دیتی خودا جورم و،خەتا     چون دەگەڵ من لوتفی بوو، نەیدام سەزا
حەق تەعالا، وایدەکوت بەگوێی شوعەیب     بۆ جەوابی وی فەسیح ئەمما لەغەیب
گەر دەڵەی کردم گەلێک زۆر، من گوناە     نەیدەدام ئازار بەلوتفی خۆی ئیلاە
بەر خیلافن گفتی تۆ، ئەی چاک نەناس     کوێرەڕێت گرت،لات دەنا تۆ، ڕێی ڕاس
من گەلێک جار دام سەزات، نەت بوو خەبەر     تۆ دەزەنجیردای، لەپێ، تا تۆقی سەر
ژەنگی توێ توێی ئەو دڵەت وەک قیری ڕەش     زاهیری تۆ ی، ئەو دەنایەنێو هەش
ئەو دڵەی تۆ هێندەژەنگی کەو تەسەر     کوێرەبۆیە، بوو لەئەسراڕ، بێ خەبەر
مەنجەڵی نوێ، دووکەڵی گەر وێکەوێ     با کەمیش بێ، دیاردەکا جێگای لەوێ
چون هەموو شت هەربەزید،پەیدا دەبێ     چاو،سپی،چۆ ن،ڕەش لەسەروی چا دەبێ؟
ڕەش ببێ مەنجەڵ بەدوو کەڵ ژێرو ڕوو     کوا دەکا تەئسیر دووکەڵ دوایەزوو؟
گەرکو ئاسنگەر ببێتن، پیاوی زەنگ     ڕووی دەگەڵ دووکەڵ دەبێتن، هاو ڕەنگ
گەرسپی پێستێک بکا ئاسنگەری     ڕووی،دەکا،دووکەڵ،بەڵەک،وەک ڕوو،و سەری
جا، دەبێ حاڵی لە تەئسیری گوناە     تا بناڵێت وبڵێت زوو، ئەی ئیلاە
گەرکوئیسراڕ کات و بەد، ئەو پیشەکا     خاک وخۆڵ بێ ئەو، دەچاو ئەندیشەکا
فکری تۆ بەی نابێ، لای شیرین دەبێ     جورم و زوڵمی زۆر، هەتا بێ دین دەبێ
جا، پەشیمانی لەلای وی، دەچتە دەر     قەلبی وی جا،توێ توێی،ژەنگ دێتەسەر
ژەنگ دەخوا،ئاسنی وی،یەک سەرە     ژەنگ دەکا کەم چی لەلا وەک گەو هەرە
سەرسپی کاغەز، بنووسرێ، چەند خەت     دێتەخوێندن هەرچی نووسرا، بێ غەڵەت
گەر بنووسی تۆ لەسەرنووسراوی دی     لەفزو مەعنای واقعی وی کەس نەدی
گەر لەسەر یەک خەت خەتێکی دیکەهات     ئەو دووخەت نادەن،چ مەعنا،خۆ،چ کات

بێتەسەر ئەو دووخەتەگەر سووەمی ڕەش دەبێ وەک گیانی کافر ئەو دەمی (٣٣٨٥)

چارەتەنها هەر پەنا بۆ چارەگەر یەئسەمس، ئیکسیری وی تەنها نەزەر (٣٣٨٦)

تا ئومیدیان دابنێ لای وی هەتا دەردی بێ دەرمانی تۆ، بکرێ دەوا (٣٣٨٧)

چون شوعەیب وای پەنددەدا،بەو هەرچەلێک لێیدەپوشکووتن دڵی وی گوڵ،گەلێک (٣٣٨٨)

گیانی وی دەی بیست وەحیی، ئاسمان دەیکوت ئەو گەر گرتمی کوانێ نیشان؟ (٣٣٨٩)

هیچ قەبووڵ ناکات ئەو، ئەی خوایە، لێم ئەونیشانەی گرتنی، داوایە، لێم (٣٣٩٠)

خوا کوتی من ساتیرم، ناڵەم سوڕان هیچیان ناڵەم بەغەیری یەک لەوان (٣٣٩١)

یەک نیشانەی قەهری من بۆ ی بوو،وەها چەندی تاعەت کرد، ڕۆژوو یادوعا (٣٣٩٢)

یا نەنوێژ و یا زەکاتو غەیری وان تامی خۆشی زەڕ ڕەیەک ناداتەگیان (٣٣٩٢)

تاعەت و ئەفعالی چاک ئەنجا م دەدا شادناکا ئەو بەقەد، یەک پووشکەکا (٣٣٩٤)

تاعەتی وی جوانە، بۆی، مەعنا نییە گوێزی زۆرن، مەغزیان تێدا نییە (٣٣٩٥)

زەوق، لازم، تا، بدا، تاعات بەر مەغزلازم، تا لەدەنک، دەربێ، شەجەر (٣٣٩٦)

دەنکی بێ مەغز، کوا دەبێتەنەو نەهاڵ؟ سووڕەتی بێ ڕووح نەبوو، غەیری خەیاڵ (٣٣٩٧)

**پاشماوەی تەعنەلێدانی ئەو کابرا بێگانە لە شێخ...**

زۆر بەدی بۆشێخ دەکوت ئەو نا لەبار دائیمەن هەرکەج دەنۆڕی،عەقڵ،خوار (٣٣٩٨)

دیم بەچاوم، من لەجێیەک ئەو کەسە ئەو لەتەقواو، مەعریفەت دا،موفلیسە (٣٣٩٩)

باوەڕیست گەرنایەهەستەتۆ، لەخەو تا ببینی شێخی خۆت و، فیسقی ئەو (٣٤٠٠)

هەرکولانکێکی دەبرد،کابرا، بەشەو پێیدەکوت، تۆ چاو لەشێخ کەو فیسقی ئەو (٣٤٠١)

چو،ڕیبای ڕۆژ،فیسقی شەو،یالەعەجەب ئەوبەڕۆژ،وەک مستەفا، شەو،بوولەهەب (٣٤٠٢)

ڕۆژ بەعبداڵڵە، دەبیسرێ، ناوی، وەی شەو بەدەس دەگرێت جامی پڕ لەمەی[1] (٣٤٠٣)

دی کەجام پڕ، وا بەدەستی شێخەکەی پێیکوت ئەی شێخ،تۆش فێڵی وادەکەی؟ (٣٤٠٤)

نەت دەکوت جامی شەراب نابێ تەمیز؟ چون سبەینان دەو دەکا، شەیتان میز (٣٤٠٥)

دی جەواب وا، جامی منیان پڕ دەکرد غەیری نووری کردگار چی دی نەبرد (٣٤٠٦)

چاو لەمن کە، غەیری خوام خۆ، لا نییە هەرچی بیستووتەدرۆیە، وا نییە (٣٤٠٧)

جام وخەمری زاهیری ئەو دووانە، نین دوورەئەوهەیە، زۆر لەشێخی غەیب بین (٣٤٠٨)

---

[1]- هەرکەڕۆژهات، بۆ وی عەبدوڵلایە نام    شەو کە هات دەگرێ، بەبێ باکانە جام

جامی مەی هەر بوونی شێخ بوو، ئەی دزێو — کوا دەویدا، میز دەکەن شەیتان و دێو؟ (٣٤٠٩)

ئەو وجوودی پڕلەنووری خوای حەقە — ئەو شکاندی، تەن، کەنووری موتڵەقە (٣٤١٠)

گەر وەپیسایی کەوێ نووری هەتاو — نوور کەپیس نابێت و، ناچێت ئەو لەناو (٣٤١١)

شێخ کوتی، خۆ، ئەو هەجام و مەی نییە — چاک بنۆڕەتا بزانی، ئەو چییە (٣٤١٢)

هات و دیتی ئەنگەبینی خاس بوو — کوێرونابینا دەبوو جا، ئەو عەدوو (٣٤١٣)

شێخ دەیکوت بەو موریدەی، ئەو دەمەی — تۆ بڕۆ، بۆم جستوجۆکە،زووکەمەی (٣٤١٤)

ناعیلاجم چوون دەکێشم زۆرعەزاب — ڕەنج ودەردان، وان لەدەردم بێ حیساب (٣٤١٥)

بۆ زەروورەت،خۆ، دەبێ منداریاک — سەرسەری،مونکیر،لە، لەعنەت بێت خاک (٣٤١٦)

چوو لەخومخانان گەڕا بۆشێخ، موریـد — هەرچی خوم دەیدیت، دەی چێژت،لەو نەبید (٣٤١٧)

ئەو لەخومخانان شەرابی هیچ نەدین — دی خومی مەی،گشتی پڕپڕ،ئەنگەبین (٣٤١٨)

دەیکوت ئەی مەستان بێژن بۆ م جەواب — بۆ چی نابینم لەنێو هیچ خوم، شەراب؟[1] (٣٤١٩)

هاتنەلای شێخ هەر بەعام گشتیان مەست — چاوبەگریان بوون،لەسەریان دا بەدەست (٣٤٢٠)

بۆ خەرابات هاتی ئەی شێخی ئەجەل — لەقدوومەت، هەرچی مەی بوو،بۆ عەسەل (٣٤٢١)

مەی کەپیسەجوان و پاکت کرد ئەتۆ — گیانی پیسیشمان بگۆڕە، هەربەخۆ (٣٤٢٢)

گەرکودونیا گشت دەخوێن دا، بێ شەلاڵ — ناخوات بەندەی خودا، غەیری حەلاڵ (٣٤٢٣)

**کوتنی حەزرەتی عایشە(رض) بە حەزرەتی موحەممەد(ص) کە ئەتۆ بە بێ موسەللا لە هەموو جێگایەک نوێژ دەکەی...**

عائیشەکردی لەبۆ ئەحمەد بەیان — ( یا رەسول اللە) عەیان و هەم نیهان (٣٤٢٤)

نوێژدەکەی تۆ،بووی، لەهەرجێ، نیشتەجێ — خۆ دەماڵ دا پاک و پیسی دیتە،تێ (٣٤٢٥)

موستەحازەو تیفل وئالوودەو، نەجیس — بچنەهەرجێ،جێ بەجێ،دەیکەن،بەپیس (٣٤٢٦)

دەیکوت ئەحمەد، بۆ ئەوەی لای خوا،عەزیز — گشتی جێگای ناحەزی خوا کرد تەمیز (٣٤٢٧)

هەرلەبۆیەجێگەسەجدەم،کردی حەق — پاک و خاوێن تا دەگا،حەوتەم تەبەق (٣٤٢٨)

با حەسوودیت بێ دەگەڵ پاکان، فەنا — تۆ دەبێ ئیبلیسی نێو دونیا، دەنا (٣٤٢٩)

ژار، دەگۆڕێ، بۆی بەهەنگوین کردگار — هەنگووین بۆ تۆ دەبێتەژاری مار (٣٤٣٠)

گەرکوگۆ ڕاوو، بەدەل بووکاری وی — بوو بەلوتف و،بوو بەنوور،گشت ناری وی (٣٤٣١)

خوا بوو، نیرووی، بۆ ئەبابیل دا دەنا — چۆن دەکووژن،چەن پەڕەندە، فیل،دەنا؟ (٣٤٣٢)

---

[1] - دەیکوت ئەی مەستان بێژن ئێوەدەی — بۆچی نابینم دەخوم دا، من، چ مەی؟

چەن، پەڕەندا ن لەشکریکیان،تیک شکاند تـا،بزانی قــوودرەتی خــۆی، خــوا، نووانــد [1] (٣٤٣٣)
گەرکوبت بێ شەکک وشوبهە، لەو قەبیل تــۆ بخوێنەســـوورەتی ئەســحابی فیــل (٣٤٣٤)
گەرکو دەعوا کەی دەگەڵ ئەو سەر وەرە کــافرم گەر،دەربــەری تــۆ ئەوســەرە [2] (٣٤٣٥)

**کێشانی مشکێک هاوساری وُشترێک و مەغروور و موتەکەببیر بوونی مشک لەو حاڵەتە..**

**خولاسەی داستان...**

مشـکێک هاوسـاری وُشـترێکی بەدەسـت گرتبـوو وبـەغرووریکی زۆردەپێشـی دا دەرۆیشـت و وشتریش بەدوای دا، مشکەکەزۆر مەغروور بوو، وشتر موتەوەججیهی ئەوحاڵەتەبوو بـەڵام چی نەکوت تا گەیشتەقەراغ ئاوێکی زۆر کەحەیواناتی بەقودرەتیش نەیان دەتوانی لەوێ بپەڕ نەوە، مشکەکەبەسەرسامی وترسـەوە،لەوێ ڕاوەسـتا وهـیچ نـەچۆ، پـێش وشـتر بـۆ ئـەدەب دانـی مشـکەکە،کوتی ئـەی هـاوڕێم بـۆ لێـرەڕاوەسـتاوی وناچیـەپێش؟ بـرۆ ئـەمن بـەدوات دا دێم،مشکەکە،جوابی داوەئاخر ئەوچۆمەزۆرگەورەیەدەترسم کەبەهیلاک بچم وشترکوتی با بزانم تاکوێی لاقم دێ؟فەوڕەن لاقی بردەنێوئاوەکەوکوتی ئەوەکە، شتێکی وا نیە،هێشتا هەتا چۆکم نەهاتووە، ئـەتۆ بۆ هێندەدەترسی؟،مشکەکە،کوتی ئەو ئاوە بۆ تۆ هیچ نییەبەڵام بۆ من زۆ رە، عاقیبەت مشکەکە، دەستی لەخود خواهی و تەکەببورو خۆ بـەزل زانین، هەلگرت،ولەوشترکەی داوای کرد لەو چۆمەگەورەیە بی پەڕینیتەوە وشتر لەرووی ڕەحمەوە ئەوی پەڕاندەوە..

گرتـی هـاو سـاری شـتور مشـکێک بچـووک ئەو بەدووی خۆی دا،دەکێشا سەهل و سووک (٣٤٣٦)
چونکـەوُشـتر تونـد بـەدووی وی دا دەچـوو خــۆی بــەزۆرزانی مشــک، مــەغروور بــوو (٣٤٣٧)
تێگەیشــت وشــتر لــەبیری مشــکی کــەم وای دەکـوت ئـەو، دوایەئـەو حـاڵی دەکـەم (٣٤٣٨)
تـا کوگەینـەچۆ مـەکی زۆر چەشـنی نیـل لێـی دەترسـان گـورگ و شـێرو بـەبرو فیـل (٣٤٣٩)
مشکەوێستا هیچ نـەچۆ پێش یـەک قـەدەم پێیـدەکوت وشـتر ئـەتۆ ئـەی دۆسـتەکەم (٣٤٤٠)
بـۆچی وێستا ی بـۆچی سـەر گـەردانی تـۆ؟ زوو بـرۆ نێـو، گـەر وەکـوو مـەردانی تـۆ (٣٤٤١)
پێشـقەڕاوڵ و ڕەهنـەمای بـۆ مـن ئـەتۆ بــۆچی وێســتای ڕا مەوەســتەزوو بــرۆ؟ (٣٤٤٢)
جــوابی دا، ئــەو ئــاوەزۆرە، زۆر عــەمیق مــن لــەخنکان زۆر دەترسـم ئـەی ڕەفیـق (٣٤٤٣)

---

[1] - چەن پەڕەندان، لەشکرێکیان دا شکەست تا ، بزانی هەرخودا نیرووی ، بەدەست

[2] - غەیرە مومکین دەر بەری تۆ، ئەو سەرە(مصرع دوم)

جـا، شـتور دەیکـوت بـزانم چەنـدەئاو      پێـی دەنێـو ئـەو ئاوەنـا،وُشـتر بـەتاو
پێیـدەکوت تا،چۆکمـە،ئاو ئـەی کوێرەمشـک      بـۆچی سەرسام مای،لەهۆش نەت،ماچ پشـک
مشـکەپێیکوت ئەوکەمـەش دەمکات،غـەرق      خـۆت دەزانـی چـۆک هەتاچۆک،زۆرەفـەرق
گـەرِکودێت تـا چـۆکی تـۆ ئـەی باهونـەر      سەت گەزیش زیاتر لەسەر من دێتەسـەر
پێیـدەکوت وُشـتر حـەیات بـێ چـاترە      جیسـم و گیانـت نـەگرێ بـا ئـەو ئـاگرە
تـۆ دەگـەڵ مشـکان دەکـەی دەعـوا، بکـە      شـەرِ دەگـەڵ وُشـتر مەکـە، بـڕوا بکـە
مشـکەدەیکوت، تۆبـە، هـەرتۆم سـەر وەری      بمبـەبۆ خـاتر خودا،بـۆ ئـەو بـەری
ڕەحمـی پێدا هات و وای کوت، جا بـەوی      بێرەسـەر پشـتم دەزانـم تـا کـەوی[1]
سـەهلەبۆمن،چوون دەنێـو ئـەو ئـاوی چـۆم      سـەت هـەزاروەک تـۆش لەپشت،خۆم کـەم بـڕۆم
چـون نـەبی، نی،تۆ،بـەڕێی وی دا بـڕۆ      لابەنەفسـت، جـاه، بێنـەدەسـتی خـۆ
تـۆ ببەڕەعیـەت ئەگـەر سـوڵتان،نی      ڕامـەدە، کەشـتی، کەکەشـتیبان، نـی
گـەر کـو نـازانی دوکـان، تـەک دامـەنێ      تـاکوفێربی،بگرەتۆ، یـەک دامـەنێ
(انصـتوا) تـۆ بگرەگـوێ، خـامۆش بـە      چون زبانی حەق نەبووی، گوێی، هۆش بە
گـەر دەڵـەی تـۆ چەشـنی ئیستیفسـار بڵـێ      تـۆ دەگـەڵ شـاهان، مسـکین وار، بڵـێ
ئیبتیـدایی کیبـرو کین،هەرشـەهوەتە      عادەتەمحکـەم دەکائـەو، تـۆش هەتـە
خوویی بـەد گـەر بـوو بـەعادەت زۆر قـەوی      هـەرچی بێژیـت لابەئـەو،تۆ خەسـمی وی[2]
هـەر کەسێکی مـەنعی گـڵ خـۆر کا لـەگڵ      دوژمنـی گـەڵ وی دەکـا، گـڵ خـۆر بـەدڵ
بوت پەرەستان چونکەخوویان گرت بەبوت      مـانعی بوتیـان ئـەوان، دوژمـن دەکـوت
ئیبلیس چون هـەی بوو،خوویی سـەر وەری      ئـادەمی دی ئـەو بـەچاوی مـونکیری
کـوا کەسێک پەیـدا دەبـێ چـاتر لـەمن؟      تـا کوسـەجـدەی بـۆ بـەرم ئـەمنی مـەزن
سـەمم و ژەهرەسـەر وەری بـۆ عام،بەجـەم      غەیری ڕۆحێک بوو بەکانگای زیددی سەم
تـۆ مەترسـەگەرکوکێو پڕبـێ لـەمار      چونکـەکێو تێیـدا هەیـە، زۆر زیـددی ژار
سەرووەری گـەر خـۆی دەمـەغزی تـۆ نوواند      دوژمنەبۆت ئەو کەسەی هات تۆی شکاند
گـەرخیلافی عادەتت،کـا یـەک ئەحـەد      کینـەدەگری تـۆ دەگـەڵ وی زیـاد لەحـەد
دەیهـەوێ خـوو وعـادەتم، لا بـا، لـەبن      دەیهـەوێ تـابیع بکـا بـۆ خـۆی، ئـەمن

---

[1]- بێرەسەرپشتم دڵی خۆ ت کەقەوی (مصرع دوم)
[2]- هەرچی بێژیت وامەکەتۆ خەسمی وی (مصرع دوم)

عادەتی بەد گەر قەوی و مەحکەم نەبێ — کینی ناویّ،بـاخیلافیش بێتەجێ (٣٤٦٩)
گەڵ موخالیف ئەو مودارا جا، دەکا — نێو دڵی وی جێ لەبۆخۆی چا دەکا (٣٤٧٠)
خوویی بەد چون بوو، دەویدا،پایەدار — مووری شەهوەت،بوو بەعادەت چەشنی مار (٣٤٧١)
ماری شەهوەت تۆ بکووژەئیبتیدا — خۆ دەنا مارت دەبێتەئەژدیها (٣٤٧٢)
موور دەبینێ گشتی ئینسان، ماری خۆ — تۆ لەساحەب دڵ بپرسەکاری خۆ (٣٤٧٣)
مس کەبۆ زێڕ، زانی ئەو مس بوو، لەپێش — دڵ کەبۆشا، زانی موفلیس بوو، لەپێش (٣٤٧٤)
جەشنی مس، تۆ خزمەتی ئیکسیربکە — خۆ ت لەبۆ دڵداری خۆ ت ئێخسیر بکە (٣٤٧٥)
شەیری ئەهلی دڵ کەسێک دڵدار نییە — غەیری دونیای دی لەلای وی دیار نییە (٣٤٧٦)
کەم ببێژەعەیبی عەبدی خوا ئەتۆ — موتتەهەم کەم، کە، بەسیرقەت شا، ئەتۆ (٣٤٧٧)

**کەراماتی ئەو دەروێشەی کە دە کەشتی دا موتتەهەمیان کرد..**

**خولاسەی داستان...**

دەروێشێک دەگەڵ جەماعەتێک هاتەکەشتییەکی وهیچ ماڵ وسەروەتی نەبووبەڵکەم سەر وەتی وی بێ نیازی ڕووحی ومەعنەوی،وی بوو، ئەو لەگۆشەیێکی کەشتی خەوی لێکەوتبوو کەلەناکاو سەروسەدایەک پەیدا بوو، کیسەیێکی زێڕ دزرا بوو،هەمووموسافیرەکان گەڕان، لەپاشان هاتنەلای ئەو دەروێشە، دەروێش لەو گومانەزۆر ناڕەحەت بوو، وڕووی دەبارەگای خودا کرد و کوتی ئەی خوداوەند عەبدی تۆ یان موتتەهەم کردووە، چۆنی پێت مەسڵەحەتەوا بکە، لەوکاتەدا سەدان هەزار ماسی سەریان لەئاو هینا دەر وهەریەک مورواریدێکی بەقیمەتی دەزاری دا بوو ئەو دەروێشەچەند دانەیێکی لەو مرواریدانەوەر گرت ودەنێو کەشتییەکەی هاویشت، لەپاشان هەڵفڕی .. حەوا بۆ وی وەک کەشتی دەحاڵی حەڕەکەتی لێهات و بەخەڵکی کەشتییەکەی کوت.. کەشتی بۆ ئێوە، وخوداوەند بۆمن ..

یەک نەفەردەروێش، دەکەشتی دا دەبوو — ئەو لەمەردی تەکیەگای بۆ جا دەبوو (٣٤٧٨)
کیسەیەک زێڕ ون دەبوو ئەو بوو،دەخەو — پاش گەڕانی خەڵکی چوون بۆلایی،ئەو (٣٤٧٩)
ئەو فەقیرەش جستو جۆ کەین، ئێمەبا — ساحەبی زێڕ پێیدەکوت تۆش هەستە،جا (٣٤٨٠)
جونکەکیسێک زێڕمان، لێ ون بووە — خەڵکما ن کرد جستو جۆ، نۆ بەی تووە (٣٤٨١)
ڕووت ببەزوو، ئێستەدەربێنەتۆ دەڵق — تا لەتۆ فارغ ببن ئەو هامی خەڵق (٣٤٨٢)
..یکوتئەیحەق لێم دەدەن توهمەتخەسان — بێرەفریام ئەی پەناهی بێ کەسان (٣٤٨٣)

چـون دڵـی دەرویـش ئیشـی کـەو تـەتێ — خسـتییانەدەر سـەری خـۆ، جـێ بـەجێ (٠٤)

ماسیان لـەو بـەحری قووڵـدا، سـەت هـەزار — بووبـــەزاریان گەوهــــەرێکی شـــاهوار (٠٥)

سـەت هـەزاران ماسـی لـەو دەریـای عـەمیق — بووبـەزاریان هەریـەکێک دوڕی عـەتیق[1] (٠٦)

ماڵیـاتی کیشـوەرێک بـوو یـەک لـەوان — کەس لەوان نەی بوو بەغەیری خوای جیهان (٠٧)

خستیەکەشتی قیسـمەتێک دوڕ،دوایـەخـۆی — چۆحـەوا دانیشـت لەسەرکورسـی دەڕۆی

زۆر،بەڕاحـەت ڕۆی لەسـەر ئـەو تەختـەبووی — کەوتـەپێش، ئەو،کەشتی پێشووش،بوو لـەدووی (٠٩)

پێیکـوتن، بـۆ وە، گـەمی، بـۆ مـیش خـودا — تـا دەگـەڵ ئێوەنـەبێت یـەک دز،گـەدا (١٠)

لــەو فیراقەکێهـــەمان بــۆ ن دێ زیـــان؟ — خوا دەگەڵ من جووتە، خەڵکیش لێم جیبان (١١)

توهمـــەتی سـێرقەت لـەمن نـادا،چ کـات — ئیختیـارم کـوا وەدەس نـا کـەس دەدات؟ (١٢)

ئـەهلی کەشتی بانگیـان کـرد ئـەی عـەزیز — چـۆ ن بـەتۆ یـان دا مـەقامی وا تـەمیز؟ (١٣)

پێیکـوتن چـون دامەبـەر توهمـەت فـەقیر — هەم خودام ڕەنجاند لەبۆ یەک شت حەقیر (١٤)

حـاش لڵــە، بـەل لەتـەعزیمی شــەهان — مـن نـەبووم قـەت بـۆ فـەقیران بـەدگومان (١٥)

ئـەو فەقیرانـەی لـەتیف وخـۆش نەفـەس — هات لەبۆ تـەعزیمی وان،سوورەی عەبەس (١٦)

ئـەو نـەداری و فـەقری وی، بـۆ ژیـن نییـە — بەڵکــەبۆ غــەیری خــودایی دیــن نییــە (١٧)

موتتەهـەم ناکـەم ئـەوان قەت،چونکەحـەق — پێـی سـپاردن مـەخزەنی حەوتـەم تەبـەق (١٨)

موتتەهەم نەفسـە، نـەوەک عـەقڵی شـەریف — موتتەهـەم حیسسـە،نەوەک نـووری لـەتیف (١٩)

نەفسـی سـۆ فەسـتائی، لێیدە،ئـەی خـەلیل — چونکەلێـدان ڕاس دەکـا ئـەو، نـەک دەلیـل (٢٠)

موعجیزەی گـەردیت دەبێ شاد ئەو دەمە — جـا، لەپاشـان پێـی خەیاڵـە، پێـی کەمـە[2] (٢١)

نـەفس بێژیـت، گـەر کووڕاس بان بێ درەو — خــۆ دەبـا چـــاو دیتبـــانی ڕۆ ژو، شـــەو (٢٢)

خـۆ ئـەوان لای چـاوی پاکـان بـوون عـەیان — چـاوی حـــەیوان کـوا دەبینێـتن ئـەوان؟ (٢٣)

موعجیزات لەوحیسسـە،بوویان عـار و نـەنگ — چـۆ ن دەبێ تـاووس لـەچاڵێک تاروتـەنگ؟ (٢٤)

پـێم نەڵـەی تـا زۆر بڵێی،تـۆ ئـەی ڕەفیـق[3] — مـن لەسـەت،هەریـەک‌دەڵـەم وەک مـوو، دەقیـق (٢٥)

---

[1]- بوون لەنێو ئەو بەحرەماسی سەت هەزار — دا نەدانە گەوهەرێکیان بوو، لەزار

[2]- جا لەپاشان پێی خەیاڵەو ، پێی گەمە(مصرع دوم)

[3]- زۆر بڵێم تا پێ نەڵێی ، تۆ ئەی ڕەفیق (مصرع اول)

### سەرزەنیش کردنی سۆفیان ئەو سۆفیەی کە لە لای شێخ زۆری دەکوت...

سۆفییەکیان تەعنەلێدا سۆفیان      چوون لەبۆ لای شێخی مەحبووب وەک گیان (٣٥٠٦)
وا بەشێخیان کوت ئەتۆ ئەی ڕابەرن      بێژەتا ئەو سۆفییەن، لا، لا بەرن (٣٥٠٧)
پێیکوتن ئەی سۆ فیان،جورمی چییە؟      جواب درا، سێ جورمی هەن، ئەو سۆ فییە (٣٥٠٨)
زۆ ربڵێ یە، دەنگی دێ، هەر وەک جەرەس      خواردنیشی زۆر ترە، تا بیست کەس[1] (٣٥٠٩)
هەر وەکوو ئەسحابی کەهفە، ئەو لەخەو      گشتی کوتیان وایەئەی شێخ، بێ درەو (٣٥١٠)
شێخ کوتی جا، بەو فەقیری دڵ بەئێش      تۆ وەسەت بگرەلەهەرشت هاتەپێش (٣٥١١)
چاکترین کار، بوو، وەسەت،وای کوت نەبێ      تۆ کە ئەخلاتت، تەراز بن، چادەبێ (٣٥١٢)
گەرنەبن ئەخلات دەگەڵ یێک، هەمتەراز      تەن دەبێ بیمار و، نای بێتن، چ واز (٣٥١٣)
حەدی دۆستت تۆ لەحەد زیاد، با نەکەی      تا جودائی، تۆ دەگەڵ وی، چا، نەکەی (٣٥١٤)
نوتقی مووسا بوو بەئەندازە، بەڵام      زیاد لەگفتی یاری خۆی کوت، ئەو کەلام (٣٥١٥)
زۆر کوتن گەڵ خزر، بۆ مایەی شیقاق      پێیدەکوت،تۆ زۆر بڵێی،(هذا فرا ق) (٣٥١٦)
مووسیا، چون زۆربڵێی، تۆ لام هەڵێ      ئەی دەنا، لام کوێرو لاڵ بە، هیچ مەڵێ (٣٥١٧)
گەرکو ناڕۆی و دەمێنی تۆ لەلام      تۆ، لەمەعنا، نی لەلام، من لێت جودام (٣٥١٨)
گەردەنوێژ دا لێت شکا، دەس نوێژ، زوو      تۆ بڕۆ تا بگری، سەر لەنوێ، وزوو (٣٥١٩)
گەر نەچووی و،خۆت خوارو خەم دەکەی      نوێژی بێ مەعناوو ڕووح ئەو دەم دەکەی (٣٥٢٠)
تۆ بڕۆ لای ئەو کەسان هەمخوویی تۆن      عاشقی گوفتاری تۆن، نەک ڕوویی، تۆن (٣٥٢١)
دۆستووان لازم بوو بکرێ پاسییان      پاسەوانیان نا هەوێ قەت ماسییان (٣٥٢٢)
پارچەپۆش رووی کردەگازور،بۆ شووار      ڕووحی عوریان زینەتی وی، کردگار (٣٥٢٣)
یا لەعوریانان بەدووربەئەی فلان      یا لیباسی تەن فرێدەوەک ئەوان (٣٥٢٤)
گەر کوناتوانی بەکول، ڕوو ت بێ ئەتۆ      کەم بپۆشە، ڕێی وەسەت، بگرەو بڕۆ (٣٥٢٥)

### عوزر کوتنی فەقیر لای شێخ...

جا فەقیر، حاڵی، لەبۆ شێخ وا، دەکوت      نوقتەزەعف و عوزری خۆی، لێکرا دەکوت (٣٥٢٦)
بۆ سوئالی یەک یەکەی، شێخ دا جەواب      چەشنی جوابانی خزر، باش و سەواب (٣٥٢٧)

---

[1] زۆ ربڵێ یە، لەحزەیەک نادا نەفەس      خواردنیشی زیاترەتا بیست کەس

چون دڵی دەروێش ئێشی کەو تە،تێ — خستیبانەدەر سەری خۆ، جێ بەجێ

ماسیان لەو بەحری قووڵدا، سەت هەزار — بووبەزاریان گەوهەرێکی شاهوار

سەت هەزاران ماسی لەو دەریای عەمیق — بووبەزاریان هەریەکێک دوڕڕی عەتیق[1]

ماڵیاتی کیشوەرێک بوو یەک لەوان — کەس لەوان نەی بوو بەغەیری خوای جیهان

خستیەکەشتی قیسمەتێک دوڕ،دوایەخۆی — چۆحەوا دانیشت لەسەرکورسی دەڕۆی

زۆر،بەڕاحەت ڕۆی لەسەر ئەو تەختەبووی — کەوتەپێش، ئەو،کەشتی پێشووش،بوو لەدووی

پێیکوتن، بۆ وە، گەمی، بۆ میش خودا — تا دەگەڵ ئێوەنەبێت یەک دز،گەدا

لەو فیراقەکێهەمان بۆ ن دێ زیان؟ — خوا دەگەڵ من جووتە، خەڵکیش لێم جییان

توهمەتی سێبرقەت لەمن نادا،چ کات — ئیختیارم کوا وەدەس نا کەس دەدات؟

ئەهلی کەشتی بانگیان کرد ئەی عەزیز — چۆ ن بەتۆ یان دا مەقامی وا تەمیز؟

پێیکوتن چون دامەبەر توهمەت فەقیر — هەم خودام ڕەنجاند لەبۆ یەک شت حەقیر

حاش للە، بەل لەتەعزیمی شەهان — من نەبووم قەت بۆ فەقیران بەدگومان

ئەو فەقیرانەی لەتیف وخۆش نەفەس — هات لەبۆ تەعزیمی وان،سوورەی عەبەس

ئەو نەداری و فەقری وی، بۆ ژین نییە — بەڵکەبۆ غەیری خودایی دین نییە

موتتەهەم ناکەم ئەوان قەت،چونکەحەق — پێی سپاردن مەخزەنی حەوتەم تەبەق

موتتەهەم نەفسە، نەوەک عەقڵی شەریف — موتتەهەم حیسسە،نەوەک نووری لەتیف

نەفسی سۆ فەستائی، لێیدە،ئەی خەلیل — چونکەلێدان ڕاس دەکا ئەو، نەک دەلیل

موعجیزەی گەردیت دەبێ شاد ئەو دەمە — جا، لەپاشان پێی خەیاڵە، پێی کەمە[2]

نەفس بێژیت، گەر کووڕاس بان بێ دڕەو — خۆ دەبا چاو دیتبانی ڕۆ ژو، شەو

خۆ ئەوان لای چاوی پاکان بوون عەیان — چاوی حەیوان کوا دەبینێتن ئەوان؟

موعجیزات لەوحیسسە،بوویان عار و نەنگ — چۆ ن دەبێ تاووس لەچاڵێک تاروتەنگ؟

پێم نەڵەی تا زۆر بڵێی،تۆ ئەی ڕەفیق[3] — من لەسەت،هەریەکدەڵەم وەک موو، دەقیق

---

[1]- بوون لەنێو ئەو بەحرەماسی سەت هەزار — دا نەدانە گەوهەرێکیان بوو، لەزار

[2]- جا لەپاشان پێی خەیاڵەو ، پێی گەمە(مصرع دوم)

[3]- زۆر بڵێم تا پێ نەڵێی ، تۆ ئەی ڕەفیق (مصرع اول)

**سەرزەنیش کردنی سۆفیان ئەو سۆفیەی کە لە لای شێخ زۆری دەکوت...**

ـــــــۆفییەکیان تەعنەلێــــدا ســــۆفیان    چوون لەبۆ لای شێخی مەحبووب وەک گیان (٣٥٠٦)

ۆ بەشێخیان کوت ئەتۆ ئەی رابەرن    بێژەتـــا ئــەو ســـۆفییەن، لا، لا بــەرن (٣٥٠٧)

ێیکوتن ئەی سۆ فیان،جورمی چییە؟    جواب درا، سێ جورمی هەن، ئەو سۆ فییە (٣٥٠٨)

ۆ ربڵێ یە، دەنگی دێ، هەر وەک جەرەس    خواردنیشی زۆر ترە، تا بیست کەس[1] (٣٥٠٩)

هەر وەکوو ئەسحابی کەهفە، ئەو لەخەو    گشتی کوتیان وایەئەی شێخ، بێ درەو (٣٥١٠)

شێخ کوتی جا، بەو فەقیری دڵ بەئێش    تـۆ وەسـەت بگرەلەهەرشـت هاتەپێش (٣٥١١)

جاکترین کار، بوو، وەسەت،وای کوت نەبی    تۆ کە ئەخلاتت، تەراز بن، چادەبی (٣٥١٢)

گەرنەبن ئەخلات دەگەڵ یێک، هەمتەراز    تەن دەبێ بیمار و، نای بێتن، چ واز (٣٥١٣)

مەدحی دۆستت تۆ لەحەد زیاد، با نەکەی    تا جودائی، تۆ دەگەڵ وی، جا، نەکەی (٣٥١٤)

ـوتقی مووسا بوو بەئەندازە، بەڵام    زیاد لەگفتی یاری خۆی کوت، ئەو کەلام (٣٥١٥)

زۆر کوتن گەڵ خزر، بۆ مایەی شیقاق    پێیدەکوت،تۆ زۆر بلێیی،(هـذا فـرا ق) (٣٥١٦)

مووسیا، چون زۆربلێیی، تۆ لام هەڵێ    ئەی دەنا، لام کوێرو لاڵ بە، هیچ مەڵێ (٣٥١٧)

گەرکو نارۆی و دەمێنی تۆ لەلام    تۆ، لەمەعنا، نی لەلام، من لێت جودام (٣٥١٨)

گەردەنوێژ دا لێت شکا، دەس نوێژ، زوو    تۆ برۆ تا بگری، سەر لەنوێی، وزوو (٣٥١٩)

گەر نەچووی و،خۆت خوارو خەم دەکەی    نوێژی بێ مەعناوو رووح ئەو دەم دەکەی (٣٥٢٠)

تۆ برۆ لای ئەو کەسان هەمخوویی تۆن    عاشقی گوفتاری تۆن، نەک روویی، تۆن (٣٥٢١)

ـستووان لازم بوو بکرێ پاسییان    پاسەوانیان نا هەوێ قەت ماسییان (٣٥٢٢)

ـرچەپۆش رووی کردەگازور،بۆ شووار    رووحی عوریان زینەتی وی، کردگار (٣٥٢٣)

یا لەعوریانان بەدووربەئەی فلان    یا لیباسی تەن فڕێدەوەک ئەوان (٣٥٢٤)

گەر کوناتوانی بەکول، روو ت بی ئەتۆ    کەم بپۆشە، رێی وەسەت، بگرەو برۆ (٣٥٢٥)

**عوزر کوتنی فەقیر لای شێخ...**

جا فەقیر، حاڵی، لەبۆ شێخ وا، دەکوت    نوقتەزەعف و عوزری خۆی، لێکرا دەکوت (٣٥٢٦)

بۆ سوئالی یەک یەکەی، شێخ دا جەواب    چەشنی جوابانی خزر، باش و سەواب (٣٥٢٧)

---

[1] زۆ ربلێ یە، لەحزەیەک نادا نەفەس    خواردنیشی زیاترەتا بیست کەس

ئـــەو جەوابانـــەی ســـوئالاتی کـــەلیم — خـزر دای بـەو، پێـی نیشـاندا خـوای عـەلیم
دای بەمووسـا پاشـی حـەللی موشـکیلات — یەک کلیل تـا موشـکیلات،بەو حـەل بکات
ئیرسـی خـزری بـرد، دەروێش،وای جـەواب — دا بەشـێخ ئـەو،وەک جەوابی،کوڕ،بـەباب
دەیکوت ئەی شێخ زۆرەئەو سات،سوودیان — خـۆ بـەڵام ئـەو سـات گـەلێک،لێکتر جیـان
ئـا وی جـۆ نیسبەت،بەوشـتر زۆر کەمـە — خۆ بەڵام بۆ مشکی چووک، هەر وەک یەمە
ئیشـتیهای بـێ هەرکەسێک بـۆ چـوار نـان — ئـەو سـەتی وی دیارەسـێ یـە، یـا دووان
دوور لەئەو سەت بوو کەبخوا، هەر چووار — بـۆ ئەسـیری حیـرس و ئـازی نـا لـەبار
یـەک نەفەرگەرئیشـتیهای بێ، بۆ، دە، نـان — حـەددی ئەوسـەت بووکەبخوا،ئـەو شەشـان
ئیشـتیهای پـەنجاه نـانم گـەر هـەبوو — تۆش شەش نان ، کوا موساوین ئێمە دوو؟
دووڕکاعــەت نــوێژ دەکــاتن،تۆ غــەمین — مـن بەپێنسـەت ڕکعـەتیش نـابم حـەزین
یـەک هـەتا کەعبـەی دەچێـتن پێخـواس — یەک هـەتا مەسجید دەچێتن، بێ حـەواس[1]
یـەک لەبۆمـەتلووبی خـۆی گیـانی دەدا — یـەک دەدا،گیـانی کەیـەک نـانی دەدا
حـەددی ئەوسـەت دیارەمەعلووم بوو وەها — هـەرچی هـەیبێ ئیبتیـداوو، ئینتیهـا
ئـەووەڵ و ئـاخیر دەبـێ مـەعلووم ببـێ — تـا کونێـوان یاوەسـەت مـەفهووم ببـێ
بـێ نیهایـەت چونکـەنیتی دوو تـەرەف — چۆنوەسەت مەعلووم دەبێلەو،وەک هەدەف؟
خـوا ئەوالـەی بێنیهایـەت کـرد یـاد — بێـژە( لـو کـان لەالبحرمـداد)
گەرکو حەو، دەریا مورەککەب بان، هەموو — خـۆ ئومێـد بـۆ ئینتیهـای وان قەت،نـەبوو
بـاغ و جەنگـەڵ گـەر هـەموو بینەقەڵـەم — لـەو وتـارە، قـەت کـەنابێتن، چ کـەم
ئـەو هـەمووحیبر و قەڵـەم فـانی دەبـن — باسـی ڕازی زاتـی حـەق نایـەت لـەبن
حاڵـەتی مـن وەک خـەوێ یـە؛ جـارو بـار — وا دەزانـێ، مـن دەخـەو دام، نـا بـەکار
چـاوی مـن نوسـتو،دڵم بێـدار بـێ پێـت — جیسـمی بێکارم،ئـەتۆ پـڕ کـار،بێ پێـت
دەیکوت ئەحمەد چاوی من دەچنەخەوێ — قـەلبی مـن ئـەمما خـەوی لێنـا کـەوێ
چـاوی تـۆ بێـدارو، دڵ چـۆ خـەو، بـەناز — چـاوی مـن نوسـتو، دڵـم بینیـا بـەڕاز
قـەلبی مـن پێـنج حیسسـی دیشـی،بێدرا — حیسسـی دڵ، دی هەردووعالـەم ئاشـکرا
تـۆ بـەزەعفت لـێم مەنۆڕەئـەی زەبـوون — چـون شـەوی تـۆ ڕۆژەبـۆمن ڕۆژی ڕوون

---

[1] - یەک هەتا کەعبەی دەچێتن ، پێ ، پەتی — یەک هەتا مەسجید دەچێ ، دێ زەحمەتی
یەک هەتا مەسجید دەچێتن، بێ کەووش — یەک لەماڵ دەڕوا ، بەزەحمەت تا حەووش

حەبس و بەندی تۆ لەبۆ من گوڵشەنە ‏ ‏ ڕاحەتم بەو دەردەسەریانەی، هەنە[1] (٣٥٥٣)

یت دەقوڕ دا، قوڕ لەبۆ من، وەردی سوور ‏ ‏ ماتەمت بۆمن،بەچەشنی جەشن وسوور[2] (٣٥٥٤)

ن لەعەردی دا،دەگەڵ تۆم هاو مەحەل ‏ ‏ غاردەدەم سەرچەرخی گەردوون وەک زوحەل (٣٥٥٥)

هاونشینت من کەنیم سایەی منە ‏ ‏ گشتی ئەندیشەلەژێر پایەی منە (٣٥٥٦)

ن لەئەندیشان تێپەڕ بووم دەڕۆم ‏ ‏ خاریجی ئەندیشە، سەیرانگایە، بۆم (٣٥٥٧)

حاکمی ئەندیشەمە، مەحکووم کە( نا) ‏ ‏ چونکەبەننا حاکمەبۆ سەر بەنا (٣٥٥٨)

گشتی عالەم، ڕامی، دەس ئەندیشەنە ‏ ‏ بۆیەئەفسووردەدڵ و، غەم پیشەنە (٣٥٥٩)

ن بەعەمدەن دەچمەژێرفەرمانی بیر ‏ ‏ بمهەوێ گەر، دێمەدەر، نابم ئەسیر (٣٥٦٠)

ن وەکووتەیری حەوام،ئەندێشە، مێش ‏ ‏ کوا لەبۆ من،مێش دەبێتە دەست کێش؟ (٣٥٦١)

ن بەعەمدەن لەو حەوایەدێمە بەن ‏ ‏ تا زەعیف و بێنەوا، لێم کۆ وەبن (٣٥٦٢)

ەر مەلوول بم من لەبەر پەستی سیفات ‏ ‏ دەچمەسەر، من وەک،(طیور الصافیات) (٣٥٦٣)

هەرلەخۆمن، باڵەکانم بوون لەپێش ‏ ‏ باڵ لەخۆم نادەم بەچەسپان و چرێش (٣٥٦٤)

جەعفەری تەییار باڵی بوو لەخۆ ‏ ‏ جەعفەری عەییار، باڵی بوو درۆ (٣٥٦٥)

ەو قسەلای (لم یذ ق )، هەر دەعوییە ‏ ‏ لای ئەوەی جێی بوو،(اوفوق ) پڕ مەعنییە (٣٥٦٦)

کیزبەلای زاغ، تۆش قسەی وای لا مەکە ‏ ‏ جامی خاڵی و پڕ لەلای مێش هەریەکە (٣٥٦٧)

ەر بەزێڕ تەبدیل ببێ خۆ راکی تۆ ‏ ‏ بێ قسوور، تۆ چەندی دەتوانی بخۆ (٣٥٦٨)

ێخ ڕۆژێک تا، وەلابا، سوئی زەن ‏ ‏ نێو لەگەن قەی کرد، پڕدوڕ، بوو لەگەن (٣٥٦٩)

گەو هەری مەعقوولی ئەو مەحسووس دەکرد ‏ ‏ سووئی زەننی بەد گومانی لا دەبرد (٣٥٧٠)

گەرتۆ مەعدەت پیس دەکا پاکی نەبیل ‏ ‏ ئەو گەروویەت قفل دە، وُن کەکلیل (٣٥٧١)

گەرکوخواردن،لەو ببێ نووری خووا ‏ ‏ بۆ ی حەلاڵەهەرچی توانی، بێ خووا (٣٥٧٢)

**بەیانی ئیددیعایەکی کە عەینی ئەو ئیددیعایە دەلیل و عیللەتە بۆ سادق بوونی ئەو شەخسە..**

گەر دەناسی ئێستە تۆ چاک گیانی من ‏ ‏ بێ خیلافەچی بڵێت ئەزمانی من (٣٥٧٣)

گەر بڵەم، من نیوەشەو لات حازرم ‏ ‏ شەو مەترسە، خزمی تۆ م، بەل چاترم (٣٥٧٤)

[1]- حەبس وزیندانت گوڵ گوڵزاری من ‏ ‏ ڕاحەتم بەو دەردەسەریانەی هەمن

[2]- ماتەمت بۆ من وەکوو شادی و سروور (مصرع دوم)

ڕاسـتەقەولم گـەرچی هەردووکیان،لـەلات    ئیـددیعان، چـون دێـت دەنگـی ئاشـنات
خـزم و لا بـوون، هـەردوو ئیـددیعان بـەڵام    واقعـین، هــەردوو لــەلای فـەهمی تـەمام
دەنگـــی نیـــزیکیش شـــەهادەت وا دەدا    دێ لــەیارێکی گــەلێک نیزیــک ســەدا
دەنگی خزم و کەس کەدێ خۆش و لەزیز    بـۆ گـەواهی سـیدقی ئـەو خزمـی عـەزیز
شەخسی ئەحمەق کوا دەزانێتن بەجەهل؟    لێـک جوداکـا،دەنگی بێگانـەی، لەئـەهل
ئیددیعایـــــەلای نـــــەفام،گفتاری وی    جـــەهلی وی بوومایـــەیی ئینکـــاری وی
شەخسی زیرەک چون دەروونی پڕ لەنوور    ڕاســتەئەو ئـاوازەلای وی، بــێ قســوور
گەربیژێ یـەک عـەرەب مـن بێ تەعەب    چـاک دەزانـم لەهجـەیی قـەومی عـەرەب
ئیددیعایەگــەر دەڵــێ مــن شــارەزام    بـــەو زبانـــە، ڕاســـتەگفتی وی بـــەڵام
گـەر بنووسـێ، یـەک بەخـەتێکی جـوان    خوێنــدن و نووســین دەزانــم هــەردووان
گــەرچی ئــەو نووســینەئیددیعایە، لــەو    ئەسـڵی نووسـین شـاهیدی مەعنایـە، لـەو[1]
یـا بڵـێ پێـت، سـۆفی یێکـی بـێ نیشـان    دوێ شەوێت دی،تۆ لەخـەو بـەرماڵ بەشان
ئـەو هە، مـن بـووم و، لەبۆ تـۆم کرد بـەیان    هەرلەخـەو دا تـا، لـەتۆ ش بێـتن عـەیان
ئـەو قسـانەم گـوێ دەیـە، بـەگوێی دڵ    لـەو قسـانەتۆ، نەکـەی هـیچ کـات سـڵ
بێتـەبیرت ئـەو قسـانەو، ئـەو خـەوون    لات دەبێتـــەموعجیزەو زێـــڕی کـــەوون
گـــەرچی ئیددیعایەئـــەو گفتـــەم بـــەڵام    ڕاستەلای سـاحەب خـەوون، گشـتی تـەمام
چونکەحیکمـەت ون، لەشەخسـی موئمینـە    ئەولەهەرکـەس بیسـتی زۆر، پێـی مووقینـە
گەرلەلای ئەوسۆفی یـەی خـەو،خۆی دەدی    چـۆن دەکـا شـەکک وگومـان،وەک ئیـدە دی؟
گـەر، بـەتینوو، یـەک بڵـێ زۆر زوو کـەتۆ    زەرف، تێیــدا، ئــا و، بیگــرە، ئــاو، وەخــۆ
کـــوا دەڵـــێ ئـــەو ئیددیعایەوانییـــە؟    سـوێن دەخـۆم ئـاوت دەزەرفـی دا نییـە
یــا لــەبۆم بێنــەدەلیلێک ئــەی ئــەمین    ئاوە،تێیــدا، نەوعەکــەش مــائی مــەعین
گـەر بەمنـداڵ بێـژی دایکێـک،کۆ ڕیەکـەم    بێــرەلام تــا تــۆ لەشــیرم تێــر بکــەم
کـوا بـەدایکی خـۆی دەڵـێ منـداڵی زار؟    کـوا دەلیـل تـا شـیر بخـۆم بمبـێ قـەرار
گەر دڵی هەرکـەس لەحـەق هـەیبێ مـەزە    ڕوو و، دەنگـــی ئـــەنبیبا بـــۆی، مـــوعجیزە
هـــەرچی پێغەبـــەرکـــوتی ئـــەوئا شـــکرا    پـەیڕەوی ئوممـەت، لـەوی زۆ ر بـاش کـرا
چـون وەکـوو گفتـی پەیامبـەر هـیچ زەمـان    قەت لەهیچکەس نەی دەبیست ئەوگوێ‌گیان

[1] - ئەسڵی نووسین، یەعنی ڕاستەبێ درەو (مصرع دوم)

ئەوکەسەی کەبوو لەزەو قی دەنگ غەریب وای کلامی حەق دەبیست (انی قریب ) (٣٦٠١)

**سەجدە کردنی یەحیا(ع) دە زگی دایکیدا بۆ دایکی حەزرەتی مەسیح..**

**خولاسەی داستان...**

کاتێک کەدایکی حەزرەتی یەحیا، بە یەحیا حاملەبوو دەگەڵ حەزرەتی مەریەم(ع) کەبەحەزرەتی مەسیح حاملەبوو، قسەی دەکرد پێیدەکوت ئەی مەریەم، دەرەحیمی تۆ دا کەسێک دەبینم کەحەتمەن دەبێتەیەکێک لەپێغەمبەرانی گەو رە،چونکەکاتێک کەلەڕوو بەڕووی تۆ دا دەنیشم جەنینی من بۆ جەنینی تۆ سەجدەدەبا..

دایکی یەحیا وای بەمەریەم کوت بەسوڕ پێش لەوەزعی حەملەکەی خۆی چەشنی دوڕ (٣٦٠٢)
حەملەکەی تۆ لام یەقینەشایە ئەو هەم او لولعەزم و، گەلێک ئاگایەئەو (٣٦٠٣)
گەرکودێمەڕاستی تۆ ئەی مەریەمە حەملی من سەجدەی دەباتن ئەودەمە (٣٦٠٤)
ئەو جەنینەم بۆ جەنینت چۆ سجوود ئەو سجوودەش ئێشی دامەنێو وجوود (٣٦٠٥)
وایدەکوت مەریەم منیش ئاگادەکەم تیفلی میش سەجدەی دەبا،گەر وا دەکەم (٣٦٠٦)

**ئیراد گرتن لەو داستانە..**

هیچ نەزان ئەو باسە، لای ئەفسانەیە موعتەقید بەو، گەر هەبێ، دێوانەیە (٣٦٠٧)
چونکەمەریەم وەختی حەملی بوو تەنێ ئەو دەشاری دا نەما، چۆ بەندەنێ (٣٦٠٨)
ما لەخاریج شار ئەو شیرین نەفەس دوورلەشار ما، تاکومنداڵ هاتەدەس[1] (٣٦٠٩)
گەر منداڵ بوو جێ بەجێ پێچایەوە جا لەبۆ لای قەو م و کەس هینایەوە (٣٦١٠)
دایکی یەحیا کەنگێ دی مەریەم هەتا باس دەگەڵ یەک کەن وەها جوور ماجەڕا (٣٦١١)

**جەوابی ئیراد...**

هیچ نەزانان کوا دەزانن ئەهلی دڵ چاک دەبینێ ئاشکرا هەم زێری گڵ؟ (٣٦١٢)
ئاشکرا بۆ مەریەمەهەروەک هەتاو دایکی یەحیا، گەرچی دوورەئەو لەچاو (٣٦١٣)
دۆست دەبینێ ئەو بەبێ چاوی سەری دوو ردەبینێ،نەک فەقەت دەورو بەری (٣٦١٤)
با نەشی دی بێ بەزاهیر هەم دەروون بگرەلەو داستانەمەعنا، ئەی زەبوون (٣٦١٥)

---

[1]- ئەو لەخاریج شارماوەتاوەکوو ئەو دەمەی فاریغ لەمنداڵ بوون دەبوو

زاهیـــری داســـتان نـــەبێ لات موعتەبـــەر ... ئەســـڵ و مـــەعنا، تـــۆ بهێنەبـــەر نـــەزەر (٤١٦-
تـــا بڵێـــتن ئـــەو کەلیلـــەی بـــێ زەبـــان ... چـــۆن لەدیمنـــە، وا دەبیســـێتن بـــەیان؟ (٤١٧-
گـــەرکو بشـــیان بایـــە، بـــەحس و گفتوگـــۆ ... قـــەت بەشـــەر حـــاڵی نییەلـــەو دووانـــەخۆ (٤١٨-
چـــۆن لـــەنێوان شـــێرو گـــا،دا دیمنـــە،وا ... بـــوو بەقاسـید کـــردی مەتڵـــەب وا ئـــەدا؟ (٤١٩-
چۆن لـەبۆ شێر، بـوو وەزیـر ئـەوگای نـەبیل ... چـۆ ن دەترسازۆر لەعـەکسی مانـگ، فیـل (٤٢٠-
کـــێ کەلیلـــەو دیمەنـــە، بـــڕوا دەکـــا ... کوا دەگەڵ زاغ لەک لـەکێک، دەعوا دەکا؟ (٤٢١-
ئـــەی براکـــەم داســـتان پەیمانەیـــە ... نێـو ئـەویش مـــەعنی بەچەشـنی دانەیـە (٤٢٢-
شەخســـی عاقـــڵ دانـــەدەگرێتن تـــەنێ ... زەرف و پەیمانـەی لـەلای خـۆی لادەنـێ (٤٢٣-
گـوێ دەگفتـو گـۆی گـوڵ و بولبـول ئـەتۆ ... گـەرچی زاهیـر هـیچ نـەیان کـرد گفتـو گـۆ (٤٢٤-

## قسە کردن بە زبانی حاڵ و حاڵی بوون لەوی...

ماجـەرای پەروانەگـەڵ شـەم گـوێ دەبـە ... بگرەمەتڵـــەب چـــاک بزانەکێهەیـــە (٤٢٥-
گـەرچی گفتـو گـۆ نـەبوو ڕاز هاتەدەسـت ... بفرەبۆ سەر، نەک نەوی وەک کونـدی پەسـت (٤٢٦-
گەر کو خانووی ڕووح نیشان دەی تۆ بەکەس ... پێـت دەڵـێ ئـەو چـۆنی خـانو، هاتـەدەس (٤٢٧-
ڕووح بـــەمیرات گرتـــی خـــانو، یـــاکڕی ... خـۆش بـەحاڵی وەی لـەزاهیر، خـۆی، بـڕی (٤٢٨-
نەحوی دەیکوت زەیدوعەمرەن قەدزەرەب ... یەک دەڵێ جورمی چ بوو،دەکرێ ئەدەب؟ (٤٢٩-
جورمی عـەمری چـی بـوو تـا کوزەیدی خام ... بـێ گوناەلێیـدا لـەوی هـەر وەک غـولام؟ (٤٣٠-
جـــوابی دا، زەرفـــە لـــەبۆ مـــەعنا، ئـــەوە ... بگـــرە دانـــە زەرفەکـــەش تـــۆ، وێیـــدەوە (٤٣١-
زەید و عەمریش هەر لەبەر ئیعرابە، بەس ... لـــەو دروێـــە، چـــاک ئیعـــراب دێتـــەدەس (٤٣٢-
جـوابی دا (نـا ) بـۆ لـە عـەمری داوە،زەیـد؟ ... بـێ گونـاەو، بـێ خـەتا، بـێ شـەرت و قەیـد (٤٣٣-
نـەحوی دەیکـوت زۆر بـە ناچـاری و کـزی ... چونکـە عـەمریش واوەکـی زیـادی دزی (٤٣٤-
زەیـد، لێیـدا کـاتێ ئـەو بـوو، باخەبـەر ... چونکـە عـەمریش پێـی لـەحـەد هینایـە دەر (٤٣٥-

## قەلبی باتڵان قسەی باتڵان قەبووڵ دەکا...

ئـەو کوتی ئـەو هـەم قەبووڵـە ئـەی هـەواڵ ... خـوار بەڕاستی دێتـە بـەر چـاو کـەج خـەیاڵ (٤٣٦-
گـەر بـەخێلێک تـۆ بڵـەی مانـگ هـەر یەکـە ... پێت دەڵێ ئەو، دوون،لە یەک بوون‌دا شەکە (٤٣٧-
گەر بڵەی بەو، دوون، بەوی جا پێش کـەنی ... ڕاســتە لای وی، وا دەڵـێ شەخســی دەنــی (٤٣٨-
لای درۆزن، کـــۆ دەبـــن کیـــزب و درۆ ... ( ئەلخەبیســـات لیلخەبیســـین )، چـاو ئـەتۆ (٤٣٩-

بـازە دەسـیان خـۆ هـەموویان بـاز دڵان    هەڵخریسـکا کـوێر، لـەنێوان بـەردەڵان (٣٦٤٠)

**جستوجۆ بۆ ئەو دارە کە هەر کەس میوەی وی بخوا نامرێ..**

**خولاسەی داستان...**

کابرایەکی حەکیم و زانا بەزبانی ڕەمزو ئیستیعارەبەدۆ ستەکانی خۆ ی دەکوت لەهیندووستان دا،دارێک هەیەکەهەر کەس لەمیوەی وی بخوا، نەپیر دەبێ ونەدەمرێ ئەو مەتڵەبەبەگوێ پاشا گەیشـت، وزۆری پـێ خـۆش بـوو کەئـەودارەوەد ەس بێنـێ، جـا، لەبـەر ئەوەقاسـیدێکی بـۆ هیندووستان بەڕێ کرد،تا بەهەرجوور بێ ئەو دارەوەد ەس بێنێ قاسید زۆرساڵان لەمەملەکەتی هیندووستان گەڕاوجستو جۆی کرد،بەڵام ئەو دارەی پەیدا نەکرد، تا ئەو حەددەکەزۆرکەس مەسخەرەیان دەکرد وپێی پێدەکەنین عاقیبەت نەی توانی پەیدای بکا وبەنا ئومێدی و چاوی بەگریان ودڵی شکاو بۆ مەملەکەتی پاشا گەڕاوەلەیەکێک لەکاروانسەرا یەکانی سەر ڕێگا لا ی دا تا ئیستیڕا حەتێک بکا، لەناکاو دەگەڵ عارفێکی ڕەببانی ڕوو بەڕوو بوو، تەسمیمی گرت کەئەو مەو زووعەبەوی بڵێت تا چارەیەک بدۆ زیتەوە، ئەو عارفەڕەببانییەپاش بیستنی قسەکانی وی پێیکـوت ئـەی ساویلکەئەسـڵەن دارێکـی وا دەتەبیعـەت دا وجـوودی نییـە، یـەقین بزانەکەمەنزووری ئەو حەکیمەزانایەلەو دارەفەقەت داری عیلم و خودا ناسین بووە..

ـەک حـەکیم دەیکوت فەقـەت بـۆ داستان    جوورەدارێـــک وا لـــەنێو هیندووســـتان (٣٦٤١)

هـەرچی بخـوا میوەکـەی وی یـەک عـەدەد    پیـر کـە نـابێ، نـاش مـرێ ئـەو تـا ئەبـەد (٣٦٤٢)

ـسـتگۆ یـەک وای بەشـا،کوت ڕاسـتە ئـەو    دار و میـوەی، فکـری شـابوو ڕۆ ژو و شـەو (٣٦٤٣)

قـــیدێک زانـــای لـــەدیوان هـــەڵبژارد    ئـــەو لـــەبۆ داری، لەهیندووســـتان دەنـــارد (٣٦٤٤)

زۆر گـــەڕا هیندووســـتان دەو ڕو بـــەری    تـــا کـــو پەیـــداکات ئـــەو، دارو بـــەری (٣٦٤٥)

ـەربەشـار چـوو، ئـەو بـەدووی ئـەودارەدا    کێـوودۆڵ و چـۆڵ، نـەما، بـن پێـی نـەدا (٣٦٤٦)

هـەرچی لێـی پرسـی گـەلێک پێـی پێکـەنی    کـەس ئـەوەی نـاڵێ مەگـەر شـێتی دەنـی (٣٦٤٧)

یـــەک بەشـــۆخی زلـــەێکی لێـــدەدا    یەک بەڵام دەیکوت ئەتۆ، ئەی خۆ ش ئەدا (٣٦٤٨)

حـــستوجۆی هووشیاری وەک تـۆ سینەساف    چـۆ ن دەبـێ بێهوودەبێـت و، هـەم گـەزاف؟ (٣٦٤٩)

مـــــەدحی وا، ئێشـــــی لەزلـــــەزیاترە    زلـــەزۆر لـــەو مـــەدحی ئاشـــکار چـــاترە (٣٦٥٠)

یـــەک بەشـــۆخی پێیـــدەکوت عالیمـــەقام    خـــۆ فـــلان جـــێ لێـــی هەیـــەدارێک زەلام (٣٦٥١)

ـێـۆ فـلان جەنگـەڵ هەیـەدارێکی شـین    زۆربڵینـــدە، پـــڕ گەڵایـــەچین بـــەچین (٣٦٥٢)

٭

قاسیدی شا، بەستی بۆ مەتڵەب کەمەر — ئەو لە زۆر کەس هاتە گوێی ،جوور جوور،خەبەر (٣٦٥٣
جا لەهیندووستان گەڕا چەندین ساڵ — پادشاش بۆ وی دەنارد، زۆر پووڵ و ماڵ (٣٦٥٤
چونکەزۆری دی لەغوربەت دا تەعەب — عاقیبەت ماندوو دەبوو ئەو، لەو تەڵەب (٣٦٥٥
بۆی لەمەقسوود هیچ ئەسەر پەیدا نەبوو — هیچ قسەی ڕاس،بۆ خەبەرپەیدا نەبوو (٣٦٥٦
پارەپارەبوو لەوی هەو دای ئومێد — هیچ نەهات جارێک لەبۆ وی بای ئومێد (٣٦٥٧
ویستی ئەوتا ڕوو بەرەو شا، بێتەوە — ئەو بەگریان کەو تەڕێ، تا بێتەوە[1] (٣٦٥٨

## تەوزیح دانی شێخ ڕازی ئەو دارە بۆ تالیبی موقەللید..

قاسید وشێخێک کەبوو قوتبی زەمان — چون لەیەک کاروانسەرا،هەردوو، دەمان (٣٦٥٩
دەیکوت ئەو مەئیووس دەچم بۆ لایی وی — نائومێدیش دێمەوەخۆ لایی وی (٣٦٦٠
تا دوعای ویم بۆ، ببێ هەمڕا، ئەمن — نا ئومێدم چونکەلەو دڵخوا، ئەمن (٣٦٦١
چوو لەبۆ لای شێخ بەچاوی پڕ لەئاو — ئەشکی باراند، هەر وەکوو ڕێژنە، بەتاو[2] (٣٦٦٢
دەیکوت ئەی شێخ وەختی لوتف و ڕەحمەتە — نا ئومێدم، نا ئومێدیش زەحمەتە (٣٦٦٣
شێخ کوتی بەو بێژەبۆ مەئیووسی تۆ — چی بوو، ویستت، یا بەچی مەئنووسی تۆ (٣٦٦٤
جوابی داوەشا، منی کرد ئیختیار — تاکو پەیداکەم لەبۆی، یەک دانەدار (٣٦٦٥
دارەکی کەمیابە،نەیدی کەس، چ کات — میوەکەی ویش ڕاس وەکوئاوی حەیات (٣٦٦٦
من گەلێک ساڵان گەڕام، نەم دی نیشان — زۆر کرام، تەوهین لەلای گەردەن کەشان (٣٦٦٧
پێکەنی شێخ و، بەوی کوت ئەی سەلیم — ئەو هە، داری عیلمەلای زاناو عەلیم (٣٦٦٨
زۆر بڵێند ە، زۆرعەجیبە، زۆر بەسیت — ئاوی ژینەهات لەلای دەریای موحیت (٣٦٦٩
زاهیرت کوت بۆیەبووی گومڕا، ئەتۆ — بۆیەنەت دی، نەت هەویست مەعنا،ئەتۆ (٣٦٧٠
جار دەڵێن، بەو دارو جارجارەش هەتاو — جاروبار دەریاوو جارجار، هەو ری ناو (٣٦٧١
ئەو یەکەئەمما، ئەسەر لەو، سەت هەزار — کەمترین ئاسار عومری پایەدار (٣٦٧٢
گەرچی فەردە، لەو ئەسەر بوون، سەت هەزار — ئەو یەکە، نێوی گەلێکن،بێ ژمار (٣٦٧٣
چاو لەوەی کە، بابەبۆ تۆیەک نەفەر — بۆ یەکی دیکەش کوڕە، بابیش لەسەر (٣٦٧٤
بۆیەکێکی مایەیی قەهرو، عەدوو — بۆ یەکیکیش لوتف و خۆشی ئەو، دەبوو (٣٦٧٥

---

[1]- ئەو بەگریان ، ڕێی بڕی، تا بێتەوە (مصرع دوم)
[2]-چەشنی ڕێژنەی ئەو دەباراند، ئاوی چاو (مصرع دوم)

سـەت هـەزاران نێـوی وی لای ئـادەمی — عـالمی وەسـفێک، لەوەسـفی دی عـەمی (٣٦٧٦)

تـالبی نێـو، گـەرچی بـش بـێ موعتەبـەر — چەشنی تۆ مـەئیووس دەبێت و دەر بـەدەر (٣٦٧٧)

بـۆ دەچەسـپی وا بـەنێوی دار ئـەتـۆ — تـا ببـی بـەد بـەخت زۆ ر تـاڵ زار ئـەتۆ؟ (٣٦٧٨)

بـەردە، نێـو، تۆ،چـاک بنـۆڕە نێـو سـیفات — تـا سیفات ڕێگـات نیشـان دەن لایـی زات (٣٦٧٩)

ئیختیلافـی خـەڵکی هـەر نێـو، چـا دەکـا — بگـرە مـەعنا کـوانێ مـەعنا وا دەکـا؟ (٣٦٨٠)

**کێشەی چوار نەفەر بە خاتری، ترێ، کە لە لای هەریەک نێوێکی مەخسووسی هەبوو..**

**خولاسەی داستان...**

چوار نەفەر کەهەریـەک زبانێکی مەخسووسی هـەبوو هاتنەجێگایـەک، کابرایـەک درهـەمێکی پووڵ دا بەوان، تا بۆ خۆ یان شتێک بکرن، ئەوەی کەفارس بوو کوتی با بچین بەو پووڵەئەنگوور بکرین .. کابرای عەرەب کوتی ئەنگوور چییە؟ئەمن عینەب (ئەنگوور) م، دەوێ ..کابرای ڕۆمی کوتی ئەمن، نەئەگوور و نەعینەب، فەقەت ئیستاقیل (ئەنگوور) م دەوێ .. کابرای تورک کوتی ئەو قسانەمەکەن، ئەمن نەئەنگوور دەوێ ونەعینـەب ونەئیستاقیل،دەبێ بڕۆین،ئوزوم (ئـەنگوور) بکرین و بی خۆین، عاقیبەت یەک نەفەر زانا کەبەهەرچوار زبانان ئاشنا بوو ئـەوانی حاڵی کرد، کەئێوە هەمووتان یەک شتتان دەوێ بەڵام بەئەلفازی جۆی جۆی، عاقیبـەت کێشەو ئیختیلافی وان تەواو بوو.

دای بەچوارکـەس کابرایـەک درهـەمێک — یـەک کوتی دەکرم بـەوی ئەنگوورکـەمێک (٣٦٨١)

دووەمـی دەیکوت نـەخێر،چون بـوو عـەرەب — نامهـەوێ ئـەنگوور ئـەمن دەمـوێ عینـەب (٣٦٨٢)

سووەمی دەیکوت نـەخێر چون بـوو عەجـەم — من بەوەی دەکرم ئوزوم، دەیخۆین بەجـەم (٣٦٨٣)

چوارەمی روومـی کـوتی بـەس قـال و قیـل — غـەیری ئیسـتا قیـل، دەمکـاتن عـەلیل (٣٦٨٤)

بـوو لـەنێو وان جـەنگ و دعـوا هـەم جنێـو — بێ خەبـەر بوون چون لـەڕاز و ڕەمزی نێو (٣٦٨٥)

وەر گەڕانەیـەک، وەکـوو شـێتان بەمسـت — هەریـەکێک ئیدی بەمستی خۆی دەخست (٣٦٨٦)

ڕاز زانێکـی عـەزیزی سـەت زەبـان — گـەر لـەوێ بـا، بـێ گومـان ئاشـتی دەدان (٣٦٨٧)

وایـدەکوت ئێسـتا ئـەمن بـەو درهەمـەی — شاد دەکەم هـەموان،وەکوو مەستان بەمـەی (٣٦٨٨)

پـێم کەبسـپێرن دڵـی خۆتـان چـەڵێ — چـا دەکـا ئـەو درهەمـەکارا ن گـەلێ (٣٦٨٩)

تاقەیـەک درهـەمتا ن دەکا چارەی مـراد — جـا دەیـان بـێ چـوار دوژمـن ئیتتیحـاد (٣٦٩٠)

گفتـی ئێوەچادەکـا جـەنگ و فیـڕاق — گفتـی مـن بـۆ ئێـوە، مایـەی ئیتتیفـاق (٣٦٩١)

هیچ مەڵێن جا، بێ سەداو خامۆش بن ... تا زبانی گفتو گۆتان بم ئەمن (۹۹۲
گەربەزاهیر گفتی ئێوەئاشتییە ... خۆ لەباتین غەیری شەڕ تێیدا نییە[1] (۹۹۳
گەرنەبێ گەرما، ئەسیل، نای بێ ئەسەر ... گەر ئەسیل بێ ئەو دەمە، دەی بێ هونەر (۹۹۴
گەربەئاگر سرکەتۆ بێنی بەجۆش ... گەرکوبیخۆی سەردی، ئەو دێتێتەتۆش (۹۹۵
چونکەئەو گەرمایەبۆی مەسنووعییە ... ئەسڵی سەردە، سەردی وی مەتبووعییە (۹۹۶
گەرچی بەستی بۆ سەهۆڵ، دۆشاو تەواو ... خواردنی وی گەرمی دا دێنێ،هەناو (۹۹۷
زۆر لەچاکیمان ڕیای شێخ چاترە ... زۆر لەئێمەچونکەئەو زانا ترە (۹۹۸
گفتی شێخ شادی دەهێنێ بێ حدوود ... تەفرەقەی لێ چادەبێ گفتی حەسوود (۹۹۹
چون سولەیمان بۆ نەبی، لای زاتی خوا ... تێگەیشت ئەزمانی تەیرانی حەوا (۰۰۰
لەو زەمانی عەدڵی وی،ئاهوو، لەشێر ... ترس و لەرزی هیچ نەبوو، بیخوات، تێر (۰۰۱
ترس و لەرزی هیچ نەبوو کۆتر لەباز ... مەڕ لەگورگی نەی دەکرد هیچ ئیحتیڕاز (۰۰۲
ئەو لەنێوان دوژمنان ئاشتی دەدا ... موتتەحید بوون باڵداران یەک سەدا (۰۰۳
چەشنی مێرووی،چووی بەدووی دان، وا مەبە ... تۆ سولەیمان خواز ببەگومڕا مەبە (۰۰۴
دانەداوە، بۆ ئەوەی دانی دەوێ ... تۆ سولەیمان خواز بە، هەردووت دەس کەوێ (۰۰۵
تەیری گیانان ئێستەلەو ئاخیر زەمان ... هیچ نییانەلەحزەیەک لێکتر ئەمان (۰۰۶
جا سولەیمان حازرە، لەو عەسرەدا ... سولح و، ئاشتی ئەو لەنێو خەڵکی دەدا (۰۰۷
قەو لی (ان من امە) نەت چی لەبیر ... تاکو (الاوخلا فیها نذیر ) (۰۰۸
خوا کوتی خاڵی کەنابن ئوممەتان ... قەت لەچاکان ولەساحەب هیممەتان (۰۰۹
تەیری گیانان یەک دڵ و یەک گیان دەکەن ... لەو سەفای وان غەلل و غەش پنهان دەکەن (۰۱۰
هەر وەکو دایکان دەبن زۆر میهرەبان ... موئمنینی کوت یەکن ،شای دوو جیهان (۰۱۱
هەر بە لوتفی مستەفا، بوون موتتەحید ... خۆ دەگەڵ یەکتر دەنا زۆر بوون بەزید (۰۱۲

[1]- گەر بەزاهیر گفتی ئێوەئیتتیفاق ... خۆ دەباتین هەردەبوو مایەی فیڕاق

**لەبەین چوونی ئیختیلاف و کێشە لە نێوان ئەنسار بە خاتری بەرەکەتی حەزرەتی ڕەسوول(ص)..**

**خولاسەی داستان...**

دوو قەبیلەلەقەبایلی عەرەب کەئەسڵ و نەسەبیان یەک بوو لەمەدینەدا دەژیان، نێویان ئەوس و خەزرەج بوو،لەنێوان ئەو دووقەبیلەشەڕوکێشەیەکی زۆر هەڵایسابوو کەزۆرساڵان بەردەوام بوو، ولەشەڕو کێشەماندووببوون، بەو حاڵەش جوولەکەکانی بەنی نەزیروبەنی قورەیزە ئەزیەتیان دەکردن بەناچار پەنایان بۆسەرۆکەکانی قورەیش برد، بەڵام ئەوانیش زۆز شەرتی سەنگین وگرانیان دانان کەهیچ کامیان قبووڵیان نەکرد عاقیبەت دینی ئیسلامیان قەبووڵ کرد وەلەڕێی تەرویجی دینی موحەممەدی زۆرتەلاشیان کرد...

دوو قەبیلەی ئەوس و خەزرەج زۆرساڵ دووژمنی یەکتر دەبوون بەگیان و ماڵ (٣٧١٣)
ـەهروکینی وان بەخاتر مستەفا کردی نابوود، نووری ئیسلام و سەفا (٣٧١٤)
ئەوودڵەن ئەو دوژمنانە، بوون برا هەر وەکوو دەنکی ترێیان، لێکرا (٣٧١٥)
ـوو بەپەند ئەوگفتە، موئمین گشت، بران بوون بەیەک تەن گەر شکان و لێکدران (٣٧١٦)
ـەک برای یەکتر دەچن، دەنکی ترێ شیرەیەک پەیدادەبێ گەر لێکدرێ (٣٧١٧)
دوژمنن بۆ یەکتری قۆرەو ترێ قۆرە، یارە، گەر بگاو، شیرین کرێ (٣٧١٨)
ـرەیەک گەر، ماوەترش و سەخت وخام خوا ئەزەڵ،بۆوی دەکردکافر،بەنام (٣٧١٩)
ـۆ براو بۆ نەفسی واحید کوا دەبێ؟ لەو شەقاوەت، نەحسی مولحید چادەبێ (٣٧٢٠)
ـەربڵەم من ئەو شتەی هەیتی نیهان چا دەکەن ئەفکار فیتنەی بێ ئەمان (٣٧٢١)
ـزی کافر، والەچاکە،کەس نەڵێ دوودی دووزەخ، با لەلای، ئیرەم هەڵێ (٣٧٢٢)
ـەر کو قۆران، قابیل و ئا مادەبن ئەهلی دڵ چۆنی بویێن، وا دەبن[1] (٣٧٢٣)
ـکو دوویی و ئیختیلافیان لابرێ قۆ رەکان، توند چوون هەتا بینە، ترێ[2] (٣٧٢٤)
ـۆ ترێ بوون، پێستی خۆ دەد ڕن بەعام ئیتتیحاد چون، بوو بەوەسفی وان، تەمام (٣٧٢٥)
ـۆست دەبێ،دوژمن هەتاکو بن بەدوو خۆ، چکات، نابێ دەگەڵ خۆی،کەس عەدوو (٣٧٢٦)
ـفەرین لەو عیشقی کوللی ئووستاد سەت هەزاران،زەڕڕە، ئەو دای، ئیتتیحاد (٣٧٢٧)
جەشنی خۆڵی ڕێ،کەبوو پەخش و بڵاو گۆزەکەر دەیکا، بەیەک گۆزەی تەواو (٣٧٢٨)

---

١- وەحدەتی وان ویستی پیرە، وا دەبن (مصرع دوم)

٢- پێست دەر دێنن هەتا بینە، ترێ ئیختیلاف لاچێت و ، وەحدەت، چاکرێ

وەحـدەتی ئەجسامی چابووی، ئـاوو خـاک ناقیسـە، نـەک وەحـدەتی جانـانی پـاک (٢٩ -
گـەر نـەزیری وی بلـێم مـن بـۆ میسـاڵ زۆ ر دەترسـێم، بێـت لـەبۆ فـام ئیختـیلال (٣٠ -
خـۆ سـولەیمان لێرەمـەو جوودەبـەڵام شـاد، بـەدوور بینین،کـەکوێر بووینـە، تـەمام (٣١ -
دووربینـی، کـوێر دەکـا دڵ ئـەی هـەواڵ هەروەکوو،نوسـتو لـەماڵ دا، کـوێر لـەمـاڵ (٣٢ -
داخـوازین ئێمـە بـۆ گفتـی دەقیـق تا کو حـەل کـەین، موشکیلات، ئێمەی عەشیق (٣٣ -
تاکوموشـکیل چابکـەین،جا،وا دەکـەین موشـکیل و جوابـان دەگـەڵ یێک،چادەکـەین (٣٤ -
چەشـنی تـەیرێکی وەکـاتن بەنـدی داو جـار دەبەسـتێ، تـا ببـێ ئاگـا تـەواو (٣٥ -
ئـەو لەسـەحراو بـاغ ناکێشـێ نەفـەس بـۆ گـرێ، عـومری دەداتـن ئـەو لـەدەس (٣٦ -
خـۆ لـەبۆ وی قـەت زەبـوون نابێـت دام بـێ گومـان دەشـکێت بـاڵی وی مـودام (٣٧ -
کـەم خـەریک بـە،بۆ گـرێ، بـاڵ و پـەڕت تـا کونـە شـکێن لێـت، ئەلەو،کـەڕرو فـەڕت (٣٨ -
سـەت هـەزاران تـەیر،باڵیان دا لـە دەسـت ئەو شکافی شوبهەیان قەت هیچ نەبەست (٣٩ -
حـاڵی وان بگـرە لـەقورئان ئـەی حـەریص (نقبـوا ) بخوێنـەتا(هـل مـن‌محـیص) (٤٠ -
هیچ لەکیشەی تورک و ڕۆمی هەم عەرەب حـەل نـەبوو ئیشـکالی ئـەنگوور و عینـەب (٤١ -
تـا سـولەیمانی سـوخەنوەر، نێتـەلان لان دەبـێ، دوویـی و، نـافرێ بـۆ تـەلان[1] (٤٢ -
ئێوەئـەی تـەیرانی دەعـوا چەشـنی بـاز گـوێ بکـەن بـۆ تـەپڵی بـازی شـاه، واز (٤٣ -
ئیختـیلاف و کێشـەلابەن خـۆش و شـاد دەسـتەجەمعی ڕێ کـەون، بـۆ ئیتتیحـاد (٤٤ -
ڕوو دەوەحـدەت کـەن لەهـەرجێگا کـەبوون وای دەوێ حـەق، ئێوەبـۆ لای وی بچـوون (٤٥ -
ئێمـە تـەیری کـوێر و نابینـا و خـام ئـەو سـولەیمانەن نەناسـی قـەت تـەمام (٤٦ -
چەشـنی کونـدان دوژمنـانی بـاز، بـووین بـۆ کـەلاوەو، چۆلگـە، زۆر داخـواز، بـووین (٤٧ -
چونکەئێمـەزۆر نـەفامین بـۆ یـەواین دوژمنـی خۆشـی عـەزیزانی خـوداین (٤٨ -
ئـەو پەڕەندانـەی سـولەیمان نـووری دان بێ گوناهـان کـوا دەکـەن، بێ بـاڵ ئـەوان؟ (٤٩ -
دان دەدەن بەو تەیری عاجز، جێی پەرۆش بێ خـیلاف و کێنـە، عـارف شـاد و خـۆش (٥٠ -
هود هود ی وان بەس لەبەر تەقدیس بوو ڕێ نیشـاندەر، ئـەو بەسـەت بلقـیس بـوو (٥١ -
زاغـی وان گـەرچی بەسـوورەت زاغ بـوو هیممـەتی بـازی هـەبوو (مـازاغ ) بـوو (٥٢ -
لەک لەکی وان،گەرچی لەک لەک، سەردەدا ئـاگری وەحـدەت دەگشـت شـەک بـەردەدا (٥٣ -
کۆترەکـەی وان هـیچ کەناترسـێ لـەباز کـۆتری وان بـازی دەبێتـەپردەباز (٥٤ -

---

[1] - ئیختلاف هەر لان دەبێ ناچتەتەلان (مصرع دوم)

بولبولی وان حاڵەتی خۆش چادەکا        ئەو دەخۆیدا، گوڵشەنێک پەیدا دەکا (٣٧٥٥)
تووتیەکەی وان نایهەوێ قەن، تا ئەبەد        گیانی وی قەن، چا دەکا، زیاتر لەحەد (٣٧٥٦)
لاقی تاووسیان گەلێک جوانتر، بەچاو        لەو پەڕی تاووسی جوانی دی، بەناو (٣٧٥٧)
مەنتیق وتتەیرانی خاقانی سەدا        مەنتیق و تتەیری سولەیمانی جودا (٣٧٥٨)
کوا دەزانی دەنگی تەیران، تۆ کەمێ؟        چونکەنەت دیوەسولەیمان، تۆ دەمێ (٣٧٥٩)
باڵی ئەو تەیرەی کەدەنگی موتریبە        تێپەڕی لەو مەشریقەو لەو مەغریبە (٣٧٦٠)
دێت دەنگی وی لەئاسمان تا زەوی        ئاسمان و عەردی داگرت، دەنگی وی (٣٧٦١)
تەیرەکی کەبێ سولەیمان ڕێ دەچێ        گەر کو خوففاش بەو بڵەم من، وێ دەچێ (٣٧٦٢)
تۆ سولەیمان بگرەئەی خوففاشی بەد        تا دەزوڵمەت دا نەمێنی، تا ئەبەد (٣٧٦٣)

**داستانی فەرخەمراویان کەپەروەردەی مریشک بوون...**

**خولاسەی داستان...**

ئەسڵی تۆ مراوییە، نە، مریشک، هەرچەند مریشک تۆ پەروەردە بکا.

گەرگەزێک بۆ لای خوداچووی، ئەی ڕەفیق        تۆ دەبی وەک گەز بەمیقیاسی تەریق (٣٧٦٤)
گەرلەبۆ لای وی بچی تۆ لەنگ وشەل        تازەنالەنگی لەوەی پاش، تۆ، چ چەل (٣٧٦٥)
ئەسڵی تۆ هێلکەی مراوی بوو، مریشک        کردی پەروەردەلەسەر خاکێکی ئیشک (٣٧٦٦)
خۆ مراوی دایکی تۆبوو، لەو یەمە        دایەنت ئیشکێک پەرەستە، بێ نەمە (٣٧٦٧)
خەسڵەتی دایکت دەتۆ دا هەرهەیە        بۆیەمەیلت وا بەدەریا هەر هەیە (٣٧٦٨)
مەیلی ئیشکی تۆ، فەقەت ئی دایەنە        لابە، دایەن، دایەنان، بێ مایەنە (٣٧٦٩)
بێڵە، دایەن تۆ لەئیشکی سەرزەوی[1]        وەک مراوی، بێرەبەحری مەعنەوی (٣٧٧٠)
گەر ئەتۆی ترساند چەلێک دایکت لەئاو        هیچ مەترسێ، تۆ بڕۆ دەریا، بەتاو (٣٧٧١)
تۆی مراوی خۆ لەوشک وتەڕدەژی        نەک مریشکی جێ گەنێو،ڕەش،وەک ڕەژی (٣٧٧٢)
تۆ لە (کرمنا بنی ادم ) کەشای        جێی لەبەحرو بەڕ خوداوەند، پێدەدای (٣٧٧٣)
گیانی وانم من لەسەر یەم، دا دەنا        باشەئەوکەس خۆ ی لەخاکی لادەنا (٣٧٧٤)

---

[1]- دانی دایەن، تۆ لەئیشکی سەرزەوی (مصرع اول)

بـــۆ مـــەلاییک ڕێ لـــەبۆ، وشـــکی نییـــە    جینسـی حـەیوان هـیچ لەیـەم، پشـکی نییـە ٠٧٥)
تۆ، بەتەن حەیوان، بـەگیانیش،بووی مەلـەک    تاکوجێگـــــات،بێ لەســـــەرعەردو،فەلەک ٠٧٦)
ئـەو دڵـەی کـردی بـەوەحیی خـوا، نـەزەر    ئـەو بـەزاهیر میسـلی ئێـوە، بـوو بەشـەر ٠٧٧)
جیســـمی خـــاکی وی کەکەوتەســـەرزەوی    خۆ،لەسـەر ئـەفلاک دەسووڕێ، ڕووحـی وی ٠٧٨)
گشـــتمان ئێمـــەمراوین ئـــەی غـــولام[1]    چـاک زبانمـان یـەم دەزا نێـتن تـەمام ٠٧٩)
جاسولەیمان بـەحرە، ئێمـەش جەشنی تـەیر    تـا ئەبـەد نێـو ئـەو سولەیما نـەین لەسـەیر ٠٨٠)
بـێ سـولەیمان،چوون، لـەبۆ یـەم نـاکرێ    چەشـنی داوود چادەکـا ئـاو، سـەت زرێ ٠٨١)
ئـــەو ســـولەیمان لای هـــەموومان حـــازرە    غیـــرەت ئـــەمما چـــاو بەســـتە ســـاحرە ٠٨٢)
چـــون نـــەفامین وخـــەواڵو، هـــەم فـــزوول    ئـەو لـەلامان، ئێمەئـەمما، لـەو، مـەلوول ٠٨٣)
دەردەسـەر بـۆ تینـو دێنـێ دەنگـی ڕەعـد    چونکـەنازانێ کـەدێنێ هـەوری سـەعد ٠٨٤)
چـاکی نـۆڕی ئـەو لـەئاوی جـۆی ڕەوان    نـەی دەزانـی تـامی ئـاوی ئاسـمان ٠٨٥)
چون لـەلای وی بـەس سەبەب هـەیبوو ڕەواج    نەیـدەکرد فکـری موسـەببیب نـاعیلاج[3] ٠٨٦)
ئـەو کەسـەی دیتـی موسـەببیب زۆ رعـەیان    نایهـەوێ قـەت هـیچ لەئەسـبابی جیهـان[4] ٠٨٧)

**موتەحەییر مانی حاجیان لە کەراماتی ئەو زاهیدە کە بە تەنهایان لە سەحرا دیت..**

زاهیـــدێک بـــوو ئـــەو لـــەنێوان بادیـــە    غـــەرقی تاعـــەت بـــوو وەکـــوو عەببادیـــە ٠٨٨)
کـاتێ حـاجی گەینەئـەو سـەحرایی دەرد    دیتیـــان یـــەک زاهیـــدی لاوازی زەرد ٠٨٩)
وشـک بووجێی زاهیـد، ئـەو بـوو تـەڕ میزاج    ئـــەو لەگـــەرمای بادیەهـــەیبوو عـــیلاج ٠٩٠)
حاجیـــان لـــەو وەحدەتـــەمابوون عەجـــەب    لـەو سـەلا مەتیـەی لـەنێو دەردو تەعـەب ٠٩١)
نوێژی خۆی کرد ئەو لەسـەر بەرماڵی خیز    دەیکوڵانـد گـەرمایی خیـز، ئـاو، بـا، لـەدیز ٠٩٢)
وات دەزانـــی ئەولـــەنێو ســـەبزەو گوڵـــە    یانەئەســـــپی وی بڕاقـــــەو دوڵدوڵـــــە ٠٩٣)
یـــا لـــەژێر پێـــی وی حـــەریر و پەرنـــەیان    یـــا ســـەمووم،بۆ، وی نەســـیمی بەربـــەیان ٠٩٤)

---

[1]- ئێمەگشتن خۆ مراوین ئەی غولام (مصرع اول)

[3]- چون لەلای وی غەیری ئەسباب، بوو عەدەم    نەیدەکرد فکری موسەببیب ، لاجەرەم

[4]- وەر دەگێرێ ڕوو لەئەسبابی جیهان (مصرع دوم)

[illegible]دوەستان مونتەزیر، ئەو بوو لەنوێژ    ئەو بەوێستان،کرد ی فیکری زۆر درێژ (٣٧٩٥)
[illegible]ەئیستیغراق گەڕاوەئەو فەقیر    لەو گرووهەیەک نەفەر ڕووناک بیر (٣٧٩٦)
[illegible] کەدەتکێ ئا و لەدەستی هەم لەڕوو    بوو کراسی تەڕ لەئاساری وزوو (٣٧٩٧)
[illegible] لەوی پرسی، بەتۆ کێ، ئاو دەدا    دەستی برد،بۆ ئاسمان، یەعنی خودا (٣٧٩٨)
[illegible]کوت هەردەم کەویستت پێت دەگات؟    بێ تەناف وسەتڵ وچاڵی قووڵ لەلات (٣٧٩٩)
[illegible]نکلی مەش حەل کەئەی سوڵتانی دین    تا لەبۆ مان بێ لەحاڵی تۆ یەقین (٣٨٠٠)
[illegible] نیشاندە تۆ لە ئەسراڕ یەک عەدەد    جا دەبین موئمین بە تۆ تا کو ئەبەد (٣٨٠١)
[illegible] بەجێ ئەو ڕووی دەکردە ئاسمان    تۆ قەبووڵ کە ئەو دوعایەی حاجیان (٣٨٠٢)
[illegible] ەلای ئاسمان دەموێ، ڕزقی خۆم    دەرکی من وەکرا، لەئاسمانان لەبۆم (٣٨٠٣)
[illegible] تۆ چاکت کرد مەکان لەو لا مەکان    (فی السماء ڕزقکم ) کردت عەیان (٣٨٠٤)
[illegible]دەمەی دا، هات هەورێک زۆر بەبار    نارەتەی لێدا وەکوو فیلان، بەغار (٣٨٠٥)
[illegible]کوو گۆزەی سەرەو بن ئاو دەهات    غارو کەندالان نەیان بوو هیچ نەجات (٣٨٠٦)
[illegible] دەی باراند وەکوو گۆزان، ئەشک    حاجییان گشت وازییان کرد، زاری مەشک (٣٨٠٧)
[illegible]یەک کاتێ کەدیتیان، وا لەوی    بەو دەبوون موئمین، دەیان کرد سەر نەوی (٣٨٠٨)
[illegible]دەیێکی دی یەقینیان بوو زیاد    لەو عەجەب (واللە اعلم بالرشاد) (٣٨٠٩)
[illegible]دیێک مونکیردەمان و ترش و خام    ناقیسانی جاویدان، (تم الکلام )[1] (٣٨١٠)

---

**تەواو بوو جلدی دووەمی مەسنەوی شەریف بەسووڕەتی هۆنراوەی کوردی بە قەڵەمی عبدالسلام مدڕسی(خانی) للەالحمدوالمنه، بەتاریخی ٧/ ٥/ ١٣٨٠ کۆچی هەتاوی .**

---

[1] -عیددەیێک مونکیر دەمان و ترش و خاو    ناقیسانی جاویدان ، باس بوو تەواو

بسم الله الرحمن الرحيم

ئـــەی حیســـامەددین بینـــەبێ، پەلـــە  ...  دەفتـەری سێهەم کەسـوننەت سێ چەلـە
دەرکـی گەنجینـەی سـوڕان تـۆ واز بکـە  ...  بێژەعـــوزریش لێرەتـــۆ پـــەر واز بکـــە
قـــووەتی حـــەق قـــووەتی تۆچادەکـــا  ...  کوانێ گـەر مای نێو ڕەگان قـەت وا دەکا؟
ئـــەو چـــرای ڕۆژێ کـــەدائیم ڕەو شـــەنە  ...  کـوا سـەبەب بـۆ وی فتیلـەو ڕەو غەنـە؟
سـەقفی گـەردون گـەر وەهـا سابیت بـووە  ...  کـــوا تـــەناف و کـــۆ لەکـــەڕایگرتووە؟
قـودرەتی جـەبریل خـۆراک پێـی نـەدا  ...  قـــودرەتی وی هـــات لەدیـــداری خـــودا
هـــەر وەهایـــەقودرەتی ئەبـــدالی حـــەق  ...  هات لەحەق ڕا، نەک غەزای سفرەو تەبەق
جیسمی وان تێکەڵ بەنووربوو یـەک بەیـەک  ...  تێپـەڕین جاهـەم لـەڕووح و هـەم مەلـەک
چـون دەتـۆ دا هـەن سیفاتی خـوای جـەلیل  ...  بیخەپشت سەر ناری ئەمراز، وەک خەلیل
جـا لـەبۆ ت ئـاگر دەبـێ سـەرد و سـەلام  ...  ئـەی عەناسـیر بـۆ میزاجـی تـۆ غـولام
بـــۆ میزاجـــان بـــەس عەناســـیرمایەیە  ...  تـــۆ میزاجـــت بـــەر تـــەرینی پایەیـــە
تۆ لـەدونیای وەحـدەتت بـۆ هـات میـزاج  ...  وەحـدەتت تۆ هاتـەدەس جـا، بووی سیڕاج
سـەد ئەسـەف زەرفییـەتی ئـەفهامی خـەڵق  ...  تەنگـەبێ حـەد هـیچ نیبانەخـەڵق حـەڵق
ئـــەی زیانەلحـــەق بەباشـــی ڕایـــی تـــۆ  ...  زار بەبـــــەردی ڕەق دەدا هـــــەڵوایی تـــــۆ
کێـوی تـوور وەختـی تەجـەللی هـەیبوو زار  ...  تـــاکو نۆشـــی مـــەی لەوەســـڵی کردگـــار
بـەو تەجـەللی جـێ بـەجێ شـەق بووجەبـەل  ...  تـا کوئێسـات دی لـەکێو، ڕەقسـی جەمـەل؟
گەر چـی نـان دان دێ لەدەستی زیندەکەس  ...  دانـــی زار، ئـــەمما بەدەســـتی خوایەبـــەس
زار دەبەخشـێتن بەجیسـم و ڕووح خـودا  ...  ئەوبەگشـت ئـەعزات دەداتـن زارجـودا
پێـت دەد ا زار کـاتێ لـەو حـاڵی ببـی  ...  تـۆ لـەفێڵ و غـەلل و غـەش خـاڵی ببـی
سیرڕی شا، بۆکـەس نەکـەی تۆ پێشکێش  ...  تـۆ نـەڕێژی قەنـد هـیچ کـات پـێش مـێش
ڕازی حـەق ئـەو کـەس دەزانێ ئـەی هـەواڵ  ...  چەشـنی سوێسـن سـەت زبانی بێت و، لاڵ
زار دەبەخشـێتن بـەخاک لـوتفی خـودا  ...  تـا کـو ئـاو بخـوات و شین بـێ سـەت گییـا

خـــــوا دەداتـــــەخاكیانیش زارو لێـــــو ‏ تا تەڵەب كەن گیا لەدەشتان هەم لەكێو (۲۳)

ێی كەخواردحەیوان دەبێ گەو رەو قەڵەو ‏ جالەبۆ ئینسان دەبێ خۆراک ئەو (۲۴)

حـرەكی دی دیتو دەخوا خاک بەشەر ‏ گەر لەئینسان بووجودا، ڕووح و بەسەر (۲۵)

ـ وەڵـەم دی زاری زۆر زەرڕەی جیهان ‏ زۆر دەكێشێ گەر بڵەم خۆراكی وان (۲۶)

ی گەلای داران بەچی؟ ئینعامی وی ‏ دایەنی دایكانەلوتفی عامی وی (۲۷)

ق و ڕۆزی خوا بەڕۆزیانیش دەدات ‏ چاو گەنم، بێ ئا و، ڕوشد ناكا، چكات (۲۸)

ـەرحی ئەو گوفتارەنیتی ئینتیها ‏ من كەمێكم بۆ نموونەكوت، وەها (۲۹)

ـتی عالەم ئاكیل و مەئكوول بوون ‏ غەیری وان دوو، موقبیل مەقبوول بوون (۳۰)

ـەو جیهانەو ساكینانی بێ قەرار ‏ لەو جیهانی دیكەسالیک پایەدار (۳۱)

ـەو جیهانەو عاشقانی وی بڵاو ‏ لەو جیهانی دی یەكن، پاكان تەواو (۳۲)

حـ ـەخی بوو ئەو كەسەی بەگیان بدات ‏ تاكوجاویدان ببێ ئاوی حەیات (۳۳)

ـ قیتوسـالیحاتن جاویدان ‏ قەت خەتەر تەهدید ناكا هیچ ئەوان (۳۴)

ـەت هەزارا ن گەر ببن عارف، یەكن ‏ با، عەدەد ئەندیش بڵێ زۆ ر بێ شەكن (۳۵)

ـیل و مەئكوول هەیانن حەڵق و نای ‏ غاڵب ومەغلووب هەیانن عەقڵ و ڕای (۳۶)

ـ ێ خوداوەند بەو عەسای مووسا گەروو ‏ بۆ یەخواردی ئەو هەموو حەبلانە، زوو (۳۷)

جۆنكەحەیوانی نەبوو شكڵ و غەزا ‏ زیاد نەبوو بەو خواردنەزەڕێک، عەسا[1] (۳۸)

ـۆ یەقینیش دای گەروو زاتی خودا ‏ تا خەیاڵاتان یەقین بەو قووت بدا (۳۹)

ـێ مەعانیش چەشنی ئەعیان بوو گەروو ‏ ڕازقی حەڵقی مەعانی خوا دەبوو (۴۰)

حـ ـەمانگێ تاكو ماسی گشتی خەڵق ‏ بۆ هەموویان بوو لەبۆ خۆ ڕاک حەڵق (۴۱)

گەر گەروو ی گیان فكری جێسمی لانەما ‏ ڕزق و ڕۆزی پێدەداتن خوای سەما[2] (۴۲)

ڕووح دەبێ ڕاحەت، میزاج هەموار بێ ‏ مەرگی بەدكار دێ، میزاج گەر خواربێ (۴۳)

گەر میزاجی ئاد ەمی بوو، خۆڵ خۆر ‏ ئەو نەخۆشە، ناتەوانە، زەرد و بۆر[3] (۴۴)

گەر میزاجی پیسی خۆی كرد قەلع وقەمع ‏ ناحەزی دەڕوا، دەبێ جوان چەشنی شەمع (۴۵)

گونی دایەن تا لەشیر بگرێ منال؟ ‏ جا بەمەعنای خۆ ش، بكا ئەو خۆ شحاڵ (۴۶)

---

۱- چونكەشكڵ و ئەكل، حەیوانی نەبوو بۆ عەسا هیچ زیاد و نوقسانی نەبوو

۲- ڕزق و ڕۆزی پێدەدا ئەو دەم خودا (مصرع دوم)

۳- ڕەنگ بۆر (مصرع دوم)

گەر لەشیری مەمک وەیکەی بێ گومان ‌ ‌ ‌ ڕێی دەبێ ئەو بچتەنێوسەت بێستان[1]
بۆ زەعیف تەنها حیجاب،هەرمەمکەبەس ‌ ‌ ‌ لەززەتی مەعنا دەخاتەنێو قەفەس
شیری مەمکن گەر نەوێ، بۆن ژین دەبێ ‌ ‌ ‌ ژینی جاویدان لەبۆن شیرین دەبێ
خوێن غەزای ئینسانەکاتێ بوو جەنین ‌ ‌ ‌ لادەدەن خۆیان لەناپاک موئمینین
گەر لەخوێن وەکرا، غەزای وی بوو بەشیر ‌ ‌ ‌ گەرلەشیر وەکرا دەبێتەلوقمەگیر
گەر وەلانێ لوقمە، لوقمانی دەبێ ‌ ‌ ‌ تالبی ئەسراری پنهانی دەبێ
گەر ببێژێ بەو جەنینەیەک نەفەر ‌ ‌ ‌ عالەمیکی دی هەیەگەر بچیەدەر
خوڕڕەمی و شادی دەویدا بێ حەدە ‌ ‌ ‌ نیعمەت و میوەش لەوێ چەندین سەدە
پڕ لەدەریا و شاخ و داخەپڕ لەدەشت ‌ ‌ ‌ پڕ لەباغ و مێرغوزارەوەک بەهەشت
ئاسمانێک زۆر بڵیند و ڕەو شەنە ‌ ‌ ‌ غەیری مانگ وڕۆژ ستێرەش زۆ ر هەنە
هەر لەمەشریق تاکو مەغریب بێ قسوور ‌ ‌ ‌ پڕ لەباغەپڕ لەشادی پڕ سروور
ناکرێت پێی وەسفی خۆ شی وی چ زار ‌ ‌ ‌ تۆش دەژی زۆربەد، لەجێی وا تەنگ وتار
تۆ لەجێی وا تەنگ وتاریک خوێن دەخۆی ‌ ‌ ‌ چاو،ئەسیری دەس لەسەرچاوانی خۆی
غەیری حاڵی خۆی لەلا، ئەو چانییە ‌ ‌ ‌ وەر دەگێڕێ ڕوو، بەمەعنای وا، نییە
چون محاڵەهەم غروورەهەم فریو ‌ ‌ ‌ چون نەزانەوەهمی کوێری هیچ نەدیو
ئەو شتەی نەیدیوەقەت ئیدراکی وی ‌ ‌ ‌ کوا دەبیسێ دەرکی مونکیرناکی وی؟
هەر وەهالەن گشتی خەڵکی نێو جیهان ‌ ‌ ‌ لەو جیهانی دی دەڵێن ئەبدال بەوان
ئەو جیهانەچاڵە،زۆر تاریک وتەنگ ‌ ‌ ‌ لەوبەدەر،هەن عالەمێک بێ نوور وڕەنگ
هیچکەسێ نەی بیست قسەی وان لەوجەمە ‌ ‌ ‌ چون تەماع بۆچاوی وان سەنگین تەمە
نایەڵێ گوێ هیچ ببیستێن تەماع ‌ ‌ ‌ چاو دەبەستێ کینە، نای بێ ئیتتیلاع
بۆ تەماعی خوێن،جەنینیش بوومەبەست ‌ ‌ ‌ چون غەزای وی بوولەجێگای زێدەپەست
خوێن جەنینی لەوجیهانەدوور کرد ‌ ‌ ‌ غەیر ی خوێنی ئەو لەلای خۆ ی دووربرد

---

[1] - گەرکو وەیکەی تۆ لەشیری مەمک، ئەو ‌ ‌ ‌ ڕێی دەبێ ئەو بچتەبێستان ڕۆژوو شەو

**داستانی چەند کەس کە فەرخە فیلێکیان خوارد و گوێ نەدان بە نەسیحەتی ناسیح..**

**خولاسەی داستان...**

دەستەیەک لەموسافیران گەیشتنەهیندووستان وچونکەبرسی بوون ویستیان کەحەیوانێک ڕاو بکەن دەو کاتەدا پیاوێکی زانا دەگەڵ وان ڕوو بەڕوو بوو ولەڕووی دڵ سۆزی ورێ نموونی بەوانی کوت .. دەو مەملەکەتەپان و بەرینەدا، فیل زۆرهەنەبەڵام ئاگاتان لەخۆتان بێ ئەوان ڕاو مەکەن،چونکەفیلەکان بەبۆن منداڵی خۆ یان دەناسنەوە، وئەگەر ئیوەفیلێک ڕاو بکەن وبیخۆن بێ گومان فیلانی مەست تۆ لەتان لێدەستێنن، پیاوی زانا پاش ئەوقسانەلەو موسافیرانەماڵ ئاوایی کرد ورۆیشت، کەم کەم ئەوان برسی بوون لەوکاتەدا لەقەراغ جاددە، فەرخەفیلێکی قەڵەویان دیت وفەورەن گرتیان و سەر یان بڕی وگۆشتەکەیان کردەکەباب و خواردیان.. بەڵام یەک نەفەر دەنێو وان دا توانی بەسەرخۆ یداموسەللەت بێ و نەی خوارد، ولێوی لەگۆشتی فەرخەفیل نەدا، ئەو گرووهەی کەگۆ شتەکەیان خواردبوو چوونەخەوێکی زۆ ر گران وتەنها ئەو کابرایەی کەگۆشتی نەخواردبوو وەخەبەر بوو، دەو بەینەدا فیلێکی تووڕەو پەرێشان هات، ولەئەووەڵەوەزاری ئەو کابرایەی بۆن کرد، ولەپاشان چوو بۆ لای ئەوانەی کەنوستبوون ولەبۆنی زاریان تێگەیشت کەقاتلی منداڵی وی ئەوانەن وهەمووی کوشتن..

| | | |
|---|---|---|
| تـۆ ئـەوەت بیستوە لـە نێـو هیندووسـتان | دی کەسـێک زانـا گرووهێـک دۆسـتان | (٦٩) |
| بـوون گـەلێک برسی بـەبێ خـۆراک دەمـان | گەینەهیندوسـتان لـەڕێی دوور ڕا ئـەوان | (٧٠) |
| عاقڵانـەچوو لـەلای وان پـێش کـەلام | زۆر بەشـادی لێـی دەکـردن ئـەو سـەلام | (٧١) |
| پێیکـوتن حـاڵیم کەبرسـی و بـێ غـەزان | زۆر دەدەردو ڕەنـج دانـەو، نـاڕەزان | (٧٢) |
| ئێوەئـەمما سـوێن دەدەم بـەخوای جـەلیل | قـەت نـەبێ خـۆ راکتـان منـداڵی فیـل | (٧٣) |
| زۆر لـەڕێگاو دا دەبیـنن فیـل تـەنێ | هیچ مەکووژن فەرخەفیل، چاک گوێ دەنێ | (٧٤) |
| فەرخـەفیل زۆر هـەن لەسـەر ڕێ بازتـان | ڕاوی وان بۆتـان دەبـێ دڵخوازتـان | (٧٥) |
| هـەن زەعـیفن هـەن لـەتیفن هـەن قەڵـەو | دایکـی وان وشـیارەبێ حـەد ڕۆژو شـەو | (٧٦) |
| ئـەو سـەدان فەرسـەخ دەچێ بـەدوای منـاڵ | ئـەو لـەدووی منـداڵ دەکـاتن ناڵـەناڵ | (٧٧) |
| ئـاگرو دوودی لـەخڕتووم دێتـەدەر | جا لەفەرخەی خۆ شەویستی کەن، حەزەر[1] | (٧٨) |
| ئـەو لیامنـداڵی خوانەئـەی جـەوان | خـۆ خەبـەر دارەخـودا دائـیم لـەوان | (٧٩) |

---

[1]- دوودو ئاگر، دەر دەدا خڕتوومی وی      ئەلحەزەر لەو فەرخەکەی مەرحوومی وی

خــەڵوەتی وان تــۆ بەنوقســان مەگرەقــەت      چون بـەتۆ ڵـەی وان دەکا، تـو، لـەت بەلـەت
ئــەولیای منــداڵی خــۆ کــوت، خــۆ، خــودا      بــوون لــەدونیا، هــەم شــکووهی وی جــودا
ئــــەولیا بـــۆ ئیمتیحــــان خـــوارو نـــەزار      مـــن دەبـــاتین دا لـــەبۆ وان بوومـــەیار[1] ۰۲
ئــــەو لیــا تــەنها ئــەمن بــووم پشــتییان      وەک دەڵـەی ئـەجزایی مـن بوون،گشـتییان ۰۳
خەرقەپۆشــان ئــی مــنن ئــەی هووشــیار      هـەر یـەکن بـا بـن بـەزاهیر سـەت هـەزار ۰۴
چـــــۆنی پێـــــدەکرا، بـــــەدارێکی دەنـــــا      مووسـیەک، فیرعـەو ن، بنێـرێ، بـۆ فـەنا؟[2] ۰۵
ئەی دەنا چۆن هـەر بەیـەک نفرینی نـووح      ئــەو جیهانــەدەمرێ نــای مێنــێ چ ڕووح[3] ۰۶
یەک دوعای لووت چۆن دەکا وێران ئەدی؟      گشـتی شـارو مەسـکەنی قـەو مـی بـەدی ۰۷
گشتی شاری وان کەبوون چەشنی بەهەشت      تێـک دران،کـاول کـران وبـوو ن بەدەشـت[4] ۰۸
ئـــەو نیشـــانانەش دەبینـــی تـــۆ ئەگـــەر      دەفعەیـەک بـۆ لایـی قودسـت کـرد گـوزەر ۰۹
ئــەنبیای زاتــی خــودا چەنــدین هــەزار      قەومی بـەدیان زۆر کـەڕەت کـرد تـار و مـار ۱۰
مــن ئەلــەو باســە، بڵــەم زیــاتر ئەگــەر      کێـو دەبـن بـەخوێن هـەموویان، وەک جگـەر ۱۱
کێــو دەبــن بــەخوێن و دیســان دەبنــەکێو      کـــوا دەبینـــی ئەوهـــەتۆ،کوێری دزێـــو؟ ۱۲
گـــەرچی کـــوێری دوورو نیزیکـــت دەدی      بـۆ لەوشـتر نەددی غـەیری تـووک ئـەدی؟ ۱۳
حیـرس و ئـازی دیـت ئینسـان مـوو بـەموو      ڕەقسـی بێهـوودەی وەکـوو ورچـی هـەبوو ۱۴
تـــۆ بەڕەقســـی خـــۆت بشـــکێنەوجوود      بـــێ ڕیبابـــەتا ببینـــی زێدەســـوود ۱۵
ڕەقس و هەڵپـەڕکێ لەسـەر مەیدان دەکەن      هەڵپـەڕین نێـو خـوێنی خـۆ، مـەردان دەکـەن ۱۶
گەر لەنەفس و نەقسی خۆیان بوون نـەجات      ڕەقـس و چەپڵەئـەو دەمـی بـۆ وان دەهـات ۱۷
مـــوتریبی وان زۆر بـــەدڵ دەف لێـــدەدەن      بـەحر، بـۆ غـەوغایی وان کـەف لێـدەدەن ۱۸
تـــۆ کـــەنابینی لـــەبۆ وان پـــەلکی دار      لێـدەدەن چـەپڵان لەسـەر داران، هـەزار ۱۹
تۆکـــەنابینی گـــەڵا کـــەف لێـــدەدەن      ئەوهەدەی وێ گوێی دڵ نەک گوێ بـەدەن ۲۰
تـۆ لـەکیزب و بـەد، ببەستەهەر دوو گـۆش      تـا ببینـی شـاری گیـان تـۆ ڕوون و خـۆش ۲۱
ڕازی گوفتـــار تێـــدەگا زۆر چـــاک نـــەبی      بۆیـەکوترا(هـو اذ ن)بـە و نێـو نـوبی ۲۲

---

[1]- ئەو لیابۆ ئیمتیحان خوارو یەتیم      من لەبۆ وان باتیننەن یارو نەدیم
[2]- چۆنی پێدەکرا دەنا مووسا بەدار      فیرعەونی نابەکار کا تارو مار؟
[3]- ئەی دەنا چۆن نووح بەنفرین نەک بەحەرب      تێک دەداتن ئەوجیهانەشەرق و غەرب؟
[4]- تێک دران وێران کران وبوون،بەدەشت (مصرع دوم)

ـتــت وجـــوودی چاووگوێیەئـــەو نـــەبی    شاد بەوین، شیر خۆر لەوین، ئێمـەش سـەبی (١٠٣)

ــــەو وتـــارەهیچ زەمـــــان ناگاتــــەبن    گـــوێ بـــدەبۆ داســـتانی فیـــل، بـــەمن[1] (١٠٤)

**پاشماوەی ئازاردانی فەرخە فیلان ...**

ـەک بەیەک فیـل زاری هەموان بۆن دەکا    جسـتوجۆی مەعـدەش دەزانـی چـۆن دەکـا (١٠٥)

ــــ کـــەبابی فەرخەکـــەی پەیـــدابکا    تاکـەباب خــۆر جــێ بــەجێ ڕیســوا بکــا (١٠٦)

ـتــتی عەبـدی خـوا بخـۆی یـانی ئـەتۆ    غەیبــەتی وان کــەی عــەزابت دێ لــەبۆ[2] (١٠٧)

ـکـــەری زارتـــان بەتـــەنها، خالقـــە    ڕەســـتگاربوو هـــەر کەســـێکی ســـادقە (١٠٨)

ـی بـــەحاڵی وەی کـــەبۆ وی بۆنکـــەرە    وەختـی قـەبری یـەک نـەکیر یـەک مونکـەرە (١٠٩)

ــتوانێ ون بکـــا زار، لـــەو دوو یـــار    یـا بـەدەرمان خـۆش بکـا ئـەو بـۆنی زار (١١٠)

ـیچ دەگـۆڕدا نـابێ پەیـدا عـەتری خـۆش    ڕێ دەبەسرێ هەردوو لێیان، عەقڵ و هۆش (١١١)

ـدەن گـورزان لەبـەد گـۆی بـێ هونـەر    جـار لەپاشـەڵ جـارو بـاریش هـەر لەسـەر (١١٢)

ـورزی عیزرائیـــل ببینەلـــەو، ئەســـەر    گـەرچی نـای بینـی ئـەتۆ بـەو چـاوی سـەر (١١٣)

ـبـار زاهیردەکـا ئــەو گــورزی خــۆی    هەر نەخۆش مەعلووم دەبێ، ئەو گورزەبۆی (١١٤)

ـگ دەکـا جـا ئـەو نـەخۆش، یـارانی مـن    بـۆچی ئێسـتا شـیر، بـوون بـارانی مـن (١١٥)

ـکـەنای بینـین، لـەبۆمان بـوو خـەیاڵ    کـــوا خەیاڵەئیرتیحالـــە، ئـــەی هـــەواڵ (١١٦)

ــوا خەیاڵە؟ئاســـمانیش زوو بـــەزوو    بیـــری مـــردن کـــردی لاواز وەک دەزوو (١١٧)

ـنـەخۆش، خـۆ، گورزوتیـغ دیـارن لـەوی    وەختـی مـردن چاو دەکا چۆن سەر نـەوی[3] (١١٨)

ـیغ و شیربۆ وین نـەخۆش لێی بوو عـەیان    کوێرەئـــەمما چـــاوی دۆســـت و دوژمنـــان (١١٩)

ـبـوو چـاوی، حیـرس و ئـازی لادەنـا    چونکەئێســـتا، وەختـــەبمرێ، بـــێ فـــەنا (١٢٠)

ـێی تیـژی بـوو بەتـەیری دوو ر لـەکات    چـون بـەکیبرو خـود پەسـەندی هەڵـدەهات (١٢١)

ـجـــەببرن ســـەری ئـــەو تەیرەگـــەر    زۆر بـەبێ مـەو قیـع سـەدای لـێ بێتـەدەر (١٢٢)

ـۆ دەحـــاڵی گیـــان دانـــی کەمکەمـــە    حیفـــزی ئیمانـــت بکـــەتۆ ئـــەو دەمـــە[4] (١٢٣)

---

[1]- ئەو وتارە نیتی پایان ئەی فلان    بیینەوە سەر باسی فیل و دۆستان

[2]- گۆشتی عەبدی خوا دەخۆی بێشک ئەگەر    غەیبەتی وان کەی، عەزابت دێتەسەر

[3]- بۆ نەخۆ ش خۆ گورزو تیغ مەحسووس بوو    وەختی مردن ،چاو، سەری مەنکووس بوو

[4]- حیفزی ئیمان وەختی گیان دان، لازمە(مصرع دوم)

عـومری تـۆ هـەنبانی زێڕئـەی خـۆش مێـر ‌ ‌ ‌ ڕۆژوشـەووەک چی دەچـن؟وەک زێـڕ ژمێر ٢٤
زێـــر ژمێـــرن ڕۆژو شـــەو هـــەر دووکیـــان ‌ ‌ ‌ تـــا دەبـــێ خـــاڵی لەزێڕ،کیســـەی ژیـــان ٢٥
گەرلـــەکێو بگـــری لەجێشـــی دانـــەنێی ‌ ‌ ‌ کێـــو لـــەبن دێ هـــیچ نامێنێـــت پێـــی ٢٦
هـەرچی عـومرت چـوو، لـەجێی وی دابنـێ ‌ ‌ ‌ غـــەیری تاعـــەت بۆخوداوەنـــد، لابنـــێ ٢٧
بۆ هـەموو کارێـک نەکـەی تـۆ زۆر تـەلاش ‌ ‌ ‌ غـەیری کـاری دیـن، تەلاشـت بـوو بـەلاش ٢٨
عاقیبـــەت تـــۆ هـــەر دەڕۆی زۆر ناتـــەواو ‌ ‌ ‌ کـــاردەمێنن نـــاقیس و[1]، نانـــت بـــەخاو ٢٩
نـــای هـــەوێ چـــاکردنی گـــۆڕو لەحـــەد ‌ ‌ ‌ دارو بـــەردو مـــاڵی زۆرو زیـــاد لەحـــەد ٣٠
بەڵکـــەگۆڕێک نێـــو ســـەفا، تۆچابکـــەی ‌ ‌ ‌ جـا وجـوودت دەفنـی زاتـی خـوا بکـەی[2] ٣١
تاکو دەبیـە خـاک لەدەرگای خوای ئەحـەد ‌ ‌ ‌ بـۆ دەمت،جـا، لـەو دەمـی وی دێ مـەدەد ٣٢
مەقبەرەوگومبـــەز لـــەبۆپاکانی حـــەق ‌ ‌ ‌ سـوودو نـەفعی هـیچ نییـە، نـا مستەحەق ٣٣
چاو کە، لەو زیندەی دەبەرخۆی کرد هـەریر ‌ ‌ ‌ کـــوا هەریربۆعـــەقڵی وی بوودەســـتگیر؟ ٣٤
کەوتـــەنێو دەردو عـــەزابان گیـــانی وی ‌ ‌ ‌ عــەقرەبی غــەم چــۆ دڵــی غەمــدانی وی ٣٥
ئـەو بـەزاهیر هـەیتی زۆر نـەقش و نیگـار ‌ ‌ ‌ ئـــەو دەباتینـــدا، لەبـــەر فکرانـــە، زار ٣٦
یـەک دەبینـی تۆ،کـەدەڵقی کـۆن، لەبـەر ‌ ‌ ‌ فکری وەک گوڵ،گفت وقەولی وەک شەکەر ٣٧

## گەڕانەوە بۆ داستانی فیل..

پێیکـوتن ناسـیح،بەپەندم چەشـنی گـەنج ‌ ‌ ‌ گوێ بـدەن چاک تا نەچن بۆبەحری ڕەنج ٣٨
گیـاو گـەڵای داران بخـۆن ئێـوەی نـەبیل ‌ ‌ ‌ تـا نەکـەن هـیچ کـات ڕاوی فەرخـەفیل ٣٩
مـن کـوتم بۆتـان نەسیحەت، بەنـد بەبەنـد ‌ ‌ ‌ هەر سـەعادەت دێنێ،گوێ دان خۆ بەپەند ٤٠
مـــن بـــەئێوەم ڕاگەیانـــد چـــی لازمـــە ‌ ‌ ‌ تـــا نـــەجاتو دەم لـــەچی دەردو غەمـــە ٤١
هووشـــیاربن تـــا تـــەماع ڕێ و، ون نـــەکا ‌ ‌ ‌ جـەرگی ئێوەتـا تـەماع کـون کـون نـەکا ٤٢
کـردی مـاڵ ئـاوایی پاشـان لـەو جەمـە ‌ ‌ ‌ برســـیەتی حەملـــەی دەهینـــا کەمکەمـــە ٤٣
جـــا لـــەناکاو دیتیـــان لای جادەیـــەک ‌ ‌ ‌ فەڕخـــەفیلێکی قەڵـــەو، نـــەو زادەیـــەک ٤٤
کـەوتنـەگیانێ وی وەکـوو گوگـانی مەسـت ‌ ‌ ‌ خواردیـان لێکـڕا هـەموو شوشـتیان دەسـت ٤٥
یەک لـەوان نـەی خـوارد گۆشـت وپەنـدی دان ‌ ‌ ‌ چـون لـەبیری بووقســـەی ئەوپەنـد زان ٤٦

---

[1] - کارەکانت ناقیس و ، (مصرع دوم)

[2] - خۆت لەنێو ئەو زاتی حەق ئیمحابکەی (مصرع دوم)

ـەو وتارەمەنعی کرد بخوا کەباب    عەقڵی کۆن زۆرچاک دەبەخشێ بەختی تاب (١٤٧)
ـی خواردن گشتی نوستن ماتوکەڕ    شەخسی برسی هیچ نەنوست وەک شوانی مەڕ (١٤٨)
ـێ کەدێ یەک فیلی گەورەی بێ ئەمان    پێشی هەموان دێ لەبۆلای پاسەوان (١٤٩)
ـێی زاری وی دەکرد فیل جا، سێ جار    لێی نەهات ئەو هیچ بۆنی نالەبار (١٥٠)
جەند جاران فیل دەو ری وی دەدا    هیچ ئەو ی ئازار نەدا، ڕۆی بێ سەدا (١٥١)
ـوستوو انی یەک بەیەک بۆن کرد،زار    بۆنی بۆ هات فیل، بۆنی نالەبار (١٥٢)
جون کەبابی فەرخەفیلیان خواردبوو    گشتی کوشتن فیل هەموویان زوو بەزوو (١٥٣)
ـەو گرووهەی یەک بەیەک کوشت بێ درەنگ    هیچ کەنەیبوو ترسو وەهم و عارونەنگ (١٥٤)
ـەک بەیەک دەیکرد بڵیند دەیدا لەعەرد    لەت دەبوونەیبوو نەجا ت قەت هیچ فەرد (١٥٥)
ـەی خورەندەی خوێنی عالەم لادەخۆ    تا کو نەگرێ خوێنی وان ئەستۆیی تۆ (١٥٦)
ـی وان وەک خوێنی وان بۆگشت کەس    بوو حەرام چون زۆر بەزەحمەت دێتەدەس (١٥٧)
ـەدەستێنێت دایکی فەرخەفیل    فەرخەفیل خۆران دەکا، خوارو زەلیل (١٥٨)
ـەربخۆی تۆ فەرخەفیل ئەی نا لەبار    فیلی زۆردار، دێ دەکا تۆ، تارو مار (١٥٩)
ـۆن ئەتۆ ڕیسوادەکاخوارو زەلیل    بۆنی فەرخەی خۆی، مەگەربۆ نایەفیل؟ (١٦٠)
ـۆنی حەق دێ لای یەمەن بۆ یەک نەفەر    بۆنی باتڵ ئەو لەمن ناکا، مەگەر؟ (١٦١)
ـەر موحەممەد هات لەبۆی بۆن، زۆر لەدوور    چۆن لەزاری ئێمەناکابۆی بخوور؟ (١٦٢)
ـۆن دەکا ئەو، لێن دەکاتن، ون بەڵام    دەچنەئاسمان بۆنی باش و بەد، تەمام (١٦٣)
ـو دەنووی بۆنی حەرامت وەک غوبار    ڕوو دەکاتەئاسمان دەڕوا بەغار[1] (١٦٤)
ـب دەگەڵ ئەنفاسی پیست ڕاس ڕا س    دەچنەئاسمان لای فریشتەی بۆن شناس (١٦٥)
ـۆنی کیبرو بۆنی حیرس وبۆنی ئاز    دێ لەگوفتار، هەر وەکوو بۆنی پییاز (١٦٦)
ـوێن بخۆی گەرئێستەمن نەمخواردووە    سیروپیوازم گەلێک دوور ناردووە (١٦٧)
ـەو هەناسەی سوێن ئەتۆ ڕیسوا د ەکا    چون دەماغت، بۆنی وان، پەیدا دەکا (١٦٨)
ـۆر دوعای تۆ، هەن قەبووڵ نین لای خودا    چون زبانت زۆر لەقەلبت بوو جودا (١٦٩)
ـەو دوعایەی (اخسئو) ی جواب پێدرا    بۆ موجازات، داری ڕەددی لێدرا (١٧٠)
گەرکو مەعنی ڕاست بێت و لەفز خوار    لەفزی خوار ئیراد نییەلای کردگار (١٧١)

---

[1] - تا نەچێ بۆ ئاسمان ناگرێ قەرار (مصرع دوم)

**بەیانی ئەو مەتڵەبە کە خەتای دۆستان لە سەحیحی بێگانان باشترە..**

**خولاسەی داستان...**

بـیلال ئـەووەڵین موئـەززینی دونیـای ئیسلام بەعیللـەتی لوکنـەتی زەبـان نەیـدەتوانی کەلیمـەی (حی)ی دەعیبارەتی (حی علی الصلوه ) و (حی علی الفلاح ) بەسەحیحی ودروستی ئەدا بکا، جـ لەبــەر ئەوەعیـــددە یــەک لـــەزاهیر بینــان ئیرادیــان لێگــرت، حــەزرەتی پێغەمبــەر(ص لەوئیرادگرتنەنارەحـەت ونا ڕازی بـوو و فـەرمووی غەڵـەت خوێندنـەوەی بـیلال باشترەلەسـەت نەوع فەساحەت ودروست خوێندنەوەی خەڵکی دی ...

دایــدەنا (هەییــە) لــەجێی(حییــە) بــیلال — وەختی دەیکوت بانگی خۆش و بی میسال (۰۲

تــاکو کوتیــان ئــەی پەیەمبــەر، وانییــە — ئێســـتەزوویە، ئــەو خەتایــەچا، نییـــە (۰۳

ئـەی نـەبی ئـەی خۆشەویسـتی لای ئـیلاه — یـەک موئــەززین بێنەنـەی بـێ ئیشـتیباه (۰۴

عەیبەئێســـتا ئـــەووەڵی دینـــو ســـەلاح — نادروسـت (حییـە) ببێـژن گـەڵ (فـەلاح ) (۰۵

تووڕەبـوو ئەحمـەد کـوتی ئـەو دەم بـەوان — یـــەک دووڕازی ئەوخوداوەنـــدی جیهـــان (۰۶

ئـەی نـەفامان،لای خـودا (هەییـە)ی بـیلال — سەت کەڕەت چاتر لە(حەییە)وقیل وقال (۰۷

وامەکــەن تــووڕەم بکــەن غــەمبار مــن — تـا نەکــەم ئەسـرِا ڕتــان ئاشــکار مــن (۰۸

گــەر دەمــی گــەرمت نییـەتۆ، بـۆ دوعــا — بــا دوعاکــەن بــۆ تــۆ ئیخــوانی ســەفا (۰۹

**فەرمانی خوداوەند بە حەزرەتی مووسا(ع) کە بەزارێک ئارەزووی خۆت لەمن بوێ کەبەو زارەگوناهت نەکردبێ ...**

دەیکوت ئـەی مووسا، لەمن بت وێ، پـەناه — تــۆ بــەزارێکی کەنــەت کردبــێ گونــاه (۸۰

مـــن کـــەزاری وام نییـــە، مووســـاکوتی — زاری خــەڵکی گازکەبــەو مــن، خواکــوتی (۸۱

کـوا بـەزاری خـەڵکی تـۆ کـردت گونـاه؟ — تـۆ بـەزاری خـەڵکی گازکـە، ئـەی ئـیلاه (۸۲

زینـــدەگی و ڕەفتـــاری تـــۆ بـــابێ وەهـــا — ڕۆژوشـــەو زاران بکـــەن بـــۆ تـــۆ دوعـــا (۸۳

تــۆ، بەئــەو زارەی کەنــەت کردووەگونــاه — زاری غــەیرە، ئــەو لــەبۆتۆ عــوزر خــواه (۸۴

یانـــەزاری خـــۆت بـــڕۆ زۆر پـــاک بکـــە — ڕووحـی خـۆت تـۆ چـابوک و چـالاک بکـە (۸۵

زیکـری حـەق پاکـە، ئەگـەرپاک گەییـەجێ — لێـــدەدا، دەڕوات ناپـــاک، جـــێ بـــەجێ (۸۶

زیـد کەزیــددی دی، دەکـاتن زوو فیــرار — چاو کەڕۆژ هات،چۆن دەچێتن شەو بەغار (۸۷

گــەر کــو نێــوی پــاک بــێ بۆنێــو زار — ناحـــەزی دەڕوات و، غـــەم دەڕوا، بـــەغار (۸۸

**بەیانی ئەو مەتڵەبەکە(الله) کوتن نیازمەند بە لەبەیک کوتنی خودایە..**

نەفەر (الله) ی دەکوت تەنها بەشەو — تاکو شیرین بوو بەزیکری لێوی ئەو (١٨٩)
کوت شەیتان دەڵەی (الله) گەلێ — کوا لەبۆت هاتوەلەوی لەبەیک،چەلێ؟ (١٩٠)
ەبۆت نایەت لەوی ڕا،یەک جەواب — دیارەپرڕووی تۆ، بەبێ حەددو حیساب (١٩١)
شکاو بووزۆڕ بەغەم، ئەو چۆ دەخەو — نێو چەمەن دیتی خزر چۆ لایی ئەو (١٩٢)
کوت تۆ بۆچی ناکەی زیکری حەق — بۆ پەشیمانی لەزیکرو فیکری حەق (١٩٣)
ی دا قەت جوابی لەبەیکم نەبیست — زۆر دەترسم هیچ نەبم لای،خۆشەویست (١٩٤)
دکوت (اڵلا) لەتۆ لەبەیکەبۆن — ئەو نیازودەردو سۆزەت، پەیکەبۆن (١٩٥)
هەموو چارەو تەلاشەت، بۆ ویسال — ئێمەباعیس بووین،کەکردت بێ میسال (١٩٦)
عیشقت لوتفی مەی گرت زیادلەحەد — جوابی هەر(یاربی) تۆ،لەبەیکە،سەد (١٩٧)
نادان لەو دوعا چۆن دوور نییە؟ — زیکری یارەب بۆوی هیچ دەستوور نییە (١٩٨)
قەلبی لێدراوە، قفڵ و بەند — تا نەناڵی لای خودا، وەختی گەزەند (١٩٩)
بەفیرعەون موڵک وماڵی بێ میسال — تاکو کردی ئیددیعای جاەو، جەلال (٢٠٠)
ەژین، ئێشی نەدی نەیکرد داد — تا نەناڵی لای خودا، ئەو بەد نیهاد (٢٠١)
بەوی حەق زێد ەموڵک و زێدەگەنج — نەیدەدا بەوقەت غەم وهیچ دەردوڕەنج (٢٠٢)
ئێش چاتربوو لەو ملکی جیهان — تا خوداوەند گاز بکەی ئەو دەم نیهان (٢٠٣)
دوعای سالم دەکا، ئەفسوردەگی — ئەو دوعای دەیکا نەخۆش،بوو، بەردەگی[1] (٢٠٤)
دوعای دەیکرد لەژێر لێو زەمزەمە — هەر بەیادی مەبدەئی ئەوعالەمە (٢٠٥)
دوعایە، بەو سەدای ساف و حەزین — گەر دڵی ئەی موستەغاس ئەی خوای موعین (٢٠٦)
بەبوو، باعیس دەکا، سەگ ناڵەناڵ — دەگرێ ڕێگر، ڕاغیبانی باکەماڵ (٢٠٧)
سەگی کەهفی لەمندار، بووی نەجات — سفرەیی شاهان، لەبۆوی بوو خەڵات (٢٠٨)
قیامەت ئەو لەپێش غار، ئاوی خۆش — عارفانەدوور لەجام دەیکات نۆش (٢٠٩)
کەسانیش هەن بەزاهیر نالەبار — باتینەن مەشموولی لوتفی کردگار (٢١٠)
دە، تا مەشموولی لوتفی خوا، ببی — بێ تەلاش و سەبر، نابێ، وا، ببی (٢١١)
سەبر. سەهلەگەر ببێ، لوتفی جەلیل — سەبرکە، چون سەبرەبۆخۆشیان،کلیل (٢١٢)

---

[1] - ئەو دعای سالم دەکا، بێ حاڵییە — ئەو دوعا دەیکا نەخۆش، عەبداڵییە

دوور لەسەبرو ئیحتیات نا بێ نەجات          بۆتەدەست و پێ سەبر، بۆ ئیحتیات
ئیحتیات کە، تۆ لەژەهری نێو گیا          خۆ شەویستەئیحتیات لای ئەنبیا
با، کەم وزۆر کا، لەجێی خۆی لا دەنێ          کوانێ ئەرزیش کێو، لەبۆ (با) دا دەنێ؟
هەر تەرەف غوول گاز دەکا تۆ، پێت دەڵێ          ئەی برا گەرڕێت دەوێ، بۆلام هەڵێ
ڕێت دەدەم نیشان دەبم بۆتۆ، ڕەفیق          شارەزام زۆر من لەڕێگای وا دەقیق
وانییەئەو شارەزای ڕێگا نەبوو          تۆ نەچی یوسوف، لەبۆ لای گورگ خوو
ئیحتیات بەو هەی دەڵێن،خۆشی جیهان          قەت فریوی وی نەخۆی تۆ، هیچ زەمان
لەززەتی دونیا دەباتین دا نییە          غەیری جادو هیچ بەدەس دونیا نییە[1]
بێرەلام ئەی نووری دوو چاوو دڵم          ماڵ لە بۆتۆ، تۆش لەبۆمن، ئەی گوڵم
ئیحتیاتەگەر بڵەی من، تۆخمەمە          یا نەخۆشم، خەستەزۆر لەو، دەخمەمە
یا سەرێشم، بەس بدەئازاڕی من          یانەکردی دەعوەتم، یەک یاری من
جونکەخۆش یێکت دەداتێ ئەو، بەڵام          دەردی دەیدا، دوایە، قەت نابێ تەمام
زێرو ماڵت گەردەداتێ بێ حیساب          گۆشتەبۆ ماسی کەدایینا، سەر قولاب
کوا دەدەن زێڕ،فێڵەبازانی چرووک؟          فێڵەبازان قەولی وان، وەک گوێزی پووک
دەنگی وان بێ، عەقڵ و مەغزی تۆ دەبا          سەت هەزاران عەقڵ، لای وی، پووشکەکا
یاری تۆ خورجێنی تۆ، هەم کیسەکەت          گەر تۆ، ڕامینی، بڕۆ لای وەیسەکەت
وەیس و مەعشووقت ئەتۆ، هەر زاتی تۆ          غەیری وی هەرچی هەبێ، ئافاتی تۆ
ئیحتیاتە، ئەوهە، گەر دەعوەت کرای          وا نەزانی شاد بەتۆنە، تۆش چرای
دەعوەتی وان دەنگی تەیران بێ، لەلات          گەر لەمەکمەن، جارو بار، ڕاوچی دەکات
جارو بارەش تەیری مردوو دادەنێ          تا نیشان دا، دەنگ لەوی دێ هەر تەنێ
وا دەزانن جنسی وانەو، پشتیان          کۆ دەبن، دەگرێت، ڕاوچی گشتیان
غەیری ئەو تەیرەی کەحەزمی دا یە، حەق          تا نەبێ گێژ، ئەو لەبۆ دانەو مەلەق
دوور لەحەزمان بوون پەشیمان، چێ بەجێ          شەرحی ئەو باسەدەدا داستانی دێ

---

[1]- لەو جیهانە، خۆشی، ئەسڵەن هەر نییە          ئەو جیهانەغەیری جادوگەر نییە

**کابرایەکی دێهاتی کابرایەکی شارستانی فریو دەدا و زۆر خواهیشی لێدەکا کە لێی میوان بێ..**

**خولاسەی داستان ...**

لەڕۆژگاری ڕابوردودا شارستانێتێکی دەو لەمەند دەگەڵ دێهاتێتێکی تەمەعکار ئاشنابوو کابرای دێهاتی هەر وەخت کەدەهاتەشاری یەک سەر دەچۆ ماڵی کابرای شارستانی وبەهەفتەو مانگ لەماڵی وی دەماوە، عاقیبەت ڕۆژێک کابرای دێهاتی بەکابرای شارستانی کوت .. ئەی سەروەروخۆشەویستم بۆتەفریح و سەیران بۆتەشریف ناهێنی بۆدێی ئێمە؟ تۆخوا، لانی کەم یەک جاردەستی ئەهل و عەیالت بگرەوسەرێک لەئێمەبدە.. حەتمەن خۆشت لێدەگوزەرێ، کابرای شارستانی تائەو خواهیشەی قەبوڵ نەکازۆرعوزرو بەهانەی دەهیناوە.. چەند ساڵێک بەو جوورەگوزەرا، کابری دێهاتی ئیسراڕی دەکرد وکابرای شارستانیش بەهانەی دەهینا، تاکو بەعیللەتی ئیسراڕی کابرای دێهاتی منداڵەکانی کابرای شارستانی ئارەزووی سەیرو سییاحەت وسەر لێدان لەدێیان کرد ولەبابیان داوایان کرد کەسەفەرێک بۆدێ بکەن، بەڵام کابرای شارستانی کەزۆر کار ئازموودەو دونیادیتووبوو ئەو وەعدەخۆشانەی کابرای دێهاتی قەبوڵ نەکرد و دەستی کرد بەنەسیحەت کردنی منداڵەکانی، وکوتی ئەی خۆشەویستانم لەشەڕو خەراپەی ئەوکەسەبترسێن کەچاکەتان دەگەڵ کردووە، ئەو جوورەدۆ ستایەتیەبێ دەوامەوقابیلی ئیعتیمادنییە، عاقڵانەنییەکەئیحتیات بەردەن، ووعدەی پووچ و خاوی کابرای دێهاتی باوەڕ بکەن،ومەعلووم نییەکەعاقیبەتی ئەو وەعدەو قەو ل و قەر ارەبەکوێ دەگا، منداڵەکان قسەی باش و بەسوودی بابیان قەبووڵ نەکرد، وئارەزووی سەفەربۆ دێ عەقڵ و هۆشی وانی بردبووعاقیبەت دەعوەتی پەیتاپەیتای کابرای دێهاتی و وئارەزووی بێ ئەمانی منداڵەکان بۆ سەفەر بۆدێ،کابرای شارستانیا ن تەسلیم کرد.. وهیچ چارەی نەما، غەیری موافەقەت دەگەڵ وان، کابرای دێهاتی پاش قەول وقەراری محکەم، بەخۆشحاڵی گەڕاوەبۆ دێ.. کابرای شارستانیش دەگەڵ مندا ڵەکانی خۆیان بۆ سەفەر ئامادەکرد، عاقیبەت تۆشەی سەفەریان هەڵگرت و بەخۆشحاڵی و پێکەنین بۆ لای دێ وەڕێ کەو تن، ولەڕێگادا قسەی خۆشیان دەکرد وڕیوایەتیان نەقڵ دەکرد و ئەشعارو سروودیان دەبارەی باشی سەفەر دەخوێندەوە و بە یەکتریان دەکوت .. لەو سەفەرەداکابرای دێهاتی هەم بەگیان و دڵ خزمەتمان پێدەکا وهەم ئازۆقەی فەسڵی زستانیشمان پێدەدا، خولاسە لە خزمەت کردن بەئێمە قسوور ناکا.. ئەوان بەو خەیاڵە خۆشانە ڕێگای سەخت و سەعبولعبووریان لەسەرما و گەرما دەپێوا .. ودڵی یەکتریان

دەداوە، بـەڵام ڕێگـا تـەواو نـەدەبوو وهـەر چەنـد دەڕۆ یشـتن ڕێگایـان لـێ درێـژ تـر دەبـوو کەمکەمەمانـدوو بوون،وئـەو قسەخۆشانەکەدەپێشـدا دەیـان کـوت تـەواو بـوون، وبۆخۆیـان و بـار بەرەکانیان مانـدوو بـوون وهـیچ ڕێـی گەڕانـەوەیان نـەبوو، وهـیچ چارەیـان نـەبوو، دەبا ڕۆیشـتبان، نیزیک بەیەک مانگ تێپەڕی وهێشتا دەبیابان دا سەر گەردان بـوون عاقیبـەت پاش ڕەنج و عـەزابێکی زۆر، دێـی مـەو ریـدی نـەزەریان پەیـداکرد، دەتکـوت کەکەعبـەی مەقسـوودیان پەیداکردووە، جارەکی دیش خۆشحاڵ بوونەوەومالّی کابرای دێهاتیان پەیداکرد، وبەپەلـەو شـادی زۆر،غاریان دا و لـەدەر کـەیان دا،کابرای دێهاتی پاش ماوەیـەک هـات لـەپێش دەرکـەڕا وەسـتا بەڵام دەتکوت کەنا یان ناسێ زۆر بەساردی تەماشای دەکردن کابرای شارستانی زۆر بەخۆشی و دڵگەرمی سەلامی لێکرد بەڵام جوابێکی زۆرساردی بیست، جـارەکی دیـش کـابرای شارسـتانی بەدەنگێکی بڵیندسەلامی لێکرد بەڵام ئەوچەلەش زۆر بەساردی جوابی دراوە، کـابرای شارسـتانی مەجبووربوو کەخۆ ی موعەڕڕەفی بکا وسابیقەی دۆستایەتی حەوت هەشت ساڵەی بۆ تـەو زیح بـدا، وپێیکـوت ئـەمن فـلان کەسـەمە، هـەمان کەسـەی کەچەنـد سـالان ئـەتۆ کەدەهاتیەشاری، *دەهاتیەماڵی وی وئەمن هەمان ساحەب ماڵەمە، کابرای دێهاتی پێیکوت بۆ هاتـەران پاتـەران* دەڵەی؟مەگەر شێت بوویە؟ ئەو قسانەچن کـەدەیان کـەی؟ پێنج شـەووڕۆژ کابرای شارسـتانی دەگەڵ منداڵەکانی دەکووچەدا گوزەراندیان وکابرای دێهاتی خۆی بەناسیار ئاشکرا نەکرد،تا ئـەو جێگایەکەکابرای شارستانی زۆر نارەحەت بوو دووبارەخواهیشی لێکـرد کـەلانی کـەم دەو شـەوی سـاردو بـارانی دا ڕێگامـان بدەبێنـەماڵ، وسـبەینێ فکرێـک لـەحاڵی خۆمـان دەکەینـەوەکابرای دێهـاتی زۆر بەتەکـەبیور سـەری ڕا وەشـاند وبەدەسـتی، ئینتیهـای بـاغی نیشـان دا، وکـوتی دەئینتیهای ئـەو باغـەدا کۆڵەیـەک هەیەکەشەوانەکەسێک دەوێدا تیـرو کـەوان هەڵدەگرێ وتـا بەیانی کێشک دەکێشێ، تا ئەگـەرگورگێک یـا هەرحـەیوانێکی دڕڕەندەبێتـەباغی بیکـوژێ، ئەگـەر حازربی ئەو شەو پاسەوانی بکەی دەتوانی لەوێ بمێنیەوە، دەنا بـڕۆ وەدوای کـاری خـۆت بکـەوە، کابرای شارستانی بـەگیان و دڵ قـەبووڵی کـرد ودەگـەڵ مـاڵ ومنـداڵی خـۆی لـەو جێگاتاریـک و نەمدارەمانـەوە، وتیـرو کـەوانی بەدەسـت گـرت و موراقیـب مـا، و هاوڕێکانیشـی دەگـۆ شـەێنێک خزین تا ئیستیراحەت بکەن بەڵام مەگەر حەشەراتی مووزی لێدەگەرێن؟ دەو بەینـەدا سایەی گورگێکی گەورەپەیدابوو کابرای شارستانی تیـری دەکـەوان نـا، وبـەقودرەت کێشای وهاویشـتی، وحەیوانەکەی لەعەردی دا وحەیوانەکەبایەکی لێبۆ وە، لەناکاو کابرای دێهاتی بەپەشۆکاوی وداد

و فەریاد خۆی گەیاندەئینتیهای باغی و هاواری کردو کوتی ئەی نامەرد بۆ جاشکەکەرەکەی منت کوشت؟ کابرای شارستانی پێیکوت نەخێر بابەگیان باش دیققەت بکە، ئەمن گورگم کوشتووەنەک کەرەکەی تۆ، کابرای دێهاتی پێیکوت نەخێر وانییەئەمن دەنگی بای حەیوانی خۆم دەنێوبیست بای دی دەناسم وەختێک کابرای شارستانی ئەو قسانەی کابرای دێهاتی دەبارەی قودرەتی تەشخیس حافیزەی وی بیست زۆرنارەحەت بوو وئێقەی گرت و پێیکوت ئەی نامەردی حوققەباز..

گەر دەشەو دا بای کەرت تۆ ناس دەکەی　　بۆچی نا نا سی ئەمن گەرراس دەکەی؟
گـەر لـە تـاریکی دەناسـی بـایی کـەر　　بۆ ئەدی نا نا سی من، ئەی خیرەسەر؟

قەدیم دووکەس دەگەڵ یێک بوون بەیار　　یەک لەدێ دەژیا ئەو ی دیکەش لەشار (۲۳۶)
کوبۆشـاری دەهـات کـابرایی دێ　　ماڵی دۆستی خۆی دەکرد بۆخۆی بەجێ (۲۳۷)
دووسـێ مانگـان دەبـوو میـوانی وی　　هـەم لەسـەر سفرەولەسـەر دووکـانی وی (۲۳۸)
ـەرنییازێکی هەبایـەجێ بـەجێ　　پیاوی شار دەیکرد موفت، بۆ پیاوی دێ (۲۳۹)
ـوی دێهـاتی کـوتی بەو پیـاوی شـار　　بـۆچی نایـەی تـۆ لـەبۆ دێمـان، چ جـار؟ (۲۴۰)
ـوێن دەدەم تۆ بەو خودایەی لەو سەرە　　بـێ بەهانەئـەو بـەهارە، هـەروەرە (۲۴۱)
ـهـاوین دا، وەرن وەختـی سـەمەر　　تـا ببەسـتم مـن لـەبۆ خزمـەت، کەمـەر (۲۴۲)
ـم و منـداڵان بکە، یەک یەکە، بانگ　　جـا دەدێمـان دا، بـژین سـێ چوارمانـگ[1] (۲۴۳)
ـوێ بـەهاران خـۆش دەکـا دێ،کردگـار　　پرگـوڵی نەسـرین و لالـەو، سـەوزەزار (۲۴۴)
ـوی شارسـتانی وەعـدەی پێـدەدا　　هەشـت سـاڵان تێپـەڕی لـەو وەعـدە،جا (۲۴۵)
ـکوت ئەو ساڵ بەساڵ، پێم بێژەکەی　　دەت هـەوێ بێی؟هـات ئـاخر مـانگی دەی[2] (۲۴۶)
ـدەکوت ئـەو سـاڵ هـات میوانمـان　　بۆیەئـەنجا مـن نـەدا، پـەیمانمان (۲۴۷)
ـکوسـاڵی دی نـەبێ بـۆم گـەورەکار　　دێـم لـەبۆ لای ئێوەئـەو دەم، هەربـەغار (۲۴۸)
ـدەکوت منـداڵی ئێمـەچاوەڕێن　　تاکومنـداڵانی تـۆ گشـت بێنـە، دێـن[3] (۲۴۹)
ـوکوو لەک لەک دەهات هەرساڵ ئەو　　مـاڵی کـابرای شـار،جێی بـووڕۆژو شـەو (۲۵۰)

---

۱- جا دەدێمان، خۆش بژین سێ چوار مانگ (مصرع دوم)
۲- پێیدەکوت ئەوساڵ بەساڵ پێم بێژەدەی　　کەی ئەتۆ دێی؟ هات ئاخر، مانگی دەی
۳- تاکو منداڵانی تۆ بۆ دێن بێن (مصرع دوم)

شارەیی خەرجی دەکرد، ماڵ زۆر لەبۆی — پێی نیشاندا بەخشیش و جوانمێری خۆی
ئاخرین جار ڕاس، سێ مانگی ڕەبەق — شارەیی بۆی دا دەنا سفرەو تەبەق
چون خەجاڵەت بوو کوتی ئەی سەر وەرم — تۆ فریوم بەس دە، ئەی تاجی سەرم
جوابی داوەجیسم و گیانم وەسڵ خواز — خۆ بەڵام تەقدیر بەدەستی چارەساز
چەشنی کەشتی و بادبانە، ئادەمی — خوابەڕێ کا(با) دەبێ کەی بێ دەمی؟
ئەو چەلەش سوێندی دەدا، تۆ ئەی کەریم — بێنەمندالان، ببینە، تۆ، نەعیم
دەستی گرت و سێ کەڕەت پێیکرد، عەهد — تۆخودا بۆ هاتنت، بت بێت، جەهد
پاش ئەوەی ساڵ، هەشت ودووکردیان گوزەر — پاشی وەعدەی زێدەخۆشی وەک شەکەر
جا بەبابیان کوت منال و ئێدەدیش — بوون موسافیر مانگ و هەورو سێبەریش
کاری زۆرت تۆ لەبۆ وی کردووە — ڕەنجی زۆرت تۆ لەبۆ وی بردووە
دەیهەوێ پاداش بدا چاکانی تۆ — هەر دەمێک دیتی لەوی میوانی تۆ
ئەو لەئێمەزۆرکەڕەت داوای دەکرد — تا کوڕازیت کەین لەبۆ دێ، وای دەکرد
پێیدەکوت وایە، بەڵام ئەی سێبویە — واجبەترسان لە( من احسنت الیە)
دۆستایی تۆوی زۆر بێ وەختەئەو — ڕەنگەفاسیدبێ، کەشین بێ، سەختەئەو
دۆستایێک چەشنی شیر دەبڕێ دڵان — یاوەکوو زستانەناهێڵێت گوڵان
نەوعەدۆستاییەک بەچەشنی نەو بەهار — چادەبێ لەو، حاسڵاتی بێ ژمار
خۆش بەحاڵی وەی کەگردی ئیحتیات — تا لەئا فات و بەدی خۆی دا نەجات
ئیحتیاتی سووئی زەن،نا ونا،ڕەسووڵ — هەرقەدەم،بابێ، لەلات یەک داو، قەبووڵ
چاو لەسەحرا چەن گوشادە، چەن بەرین — هەر قەدەم یەک داوە، بۆ توند لێخورین؟
بزنەکێوی غار دەدا، بێ باک لەداو — بێ خەبەر بوو کەوتەئەستۆی داو، بەتاو
ئەوکەسەی بێ باک لەداو بوو،چاو لەوی — نەیدەدی داو، دی فەقەت دەشت و زەوی
داووڕاوچی گەرنەبن ئەی هوشیار — چۆ ن دەبێ دووگە، لەنێوان سەوزەزار؟
ئەو کەسانەی عومری خۆیان کرد هەدەر — چاو لەئێسکی وان بکە، هەم کەللەسەر
گەر کوڕێگات تۆ دەگۆ رستان کەوێ — تۆ لەئێسکان وەزعی ڕابردووت بوێ[1]
تا ببینی ئاشکرا کوێرانی مەست — چۆن دەچاڵاوی غروور دا، بوون بەپەست
گەر دەبینی،تۆ مەڕۆ وەک کوێری مەست — گەرکونابینی، عەسایەک بگرەدەست

---

[1] - گەر لەنێو قەبران گەڕای ئەی موڕتەزا — تۆ لەئێسکانیان بپرسە، ما مەزا

عەسـایەی حـەزم وئیسـتیدلال،جا — گـەر کـو کـوێری بیکـەبۆخۆت پێشـەوا (٢٧٧)
حەزم و ئیسـتیدلال عەسـانە،گەر نـەبوون — ڕا مەوەسـتـەتۆ لـەڕێ، بـێ ڕێنمـوون (٢٧٨)
وەکـوو کـوێران لـەڕێگا دا بـڕۆ — تـا نـەجاتت بـێ لـەچاڵ و سـەگ ئـەتۆ (٢٧٩)
بەلەرزەلـەرزو تـرس و ئیحتیـات — دا دەنـێ پـێ، تـا لەبـەد، بـی بـێ، نـەجات (٢٨٠)
بەدووکـەڵ ڕا دەچـووی بۆنێـو نـار — لوقمـەخوازبووی بـووی بەلوقمـەی زاری مـار (٢٨١)

**ناسپاسی و ناشوکری کردنی ئەهلی سەبا، دە موقابیل نیعمەتی خودا..**

**خولاسەی داستان...**

موفەسسیران و مووەڕڕیخان نوسیویانە کە وڵاتی(سەبا) لەعەرەبستانی جنووبی غـەرقی نیعمـەت وپـڕ لەنیعمـەتی تـەبیعی بووەئـەو وڵاتـەپڕ لەنیعمەتەسەراسـەر سەرسەوزوشـاد و ئـاوەدان بـوو، وموسافیران نیازیان بەوەنەبوو کەتۆشەو ئازۆقەدەگەڵخۆیان هەڵگرن چونکەلەهـەموو جێگای ئـەو وڵاتەدا تەعام و تۆشەو ئازۆقەپەیدا دەبوو، خولاسـە، خـەڵکی وێ لـەو هـەموو نیعمەتانـەتێر و دڵ سـارد بـوون، وەکـوو قـەومی بـەنی ئیسـرائیل دەسـتیان کـرد بەناسپاسـی وناشـوکری کـردن ..چونکەئەوان دەیان ویست لەباتی ئەو هـەموو ئاوەدانی و نیعمـەتی زۆر، دەشـت و سـەحرایەکی چۆل و وشک و بێ ئاویان هەبێ، تا کو بەزەحمەت پێ ویستی ژیانیـان وەدەسـت بێنن، ودەگـەڵ سـەختی بـێ پایـانی بیابـان و سـەحرا ڕوو بـەڕوو بـن، لـەئاخردا ناسپاسـی وناشـوکری وان بەنەتیجەگەیشت وئێقـەی وانی گـرت وسـێڵاوێکی زۆر هـات و سـەددی مـەئاریبی وێـران کـرد وئەوانیشی بڵاو کرد ...

قیسـەی ئـەهلی سـەبات دیبـێ ئەگـەر — هەرلەئـەلفاز نـەک مـەعانیت کـرد نـەزەر (٢٨٢)
وەکـو لـەدەنگێکی کـەدێ ئاگانییـە — هۆشـی کێـو قـەت ڕێـی لـەبۆ مـەعنا نییـە (٢٨٣)
بێدەکـا بانـگ وسـەدا بـێ گـوێ وهـۆش — تۆ کەنەت بوودەنگ، ئەویش وەک‌تۆخـەمۆش (٢٨٤)
بۆ بەوان حـەق زێدەشادی و قـەلبی ساغ — زیـاد لەحـەددیش پێیـدەدان ئـەو،کاخ و بـاغ (٢٨٥)
شوکری نیعمـەتیان نـەکرد ئـەو ناکەسـان — بۆ وەفـا کەمتر لەسـەگ بـوون ئـەو خەسـان (٢٨٦)
نـان بەسـەگ بـدرێ لەهەردەرگایە،گـەر — ئـەو لـەبۆ خزمـەت دەبەسـتێتن کەمـەر (٢٨٧)
ئـەو لـەپێش دەرگـا دەبێتەپاسـەوان — زۆردەکـا ئـازار قـەبووڵ، وەک پاڵـەوان (٢٨٨)
ئەو لـەپێش دەرگـای دەبـێ دائـیم قـەرار — کفـرەلای وی غـەیری وێ، کـا، ئیختیـار (٢٨٩)
گـەر سـەگێکی دیکـەبۆ ئـەو دەرکـەبێ — دەیگـرێ ڕەنجـی دەدا هـەرجێ بـەجێ (٢٩٠)

تــۆ بــڕۆ بــۆ دەرکــی ئــەووەڵ منزڵــت[1] چونکەمەدیوونەبەئـــــەو دەرگـــــا دڵـــــت
دەیگرێـــــت و دەیگـــــەزێت و پێیـــــدەڵێ بــێوەفــا بــۆدە رکــی ئــە ووەڵ تــۆ هــەڵێ
تۆ لـە دەرکـی ئـەهلی دڵ ئـاوی حـەیات زێــدە خــواردت، چــاوەکانــت هەڵـدەهــات
سوکرو وەجدو چوون لەهۆشیت بۆ دەهات خــۆ لــەلای ســاحەبدڵانی خــۆش ســیفات
تــۆ لەبــــەرئاز، دەرکـــی وانـــت لادەنـــا خــۆت وەکــوو ورچــان لەهــەرجێ، دا دەنــا
تــۆ لــە بــۆ لای مــونعیمی خــۆراک چــەور توند دەڕۆی بۆ یەک تلّیت ، هەرچەشنی هەور
ئەو هە چەورە گەرکو گیان بێ بەو قەڵەو کــاری مەئیووســان بکــا محکــەم، پتــەو

## کۆبوونەوی نەخۆشان لە دەرکی سەومیعەی حەزرەتی عیسا(ع) بۆ تەڵەبی شەفا بە دوعای وی ...

ســەومیعــەی عیسـایە سـفرەی ئـەهلی دڵ تۆ نەکـەی ئـەی موبتـەلا، لـەو دەرکـە سـڵ
کۆدەبـوون لەوســەومیعەی وی زێدەخــەڵق کــوێرو ئیفلــیج وزەعیــف و ئــەهلی دەڵــق
کۆ دەبوون لای سەو میعەی وی سوبحەدەم تــا نــەجاتیان دا لــەدەردو غــەم، بــەدەم
هەر دەمێک دەیکرد دوعای خۆ ی ئەو تەواو چێشــــتانان ئـــــەو دەهاتـــــەدەر، بــــەتاو
جــا دەهــات دەیــدی نەخۆشــانی نــەزار بــوون لــەپێش دەرگا دەیـان کـرد ئینتیـزار
وایـدەکوت ئـەی دەردمەنـدان، لای خـودا یــەک بەیــەک کــاری هــەمووتان بــوو ڕەوا
ڕێکـــــەون لێکـــــڕا، بــــەبێ دەرد و بــــەلا ڕوو کەنـــــەغوفران و، ئیکرامـــــی خـــــودا
گشـــتیا ن وەک وشـــتران پـــێ بەســـتراو ڕایـــی باشـــت کردنـــی ئـــازاد تـــەواو
بــەو دوعــای عیســا نەخۆشــان شــادمان تونـد دەڕۆیشـتن لـەبۆ لای خـان و مـان
زۆرکـەڕەت کـردت لـەبۆ خـۆت ئیمتیحـان چــۆ ن لـــەپاکان هاتەدەســتی تــۆ ئــەمان
چـەن شـەلینـت چـاک و زۆر هـەموار بـوو چەنـــدەگیانت بـــێ غـــەم و ئـــازار بـــوو
تــۆ نیشــانێک دابنــێ ســەرلاق ودەســت ون نەکەی تا خۆت ئەی شەهوەت پەرەست
نــا سپاســی و ئــەو فــەرا مۆشــیەی هەتــە مەنعی کرد بیرکەی ئەلەو خۆشیەی هەتە
جـا بـەنا چـار ڕێـی وەهـات لـێ بەسـتەبوو چـون دڵـی ساحەب دڵـت لـێ خەسـتەبوو
زوو ئــــەوان پەیـــــدا و، ئیســـــتیغفاربکە چەشـنی هـەو ران شـین وگریـەو زار بکـە

---

[1]- تۆبڕۆ بۆجێو مەکانی ئەووەڵت (مصرع اول)

٢- تۆبڕۆ بۆجێو مەکانی ئەووەڵت (مصرع اول)

ـــ گوڵســـــتانیان لـــــەبۆتۆ وازبیـــــێ    میـــوەیی مـــەعنا لـــەبۆت، دڵخـــواز بیـــێ (٣١٣)

حـۆی سـەگی ئەسحابی کـەهفت گەرهەیـە    ڕووده‌وان کـــە، تـــا لەسەرتەن،ســـەرهەیە (٣١٤)

جـۆن سـەگانیش دائیمـەن پێکتـر دەڵـێن    هەرلـــەبۆ لای دەرکـــی ئـــەووەڵتان هـــەڵێن (٣١٥)

ـەرکـی ئـەووەڵ تـۆ کەئێسـکت لێخـووارد    بـەر مەدە،قـەت دڵ نەکـەی لەودەرکەسارد (٣١٦)

ـێگـەزن تـا ئـەو لەدەسـتی وان هـەڵێ    بـۆ نـەجات بـوون بچتـەدەرکی ئـەوو ەڵـێ (٣١٧)

ـێگـەزن سـەگ، تـۆ بـڕۆ تـاغی مەبـە    لـەو وەلـی نیعمـــەت ئـــەتۆ یـــاغی مەبـــە (٣١٨)

جەتـنی حەڵقـە، تـۆ لەبـەر دەر، بەسـتەبە    پاســـەوان و چـــابوک و بـــەر جەســـتەبە (٣١٩)

ـێ وەفـای ئێمەسـەگان، نـابوود مەکـە    بێ وەفـایی بـەس،وەفاش بێ سـوود مەکـە (٣٢٠)

جـۆن وەفـا بۆسـەگ بـەدائیم بـۆ شـیعار    بـۆ سـەگان تـۆ هـیچ مەهێنەنـەنگ و عـار (٣٢١)

ـێ وەفـایی بـۆ سـەگان، چـون نـەنگ و عار    چـۆن دەکـەی تـۆ، بـێ وەفـایی ئاشـکار؟ (٣٢٢)

حـ وەفای خۆی فەخری خۆی ئەو نێو دەنا    چـــاو لـــە(مـــن اوفـــی بعهـــد غیرنـــا ) (٣٢٣)

ـێ وەفـایی بـوو وەفـا گـەڵ زیـددی حـق    چـون حـەقی حـەق، نـاکرێتن لـەو سـەبەق (٣٢٤)

حەققی دایکیش، پاشەوی بوو، چـون ئیلاە    لـەو جـەنینی تـۆی، دەکـرد ئـەو وام خـواە (٣٢٥)

ـۆی موسـەووەرکرد دەویـدا خـوای قـەدیر    وەختـی حـەملیش سەبروخووی دابێ نـەزیر (٣٢٦)

ـەتۆی وەک جوزئی خۆی دی، نەک جودا    گەرجودا بووی وای دەویست حـوکمی خـودا (٣٢٧)

جێ دەکردحەق فەنن وفووت چەندین هـەزار    تـا دەد ڵ داک،حـوببی تـۆ بگـرێ قـەرار (٣٢٨)

حەققی دایکان پاش حەقی خوای لـەو سـەرە    هەرکەســـێ ئەوهـــەی نـــەزانێ زۆرکـــەرە (٣٢٩)

حـبوو چـاکی کـرد دایـک و مـەمک وشیر    کردیەدۆسـتی بـاب، نـەک تـۆی وا فـەقیر (٣٣٠)

ـنت ئیحسان هەر لەتۆن ئەی گیان پەنا    گشــت لەتۆنەهـــەرچی زانـــیم یـــا نـــە، نـــا (٣٣١)

ـت دەفـەرموو ئێمەحـەققت یـاد بکـەین    حـەققی مـن کـۆن نابێ ناچێ قـەت لەبـەین (٣٣٢)

ـــەبیرت لـوتفی کـردم ئـەو سـەبووح    چۆن دەبوون مەحفووزلەنێو ئەوکەشتی نووح (٣٣٣)

ـــب و بـــاپیرانی ئێوەئـــەو زەمـــان    چـۆن لـەدەس تۆفـان و ئـەمواج دام ئـەمان (٣٣٤)

ـۆی پـڕ جـۆش گرتبـووی پـاکی زەوی    کێو لەحاستی مـەوجی ئـەو ئاو، سـەرنەوی (٣٣٥)

حیفـزی ئێـوەم کـرد نـەم کـرد ڕەددتـان    نێو وجوودی جـەد دی جـەد دی جـەددتان (٣٣٦)

ـ کـەبووی سـەر، چـۆن ئـەتۆ لابـەم ئـەمن    کارگـای خـۆم تێـک بـدەم ئـەو دەم ئـەمن (٣٣٧)

جـۆن دەبـی بـۆ بـێ وەفایـان تـۆ فیـدا؟    چـۆن بـەزەنتی بـەد بـەجێ دیڵـی خـودا (٣٣٨)

ـــتیباەو بـــێ وەفـــائیم لا، نییـــە    بێـــرەلای مـــن، بـــەدگومانی چـــا نییـــە (٣٣٩)

بـــەدگومانی تـــۆ لەجێیـــەک بێنـــەکار ... گەر دەکەی خۆت بۆ کەسێک دوولاووخوار -٤٠)
زێـدەگرتت یـارو هـاوڕێ ئـەی جـەوان ... گـەر بلـەم کـوان؟ تـۆ دەڵـەی ڕۆیـین ئـەوان -٤١)
یـاری باشـت ئاسـمانان جێـی ئـەوی ... جێـی و مـەکانی یـاری بـەدکار بـن زەوی -٤٢)
بێ مـەدەد تـەنها دەمـای تـۆ بـێ گومـان ... هـەر وەکوئـا گـر لەپاشـی کـاروان -٤٣)
بگرەداوێنـی کەسـێک تـۆ ئـەی دلێـر ... گـەر کـو خـاوێن بـێ لـەبالاّ هـەم لـەژێر -٤٤)
نـەک وەکووعیسـا دەچووبـۆ سـەر سـەما ... نـەک وەکووقـارووون لـەژێر عـەردی دەمـا -٤٥)
بێ مـەکان و بامـەکان بـی ئـەو لـەلات ... گـەر جـودا بـی تـۆ لـەماڵ و کارگـات -٤٦)
کـاری ناپاکـان دەگـۆڕێ بۆسـەفا ... زوڵـم و زۆری تـۆ دەگـۆڕێ بـۆ وەفـا -٤٧)
گەرجەفاکـەی ئـەو دەکا تۆ، مشت و ماڵ ... تـا لەنوقسـان تـۆ بـڕۆێ بـۆ لای کـەماڵ -٤٨)
گەر دوعایـەک تۆ ڕەهاکـەی ئـەی جـەناب ... دێ لـەبۆتۆ دەردو ڕەنـج و ئیزتیـڕاب[1] -٤٩)
ئیزتیـڕاب تەئدیبـەیـەعنی وا مەکـە[2] ... هـیچ لەعەهـدی کۆنـە، تـەغییر، چـا مەکـە -٥٠)
پـێش ئـەوەی کـە، ئیزتیـراب زەنجیـر بـێ ... بەنـدی قەلبـەپێش ئـەوی بـێ بەنـدی پـێ -٥١)
ڕەنجی مەعقوولت دەبێ مەحسووس و فاش ... تـۆ نەکـەی ئـازاری وا بگـری بـەلاش -٥٢)
ئیزتیـراب بـۆ بەنـدی دڵ، بـۆ بـەد عەمـەل ... ئیزتیـراب زەنجیـر بـوو خـۆ پـاش عـەجـەل -٥٣)
هەرکەسـێکی دوور لـەزیکری مـن بـژی ... لێـی دەسـێنم چـاو، دەیـدەم بـەو، دژی -٥٤)
دز کـەهات مـاڵی کەسـێکی بـردو ڕۆی ... ئیزتیـراب دێنێـت دڵتـەنگی لـەبۆی -٥٥)
جـا دەڵـی مـن ئیزتیـرابم چـۆن دەهـات؟ ... ئیزتیرابـی شەخسـی لێقـەوماوە، لات -٥٦)
گـەر نـەکا بـەو ئیزتیرابـەئیلتیفات ... بـایی ئیسـڕاڕ، ئـاگری وی خـۆ ش دەکـات -٥٧)
ئیزتیـراب بـاعیس بـوو ئـەوبوو دەسـتگیر ... نادیـاران ئاشـکرابوون لـەو ئەسـیر -٥٨)
بـۆ گوناهکـاران، غـەم، بەنـد و بـەلا ... ڕیشـەیە، غـەم، چادەکـا میوەوگـەلا -٥٩)
ڕیشـەپنهان بـوو، دەبـێ زاهیـر لەعـەرد ... قەبز و بەستیش ڕیشەنە،ئەی ڕەند و مەرد -٦٠)
ڕیشـەبەدبێ،عاقڵان زوو لێـی دەدەن ... تا دڕووی لێ شین نەبێ قەت قەت چەمەن -٦١)
ئیزتیرابـت چارەکـە، هـەت بـێ ئەگـەر ... چونکەدیارەسـەر لـەبن ڕا دێتـەدەر -٦٢)
ئـاو دە، ئـەو شـادیەی کـەتۆ دیتـت لـەخۆ ... میوەکـەی ویـش تـۆ بدەدۆسـتا ن بـڕۆ -٦٣)

---

[1]- گەر دوعایێکی تەریقەت کەی ڕەها ... دێ لەبۆتۆ دەرد و ڕەنج و زۆربەلا
[2]- دەردو ڕەنج تەئدیبەیەعنی وا مەکە(مصرع اول)

## پاشماوەی داستانی ئەهلی سەبا..

بوون هەوەسباز،خەڵکی نێو شاری سەبا ناسپاس بۆ، هەرچی چاکەی کردبا (٣٦٤)
ناسپاسی وا دەکوترێ بۆ میسال تۆ دەگەڵ مونعیم بکەی جەنگ وجیدال (٣٦٥)
نامهەوێ چاکەی وەها ئەی یاری من من دەڕەنج دام، بۆ دەدەی ئازاری من؟ (٣٦٦)
تۆ بەلوتفت، لوتفی وام لێ دووربکە نام هەوێ چاو، چاوەکەم بێ نووربکە (٣٦٧)
خەڵکی کوتیان لێکمان تۆ دوور بکە ژینی خۆشمان زووکە، تاڵ و زوور بکە (٣٦٨)
نانهەویتن ئێمەهیچ ئەو کاخ و باغ یاژنانی باش دەگەڵ ئەمن و فەراغ (٣٦٩)
شار کەلێک نیزیک ببن لامان بەدە خۆشەسەحرایەک کەوەحشی بێ حەدە (٣٧٠)
کاتی هاوین دەیهەوێ زستان بەشەر نا ڕەزا شە،گەر کو زستان هاتەدەر (٣٧١)
ئەو ڕەزای نابێ بەهیچ حاڵ و زەمان هەم بەناخۆشی، ویاخۆشی و ئەمان (٣٧٢)
بمرێ ئینسان، چەندەزۆربوو ناسپاس هەرکەگەییەنیعمەت ئەوبووحەق نەناس (٣٧٣)
نەفس وایە، بۆیەدەیکوت وا بەوی ( اقتلوا انفسكم ) مووسا نەبی (٣٧٤)
ئەو درووی سێ سووچەهەرجوور دای بنێی چادەکا زەخم،کوا دەشێی تۆ، لای بنێی (٣٧٥)
ئاگری تەرکی هەوا، تۆ بەردەخار بگرەداوێنی کەسێک، پەرهیزکار (٣٧٦)
ناسپاس بوون زیادلەحەد ئەهلی سەبا خۆشترەلامان وەبا، لەو بای سەبا (٣٧٧)
ناسیحان کوتیان بەوان زۆر بێ قسوور بەس ئەسیر کەن خۆ لەبۆ فیسق و فجوور (٣٧٨)
ناسیحانیان ویست بکووژن گشتیان تۆوی کفرێ تاکو شین بێ، ڕشتیان (٣٧٩)
گەر قەزابێ، ئەو جیهانەتەنگ و تار لای قەزا هەڵوا دەدا ئازا ر، زار (٣٨٠)
گەر قەزابێ تەنگ دەبێ، بێ شک فەزا کوێر دەبن چاوان، ئەگەر بێتن قەزا (٣٨١)
گەر قەزا هات چاو نابینێ شتێ تا کونابینێت چاو، کل، هەر پتێ (٣٨٢)
فێڵی ئەو سوارەی کەتۆز پەیدا دەکا تۆ لەکۆ مەک دوورو، زۆر ڕیسوا دەکا (٣٨٣)
تۆ لەبۆ لای سوار بڕۆ نەک لای غوبار تۆ دەنا ڕیسوا دەکا فێڵی سووار (٣٨٤)
خوا کوتی گورگی قەزا هەرچی دەبرد تۆزی گورگی دی، لەبۆ زاری نەکرد (٣٨٥)
نەی دەناسی تۆزی گورگی، ئەو ئەگەر بۆلەوەڕ، بۆ گیانی خۆیدا ئەو هەدەر؟ (٣٨٦)
مەڕ کەبۆنی گورگی بۆدێ، جێ بەجێ تێدەگا ئەو دەم لەبۆ هەر لا دەچێ (٣٨٧)
مەغزی حەیوان بۆنی شێری بێ لەبۆی جێ دەهێڵێ ئەو لەوەڕگەوێ جێی خۆی (٣٨٨)
بەد مەکەتۆ، بۆنی شێر هات بۆت، ئەگەر بگرەباوەش تۆ،مو ناجات و حەزەر (٣٨٩)

ئـەو گـروو هـەتۆزی گورگیـان دی بـەعام    چا نەبوون پاش تۆز، هات گورگێک زەلام
زۆر بـەرق هـات گورگ،مـەرانی هەڵـدڕی    چـون لەشـوانی عـەقڵ، خۆیـان هـەڵبڕی
بـانگی کـردن شوان ئەوان خـۆ زێـدە جـار    کردیانـــــەچاوی ئـــــەو شـــــوانەغوبار
تـــۆبڕۆ لامـــان لـــەتۆ، زۆر شـــوانترین    چۆن دەبین تابیع بـەتۆ؟، گشت سەروەرین
گـــورگ بـــابخوات، ئەمـــەبۆی یـــارنین    بـا بسـووتێین، تـابیعی هـیچ عـار نـین
چـون غـروور و کیبریـان بـوو، قوڕدەمـاغ    بۆیەوێرانگـەی ئـەوان، لێـی خوێنـد، زاغ
بـۆ هـەموو مـەزڵووم، هـەڵیان قەنـد چـاه    کەوتنـەچاڵ خۆیـان، دەیـان کـوت ئـا ەئـاه
هـەرچی یوسوف بوو،دەگەڵیان کرد بـەدی    جـا جـەزای ئـەعمالی خۆیـان گشـت دەدی
کێیەیوسوف؟ئەو دڵـەی حـەق خـوازی تـۆ    دەسـت بەسـتە، ئـەو لـەجێگای ڕازی تـۆ
یەکستوون دەتبەست لەوی یەکجەبرەئیل    تـۆ بـەزەخمی بـاڵ و پـەڕکردت زەلیـل
جـار لـەپێش وی گـوێلکی بریـان دا دەنێـی    جـار لـەکا دێن،تـۆ لـەپێش وی، کـا، دەنێـی
تۆ بخـۆ چـون غـەیری ئـەو هـەن، لا نییـە    قـووتی ڕووح غـەیری لیقـائی خـوا نییـە
لـەو شـکەنجەو ئیمتیحـان ئـەو موبتـەلا    لێـت دەکـاتن ئـەو شـکایەت لای خـودا
ئـەی خودایـەداد لـەدەس ئـەوگورگی پیـر    حەوسەلەت بێ خوا دەڵێ دەیکەم ئەسیر
مـن حـەقت دەگـرم لەهـەرچی بێ خەبـەر    کـێ دەدا حـەق غـەیری زاتـی دادگـەر؟
ڕووح دەڵـێ سـەبرم نـەما، لـێم بـوو فـەنا    چـــون لـــەتۆ دوورم گـــەلێک ( یاڕبنـــا )
ئەحمـــەدم مـــن وا،گرفتـــاری یـــەهوود    سـالحم کـەو تـوو مەزینـدانی سـەموود
ئـەی سـەعادەت بەخشی پاکان لەو سەرە    یانـــەبم، یـــا بمبـــەلای خـــۆت، یـــا وەرە
کـافریش بـۆهیجری تـۆ نیتـی چ تـاب    جـــا دەڵـــێ،(یـــالیتنی کنـــت تـــراب )
وایـەحاڵی ئـەو کەسـەی لێـت بـوو جـودا    چۆنـەحاڵی وەسـڵ خـوازت ئـەی خـودا
حەق دەڵێ بەو ڕاس دەکەی ئەی ڕووحی پاک    گوێ دەمـن سـەبرت بێ،چـون سـەبرەچاک
سـوبح نیزیکـەو خـەمۆش بەو،کـەم فیغـان    مـن دەکۆشـم بـۆت، مەکۆشـە، تـۆ، چ ئـان

### پاشماوەی ڕۆیشتنی کابرای شارەیی بە دەعوەتی کابرای دێهاتی بۆ لای دێ...

ئەوهـە بەسسـە، بـا بـزانین ئـەی هـەواڵ    پیـــاوی دێ، ئـــەویاری شـــاری بردەمـــاڵ
قیسســـەیی خـــەڵکی ســـەبا، دانـــێ لـــەوێ    پـــێم بڵـــێ تـــۆ شـــارەیی چـــۆن هاتـــەدێ؟
بـۆ ڕییـا زۆر چـاکی کـار کـرد پیـاوی دێ    حـەزمی پیـاوی شـارەیی بـرد جـێ بـەجێ

...ـەیامی دوای پەیام بۆ یاری شار — حەزمی یاری شار لێڵ بوو، بوو بەتا ر (٤١٥)
...دیانکوت یەک بەدووی یەک دا منداڵ — ( نرتع و نلعب ) بەشادی و خۆشحاڵ (٤١٦)
چەشنی یوسو ف چی بەسەر هات ئەو، چ جوور — ( نرتع و نلعب ) لەبابی کرد دوور (٤١٧)
...ـەبازی بەڵکەئەو گیان بازیە — فێڵەبازی ومەکرو نەیرەنگ سازییە (٤١٨)
...ـەرچی ویستی تۆ لەبابت دوورکەوی — لێی مەبیسە، چون زیانت دێ لەوی (٤١٩)
...کوو سوودت هەبێ چەندین هەزار — جێی مەهێڵەتۆ لەبۆ زێر، گەنج دار (٤٢٠)
...ـێت لەمن بێ چەن خودا لۆمەی دەنارد — چۆن بەئەسحابی نەبی کوت گەرم و سارد (٤٢١)
جـ... لەساڵی قات، کەهات دەنگی دەهۆڵ — جومعەیان جێ هێشت و مەسجید بوو بە چۆڵ (٤٢٢)
...ـەبادا خەڵکی دی هەرزان بیەن — هیچ نەمێنێ بۆمە، ئێمەش وا ڕەبەن (٤٢٣)
...بەتەنها ئەحمەدی موختار و بەس — یاری وی تەنها دەمان سێ چوار کەس (٤٢٤)
...کوتی گەر تەپڵی مالیان لێدەدا — چاو چلۆن جێتان دەهێشت یاری خودا (٤٢٥)
...ـوون پەشۆکاو،بۆ ئەوەی گەنمو هەبێ — جێودەهێشت ئەحمەدلەسەر هەردووک پێ (٤٢٦)
... ئەوی تا هەر کەمێک گەنمو دەنێ — ئێوەجێتان هێشت ڕەسولی خوا، تەنێ (٤٢٧)
...ـحبەتی وی چاکترەتا، لەهوو،ماڵ — چاو هەڵێنەکێت بەجێ هێشت، ئەی هەواڵ (٤٢٨)
...ـی ئێوەنەدیدەهێشت لێو بێ یەقین — بەس منم ڕەززاق و خەیرڕرازیقین (٤٢٩)
...کەسەی ئاوێ بەگەنمان وا دەدا — چۆن ئومێدی ئێوەئەو بەر با، دەدا؟ (٤٣٠)
...ـەبۆ گەنمی لەوی خۆت کرد جودا — خۆ لەئاسمان بۆت دەنێرێ، ئەو، خودا (٤٣١)

**دەعوەت کردنی باز مراویان کە لە نێو ئاو بێنە دەر بۆ سەحرا...**

...بەبەت،کوت باز، لەئاو تۆ، بێرەدەر — تا ببینی وەک بەهەشت تۆ، دەشت و دەر (٤٣٢)
...ـتی عاقڵ وای بەباز کوت، لێم بە، دوور — ئا و لەبۆمن جێگەئەمن و جێی سروور (٤٣٣)
جەشنی باز دێو هات، کەئەی بەتتان، بەتاو — گوێ مەدەن بەو، جێ مەهێڵن ئێوەئاو (٤٣٤)
... دڵێن بەتتان بەباز، لامان بڕۆ — لێن گەرێ تۆ ڕاس بڕۆ جێگایی خۆ (٤٣٥)
...ـعوەتی تۆن ئێمەناوێ خۆ چ کات — دەعوەتی خۆت با ببێ، هەرخۆت لەلات (٤٣٦)
...ـعەبۆمە، قەند و قەندستان لەبۆت — هەدیەکانت، نان هەوێن،تۆ بگرەخۆت (٤٣٧)
...کو گیان بێ، قووت نابێ خۆ، چ کەم — تاکو لەشکر بێت، نا بێ کەم، عەلەم (٤٣٨)
...ـبەهانەو عوزری هینا یاری شار — زۆربەهانەی کوت لەبۆ شەیتانی هار (٤٣٩)

پێیــدەکوت وا، زێــدە کــارم هــەن مــوهیم   گـەر کـو بـێم، نـابن ئـەوان، قـەت موتتـەزیم (۴۴۰

دای بـەمن کارێـک دەقیق،شـاو، دەیهـەوێ   شــا، بــەئینتیزاری مـــن نـــانوێ شــەوێ (۴۴۱

نــاتوانم تــەرکی ئــەمری شــا، بکــەم   خــۆم لــەلای شـا، نامــەوێ ڕیســوا بکــەم (۴۴۲

هەرسـەباح و هەرمەسـا، مـەئمووری خـاس   دێ دەکــا داوا لــەمن،کار کــەم خــەڵاس (۴۴۳

دەت هــەوێ بـێم، ئێسـتەمن بـۆ لایـی دێ   تــا لــەداخم شــا برۆیــان تێــک بنــێ؟ (۴۴۴

جـا چلـۆن دەرمـانی خەشـمی شـا، بکـەم؟   یانەزینــدە،گۆڕ لــەبۆ خــۆم چــا، بکــەم (۴۴۵

ســەد بەهانــەی وای دەهینــا یــاری شـار   جــووت نــەبوون فــێڵان و حــوکمی کردگـار (۴۴۶

گـــەر بـــبن زەڕراتـــی عالـــەم حیلەگـــەر   لای قـەزای ئاسـمان هـیچن، بـێ هـو نـەر[1] (۴۴۷

چــۆن لــەدەس ئاســمان هەڵــدێتن زەوی؟   چــۆن دەکــا خــۆی نادیــارو، ون، لــەوی؟ (۴۴۸

هەرشـــتێکی بـــێ لەئاســـمان بـــۆزەوی   نـاعیلاج زوو سـەر دەکـا، بـۆ وی، نـەوی (۴۴۹

گــەر برێــژێ ئــاگری ســەر وی، هــەتاو   بــۆ هــەتاو تەسـلیم دەبێـتن، ئـەو بـەتاو (۴۵۰

گــەر کــو ســێڵاو بێتەســەر پــاکی زەوی   تێــک بــداو، وێــران بکــا شــارانی وی (۴۵۱

ئــەو دەبــێ تەســلیمی ئــاو، ئــەیبو ب وار   مــن ئەسـیرم هــەرچی ویسـتت، بێنـەخوار (۴۵۲

تــۆ کــەجوزئی ئــەو زەمینــەی، لامــەدە   حوکمی یـەزدان هات ئەگەر، خۆت بامەدە (۴۵۳

چونکـەچاکی کـرد لـەخاک، تـۆ کردگـار   دەیهەوێ تۆش چەشنی خاک بی، خاکسار (۴۵۴

چـاو کەچانـدم دەنکـەتۆوێک مـن لەعــەرز   تـۆزو خـۆڵی تـۆ، ئـەمن تـۆم کـرد بـەرز (۴۵۵

جارەکی دیش خۆت وەکوو خۆڵ بگرەکەم   تـا لەسـەر میـران بـەعام تـۆ، میـر بکـەم (۴۵۶

چاو لەسـەر ڕا چـۆن لـەبۆ خـوار دێـت ئاو   جـا لـەخوار ڕا دێ لـەبۆ سـەر، زۆر بـەتاو (۴۵۷

چــاو لەگــەنمی چــۆن لــەبالا هاتەئــەرز   جا لەپاشان بـوو بەخۆشـەی جـوان و بـەرز (۴۵۸

دەنکــی هــەرمیوێک کەدێتــەنێو زەمــین   دێتەدەر پاشان لەخاک سەر سەو زو شین (۴۵۹

هـەرچی نیعمـەت بێ لەئاسـمان دێتـەخاک   جــا دەبــێ پاشــان غــەزا بۆگیــانی پــاک (۴۶۰

چـون هـەموو نیعمـەت لـەژوور ڕا هاتنـەژێر   بــوون بــەجوزئی ئــادەمی زینــدەو دلێــر (۴۶۱

بـۆ سـیفاتی ئـادەمی جـا، ئـەو جـەماد   ئـەو لەسـەر عەرشـی دەکـا پـەرواز شـاد (۴۶۲

جـێن جیهـانی زینـدە بـوو، هاتینـە خـوار   ڕووبەرەوژوور،ئەوچەلەش‌چووین،هەربەغار (۴۶۳

گشتی زەڕڕات هـەم لەسەیرو هـەم سکوون   وا دەڵـــــێن ( انــــــا الیـــــــەراجعون ) (۴۶۴

زیکـــرو تەســـبیحاتی ئـــەجزایی نیهـــان   زەمزەمـــەو غـــەو غـــایی خستەئاســـمان (۴۶۵

---

[1] - لای قەزای ئاسمان هیچن، بێ سەمەر (مصرع دوم)

گەر قەزا بێ، مەکرو فێڵ بێنێ بەکار     یەک دێهاتی مات دەکا، یەک یا ڕێ شار (۴۶۶)
ـەری شار بەو حەزمی زۆر،چاو، مات بوو     ئەو سەفەر بۆی، جێی گەلێک ئافات بوو (۴۶۷)
ئەو بەسابیت بوونی خۆی کرد ئیعتیماد     هات کەمێک سێڵاو،نەی هێشت لەو، چ یاد (۴۶۸)
گەر وەدەرنێ سەر، قەزا، لای بەحر و بەڕ     عاقڵ و زانا دەبن گشت کوێرو کەڕ (۴۶۹)
ـێتەدەر ماسی بەبێ عیللەت لەئاو     تەیری زیرەک دێ دەبێ یەخسیری داو (۴۷۰)
ـێ پەری و دێو، دێنەنێو شووشەی بەتاڵ     یانەهاڕووت دێ، لەبابیل دەچتەچاڵ (۴۷۱)
هەرچی بۆ تیغی قەزا، داینا سەری     نەحس، کەم ناکا، لەداری وی، بەری (۴۷۲)
تەیری چوون بۆ لای قەزا، ئەی خۆش سیفات     قەت، چ فێڵ و حیلەنادەن تۆ نەجات (۴۷۳)

**داستانی ئەهلی زەڕوان و فێڵ کردنی وان تا بە دوور لە وجوودی دەروێشان میوەی باغەکانیان لێوەکەن...**

خوێندبێتت باسی زەڕوانیان ئەگەر     چۆن دەبێ تۆ فێڵەبازو حیلەگەر؟ (۴۷۴)
جەن نەفەر ئازار دەهەندەی بێ ئەمان     ویستیان ببڕن لەچەن دەر وێش نان (۴۷۵)
فکرو بیریان بوو ئەوە، شەو تا سەحەر     ڕوو بەڕووی یێک دابنیشن، چەن نەفەر (۴۷۶)
ـری خۆیان کوت بەسرتە،تا نەوەک     تێبگا حەق هەرچی دەیڵێن یەک بەیەک (۴۷۷)
دەیهەویست فێڵ کا لەحەق چاکراولەگڵ[1]     چۆن دەکا کارێک دەس، ون بێ، لەدڵ؟ (۴۷۸)
ـێ خەبەر بووخوا، مەگەر لەو ( من خلق )؟     نەیدەزانی سرتەسیدقەیا مەلەق؟ (۴۷۹)
چۆن دەبێ غافڵ لەوەی دەڕوا سبەی؟     ئەو خودایەی بوو بەجێی،ئاگا سبەی (۴۸۰)
ـجتەهەر جێ، جا سەروو بێ یانەخوار     ئاشکرایەکاری وی بۆ کردگار (۴۸۱)
ـوێت لەغەفڵەت ئێستەزووکە، پاک ئەتۆ     تابیبی ناڵەیی غەمناک ئەتۆ (۴۸۲)
ـبزانەتۆ بەغەمگین دات زەکات     گوێ بدەی گەر بەو قسانەی ئەو دەکات (۴۸۳)
گوێ دەغەمگینان کەکوتیان دەردی دڵ     ئیحتیاجی گیان، سەبەب بوو ئاوو گڵ (۴۸۴)
ـەکەی گیان پڕ لەدوودو پڕ فەنە     تۆ بەگوێ دان، بۆی وەکە، یەک ڕەوزەنە (۴۸۵)
ـوێ بەپاکان گەر بدەی تۆ ئەی هەواڵ     کەم لەماڵی گیان دەمێنێ دوودی تاڵ (۴۸۶)

---

[1]- دەیهەویست فێڵ کا لەحەق، مەخلووق، لەگڵ (مصرع اول)

(٤٠٧ تــۆ لەگــەڵمان ئــەی ڕەوی، بەغەمگوســار ... دەت هــەوێ گــەر تــۆ بچــی لای کردگــار
(٤٠٨ دوو دڵــی خــۆ حــەپس و زیندانــەلــەبۆی ... نــا یــەڵێ گیــان بچتــەجێی دڵخــوازی خــۆی
(٤٠٩ هــەر یەکــەی دەی وێ بچــێ بــۆ لای وی ... ڕێتمــوونی چەشــنی مــن، نەیــدی زەوی
(٤١٠ دوو دڵــی خــۆ گەردەنــەی ڕێگــای خــودا ... خــۆ ش بــەحاڵی وەی کــەپێی ئــازاد کــرا
(٤١١ ئــەو کەســەی دوو دڵ نییــەزۆر ڕاســتەڕێی ... ڕێ کەنازانی،تەڵـــەب کـــەجێی پێـــی
(٤١٢ شــوێنی ئــاهوو هــەلگرە، ڕاحــەت بــڕۆ ... تــا لــەجێی پێــی، نــاف دێتــی دەســتی خــۆ
(٤١٣ ئــەوجی ڕوونــت جێگەیە،گــەر وا بــڕۆی ... ئــەی برادەر،گــەر بەســەر نــار، دا بــڕۆی
(٤١٤ هیچ مەترسێ جا لـەدەریاو مەو ج و کەف ... چونکەبیســتت تــۆ خیتــابی ( لا تخــف )
(٤١٥ (لا تخـف ) بـێ لات،کەخـەوفی دایی،حـەق ... نــان دەنێــرێ ئەوکەســەی نــاردی تەبــەق
(٤١٦ ئـەو هەترسا گـەر لەحـەق ترسـی نـەبوو ... غەم لەبۆ ئەوکەس، لەڕێی حەق، دا نەچوو

**چوونی کابرای شاری بۆ دێ...**

(٤١٧ یاری شار، بۆ قەستی دێ، تۆ شەی کڕی ... تــەیری عــەزمی وی لــەبۆ لای دێ، فــڕی
(٤١٨ بــوون مــو هــەییا خانــەوادە، زۆر بەبــەزم ... بــاری خۆیــان دا دەنــا، ســەرگایی عــەزم
(٤١٨ شـــادمان و خۆشـــحال زۆر، چوونـــەڕێ ... جا دەخۆین میوەی گەلێک شیرین لەدێ
(٤٢٠ لــەو لەوەڕگــە، هــەرچی دڵ بیــوێ، هەشــە ... دۆستەکەشــمان زۆر کــەریم و دڵکەشـــە
(٤٢١ زۆر بـــەهیوا، هـــات ئێمـــەی گـــازکرد ... دەرکــی گــەنجی بەخششــی بــۆن، وازکــرد
(٤٢٢ ڕزقـــی دەە ســـالان لـــەدێ دێنینەشـــار ... چونکـــەخۆی پێمـــان دەدا، دێرینـــەیار
(٤٢٣ بەڵکەڕەنگــەباغ بکــا بــۆ مــان نیســار ... تــا لــەنێو دڵمــان بــدا ئــەوخۆی قــەر ار
(٤٢٤ یــاری شــار دەیکــوت کــەزوو بــن( تربحــوا) ... عقــڵ، پنهــان پێیکــوتن (لا تفرحــوا )
(٤٢٥ ســوودی خوا،بــا، ئێوەکــاتن خۆشــحاڵ ... چون (فەریح) لای خوا، گەلێک بوو گۆشت تاڵ
(٤٢٦ شاد ببن کەم، حـەق کەپێیـدان نیعمـەتێ ... زۆر لەنیعمــەت هــەن کــەدێنن غەفڵــەتێ
(٤٢٧ شــادمان بــە، بــەس بــەزاتی ســەرمەدی ... ئــەو بــەهارە، مــانگی دەینــە، ئیــدەدی
(٤٢٨ هــەرچی غــەیری وی بــێ، ئیستیدڕاجی تــۆ ... گــەرچی تــەخت و مــوڵکی تــۆ یاتــاجی تــۆ
(٤٢٩ شــا د بەغــەم بــە، چونکەغــەم مایــەی لیقا ... غــەم لــەڕێی حــەق، باعیســەبۆ ئیرتیقــا
(٤٣٠ غەم وەکووگەنج، ڕەنجی تۆش بوو،چەشنی کان ... خــۆ منــاڵ نــادا بەوەی،قــەت گوێــەکان
(٤٣١ گـــەرمنالان بیســـتییان نێـــوی قومـــار ... حــازرن گــەڵ گۆڕەخــەر، هــەڵبێن بــەغار
(٤٣٢ ئـەی کـەرانی کوێر، لەلایـەک، دام هــەن ... نێــو کــەمینیش زێــدەخوێن ئاشــام هــەن

تیـر گـەلێک زۆر دێـن، کـەوانیش نادیـار — تیـری پیـری بـۆ جـەوانی دێـن هـەزار (٥١٣)

...خۆشـی لـەبۆ سـەحرایـی دڵ — ڕاحـەتی چـون لا نییـە، سـەحرایی گـڵ (٥١٤)

...ـەن و ئابـادە، دڵ، ئـەی دۆ سـتان — پـڕ گـوڵ و گـوڵزارو کـانی و، بۆسـتان (٥١٥)

...ـەبۆ لای دڵ بـڕۆ ئـەی سـارییە — زۆردەوێ دان، دارو کـانی جارییـە (٥١٦)

...ـەڕۆ دێ، دێ کـەپیاو ئەحمـەق دەکـا — عـەقڵی وی، بـێ نـوورو بـێ ڕەونـەق دەکـا (٥١٧)

...ی پێغەمبـەر ئـەتۆ چـاک بگرەگـوێ — گـۆڕی عەقڵەگـەرکو ژینـت بـێ لـەدێ (٥١٨)

...کەسێکی بێ لـەدێ یـەک ڕۆژو شـەو — تـاکو یـەک مانـگ، ناقیسـەخۆ عـەقڵی ئـەو (٥١٩)

...یـەک مانگ ئەحمـەقی بـۆی یاردەبێ — غەیری ئەوهە،چی لەگیای دێ، دیار دەبێ؟ (٥٢٠)

...کەسـەی یێک مانـگ لـەنێو دێ دا دەما — ڕۆژگارێـک سـەهمی وی جـەهل و عـەما (٥٢١)

...ـەدێم بـوو، شـێخی ناواسـڵ، مـەرام — ئـەو دەکـا تەقلیـد لەگوفتاروکـەلام (٥٢٢)

...حەواس لای شاری عەقڵی،ئەی جـەوان — وەک کـەری چـاو بەسـتەیی بـەرداش وان (٥٢٣)

...ـەس بێ ئـەو هـە، بگرەداسـتان زاهیـری — دەنکـی گـەنمی بگـرە، بێڵەگـەو هـەری (٥٢٤)

...بـوو، تـۆ، دوڕ،کـەبۆت پەیـدا نییـە — بگرەزاهیـر، ڕێـت لـەبۆ مـەعنا نییـە (٥٢٥)

...ـەداسـتانت مـەرام بـێ زاهیـری — دێ وەدەس، بـاتین لـەزاهیر، ئـاخیری (٥٢٦)

...ی سـووڕەت بـوو، ئـەووەڵ ئـەی بـرا — پاشـی گیـان و ڕووح، جـەماڵی پێـدرا (٥٢٧)

...: ئـەووەڵ سـووڕەتێک تـەنها و بـەس — پێیـدرا، لـەززەت کەمـەعنی هاتـەدەس (٥٢٨)

...ێک دەکرن ئەوی چاک،جوان دەکەن — دوایـەدەو دا، دێـن تـورک میـوان دەکـەن (٥٢٩)

...ـووڕەتت،چادر بوو،تورکـت مەعنییـە — مـەعنی کەشـتیوان و، سـووڕەت کەشـتییە (٥٣٠)

...خـودا، لـەو باسـە بەسـکە، هـەردەمێ — باسـی یـاری شـار بکـە، بـۆم، گـوێ دەمـێ (٥٣١)

## ڕۆیشتنی کابرای شاری دەگەڵ خانەوادەی خۆی بۆ دێ ...

...مناڵ حـازربوو، بـۆ دێ، یـاری شـار — دایـدەنا سـەر بارەبـەر، بـار، چـوون بـەغار (٥٣٢)

...ی چۆلیـان گرتەبـەر خۆشـحاڵ هـەموو — بـۆ سـروودیان (سـافرو کـی تغنمـوا ) (٥٣٣)

...سـەفەربێ، مانـگ کەیخەسـرەو دەبـێ — بـێ سـەفەرمانگ بێژە،کی،خەسـرەودەبێ؟ (٥٣٤)

...سـەفەر بـاعیس بووسـەرباز،بۆ وەزیـر — یوسـوفیش لـەو دی، مـەرامی بـێ نـەزیر (٥٣٥)

...دەسـووتا ڕوو مـەتی گشـتیان بـەتاو — شـەو بـە ئەسـتێران دەڕۆیشـتن بـە تـاو (٥٣٦)

...ش دەبـوو، بـۆ وان ڕێگـای زۆر خـەراب — خـۆ، لـە خۆشـی دێ، لـەبۆ وان، ڕێ، شـەراب (٥٣٧)

...بـەدەس شـیرین لـەبان، شـیرین دەبـێ — خارلـەنێو گـوڵزار، جـوان و، شـین دەبـێ (٥٣٨)

حــەنزەلیش دەس یار،وەکووخورمــا دەبــێ          ماڵی تـەنگ گـەڵ یـار، وەکـوو سـەحرا دەبێ

زۆر عــەزیزان، بــوون لــەدونیا، ڕەنــج بــەر          تــاکو یــاری مانــگ ڕوویــان، بێتــە بــەر

زۆر کەســان دایــان بــەخۆ، دەردی گــران          تــا لــەلای خۆیــان ببیــنن یــاری جــوان

چاوکـە ئاسـنگەر دەکـا ڕووی خـۆیی، ڕەش          تا کە شەو هات ماچ بکا ئـەو ڕوویـی گـەش

گــەر دووکانــدار، ڕادەوەســتێ تــاکو شــەو          چونکەڕیشـەی سـەروی تێـدا، قـەلبی ئـەو

تاجرێـک گــەر بـەحرو بـەڕ، بـن پـێ دەدا          عیشــقی یــاری ماڵــە، نیــرووی پێــدەدا

هەرکەســێ هــەیبێ ســەرو کارگــەڵ جــەماد          بۆیەوایــە، یــاری جــوانی بــوو لــەیاد

گــەرکو نــەجار، داری کردەکــاری خــۆی          بۆیەوایەشــاد بکــا تــا یــاری خــۆی

تــۆ، بــەیــەک زینــدوو ببەئومێــد وار          تــا ئەبــەد ئــەو، هــەر بمێنــێ پایــەدا ر

مەگرەبۆ یار ئەو کەسەی بوو خوار و پەست          چونکــەدەڕوا دۆســتایی وی، لەدەســـت

ئونسی تۆ گەڵ دایک و بابت کوا ئەدی؟          گــەر وەفاوئونســت بەغــەیری خــوا، دەدی

ئیعتیمــادت گــەر بەغــەیری خــوا دەدی          ئونســی دایــەن یـا لەلـەی تۆ،کـوا ئـەدی؟

لات نـەما تـۆ ئونسی مـەمک و ئونسی شیر          نفرەتـت، بـۆ دەرس و مەکتـەب چـوو لـەبیر

ئەو شوعاعێک بوو لەڕووی دیواری جوان          چـوو لـەبۆ لای ڕۆژی زۆرڕوون ئـەو نیشـان

هەرشــتێکی بێتەســەروی ئەوشــوعاع          تـۆ دەبـی عاشـق بـەوی زوو، ئـەی شـوجاع

هەرشــتێکی خۆشەویســتەئەو لــەلات          زێـڕی وەسفی خوایەئـەو ڕوو کـەش دەکات

گــەرکو زێــڕ ڕۆی،ماوەمس،تــەنها وبــەس          نای هەوێ ئەو دەم بەبێ شک تەبعی کەس

ڕوو کەشـی وەسـفی خوداشـت تـۆ نـەوێ          زێـڕی فێـڵ تـەعریف مەکە،گـەر دەسکەوێ

جــوانی زێــڕی فێــڵ نــابێ پایــەدار          ژێــری زێــڕی فێــڵ، پــیس و نالــەبار

زێـڕی ڕووی فێـڵ، عاقیبـەت دەڕواتـەکان          تـۆش وەکـوو ئـەو زێـرە، کانـت بـێ مـەکان

نـووری سـەر دیـوار دەچـێ بـۆ لای هـەتاو          ڕوو کەتاوی حەق ئەتۆش، ئەی خـۆ ش نـاو

بتهـەوێ ئـاو، لـەو سـەمایەی پـڕ برووسـک          چونکەنـەی بـوو هـیچ وەفـا بـۆ تـۆ پلووسـک

داوی گورگـان مەعــدەنی دووگــان نییــە          گــورگ نازانێــت خــۆ مەعــدەن چییــە

فیکـری وان بـوو زێـڕی بەستەی نێـو گرێ          بۆیەتونـد و شـاد دەچـوون بـۆ لایـی دێ

چـوون لـەبۆ لای دێ بەشـادی و پێکـەنین          غـەیری دێ موشـتاقی هیچـی دیکـەنین

گـەر دەیـان دی تـەیرێ بـۆ لای دێ فـڕی          سـەبرییان ئـەو دەم کراسـی خـۆ ی، دڕی

هــەر کەسـێ هاتبـا لـەدێ بـۆ کـوویی وی          جـێ بـەجێ مـاچی دەکـرد ئـەو، ڕوویـی وی

چونکەدیتووتەئـــەتۆ ڕووی یـــاری مـــە گیانی گیـان تـۆی، چـاوی بـۆ دیـداری مـە (٥٦٦)

**نەوازیش و لاواندنەوەی مەجنوون، سەگی مەحەللەی لەیلی...**

چەشـنی مـەجنوون، چـۆن سـەگی لاوانـدەوە مـاچی کـرد و خـۆی لـەپێش ڕاژانـدەوە (٥٦٧)

خازیعانەئـەو سـەگەی کـرد ئـەو تـەواف دای بەوی جا، شەربەتی بۆن خۆش و ساف (٥٦٨)

بولفزوولێک پێیکوت ئـەی مـەجنوونی خـام بۆدەکـــەی تـــۆ، فێڵـــەبازی وا، مـــودام (٥٦٩)

زارو خـۆراک پـیس و، پـیس لـەو دیتـەوە مەقعـەدی خـۆی ئـەو بـەلێو دەسـڕێتەوە (٥٧٠)

بـولفزوول عـەیبی سـەگی زۆرکـرد، بـەیان عـەیب زان، خـۆ نەیدەناسـی غـەیب زان (٥٧١)

پێیـدەکوت مـەجنوون کـەتۆ نـەقش و تـەنی چـاک بـەچاوم چـاو لەویکـە، بـی خـەنی (٥٧٢)

چـون تەلەسـمی بەسـتەیی مـەو لایەئـەو پاســەوانی کووچــەیی لــەیلا یــە، ئــەو (٥٧٣)

چاو کـەوالا هیممەتـە، چـەن؟ بـێ حیسـاب ئەولـەبۆزین چاو،کـەکوێی کـرد ئینتیخـاب؟ (٥٧٤)

ئـەو مبـارەک ڕوو، سـەگی کـەهفی منـە بەڵکەئـەو هـاو دەردو هـاو لـەهفی منـە (٥٧٥)

ئـەو سـەگەی کـە، بـێ مـوقیمی کوویی وی چۆن بەشێران من دەدەم یەک موویی وی؟ (٥٧٦)

ئەی ئەوەی شێر بۆ سەگی وی بۆ غـولام بـا نـەڵێین لـەو باسـەچیدی، وەسسـەلام (٥٧٧)

گـەر لەسـوو ڕەت تێپـەڕن ئـەی دۆسـتان چەننـــەت و گـــوڵزارە، بـــاغ و بۆســـتان (٥٧٨)

سوو ڕەتی خۆت پاش شکان، سووتاند،ئەگەر بـوت شـکەن دێی،ئـەو دەمی،تـۆ بەرنـەزەر (٥٧٩)

جـا لەپاشـان سـووڕەتان بـەربا، دەکـەی چەشنی حەیدەر، دەرکی خەیبەر، ڕا دەکەی (٥٨٠)

یـاری شـاری زاهیـری گـرت زێدەچووست چوولـەبۆ دێ ئـەو بەقـەو لـی نـا دروسـت (٥٨١)

هاتـــەلای داوی ڕیپـــا، ئـــەو شـــادمان چەشـنی تـەیرێک دیتـەلای دانـەی نـەمان (٥٨٢)

تـەیر، وایزانـــی کەئـــەو دانـــە، ســـەخا ئنیتیهـای حیرسـە، نـەجوودە ئـەو عـەتا (٥٨٣)

تـــەیرەکان بـــۆ حیرســـی دانەخۆشـــحاڵ لێـدەدەن بـۆ لایـی فێـڵ تونـد تونـد، بـاڵ (٥٨٤)

گـەر کوئاگـات کـەم، لەشـادی یـاری شار ڕەنگـــەدوورت کـــەم لـــەڕازی کردگـــار (٥٨٥)

موختەسـەر بێـژم دەگـەڵکو دێـی، دەدی چونکـەپێی ئـەو دێ نـەبوو، چـۆ ڕێـی دەدی (٥٨٦)

ڕێ دەچوون نیزیک بەیـەک مانگ دێ بـەدێ چـون لـەبۆ وان چـاک نەبوومـەعلووم ڕێ (٥٨٧)

ئـەو کەسـانەی چوونـەڕێ بـێ ڕێنمـوون ڕێی دوو ڕۆژان، خۆ، بەسەد ساڵان دەچوون (٥٨٨)

هـەر کەسـێک بڕواتەکەعبـە، بـێ دەلیـل چەشـنی لێقـەو مـاو دەبـێ، خـوار و زەلیـل (٥٨٩)

هـەرچی بـێ ئوسـتاد سـەنعەت فێـر ببـێ ئـــەو دەبێتەمەســـخەرە، بـــۆ شـــارو دێ (٥٩٠)

ئیتیفـاقی وا کەمـە، زۆر، ئـەی جـەناب بێتـەدونیا ئـا دەمێـک، بـێ دایـک و بـاب (٥٩١)

مـال دەبـێ بـۆ ئەوکەسـەی کـردی تـەلاش    کەم دەبێ گەنجی وەدەس بێ،یەک، بەلاش    (۲:-

مسـتەفایەک کـوانێ جیسـمی گیـان بـێ    تـا کـو ڕەحمـان ( علـم القرئـا ن بـێ )    (۳:-

خـوا، لـەبۆ ئینسـان ( علـم، بـالقلم )    دایـدەنا وەک بەخشـش و بـەزل و کـەرەم    (۴:-

هەرحەریسێک، بێ بەش و مەحروومـەخۆ    تـۆ سـەبرکە، وەک حەریسان تونـد مـەڕۆ    (۵:-

دیتیـان لـەو ڕێیـەڕەنجی بـێ حیسـاو    وەک عـەزابی تـەیری خـاکی، بـێ، دەئـاو    (۶:-

جـا لەهـەرچی دێ بـوو، ئـەو بێزاربـوو    قـەولی خۆشـی پیـاوی دێـی، لا زار بـوو    (۷:-

## گەیشتنی یاری شار و خانەوادەی وی بۆ دێ و خۆ لێ نەناسکردنی کابرای دێهاتی لەوان...

گەینەئـەو دێ پاشـی مانگێـک دەر دەسـەر    بـێ نـەوا، مـان، بـێ تفـاقیش بارەبـەر    (۸:-

چـاو کـەدێهاتی لەبـەر بـەد نییـەتی    ئـەو دەکـا (بعـداللتیا والتـی)    (۹:-

ڕۆژ دەهات خۆی ون دەکردئەو، تا، نەوەک    بێنـەباغی وی بخـۆن چـەن میوەیـەک    (۰:

ڕووی ئـەوەی کەفێڵـەبازەو بـێ ورە    گـەر موسـەڵمان ئـەو نـەبینێ چـاترە    (۱:

لێی دەنیشێ چەشنی مێش ڕووی والە، دێو    پاسـەوانی لێدەکـەن، لێـی دەبنـەخێو    (۲:

گەر تەماشای کەی، دەکەن پێت، حەملەدێو    گـەر کودیتـت، خەندەلابـە، تـۆ لـەلێو    (۳:

خـوا لـەبۆ ڕووی والـەپیس و عاسـییە    وا دەفـەرمووی (نسـفعن بالناسـیە)    (۴:

ماڵیـان پەیـدا دەکـرد پـاش پرسـیار    چوون لەبۆلای دەرکە، توند، وەک ماڵی یار    (۵:

ئەهلی ماڵ دەرکیان دەبەست محکەم لەوان    یـاری شـارو قـەو مەکـەی حـەیران دەمـان[1]    (۶:

وەختی کێشەو شەڕ نەبوو گەڵ ئەهلی ماڵ    کێشەسـوود نـادا لـەبۆ وەی،کەوتـەچاڵ    (۷:

پێـنج ڕۆژی ڕاس لەبـەر ئـەو دەرکـەمان    ڕۆژو شـەو گـەرماو، سـەرما لێیـدەدان[2]    (۸:

باعیسیش غەفڵـەت نـەبوو یـا عـەقڵی خـوار    بەڵکـەباعیس بـێ وەسـیلەو ئیزتیـرار    (۹:

ئیزتیرارەچـاک دەبـێ دۆسـتی خەسـیس    نـاعیلاج دەخـوات شـێر، منـداری پـیس    (۰:

یـاری شـار دەیـدیت و دەیکـرد لـەو سڵاو    خـۆی دەناسـاند، هـەم بەجێگـە، هـەم بـەناو    (۱:

پێیـدەکوت نەمـدیوە تـۆ، مـن قـەت چ جـار    کـوا دەزانـم باشـی یـا خـۆ، نـا بـەکار؟    (۲:

پێیـدەکوت ئێسـتا بەمەحشـەر بـوو شـەبیە    چـاو، بـرا، چـۆن، بـۆ ( یفـرمن اخیـە)    (۳:

مـن ئـەوەم، خـواردت لەسـەر سفرەم، ئـەتۆ    زۆر غـەزا، چـون بـووی لـەماڵم، سـەر بـەخۆ    (۴:

---

[1]- ئەهلی ماڵ دەرکیان لەوان محکەم دەبەست    یاری شار لەوکارە،دەستی خۆی دەگەست

[2]- شەو لەسەرما ، ڕۆژ، گەرما لێیدەدان (مصرع دوم)

ـن فلان رۆژەی کریم بۆتۆ مەتاع     ( کل سر جاوز الاثنین شاع) (۶۱۵)

حۆنەویستی ئێمەیان بیست گشت خەلق     شەرمەبۆ ڕووو، نیعمەتێ بخوات حەلق (۶۱۶)

ییـ:کوت ئەو، بەس بلێ بۆم، توڕڕەهات     نێوی تۆم خۆ من نەزانیوە، چ کات (۶۱۷)

یجەمین شەو هەر وەها ما بوون غەریب     ئاسمان بارانـدی بارانێک، عەجیب (۶۱۸)

جۆیکەزۆر غەمگین و غەمبار، ما، لەوێ     دای لەدەرگا، ساحەبی مالم، دەوێ (۶۱۹)

حـ ـەت‌خواهیش‌دەهات وەک شەخسی زیز     پێیدەکوت،ها،چیت دەوێ لێم ئەی عەزیز (۶۲۰)

ـ ری شار پێیکوت کەناموێ من حەقم     نامهەوێ من ئەو حەقەی پێی لایقم (۶۲۱)

ـەردو گەرمی، نەیدەهێشت بۆ من، چ حاڵ     پێنج ڕۆژ، دیتوومەڕەنجی پێنج ساڵ (۶۲۲)

ـێک جەفا بێ،گەر لەقەو م و خزم و یار     زێدەناخۆشتر لەڕەنجی سەت هەزار (۶۲۳)

جۆن نەبوو، لەو، ئیتیزارێک بۆ جەفا     عادەتی بووگیان، لەوی بۆی، بێ وەفا (۶۲۴)

ئەو غەمانەی وەک هەمووکەس تۆش هەتە     مەنشەئی هەموان خیلافی عادەتە (۶۲۵)

ییـ:کوت ئەی ڕۆژی میهرت چۆ زەواڵ     گەبرێژی خوێنی من، دەتکەم حەلاڵ (۶۲۶)

ـەو شەوەی باران بمان بە، گۆشەیەک     تا لەمەحشەر بێتەدەستت تۆشەیەک (۶۲۷)

ییـ:کوت گۆشێک هەیە، ئی باغەوان     ئەو لەبەر گورگان، دەوێدا پاسەوان (۶۲۸)

تیری ئامادەو کەوان نێو دەست دا     تا ئەگەر یەک گورگ هات، زوو لێی بدا (۶۲۹)

ـەو لەبۆتۆ گەر ئەتۆ بێ و، وا بکەی     وانەبێ، جێیەک دەبێ، پەیدا بکەی (۶۳۰)

ییـدەکوت من وادەکەم تۆ ش جێم بدە     ئەو کەوان وتیرەزووکە، وێم بدە (۶۳۱)

ـن کەنانووم پاسەوانی باغ دەکەم     گەر کو گورگیش هات مەغزی داغ دەکەم (۶۳۲)

ـەو شەوەجێم پێبدە، تۆبی و خودا     با لەسەر قوڕ چیدی باران لێم نەدا (۶۳۳)

گۆشەیەک خاڵی دەبوو ئەو گەڵ مناڵ     چوونەوێ،تاریک وتەنگ، هەرچەشنی چاڵ (۶۳۴)

حـ ـەترسی سەیل، لەو جێی تەنگ و تار     چەشنی کوللۆ،بوون لەسەر یەکتر سووار (۶۳۵)

ـەو هەموو لێکرا دەیانکوت ئەی خودا     موستەحەقین ئێمە، بۆ پاداشی وا (۶۳۶)

ـ جەزای هەر ئەو هەبێ، یاری خەسان     یائەوەی چاکەی دەکا گەڵ نا کەسان (۶۳۷)

ـ جەزای هەر ئەو هەبێ، تەمماعی خام     جێ بهێڵێ خاکی بەر دەرگای کیرام (۶۳۸)

گەر وەلێسی خاکی بەر دەرگای کیرام     چاکترەتازێڕو گولزاری عەوام (۶۳۹)

ـەندەیی ئەوکەس بێ، ڕەو شەن بێ دڵی     چاکترەتا بێ لەسەر شا، وەک گوڵی (۶۴۰)

جۆن لەشایان غەیری دەنگی کەڕڕەنا     نایەبۆتۆ هیچی دیکەنا یە، نا (۶۴۱)

شارەیی نیسبەت بەئەڕواح، دز سیفەت      کێنەدێهاتی وەها بێ مەعریفەت؟
با جەزای بێ ئەو کەسەی بێ عەقڵی خۆی      دەنگی غوولی هات، لەجێی خۆی زوو دەڕۆی
چون پەشیمانی دڵی وی گرت هەموو      خۆ لەوەی پاش ئیعتیراف بێ سوود دەبوو
یاری شار تیرو کەوانی گرتەدەست      مونتەزیرما، تا ببینێ گورگی پەست
چەشنی ئاگر، گورگ کابرای گرتەبەر      کابراش لەو گورگە، نەیبوو هیچ خەبەر
کێچ و مێشوولەش ببوونەگورگی وی      زەخمییان کرد پشت و لاق و، ورگی وی
نەیبوو فرسەت تا بکا مێشوولەدوور      ئەو لەترسی حەملەیی گورگی شەڕوور
تا مەبادا گورگ بێ، هەیبێ زییان      پیاوی دێش لێی هەڵقەنێ ڕیشەی ژییان
تاکونیوەی شەو، وەهابوو دڵ پەرێش      گییانی هینابوو هەتا لێو، ترس و ئێش
ناگەهان گورگێک زەلام و پڕ خەتەر      ئەو لەبشت تەپکێک سەری هینا یەدەر
تیری هاویشت ئەو دەمە، کابرایی شار      جێ بەجێ گورگیش لەسەر ڕا کەوتەخوار
لێیدەبوو حەیوان ئەو دەم، با، جودا      پیاوی دێ (های )کرد و دەستی لێک دەدا
نا جەوانمەرد، ئەو هەخۆ جاشکی منە      پێیدەکوت نا،گورگە، پێمان دوژمنە
ئەو بەزاهیرگورگەنەک یەک جاشەکەر      شکڵی وی گورگی دەدا تەبەر نەزەر
پێیدەکوت، نا، بای لەوی گەر هاتەدەر      چاک دەناسم هەر وەکوو کەردار کەر
تۆ لەنێوباغ لێت دەکوشتم جاشەکەر      ڕەببی هەت بێ دائیمەن تۆ دەردەسەر
پێیدەکوت تۆ چاک بنۆڕە چون شەوە      چون بەشەو مەعلوو م نییەئەو یا ئەوە
ئیشتیبای چاو زۆرەشەو، نەک دەمدەمە      چاوی واقیع بین دەشەو دا، زۆرکەمە
هەم شەوو هەم هەورو هەم بارانی وا      ئەو سێ تاریکی دەهێنن، ئیشتیبا
پێیدەکوت من چەشنی ڕۆژ لێم ڕۆ شنە      من دەناسم ( با ) کەبای جاشکی منە
من دەناسم بای وەها نێو بیست( با )      وەک موسافیر نایبێ بۆ بار ئیشتیبا
زۆربەقەهرو کین هەڵستا یاری شار      گرتی ئێقەی پیاوی دێهاتی، بەغار
ئەی ئەتۆ بۆ فێڵەبازی عارو نەنگ      خواردووتەدیارەتۆ ئەفیو ن و بەنگ
گەر دەتاریکی دەناسی بایی کەر      بۆچی نا نا سی ئەمن ئەی خیرەسەر؟[1]
ئەو کەسەی گوێلکی دەناسێ نیوەشەو      دۆستی دەە ساڵ چۆن نا ناسێت ئەو
تۆ دەڵەی من عارفم زۆر پاک و چاک      چاوی مەردیت بۆچی پڕکرد تۆ لەخاک؟

[1]- گەر دەشەو دا بای کەرت تۆ ناس دەکەی      بۆچی نا نا سی ئەمن ،گەرراس دەکەی؟

ـی خەبەر ماوم لەخۆم ئاگا نییە — نێو دڵی من غەیری خوای تێدا نییە (۶۶۸)
ـەۆ ـتەی خواردوومەدوێنیەم، یاد نییە — دڵ بەغەیری چوون لەهۆشی، شاد نییە (۶۶۹)
ـەۆ ـەهۆش، تۆ لێم گەڕێ گەر وام، ئەمن — عاقڵم،گەر ئێستەشێتی خوام ئەمن (۶۷۰)
ـەۆ کەسەی دەخوات مندار،وەک شەراب — ئەو مەعا فی شەرعە، بێ سوال وجەواب (۶۷۱)
ـەست و بەنگی، بۆ ئەوان سەودا نییە — وەک منالێک هیچ سزای لای خوا نییە (۶۷۲)
ـەستییەک، کەبۆنی خوا ئەو چا دەکا — مەی دەکووپان کوا لەمەغزان وا دەکا؟ (۶۷۳)
ـ ـەسەر وی چۆن دەبێ تەکلیف ڕەوا؟ — کەو تەخوار ئەسپ، چوارپەلیشی لێشکا (۶۷۴)
ـی لەپشتی جاشەکەر داینا وەبار — کێیەدەرسی پاکی دا، شەیتانی هار؟ (۶۷۵)
ـ وەر دەگرن، لەوەی هەیبێ عەرەج — حەق کوتی (لیس علی الاعمی حەرەج ) (۶۷۶)
ـ ـەحاس خۆم کوێر، لەحاستی خوا بەسیر — جا مەعافم بۆ قەلیل وبۆ کەسیر (۶۷۷)
ـ دەڵەی دەروێشم و، بێهۆش لەخۆم — وەک غەزا من،های و هوی مەستان دەخۆم (۶۷۸)
ـن چ نازانم زەمین و ئاسمان — ئیمتیحانی کردی غیرەت، ئیمتیحان (۶۷۹)
ـی جاشکەکەر، ئەتۆی ریسوا دەکرد — چون وجوودی تۆی، با، پەیدا دەکرد (۶۸۰)
ـبەبازان، خوا ئەوان، ڕیسوا دەکا — ئەو هەڵاتوان گیر لەداودا، وا دەکا (۶۸۱)
ـیمتیحان هەن زێدە، تا چەندین هەزا ر — بۆ ئەوەی بێژێ، کەمن بۆ شا مە یار (۶۸۲)
ـەر نەناسن عامە،ئەو بێ ئیمتیحان — خۆ خەواس داوا دەکەن لەو زۆر نیشان (۶۸۳)
ـەربکا دەعوایی خەبیاتی خەسێ — شا، لەپێش وی دا دەنێتن، ئەتڵەسێ (۶۸۴)
ـۆ کەبیرە،تۆ عەبایەک، باش، گوشاد — ئیمتیحان دەیدات ئابڕووی وی بەباد (۶۸۵)
ـەر لەبۆ بەد هیچ نەبایەئیمتیحان — وەختی شەڕ، نا مەرد، دەبۆ یەک پاڵەوان (۶۸۶)
ـەر دەبەر کا، یەک نەفەر نامەرد، زرێ — زەخمەکی گەر دیت، دوژمن دەیگرێ (۶۸۷)
مەستی حەق وشیار ناکا، بای دەبوور — مەستی حەق نایەت وەخۆ، بێت نەفخی سوور (۶۸۸)
ـەی لەحەق بێ، ڕاستەبێ شک نەک درۆ — دۆیەخواردت دۆیەخواردت، دۆیە، دۆ (۶۸۹)
ـۆت نیشان دا، وەک جونەید و بایەزید — لێک جیبا ناکەم ئەمن تەور و کلید (۶۹۰)
ـۆرەیی هەم تەنبەڵی هەم حیرس و ئاز — چۆن دەکەی پنهان بەفێڵ، ئەی فێڵەباز؟ (۶۹۱)
ـۆت وەکوو مەنسووری حەللاج لێدەکەی — دینی خەڵکیش ئاگری، تۆ تێدەکەی (۶۹۲)
ـیک جیبا ناکەم عومەر گەڵ بوو لەهەو[1] — بای لەجاشکم بێ دەناسم،نیوەشەو (۶۹۳)

[1]- من کە ناناسم عومەر یا بوو لەهەو (مصرع اول)

زۆر کەرە، وەک تۆ کەپێت باوەڕ دەکا      جا لەبەر تۆ خۆشی کوێر و کەڕ دەکا (۶۹۴)
تۆ لەوانەی سا لیکن دوور بگرەخۆ      تۆ ڕەفیقی ڕێگرانی، گوو، مەخۆ (۶۹۵)
باڵی فیل ببڕە، ببەتۆ عەقڵ خواز      کوا دەبا بۆ ئاسمان باڵی مەجاز (۶۹۶)
وات نیشان دا عاشقی ڕەحمانی تۆ      خۆ، لەواقیع، عاشقی شەیتانی تۆ (۶۹۷)
عاشق و مەعشووق دەبەن ڕۆژی جەزا      پێکەوە، بۆ مەحشەری،بۆ لای خودا (۶۹۸)
خۆت نیشان دا گەر ئەتۆ مەدهۆش وحەز      خوێنی ئیمەت خواردووە،نەک خوێنی ڕەز (۶۹۹)
لام بڕۆ ناسیار نی، خۆ، وا مە، من      عارفم مەد هۆش ومەستی خوا مە، من (۷۰۰)
خۆ خەیاڵ و، وەهمە، لای تۆ، قوربی حەق      چون تەبەق ساز، دوورکە نابی،لەوتەبەق (۷۰۱)
دیار دەکا نەت دیوەقوربی ئەو لیبا      چەندەیان لا هەن کەڕا مەت هەم کیبا (۷۰۲)
ئاسنی دەس داودی هەر چەشنی مێو      مێو دەدەستت ڕەق دەبێ وەک بەردی کێو (۷۰۳)
قوربی خەڵق و ڕزق، بۆ عالەم بەعام      قوربی وەحیی عیشق، مەخسوو سی کیرام (۷۰۴)
قوربی حەق ئەنواعی زۆرن ئەی بەنێو      چاو، دەدا تا و، هەم لەزێڕو هەم لەکێو (۷۰۵)
قوربی تاو بۆ زێڕ، ئەمما وا، دەبێ      دارەبی لەو قوربەکوا ئاگا دەبێ؟ (۷۰۶)
تاو لەلک وەک یەک،لەوشک وتەڕ دەدا      ئەو بەوان دوو،نووری زۆرپڕ فەڕ دەدا (۷۰۷)
لەو لکی تەڕ نووری تاوێ، گەر دەدا      میوەیی زۆر جوان و شیرین، بەر دەدا (۷۰۸)
ئەو لکی وشکیش کەتاوی دێتەسەر      غەیری زیاتر وشک بوون، تای بێ، چ بەر (۷۰۹)
تۆ مەبە، وا مەست،گەر هاتی وەهۆش      هێن پەشیمان بی لەتاوان، بی نەخۆش (۷۱۰)
بەڵکەلەو مەستا نەبە، مەی گەر دەخۆن      عاقڵان حەسرەت لەبۆ وان، هەر دەخۆن (۷۱۱)
ئەی ئەوەی وەک گوربەگرتت،مشکی پیر      گەربخۆی لەومەی دەکەی تۆشێرئەسیر (۷۱۲)
ئەی ئەتۆ گرتووتەدەس، جامی خەیاڵ      چەشنی مەستانی حەقایق مەگرە حاڵ (۷۱۳)
تۆ دەڕۆ ی وەک مەستێ، هۆشی پێ نییە      ئەی تۆ لێرە، خۆ لەلای دی، ڕێ نییە (۷۱۴)
گەر کو هاتی تۆ لەبۆلای سەر وەرت      بۆ هەموو لایەک بسووڕێتەسەرت (۷۱۵)
تۆ کەماددی، باسی ئەو لا بۆ دەکەی؟      بۆ کەزیندووی باسی مەرگی خۆ دەکەی؟ (۷۱۶)
عارفێکی گەر لەمردن نیتی باک      لایقەگەر ئەو نەناسێ خەڵکی خاک (۷۱۷)
تۆ، بەئەو هام خۆش دەکەی زاربێ گومان      پڕ لەبای کیبری دەکەی هەنبانی گیان (۷۱۸)

جـا بەیـەک دەرزی دەبـێ خـاڵی لـەبا | خۆزگەهەرکـەس عـەقڵی بایـە، وا، نـەبا (٧١٩)
تـۆ لەزسـتان چـا دەکـەی گـۆزانی بـەرف | کـوا دەمێنن، گـەرکو بـۆ ئـا و، بینـەزەرف؟ (٧٢٠)

**کەوتنی چەقەڵ دە کووپەی ڕەنگ و ڕەنگین بوونی وی و ئیددیعای تاووسی کردن دەنێو چەقەڵان دا...**

**خولاسەی داستان...**

چەقەڵێک چۆ نێو کووپەیەکی ڕەنگان کاتێک هاتەدەر پێستی وی ڕەنگاوی ببوو و دەموقابیل چەقەڵـەکانی دی ئیفتیخـارو تەکـەبوری دەکـرد.. کەبـەڵێ ئـەمن تاوسـی بەهەشـتێمە، ئـەمن چەقەڵ نیم، چەقەڵەکانی دی پێیانکوت ئەڵێان کەڕەنگی تاوسانی گوڵستانت گرتوەئا یا دەنگی تاوسانیشت هەیە؟ یا هەر وەک پێشو دەلووریێی؟ چەقەڵی موتەکەببیرو خودخواەڕیسوا بوو ..

یەک چەقەڵ جارێک دەچۆ نێوکووپەڕەنگ | کردی یـەک ساعەت دەنێوکووپە، درەنـگ (٧٢١)
هـاتـەدەر پێسـتی هـەموو ڕەنگـین بـوو | مـوددەعی تاووسـی عیلیـین بـوو (٧٢٢)
جوان لـەوی ڕازاوەبوو، بەو ڕەنگ و تووک | تیشـکی تـاویش کردبوویـە، تـازەبووک (٧٢٣)
خۆ ی کەدی وا زەردو بۆرو سەو زو سوور | چـوو لـەبۆ لای چەقەقـەڵی نیزیـک و دوور (٧٢٤)
گشتی کوتیان ئەی چەقەڵ تۆ بۆچ وای؟ | وا دەخۆشـی و شـادمانی پێچـرای (٧٢٥)
تـۆ، بەشـادی خـۆ ت لەئێمـەکردە دوور | تـۆ لـەکوێت هێنـاوەبۆ خـۆت ئـەو غـروور (٧٢٦)
یـەک چەقـەڵ هات وکوتی بـەو ئـەی فلان | فێڵەدەیکـەی یانـەبوو ی وەک خـۆش دلان (٧٢٧)
فێڵەدەیکـەی تـا بچـی سـەر مینبـەرێ | تـا بـەفێڵ گـوێگر بـەتۆ حەسـرەت، بـەرێ (٧٢٨)
بـەو تەلاشـەزۆرە، نـەت دی گـەرمی تـۆ | فێڵـەبازی بۆیـەوا، بـێ شـەرمی تـۆ (٧٢٩)
گـەرمی خاسـی ئـەنبیاو و ئـەولیا | بـێ حـەیایی،بۆ پـەنای فێـڵ و ڕیـا (٧٣٠)
ڕوو دەکـەن تـا خـەڵکی بەرنـەلایی خـۆ | مـوددەعین، خـۆ شـن، بـەلام وا نینـەخۆ (٧٣١)

**چەورکردنی پیاوی فێڵەباز لێو و سمێڵی خۆی هەموو بەیانان بە چەورایی پێستی دوو گە و هاتنی وی بۆلای ڕەقیبەکانی خۆی کە ئەمن فلان شتەم خواردووە...**

پێستی دووگـەی کـەو تەدەستی،پیاوی فێـڵ | گشت بەیانان چەوری کرد بەو، دوو سمێڵ (٧٣٢)
جـا دەچـوو دەیکـوت لـەنێو خـەڵکی بـەعام | خواردوومـە، مـن غـەزای چـەورو بـەتام (٧٣٣)
دایـدەنا دەسـتی لەسـەر هـەر دوو سـمێڵ | تا بـەدەس کێشان نیشان دا چـەو ری فێـڵ (٧٣٤)
شـاهیدی سـیدقی قسـەم بـێ، ئـەو هـە، بـا | چونکەدیارەلەو،کەچـەن خـۆش بـوو غـەزا (٧٣٥)

جــوابی وی داوەزگـــی وی زۆر غـــەمین / خـوا نـەهێڵێ مـەکرو کەیـدی کـازیبین (٧٣٦
مـــەکرو فێڵـــت ئـــاگری بـــەر دا دەمـــن / ئـەو سمێڵی چـەو ری تـۆ دەر بـێ، لـەبن (٧٣٧
گـــەر نەبایەمـــەکرو فێڵـــت ئـــەی گـــەدا / یـەک نەفـەر خێـری لـەڕێی خـوا، پێن دەدا (٧٣٨
عـەیب و نەقسی خۆت کەکوتبا تۆ ئەگەر / یـەک تـەبیب لـەودەردە، دەی هینا یـە دەر (٧٣٩
خـوا کوتویـەڕاس تـەکان دەگـوێ و دوم / چـون دەداتەسـادیقین سـوود ( صـدقهم) (٧٤٠
کـەج دەنێـو غـاردا مـەنوو ئـەی موحتـەلیم / هـەرچی هـەت بێ ئاشکرای کە( فاستقم ) (٧٤١
گەر کونالێی عـەیبی خۆت، تۆ هیچ مەڵێ / بێژەفێـڵ بـا هـیچ نـەمێنێ لات، هـەڵێ (٧٤٢
هـیچ مـەڵێ لـەو نەقـدو زێـڕەی هاتـەدەس / بـەردی ئیمتیحـان هەیـە، لای زێدەکـەس (٧٤٣
بـەردی ئیمتیحـان وەکـوو زێـڕی جـووان / حـاڵی وی دەکـرێ بـەبێ شـک ئیمتیحـان (٧٤٤
خـوا کـوتی وەختـی وەلادەت تـاکو( حـەین) / ئیمتیحـان دەکـرێن هەرسـاڵ ( مەڕڕەتـەین) (٧٤٥
ئیمتیحان چـون زۆرهەنەسـەنگین و سـووک / تـۆ نـەکا مـەغروور ئیمتیحـانی چـووک (٧٤٦

**خاترجەم بوونی بەلعەمی باعور کە خودا زۆر جار ئەوی ئیمتیحان دەکرد و لـە هـەموو ئەو ئیمتیحانانە قەبووڵ ببو...**

بەلعـەمی بـاعوورو ئیبلـیس هـەر دووان / ئیمتیحـانی ئـاخری بـوو دەرکـران (٧٤٧
ئیددیعای دەو لەت دەکا، ئەو هەر بەفێڵ / مەعدەشـی لەعنـەت دەنێـرێ بـۆ سـمێڵ (٧٤٨
ئـەو شـتەی پنهـانی کـرد پەیـدایی کـە / ئـاگری بـەردا دەمـە، ڕیسـوایی کـە (٧٤٩
دوژمنـی ویـن گشـت ئـەعزایی بـەدەن / ئـەو لـەدەی، باسـی بەهاریەهـەم چەمـەن (٧٥٠
قـەو لـی بێهـوودە، دەکـا نیعمـەت هـەدەر / ڕیشـەیی نیعمـەت لـەبن دێنێتـەدەر (٧٥١
ڕاس خـواز بـە، یانـە خـۆ ت خـامۆش کـە / ئـەو دەمـە، ڕەحمـەت ببینـەو، نـۆش کـە (٧٥٢
جـا، زگـی وی بـوو بـەدوژمن، بـۆ سـمێڵ / وای دوعـاکرد لـەو سـمێڵەی چـەوری فێـڵ (٧٥٣
ئـەی خـودا ڕیسـواکەبێهوودەی لیشـام / تـا لـەبۆ لای ئێمـەبێ، ڕەحمـی کیـرام (٧٥٤
خـوا قـەبووڵی کـرد جـا، لـەو زگ دوعـا / ئیحتییـاجی بـوو شـەدید، ئـەو بـۆ غـەزا (٧٥٥
خواکـوتی گەرفاسـقی یـا بـو ت پەرەسـت / گەرکو باش داوام بکەی،دەت هێنمەدەست (٧٥٦
گـەر دوعاکـەت بـێ دەگـەڵ وی ناڵـەناڵ / عاقیبـەت شـیرنایی دێـت، دەڕوات، تـاڵ (٧٥٧
چونکەزگ، چاک خۆی بەزاتی خوا سپارد / هـات پشیلەپێستی دووگەی بـرد و خـوارد (٧٥٨
ئـەو پشـیلەتوند هـەلات وچـوون بـەدووی / جا لەترسی باب، مناڵ ڕۆی، ڕەنگی ڕووی (٧٥٩
هات لـەبۆ نێو خـەڵکی ئـەو منداڵی چـووک / ئـابڕووی بـابی دەبـرد، دەی کـرد سـووک (٧٦٠

پێیکوت ئـەو دووگـەی سبەینان زوو ئـەتۆ        دات دەنـا سـەر دوو سـمێڵ و لێـوی خـۆ (٧٦١)
هـات پشـیلەنا گـەهان دوو گـەی دەبـرد        زۆر بە دووی دا چووین،تەلاش سوودی نەکرد (٧٦٢)
پێکـــەنین لێکـــرا کـــەکوترا والـــەڕاز        ڕەحمییـان هـات جـا، بـەکابرای فێڵـەباز (٧٦٣)
بانگییـــان کـــرد، تێریـــان دا، بـــەو غـــەزا        چاکـەیان زۆر کـرد، دەگـەڵ وی بـێ جـەزا (٧٦٤)
چونکـەزۆری دیـت چاکـە، لـەو کیـرام        بـێ تەکـەببور بـوو لـەبۆ راسـتی، غـولام (٧٦٥)

## ئیددیعای تاوسی کردنی ئەو چەقەڵەی کە دەکووپەی رەنگان کەوتبوو...

هـات لـەبۆ بـن گوێی،مەلامەتگەر،چەقـەڵ        وای بەگوێی وی کوت بەسرتەئەی دەغـەڵ (٧٦٦)
چاوکـەڕەنگی چەنـدەجوانم کـەو تەدەسـت        کوا بوتی وەک من دەبێ بۆ بو ت پەرەست؟ (٧٦٧)
چەشنی گوڵزارجـوانم ئێستەڕەنگ بـەڕەنگ        زووکەسەجدەم بۆ بەرە، نەت بێ، چ نـەنگ (٧٦٨)
چاو لـە فـەڕی مـن کـە تۆ، ئـەی نازەنین        پـێم بڵـێ تـۆ فـەخری دونیـا و ڕوکنـی دیـن (٧٦٩)
مەزهـەری لـوتفی خـودایی بوومـە، مـن        لـەو حـی شـەرحی کیبریـایی بوومـە، مـن (٧٧٠)
پـێم مـەڵێن چیدی چەقـەڵ ئێـوەی هـەواڵ        کـوا چەقـەڵ دەیبێ وەها جوانی و جـەماڵ؟ (٧٧١)
چەقـەلان هـاتن لـەدەوری بـوون بەجـەم        هـەر وەکـوو پەروانـە دەگـرن دەوری شـەم (٧٧٢)
جا، بڵەین چی ئێمـەپێت؟ ئـەی جـەو هـەری        پێیکـوتن تاووسـی نێـر، وەک موشـتەری (٧٧٣)
جـا دەیـان کـوت بەو،کەتاووسـانی گیـان        زۆر لەمـەزراو بـاغ هەیانـە، حـاڵی جـوان (٧٧٤)
حاڵی تـۆش واجوانـە؟ دەیکـوت ئەو،کـە، نـا        من کەنەم دی دەشت،چۆن باس کەم (مـەنا) (٧٧٥)
دەنگـی تاووسـت هەیـە؟ دەیکـوت کـە، نـا        وا کـەنی تـاووس نـی، جێگـای سـەنا (٧٧٦)
دێ لەئاسـمانان لـەبۆ تـاووس خـەلات        کـوا بـەڕەنگی فێـڵ دەسـتت بـەو دەگـات؟ (٧٧٧)

## شەباهەتی فیرعەون و ئیددیعای ئولوهییەتی وی بەو چەقەڵەی کە ئیددیعای تاووسی دەکرد ...

چەشنی فیرعـەونی کەڕیشـی کـرد جـووان        خـۆی بـەزیاتر گـرت لەعیسـای ئاسـمان (٧٧٨)
ئـەو لـە نەسلی چەقەڵی مـێ بـوو بـەڵام        کەوتـە کووپـەی مـاڵی دونیایـە و مـەقام (٧٧٩)
هەرچی دی ئەو جاوماڵ، سەجدەی دەبرد        سـەجدەیی خـەڵکی ئـەوی زۆر شاد دەکـرد (٧٨٠)
مەست وخۆش بووئەوگەدایـەی ژەندەدەڵق        کاتێ دەیدی بۆی دەبەن سـەجدان خـەڵق (٧٨١)
مـــاڵ، مـــارە، ژاری وی بـــێ ئینتیهـــا        سـەجد ەهـەم تـەعزیمی خـەڵکیش، ئـەژدیها (٧٨٢)

ئەی تۆ فیرعەون، خۆ ئەتۆ تەقوات نییە      چەققەڵی نەک تاووسی بڕوات نییە[1] (۰۳
کاری تاوسان گەربکەی لای تاووسان      سەر نەوی و ڕیسوا دەبی تۆ، بێ گومان (۰۴
مووسیو هارووون کەتاووس بوون، بەجووت      باڵی جیلوەی جوانی خۆیان دا لەڕووت (۰۵
ناحەزی وریسوایی تۆ بوون ئاشکار      جا سەروبن ڕاس لەژوور ڕا کەوتیە خوار (۰۶
گەرمەحەک هات ڕەش دەبی تۆچەشنی قەلب      نەقشی شێر ڕۆی خۆی نمایان کردکەلب (۰۷
ئەی سەگی تەمماع کەپێستت لا هەنە      پێستی شێری تۆ لەبەر خۆت، داکەنە (۰۸
دەنگی شێر دەی وێ بکا، تۆ ئیمتیحان      چونکەنابێ دەنگی شێرو خووی سەگان (۰۹

**تەفسیری (و لتعرفنهم فی لحن القول )..**

وای بەئەحمەدکوت دەقورئان دا خودا      تا بناسێ سادەتر ئەهلی ڕییا (۱۰
گەر مونافیق زاهیری جوان بێ و بەهەول      چاک دەناسێنێ بەتۆ ئەو لەحنی قەول (۱۱
گۆزەیێکت ویست کەبکڕی ئەی فلان      بێ گومان تۆ چاک دەکەی ئەو ئیمتیحان (۱۲
چاک دەدەی دەستت لەوی تۆ ئەی برا      تا لەدەنگی وی شکەست بێ ئاشکرا (۱۳
ئاشکرایەگۆزە، گەر بێ، لەو سەدا      چون سەدا بۆ موشتەری بوو ڕەهنەما (۱۴
دەنگی گۆزەی دێت ئەو تەعریف بکا      چەشنی مەسدەر فیعلی ویست تەسریف بکا (۱۵
ئیمتیحانی خوایی چونکەباس کرا      هاتەیادم باسی هارووت، ئەی برا (۱۶

**داستانی هارووت و مارووت و حازر بوونیان بۆ قەبووڵ بوون لە ئیمتیحانی خوداوەندی مەزن..**

من لەوەی پێش باسی ئەو هەم کردکەمێ      وەک نیشاندەم من لەیەک دەریا، نەمێ (۱۷
دەمهەویست لەو بارەتەحقیق کەم گەلێ      وەک دەڵەم، مومکین نەبوو،بۆ من،چەلێ (۱۸
ئەو چەلەش من باس دەکەم لەوزۆر قەلیل      هەروەکووعوزوێک بەیان کەم من لەفیل (۱۹
گوێ بدەهارووت و مارووت نا تەمام      ئەی غولامی ڕوویی جوانت بین، بەعام (۲۰
مەست بوون ئەو دوو لەدیدا ری ئیلاه      لەو عەجایباتی ئیستیدڕاجی شاه (۲۱
مەستی وا،چاکات ئیستیدراجی حەق      چۆن دەکا مەست داخووا، میعراجی حەق؟ (۲۲
مەستی وا، چاکات دا نەی دامی وی      چی دەبی بێ، سفرەیی ئەنعامی وی؟ (۲۳

---

[1]- تاووسی چی؟ چەققەڵی بڕوات نییە(مصرع دوم)

ـەست بوون ئازاد لەزەنجیری هەوا — چەشنی عاشق کردیان غەو غاو سەدا (٨٠٤)
ێمتیحانی سەخت، لەو ڕێ، دا دەبوو — کێو لەحاستی سەر سەر ی وی، کا، دەبوو (٨٠٥)
ـێ شەدید هات، سەختی کردن ئیمتیحان — بێ خەبەر لەو حاڵەسەر مەستان دەمان (٨٠٦)
حەندەک ومەیدان لەلای وی هەریەکە — چاڵ وخەندەک بۆوی زۆرخۆش مەسلەکە (٨٠٧)
جۆ ـەئاهوو، گەر دەچێتەشاخ و داخ — تاکوبخواگیاو گوڵ، بێ دەردو ئاخ (٨٠٨)
ـکو بخواگیا دەبینێ ناگەهان — حوکمەکی دیکەلەحوکمی ئاسمان (٨٠٩)
ـوەکی دی، بۆ وی دێتەبەر نەزەر — بزنەکی، ئەو کێوەوێستاوە لەسەر (٨١٠)
جۆی وی تا ڕیک دەبینێ جێ بەجێ — بازدەدا ئەو، تا کو زۆر زوو بچێتەوێ (٨١١)
ێندەنیزیک کێو دەبینێ ئەو لەدوور — وەک بسووڕێ یەک لەماڵ، دەو ری تەنوور (٨١٢)
ـەۆ هەزارن زێدەگەز، دەیدی بەدوو — مەست بوو، ویستی بچێ بۆ وێ، بەزوو (٨١٣)
ـەر کەبازدا ئەو لەسەر ڕا دێتەخوار — جا لەنێو دوو کێو دەگرێتن قەر ار (٨١٤)
ـەو کەچوو بۆکێو لەترسی ڕاو کەر — هەرپەنا گا، خوێنی وی دا بوو، هەدەر (٨١٥)
ۆ کەران دانیشتبوون زۆر مات و کڕ — تا قەزا ڕوئیەت، بکەن لەو دۆڵ و، خڕ (٨١٦)
ـبەن بەو جوورەدەگرن ئاهووان — خۆ دەنا چالاک و توندن، پڕ، تەوان (٨١٧)
ـەرچی ڕۆستەم هەیبو هەیبەت،زۆربەناو — بێ گومان شەهوەت بووباعیس کەوتەداو[1] (٨١٨)
ێش وەکوومن مەستی شەهوەت نەت بێ با — تۆ دەوشتر د ا ببینە، مەستی وا (٨١٩)
ـەستی شەهوەت بوون لەنێو دونیایی دوون — خۆ لەحاس مەستی مەلەک زۆرسووک بوون (٨٢٠)
ـەستیەتی ڕووح، مەستیەتی تەن لا دەنێ — باش، بەشەهوەت کوانێ ئەرزیش دا دەنێ؟ (٨٢١)
ـەر تۆ قەت نەت خواردبێ ئاوی لەزیز — ئاوی سوێر لات زێدەخۆشە، زۆر عەزیز (٨٢٢)
ـەر لەئاسمان بێتەخوار قەترێک شەراب — نایهەوێ ئینسان مەی و ساقی و کەباب (٨٢٣)
ـێ نیهایەت خۆش دەبن ئینسانی چاک — لەو جەلال و، عیززەتی یەزدانی پاک (٨٢٤)
ۆ دەبوون بەو مەی خودا ئوممێدوار — مەی جیهانیان هیچ نەهێشت، دایان لەدار (٨٢٥)
ـەیری ئەو هانەی لەڕەحمەت بوون بەدوور — هەروەکووکوففاری مەدفوون نێو قبوور (٨٢٦)
ـەو نەمامی ئارەزووی خۆیان شکاند — تا لەدەستیان هات دڕوویان دا دەچاند (٨٢٧)
ـ لەبەر مەستی دەیان کوت چەشنی مەرد — خۆزگەدابان ڕەحمەتی بێ حەد بەعەرد (٨٢٨)
ـەو جیهانەی جێگەزوڵم و جێی جەفا — دان دەنا عەد ڵ و عیبادات و، وەفا (٨٢٩)

[1]- گەرچی ڕۆستەم هەیبوو ئەو گورزو مەتاڵ — بێگومان شەهوەت بوو باعیس، کەو تەچاڵ

لێـــرەڕای گـــرتن قـــەزای پـــەروەردگار — پێشـــی پێتـــان داو زۆر هـــەن نادیـــار
بـێ تـەوەججوەتـۆ مـەڕۆ قـەت بـۆچ لا — تۆمـەڕۆ وەک کـوێر، بـۆ نێـو کـەر بـەلا
چونکـەزۆرن ئێسـک و مـوویی هالیکـان — جـێ نییـەخۆ، هـیچ لـەبۆ پێـی سـالیکان
پڕلەئێسـک و مـوو، و پیـوە، ڕێ، هـەمووی — هێندەئەشـیا تیغـی خوایـان بـوو لـەدووی
خـوا کـوتی بەنـدانی خاسـی مـن، بەشـەرم — زۆرلەسـەرخۆ، ڕێ دەڕۆن ئـارام و نـەرم
چـۆن لـەنێو دڕوان دەچێ پێخـواس بـەغار؟ — هـەر دەبـێ ئـارام بچـێ، پـەرهیز کـار
خـۆ قـەزا لـەو باسـە، زۆری کـوت بـەوان — بەسـتبووی گـوێی وان حیجـابی، بـێ ئـەمان
چاوو،گوێیـان پـەردەیان بۆسـەردەهات — غـەیری ئەوکـەس گەرلـەخۆی،خۆی دا نـەجات
لـوتفی خوایـەچاوی بـاتین گـەر، وەبـێ — هـەر بەخۆشـی تـووڕەیی نـابوود، دەبـێ
یـاخووا کـەس نـەیبێ، بێهوودەتـەلاش — بـەس خودایـە، چـاک دەناسێ، ڕێـی بـاش

**داستانی خەون دیتنی فیرعەون، هاتنی مووسا(ع) و فکری چارە کردن ..**

**خولاسەی داستان...**

هەرچەند ماجەڕای بەدونیاهاتنی مووسادەتەفاسیری قورئان وتەواریخ بەسووڕەتی جـوور بـەجوو نـەقڵ کراوەبـەڵام ئـەو مەتڵەبـە، ئیتیفـاقی لەسـەرەکەنەجاتبوونی مووسا لەدەسـتی قـەهروزوڵمی فیرعـەونی فەقـەت بـەلوتف و عینایـەتی خـودا بـووە، دەتـەوراِت دا ئـەو مەتڵەبـەزۆر مەختەسـە بـەیان کراوە،پـاش ئـەوەی کەمونـەججیمان وموعـەببیران فیرعـەو نیـان لەبـەدونیا هـاتنی موسـ ئاگادار کرد بەدەستووری فیرعـەون، منداڵی نێرینـەی بـەنی ئیسـڕائیل قـەتڵ عام کران ودەڵێن لەبۆ پەیداکردنی مووسا، نـەوەد هـەزار منداڵی بـەنی ئیسـڕائیلی کوشـت، بەڕیوایـەتی وهبی بنـ مونببیـە کاتێـک کـەدایکی مووسـاحامیلەدەبێ ئـەو مەسـئەلەلەهەموو کـەس دەشـارێتەوە، ولـە ساڵەی کەقـەر ار بـوو مووسا بـەدونیا بێ فیرعـەون قابیلـەی بەجاسووسـی دەناردەماڵان تا ئـە منداڵـەی کـەبۆ خـۆ یـان دەنـەزەر یـان دا بـوو بیکـوژن، ئـەمما دایکـی مووسـا وەک حـاملا نـەدەچوو، ولـەزگو ڕەنگـی مـەعلووم نـەبوو تـەنها خوشـکێکی وی لەشـەوی وەلادەت، لـەو مـە زووعەئاگا دا ربوو، ولەعەبدوڵڵای بنی عەبباس نەقڵ کراوە، کەکاتێک قابیلەیەک لـەماڵی دایکی مووسا هاتـەدەر، نیگـەهبانان بەعەجەلـەهاتن بـۆ مـاڵی دایکـی مووسـا مەریـەمی خوشـکی،ئەوی لەهجوومی مەئموورانی دڵ ڕەقی فیرعەون ئاگا دا ر کرد، دایکی مووسا جێ بـەجێ منداڵەکەی دەپـار چـەێکی وەر پێچـاو ودەنێـو تەنـدووری ئایسـاوی هاویشـت، مـەئموورەکان کەهاتنـەژوور

هـەموو لایـەک گـەڕان، بـەڵام منـداڵیان نەدیتـەوە، دوایـەبۆ لای تەنـدووور چـوون دیتیـان کەتەنـدوورئاگری لێدیتـەدەر، ولایـان وابـوو کـەهیچ کەسێک دەو ئـاگرەدا ناژیـت وبەدیققـەت چاویان لەدایکی مووساکرد بەڵام نیشانەیەکیان لەحامیلەبوون دەویدا نەدی ناچار ماڵیان بـەجێ هێشـت و ڕۆیشـتن، دایکـی مووسـا بەعەجەلـەچوو بـۆ لای تەنـدوور و بەتەعـەجوب دیتـی کەئاگری شوعلەوەر ساردو سازگارە، وهیچ زیانێکی بەمنداڵەکەنەگەیاندووە..

جەهـدی فیرعـەون چونکەنـەیبوو ئیعتیبـار ‎ ‎ ‎ بوو نەتیجەی کاری وی بـەس نـەنگ و عار (۸۴۰)

زێری حوکمی بوون مونەججیم یەک هـەزار ‎ ‎ ‎ سـاحیرو تەعبیرکـەری خـەو، بـێ ژمـار (۸۴۱)

هـاتنی مووسـا نیشـانیاندا دەخـەو ‎ ‎ ‎ تێکـدرافیر عـەو ن ومـو لَـک و تـەختی ئـەو (۸۴۲)

حـا، کـوتی بـۆ ئـەهلی تـەعبیرو نجـووم ‎ ‎ ‎ چۆن دەبێ دەفعی خـەیاڵ و خـەونی شووم؟ (۸۴۳)

گشـتی کوتیـان ئێمـەچارێک وا دەکـەین ‎ ‎ ‎ سـەد، لـەڕێی ئـەو هاتنـەدونیا، چـا دەکـەین (۸۴۴)

تـا شـەوێکی کـاتی بـوونی هـات منـاڵ ‎ ‎ ‎ دارو دەسـتەی فیرعـەون وای بـوو خـەیاڵ (۸۴۵)

تـا سـبەینێ زوو هـەموویان بێنـەدەر ‎ ‎ ‎ بەرنەمەیـدان تـەختی شاهی، شاش لەسـەر (۸۴۶)

گزبکـەن جـا، گشـت ئیسـڕائیلیان ‎ ‎ ‎ دەیهـەوێ شـا ئێوەبێنەئـەو مـەکان (۸۴۷)

تـاکو ئێوەشـا، ببیـنن، بـێ نیقـاب ‎ ‎ ‎ پێـو عـەتاکا، تـاکو ئیحسـان و سـەواب (۸۴۸)

دیتنـی شـا، قـەت لـەبۆ وان جـوور نـەبوو ‎ ‎ ‎ دیتنـی شـا،بۆ ئـەوان دەسـتوور نـەبوو (۸۴۹)

گـەر لـە ڕێگـا، ڕوویـی شـایان دیتبـا ‎ ‎ ‎ زوو بەسـەر ڕوو کەوتباناپـەدەبا (۸۵۰)

جونکـەقانوون بـوو نـەبینێ هـیچ ئەسـیر ‎ ‎ ‎ قـەت لـەهیچ کاتێـک ڕوویـی ئـەو ئـەمیر (۸۵۱)

دەنگـی جـاڕ چیـانی لەهـەرجێ بیسـتبا ‎ ‎ ‎ تـا نـەبینی، ڕوو بـەدیوار بـا دەبـا (۸۵۲)

گەرکودیبای موجریم،ئەومەحسووب دەبوو ‎ ‎ ‎ ئـەو عـەزابی بـوو، شـەدیدمەغزووب دەبـوو (۸۵۳)

ویسـتی وانـیش بـوو لیقـائی مومتـەنیع ‎ ‎ ‎ چـون حەریسـەئا دەمـی ( فیمـا مونیـع) (۸۵۴)

ئـەی ئەسـیران بچنەمەیـدان ئێوەعـام ‎ ‎ ‎ تـا ببیـنن شـاەو، ئـەنعامی تـەمام (۸۵۵)

کـاتێ بیسـتیان موژدەئیسـڕائیلیان ‎ ‎ ‎ زێدەموشـتاق بـوون بـەو دیـدار ئـەوان (۸۵۶)

گشت فریو یان خوارد چوون بۆ لایی وی ‎ ‎ ‎ بـوو دەسـەریان دا هـەموو سـەو دایـی وی (۸۵۷)

هـەر وەکـوو لێرەمـە غـوولی حیلەگـەر ‎ ‎ ‎ دەیکوت ئەو دەموێ لە میسریان یـەک نەفەر (۸۵۸)

میسریان گشت کۆوەکەن بۆیـەک تـەرەف ‎ ‎ ‎ تـا کـو بـەوجوورە،وەدەس بێ،بۆن هـەدەف (۸۵۹)

هـەرچی هاتبـا پێیـدەکوترا، تـۆ کـەنی ‎ ‎ ‎ لـەو قولینچکـە، دابنیشـە، تـۆ خـەنی (۸۶۰)

کـۆ وەبـوون بـەو فێڵەمیسـری گشـتییان    یەک بەیەک، پاشان مـەغوولا ن،کوشتییان[1]
چون بـەبانگی نوێژ، نـەیان دا هیچ جـەواب    هـات بەسـەریان وا شـەدید دەردو عـەزاب
فێڵـی فێڵبـاز بردنـی بـۆ لای نـەمان    ئەلئـەمان لـەو مـەکری شـەیتان، ئەلئـەمان
بـانگی دەروێشـان و موحتاجـان ببـێ    تـا بـەدەنگی حیلەگـەر گوێـت کـەڕ نـەبێ
گـەر گـەدایان تـامیع و بـەد خـوون، ئـەتۆ    ئـەهلی دڵ نێـو ئەغنییاکـە، جسـتو جـۆ
قـەعری دەریا وەک دوڕان تێیدایـە، سـەنگ    ئیفتیخـارو پیـاوەتی تێدایـە، نـەنگ[2]
هاتنـەجۆش ئیسـڕائیلی دێهـات و شـار    ئـەووەڵی ڕۆژ، چوونـەلای مەیـدان بـەغار
چـوون بـەفێڵی بردنەمەیـدان شـا    ڕوویـی خـوی جـوان دا نیشـانی وان، شـا
بەخشـش و دڵـداری وانـی زۆر دەدا    شـاهی زاڵـم زۆر بـەوانی دا، عـەتا
جـا لەپاشـان پێیکـوتن بـۆ حیفـزی گیـان    گشت بنوون ئـەو شـەو لەمەیدان تـا بـەیان
جوابیـان دا، ئێمەخزمـەتکاری تـۆین    تـا نـەڵێی تـۆ، ئێمـەلێرەکوا دەڕۆیـن؟

**گەڕانەوەی فیرعەون لە مەیدان بۆ شار، شاد و خۆشحاڵ بە جودا کردنی بەنی ئیسرائیل لە ژنەکانیان لەشەوی حەملدا ..**

شـا،گەڕاوەماڵی خـۆی زۆر شـادمان    ئـەو شـۆ، وەختـی حەملـەلایان، نـین ژنـان
جـا لەخزمـەت وی بـووعیمران، خەزنـەدار    ئـەو لەخزمـەت شـا، گـەڕاوە، هاتەشـار
پێیکـوت ئـەی عیمـران بنـوو لای دەرکـەتۆ    ئـەو شـەوە، ئـەمما لـەبۆ لای ژن مـەڕۆ
بـاش، دەنـووم پێیکـوت، لەبـەردەرگاهی تـۆ    فکـرو بیـری مـن فەقـەت دڵخـواهی تـۆ
یـەک لەئیسـڕائیلیان، عیمـڕان بـوو    ئـەو بـەڵام بۆشـا، عـەزیز، وەک گیـان بـوو
کـوا لـەلای وابـوو خیلافـی شـا دەکـا؟    هـەرچی ترسـی بـێ لـەوی شـا، وا دەکـا

**جەمع بوونی عیمران دەگەڵ دایکی مووسا، و حامیلەبوونی دایکی مووسا(ع)...**

شا کەڕۆیشت ئەو لەبەر دەرگا دەنوست    نیوەشـەو ژن هاتـەلای وی، زێدەچوسـت
تـێ خـزا، ژن، مـاچی کـرد دوو لێـوی ئـەو    وای لەخـەو وشـیار دەکـرد ئـەو نیوەشـەو
دی، ژنـی خـۆی شـادو خۆشـحاڵ وا لـەلای    مـاچ دەبـارێنی وەکـوو، بـاران بـەبای

---

[1] - تاکو بەو فێڵەهەموویان کۆ کران    گەردەنی هەموان لەپاشان لێدران
[2] - ژێری دەریا گەو هەرو بەردی هەیە    وەک دەنێو عار،فەخرو هەم مەردی هەیە

ــدەکوت باعیس چ بوو هاتوویەلام؟    جوابی دا، شەوق و قەزای، خوا ی،لا یەنام (٨٨١)
ـرتیەباوەش، زۆر بەخۆشی و شا دمان    ئیختیاری لا نەما هیچ ئەو زەمان (٨٨٢)
ــزێت دەبوون، داینائەمانەت لای ژن    پێیدەکوت مەیڵی بە هیچکەس غەیری من (٨٨٣)
ـ ـ ەئاسن بەرد، ئاگر چادەبوو    ئاگرێک دوژمن بەگیانی شا، دەبوو (٨٨٤)
جەنـنی هەورم، تۆ زەوی،مووسا، نەبات    حەق،شەهی شەترەنج و،ئێمەش مات مات (٨٨٥)
ـتۆ بردن، بەس بەدەس خوای لەو سەرە    بێ دەلیل قەت تۆنەکەی من مەسخەرە (٨٨٦)
ـەو شتەی فیرعەون زۆرترسا لەوی    ئێمەلێک نیزیک کەبووین،ئەو هاتەدی (٨٨٧)

## وەسیەت کردنی عیمڕان بە هاوسەری خۆی پاش نیزیکی کردن، کە ئەو مەتڵەبە باس مەکە..

ـــس مەکەلەو مەتڵەبە، تۆ زۆرو کەم    تا نەیەت بۆ سەر من و تۆ، زێدەغەم (٨٨٨)
ـقیبەت ئاساری وەی پەیدا دەبێ    وەک دەڵێن ئەستێرەناسان وا دەبێ (٨٨٩)
ـت لەمەیدان دەنگ و غەو غا ئەو دەمە    بیستیان عالەم هەموو ئەو هەمهەمە (٨٩٠)
ـا لەترسان پێخەواس زوو هاتەدەر    تا بزانێتن لەوێ باس و خەبەر (٨٩١)
ـت لەمەیدان دەنگ و غەوغا، بێ حیساب    جنن و دێو،ترسان لەبۆ یان بێ، عەزاب (٨٩٢)
ـیدەکوت عیمڕان، شا، بێ پایەدار    جوونەشادن، چونکەدیتیان شەهریار (٨٩٣)
ــدمانی وا، بەلوتفی شا، دەکەن    هەڵپەڕین و چەپڵەڕێزان، وا، دەکەن (٨٩٤)
ـیدەکوت شا، ڕەنگەوابێ، خۆ بەلام    من لەژێر چەتری خەیاڵات دا، دەمام (٨٩٥)

## ترسانی فیرعەون لەو هەرا و هوریایە...

ـەو سەدایەگیانی من تەغییر بوو    بەو غەمی تاڵ، جیسمی من زۆر پیربوو (٨٩٦)
ـتۆ چۆی کرد تا سەحەر جا، شای نەزان    وەک ژنێکی ژانی بێتێ وەختی زان (٨٩٧)
ـرو بار دەیکوت بەعیمڕان، خۆ ئەمن    بەو هەرایە، هاتەدەر،ڕیشەم لەبن (٨٩٨)
ـیدەکوت عیمڕان، باسی کاری خۆی    تێکەڵاوی،گەڵ ژنی غەمخواری خۆی (٨٩٩)
ـیدەکوت ژن بوودەگەڵ من، هاو سەرین    نەجمی مووسا، ڕوونی کرد دونیای بەرین (٩٠٠)
ـیەیەمبەرنێو ڕەحیم بگرێ قەرار    نەجمی وی سەر ئاسمان ڕوون ئاشکار (٩٠١)

**زاهیربوونی ئەستێرەی مووسا(ع) لە ئاسمان و غەوغای ئەستێرەناسان لە مەیدان ...**

نەجمی مووسابوو لەئاسمان ئاشکار
کوێربێ با، فیرعەونی نا بەکار

ڕۆژ کەهات پێیکوت بڕۆ عیمران، زوو
تابزانی ئەو هەراو هوریا، چ بوو

چوو لەبۆ مەید ان عیمران، زیدەچوست
پێیکوتن چی بوو هەرا، شا، خۆ نەنوست

گشت مونەجیم پێ پەتی و، ئێقەدڕاو
وەک عەزا دار، تۆز لەسەر، پەخش و بڵاو

هەروەکوو ساحەب عەزا بوو دەنگیان
نەرمو گیراو، هەم پەڕی بوو، ڕەنگیان

ڕیش و موو، هەڵقەندرا وو، ڕوو ڕنا و
خاک بەسەر دابێژراو و، خوێن بەچاو

پێیکوتن بۆچی وەها ئاشووبە،حاڵ؟
دیار دەکا ئەو هەش، نیشانەی نەحسی ساڵ

عوزرییان هێناوەکوتیان ئەی ئەمیر
دەستی تەقدیر ئێستە ئێمەی کرد ئەسیر

بەو هەموو سەعیەش،حکوومەت تار، بوو
هات دوژمن، پەرچەمیشمان، لار، بوو

ئێمەهەرچەن بین، بەکوێری چاومان
هات ستێرەی ئەو کوڕە، سەر ئاسمان

بەو ستێرەدیارەڕوو ن بوو ئاسمان
بۆیەئێمە وا دەکەین دادو فیغان

شا بەدڵ،عیمران بەزاهیر، دای لەخۆی
ئاخ و سەت حەسرەت، کەشاهەنشاه، ڕۆی

ئەو بەزاهیر خۆی نیشان دا زۆر غەمین
هەر وەکوو دێوانەکەو تەسەر زەمین

خۆی بەزاهیر ئەو دەمی، نادان نوواند
زۆر بەناحەز هات ئەو خەڵکی دوواند

ئەو بەزاهیر خۆیی غەمبار کردبوو
باتینەن شاد بوو کەبازی بردبوو

ئێوەعەزڵ و کرد دەزانم، شایی من
خائین و تامیع لەبۆ مەو لا یی من

ویستتان شا، بێتەمەیدان ئێوەگشت
تاکوو ئابڕووی شاهی ئێمەو، ئێوەڕشت

ئێوەقەو ل و دا، دەبین بۆ شا، زەمان
دوور دەکەین ئێمەلەشا، دەردو غەمان

شا، کەبیستی زوو،کوتی ئەی خائینان
من دەدەم ئێوەلەدار، ناو دەم ئەمان

من بەڕایی ئێوەخۆم کرد مەسخەرە
ماڵی خۆم دا دوژمنانم، یەک سەرە

تاکو ئەو شەو گشتی ئیسڕا ئیلیان
هەڵبڕا بوون گشت، لەنیزیکی ژنان

ماڵ کەڕۆی، ئابڕوو نەما، کار زیدەخام
کارو دۆستایی وەهایەگەڵ کیڕام؟

من بەئێوەم دا گەلێ مووچەو خەڵات
چۆنی ویستان سوودی پێتان دا وڵات

ئەو هەبوو دا خوا ئەوەی دەیکوت نجووم؟
موفتەخۆرن فێڵەبازن، زیدە شووم

ئاگر و تێبەر دەدەم، پاش هەڵدڕین
پاشی گوێ وو، لووتو لێو، لێ هەڵبڕین

دەستەچیلەی ئاگر و لێ چادەکەم
زیندەگی خۆشتان، هەموو بەر با، دەکەم

سەجدەیان بردو دەیانکوت ئەی ئەمیر — گەر چەلێکی داین شکەست دێوی شەریر (۹۲۸)

ئەندەهێشت بێتن بەلا چەندین ساڵ — کاری وامان کرد، حەیران ما خەیاڵ (۹۲۹)

گەرچی لەوحەملەنەبووین هیچ هوو شیار — نوتفەدەرهات چوولەجێی خۆی گرت قەرار (۹۳۰)

خۆ بەلام لەو جورمەئیستیغفار دەکەین — ڕۆژ ی بوونی وی لەدایک،دیار دەکەین (۹۳۱)

ڕۆژ ی بوونی وی دەقیقەن دیار دەکەین — بۆ نەهاتن، تا قەزا، ناچار دەکەین (۹۳۲)

وا نەبین گەر، بنکوژە، بێ وەقفەتۆش — ئەی غولامی ڕایی تۆ، ئەفکارو هۆش (۹۳۳)

تاکو نۆ مانگ، ڕۆژبەڕۆژیان کرد ژمار — تاکو نەبڕێ، تیغی حوکمی کردگار (۹۳۴)

هەرکەسێکی حەملەکا بۆ سەر قەزا — ئەو بەخوێنی خۆی دەکا سوور، هەرقەزا (۹۳۵)

گەر دەگەڵ ئاسمان عەداوەت کا، زەوی — ئەودەبێتەشۆرەکات،دێ مەرگی وی (۹۳۶)

نەقش گەڵ نەققاش گەرکا، دوشمەنی — ئەو سمێڵ و ڕیشی خۆی، خۆی هەڵقەنی (۹۳۷)

### دەعوەت کردنی فیرعەون، ژنانی منداڵ بوو، بە فێڵ بۆ مەیدان...

چوو لەبۆ مەیدان پاش نۆ مانگ، شا — جاڕ چیش بەو جوورەخەڵکی جاڕ دەدا (۹۳۸)

بچنەمەیدان ئەی ژنان هاوڕێی منال — گشتی ئیسرائیلیان دەرچن لەماڵ (۹۳۹)

چەشنی پارپیاوان کەنۆبەی وان دەهات — یەک بەیەک وەریان دەگرت زێڕوخەلات (۹۴۰)

ئێستەئەو ساڵ نۆ بەیانەبێن، ژنان — وەر گرن تا هەرشتێ ویستیان ئەوان (۹۴۱)

وەرگرن تا ژن لەدەستی شا، خەلات — بۆ منالانیش کلاوی زێڕ بدات (۹۴۲)

هەرکەسێک ئەو مانگەمنداڵی بووە — وەر گرێ ئەو گەنج لەشا، تاکو زووە (۹۴۳)

جا، دەگەڵ منداڵی خۆ،هاتن ژنان — تاکو خەیمەو بارەگای شا، شادمان (۹۴۴)

هەرژنێ نەو زادی بوو، دەرچوو لەشار — هات لەبۆ مەیدان و غافڵ بوو لەژار (۹۴۵)

گەر لەلای فیرعەونی کۆ بوون ژن،تەمام — هەرمناڵێک کوڕبوو، ئەستاندیان، بەعام (۹۴۶)

گشتییان سەر لێوەکردن، تا ئەوان — نەبنەدوژمن قەت لەبۆ پاشای زەمان (۹۴۷)

### بەدونیاهاتنی مووسا(ع) و هاتنی دار و دەستەی فیرعەون بۆ ماڵی عیمران و وەحیی هاتن بۆ دایکی مووسا کە مووسا دە ئاگر باوێ...

هاوسەری عیمران مووسای بردبوو — دی کەمەیدان زۆر شلۆوغە، ئەو نەچوو (۹۴۸)

ناردی بۆ مالان ژنانی قابیلە — تێبگەن تا وەزعی حەملی حامیلە (۹۴۹)

وا بەشایان دا خەبەر،خەفیەی وڵات — یەک منال لەو ماڵەبۆ مەیدان نەهات (۹۵۰)

وای بەشا، دا یەک ژنی جاسووس خەبەر     پێدەزانم یەک ژنی منداڵەبەر
پاش نیشاندان،زێدەمەئموورچوونەژوور     ئەمری حەق هات، بیخەمنداڵ، نێو تەنوور
وەحیی نارد بۆ دایکی مووسا، خوای جەلیل     بیخەئاگر ئەوکوڕەی نەسلی خەلیل
خوا کوتی ( یانارِ کونی باردا )     بۆیەئاگر هیچ ئەوی ئازار نەدا
ژن بەئەمری حەق خستیەنێو شەرەر     ئاگری سووزان نەی کرد لەو، ئەسەر
چونکەمەئیووس بوون مەئموور،چوونەدەر     جا رەکی دیش بوونەجاسوو س، با خەبەر
ماجەڕایان کوت بەشا، مەئمووری شا     زۆر بەپووڵێک کەم، لەبۆ مزدووری شا
ئەوچەلەش تەحقیق بکەن لەو ماڵەدا     بێ گومان تەحقیق، بەئێوەسوود دەدا

**وەحیی هاتن بۆ دایکی مووسا کە مووسا دە ئاوی باوێ...**

وەحیی بۆهات دایکی مووسا ئەچەلەش     بیخەنێو ئاو، غەم مەخۆ، تۆ ئەو هەلەش
بیخەنێو نیل ئیعتیمادت بێ، ئەتۆش     دەت گەیێنم من ئەتۆ بەو، تۆش خۆش[1]
زۆری فەنن و فێڵ کردن فیر عەون     کوێرەڕێ چوو،ڕێی ئەسلی کرد ون
سەت هەزارا ن تیفلی کوشت،خاریج لەماڵ     داخلیش مووسا دەژی، زۆر خۆشحاڵ
ئەو جنوونی بوو کەکوشتی زۆرجەنین     فێڵەبازبوو نەیبوو چاوی راست بین
ئەژدیهابوو مەکری فیرعەونی لەعین     قووتی دا بوون مەکری شایانی زەمین
خۆ بەڵام هات یەک لەوی زیاتر قەوی     قووتی دا، هەم فیرعەون، هەم مەکری وی
ئەژدەها بوو ئەو،عەساش بۆ ئەژدەها     حوکمی حەق بوو ئەژدەهای قووتدا عەسا
دەس گەلێک بالایی دەس هەن هەر وەها     تا دەگاتەحەق، (الیەالمنتها )
زاتی حەق دەریایەکە، بێ ئینتیها     گشتی دەر یای دی لەلای وی، بێ بەها
مەکرو فێڵ و حیلە، گەر بوون ئەژد ەها     خۆ لەحاستی قودرەتی وی بوونە( نا )
من بەیانم کەو تەسەجدە، لێرەدا     مات دەما، زانای بەڕاستی هەر خودا
ئەو شتەی فیرعەون بووی، هەن لایی تۆ     خۆ بەڵام مەحبووسەئەژدیهایی تۆ
هەرسیفاتی تۆن بەیانم کرد لەبۆت     نیسبەتت داون، بەفیر عەون، نەک بەخۆت
هەرچی وەسفت بێژێ پێت دێوانەیە     وەسفی خەڵکی دیش لەلات، ئەفسانەیە
زۆر ئەتۆ نابوود دەکا نەفسی لەعین     زۆر لەحەق تۆ دوور دەکا تن ئەو قەرین

---

[1]- دەت گەیێنم من ئەتۆ بەو ، زێدەخۆش (مصرع دوم)

قودرەتی فیرعەون گەرلای تۆش هەبا    بۆ فەساد وەک وی دەبووی نەک لەوجودا (٩٧٥)

**حیکایەتی مارگیرێک کە ئەژدیهایەکی سڕی بە مردوو زانی و تەناف پێچی کرد و هینا یە بەغدا ..**

**خولاسەی داستان...**

دەڵێن مارگیرێک بۆ گرتنی ماران چۆ شاخان، پاش جستوجۆیەکی زۆر چاوی بە ئەژدیهایەکی گەورە کەوت، کەدەنێو بەفرێ وەک مردوو دەهاتەبەر چاو مار گیر فەو ڕەن دەس بەکار بوو وئەژدیهایەکەی بەزنجیر و تەنافان بەست وبەرەو شاری بەغدا وەڕێ کەوت تا نوما یشی پێبدات ولەو ڕێگایەپوولێکی چاکی وەدەس کەوێ، ئەژدیهای سڕی بەدوای خۆیدا ڕا دەکێشا تا کو گەیشتەقەراغ چۆمی دەجلەلەبەغدا، وبەند و بیساتی نومایشی لەوێ دانا، وعالەم لەهەموو لایەکەوەبۆ تەماشا هرووژمیان هینا، وجەماعەت ئەوەندەزۆر بوو کەئەگەر دەرزیت هەڵا ویشتبا نەدەکەوتەعەرزی، هێندەی پێنەچوو کەڕۆژ هەڵات وهەموو لا یەکی گەرم دا هینا و ئەژدیهای سڕیش کەمکەم گەرم بۆوە، و وردەوردەبزووت، عالەم لەدیتنی ئەو سەحنەوەحشەتناکەهەڵاتن، وئەژدیهای تووڕەزنجیرو تەنافی پساندن و ڕۆی، وعالەمیش لەهەموو لایەکەوە، هەڵدەهاتن، بەڵام چونکەجەماعەت زیاد لەحەد زۆر بوون بەعزێک وەبن دەست و پێیان کەوتن و تەلەف بوون، مار گیریش لەترسان، حەیران و سەرسام لەجێی خۆی وشک ببوو، وبەخۆی دەکوت عەجەب دیاریەکم لەشاخی ڕا هیناوە، ئەژدیها حەملەی کردەمار گیر و فەو ڕەن کوشتی عالەمیش هەرا سان لەترسان هەڵدەهاتن ..

داستانێک بۆت دەڵێ تاریخ گۆ    تا لەرازی نادیار بۆت بێت، بۆ (٩٧٦)
مارگیرێک چوو لەبۆ لای کۆهسار    تاکوبگرێ ئەو بەئەفسوونان مار (٩٧٧)
شەخسی عاقڵ ئەو قسەی بڕوا دەکا    جستۆجۆ کەر،عاقیبەت پەیدا دەکا (٩٧٨)
تێتەڵەب کە، ڕا مەوەستە،بێ وچان    ڕابەری ڕێگا، تەڵەب بوو،بێ گومان (٩٧٩)
ڕەنگ وسست،بێ پێ،چەما وە،بێ ئەدەب    ڕوو لەوی کەهەر ئەوی کە،تۆ تەڵەب (٩٨٠)
جار بەگوفتار جار بەخامووشیی و جار[1]    بۆن و ئیستیشمام، بۆلای شەهریار (٩٨١)

[1]- جار بەگوفتار جار بەبێ گوفتارو جار (مصرع اول)

وایــــدەکوت یـــاقووب بەمنـــدالانی خـــۆی / جستوجۆ کەن زیاد لەحەد یوسوف لەبۆی (۰۰۲
حیسســی خۆتــان ئێوەزۆرچاک،بــەن بــەکار / جستو جـۆ کـەن ئێوەبـاش، بـن بـەردو دار (۰۰۳
پێیکـوتن مـــەئیووس لـــەلوتفی خـــوا مـــەبن / وەک ئـەوەی لێـی ون نـەبێ کـوڕ، وا مـەبن (۰۰۴
جــا، لــەرێگای حیسســی زار، جۆیــا بــبن / موتتـــەزیر بـــەگوێ، لەهـــەرچوار، لا بـــبن (۰۰۵
گەر لەهەرجێ بۆنی خۆش هات ڕووکەوێ / ڕازی دڵخـــوازت هـــەتا تـــۆدەس کـــەوێ (۶
لوتف و خۆشیت گەر، لەهەرجێ، دی ئەتۆ / تـــاکو ئەســڵت دە ســکەوێ، بــۆ وێ بــڕۆ (۰۰۷
جــوزئی دەریــای بــێ بــنن، جــوانی تــەواو / لابـــەجوزئان بگرەکول،تــۆ ژێـــر چـــاو
شەڕ دەکەن خەڵکی کەچاکەی بێننەدەست / خۆشـــبەختە، لادەنـــێ، دونیـــایی پەســـت (۰۰۸
خەشـــمی خـــەڵکی، ئاشـــتی چـــاوی وییـــە / ڕاحـــــەتی بـــــێ ڕاحـــــەتی، داوی وییـــــە
چادەکــا لێــدان مەحەببــەت، جـــارو بـــار / شوکری دێ لـەدوا، گیلایـەی دۆست و یار
تۆ لـەجوزء، بـۆ کـول بـڕۆ زوو ئـەی کـەریم / تـۆ لەزیـد بـۆ زیـد بـڕۆ زوو، ئـەی حـەکیم (۰۴۲
ئاشــتی دێــتن لــەدووی شــەڕ، عاقیبــەت / مـار گیـر مـاری دەگـرت بـۆ مەنفەعـەت (۰۴۳
دەیهـــەوێ مار،ســـوودی تـــا بـــێ، ئـــادەمی / بۆیـــەدەخوا غـــەم، نـــەمێنێ تـــا غـــەمی (۰۴۴
چــوو گــەڕا نێــو بــەفری سەرشــاخان هــەتا / بگـرێ ئـەو، مارێـک عـەزیم وەک ئـەژدەها (۰۴۵
دیتـــی ئـــەژ دیهایـــەکی مـــردوو لـــەوێ / چــی نــەما بــوو دڵ لەترســان دەرکــەوێ (۰۴۶
مـــارگیر دەی ویســـت لـــەنێو بـــەفری شـــێتا / مـــاری گـــەورە، دی لـــەناکاو ئـــەژدیها (۰۴۷
دەگرێ مار، مارگیر لەبەر حەیرانی خەڵک / جـــا بزانەئـــەو هەیـــەنادانی، خـــەڵک (۰۴۸
کێوەئینســـــان، بـــــەر قەرارە،پایـــــەدار / چۆن دەبێ حەیران و مات بێ کێو، بەمار؟ (۰۴۴
خۆیـــو قـــەدری خـــۆی نەناســـی ئـــادەمی / ئـەو لـەزۆری مەعنـەوی هـات، بـۆ کـەمی (۰
خــۆی فرۆشــت ئینسـان بەهەرزان،زیندەکەم / ڕۆژی ڕوون بوو،خـۆی دەخستەجیسمی تـەم (
سـەت هـەزارن مـارو کێـو حـەیرانی وی / چـۆن دەبێ مـار بێت، ببێ سـەیرانی وی؟ (۲
ئـەژدیهای گـرت مـار گیرجـا، جـێ بـەجێ / بـــۆ نومـــایش ڕوو بەبەغـــدا کەوتـــەڕێ (۳
ئـەژدەها وەک کۆڵەکـەی مـاڵ بـوو، زەلام / ڕای دەکێشـــا بیـــدەنێ تـــا، پووڵ،عـــەوام (۴
ئـــەژدەهام هینـــاوەمردوو، چـــاو، چـــاو / زۆرعـــەزابم دی،کــە ئــەو هــەم کــرد ڕاو (۵
وایـــــدەزانی ئەژدەهاکـــــەی، مـــــردووە / نەیـــدەزانی ئیشـــتیبای ئـــەو کـــردووە (۶

ەفرو سەرما، بوو سەبەب، ئەو سڕ، ببو  گیان لەبەربوو،وا کەماتو کڕ ببوو (۱۰۰۷)

ەی جیهانەی سڕ، کەپێی بێژن جەماد  جامیدیش، بێ حاڵ و سڕ، ئەی ئووستاد (۱۰۰۸)

ەر هەتاوی حەشر، زاهیربێ و عەیان  تۆ دەبینی جونبشی جیسمی جیهان (۱۰۰۹)

جۆن عەسای مووسا لەدونیا، بوو بەمار  جامیدان گیاندار دەزانی هووشیار (۱۰۱۰)

جۆن بەخاکی تۆی خوداوەند،گیان دەدا  لا ئیقن خاکان ستایش کەن خودا (۱۰۱۱)

ر ەمردوونەو لەلای دی گیاندار  لێرەخامووشن، لەلای دی،پڕ وتار (۱۰۱۲)

ەر تەوەججو ە،کا بەمەعنی ئادەمی  جامیدان گیا ندار دەبینێ ئەو دەمی (۱۰۱۳)

خەخوانی چەشنی داوود،کێو دەبێ  جەوهەری ئاسن،بەحەق، وەک مێودەبێ (۱۰۱۴)

ۆ سولەیمانیش دەبێ حەمباڵ، با  یەم دەگەڵ مووسا دەکا گوفتار جا (۱۰۱۵)

نگ دەبینێ چاک ئیشارەی ئەحمەدی  بۆ خەلیل گولزار لەئاگر دێ وەدی (۱۰۱۶)

ک. قاڕوون قووت دەدا هەر چەشنی مار  ئوستونی حەننانەدەگری، زار زا ر (۱۰۱۷)

رد.کەدی ئەحمەد، سەلامی لێدەکا  کێو لەبۆ یەحیا، دەخۆیدا، جێدەکا[1] (۱۰۱۸)

ەبینایین هەم سەمیع و شادمان  ئێمەخامۆشین دەگەڵ نا مەحرەمان (۱۰۱۹)

ەر دەچی بۆ لای جەمادی چۆن ئەدی  مەحرەمی گیانی جەمادات،خۆت دەدی؟[2] (۱۰۲۰)

ەرجەمادی جێ بهێڵی بۆ گییان  تۆ دەبیسی حەمدی گشت ئەجزای جیهان (۱۰۲۱)

نگی تەسبیحی جەمادات جا، ئەتۆ  چاک دەبیسی، هیچ فریو نادا ئەتۆ (۱۰۲۲)

جونکەگیانت نیتی قەندیل زۆر وکەم  بۆ وزووح تەئویل دەکەی تۆ، دەمبەدەم (۱۰۲۳)

جۆن لەتەسبیح زاهیری دەکرێ مەرام؟  ئیددیعای دیتن، خەیاڵی پووچ و خام (۱۰۲۴)

کەمەقسوود ئەو کەسەی دیتی ئەوان  عیبرەتی دەگرێ دەبێ تەسبیخ خوان (۱۰۲۵)

جونکەئەو تەسبیح بەیادی تۆدەدا  وەک ئەوەی چوو،کردی بێ تەسبیح ئەدا (۱۰۲۶)

ەو هەیەتەئویلی ئەهلی ئیعتیزال  یا ئەوەی نەی بێ لەتەئویل نوور، بۆ میساڵ (۱۰۲۷)

ەر لەحیس نەیدا نەجات خۆی ئادەمی  ئەو بەنیسبەت غەیب نادان، ئەو دەمی (۱۰۲۸)

ەس بێ، ئەو باسە، کە نیتی ئینتیها  ڕای‌دەکێشا مارگیر، ئەو ئەژدیها (۱۰۲۹)

ەژدیهای هینا هەتا بەغدایەئەو  تاکو چاکا، بەو هەراو، غەو غایەئەو (۱۰۳۰)

ەو قەراغی دەجلەداینا، هەنگەمە  شاری بەغدا، کەوتەنێوی، زەمزەمە (۱۰۳۱)

---

1- بەر، دەکا کاتێ کەدی ئەحمەد، سەلام  کێو دەنێرێتن لەبۆ یەحیا، پەیام

2- گەر دەچی بۆلای جەمادی تۆ، ئەدی  مەحرەمی گیانی جەمادات چۆن دەبی؟

ئەژدەهایەک گەورە، لای یەک مارگیر      زۆرعەجەب ئەوئەژدەهای چۆن کرد ئەسیر؟ (۱۰۳۲)

سەت هەزاران کۆ وەبوون ئەفرادی خام      چەشنی مارگیر ئەژدیهایان ویست تەمام (۱۰۳۳)

مونتەزیر بوون خەڵک و مار گیر مونتەزیر      تا لەهەرلابێن جەماعەت مونتەشیر (۱۰۳۴)

خەڵکی غەوغاو هەنگەمەی زیاتر ببێ      بەخشش وپووڵ دان گەلێ چاتر ببێ (۱۰۳۵)

سەت هەزاران کۆوەبوون بێکارو بار      جێ نەبوو گەر دەرزی باوێی بێتەخوار (۱۰۳۶)

خەڵکی لێکتر بێ خەبەر کردئیزدیحام      لێکدرابوون وەک قییامەت خاس و عام (۱۰۳۷)

هەرکەمار گیر دەستی کردەهەنگەمە      خەڵکی سەریان زۆر بڵێند کرد ئەو دەمە (۱۰۳۸)

ئەژدەهای سەرما زەدەش ئەفسوردەبوو      ئەولەژێر سەت جوور لیباس وپەردەبوو (۱۰۳۹)

بەست بووی ئەو چاک بەڕیسمانی قەوی      ئیحتییاتی کرد بوو، وای کرد لەوی (۱۰۴۰)

لەو دەمەی کەکۆ ببوون خەڵکی بەچین      دای لەئەژدیهای قەوی تاوی بەتین (۱۰۴۱)

تاوی تیندار هات ئەوی چاک گەرم کرد      هەرچی ساردی بوو لە ئەعزای لا دەبرد (۱۰۴۲)

مردبوو زیندوو وەبوو،زۆر جێی عەجەب      ئەژدەها کەمکەم بزووت،گەرما سەبەب (۱۰۴۳)

خەڵکی گەر دیتیان تەکانی مردەمار      حیرەتی وان زێدەتر بوو سەت هەزار (۱۰۴۴)

نەعرەیان کێشا لەترسان لێکڕا      گەر تەکانی خوارد، هەڵاتن تێکڕا (۱۰۴۵)

هەرکەبیستی ئەو هەرا و هوریاو دەنگ      بەند و زنجیری پساند زوو، بێ درەنگ (۱۰۴۶)

بەندی لەت کرد هاتەدەر جا، ئەولەژێر      ئەژدەهایەک پیس،غوڕڕان،چەشنی شێر (۱۰۴۷)

خەڵکی کوژران کاتێ عالەم گشت هەڵات      چا دەبوون لەوکوشتەزۆرە، یەک قەڵات (۱۰۴۸)

هێندەترسا مار گیر نەی کرد فیرار      چاو کەچم هینا لەدەشت و کۆهسار (۱۰۴۹)

کوێرەمەڕ وشیاری کرد گورگی تەلان      قاتڵی خۆی کرد پەنا بۆ خۆی، نەزان (۱۰۵۰)

ئەژدەها زوو قووتی دا، ئەو پیاوی گێژ      سەهلەحەججاج دائیمەن بێ، خوێن ڕێژ (۱۰۵۱)

خۆی لەدارێکی دەهاڵاند ئەژدەها      ئێسکی هەرچی خواردبووی گشت تێک شکا (۱۰۵۲)

نەفسی تۆش وەک ئەژدەها وایە، سڕە      چی لەدەس نایەکەوا ماتو کڕە (۱۰۵۳)

چەشنی فیرعەون، قودرەتی بێ نەفسی تۆ      پێن دەڵێ دەڕوا بەئەمرم، ئاوی جۆ (۱۰۵۴)

ژێر بینای فیرعەون ئەو دەم ڕا دەکا      کێشەگەڵ مووساووهاڕوون، چا دەکا (۱۰۵۵)

کرمی چووکەئەژدەها،گەر هەیبێ فەقر      جاەو، ماڵی بێ دەبێ مێشووڵە، سەقر (۱۰۵۶)

ئەژدەها بابێ لەنێو بەفرا ن غەمین      تۆ مەهێڵەلێی بدا قەت تاو بەتین (۱۰۵۷)

تا سڕو ئەفسوردەبێ،ئەو ئەژدەهات      خۆ دەنا دەت خوا ئەگەر بێ بێ، نەجات (۱۰۵۸)

ـت کەنەفست تاکو ئەوتۆ مات نەکات ... کەم کە، ڕەحمی بەو،نەبووئەهلی سیلات (١٠٥٩)

ـۆی شەهوەت گەرکو تینی دا، لەوی ... دێتەپەرواز ئەوخوفاشی سەر نەوی (١٠٦٠)

ـۆ:کوو مەردان دەگەڵ ویت بێ قیتال ... تاخودا بیدا بەتۆش پاداش، ویساڵ (١٠٦١)

ـەرکەئەژدیهای، هینا مار گیر ... بوو بەدێو، ئەو لەو هەوایەی گەرمەسیر (١٠٦٢)

ـاجەرەم فیتنەو هەرای پەیدا دەکرد ... زیاد لەوەی بیستووتەغەوغای چا دەکرد (١٠٦٣)

ـتهەوێ تۆ، ڕاگری ئەو، بێ جەفا ... شادمان و با ویقارو با وەفا (١٠٦٤)

ـۆ هەموو کەس کاری والەی دێ لەدەس؟ ... کاری والەدێ لەدەس مووسا وبەس (١٠٦٥)

ـەژدەهای مووساکەلەوکردیان فیرار ... خەڵکی کوژران،نەک هەزار،چەن سەت هەزار (١٠٦٦)

**تەهدید کردنی فیرعەون مووسا(ع)...**

ـیدەکوت فیرعەون، مووسا بێژەبۆ ... باعیسی کوژرانی خەڵکی بووی ئەتۆ؟ (١٠٦٧)

ـۆ دەبووی با عیس کەعالەم وا هەڵات ... مان لەبن پێ، کەم کەسان بوو یان، نەجات (١٠٦٨)

ـاجەرەم عالەم لەبۆ تۆ دوژمنە ... دوژمنی تۆن هەرچی پیاوەیا ژنە (١٠٦٩)

ـدعوەتت کرد، خەڵک بۆ لای خۆ ت بەڵام ... بوون بەدوژمن بۆ تۆ گشت عالەم، بەعام (١٠٧٠)

گەر لەشەڕت لادەدەم بۆ لای قەراغ ... فێڵەوایەلێت دەدەم ئاخر، پەیاغ (١٠٧١)

و مەزانەمن فریوی تۆ دەخۆم ... جا ئەتۆ ڕەهبەر دەکەم بۆ خەڵک و خۆم (١٠٧٢)

ـۆ نەبی مەغروور بەوەی کە، وات کرد ... عالەمت ترساند و گشتت مات کرد (١٠٧٣)

چەندەواکەی، عاقیبەت ڕیسوا دەبی ... دوژمنی تۆ، چۆنی ویست تۆ وا دەبی (١٠٧٤)

ـۆر لەدونیابوون وەکوو تۆ حیلەگەر ... عاقیبەت ڕیسوا دەبوون و، چوونەدەر (١٠٧٥)

**جوابدانەوەی مووسا بە فیرعەون کە مووسای تەهدید دەکرد...**

ـیدەکوت ئەمری خودام، پێ تاکە، من ... بم کوژی یا نەم کوژی پێم،چاکە، من (١٠٧٦)

ـاکرو ڕازیم ئەمن زۆر، ئەی حەریف ... لێرەبا ڕیسوا ببم لای خوا، شەریف (١٠٧٧)

ـا لەلای خەڵکی ببم خوار و زەلیل ... خۆ شەویست بم خۆ شە بۆم، لای خوا جەلیل (١٠٧٨)

جوابی تۆم ویست، پێت بدەم من،خۆ دەنا ... ڕوونە لام حەق تۆ دەکا، ڕیسواو فەنا (١٠٧٩)

گەو ڕەیی لائیق بەخواو، بەندانی وی ... ئادەم و ئیبلیس نیشانەی جوانی وی (١٠٨٠)

ـوایی نایەکارو زاتی کردگار ... بەس کەلەو باسە، ببەستەئێستەزار (١٠٨١)

### جوابدانەوەی فیرعەون بە مووسا (ع)...

پێیدەکوت فیرعەون حوکمی من حەقە — بۆ هەموو دونیایەحوکمم موتڵەقە (۰۲
گشتی منیان کرد قەبووڵ، خەڵکی جیهان — بێژەبۆ من، تۆ چ کارەی ئەی فلان (۰۳
خۆت بەزۆردەگری ئەتۆ مووسا، برۆ — خۆت بەکەم بگرەمەبە، مەغروور ئەتۆ (۰۴
کۆ دەکەم من، ساحیرانی رۆژگار — تا نیشاندەم جەهلی تۆ، بۆ خەڵکی شار (۰۵
کوا بەدوو رۆژ کاری والەچا، دەبێ؟ — تا چلەی هاوین سەبر کە، چا، دەبێ (۰۶

### جواب دانەوەی مووسا بە فیرعەون ...

پێیدەکوت مووسا لەبۆ م، دەستوور نییە — عەبدی خوامەمۆ لەتت، مەئموور نییە (۰۷
گەرچی تۆ شایو، منیش یارم نییە — من موتیعم هیچ بەوان،کارم نییە (۰۸
من دەگەڵ تۆتا کو هەم دەعوا دەکەم — ئەمری حەق، هەرچۆن ببێ، من وا دەکەم (۰۹
تا دەگا حوکمی خودا، دەعوا دەکەم — تاکو لێکمان جیادەکا، هەر وا دەکەم (۱۰

### جواب دانەوی فیرعەون بە مووسا(ع) و وەحی هاتن بۆ مووسا(ع)...

پێیکوتن فیرعەون مۆ لەت با ببێ — کەم کە، فێڵان، کاری چاکت جا ببێ (۱
وەحیی بۆ مووسا دەنارد خوا، جێ بەجێ — مۆ لەتی دە، هیچ لەوی ترست نەبێ (۲
ویستی چل رۆژ مۆڵەتی دەی، تۆ، بدە — با بکا فێڵان، بەهەشت و نۆ و، دە (۳
چی لەدەس دێ، با بەبێ پەروا، بکا — من لەلاتم، چۆنی ویست با وا، بکا (۴
مەکرو فێڵی وا، هەموو من تێک دەدەم — زیاد ببێ گەر فێڵی وان، دەیکەم بەکەم (۵
ئاو کەبێنن جێ بەجێ دەیکەم بەنار — شەربەتی شیرینی وان دەیکەم، بەژار (۶
میهر وعیشقی وان بەێێک، ئیمحا دەکەم — چی لەفیکری وان نایەت، وا دەکەم (۷
تۆ مەترسەمۆ لەتی دەزێدەزۆر — کۆ وەکا لەشکر، بکەن فێڵ جۆر بەجۆر (۸

### مۆڵەت دانی مووسا بەفیرعەون تا ساحیران لە مەیدان کۆوەکا...

پێیدەکوت مۆڵەت درای فەرمانەهات — دەچمە جێی خۆم تۆ ش لەدەستم بووی نەجات (۹
کەو تەرێ مووساوو،ئەژدیهاش لەدوو — وەک سەگێکی باوەفاو، وشیاربوو (۰
کلکی سووڕاند چەشنی تاجی توندو تۆڵ — بەردی ژێر خۆی ورد،دەکردوەک تۆزوخۆڵ (۱
بەردو ئاسنی هەر وەکوو یەک قووت دەدان — ئاشکرا وردی دەکرد ئاسن، بەدان (۲

وەختــی ڕاوەســتان بەقــەد، بــاڵایی بــورج — جا، دەدەترسـان زۆرلـەوی ڕۆمیـی و گـورج (١١٠٣)
ئـەو هـەڵی دەخرانـد کـەف وەک لۆک،جـا — گـول دەبوو،قـەترێک وەهەرکـەس کـەوتبا (١١٠٤)
دڵ لەبــەر دەنگــی ددانــی دەر دەهــات — عومری گیانی شێر کەبیسبای، سەر دەهات (١١٠٥)
هەرکەچۆ لای قەو می خۆی ئەو موجتەبا — کـونجی لێـوی گـرت و دیسـان بـۆ عەسـا (١١٠٦)
دای لەسەروی تەکیەدەیکوت ئەی عەجەب — ڕۆژەبـۆ مـن بـۆ عەدووشـم بووبەشــەب (١١٠٧)
زۆر عەجـەب مام لـەو سپای فیرعـەونی دوون — بـۆچی نـا بیـنن لەچێشـتان ڕۆژی ڕوون؟ (١١٠٨)
چــاوو گوێیــان بــازو زۆریــش هووشــیار — مام عەجەب چۆ ن چاوی بەستن کردگار (١١٠٩)
زۆرعەجـەب ماوون لەمن،هـەم مـن لـەوان — یەک بەهار لێی بوون بەخار، من ئەڕغـەوان (١١١٠)
زۆر لــەبۆ وانــم دەبــرد جــامی شــەراب — بـوو بەبـەرد،ئاوی شـەرابی خـۆ ش و نـاب (١١١١)
بـۆم دەبـردن دەسـتەگوڵ شـاد و جـووان — گوڵ بـەخار تەبدیل دەبوو شادیش بەژان (١١١٢)
قیســــمەتی وا، لائیقــــی پاکانەبــــەس — نـەک لـەبۆ خودخواهو، مـەغروورانی خـەس (١١١٣)
یارمــان نــا بــێ لــەدونیا هــەیبێ هـۆش — تـا بەوشـیاری ببینــێ خــەو نــی خـۆش (١١١٤)
دوژمنــی ئــەو خەونەخۆشـەن،فکری خـەڵق — تــا نــەنوون فکـری وەهــا، بەسـراوەحەڵق (١١١٥)
حیرەتێــک لازم بــوو لابــا گشــتی فیکــر — لادەبـا حیـرەت هـەچی بێ، فیکـرو زیکـر (١١١٦)
هەرکەسـێک هـەیبێ لـەدونیا، زۆر هونـەر — ئـەو بـەزاهیر بـاش، بـەباتین خـۆڵ وەسـەر (١١١٧)
( ڕاجعـون ) ی کـوت ڕجـووعیش تـۆ بڵـێ — بێتەوەمێگــەڵ لــەبۆ جێــی ئــەووەڵێ (١١١٨)
گــەر لەســەحرا هاتــەوە، ئــەو مێگەلــە — نێـری پـێش مـەڕ، دیتـەئاخیر، ئـەو چەلـە (١١١٩)
بزنــی لــەنگی دوایــی مێگــەل، دیتــەپێش — شاد دەکا، ڕیجعەت، دڵی پڕ دەرد و ئێش (١١٢٠)
ئـەولیا یـان چـۆن دەبـن بێهـوودە، لـەنگ؟ — فـەخر، دەفرۆشـن دەسـێنن عـارو نـەنگ (١١٢١)
لاق شکاو چـوون، ئـەو گرووهـە، تـاکو حـەج — ڕێ لـەجێی سـەخت، نـا دیارەتـا فـەرەج (١١٢٢)
گشـتی دانیشـیان وەلا نـان ئـەو فـەریق — چونکــەنازانێت دانــیش ئــەو تــەریق (١١٢٣)
دانیشـێک لازم کـە ئەسـڵی لـەو سـەرە — چونکەئەسـڵان، فـەرع، بـۆ وان ڕەهبـەرە (١١٢٤)
نـافڕن گشـت بـاڵ لەسـەر دەریـا، هـەتا — لای خوداوەنـد، تـۆ دەبـا عیلمــی خـودا (١١٢٥)
فێـری خـەڵکی بـۆ دەکـەی ئـەو عیلمـەتۆ؟ — پـاک دەکـەن سینان لـەوی، بێ گفتـو گـۆ (١١٢٦)
تــۆ مەبەپێشــڕەو، لــەدونیا، لــەنگ بــە — تــۆ لــەدونیای دیکــەپێش ئاهــەنگ بــە (١١٢٧)
تــۆ لــەئاخر دا، ببەپێشــڕەو، شــەدید — زۆر لـەدار پێشـکەو تـووە، میـوەی جەدیـد (١١٢٨)
گـەرچی میـوە، ئـاخری ئـەو دیتـەدەس — ئەو لەئەووەڵ، چونکەمەقسوود بوو و، بەس (١١٢٩)

وەک مەلاییک بێژە( لا علم لنا )     تا کو بگرێ دەستی تۆ، عیلمی خودا (٣٠
گەر نەبێ تەکیەت لەدونیا،عیلمی نەقڵ     چەشنی ئەحمەد پڕدەکاتۆ، نووری عەقڵ (٣١
گەر نەبی مەشهوور بەدانیش نێو بیلاد     کەم،کەنی تۆ، خوا دەناسێ چاک عیباد (٣٢
گەر کەلاوەشوهرەت و نێوی نییە     بۆ نەجاتی زێڕی گەنجی، نێو وییە (٣٣
قەت لەجێی مەشهوورنابێ زێڕو گەنج     هەر وەهایەڕاحەتیش بوو ژێری ڕەنج (٣٤
لێرەئیشکال چادەکا، دڵ، زۆر، بەلام     جێ دەهێڵێ ئەسپی چاک هەموا ن بەعام (٣٥
عیشقی وی ئاگر لەئیشکال بەر دەدا     نووری ڕۆژ، وەهم و خەیاڵان دەر دەدا (٣٦
جوابی خۆ ت ئەی مرتەزا لەو لا بوێ     چون سوئاڵ بێ شک لەبۆتۆ هات لەوێ (٣٧
گۆ شەیی بێ ئینتیهای دڵ شاهڕاه     نووری لا شەرقیی و، لا غەرب، هات لەماه (٣٨
تۆ دەچی ئێرەو ئەوێ بۆ؟وەک گەدا     تۆ کەکێوی بۆ دەچی بەدوای سەدا؟ (٣٩
جا تەڵەب کەدەنگی حەق لەو لایەتۆ     گەر دەڵەی یاڕەب، یا، یاخوایەتۆ (٤٠
ڕوو دەکەی لەولا،کەبۆت هات ئێش ودەرد     دەردکەڕۆی بۆلاڵ دەبی تۆ چەشنی بەرد؟ (٤١
وەختی میحنەت بانگ دەکەی هەرخوا ئەتۆ     هەرکەمیحنەت ڕۆی دەڵەی خواکوا؟ ئەتۆ (٤٢
بۆیەوایەچونکەهەر کەس وا دەکا     ڕۆژو شەوئەو زیکرو یادی خوا دەکا (٤٣
گەر حیجاب بۆعەقڵی هەرکەس بۆپەنا     لەت دەبێ جار جار حیجاب جارجار کەنا[1] (٤٤
عەقڵی جوزئی جار ڕاستەو جار خوار     عەقڵی کوللی دوور لەدەردی ڕۆژگار (٤٥
بکرەحیرەت، لابەعەقڵی جوزوی تۆ     ڕووکەخواری، بۆ بوخارا تۆ مەڕۆ (٤٦
بۆبەگوفتار ئێمەوا ئا لوودەبووین؟     چون بەداستان ئێمەوەک داستان چووین (٤٧
من دەبم فانی بەگریان و حەنین     تا ببم من یەک لەجوملەی ساجیدین (٤٨
کوا نێ داستان بۆ ئەوە، لای هووشیار؟     وەسفی حاڵە، هەم حزووری یاری غار (٤٩
ئەو کەسەی ئەفسانەیەقوڕئان لەبۆی     بۆ نیفاقی خۆی دەلیل هەر گفتی خۆی (٥٠
لامەکانێک چونکەنووری خوا، لەوێ     مازی وموستەقبەل و،حاڵ،کوا لەوێ؟ (٥١
مازی و موستەقبەلی، نیسبەت بەتوون     هەر دوو یەک شت، وا دەزا نی تۆ، کەدوون (٥٢
وەک کەسێک باب بێت وکوڕ بۆ یەک نەفەر     ژێر بووبان بۆ زەید،بۆعەمربوو،بەسەر (٥٣
هەربەنیسبەت ئەو دووکەس بووژێرو سەر     خۆ دەنا بان هەریەکە،ئەی خۆش نەزەر (٥٤
میسلی وی نابێ، میسالم کرد بەیان     لەفزی کۆن ناکات مەعنی نوێ، عەیان (٥٥

---

[1]- جار و بار دەدڕێ حیجاب ،جار جار کەنا (مصرع دوم)

ر بەستە، مەشکە، ئێرە،جۆ نییە     بەحری قەندە، لێرەساحیل، خۆ نییە (١١٥٦)

**بەڕێ کردنی فیرعەون قاسیدان، بۆ مەداین بۆ هێنانی ساحیران..**

**خولاسەی داستان ...**

کاتێک کەحەزرەتی مووسا لەلای فیرعەون گەڕا وە، فیرعەون، موشاویران و زانایان دەر باری خۆی دەعوەت کرد، وبۆڕەفعی خەتەری مووسا ڕێگای چارەی لەوان ویست قەراریان دا نا کەهەموو ساحیری ماهیر،کۆ کەنەوە، مەئموورانی فیرعەون بۆ هەموو لایەکی مەملەکەتی میسر چوون، وزۆریان جستو جۆ کرد، لەئاکام دا دوو جەوانی ساحیری ماهیریان پەیداکرد، کەلەکاری سیحرو جادوو دا، بێ نەزیر بوون، پەیامی فیرعەونیان بەوان ڕا گەیاند، وقیسمەتێکیش لەکارو بارو خسڵەتی مووسایان بۆ بەیان کردن،ئەودووساحیرەتەڕدەستانەچوون بۆخەڵوەت ودەستیان کرد بەفکرو مەشوەڕەت تا لەبارەی مووسا چارەیەک بدۆزنەوە، ولەپاشان هەستان وچوون بۆ لای دایکیان ولەویان داوا کرد کەقەبری بابیان پێ نیشان بدا، تا ئەوان بچنەسەر قەبرەکە، ولەبابیان داوا بکەن کەئەوان لەحەقیقەتی کاری مووسا ئاگادار بکا، کەئایا پێغەمبەری خودایەیاساحرێکی ماهیرە؟ بابیان دەجوابی وان دا کوتی زۆرمەخفیانەبڕۆن بۆ لای جێگای مووسا ئەگەر توانیو بەبێ ترس و لەرز عەسای وی هەڵگرن، بزانن کە ئەوە ساحیرێکی ماهیرە و دەتوانن کەسیحری وی چارەبکەن، وئەگەر نەو توانی عەسای وی هەڵگرن بزانن کەئەوەپێغەبەری خودایەوئێوەقەت ناتوان ئەوی شکەست بدەن، جا ئەو دوو ساحیرانەوەڕێ کەوتن ومووسایان لەژێر دارەخورمایەک دی کەنوستبوو، وسەبرۆکەبۆلای وی چوون، وەهێستا دەستیان لەعەسای مووسا نەدا بوو کەعەسای مووسا وەحەرەکەت کەوُت، وئەو دوو نەفەرەتووشی ترس و هەراس بوون وعەسایەکەتەبدیل بەئەژدیهابوو، وبەنارەتەحەملەی هینا، ئەو دوو جەوانەهەڵاتن وحاڵیان تێک چووو،بەو جوورەحەقیقەتی حاڵی مووسا لەوان مەعلووم بوو وزانیان کەئەو پێغەمبەری خودایە،جالەبەرئەوەکەسێکیان بۆ شەفاعەت ناردەلای حەزرەتی مووسا وعوزرخواهی و داوای لێبوردنیان لێکرد ...

ەر گەڕاوەماڵ مووسا، ماوەئەو     ئەهلی ڕای گازکرد هەر وەک باوە،ئەو (١١٥٧)

ـەزەریان دا، لەگشت ئەترافی میسر     کۆوەکا شا، ساحیری سەڕڕافی میسر[1] (١١٥٨)

---

1- ساحیران گشت کۆ وەکا، سەڕڕافی میسر (مصرع دوم)

ئـەو بـەرێی کـرد عالـەمێک زۆر ئـەو زەمـان ‌‌ ‌ کـۆ وەکـا تاجـادووان، بـۆ هــەر مــەکان
ســـاحیرێک بایـــە، لەهـــەرجێ نامـــدار ‌ دەە نەفەرقاسـید دەچـوون، بـۆ لای، بـەغار
دوو جـەوان سـاحیر هـەیان بـوو نێـو بانـگ ‌ سـیحری وان کـاری دەکردەنێـو مانـگ
ئاشــکرا شــیریان لـــەمانگ هێنایـــەدەر ‌ ئەسپی وان یـەک خومرەبوو کـاتی سـەفەر
نـووری مانگیـان دا نیشـانی عـام، بـەجاو ‌ جـا دەیـان پێـواو و، دەفرۆشـا، بـەتاو
پـووڵ دەچـوو جـا، موشـتەری ئاگـا دەبـوو ‌ دڵ شـکاو بـۆ پـووڵی لـەو ئـاوا دەبـوو
کردیـان جـادوو ئـەوان دوو سـەت هـەزار ‌ موبتەکیربوون، قەت نەبوون،پەیڕەو، چ جار
هـەر کەئـەو پـەیغامی شایان، وا دەبیسـت ‌ شـا لـەئێوەی ئێسـتەفەوری، چارەویسـت
چونکـەهاتن دوو نەفـەر بـۆ شـار فـەقیر ‌ شـاهو قەسـری وی لـەلای وان، زۆرحـەقیر
هـیچ نیبانەئـەو دوو غـەیری یـەک عەسـا ‌ ســـاحەبی وی ئـــەو دەکاتەئـــەژدەها
شاهولەشـــکر گشـــتییان بێچارەمـــان ‌ لـــەو دوو شەخسەگشـتییان غـەمبارەمان
جـا بـەجادوو چارەیـەک بێـنن بـەکار ‌ تـا زیبـانی پـێن نـەگا، لـەو دووانـە، مـار
ئـەو دوو سـاحیر کـاتێ بیسـتیان ئەوپـەیام ‌ ترس و حوب، دایگرت دڵی ئەو دوو،تەمام
گــەر،ڕەگی هــەمکاریان هــەردوو،بزووت ‌ هەردوو،سەریان داد ەنا سەرچۆک بەجووت
چــون دەبیرســتانی سـۆفیان، چـۆکی وان ‌ حـەل دەکـەن چۆک موشکیلان وەک جادووان

**گازکردنی ئەو دوو ساحیرە بابی خۆیان لەقەبر، و پرسیار لە ڕووحی باب، حەقیقەتی مووسا(ع)...**

جـا لەپاشـان بـانگی دایکیـان کـرد، وەرە ‌ ئێمـەبۆ سـەر قـەبری بـابی خـۆن، بـەرە
بردنـی سـەر قـەبری بابیـان، دایکـی وان ‌ گرتییـــان ســـێ ڕۆژ، ڕۆژو ئـــەو دووان
وا بـــەبابیان کـــوت لەپاشـــان ئـــەودووان ‌ وا بەئێمـــەی دا پـــەیام پاشـــای زەمـــان
چاکیـان کـرد بۆی دوو کـەس دەردەسـەری ‌ ئابڕوویـــان بـــرد لـــەلای دەو رو بـــەری
بـێ سـیلاح و لەشـکرن بـێ یـارو کـەس ‌ قـودرەتی وان یـەک عەسـا، لایانـە، بـەس
تـۆ، بەمـەرگت چوویـەلای ئەشخاسـی پـاک ‌ گـەرچی زاهیرئێستەنوستووی ژێـری خـاک
تـۆ، بمـان کـە، بابـە، لـەو هـە، باخەبـەر ‌ سـیحرەئەوهە، یانەئـەمری خـوای لەسـەر؟
یاخەبـەر کـە، تـاکو خزمـەت کـەین بـەوی ‌ تـا لـەدونیاو دیـن نـەبین قـەت سـەر نـەوی
نـــا ئومێـــدی ڕۆی و،ئوممێـــد هاتـــەلان ‌ دەرکـــی وی جێمانەئێســـتا، نـــەک تـــەلان

**جواب دانەوەی ساحیری مردوو بە کوڕەکانی خۆی ...**

ـب دەخەو دا وایدەکوت بەو دوو برا  مەتڵەبی وا، نابێ بێژم ئاشکرا (١١٨٣)
ـەبی وا نابێ بیڵەم ئاشکرا  گەرچی ڕوونەئەو لەلای من، وەک چرا (١١٨٤)
ـەک نیشانەو پێدەڵەم ئەمما ئەمن  ئاشکرا بێ ئەمری مەخفیتان لەبن (١١٨٥)
ـەی عەزیزان گەرکوچوون بۆلایی وی  چاک بناسن جێ خەوی، مەئوایی وی (١١٨٦)
ـەلای وی گەرکو نووست ئەوشەخسی بەرز  تاکو بدزن، لەو،عەسا، بێ ترسو لەرز (١١٨٧)
ـەر دزیتان لەو عەسا، ئەو، ساحیرە  چارەیی ساحیرلەلاتا ن حازیرە (١١٨٨)
ـەر کو نەو توانی، بزانن لای خودا  ناردراوە، موجتەبایەو موهتەدا (١١٨٩)
ـەرجیهان پڕبێ لەفیرعەون شەڕقوغەڕب  تێک دەچن گەڵ حەق بکەن‌گەرجەنگ‌وحەڕب (١١٩٠)
ـەو نیشانەم، ڕاس ئەمن دا،گیانی باب  بیخەنێو د ڵ، حەق دەزانێ چاک سەواب[1] (١١٩١)
ـنی بابا، گەرکو بنوێ ساحرێ  سیحرو مەکری ئەوکەهیچ پێ ناکرێ (١١٩٢)
جونکەشوان گەرنوست،گورگ،ئیمەن دەبێ  چونکەشوان خاڵی لەجەهدوفەن دەبێ (١١٩٣)
ـەرکو حەیوان، شوانی وی بێتن خودا  گورگ نابا، ڕێ لەبۆ حەیوانی وا (١١٩٤)
ـەر بەچاوی تۆ بکا، جادوو،خودا  گەر بڵەی جادوو بەوی، قەولت خەتا (١١٩٥)
ـەو نیشانە، ڕاستە، نیتی ئیشتیبا  گەر کو بمرێ، خوا لەبۆ لای خۆی دەبا (١١٩٦)

**تەشبیەکردنی قورئان بە عەسای مووسا و وەفات کردنی مستەفا(ص) بە خەوی مووسا (ع)...و قاسیدانی تەغییری قورئان بەو دوو کوڕیژگە ساحیرانە کە قەستی بردنی عەسایان کرد دەحاڵێک دا کە مووسا نوستبوو...**

ـی بەئەحمەد وەعدەداوە، خوای ئەحەد  تۆش نەبی، قورئان دەمێنێ، تا ئەبەد (١١٩٧)
ـن کیتاب و موعجیزەی تۆم لا، عەزیز  نایەڵم لێی زیادوکەم کەن، یەک پەشیز (١١٩٨)
ـفیزی تۆم من لەنێو هەر دوو جیهان  نایەڵم ئەزیەت بکەن تۆ، تاعینان (١١٩٩)
ـتوانێ زیادو کەم کا، کەس لەوی  حافیزی چاتر لەمن، دەس نا کەوی (١٢٠٠)
ـۆژ بەڕۆژ بۆت زیاد دەکەم من بۆت نێو  لێدەدەم من نێوی تۆ سەر زێڕو زێو (١٢٠١)
ـنبەر و میحراب لەبۆتۆ چادەکەم  قەهری تۆش وەک قەهری خۆم ئیجرادەکەم (١٢٠٢)
ـۆربەپنهان نێو دەبەن تۆ، پیاووژن  وەختی نوێژ خۆ ون دەکەن، تا دیار نەبن (١٢٠٣)

---

[1] - بیخەدڵ (اللهاعلم بالصواب)(مصرع دوم)

هــەر لــەترس و لــەرزی کوففــاری لــەعین ... ون دەبـــێ دینـــت دەچێتـــەژێر زەمـــین ۰۴)

جـــا بەمەســـجید پردەکـــەم ئافاق،ئـــەمن ... کوێر دەکەم دوو چاوی شەخسی عاق ئەمن ۰۵)

پـــەیڕەوت فـــەتحی دەبێـــت و، نێـــوو بانـــگ ... دینـــی تـــۆ دەڕوا لەماســـی تـــا کـــو مانـــگ ۰۶)

تاقیامـــەت دینـــی تـــۆ دەیبـــێ ســـەفا ... پشـــتیوانی دینـــی تـــۆین، ئـــەی مســـتەفا ۰۷)

تـــۆ کـــەجادوو نـــی، ڕەســـوولی خـــوای ئـــەتۆ ... ســـادقی، هـــاو خـــەر قـــەیی مووســـای ئـــەتۆ ۰۸)

ئەو کیتابـەی دەستی تـۆ هـەر وەک عەسـا ... هەڵدەلووشـــێ کفـــر، هـــەروەک ئـــەژدەها ۰۹)

گـەر چـی ئێسـتا تـۆ لـەژێر خـاکی بـەلاّم ... وەک عەسـای مووسـایەقەو لـی تـۆ تـەمام ۰)

نـــاتوانێ کـــەس عەســـاکەی تـــۆ ببـــا ... تـۆ بنـوو ڕاحـەت خـەوت خـۆش بێـت، بـا ۱)

تـۆ لـەژێر خـاک، نـووری تـۆ چـۆ ئاسـمان ... بـۆ شـەڕت کـافر بەدەسـتی گـرت کـەمان ۲)

فەلسـەفی گـەر دێ قسـەی بێ سـوود دەکا ... تیـری قەوسـی تـۆ ئـەوی نـابوود دەکـا ۳)

زیـاد لەوەعـدە، دای بـەوی خـۆ کردگـار ... چونکەئەو نوست،بەختی وی بوو هوو شیار ۴)

گیانی بـابی، گـەر کـو سـاحیر چـۆ خـەوێ ... سـیحری وی ناکـا ئەسـەر، لێـرەو لـەوێ ۵)

قەبری بابیـان مـاچ دەکرد ئەو دوو جـەوان ... چـوون لـەبۆلای میسـر،بۆ شـەڕ ئـەو زەمـان ۶)

هەرکـەچوون بـۆ میسـر تـادەعوا بکـەن ... مـــاڵی مووســـا ویســـتییان پەیـــدا بکـــەن ۷)

ئیتیفاقـەن ئـەو دەمـەی گـەر گەینەشـار ... نوســـتبوو مووســـا لـــەبن یـــەک دانـــەدار ۸)

جـا، نیشـانیان دا بـەوان، مووسـا لـەوێ ... بچنەئـــەو نەخلانە،گـــەر مووســـاو دەوێ ۹)

گـــەر لـــەبۆ نـــەخلان دەهـــاتن ئـــەو دووە ... یـــەک نەفـــەر وشـــیاریان دی، نوســـتووە ۲۰)

ئـەو بـەزاهیر بەسـتبووی دووچـاوی سـەر ... عەزشـو فەرشـی بووهەموو،ئـەو ژێـر نـەزەر ۲۱)

زۆرهەیەوشـــــیارەچاوو، نوســـــت دڵ ... کـــوا دەبینـــێ چـــاوی، ئـــەهلی ئاووگـــڵ؟ ۲۲)

ئەوکەسـەی وشـیار دڵ بـێ، چـاوی سـەر ... گـەربنووی وشـیارە، هـەیتی سـەت بەسـەر ۲۳)

گـــەرتۆ ئـــەهلی دڵ نـــەبی، بێـــدار بـــە ... دڵ تەڵـــەب کـــە، تـــالبی پـــەیکار بـــە ۲۴)

تـــۆ بنـــوو ڕا حـــەت دڵـــت وشـــیارەگەر ... ون نیبەئـەو دەم لـەتۆ هـیچ ژێـر و سـەر ۲۵)

وایـدەکوت ئەحمـەد دووچـاوم دەچنەخـەو ... نـــانوێ ئـــەمما دڵـــی مـــن ڕۆژ و شـــەو ۲۶)

شـــابێدار، نوســـت ئـــەمما پاســـەوان ... گیـــان فیـــدایی قـــەلبی بینـــای نوســـتووان ۲۷)

وەسـفی وشـیار بـوونی دڵ ئـەی مەعنـەوی ... بـــۆی بـــەیان نـــابێ هـــەزاران مەســـنەوی ۲۸)

کـــاتێ دیتیـــان نوستووەمووســـا لـــەوێ ... ویســـتیان بـــدزن عەســـا، وەختـــی خـــەوێ ۲۹)

بـــۆ دزیـــن وا یـــان دەدا، هـــەر دوو، نـــەزەر ... والەچاکـــە،بۆی بچـــین لای پشـــتی ســـەر ۳۰)

هەرکەکەم بۆپێش دەچوون ئەو دوو جەوان ... هاتەلـەرزین ئـەو عەسـای مووسـا، لـەوان[1] (١٢٣١)

...ێن بەشـیددەت هاتەلـەرزین ئـەو عەسـا ... مـات دەبـوون دەتکوت کەگیانیان پێ نـەما (١٢٣٢)

...ردی حەملـەپاش ئـەوەی بـۆ ئـەژدەها ... هەڵـدەهاتن هـەردوورەنگ زەر،چەشـنی بـا (١٢٣٣)

...ـا لەترسـان وا هـەلاتن دوو بـەدوو ... یـەک دەکەوتو، یـەک بەسـەرچاو دا دەچوو (١٢٣٤)

... بـەقینیان بـوو کـەکۆ مـەک خوایەبـەس ... چونکـە سیحری والـە، ناکا قـەت چ کـەس (١٢٣٥)

... لەپاشـان هاتـەوان ئیسـهال و تـەب ... چی نـەمابوو گیـان لـەوان، وەر بگرێ، ڕەب (١٢٣٦)

... دەیان نارد قاسیدێک هەر ئەو زەمان ... لایـی مووسـا تـا قـەبوو ڵ کـا، عـوزری وان (١٢٣٧)

...بەناحـەق ئێمـەتۆن کـرد ئیمتیحـان ... چون حەسوود بووین ئێمەوان کرد، بێ گومان (١٢٣٨)

...بەخشـەئێمەیی مـوجریم بەشـاە ... ئـەی تـۆ بەنـدەی خاسـی دەر گـاهی ئـیلاه (١٢٣٩)

...ش دەبوو مووسا لەوان دوو،باش دەبوون ... لـەو زەمینـەی پێشـی مووسـا، سـەجدەچوون (١٢٤٠)

...ی دا بەخشـیم، ئـەمن ئێـوەی، کیـرام ... دووزەخیش بۆ گیان و تـەنتان، بوو حـەرام (١٢٤١)

... چ کـات ئێـوەم نەدیوەئـەی دوو یـار ... هـیچ مـەڵێن لای خـەڵکی بـۆ مـن، ئیعتیـزار (١٢٤٢)

... هێـرەن بێگانـەـە، بـاتین ئاشـنا ... وەرنـەدەعوای مـن، بـەخاتر پادشـا (١٢٤٣)

... زەمینیان ماچ دەکرد هەر دوو دەچوون ... مونتـەزیر بـۆ فرسـەتو، بـۆ کـات دەبـوون (١٢٤٤)

**کۆکردنـەوەی سـاحیران لـە مـەداین بـۆ لای فیرعـەون و جـایزە وەرگـرتن و تـەعریف و تەمجیدی ساحیران لە خۆیان ..**

...تـەلای فیرعـەون، سـاحیر ئـەو دووان ... دای بەهـەردووکیان خـەڵاتی ڕۆر گـران (١٢٤٥)

... لەوەعـدە، دای بـەوان خەلعـەت گـەلێ ... عەبـدو ئەسـپ و مـاڵ، وەر بگرن،چـەلێ (١٢٤٦)

...ـا لەپاشـان پێیکـوتن ئـەی سـابیقان ... گـەر بـدەن ئێوەبـەچاکی ئیمتیحـان (١٢٤٧)

...ـدەزۆرتان پێـدەدەم بـەزل و عـەتا ... پـەردەیی جـوودوو عـەتا بـدرێ، هـەتا (١٢٤٨)

... بەشـایان کـوت، بـەلوتفی شـەهریار ... تێک دەدەین لەو، کارو،دەیکەین خوار و زار (١٢٤٩)

...ـەبۆ جـادوو هـەموو مـان پاڵـەوان ... قـەت وەکـوو ئێمـەی نـەدیوەخۆ جیهـان (١٢٥٠)

...کری مووسـا فیکـری زۆر بەنـد کـردووە ... داسـتانە، چونکەپێشـێش هـەر بـووە (١٢٥١)

... هێـرەن مـەو زوو عـە، داسـتانی کـەلیم ... نـووری مووسـا نەقـدی تـۆ یەئـەی کـەریم (١٢٥٢)

...ـییو فیرعـەون هـەر دوولێکـرا ... نێـو وجـوودی تـۆ لـەبۆ وان جێکـرا (١٢٥٣)

[1]- هەردەگەڵکوو چوونەپێش ئەو دووجەوان ... هاتەجنب وجۆش عەسای مووسا لەوان

تاقیامـــەت چادەکـــا مووســـا، نیتـــاج — نـــوور نـــاگۆڕێ، دەگـــۆڕێتن ســـیراج
وەک پڵیتەجێگـــەڕۆن تـــەعویز کـــرا — هـــیچ کـــەناگۆڕێ بـــەڵام نـــووری چـــرا
چونکەشووشەکەســـرەتی تێـــدا دەبـــێ — لـــەو بنـــۆڕی کـــوانێ ڕێ پەیـــدا دەبـــێ؟
گـەر بنۆڕی تـۆ لـەنوور دەت بـێ نـەجات — کەســـرەتو ئەعـــداد نـــامێنێ لـــەلات
بـــەس لـــەچاوو، کەســـرەتو، ئەعـــداد بـــوو — ئیختیلافـــی گـــاور و ئیســـلام و، جـــوو

**ئیختیلاف لە چۆنیەتی شکڵی فیل..**

**خولاسەی داستان...**

خـەڵکی هیندووسـتان فیلـەکیان هینـا لەخانویـەکی تاریکیـان دانـا، خـەڵکی ئـەو جێگایەکـەتا ئـە وەختی فیلیان نەدیبوو، بۆتەماشای فیل کۆ بوونەوە، چونکەخانویەکەتاریک بوو کەس نەیدەتو کەئـەو فیلـەببینێ، جـا لەبـەر ئـەوە، یـەک بەیـەک دەسـتیان بەسـەر ئـەعزای فیـل دا دەهێ وشتێکیان دەزیهنی خۆیان دا موجەسسەم دەکرد..مەسەلەن یـەکێک دەستی بەسـەر خورتوو داد ێنا، فیلی وەک لووساوک تەسەوور دەکرد، یەکێک دەستی بەسەرگوێی ئەوفیلەدادەهینا وابو فیل وەک باوەشێن وایە، هـەر بـەو جوورەیـەکێک دەسـتی بەسـەر لاقـی د ا دەهینا، ئـەو بەشکڵی کۆ لەکـە، موجەسسـەم دەکـرد، وعاقیبـەت یـەکێک دەسـتی بەسـەر پشـتی دا دەهێ دەیکـوت فیـل وەک تـەختی وایـە.. دەحاڵێـک دا هـەموویان دەئیشـتیبا دابـوون، ئەگـەر دەو شەمعێک هەڵکرا با، شکڵ و سوورەتی فیل مەعلووم دەبوو.

هینـــــدییان بردیانـــــەماڵێک زێـــــدەتار — گـەورەفیلێک، تـا نیشـان د ەن، ئـەو، لەشـار
کـــۆ وەبـــوون بـــۆ دیتنـــی وی خـــەڵکی زۆر — چوونـەنێو ئـەو زوڵمەتە،هـەر چەشـنی کـۆر
چـون نـەبوو مـومکین ببیـنن ئـەو بـەچاو — دەسـتی خۆیـان دەدەنـا سـەر وی، بـەتاو
یەک کە دانیا دەس لەسەر خورتوومی وی — چەشني ناودان ئەو کوتی ،مەفهوومی وی
دایـدەنا دەسـتی لەسـەر گـوێ، یـەک نەفـەر — باوەشـــێنی ئـــەو دەهاتەبـــەر نـــەزەر
یـەک، کەدەسـتی دا دەنـا سـەرلاقی فیـل — فیل لەلای وی وەک ستوون، بێ قال و قیل
یـەک کەدەسـتی دادەنا سەرپشـتی سـەخت — وایدەکوت ئەو،فیل دەبینم چەشنی تـەخت
هەرکەسێکیش وەسفی ئەعزای بیست لەوان — وایـــدەزانی وایـــەفیل ئـــەو، بـــێ گومـــان
هەرنەزەر باعیس بو گـەر بـوون موختـەلیف — یـەک بـەفیلی دال دەکـوت یکیـان ئـەلیف
گەردەدەسـتیان دا هـەبا، یـەک دانەشـەمع — ئیختیلافیـان لادەچـوو خـۆ دەسـتەجەمع

چاوی حیس هەر وەک کەفی دەستانەبەس کــەف بــەکوللی فیــل، نیتــی دەســتڕەس (۱۲۶۹)

چــاوی دەریــابین وچــاوی کــەف، جییــان چاوی دەریـا سـوود دەبینـێ، کـەف زییـان (۱۲۷۰)

جونبشـی کـەف هەرلەبـەحرە، ڕۆژو شـەب کـەف بـەبێ دەریـا دەبینـێ، ئـەی عەجـەب (۱۲۷۱)

ئێمــەوەک کەشــتی لــەنێو دەریایــەواین تارەچاومـــان، وا، دەئـــاوی ڕوون دایـــن (۱۲۷۲)

ئەی دەکەشتی تەن دەخەو دای تۆ، تەواو تـــۆ دەبینـــی ئـــاو، بنۆڕەئـــاوی ئـــاو (۱۲۷۳)

ئـــاو، ئـــاوێکی هەیەگـــەر، ڕایـــدەدا ڕووح ڕووحێکــی هەیــە، دەیکــا ســەدا (۱۲۷۴)

کـوا لـەکوێ بـوون مووسییو عیسـا، کـەتاو؟ کیشـتی مـەو جـووداتی گشـت دا، واڵـەئاو (۱۲۷۵)

ئادەم و حـەووا لـەکوێ بـوو ن ئـەو زەمان؟ دایـدەنا حـەق، تیـری هەسـتی، نێـو کـەمان (۱۲۷۶)

ئـەو قسـەم هـەم ناقیسـە، هـەم بـێ بـەرە ئەو قسـەی نەقسی نییـە، بـەس ئـەو سـەرە (۱۲۷۷)

گــەر بڵێــتن لــەو، دەڵــەغزێ پــایی تــۆ گەرنــەڵێتن هــیچ لــەوی، ئــەی وایــی تــۆ (۱۲۷۸)

گـەرکو بـۆت بێژێـت واسیل یـەک میسال زاهیـری وەر دەگـری تـۆ بـێ قیـل و قـال (۱۲۷۹)

تـۆ، بەچەشـنی گیـایی، وا بەسـتەی زەمـین بـا، کەبێ،دەیـدەی تـەکان، سـەر، بێ یـەقین (۱۲۸۰)

تــۆ بــەڵام لاقــت نییــەتا بچیــەســەر نــاتوانی لاق لــــەنێو قــــوڕ بێنیــــەدەر (۱۲۸۱)

چۆن لەقوڕ دەر دێ لەبۆت لاقی حـەیات؟ چـون لـەقوڕ ڕا، زینـدەگی بـۆ تـۆ دەهـات (۱۲۸۲)

چـون حـەیاتت بـۆ لەحـەق دێ ئـەی فلان هــیچ بــەقوڕ نــابێ نیيــازت بــێ گومــان (۱۲۸۳)

گـەر لەشـیری خـۆی وەکـا دایکێـک منـاڵ بەس غـەزا دەخـوا منـاڵ، نـەک شیری کاڵ (۱۲۸۴)

تۆ بەشـیری عـەرد بەسـتەی وەک حبـووب نـەت هـەوێ شیر،بت هـەوێ(قـوت القلـوب) (۱۲۸۵)

نـووری مـەحجووب یـانی حـەرفی حیکمـەتی وەرگرەگــــەرنووری ڕووت دێ،زەحمــــەتی (۱۲۸۶)

گـەرکو لایـق بـی بـەنووری بـێ حیجـاب بـێ حیجـاب تـۆ نـوور دەبینـی بێ حیساب (۱۲۸۷)

وەک سـتێران تـۆ لەئاسـمان خـول دەخـۆی بـێ سـەماوات بـۆ سـەفەر، ئـەو دەم دەڕۆی (۱۲۸۸)

تـۆ کەئێسـتا هـەی لەپیشـان بـووی عـەدەم تـۆ بەمەسـتی دات دەنـا، هەسـتی قـەدەم (۱۲۸۹)

تـۆ لــەبیرت چــوو کــەچۆن هاتیــەجیهان پێت دەڵـێم ئـەمما ئـەمن، ڕەمزێـک جـووان (۱۲۹۰)

هۆشـی جـوزئی لابـە، کـوللی بـا هـەبێ بگرەگـوێی حـیس، گـوێی بـاتین تـا هـەبێ (۱۲۹۱)

تــۆ کــەخامی، بــا نــەڵێم چیــدی، چ جــار نـەد دی هـاوین، وای لـەنێو فەسـڵی بـەهار (۱۲۹۲)

ئــەو جیهانەچەشــنی دارە، ئــەی هــەواڵ میوەکـــەش ئێمـــەین، ئـــەمما نیوەکـــاڵ (۱۲۹۳)

خــام، لکــی داران دەگــرێ زێدەســـەخت چـون نـەبوو خام،لایقی شای کاخ و تـەخت (۱۲۹۴)

گەر گەیشت و خۆ ش و شیرین بوو، بەتام ســـت دەگــرێ میوەلک،ئـەو دەم بــەعام (۱۲۹۵)

گـــەر بەئـــەو ئیقباڵەشـــیرین بێـــت زار — نایهـــەوێ، ئینســـان، مـــوڵکی ڕۆژگـــار (١٢٩٦)
سەخت گیری هەم تەعەسسوب، خامییە — تـا جـەنینی، کـار، خـوێن ئاشـامییە (١٢٩٧)
ماوەیـەک شـت نـابێ بێـژم مـن ئـەوی — پێـت دەڵـێ ئـەو، جـەبرەئیلی زۆر قـەوی (١٢٩٨)
ئیمـە هەرسـێ، جـەبرەئیل وتـۆ و ئـە مـن — ئەسڵ وریشەن هەریەکە، نەک وێک دەچن (١٢٩٩)
وەک دەخەودا دیتەپێش خەو نێک لەبۆت — تۆ لـەلای خـۆت ڕا دەچی،بۆ لایی خـۆت (١٣٠٠)
تـۆ لـەخۆت بیسـت وا دەزانـی گـەرفلان — هـات لـەبۆ تـۆی ئـەو وتـارەکرد بـەیان[1] (١٣٠١)
یەک نەفەرنی، بێ گومان تۆ، ئەی ڕەفیق — بەڵکـەتۆ گـەردوونی هـەم دەریـای عـەمیق (١٣٠٢)
زۆرعـەزیم و گـەو ڕەریی تۆ، نـەک کـەمی — بـەحری بـێ پایـانی تـۆ، ئـەی ئـا دەمـی (١٣٠٣)
کـوا لەهوشیاری و لەخـەو جێگـای دەبـێ؟ — کوا کەسێک زانا بەباش،وەک خوای دەبێ؟ (١٣٠٤)
هـیچ مـەڵێ تـا دێـن دەڵـێن بـۆ ت عارفـان — ئەو شتەی نەیکرد بەیان قەت هیچ زەبان (١٣٠٥)
هـیچ مـەڵێ تـا بـۆت دەڵێـتن ڕۆژی گـەش — ئەو شتەی گوێ و زار نەیبوو لەو، چ بەش (١٣٠٦)
هـیچ مـەڵێ تـا دێ دەڵێـتن بـۆت ڕووح — تۆ مەلەی لانێ، کەبووی نێو کەشتیی نووح (١٣٠٧)
گەر مەلـەت زانـی تـۆ وەک کـەنعان مەبـە — دوژمنـی ئـەو نـووحی کەشـتیوان مەبـە (١٣٠٨)
نـووح دەیکـوت بێـرەلام کـەنعانی مـن — تـا نـەخنکێی، ئـەی ئـەتۆ چـاوانی مـن (١٣٠٩)
جـوابی دا، نایـەم، مەلـەی چـاک ئاشـنام — شـەمعی تـۆم ناوێـت، شـەمعی خـۆ م لـەلام (١٣١٠)
نـووح پێیکـوت سـەختەتووفان ئـەو چەلـە — کـاری دەسـت و پـێ نییـە، ئـەو ڕۆ، مەلـە (١٣١١)
بـایی قـەهرە، بـۆ هـەموو شـەمعان بـەڵا — ڕوو ن دەمێنـێ هەرتـەنێ شـەمعی خـولا (١٣١٢)
جـوابی داوەدەچمەسـەر ئـەو کێـوە، مـن — ئـەو دەدا چـاکم پـەنا، نـەک ئێـوە، مـن (١٣١٣)
وا مەکـە، ئـەو ڕۆ کـەکێو بـوو، چەشـنی کـا — غـەیری دۆسـتی خـۆی نـەجات نـادا خـودا (١٣١٤)
پێیدەکوت کەی پەندی تۆم من بیستووە؟ — وا منـت یـەک فـەردی ئـەهلت ویسـتووە (١٣١٥)
گفتی تۆم پێ خۆش نەبوو قەت هیچ زەمان — من بەری بووم لێت، لەنێو هەر دوو جیهان (١٣١٦)
نـووح پێیکـوت بێـرە، وەختـی نـاز نییـە — بـۆ خوداوەنـد هـیچ کەسـێک هـاو ڕاز نییـە (١٣١٧)
تـــاکو ئێســـتات نـــازکرد ئیـــدی مەکـــە — لێرەنـــاز ســـوودی نییەچیـــدی مەکـــە (١٣١٨)
(لـم یلـد لـم یولـد ) ە، زاتـی خـودا — بـێ منـاڵ و دایـک و بـاب و، ئـەقربا (١٣١٩)
کـوا دەکێشـێ نـازی منـداڵ ئـەو جـەناب؟ — کـوا دەبیسـێ نـازی دایـک و نـازی بـاب؟ (١٣٢٠)
کـــەم کـــەنازان بێـــژەمن بـــابم نییـــە — ئـەی جـەوان مـن بـاب نـیم، نـازت چییـە؟ (١٣٢١)

[1]- هات بەتۆی کوت ئەو وتارە زۆر نیهان (مصرع دوم)

میردی کەس نیم قەت نەبووم من شەهوەتی  کەم کەنازان تۆ ئەلێرە، ئەی ستی (١٣٢٢)

بەس خزووع و بەندەگی هەم ئیزتیرا ر  دێن بەکار، لای زاتی پاکی کردگار (١٣٢٣)

پێیدەکوت با با، لەمێژەوا دەڵەی  ئەوچەلەش وەک جاری جاران هەر هەڵەی (١٣٢٤)

تۆ ئەوەت زۆر کوت دەگەڵ یارو نەیار  هاتەگوێی تۆ زۆر جەوابی نا لەبار (١٣٢٥)

ئەو قسەی تۆ م من نەویست، زۆرم دەبیست  خاسە، ئێستە، تێپەڕی عومرم لەبیست (١٣٢٦)

پێیدەکوت نووح هیچ کەنابینی زەرەر  پەندی بابی خۆت ببیسی تۆ ئەگەر (١٣٢٧)

نووح دەیکوت هەروەها پەندی لەتیف  جوابی بیست ئەمما، لەکەنعان زۆرعەنیف (١٣٢٨)

نووح لەپەندی وی نەبووماندووکەمێ  گوێی بەپەندی نووح نەدا کەنعان دەمێ (١٣٢٩)

ئەو دەمەی دا، هات مەو جێک زۆر قەوی  دای لەکەنعان کوشتی،کردی سەر نەوی (١٣٣٠)

نووح دەیکوت ئەی خودا ئەی کردگار  هات لەبۆ من غەم گەلێک زۆر بێ ژمار (١٣٣١)

تۆگەلێک جاران بەمن وەعدەت دەدا  گەر دەبێ ئەهلت لەدەس تۆ فان ڕەها (١٣٣٢)

من ئومێدم هەر ئەتۆ بووی ئەی کەریم  بۆچی لێی ساندم ئەدی سەیلت، گلیم؟ (١٣٣٣)

خوا کوتی کەنعان لەئەهلی تۆ نەبوو  تۆ سپی، ئەو ڕەش، وەکوو تۆ، ئەو نەچوو (١٣٣٤)

گەر ددانێکت خەرابوو ئەی فڵان  بێنەدەر تۆ زۆر بەزوویی ئەو ددان (١٣٣٥)

تا کو باقی تەن نەبێ لەو دەردەدار  با لەتۆش بێ، لەو بەدوور بە، چەشنی مار (١٣٣٦)

نووح کوتی دوورم لەغەیری زاتی تۆ  غەیری تۆ نابێ ئەوەی بوو، ماتی تۆ (١٣٣٧)

خۆت دەزانی چۆنەحاڵم گەڵ تۆ من  کوانێ بارانەو چەمەن قەت وا دەبن؟ (١٣٣٨)

زیندەگیو شادیم لەتۆ بەئەی خودا  دێ لەتۆ بێ واسیتەبۆ من غەزا (١٣٣٩)

وەسڵ و فەسڵم نی ئەتۆ ئەی زولجەلال  ئیر تیباتمان بەڵکەبوو بێ ئیعتیلال (١٣٤٠)

ئیمەماسین و ئەتۆ دەریای حەیات  ژینی دا پێن، لوتفی تۆ ئەی خۆ ش سیفات (١٣٤١)

جێت ئەتۆ نابێ، لەنێو فکرو خەیاڵ  نی وەکووعیللەت، دەگەڵ مەعلوول هەواڵ (١٣٤٢)

پاش و پێش سێڵاو، خۆ، ئەی کردگار  هەر ئەتۆم داوا دەکرد بۆ گشت کار (١٣٤٣)

من قسەم کرد هەردەگەڵ تۆ نەک ئەوان  ئەی بەلەفزی نوێت کرد تۆکۆن بەیان (١٣٤٤)

چاو کەعاشق چی دەڵێتن ڕۆ ژو شەو  زیکری ئەتلال و دەمەن بۆ، ویردی ئەو (١٣٤٥)

غەیری مەعشووق کێ دەکا تەعریف ئەگەر  ئەولەبۆئەتلال دەڵێ باس وخەبەر (١٣٤٦)

شوکر، سێڵاو هات و ئەمرت پێدەکرد  واسیتەی ئەتلال هەرچی بوو دەبرد (١٣٤٧)

چونکە ئەتلال زۆر لەئیم و پەست بوون  بێ نەداو و، بێ سەداو و هەست بوون (١٣٤٨)

دەمهەوێ ئەتلالی وا من ئەی خودا     دەنگ کەبێ وەک کێو جەوابی من بدا (-٤٩)
دوو کەڕەت تا من ببیسم نامی تۆ     عاشقم بۆ نامی گیان ئارامی تۆ (-٥٠)
ئەنبییایان بۆیەکێو یان خۆش دەوێ     چون دەبیسن دووکەڕەت نێوت لەوێ[1] (-٥١)
ئەو تەپۆڵکەی بەردەڵا ن،کێ دەیهەوێ     لایقی مشکانە، نەک ئینسان، ئەوێ (-٥٢)
من دەڵێم ئەو هیچ کەنابێ یاری من[2]     بێ سەداو بێ جواب دەبێ گوفتاری من (-٥٣)
ئەو دەگەڵ خاک ساف کە، بیکەتۆ عەدەم     یار کەنابێ، بیکەیاری ژێر قەدەم (-٥٤)
خوا کوتی ئەی نووح بت وێ تۆ ئەگەر     گشتی خنکاوان لەژێر خاک دێنمەدەر (-٥٥)
چۆن بەکەنعان تۆ دەدەم ئازار ئەمن؟     دەمهەوێ بت کەم لەحاڵ هوشیار ئەمن (-٥٦)
جوابی دا، نا نا، ئەمن ڕازیمەگەر     بت هەوێ، غەرقم بکەی ئەی خوای لەسەر (-٥٧)
خۆشەلام غەرقم بکەی تۆ هەرزەمان     حوکمی تۆ مەقبوولە، لام زیاتر لەگیان (-٥٨)
چاولەکەس ناکەم ئەگەرچاوکەم لەکەس     بۆ بەهانە، مەنزەرم هەرتۆی و بەس (-٥٩)
سونعی تۆم مەعشووقەوەختی شوکرو سەبر     عاشقی مەسنووع نیم من، چەشنی گەبر (-٦٠)
عاشقی سونعی خوداوەند، باکەماڵ     عاشقی مەسنووعی وی بوو، دین بەتاڵ (-٦١)

**تەوافوق دەبەینی ئەو دوو حەدیسە..(الرضا بالكفر كفر ) و حەدیسی (من لم يرض بقضائي فليطلب ربا سواي)...**

بۆ سوئالێک هاتەلام دوێ یەک نەفەر     تێبگا تا هەم قەزاوو، هەم قەدەر (-٦٢)
پێیکوتم وایکوت ڕەسوولی موجتەبا     ( الرضا بالكفر كفر ) بێ ئیبا (-٦٣)
دوایەفەرمووی لازمەبۆ هەر قەزا     چی موسەڵمانەلەوی هەیبێ ڕەزا (-٦٤)
خۆ قەزای خوان هەر دووان، کفر و نیفاق     گەر کوڕازی بم بەوان، دەمبێ شیقاق (-٦٥)
گەر نەبم ڕازی، ئەو یش بۆ من زیان     پێم بڵێ چارەم چییە؟ چون لێک جییان (-٦٦)
پێم دەکوت ئەوکفرە، مەقزی نەک قەزا     یەک ئەسەربوو،بۆ قەزا ئەوکفرەجا (-٦٧)
لێک جییاکەجا، ئەتۆ مەقزی و قەزا     تا لەجوابی خۆت هەبێتن تۆ ڕەزا (-٦٨)

---

[1] - چون دەبیسن نێوی تۆ دوو چەل لەوێ (مصرع دوم)

[2] - من دەڵێم ئەو تەپکە، نابێ یاری من (مصرع اول)

ـن لـەکفریم بـوو ڕەزا، چـون بـوو قـەزا گـەر لـەمن ڕازی ببـێ، نـیم لـەو ڕەزا (١٣٦٩)
کفرێکـی گـەر ویسـت جـارێکی قـەزا ئـەو نـەکفرە، کفـر نـابێ وەسـفی خـوا (١٣٧٠)
کفـر. جەهلـەخۆ قـەزای کفریشـە عـیلم چۆن دەبێ ئەو دووانەیەک بن، حیلم و خیلم (١٣٧١)
ـ حـەزی خـەت ناحـەزی نـەققاش نییـە بـەل نیشـانەی پـیس نیشـاندانی وییـە (١٣٧٢)
ـ ـنـەققاش مـاهیر و هـەم پـڕ تـەوان گەر بکێشێ نەقشی ناحەز، هەم جووان[1] (١٣٧٣)
ـەر کـو لـەو باسـە ببێـژم زێـدەمن زۆر دەکێشێ جواب و سوا ل، تا دێتەبن (١٣٧٤)
ـ قی نوکتـەی عیشق، دەڕواتـن لـەدەس نابێ نەقشم ئەو دەمی، خزمەت بەکەس (١٣٧٥)

**مەسەل لەبارەی ئەوەدا کە حیڕەت مانعی بەحس و فکرە...**

**خولاسەی داستان**

کابرایـەک کـە ڕیشـی مـاش و بـرینج ببـو هاتـەلای سـەلمانی و پێیکـوت مووکانی سپیم بۆ لـە مـووەکانی ڕەش جیاکـەوە، کابرای سـەلمانی فـەورەن تـەواوی ڕیشـی بـە مقەسـت هـەڵپاچی و پێیکوت چونکە ئەمن سەرم شلووغە و کارم زۆرە بۆ خۆت لێکیان جیاکەوە...

ـەک نەفەر ماش و برینج بوو موویی وی هاتـەلای سـەلمانی جـوان کـا ڕوویـی وی (١٣٧٦)
پێیـ کوت لێم جیاکەوەئەی دەست سووک مـووی سـپی، هێناومەچونکـەتازەبووک (١٣٧٧)
ـشـی هـەڵپاچی، وەدەسـتی خـۆی دەدا هـانێ کـارم زۆرە، بیکـەخۆت، جـودا (١٣٧٨)
ـش سـوئال وجـواب سپی، لێکیـان کـەوە ئـەهلی دیـن کـا ری چییەبـەو یـا ئـەوە (١٣٧٩)
ـەک نەفـەر زڵلەی لـەپش مـل، زەیدی دا وەر گـەڕا وەزەیـد، لێیـدا، زڵلـەتا (١٣٨٠)
ـەزەن دەیکـوت سـوئالێک مـن دەکـەم جوا ب دەپێم پاشان تۆ لێم دە، زۆر نەکەم (١٣٨١)
ـن کـەلێم دای دیارەدەنگێـک خـۆ دەهـات مـن سـوئالێکم ئـەلێرە، بـۆ دەهـات (١٣٨٢)
ـسـتی مـن بـوو دەنگـی لێهـات والـە، یـا پـش ملـت بـوو، بێژەبـۆ مـن، ئـەی کیـا (١٣٨٣)
حوێی دا، من بوو م لەبەر ئێش، بێ خەبەر جـوابی ئەوهـەم بۆیەنایـەت بـەر نـەزەر (١٣٨٤)
تـۆ کـەبێ دەردی ببـێ بـۆت، بیـر، کـار کـوا دەکـاتن بیـری والـە، دەردەدار (١٣٨٥)

**حیکایەت ..**

کـەم لەئەسـحاب بـوون قوڕئانیان،لەبـەر گەرچی مەیلی حیفزی ویشیان بوو لەسەر (١٣٨٦)

---

[1]- دیارە نەققاش ماهیرەگەربێ درەنگ ئەودەکێشێ نەقشی ناحەز هەم قەشەنگ

چونکەکاکڵ گەرگەیشت چاک ئەی ڕەفیق ... پێســـتی وی زۆرزۆردەبـــێ ناســـکورەقیق (۲۰۰۷)
مـــــەغزی گوێزوپســـــتەوو،بادام بەجـــــەم ... گەرگەیشت زۆرچاک، دەبێ پێست زێدەکەم (۲۰۰۸)
مەغزی دانیش زۆر ببێ، پێست کەم دەبێ ... باعیســـی پەروانەســـوزی، شـــەم دەبـــێ (۲۰۰۹)
تـالبی و مـەتلووبی چـون زیـد بـوون وەهـا ... وەحـــی، وای ئـــاگر لەئەحمـــەد بـــەر دەدا (۲۰۱۰)
گەرتەجـــەللی کـات ئـەو سـافی قـەدیم ... وەســـفی حـــادیس لێدەســـوو تێتن،گلـــیم (۲۰۱۱)
(جـل فینــا ) بــوو لــەلای ئەســحابەگەر ... حیفزی بایە، ڕوبعی قوڕئا ن، یـەک نەفەر (۲۰۱۲)
جـەمعی سـووڕەت بەومـەعانی زۆرعـەمیق ... بەس لەدەستی شای عەزیم دێ ئەی ڕەفیق (۲۰۱۳)
چونکـەنابێ بـەو هەموو،مەیلـەش، ئـەدەب ... گەرکو بش بێ، واقیعەن،ئەمرێک عەجەب (۲۰۱۴)
وەختـــی ئیســـتیغنا، موراعـــاتی نیـــاز ... وەک دەگەڵ یـەک کۆ وەبن، دوو، لێک جیاز (۲۰۱۵)
چاو عەسا بۆ کوێر چۆن مەعشووق دەبێ ... کـوێر لـەبۆ قوڕئـان وەک سـەندووق دەبـێ (۲۰۱۶)
یـەک کـوتی کـوێران وەکووسـەندووقی پـڕ ... لـــەفزو ئەمســـالی نـــوبی دەو دانـــە، خـــڕ (۲۰۱۷)
گـەرکو بـێ سـەندووقی بـۆ قوڕئـان بـەماڵ ... زۆرلـــەوەی چـــاتر، لـــەقوڕئان بـــێ بـــەتاڵ (۲۰۱۸)
ئەو چەلەش سەندوو قەکی نەبێ، چ بار ... چاکترەلەوهـــەی کەهـــەبێ مشـــک ومـــار (۲۰۱۹)
گەر کەسێکیش هات و، وەسڵی دەسکەوێ ... واســـیتەو دەلالـــێ کـــوانێ ئـــە.و دەوێ؟[1] (۲۰۲۰)
گـەر بەمـەتڵووبت گەیشـتی ئـەی مـەلیح ... ویســـتنی عیللـــەت دەبـــێ ئـــەو دەم قـــەبیح (۲۰۲۱)
گــەر وەســـەر کـــەوتی ئـــەتۆ بـــۆ ئاســـمان ... دوور لەسـوودە، بـت هـەوێ گـەر نـەردەبان (۲۰۲۲)
غـەیری کۆمـەک یانەتـەعلیم دا ن، بەغـەیر ... سـوود نـادا، خـەیر کـردن پاشـی خـەیر (۲۰۲۳)
گـــــەر کوئاوێتـــــەبێ ســـــاف و جـــــەلی ... جەهلەهـــەر کـــەس ئـــەو بکـــاتن ســـەیقەلی (۲۰۲۴)
گـەر لـەلای شـا، دابنیشـێت، بێـت، قـەبووڵ ... بـــۆی بنێـــرێ ناحـــەزە، نامـــەو ڕەســـووڵ (۲۰۲۵)

**داستانی مەشغووڵ بوونی عاشقێک بەخوێندنەوەی نامەی عاشقانەوموتالەعەی نامەی عاشقانەلەحزوور مەعشووقی خوی، وناحەزبوونی ئەو کارەلەلای مەعشووق ... (طلب الدليل عند حضورالمدلول قبيح والاشتغال بالعلم بعد الوصول الى المعلوم مذ موم )**

**خولاسەی داستان...**

مەعشووقێک عاشقی خۆی هینا لەلای خۆی دانا، ئەمما عاشقی ساویلکەو خام لەباتی بەگەیشتن بەمەعشووقی خۆی شادو خۆشحاڵ بێ، دەستی دەباغەڵی نا، و زۆرنامەی دەر هینان کەلەزەمانی

[1]- واسیتەو دەلالی دوایەی، کوا دەوێ؟ (مصرع دوم)

دوو ربوون لەیاری خۆی بەسۆزو عیشقێکی زۆر نووسی بوونی ودەستی بەخوێندنەوەی ئەو نامانەکرد، خولاسەئەوەندەی نا مەخوێندنەوەکەمەعشووق حەوسەلەی بەسەر چوو، لەپاشان مەعشووق زۆر بەحاڵەتێکی تەحقیر ئامیز پێیکوت ئەو نامانەت بۆ کێ نووسیون؟ ئەگەر بۆ منت نوو سیون ئەوەئەلئان ئەتۆ لەلای من دانیشتوی وبەوەسڵی من شاد بووی، وادیارەخوێندنەوەی نامەی عاشقانەلەکاتی ویساڵ غەیری زایع بوونی عومر، بەرهەمێکی دیکەی نییە،عاشق جوابی داوەخۆ ئەمن دەزانم کەئەمن ئەلئان لەلای تۆ دانیشتووم،ئەمما نازانم بۆچی ئەو لەززەتەی کەلەکاتی دووری و فیراق دەمکرد ئەلئان نایکەم؟ مەعشووق پێیکوت بۆیەوای چونکەئەسڵەن ئەتۆ عاشقی من نی، بەڵکەعاشقی ئەحواڵی موتەغەییری خۆتی ..

ـشقی خۆی دادەنا لای خۆیی یار　　عاشقیش دەی خوێند لەبۆی نامانی پار[1] (١٤٠٦)
ـمەتییدابوو گەلێک سۆزی بەتین　　شیعرو شین و ناڵەناڵی زۆر حەزین (١٤٠٧)
ـپێدکوت مەعشووق ئەوەت گەر بۆ منە　　وەسڵ بێت وا، عومر، زایع کردنە (١٤٠٨)
ـەدەخوێنی ئەتۆ ئەمنیش لەلات　　بێژەبۆ من کوانێ عاشق وا دەکات؟ (١٤٠٩)
ـوابی دا حازر لەلامی، تۆ بەڵام　　لەززەتێ نابەم لەوەسڵی تۆ تەمام (١٤١٠)
ـن کەئەوخۆشیەی لەتۆ م ڕا، دیت پار　　ئێستەنیمەگەرچی وەسڵم بوو بەیار[2] (١٤١١)
ـن لەکاتی عیشقی تۆم خوارد، ئاوی ساف　　چاوی قەلبم تازەکرد بەو، بێ گەزاف (١٤١٢)
ـن دەبینم کانی ئەمما ئا و، نا　　دیارەڕێگر جێی لەسەر ڕێم دا دەنا (١٤١٣)
ـپێدەکوت مەعشووق، نیم من جا، لەبۆت　　لێک بەدوو ڕین، ئاسمان و خۆڵەپۆت (١٤١٤)
ـشقی تۆ، هەم بەمن، هەم حاڵی خۆت　　حا ڵی تۆ نابێ دەوام هیچ کات لەبۆت (١٤١٥)
حا کەوابێ عاشقی من نی، تەواو　　جوزئی مەقسوودم لەبۆ تۆ، ئەی بەناو (١٤١٦)
ـڵی مەعشووقم ئەمن، مەعشووق،نا　　عیشق بۆ نەقدینەیە،سەندووق، نا (١٤١٧)
ـەو کەسەی مەعشووقەهەرتەنهایەئەو　　موبتەدایە، مونتەهایە، وایەئەو (١٤١٨)
ـەر ئەوت دەسکەو ت نات بێ ئینتیزار　　ئەو وەها یە، ئاشکرایەو، نادیار (١٤١٩)
ـیری حاڵان بوو نەوەک مەو قووفی حاڵ　　بەندەنەبۆ مانگی ئەوها،مانگ و ساڵ (١٤٢٠)
جۆن بەحاڵ فەرمان بدا، حاڵ وا دەبێ　　بی هەوێ گەر، گیان لەجیسمی چا دەبێ (١٤٢١)

---

[1]- بۆی دەخوێندعاشق گەلێک نامەی دەپار (مصرع دوم)

[2]- لەززەتێکی دیم لەتۆ ڕا پارساڵ　　ئێستەنیمەگەرچی هاتەدەس، ویساڵ

خۆ، نەکامیل بوو ئەوەی، مەو قووفی حاڵ / دابنیشێ جستو جۆ کا، حاڵ بەساڵ ۴۲۲)
کیمیا بۆ حاڵ دەبێتن دەستی وی / دەس تەکان دا، مس دەبێتە، مەستی وی ۴۲۳)
بیهەوێ گەر، مەرگی تاڵ، شیرین دەبێ / درِک و دا ڵیش نەر گس و، نەسرین دەبێ ۴۲۴)
ئەو کەسەی مەوقووفی حاڵە، وایەئەو / حاڵ ببێ ئەو زیاد نەبێ، بێ مایەئەو ۴۲۵)
سۆفی ئیبنولوەقتە، ئەمما ئەی هەواڵ / سافی فاریغ ما، لەئەو قات و، لەحاڵ ۴۲۶)
حاڵ هەموو مەقووفی عەزم و رایی تۆ / دای بەوان ژین، فووی مەسیح ئاسای تۆ ۴۲۷)
عاشقی من نی، بەحاڵ تۆ عاشقی / هەر بەهیوای حاڵ تۆ، پێم شایقی ۴۲۸)
ئەوکەسەی جار کاملەو، جارِ جارِ قەلیل / ئافیلە، نابێتەمەعبوود، بۆ خەلیل ۴۲۹)
ئەو کەسەی نەبێ لەسەر یەک حاڵ،قەرار / بۆیەنابێ کەس ئەوی، بگرێ بەیار ۴۳۰)
ئەوکەسەی کە، خۆشە، جارجارەش نەخۆش / جار دەبێتە ئاوو،جار ئاوری لەجۆش ۴۳۱)
بورجی مانگە، مانگ نییە، مانگ وا نییە / نەقشی بوت، بوو ئەو، لەخۆی ئاگا نییە ۴۳۲)
سۆفی سافی وەختی لا،زۆر خۆ شەویست / بابی خۆی چۆن ویست وەختی وا دەویست ۴۳۳)
غەرقی نووری خوایەسافی ئەی هەواڵ / بێ نییازەئەو لەباب و وەخت و حاڵ ۴۳۴)
غەرقی نوورێک بوو کە( لم یولد ) لەکەس / (لم یلد لم یولد) یش بۆخوایەبەس ۴۳۵)
بت هەوێ ئەو عیشقەتا نەت بێ فەنا / تۆ دەبێ بەندەلەبۆ ئەو قات، دەنا ۴۳۶)
تۆمەنۆرِەجوانەنەقشت یانەپیس / عیشق و مەتڵەب بێنە،گەر تێیدایەکیس ۴۳۷)
چاو مەکەلەوهە،فەقیری، یازەعیف / هیممەتی خۆت، بێنەبەر چاو، ئەی شەریف ۴۳۸)
تۆ، تەڵەب کە، دائیمەن ئەی خۆش نێو / هەروەکوو داوا دەکا، ئاو، وشک لێو ۴۳۹)
لێوی وشکی تۆ گەواهی وا دەدات / تۆدەگەی ئاخر،بەسەر چاوەی حەیات ۴۴۰)
وا بەتینوو ئا و دەدا پەیغامی خۆش / پێم دەگەی تۆ، بەو تەلاش و جنب و جۆش ۴۴۱)
ئەو تەلاشەزێدەباشەپرِ سەمەر / لادەبا مانیع، لەرێی خوا بێ، ئەگەر[1] ۴۴۲)
بۆ تەڵەب، میفتاحی مەتلووباتی تۆ / هەم سپاهو،نوسرەتو، رایاتی تۆ ۴۴۳)
دیقلی سوبحە،خۆ تەڵەب، زۆرخۆش خەبەر / بانگ دەکا، نیزیکەبێت، وەختی سەحەر ۴۴۴)
تۆ تەڵەب کە،گەرچی نەت بێ هیچ سەبەب / چون لەئەسباب بێ نییازە،رێی رەب ۴۴۵)
هەرکەسێ دیتت تەڵەببوو کاری وی / یاری وی بە ، تۆ لەبۆی کە سەرنەوی ۴۴۶)
چون دەگەڵ تالب ئەتۆش تالب دەبی / تۆ لەسایەی غاڵبان غاڵب دەبی ۴۴۷)

---

[1]- زۆر شەریفەئەو تەلا ش و جنبوشە گەر لەرێی حەق دا ببێ ، مانیع کوشە

گـەر سـولەیمانی دەوێ، مێـرووی بچـووک — تـۆ مـەنۆ ڕە، هـیچ کاتێـک لـەو، بەسـووک (١٤٤٨)
ماڵ و سەروەت هـەرچی هـەتبێ، بێ گومان — بیـرو ویسـتن بـوو لەئـەووەڵ، ئـەی فـڵان (١٤٤٩)

**داستانی ئەو کابرایەی کە دەزەمانی حەزرەتی داود شەو و ڕۆژ دوعای دەکرد کە ئەی خودا، ڕزقێکی حەڵاڵ و بێ ئەزیەتم دەیە..**

**خولاسەی داستان...**

کابرایەک دەزەمانی حەزرەتی داود دا هەمیشەوای دوعا دەکرد،خودایا ڕزق و ڕۆزیـەکی حـەڵاڵ وبێدەردو ڕەنج بەمن عەتا کە، خـەڵکیش وەختێک دوعـای ویـان بـەزاهیر پـووچ و بـێ ئەساس دەبیست، مەسخەرەیان دەکرد، بەڵا م ئەوگوێی نەدەدا بەو مەسـخەرانە، و هـەروەها بـەو دوعـا و پاڕانەوە و خواستنی ڕزق و ڕۆزی بێ زەحمـەت و بـێ دەردەسەر،مەشـغووڵ بووتـا وەکوورۆژێـک دەحاڵێک داکەغـەرقی دوعاوپاڕانـەوەبوو گـا یـەکی قەڵـەو بـەغاردان هاتەبـەر دەرکـی مـاڵی وی وبەشاخی زەلامی، محکەم لەقفلی دەرکەی دا وقفلی شکاند و هاتەژوور، کابرا جێ بەجێ دەسـت و پێی ئەو حەیوانەی محکەم بەست و بەچەقوویەکی تیـژ، سـەری بـڕی ساحەبێ (گا) وەختێـک کەگایەکەی خۆی بەکوژراوی و خوێناوی دیت ئێقەو بەرۆکی کابرای فـەقیری گـرت وپێیکوت ئەی بێ ڕەحمی دڵڕەق بۆ گای منت کوشت؟ کابرای کەگایەکـەی سـەربڕی بـوو جـوابی داوە، کەئەمن هیچ سووچ و تاوانم نییەزۆرلەمێژبوو کەڕزق و ڕۆزی حەڵاڵم لەخودا داوا دەکرد، ئێستا دوعام قەبووڵ بووەوە.. ساحەبی گا لەو جوابەکەبەزاهیرلەلای کەس قابیلی قەبووڵ نەبوو بـەجنێوو لێدان بردی بۆ مەحکەمەی حەزرەتی داود(ع) حەزرەتی داود پێیکوتن چ قەوماوە؟ سـاحەب گـا پێیکوت ئەی پێغەمبەری خودا بـەدادم بگە، ئـەو کابرایەبـەزوڵم گـای منـی سـەر بڕیوەحـەزرەتی داود ڕووی دەموتتەهەم کرد و پێیکوت بۆچی ماڵی ئەو کابرایەت تەلەف کردووە؟ بەچ دەلیلـی شـەرعی یاعورفی گـای ویـت سـەر بڕیـوە؟ کابرای کەگایەکـەی سـەر بڕیبـوو کـوتی ئـەی داود حەوت ساڵەشەوو ڕۆژ لەدەرگای خودا دەپاڕێمەوەکەڕزق و ڕۆزیـەکی حـەڵاڵ و بـێ زەحمـەت و بێ ڕەنج و بێ دەردەسەر بـەمن عـەتا کا ئێستا دەبینـم دوعایەکـەم قـەبووڵ بـووەوە، ئـەمن نـەک لەبـەرخواردنی گۆشـتی ئەوحەیوانەبەڵکـەم بەشـوکرانەی ئەوەکەدوعایەکـەم قـەبووڵ بووەوەئـەو حەیوانەم سەر بڕیوە؛ خولاسە حەزرەتی داود پاش بیستنی قسەی هـەر دووک لا، چۆ میحرابی عیبـادەت وخەڵوەتخانـەی خـۆی، ماوەیـەک لـەکار و بـاری ئـەو دوو نەفەرانـەفکری

کردەوەوعاقیبەت وەحیی خودا لەو بارەدا گەیشت وحەقیقەتی مەو زووع ئاشکرا بوو..داود (ع) لەخەڵوەتخانەی عیبادەت هاتەدەر تا حوکمی نیهائی خۆی لەبارەی ئەو مەو زووعەدا، ئیعلام بکا . حەزرەتی داود بەساحەب گای کوت دەست لەئیددیعای پووچ و بێ ئەساسی خۆت هەلگرە،حەق بەو کابرایە،کەگایەکەی سەربڕیوە،وئەو کابرایەنەک هەرزوڵمی نیسبەت بەتۆ نەکردووە، بەڵکەم دەبێ تەواوی ماڵ و سەر وەت و داراییت بدەی بەوی، ساحەب گا کەئەو حوکمەی بیست دادو فیغانی لێ بڵیند بوو و وەک شێتان بۆ ئەو لاو ئەو لا دەچوو ولەخەڵکی کۆمەکی دەخواست وخەڵکیش زۆر بەتەعەججو ب و دڵنەرمی حەقیان بەساحەب گا دەدا، وپێیان وابوو کەئەو زوڵمی لێکراوە، جا لەبەر ئەوە، لەحوکمی داودیان شک و گومان هەبوو ودەستیان کرد بەئیعتیراز کردن، حەزرەتی داود وەختێک کەلەو ئیعتیرازانەئاگاداربوو ئیحساسی کرد کەوەختی ئەوەیەکەحەقیقەتی حاڵ ئاشکرا بکا، جا بەخەڵکی کوت هەستن با پێکەوەبچین بۆ سەحرا تا پێتان سابیت بکەم کەحەق بەکێیە.. هەموو وەڕێ کەوتن جا، ڕۆیشتن تاکو گەینەدارێکی زەلام وگەو رە، بەلک وگەڵای زۆر،حەزرەتی داود کوتی لەژێر ئەودارەبۆنی خوێن دێ، ئەوخەرابکارە(ساحەب گا) لەساڵانی پێش دا بابی ئەو کابرا فەقیرەی (کابرای کەگای سەربڕی بوو) کوشتووەوتەواوی ماڵ و سەر وەتی ویشی داگیر کردووە، ڕازی ئەو جینایەتە، زۆر لەمێژ ساڵەکەدا پۆشراوەبەڵام حیرس و تەماعی ئەو کابرایە( ساحەبی گایەکە) باعیس بووکەشکایەت بێنێ بۆ مەحکەمەی من وهەر بەو شکایەتەحەقیقەتی مەو زووع ئاشکرا بوو وپەردەلەسەر ئەو جینایەتەلاچوو لەپاشان داود(ع) ڕوو ی لەخەڵکی کرد و کوتی ئەو خەرابکارە(ساحەب گا) بۆ ئەوەماڵی بابی ئەو کابرایە(کابرای کەگا یەکەی سەر بڕی بوو) داگیر بکا ئەوی بەچەقوو کوشت وچونکەزۆر بەعەجەلەبووجەسەدەکەی بەچەقووەئەلێرەلەژێر خاک دەفن کرد، ولەبۆ ئیتمینان ئێرە، بدەنەوە، تا حەقیقەتی ما جەڕاتان لێ مەعلووم بێ فەو رەن ئەوێیان دا وەو جەسەدەکەیان دەگەڵ چەقوو دیت و لەئاخیردا، موجریم، بەقیساس موجازات کرا ..

| | | |
|---|---|---|
| یەک نەفەربوو،لەو دەمی داود، نەبی | ئەو لەلای خەڵکی، چ زانا، یا غەبی | ۴۵۰ |
| وای دوعابوو، ڕۆژو شەو تۆ، ئەی خودا | ڕزق و ڕۆزی بێ عەزاب، پێم کەعەتا | ۴۵۱ |
| چونکە ئەی حەق تۆ منت چاکرد یەقین | تەنبەڵ و سست و تەوززەل، زۆر غەمین | ۴۵۲ |
| ئەو کەرانەی پشت برینداری ڕەبەن | باری ئێستر، یانەئەسپان،کوا دەبەن؟ | ۴۵۳ |

جـون منـت چـاکرد تەنبـەڵ، ئـەی خـودا — هەرلــەرێگای تەنبــەڵی، پــێم دە، غــەزا (١٤٥٤)

ــێبەری جێگـا خــەوی مــن، نێـو وجــوود — تەنبـەڵم جێـی وای بـەمن دا، فـەزل وجـوود (١٤٥٥)

ـتۆ بەسسـت وتەنبـەڵ و بـێ حـاڵ مەگـەر — ڕزق و ڕۆزی دی دەدەی، ئــەی داد گــەر؟ (١٤٥٦)

ـەرچی لاقـی بـێ، دەچـێ بـەدوای غـەزا — خــوت بکــەڕەحمێ بــەبێ لاق، ئــەی خــودا (١٤٥٧)

ـتۆ بنێــرەڕزق بــۆ لای ئــەو حــەزین — تــۆ بنێرەهــەور، بــۆ هــەر ســەر زەمــین (١٤٥٨)

جۆنکەدەســت وپێــی نییەئەســڵەن، زەوی — جـوودی تـۆ هـەو را ن دەبا، بـۆ لایـی ئـەوی (١٤٥٩)

ـکومنــداڵ بــێ لەدەســت و پــێ بــەدوور — دێ دەدا دایکــی غــەزا بــەو، بــێ قســوور (١٤٦٠)

ـمهــەوێ ڕزقێــک لــەناکاو،بێ تەعــەب — چون لەکۆشش، بەرهـەمم بوو،بـەس تەڵـەب (١٤٦١)

ــاوەێیکی زۆری ئــــەوکرد وا، دوعـــا — ڕۆژ هــەتا شــەو، شــەو هــەتا وەختــی زوحـا (١٤٦٢)

ـێکـــــەنینی خســــــتەجەم،گفتاری وی — ئــەو تــەماعی پــووچ و، زۆر ئیســـڕاری وی (١٤٦٣)

جـی دەڵـێ وا زۆر عەجـەب ئـەو ئەحمەقـە؟ — یاکەســێک پێیداوەبــەنگ، هۆشــی لەقــە (١٤٦٤)

ـێـی ڕۆزی کەسـب وڕەنجـە، هـەم تەعـەب — دای بەگشـت کـەس خـۆ خوداپیشـەوتەڵەب (١٤٦٥)

ــەس لــەڕێی ئەســباب ڕۆزیتــان بــوێ — گەر کو چوون بۆ ماڵ، لەڕێی دەر، بچنەوێ (١٤٦٦)

ـو نــەبی ئێسـتا لەلایەن،گشـت کــەس — هــەر بەتــەنیا، حــەزەتی داوودە، بــەس (١٤٦٧)

ــەو شــکۆهو عیــززو نــازی مەعنــەوی — ئینتیخــابی کــرد خــودای بــاڵا و نــەوی (١٤٦٨)

ـوورلەئـەژمار بــوو لــەبۆ وی مــوعجیزات — مەوجی بەخشیش‌یەک بـەدووی‌یـەک‌دا دەهات (١٤٦٩)

ـێ لــەئادەم تــاکو ئێســتا هاتــەبوون — دەنگی خۆشی بێ بەچەشنی ئەر غـەنوون؟ (١٤٧٠)

ئەوبەهــەرووەعزێک کەدەیـدا یـەک سـەدا — دووسـەدان ئینسـان لـەوێ گیانیـان دەدا (١٤٧١)

ـێر و ئـاهوو کـۆ دەبـوون، تـا ئـەو زەمـان — گـوێ بـەووەعزان دەن، لەیـەک غافڵ ئـەوان (١٤٧٢)

ـەو سـەدایەهەم سـەدا بـوو ن تـەیرو کێـو — بردنـی دەنـگ ئـەو دوو بـۆلای وی، نـەخێو (١٤٧٣)

ـەیری ئەو هەش هەیتی ئەو سەت موعجیزات — نووری ڕووی وی،بێ جیهات و نێو جیهات (١٤٧٤)

ــەو هــەموو ئیعــزازەدای بــەو،کردگار — ڕزق و ڕۆزی، بەس لەڕێگای کەسب و کار (١٤٧٥)

ـەرچی نـەی بـوو ئـەو دەژینـدا هـیچ گـرێ — رزقـی ئــەو دەم بوو،کـەکردی چـاک، زرێ (١٤٧٦)

ـەک نەفەر بەد بەختی خۆشی قـەت نـەدیو — دەر کــراوی دەهــر و، خــانوو بــۆ گــەنیو (١٤٧٧)

ـۆر بـەزوویی دەیهـەوێ ئـەو بـەخت، ڕەش — بـێ تیجـارەت زۆرلەسـوود بـی بێـت بـەش (١٤٧٨)

ـێــتەئەو گێــژی نــەفامی هــیچ نــەزان — دەیهــەوێ ئاســمان بچــێ، بــێ نــەردەبان (١٤٧٩)

ــەک بەشــۆخی پێیــدەکوت تــۆ بگرەهــا — ڕزق و ڕۆزیـت، موزدەشـت بـۆ هـات، وەهـا (١٤٨٠)

پێکەنی ێێکێک کوتی ئەی چاو ڕەشم — لەو هەدایای دای بەتۆ میر، کوا بەشم؟ (٤٨١

بەو هەموو عەیبەی کەلەو یان گرت ناس — لاینەنا قەت، ئەو دوعایەو ئیلتیما س (٤٨٢

تا کو ئەو بوو وا لەنێو خەڵکی شەهیر — خۆ لەهەنبانەی بەتاڵ، دەبوێ، پەنیر (٤٨٣

بۆ مەسەل بۆ سادەلەوحی ئەو گەدا — لەو دوعایە، خۆی نەکرد، هیچ کات جودا (٤٨٤

**هاتنی گا، بە غاردان بۆ ماڵی ئەو کابرای کە بە ئیلحاح و ئیسراڕ دوعای دەکرد (قال النبی علیەالسلام) (ان اللەیحب الملحین فی الدعاء ) حەقیقەتەن خوداوەند دوعاگۆی موسیڕڕی خۆش دەوێ ...**

تاکو ڕۆژێک وەختی چێشتان ناگەهان — لەو دەمەی دەیکرد دوعای وا، ئەو فلان (٤٨٥

هاتەماڵ گایەک بەتوندی ناگەهان — قفڵی دەشکاند زوو بەشاخان ئەو زەمان (٤٨٦

هاتەژوور بێ ترس و بێ باکانە، گا — دەست و پێی بەست، جێ بەجێ کابراکە، جا (٤٨٧

جا، بڕی لەو گایەسەر هەر ئەو زەمان — بێ تەوەققوف، بێ تەئەممول، بێ ئەمان (٤٨٨

پاش ئەوەی کردی جودا، لەو گایە، سەر — چوو کەقەسساب، پێستەکەی بێنێتەدەر (٤٨٩

**کۆمەک ویستنی نازیم(حەزرەتی مەولانا) لەخوداوەند...**

دەمهەوێ لێت ئەی خودای باڵا و نەوی — بت هەوێ گەر من تەواو کەم مەسنەوی (٤٩٠

سەهل کە، تەوفیق بدە، ڕێم دە، نیشان — یانەببرەتۆ ئومێدم، سەهل و سان (٤٩١

گەر لەموفلیس دەتهەوێ تۆ زێڕی کان — شەهریارا تۆ بدەبەو، زێڕ، نیهان (٤٩٢

بێ تۆ شیعرو قافییە، شام و سەحەر — کوا دەکا جورئەت کەبێتەبەر نەزەر؟ (٤٩٣

شیعرو تەجنیس و قەوافی ئەی خودا — گشت موتیعی ئەمری تۆنە، بێ سەدا (٤٩٤

چونکەکردت تۆ موسەببیح ئەی غەفوور — زاتی عاقڵ یا لەعەقڵی زۆر بەدوور (٤٩٥

یەک بەیەک تەسبیح دەکەن تۆ،خوای لەسەر — گشت لەحاڵی یەکتری بوون بێ خەبەر (٤٩٦

ئادەمی مونکیر بەتەسبیحی جەماد — ئەو جەمادەش بۆ عیبادەت ئووستاد (٤٩٧

بەڵکەحەفتاد و دوو میللەت یەک بەیەک — بێ خەبەر بوون لێکتری، لێک کەوتنەشەک (٤٩٨

گەر دوو ناتیق لێکتری بن بێ خەبەر — چۆن لەیەک ئاگا دەبن دیوار و دەر؟ (٤٩٩

گەر لەزیکری ناتیقان من غافڵم — کوا دەزانێ زیکری سامیتان، دڵم؟ (٥٠٠

بوو لەزیکری جەبری، سوننی بێ خەبەر — زیکری سوننی نەیبوو، بۆ جەبری ئەسەر (٥٠١

سوننی بۆخۆی زیکری خاسی خۆی دەکات — جەبری زیدی وی دەکابی بێ، نەجات (٥٠٢

هــەردوو یــەکتر زاڵ دەزانــن، ڕێگــەگوم بێ خەبەر بوون لێکتری و فەرمانی (قوم) (١٥٠٣)
یـەک دەڵێـتن ئـەو هـەنیتی هـیچ خەبـەر جەنگی وان چابوو بەویستی خوای لەسەر (١٥٠٤)
گـەو هـەری هـەموان دەکا لێکتر جودا باش و بەد لێکتر دەکا زاهیر خودا (١٥٠٥)
قەهرو لوتفی چاک دەناسن گشت کەس جاچ زانا یانەزان بێ، یانەخەس (١٥٠٦)
ـۆنغـەکی ئـەمما بـەزاهیر بوو بەکین یانەقەهرێک، کردی نێو لوتفێک کەمین (١٥٠٧)
ـەیری مەردی حەق نەبێ هیچکەس ئەوان لێک جودا ناکات و بۆی نابن، عەیان (١٥٠٨)
ـەیری وان تابیع بەزەنن، نەک یەقین تاقەیەک باڵیان هەیە، بۆ هەڵفڕین (١٥٠٩)

**بەیانی ئەو مەتڵەبە کە عیلم دوو باڵی هەیە، وشک و گومان یەک باڵ.. گومان ناقیسە و لە پەرواز عاجزە، و میسالی زەنن و یەقین دەعیلم دا ...**

ـەیتی دوو باڵ عیلم و، یەک باڵ بوو گومان زەن لەپەرواز ناقیسەهەم ناتەوان (١٥١٠)
تەیری یەک باڵ هەڵفڕی گەر دوو قەدەم تۆدەبینی کەوتەعەردی، لاجەڕەم (١٥١١)
زۆربەزەحمەت، ڕێ دەچێ، تەیری گومان بەو ئومێدەبچتەوەبۆ ئاشیان (١٥١٢)
عیلمی بۆ هات گەر لەزەن خۆی هەڵبڕی تەیری یەک باڵ بووبەدوو باڵ، هەڵفڕی (١٥١٣)
حا. لەپاشان ڕێ دەچێ ئەو موستەقیم نەک بەسەر ڕوو، یا ببێتن ئەو سەقیم (١٥١٤)
هەیبێ دوو باڵ، دەفڕێ هەر وەک جەبرەئیل بێ گومان و بێ شک و، بێ قال و قیل (١٥١٥)
گەر هەموو کەس پێی بڵێ ئەڵێن ئەتۆی ڕاس لەڕێی ڕاستی خوداوەند، دا، دەڕۆی (١٥١٦)
زەڕڕەیەک ناکا بەمەدحی وان نەزەر ئافەرینی وان لەبۆ وی، بێ سەمەر (١٥١٧)
یا هەموو بێژن لەدین تۆ وەر گەڕای خۆت بەکێو زانی، بەڵام یەک پووشکەکای (١٥١٨)
ئەو بەتانەی وان نای بێ هیچ گومان ئەو غەمین نابێ کەدوور بن ئەو، لەوان (١٥١٩)
بەڵکەگەر دەریاو کێو، بێژن وتا ر پێی بڵەن گەڵ گومڕەهان تۆ بوو ی بەیار[1] (١٥٢٠)
بەو وتارە، زەڕڕەیەک، ناکا خەیاڵ لۆمەناکا ئەو، چ کات، ناخۆشحاڵ (١٥٢١)

---

[1]- پێی بڵەن گەڵ گومڕەهان تۆبوویەیار

**میسالی نەخۆش بوونی ئادەمی بە سەبەب خەیالاتی تەعزیمی خەلک و ڕەغبەتی موشتەری نیسبەت بەوی، و داستانی موعەللیم ...**

**خولاسەی داستان ...**

منداڵی مەکتەبخانەلەسەخت گیری و تەلاشی ئوستادی خۆیان لەدەرس و مەشق مەلوول و دڵتەنگ و خەستەببوون، ڕۆژێک کۆ بوونەوەتا چارەیەک بدۆزنەوەوماوەیەک لەدەس ماما مۆستای خۆیان ئاسوو دەبن و نەفەسێکی ڕاحەت بکێشن، لەنێو، وان دا منداڵێکی زیرەک هەبوو وفکرێکی کرد وڕووی دەمندالان کرد و پێیکوتن ئەی دۆستانی خۆشەویست قەرار دا دەنێین کەهەر وەخت ما مۆستا هات، لەهەوەڵەوەئەمن پێیدەڵەم ئەی مامۆستای بەڕێز خودا بەد نەدا، مەگەر نەخۆشی؟ بۆ ڕەنگی موبارەکتان پەڕیوە؟ وهەر وەها لەو جوورەقسانە..ئەگەر ئێوەش بەو جوورەقسەی دەگەڵ بکەن بێ شک فکر دەکاتەوە، وبەوەهم و خەیاڵ دوچاری نەخۆشی دەبێ وحاڵی تێک دەچێ، ودەتوانین ماوەیەک لەدەستی وی ڕاحەت بین دەئاخیردا مندالان مامۆستایان بەو قسەو تەڵقینانەی خۆیان شکەست دا، مامۆستا پێی وابوو کەبەڕاستی نەخۆشەو بەو جوورەمەکتەبخانەی تەعتیل کرد ومنداڵەکان نەفەسێکی ڕاحەتیان کێشا ..مامۆستا چۆوەماڵ، وهاو سەری خۆی سەرزەنیش کرد کەئەتۆ بۆ پێت نەکوتوە؟ ولەماڵ کەوُت...

چون تەلاشی کرد لەمەکتەب ئوستاد بوون مەلوول منداڵ، نەبوون یەک زەڕەشاد (۲۲:

مەشوەڕەتیان کرد بەکار بێنن، چ چار تاکو تەعتیل کا، موعەللیم دەرس و کار (۲۳:

بۆچی نابێ چەند ڕۆژ، ڕەنجوور ئەو؟ تا لەدەرس و مەکتەبێ، بێ دوو ر ئەو (۲۴:

تا نەجات بین هەم لەدەرس و هەم لەکار ئەو بەچەشنی سەنگی خارا بەر قەر ار (۲۵:

یەک منداڵی زێدەزیخ، وای کرد، بیر پێیدەڵەم بۆ ڕەنگ زەردی وەک ئەسیر؟ (۲۶:

ڕەنگ پەڕیوی، پێت نەداتن، دەرد، ڕەب یاهەوا باعیس بوو والەی یانەتەب (۲۷:

بەو قسانەم،کەم دەچێ بۆ نێو خەیاڵ تۆش بەمن کۆمەک بکە، وا، ئەی هەواڵ (۲۸:

پێی بڵێ گەرهاتی مەکتەب ئەی هەواڵ خوانەدا بەد، پێت بدا خوا، باش حاڵ (۲۹:

جا، خەیاڵی زیاد دەبێتن ئەو دەمی هەرخەیاڵ باعیس بوو شێت بوو ئادەمی (۳۰:

شەخسی سێوو، چوارەمو، هەم پێنجەمین چەشنی ئێمەخۆی نیشان دا، زۆر غەمین (۳۱:

گەر ببێژن سی منال ئەو جوورخەبەر ئەو دەکا باوەڕ خەبەر، بێ دەردەسەر (۳۲:

گشتی کوتیان ئافەرین ئەی هووشیار پێت بداتن بەخت و ئیقباڵ، کردگار (۳۳:

ـێتێفاقیـــان بـــوو لەعەهـــدی ئیســـتیوار　　لــــەو قســــانەلانەدا، یــــەک دانــــەیار (۱۵۳۴)

ـــ ـەپاشـان سـوێندی دا، ئـەو گشـتیان　　تـــاکو نەشـــکێنێت غـــەمماز، پشـــتیان (۱۵۳۵)

ـکـری ئەومندالــە، مــەقبووڵ لای هــەموو　　کەوتەپێشـیان عـەقڵی وی، ئیـدیش لـەدوو (۱۵۳۶)

ـ ـر تـەفاوەت بـوو لـەنێو عـەقڵی بەشـەر　　هــەروەکوو فــەرقیان هــەبوو،جوانی سـووەر (۱۵۳۷)

ـیەفـەرمووی والـە، ئەحمـەد، نێـو مـەقال　　نێـو زبـان پنهـان دەبـێ حوسـنی ڕیجـال (۱۵۳۸)

**عقوول دەخیلقەت دا، لێک جیان بەڵام لەلای موعتەزیلان بەرابەر وموساوین تـەفاوەتی عقوول بەتەحسیلی عیلم و دانیش پەیدا دەبێ ...**

ـێ ـەخیلقـەت دا، عقـوول لێکتـر جییـان　　بگرەگـوێ تـۆ، تیبقـی قـەو لـی سـوننییان (۱۵۳۹)

ـەزلی ئـەهلی ئیعتیـزال خـۆ، وا، نییـە　　عـەقڵ، لای وان یـەک لەئیـدی جیـا نییـە (۱۵۴۰)

ـەس بـەدانیش عـەقڵ،زیاد وکـەم دەبـێ　　بەس بەدانیش یەک لەیەک،ئەعلەم دەبێ (۱۵۴۱)

ـ ـەـ ئـــەو قەولەچونکەیـــەک منـــاڵ　　گـەرچی نیتـی تەجرەبـەی چەنـدین سـاڵ (۱۵۴۲)

ـ ـ دەبێ فکرێک دەکا ئەو تیفلی چووک　　پیـــر لەدەســـتی وی دەبێتن،عـــەقڵ،پووک (۱۵۴۳)

ـــــدەبوونێکی لــــەڕێگای فیترەتــــە　　چاکترەلـــەو هـــەی لـــەڕێگای فکرەتـــە (۱۵۴۴)

ـمەباشـــەبێژەپێم ئـــەی خـــۆش ئـــەدا　　عـەقڵی کەسـبی یانەعـەقڵێک، دای خـودا؟ (۱۵۴۵)

**گرفتار بوونی مامۆستا بە وەهم و خەیاڵ، تەوەسسوتی مناڵان...**

ـــوژ بـــەڕۆژو گشـــتییان هـــاتن منـــاڵ　　تـــاکو مەکتەبخانەبـــەو فیکـــرو خـــەیاڵ (۱۵۴۶)

ـــ ـن لەپشـتی دەرکـە، بوویـان ئینتیـزار　　تـا لەئـــەووەڵ بچتـــەژوور وشـــیار، یـــار (۱۵۴۷)

جونکـــەبۆ ئـــەو بیرەهـــەر ئـــەو ڕەهبـــەرە　　پێشـــەوای پـــێ، خـــۆ هەمیشەهەرســـەرە (۱۵۴۸)

ـێ موقەللید تۆنەکەی قەت،پێش کەوی　　لەوکەسـەی کـەنووری حـەق دێ بـۆ ئـەوی (۱۵۴۹)

ـتەژوورئـەو، زوو کوتی،ئوسـتاد، سـەلام　　خـوا نـەدا، بـەد، ڕەنگی ڕووت، زەردە،لـەلام[1] (۱۵۵۰)

ـــ:کوت ئوستاد نـەخۆش نـیم، وا مـەڵێ　　زوو لـەجێی خـۆت دابنیشـە، دەی، هـەڵێ (۱۵۵۱)

ـ ـدەکوت ئـەمما خـەیاڵی وەک غوبـار　　هات لەدڵ نیشت کەمکەمە، لەو بوو، بەبار (۱۵۵۲)

ـکـی دیکـەش هـاتو، وایکـوت ئـەو دەمـە　　جـا خـەیاڵ و وەهمـی زیـاد بـوو کەمکەمـە (۱۵۵۳)

ـەڕوەهابوو تـاکو وەهمـی بـوو قـەوی　　جـا، خـەیاڵ کـردی بەئوسـتاد، سـەر، نـەوی (۱۵۵۴)

---

- خوانەدا بەد، ڕەنگ و ڕووت زەردەلەلام (مصرع دوم)

## نەخۆش بوونی فیرعەون، بە خەیاڵ و وەهمی تەعزیمی خەڵکی ...

سـەجدەیێکی پیـاوو ژن بردیـان بـەعام ... کـردی ڕەنجـوور قـەلبی فیرعـەونی نـەفام
چونکـەکوتیان تـۆ خـودایی بـێ هـەواڵ ... لێـی سـتاند، ئـابڕوو، لـەوی وەهمـو خـەیاڵ
ئـەو بـەدەعوایی خـودایی بـوو دلێـر ... بـوو بەئـەژدیها، نـەبوو هـیچ کـات، تێـر
عـەقڵی جـوزئی ئافـەتی وی، بـوو بـەزەن ... چونکـەتاریکی لـەبۆ وی، بـوو، وەتـەن
نیـو گـەزت ڕێگـا هـەبێ گەرتۆ،لەعـەرز ... بێ خـەیاڵ تۆ، ڕێ دەڕۆی، بێ تـرس ولەرز
گەرلەسـەر دیـواری عـالی ڕێکـەوی ... دوو گەزیش بێ کەج دەڕۆی، نەک تێکەوی
بـەل، لەترسـان تـۆ دەبـی دووچـار بـەوەهم ... چـاک بناسەترسـی وەهمـێ، تـۆ بەفـەهم

## نەخۆشبوونی ئوستاد بە وەهم و خەیاڵ...

سسـت بـوو ئوسـتاد بەئـەوهام،چوو لـەحاڵ ... ڕاپـەڕی یـەک سـەر لـەوێ ڕا، چـۆ وەمـاڵ
تووڕەبـوو ئـەو زۆر لـەژن، چـاو نایهـەوێم ... وا نەخۆشـم هـیچ نـەی پرسـیوەلێم
بـۆچی نـەیکوت ئەوپـەڕیوەڕەنگی مـن ... دەیهەوێ ئەو دوور لەخۆی کا، دەنگی من
ئەو بەجوانی زاهیری خۆی بوو بە مەست ... ئێستەئەمنیش عومری جوانیم چوولەدەست
هـات گـەڕاوەماڵ بـەتووڕە، ئووسـتاد ... بـوون لـەدووی وی دا، منـاڵان زێـدە شـاد
ژن کـوتی زووهـاتی، خـوا پێـت بـەد، نـەدا ... تـۆ لـەدەردو بـەد، بـەدوو رکـاتن، خـودا
جـوابی دا کوێرنی ئەگـەر، چاو ڕەنگی مـن ... ئەجنـەبی بـۆم شـین دەگێـڕن، پیـاوو ژن
تـۆ لـەماڵ دا چـون هەتـەزۆر بـوغز و کـین ... بۆیـەنابینی دەمـن دا، تـای بـەتین
ژن کـوتی عـەیبت نییـەتۆ، ئـەی عـەزیز ... زەننی هیچ و پووچ ئەتۆی کرد، وا لە، زیز
پێیکوت ئەی بەد ،هەر وەکوو پێش،وای عەنید ... کـوێری نـابینێ دەلـەرزم چەشـنی بیـد؟
مـن گونـاهم چـی بووکـوێری کـەڕ ئـەتۆ؟ ... مـن دەڕەنـج ودەردو میحنـەت بـم، لـەبۆ؟
ژن کوتی نەینووک دەدەم پێت ئەی بەجاه ... تـا بزانـی نیمـەمن، جورمـو گونـاه
پێیدەکوت نـەینووک وخـۆت تـایع، کـەنین ... خـاتیئودوژمن، بـەمن، هـەم ئـەهلی کـین
زووکـە، چاکـە،جێ لـەبۆ مـن، ئـەی فـلان ... تـابنووم مـن، چـون سـەرم زۆر بـوو گـران
ژن درەنگـی کـرد جـا، پیـاو بـەو کـوتی ... ئـەی عـەدوو زووکـە، شـیاوی میحنـەتی

**نەخۆش کەوتنی ئوستاد بە جێ و بان و ناڵینی وی لە وەهمی نەخۆشی ...**

| | | |
|---|---|---|
| ـ کوتی و، چاکی دەکرد جێگایی نەرم | ناعیلاجم، چاو دەسووتێ، چەندەگەرم | (١٥٧٧) |
| ـ بڵەم گەر،ئەو دەکا، من موتتەهەم | گەر نەڵەم، دەردی دەبێ زیاد،زۆر، نەکەم | (١٥٧٨) |
| ـی بەد، ڕەنجووردەکاتن، ئا دەمی | گەر چی نەیبی زەڕڕەێکیش، ئەو غەمی | (١٥٧٩) |
| ـکرا دەیکوت بەخەڵکی، وا، نەبی | گەر نەخۆش کەن ئێوەخۆتان، وادەبی | (١٥٨٠) |
| گەر بڵەم بەو، وەهمەوالەی ئەی جەناب | خۆی دەڵێ، ژن دەیهەوێ کاری خەراب | (١٥٨١) |
| دەیهەوێ تاکو لەماڵم بچمەدەر | بۆ فەساد و فیسق نەیبێ هیچ سپەر | (١٥٨٢) |
| جێی لەبۆ ئوستاد چاکرد ژن لەماڵ | جا، لەژێر جێ دەستی کردەناڵەناڵ | (١٥٨٣) |
| ـ دەنیشتن جا لەوێ منداڵ بەجەم | دەرس و مەشقیان بەر دەوام بوو، زۆر بەغەم | (١٥٨٤) |
| بەو هەمووفێڵەش لەزیندان ماینەوە | ئەو هەپاداشێکەقانو ن داینەوە | (١٥٨٥) |

**بۆ دووهەم جار منالان ئوستادی خۆیان خستە خەیال، کە ئوستاد لە قورئان خوێندنی ئێمە سەری دێشێ ...**

| | | |
|---|---|---|
| وای بەمندالان دەکوت ئەو هووشیار | توند بڵێن دەرسان وەکوو، هەو ری بەهار | (١٥٨٦) |
| وەختی خوێندیان، بانگی کردن بێ درەنگ | ئەزیەتی ئوستاد دەدا، ئەو دەنگەدەنگ | (١٥٨٧) |
| دەنگی ئێمەهەیتی بۆ ئوستاد زەرەر | چۆن دەبێ بۆ پووڵی کەم، وا، دەردەسەر؟ | (١٥٨٨) |
| پێیکوتن ئوستاد هەستن بچنەدەر | زێدەبوو بەو دەنگەبۆ من دەردەسەر | (١٥٨٩) |

**نەجات بوونی منالان لە مەکتەب بەو فێڵە...**

| | | |
|---|---|---|
| سەجدەیان برد و دەیان کوت ئەی کەریم | دەردوڕەنجت پێ نەدا،قەت خوای ڕەحیم | (١٥٩٠) |
| دەرپەڕین منداڵ هەموویان چوونەماڵ | وەک دەچن بۆ دانە، تەیران خۆشحاڵ | (١٥٩١) |
| دایکی مندالان بەڕق،کوتیان، منال | ڕۆژی دەرسە، مەکتەبو، بۆ کرد، بەتاڵ[1] | (١٥٩٢) |
| وا بەدایکیان کوت منالان ئەو دەمە | بێ گوناهین گەر دەکەین، با زی ئەمە[2] | (١٥٩٣) |
| وای لەبۆ ئوستاد موعەییەن کرد قەزا | گەر بەدەردو ڕەنج و ئێش بێ، موبتەلا | (١٥٩٤) |
| دایکی مندلان، کوتیان ئێوە، خۆ | بۆ قوماران چا دەکەن سەت جوور درۆ | (١٥٩٥) |

---

[1]- بۆ لە دەرس و مەکتەبو ، کرد ، ئاش بەتاڵ (مصرع دوم)

[2]- بێ گوناهین گەر دەکەین بازی و گەمە(مصرع دوم)

ئێمــەدێین، بــۆ لای موعــەللیم، ســوبح زوو — تـا عــەیان بـێ، مـەکرو فێڵتـان، لـێن هــەموو (۴۶)
گشــتی منــداڵان بــەدایکیان کــوت بــڕۆ — تــا عــەیان بــێ، ڕاســتەقەو لــن، یــادرۆ (۴۷)

**چوونی دایکان بۆ عەیادەتی مامۆستا...**

لای موعـەللیم چـوون سبەی زوو،دایکـەکان — نوسـتبوو ئـەو، وەک نەخۆشـێک، سـەرگران[1] (۴۸)
ئـــەو بـــەلێفان ئارەقـــەی زۆر کردبـــوو — پێچـــراو ســـەر، ون لـــەژێر لێفـــان، ڕوو (۴۹)
ناڵـــــەناڵی کەمکەمـــــــەجا، هاتـــــەدەر — دەنگــی لاحەولــەش، لەخــەڵکی دەورو بــەر (۵۰)
خـوا شـەفات ئوسـتاد بـدا، لـەو دەردەسـەر — سوێن بـەگیانت،بووین لـەدەردت بێ خەبـەر (۵۱)
پێیکـوتن نـەم بـوو منـیش خـۆ هـیچ خەبـەر — هــەرمناڵ کوتیــان بــەمن ئــەو دەردەســەر (۵۲)
بێ خەبـەربوو م مـن بەشـوغڵی قـاڵ و قیـل — بــووم دەبــاتین دا گــەلێک، دەردی ســەقیل (۵۳)
گـەر دەقیـق مەشـغووڵ بـەکار بێ ئـا دەمـی — ئــەو لــەدەرد و ڕەنــج کــوێرە، ئــەو دەمــی (۵۴)
چـون لەیوسـوف کردیـان ژن،چـاک نـەزەر — چوون لەهۆش و بوون لەخۆیان بێ خەبەر (۵۵)
دەستی خۆیان لەت دەکرد، بێ دەردو ئێش — ڕووحی عاشق کوێر، لەحاستی پاش وپێش (۵۶)
زۆر دەبــێ پیــاوی دلێــری دوور لەنــەنگ — دەست و پێی دەبڕێ، لەنێو مەیدانی جەنگ (۵۷)
ئەو لـەبۆ جـەنگ دێنـێ ئـەو دەستی، بـەکار — بـەو خەیاڵـەدەس لـەجێی خـۆی بـەر قـەرار (۵۸)
جـــا دەزانـــێ دوایەدەســـتی دی، زەرەر — گەرچی خـوێن زۆر ڕۆی لـەوی، نـەیبوو خەبـەر (۵۹)

**لەبارەی ئەو مەتڵەبە، کە بەدەن لەبۆ ڕووح وەک لیباسەو ئەو دەستەی زاهیری ئاستینی دەستی ڕووحەو ئەو لاقەی زاهیری کەوشی لاقی ڕووحە...**

تـەن، لـەبۆڕووح وەک لیباسـێک تـۆ بنـاس — تـۆ بـڕۆ لابـیس تەڵـەب کـە، نـەک لیبـاس (۶۰)
چەشـنی تەوحیـد خـۆش نییـەهیچ،بۆ گیـان — غەیری زاهیر دەست وپێی دی هەن، جییان (۶۱)
دەست و پێی دیتت دەخەو دا،جـوان و ڕاس — با حەقیقـەت بن لـەلات، نـەک بێ ئەساس (۶۲)
غـەیری جیسمی زاهیریت تـەن بوو، جییان — جـا، مەترسـەگەر لەتـەن، دەرچـوو، گییـان (۶۳)

---

[1]- نوستبوو ئەو وەک نەخۆشێکی گران (مصرع دوم)

**حیکایەتی ئەو دەروێشە کە لە کێو دەخەڵوەت دابوو و بەیانی شیرینی مونقەتیع بوون لەدونیا و خەڵوەت و داخل بوون دەو مەسیرەکە(انا جلیس من ذ کرنی وانیس من استانس بی)**

گر با همەای چو بی منی بی همەای ور بی همەای چو با منی با همەای

**خولاسەی داستان ...**

دەروێشێک لەکێوێک دوو ر لەخەڵک زیندەگی دەکرد ئەو کێوەداری سێوو هەرمێ و هەناری زۆر لێبوو ولەوانی تەغزییەدەکرد ولەوێ دا بەموراقەبەو زیکرو فیکرو عیبادەت مەشغووڵ بوو، ڕۆژێک ئەو دەروێشەدەگەڵ خودای عەهدو پەیمانی بەست کەقەت میوەیەک لەدار نەکاتەوەوفەقەت میوەیەک بخوات کەبا لەداری دەکاتەوەودەکەوێتەسەرعەرزی، دەروێش ماوەیەک لەسەر ئەو عەهدو قەرارەبەر قەرارما تاکاتێک کەقەزاو قەدەری ئیلاهی ئەوی ئیمتیحان کرد، بەو جوورەکەهیچ میوەیەک لەداران نەدەکەو تەسەرعەرزی، ودەروێش تووشی برسێتی و زەعف وناتەوانی بوو ئەو حاڵەتەتا پێنج ڕۆژان بەردەوام بوو ودەئاخیر دا دەروێش ئیختیاری لەدەس دا نەما وعەهدو پەیمانی شکاند ودەستی کرد بەلێکردنەوەی هەرمێیان، هێندەی پێنەچوو،کەخوداوەندی موتەعال بەعیللەتی ئەو پەیمان شکێنییە، بەشیددەت موجازاتی کرد،ماجەرا لەو قەرا رەبوو، کەڕۆژێک لەو کێوەی کەدەروێش خەڵوەتی لێکردبوو زیاترلەبیست دز، هاتبوون ومالێکی کەدزیبوویان لەبەینی خۆیان تەقسیمیان دەکرد، لەو بەینەدا یەکێک لەجاسووسانی حکوومەت لەو مەو زووعەئاگا داربوو، ودارۆغەی ئاگادار کرد وفەو رەن مەئموورانی حکوومەت گەیشتنەوێ وتەواو دزەکانیان دەسگیر کردن ئیتتیفاقەن ئەو دەروێشەش بەدز حیساب کرا، تیبقی حوکمی سادرە، هەر لەوێ یەک دەست و یەک پێی مەحکوومان برا، دەروێش کەنۆبەی هات لەهەوەڵەوەدەستی ڕاستیان بڕی، ودەگەڵکو ویستیان کەلاقیشی ببڕن یەکێک لەمەئموورانی ئەسب سەوارگەیشتەوێ وئەو دەروێشەی ناسی وبەتوندی بانگی مەئمووری ئیجرای حوکمی کردکەئەی سەگ سیفەت، چاو هەڵێنەوبزانەکەکێ موجازات دەکەی؟ ئەوکابرایەلەئەو لیبای خودایەبۆ دەستی ویت بڕی؟ کاتێک کەدارۆغەلەو مەوزووعەئاگاداربوو بەپەلەچۆ لای دەروێش وعوزر خواهی لێکرد بەڵام دەروێش بەڕوو خۆشی وڕەزایەت پێیکوت ئەمن موستەحەققی ئەو موجازاتەبووم،چونکەئەمن عەهدو پەیمانی خودام شکاندووەوهەر خودایەکەئەمن ئازار دەدا، نەئێوەجا پاش ئەو مەو زووعەئەو دەروێشەلەنێو

خـەڵکی بەدەروێشـی یـەک دەسـت یادەروێشـی دەسـت بـڕاو مەشـهوور بـوو وهـەروەها دوو لەخەڵک دەژیا، لەکەپرێکی دوور لەشار مەشغووڵی زەنبیل چنین بوو.. ڕۆژێک کابرایەک، بێ ئیتتیلاعی قەبلی دەچێتەلای وی وبەکەماڵی تەعەجوب دەبینێ کەبەدوو دەست زەنبیل دەچنێ دەروێش ئەوی سوێند دەدا کە ئەو مەوزووعەبەکەس نەڵێ بەڵام کەمکەمەخەڵکی دیش لەو ڕازەئاگاداربوون ڕۆژێک دەروێش ڕووی لەدەرگای خوداوەند کرد وپاڕاوەو عەرزی کرد حیکمەتی ئاشکرابوونی ڕ ازی کرامەتی من چییە؟ خوداوەند فەرمووی چونکەخەڵکی لەبارەی حەققانییەتی تۆ بەد گومان ببون، ڕازی کرامەتی تۆم بۆ وان ئاشکرا کرد تالەو بەد گومانییە بەدوور بن ولەمەقامی والاو بەئەرزیشی تۆ ئاگا داربن ...

| | |
|---|---|
| یەک نەفەر دەروێش لەشاخێک بوو موقیم | خەڵوەت و عوزلەت لەبۆ وی بوو،نەدیم |
| گەر سکوون بۆ وی دەهات لای خوای غەفوور | دەیهەویست ئەو بێ لە خەڵکی دی بە دوور |
| وەک لە بۆمان سەهل و ئاسان بوو حەزەر | سەهل و ئاسان بوو لەبۆ ئیدی سەفەر |
| یا وەکوو تۆ عاشقی بۆ سەر وەری | شەخسەکی دیش عاشقی ئاسنگەری |
| هەرکەسەی مەخسووسی کارێک،چێ،کرا | مەیلی ئەوکارەی دەدڵدا، جێ، کرا[1] |
| دەست و پێ نادا تەکان، بێ مەیل، کەس | با، نەبێ، یا ئاو نەبێ، ناڕوات، خەس |
| گەرببینی مەیلی خۆت بۆ لای سەما | باڵی هیممەت لێک بدە، هەر وەک هوما |
| گەرببینی مەیلی خۆت بۆ لای زەوی | شین بگێڕە، لای خودای باڵا و نەوی |
| پێش بەڵا، عاقڵ دەکا،گریان و شین | پاش بەڵا جاهیل دەبێ، مات و حەزین |
| ئاخیری کار تۆ ببینە، ئیبتیدا | تا پەشیمان، تۆ نەبی، ڕۆژی جەزا |

**دیتنی زەڕگەر عاقیبەتی کار، و قسەکوتنی وی موتابیقی عاقیبەتی کاری ئەوەی کە دەی ویست کە تەرازوو بە ئەمانەت وەربگرێ...**

| | |
|---|---|
| هاتەلای زەڕگەر کوتی پیرێ مەزن | تۆ تەرازووم،وێدەزێرم کەم، وەزن |
| پێیدەکوت زەڕگەر لەلام هێڵەک، نییە | پیر کوتی میزان بدە، تەو هێن چییە؟ |
| پێیدەکوت زەڕگەر کە،گەسکم، لا نییە | پیرکوتی بەو، بەسکەتەو هێن، چا نییە |

[1]- هەرکەسەی مەخسووسی کارێک چا ،کرا    مەیلی ئەو کارەی دەد لدا ،جا ، کرا (مصرع دوم)

…ن تەرازووم لازمە،وێم دە، ئەتۆ — کەڕ مەکەخۆت، تۆ لەبۆ هیچ لا مەڕۆ (١٦٢٧)
…کوت زەڕگەر قسەم، بیستی تەمام — وامەزانەمن کەڕم، گێژم، نەفام (١٦٢٨)
… سست و، لەرزی،تۆ، بیستم، دەنا — دەست لەرزی، ناتەوان، نیزیک فەنا (١٦٢٩)
…کنست ورکەنە، دەرژێنەعەرز — چون زەعیفی ناتەوانی، دەست لەرز (١٦٣٠)
…ەی پێم، بێنەگەسکێک تۆ، بەغار — تاکو پەیدای کەم تەلای خۆم، نێو غوبار (١٦٣١)
…گەسکیت کۆ، وەکرد تۆ خاک و زیڕ[1] — پێم دەڵەی جا، بێنەهێڵەک، ئەی دلێر (١٦٣٢)
…حیری کار من لەئەووەڵ، دیم، تەمام — لێرەبۆ جێی دی، بڕۆ، تۆ، وەسسەلام (١٦٣٣)

**پاشماوەی داستانی ئەو زاهیدەی کێوی کە نەزری کردبوو میوەی کێوی لە دار نەکاتەوە و دار تەکان نەدا، و بە سەڕاحەت و کینایەت بە کەس نەڵێ کە دارم بۆ تەکان بدە، و فەقەت ئەو میوە دەخۆم کە با بیوەرێنێ ...**

… میوەی بوون گەلێک ئەو کووهسار — بوون لەوێ هەرمیی کێوی، بێ ژمار (١٦٣٤)
…ی دەگەڵ حەق کرد ئەو،دەرویش، قەرار — لێوەناکەم میوەیەک، قەت من لەدار (١٦٣٥)
…رین بێ میوەدەیخۆم من فەقەت[3] — لێوەناکەم میوەیی سەردار قەت (١٦٣٦)
…یەک کردی بەوەعدەی خۆی وەفا — تا لەبۆی هات ئیمتیحاناتی قەزا (١٦٣٧)
…فەرمووی حەق کەئیستیسنا بکەن — زیاد لەپەیمان (بی هەوێ گەرخوا ) بکەن (١٦٣٨)
…یی بۆ دڵ چا دەکەم من، دەمبەدەم — لەحزەلەحزەمن بەدڵ دەردان، دەدەم (١٦٣٩)
…ن هەموو ڕۆژێم هەیەشەئنی نووێ — هەرچی شەئنە، دای بەئەمری من گووێ (١٦٤٠)
…ی بەئێمەکوت نەبی، دڵ وەک پەڕە — جا، لەسەحرا دا، ئەسیری سەڕ سەڕە (١٦٤١)
…ی هەموولایەک دەبا ئەو پەڕڕە،با — جار بەڕاست و،جار بەچەپ،سەت جوور دەبا (١٦٤٢)
…کی دیش وای دەفەر موو بۆ دڵی — وەک دەمەنجەڵدا، بەئاگر، ئا و کوڵی (١٦٤٣)

---

1- گەر بەگەسکی کۆت وەکردتۆ خاک و زیڕ (مصرع اول)

3- من دەخۆم میوێک کەبا، بیخا، فەقەت (مصرع اول)

دێنەسەردڵ فکر و ڕا،گشت کات وئان … نەک لەدڵ دێن،دێن لەجێگای دی،ئەوان ۴۴۴)
جا، مەبە، ئیمەن لەڕایی دڵ، لەبۆ؟ … چون دەبی، شەرمەند ە، پاش پەیمان، ئەتۆ ۴۴۵)
حوکمی خوایەگەرکو دڵ وای دێ، بەسەر … تۆدەبینی چاڵ و ناکەی لەو حەزەر ۴۴۶)
گەر نەبینێ داو پەرەندەی ئاسمان … هیچ عەجەب گەر بێتەسەر داوی نەمان ۴۴۷)
سەیرە، میخ و داوی ئەو چاو پێکەوێ … بیهەوێ یانەیهەوێ، هەر تێکەوێ ۴۴۸)
داو لەپێش دا، ئاوەڵەش جا گوێ و چاو … ئەو بەباڵی خۆی دەچێ بۆ لایی داو ۴۴۹)

**تەشبیەکردنی بەند و داوی قەزا، بە سووڕەتێک نادیار و بە ئەسەر ئاشکار...**

تۆ دەبینی گەو ڕەزادێک، نێو دەڵق … بێ کڵاو سەر، کەوتەدەردان، تاکو حەڵق ۴۵۰)
ئەو بەعیشقی نا بەکارێک بوو بەمەست … جنس وئەملاکی هەموو چووئەو، لەدەست ۴۵۱)
عیززەت و ناموسو ماڵی چوو لەدەست … ئەو بەمەیلی دوژمنی خۆی بوو بەپەست ۴۵۲)
زاهیدی گەر، دی دەڵێ بەو، ئەی جەناب … کۆمەکم کەتاکو نەم مێنێ عەزاب ۴۵۳)
من لەبەختی زۆر ڕەشم کەوتوومە، هەش … من لەزێڕو سەروەتم، نەم ماچ بەش ۴۵۴)
کۆمەکم کەتا نەمێنێ ئەو خەتەر … لەو قوڕەی زۆر ڕەش ئەمن، با، بێمەدەر ۴۵۵)
دەیهەوێ، بۆی وا، دوعاکەن، عام و خاس … خۆی دەڵێ جا،(الخلاص والخلاص) ۴۵۶)
دەست وازو، لاق وازو،دوور لەبەند … بێ نیگەهبان دوور لەزەنجیرو کەمەند ۴۵۷)
تۆ لەکام زەنجیر دەت وێتن خەلاس؟ … تۆ لەکام زیندان دەت وێتن مەناس؟ ۴۵۸)
بەند ی تەقدیرو قەزایی نادیار … گیان کەساف بێ ئەو دەبینی، ئاشکار ۴۵۹)
ئەو لەباتین بوو لەزاهیردا نییە … شیددەتی زەنجیر وزیندان، وا نییە ۴۶۰)
چونکەئاسنگەر دەکا زەنجیر خرا … حوفرەگەر زیندان دەکا کون، ئەی برا ۴۶۱)
زۆر عەجەب لەوبەندی پنهانی گران … عاجزن لەت کەن ئەوی، ئاسنگەران ۴۶۲)
غەیری ئەحمەد، نەیدی ئەو بەند،هیچ ئەحەد … لەوگەرووی پێچراو، بە(حبل من مسد) ۴۶۳)
دی لەسەرپشتی عەیالی بوو لەهەب … بەستەدار،پێیکوت،کەحەممالەی حەتەب ۴۶۴)
دارو ڕیسمان چاوی وی دیتیی و، بەس … نادیار لەوبوون دیار، نەک هیچ کەس ۴۶۵)
چوون بەڕێی تەئویل دا، خەڵکی دەدی … چونکەلەو باسەحەقیقەتیان، نەدی ۴۶۶)
گەورەزادەپشتی وی کوورکرد قەدەر … چی بەشین لای تۆدەکوت، ئەوخاک بەسەر؟ ۴۶۷)
کۆمەکم کەتاکو بەس بێ، دەردەسەر … تاکو لەو بەندی نیهان من بێمەدەر ۴۶۸)

ـ‌ـەو کەسـەی کـە ئـەو نیشـانانەی دەدی — چـاک دەزانـێ کـێ سـەعیدەو کـێ شـەقی (١٦٦٩)
ـ‌ـەمری خوایەگـەر کـو نایکـا ئاشـکار — نارەوایەکەشـــــفی رازی کردگـــــار (١٦٧٠)
ـ‌ـەو وتـــارەدوایی نایەئـــەو فـــەقیر — بـوو زەعیـف و ناتـەوانو، تـەن ئەسـیر (١٦٧١)

**ناچاربوونی فەقیر بە لێکردنەوەی هەرمێ لە دار و گەیشتنی موجازاتی خوداوەند بە بێ مۆڵەت...**

ـ‌ـێج رۆژ هـەرمێی نەڕشت، یـەک دانـە، با — ئـەو لەبرسـان، زەرڕەیـەک، سـەبری نـەما (١٦٧٢)
ـ‌ـەسەریەک لک کەمێک هەرمێی دەدی — زووکشـاوەچون کـوتی عەهـدم ئـەدی؟ (١٦٧٣)
ـ‌ـقیبـەت،با، هـات،لکی کـرد سـەر نـەوی — خـواردنی کـرد ئـارەزوو جـا، تـەبعی وی (١٦٧٤)
ـ‌ـووع و زەعـف وقـووەتی جـەزبی قـەزا — کردیـان زاهیـد، بەعەهـدی، بـێ وەفـا (١٦٧٥)
ـ‌ـەگـەڵکو، لێـی وەکـرد هـەرمێ، لـەدار — ئـەو شـکاندی عەهـدو پـەیمانو قـەرار (١٦٧٦)
ـ‌ـ بـەزوویی خـوا ئـەوی کەیفـەر دەدا — ئـا وەڵای کـرد چـاوو، گـوێی کێشا، خـودا (١٦٧٧)

**موتتەهەم بوونی ئەو شێخە دەگەڵ دزان، و بڕینی دەستی وی...**

ـ‌ـون لەوێـدا بیسـت دز، یازیـاد لەبیسـت — ماڵی دزیاریـان دەکـرد بـەش، وام دەبیسـت (١٦٧٨)
ـ‌ـ بەدارۆغـەی دەدا، جاسـووس، خەبـەر — جـێ بـەجێ دارۆغـەهاتن گەینەسـەر (١٦٧٩)
ـ‌ـستی ڕاسـت و لاقـی چـەپیان لـێ بـڕین — بـوو لـەوێ غـەوغاو هـەراو گریـان و شـین (١٦٨٠)
ـ‌ـیدیشـیان دەسـت، لـێ دەبـڕی، غەڵـەت — دەیهەویست مەئموورکەلاقیش کا سەقەت (١٦٨١)
ـ‌ـەو دەمـی سوارێک دەهـا ت،بامەعریفـەت — وایدەکرد مەئمووربانگ،ئەی سەگ سیفەت (١٦٨٢)
ـ‌ـەو هەشـێخە، یـەک لەئەبـدالی خـودا — بـۆچی دەسـتی ویـت ئـەتۆ لێکـرد جـودا؟ (١٦٨٣)
ـ‌ـەلای دارۆغەئـەو مـەئموور بەشـین — پێیــدەکوت ئـەو ماجەڕایـە، زۆر بـەتین (١٦٨٤)
ـ‌ـێ پـەتی دارۆغـەهات، بـوو عوزرخـواە — تـۆم نەناسـی ئـەو خودایـەم بـێ گـەواە (١٦٨٥)
ـ‌ـۆ لـەکاری والـەپیس، بـم کەحـەلاڵ — ئـەی کـەریم و سـەر وەرو، ئـەهلی کـەماڵ (١٦٨٦)
ـ‌ـوابی دا، مەعلوومەعیللـەت، مـن لـەبۆم — چـاک دەناسـم مـن گونـاەو جـورمی خـۆم (١٦٨٧)
جونکەعەهـدو حورمـەتی عەهـدم شـکاند — دادسـتانی حـەق جـەزامی، لـێم سـتاند (١٦٨٨)
ـ‌ـن شکاندم عەهدو، خۆم کرد والە، پەست — تـا لەدەسـتم دا، بەشـوومی والـە، دەسـت (١٦٨٩)
ـ‌ـستی ئێمـەو لاقـی ئێمـەو مـەغزو پۆسـت — بـا هـەموویان بـن فیـدایی حـوکمی دۆسـت (١٦٩٠)
ـ‌ـوو قیسمەت، ئێستەتۆم کرد، من حەلاڵ — چونکەنـەت زانـی ئـەتۆ، نـات بـێ وەبـاڵ (١٦٩١)
ـ‌ـەو کەسـەی ئاگایـە، ئـەو فـەرمانڕەوا — کێ شەڕی پێ دەکرێ گەڵ حوکمی خودا؟ (١٦٩٢)

زۆر دەبێ تـەیرێک دەچێ بـەدوای دان — دا دەنێ بۆ دانـەدانێک، ئـەو گیـان (۴۴۳)
زۆر دەبێ تـەیرێک کەمەعـدەی پـوڕ دەکا — خـۆی دەزینـدان دا، ئەسـیری قـوڕ دەکـا (۴۴۴)
هـەن گـەلێک ماسی بـەبێ ڕەنج و عـەزاب — بـوو ن لەبـەر خواردن،گرفتـاری قـولاب (۴۴۵)
زۆر دەبێ ئنیسـان کـەپاک و چـا، دەبـوو — ئـەو بەمەعـدەو شـەهوەتی، ڕیسـوا دەبـوو (۴۴۶)
زۆر دەبێ قـازی کـەزانا و بـاش خـوون — ڕشـوەتو مەعدەسـەبەب بـوون، زەرد ڕوون (۴۴۷)
هـەر وەهـا، هاڕووت و ماڕووت ئـەو دووان — بـوو سـەبەب شـەهوەت، نـەچن بۆ ئاسـمان (۴۴۸)
بایەزیـد کـردی لـەخواردن، ئیحتیـڕاز — کـاتێ دیتـی خـۆی لـەنوێژان، دوور لـەواز (۴۴۹)
عیللـەتی کـرد جسـتوجۆ، ئـەو زۆر تـەواو — دی کەعیللـەت خـواردنی زۆر زێـدەئاو (۴۵۰)
تـاکو یێـک سـاڵ ئـەو کـوتی نـاخۆم ئـا و — نەیدەخوارد ئا و، خوا، جـەزای دا بێ حیساو (۴۵۱)
ئـەو هەکـەمتر کـاری وی، بـۆ ڕێـی دیـن — بـوو بەسـولتانو، بـەقوتبو لعـاریفین (۴۵۲)
چـون لەشـێخ دەبڕا،بەخاترمەعدە،دەسـت — دەرکی شەکوای پیاوی زاهیدخۆی، دەبەست (۴۵۳)
شێخی یەک دەست نێوی وی بوو، لایی خـەڵق — وایـدەکرد مەشـهوور، فەقـەت ئافـاتی حـەڵق (۴۵۴)

**کەراماتی شێخی یەک دەست و زەنبیل چنینی وی بە دوو دەست ...**

هاتـەلای شـێخ زائیرێـک ڕۆژێـک، جـا — دی بـەدوو دەست شێخ، زەنبیـل چا دەکا[1] (۴۵۵)
پێیـدەکوت شێخ، ئـەی عـەدوو بـەگیانی خۆ — بێژەبـۆچی هـاتی بـۆ کولبـەم ئـەتۆ؟ (۴۵۶)
بـۆ پەلـەت کرد،بێ سوئال تۆ هاتیـەژوور؟ — پێیدەکوت چون شەو قی تۆم بوو، زۆر لەدوور (۴۵۷)
پێیدەکوت جا، بێرەلام ئەی خۆش نەفەس — لێت نەبیسێ ئەو هەئەمما قەت، چ کەس (۴۵۸)
تـاکو نـەمرم، تـۆ مـەڵێ ئـەو هـە، لـەلای — خـزم و بێگـا نـەو ڕەفیـق و ئاشـنای (۴۵۹)
قـەو مـەکی دی لەوکەلێنـەی بـوویی دەر — بـوون لـەزەنبیل بـافی ئـەو شـێخ باخەبـەر (۴۶۰)
شـێخ کـوتی ئاگـای بەحیکمـەت،کردگار — مـن دەکـەم پنهـان، دەکـەی تـۆ ئاشـکار (۴۶۱)
وا دەهـات ئیلهـام کەعالـەم گشـت بەجـەم — مونکیرت بوون کاتێ بۆت هات دەردو غـەم (۴۶۲)
خـەڵکی کوتیـان ڕەنگـەفێڵی کردبـێ — وایـدەکرد حـەق تـاکو ئـابڕوی، بردبـێ (۴۶۳)
نامهـەوێ ئـەو قەومـە، کـافر بـن، ئـەمن — نامهـەوێ ئـەو قەومـەهیچ گـومڕا بـبن (۴۶۴)
کردمـان بۆتـۆ کەڕامـەت ئاشـکار — پێت بدەین جا، ئێمەدوو دەست وەختی کار (۴۶۵)
تـاکو ئـەو بێچارەگـانی بـەد گومـان — ڕەد نـەبن لـەو بارەگـای خـوای دوو جیهـان (۴۶۶)

[1]- زائیرێک چۆ ماڵی شێخی دی کەئەو    چادەکا زەنبیل بەدوو دەستی پتەو

ێ ئەوەش من زۆر کەرامەت پێم دەدای    من لیقای خۆم بۆتەسەللی، وێم دەدای (١٧١٧)

ء کەرامەت، پێت هیدایەت بن، ئەوان    بۆیەدامنا، من چرا،بۆت ئەی فلان (١٧١٨)

ـەوەی تێپەڕ دەبووی تا مەرگی تەن    لێی بترسێی یا لەورد بوونی بەدەن (١٧١٩)

ت نەما ترسان کەورد بێ، پێی وسەر    دەفعی ترسان بۆت دەبێتەیەک سپەر (١٧٢٠)

**عیللەتی جورئەتی ساحیرانی فیرعەون، لە بڕینی دەست و پێ ...**

ری فیرعەونی لەعین تۆ، بێنەسەر    نەیدەکرد وا، ساحیران تەهدید مەگەر؟ (١٧٢١)

ت وچەپ دوو دەست و پێو،دەبڕم لەبن    جا لەپاشان دەو بەمە سەر دار ئەمن (١٧٢٢)

ەۆ لەلای وابوو هەیانەگشت ئەوان    وەهم و تەخویف،هەم هەراس وهەم گومان (١٧٢٣)

دەزانی فیرعەونی دین بەتاڵ    ترس و لەرزیان پێدەدا، وەهم و خەیاڵ (١٧٢٤)

ێدەزانی ئەو نەجاتی بوو، لەبەد    ئێستەدانیشتوون لەبەر نووری ئەحەد (١٧٢٥)

ج ک دەناسن خۆ، کەوابەستەی خودان    چابوک وچوستن بەجێ دێڵن جیهان (١٧٢٦)

ەر لەنێو ئاوونگی دونیا سەت کەڕەت    ورد کرێن، بکرێن هەموویان، لەت بەلەت (١٧٢٧)

ەسڵی ئەو تەرکیبەیان، چون دیتووە    دەغدەغەی ترسان، لەلایان دەرچووە (١٧٢٨)

ەو جیهانەخەو نە، بێ شک ئەی برا    نەت بیێ باک،گەر لەخەو دەستت بڕا (١٧٢٩)

ەر لەخەودا هات بڕی لێت سەر،مقەست    سەرلەجێی خۆی، عومری زۆرت هاتەدەست (١٧٣٠)

ەر لەخەو دیتت کەدوو لەت بووی ئەتۆش    سالمی تۆگەرکو هەستای نەک نەخۆش (١٧٣١)

ەت کەڕەت گەر لەت ببێتن، تەن لەخەو    ترس و لەرزو خەو فی نابێ، هیچ ئەو (١٧٣٢)

ەو جیهانەگەر بەسووڕەت قائیمە    وایدەکوت ئەحمەد،کەخەو نی نائیمە (١٧٣٣)

ۆ لەڕێی تەقلید ئەوەت کرد جا، قەبووڵ    سالیکان مەعلومەبۆیان، بێ رەسووڵ (١٧٣٤)

ۆژ دەخەو دای، تۆ مەڵێ نا،ئەو نەخەو    سایەفەرعە، ئەسڵی سایەش مانگەشەو (١٧٣٥)

وو شیاری و، خەو لەبۆتۆ بێ درەو    وەک لەخەودا، تۆ ببینی چوویەخەو (١٧٣٦)

ا دەزانێ ئەو کەئێستا چۆ تەخەو    بێ خەبەر لەوهەی کەدوو هەم جارەئەو (١٧٣٧)

گەر کو بشکێنێت گۆزە،گۆزەگەر    چادەکا دوو بارە، بی وێتن، ئەگەر (١٧٣٨)

کوێر لەچاڵ کەو تن، دەترسێ، هەر قەدەم    ئەو بەترس و لەرز دەڕوا، دەمبەدەم (١٧٣٩)

شەخسی بینا چاک دەبینێ عەرزی ڕێ    چاڵ و کەنداڵ چاک دەبینێ نەچتە، تێ (١٧٤٠)

لاقو ئەژنۆی کوا دەلەرزێ دەمبەدەم؟    کەی دەبێتن ڕوو گرژ، یا دڵ بەغەم (١٧٤١)

هەستەئەی فیرعەون، ویستت بێنەجێ ... دەنگی غوول ئێمەکەلا نادا، لەڕێ (۰۴۲)
چا دەکا خەییات لیباسمان گەر درا ... چانەکا گەر، خۆشی ڕوو تین پێ برا (۰۴۳)
بێ لیباس مەحبووبمان دیتەکەنار ... خۆش دەژین جا، ئەی نەیاری نا بەکار (۰۴۴)
هیچ وەکوو تەجرید لەجیسم و هەم میزاج ... خۆش نییە، ئەی فیر عەو نی بێ ڕەواج (۰۴۵)

**شکایەتی ئێستر لەلای وُشتر کەبۆچی ئەمن بەسەرڕوودا دەکەوم بەلام ئەتۆ بەسەر ڕوو دا ناکەوی مەگەر بەسوورەتی ئیتتیفاق؟ ...**

**خولاسەی داستان ...**

ئێسترێک هاتەلای وشترێک وپێیکوت ئەی ڕەفیق ئەتۆ بۆچی لەڕێگای هەو را زو نەوی و باریک ونەرم و هەموار دا دەڕۆی بەلام هیچ کات وەعەرزی ناکەوی؟دەحاڵێک دا ئەمن لەوەختی ڕێ ڕۆیشتن سەرو بن دەکەو مەعەرزی پێم بڵێ بۆچی وایە؟ وشتر پێیکوت.. هەم چاوەکانم لەچاوی تۆ قەوی ترن وهەم قەدو قامەتم لەتۆ بڵیند ترە، جا لەبەر ئەوە، ئەمن لەبڵیند ترڕا، ڕێیەکانی عەرزی دەبینم وهەر بۆیەوەعەرزی نا کەوم ...

وایدەکوت ئێستر بەوُشتر ئەی ڕەفیق ... تۆ لەهەورازو نشیوو، ڕێی دەقیق (۰۴۶)
بۆچی ناچی قەت بەسەرڕوو یەک کەڕەت؟ ... من بەسەر ڕوو دا دەچم هەروەک سەقەت (۰۴۷)
من بەسەر ڕوو دادەچم خۆ هەر دەمێ ... جا بەوشکی دابڕۆم یا نێو نەمێ (۰۴۸)
عیللەتی ئەو کەوتنانەبێژەچین؟ ... تاکو ئەمنیش فێر ببم ڕێگایی ژین (۰۴۹)
پێیدەکوت چاوُم لەچاوت ڕوونترە ... هەم لەجێگای زۆر بڵێندیش نازرە (۰۵۰)
گەر لەکێوێک زۆر بڵێند من بچمەسەر ... چاک دەبینم دۆڵ و دەشت و دەو رو بەر (۰۵۱)
جا، هەموو ڕێیەک، چ بالا، یا نەوی ... پێم دەدا نیشان، خودای عەرش و زەوی (۰۵۲)
من بەبینش دا دەنێم، یەک یەک قەدەم ... جا نەجاتی خۆم لەکەو تن وا، دەدەم (۰۵۳)
چەن قەدەم زیاد، تۆ کەنابینی، بەچاو ... دان دەبینی نادیار لێت، ڕەنجی داو (۰۵۴)
کوێرو بینا کوا وەکوو یەکتر دەبوون؟ ... وەختی وێستان یانەوەختی هاتو چوون (۰۵۵)
گەر جەنین پێیدا خودا، نێوزگ،گییان ... خوا بەئەجزای ویش دەدا یەک یەک تەوان (۰۵۶)
خواردنی وی جەزبی نێو ئەجزا، دەکا ... تاروپوودی جیسمی خۆی ئەو، چادەکا (۰۵۷)
تاکوچل ساڵ جەزبی، بۆ ئەجزا دەدا ... حیرس و ڕوشدێ بەو دەداتن، چاک خودا (۰۵۸)
جەزب و ڕوشدێ خوا بەڕووح تەعلیم دەدا ... جەمعی ئەجزای چۆن لەدەس نایەت خودا؟ (۰۵۹)

جـــامعی زەڕڕاتـــی عالـــەم بـــوو خـــودا    کـۆ دەکـا ئـەجزایی تـۆ ئـەو، بـێ غـەزا (١٧٦٠)
گەرلەخەوهەستای ئەتۆئەی خـۆش خەبەر    هۆش وحیسست وێدەدا، زووخوا ی لەسەر (١٧٦١)
هـیچ شـتێ غائیـب نییـەلای کردگـار    ئـەو بەهـەرچی بێرەبێـژێ، دێ بـەغار (١٧٦٢)

**کۆبوونەوەی ئەجزای کەری عوزەیر(ع) پاش ڕزین بە ئیزن و ئیجازە و مەشییەتی خوداوەند و تێکەڵ بوونی ئەجزای ئەو کەرە، لەپێش چاوی عوزەیر...**

**خولاسەی داستان ...**

ئـەو حیکایەتەلەمـەزموونی ئایـەتی ٢٥٩ سـوورەی بەقـەرەوەرگیراوە لـەو ئایەتەسەرگوزەشـتی کەسێک هاتوەکەلەزیمنی سەفەر دەحاڵێک دا کەسواری مـەرکووبی خـۆی بـوو وکـەمێکیش ئاوو خواردەمەنی پێ بوو بەقەراغ وێرانەیێکی خامۆش و بێ دەنگ دا دەڕۆیشت، ئەجساد و ئێسکانی زۆری ساکینان ئەو جێگایەمەنزەرەیێکی وەحشەتناکی بەوجوود هینا بووئەوشەخسەبەخۆی کوت خوداوەند چلۆن ئـەو مردوانەزینـدوو دەکاتـەوە؟ وئـەو سوئالەش لەڕووی ئینکار و عیناد نـەبوو بەڵکـەم لـەڕووی حیـرەت و تەعـەججوب بـوو چـون بەقـەرائینێک کەلـەو ئایەتەوهـەرووەها تەسریحاتێک کەلەبەعزەڕیوایەتێکی مەشهوور دا هەیە، ئەو شەخسەمەقامی نبووەتی هـەبوە، لەو حاڵەدا بوو کە خوداوەند گیانی وی وەر دەگرێ، وسەت ساڵ دوایە، زینـدووی دەکاتـەوە، ولـەوی دەپرسێ کەئـەتۆ چەنـد وەختەکەلـەو وێرانەخامۆشـەدا مـاو یەتـەوە، ئـەو پێی وابـوو کـەزۆر کـەم دەوێدا ما وەتەوە، جا لە بەر ئەوەدەڵی.. ڕۆژێک یا کەمتر لەڕۆژک ..

ئـەی عـوزەیر، تـۆ چـاک تەماشا کە،کـەرت    چـــۆن ڕزیوەهـــــەم ڕزا، دەورو بـــەرت (١٧٦٣)
مـن لـەلای تـۆ کـۆ دەکـەم ئـەجزایی وی    هەم سەرو هـەم کلکو دووگوێ و، پایی وی (١٧٦٤)
د دەنێ ئـەعزا لـەلای یەک،یـەک بـەیێک    جا بـەبێ دەستیش دەیان کا، ڕێک و پێک (١٧٦٥)
تـــۆ بنۆڕەوەســـــڵەدۆزی زوو کـــــەزوو    چا و کەدەد رووی کۆن بەبێ دەرزیو دەزوو (١٧٦٦)
هـــیچ دەزووو، دەرزی دەوێـــدا،جا نییـــە    واشـی دەدرووی، د رزی هـیچ تێـدا نییـە (١٧٦٧)
جـاو هەڵێنـەلێت بیـێ مەحشـەر، یـەقین    تاکونـەت بـێ شـوبهە، تـۆ بـۆ ڕۆژی دیـن (١٧٦٨)
تـا ببینـی قـودرەتی مـن، تـۆ، تـەمام    تـا نـەدەی تـۆ هـیچ بـەمردن ئیهتیمـام (١٧٦٩)
هـەر وەکـوو تـۆ وەختـی نوسـتن نیتەغـەم    گـەرچی لات نین،تـۆ حەواسـت،زۆرو کـەم (١٧٧٠)
وەختی خـەو، تۆ بۆ حەواست، غـەم مـەخۆ    بـا پەرێشـان و بـڵا ویـش بـن لـەتۆ (١٧٧١)

**نەگریانی شێخێک بۆ منداڵەکانی خۆی...**

**خولاسەی داستان ...**

لەزەمانی قەدیم شێخێکی خودایی دەژیا ئیتتیفاقەن ڕۆژێک دوو دانەمنداڵی مردن وتەواوی ئەعزای خانەوادە، داغدارو عەزادار بوون.. وشین و گریان فەزای ماڵێی داگرتبوو،بەلام زۆر عەجیب بوو کەشێخ حاڵەتێکی زۆر ئارامی هەبوو و فرمیسکی نەدەڕژاند وشیوەنو گریانی نە دەکرد، جا لەبەر ئەوەئەهلی خانەوادەبەسوو ڕەتی گلایەسوئالیان لێکرد..کەئەی شێخ مەگەر ئەتۆ ئیحساس و عاتیفەت نییە؟ ئێمەبەداغی منداڵەکانی تۆ وا، دەسووتێین وحاڵەتێکی زۆر ناخۆشمان هەیە.. ئەدی ئەتۆ بۆ چی گریانت نایەوحاڵەتێکی زۆر ئارامت هەیە؟ شێخ دەجواب دا کوتی.. پێتان وا نەبێ کەئیحساس و عاتیفە و مەحەببەتم نییەئەمن حەتتا، بەنارەحەتی کافرانیش نا ڕەحەت دەبم بەلام بۆیەئەمن ناگریەم چونکەگریان وەختی هیجران و فیراقە، خۆ ئەمن هیچ هیجران و فیراق نا بینم چونکەئەو منداڵانەم کەمردوون لەحزەیەک لەپێش چاوی من غائیب نابن، ئەمن دەبینم کەئەوان لەدەورو بەری من هەڵدێن وقوماران دەکەن ئەگەرعالەم مردووی خۆیان فەقەت دەخەو دا دەبینن ئەمن خۆشەویستانی لەدەست چووم دەحاڵەتی وشیاری دا دەبینم، چونکەخوداوەندی موتەعال چاوی دڵی منی نیسبەت بەکائینات بیناکردووە..وبێ ئەوەی بنووم عالەمی ڕووحانی جیهانی بەرزەخ دەبینم...

بوو لەدەورانی قەدیم شێخێک بەدین ئەو چرابوو هەڵکرابوو، بۆ زەمین (۱۷۷۲)
چەشنی پێغەمبەر لەنێوان ئوممەتان دەر کەوانی ڕەو زەیی (دارالجنان ) (۱۷۷۳)
دەیکوت ئەحمەد شێخ کەکامیل ڕێگەڕۆی وەک نەبی وایەلەنێوان قەومی خۆی (۱۷۷۴)
ڕۆژەکی پێیان دەکوت، جا ئەهلی ماڵ بۆ چی هێندەدڵ ڕەقی ئەی خۆشحاڵ؟ (۱۷۷۵)
شین دەگێڕین ئێمەبۆ منداڵی تۆ پشت چەماوین، خۆ بەلام خۆشحاڵی تۆ (۱۷۷۶)
شین و گریانت ئەتۆ هیچ لا نییە یانەڕەحمت هیچ دەنێو د ڵ دا نییە (۱۷۷۷)
گەر دڵی تۆ ڕەحمی هیچ تێدا نەبێ چاکە، چاکەن، هیچ لەتۆ هیوا، نەبێ (۱۷۷۸)
تۆی ئومێدو پێشەوا مان،هەم پەنا دەستگیری بۆن، لەنێو داری فەنا (۱۷۷۹)
گەرکو جوانیان کرد ڕۆژی حەشر، تەخت تۆ دەبی بۆمان، شەفیع، لەو ڕۆژی سەخت (۱۷۸۰)
لەو شەوو ڕۆژی گەلێک تاڵ چەشنی ژار بەخششی تۆن، ئێمەتەنها، ئینتیزار (۱۷۸۱)
دەستی ئێمەو دامەنی تۆئەو زەمان چونکەموجریم نیتی ئەو دەم هیچ ئەمان (۱۷۸۲)

دەیکوت ئەحمەد گەر حەشر بوو بەر قەرار — موجریمان چۆن جێ دەهێڵم ئەشکبار؟ (١٧٨٣)
من شەفیعم بۆ گوناهباران بەگیان — تا نەجاتیان دەم لەڕەنجی زۆر گران (١٧٨٤)
بۆ گوناهباری کەبیرە، زۆر بەجەهد — دەبمەناجی من لەڕەنجی نەقزی عەهد (١٧٨٥)
سالحانی ئوممەتم بوون بێ نیاز — ببمەشافیع ڕۆژی زاهیربوونی ڕاز (١٧٨٦)
بەڵکەدەبنەشافیعی خەڵکی ئەوان — قەولی وان، مەقبووڵە، لای حەق بێ گومان (١٧٨٧)
هیچ گوناهبار، باری غەیری دی نەبرد — بێ گوناهم، خوا منی عالی دەکرد (١٧٨٨)
ئەو کەسەی بێ جورمە،شێخەئەی جەوان — بێ گومان مەقبووڵەلای خوای دووجیهان (١٧٨٩)
شێخ کێیە؟ پیر، سپی بێ،مووی تەمام — مووی سپی مانای چییەجا ئەی نەفام؟ (١٧٩٠)
موویی ڕەش یانی وجوودێک ئەوکەبووی — لەو وجوودەش هەرنەما،یەک دانەمووی (١٧٩١)
گەر وجوودی چوو، دەبێ پیر، ئەو دەمی — ڕەش ببێ مووی، یانەخێر، جۆو گەندومی (١٧٩٢)
بوو موراد لەمووویی ڕەش، وەسفی بەشەر — خۆ موراد لەموو نەبوو،مووی ڕیش وسەر (١٧٩٣)
وای دەکرد عیسا دەلانکێ دا، نەدا — پێش جحێڵیم شێخ و پیرم، لای خودا (١٧٩٤)
گەرلەبەعزێک وەسفی ئینسان بووی نەجات — کەهلە،نەک شێخ ئەودەمی،ئەی خۆش سیفات (١٧٩٥)
وەسفی ئینسان گەر دەئینسان دا نەما — شێخە، مەقبووڵ لای خودای ئەرزو سەما (١٧٩٦)
با سپیش بێ موویی وی، گەر خۆی، بوێ — پیرنییە، جێی لای خودا، دەس نا کەوێ (١٧٩٧)
وەسفی ئینسان گەر کەمێک لەو باقییە — ئەو نەعەرشی، بەڵکە ئەو ئافاقییە (١٧٩٨)

## تەوزیحاتی شێخ لە بارەی نەگریانی وی بە خاتری مردنی منداڵەکانی خۆی...

شێخ کوتی پێت وانەبێ تۆ ئەی ڕەفیق — ڕەحم و میهرم من نییەو، قەلبی شەفیق (١٧٩٩)
ڕەحمی من خۆ کافریشی گرتەبەر — گەر چی کافر ناسپاسەو بەد نەزەر (١٨٠٠)
بۆ سەگان حەتتا، دەبم من ڕەنگ زەرد — بۆ دەبێ لێیان بدەن خەڵکی، بەبەرد؟ (١٨٠١)
بۆ سەگێکی بم گرێ، بێژم دوعا — تۆ، لەخووی والەی نەجات دە، ئەی خودا (١٨٠٢)
ئەو سەگانەش فێرکە، تۆ ئەی کردگار — تا نەکەن خەڵکی ئەوان، قەت سەنگسار (١٨٠٣)
ئەو لیبا ی ناردن خودا بۆ سەر زەمین — تا بییان کا، ڕەحمەتەن لیلعالەمین (١٨٠٤)
بانگ دەکەن خەڵکی لەبۆ دەرگایی وی — تالیبن بۆ لوتفی بێ هەمتایی وی (١٨٠٥)
جا، دەڵێن گەرپەندی وان سوودی نەدا — تۆ مەبەستەدەرکە، لێیان، ئەی خودا (١٨٠٦)
ڕەحمەتی جوزئی، خودا دای،کوللی ناس — ڕەحمەتی کوللی دەدا،بەس بۆ خەواس (١٨٠٧)

ڕەحمــەتی جــوزئی خــودا بــۆ، وەســڵی کــول — ڕەحمــــەتی دەریـــا دەبـــێ هـــادی ســـوبول (٨٠٨

ڕەحمـــەتی جـــوزئی، ببـــەتۆ وەســـڵی کـــول — ڕەحمـــەتی کـــول، بگرەهـــادی بـــۆ ســـوبول (٨٠٩

تاکوجوزئـــە، بـــێ خەبـــەر لـــەو ڕێـــی یـــەم — یـــەم دەزانـــێ، ئـــەو غـــەدیری زۆرو کـــەم (٨١٠

گـەر کـو ڕێگای بـەحری ئـەو هێستا نـەدی — چــۆن لــەبۆ دەریــا دەبــا، خــەڵکی دەدی؟ (٨١١

گــەر بــەدەریا موتتەســیل بــێ، ئــەو دەمــی — چەشــنی جــۆو ســێڵاو، دەبــا، تــا نێــو یــەمی (٨١٢

بــوو بەتەقلیــد واکــە دەعــوەت کــا ئــەدا — نــەک عــەیان و، وەحیــو، تەئییــدی خــودا (٨١٣

ژن کـوتی چـون عامەڕەحمەت،ئـەی فـلان — تـۆ دەسـووڕێی دەوری مێگـەل وەک شـووان (٨١٤

بـۆ لـەبۆ منـداڵی خـۆت ناکـەی چ شـین؟ — گــەربڕی لێیــان ئەجــەل ئەســتۆیی ژیـــن (٨١٥

بۆتــەڕەحوم ئەشــکی چــاوان شــاهیدی — وشــک و بــێ گریانــەچاوت، بــۆ ئــەدی؟ (٨١٦

ڕووی دەژن کردو کوتی بەو، ئەی عەجووز — فەسڵی زسـتان کـوا دەبێـتن وەک تـەمووز؟ (٨١٧

گـــەر کـــوبمرن یـــا بـــژین منـــداڵی مـــن — چـۆن لـەچاوی قـەلبی مـن پنهـان دەبـن؟ (٨١٨

چون دەیان بینم ئەوان زۆر خۆش دەژین — بـۆ وەکـوو تـۆ مـن بکـەم، وا، ڕوو ڕنـین؟[1] (٨١٩

گـەرچی خـاریج بـوو ن لـەدەو ری ڕۆژگـار — لای مـنن، ئێسـتا دەکـەن بـازی و قومـار (٨٢٠

هیجـرو فیرقـەت جادەکـەن گریـان و شین — مـــن عـــەزیزانم لەلا،ئێســـتا دەژیـــن (٨٢١

وەختـێ خـەو خـەڵکی دەبیـنن مـردووان — مـــن بەوشـــیاری دەبیـــنم هـــەر دووان (٨٢٢

لــەو جیهانــەخۆم دەمــێ پنهــان دەکــەم — جا،گەلای حیس، من لەدار ئەفشان دەکەم (٨٢٣

حـیس، ئەسـیری عەقڵـەدائیم ئـەی فـلان — بـۆ ئەسـیر بـۆ ڕووح عـەقڵیش، بێگومـان (٨٢٤

دەستی بەستەی عەقڵی، گیان هات وازکرد — حـــازری بـــۆ شـــارەزایی ڕازکـــرد (٨٢٥

حیسـس و ئەندیشـە، لەسـەر ئـاوی جـووان — وەک خەس و خاشاک لەسەر ئاو بن ڕەوان (٨٢٦

دەسـتی عـەقڵی ئـەو خەسـەی دێ،لا دەدا — ئاو لەلای عەقڵ،خۆی نیشان جوان،جا،دەدا (٨٢٧

خەس لەسەرجۆ زۆر دەبێ چەشنی حوباب — لادەچـێ خەس،دێتـەڕوو ئاو،ئـەی جـەناب (٨٢٨

دەسـتی عـەقڵی گـەر نـەکاتن واز خـودا — بــا، خــەس و خاشــاک بەســەر ئـاو دا دەدا (٨٢٩

دا دەپۆشــرێ ئــاوی جــوان بــەوجوورەخۆ — شـادو خەنـدا ن بـاوو، گریـان عـەقڵی تـۆ (٨٣٠

چونکەتــەقوا بەســتی دوو دەســتی هـــەوا — واز دەکـا حـەق هـەر دوو دەستی عـەقڵ،جا (٨٣١

جا،حـەواس گشـتیان دەبـن مـەحکوومی تـۆ — گـەر کـو عـەقڵی تـۆ ببـێ، مەخـدوومی تـۆ (٨٣٢

عـەقڵ بـێ خـەو، حـیس دەباتـە، نێـو خـەو — تـــاکو ڕووح،پنهـــان زاهیربێـــت، لـــەو (٨٣٣

---

[1]- بۆ وەکوو تۆ من بکەم ڕووی خۆم، برین؟ (مصرع دوم)

ـــەی بەوشـــیاری دەبینـــێ زێـــدەڕاز دەرکـی ئەسـراڕ جـا لـەبۆی دەکرێـت واز (١٨٣٤)

**داستانی خوێندنەوەی قورئان تەوەسسوتی شێخی نابینا لەڕووی قورئـان و بینـابوونی ئەو شێخە لە وەختی خوێندنەوەی قورئان ...**

**خولاسەی داستان ...**

ـەرۆژگاری قەدیم دا یەکێک لەشێخان میوانی پیرەمێردێک نابینا بوو ڕۆژێک شێخ قورئا نێکی ـەماڵی ئەو نا بینایەدی، جا لەبەر ئەوە، تەعەججوبی کرد وبەخۆی کوت دەو ماڵـەداهیچ کـەس غەیری ئەو پیرەمێردەنابینایەنازیت جا،کەوا بێ ئەو قورئانەبەکاری چ دێ؟ .. شێخ چەندڕۆژێک چی نەکوت تا کو شەوێک بەقورئان خوێندنی ئەو نا بینا یەلەخەو هەستا زۆر بەتەعـەججوب دیتی کەپیری نا بینا لەسـەر سـەفحەی خواربۆتەوەومەشغووڵی قورئان خوێندنە، سـەبری نـەما ولەپیرەمێردی پرسی:پێم بڵێ ئـەتۆ کـەنا بینـای چلۆن قورئان دەخوێنی؟ و مەعلوومیشـەکەئەز بەر نای خوێنی چونکەحەرەکاتی قامکانت لەسەر ختووتی قورئان نیشان دەدا کەئـەتۆ حرووفی قورئان دەبینی، پیرەمێردی نابینا لـەجواب دا کـوتی.. بۆ لـەکاری خـودا تەعـەججوب دەکـەی؟ ئەمن بەدڵ و گیان لەخودام داوا کردووەکەهەر وەخت ویستم قورئان بخوێنم چاوەکانم بینا بکا، خودای تەبارەک و تەعالاش دوعای منی قەبووڵ کرد.

ـەک لـەڕۆژان دیتـی یـەک شـێخی فـەقیر موسـحەفێک، نێـو مـاڵی پیرێکـی زەریـر (١٨٣٥)
ـ؛ختـی هـاوین، شـێخ لـەپیر، میـوان دەبـوو چەند ڕۆژێک بوون لەلای یـەک،دوو بـەدوو (١٨٣٦)
ـێخ کـوتی مـاوم عەجـەب کـەو توومـەبیر بـۆچی قورئـان لێرەیـە؟ خـۆ کـوێرە، پیـر (١٨٣٧)
ـەوتـــەنێو بیـــری خـــەیاڵ و وەسوەســـە ئێرەهـەر ئـی پیـرە، نـەک ئـی چەنـد کەسـە (١٨٣٨)
ـــەو بەتـــەنهاو، موسـحەفێک دیـوارەجێی تێکـــەڵاو بـــەو نیمـــە، نـــەم پرســـیوەڵێی (١٨٣٩)
ـــا بپرســـم والەچاکـــەهیچ نەڵـــەم گەر نەکـەم سـەبرێ، دەبێ مـەعلووم هەڵـەم (١٨٤٠)
ـەبری کرد جا، چەند ڕۆژ کێشای حەرەج بـــوو عـــەیان چـــون، ســـەبرمیفتاحولفەرەج (١٨٤١)

**سەبرکردنی لوقمان لە سوئال کردن وەختێک کە دیتی داود(ع) حەڵقەی زرێ چادەکا بەو نییەتە کە سەبر کردن لە سوئال موجیبی ئاسایش و گوشایشە...**

**خولاسەی داستان ...**

لوقمانی حـەکیم لـەڕووی سـەفاو خلووس هاتـەلای حـەزرەتی داود (ع) دیتـی کـەزرێ چـا دەکا. چونکەلوقمان سـەنعەتی دروست کردنی زرێی نەدەزانی لەو کارەزۆر تەعەججوبی کرد وبـەخۆی

کوت بۆچی داود حەڵقەی پۆڵا، لێک قایم دەکا؟ لەهەوەڵەوە، ویستی کەعیللەتی ئەو کارەبپرسێ بەڵام بەخۆی کوت وا چاکەسەبر بکەم وهیچ نەڵەم تا مەجهوولم مەعلووم دەبێ، ماوەیەک سەبری کرد تا داود کاری خۆی تەواو کرد، وزرێ یەکەی دەبەر کرد. جا هەر بۆ خۆی وای تەو زیح دا کەئەو پۆشیشەئینسانی لەزەرەباتی شەمشیر ونێزە، لەوەختی شەڕ، حیفز دەکا...

هاتەلای داوود لوقمان باسەفا    دی لەئاسن حەڵقەحەڵقەچا دەکا (۰۴۲
جا لەپاشان یەک بەیەک لێکی دەدان    شای بڵیند عالیمەقام، جێ ئاسمان (۰۴۳
چونکەنەی دیبوو زرێ چۆن چادەکا    ما عەجەب کاتێ کەدیتی وا دەکا (۰۴۴
والەباشەگەر بڵەم بۆ م بێژە، دەی    چا دەکەی چی؟ حەڵقەحەڵقەلێک دەدەی (۰۴۵
جا کوتی واباشەهەمبێ، حەو سەلە    دوور لەمەقسوود ما، ئەوەی کردی پەلە (۰۴۶
بێ سوئال مەعلووم دەبێ مەجهوول زوو    بەس، بەسەبرەدێتەدەست ئارەزوو (۰۴۷
گەر بپرسی زۆر درەنگ پەیدا دەبێ    بێ سەبر، موشکیل لەسەهلت چا دەبێ (۰۴۸
چونکەلوقمان چی نەکوت هەر ئەو دەمی    سەنعەتی داوود تەواو بوو، بێ کەمی (۰۴۹
کردیەبەرخۆ، ئەو زرێی چای کردبوو    ئەو لەلای لوقمانی باش و سەبر خوو (۰۵۰
پێیدەکوت زۆر باش لیباسە، ئەی مەتین    ئەو لیباسەبۆ شەڕو دەفعی برین (۰۵۱
جا کوتی لوقمان سەبر زۆر خۆش دەمە    هەم پەنا و، هەم لابەری هەرچی غەمە (۰۵۲
سەبری گەڵ حەق خوا،لەقورئان کرد قەرین    ئاخری (والعصر) ی تۆ چاو، ئەی ئەمین (۰۵۳
سەت هەزاران کیمیا ی چاکرد خودا    کەس وەکوو سەبری نەدی چاک کیمیا (۰۵۴

**پاشماوەی داستانی نابینا و قورئان..**

پیاوی میوان سەبری کرد جا نا گەهان    بۆی عەیان بوو حاڵی موشکیل ئەو زەمان (۰۵۵
دەنگی قورئانی دەبیست ئەو نیوەشەو    زۆر عەجیب بوو بۆ وی هەستا زوو لەخەو (۰۵۶
دی کەکوێرقورئان دەخوێنێ دروست    جستوجۆێ کرد، وەزع وحاڵ،چالاک و چوست (۰۵۷
زۆرعەجەب، پێیکوت بەچاوی دوورلەنوور    چۆن دخوێنی چۆن دەبینی تۆ ستوور؟ (۰۵۸
هەرپەڕەی خوێندت ئەتۆ ئەو لا دەنێی    دەس لەسەرحەرفان دەقیقەن دا دەنێی (۰۵۹
ئەو تەکانی قامکی تۆ دەیدا نیشان    تۆ دەبینی هەرچی حەرفە، بێ گومان (۰۶۰
جوابی دا، ئەی بووی لەجەهلی تەن جودا    زۆر عەجیبەلات، مەگەر سونعی خودا؟ (۰۶۱
وام لەحەق داوا دەکرد ئەی موستەعان    بۆ قەرائەت زۆر حەریسم چەشنی گیان (۰۶۲

نووری چاوم پێ بدە، حافز کە، نیم ... وەختی خوێندن ئەی خوداوەندی کەریم (۱۸۶۳)
هەر دوو چاوم وێدەوە، تۆ ئەو زەمان ... دەس بەقورئان بم تیلاوەت کەم بەیان (۱۸۶۴)
هات لەحەق ڕا، وا، نەدا، ئەی پیاوی کار ... ئەی لەهەر ڕەنجێک، بەمن ئومێد وار (۱۸۶۵)
حوسنی زەنن و هەم ئومێدی خۆشی تۆ ... لەحزەلەحزەپێت دەڵێن بۆ سەر برۆ (۱۸۶۶)
خوێندنو قورئانی جوێ جوێت ویست ئەگەر ... یا قەرائەت جووربەجوور،ئەی خۆش نەزەر (۱۸۶۷)
دەت دەمێ ئەو دەم بەتۆ، دوو چاوەکان ... تاکو قورئان تۆ بخوێنی زۆر جووان (۱۸۶۸)
وایدەکرد ئەو قەولی خۆی هینایەدی ... هەردەمێک قورئانی نێو دەستی دەدی (۱۸۶۹)
ئەو شەهەنشاهەی نەبوو غافڵ لەکار ... ئەو مەقام باڵا، عەزیزو کردگار (۱۸۷۰)
پێم دەبەخشێ نووری دووچاوان ئەو ... جێ بەجێ هەر وەک چرای زۆر ڕوون لەشەو (۱۸۷۱)
بۆیەنابێ لەو بکا کەس ئیعتیراز ... هەرچی ئەستاندی دەنێری، ئیعتیاز (۱۸۷۲)
گر بدا باغت، تریت ئەو پێدەدا ... ماتەمت بێ، سوورو شادیت، وێدەدا (۱۸۷۳)
بەو شەلی بێ دەست، ئەو جا، دەست دەدا ... ئەو بەکانی غەم،دڵی سەر مەست دەدا (۱۸۷۴)
ئیعتیرازو (لانسلم )چوون لەلان ... پێن دەدا چاتر لەوانەی ئێمە، دان (۱۸۷۵)
چوون بەبێ ئاگر، بەمن گەرما دەدا ... بمکوژێ ڕازیم بەئا گر، گەر خودا (۱۸۷۶)
چون دەدا پێت، ڕەو شەنی ئەو، بێ چرا ... گەر چرات چوو، تۆ نەکەی شین، ئەی برا (۱۸۷۷)

**سیفەتی بەعزێک لە ئەولیا کە ڕازین بە ئەحکام، و دوعا ناکەن بۆ لابردنی ئەحکام...**

گوێ دە باسی سالیکانێک ئەی جەوان ... ناگرن ئیراد، لەهەرچی، بووی جیهان (۱۸۷۸)
ئەو لییا هەن، قیسمەتێک، ئەهلی دوعا ... جار دەدروون، جارو بار دەدرن کەوا (۱۸۷۹)
یەک گروو هی دی دەناسم ئەو لییا ... بەستیان زاریان لەئیزهاری دوعا (۱۸۸۰)
چونکەڕازی بوون ئەوان قەو می کیرام ... کردییان دەفعی قەزا بۆ خۆ، حەڕام (۱۸۸۱)
بۆ قەزا زەوقێک دەبینن،زێدەخاس ... کفرەلای وان گەڕتەڵەب کەن لەو،خەلاس (۱۸۸۲)
بۆ دڵی وانْ حوسنی زەننێک بوو بەبەش ... بۆ غەم و ماتەم، دەبەرناکەن، چ ڕەش (۱۸۸۳)

**سوئوال کردنی بەهلوول لە دەروێشێک ...**

وایدەکوت بەهلوول بەدەروێشێک بەهۆش ... چۆنەحاڵت ئێستە، خۆشەیا، نەخۆش (۱۸۸۴)
جوابی داوەچۆنەشەخسێک جاویدان ... چۆنی ویست ئەو، وا بسوو ڕێتن جیهان (۱۸۸۵)
سەیل و جۆگە، بن بەمەیلی وی ڕەوان ... بن بەمەیلی وی ستێرەی ئاسمان (۱۸۸۶)

ژین و مردن هەردوو مەئموورانی وی — چۆنی ویست ئیجرادەکەن فەرمانی وی (۱۸۸۷)
هەرمەکان ویستی دەنێرێ تەعزییەت — هەرمەکان ویستی دەنێرێ تەهنییەت (۱۸۸۸)
چۆنی ویست ئەو، وا دەڕۆن جا، ڕێبوار — بوو ن ئەسیری داوی وی گشت ماندگار (۱۸۸۹)
پێکەنینی نایەتێ، قەت هیچ ددان — بێ ڕەزاو، بێ ئەمری ئەو فەر مان،ڕەوان (۱۸۹۰)
پێیدەکوت بەهلوول دەگەڵ ڕاس بووی بەجووت — دیاردەکا،ڕاستیت لەسیماوڕەنگوڕووت (۱۸۹۱)
سەت ئەوەندەی تۆ کوتت ڕاستی، بەڵام — بێژەبۆ من شەرحی ئەو باسەی، تەمام (۱۸۹۲)
گەر ببیسێ شەخسی فازیل یافزوول — زوو قەبووڵ کا، هیچ نەکاتن ئەو نکوول (۱۸۹۳)
وا ببێژەتۆ لەبۆ تەشریح،کەلام — بەهرەبگرێ هەرچی بیستی ئەو، بەعام (۱۸۹۴)
ناتیقی باش وەک سەخاوەتمەندە، لام — چون لەسەر سفرەی دەبێ چەن جوورتەعام (۱۸۹۵)
تا نەمێنێتن چ میوان بێ غەزا — بێتەدەستی وان، غەزای خۆیان جودا (۱۸۹۶)
هەر وەکوو قورئان کەهەیتی حەو تووێ — خاس و عام دەدرێ غەزایان لەو، جووێ (۱۸۹۷)
وایدەکوت دەروێش یەقینەخۆ لەعام — ئەو جیهانەئەمری حەق کردوویەڕام (۱۸۹۸)
ناکەوێتن هیچ گەڵایەک، خۆ لەدار — بێ قەزاو بێ حوکمی زاتی کردگار (۱۸۹۹)
قەت نەچووپاروو لەزار، بۆ لای گەروو — تا بەپاروو خوا، نەڵێتن ( ادخلو ) (۱۹۰۰)
مەیل و ڕەغبەت گەر لغاوی ئادەمین — هەردوو ژێر فەرمانی ڕەببەلعالەمین (۱۹۰۱)
زەڕڕەزەڕڕە، شت لەئەرز و ئاسمان — قەت چ ناجووڵێت، نیتی هیچ تەکان (۱۹۰۲)
تانەیەت فەرمانی زاتی بێ نەزیر — عاجزەبۆ شەرحی والە، شەخسی ژیر (۱۹۰۳)
کێیەبژێرێ گەلای داران تەواو؟ — بێ نیهایەت، لەفز، پێی ناکرێت ڕاو (۱۹۰۴)
هەر ئەوەندەی بگرەگوێی خۆت،گشت کار — دێن لەپاش فەرمانی زاتی گردگار (۱۹۰۵)
**گەر قەزای حەق بۆ ڕەزا، بۆ ئا دەمی — ئا دەمی تەسلیمی حوکمە، ئەو دەمی** (۱۹۰۶)
بێ تەکەللوف، بێ ئەوەی، بی وێ سەواب — بەڵکەوایەتەبع و خوویی موستەتاب (۱۹۰۷)
ئەو لەبۆ خۆی نایهەوێتن، مان و ژین — لەززەتو خۆشی لەژین بۆ وی، چ نین (۱۹۰۸)
جا لەڕێگای ئەمری حەق ئەو، ڕێ دەچوو — ژینو مردن بوون بەیەک، بۆ وی، نەدوو (۱۹۰۹)
ژینی وی هەر بۆ خودایە، خۆ، نەگەنج — مردنیشی بۆ خودایە، خۆ، نەڕەنج (۱۹۱۰)
هەیتی ئیمان، بەس بەخاتر زاتی وی — نەک لەبەر ئەشجار و جۆو، جەنناتی وی (۱۹۱۱)
تەرکی کفریش بەس بەخاتر خوا دەکا — نەک بەخاتر چوون دەئاگر، وا دەکا (۱۹۱۲)
خوویی وا هات ڕاس لەسەر چا وەی خودا — جستوجۆ و، ڕەنج، خسڵەتی وای بەو نەدا (۱۹۱۳)

ئــــەو دەمــــەی شــــادەبینی لــــەو ڕەزا هــەر وەکــوو هەڵوایەئــەو دەم، لای، قــەزا (١٩١٤)
بەنـدەیێکی خوڵـق و خـووی وابـێ ئەگـەر چـۆنی ویسـت دونیـا وەهـا نـابێ مەگـەر؟ (١٩١٥)
جـا بــەناڵین وا دوعـا کـا، ئـەو لــەبۆ؟ ئــــەو قەزایەلابەرەئـــەی خـــوا ئـــەتۆ (١٩١٦)
مــەرگی وی، هــەم مــەرگی منـداڵانی وی بـۆ خوداوەنـد، چەشـنی هـەڵواو نـانی وی (١٩١٧)
مـەرگی منداڵ بۆ ئـەوەی خـوای بـوو بـەیار هــەروەکوو هــەڵوا لــەپێش پیــری نــەدار (١٩١٨)
جـا لــەبۆچی ئــەو دوعــابێژێ؟ مەگــەر لــەو دوعــا دا بێــت ڕەزایـــی داد گــەر (١٩١٩)
نـەک لەڕەحەمەگـەر شـەفاعەت یـا دوعـا بەنـــدەیی کامیـــل دەکـــاتن لای خـــودا (١٩٢٠)
ڕەحمی خۆی سووتاند وئەو دەم لای دەبرد گــەر چــرای حــەققی دەدڵـدا هەڵـدەکرد (١٩٢١)
دووزەخـی ئـەو سافی وی هـەر عیشـق بـوو وەسـفی خـۆی ئـاگردەدا ئـەو، مـوو بـەموو (١٩٢٢)
کـوا دەزانــن ئـەو مەسـائیل شـەو ڕەوان؟ هــــەر دەقـــووقی شـــارەزایەچاک بـــەوان (١٩٢٣)

**داستانی دەقووقی و کەراماتی وی ...**

**خولاسەی داستان...**

دەقووقی عارفێکی عالی مـەقام بـوو، وهەمیشەدەموسافەرەت دا بـوو، کـەم هەڵدەکەوُت کـەدوو ڕۆژ لەجێیەکی بمێنێتەوە، زۆر بەتەقواو پەرهیز کار بوو، ورەئیوئیزهـار نـەزەری وی دروست بـوو .. بەو حاڵەتەشەوەزۆر بەجیددی دەجستو جۆی ئـەو لیبای خاسی خودادا بوو جا لەبەر ئەو ەزۆرساڵان هـەر گـەڕا و دەموسافەڕەت دابووتا بەمەقسوودی خۆی بگا جارو باریش وا دەبوو کەبەپێخواسی وکراسی دڕاو بەنێو درکو داڵو بەردەڵان دا دەڕۆیشت وزۆر بەئیشتیاق و ئارەزوو بەهەموو جێیـەک دا دەگـەڕا، بەڵکەم ئەولییای خودا، خۆیان لـەوی مـەعلووم بکـەن دەئاخر دا پاشی زۆرساڵان تەحـەمولی ڕەنج و مەشەققەت،لەساحیلێکدا مـەنزەرەیێکی عـەجیب و جـالبی دیـت، جـا ئـەلێرەدا واباشـەماجەڕاو ومـەوزووع لـەزبانی خـۆی ببیسین .. لـەناکاو لەقـەراغ دەریـا حــەوت شــەمعی هــەڵکراوم دیــت ..کــەزۆر بەشــۆقو ڕوو نــاک بــوون شــوعلەی ئــەو شەمعانەدەگەیشتەئاسـمان، زۆر بـەحیرەتو تەعـەججوب بـەخۆم کـوت .. ئـەو شـەمعانەچین؟ وسەرچاوەی نووری وان کوێیە؟ بۆچی عالەم ئەونوورەخاریقولعادەیەنابینن؟ لـەناکاو دیـتم کەئەو حــەوت شــەمعانەبوون بەیــەک شــەمع وڕەو شەنایشـی زیاتربوو،دووبـارەدیتم کەئــەو یــەک شـەمعەبوو بەحـەوت شـەمع ولـەناکاو حـەوت شـەمع بەحـەوت پیـاوی نـوورانی تەبـدیل بـوون کـەنووری وان تـا ئاسمان دەچـوو، حیرەتـو تەعـەججوبم زیاتربوو،کـەمێک چوومـەپێش وەختێـک

کەدروست دیققەتم کرد مەنزەرەیێکی عەجیب ترم دیت، دیتم کەهەریەک لەوپیاوانەبەتاقەدارێک دەهاتەبەرچاو، حەوت داری پرلەلک و گەڵای زۆر لەپێش من بوون کەبێ حیساب میوەی جوانیان پێوەبوو وبەتەعەججوبێکی تەواو لەخۆم پرسی، بۆچی هەموورۆژێ هەزاران ئینسان بەقەراغ ئەو دارا نەدا دەڕۆن بەڵام ئەو دارانەنابینن؟دووبارەچوومەپێشتر،دیتم کەحەوت دار بەیەک دار تەبدیل بوون،وئەو وەختەدیتم کەئەو دارانەسەفیان کێشاوەویەکیان لەپێش دا ڕاوەستاوەدەت کوت دەیان هەوێت کەنوێژی جەماعەت بخوێنن لەوەش عەجیبترئەو دارانەقیام و ڕکووع وسجوودیشیان هەبوو . هێندەی پێنەچوو کەئەو حەوت دارانەبوون بەحەوت پیاو، وئەوانیش پێکەوەمەجمەعێکیان تەشکیل دا، لەبەر حیرەتو تەعەججوب چاوەکانم خاوێن دەکردنەوە، وبەدیققەت تەماشام دەکرد تا بزانم ئەو حەوت پیاوەگەورانەکێن؟ نیزیکتر چووم وسەلامم لێکردن،سەلامیان دامەوەوئەمنیان بەنێو بانگ کرد. ماتو مەبهووت مام کەئەوانەئەمن لەکوێ دەناسن؟وچلۆن نێوی من دەزانن؟دەو فکرانەدابووم کەدەت کوت ئەوان لەدڵیمن ئاگاداربوون وجوابیان دامەوە، بۆچی تەعەججوب دەکەی؟مەگەرنازانی کەعارفانی ڕووناکبیرلەدڵی هەمووکەس ورازو ئەسراری جیهان خەبەر دا رن؟ لەپاشان بەمنیان کوت پێمان خۆشەدەگەڵ تۆ نوێژێک بەجەماعەت بخوێنین . وئەتۆ ئیمام بە.ئەمنیش قەبووڵم کرد.نوێژی بەجەماعەتمان لەقەراغ دەریا دەست پێکرد. دەوەسەتی نوێژدا دەقووقی دیتی کەدەریاموتەلاتیم وبەرێشانەوکەشتییەک لەنێو ئەمواجی دەریا گرفتارە،بای شەدید ئەمو اج و شەپۆلی وەک کێو دروست دەکا وبەسەر یەکیان دا دەدا وهەر وەکوو کوندی بەد شووم هاواری مەرگ و نەمان دەکا، ساکینانی ئەو کەشتییەلەوغەو غای خەتەرناکەدا، ڕووحییەی خۆیان لەدەست دا بوو وداد فەریاد وشیوەنیان دەگەیشتەعەرشی ئەعلا. بەڕاستی قیامەت بەرپابوو. دەقووقی دەئەسنای نوێژدا ئەومەنزەرەدڵ تەزێنەی دیت .ودڵی بەحاڵی وان سووتا. جا بەدڵ بۆ نەجات بوونی ئەو گرفتارانەدوعای کرد، وبەگریانو زاری لەدەرگای خودا داوای کرد کەئەو گرفتارانەلەو بەڵا خەتەر ناکەنەجات بدا.دوعای دەقووقی قەبووڵ بوو وئەو کەشتییەش بەسەلامەت گەیشتەساحیل، ونوێژی وانیش لەو وەختەدا تەواو بوو . دەو حاڵەدا ئەو حەوت نەفەرانەسەبرۆکە، لێکتریان دەپرسی ئەوەکێ بوو دەکارو باری خودا دا فزوولی کرد؟هەموویان دەیان کوت کەئەمن دوعایەکی بەو جوورەم نەکردووە. عاقیبەت یەکێک دەو بەینەدا کوتی ..ئەو دوعایەکاری دەقووقییە..دەقووقی کوتی وەختێک چاوم لەلای پشتەوەم کرد تا بزانم دەڵێن

چی..هیچ کەسم لەپشت سەرم نەدی ودەت کوت کەهەموویان چوونەئاسمان ..ولەو وەختەتاکو ئەلئان زۆرلەمێژساڵەکەئەمن دەئارەزووی پەیدا کردنی وان بەسەر دەبەم . بەڵام بەئارەزوو نەگەیشتووم ...

ئـــەو دەقـــووقی هەیبووئیبتیـــدایی خـــۆش     عاشـق و سـاحەب کـەرامات، دڵ لـەجۆش (۱۹۲۴)
ئـەو لەعـــەرزی چەشـــنی مـــانگی ئاســـمان     ڕوون دەبوو بەو گیان و ڕووحی شەو ڕەوان (۱۹۲۵)
کـــەم دەماوەئـــەو لەهـــەر جێیـــەک دەچـــوو     زیاد لەدوو ڕۆژ ئەو لەهیچ دێ، گیر نـەبوو (۱۹۲۶)
ؤ یدەکوت ئـەو گـەر دوو ڕۆژان، بم لـەماڵ     عیشقی ئەو مەسکەن، لەمن دەگرێت حاڵ (۱۹۲۷)
مـــن فریـــوی مەســـکەنم نـــاخۆم، چ جـــار     دوور بە، ئەی نەفس، تا غینات بێ،تۆ، بەیار (۱۹۲۸)
عـادەتی نـادەم دڵـم قـەت بـۆ هـیچ مـەکان     تاکوخـــالیس بێـــت، وەختـــی ئیمتیحـــان (۱۹۲۹)
ئـەو بەشـەو نـوێژی دەکـردو ڕۆژ سـەفەر     چەشـنی بـاز دەیکـرد لەشاباز، ئـەو، نـەزەر (۱۹۳۰)
دوور لەخـەڵکی بـوو، لەبـەد خـوویی نـەبوو     دوور لـــەپیاوو ژن، لەبـــەر دوویـــی نـــەبوو (۱۹۳۱)
میهرەبـان بۆخـەڵکو، نـافیع چەشـنی ئـاو     خۆش شەفاعەت، لەو دوعا مـەقبووڵ، تەواو (۱۹۳۲)
هـەم پـەنا بـۆ بـاش و بـەد هـەم میهرەبان     دایک و باب ناگەن بەوی قـەت هیچ زەمان[1] (۱۹۳۳)
وایـــدەکوت ئەحمـــەد بەئەســـحابی لوبـــاب     مـــن لـــەبۆتا ن میهرەبـــانم چەشـــنی بـــاب (۱۹۳۴)
جونکـــەبۆمن، ئێـــوە جـــوزئن وەک بـــەدەن     نادروســـتەگەر لـــەکول، جـــوزئی وەکـــەن (۱۹۳۵)
گـەر لـەکول جوزئێـک وەبـوو، بێکـار بـوو     گـەر لەتـەن عوزوێـک وەبـوو، منـدار بـوو (۱۹۳۶)
ئـەو بـەکول وەسـڵی نـەبێ ئـەو جارە،گـەر     مـــردووە، نیتـــی لەگیان،ئـــەو هـــیچ خەبـــەر (۱۹۳۷)
بـــۆ ســـەنەد نـــابێ تـــەکان، لـــەو بۆژیـــان     عـــوزوی تـــازەلێوەبووش، هـــەیتی تـــەکان (۱۹۳۸)
کول دەبێ کەم،جوزء،کـەم کـەی گەرلـەوی     کـــەم کـــەنابێ گـــەربێ،کول مەعنـــەوی (۱۹۳۹)
عاجزەلـــەو قـــەتعو وەســـڵە، خـــۆ مـــەقال     ناقیسـم کـوت چـەن مـەقالێک بـۆ میسـال (۱۹۴۰)

**گەڕانەوە بۆ داستانی دەقووقی ...**

ئـێری نـاو نـا ئەحمـەدی موختـار، عـەلی     گـەرچی نـابێ شـێر وەکـوو وی موعتـەلی (۱۹۴۱)
ئـەو میســـال و میســـل و، فەڕقـــە، واوەرە     لـەو دەقـووقیم بـۆ بڵـێ، ئـەو سـەر وەرە (۱۹۴۲)
گشـتی خـەڵکی پـەیڕەوی فـەتوایی وێـن     خـۆ لەتـەقواش دا، مەلـەک، لـەدوایی وێـن (۱۹۴۳)
بـۆ سلووک ئـەو مـانگی ڕوونـی مـات کـرد     وا بەدین بوو، دیـن بـەوی، حەسرەت دەبرد (۱۹۴۴)

---

[1] - هەم پەنا هەم میهرەبان بۆ باش و بەد     دایک و باب ناگەن بەوی تاکو ئەبەد

بەو هەمموو تەقواو و، ئەو ڕادو قییام    تالبی خاسانی حەق بوو، ئەو، مودام (۹۴۵)
مەتڵەبی وی بۆ سەفەر، وا بوو دەقیق    ماوەیەک بۆبەندەیی خاس، بێ، ڕەفیق (۹۴۶)
گەر دەکەوتە، ڕێ وەها دەیکرد دوعا    بم کەهاو دەم بۆ خەواست، ئەی خودا (۹۴۷)
یارەب ئەو هانەی دەیان ناسێ دڵم    بەندەمە بۆ وان، لەژێر پێی وان،گڵم (۹۴۸)
گەرکو نەم ناسین، ئەتۆ ئەی خوای گییان    زوو ئەوان نیسبەت بەمن کە، میهرەبان (۹۴۹)
خوا کوتی جا، بەو دەقووقی خۆش مەرام    عاشق وتینوویی چی؟ ئەی خۆش کەلام (۹۵۰)
میهروحوبیی من لەبۆ تۆ زۆرە، خۆ    خوات لەگەڵ بێ، چیت لەئینسان داوەتۆ؟ (۹۵۱)
جوابی داوەئەی خودای دانایی ڕاز    تۆ لەقەلبم ڕێی نییازت کرد واز (۹۵۲)
من لەنێو دەریای عەزیم، جێم گەر هەیە    ئارەزووم بۆ ئاوی گۆزە، هەر هەیە (۹۵۳)
چەشنی داودم،مەڕلەسەت، یەک دانەکەم    ئارەزووی ئەویەک مەڕەی دۆستم دەکەم (۹۵۴)
حیرسی عیشقی تۆ لەبۆ من ئیفتیخار    حیرسی غەیری تۆ لەبۆ من نەنگ و عار (۹۵۵)
عیشقی خاسان بۆ کەماڵی وانە، بەس    عیشقی ناکەس ئەو دەکاتەخارو خەس (۹۵۶)
عیشقی خاسان هەر کەماڵ دێنێتەدەست    عیشقی ناکەس ئەو دەبا بۆ جێی پەست (۹۵۷)
عیشقی خاسان، بۆ کەماڵ و، مەردییە    عیشقی ناکەس نەنگ و عار و سەردییە (۹۵۸)
لێرەدا ڕازێک هەیە، نا ئاشکار    چوو لەبۆلای خزر، مووسا هەر بەغار (۹۵۹)
هەر وەکوو تینوو کەتێر نابێ لەئاو    ڕامەوەستەلای هەچی دیتت، بەچاو (۹۶۰)
بارەگای حەق، ئینتیهای نابێت خۆ    تۆ لەهیچ جێ ڕا مەوەستە، هەر بڕۆ (۹۶۱)

**سیرڕ و ڕازی ئەو مەتڵەبە کە مووسا دەیهەوێت خزر پەیدا بکا با وجوودی نبووەت و قوربی مووسا لە خودا...**

تۆ لەمووسا فێر ببەچاک، ئەی کەریم    چاو دەڵێ چی؟ هەر بەمەیلی خۆی کەلیم (۹۶۲)
بەو مەقامی گەو رەیی پێغەمبەری    تالبی خزرم، لەخودخواهی بەری (۹۶۳)
قەومی خۆت بۆچی بەجێ هێشت ئەی کەلیم    چووی بەدووی شەخسێک شەریفوزۆرکەریم (۹۶۴)
شای نەجات بووی هەم لەخەوف و هەم ڕەجا    بەس گەڕان بەس جستوجۆ،چون وایەجا (۹۶۵)
تۆ دەگەڵتەمەتڵەبت واقیف بەوی    ئەی سەماوی چەن دەپێوی، تۆ زەوی؟ (۹۶۶)
پێیکوتن مووسا مەکەن لۆمەم،چ کات    ڕێ لەمانگ و ڕۆژ مەگرن ئەی سیقات (۹۶۷)
نامهەوێ تا مەجمەعولبەحرین، قەرار    تا دەبم هاو دەم دەگەڵ شای ڕۆژ گار (۹۶۸)
من دەکەم خزری سەبەب بۆ کاری خۆم    وا نەبێ گەر، من گەلێک ساڵان دەڕۆم (۹۶۹)

زۆرلەساڵان لێک دەدەم مـن باڵ و پەڕ — زۆرلەساڵان دێتمەژێر پێ، بەحرو بەڕ[1] (١٩٧٠)
مـن دەڕۆم لەوڕێیەتا هەمبێ ژیان — کەم لەعیشقی نا ن نییەخۆ عیشقی گیان (١٩٧١)
ئەو وتارەدوایی نایە، مامە، خۆ — داستانی ئەو دەقووقی بێژەتۆ (١٩٧٢)

**گەڕانەوە بۆ داستانی دەقووقی ..**

ئەو دەقووقی ڕەحمەتی خوا، بێ لەوی — وایدەکوت سووڕام لەچوار قورنەی زەوی (١٩٧٣)
من لەعیشقی مانگ سووڕام زۆر لەعەرد — ڕێم نەزانی، خۆڵە، خیزە، یانەبەرد (١٩٧٤)
دات دەنا ژێر لاقی ڕووت، بەردو دڕوو — جوابی دا حەیران بووم هۆشم نەبوو (١٩٧٥)
وا مەزانەدا دەنێم پێ، سەر زەمین — چون بەدڵ ڕێگا دەچێ، عاشق، یەقین (١٩٧٦)
مەنزڵ و ڕێگا، چ کووتا، یادرێژ — بێ خەبەر لێیان، دڵێکی مەستی گێژ (١٩٧٧)
ئەو درێژوکورتەهەر دوو وەسفی تەن — جوورەکی دی،ڕووح بەجێ دیڵێ، وەتەن (١٩٧٨)
وات سەفەر کرد تۆ لەنوتفەتاکو عەقڵ — پێ نەبوو، مەنزڵ نەبوو، هەروا، نە، نەقڵ (١٩٧٩)
بۆ گەڕانی ڕوو ح نییەهیچ جێو زەمان — گیانە، فێری جیسمی ئێمەی کرد گەڕان (١٩٨٠)
ئەو، گەڕانی جیسمی ئێمەی لادەنا — وان دەزانی تەن گەڕا، ڕووح بوو دەنا (١٩٨١)
وایدەکوت ڕۆژێک دەبووم موشتاق وار — تا لەئینسان دا ببینم نووری یار (١٩٨٢)
بەحرەکم،نێو قەترەێک، من بێتەچاو — من لەنێو زەڕڕێک ببینم یەک هەتاو (١٩٨٣)
گەر گەیشتم، پێم لەساحیل دا دەنا — شەو دەهات جا، ڕۆژی ڕوونی لادەنا (١٩٨٤)

**زاهیر بوونی حەوت شەمع لە ساحیل ...**

حەو شەمم دیتن لەدوور ڕا نا گەهان — لەو قەراغ دەریایە، زوو چووم، لای ئەوان (١٩٨٥)
نووری شوعلەی هەر یەکێک لەو حەو شەمان — وا بڵیند بوو تا گەیشتەئاسمان (١٩٨٦)
حیرەتم کرد حیرەتیش حیرەت دەما — مەوجی حیرەت عەقڵی داگرت هیچ نەما (١٩٨٧)
چۆن دەسووتێن ئەو شەمانەداخووا؟ — بۆچی نەی د ی چاوی خەڵکی دی، ئەوا؟ (١٩٨٨)
خەڵکی بەدوای یەک چرای ڕوون،دا دەچوون — گەرچی لایان شەم لەمانگی،زێندەڕوون (١٩٨٩)
زۆر عەجەب چاوان حیجابیان بێ، وەها — چاوی وانی بەست (یهدی من یشا ) (١٩٩٠)

---

[1]- زۆرلەساڵان من دەپێوم بەحر و بەڕ (مصرع دوم)

### تەبدیل بوونی ئەو حەوت شەمعانە بە یەک شەمع ...

ئەوچەلەش دەمدی،کە هەرحەو بوون بە یەک    نـووری وی دەدرێـت جـا، ئێقـەی فەلـەک (۴۹۹۱)
جارەکی دیش دیم کەئەویەک، بوو بەحەو    زێــدەمن حــەیران دەبــووم دیتم،کەئــەو (۴۹۹۲)
وا بەیەکتر موتتەسیل بوو ن ئـەو شـەمان    قــەت زبــانی ئێمــەپێی نــاکرێ بــەیان (۴۹۹۳)
وا دەبێ یـەک شـت دەبینـرێ، دوایـە ئـەو    ناتــەوان بـۆ وەسـفی وی چــەن سـاڵە، دەو (۴۹۹۴)
لەحزەیەک، یەک شت دەبینێ دەرکی هۆش    عــاجزەبۆ بیســتنی، چــەن ســاڵە،گۆش (۴۹۹۵)
خــۆت بناســە، ئەوهــەدوایی نایــەخۆ    چـون لەدەسـتم نـا یەوەسـفی خاسـی تـۆ (۴۹۹۶)
چوومەپێشــترتا بــزانم ئــەو شــەمان    چـی دەدەن پێمـان لـەزاتی حـەق نیشـان (۴۹۹۷)
من دەبووم بێ حاڵ و، مەد هۆش و خەراو    تا کو کەوتم، چون دەچووم مـن زۆر بـەتاو (۴۹۹۸)
ما وەیەک مام،من لەوێ، بێ عەقڵو هۆش    جـا لەسـەرعەرزی دەکـەوتم وەک نـەخۆش (۴۹۹۹)
ئــەو چەلــەش هەسـتامو هۆشـم هاتەبـەر    ڕێ،دەچووم جا، وەک کەنەم بێ، پێ و سەر (۵۰۰۰)

### زاهیربوونی ئەو حەوت شەمعانە بە سوورەتی حەوت پیاو ...

ئەو حەوت شەم بوون بەحەو پیاو ئەو زەمان    نــووری وان بۆســیدرە،چوو تــا ئاســمان (۵۰۰۱)
نــووری وان جــا نــووری ڕۆژی لادەنــا    هێنــدەڕوون بــوو نــووری دیکــەی ڕادەنــا (۵۰۰۲)

### دووبارە تەبدیل بوونی ئەو حەوت شەمعانە بە حەوت دار...

یـەک بەیـەک ئـەو حـەو پیـاوەبوون بـەدار    خۆش نەبوو وەک ئەو دەمی چاوم،چ جار (۵۰۰۳)
چون گەڵا زۆر بوون، نەبوون هیچ لک دیار    گشت گـەڵا، ون بـوون، لەبـەر زۆری سیمار (۵۰۰۴)
تاکوسیدرە، یـەک بەیـەک کردیـان گـوزەر    بۆ خـەلا چـوون، سیدرەیان نـا، پشتی سـەر (۵۰۰۵)
ڕیشەکەشیان چـوو هـەتا قـەعری زەمـین    زۆر لـەژێر ئـەو گـاوو ماسـی هـەن، یـەقین (۵۰۰۶)
ڕیشــەیان شــادتر لــەلکیان بــوو هــەموو    عـەقڵ، لـەو ئەشـکالی وان حـەیران دەبـوو (۵۰۰۷)
میــوەیی حاســڵ لــەوان، بــدرێ فشــار    بـەرق و نـوور لـەجیاتی ئـاو، لـەو دێنـەخوار (۵۰۰۸)

### نادیار بوونی ئەو دارانە لە پێش چاوی خەڵکی...

زۆر عەجەب خەڵکی بەلای وان دا دەچوون    نــەک هەزار،بەڵکــەم هەزاران،زێــدەبوون (۵۰۰۹)
بۆکـەمێک سـێبەر دەیـان دا مـاڵ و گیـان    ئـەو بـەڕەی بوویـان، دەیـان کـرد سـایەبان (۵۰۱۰)
سـێبەری وانـی نـەدی قـەت یـەک نەفـەر    سەت هـەزاران تـف لـەچاوی کـەج نـەزەر (۵۰۱۱)

قەهری حەق مۆری لەچاوی وان دەدا    کوێر لەحاستی وان دەبینن چاک، سوها (۲۰۱۲)
چاک دەبینن زەرڕەنابینن هەتاو    نائومێدیش نین لەلوتفی خوا، تەواو (۲۰۱۳)
کاروانان خەستە زۆر، میوەش ئەوا    گەیونو دەرژێن، چ سیحرە؟ ئەی خودا (۲۰۱۴)
چاو لەخەڵکی،سێو ڕزی بێ، خڕ دەکەن    یەکتری بۆ سێوی وا پیس، قڕ دەکەن (۲۰۱۵)
دەمبەدەم بەرگ و شکووفەی ئەو غسوون    وا دەڵێن (یالیت قومی یعلمون ) (۲۰۱۶)
یەک بەیەک خەڵکیان دەکرد، دار، وا سەدا    وەرنەلامان ئەی لەبەختی باش جودا (۲۰۱۷)
جا لەحەق ڕا، وا دەهات دەنگ بۆ شەجەر    چاوی وانمان بەست (کلا لا وزر) (۲۰۱۸)
گەر کەسێ کوتبای بڕۆن ئەو جارە، جا    لای فلان دار،سوود ببەن لەو دارە، تا (۲۰۱۹)
گشت دەیان کوت،گێژە،عەقڵی دا لەدەست    ئەو قەزای حەق والەکردی شێتوپەست (۲۰۲۰)
مەغزی ئەو مسکێن لەبەر سەودایی کۆن    هەم ڕیازەت، بوو خەراب گرتوویەبۆن (۲۰۲۱)
ما عەجەب لەو کارەدەیکوت ئەی خودا    بۆ دەبێ گومڕابین خەڵکی ئەوا؟ (۲۰۲۲)
گەر بڵێ بۆ عام لەڕێگای عەقڵ، وا    یەک قەدەم نایەن لەبۆ لای ئەو لیا (۲۰۲۳)
عاقڵ و زیرەک لەوان، وا کار دەکەن    ئەولیای زاتی خودا ئینکار دەکەن (۲۰۲۴)
یا ئەمن دێوانەمەیا خێر ئەوان    دای لەسەر من دێو، شتێکی زۆر گران (۲۰۲۵)
چاوی خۆم خاوێن دەکەم چون من دەڵەم    یانەخەو نە، من دەبینم، یا هەڵەم (۲۰۲۶)
خەونی چی؟ من ڕوو بەرەو داران دەڕۆم    بۆ نەکەم باوەڕ، لەمیوەی وان دەخۆم (۲۰۲۷)
دێنمەژێر چاو مونیکرانی نا بەکار    بۆ لەباغی وان دەکەن خۆیان کەنار (۲۰۲۸)
گەر چی هەیتی ئیحتیاج ئەو، وەک گەدا    هەر بەهیوای کەم لەقۆرە،گیان دەدا[1] (۲۰۲۹)
هەر بەشەو ق و ئارەزووی یەک بەرگەدار    ئاە دەکێشن ئەو فەقیرانی نەزار (۲۰۳۰)
کردیان عالەم لەدارو بەر، فەرار    سەت هەزار نا، بەڵکەچەندین سەت هەزار (۲۰۳۱)
ئەو چەلەش دەمکوت نەکا، چووبم لەحاڵ    گرتبم من لک، لەئەوهام و خەیاڵ (۲۰۳۲)
تۆ لە(حتی ا ذ استیا س الرسل ) بڵێ    ڕا مەوەستەتاکو (کذ بوا ) هەڵێ (۲۰۳۳)
بێژە( کذ ب ) تۆ بەتەشدید ئەی جەناب    تا نەمێنن ئەنبییایا ن ژێر حیجاب (۲۰۳۴)
شەکک و تەردید کەوتەگیانی ئەنبییا    کاتێ دیتیان ئیتیفاقی ئەشقیا (۲۰۳۵)
پاشی شەک من، نەسرو یاریم پێدەدان    شەک مەکەتۆش،بێرەسەر داری گییان (۲۰۳۶)
هەم بخۆ خۆت،هەم بدەساحەب بەشان    فێر دەکەن خەڵکی دەبا، نەشبێ، نیشان (۲۰۳۷)

---

[1]- هەر بەهیوای قۆرەیەک کەم ، گیان دەدا (مصرع دوم)

جــا دەڵــێن خــەڵکی کــەهاوار بۆچییــە | خــۆ لەســـەحرا دارو میـــوەهیچ نییـــە (۳۰۳۸
گێـژی کـردین قـەولی شـێتان گـەر دەڵـێن | زوو لـەبۆ ئـەو بـاغی نیزیـک لێـو، هـەڵێن[1] (۳۰۳۹
چــاک دەنــۆڕین لێرەبــاغ ناکــا زهــوور | یانەدەشـــتە، یانـــەڕێی ســـەعبولعبوور (۳۰۴۰
باســـی والـــەدوایی نایەئـــەی جـــەوان | زۆر بەسـوودە، ئـەو لیبـا گـەر هـەن،کوان؟ (۳۰۴۱
خۆ،منیش وەک وان دەڵێم ئەی وای عەجەب | بــۆچی قفڵــی دا دڵــی وان ســونعی ڕەب (۳۰۴۲
لـــەو نیزاعانەموحەممـــەد مـــا عەجـــەب | هەر بەچەشنی وی عەجەب ما، بوو لەهەب (۳۰۴۳
ئەو عەجەب تا ئەو عەجەب زۆر لێک بەدوور | بـا بـزانین چـی دەکـا ئـاخر، غـەفوور (۳۰۴۴
ئەی دەقووقی خۆش بڕۆ،خۆت کەخەمۆش | بــەس بڵــێ تۆ،چونکەئێســـتا، قاتــەگۆش (۳۰۴۵

**تەبدیل بوونی ئەو حەوت دارە بە یەک دار...**

وایـدەکوت مـن چوومەپێشـتر هـەر بـەغار | دیم کە هەر حەوتیان دەبوون یەک دانەدار (۳۰۴۶
حەو،دەبۆ یەک،یەک دەبۆ حەو،زوو بەزوو | خۆزگـــەدیبات حیرەتـــی مـــن چەنـــدەبوو (۳۰۴۷
جالەپاشـــان دیـــم کـــەداران، بـــۆ نـــوێژ | وەک جەماعـەت ڕادەوەسـتان، سـەف درێـژ (۳۰۴۸
یــەک لەپێشـیان ڕادەوەسـتا، وەک ئیمـام | کردییـــان ئیـــدی لەپشـــتی وی قییـــام (۳۰۴۹
لــەو ســجوودو لــەو ڕکووعولــەو قییــام | گــەر لــەدارانم دەدی ســەر ســام دەمــام (۳۰۵۰
هاتـەبیـرم قـەولی حـەق جـا، ئـەو زەمـان | هەم شەجەر هەم نەجم، هەر دوو( یسجدان (۳۰۵۱
خـۆ لـەوان د ار دا، نـەبوو چۆکـو کەمـەر | چۆن دەبێ جا، نوێژی وا، ئەی خوای لەسەر؟ (۳۰۵۲
وا، لەحـەق ئیلهـام دەهـات ئـەی یـاری مـە | هێشـــتەتۆ هـــەرپێت عەجیبـــەکاری مـــە؟ (۳۰۵۳

**تەبدیل بوونی ئەو حەوت دارانە بە حەوت پیاو...**

ماوەیـەک پاش،بوونـەپیاو دار، سێ و چـوار | دا دەنیشـــتن گشـــتییان لای کردگـــار (۳۰۵۴
چـاو دەکـەم خاوێن،کەئـەو حـەو پاڵـەوان | کێن؟چکـــارەن؟وا، لـــەدونیادا، ئـــەوان (۳۰۵۵
گەر لەوان نیزیک دەبووم ئەی خۆش کەلام | هاتـــەلام هۆشـــم لـــەوانم کـــرد ســـەلام (۳۰۵۶
وا بـــەمنیان دا جـــەوابی ئـــەو ســـەلام | ئـەی دەقووقی تـاجی فـەخری گشت کیـرام (۳۰۵۷
چـۆن دەناسـن ئێـوەمن؟ وایکـوت بـەوان | خـۆ نـەتان دیبـووم لـەپێش دا، هیـچ زەمـان (۳۰۵۸
بـوون لەقـەلبی مـن ئـەوان ئاگـا، تـەواو | جـــا لەیـــەکتریان دەنـــۆڕی، ژێرچـــاو (۳۰۵۹

[1]- زوو لەبۆ ئەو باغی نیزیکتان هەڵێن (مصرع دوم)

وا، بەمن دایان،جەواب، ئەی خۆشەویست　　تاکو ئێستا، تۆ مەگەرئەوهەت نەبیست؟ (٢٠٦٠)
قەلبی پاکی عارفان و ئەو لیا　　ون لەوان نابێت، ڕازی کیبریا (٢٠٦١)
من بەخۆم کوت گەرلەڕاز ئاگان ئەدی　　بۆ دەزانن ئیسم و حەرفی ئیدەدی؟ (٢٠٦٢)
جوابی دا، غەفڵەت لەئیسمێک بۆ وەلی　　دێ لەئیستیغراقی وی، نەک جاهیلی (٢٠٦٣)
ویستی خۆیان وا، لەپاشان کرد ئەدا　　دەن هەوێ ئێمەبەتۆ کەین ئیقتیدا (٢٠٦٤)
پێم کوتن سەبرو هەبێ،باش، وا دەکەم　　چون هەمن موشکیل لەگەردوون،زۆر نەکەم (٢٠٦٥)
چون دەکا حەل، هاودەمی ئەشخاسی پاک　　هاو دەمی باعیس،ترێ دەر دێ، لەخاک (٢٠٦٦)
بوو بەهاو دەم دەنکی پڕ، بۆ خاکی ڕەش　　چونکەهەیبوو ئەو لەقەدرو مەجد، بەش (٢٠٦٧)
خۆی دەکرد نابوود لەژێر ئەو خاک و عەرد　　تاکو نەبێ، ڕەنگ و بۆنو سوورو زەرد (٢٠٦٨)
پاش فەنا بوون، هیچ نەما بۆ وی جموود　　خۆیو باڵی واز دەکرد چۆ، نێو وجوود (٢٠٦٩)
بێ، کەسێ لای ئەسڵی خۆی فانی ئەگەر　　سوورەتی دەرواتو،مەعنی جیلوەگەر (٢٠٧٠)
پەیڕەوین بۆت، وا ئەوان کوتیان بەسەر　　شادمانین پەیڕەوی تۆین ئێمە،گەر (٢٠٧١)
ماوەیێکم من دەگەڵ وان بردەسەر　　وەک موراقیب من لەخۆم بووم بێ خەبەر (٢٠٧٢)
گیانی من ئەو دەم لەکات دەیبوو نەجات　　چونکەکاتە،گەر جەوانان پیر دەکات (٢٠٧٣)
بەس بەکاتەگەر دەگۆڕێن، شت، هەموو　　دوورلەگۆڕان،ئەو کەسەی بێ کات بوو (٢٠٧٤)
لەحزەیەک نەت بێ ئەگەرکات وزەمان　　بۆت دەبێ مەحرەم ئەتۆ،خوای دوو جیهان (٢٠٧٥)
خۆ، لەبێ کات ئەهلی کات ئاگا نییە　　ڕێگەبۆ بێکات، لەکات حەیرانییە (٢٠٧٦)
بۆ هەموو کەس دیارکرا جێگای لەبۆ　　لەو جیهانەی پڕ تەلاش و جستوجۆ (٢٠٧٧)
بۆ هەموو جێیەک، هەیەمەئمووری وێ　　تا نەیەت فەر مان، لەوێ دەرنا کەوێ (٢٠٧٨)
گەر هەوەس کا،یەک لەجێی خۆی دەرکەوێ　　ڕوو لەجێگای ئیدەدی کا، بچتەوێ (٢٠٧٩)
جێ بەجێ دەگرن بەچوستی دەستی وی　　جا لەبۆ جێی خۆی دەکێشن سەر نەوی (٢٠٨٠)
گەر نەبینی حافیزان ئەی هووشیار　　ئیختیارت چاو، کەنیتی ئیختیار (٢٠٨١)
تۆ بەئیمکان جار دەکەی شت، ئیختیار　　نا توانی ئەو بدەی ئەنجام چ جار (٢٠٨٢)
حافیزانی باتینی ئینکار دەکەی　　نەفسی ئەممار، ساحەبی ئیجبار دەکەی (٢٠٨٣)

## وە پێش کەوتنی دەقووقی بۆ ئیمامەت ...

دوایی نایە، باسی وا، دوورو درێژ　　ئەی دەقووقی پێشکەوەتۆ، بۆ نوێژ (٢٠٨٤)

دوو ڕکاعەت نوێژبکە، ئەی نامدار　　تا موزەییەن کا، وجوودت، ڕۆژ گار (۲۰۸۵)
ئەی ئیمامی وەختی نوێژ، تۆی ڕوون چاو　　پێشەوا، بێ چاوی ڕوون، زۆر ناتەواو (۲۰۸۶)
خۆ بەشەرعیش بوو بەمەکرووە، ئەی دلێر　　گەر دەنوێژ دا، بێ بەئیمام، شەخسی کوێر (۲۰۸۷)
گەرچی حافز بێت و چالاک و فەقیە　　نابێ وەک چاو ساغ، هەر چەن بێ سەفیە (۲۰۸۸)
کوێر لەدەستی نایەخۆی دوور کا لەپیس　　بۆ حەزەر کردن لەپیس، چاو بوو ڕەئیس (۲۰۸۹)
چونکەنابینێ لەڕێ ئەو پیس،چ جار　　قەت چ موئمین کوێر نەبێ ئەی کردگار (۲۰۹۰)
کوێری زاهیر، زاهیری وی بوو، بەپیس　　کوێری باتین، باتینی وی بوو نەجیس (۲۰۹۱)
پیسی زاهیر ئا و کەبێ، ئەو لادەبات　　پیسی باتین زیاد دەبێ ناڕوا، چ کات (۲۰۹۲)
ئەشکی چاوان لا دبا پیسی دەروون　　گەر ببێ پیسی دەروون مەشهوود و ڕوون (۲۰۹۳)
گەرخودا دەیکوت نەجیس بۆ کافری　　بەس بەباتین بوو نەجیس، نەک زاهیری (۲۰۹۴)
زاهیری کافر، نەبوو پیس خۆ، یەقین　　ئەو نەجیس بوو، بەس لەبەر ئەخلاق و دین (۲۰۹۵)
پیسی زاهیر چەن قەدەم، لەو بۆ ن،کەدێ　　پیسی باتین بۆ ن لەوی دێ، دێ بەدێ (۲۰۹۶)
بەڵکەدێ تا ئاسمانان بڕ دەکا　　ئەومەشامی حوورو ڕیزوان، پڕ دەکا (۲۰۹۷)
مەتڵەبم کرد من بەقەت فەهمت بەیان　　من لەبۆ فەهمی دروستم، داوەگیان (۲۰۹۸)
جیسمی ئینسان گۆزە، فەهمیش چەشنی ئاو　　گۆزەگەر بشکێت دەڕژێ، ئا و، تەواو (۲۰۹۹)
پێنج کونی گەورەو عەزیم دەو گۆزەدان　　بەفرو ئاو دەو گۆزەدا، هیچیان نەمان (۲۱۰۰)
چاو لەپیس و بەد ببەستن،کوت خودا　　گەرچی بیستت، تۆ، بەویت، هیچ گوێ نەدا (۲۱۰۱)
قەولی بەد، فەهمت دەکا،خوار و نەزار　　خیزەگوێ، فەهمت لەوی دەڕواتەخوار (۲۱۰۲)
هەر وەهانەئەوکونانەی دیت،کەهەن　　فەهمو هۆشی تۆ ئەوانیش دێن دەبەن (۲۱۰۳)
بێ عیوەز ئاو، گەر لەدەریا دەر کەوێ　　یەم کەنامێنێ، دەبێ سەحرا، ئەوێ (۲۱۰۴)
خۆزگەمن وەختم هەبایە، ئەی فلان[1]　　کردبام ئەعواز و ئەبدال بۆت بەیان (۲۱۰۵)
جا، لەکوێ ئەعواز و ئەبدال دێنەیەم　　گەر لەدەریابێتەدەر ئاو،زورو کەم (۲۱۰۶)
سەت هەزاران جانەور دێن لەو دەخۆن　　دێن دەبەن هەر وا، لەوی، پاشان دەڕۆن (۲۱۰۷)
دێن لەبۆ دەریایەئەعواز، زۆر کەهەن　　دێن لەکوێ ڕا؟ چاک دەزانن ئەهلی فەن (۲۱۰۸)

---

[1]- سەت بری ، وەختم هەبایەئەی فلان (مصرع اول)
سەت ئەسەف وەختم هەبا من، ئەی فلان (مصرع اول)

مەتڵەبی خۆن چون بەیان کرد زۆر بەتا و — لــەو کتێبەداســتان، مــان، نــا تــەواو (٢١٠٩)
ئــەی حیســامەددینی پــاکی ئەمجــەدی — ئەی وەکوو تۆی، قەت بەخۆ، دونیا نەدی (٢١١٠)
تۆ عــەجیب نێو گیان و دڵ گرتت قــەرار — ئــەی لــەبینینت، دڵ و گیــان شــەرمەزار (٢١١١)
زیندەمــەد حــم کــرد قــەومی مــا مــەزا — تــۆم مــەرام بــووی، چونکــەوا بــوو، ئیقتیــزا (٢١١٢)
جنیەکــەی خــۆی چــاک دەناسێتن، دوعــا — هــەر کەسـت ویسـت، تـۆ بکـەبۆوی سـەنا (٢١١٣)
تــا کــو مەمــدووحم نەناســن نــا کەســان — خواش لەبۆ ئێمەی حیکا یەت کرد وەسان (٢١١٤)
گــەرچی مــەدحی وا،لــەتۆ بــوو شــەرمەزار — خوا قەبووڵیەجەهدی هەرکەس بێ نەدار (٢١١٥)
لای خــودا مەقبووڵەکــەم، دەیکــا مــەعاف — چــون لــەچاوی کــوێر دوو قەترەکــەفاف (٢١١٦)
تێگەیشــتن خــەڵکی ئیبهــامم، بــەعام — هــەر حیسـامەددین لەمـەدحم، بـوو مـەرام (٢١١٧)
تا حەسوود ئاهی نەگا بەو، قەت چ کات — تـاکوهیچ کـەس دوشـمەنی بـۆ وی، نـەکات (٢١١٨)
کوا دەناسێتن ئـەو ی، حاسید دروسـت؟ — کوا،لـەماڵی مشـک،تووتی هـات دەنوسـت؟ (٢١١٩)
ئــەو خەیاڵــەی دا بەحاســید، ئیحتیــال — مووی برۆی بوو کەوتەسەرچاو، نەک هیلال (٢١٢٠)
زیاد دەڵەم مەدحت،لەپێنج و هەم حەوت — دەی بنووســەتۆ،دەقووقی پــێش کــەوت (٢١٢١)

**وەپێش کەوتنی دەقووقی بە عینوانی ئیمام بۆ ئەو گرووهە...**

دەو تــــــەحییاتو، سەلاموســــــالحین — ئـەنبیاش تێـدا هەنـە، بـێ شـک، یـەقین[1] (٢١٢٢)
هــەرچی مەدحەگشــتیان بــوون تێکــەڵاو — نێو لەگەن دەکران لەگۆزان، ئا و، تەواو (٢١٢٣)
چونکەمەمدووح هەریەکەنەک سێ ودوون — بۆیەئـەدیان زیـا د لەیـەک دا نـە، نـەبوون (٢١٢٤)
هــەرچی مەدحــە، بۆخــودای زانــایی ڕاز — مەدحی سوو ڕەت یانەئەشخاس، بوو مەجاز (٢١٢٥)
مــەدحی ئــەهل و موســتەحەققان بــوو ڕەوا — مــەدحی نــا ئــەهلان وناکــەس ئیشــتیبا (٢١٢٦)
وەک جیـدارێک وێکـەوێ نـوور، جـارو بـار — باعیســەبۆ ئینعیکاســی نــوور، جیــدار (٢١٢٧)
بێ لەبۆ لای مانـگ، نـووری سـەر جیـدار — مەدحی نوور ناکا، نەدیتووی، مانگ، چ جار (٢١٢٨)
یـا لـەنێو بیـر، یـەک ببینـێ مانـگ ئەگـەر — ئەو دەکا تـەعریف، لەئەسڵیش بێ خەبەر (٢١٢٩)
خۆ،حەقیقـەت ئـەودەکا تـەعریف لـەمانگ — گەرچی نەیدی ئەولەمانگ یەک دانەدانگ (٢١٣٠)
مـانگی تـەعریف کـرد عەکسـی مانگ،نـا — بــا نــەبێتن عەکســی وەی، کفرەدەنــا (٢١٣١)
چـون شـەقی بـوو کـردی ڕێ ون، ئـەو دلێـر — مانـگ لەسـەربوو، وایـدەزانی ئـەو لـەژێر (٢١٣٢)

---

[1] - سالحانی نێو تەحییات پاش سەلام — ئەنبیاش دەگریتەبەر ، گشتتیان بەعام

عیشـقی جوانـان دێ پەرێشـانی لـەدووی  شـەهوەتیش دێـتن، پەشـیمانی لـەدووی (٢١٣٣)

چـون خـەیاڵی شـەهوەتی تـۆ بـوو، مـەجاز  دوور لــەواقیع دوور لەئەسـڵی دڵخـوواز (٢١٣٤)

چـا دەکـا بـۆ عیشـقی تـۆ باڵ،یـەک خـەیاڵ  توند دەچێ جا، بۆ حەقیقەت، ئەی هەواڵ (٢١٣٥)

شـەهوەتت گـەر بـێ مـەڕام، دەرژێـت بـاڵ  شـەل دەبـێ تـۆ، لات، چ نـامێنێ، خـەیاڵ (٢١٣٦)

گەر بەدووی شەهوەت بڕۆی، دەرژێت باڵ  ئـەو دەمـی نـا بێ بەهەشـت بـۆ تـۆ بـەماڵ (٢١٣٧)

وا دەزانــن خــەڵکی خۆشــن شــادمان  چــوو لەدەسـتی وان، بــاڵی ئاسـمان (٢١٣٨)

شـەرحی ئـەو نوکتەئـەمن بـووم وامـدار  مـۆ لـەتم دە، موعسـیرم ئـەی نامـدار (٢١٣٩)

## ئیقتیدا کردنی ئەو گرووهە بە دەقووقی...

پێش کـەوت بـۆ نـوێژ دەقـووقی، بـۆ ئیمـام  زینـەتی وان بـوو دەقـووقی خـۆش مـەڕام (٢١٤٠)

ئـەو شەهانەبەسـتیبا ن، سـەف سێ و چـوار  بـوون لـەدووی ئـەو موقتـەدایی نامـدار (٢١٤١)

هـەر کەتـەکبیریان دەکـوت زۆر موعتەبـەر  چەشـنی قوربـان لـەو جیهانەچوونـەدەر (٢١٤٢)

ئـەی ئیمـام مـەعنایی تـەکبیربوو، ئـەوا  ئێمـەقربانین لـەپێش تـۆ ئـەی خـودا (٢١٤٣)

وەختـی زیـبح،( اللـەاکبر)، تـۆ دەڵـەی  گـەر نەڵـەی، بۆ کوشتنی نەفست، هەڵەی (٢١٤٤)

چەشنی ئیسماعیلەتەن، گیان وەک خـەلیل  گیان کەتـەکبیر کا، لەسـەر جیسمی نـەبیل (٢١٤٥)

تـەن دەبێ، بێ شـەهوەتو حیرسـی درێـژ  بـوو بەبیسـم اللـە، قوربـان، نێـو نـوێژ (٢١٤٦)

وەختـی وێستان سـەف دەکێشن لای خـودا  تا حیسابیان یـەک بەیـەک، حەق، وێ بـدا (٢١٤٧)

ڕا دەوەسـتن لای خـودا چـاو پـڕ لـەئاو  هـەر وەکـوو ڕۆژی قییامـەت دێتـەچاو (٢١٤٨)

خـوا دەڵـێ چـت پێیـەبۆ مـن، دا، بڵـێ  لـەو دەمـەی دام مۆڵـەتی تـۆ جـا، بڵـێ (٢١٤٩)

عـومری خـۆت تـۆ چـۆن بـەپایان بـردووە؟  قـودرەتی خـۆت چـۆن فـانی کـردووە؟ (٢١٥٠)

خەرجی چیت کرد گەو هـەری نایابی چاو؟  چیت بەدەس هینا بەپێنج حیسسی تەواو؟ (٢١٥١)

چاوو گـوێ و،هـۆش وزێـڕی عەرشـی بـەرز  دات لەدەستت،چت بـەدەس هینا لەعـەرز؟ (٢١٥٢)

وەک مـەڕەو پـاچ، دەستو پـێم مـن دا، بـەتۆ  مـن بـەتۆم دان خـۆ نـەهاتن، سـەر بـەخۆ (٢١٥٣)

جـا پــەیامی والــەناخۆش چەشــنی ژار  سـەت هــەزاران دێـن، لـەزاتی کردگـار (٢١٥٤)

وەختی وێستان زۆرسو ئال کردیان ڕجووع  جا لەشـەرمان بـوو بـەدوو قـەد،چۆ ڕکووع[1] (٢١٥٥)

چـون لەشـەرمان نەیـدەگرت لاقـی قـەرار  چـۆ ڕکـووع ئـەو کـردی زیکـری کردگـار (٢١٥٦)

[1]- وەختی وێستان چون سوئال بوون بێ ژمار  چۆ ڕکووع دوو قەدبوو،چون بوو شەرمەزار

وا دەهات فەرمان کەسەر هەڵبێنەتۆ   لەو ڕکووعەبێژەجوابی خوایی خۆ (٢١٥٧)

لەو ڕکووع هەڵدێنێ سەر ئەو شەرمەزار   دێتەسەر ڕوو ئەوچەلەش ئەوخام کار (٢١٥٨)

دێت فەرمان ئەو چەلەش هەڵبێنەسەر   بێژەبۆمن تۆ لەکردەی خۆت، خەبەر (٢١٥٩)

ئەوچەلەش هەڵدێنێ سەر زۆر شەرمەزار   دێتەسەرڕوو،جارەکی دیش چەشنی مار (٢١٦٠)

سەر هەڵێنەئەوچەلەش دەی زوو بەزوو   دەمهەوێ تەحقیق بکەم لێت، موو بەموو (٢١٦١)

ناتوانێ بگرێ ئەو سەرێ قەر ار   چون خیتابی حەق ئەو ی کرد گیان نەزار (٢١٦٢)

دا دەنیشێ جا لەبەر باری گران   خوا دەڵێ بەو، زووکە، دەی، بۆم کەبەیان (٢١٦٣)

نیعمەتم دا پێت، شوکری خوا، ئەدی؟   دام بەتۆ سەر مایەسوودت کوا ئەدی؟ (٢١٦٤)

ڕوو لەدەستی ڕاس دەکا بێژێ، سەلام   ڕوو دەکاتەئەنبیایان، هەم کیرام (٢١٦٥)

یەعنی ئەی شاهان، شەفاعەت بۆ لەئیم   چون لەقوڕ دا غەرقەهەم خۆی هەم گلیم (٢١٦٦)

**بەیانی ئەو مەتڵەبە،کە ئیشارە بۆ لای ڕاست لە کاتی سەلام ترس و هەیبەتە لە موحاسەبەی حەق لە ڕۆژی قیامەت، و لە ئەنبیا کۆمەک و شەفاعەت ویستن ...**

ئەنبیا بێژن کەچارە، هیچ نەما   ئەسڵی چارە، بوو لەدونیا، لێرە، نا (٢١٦٧)

بەس بڵێ بێهوودەئەی بەد بەختی دوون   لێن گەڕێ، لێن لێڵ مەکە، تۆ ئاو ی ڕوون (٢١٦٨)

ڕوو دەکاتەلای چەپە، بۆ قەومو کەس   پێی دەڵێن تۆ بەس بڵێ لەو باسەبەس (٢١٦٩)

بێژەجوابی خۆت ئەتۆ، لای کردگار   چونکەئێمەناتوانین قەت، چ کار (٢١٧٠)

هەم لەڕاست و هەم لەچەپ بێچارەبوو   گیانی ئەو بێچارە دڵ، سەت پارەبوو (٢١٧١)

نائومێد بووچون لەهەر دووک لاوە، جا   ئەو بڵێندی کرد دوودەست بۆ دوعا (٢١٧٢)

چون لەگشت مەئیووس بووم، ئەی خوایی من   ئەووەڵ و ئاخر،ئەتۆی هیوایی من (٢١٧٣)

ئەو ڕمووزی نوێژ بێنەبەر نەزەر   چون لەمەحشەر گشت ئەوانەت دێن بەسەر (٢١٧٤)

تۆ لەهێلکەی نوێژ جووجکەی بێنەدەر   دا مەنێ وەک تەیری بێ تەرتیب، سەر (٢١٧٥)

**بیستنی دەقووقی دەحاڵی نوێژدا شیوەن و گریان و داد و هاوار، دەنێو کەشتیەک دا،کەنیزیک بوو غەرق بێ ...**

ئەو دەقووقی بۆئیمامەت ساز بوو   بۆئیمام لەو ساحیلە، دڵخوازبوو (٢١٧٦)

جا لەدووی وی،ئەو گرووە،کردیان قیام   زیندەجوان،مەئموومو،هەڵکەوتوو،ئیمام (٢١٧٧)

نا گەهان دیتی بەچاو، دەریایی شین   جا لەدەریا هاتەگوێی وی، داد و شین (٢١٧٨)

ئـەو لـەنێو ئـەمواج دیتـی یـەک گـەمی ‌ ‌ ‌ بــوو لــەنێو دەردو بــەڵاو، ڕەنجــی یــەمی (٢٠٧٩)
هەم شەوو،هەم هەورو هـەم مـەوجی عـەزیم ‌ ‌ ‌ ئەوســێ تاریکیە،لەمــەوجیش تــرس وبــیم (٢٠٨٠)
بایـەکیش تونـد چەشـنی عیزرائیـل دەهـات ‌ ‌ ‌ ڕاست وچەپ مەوجی دەدان لێک،وەک قـەڵات (٢٠٨١)
ئـەهلی نێـو کەشـتی لەترسـان ئـەو زەمـان ‌ ‌ ‌ داد و فـــەریادیان دەچـــوو، بـــۆ ئاســـمان (٢٠٨٢)
سـینگ و بـەریان داوەبەر،چەپۆک،بەشـین ‌ ‌ ‌ کافرومولحیــد، دەبــوون مــوخلیس بــەدین (٢٠٨٣)
جـا دەگـەڵ حـەق زۆر بـەگریان ئـەوزەمان ‌ ‌ ‌ عەهــدیان کــرد زۆر بــەگیان و دڵ ئــەوان (٢٠٨٤)
چوونـە سـەجدەگشتییان، بـوون ڕووت، سـەر ‌ ‌ ‌ گـەرچی پێشـان بـوون لـە قوبڵـەبێ خەبـەر (٢٠٨٥)
ئەو کەسـەی کەبەنـدەگی پـووچ بـوو لـەلای ‌ ‌ ‌ گـەر بـەڵا، بـێ، ژیـن دەبینـێ لای خـودای (٢٠٨٦)
نـا ئومێـد مـابوون لەقـەو مـو کـەس تـەمام ‌ ‌ ‌ هـەم لەدۆستا ن هـەم لـەخاڵ و باب و مام (٢٠٨٧)
فاسـقیش ئــەو دەم دەبــوو، جــا، موتتــەقی ‌ ‌ ‌ وەک لــەکاتی مردنــی، شەخســی شــەقی (٢٠٨٨)
چــارەبۆ وان هــەر لــەهیچ لا یــەک نــەما ‌ ‌ ‌ گـەر نـەما فێـڵ، ئـەو دەمـە، وەختـی دوعـا (٢٠٨٩)
شـــیوەنوزاری و دوعاوناڵـــەی ئـــەوان ‌ ‌ ‌ دوو کــەڵێکیان چــا دەکــرد تــا ئاســمان (٢٠٩٠)
وا ئــەوانی گــاز دەکـرد شـەیتانی پەسـت ‌ ‌ ‌ ئەی بەدوو دەرد موبتەلا،ئەی سەگ پەرەست (٢٠٩١)
مـەرگ و ڕەنجـو بێـت، ئـەی ئـەهلی بـەدی ‌ ‌ ‌ عاقیبـــــەت ئـــــەو ئیتیفاقەدیتـــــەدی (٢٠٩٢)
ئەشـکتان بـێ سـوودەچونکەپاش خـەڵاس ‌ ‌ ‌ ئێوەبــۆ شــەهوەت دەبــن شــەیتانی خــاس (٢٠٩٣)
چـوو لـەبیرتا ن گـەر لـەبۆتان، هـات خەتـەر ‌ ‌ ‌ خـــوا نــەجاتی دان لـــەنێوان دەردەســـەر (٢٠٩٤)
هـەر وەهـا دەنگـی دەهـات شـەیتا ن،بـەڵام ‌ ‌ ‌ ئەوقســـەهەرخاس دەبیســـێ،نەک عـــەوام (٢٠٩٥)
ڕاسـتی فـەرموو، خـۆ، لـەبۆمان مسـتەفا ‌ ‌ ‌ قوتبـــو شاهەنشـــاهو دەریـــایی ســـەفا (٢٠٩٦)
هــەر چـی دەی بینێـت جاهیـل عاقیبـەت ‌ ‌ ‌ ئــەو دەبینــێ عاقــڵ ئــەووەڵ مەرتەبــەت (٢٠٩٧)
عــاقڵان ئــەووەڵ دەبیــنن کــاری ســیڕ ‌ ‌ ‌ تێـــدەگا ئـــاخیر، نـــەزانی زۆر موســـیڕ (٢٠٩٨)
کـار لەئـەووەڵ بـوو لـەعام و خـاس نـەهان ‌ ‌ ‌ بــۆ عمـــووم ئــاخیر دەبێــتن ئــەو، عــەیان (٢٠٩٩)
واقیعـــەی پنهـــان کـــەنابینی ئـــەتۆ ‌ ‌ ‌ ئیحتیـــاتو خـــەزمی تـــۆ هـــەرماوە،خۆ (٢١٠٠)
حـەزم، یـەعنی بـوو ن بـەدونیا بـەدگومان ‌ ‌ ‌ مونتـــەزیر بـــۆ دەردو ڕەنجـــی ناگـــەهان (٢١٠١)

### تەسەووڕاتی ئینسانی بە حەزم و ئیحتیات...

وەک ببینــێ شــێر،لەجێیەک،یەک نەفــەر ‌ ‌ ‌ ئــەو ببــا بــۆ جەنگــەڵێکی پڕخەتــەر (٢١٠٢)
چۆن دەکا بیر، ئەو دەمـەی شێر ئەو دەبا ‌ ‌ ‌ بیــرو فکــری تــۆش وەک وی بێــت، بــا (٢١٠٣)

ئیمـــەبۆ جەنگـــەڵ دەبـــا، شـــێری قـــەدەر    گیـــان خـــەریکی ســـەنعەتو کـــارو هونـــەر (٢٢٠٤)
چونکەترســـیان بـــوو لەفـــەقری، زیدەخـــەڵق    چـــوون لـــەبۆ نێـــو ئـــاوی ســـوێرجا،تاکوحەڵق (٢٢٠٥)
لـــەو خـــودای فـــەقریَ بترســـابان ئەگـــەر    گـــەنجی ژێـــر عـــەرزی لـــەبۆ، دیتنـــا نـــەدەر (٢٢٠٦)
گشت لەترسی غـەم دەچـوون بـۆ نێو غـەم    گشت لەدووی بوونو وجوودچوون بۆعـەدەم[1] (٢٢٠٧)

**دوعا و شەفاعەتی دەقووقی بۆ نەجات بوونی کەشتی ...**

چـون دەقـووقی بیسـتی ئـەو غـەوغاو هـەوار    ڕەحمـی دەبـزووت ئەشـکی چـاوی هاتـەخوار (٢٢٠٨)
جـا، کـوتی ئـەی حـەق مـەنۆڕەکاری وان    بگرەدەســـــتی وان، ببـــــەتۆ یـــــاری وان (٢٢٠٩)
تـۆ لـەبۆ سـاحیل بـەرە، زۆرخـۆش ئـەوان    تـــۆی دەدەســـتت دایەعـــەرزو ئاســـمان (٢٢١٠)
ئـــەی کـــەریم و میهرەبـــانی ســـەرمەدی    خـــۆش ببـــەلێیان، ئەگـــەر بوویـــان بـــەدی (٢٢١١)
ئـەی خـودای دات بـێ نیهایـەت،چاووگۆش    دات بەبێ ڕیشوەت بەخـەڵکی عـەقڵو هۆش (٢٢١٢)
زیـاد لەئیسـتیحقاق بەخشـیت تـۆ عـەتا    گـەر چـی دیتـت تـۆ لەئیمـە، زۆر خـەتا (٢٢١٣)
ئـــەی خـــودایی قـــادرو زانـــاو ڕەحـــیم    تۆی دەبەخشی جورمی زۆر گەو رەو، عەزیم (٢٢١٤)
ئـاگرن بـەردا، بـەحیرس و ئـاز لـەخۆن    ئـــەو دوعایەهـــەر ئـــەتۆ نـــاردت، لـــەبۆن (٢٢١٥)
بیکـەخاتر ئـەو دوعایـەی وێـت، دەدایـن    ئـەو چرایـەی تـۆ لەزوڵمـەت، پێـت،دەداین (٢٢١٦)
هـەر وەهـا دەیکـوت بەئـەزمان ئـەو دوعـا    ئـــەو دەمـــی وەک دایکـــەکانی بـــا وەفـــا (٢٢١٧)
ئـەو بەشـین و، چـوون لـەخۆ، کـردی دوعـا    تـا دوعـای وی تێپـەڕی، چـۆ سـەر سـەما (٢٢١٨)
ئـەو دوعـای دەیکـا لـەخۆ چـوو، ئـەو جـودا    ئـەو دوعـا، خـۆ، لـەو نییـە، دەیڵـێ خـودا[2] (٢٢١٩)
ئـەو دوعایـە، خـوا دەکـا، ئـەو بـوو فـەنا    ئـــەو دوعایـــەو ئـــەو ئیجابـــەت لای خـــودا (٢٢٢٠)
ئـــەو دەمـــە، ئینســـان دەنێـــوا ن دا نییـــە    جیسـم وگیـان یـەک زەڕڕەیـان، ئاگـا نییـە[3] (٢٢٢١)
بەنـــدەگانی زاتـــی حـــەق زۆر بوردبـــار    خـــووی خودایـــان لایـــەبۆ ئیســـلاحی کـــار (٢٢٢٢)
یـا وەرن، بـێ ڕیشـوەتن، هـەم میهرەبـان    وەختـــی ســـەختی هـــەم لـــەڕۆژانی گـــران (٢٢٢٣)
ئـەو گرووهەجسـتو جۆکـە، ئـەی فـڵان    پـێش بـەڵا تـۆ بگـرەزۆر زۆر قـەدری وان (٢٢٢٤)
دای نەجات کەشتی،دوعای ئەو شەخسە بەس    ئـەهلی کەشـتیش،ناجییان خـۆ،دی نەکـەس (٢٢٢٥)

---

[1] - گشت لەدووی بوونو وجوود چوون،نێو عەدەم (مصرع دوم)
[2] - ئەو دوعا، ئی وی نییە، دەیڵێ خودا (مصرع دوم)
[3] - جیسم وگیا ن هیچ ئیتیلاعیان ، لا ، نییە(مصرع دوم)

ئـەهلی کەشـتی وا دەیـان کـرد فکـرو بیـر ... هــەر لەدەســتی وان هەدەف،گرتوویــەتیر (٢٠٢٦
پـێ، دەدا ڕێـوی نــەجات، وەختــی شــکار ... ئـەو لـەکلکی خـۆی دەزانـێ، نـەک لـەغار (٢٠٢٧
زۆر بـــەکلکی خـــۆی دەکـــاتن ئیفتیخـــار ... چـون دەدا ئـەو مـن نـەجات، وەختـی شـکار (٢٠٢٨
حیفزی پێت کە،ڕێوی نەیدەی تۆ لەبەرد ... گـەر نـەبێ،پێ،کلک نـاخوا، هـیچ بـەدەرد (٢٠٢٩
ئێمـــەڕێوین و، دوو پێمـــان ئـــەو لیبـــا ... جا لەسـەت جـوور ئینتیقام دەن دەن، ڕەها (٢٠٣٠
کلکـــی ئێمەمـــەکری ئێمەئـــەی فـــلان ... عیشـق و بـازی ئێمـەبوو، بـەس کلکمـان (٢٠٣١
خـول دەدەیـن وا، کلکی ئیستیدلا لـو، مـەکر ... مــاتو واقــو وڕ دەمێــنن، زەیــد و بــەکر (٢٠٣٢
دەمهەویسـت حـەیران بکـەم عالـەم هـەموو ... ئـارەزوو شـم بـۆ خـودایی، مـن هـەبوو (٢٠٣٣
تــا بـــەفێلا ن دڵ بـــەدەس بێـــنم گـــەلێ ... نــەم دەزانــی وا دەچــاڵ دام مــن چــەلێ (٢٠٣٤
تـۆی لـەنێو کەنـداڵ و چـاڵ دا،ئـەی گـەدا ... خـۆت نـەجات دە،چیـت لەخـەڵکی دیکـەدا؟ (٢٠٣٥
گـەر بەبێستانێک بگـەی تۆ،جـوان و،خـۆش ... تۆ لەخـەڵکی بگرەدامـەن، هـەت بێ هـوش (٢٠٣٦
ئەی لەپێنج و چوارو شـەش تۆ گیرە، پێت ... خـەڵکی بۆ لای خۆت بەرە،زۆر خۆشەجێت (٢٠٣٧
ئـەی تـۆ چار وێدار وجێگـەت دووی کـەرە ... جێگــەماچت دەس کەوت،ئێمــەش بــەرە (٢٠٣٨
تۆ کەنـەت بـوو هـیچ لـەلوتفی خـوا خەبـەر ... مــەیلی شــاهیت تــۆ لــەکوێ ڕا هاتەســەر؟ (٢٠٣٩
بـەو ئومێدە،خـەڵکی تەحسـین کـەن ئـەتۆ ... یــەک تــەنافت خستەئەسـتۆی گیـانی خـۆ (٢٠٤٠
کلکـی فێـڵ ئـەی ڕێـوی، بێڵـە، تونـد بـڕۆ ... وەســڵی دڵپاکــان بکــەتۆ، قــەلبی خــۆ[1] (٢٠٤١
خـۆ لـەلای شـێران،غەزای چـاک زۆرە،زۆر ... تـۆ لـەبۆ منـدار مـەڕۆ، ئـەی ڕێـوی بـۆر (٢٠٤٢
لوتفی حـەق ئـەی دل،چکاتێک دێ،لەبۆت؟ ... گـەر وەکووجوزوێـک بـڕۆی لای کـوللی خـۆت[2] (٢٠٤٣
حــەق دەڵــێ مــەنزووری مــن تــەنها، دڵــە ... چــیم لەســوو ڕەت دا،کەهــەر ئــاوو گڵــە؟ (٢٠٤٤
تۆ دەڵەی من ئێستەقەلبی خۆ م بەدەست ... دڵ لەژووری عەرشە، نەک جێگایی پەست (٢٠٤٥
ئـاوی لێـڵ و تـار لــەقوڕ پەیـدا دەبــێ ... ئـەو بـەلام بۆدەسـت نـوێژان کـوا دەبـێ؟ (٢٠٤٦
ئـا و لــەنێو قــوڕ، بـا هەبێ،مەغلووبــەخۆ ... جـا، دڵـی خـۆت قـەت مـەڵێ بـەو،دڵ، ئـەتۆ (٢٠٤٧
ئەو دڵـەی کـەجێی سـەماوات، سـەر سـەرە ... ئــەو دڵــی ئەبدالــە، یــا پێغەمبــەرە (٢٠٤٨
ئــەو لــەقوڕ خــاوێن بووەوەســافی بــووەوە ... زێـدەیی ئـەو دەس کـەوت، وافـی بـووە (٢٠٤٩
تـەرکی کـرد ئـەو قوڕ،لـەبۆ دەریـا دەهـات ... بـوو بـەدەریا،بووی لەحەپسـی قوڕ،نـەجات (٢٠٥٠

---

[1]- وەسڵی دڵپاکان بکە، قەلبت ئەتۆ (مصرع دوم)

[2]- کەی دەبێ نازیر خودا ، ئەی دڵ بەتۆ؟ گەر وەکوو جوزوێک بڕۆی لای کوللی خۆ

ئاوی ئێمەحەپسی نێو قوڕ، دا، وەرە    بەحری ڕەحمەت، ئێمەبۆ لای خۆت بەرە (٢٢٥١)
یەم دەڵێ دەت هێنمەڕاس نێو باوەشم    تۆ بەڵام بێژی کەئاوم بێ غەشم (٢٢٥٢)
ئیددیعای وا، تۆ دەکا مەحرووم،جا    بێرەلای من قەت مەکە، تۆ فکری وا (٢٢٥٣)
ئاوی قوڕڕاو، ویستی بۆ دەریا بچێ    پێی دەگرت قوڕ، نەیدەهێشت ئەو تا بچێ (٢٢٥٤)
گەر نەجات داتن لەقوڕ ئاو، لاقی خۆ    قوڕ دەبێ وشک و،دەبێ ئاو، سەر بەخۆ (٢٢٥٥)
ئەو دەمەی کە، ئا و لەقوڕ بیبێ نەجات[1]    شەربەتی نایاب و نوقڵت پێدەگات (٢٢٥٦)
هەر وەها هەر شەهوەتێکی نێو جیهان    جا، چ ماڵ بێ، یا مەقام بێ، یانە، نان (٢٢٥٧)
مەس،دەبێ گەر بێ دەگەڵ ئەوهانە،یار    گەرکو نەت بن،تۆ دەبێ غەمگین،خومار (٢٢٥٨)
وا خوماری غەم دەلیلی دا بەدەست    ئەو شتەی تۆ دات لەدەست، تۆی کرد مەست (٢٢٥٩)
لەو بەئەندازەی لزووم، بۆ خۆت بەرە    تا نەبینی ئەو لەسەر تۆ، سەر وەرە (٢٢٦٠)
تۆ بەمەغرووری کوتت، ساحەب دڵم    من لەئەغیار بێ نیازم، واسڵم (٢٢٦١)
وەک دەکاتن ئاوی نێو قوڕ، والەگاز    ئاوی سافم من بەکەس نەم بوو نیاز (٢٢٦٢)
تۆ لەلات دڵ والەپیسن، ئەی فلان    نا عیلاج تۆ، لا دەنێی، ساحەبدڵان (٢٢٦٣)
بۆ دەبێ دڵ ئەو هەبێ پێت،ئەی بەهۆش    عاشقی هەنگوینوشیرو،چێشتی خۆش (٢٢٦٤)
لوتفی شیر و ئەنگەبین جێگای دڵە    هەرچی خۆشی بێت، دەدڵدا، حاسڵە (٢٢٦٥)
دڵ دەبێتەجەو هەرو عالەم عەرەز    سێبەری دڵ، چۆن دەبێ بۆدڵ غەرەز؟ (٢٢٦٦)
گەر دڵێک عاشق بەجاهو ماڵەئەو    یا نەخێر، بۆ ئاوو قوڕ، بێ حاڵەئەو (٢٢٦٧)
یا خەیا لا تێک، دەنێو زوڵمات دا    چادەکا بۆ خۆی لەوان، مەعبوود جا (٢٢٦٨)
دڵ دەبێ دەریایی نوور بێ ئەی فلان    مەنزەری خوایەدەبینێتن، نیهان (٢٢٦٩)
نینەدڵ نێو سەت هەزارن خاس وعام    یەک دەبێ تەنها،دەڵەم بۆت ئەی بەفام (٢٢٧٠)
دڵ تەڵەب کە، قەلبی چووکە، لابەرە    تا دەبن،چووکان بەکێو، لەو سەروەرە (٢٢٧١)
دڵ موحیتەخۆ لەنێو خیتتەی وجوود    زێڕ دەبەخشێ ئەو لەبەر ئیحسان و جوود (٢٢٧٢)
لەو سەلامەی دای بەوی گەر کردگار    چاک دەکا بۆ ئەهلی عالەم ئەو نیسار (٢٢٧٣)
هەرکەسێکی دامەنی ئامادەبێ    فەیزی دڵ لەو دامەنەی دا، جا دەبێ (٢٢٧٤)

---

[1]- جیم مەڕام بوو ئاولەقوڕ بیبێ نەجات؟ (مصرع اول)

دامـــەنی تـــۆ هـــەم نیازەهـــەم حـــزوور   دا مـــەنی لـــەو دامەنـــە، ســـەنگی فجـــوور (٠٠٠٥)
تاکونـــەدڕن دامـــەنی تـــۆ بـــەرد و ســـەنگ   تـا کو لێکیـان جیابکـەی تۆ نەقد و، ڕەنگ (٠٠٠٦)
دا مـــەنت پـــڕ کـــرد بەبـــەردان خۆشـــحاڵ   پـڕ لەبـەردی زێـڕ و زیـو، هـەر وەک منـاڵ (٠٠٧٧)
چون خەیاڵ بوو تۆ لـەلات بـوون زێـڕ و زیو   دامـــەنی ســـیدقت دڕا، غـــەم بوونـــەکیو (٠٠٠٨)
کـوا عەیانـــەبۆ منـــاڵان ســـەنگ ســـەنگ؟   تاکونـــەگرێ عـــەقڵ، دامـــەنیان بەچـــەنگ[1] (٠٠٠٩)
پیـــر بەعەقڵەنـــەک ســـپی بـــێ مـــوویی ڕوو   جێـــی نییەتـــەنها، لـــەلای ئیقبـــاڵ مـــوو (٠٠١٠)

## موخالەفەتی ئەو گرووهە بە دوعا و شەفاعەتی دەقووقی و ون بوونی وان لەبەر چاوان و موتەحەییرمانی دەقووقی کە چوونە حەوا یا زەوی؟

گـەر نـەجاتی هـات کەشـتی لەوهـەراس   ئەوگرووهـەش بـوون لـەنوێژی خۆ،خـەلاس (٠٠٨١)
سرتەسـرتیان کـرد دەگـەڵ یـەکتر ئـەوان   ئـــەو فزوولـــە، کێیـــەلامان؟ بابـــەگیان (٠٠٨٢)
یـەک بەیـەک لێکیـان دەکردهەرئەوسـوئال   بوودەقـــووقی پشـــت بـــەوان،وەختی مـــەقال (٠٠٨٣)
یـەک بەیـەک جوابیـان دەدا پێکتـر ئـەوان   مـن کەنـەم کـرد جـا، چ زاهیـر یـا نیهـان (٠٠٨٤)
یـەک کـوتی مـن پـێم ئیمامـە، ئـەو ئـەوا   وەک فـــزوول کـــردی موناجـــاتو دوعـــا (٠٠٨٥)
ئێکی دیش دە یکوت منیش وام بوو، نەزەر   هـەرئیمام کـردی دوعـا لای خـوای لەسـەر (٠٠٨٦)
چـون دەدڵـدا هـەیبوو ئـێش و، ئینقیبـاز   کـردی لـەو موختـاری موتڵـەق ئیعتیـراز (٠٠٨٧)
گـەر تەماشـای پشـتەخۆم کـرد، مـن ئیمـام   تـا بـزانم چـی دەڵـێن پێـک، وان کیـرام (٠٠٨٨)
نـەم دەدی هیچ یـەک لـەجێی خۆیان،بەچاو   چـون ئـەوان ڕۆیبـوون لـەجێی خۆیـان تـەواو (٠٠٨٩)
ڕاست و چەپ نۆڕیم لەوان، هـەم ژێروژوور   نەم دەدی هیچ یەک لەوان نیزیـک و دوور (٠٠٩٠)
وەک بڵەی دوڕ بوون ئەوان گشت بوونەئاو   نـەم دەدی جـێ لاقـو، نـەم دی تـۆز بـەچاو (٠٠٩١)
چـوون لـەبۆ ئاسـمانی حـەق لێکـرا هـەموو   کامەگوڵشـــەن جـــا، لـــەبۆ وان جێگـــەبوو (٠٠٩٢)
مـــاتو حـــەیران مـــام لـــەکاری کردگـــار   بـــۆ ئـــەوانی کـــرد لـــەچاوم، نادیـــار؟ (٠٠٩٣)
جـا لـەپێش چـاوی وەهـا، ون بـوون بەجـەم   وەک دەچـن ماسـی لـەبۆ نێـو ئـاوی چـەم (٠٠٩٤)
مـەیلی وانـی مـا، هـەتا مـا، ئـەو بـەدین   شـەوقی وان بـوو دای بـەوی تـا، مـا، گـرین (٠٠٩٥)
گـەر بڵـەی تـۆ پیـاوی خـوا چـۆن وا دەکـا   زیکـری کـەس تێکـەڵ بـەزیکری خـوا دەکـا (٠٠٩٦)
لێرەفکـــرت گیـــر دەکـــا تـــۆ ئـــەی فـــلان   چون ئەوەی دیتت بەشەربوو، نەک گییان[1] (٠٠٩٧)

---

[1]- تا عەقڵ نەگرێت دامەنیان بەچەنگ (مصرع دوم)

بێرەکارت لێ خەرا بوو، ئەی نەفام — چون ئەوانت تۆ بەشەر دی، وەک عەوام (٢٢٩٨)
تۆش وەهات دی، چەشنی ئیبلیسی لەعین — من لەئاگر ئەو کوتی، ئادەم لەتین (٢٢٩٩)
چاوی ئیبلیسیت ببەستە، تۆ، دەمێ — لابەسوورەت، ڕوو کەمەعنا، هەر کەمێ (٢٣٠٠)
وێک دەقوو‌قی هەربەچاوی چەشنی جۆ — تۆ، بەدائیم هەر ئەوان کە، جستوجۆ (٢٣٠١)
جستوجۆکە، ڕوکنی ئیقبالْ جستوجۆ — دڵ کەگیرا دوایەشادیت دێ ئەتۆ[2] (٢٣٠٢)
هەڵگرەدەستت لەگشت کاری جیهان — چەشنی فاختە، بێژەکوکو، ئەی فڵان (٢٣٠٣)
چاو،ئەلەوباسەی کە،چاک،ئەی موحتەجیب — بۆدوعای وابەستەکردحەق(استجب) (٢٣٠٤)
هەرکەسێ نەیبێ دڵی وی ئیعتیلال — هەر دوعای بیکا، د ەچێ لای (ذی الجلال ) (٢٣٠٥)

**جارەکی دیش باسی ئەو کابرایەی کە دوعای بۆ ڕزق و ڕۆزی حەڵاڵ کرد بێ کەسب و ڕەنج، لە زەمانی حەزرەتی داود(ع) و قەبووڵ بوونی دوعای وی ...**

هاتەبیرم داستانی ئەو فەقیر — ڕۆژ و شەو بۆ شین و گریان، بوو ئەسیر (٢٣٠٦)
ئەو لەخوای داوا دەکرو ڕۆزی حەڵاڵ — بێ شکار و دەرد و ڕەنج وکەسبی ماڵ (٢٣٠٧)
من لەپێش دا حاڵی ویم کەم کرد، بەیان — ئەو لەنێو داستانی دیکەبوو نەهان (٢٣٠٨)
بێت دەڵەم ئێستاکەئەو،چی هات،بەسەر — هەوری فەزلی حەق ڕژاندی بۆ ی،ئەگەر (٢٣٠٩)
ساحەبی گاو، دیتی دەیکوت ئەی فلان — تۆ بەناحەق لێت دەکوشتم گاوی جوان (٢٣١٠)
بێنم بڵێ بۆچیت دەکوشت تۆ گایەکەم؟ — ئەی نەفامی ساریقی ئینساف کەم (٢٣١١)
دای جەواب ڕۆزیم دەویست لای بێ هەواڵ — قوبڵەشم جوان کرد، بەشین و ناڵەناڵ (٢٣١٢)
ئەو دوعای کۆنم لەمن بوو موستەجاب — ڕزقی من بوو، بۆیەکوشتم بێ خیتاب (٢٣١٣)
تووڕەبووگرتی بەرۆکی وی،بەزوو — چەند مستی سەختی لێدا، ئەو لەڕوو (٢٣١٤)

**چوونی هەردووک تەرەف بۆ لای داود پێغەمبەر(ع)...**

ڕێدەکێشا تاکو لای داود نەبی — زوو کەدەی ئەی زاڵمی گێژی غەبی (٢٣١٥)
حوججەتی سست لا بەتۆ ئەی فێڵەباز — بێنەنێو تەن عەقڵ و هۆشی دڵخواز (٢٣١٦)
فکری بێ سوودی دوعا، تۆ لابەرە — قەت من و خۆت مەگرەتۆ، بۆ مەسخەرە (٢٣١٧)

[1]- چون ئەوانت ، تۆ بەشەر دی ، نەک گیان (مصرع دوم)
[2]- دڵ کەگیرا دوایەشادیت دێ ، لەبۆ(مصرع دوم)

دای جەواب، زاری و دوعام کرد، لای خودا　　زێـدەخواردم خـوێنی دڵ، لـەو ڕێگـەدا (۳۱۸-
لێم یـەقین بـوو گـەر قـەبووڵ بـوولێم، دوعـا　　تـۆش لەبـەردی ڕەق بدە،سـەر،ئەی دەغـا (۳۱۹-
کـۆ وەبـن دەیکـوت، موسـەڵمانان، بـەعام　　چـاو دەڵـێ چـی پـێم، نـەزانی دوور لـەفام (۳۲۰-
ئـەی موسـەڵمانان وەرن خـاتری خـودا　　چـۆن دەکاتـەماڵی خـۆی، مـاڵم، دوعـا؟ (۳۲۱-
گـەر دوعـا ئەستاندبای مـاڵ، خـۆ یـەقین　　مـاڵی یـەکتریان دەبـرد، عالـەم، بـەکین (۳۲۲-
گـەر وەهابا،گشـت گـەدایانی فـەقیر　　ساحەبی سـەروەت دەبـوون و، هـەم ئـەمیر (۳۲۳-
چـون دوعایـان ڕۆژوشـەو وا بـوو گـەدا　　پـێن بـدەتۆ ڕزق و ڕۆزی ئـەی خـودا (۳۲۴-
دان وبەخشیش تۆدەکەی نەک هیچ کەس　　حـەللی موشـکیل تۆدەکـەی تەنهاوبـەس (۳۲۵-
کەسبەبۆکوێران دوعـا، نـەک هـیچ کـەس　　لێـوی نانیـان دێتـەدەس تـەنهاو بـەس (۳۲۶-
خـەڵکی کوتیـان ئـەو موسـەڵمانە، حەقـە　　ئـەو فـەقیرە، زاڵمێکـی موتڵەقـە (۳۲۷-
کـوا دوعـا مـوڵکی کەسێکی زیـاد دەکـا؟　　کـوا شـەریعەت باسی وا، قـەت یـاد دەکـا (۳۲۸-
ڕێـی وەکـوو بـەیع و وەسـییەت یاعـەتا　　موڵک و سەروەت پێت دەدا خۆ، نەک دوعا (۳۲۹-
کـام کتێبـی شـەرعە، تێیـدابێ ئـەوە؟　　یانەزینـدا ن یانەگاکـەی، وێـدەوە (۳۳۰-
ئـەو لـەئا سمان ئـەودەمی کـردی نـەزەر　　غـەیری تۆ،خـۆ، بـوون لـەحاڵمان بێ خەبـەر (۳۳۱-
دات دەنـا تـۆ، نێـو دڵـی مـن ئـەو دوعـا　　سـەت ئومێـدت خستەقەلبم ئـەی خـودا (۳۳۲-
نـەم دەکـرد بێهوودەخـۆ مـن، ئـەو دوعـا　　چەشنی یووسوف دیتبووم خـەو نـی سـەفا (۳۳۳-
دی لەخـەو یووسـوف هـەتاوو، ئەختـەران　　دێنو سـەجدەی بۆ دەبەن، وەک نۆکەران[1] (۳۳۴-
ئـەو بەخـەونی سـادقی بـوو ئیعتیمـاد　　هەم لەزیندان هەم لەچاڵ هەر بووی لەیاد (۳۳۵-
ئیعتیمـادی چونکـەبوو نـەی بـوو، چ غـەم　　بێت غـولام یـا بێت مـەلام یـا زۆر و کـەم (۳۳۶-
وا بەخـەونی خـۆی هـەبوو ئـەو ئیعتیمـاد　　وەک لەلای وی بێت شەمعێک ڕوونو شاد (۳۳۷-
ئەو دەمەی کە، خستییان یووسوف لەچاڵ　　هاتـەگوێی وی، دەنـگ، لـەزاتی بـێ هـەواڵ (۳۳۸-
ڕۆژەکـی دێ، شـا، دەبـی، ئـەی پاڵـەوان　　ئـەو جەفایـەش تـۆ دەدەی نیشـان، بـەوان (۳۳۹-
سـاحەبی ئـەو دەنگەنایـەت، بـەر نـەزەر　　دڵ ئـەوی ناسـی بـەڵام، چـون دی ئەسـەر (۳۴۰-
ئیعتیمـادو ڕاحـەتیو، نیـرووی بـەوی　　دا، نـەدا، هـات،بۆی لـەخوای بـاڵاو نـەوی (۳۴۱-
چـاڵ لـەبۆ وی بـوو، بەئـەو دەنگـی جـەلیل　　گوڵشـەنێ خـۆش، چەشنی ئاگر بـۆ خـەلیل (۳۴۲-

---

[1]- دی دەخەو یووسوف، کەتاوو، ئەختەران　　دێن و سەجدەی بۆ دەبەن وەک نۆکەران
دی لەخەو یووسوف، ستێران هەم هەتاو　　دێن و سەجدەی بۆ دەبەن، گشتیان بەتاو

ـ ئەپاشـان هـەرچی بـۆی هاتبـا جـەفا ... ئـەو قـەبووڵی بووبەشـادی هـەم سـەفا (٢٣٤٣)
ۆ:ک مەزەی دەنگی( ئەلەست)،خۆ هەردەبێ ... نێـو دڵـی مـوئمین هـەتا مەحشـەردەبێ (٢٣٤٤)
ـا نـەیان بـێ بـۆ بـەڵایان ئیعتیـراز ... تـا لەئـەمری حـەق نـەیان بـێ ئینقیبـاز (٢٣٤٥)
ۆقمـەیی فـەرمانی حـەق گـەر بێـت تـاڵ ... خـۆش دەکا ئەوگوڵشـەکەر، لای بی هـەواڵ (٢٣٤٦)
هەرکەسێ مـەحرووم ببێ لـەو گوڵشـەکەر ... هـەرچی بیخـوا، قـەی دەکـا، جـا، دیتـەدەر (٢٣٤٧)
هەر کەسێ دیتی خـەوی ڕۆژی( ئەلەست) ... ئەولـەڕێی تاعـاتی حـەق،بوو مەست مەست (٢٣٤٨)
ـر دەبـا وەک وشـتری مەسـت، زۆرگـران ... بـێ مـەلال و بـێ فتـوورو بـێ گومـان (٢٣٤٩)
ئەو کەفەی تەسدیق کە،کۆ بوو، دەوری زار ... بـوو بەشـاهید ئەوکەمەسـتە، بـێ قـەرار (٢٣٥٠)
وشتریش وەک شێری نێر، پڕ زۆر بـوووە ... ئـەو لـەژێر بـاری گـران، کـەم خـۆر بـوووە (٢٣٥١)
ـەو لەشـەو قـی ناقـەزۆر برسـی دەبـوو ... کێو لەپێش وی، ئەو دەمی، وەک تاری موو (٢٣٥٢)
ێو( ئەلەست)خـەونی وەهای گەریـەک، نەدی ... خـۆی لـەدونیادا موریـد، بـێ شـەک،نەدی (٢٣٥٣)
گـەر مریـدیش بایـە، هـەیبوو شـک گـەلێ ... سـاڵەکی ئـەو موعتـەریز، شـاکر چـەلێ (٢٣٥٤)
ئـەو بەشـک دەڕوا لـەنێو ڕێگـایی دیـن ... ئەو بەسەعت شک دادەنێ، پێ، نەک یەقین (٢٣٥٥)
ـەرحی ئەو هەم ماوەنەمکوت ئەو هەلەی ... تـۆ (الـم نشـرح) بخوێنەگـەر پەلـەی (٢٣٥٦)
ـەرحی ئـەو مەعنایـە نیتـی ئینتیهـا ... سـاحەبی گـا، چـی بەسـەرهات، دا خـودا (٢٣٥٧)
ئـەو کـوتی کـوێرم، دەزانـێ ئـەو دەغـا ... وەک بلیس کردی قیياس، ئەو، ئەی خودا (٢٣٥٨)
جەشنی کوێران من دوعام کەم کردووە؟ ... حاجـەتم لای غـەیری خوا،کـوا،بردووە؟ (٢٣٥٩)
کوێر دەکەن داوا لەخەڵکی، بەس بەجەهل ... مـن لـەتۆ، بـەس تـو دەکەی دیـژوار سەهل (٢٣٦٠)
کوێرە، ئەمنی دی بـەکوێر، نـەک چاوی باز ... نـەی دەدی ئـیخلاس و ڕووحـم هـەم نیـاز (٢٣٦١)
کـوێری عیشقم،کوێری چاونیم ئـەی بەفەڕ ... ئەی حەسەن،حوب،کوێردەکاچاو،گویش کەڕ (٢٣٦٢)
کـوێر لەحاسـتی خـەڵکم و، بینـام بەحـەق ... بێژەئەوهـە، عیشـق وای بـوو، موسـتەحەق (٢٣٦٣)
مـەمزمێرەتۆ، لـەکوێران ئـەی خـودا ... دەوری لـوتفی تـۆ دەسـووڕێم،وەک گـەدا (٢٣٦٤)
هەر وەکوو خـەونت بەیووسو ف دا نیشان ... خـەونی ویـت کـرد، تـۆ لـەبۆ وی پشـتیوان (٢٣٦٥)
ـوتفی تۆش خۆ خـەو نـەکی دا مـن نیشان ... ئەو دوعای دەمکرد دروست بوو،بێ نیشان (٢٣٦٦)
نەیـدەزانی هـیچ کەسـێ ئەسـراری مـن ... دوور لەسوود بوو لای عمووم گوفتاری من (٢٣٦٧)
حـەققی وان بـوو گـەر نـەزانن ڕازی غـەیب ... غەیری خوای زانا بەسیر، سەتتاری عەیب (٢٣٦٨)
خەسـم پێیکـوت ڕوو لـەمن کەئـەی فـڵان ... حـەق بڵـێ تۆ، بـۆچی ڕووت کـرد ئاسمان؟ (٢٣٦٩)

خۆت بەزاهیر باش دەکەی، فێڵ تاکو کەی؟    لافی عیشق و لافی قوربەت لێدەدەی (۳۷۰-

تۆ، بەکام ڕوو، چونکەقەلبت مردووە    ڕووت لەلای گشت ئاسمانان کردووە؟ (۳۷۱-

کەوتەشار، غەو غاو هەرا، لەو باسەجا    ئەو موسەڵمان ڕووی لەسەر خاک دادەنا (۳۷۲-

ئەی خودایا، تۆ ئەمن ڕیسوا، مەکە    گەر بەدیش بم ڕازی من، پەیدا مەکە (۳۷۳-

خۆت دەزانی گەر شەوان تا کوسەحەر    هەرئەتۆم داوا دەکرد، ئەی خوای لەسەر (۳۷۴-

گەرکوعالەم هیچ بەمن قەدریان، نەدا    وەک چرای ڕوونم لەلای تۆ، ئەی خودا (۳۷۵-

## بیستنی داود(ع) قسەی هەردووک تەرەفان و سوئال کردن لە(مدعی علیە)...

گەر لەخەڵوەتخانەداوود هاتەدەر    لێیدەپرسین ئەو لەهەردووکان، خەبەر (۳۷۶-

موددەعی دەیکوت بەداوود، ئەی بەناو    گایەکەم، چۆ ماڵی ئەو هەی، زۆر بەتاو (۳۷۷-

گایەکەی کوشتم بپرسە، لێی ئەتۆ    گای فلانەت تۆ کەکوشت، ئاخر، لەبۆ؟ (۳۷۸-

پێیدەکوت داوود بڵێ ئەی خۆش مەرام    بۆ چی کوشتت گای،کەبۆتۆ، بووحەرام؟ (۳۷۹-

دەی دەلیل تۆ، بێژەبۆ من ئاشکار    تا تەوا و بێ ئیددیعاو غەو غاوو، کار (۳۸۰-

دەیکوت ئەی داوود،کەبوو مەحەوت ساڵ    دائیمەن دەمکرد دوعا،لەو خوایەسواڵ (۳۸۱-

وام دەکرد داوا لەیەزدان، ئەی خودا    پێم بدەڕۆزی حەڵاڵ و بێ عەنا (۳۸۲-

پیا و ژن ئاگان،کەدەمکرد، ناڵەناڵ    واسیفی حاڵم، لەکووچان دا، مناڵ[1] (۳۸۳-

پاش دوعای وا زۆرو گریان و، فیغان    دیم لەماڵی خۆم،گایەک نا گەهان (۳۸۴-

تۆ لەهەر کەس دەت هەوێ تەحقیق بکە    تا بڵەن پێت وەک دەڵەم من،یەک یەکە (۳۸۵-

ئاشکراو پنهان بپرسە، تۆ، لەخەڵق    چی دەکوت ئەو بێ نەوایی ژەندەدەڵق؟ (۳۸۶-

چاوی من تاریک دەبوو، نەک بۆ غەزا    شاد دەبووم،من،چون قەبووڵ بوو، لێم دوعا (۳۸۷-

گایەکەم کوشت من بەشوکری خوای جیهان    چون دوعای کردم قەبووڵ،ئەو ڕازدان (۳۸۸-

## حوکم دانی داود (ع) بە زیانی کابرای فەقیر کە گایەکەی سەربڕی بوو...

پێیدەکوت داوود کەبەس تۆ وا بڵێ    تۆ دەلیلی شەرعی بۆ دەعوا بڵێ (۳۸۹-

کوا ڕەوایەعا دەتێک من دابنێم    ئیحتیرامی موڵکی خەڵکی لا بنێم؟ (۳۹۰-

کێ بەتۆی دا؟ تۆ کڕیت یا واریسی؟    دەت هەوێ مەحسوول،مەگەر تۆحاریسی؟ (۳۹۱-

---

[1]- حاڵی من تەو سیف دەکەن یەک یەک مناڵ (مصرع دوم)

ؤ:ک زەراعـەت وایـە، مامـە، کەسب و کار — تـا نــەچێنی دەغــڵ و دان،نایــەت بــەبار (۲۳۹۲)

ـەرچی چانـدت، تـۆ درووت، ئـەو مـاڵی تۆ — وا نەکــەی گــەر، زاڵمــی، بــەدحاڵی تــۆ (۲۳۹۳)

ؤ:و. موســەڵمانەی دەوە، تــۆ مــاڵ، تــەمام — تــۆ مــەڵی باتــڵ، کەنــەت بــوو بگــرەوام (۲۳۹۴)

پێیدەکوت هەر وا، ئـەتۆش ئەی،شا، دەڵـەی — چـی دەڵـێن پـێم، زاڵمـان، تـۆش وا، دەڵـەی (۲۳۹۵)

## ناڵاندنی کابرای فەقیر لە قەزاوەت و داوەری داود (ع)...

کردی سـەجدە، جـا کوتی ئـەی خوایی مـن — بیخەقـــەلبی داودی، ئـــای وایـــی مـــن (۲۳۹۶)

تــۆ هــەمان ســۆزی لەقــەلبم دات دەنــا — تــۆ لەقــەلبی ویــش دانــی، ئـەی پــەنا (۲۳۹۷)

شــین و گریــانی لەپاشـــان، وادەکـــرد — قـەلبی داوود، شـین، لـەجێی خـۆی لا دەبـرد (۲۳۹۸)

پێیـدەکوت ئــەو ڕۆ بەسـاحەب گایەکــە — مــۆ لـــەتم دە، ئێســـتەگا، داوا، مەکـــە (۲۳۹۹)

تا دەچـم مـن نـوێژ دەکـەم، بـۆ بـێ نییاز — جـا، دەپرسـم حـاڵ، لـەوی، زانـا بـە، ڕاز (۲۴۰۰)

چون دەنوێژ دا،بەس بەخوا م کرد ئیلتیفات — وایــە مانــای (قــرة عینــی فــي الصــلات) (۲۴۰۱)

ڕەوزەنــەی ڕووحــم ســەفا دەیکــات واز — نامــەبۆم دێ، موســتەقیم لای بــێ نییــاز (۲۴۰۲)

نا مـە، هـەم بـارانی نـوور، لـەو ڕەوزەنـەم — دیتــەنیو مــاڵی دڵــم، لــەو مەعدەنــەم[1] (۲۴۰۳)

دووزخــە، ماڵێــک کەنــەیبێ ڕەوزەنــە — دڵ کەنــەیبێ ڕەوزەنــە،کوا ڕەو شــەنە؟[2] (۲۴۰۴)

کــەم بدەتیشەلەبیشــە، ئــەی خــەنی — تیشــەلێدە، تـــاکو ڕەو زەن، هەڵقـــەنی (۲۴۰۵)

یانــەنازانی کـــەنووری ڕوونـــی تـــاو — عەکســی تـاوی بـێ حیجابەئـەی بـەناو (۲۴۰۶)

نـوور کەحـەیوان دیتـی خـۆ پێـت نوورەتـۆ — چـاو لــە(کرمنــا بنــی ئــادم ) لــەبۆ؟ (۲۴۰۷)

چەشـنی تـاوم، غـەڕقی نـوورم، وا ئــەمن — ناکرێـت فـەڕقم دەگـەڵ نـوور، جـا ئـەمن (۲۴۰۸)

مـن دەچـم بـۆ نوێژوبـۆ خـەڵوەت، هـەتا — فێـر بکــەم خــەڵکی لــەبۆ ڕێگــای خــودا (۲۴۰۹)

خـوار دەڕۆم تـا ڕاس بـڕۆن خـەڵکی جیهـان — جــەنگ، فێــڵ و حیلەیــە، ئــەی پاڵــەوان (۲۴۱۰)

گــەر کــو دەســتوور هاتبــا بــۆ داوودی — تۆز دەهات، لەو بەحری ڕازی سەر مەدی (۲۴۱۱)

هــەر وەهــا داوود، دەیکـوت لــەو نەســەق — عـەقڵی خـەڵکی کـەم دەما،لـەو موحتـەڕەق (۲۴۱۲)

یەک نەفـەر کێشای لەپشت ڕا، ئەو دەمی — ئــەو قسـانەت مـن قەبووڵمە،سـەر جـەمی (۲۴۱۳)

هـات وەخـۆ ئـەو دەم قسـەی کۆتـا دەکـرد — لێـوی بەسـت و ڕووی دەخـەڵوەتگا،دەکرد (۲۴۱۴)

---

[1]- دیتەنیو ماڵی وجوود لەو مەعدەنەم (مصرع دوم)

[2]- ئەسڵی دین ، ڕەو زەن لەدڵ، واز کردنە(مصرع دوم)

### چوونە خەڵوەتی داود(ع) بۆ ئاشکرابوونی حەقیقەت ...

دەرکی قایم کردو ڕۆی، زوو،ئەو جەناب ڕووی لەمیحراب کرد،دوعای بێ موستەجاب (۴۱۵-
هەرچی لازم بوو،بەوی کوت حەق، تەمام لێی عەیان بوو، موستەحەققی ئینتیقام (۴۱۶-
ڕۆژی دوا، هاتن عموومی دوژمنان جا لەلای داوود،بەسەف، وێستان، ئەوان (۴۱۷-
هەر وها، ئەو ماجەرا، تیکرار بوو موددەعی بۆ گفتی بەد، زۆر هار، بوو (۴۱۸-

### حوکم و قەزاوەت کردنی داوود بەزیانی ساحەبی گا، کەدەست لەگا، هەلگرە و قسەی ناحەز کوتنی ساحەبی گا، بەداود (ع)...

پێیدەکوت داود مەڵی زیاتر بڕۆ زوو حەلاڵ کە، ئەو موسەڵمانە، ئەتۆ (۴۱۹-
ئەی جەوان چون حەق، لەبۆی پۆشی بەدی بەس کە، ئیدی حەققی سەتتار،بێنەدی (۴۲۰-
ئەو کوتی،چۆن حوکمی وا ئیجرا دەکەی؟ شەرعی تازەم تۆ مەگەربۆچا دەکەی؟ (۴۲۱-
شۆرەتی عەدڵت وەها چۆ نێو جیهان بوو موعەتتەر لەو، زەمین و ئاسمان (۴۲۲-
بۆ سەگی کوێریش نەبوو وا جەورو دەرد زوڵمی وا زۆر لەت دەکاتن کێوو،بەرد (۴۲۳-
ئاشکرا دەیکوت قسەی زۆر نا لەبار چاو، ئەلەو زوڵمەی، کرا لێم، ئاشکار (۴۲۴-

### حوکم و قەزاوەت کردنی داود بە زیانی ساحەب گا، کە تەواوی ماڵی خۆت بدە بەو کابرایە

جا، لەپاشان پێیدەکوت داود،کەزوو بیدەبەو، تۆ هەرچی ماڵت بێ، هەموو (۴۲۵-
پێم کوتی گەر وانەکەی بۆت سەختەکار زوڵمی کردت لێت دەبێ، بەو، ئاشکار (۴۲۶-
ئەو یەقەی دەدڕاند و[1]، خۆڵی کرد وەسەر زوڵمی تازەم[4]، دەمبەدەم، بۆ دێنیەدەر (۴۲۷-
ناحەزی کوت موددەعی زۆر،ئەو هەلەش بانگی لای خۆی کرد داود، ئەو چەلەش (۴۲۸-

---

۱- دەدڕیوو ، (مصرع اول)

۴- زوڵمی زیدەم ، (مصرع دوم)

بێیدەکوت چون تۆ، نەبوو، بەختت بەیار | زوڵمی مەخفیت کەمکەمە، بوو ئاشکار (٢٤٢٩)
تالبی بۆ سەدر و، پیست کرد، خۆ | حەیفەبۆ وەک تۆ کەرێ، خۆ، کاوو، جۆ (٢٤٣٠)
گشتیان لێکرا، ژن و منداڵی تۆ | بوون بە، بەندەی وی[1]، مەڵێ زیادی، برۆ (٢٤٣١)
ئەو بەبەردان دای لەسینگی خۆی،بەدەست | ئەولەبەرجەهلی دەچۆ، باڵا وو،پەست[2] (٢٤٣٢)
خەڵکی هاتن کردیان داود، مەلام | چونکەغافڵ بوو ن لەئەسڵی کار، تەمام (٢٤٣٣)
کوا دەناسێ زاڵم و مەزڵووم،کەسێ | ئەو ئەسیر بێ بۆ هەوا،هەر وەک خەسێ؟ (٢٤٣٤)
زاڵم و مەزڵووم عەیانن، لای ئەوە | گەر لەنەفسی زاڵمی، سەرکردەوە (٢٤٣٥)
خۆ دەنا ئەو زاڵمی نەفسی دەروون | دوژمنی مەزڵوومە، چون هەیتی جنوون (٢٤٣٦)
سەگ فەقەت حەملەی دەبا،بۆ بێنەوا | دەیگرێ دەیکا برینـدار، بێ دەوا (٢٤٣٧)
شێر، حەیا و شەرمی هەیە، سەگ وا نییە | شێر لەجیران سەیدی قەت داوا نییە (٢٤٣٨)
جا، عەوام و،خەڵکی خواهانی بەدی | چەشنی سەگ هاتن لەبۆ لای داودی (٢٤٣٩)
ڕوو لەداودیان دەکرد جا گشت ئەوان | ئەی پەیامبەر، ئەی لەبۆ مان، میهرەبان (٢٤٤٠)
خۆ، شیاوی تۆ نەبوو ئەو زوڵمی فاش | بێ گوناهێکت کەکرد مەحکووم، بەلاش[3] (٢٤٤١)

## تەسمیم گرتنی داود (ع) بۆ دەعوەت کردنی خەڵکی بۆ سەحرای موشەخخەس تا ڕاز ئاشکرا کا،وەدەلیلان بەسووڕەتی قەتعی سابیت بکا ...

جا کوتی داود بەوان ئەی دۆست و یار | وەختی وەی هات ڕاز ببێتن ئاشکار (٢٤٤٢)
گشتو، هەستن تا بڕۆین لێکرا، بەعام | تا عەیان بێ، ڕازی پنهان، لێن، تەمام (٢٤٤٣)
نێو فڵان سەحرا هەیە، دارێک قەوی | زۆر لکی هەن، موتەسیل پێک،سەر نەوی (٢٤٤٤)
زۆرقەوین جا، خەیمەگاهو، میخی وی | بۆنی خوێن دێتن لەریشەو بیخی وی (٢٤٤٥)
یەک نەفەرکوژرا لەژێر ئەو داری سەخت | سەرەوەری خۆی کوشتووەئەودوور لەبەخت (٢٤٤٦)
حیلمی حەق بۆی دا دەپۆشی ئەو سوڕە | ئاشکرا بوو، ناشکوری کرد، ئەو کوڕە (٢٤٤٨)
قەت عەیالی سەروەری خۆی ئەو نەدی | هەم لەنەو ڕۆژ هەم لەجێژنا نی دەدی (٢٤٤٩)
ئێستەبەس بۆ تاقەگایەک، ئەو لەعین | چاو دەکا منداڵی وی چەن زۆر، غەمین (٢٤٥٠)

---

1- بوونەبەندەی وی ، (مصرع دوم)

2- بۆ هەدەف بۆ بەردی دەس خۆی، سینگی وی | ئەو لەبەر جەهلان دەچۆ، باڵاو نەوی

3- خۆ نەبوو قابیل بە تۆ ئەو زوڵمی فاش | بێ گناهێکت دەکرد مەحکووم ، بەلاش

ئەو لەبۆ خۆی لای دەبرد،پەردەی گوناه[1] — دای دەپۆشی خۆ، دەنا، بۆ وی، ئیلاه (٥١)
فاسق وکافر لەهەر دەوروزەمان — لادەبەن پەردەی گوناهی خۆ، ئەوان (٥٢)
نادیارە، زوڵمی نێو ئەسراری گیان — دای دەنێ زاڵم، لەپێش خەڵکی جیهان (٥٣)
چاک تەماشام کەن، هەمن، شاخ بێ ژمار — جا ببینن گاوی دووزەخ ئاشکار (٥٤)

**گەواهی دانی دەست وپێ و، زبان لە سەر ڕاز و سیرڕی زاڵم، دە دونیاش دا ...**

جا، لەدونیاش، دەست و پێ وەک زاری تۆ — شاهیدن بۆ باتینی نادیاری تۆ (٥٥)
زوڵمی پنهان گەر موسەللەت بوو بەتۆ — پێت دەڵێ ئەسرار بڵێ تۆ، سەر بەخۆ (٥٦)
خاسسەئەو دەم گەرکو ئینسان،تووڕەبوو — ڕاز دەکاتن ئاشکرا ئەو موو، بەموو (٥٧)
گەر ببێژن هەر دەمی زوڵم و جەفا — ئاشکرا کەن، ئێمە، دەی، ئەی دەست و پا (٥٨)
جا، چلۆن ئەعزا گەواهنابن بەعام؟ — خاسسەوەختی تووڕەبوون، ئینتیقام (٥٩)
ئەو کەسەی مەئمووری وا،جا،جا دەکا — پەرچەمی ڕازان، لەدەشت،بەر پا،دەکا (٦٠)
چا دەکا مەئمووری دیکەش، ڕۆژی حەشر[4] — تا بکەن ڕازو سوری پنهان نەشر (٦١)
ئەی ئەوەی کردت گەلێ زوڵم و گوناه — جورمی تۆ زاهیر لەتۆ دا، بێ گەواه (٦٢)
نی ئەتۆ، موحتاج کەزوڵمت، بێ شەهیر — چون دەبینن ئاگرت دانا، زەمیر (٦٣)
نەفسی تۆ زاهیر دەکا هەردەم شەڕار — خۆی دەڵێ من، فەردەکی، ئەسحابی نار (٦٤)
من دەچم بۆ کوللی خۆم، جوزئم لەنار — نوور کەنیم تا من بڕۆم لای کردگار (٦٥)
هەر وەکوو ئەو زاڵمی هیچ حەق نەناس — کردی بۆ یەک دانەگا، زۆر ئیلتیباس (٦٦)

[1]- بەس بەخۆی ئەو لای دەبرد پەردەی گوناه(مصرع اول)

[4]- چا دەکا مەئمووری دیش ئەو ڕۆژی حەشر (مصرع اول)

ۆشترو گای لێ ستاند هەر دووک،بەسەد    نەفسی ئەممار وا یەنەت وێ،تا ئەبەد (٢٤٦٧)

قەت لەلای حەق شیوەنو زاری نەکرد    لەفزی یا ڕەببی، بەسۆز، جاری نەکرد (٢٤٦٨)

دوژمنی من شاد بکەتۆ، ئەی خودا    سوود بدەبەو، گەرچی زیانم، بەو دەدا (٢٤٦٩)

گەرخەتام کوشت،خوێن بەها دەیدەن کەسان    کەس،لەبۆم ڕۆژی(الست)تۆی، خوای جیهان[1] (٢٤٧٠)

بەرد بەتۆ نادا، بەئیستیغفاری دوڕ    ئەو هەیە، ئینسافی نەفس، ئەی گیانی حوڕ (٢٤٧١)

**چوونی خەڵکی بۆ لای ئەو دارە...**

گەرکو چوون بۆلایی ئەو داری قەوی    پێکەوتن داوود، ببەستن دەستی وی (٢٤٧٢)

تا گوناهو جورمی وی پەیدا بکەم    پەرچەمی عەدڵم لەدەشت،بەرپا، بکەم (٢٤٧٣)

پێکوت ئەی سەگ،جەددی ئەوهەت کرد فەنا    بووی بەسەروەر،تۆ غوڵام بووی،خۆ دەنا (٢٤٧٤)

سەر وەری خۆت کوشتو، بردت ماڵی وی    ئاشکرای کرد زاتی یەزدان، حاڵی وی (٢٤٧٥)

ئەو ژنەت بۆ وی کەنیز بوو، تا هەبوو    سەوەری خۆتان جەفا دا، دوو بەدوو[2] (٢٤٧٦)

هەرچی منداڵ بوو لەوی، نێر یانە، مێ    گشت لەبۆ واریس، بەتۆ ناگا کەمێ (٢٤٧٧)

تۆ غوڵامی، کەسب و کارت ماڵی وی    تۆ، بکەبۆ شەرعی ویستت، سەر نەوی (٢٤٧٨)

سەروەری خۆت کوشت بەنا حەق،بێ سەدا    زۆرلەتۆی ویست بەوئەمان دەی،پێت نەدا (٢٩٧٩)

کاردەکەت تۆ دا دەنا زوو، ژێرخاک    چونکەهەتبوو تۆ خەیاڵی سامناک (٢٤٨٠)

هەم سەرو، هەم کارد، ئێستا ن،ژێری خاک    جستو جۆ کەن ئەو زەمینە، ئێوەچاک[3] (٢٤٨١)

کارد نێوی ئەو سەگەی حەک بوو لەسەر    وای بەسەروەرئەو،گەیاند مەکرو زەرەر (٢٤٨٢)

عەردیان هەڵقەندو خۆلیان کرد، بڵاو    ژێر زەمین ئەو کاردو سەریان دی، بەچاو (٢٤٨٣)

کەو تەنێو خەڵکی هەمان کات، وەلوەلە    زۆر قەوی بوو ئیعتیقادیان، ئەو چەلە (٢٤٨٤)

جا لەپاشان پێیدەکوت، داد خواز، وەرە    بگرەڕوو ڕەش، داد و، حەققی خۆت بەرە (٢٤٨٥)

**دەستوور دانی داود بە قیساسی کابرای قاتڵ پاش ئیسبات و ئیتمامی حوججەت لە سەر وی**

ئەمری کرد بەو تیغەبیکەن ئەو قیساس    مەکری وی نایکا لەئەمری حەق خەلاس (٢٤٨٦)

گەر چی زۆرەسەبرو حیلمی کردگار    ئەو دەکاتن زوڵمی بێ حەد تارو مار (٢٤٨٧)

گەر بەناحەق خوێن ڕژا، ناچێ هەدەر    جستو جۆی قاتڵ دەکا، هەر هۆش لەبەر (٢٤٨٨)

---

[1] - خزمی من ڕۆژی(الست ) تۆی ، خوای جیهان (مصرع دوم)

[2] - زۆر جەفاو دا ، سەر وەری خۆو، دوو بەدوو (مصرع دوم)

[3] - ئێوەئێرەهەڵقەنن ئێستاکەچاک (مصرع دوم)

وای دەویـــتن حـــوکمی زاتـــی کردگـــار[1] رازی وا، بـــۆ هـــەر دلـــێ، بـــێ ئاشـــکار (۴۸۹-
چۆنـەداخوا ئـەو فلان، چـی هـات بەسـەر؟ وەک لـــەگوڵزار ســـەبزەوو، گـــوڵ دیتـــەدەر (۴۹۰-
جۆششـی ئـەو خوێنـەبوو، خـۆ جسـتو جـۆ وەسوەســەی قــەلبان و بــەحس و گفتــو گــۆ (۴۹۱-
چونکـــەڕازی وی دەبـــوو ئاشـــکار تـــەمام مـــوعجیزەی داود دەبـــوو مـــەعلووم لـــەعام (۴۹۲-
خـەڵق، هـاتن گشـتی سـەر ڕووت، لایـی وی چوونەســـەجدەکردیان جـــا، ســـەر نـــەوی (۴۹۳-
کوێری ئەسـڵی ئێمـەبووین خـۆ ئـەی نـەبی سەت عەجیبمان دی لەتۆ هەر بووین غـەبی (۴۹۴-
بـەرد، لەگـەڵ تـۆ هاتەباسـو، گفتـو گـۆ بگرەبـۆ کۆمـەک بـەتالوو ت مـن، ئـەتۆ (۴۹۵-
قــۆ چــەقانی وبــەرد، ســێت هینــا بــەکار ســەت هــەزاران پیـاوی جـەنگیت دا، فـەرار (۴۹۶-
سـەت هـەزاران پـارەبوون هـەر سێک بـەرد هــەر یەکــەی جــا، دوژمنێکــی دا، لەعــەرد (۴۹۷-
بـوو لەدەسـتی ئێـوە ئاسـن چەشـنی مێـو گــەر زرێ،چــابوون، دەبــوو مــەعلووم لێــو (۴۹۸-
کێو دەگەڵ تۆ هـەم سەدا بوو،هـەم شـەکوور گەردەگـەڵ تۆ،بـوون بەخوانەنـدەی زەبـوور (۴۹۹-
ســەت هــەزاران چــاوی دڵ، دەکــران واز بەو دەمی تۆ، بوون موهەییای غـەیب و ڕاز (۵۰۰-
مــوعجیزەی زۆر قــائم و محکــەم لــەوان ژیــن دەبەخشــێ، ئــەو بەئینســان جاویــدان (۵۰۱-
ئـەو هەیـەخۆ، ئەسـڵ و ڕووحـی موعجیزات گــەر بــەمردوو، ژینــی دائـیم کـا خــەلات (۵۰۲-
زاڵمێـــک کـــوژرا جیهانێـــک هـــات ژیـــا یـەک بەیـەک، دیسـان دەبوو ن بەنـدەی خـودا (۵۰۳-

**بەیانی ئەو مەتڵەبە کە نەفسی ئینسان لە جێی ئەو ئینسانەیە کە ئیددیعای گای دەکرد، ئەوەی کە گایەکە دەکوژێ عەقڵە، و داود، حەققە یا شێخە، کە نائیبی حەققە، بە قووەتو یاری حەق ئەو تەوانایە، بە کوشتنی زاڵم، و دەوڵەمەند بوون بەبێ کەسب و بێ حیساب...**

ژیـــن بـــدەدونیا، بکووژەنەفســـی خـــۆ قـــــاتڵی ڕووح، نەفســــــە، بیکەبەنـــــدەتۆ (۵۰۴-
نەفســـی تـــۆ یەئیـــددیعایی گـــا، دەکـــا خــۆی بــەزاهیر ســەر وەر و ئاغـا دەکـا (۵۰۵-
عـەقڵی تۆیـەگا یەکـەی کوشـت، دەی بـڕۆ قـاتڵی گـای تـەن مەکـە، ئینکـار ئـەتۆ (۵۰۶-
عەقڵەیەخسـیر، دەیهـەوێتن ئـەو لەحـەق ڕزقـی بێ ڕەنج،نیعمـەتی زۆر، سـەر تەبـەق (۵۰۷-

---

[1]- وای تەقازا کرد، حوکمی کردگار (مصرع اول)

ڕزقی بێ ڕەنجی ئەویت، بەستەی، چ دی؟    گا بکووژی،چونکە،گا، ئەسڵی بەدی (٢٥٠٨)

نەفس، بێژیت بۆچی کوشتت گاوی من؟    گاوی نەفس و نەقشی تەن چون وێک دەچن (٢٥٠٩)

چەشنی سەر وەر زادە، عەقڵە، بێ نەوا    نەفسی قاتڵ بوو بەئاغاو، پێشەوا (٢٥١٠)

ڕزق و ڕۆزی بێ مەشەققەت،ئەی کیا    قووتی ئەرواح،ڕزق و ڕۆزی ئەنبیا (٢٥١١)

ئەرتەقوربان بێ لەبۆ و ەی، گاوی تەن    گەنجی پنهان،زۆر لەنێو ئەوگایە، هەن (٢٥١٢)

دوێ شەوێم خوارد من غەزایەک، خۆ دەنا[1]    من زیمامم، دەستی فامی تۆ دەنا (٢٥١٣)

من کوتم خواردم شەوێ دی، وا، نییە    هەر چی دێ بۆمن لەلای یەزدانییە (٢٥١٤)

چاوەکەم نابێ لەبۆ ئەسبا ب، واز    چونکەفێر بوو ئەو لەچاو جوانان، ناز (٢٥١٥)

غەیری زاهیر، هەن سەبەب زۆر، ئەی جەوان    تۆ مەنۆڕەزاهیری، بڕوانەوان (٢٥١٦)

ئەنبیا لای وان سەبەب، بێ ئیعتبار    موعجیزاتیان کرد لە کەیوان ئاشکار (٢٥١٧)

بێ سەبەب دەریا لەبۆ وان بوو بەخاک    بێ زەڕاعەت هات لەبۆ وان گەنمی پاک (٢٥١٨)

بوو بەئاردی زێدەجوان بۆ وان خیز    مویی بزنیش بوو بەئا و ریشمی تەمیز (٢٥١٩)

گشتی قورئان باس دەکا قەتعی سەبەب    عیززەتی دەر وێش هیلاکی بوو لەهەب (٢٥٢٠)

تەیری بابیلی فڕێدا،یەک دوو بەرد    لەشکری گەورەی حەبەش گشت،کەوتەعەرد (٢٥٢١)

بەردی تەیری ئاسمان غەوغا دەکا    فیلی گەو ڕە،کون کون و، ڕیسوادەکا (٢٥٢٢)

کلکی گا، دانێ لەسەر مەقتوو ل ئەتۆ    دێتەبەر وی گیان دەکا، جا،گفتو گۆ (٢٥٢٣)

شەخسی مەقتوو ل ڕاپەڕی جا، وا دەکا    ئەولەقاتڵ خوێتی خۆی دا وا دەکا (٢٥٢٤)

خۆ لەقورئا ن هەرلەئەووەڵ تا تەمام    تەر دی ئەسباب،تەردی عیللەت وەسسەلام (٢٥٢٥)

عەقڵی مەشغووڵ کوانێ کەشفی وا دەکا؟[3]    ئەو هەزانی، بەندەگی بۆ خوا دەکا (٢٥٢٦)

کەو تەزیندانی خەیاڵات، فەلسەفی[5]    شەهسەواری عەقڵی عەقڵە، خۆ سەفی (٢٥٢٧)

---

[1]- من شەوێ دیم خوارد، غەزایەک خۆ، دەنا (مصرع اول)

[3]- عەقڵی مەشغووڵ کەشفی وا جا کوا دەکا؟ (مصرع اول)

[5]- بەندی مەعقوولات بوو خۆ فەلسەفی (مصرع اول)

عــەقڵی عــەقڵت مەغزە،پێســتەعەقڵی تــۆ    پێســـت خووازە،مەعـــدەیی حـــەیوان خـــۆ (٢٠٢٨)
مـەغز خـواز دائـیم لەپێسـت خـۆی لا دەدا    مـــەغز بـــۆ پاکـــان حەڵاڵـــە، خـــوا دەدا (٢٠٢٩)
عــەقڵی جــوزئی ســەت دەلیلیشــی هــەبێ    عـەقڵی کـول، قـەت بێ یـەقین نـاڕوا، لـەجێ (٢٠٣٠)
عــەقڵی جــوزئی دەفتــەران زۆر ڕەش دەکـا    عــەقڵی عــەقڵ،ئافاق ڕوونــو، گــەش دەکـا (٢٠٣١)
ئـەو لەهـەر جـی بێ سپی و ڕەش، فاریغـە    نـــووری مـــانگی وی لەســـەر دڵ، بازیغـــە (٢٠٣٢)
ئـەو سـپی و ڕەش قـەدرییان، گـەر پێـدرا    لـەو شـەوی قـەدرە، کەڕوونـە، وەک چـرا (٢٠٣٣)
زێــڕ بەهەنبانـــەو بەکیس،قـــەدرێ،دەدات    زێڕ نـەبێ گەر،هـەر دوو بێ سوودن لـەلات (٢٠٣٤)
هـەر وەکوو تـەن، قـەدری وی بـەس گیان دەدا    قـــەد ری گیانیش،پەڕتـــەوی یـــەزدان،دەدا (٢٠٣٥)
گــەر کــو زیندوبایــە، بــێ پەڕتــەو، گیــان    کافری بۆ ( میتون ) کوت خـوای جیهان؟ (٢٠٣٦)
بێژەتــۆ، جـــا، ناتیقـــە، جـــۆ چـــا دەکـــا    بـۆ ئــەوەی دێ دوایــە، ئــاو ئیجــڕا دەکـا (٢٠٣٧)
ڕەهنەمای خۆی با هەبێ، گشت کات و ئان    گفتـی ڕابـردوان دەکـا کـۆ مـەک بـەوان (٢٠٣٨)
چاو لەتەو ڕات هـەم لەئینجیل هـەم زەبوور    بوون گەواهی سیدقی قورئان ئەی شەکوور (٢٠٣٩)
تـۆ تەڵـەب کـە، ڕزقـی بێ ڕەنج بێ ژمـار    تـا لەجەننـەت، بێنـێ جـەبریل، بـۆت هـەنار (٢٠٤٠)
بەڵکـەڕزقێک دێ لەلایــەن خــوای جیهــان    بــێ غــەزا، بــێ زەرع و، ڕەنجــی باغـــەوان (٢٠٤١)
چونکەسـوودی نـان، لـەنان، عـەدڵی خـودا    بێ سـەبەب ئـەو سـوودو نەفعـەت پێدەدا (٢٠٤٢)
نەقشی نان وەک سفرە، لەززەت مەعنەوی    نـان بـەبێ سـفرە، وەلـی بـەهرەی لـەوی (٢٠٤٣)
ڕزقی ڕووح کـەی پێـت دەدا، سەعیو تـەلاش؟    غـەیری عـەدڵی شـێخ و ەکـوو، داوود بـاش (٢٠٤٤)
نەفسی تۆ،تۆی دی، دەگەڵ شێخت ئەگەر    ڕام دەبـێ بـۆ تـۆ لـەبێ، تـا تـۆقی سـەر (٢٠٤٥)
ســاحەبی ئەوگایـــەڕام بـــوو ئـــەو دەمـــی    گـــەر کوئاگـــابوو، لـــەداوودو دەمـــی (٢٠٤٦)
گـەر دەگـەڵ شـێخ عـەقڵی تـۆ بێـتن بـەیار    نەفسی سەگ مەغلووب دەکا، وەختی شکار (٢٠٤٧)
نـــەفس، ئەژدیهایـــەزۆری فـــەن هەنـــە    چاوی بـەو ڕووی زومـڕودی شێخ هەڵقەنـە (٢٠٤٨)
بت هەوێ گەر نەفسی خۆت کەی، تۆ زەلیل    لێیـــدەنـــەقیزە، بچـــێ بـــۆ لای دەلیـــل (٢٠٤٩)
ئـەو دەمـەی نیزیـک لەدۆستی خـوا دەبـێ    ئـەو زبـانی سـەت گـەزی، کـۆ تـا دەبـێ (٢٠٥٠)
سەت زەبان و سـەت لوغـەت بوو، هـەر زەبان    مـەکرو حیلـەی وی کـەناکرێن قـەت بـەیان (٢٠٥١)
نەفس وەک ئەو موددەعی گاو، زۆر فەسیح    سەت هەزار حوججەت دەڵێ ئەو نا سەحیح (٢٠٥٢)

ئــەو دەدا خــەڵکی فریــو بــەس شــا، نــەبێ	ون دەکــا، ڕێ لــەو کەســەی ئاگــا نــەبێ (٢٥٥٣)
نــەفس بــووی تەســبیح و قورئــان،نێو یــەمین	خــەنجرو شەمشــیری بــوون، نێــو ئاســتین (٢٥٥٤)
موســحەفو، سالووســی وی، بــاوەڕ مەکــە	خۆت دەگەڵ وی هەمسیرِو هەم سەر مەکە (٢٥٥٥)
تــۆ دەبــا بــۆ لایــی حــەو زێ، بــۆ وزوو	تــۆ دەنێــو ئەحــەو زەداوێ، زوو بــەزوو (٢٥٥٦)
عــەقڵی نــوورانی گــەلێک چــاک تاڵبــە	نەفسی تاریک چـۆن بەسـەر وی غاڵبـە؟ (٢٥٥٧)
چـون لـەماڵی خۆیەئـەو، عـەقڵیش غـەریب	سەگ لەدەرکی خۆی، وەکوو شێری مەهیب (٢٥٥٨)
ســەبرکە، شــێر بچتەبێشــە، ئــەو دەمــی	دەبنەمـەقهوور گشـت سـەگی کوێرو عـەمی (٢٥٥٩)
مــەکری نــەفس و تــەن لەعالــەم نادیــار	وەحیــی قەلبەئــەو دەکــاتن، تــارو مــار (٢٥٦٠)
جینسی وی هەرکەس کەبێ، ئەو یاری وی	غــەیری وەی داوود بیــێ هــەمکاری وی (٢٥٦١)
چـون ئـەوەی گـۆڕا، لەجینسـی تـەن جـودا	دیـار کـرا جێگـای لـەلای دڵ، لای خـودا (٢٥٦٢)
گشـتی عالـەم بـوون دەبـاتین دا نـەخۆش	دەتهـەوێ مـەعیووب، کەمـەعیووب بی، ئەتۆش (٢٥٦٣)
هەرخەســێ دەعــوایی داوودی دەکــا	موعتەقیــد بــەو، ڕوو دەنــابوودی دەکــا (٢٥٦٤)
دەنگی تـەیری بیست لەڕاوچی،تـەیری خـاو	هــەڵفڕی بــۆ ئــەو تــەرەف، نەیــدیوە، داو (٢٥٦٥)
عیلمــی حــاڵو قــال نــەزانێ، ئــەو غــەوی	لادەلـەو، تـۆ، گـەرچی گفتـی، مەعنـەوی (٢٥٦٦)
فـەرقی گیـاو فـەرقی جـەماد ئـەو،کوا دەکا؟	هـەر لەشـک دا گـەر یـەقین دەعـوا، دەکـا (٢٥٦٧)
شەخســی والەگــەرچی ژیــری موتڵەقــە	چونکــەبێ شەخســییەتە، زۆر ئەحمەقــە (٢٥٦٨)
جـا، لەبـەر وی ڕاکـە، وەک ئـاهوو لەشـێر	قـەت مـەچۆ لای وی ئـەتۆی زانـا و دلێـر (٢٥٦٩)

**هەڵاتنی عیسا(ع) بۆ لای کێو لە دەستی ئەحمەقان ...**

**خولاسەی داستان ...**

حـەزرەتی عیسـا (ع) بەپەلـەبۆ لای کێوێـک هەڵـدەهات، شەخسـێک لـەو حاڵـەدا ئـەوی دی وپێیکـوت وا بەپەلـەبۆ کـوێ هەڵدێی؟چونکەئـەمن لەپشـت سـەری تـۆهیچ نـابینم نەشـێرێک نەدرِندەیەک نەدوژمنێک ..حەزرەتی عیساپێیکوت ئەمن لەدەست ئینسانی ئەحمـەق هەڵدێم، ئەو شەخسەزۆر بەدیققەت لێی پرسی مەگەر ئەتۆ ئەو هەموو کوێرو عاجزو نەخۆشەت چا نەکردۆ تەوە؟ مەگەر ئەتۆ نەبوو ی کەئەو هەمووموعجیزانەت ئیجراکردن،وخەڵک مات و سەر سام مـان؟ ئێستا کەئـەو هـەموو قودرەتـەت هەیـە، ئەحمـەقانیش عاقـڵ کـە..حـەزرەتی عیسـا فەرمووی.. بەڵێ ئەمن بەو نەفەسی گەرمی ئیلاهی خۆم توانیومەکەمردوانیش زینـدوو بکەمـەوە،

**بەڵام هەرچەند زۆر جاران ئینسانی ئەحمەقم نەسیحەت کردووەنەسیحەت و پەندی من هیچ تەئسیری نەبووە، جا کەوایەئەی پرسیار کەر تۆش لەدەست ئەحمەقان هەڵێ ...**

تونـد دەچووعیسـا لـەبۆ کێوێـک بـەغار | وەک لەدووی بێ شێرەکی خوێنخۆری هار (۲۵۷۰)
یـەک بـەدووی دا توند هـەلات، پێیکوت ئـەتۆ | هـیچ کەسـت لـەدوا نییەهەڵـدێی لـەبۆ؟ (۲۵۷۱)
هەڵـدەهات ئـەو زۆر بەتونـدی، زۆر پەلـە | نـەیتوانی بـەو جـەواب دا، ئـەو چەلـە (۲۵۷۲)
یەک دوو مەیدان چوو بەدووی عیسا بەدەو | جـا بەجیـددی بـانگی عیسـای کـرد ئـەو (۲۵۷۳)
لەحزەیـەک ڕا وەسـتەتۆ،خاتر ی خـودا | ئـەو هەڵاتنـەت، موشـکیلێکی پـێم دەدا (۲۵۷۴)
بـۆچ، لـەبۆ ئـەو لایەهەڵدێی،ئـەی ئـەمین؟ | شێرو دوژمـن تـرس و بیم، لەدوات کەنین (۲۵۷۵)
دای جەواب،هەڵـدێم لەبەرئەحمـەق، وەهـا | لێم گـەڕێ تـا خـۆم لـەدەس وی کـەم،ڕەها (۲۵۷۶)
پێیکـوت ئـاخر تـۆ مەسـیحا، نـی مەگـەر؟ | چادەکـەی کوێروکـەڕان بـێ دەردەسـەر (۲۵۷۷)
دای جـەواب، بـا، پێیـدەکوت ئـەو شایە، نی | بوو ی بەجێی ئەفسوونو ڕازی خوای غـەنی؟ (۲۵۷۸)
ئـەو فسـوونەت گـەر لـەمردوو خوێنـدبا | ڕا دەبـوو ئـەو تونـدو تـۆڵ هـەر چەشـنی بـا (۲۵۷۹)
دای جـەواب، با، پێیدەکوت ئەی چەشنی دوڕ | تۆ نـەبووی چاکت دەکـرد تـەیران لـەقوڕ؟ (۲۵۸۰)
دای جەواب، با، پێیدەکوت ئەی ڕووحی پاک | هەرچی بت وێ،تۆ دەکەی بێ ترس و باک (۲۵۸۱)
بـەو دەلیلانـەی هـەتن، کـوا وادەبـێ؟ | یـەک نەفـەر دوژمـن لـەبۆت، پەیدا دەبێ؟ (۲۵۸۲)
دای جـەواب عیسـا بـەزاتی زولمینـەن | خـالقی ئەبـدان و گیـانیش پـێش بـەدەن (۲۵۸۳)
هـەم بـەزات و هـەم سـیفاتی پـاکی وی | گـەر سـەماوات بـوون گریبـان چـاکی وی (۲۵۸۴)
ئـەو فسـوونەم خوێنـد بۆکـوێرو کـەڕان | چـا دەبـوون، لایـان نـەما، دەردی گـران (۲۵۸۵)
مـن لەسـەر کێوم دەخوێند کێو بوو شکاف | خەڕقەکـەی جیسـمی دڕی ئـەو تـا کونـاف (۲۵۸۶)
من لەسەر مردووم دەخوێند ئەو بوو،بەحەی | هـەم لەسـەر لا شـەیء،خوێدم بـوو بەشـەی (۲۵۸۷)
بۆ دڵی ئەحمـەق ئـەوم خوێنـد سـەت هـەزار | زەڕڕەیـەک دەرمـان نـەبوو ئـەو نـا بـەکار (۲۵۸۸)
لای نـەدا لەوخوویەقـەت، ئـەو بوو،بەبـەرد | بوو بەخیز،لەو شین نەبووهیچ،وەک لەعەرد (۲۵۸۹)
پێیـدەکوت بـۆچی لـەوێ نێـوی خـودا | سوودمەند بـوو، بۆچی لێرەی سوود نـەدا؟ (۲۵۹۰)
لا دەبـاتن ڕەنجـی ئـەمراز، جـا دەوا | بـۆ چـی ڕەنجـی ئەحمـەقی، نـا بـا، دەوا؟ (۲۵۹۱)
جـوابی داوەڕەنجـی حـومقێ، قـاری خـوا | ڕەنـج وکـوێری نینـەقار، بـەل ئیبتـیلا (۲۵۹۲)
ئیبتـیلا ڕەنجێکـەڕەحمی دێ لـەدوو | ئەحمـەقی ڕەنجێکـەزەخمی پێوەبـوو (۲۵۹۳)
داغـی خوایـەمۆری کـرد گـەر دای لەکـەس | نـاتوانێ کـەس بـەرێتن بـۆ وی، دەس (۲۵۹۴)

تۆ لەبەر ئەحمەق هەڵێ، عیساش هەڵات　　سوحبەتی ئەحمەق دەکا، وێران وڵات (٢٥٩٥)

چاو، کەکەمکەم ئاوێ دەدزێتن، هەوا　　ئەحمەقیش دەدزێت دینی تۆ وەها (٢٥٩٦)

لادەبا گەر مایی تۆ، سەردی دەدا　　وەک کەسێکی قوون وەسەر بەردی دەدا (٢٥٩٧)

کوا هەڵات عیسا لەترس و بیم بوو؟　　ئەو ئەمان بوو، بەس لەبەر تەعلیم بوو (٢٥٩٨)

گەر کوسەرما پڕ بکا ئافاق بەجەم　　بۆ هەتاوی ڕوون کەنابێ خۆ، چ غەم (٢٥٩٩)

**داستانی ئەهلی سەبا و حەماقەتی وان و ئەسەر نەکردنی نەسیحەتی ئەنبیا بۆ ئەحمەقان...**

هاتەبیرم باس بکەم ئەهلی سەبا　　لەو دەمی ئەحمەق، سەبایان، بوو وەبا (٢٦٠٠)

چەشنی شارێک زۆر عەزیم و ئا وەدان　　باس دەکەن لەو، چی منداڵ دەو ناوەدان (٢٦٠١)

زیکری ئەفسانان لەلا یان، چەشنی قەند　　زۆر دەنێو ئەفسانەیان دا، ڕازو پەند (٢٦٠٢)

زۆر دەڵێن منداڵ دەنێو داستان درۆ　　گەنج تەڵەب کە، بەس لەنێو، وێرانەتۆ (٢٦٠٣)

شارەکی گەو ڕەو عەزیم بوو ئەو، بەڵام　　هەر بەقەد یەک دانەکاشی بوو زەلام (٢٦٠٤)

زۆر عەزیم بوو زۆر درێژ بوو زۆر بەرین　　زۆر قەوی، ئەندازە،یەک پیوازیەقین (٢٦٠٥)

خەڵکی دەە شار کۆ وەبوون دەو شارەدا　　گشتیان بوون سێ نەفەر پیس، بەد ئەدا (٢٦٠٦)

بوو دەوێ دا بێ ژمارجا، خەڵکی زۆر　　گشتیان بوون سێ کەسی خام، موفتەخۆر (٢٦٠٧)

گەر کو نەیبێ گیان،مەیلی خوای لەسەر　　با هەزاران زێدەبن، هەر نیو نەفەر (٢٦٠٨)

یەک لەوان کوێر بوو بەڵام دەیدی لەدوور　　لای سولەیمان کوێر دەیدی، لاقی موور (٢٦٠٩)

دووەمی کەڕ، زۆر بەگوێیان سووک بوو　　ئەو لەگەنج بێ بەش، لەزێڕی پووک بوو (٢٦١٠)

سووەمی ڕووت و ڕەجالو، بێ لیباس　　بووی دەبەردا، یەک درێژ دامەن کراس (٢٦١١)

کوێر کوتی هات لەشکرێکی بێ ئەمان　　مەن دەبینم کێن و چەندن جا، ئەوان (٢٦١٢)

کەڕ کوتی مەن دەنگی وانم دێتەگوێ　　سرتە، هەم ئاشکار دەبیسم جوێ بەجوێ (٢٦١٣)

ڕووت کوتی ترسم هەیە، بێن چەشنی مەست　　ئەو درێژی دامەنم، دەن بەر مقەست (٢٦١٤)

کوێر کوتی ڕاکەن کەهاتن گەینەجێ　　با نەیەت بۆمان برین و، بەندی پێ (٢٦١٥)

کەڕ کوتی یاران دەبیسم هەمهەمە　　دێن دەبن نیزیک لێمان،کەمکەمە (٢٦١٦)

ڕووتەدەیکوت دامەنم دەبڕن لەبن　　بۆ تەماع، خۆ، نیمەئەمنییەت ئەمن (٢٦١٧)

هاتنەدەر هەرسێ، بەجێیان هێشت شار　　ڕوو بەرەو دێیەک، ئەوان کردیان فەرار (٢٦١٨)

هاتەدەستی وان لەدێ، مورغێک قەڵەو　　چونکەکز بوو نەیبووگۆشت،یەک زەڕڕەئەو (٢٦١٩)

مورغی مردووی وشکی ژێر نووکی کەلاغ ئێسکی لاوازو زەعیف، هەر وەک پەناغ (٢٦٢٠)
خواردیان لەو هەر وەکوو شێران لەڕاو تێر دەبوون لەو خواردنەوەک فیل، تەواو (٢٦٢١)
هەرسێ خواردیان لەو مریشکەبوون سەمین چەشنی سێ فیل زۆر زەلام،پانو، بەرین (٢٦٢٢)
هێن سەمین و گەو رەبوون هەر یەک لەوان[1] چووکەبوو، بۆ جێگەژینی وی جیهان (٢٦٢٣)
گەر چی زۆر گەورەو زەلام بوونو قەڵەو هەر لەقەڵشی دەرکەچوونەدەر، بەدەو (٢٦٢٤)
ڕێگەبۆ مەرگی خەلائیق مەخفییە چونکەڕێگای مردنێ، مەحسووس نییە[3] (٢٦٢٥)
جا بەدووی یەک دا خەلائیق ڕێز دەبوون لەو قەڵەشتی نادیاری دەر کەچوون (٢٦٢٦)
ئەو قەڵەشتەی کەس نەدیوە،گەورە، چووک زۆر دەرۆن ئەمما بەویدا،تازەبووک (٢٦٢٧)

**شەرحی ئەو کوێری دوور بین و ئەو کەڕی گوێ سووک و ئەو ڕووتی دامەن درێژ...**

کەڕ تەمەعکارەکەدونیای زۆر دەویست مەرگیخەڵکیدیتوبیست،ئی خۆی نەبیست (٢٦٢٨)
کوێر حەریسێکەدەبینێ موو بەموو عەیبی خەڵکی زۆر دەڵێ ئەو بۆ هەموو (٢٦٢٩)
عەیبی خۆی ئەو لێ دیار نین خۆ،چ کات گەرچی جستو جۆ لەعەیبان، زۆر دەکات (٢٦٣٠)
ڕووت دەترسێتن کەببڕن دامەنی کێ لەڕووت دەبڕێت دامەن،بێ غەنی؟ (٢٦٣١)
پیاوی دونیا موفلیسەهەم زێدەکز گەرچی بێ ماڵەدەترسێ ئەو لەدز (٢٦٣٢)
ئەو بەڕووتی هات بەڕووتیش دەچتەدەر لێی دەبێ بەخوێن لەترسی دز،جگەر (٢٦٣٣)
وەختی مەرگیش گەر دەگێڕن شین، لەبۆی پێکەنینی دێت ڕووح، لەو ترسی خۆی (٢٦٣٤)
تێدەگا بێ زێڕەئەو دەم، پووڵدار تێدەگا نیتی هونەر هیچ، هووشیار (٢٦٣٥)
وا لەبۆ ماڵی دەڵەرزێ، ڕەببی ماڵ وەک لەبۆ قاشوول دەڵەرزێتن منداڵ (٢٦٣٦)
گەر تۆ بگری، لەو یەکێک، ئەو دێتەشین وێدەوە، ئەو دێتەقاقاو پێکەنین (٢٦٣٧)
چونکەمنداڵ زۆر لەدانیش بێ بەشە پێکەنینو شینی وی بێ ئەرزیشە (٢٦٣٨)
عارییەی چون موڵکی خۆی دی،موحتەشەم سووت لەبۆ ماڵی درۆ، ئەوچەشنی شەم[4] (٢٦٣٩)

---

[1]- وا قەڵەوبوون ئەو سێ کەس هەر یەک لەوان (مصرع اول)

[3]- ڕێگەبۆ مەرگی خەلائیق نادیار چونکەنابینرێ بەچاوان ، قەت ، چ جار

[4]- موحتەشەم چون عارییەی دی موڵکی خۆ زۆر پەرێشان بوو لە بۆ ماڵی درۆ

دیتەخەونی،ئەوکەهـــــەیتی زێـــــدەماڵ    زۆر دەترســـێ، دز، جـــەواڵی کا،بـــەتاڵ (٢٦٤٠)
گـەر کو گوێی کێشا یـەکێ، هەستا لەخـەو    پێکـەنینی دێـت بەترسـێک هـەیبوو ئـەو (٢٦٤١)
عالمـــانیش وا دەلـــەرزن ئـــەی فـــلان    زاهیـــری بـــوو، چونکـــەعیلم و عـــەقڵی وان (٢٦٤٢)
بەوکەســـــانەی عـــــاقڵن، وا بـــــافنوون    خـــوا لـــەقورئان دا کـــوتی (لا یعلمـــون ) (٢٦٤٣)
یەک بەیـة ک ترسیان هەبوو، بدزن لـەوی    چونکـــەخۆیان دی، بـــەزانای ســـەر زەوی (٢٦٤٤)
ڕۆژگـــارم ئـــەو دەڵـــێ دەیخـــەن لەبەنـــد    ڕۆژگـــاری قـــەت نـــەبوو، ئـــەو ســـوودمەند (٢٦٤٥)
ئـەو دەڵـێ مـەنعم دەکـەن خـەڵکی لـەکار    قـەت نـەبوو، بـۆ کـار گییـانی وی بـەیار (٢٦٤٦)
ڕووت دەترسـێت و، دەڵـێ دەبـڕن لـەبن    دامـــەنم،چۆنی نـــەجات دەم، ئێســـتەمن؟ (٢٦٤٧)
ســـەت هـــەزاران زێـــدەزانی، ئـــەو علـــووم    گیـانی خـۆی ئـەمما نەناسـی ئـەو زەلـووم (٢٦٤٨)
ئەو دەزانێ ئەسڵ و، ڕیشـەی جـەو هـەران    بـۆ بـەیانی جـەو هـەری خـۆی وەک کـەران (٢٦٤٩)
ئـەی ئـەوەی بێـژی دەزانـم زیـاد لەحـەد    خـــۆت کـــەنازانی قـــەبوولی، یانـــەڕەد (٢٦٥٠)
تـۆ ڕەوا، هـــەم نـــاڕەوات زانـــی، ئـــەدی    قـەت لـەخۆت نـۆڕی کەباشـی، یابـەدی؟ (٢٦٥١)
تـــۆ دەزانـــی قیمـــەتی کـــالاو، حـــەقی    گـــەر نـــەزانی قیمـــەتی خـــۆت، ئەحمـــەقی (٢٦٥٢)
نێت عـەیان بـوون سـەعدو نەحسی نێو جیهان    بۆ لەسـەعدو نەحسی خـۆت ناڕوانی جوان؟ (٢٦٥٣)
گیـان و ڕووحـی گشـت عیلمـان،خۆ، یـەقین    ئـەو هـەبوو،تۆ خـۆت بناسـی ڕۆژی دیـن (٢٦٥٤)
تـۆ ئوسـوولی دیـن دەزانـی چـاک، بـەلام    چـاک بنۆڕەئەسـڵی خۆشـت، ئـەی بـەفام (٢٦٥٥)
کوا ئوسوولی دین دەبێ وەک ئەسڵی خۆت؟    دەرکی ئەسڵی خۆت دەداتن سوود لەبۆت (٢٦٥٦)

**تەوسیفی خۆشی و شادابی ئەهلی سەبا، و ناشوکری کردنی وان ...**

زۆر خـەراب بـوو گـەو هـەری ئـەهلی سـەبا    دوور دەکـەو تـن گشـت لەئەسـبابی لـەقا (٢٦٥٧)
دای بـــەوان بـــاغ و زەمینـــی زۆر، ئـــیلاه    هەم لەڕاست و هەم لەچەپ، بەس بۆ ڕەفاه (٢٦٥٨)
هێنـــدەزۆر میـــوە، دەکەوتـــەخوار، لـــەدار    ڕێ دەبـوو تـەنگ لـەو کەسـەی بـا، ڕێبـوار (٢٦٥٩)
ڕێـی دەگـــرت میوە،کـــەدەڕژا بـــێ ژمـــار    مـات دەمـا، هـەر کـات کەدەیـدی، ڕێبـووار (٢٦٦٠)
گـەر لەباغ،قەرتاڵەهـەر کـەس، بـای لەسـەر    پڕدەبـوو، بـێ وەی تـەکان دا، داری بـەر (٢٦٦١)
دەی ڕژانـد تـەنها کـەمێک لـەو میـوە، بـا    پڕدەبـوون دامێن،گـەلێک، لـەو میـوە، جـا (٢٦٦٢)
هێندەهێشـووی گـەو رەجـا، هاتبوونـەخوار    وێدەکـەو تـن لـەو، سـەرو ڕووی ڕێبـووار (٢٦٦٣)
هێندەزۆربوو زێڕ لەوێ ئەی خۆش خەبەر    بـوو لەقـەدیا ن نـۆ کـەران، زێـڕین کەمـەر (٢٦٦٤)

سەگ کولیچەی ورد دەکرد ژێر پێ وگورگ    هێندی دەخوارد، تووش دەبوو، بەئێشی ورگ
وا، لە،گورگ و دز، ئەمین بوون دێ و شار    نەی دەترساند، قەت چ بزنێک گورگی هار
نیعمەتی ئەوقەومەگەر کەم، من بەیان    ڕۆژبەڕۆژیش زیاد دەبوون خۆ بۆ ئەوان
نایەڵێ باس کەم ئەمن کاری موهیم    ئەنبییا بردیان لەبۆ وان (فاستقم)

**هاتنی پێغەمبەران لە لای خودا بۆ نەسیحەتی ئەهلی سەبا ...**

سێزدەپێغەمبەر دەهاتن بۆ ئەوان    تا بەوان ڕێگای حەقیقەت دەن، نیشان
کوانێ شوکری نیعمەتی خوا، پێی دەدان؟    ئەسپی شوکرو،گەرکو نوست بیدەن تەکان
واجبەلای عەقڵ، شوکری مونعیمی    گەر نەبێ وا، قەهری حەق دێ، دائیمی
کوا ڕەوایەتاقەشوکرێک بۆ خودا؟    بەو هەموو ئەنعامەزۆرەی ئەو دەدا[1]
سەر دەبەخشێ، دەیهەوێ ئەو، یەک سجوود    پێ دەبەخشێ دەیهەوێ ئەو، یەک قعوود
قەوم، کوتیان شوکری ئێمەی برد غوول    هەم لەشوکرو هەم لەنیعمەت، بووین مەلوول
هێندەدڵ تەنگ بووین لەئەنعام و عەتا    خۆش نییەبۆ ئێمەتاعەت هەم خەتا
نانهەوێتن ئێمەهیچ ئەنعام و باغ    نانهەوێتن ئێمەئەسبابی فەڕاغ
ئەنبییا کوتیان بەقەلبی وان عەلیل    چون نەیان ناسی ئەوان، قەت خوای جەلیل
چون نەخۆش نیعمەت دەبێ، عیللەت لەوی    قەت کەناکەن نیعمەتان بیمار قەوی
نیعمەتی خۆشت گەلێک دی بێ گەزاف    ناسوپاس بووی، لێڵ دەبوون، ئەنعامی ساف
تۆ لەبۆ ئەولەززەتا نە، بووی عەدوو    کردنی ناخۆش دەستی تۆ، هەموو
هەرکەسێکی بوو بەئاشنا و یاری تۆ    بوو حەقیر وخوار، لای دیداری تۆ
هەر کەسێک بۆ تۆ د ەبۆ بێگانەئەو    زۆر لەلات بوو موحتەڕەم، دوڕ دانەئەو
خولقی وا تەئسیری ئەو بیمارییە    ژەهری وی بۆ گشتی دۆستان جارییە
ئەو نەخۆشیەچاکەلا ببرێت زوو    چون دەگەڵ وی،شەکر دەگرێت، بۆنی گوو[2]
گشت دەبن ناخۆش خۆشیەکان لەلات    لێت دەبێ ئاگر ئەتۆ ئاوی حەیات

[1]- بەو هەموو ئەنعامەزۆرەی پێت دەدا (مصرع دوم)
[2]- ئەونەخۆشیەزوو وەلا بە، ئەی جەلیس    چون دەگەڵ وی شەکردەگرێ بۆنی پیس

کیمیای مەرگ و عەزابەخوویی وا    مەرگی لەدوا دێت، حەیاتی والە، جا (٢٦٨٦)

زۆر غەزا دڵ خۆش دەکەن کامیل، نەنیو    بێتەجیسمی تۆ دەبێ ئەو بۆ گەنیو (٢٦٨٧)

زۆر عەزیزا ن هەن،بەنازان بوون، شکار    گەر شکار بوون،بوون لەلای تۆ،خوار و زار (٢٦٨٨)

عەقڵ گەڵ عەقڵ، ئاشنا بێ، باسەفا    لەحزەلەحزەزیاد دەبێ دۆستی و، و ەفا (٢٦٨٩)

گەر دەگەڵ نەفس، نەفسی پەست بێ ئاشنا    دۆستایی کەمکەمە، دەچێتەفەنا (٢٦٩٠)

چونکەعیللەت خوازەنەفسی ئا دەمی    مەعریفەت فاسید دەکا ئەو، سەر جەمی[1] (٢٦٩١)

دەتهەوێ دۆستت بناسێ تۆ، بەکۆست    چەشنی عاقڵ، بگرەعاقڵ تۆ، بەدۆست (٢٦٩٢)

چون بەژاری بای سەمووم تۆ بووی نەخۆش    دەردی بۆدێ، هەرچی بگرێ دەستی تۆش (٢٦٩٣)

گەو هەری بگری، بە سەنگ تەبدیل دەبێ    خۆشەویستیش لات،بەجەنگ تەبدیل دەبێ (٢٦٩٤)

گەر تۆ بگری نوکتەیەک تازەو لەتیف    تۆکەزانیت، ئەو دەبێ پووچ و کەسیف (٢٦٩٥)

من ئەوەم زۆر بیستووە، زۆر کۆنەلام    غەیری ئەو هە، بێنەتۆ، بۆم ئەی برام (٢٦٩٦)

جارەکی دیش گەر بکەن نوێ، بۆت،بەیان    زۆر بەنارازی دەدەی،تۆ، خۆت نیشان (٢٦٩٧)

دەردو عیللەگەر لەخۆت کەی تۆ،بەدوور    قەو لی کۆ ن وەک نوێ دەکا،بۆتۆ، زهوور (٢٦٩٨)

بێتەدەر لەو کۆنەتا بەرگی نووێ    بێن لەڕیشەی، زۆر هێشووی، جوێ جووێ (٢٦٩٩)

ئێمەدوکتۆران، شاگردانی حەق    بەحری ڕەش ئێمەی کەدی، زوو (فانفلق ) (٢٧٠٠)

ئەو تەبیبانەی تەبیعەت زۆر جییان    هەر لەنەبزی ڕا، دەنۆڕن، نەک گییان (٢٧٠١)

ئێمەدەروانین لەقەلبان بێ سەبەب    چون بەئێمەی زۆر فەراسەت داوەڕەب (٢٧٠٢)

بۆغەزان، دوکتور، تەبیبانی بەدەن    گیانی حەیوانی ئەوان قووەت دەدەن (٢٧٠٣)

ئێمەدوکتورانی کردارو مەقال    مولهیمیشمان، پەرتەوی نووری جەلال (٢٧٠٤)

پێت دەڵێین کام کارە، تۆ رزگار دەکا    یا نەکام کار ڕێی دروستت، خوار دەکا (٢٧٠٥)

پێت دەڵێین کام قەو لەسوودی بۆگییان    یانەکام قەو لەدەدا بەگیان،زیبان (٢٧٠٦)

ئەو تەبیبان میز، لەبۆ وان بۆ دەلیل    بۆ مە، ئەمما، بۆ دەلیل، وەحیی جەلیل (٢٧٠٧)

دەستموزدمان ناهەوێ، خۆ هیچ چەلێ    دەستموزدمان پێدەداتن، خوا،گەلێ (٢٧٠٨)

ئەی نەخۆشی بێ عیلاج بت بێت هۆش    چادەکا، دەرمانی مە،یەک یەک،نەخۆش (٢٧٠٩)

---

[1]- مەعریفەت فاسید دەبێ بەو، سەر جەمی (مصرع دوم)

**موعجیزە ویستنی قەوم لە پێغەمبەران...**

قـەوم کوتیـان ئـەی گرووهـی مـوددەعی کـوا دەلیلـی عیلمـی تیبـو، نـافیعی؟ (۲۷۱۰)
ئێـوەوەک ئێمـەن دەتـان وێ،خوردوخـەو فکـری خـواردن کـەن،وەکوو مـە، ڕۆژو شـەو (۲۷۱۱)
چونکـەئێوەوان لـەداوی ئاوو،گـڵ نـاتوانن ڕاو بکـەن سـیمرغی دڵ (۲۷۱۲)
بـوو، لـەوان دا حـوببی جـاهو سـەر وەری بۆیـەبوویان ئیـددیعای پێغەمبـەری (۲۷۱۳)
نانهـەوێتن ئێمەقـەت لاف و درۆ بێتـەگوێمان یانـەبێهۆش بـین، بـەدۆ (۲۷۱۴)
ئـەنبیاکوتیان نـەخۆشـن ئێـوەوان وەک حیجابـە،کوێر دڵـی خـۆ، بێ گومـان (۲۷۱۵)
ئێوەبیسـتو، دەعـوەتی ئێمـە، ئـەدی گـەو هـەری نێـو دەستی ئێمـەو، بۆ نـەدی؟ (۲۷۱۶)
گەوهـەری وان کـرد لـەبۆ عـام ئیمتیحـان بۆیەدەیـدەین ئـەو بەگشـت چـاوان نیشـان[1] (۲۷۱۷)
ئـەو کەسـەی داوادەکـا شـاهید لـەوان شـاهیدی کوێربـوونی خـۆیتی بێ گومـان (۲۷۱۸)
گـەر بیێـژیتن بـەتۆ جارێـک هـەتاو ئێسـتەڕۆژەزوو لەخـەو هەسـتە، بـەتاو (۲۷۱۹)
تـۆش بیێـژی کـوا گـەواهت ئـەی هـەتاو؟ پێـت دەڵێ ئـەی کـوێر، لەحـەق داواکـە،چاو (۲۷۲۰)
تـالیی ڕۆژ گـەر بـەدەس بگـرێ چـرا کوێرەدیـارە، وادەکـا، ئـەو ئـەی بـرا (۲۷۲۱)
تۆ لەشک دای گەرکو نـەت دی ڕۆژی ڕوون بـۆ حیجـابو پەردەبۆتۆ،جـەهلی دوون (۲۷۲۲)
تـۆ نەکـەی بەوگفتـە،کوێریت ئاشـکار بێ سـەدا بە،فـەزڵی خـوات بێ ئینتیـزار (۲۷۲۳)
گـەر لـەڕۆژدا بێـژی ڕۆژم دەن نیشـان خـۆت دەکـەی، ڕیسوایی عالـەم بێ گومـان (۲۷۲۴)
سـەبرو خامۆشـینەڕەحمەتیـان لـەدوو وا نیشـان ویسـتن، نیشـانەی دەرد بـوو (۲۷۲۵)
( انصـتوا ) ت بـابێ قـەبووڵ تـۆ بێ سـەدا دێ جـەزای ئـەو(انصـتوا ) بـۆت لای خـودا (۲۷۲۶)
دەتهـەوێ سـالم بـی دائیـم تـۆ ئەگـەر لای تـەبیبی والـە، دانـێ مـاڵ و سـەر (۲۷۲۷)
لابـەرە، تـۆ قـەو لـی زێـدەو، نالـەبار بـەزلی گیـانو جـاهو ماڵـت، بێ بـەکار (۲۷۲۸)
تـا بیێـژێتن سـەنای تـۆ فـەزڵی خـوا تـا بـەجاهت ئاسـمان غیبتـەی خـووا (۲۷۲۹)
گـەرکو ڕازی کـەی تـەبیبی کردگـار خـۆت دەبینـی، جـا دەبـی تـۆ شـەرمەزار (۲۷۳۰)
گەرتـەبیبان کـوێر دڵان بینـا دەکـەن بـەس بـەلوتفو ڕێنمـوونی خـوا، دەکـەن (۲۷۳۱)
بـۆ تـەبیبی والـەبن، خزمـەت گـوزار تاکوعـەترو عەنبـەرو لێبێتـەخوار (۲۷۳۲)

---

[1]- بۆیەدەیدەین، ئەو بەچاوی جەم، نیشان (مصرع دوم)

**موتتەهەم کردنی قەوم ئەنبییایان ...**

قـەوم کوتیـان ئەوهەگشـتی فێـڵ و مـەکر / چۆن لەجێی خۆی دادەنێ خوا،زەید و بەکر؟ (٢٧٣٣)
قاسـیدی شـاهان لەجینسـی وان دەبـێ / ئاوو گڵ کوا چەشنی خوای ئاسمان دەبێ؟ (٢٧٣٤)
ئێمەخواردوومانەمێشـکی کـەر مەگـەر؟ / بـن هومـا و مێشـووله لامـان، هـاو سـەفەر (٢٧٣٥)
لێک جییان پەششـەو هوما، خـاک و خـودا / ڕۆژی ئاسـمان زۆر لـەزەڕڕە، بـوو جـودا (٢٧٣٦)
نیسـبەتو پەیوەنـدی وا، کـوا چـا دەبـێ؟ / چـۆن لـەنێو عـەقڵ و دەماغێـک وا دەبێ؟ (٢٧٣٧)

**حیکایەتی کەروێشکان کە،کەروێشکێکیان بەقاسید نـاردەلای فیـل کـەتۆ پێـی بڵـێ ئـەمن قاسیدی مانگی ئاسمانم بۆلای تۆ.. کە لەو کانیاوە خۆت بپارێزە...**

**خولاسەی داستان ...**

موخالیفـانی پێغەمبـەران بـەوانیان کـوت ئیـددیعاکانی ئێوەهـەر وەک ئـەو داسـتانەیەکەدەڵێن گرووهێـک لـەفیلان جـار جـار دەهاتنەسـەرکانیاوێکی زۆر زولال و ڕوون، وەدەبوونەسـەبەبی وەحشـەتوهەلاتنی جانـەوەرەکانی دی، لـەئاکام دا ئـەو جانەوەرانەهەمیشـەتینوو،ونەخۆش بـوون، تاکو، کەروێشکێکی زیرەک، فێڵێکی بەکار هینا، وهاواری دەکرد کەئەی پاشای فیلان ئەمن قاسیدی مانگی ڕووناکم، مانگ وای بەئێوەڕا گەیاندووەکەئەو کانیاوەموتەعەللیق بەمنە، لەوەپاش لەسەر وی کۆ مەبنەوە، چونکەحەزیەتو دەکەم نیشانەی ئەنجام دانی تەهدیدی مانگ ئەوەیە، کـە هـەرکات خورتوومتـان دەکانیـاو وەردا، مانـگ پەرێشـانو تـوورەدەبێ، و بـزانن کەئـەو وەعدەدەشـەوی چاردەدا دێتـەجێ دەشـەوی دیـاری کـراو پاشـای فـیلان هاتەسـەرکانی، هـەر دەگەڵکو، خورتوومی دەئاو وەردا، عەکسی مانگ هاتەلەرزین، وەختێک کەفیل ئەو وزعەی دیت قسەکانی کەر وێشکی هاتەبیر، وپێی وابوو کە ڕاستە و لە ترسان کشاوە، ولەکانی دوور کەوت و فیلەکانی دیکەش بەدووی ویدا کشانەوە...

وایەئـەو هـە، وەک بکـا کـەر وێشـک، بانـگ / قاسـیدم مـن، نـاردمی لای فیـل، مانـگ (٢٧٣٨)
چـون دەهـاتن فیـل گـەلێ بـۆ کانیـاو / بـوون دەدەردو ڕەنـج حـەیوانات، تـەواو (٢٧٣٩)
گشـت لەترسـان بـوون لـەکانیاو دوور زۆر / کردیـان حیلێـک نـەیان بـوو چونکـەزۆر (٢٧٤٠)
هاتەسـەرکێو پیرەکەروێشـک،کردی بانـگ / هەرچی فیلی بوون شـەوی ئەووەڵ،لەمانگ (٢٧٤١)
تـۆ شـەوی چـاردەوەرە، ئـەی شـاهی فیـل / تـا لـەنێو کـانی ببینـی تـۆ دەلیـل (٢٧٤٢)
قاسـیدم مـن بێـرەپێش ئـەی شـاهی فیـل / قاسـیدان خـۆ، نـاکرێن، زەنجیـرو دیـل (٢٧٤٣)

مانــگ دەڵــێ ..فــیلان، ئێــوەدا، بــڕۆن کــانی مــاڵی ئێمەیــە، دەی، جــا، بــڕۆن (٢٧٤٤)
کوێردەکـەم چاوتـان ئـەمن، واکـەن، ئەگـەر نایــەڵم مــن هــیچ گونــاهم بــێ لەســەر (٢٧٤٥)
تــەرکی ئــەو کانیاوەکــەن، لاچــن، تــەمام تـاکو نـەبڕێ تیغـی مانـگ سـەرتان بـە عـام (٢٧٤٦)
بــۆ نیشــانەی تووڕەبــوونی مــانگی بــەرز ئــاوی کــانی، فیــل کــەبی خــوا، دێتەلــەرز (٢٧٤٧)
تۆببـــەحازرفلان شـــەو، شـــاهی فیـــل تـا لـەنێو کانیـت وەدەس بـێ تـۆ دەلیـل (٢٧٤٨)
کاتێ حـەوت و هەشـت لـەمانگێ ، تێپـەڕی شــاهی فــیلان هاتــەلای کــانی چــەڕی (٢٧٤٩)
هەردەگـــەڵکو دای لەئاوخوڕتووم،شـــەوێ کەوتەلـەرزین ئـاوو،دوا یـەش، مانـگ لـەوێ (٢٧٥٠)
بـاوەڕی کـرد فیـل لـەوی زوو، ئـەو خیتـاب چونکــەمانگ کــردی لــەکانی ئیزتیــراب (٢٧٥١)
ئـەی گـرووەوەک فیلـی ئەحمـەق، ئێمـەنین ئــاو بلــەرزێ، ئێمەهــەڵبێین، تــاکو چــین[١] (٢٧٥٢)
ئــەنبیاکوتیان ئەســـەف بـــەو پەنـــدەمان ئـەی سـەفیهان زێـدەتر لـەو بەنـدە، مـان (٢٧٥٣)

**جواب دانەوەی ئەنبییا بەوان و مەسەل هێنان بۆ وان ...**

سەت ئەسەف دەرمانی دان بۆ دەردو ئێش بـوو بەقـەهرو بـوو بـەژەهری گیـان کـێش (٢٧٥٤)
چـــــاوی ئێوەبـــــەوچرایەزێـــــدەتار چونکەپــەردەی قــەهری دانــا، کردگــار (٢٧٥٥)
کـوا لـەئێوەن ویسـت ئێمـە، سـەرەوەری؟ سـەروەریمان گەیەئاسـمان سـەر سـەری (٢٧٥٦)
کوا لەکەشتی دێ شەڕەف بۆ بەحری دوڕ؟ خاسسە،کەشـتی گـەر بەپـەینی بێـت پـوڕ (٢٧٥٧)
سـەت ئەسـەف ئـەوکوێری نـا بینـا لـەچاو چەشـنی زەڕڕە،چـووک دەبینـێ ئـەو هـەتاو (٢٧٥٨)
ئــادەمی وا بـــێ نـــەزیر، زانـــا بەســـوڕ چاوی ئیبلیس نەیدەدی لەو، غـەیری قـوڕ (٢٧٥٩)
دی، بـــەهاری وی بـــەدەی، دێوانـــەبوو چـون لـەجێ یـەک هات،کەشـەیتانخانەبوو (٢٧٦٠)
بـەخت و،ئیقبـاڵ وا دەبـێ، دێ جـارو بـار چـون نـەبوو لائیـق، دەکـا زوو لـەو، فـەرار (٢٧٦١)
زۆر دەبـــێ وا، دێـــت یـــار، نـــا ناســـیار لای نگوون بـەختێ، کـەناگرێ قـەدری یـار (٢٧٦٢)
بەختی بەد باعیس بوو، نەی دی چاو، ڕەزا قـەلبی لای ناحـەق دەبـرد (سـوء القضـا ) (٢٧٦٣)
چـون بـوتی بـەرد، بۆتـۆ ڕووگـەو، سـەرەوەرە لەعنــەتو، کــوێری لــەبۆ تــۆ، ســێبەرە[٢] (٢٧٦٤)
چـۆن دەبـێ بـەردێ ببـێ ئـەنبازی حـەق بۆ نـەبن عـەقڵ و گییـا ن،هـەمڕازی حـەق؟ (٢٧٦٥)
بــۆ هومــا، مێشــوولەمردوو، بــۆ شــەریک بــۆ نــەبێ زینــدوو، بەهــەمڕازی مــەلیک (٢٧٦٦)

---

[١]- ئاو بلەرزێ ئێمەهەڵبێین ، چین بەچین (مصرع دوم)

[٢]- چون بوتی بەرد، بۆتۆ ڕووگەو مایەیە لەعنەتو کوێری لەبۆ تۆ سایەیە

یانــەچاکتان کــرد ئــەوەی گــەر مــردووە پەششــەیی زینــدووش، خــودا چـای کــردووە (٢٧٦٧)
عاشـقن بـۆ کـاری خـۆ تـان بـێ قـەر ار هەرلـەدەوری سـەر دەهـاڵێ، کلکـی مـار (٢٧٦٨)
نیعمـــەتی تێـــدا نییـــەخۆ کلکـــی مـــار خـۆ سەریشـی دوور لەلـەززەت، پـڕ لـەژار (٢٧٦٩)
دەوری سـەر سـوورا بەئاشـکار کلکـی مـار لائـیقن زۆر پێکتـری، ئـەو هـەر دوو یـار (٢٧٧٠)
وا دەڵـی بـۆ مـان حـەکیمی غەزنـەوی دەو ئیلاهـی نامــە، بگرەگــوێ، لــەوی[1] (٢٧٧١)
تـۆ فزوولـی کەمکـە، نێـو حـوکمی قـەدەر لائیقـەبۆ جیسـمی کـەر، خـۆ گـوێی کـەر (٢٧٧٢)
بـوون مونـا سـیب عـوزوو، ئەبـدان پێکـەوە بـوون موناسـیب وەسـف و گیانـان پێکـەوە (٢٧٧٣)
وەسفی هـەر گیانێـک موناسـیب بـوو، بـەوی بێ گومـان وای ویسـت خـودای باڵاو نـەوی (٢٧٧٤)
وەسـف و گیـانی چونکەئـەو جـووت کردبـوو تـۆش موناسـیب بگـرەوان، وەک چـاوو،ڕوو (٢٧٧٥)
بوون دەگـەڵ یـەکتر موناسیب، باش و بـەد چونکـەوای نووسـی دەتەقـدیر دا، ئەحـەد (٢٧٧٦)
چـاوو دڵ هــەردوو دەنێــو دووقــامکی وی وەک قەڵەم نێو دەستی کاتیب، سەر نـەوی[2] (٢٧٧٧)
قـامکی لوتفـو قـامکی قـەهری خـوا م مـوراد بـەو دوو قامکـە، دڵ دەبـێ غـەمگین و شـاد[3] (٢٧٧٨)
ئــەی قەڵــەم تــۆ لائیقــی، لای کردگــار چاو دەنێو دوو قامکی کێت گرت، تۆ قەرار؟ (٢٧٧٩)
گشــتی قەســدو جونبشــت دەو قامکــەدا قــەلبی تــۆ وەســڵەبەچوار ڕێگــای خــودا (٢٧٨٠)
حـەرفی حاڵی تـۆی زهـوور دا، نەسـخی وی عەزم و فەسخت هەر دووعـەزم و فەسخی وی (٢٧٨١)
غــەیری گریــان و نییــاز ڕێگـــا، نییـــە لـەو عـەوەز بوونـەش قەڵـەم ئاگـا، نییـە (٢٧٨٢)
دڵ بەقەد خۆی تێدەگا، نـەک زیاد لەحـەد ئەرزیشـی وی بـوو، بـەکاری بـاش و بـەد (٢٧٨٣)
بـوو لەکەروێشـک و لـەفیل، بـۆ وان ئەمـەل تێکـەڵاو کـەن تـا دەگـەڵ فـێلان ئـەزەل (٢٧٨٤)

**بەیانی ئەو مەتڵەبە کە هەموو کەس شایانی مەسەل هینان نییە مەخسووسەن لە کار و باری خودا دا ...**

کــوا دەبــێ لائیــق بــەئێوە، وا، بکــەن بۆ خودای بێ میسل تەمسیل چا، بکەن؟ (٢٧٨٥)
خـوا مەسـەل دێنێـت، بۆمـان، سـەر وەرە چـون لـەعیلمی سیرڕوئاشـکار میحـوەرە[4] (٢٧٨٦)

---

[1]- دەو ئیلاهی نامە،گوێ دە، تۆ، بەوی (مصرع دوم)

[2]- چاو و دڵ هەردوو لە نێوان (ئیصبەعەین) وەک قەڵەم نێو دەستی کاتیب ئەی حوسەین

[3]- بەو دوو قامکە بوو قەڵەم ، غەمگین و شاد (مصرع دوم)

[4]- چون لەعیلمی سیرڕ و جەهر، ئەو میحوەرە(مصرع دوم)

ئەی کەچەڵ کوا هات لەسیر، بۆ تۆ، چ بۆن؟ تـا لـەزولف و ڕوو، مەسـەل بێنـی لـەبۆن (٢٧٨٧)
ئـەو عەسـای نێـو دەسـتی مووسـا دار بـوو ئاشـکرابوو ڕاز، کـە ئـەو دەم، مـار بـوو (٢٧٨٨)
گـەرکو مووسـا نەیـدی ڕازی دار بـەچاو چۆن[1] دەزانـی تـۆ، سـوڕی ئـەو دان و داو؟ (٢٧٨٩)
چـاوی مووسـا بـۆ مەسـەل،کردی خـەتا چـۆن دەبـێ مشـکێک نـەکا، هـیچ ئیشـتیبا (٢٧٩٠)
خــــوا میســـــالانت دەکاتەئــــەژدەها بـۆ سـەزا لـەت لـەت بکـا ئـەو تـۆ، هـەتا (٢٧٩١)
وای مەســـەل هیناوەئیبلیســـی لـــەعین تـا دەبـوو مـەلعوونی حـەق، تـا ڕۆژی دیـن (٢٧٩٢)
وای مەســەل هیناوەقـاڕوون، بـۆ لیجـاج چۆ دەعەردی،خۆی دەگەڵ ویش تـەخت و تاج (٢٧٩٣)
ئـەو میسـالەت زاغـو کونـدە، بـێ گومـان چـون بـەوان زۆر، خانـەدان، چوونـو نـەمان (٢٧٩٤)

**مەسەل هینانی قەومی نووح بەتەوهین و مەسخەرە لە کاتی کەشتی دروست کردن...**

نـووح لەسـەحرادا، دروسـتی کـرد، گـەمی چوون لەبۆ تەو هین، مەسـەل بێژ، ئـەودەمی (٢٧٩٥)
لــــەو بیابانەکــــەنیتی ئـــاو لــــەچاڵ چـا دەکـا کەشـتی کـەلێی شـێواوە، حـاڵ (٢٧٩٦)
یـەک لـەوان دەیکوت کەکەشتی توند بڕۆ ئێکـی دیـش دەیکـوت لـەبۆی بـاڵ چاکـە،تۆ (٢٧٩٧)
ئـەو بـەڵام دەیکـوت کەئـەمر ی خوایـەلام مەسـخرەناکات ئــەو قــەت نـا تــەمام (٢٧٩٨)

**حیکایەتی ئەو دزە کە لێیان پرسی بەو نیوەشەوە لەبن ئەو دیوارە چدەکەی؟ کوتی دەهۆڵێ لێدەدەم ...**

**خولاسەی داستان...**

دزێک لەنیوە شەوێک دا خەریک بوو دیواری ماڵێکی کون دەکرد، کابرایـەک ئـەوی دی وپێی کوت بابەگیان بەو شـەوە تاریکـە خـەریکی چی؟ دزەکـە کوتی دەهۆڵ لێدەدەم، کابرا پێیکوت ئەدی بۆ دەنگی نایە؟ دزەکە، جوابی داوە سبەینێ دەنگی دێ ...

هــات دزێ شــەو، تــا دزی کــا جــارەکی ئــەو خــەریک بووکــون بکــا، دیــوارەکی (٢٧٩٩)
یەک نەفەر بیماری گوێ سووک، ئەودەمە تـەق تـەقی سـەبری دەبیست ئەوکەمکەمـە (٢٨٠٠)
زوو دەچـۆ سـەربان و، چـاوی کـرد لـەژێر پێیـدەکوت بـۆ وادەکـەی تـۆ ئـەی دلێـر؟ (٢٨٠١)
کێی؟چکـارەی؟چی دەکــەی بەونیوەشــەو؟ پێیدەکوت مـن یـەک دەهـۆڵ کوت،بێ درەو (٢٨٠٢)
چی دەکەی؟ دەیکوت ئەمن دەکتوم دەهۆڵ کوا ئـەدی دەنگی دەهـۆڵ ئـەی توندوتۆڵ؟[1] (٢٨٠٣)

---

[1]- کوا (مصرع دوم)

پێیـدەکوت سـبحەینێ دێـتن دەنگـی وەی ‌ ‌ ‌ نارەتـەی یـا حەسـرەتاو، وأوەیـل و، وەی (٢٨٠٤)

نادروسـتە، چـاکراوە، ئـەو هـە، خـۆ ‌ ‌ ‌ سـیڕڕو ڕازی وەت نـەزانیوە، ئـەتۆ (٢٨٠٥)

**جوابی ئەو مەسەلەکەمونکیران کوتیان ..کەروێشک لەتەڕەف مانگی ئاسمان پەیامی بۆ فیل هینا ...**

خـۆ هـەمان کـەر وێشـکی شـەیتانی نـەفام ‌ ‌ ‌ بـۆ ڕەسـووڵ هینـای لـەبۆ نەفسـت پـەیام (٢٨٠٦)

تـا کونەفسـی کـەو دەنـت مـەحرووم بکـات ‌ ‌ ‌ تـۆ لـەئا وی زینـدەگی بەخشـی حـەیات (٢٨٠٧)

ئەی عـەنوود مـەعنیت کـەکرد تۆ، واژگوون ‌ ‌ ‌ بـۆ عـەزاب ئامادەبەئـەی پەسـتی دوون (٢٨٠٨)

تـۆ کوتـت لـەرزیش لـەبۆ مانـگ نێـو زولال ‌ ‌ ‌ گـەر کـو ترسـاندی بـەوی فـیلان، شـوغال (٢٨٠٩)

باس دەکەی کەر وێشک و ئاوو، فیلی بەرز ‌ ‌ ‌ ترسـی فیلانـیش لـەمانگ، نێـو لەرزەلـەرز (٢٨١٠)

لەرزیشی ئاو،وەک، چ چوو؟ئـەی کـوێری خـام ‌ ‌ ‌ چەشنی مانگێک بۆی زەبوون،بوون خاس و عام (٢٨١١)

مانگ و ڕۆژ چن؟خۆ، چ نینە گشت فەلەک ‌ ‌ ‌ چن عقوول و چـن نفووس و چـن مەلـەک؟ (٢٨١٢)

ڕۆژی ڕۆژی ڕۆژی عالەمتابـە ئـەو ‌ ‌ ‌ چیم دەکوت؟ نـەمزانی ڕەنگە، بـم لەخـەو[٢] (٢٨١٣)

سـەت هـەزاران زێدەشار خەشـمی شـەهان ‌ ‌ ‌ کردنـی نـابوود، ئـەی بـەد گومڕەهـان (٢٨١٤)

لـەت دەبێ کێو، لەو دەبێتن سـەت شکاف ‌ ‌ ‌ تاو، لـەدەو ری وان دەکا،وەک ئاش،تـەواف (٢٨١٥)

خەشمی مەردان وشک ئەکاتن سـەت سـەحاب ‌ ‌ ‌ خەشـمی دڵیـان زۆر جیهـانی کـرد خـەراب (٢٨١٦)

چـاک بنـۆڕن، ئێـوە مـردووی بـێ حـەنووت ‌ ‌ ‌ لـەو نـەدا مـەتگاهی شارسـتانی لـووت (٢٨١٧)

فیل کە هیچ نـین، سێ پەڕەنـدەی زۆر بچووک ‌ ‌ ‌ ئێسکی وانی کرد بـە بـەردان، ورد و سووک (٢٨١٨)

ئەزعـەفی تـەیرا ن ئـەبابیل ئـەی بـرا ‌ ‌ ‌ لەشـکری فـیلان بـەوان چـۆن تێـک درا (٢٨١٩)

کـێ هەیەنـەی بیسـتبێ تووفـانی نـووح ‌ ‌ ‌ یانـەدەعوای لەشـکری فیرعـەو نـو، ڕووح؟ (٢٨٢٠)

خسـتنی نێـو ئـاو شـکاندی پشـتییان ‌ ‌ ‌ یـەک بەیـەک، ئـاو کوشـتنی جـا، گشـتییان (٢٨٢١)

کـێ هەیەنـەی بیسـتبێ حـاڵی سـەموود؟ ‌ ‌ ‌ سەر سەڕیش نـەی هێشت، لـەعادیان تاروبوود (٢٨٢٢)

چـاک لـەوان فـیلان بنـۆڕە، جـارو بـار ‌ ‌ ‌ چۆن کەبوون فیل کوژ، لەنێو جـەنگ و هـەوار (٢٨٢٣)

چـاو کەلـەو فـیلان و شـاهانی زەلـووم ‌ ‌ ‌ چۆن بەخەشمی دڵ هەمیشـەبوون، ڕەجووم[٣] (٢٨٢٤)

جـا، دەزوڵمـەت دا دەبـن تـا کـو ئەبـەد ‌ ‌ ‌ ڕەحمـەتێ ناکـا، بـەیاوەریان، ئەحـەد (٢٨٢٥)

---

[١]- چی دەکەی؟دەیکوت دەهۆڵێ لێدەدەم ‌ ‌ کوا ئەدی دەنگی دەهۆڵ ئەی خۆش قەدەم؟

[٢]- تاوی تاوی تاوی عالەمتابەئەو ‌ ‌ چی دەڵەم من؟ ، ڕەنگەئێستا ، بم لەخەو

[٣]- ڕوجووم (مصرع دوم)

ئێوه نەوبیستوه، مەگەر چاکە و بەدی — خەڵکی دیتیان ئێوه بۆ نەودی ئەدی؟ (٢٨٢٦)

لەو شتەی دیتو دەڵێن نەن دی نیشان — واز دەکا مردن لەبۆ تان چاوتان (٢٨٢٧)

گەرچی پڕ بێتن لەڕۆژو نوور، جیهان — تۆ لەتاریکایی گۆڕ دا، ئەی فلان (٢٨٢٨)

بێ نەسیبی خۆ ئەلەو نووری عەزیم — ڕەوزەنەی بەسرا، لەتۆ مانگی کەریم (٢٨٢٩)

چووی لەکاخ بۆچاڵ، لەوێ بت بێت ژین — کوا گوناەبۆ ئەو جیهانەی وا بەرین؟[1] (٢٨٣٠)

گەر لەحاڵ و وەسفی گورگی ماوەگیان — چۆن دەبینێتن لەیووسوف، ڕووی جووان (٢٨٣١)

دەنگی داوود گەیە کێوو، بەر دەڵان — کەمتری بیست ئەو بەڵام، گوێی بەردڵان[2] (٢٨٣٢)

ئافەرین بۆ عەقڵ و بۆ ئینساف و داد — دائیمەن، (واللّەاعلم بالرشاد ) (٢٨٣٣)

ئەی سەبا، تەسدیق بکەن گشت موڕسەلین — هەر وەها ڕووحێک بەحەق، بی بێ، ئەوین (٢٨٣٤)

ئەنبییاباوەڕ بکەن، ڕۆژن، ئەوان — جا لەمەحشەر دا، ئەوان بۆتان پەنان (٢٨٣٥)

ئێوەباوەڕ کەن بەوان، بەدرن ئەوان — پێش ئەوەی مەحشەر لەبۆتان بێ، مەکان (٢٨٣٦)

ئێوەباوەڕ کەن بەوان، نووری دوجان — قەدری وان بگرن، کەمیفتاحی ڕەجان (٢٨٣٧)

ئەوهەتەسدیق کەن کەموزد، داوا، نەکات — ون مەکە، ڕێگا لەغەیرەو،خۆت،چکات (٢٨٣٨)

لابەتازی بێژەفارسی تۆ بەدڵ — تۆ بەحەق عاشق ببە، ئەی ئاوو گڵ (٢٨٣٩)

گوێ دەقەولی ئەنبییایان ئەی فلان — ئاسمانان کردیان باوەڕ بەوان (٢٨٤٠)

## مانای حەزم و میسالی پیاوی خام ...

بێنەبەر چاو حاڵی ڕابوردوان ئەتۆ — یا لەبۆ لای حەزم، تۆ، زۆر توند بڕۆ (٢٨٤١)

حەزم، یانی، نێو دوو تەدبیر ئیحتیات — بگری لەو دوو، ئەوهە، نەی بێ هیچ خوبات (٢٨٤٢)

یەک دەڵێ حەو دانەڕۆژان دوورە، ڕێ — ئا و کەهیچ نا، خیز دەسووتێنێت پێ (٢٨٤٣)

یەک دەڵێ تۆ توند بڕۆ، خۆ، وا نییە — زۆر بەمەودای کەم لەیەکتر، کانییە (٢٨٤٤)

ئەو هەحەزمە، ئا و دەگەڵ خۆت، جا، بەری — تادروست بێ کارو، ترسیش لا بەری (٢٨٤٥)

ئەو هە، ڕۆکە،ئا و لەڕێگا بێ ئەگەر[3] — گەر نەبێ ئاو،گیان بەحەسرەت دیتەدەر (٢٨٤٦)

---

١- کوا گوناهی بوو،جیهانی وا ، بەرین؟ (مصرع دوم)

٢- کەمتری بیست ئەو بەڵام ،گوێی سەنگ دڵان (مصرع دوم)

٣- ئەو هەبڕێتە، لەڕێ ، ئا و بێ ئەگەر (مصرع اول)

ئـــەی خەلیفـــەزادەگان هـــەر وا بکـــەن ئیحتیـــات بـــۆ ڕۆژی میعـــاد، چـــا بکـــەن (٢٨٤٧)
ئـەو عـــەدووی گرتـــی لـــەبابتان، ئینتیقـــام دوور بەهەشتی کـردو، دونیـای کـرد مـەقام (٢٨٤٨)
شـــاهی شـــەترەنجی دڵانـــی مـــات کـــرد دوور بەهەشتو، مەسخەرەی ئافات کـرد[1] (٢٨٤٩)
نێوقـەدی گـرت زۆرکـەڕەت وەختـی‌نـەبرد تـــا لەعـــەردی داو،کـــردی ڕەنـــگ زەرد (٢٨٥٠)
ئـــادەمی وا فـــازلی کـــرد غـــەرقی غـــەم ئێوەمـــەگرن هـــیچ کاتێـــک ئـــەو، بەکـــەم (٢٨٥١)
تـا جـو خشـڵی دایکـو بـابی مـەی، دەبـرد ئـەو حەسـوودە، زۆر بەچوستی وای دەکـرد (٢٨٥٢)
کردنی، هەر دووکییا ن جا، ڕووت و خوار زۆر بەســـاڵ، ئـــادەم دەگریـــا، زا ر زا ر (٢٨٥٣)
گیای چیا، شین بوون بەئەشکی چاوی وی چـون لەجوملـەی عاسییان بـوو، نـاوی وی (٢٨٥٤)
بیـــر لەمـــەکرو فێڵـــی وی کـــە، تـــۆ وەرە چـاو، کـەچی هینـا، بەســـەر ئەوســـەر وەرە (٢٨٥٥)
ئـــەی بـــەنی ئـــادەم لەشـــەیتان، ئەلحـــەزەر دابنـــێن شەمشـیری لا حـــەو لـــەی، لەســـەر (٢٨٥٦)
لـــەو کـــەمینگای خـــۆی دەبینـــێ، ئێوەچـــاک ئێوەنـــابینن ئـــەوی، ئـــەی ئـــاوو خـــاک (٢٨٥٧)
دائیمـــەن دەرژێنـــێ ڕاوچـــی، دان، لـــەڕاو دانەپەیـــــــداو زاهیـــــــرە، پنهانـــــــەداو (٢٨٥٨)
لادەخـۆت لـەو دانـەتۆ ئـەی خـۆش فـەڕ تـــا نەبەســـتێتن لـــەتۆ داو، بـــاڵ و پـــەڕ (٢٨٥٩)
چونکەتـەیرێک گـەر کودانـەی کـرد، ڕەهـا دانـــەدەخوا ئـــەو لەســـەحرا، بـــێ ڕییـــا (٢٨٦٠)
چونکـــەقانع بوو،لـــەداو دەبیـــوو نـــەجات نەیدەبەست داو،باڵ و پەڕ،لەو،قەت چکات (٢٨٦١)

### خەراپ بوونی کاری ئەو تەیرەی کە لەبەر تەماع و هەوای نەفس تەرکی حەزم و ئیحتیاتی کرد...

**خولاسەی داستان ...**

باڵەندەیـەک لەسـەر دیوارێـک هەڵنیشـتبوو، ولـەو دەو روبەرەتەماشـای ئـەو دانـا نـەی دەکـرد کەلەژێر داوێـک ڕۆ کرابوون جـار جـار تەماشای سەحرای پانو بـەرینی دەکـرد جـار جاریش تەماشـای ئـەو دا نـا نـە، هـەم دەفکـری زینـدەگی ئـازادی سـەحرا دا بـوو، هـەم دڵیشـی بـەو دانانەوەبوو.. نەیـدەزانی چبکا .. لەدانـەکان دەسـت هـەڵبگرێ وبـۆلای سـەحراو زینـدەگی ئـازادی خۆی باڵ لێک داو بڕوا، یا بڕوا بۆ لای لەززەتی خواردنی ئەو دانا نە، کەئەسیر بوون یا کوشـتنی وی بەدوا دایە؟.

---

[1] - دوور لەجەننەت ، مەسخەرەی ئافات کرد (مصرع دوم)

نیشتبوو تەیرێک لەسەر دیوارەکی    چاو لەدانی زێری داو بوو، جارەکی (۲۸۶۲)

جاردەکاتن ئەو لەلای سەحرا نەزەر    جار تەماعی دەنک و دانەی دێتەسەر (۲۸۶۳)

ئەو خیلافی بوو لەنێو ئەو دوونەزەر    ناگەهان عەقڵی لەسەر وی، بردەدەر (۲۸۶۴)

ئەو پەڕەندەی لای دەنا، شەککو گومان    ڕووی لەسەحراکردو لاینا، فکری دان (۲۸۶۵)

ئافەرین بەو، هەڵفڕی شاد، چۆ حەوا    بۆ هەموو ئازا دەگان بۆ پێشەوا (۲۸۶۶)

بووی نەجات هەر کەس ئەو ی کرد موقتەدا    پاڵ وەجێگای خۆش و ئەمنییەت دەدا (۲۸۶۷)

چون لەبۆ گشت حازمان بوو، شا، دڵی    پەیڕەوی وی بوو، بەگوڵزار، مەنزڵی (۲۸۶۸)

حەزم ڕازی بوو ئەویش ڕازی لەحەزم    تۆش وەهاکە، هەت بێ گەر تەدبیر و عەزم (۲۸۶۹)

تۆ دەداوی حیرس کەو تووی زێدەجار    تۆ گەرووی خۆ ت دادەنا، بۆ تیغ و دار (۲۸۷۰)

لوتفی تەوواب بوو کەتۆی ئازاد کرد    لێت قەبووڵ بوو، تۆبە،جا، تۆی شاد کرد (۲۸۷۱)

خوا کوتی من موجریمان ئازار دەدەم    من سزایان لائیقی کردار دەدەم (۲۸۷۲)

گەر لەجووتێک بێنمەلای خۆم،یەک لەدوو    دێ ئەوی دیش بێ گومان و شک،لەدوو (۲۸۷۳)

من دەگەڵ ئەو کارە، جووتم کرد ئەسەر    جووت هەر دوو دێن،یەکیان بێ ئەگەر (۲۸۷۴)

گەر لەیەک جووت یەک نەفەر بدزێت شووی    تا پەیاکا، ژن ئەو ی، دەڕوا بەدووی (۲۸۷۵)

جارەکی دیش هاتی تۆ، بۆ لایی داو    تۆبە،کوێر بوو، چونکەکردت، خاک دەچاو (۲۸۷۶)

ئەوچەلەش تەوواب وەی کرد، بۆت گرێ    پێیکوتی قەت پێ لەجێی وا، دا مەنێ (۲۸۷۷)

هات پەروانەی لەبیر چوون، تۆی دەبرد    گیانی تۆی ئەو دەستەچیلەی نار، دەکرد (۲۸۷۸)

ئەی پەپوولە کەمکە نیسیان کەمکە شەک    چاو لەباڵ و پەڕی سووتاو کە، چەلەک (۲۸۷۹)

گەر نەجاتت هات،شوکرت بێ، ئەوە    تۆ لەبۆ ئەودانەهیچ کات، نەچیەوە (۲۸۸۰)

پێت دەبەخشێ شوکری ئەو کەی تۆ ئەگەر    رزقی بێ داو ڕزقی بێ خەو فو خەتەر (۲۸۸۱)

شوکری ئەو نیعمەت کە، تۆی ئازاد کرد    وادەبێ گەر نیعمەتی ویست، یاد کرد (۲۸۸۲)

تۆ لەوەختی ڕەنج دەت کوت زێدەجار    تۆ نەجاتم دە، لەداو، ئەی کردگار (۲۸۸۳)

تاکوباش خزمەت بکەم، ئیحسان بکەم    خاک دەنێو چاوی بەدی شەیتان بکەم (۲۸۸۴)

## حیکایەتی نەزر کردنی سەگان لەهەموو زستانان دا کەلەهاوینی داهاتوودا ماڵێک بۆخۆم چادەکەم لەبەر سەرمای زستان...

### خولاسەی داستان

سەگی بێچارە لە زستان دا لەوەختی سەرما و سۆڵ زەعیف و لاواز دەبێ وبەزبانی حاڵ دەڵێ، هەر لەگەڵکو گەرما بێت، جێ بەجێ جێگا و سەر پەنا یەک بۆ خۆم چا دەکەم، بەڵام کاتێک کە لەشکری بەقودرەتی زستان ڕۆیشت و هەوا گەرم و مولایم بوو، قەسدو ئارەزووی خۆی لەبیر دەچێتەوە و بەغەفڵەت ڕۆژگار دەگوزەرێنێ ...

ئێسکی سەگ زستان کەهات ڕێک دێن بەجەم — زەربــــی زســــتان وای دەخاتەدەروخــــەم (۲۸۸٥)

ئـەودەڵێ جـا مـن لـەوەی پـاش وا، دەکـەم — ماڵـەکی بـۆ خـۆم، بەبـەردان، چـا دەکـەم (۲۸۸٦)

هەرکە هاوین هات دەکەم من،کار بەچەنگ — چـا دەکـەم ماڵێـک لەبەرسـەرما، بەسـەنگ (۲۸۸۷)

هەرکــەهاوین هــات و گــەرما بــوو زیــاد — ئێســکەکانی پــان دەبــن، پێســتیش، شــاد (۲۸۸۸)

ئــەو دەڵــێ کــاتێ کــەخۆی دی زۆر زەلام — من لەکام ماڵ جێم دەبێ؟ ئەی خۆش کەلام (۲۸۸۹)

زل دەبــێ دەڕوا لــــەبۆ ســــێبەر بــــەغار — تەنبەڵو تێر، خودپەسەند، پڕ عـەیب و عـار (۲۷۹۰)

پێیــدەڵێ دڵ، چاکەچاکــەی مامــە، مــاڵ — پێیدەڵێ کوا جێم دەبێ ماڵ، ئەی هەواڵ؟ (۲۸۹۱)

دەردو میحنــەت گــەر کــوبێن بــۆ ئــادەمی — لا دەنـێ ئـەو حیـرس و ئاز،جـا، ئـەو دەمـی (۲۸۹۲)

جــا دەڵــێ ماڵێــک لــە تۆبــەی، چادەکــەم — وەختــی زســتان مــن ئــەوی ئــاوا دەکــەم (۲۸۹۳)

گـەر بـەڵا ڕۆی، حیـرس و ئـازی دیتـەباڵ[1] — چەشنی سـەگ ئـەو، لا دەنێتن فکـری مـاڵ (۲۸۹٤)

زۆر لەنیعمــەت خۆشــترە، خــۆ شــوکرەکەی — کـەی دەچـێ شـاکیر بـەدووی ئەنعام،کـەی؟ (۲۸۹٥)

گیانی نیعمەت شوکرە، نیعمەت، چەشنی پۆست — چونکەشـوکرت،تۆ دەبـا، بـۆ لایـی دۆسـت (۲۸۹٦)

دێنێ نیعمــەت غەفڵــەت و، شــوکر، ئینتیبــاە — ڕاوکەنیعمـەت، تـۆ، بـەداوی شـوکری شـاە (۲۸۹۷)

شـوکری نیعمـەت تـۆ دەکـا قـانیع، ئـەمیر — تا لەدەستت دەگرێ سەت، نیعمـەت، فـەقیر (۲۸۹۸)

زۆر تەعامی خۆش و باش،حەق، پێت دەدا — تـا نـەبی تـۆ قـەت لـەلای هـیچ کـەس گـەدا (۲۸۹۹)

---

[1]- گەر بەڵا ڕۆی ، حیرس و ئازی دیتەباڵ (مصرع اول)

### مەنع کردنی ئەنبیایان علیهم السلام لەنەسیحەت کردن وهینانی دەلیلی جەبرییانە...

قەوم کوتیان ئەی نەسووحان بەسسەبەس | ئەو وتارە، گەر ببێ لەو دنیەکەس (۲۹۰۰)
قەلبی ئێمەی بەست بەقفڵان کردگار | کاری خوای، پێ ناکرێ ڕەد، کەس، چ جار (۲۹۰۱)
نەقشی ئێمەی ویست نەققاش، ئەوهەبەس | ناتوانێ تێک بدا ئەو، قەت، چ کەس[1] (۲۹۰۲)
بەر، بەزێڕ تەبدیل کەناکا قەت، وتار | کۆن کەنوێ نابێ، بەگوفتاران، چ جار (۲۹۰۳)
خوویی ئاو ناگرێت، قەت خاکی فەقیر | ئاو عەوەز نابێ بەهەنگوین، یانەشیر (۲۹۰۴)
خالقی ئەفلاک هەم ئەفلاکییان | خالقی ئاو، هەم گڵو، هەم خاکییان (۲۹۰۵)
سەفوەت و سووڕانی خالق، دا سەما | دای بەخاک و ئا و بەڵام، تاری و نەما (۲۹۰۶)
کوا لەدەستی دێت ئاسمان بێ بەتار؟ | کوا دەبن ڕوونا ک ئاوو گڵ، چ جار؟ (۲۹۰۷)
بۆ هەمووشت کردی تەعیین ڕێ، خودا | کوا بەیەک، کۆشیش دەبێ، کێوێک بە،کا (۲۹۰۸)

### جواب دانەوەی ئەنبیا یان بەجەبریان...

ئەنبیا کوتیان کەچای کرد خوای جیهان | قیسمەتێک ئەو ساف، کەناڕۆن قەت، ئەوان (۲۹۰۹)
هەر وەها چای کرد سیفاتی عاریزی | وەک کەسێک مەبغووزو مەنفوور، بێ ڕەزی (۲۹۱۰)
گەر بڵەی بەر، زێڕ بەتۆ، بێهوودەیە | گەربڵەی مس، زێڕ بەتۆ،ڕێی بۆ هەیە (۲۹۱۱)
گەر بەخیز بێژی ببەقوڕ، عاجیزە | گەر بەخاک بێژی ببەقوڕ، جائیزە (۲۹۱۲)
زۆر لەدەردان هەن دەوایان، لێ بەزی | وەک لەئینسان دا هەبێتن، ناحەزی (۲۹۱۳)
دەردو ڕەنجیش هەن گەلێ، دەکرێن چار | وەک سەرێشەو خوار بوونی چاوو، زار (۲۹۱۴)
بۆ سەلاح چای کرد دەرمان،کردگار | دەرد و دەرمان دوورلەسوود نین خۆچ جار (۲۹۱۵)
ئەغلەبی دەردان کەهەن، بێ چارەنین | چارەدێ، گەر بێ تەلاشی تۆ، یەقین[2] (۲۹۱۶)

### تیکرار کردنی کافرا ن حوججەتی جەبریانە...

قەوم کوتیان ئەی گرووە،خۆ دەردمان | بێ دەوایەبێ عیلاجەبێ ئەمان (۲۹۱۷)
زۆر چەلانتان کوت وەها، ئەفسونو پەند | لەحزەلەحزە، بوو شەدید تر، بۆ مە، بەند (۲۹۱۸)
گەر لەبۆ ئەو دەردە، قابیل با، دەوا | زەرڕەیەک لەو دەردە، جا کەم بایەبا[1] (۲۹۱۹)

---

[1]- نەقشی ئێمەی والە، ویست خوای بێمیسال | ناتوانێ تێک بد ا ئەو ، قیل و قال
[2]- ئەغلەبی دەردان بێ دەرمان، کە نین | گەر تەلاش کەی دێتەدەس دەرمان ، یەقین

سوددەگەر بێ، ئاو ناچتەنێو جگەر — دەچتەجێی دی، بەحر، بخوا، ئەو، ئەگەر (٢٩٢٠)
لا جەرەم جا،دەست و پێی وی، با،دەکا — گەر جگەر کاری نەکرد،ئاو، وا دەکا[٢] (٢٩٢١)

**دووبارەجواب دانەوەی ئەنبییایان بەجەبریان ...**

ئەنبیا کوتیان کەمەئیووس بوون بەدە — فەزڵ و ئەڵتافی خوداوەند، بێ حەدە (٢٩٢٢)
نائومێدبوون لەو خودایە، نەنگەنەنگ — بگرەهەو دای ڕەحمەتی وی تۆ، بەچەنگ (٢٩٢٣)
وا دەبێ ئەووەڵ گەلێک زۆر، سەعبەکار — جا، دەبێ سادەو دەکا سەختی، فەرار (٢٩٢٤)
پاشی مەئیووسبوون گەلێک ئومێد هەنە — چون لەپاشی زوڵمەتان، ڕۆژ، ڕەو شەنە (٢٩٢٥)
والەفەرزم کرد کەدڵتان بوو بەبەرد — هەر چی تەبلیغ کردمان داتان لەعەرد (٢٩٢٦)
ئێمەنیمانەبەتەسدیقتان چکار — ئێمەتەسلیمین بەئەمری کردگار (٢٩٢٧)
ئەو بەوئێمەی بەندەگی دەستوور دەدا — خۆ لەخۆن نالێین هیچ، بۆن دێ نەدا (٢٩٢٨)
جا بەگیا ن فەرمانی وی ئیجرا دەکەین — گەر لەخیزی ویست بچێنین، وا دەکەین (٢٩٢٩)
غەیری حەق گیانی نەبێ، یاری نییە — بەو قەبووڵ یاڕەددی عام، کاری نییە (٢٩٣٠)
موزدی تەبلیغی ریسالات، ئەو دەدا — نا لەبار بووین ئێمەبۆ خاتر ی خودا (٢٩٣١)
ئێمە نابین خەستە لەو دەرکە، چکات — بوعدی ڕێ ناداتە مە، وێستان و مات[٣] (٢٩٣٢)
خەستەوو، دڵ بەستە، بەس ئەو کەس دەبێ — گەر لەدووری یار،جێی مەحبەس دەبێ (٢٩٣٣)
چون دەگەڵمانەهەمیشەئێمە، یار — زۆربەئیخلاس گیان دەکەین بۆ وی، نیسار (٢٩٣٤)
نێو دڵیشمان لالەزارو گوڵشەنە — پیری هەم پەژ موردەگیمان، لێ و نە (٢٩٣٥)
دائیمەن شاداب وجوانین و، لەتیف — تازەهەم شیرین و خەندان و زەریف (٢٩٣٦)
ساعەتێک یاساڵ بەسەت بێ، لان یەکە — چون درێژ و کورت لێمان، مونفەکە (٢٩٣٧)
بەس دەجیسمان دا درێژی و کورتییە — ئەو درێژو کورتە، نێو گیان جێی نییە (٢٩٣٨)
سێ سەدو نۆ ساڵ ئەو ئەسحابی کەهف — تاقەڕۆژێک بوو لەلای وان،دوور لەلەهف (٢٩٣٩)
خوا نیشانی دا بەوان یەک ڕۆژ، زەمەن — چون لەلای حەق هاتەوەڕووح، نێو بەدەن (٢٩٤٠)
گەر نەبن هیچ ڕۆژو شەو هەم مانگ و ساڵ — چۆن دەبێ دڵ تەنگ وپیرو سست حاڵ (٢٩٤١)

---

[١]- زەڕڕەیەک لەو دەردەبا ، کەم بایە، جا(مصرع دوم)

[٢]- لاجەرەم ئەستوور دەبن جا، دەست و پێ — تونیەتی وی قەت بەئاوێ ، ناشکێ

[٣]- خەستەو و دڵبەستە بەس بوو ئەو کەسە — گەر لە دووری یار جێگای مەحبەسە

چـون لـەگوڵزاری وجـوود بوو،چـوون لـەخۆ　　دێ لـەجامی لـوتفی حـەق، مەسـتیت لـەبۆ (٢٩٤٢)
تێنەگـەی هـەرکـەس کەلـەوجام نـەیخوارد　　کـوا جوعـەل بـۆنی گـوڵی بـۆ بیـر دەنـارد؟ (٢٩٤٣)
خـۆ نـەبوو مـەو هووم،کەبا،مـەو هـووم ئـەو　　چەشـنی مـەو هوومـان دەبـوو مەعـدووم ئـەو (٢٩٤٤)
کـوا دەکـاتن دوو زەخـی بیـری بەهەشـت؟　　ڕوویـی جـوانی کوانێ،خـووکی کێوو،دەشـت؟ (٢٩٤٥)
تۆ گەرووی خۆت مەبڕەجا،ئەی شەخسی خوار　　چونکـەهات ئـەو لوقمـەنیزیـک بوولـەزار (٢٩٤٦)
گشـتی ڕێـی سـەعبن، بـەپایان بـردووە　　بـۆ موریـد، ڕێن،زێـدە ئاسـان کـردووە (٢٩٤٧)

**تیکرار کردنی قەوم ئیعتیرازی تەرجییە، لەموقابیل ئەنبیا یان علیهم السلام...**

قـەوم کوتیـان گـەر دەزانن،خۆبـەچاک　　مورتەدو نەحس و عەدوون لای ئێمە، پاک (٢٩٤٨)
گیـانی ئێمـە نـەیبوو وەهـم و بیـر هـەم　　ئێـوە هێنائـان لـەبۆ مـان دەردو غـەم (٢٩٤٩)
پـێش لـەئێوە، ئێمـەبوومان ئیتتیفـاق　　فاڵی شوومتان بوو کەهات، سەت ئیفتیراق (٢٩٥٠)
ئێمـەتووتی نوغـڵ و شـەکران بـووین، بەناز　　ئێـوەئێمـەو کردەتـەیری مـەرگ، خـواز (٢٩٥١)
گـەر لەهـەر جێگـای جیهـان دا بـێ غـەمێ　　یـا لەهـەرجێ دەنگـی نـاخۆش بـێ کـەمێ (٢٩٥٢)
یـا لەهـەر جێگـای جیهـان بـێ فـاڵی بـەد　　بێ لەهەرجێ مەسخ و دەردی زیاد لەحەد (٢٩٥٣)
گشـت لـەژێر داسـتان و فـاڵی ئێـوەدان　　دەرکـی شـادی و لـەززەتا نـو، پێـوەدان (٢٩٥٤)

**دووبارە جواب دانەوەی ئەنبییایان علیهم السلام ...**

ئـەنبیا کوتیـان کـەفاڵی پـیس و بـەد　　ڕاس لـەنێوان گیانتـان دەگـرێ، مـەدەد[1] (٢٩٥٥)
گەر لەجێ یەک تۆ بنووی هەی بێ خەتەر　　ئەژدەهایـەک بێتـەلات، بـۆ قەستەسـەر (٢٩٥٦)
میهرەبانێـک گـەر کـو وشـیار کـا، ئـەتۆ　　ئـەژدیها هـات، ڕاکەنـەخوا، بـا ئـەتۆ (٢٩٥٧)
ڕەنگـەبێژی، لێـدەدەی فـاڵ، زۆر خـەراو　　فـاڵی چـی؟ هەسـتە، ببینـەتۆ، بـەچاو (٢٩٥٨)
دەمهـەوێ تـۆ، دەم لـەفاڵی بـەد، نـەجات　　تـۆ دەبـەم بۆ کۆشکی ڕوونو جێی حـەیات (٢٩٥٩)
ئـەو لـەپنهان بـوو خەبـەر دار وەک نـەبێ　　چـون دەبینـێ وا،کـەهیچ کـەس وای نـەدی[2] (٢٩٦٠)
گـەر تـەبیبێک پێـت بڵـێ قـۆرەی مـەخۆ　　چـون دەبـی بیمـار و ڕەنجـوور، بـەو ئـەتۆ (٢٩٦١)
گـەر بڵـەی فـاڵی بـەدت لێـدا، لـەبۆ؟　　ناسیحت مـوجریم حیساب کـرد جـا، ئـەتۆ (٢٩٦٢)

---

[1]- ئەنبییا کوتیان کەفاڵی پیس، هەر　　ڕاس لە نێوان گیانی ئێوە، دێتە دەر
[2]- چون دەبینی ئەو شتەکەس نەیدەدی (مصرع دوم)

گـەر مونـەججیم پێـت بڵـێ ئـەو ڕۆ ئـەتۆ    بـۆ فـلان کـار هـیچ مەکـە، ئامـادە،خۆ    (۲۹۶۳)
سـەت کـەڕەت گـەرکردیتی ئـەو درۆ    یەک دووجار ڕاست،بەو دەکەی باوەڕ، ئەتۆ    (۲۹۶۴)
قـەت نجـوومی ئێمەنـەیبوو هـیچ خـیلاف    سیحەتی وی، بـۆ لـەلای تـۆ چـۆ غـیلاف؟    (۲۹۶۵)
عیلمـی دوکتـوورو مونـەججیم بـوو گومـان    عیلمـی ئێمـە، بـوو بـەڵام، کەشـف و عـەیان    (۲۹۶۶)
دوود دەبیـنن ئـاگریش لـەو لای جیهـان    حەملـەدێنێـت ئـەو لـەبۆ لای مـونکیران    (۲۹۶۷)
تۆ دەڵەی ئەو دەم کەبەس کەن لەو خەبەر    چونکـەگفتی ئێوەهـەیتی بـۆ ن زەرەر    (۲۹۶۸)
تـۆ کەنابیسـی لەناسـیح، تـا ئەبـەد[1]    بچیەهـەرجێ، هـەر لەگەڵتـە، فـاڵی بـەد[3]    (۲۹۶۹)
گـەر لـەدووت بـڕوات مارێـک پـڕ خەتـەر    یـەک لـەبان، بـت بینـێ بـت کـا، باخەبـەر    (۲۹۷۰)
پێیدەڵـەی مەمکەغـەمین، خـۆ تکەخـەمۆش    ئەو دەڵێ،باش،تۆش بژی زۆر شادو خۆش    (۲۹۷۱)
گـەر کـو گرتـی مـار ئەسـتۆت ئـەو دەمـی    شـادی دەڕوا، غـەرقی نێـو دەردو غـەمی    (۲۹۷۲)
پێیدەڵەی بۆچ،وام دەکەی بانگ،ئەی فلان    بـۆ یەقـەت نـەدڕیو، نـەت کرد،تۆ فیغـان    (۲۹۷۳)
یـا لەسـەربان بـۆ چ بـەردت لێنـەدام؟    تـا لەمـەو زووع، چـاک ئاگـا دار ببـام[4]    (۲۹۷۴)
ئـەو دەڵـێ چـون تـۆ، منـت ئـازار دا    تۆش دەڵەی شادیت بەمن سەت بار دا    (۲۹۷۵)
ئـەو دەڵـێ کـردم جەوانمـەرد ی بەپەنـد    تـا نـەجاتت دەم لەسـەختی قەیـد و بەنـد    (۲۹۷۶)
حەققی ئەو چاکەت نەزانی بووی بەپەست    ئەزیـەتو ئازارمـت، تـۆ خستەدەسـت[5]    (۲۹۷۷)
هـەر وەهایەخەسـڵەتی پەسـتی دەنـی    بەد دەکا گەڵ ئەو کەسەی بیکا، خەنی[6]    (۲۹۷۸)
تۆ بەسەبرت نەفسی خۆت کە، مونحەنی    چـون بەچاکـە،چاک نـابێ، ئـەو دەنـی[7]    (۲۹۷۹)
گـەڵ کـەریمێک چاکەکـەی زۆر بـووڕەوا    ئـەو لـەباتی چاکەیەک،حـەو سـەت دەدا    (۲۹۸۰)
گـەر دەگـەڵ پەسـتێک بکـەی قەهروجـەفا    بـۆت دەبێتەبەندەیـەک، زۆر بـا وەفـا    (۲۹۸۱)

---

[1]- ئەی ئەوەی نابییەی لەناسیح، تا ئەبەد (مصرع اول)

[3]- ئەی ئەوەی نەت بیست لە ناسیح ،قەت چکات    بچیە هەر جی، فاڵی بەد هەروا، لە لات

[4]- تا لە مەوزووع چاک ئاگات کردبام (مصرع دوم)

[5]- ئەزیەت و ئازارمت تۆ گرتە دەست (مصرع دوم)

[6]- بەد دەکا گەڵ تۆ، ئەگەر بیکەی خەنی (مصرع دوم)

بەد دەکەن گەڵ ئەو کەسەی بیکەن، خەنی (مصرع دوم)

[7]- چون بەچاکە،چاک نابێ قەت، دەنی (مصرع دوم)

کـافران چانـدیان لـەنێو نیعمـەت جـەفا   جـا، لـەدووزەخ دا دەکـەن گـاز، (ربنـا ) (٢٩٨٢)

**حیکمەتی دروست کردنی دووزەخی دونیای دی، و زیندانی ئەو دونیایەتا مەعبەد و پەرستشگاهی موتەکەببیران بێ، کە(ایتیا طوعا او کرها )...**

گەرجەفادەی شەخسی پەست، سافی دەبێ   گـەرببینی ئـەو، سـەفا، جـافی دەبـێ (٢٩٨٣)

جێـی عیبـادەت جـا لـەبۆ وان دووزەخـە   بەنـدی تـەیری لاقـی بێگانـە، فەخـە (٢٩٨٤)

بـۆ دزو، پەسـتان، زینـدان مەعبـەدە   چـون لەوێـدا زیکـری خـالق بـێ حـەدە (٢٩٨٥)

بـۆ عیبـادەت چونکـەبوو خـەڵقی بەشـەر   بـۆ عیبادەتگـاهی گەردەنکـەش، سـەقەر (٢٩٨٦)

دێ لەدەسـتی ئـا دەمـی خۆ،زێـدەکار   غەیری تاعەت، نەیبوو قەست، لەو کردگار (٢٩٨٧)

(ماخلقـت الجـن والانـس ) بێنـەڕوو   غەیری تاعەت، قەست، لەدونیا، هیچ نەبوو (٢٩٨٨)

چـاو کتێـب نوسرا فـەقـەت بـۆ خوێنـدنێ   خـۆ دەبێ، ئـەو یـەک لـەبن سـەر دابنـێ[1] (٢٩٨٩)

خـۆ بـەڵام بـاڵنج لـەوی مەقسـوود نـەبوو   قەسـتی غـەیری دانیشی پـڕ سـوود، نـەبوو (٢٩٩٠)

گەرلـەجێی بزمـار، شـیرت بـرد بـەکار   تۆشکەسـتت خـوارد لەشـەڕ،کردت فـەرار (٢٩٩١)

گـەرچی مەقسوود ئیهتیداو دانیش، لەناس   یـەک بەیـەک بـوو یانْ عیبادەتگاهی خاس (٢٩٩٢)

مەعبـەدی ئینسـانی بـاش، ئیکرامـی وی   مەعبـەدی ئینسـانی بـەد، ئیسـقامی وی (٢٩٩٣)

لێدەپەسـتان تـا ئـەوان وێـت سـەر بـدەن   وێدەباشـان، تائـەوان وێـت، بـەر، بـدەن[2] (٢٩٩٤)

لاجـەرەم حـەق چادەکـا، دوو مەعبـەدان   جا، بەهەشت بۆ باش و، دووزەخ بۆ بەدان[3] (٢٩٩٥)

دەرکی قودسی چووکەکرد مووسایی تـوور   تـاکو مـەغروور سـەر نـەوی کـا بێتـەژوور (٢٩٩٦)

چون ئەوان مـەغروور بوون زۆر خۆ خـوواز   دووزەخەئـەو دەرکەچووکـە، جێـی نیـاز (٢٩٩٧)

---

[1]- خۆ دەبێ ئەو یەک لەبن سەر خۆ، بنێ (مصرع دوم)

[2]- گەر لەپەستان تۆ بدەی ،وێت سەر دەن   گەر بەباشان تۆ بدەی ،وێت بەردەدەن

[3]- لاجەرەم دوو مەعبەدی چاکرد خودا   بۆ کەریم جەننەت ،بەبەد ، دوو زەخ دەدا

**بەیانی ئەو مەتڵەبەکەخوداوەند سوورەتی پادشایانی بەسەبەبی موسەخخەرکردنی جەبباران کە بۆ خوداوەند موسەخخەر نین دروست کردووە، وەکوو مووسا (ع) دەرکێکی چووکەی لە بەیتولموقەددەس چاکرد بۆ ڕکووعی جەببارانی بەنی ئیسرائیل لەوەختی هاتنەژوور دا (ادخلوا الباب سجدا وقولوا حطه)...**

وەک لەئێسکو گۆشتی پادشایان، وەدوود          دەرکەکی چووکەی دروست کرد بۆ ورووود (٢٩٩٨)

ئەهلی دونیا تاکو سەجدەی بەن، بەوان          دوژمنن چونکەبەسەجدەی خوای جیهان (٢٩٩٩)

یەک زەباڵەدانی کرد میحرابی وان          ئیسمی ئەو میحرابە، میر و پاڵەوان (٣٠٠٠)

ئێوەنین لا ئیق بەدەرگای، بێ هەواڵ          نەیشەکەر پاکانو، ئێوەش نەی بەتاڵ (٣٠٠١)

خازعن بۆ ئەوسەگان پەستانی خوار          پەیرەوی وانی لەخۆ دی، شێر بەعار (٣٠٠٢)

بۆ پشیلان بوون مشکان ژێر دەست          با لەشێران قەت نەترسێ، مشکی پەست[1] (٣٠٠٣)

ترسی مشکان بوو لەسەی پەر وەردگار          کوا، لەڕۆژی کردگار ترسان، چ جار؟ (٣٠٠٤)

(ڕبی الا علا) یە، ویردی ڕۆژی حەق          (ڕبی الادنی ) بەنادان، موستەحەق (٣٠٠٥)

مشک ناترسێ لەشێرانی مەساف          بەڵکەهەڵدێ، ئاسکەکەی بۆن خۆش ناف (٣٠٠٦)

تۆش ئەی پەست بگرە کۆمەک هەر لەپەست          بیبەپێش وی تۆ لەبۆکۆ مەک،دوو دەست (٣٠٠٧)

بەس بکەم، زیاتر نەڵەم لەو باسەبا          چون دەبن توورە، کەواڵەن، میر و شا (٣٠٠٨)

بووخولاسەی ئەو هە، بەد کە، ئەی کەریم          گەڵ لەئیمان، دابنێ تا، سەر، لەئیم[2] (٣٠٠٩)

ئەوکەسەی گەڵ نەفسی بەد ئیحسان دەکا          وەک لەئیمان، نەفسی بەد،کفران دەکا[3] (٣٠١٠)

هەر لە بۆیە ئەهلی میحنەت شاکیرن          ئەهلی نیعمەت ناسپاسن، ماکیرن (٣٠١١)

ناسپاس و سەر کەشن شاهو ئەمیر          شاکیرو ئارامەهەر کەس بوو فەقیر (٣٠١٢)

کوا لەبۆ شوکرێ سەبەب بوو ن موڵک وگەنج؟          باعیسی شوکرن فەقەت هەردەردو ڕەنج (٣٠١٣)

---

[1]- شێری ناکا گەورە، ترسی مشکی پەست (مصرع دوم)

[2]- گەڵ لە ئیمان، تاکو سەر دانێ لەئیم (مصرع دوم)

[3]- ئەهلی نیعمەت سەرکەشن ، هەم ماکیرن (مصرع دوم)

**داستانی عاشق بوونی سۆفی بەسفرەی خاڵی ...**

**خولاسەی داستان ...**

دەروێشێک ڕۆژێک لەجێیەک سفرەیەکی خاڵی دیت کە هەڵا وەسرابوو، جێ بەجێ بەشەو قو هەیەجانی وی، وە دەست تەکاندانو ڕەقس و سەما کەوت، و کراسەکەی دڕی و بانگی کرد کە ئەی فەقیر و بێنەوایان ئەو هەیەویست و ئومێدی بێنەوایان .. کەمکەمە دەروێشی دیکەش وە شەوق و زەوق کەوتن، و دەگەڵ وی شادی و سەمایان دەست پێ‌کرد، لەو کاتەدا یەک نەفەر فزوول کە ئەو حاڵەتە عاشقانەی دیبوو،کوتی ئەی بابا ئەو هەراو هوریایەتان بۆ چییە؟ سفرەیەکی بێ نان و،بەبزمارێک هەڵاوەسراو ئیحتیاجی بەو هەموو سەرو سەدایەنییە، سۆفی پێیکوت بڕۆ، تۆ کەنەخۆت دەناسی ونەلەعیشقی حەقیقی خەبەرت هەیە، عاشقانی سادق بەکەمەندی نەبوونی بەزاهیر بوون، ئەسیر نابن...

سۆفییەک دی، سفرە سەربزمارەکی — دەیدڕی ئیقەو دەرەقسی، جارەکی (٣٠١٤)

بانگی کرد ئەوهە، نەوایی بێ نەوا — هات عیلاجی دەرد و ڕەنجی بێ دەوا (٣٠١٥)

شەوقو زەوقی چونکە زۆر بۆ هاتە دی — کۆوە بوون دەور و بەری سۆفی دەدی (٣٠١٦)

پێکەنین و هایو هویان بوو،بەکار — جار دەبوون بێهۆ ش و، هوشیار جارو بار (٣٠١٧)

یەک فزوول پێیکوت لەبۆ غەوغا دەکەی؟ — تۆ لەبۆ سفرەی بەتاڵ، بۆ وا دەکەی؟ (٣٠١٨)

پێیدەکوت تۆ نەقشی بێ مەعنای، بڕۆ — هەستی خواز بە، دوور لەعیشقی، خۆ ئەتۆ (٣٠١٩)

عیشقی نان، بێ نان، غەزایی عاشقە — بەندی هەستی نابێ، هەرچی سادقە (٣٠٢٠)

عاشقان نایان هەوێ خۆ، قەت وجوود — عاشقان دەگرن بەبێ سەرمایە، سوود (٣٠٢١)

هەڵفڕین بێ باڵ ئەوان دەوری جیهان — گۆ، لەمەیدان دەر دەکەن بێ دەس، ئەوان (٣٠٢٢)

ئەو فەقیرەی بۆی لەمەعنی هات، بۆن — ئەو بەیەک دەس چای دەکرد زەنبیل،چلۆن (٣٠٢٣)

چون ژییانی عاشقان بوو، نێو عەدەم — ڕەنگ و نەفسی موتتەحیدیان بوو، بەجەم (٣٠٢٤)

کوا دەزانێ، شێرخۆر تامی غەزا — بۆ پەری، بۆن بوو غەزا، ئەی مورتەزا (٣٠٢٥)

کوا لەوی بۆ ئا دەمی بۆن دێ، چ جار؟ — چون دەگەڵ یەک ئەودووخوون، ناسازگار (٣٠٢٦)

لەززەتێکی دێ لەبۆن ڕا بۆ پەری — تۆ لەخۆرا ک ناتوانی ئەو بەری (٣٠٢٧)

بوو بەخوێن بۆ قیبتییان ئەو ئاوی نیل[1] خۆ بەڵام بۆ سیبتییان ئاوی جەمیل (٣٠٢٨)
بوو بەڕێ، بۆ قەومی ئیسرائیل، یەم بوو بەجێی خنکانی فیرعەونو خەدەم (٣٠٢٩)

**مەخسووس بوونی یەعقووب (ع) بەخواردنەوەی جامی حەق لەڕووی یووسوف ...**

ڕوویی یووسوف چاوی یەعقووب،وای دەدی نەیدەدی وا، قەت برا و خەڵکی دەدی (٣٠٣٠)
یەک لەتاو، وی چاڵ لەبۆ خۆی چادەکا یەک لەداخان ئەو لەنێو چاڵ ڕا دەکا (٣٠٣١)
لای برا سفرەی بەتاڵ بوو، ڕووی وسوو پڕ لەلای یەعقووب لەنانی خۆش بوو (٣٠٣٢)
کوا دەبینێ چاوی ناپاک ڕوویی حوور؟ نوێژ کەمەقبووڵ نابێ (الا بالطهور) (٣٠٣٣)
بۆ گیانان عیشقەبەس خۆ راکیان بۆیەجووع بۆقووت، بۆ گشت ڕووح و گیان (٣٠٣٤)
هەیبوو یەعقووبجووع بەیووسوفچەشنینوور بۆنی نانی یووسو فی بۆ هات لەدوور (٣٠٣٥)
ئەو کەسەی هێنای کراس زۆرتوند بەغار بۆنی یووسوف لەو کراس نەی کرد چ جار (٣٠٣٦)
ئەوکەسەی سەت فەرسەخان لەودووربوو چونکەیەعقووب بوو،دەهات بۆی بۆن، زوو (٣٠٣٧)
زۆرهەنەعالم لەدانیش بێ نەسیب حافیزن بۆ عیلم و دانیش نەک حەبیب (٣٠٣٨)
موستەمیع بۆی دێ لەوی، بۆ ن بۆ مەشام گەرچی بێ، ئەوموستەمیع جینسی عەوام (٣٠٣٩)
چون لەدەستی وی کراس بوو عارییە وەک لەدەس دەڵلاڵ بێتن جارییە (٣٠٤٠)
لای دەڵاڵ قەدری کەنیز بوو سەر سەری دەیهەوێ چون ئەو بداتەموشتەری (٣٠٤١)
ڕزقی عالەم هەربەدستی خوایەبەس کەس لەدەستی نایەببڕێ ڕزقی کەس (٣٠٤٢)
یەک خەیاڵی خۆش دەبێ،یەک باغی خۆش یەک خەیا ڵی بەد، دەبا، ئینسان لەهۆش (٣٠٤٣)
هەرخودا باغێک لەوەهمێک چادەکا یا لەوەهمێک دووزەخێک بەرپا دەکا (٣٠٤٤)
جا لەکێ مەعلوومەڕێی گوڵزاری وی؟ کێ دەزانێ کوێیەجێگەی ناری وی؟ (٣٠٤٥)
وەختی گەشت، دڵ کوێربوو دیدەبانی وی دێ خەیاڵ لای کام تەرەف لەگیانی وی (٣٠٤٦)
گەرخەیاڵی باتڵی دیبایە، دڵ هەرچی باتڵ با، خەیاڵ دەینایە،گڵ[٣] (٣٠٤٧)
کەی دەکا جاسووس لەڕێگایەک گوزەر؟ زۆر بەرین بێ، پرکەمین بێ،پڕ خەتەر (٣٠٤٨)

---

[1]- خوێن دەبێ بۆ قیبتییان ئەو ئاوی نیل (مصرع اول)

[٣]- هەرچی باتڵ با، خەیاڵ ،دەینا، لەگڵ (مصرع دوم)

چەشنی کوێر دامێنی فەزلی بگرە دەس — قەبزی کوێر هەر ئەوهەیە، ئەی خۆش نەفەس (٣٠٤٩)
دامەنی وی یەعنی هەر فەرمانی وی — بەختەوەر ئەوکەس، کەتەقوا،گیانی وی (٣٠٥٠)
یەک دەژی لای جۆگەئاوو، مێرغوزار — یەک دەژی لای دەرد و ڕەنجی بێ ژمار (٣٠٥١)
زۆر عەجەب لەو بەختەوەر ما، ڕەنجبەر — وەک عەجەب لەو ڕەنجبەرما،بەختەوەر (٣٠٥٢)
بۆچی وشکی؟ لێرەزۆرن کانیاو — بۆچی زەردی؟ لات دەوا هەن بێ حیساو (٣٠٥٣)
تۆش لەبۆ چیمەن وەرەئەی هەمنشین — ئەو دەڵێ من جێم لەنێو چیمەن، چ نین[1] (٣٠٥٤)

**داستانی ئەمیر وغولامی وی کەزۆر بەنوێژ و موناجات عەلاقەمەند بوو...**

**خولاسەی داستان ...**

لەڕۆژگاری ڕابوردوودا ئەمیرێک غولامێکی بەنێوی (سونقوڕ) هەبوو،لەیەکێک لە بەرەبەیانان دا ئەمیر ویستی کەبڕواتەحەمام بانگی غولامەکەی کرد کەئەی سونقوڕ لەخەو هەستەوئەسباب و لەوازم ئامادەکە، دەمهەوێ بچمەحەمام،سونقوڕ جێ بەجێ جام و حەولەی ئاما دەکردو وەڕێ کەوتن، لەسەر ڕێگا، مزگەو تێکیان دی کەدەنگی بانگ لەمنارەکانی دەهات، سونقوڕ چونکەزۆر بەنوێژو موناجات عەلاقەمەند بووکوتی ئەی ئەمیر کەمێک لێرەڕاوەستەهەتا ئەمن دەچمەمزگەوت ونوێژ دەکەم، پاش ماوەیەک ئیمام وجەماعەت نوێژیان تەواو کرد ولەمزگەوت وەدەر کەوتن، بەڵام ئەمیر هەر مونتەزیرما، وسونقوڕی لەنێو ئەو جەماعەتەدا نەدی، دوو بارەسەبری کرد بەڵام دوو بارەخەبەرێک لەو نەبوو، تا کو ئەمیر لەدەرکی مزگەوت بانگی کرد .. ئەی سونقوڕ بۆ لەمزگەوت نایەدەر؟ سونقوڕ جوابی داوە.. ئاخر ئەو نایەڵێ کەئەمن بێمەدەر، ئەمیر پێیکوت کەس لەمزگەوت دا نەماوە، کێ نایەڵێ کەئەتۆ لەمزگەوت بێیەدەر؟ سونقوڕ پێیکوت هەمان کەسێک کەنایەڵێ ئەتۆ بێیەمزگەوت ...

بوونیازی میربەحەممام یەک سەحەر — سونقوڕی گازکرد، وا، هەڵبێنەسەر (٣٠٥٥)
جام و حەولەو گڵ، لەئالتوون وەرگرە — تا لەبۆ حەممام بڕۆین ئەی خۆش ورە (٣٠٥٦)
سونقوڕئەودەم جام وحەولەی زێدەباش — گرت و ڕۆیین دوو بەدوو، وەک یولداش (٣٠٥٧)
بوولەسەر ڕێ مەسجدێک دەنگی ئەزان — هاتەگوێی سونقوڕ کەبیستی ئەو زەمان (٣٠٥٨)
زۆر بەشەو قی نوێژ سونقوڕ بوو ئەسیر — پێیدەکوت ئەی سەر وەری من ئەی ئەمیر (٣٠٥٩)

[1]- بێرەبۆ نێو چیمەن و گوڵزار، ئەتۆش ئەو دەڵێ توانام نییە، بۆ جێی خۆش

ڕابوەستەتۆ ئەلەو دووکانە،کەم | تا دەخوێنم ( لم یکن ) نوێژیش دەکەم (٣٠٦٠)
کاتێ هاتن بۆ دەرێ قەوم و ئیمام | کردییان نوێژو دوعای خۆیان تەمام (٣٠٦١)
ما، لەوێ سونقوڕ هەتا لای چێشتان | مونتەزیر ما، میر لەوێ، تا یەک زەمان (٣٠٦٢)
دەیکوت ئەی سونقوڕ لە بۆ نایەی دەرێ؟ | پێیدەکوت، زانا بەفەن لێم ناگەڕێ[1] (٣٠٦٣)
حەوسەلەت بێ ئێستەدێم ئەی ڕەو شەنی | دائیمەن تۆ هەر لەقەلب و گوێی منی (٣٠٦٤)
حەو کەڕەت سەبری دەکرد، بانگی دەکرد | تا بەتەئخیر، حەوسەلەی میری دەبرد (٣٠٦٥)
جوابی هەروا بوو کەدەیکوت ئەی ئەمیر | نایەڵێ بێم، لێرەکردوومی ئەسیر (٣٠٦٦)
پێیدەکوت خۆ کەس نەما، بۆ نایەدەر؟ | کێ دەکا مەنعت، ئەتۆی کرد دەس بەسەر (٣٠٦٧)
دای جەواب، ئەوکەس کەتۆ ی ڕاگرت لەدوور | ڕای دەگرت ئەمنیش وەکوودیتت لەژوور (٣٠٦٨)
ئەو کەسەی مەنعت دەگا، تۆ بێیەژوور | نایەڵێ ئەو، من لەمەسجید بم بەدوور (٣٠٦٩)
ئەو کەسەی نەیهێشت بێ، بۆ ژوور دوپێت | بەستی دوو پێی عەبدی خۆی نەیهێشت کەبێت (٣٠٧٠)
نایەڵێ، یەم، ماسییا ن لێی بن، بەدوور | نایەڵێ یەم، خاکییان لێی بێنە ژوور (٣٠٧١)
ئەسڵی ماسی ئاو، ئی حەیوان گڵە | هەرچی تەدبیر بێت لێرە، باتڵە (٣٠٧٢)
بەس خودا دەیکاتەوە، قفڵی قەزا | بگرەتەسلیم بگرەتۆ ڕێگای ڕەزا (٣٠٧٣)
گەر هەموو زەڕڕاتی عالەم، بن، کلیل | ناوەبێ ئەوقفڵە، گەر نەیکاجەلیل (٣٠٧٤)
گەرفەرامۆشت ببێ تەدبیری خۆت | بەختی وا جوان پێت دەدا، جا، پیری خۆت[2] (٣٠٧٥)
خۆت لەبیرچێ گەر ئەتۆ، یادت دەکەن | بەندەبی باش، ئەودەم ئازادت دەکەن[3] (٣٠٧٦)

### نائومێدبوونی ئەنبیا لەهیدایەتی مونکیران ..( حتی اذا استیاس الرسل ) ...

ئەنبیا کوتیان بەخۆیان ئێمەچەند | ئەو نەفامانەبدەین،هەر وەعزو پەند؟ (٣٠٧٧)
ئاسنی ساردمان زۆر کوتا بێهوودەبوو | نێو قەفەسمان بێحیساب کرد، ئێمە، فوو (٣٠٧٨)
مەعدەنی ئەفعال، قەزا، هەم وەعدەیە | باعیسی تیژی ددانان مەعدەیە (٣٠٧٩)
ڕیشەبەد بێ، بەد دەبێتن بەرگو بەر | بۆ گەنیوی کلکی ماسی د ێ، لەسەر (٣٠٨٠)
ڕووکەتاعەت،تۆ بەڵام هەر چەشنی تیر | چونکە(بلغ ) بوو بەگفتی خوای قەدیر (٣٠٨١)

---

1- دەیکوت ئەی سونقور لەبۆ ماوی لەوێ؟ پێیدەکوت زانا بەفەن وای لێم، دەوێ
2- بەختی وا جوان پێت دەگا، لەو پیری خۆت (مصرع دوم)
3- گەر لە بیرت چێت خۆ تۆ، یاد دەکەن بەندەبە، ئەودەم ئەتۆ، ئازاد دەکەن

باشـــی یابـــەد،خۆ لـــەتۆ مـــەعلووم نییـــە تـۆش تـەلاش کـە، تێبگـەی، ئەسڵت، چییـە (۳۰۸۲)
دابنێـی گـەر پشـتی کەشـتی بـار ئـەتۆ بێ تـەوەککول کـوا دەکـەی ئـەوکا ر، ئـەتۆ؟ (۳۰۸۳)
تـۆ لـەدوولا نیتـەهیچ عـیلم و خەبـەر ڕەســتگاری یانەغــەرقی لــەو ســەفەر (۳۰۸۴)
گەربڵـەی تـا مـن نـەزانم کێهەمـە دوژمـنم، بـۆ هـەرچی کەشـتی نێـو یەمـە[1] (۳۰۸۵)
مـن ئەلـەو ڕێگایـەناجیم، یانـەنا[2] لـێم عـەیان کـەتۆ، ئـەمن نـاچم دەنـا (۳۰۸۶)
مـن بەشـک نـاچم ئەلـەو ڕێگایـە، قـەت چەشنی خەڵکی هەر بەیەک هیوا، فەقەت (۳۰۸۷)
تـۆ تیجـارەت نـاتوانی وەک، چ کـەس چونکـەئاگا بـەو دوولایـە، خوایـە، بـەس (۳۰۸۸)
گـەر بترسـێ تـاجرێکی شووشـەگیان خـۆ، چکـات ناکـات ئـەو سـوودو زییـان (۳۰۸۹)
بەڵکـەبوو، بـێ بـەش، زییـانیش زێـدەزۆر چونکـەدەبێ نوورکەسـێ، بـێ، شـوعلەخۆر (۳۰۹۰)
بـەس ئومێد بـوو ژێر بـەنای کاران، یـەقین تـا نـەجاتت بـێ لـەوی، تـۆ بگـرەدین (۳۰۹۱)
دەرکی حـەق تۆ نابێ لێدەی ئـەی جـەناب هەرئومێـدت بـێ لەحـەق، دانـای سـەواب (۳۰۹۲)

**بەیانی ئەو مەتڵەبەکەئیمانی موقەللید هەر خەوف و ڕەجایە...**

عیللـەتی کـارن ئومێـدەو ئـارەزوو گـەرچی ملیـان بـوو بەکۆشیش وەک دەزوو (۳۰۹۳)
دەچنـەلای دووکـان، سـبەینان زێـدەزوو ڕزق و ڕۆزیـان چـون ئـەوان بـوو ئـارەزوو (۳۰۹۴)
پێـت نـەگا لـەو ڕێیـە، ڕەنگـەڕزق و مـاڵ بـۆ دەڕۆی تـۆ وا بەشـەو ق و خۆشـحاڵ؟ (۳۰۹۵)
خەوفی حیرمانی ئـەزەل، بۆ کەسبی قووت لای نـەنا بـۆچی لەجسـتو جـۆت ڕووت؟ (۳۰۹۶)
تۆ دەڵەی گەر ترسی حیرمان بێ لەپێش تەنبـەڵی خـۆ، زێـدەدێنێ، دەرد و ئـێش (۳۰۹۷)
زیـاد دەبـێ هیـوام تەلاشـم بـێ ئەگـەر تەنبـەڵی بـۆم چادەکـا، زیـاتر خەتـەر (۳۰۹۸)
بـۆ لـەکاری دیـن ئـەدی ئـەی بـەدگومان دامـەنت دەگرێـت ئـەو خـەوفو زییـان؟ (۳۰۹۹)
خـەڵکی ئـەو بـازارە، تـۆ نـەت دیـوە، یـا چـاو لەسـوودی ئـەو لییـاوو ئـەنبیا (۳۱۰۰)
چـون ئەلـەو دوکانـەبۆیان هات،کـان چەندەلـەو بازاڕەسـوودیان بـرد ئـەوان (۳۱۰۱)
ئـاگری سـوور جـا، دەبـۆ خـەڵخاڵی وان بـەحری مـەوواج، جـا دەبـۆ حـەمباڵی وان (۳۱۰۲)

---

[1]- دوژمنی من هەرچی کەشتی نێو یەمە(مصرع دوم)
[2]- من ئەلەو ڕێگا، دەخنکێم یانەنا (مصرع اول)

ئاسـنیش بـۆ وان، ڕام، وەک مـووم دەبـوو بـا، لـەبۆ وان بەنـدەبوو، مـەحکووم دەبـوو (٣١٠٣)

**بەیانی ئەو مەتڵەبە کە حەزرەتی ڕەسوول (ص) فەرمووی (ان للەتعالی اولیاء اخفیاء)...**

یـەک گرووهـی دیکەهـەن پنهـان دەژیـن شـوهرەتو نیـوو نیشـان، بـۆ وان، چ نـین (٣١٠٤)

بـەو هـەموو، والا مـەقامی وان، چ کـەس گـەورەیی وانـی نـەدی قەت،یـەک نەفـەس (٣١٠٥)

نێـو حـەرەم بوون،گـەڵ کەرامـەتیان نیهـان هـیچ لەئەبـدالان، نـەیان بیسـت نێـوی وان (٣١٠٦)

یانەنـەت بیسـت لـوتفی زاتـی لـەو سـەرە بانـگ دەکـا وا، تـۆ لـەبۆ ئـەو لا وەرە (٣١٠٧)

شـەش جیهـاتی عالـەمێ، ئیکرامـی وی چـاو لەهـەرجێگا، بکـەی، ئیعلامـی وی (٣١٠٨)

گـەر کـەریمێک پێبکـوتی، نێـو نـار، بـڕۆ زوو بـڕۆ سـووتان نەترسـێنێ ئـەتۆ (٣١٠٩)

**حیکایەتی دەتەندوور هاویشتنی دەسرەی ئەنەس(رض ) ونەسووتانی ئەو دەسرەیە...**

**خولاسەی داستان ...**

کابرایـەک دەگـەڵ چەنـد نەفـەرێک بـوو بـەمیوانی ئەنەسی کوڕی مالیک، پاش غـەزاخواردن ئەنەس موتەوەججیەبوو کەدەسماڵی سەر سفرە، زەردوچڵکن بووە، بەکەنیزی خۆی کوت بڕۆ ئـەو دەسـماڵەدەنێو ئـاگری تەنـدوور باوێ،کـەنیزجێ بـەجێ ئـەو کـارەی ئـەنجام دا میوانـەکان مونتـەزیر بـوون کـەدوو کـەڵێکی ڕەش لەتەنـدوور بێتـەدەر، بـەڵام زۆر بـە تەعەججوبـە وە موتەوەججیـە بـوون کەخەبـەرێک لەدووکـەڵ نییـە، دوای چەنـد دەقیقـان کـەنیـز چووکەدەسـماڵەکەی بـێ حـەد سپی ببـوو لەتەنـدوور هینـا یـەدەر، میوانـەکان لـەدیتنی ئـەو مەنزەرەیـەزۆر تەعـەججوبیان کـرد، عیللـەتیان پرسی، ئەنـەس کوتی ..چونکەحـەزرەتی ڕەسوول (ص) چەنـد جاران،دەسـت و ڕووی موبـارەکی بـەو دەسماڵەئەسـترپوەتەوە، ئـاگر زەرەر بـەو نـا گەیەنێت،لەو کاتەدا کەنیز بەمیوانەکانی کوت هـەر کات پیاوانی خـودا بـەمن دەستوو ر بدەن کـەخۆت دەنێو ئاگر باوێ، جێ بـەجێ ئـەو کارەئـەنجام دەدەم چونکەبەگـەورەپیاوان ئیعتیقـادی ڕاسیخم هەیە...

وا، ڕیوایـەت بـو کـەڕۆژێکی ئەنـەس بوون بەمیوان،لەو کەسێ،گەڵ چەند کەس (٣١١٠)

وای حیکایـەت کـرد، کـەپاش خـۆراکی زۆر دی ئەنـەس دەسـماڵی سـفرەی، زەردو بـۆر (٣١١١)

زیـندەچڵکن، پێیـدەکوت تـۆ ئـەی کـەنیز بیخەتەنـدوور، ڕا مەوەسـتە، چەشـنی زیـز (٣١١٢)

خسـتیەنێو تەنـدووری پڕئـاگری لـەجۆش جـێ بـەجێ دەسـماڵی سـفرە، ئـەو بـەهۆش (٣١١٣)

مـات دەمـان لـەو کـارە، میوانـان هـەموو ئینتیـزاری دوو کـەڵی زۆر یـان، هـەبوو (٣١١٤)
جـا دەری هینـا لەپاشـان لـەو تـەنوور زۆر سپیو پاک، چڵکی پیس لەو بوو، بەدوور (٣١١٥)
قـەوم کوتیـان ئـەی سـەحابی، ئـەی عـەزیز بـۆ نەسـووتا، بەڵکـەبوو زۆر زۆر تـەمیز (٣١١٦)
پێیکـوتن چـون ئەحمـەدی وا نامـدار دەسـت و لێـوی دەسترێ بـەو جـارو بـار (٣١١٧)
ئـەی دڵـی ترسـاو لـەئاگر هـەم عـەزاب تـۆ لەدەسـت ولێـوی وا کـە، ئیقتیـراب (٣١١٨)
گـەر جـەماد لـەو عیززەتـی والـەی دەدی قـەلبی عاشـق چـی لـەوی بـۆ دێ، ئـەدی؟ (٣١١٩)
خـۆڵی کەعبـە، بـوو بەڕووگـە، هـەر لـەوی خۆڵی بن پێی شەخسی پاک بە، ئەی قەوی (٣١٢٠)
جا دەیان کوت پاش ئـەوەی، بـەو خادیمـە بێژەحـاڵی خـۆت ئێسـتاکە، بەمـە (٣١٢١)
بـۆ بـەگفتی ویـت فـڕێ دا دەسـرە، زوو وا گریمـان کرد،زانـای رازبـوو (٣١٢٢)
تـۆ لـەبۆ دەسـماڵی سـفرەی، پـڕ بـەها[1] خسـتەنێو تەنـدووری پـڕ ئـاگر، وەهـا؟ (٣١٢٣)
پێیکـوتن پاکـان لـەبۆم جێـی ئیتمینـان نائومێـدی لـوتفی وان نـیم، هـیچ زەمـان (٣١٢٤)
هـیچ نییـەخۆ، د ەسـتماڵێکی پـەڕۆ گـەر بڵـێ ئـەو، تـۆ لـەبۆ نێـو نـار، بـڕۆ (٣١٢٥)
دەچمەنێو نار مـن بەبێ شک ئەی جەناب چـون ئومێـدم بـوو لـەپاکان، بێحیسـاب (٣١٢٦)
دەسرەهیچ، مـن دا دەنـێم سـەر نێـو نـار چـون بـەپاکان ئیعتیمـادم بـوو، بـەیار (٣١٢٧)
خـۆت ئەلـەو ئیکسـیرە، دە، تـۆ ئـەی بـرا کـەم مەکەسـیدقت لـەوەی، ژن پێـی درا (٣١٢٨)
قـەلبی پیـاو کـەم بێ لەقـەلبی ژن، ئەگـەر زۆر لـەزگ کەمتربوو ئـەو، زۆر بێ سـەمەر (٣١٢٩)

**داستانی گەیشتنی ڕەسووڵ(ص) بە فەریادی کاروانی عەرەب کە بە تونیایەتی و بێ ئاوی لـە سـەحرادا مابوونـەوە، و خۆیـان و وشـترەکانیان لـە تونیـان زبانیـان کێشـابوو و مونتەزیری مردن بوون ...**

**خولاسەی داستان ...**

لەبیابانێکی وشک و گەرم کاروانێکی عەرەب بەبێ ئا و مابوونەوە.. و هەڵۆی ڕەشی مردن باڵی بەسەر وان دا کێشا بوو ..لەو کاتەسامناک و نا خۆ شەدا بوو کەپێغەمبەری ئەکرەم (ص ) گەیشتێ و فـەو رەن بەتیعـدادێک لـەوانی فـەرموو هـەرچی زووترەبـڕۆن بـۆ ئـەو بـەری ئـەو

---

[1]- تۆ لە بۆ دەسماڵی وا باش ، پڕ بەها (مصرع اول)

تەپۆڵکەخیزانە.. کاروانچیەکان پرسیان یا ڕەسوول اللەمەگەر لەو بەری ئەو تەپۆڵکەخیزانەچ خەبەرە؟ فەرمووی لەو بەری ئەو تەپۆڵکەخیزانەغولامێکی ڕەش بەمەشکێکی پڕئاو بە وشترەکەی خۆی دەڕوا،بڕۆن بەهەر جوورێک بێ، ئەو ی بیننەئێرەئەو جەماعەتەچوونەئەو بەری تەپۆڵکەخیزەکان وەهەر وەکوو پێغەمبەر(ص)فەرموو بووی غەلامێکیان دی کەسواری وشترە و مەشکێکیشی ئاو پێیە.. ئەو جەماعەتەغولامەکەیان بۆ خزمەت پێغەبەر(ص) هینا، لەحاڵێک دا کە ئەو غولامە پێغەبەر و مەقامی بەرزی وی نەدەناسی.. پێغەبەر(ص) بە کاروانچیەکانی فەرموو لەو ئاوەی کەدەمەشکەی ئەو غولامەدایە، وەخۆن وکەمێکیش بۆ خۆتان پاشەکەوت بکەن ئەو تینوانەهەموویان لەو مەشکەئاویان خواردەوە،وشترەکانیشیان تێرئاوکردن وتەواوی مەشکەی خۆشیان پڕئاو کرد، تا لەکاتی بێ ئاوی دا زەخیرەبێت، وپاش ئەو هەموو ئاو بەتاڵ کردنەش هێشتا مەشکەی ئەو غولامەهەر پڕ لەئاوبوو .. تەواوی حازران لەو موعجیزە و خارقولعادەیەماتو سەرسام مان،غولام لەدیتنی ئەو موعجیزەی ئیلاهی گۆڕا و نووری ئیمانی کەوتەقەلبی، وئیمانی بەپێغەمبەری هینا،پێغەمبەر(ص)دەستی بەسەری ئەو غولامەدا هینا و فەو رەن رەنگی ڕەشی وی بەسپی گۆڕا جا ئەو دەم پێغەمبەر بەوی فەرموو، ئێستا برۆ بۆ مەنتیقەی خۆت وئەو خەبەرەیان بۆ بگێڕەوە..غولام بەوشترو مەشکی پڕلەئاو چۆوەماڵی ئەربابی خۆی کاتێک کەگەیشتەماڵی ئەرباب، ئەرباب ئەوی نەناسی وپێیوابووکەئەوکابرایەغولامەکەی وی کوشتووەوبەمەشکەو،وشترەوەبۆ لای وی دێ کاتێک کەئەرباب دەگەڵ وی ڕوو بەڕوو بوو نەیناسی وسۆراغی غولامی خۆی لەوی دەپرسی وپاش جواب و سوئالێکی زۆر تێگەیشت کە ئەو جەوانی سپی بێست وجوان هەمان غولامی ڕەشی خۆیەتی ...

بوولەسەحرادا گرووهێکی عەرەب — ئاو نەبوو، مان وشک مەشک وشک لەب (٣١٣٠)

مان ئەلەو سەحرایەزۆر حەیران ومات — دەنگی لای لای مردنیش بۆ وان دەهات (٣١٣١)

ناگەهان هات یاوەری هەر دوو جیهان — مستەفا هات، هەر لەبەر کۆمەک، بەوان (٣١٣٢)

دی لەوێ کاروانی گەو رەو دوو ر لەبەخت — وان لەسەر گەرمایی خیزو، ڕێگەسەخت (٣١٣٣)

وشترانیان گشت زبانیان بوو لەدەر — خەڵکەکەش کەوتوون لەسەرخیز، بێ خەبەر (٣١٣٤)

ڕەحمی هاتو، پێیکوتن زوو، چەند یار — بچنەلای ئەو تەپکەخیزانەبەغار (٣١٣٥)

مەشکی ئاو یەک ڕەش،بەوشتر، وا، دەبا — دەچتەلای ئەربابی خۆی توند،چەشنی با (٣١٣٦)

ئەو ڕەشی وشتر سەوار، گەر چوونەوێ — بێننەلای من، بێ هەوێ یا نەیهەوێ (٣١٣٧)

هاتنەلای ئەو تەپکەخیزانەئەوان    ڕاستیان دی گفتی پاشای دوو جیهان (٣١٣٨)
ڕەش غولام دەڕوا،بەوشتر چەشنی با    چەشنی سەو قات مەشکی پڕ ئاو ئەو، دەبا (٣١٣٩)
جا دەیان کوت بەوکەدەی وێ،بچیەلای    لەو تەڕەف مەحبووبی بێ هەمتای خودای (٣١٤٠)
پێیکوتن ئەوکێیە؟ نا ناسم ئەوی    جواب درا، ڕوو خۆشە، مانگی سەر زەوی (٣١٤١)
کردیان تەعریفی واقیع لەو، بەیان    ئەو کوتی ناکا، بڵێن، شاعیر فلان (٣١٤٢)
ئەوکەسەی کەبوون گرووهێک پەیڕەوی    هەربەجادوو،من کەناچم لای ئەوی (٣١٤٣)
بردیان ئەو، هەر بەڕاکێشان ئەوان    دادو فەریادی دەچوو، بۆ ئاسمان (٣١٤٤)
هەرکەهێنایان بەڕاکێش لای نەبی    پێیکوتن ئاوێ وەخۆن، ڕاش کەن لەوی (٣١٤٥)
گشتییان لەو مەشکی ئاو، تێر ئاو کران    یەک یەکەی کاروانچییان، هەم وشتران (٣١٤٦)
مەشکی خۆیان پڕدەکرد لەو مەشکە، جا    هەو ری ئاسمانان لەوی، سەرسام دەما (٣١٤٧)
کێیەدیبی تاقەمەشکێکی پڕاو    ئاگری چەن دووزەخان بەو بێ، بڕاو؟ (٣١٤٨)
کێیەدیبی بەس بەمەشکێکی پڕاو    مەشکی زۆری دی، ببن پڕ ئاو، تەواو؟[1] (٣١٤٩)
مەشکەڕووپۆش بوو دەنا خۆ، مەوجی فەزڵ    دێ بەئەمری وی،دەگا، لەو بەحری ئەسڵ (٣١٥٠)
ئاو دەگۆڕێ بۆ هەوا،گەرما هەبێ    ئەو هەوا تەبدیل بەئاو، سەرما هەبێ (٣١٥١)
بەڵکەبێ عیللەت خوداوندی کەرەم    چای دەکردئاو، ڕاس لەسەرچاوەی عەدەم (٣١٥٢)
چون لەئەووەڵ، بۆ سەبەب بووی سەرنەوی    تۆ، بەجەهلت هەروەها، لەدوایی وی (٣١٥٣)
تۆ سەبەب دەگری موسەبیب لادەنێی    سوورەتوڕوو پۆش، لەجێی وی دا دەنێی (٣١٥٤)
گەر سەبەب ڕۆی،تۆ بەسەرخۆت،دا دەدەی    جا دەڵەی کۆ مەک کەپێم، ئەی خوایەدەی (٣١٥٥)
خوا دەڵێ پێت، تۆ بڕۆ بۆ لای سەبەب    چۆن وەبیرت هات سونعم؟، ئەی عەجەب (٣١٥٦)
ئەو دەڵێ من، تۆ د ەبینم ئێستەبەس    غەیری تۆ نا کەم ئەمن، چاوم لەکەس (٣١٥٧)
پێیدەڵێ (ڕدوا لعادوا ) کاری تۆ    تۆبەسستی، دائیمەن بۆ یاری تۆ (٣١٥٨)
خۆ بەڵام چاوم لەکارت لا دەدەم    ڕەحمەتم زۆرە، بەتۆش من، جا، دەدەم[2] (٣١٥٩)
قافڵەوکارەگەلێک حەیران دەبوو    ئەوهەچی بوو؟ئەی نەبی، ئەی بەحری خوو (٣١٦٠)
کرتەڕووپۆش تۆ لەبۆ عام، مەشکی ورد    مات دەمان لەو، چی عەرەب با، یانەکورد[3] (٣١٦١)

---

[1]- کێیەدیبی تاقەمەشکێک هەرتەنێ    چەندەمەشکان لەو هەتا سەر، ئاو دەنێ

[2]- ڕەحمەتم زۆرە بەتۆش هەروا دەدەم (مصرع دوم)

[3]- کردتەڕوو پۆش لەبۆعام مەشکی ورد    مات دەمان لەو، کێ عەرەب با ،یانەکورد

**پڕکردنی مەشکەی ئەو غولامە لە ئاو بە موعجیزە، و ڕووسپی کردنی ئەو غولامە ڕەشە بە ئیزنی خوداوەند..**

ئـەی غـولام تـۆ پـڕ ببینەمەشـکی خـۆ　　تـا نەکـەی لێمـان، شـکایەت، دوایـەتۆ (۳۱۶۲)
ئـەو ڕەشـەی حـەیران دەکـرد بورهـانی وی　　جـا دەهـات لای لا مـەکان، ئیمـانی وی (۳۱۶۳)
دی لەئاسـمان کانیاوێـک، دێتـەخوار　　مەشـکی وی ڕوو پۆشـی فـەیزی کردگـار (۳۱۶۵)
بـەو نـەزەر ڕوو پۆشـی دەدڕێـن ئـەو، تـەواو　　تـا بـەچاوی زاهیـری دی، کانیـاو (۳۱۶۶)
چـاوی پڕکـردن لـەئا و، ئـەو دەم، غـولام[1]　　چـوو لـەبیری هـەم ڕەئـیس و، هـەم مـەقام (۳۱۶۷)
دەست و پێی وی بی تەکان مان ئەو چەلە　　دای دەنـا نێـو گیـانی وی، حـەق، زەلزەلـە (۳۱۶۸)
بـۆ سـەلاح، دوو بـارەکردی هووشـیار　　بێنەبـەرخۆت هـۆش، بـڕۆ بـەدوایی کـار[3] (۳۱۶۹)
مـەگرەحیرەت دوایـەحیرەت دێتـەپێش[4]　　تونـد بـڕۆ لـەو ڕێگـەدا، بـێ دەرد و ئـێش (۳۱۷۰)
دایـدەنا سـەر ڕووی، دو دەسـتی ئەحمـەدی　　مـاچی زۆری لـەو دوو دەسـتە، ئـەو دەدی (۳۱۷۱)
دەسـتی کێشـا مسـتەفا سـەر ڕوویـی وی　　گـەو ڕەیی بەخشی بـەوی، هـەم خوویی وی (۳۱۷۲)
بوو سپی پێست گەرچی ئەو بوو پێست ڕەش　　بـۆی شـەوی تـار، بـوو بـەڕۆژی ڕوونوگـەش (۳۱۷۳)
بـوو بەیـەک یووسـوف، بـەنازو بـا جـەماڵ　　پێیـدەکوت ..بـۆ دێ بـڕۆ، تـۆ بێژەحـاڵ (۳۱۷۴)
ئەو دەچوو، بێحاڵ و بێهۆش، مەست مەست　　نەیدەناسـی ئـەو لـەخۆی جاپـاوو دەسـت (۳۱۷۵)
جـا بەدوومەشـکی پـڕاو ئـەو بـوورەوان　　هاتـەلای ئـەرباب لەلایـەن کـا ڕوان (۳۱۷۶)

**ئەرباب غولامی خۆی بەسپی دی و ئەوی نەناسی و پێیکوت کە ئەتۆ غولامی منت کوشتووە و خوێن ئەتۆی گرتووە و خوداوەند ئەتۆی وەدەست من خست ...**

مـات دەمـا ئـەرباب کـەدیتی ئـەو لـەدوور　　خـەڵکی گاز کـرد، وەرنـەلام، هـەوبێ حـزوور (۳۱۷۷)

[1]- چاوی پڕکردن لە فرمێسک ، ئەو غەلام (مصرع اول)

[3]- هووشیاربەتۆ ، برۆ بەدوایی کار (مصرع دوم)

[4]- مەگرەحیرەت ئێستەحیرەت وا لەپێش (مصرع اول)

مــن دەبیــنم وشــترم هــەم مەشكەشــم بــۆچی نــابینم ئــەدی بەنــدەی ڕەشــم؟ (٣١٧٨)
ئەوكەسـەی دیَ، مـانگی چاردە، ڕوویـی وی نووری ڕۆژخۆ، بوو لـەحاس وی سەر نەوی (٣١٧٩)
کــــوا غولامم،یانــــەڕێگای ون بــــووە یـا بـەدەس گورگـان، تـەفرو تـوون، بـووە (٣١٨٠)
گەركوهاتــەپێش پێیکــوت ئــەی فــڵان تـورکی یـا خـەڵکی یەمـەن تۆ، هێنـدەجوان[1] (٣١٨١)
کـوا غـولامم چـت لـەوی کـرد؟ دا بڵـێ کوشــتبێتت گــەر ئــەتۆ، ڕاس وا، بڵــێ (٣١٨٢)
پێیدەکوت گەرکوشتبام ئەو عەبدی خاس چـۆن بـەپێی خـۆم،من دەهـاتم بـۆ قیسـاس (٣١٨٣)
کـوا غـولامم؟ پێیـدەکوت، ئـەو خـۆ، مـنم کـردی دەسـتی فـەزڵی یـەزدان ڕۆشـنم (٣١٨٤)
ڕاس بڵێ پێم چی بەسەر بەندەم دەهات غـەیری ڕاسـتی تـۆ، لـەمن نـادا نـەجات (٣١٨٥)
پێیـدەکوت ئەسـراڕی تـۆ گـەڵ ئـەو غـولام گشتییان من پێت دەڵەم یەک یەک، تەمام (٣١٨٦)
لــەو زەمــانی تــۆ منــت دەکــری، هــەتا ئێستە،گشــتیت پێــدەڵێم، مــن مــا جــەڕا (٣١٨٧)
تـا بزانــی مــن هــەمان بەنـدەم، لـەبوون گـەرچی تـاریکی شـەوێم، بـۆ سوبحی ڕوون (٣١٨٨)
ڕەنگ عەوەز بوو، خۆ بەڵام ئەو گیانی پاک دوور لــەڕەنگ ودوور لەئــەرکانو لــەخاک (٣١٨٩)
ئــەهلی زاهیــر ئێمــەزۆر زۆر لادەنــێن ئــەهلی بــاتین ئێمــەنێو د ڵ، دا دەنــێن (٣١٩٠)
کەسرەتو ئەعـداد نـین، بـۆ گیـان شـناس غەرقـەنێو دەریـای وجـوودی خـوایی نـاس (٣١٩١)
تۆ لەڕێی گیان، گیان بە،تا، بی گیـان شناس یــار بــەبۆ بینــیش نەمنــداڵی قییــاس (٣١٩٢)
گەو هـەری عـەقڵ و مەلـەک هـەڕ یـەک دەبوو بـۆ سـەلاح لێکترجودابـوون، بـوون بـەدوو (٣١٩٣)
ئـەو مەلـەک وەک تـەیر، گرتـی باڵ و پـەڕ عـەقڵ لای نـا، باڵ و پـەڕ، دەی گـرت فـەڕ (٣١٩٤)
بــوون لــەبۆ یــەکتر بــەیاوەر لا جــەرەم بوون بەپشتی یەک ئەوان دوو خۆش قەدەم (٣١٩٥)
هەم مەلەک هەم عـەقڵ، بۆ حـەق واجیـدن هــەردوو بــۆ ئــادەم مــوعین و ســاجیدن (٣١٩٦)
نەفس وشەیتان بوون لەئەووەڵ یەک نەدوو بۆیـەبۆ ئـادەم حەسـوود بوون،هـەم عـەدوو (٣١٩٧)
ئەوکەسـەی دی خـاک، لەئادەم کردی ڕەم ئەو کەسەی دی نوور لەوی، خۆی کرد خەم (٣١٩٨)
ڕوون دەبـوو بـەو نـوورە، هـەر دووچاویـان نەفس و شەیتان بوو لەوان، هەرقوڕ، عەیان (٣١٩٩)
زیندەلــەو باســەنەڵەم نــا دات، ســوود خوێنــدنی ئینجیــل نــاکرێ، بــۆ جهــوود (٣٢٠٠)
کـێ لـەلای شـیعەی، دەکـا باسـی عومـەر؟ چــۆن لــەبۆ کــەڕ لێدەدا،بەربەت،بەشــەر؟ (٣٢٠١)
گـەر لەگۆشـەی دێ، فەقـەت، هەریـەک کەسە ئــەو هــەراو هوریــای کــەکردم مــن، بەســە (٣٢٠٢)
مســـتەحەققی شـــەرح، بـــەردو ســـندەگڵ بۆی دەکەن شـەرح و بـەیان، مـەقبووڵی دڵ (٣٢٠٣)

[1]- تورکی یا خەڵکی یەمەن ، وا ، هێندەجوان (مصرع دوم)

**بەیانی ئەو مەتڵەبە کە خوداوەندی موتـەعال هـەرچی دای یـا خـەڵقی کرد لـە عـەرد و ئاسمان و ئەعراز و ئەعیان هەمووی بەخاتری نیازمەند بوونی خەڵکی دروست کرد، لازمە ئیحتیاج بەشتێک هەبێ تا، بت داتێ کە (امن یجیب المضطر اذ ا دعاه ) ئیزتیرار شاهیدی ئیستیحقا قە...**

چونکەمەریـــەم بــووی نییــازودەردی زۆر　　　هاتـــەگفتوگۆ منـــا لَیـــک شـــیر خـــۆر (٣٢٠٤)

جــوزئی وی، بــێ وی دەکەوتــەگفتو گــۆ　　　گفتــی زۆر ی هــەن نیهــان، ئــەجزایی تــۆ (٣٢٠٥)

دەســت وپــێ ڕۆژی جەزا،هــەر دووگــەواه　　　جا، نەکەی بەودەست وپێی خۆت،قەت گوناه (٣٢٠٦)

گەرنـەبی تـۆ مسـتەحەققی شـەرح و گفـت　　　چاکــەناتیق دەم ببەســتێ، ســفت ســفت (٣٢٠٧)

هەرچی زاهیر بوو، سەبەب بوو، بەس، نییاز　　　تــاکو تالیــب بێتــەدەس وی، دڵخـــوواز (٣٢٠٨)

گــەر خوداوەنــد ئاســمانی چــا دەکــرد　　　بــەس لەبــەر دەفعــی نییــازی وا دەکــرد (٣٢٠٩)

بـــێ لەهـــەرجێ دەرد، دەچێتـــەوێ، دەوا　　　بـێ لەهــەر جــێ فــەقر، دەچێتــەوێ، نــەوا (٣٢١٠)

دەچێتەئــەو جێگایەموشــکیل بــێ، جــوواو　　　دەچێتەئــەو جێگایەکەشــتی، بێــت ئــاو (٣٢١١)

خۆت کەتینوو، کەم کە، تۆ ئاو جستو جۆ　　　هــەڵقوڵێ تــا، بـۆ ت لەشــەش لا، ئـاو ئـەتۆ (٣٢١٢)

تـا نـەبێ تفلـێ گــەروو چــووک، تـا زدار　　　چۆن لەمـەمکی دایکـی وی شـیر دێتـەخوار (٣٢١٣)

تــۆ برۆبــاڵا و هــەم پەســت هــەر بــەغار　　　تــا لەگــەرمان بــی بــەتینووی، بــێ قــەرار (٣٢١٤)

دەنگی زەنبووری هـەوات گەر بیست ئەتۆ　　　تــۆ دەبیســی دەنگــی خۆشــی ئــاوی جــۆ (٣٢١٥)

بۆنیازکــەمتر لــەپووش نــی ئــەی فــلان　　　تــۆ لــەبۆ لای وی دەکــەی ئــاوێ، ڕەوان (٣٢١٦)

ئـاو دەبـەی بـۆ مەزرەعـەی وشـکت،بەغار　　　تـــا وەدەســـتی بێـــت شـــادی، کشـــتزار (٣٢١٧)

زەرعــی گیــا ن دەودا،کەگەوهــەر موزمــەرە　　　هــەو ری ڕەحمەت،پڕلــەئاوی کەوســـەرە (٣٢١٨)

تــا (ســقاهم ربهــم ) بــۆت بــێ خیتــاب　　　خـۆت کـەتینوو، هـەرخودا زانـای سـەواب (٣٢١٩)

**هاتنی ژنێکی کافر دەگەڵ منداڵی شیرخۆری خۆی بۆلای حـەزرەتی موحەممـەد(ص) و وەقسـەهاتنی ئـەو منداڵـە وەک حـەزرەتی عیسـا(ع) بـۆ بـەیان کردنـی مـوعجیزاتی ڕەسووڵ(ص)...**

**خولاسەی داستان ...**

ژنێکی کافر ڕۆژێک دەگەڵ منداڵی دوو مانگەی خۆی هاتە لای پێغەمبەر(ص)تا ڕاستی و دروستی ئیددیعای وی ئیمتیحان بکا، جێ بەجێ منداڵەکە، وەقسەهاتوکوتی ..ئەی موحەممەد

سەلامی خودا لەسەرتۆ بێ، دایکی لێی توورەبوو وەبەسەری دا گوڕڕاند و پێیکوت کێ ئەو قسەی فێری تۆکردووە؟منداڵەکەجوابیداوەخوداوجەبرەئیل،حەزرەتی ڕەسوول لێی پرسی نێوت چییە؟ منداڵەکوتی نێوی ڕاستی وواقیعی من، عەبدولعەزیزەچونکەئەمن بەندەی خوداوەندی عەزیزم، بەڵام ئەو قەو مەنەفامانەنێویان ناوم، عەبدولعوززا، چونکەبوتی مەشهوور بەنێوی عوززا، دەپەرستن، لەئاخیر دا، دایکیشی ئیمانی هینا...

هات هەمان، لەو دێ، ژنێکی کافران — لای موحەممەد،تاکوبیکا، ئیمتیحان (٣٢٢٠)

لای ڕەسوول هات، رووسەریشی بوو لەسەر — تیفلەکی دوومانگەشی ئەو، بوو لەبەر (٣٢٢١)

تیفل دەیکوت، لێت، سەلامی خوایی تۆ — ئەی نەبی، هاتوینە، ئێمە، لایی تۆ[1] (٣٢٢٣)

پێیدەکوت دایکی،بەرق،بێ دەنگ بە، دەی — کێ ئەتۆی فێرکرد شەهادەت وا بدەی؟ (٣٢٢٤)

کێ ئەتۆی فێرکرد ئەی منداڵی چووک — بێ زبانت وا درێژو واڵە سووک (٣٢٢٤)

پێیدەکوت،پاش حەق،کوتی پێم جەبرەئیل — بۆ بەیان، جەبریل دەگەڵ من بۆ ڕەسیل (٣٢٢٥)

پێیدەکوت کوا؟دای جەواب باڵای سەرت — تۆ کەنەت دی بیخەباڵا، مەنزەرت (٣٢٢٦)

ئێستەوێستاوەلەسەر تۆ جەبرەئیل — سەت کەڕەت بۆ ڕێنموونم، هەم دەلیل (٣٢٢٧)

پێیدەکوت دیتووتەتۆ، دەیکوت ئەدی — وا لەژوور سەرتە، بەجوانی بێ حەدی (٣٢٢٨)

وەسفی حاڵی مستەفام ئەو فێر دەکات — چونکەباشم، ئەو لەبەد، دەمدا نەجات (٣٢٢٩)

جا ڕەسوول دەیکوت بەوی تۆ ئەی ڕەزیع — بێژەنێوت،تۆ، بە، بۆ قەولم موتیع (٣٢٣٠)

پێیدەکوت عەبدولعەزیزم لای خودا — عەبدی عوززا، ناکەسان دەمکەن سەدا (٣٢٣١)

من لەعوززا، پاک و بێزارم، بەری — بەو خودایەی دای بەتۆ پێغەمبەری (٣٢٣٢)

تیفلی دوومانگە، بەچەشنی مانگی بەدر — دەرسی کوت وەک کامیل و ئەسحابی سەدر (٣٢٣٣)

هات لەجەننەت بۆنی خۆش ئەوکاتەزوو — تا مەشامی دایک و تیفلی وی دەچوو (٣٢٣٤)

هەردوو کوتیان گیان لەبەرمان بێتەدەر — خۆشترەتا بۆنی وا بڕوا، هەدەر (٣٢٣٥)

هەرکەسێ بۆی بێ موعەرریف خوای وەداد — ئەو دەکەن تەسدیق نامی هەم جەماد[2] (٣٢٣٦)

هەرکەسێ ئاگای لەوی بێ خوای جیهان — تەیرو ماسی،بۆ دەبن ئەو، پاسەوان (٣٢٣٧)

---

[1]- ئەی ڕەسوو لەڵلاە، هاتوین لایی تۆ (مصرع دوم)

[2]- هەرکەسێ بۆی بێ موعەرریف خوایی حەق — جامید و نامی دەڵێن هەردوو،(صدق)

**فڕاندنی هەڵۆ کەوشی مستەفا(ص) و بردنی وی بۆ حەوا، و فڕێدانی ئەو کەوشە بۆخوارەوە و وەدەرکەوتنی مارێکی ڕەش لەو کەوشە...**

**خولاسەی داستان ...**

پێغەمبەری ئەکرەم (ص) دەحاڵی دەست نوێژ گرتن دا بوو کەهەڵۆ یەک لەئاسمان هاتەخوار وکەو شی وی ڕفاند و بۆ حەوا ی برد، ولەحەوا، ئەو کەو شەی تەکان دا ولەناکاو مارەکی ڕەش لەو کەو شە،کەو تەعەردی، وبەو جوورەگیانی شەریفی حەزرەتی خەتمی مەرتەبەت (ص) لەسەدەمەی ئەو مارەنەجاتی بوو .. و لەپاشان هەڵۆ، کەوشی ڕفاندراوی بۆ ئەو حەزرەتە،گەڕاندەوە...

دەنگی بانگی نوێژدەهات، لەو کاتەدا مستەفا دەی بیست لەباڵا، ئەو سەدا (٣٢٣٨)
تاوزووی خۆی تازەکا، ئەو ویستی ئاو ئەو بەئاوی سارد شوشتی دەست و چاو (٣٢٣٩)
شوشتی هەر دوو پی و،ویستی کەو شی خۆ لێی ڕفاند یەک لینگەکەوشی وی هەڵۆ (٣٢٤٠)
دەستی بردبۆکەو شی خۆی ئەو،خۆش خیتاب کەو شی دەفڕاند،جا لەدەستی وی عوقاب (٣٢٤١)
کەو شی وی برد بۆ حەوا، وەک با، بەغار خستیەخوارو، مارەکی لێکەو تەخوار (٣٢٤٢)
کەوتەعەردی مارەکی ڕەش بێ ئیجاز لوتفی حەق بوو، بۆی هەڵۆ بوو، خێر،خوواز (٣٢٤٣)
کەوشەکەی هیناوەبۆ وی ئەو هەڵۆ پێیدەکوت، ها، کەو شەکەت، بۆ نوێژ برۆ (٣٢٤٤)
ناعیلاج بووم ئیحتیرامم لادەنا موکریمی تۆم، بێ حیساب، بەخوا، دەنا (٣٢٤٥)
وای بەحاڵی وەی دەبی ئەو، وا جەسوور هەرلەخۆ، فەتوا، دەدا، ئەو، بێ زەروور (٣٢٤٦)
پاش تەشەککور وای بەوی کوت، مستەفا ئەو جەفای دیتم لەتۆ، ئەو بوو وەفا (٣٢٤٧)
کەوشەکەت بردم، دەهات بۆم غەم هەزار من غەمین بووم گەرچی تۆم بووی غەمگوسار (٣٢٤٨)
گەرچی غەیبی حەق،نیشاندابن،سەرجەمی دڵ بەخۆ مەشغووڵ دەبو،خۆ ئەودەمی (٣٢٤٩)
پێیدەکوت غەفڵەت لەتۆ زۆر دوورەخۆ غەیبی والەی پێ نیشاندام عەکسی تۆ (٣٢٥٠)
مار،لەنێو کەو شێ ببینم لەوحەوا عەکسی تۆیە، نیمەوا ئەی مستەفا (٣٢٥١)
ئینعیکاسی گشت پاکان، ڕوون و گەش ئینعیکاسی گشت ناپاک، تارو ڕەش (٣٢٥٢)
ئینعیکاسی ڕووحی پاکان بوو بەنوور عەکسی ئەغیارکوێر، لەنوور بوو زۆر بەدوور (٣٢٥٣)
ئینعیکاسی ڕووحی خەڵکی زۆر دەقیق تۆ بناسە، بیکەمەقبووڵت، ڕەفیق (٣٢٥٤)

**پەندو عیبرەت وەرگرتن لەو حیکایەتە، وبەیەقین زانین کە.. ( ان مع العسريسرا )...**

پەندو عیبرەت وەرگرەلەو باسەتۆ تاکو ڕازی بی بەحوکمی خوایی خۆ (٣٢٥٥)

تـاکوزیرەک بـی، ئـەتۆ ئـەی خـۆش گومـان — گــەر ببینـــی واقیعـــەی بـــەد، ناگـــەهان (٣٢٥٦)
نـــا ڕەزایـــان زەرد دەکـــا، بـــیم، ڕەنگییـــان — شاد بەوەک گوڵ، گەر کو سوودبێ، یا زیبان (٣٢٥٧)
گەر لـەگوڵ، یـەک یـەک، گـەڵا، تۆ لێوەکـەی — شـادە، نـاڕوا، قـەت بـزەی سـەرلێوەکەی[1] (٣٢٥٨)
ئـەو دەڵـێ خـاربم ئەگـەر، بـۆ بـم، غـەمین؟ — خـۆ لـەخار، مـن هاتەدەسـتم، پێکـەنین[2] (٣٢٥٩)
هەرشـــتێکی لـــێ ســـتاندی گەرقـــەزا — لێـت یـەقین بێ دەگرێ ئـەو، پێشی بـەلا[3] (٣٢٦٠)

بوو،تەسـەووف ئەوهـە، تـۆ بـی، شـاد شـاد — ئەودەمـەی دێـن دەردومیحنـەت،زۆر زیـاد[4] (٣٢٦١)
تۆ عیقابی خواش حیساب کە،یەک عوقاب[5] — گـەر ڕفانـدی کـەو شـەکەی ئـەو مستەتاب (٣٢٦٢)
تـــا نەگاتـــەلاقی وی هـــیچ زەخمـــی مـــار — خـۆش بـەحالی عەقڵـەکی نـەی بـێ غوبـار (٣٢٦٣)
خوا کوتی بۆ وەی لەدەس چوو غـەم مـەخۆ — گـەرچی شـێرخواردی هـەموو مـاڵاتی تـۆ[7] (٣٢٦٤)
چـون بـەڵای وا، بـۆ بـەڵای گـەو ڕە، سـپەر — بـــۆ زیبـــانی گـــەو ڕە، مەنعەئـــەو زەرەر (٣٢٦٥)

**داواکردنی ئەو کابرایە لە مووسا کە زبانی حەیوانات و پەڕەندانی فێر بکا...**

**خولاسەی داستان ...**

**جەوانێک هاتەلای حەزرەتی مووسا(ع) وپێیکوت ئەی پێغەمبەری خـودا زبانی حـەیوانات فێـری مـن بکـەتا لـەدەنگ و سـەدای وان بـۆ تەقویـەتی دیـن و ئیمـانی خـۆم ئیسـتیفادەبکەم،حەزرەتی مووسـاپێیکوت دەسـت لـەو ئارەزوویـەت هەلگرەوحـەددو مـەرزی خـۆت بناسـە، جـەوانی ساویلکەدەستی لەئارەزووی موهیممی خۆی هەلنەگرت وهـەر وەها داوای لیـدەکرد حـەزرەتی مووسا ڕووی لـەدەرگای خـودا کـرد وعـەرزی کـرد ئـەی خوداونـد ئـەتۆ بـۆ خـۆت قـەزاوەت**

[1]- شادەناڕوا ، پێکەنینی لێوەکەی (مصرع دوم)

[2]- خۆ لەخاربم هاتەدەس، من پێکەنین (مصرع دوم)

[3]- هەرشتێکی گەرکو ئەستاند ، لێت قەزا — لێت یەقین بێ، نایەلێ بۆت بێ بەلا

هەرشتێکی گەرکوئەستاند لێت قەدەر — لێت یەقین بێ، دوور دەکا لێت دەردەسەر

[4]- ئەوهەبوومانای تەسەووف،تۆ ،بەدڵ — شاد بەغەم بی، لەو نەکەی هیچ کات سڵ

[5]- باعیقابی خواش لەلات بێ یەک عوقاب (مصرع اول)

[7]- بۆ لەدەس چوو، غەم مەخۆن ، گفتی خووا — گەرچی حەیوانت هەموو ، شێر بێ خووا

بفرمـوو.. ئەگـەر زبـانی حـەیواناتی فێربکـەم، چونکەزەرفییـەت و قابلییـەتی بـۆ وی نییەلەبـەین دەچێ.. وئەگەر فێری نەکەم نارەحەت دەبێ ..خوداوەنـد فـەرمووی ئارەزووی وی قـەبووڵ بکـە.. حەزرەتی مووسا جارەکی دیش بەدڵسۆزی پێیکوت.. ئەو ئارەزوویەت لەسەر وەدەر خـە، وخۆت دەهیلاکەت ماوێ، جەوانەکەپێیکوت ئێستا کەنات هـەوێ زبـانی هـەموو جانـەوەران فێـری مـن بکەی لانی کەم زبانی کەڵەباب و سەگی ماڵێم فێر بکەتادڵخوازی وان تێبگەم ..حەزرەتی مووسا زبانی ئەو دوو جانەوەرانەی فێر کرد،ئەو جەوانەساویلکەیەهەمووڕۆژێ سبەینان زوو لەحەساری ماڵی خۆی ڕادەوەستا تا ئەوەی فێری بووەئیمتیحانی بکا، لەو کاتەدا کڵفەتی ماڵێ سفرەی غەزای لەحەسار دا، تەکاند،وپەلکەنانێک لەوی کەوتەسەر عەرزی کەڵەباب زۆر بەچوستو چالاکی هات وئەوی لـەپێش سـەگەکە، ڕفانـدو بـردی ..سـەگ لـەو کارەبێ باکانـەی کەڵـەباب گیلایـەی کـرد وئەوەی لـەبارەی خـۆی بـەزوڵم حیسـاب کـرد کەڵـەباب بەسـەگەکەی ئیتمینان دا کەنارەحـەت مەبەچونکەسبەینێ ئەسپی ئەو کابرایەدەمرێ... وتۆ لەکەلاکی وی زگی خۆت تێر دەکەی، هـەر لەگەڵکو ئەو خەبەرەی لەکەڵەباب بیست ئەو ی بردەبازاڕی وفرۆشتی، تا خۆی لەزەرەر نەجات بـدا ..ڕۆژی دوایەسـەگ موتەوەججیـەبوو کەخەبـەرێک لەئەسـپ و کـەلاک نییـە، جـا لەبـەر ئەوەکەڵەبابەکەی سەرزەنیش کرد و بەدرۆ زنی لەقەڵەم دا ..کەڵەباب پێیکوت بزانەکەسبەینێ ئێستری ئەو کابرایەدەمرێ،وەک جاری ئەووەڵ ئێسرەکەشی فرۆشت ..ڕۆژی دوایەسەر زەنیشی سـەگ بـۆ کەڵـەباب تیکـرار بـۆ وە، کەڵـەباب کـوتی ئـەی سـەگ، بزانەکەسبەینێ نـۆ بـەمردنی غولامی ئەو ماڵەیەئەو دەمرێ،کەس و کاری وی بۆ سەرەخۆشی دێن، وئـەنواعی غـەزا دروست دەکـەن ولـەباقی مانـدەی ئـەو غەزایـەزگی خـۆت تێـر دەکـەی..ئـەو کابرایەئـەو خەبەرەکـەی کەبیســـت فـــەورەن غولامەکەشـــی فرۆشـــت ولـــەزەرەروزیانی وی خـــۆی نـــەجات دا، ڕۆژی دوایەسـەگ کەڵـەبابی دیـت و پێیکـوت ئـەی درۆزن ئـەدی ئـەو هەموووەعدەشـیرنانەت کـوان؟ کەڵـــەباب کـــوتی ئـــەمن لـــەپێش بینیـــەکانم ئیشـــتیبام نەکردووە،بـــەڵام ئەوەبزانەکەســـبەینێ ئەوکابرایـەبۆ خـۆی دەمـرێ وقـەوم وکـەس و کـاری بـۆ تازیـەو سەرەخۆشـی دێـن، وگایـەک دەکوژنەوە، غەزا دەدەنەفەقیران وسەگیش لەو غەزایانەبەئارەزوو دەگەن، کاتێـک کەئـەو کابرا ساویلکەیە، ئـەو خەبـەرەی بیسـت بەپەلـەچوو لای حـەزرەتی مووسـا ولەبـەری پـاڕاوەوپێکوت بەدادم بگەکەسبەینێ تیری ئەجەل وەمن دەکەوێ حەزرەتی مووسا پێیکوت مەگـەرپێتم نـەکوتی کەئەتۆ لیاقەت و قابلییـەتی فێربوونی زبـانی جانـەوەرانت نییـەوتاب و تـەوانی بیسـتنی ئەسراڕی

غەیبیت نییە؟ ئێستەبزانەکەتیری ئەجەل لەکەوانی ئیرادەی خوداوەند، وەدەر کەوتووەوسەینی وەتۆ دەکەوێ .. وهیچ ڕێگای فیرارو نەجاتت نییە..دەحاڵێک دا،کەئەگەر قەزا و بەڵا وەو حەیوانانەکەوتبان گیانت لەهیلاکەت نەجاتی دەبوو ..بەڵام تەماع ئەتۆی نابوود کرد..ئێستا تەنها کۆمەکی من بەتۆ ئەو هەیەکەلەخودا داوا بکەم کەئەتۆ بەئیمان لەدونیا یە، ببا..حەزرەتی حەق دوعای مووسای قەبووڵ کرد وئەو کابرایەی بەئیمان لەدونیا برد...

وای بەمووساکوت جەوانێک خۆش نەزەر — فێر کەتۆ من،گشت زبانی جانەوەر (٣٢٦٦)
دەنگی حەیوانات کەبێ،جارجارەبۆم — من بەوی مەحکەم دەکەم ئیمانی خۆم (٣٢٦٧)
چون زبانی گشت ئینسانان تەواو — هەر بەدووی فێڵ و فریوو، نان و ئاو (٣٢٦٨)
ڕەنگەحەیوانات هەیان بێ دەردی دی — وەختی مەرگ و میر، لەوان ئەو دێ وەدی (٣٢٦٩)
پێیدەکوت مووسا وەلانێ ئەو نەزەر — زاهیر و باتین کەهەیتی زۆر خەتەر (٣٢٧٠)
پەندو هوشیاری لەیەزدان کەتەڵەب — نەک لەنوسراوەو، لەقەو ل و حەرف و لەب (٣٢٧١)
زیاد دەبووحیرسی، بەمەمنووع ئەو جەوان — تالیبی مەمنووعەئینسان، ئەی فلان (٣٢٧٢)
دەیکوت ئەی مووسا کەنوورت هات وەها — هەر لەتۆی گرت، هەرشتێ هەیبوو، بەها[1] (٣٢٧٣)
زۆر لەلوتفی تۆ بەدوورەئەی جەواد — مانیعم بی، تا نەگەم من بەو مراد[2] (٣٢٧٤)
جێ نشینی خوا ئەتۆی لەو عەسرەدا — یەئسەبۆمن گەر ئەوەت، تۆ پێم نەدا (٣٢٧٥)
جا، کوتی مووسا کەئەی خوا، ئەو کەسە — وەک لەشەیتان هاتبێ بۆی وەسوەسە (٣٢٧٦)
گەر کوفێری کەم دەکا ئەو زۆر زیان — گەر نەدەم بەو یاد، دەبێ ئەو، بەد گومان (٣٢٧٧)
دەیکوت ئەی مووسا بەوی یاد دە کە، من — قەت نەبوو ڕەد کەم دوعای هیچ پیاوو ژن (٣٢٧٨)
دەیکوت ئەی ڕەب، دێ پەشیمانی لەدووی — جا یەقەی دەدرێت و، دەستی خۆی دەجووی[3] (٣٢٧٩)
لائیقی قودرەت کەنین خۆ، گشت کەس — چاکترین سەرمایەبۆ پاک، عەجزەبەس (٣٢٨٠)
فەقر،بۆیە، بوو بەفەخری دائیمی — چونکەتەقوای بەس، فەقیر بێ ئا دەمی (٣٢٨١)
بۆیەسەر وەت لای خودا مەردوود بوو — چونکەقودرەت لادەبا، سەبران، زوو (٣٢٨٢)
بۆ بەشەر بەس، عەجزو فەقرە، بوو[4] ئەمان — لەو بەڵای نەفسی تەمەعکار و غەمان (٣٢٨٣)

---

[1]- بەس لەتۆ بۆی هات هەچی هەیبوو بەها (مصرع دوم)

[2]- مەنعی من کەی تا نەگەم من بەو مراد (مصرع دوم)

[3]- جا یەقەی دەرێت و قامکی خۆی دەجووی (مصرع دوم)

[4]- ، بۆ (مصرع اول)

ئارەزووی بێهوودە چاکی کرد غەم — چونکەوایەعادەتی ئینسان بەجەم (٣٢٨٤)

ئەخسی گڵ خۆر،گڵ لەفیکری ناچتەدەر — پێی هەزم ناکرێت ئەو قەت گوڵشەکەر (٣٢٨٥)

**هاتنی وەحی لای خوداوەند، بۆ مووسا(ع) کە ئەوەی دەی هەوێ، یا هەموو یا قیسمەتێکی فێر بکە...**

خوا کوتی تۆ،وێیدەچی داوا بکا — لێبگەرێ ئەو چۆنی ویست،با، وا بکا (٣٢٨٦)

بۆ هەموو تاعەت، نەمەک بوو، ئیختیار[2] — بێ ئیرادەناگرن ئەفلاک قەرار (٣٢٨٧)

گەردشی وان نیتی هیچ ئەجرو عیقاب — موزد،لەڕووی ئیختیار دەدەن،ڕۆژی حیساب[4] (٣٢٨٨)

هەرچی مەوجوود بێت، زیکری خوا دەکا — دوور لە سوود بوو، گەر بە ئیجبار وا دەکا (٣٢٨٩)

وێیدەتیغ و لابە، عەجزی وی، ئەتۆ — تا بزانی ڕێ گرەیا جەنگجۆ[5] (٣٢٩٠)

کردی (کرمنا )بەشەر بەس ئیختییار — نیوەمێش هەنگوین و، نیوەی دیکەمار (٣٢٩١)

چەشنی زەنبوور جێی عەسەل، ئیماندار — کافرانیش جێگەژەهرن، چەشنی مار (٣٢٩٢)

چاکترین گوڵ، موئمینان بوون خواردییان — بۆیە، تفیان، چەشنی نەحل، ئاوی ژییان (٣٢٩٣)

کافران ئەمما غەزایان بوو، زوخاو — لەو غەزایەچادەبێ ژەهری بەناو (٣٢٩٤)

ئەهلی ئیلهامی خودا، کانی ژییان — ئەهلی تەسویل و ڕیا، ژاری نەمان (٣٢٩٥)

گەر دەکەی مەدح و دەدەی شا باش هەزار — بێ گومان و شک، هەتەتۆ، ئیختییار (٣٢٩٦)

نا کەسان کاتێ لەزیندان دا دەبن — موتتەقی و زاهید، موریدی خوا دەبن (٣٢٩٧)

گەر نەما قودرەت، دەبێ کاسید، عەمەل — ها، لەتۆ نەگرێت[6] سەرمایە، ئەجەل (٣٢٩٨)

قودرەتت سەرمایەیی سوودە، ئەتۆش — حیفزی وەختی قودرەتت کە، ئەی بەهۆش[7] (٣٢٩٩)

---

[2]- خوێی عیبادەت ناسراوەئیختیار (مصرع اول)

[4]- بەس بەموختار موزد ، دەدەن ، ڕۆژی حیساب (مصرع دوم)

[5]- عەجزی لابە، وێیدەتیغ ، دڵخوازییە   تێدەگەی جا ، ڕێ گرەیا غازییە

[6]- با ، لەتۆ نەگرێت (مصرع دوم)

[7]- حیفزی وەختی قودرەتت کە، هەت بێ هۆش (مصرع دوم)

ئەسپی (کرمنا ) بەشەر، لێی بوو سووار فــەهمی وی،گرتــی لغــاوی ئیختییــار (٣٣٠٠

پەندی دا وی ئەوچەلەش مووسا، بەمیهر[١] پێیدەکوت ئەو ویستەدەت کا،زەرد چیهر (٣٣٠١

وات نەوێ تۆ هەت بێ با ترسی خودا بــۆ فریــوە، دێــو، کەدەرســت وا دەدا (٣٣٠٢

## قانع بوونی ئەو کابرایە بە فێربوونی زبانی کەڵەباب و سەگی ماڵی خۆی و جواب دانەوەی مووسا، بەوی ...

پێیدەکوت.. ناڵەی هەموو پێم، ئەی بەگم[٢] فێر کەتۆ من، نوتقی دیکم، هەم سەگم (٣٣٠٣

پێیــدەکوت مووســا بــەوی، باشــە، بــڕۆ فــەهمی نــوتقی ئــەو دووان، دەد را بــەتۆ (٣٣٠٤

هەر لەبەر ئەزموون هەموو ڕۆژان، سەحەر ڕا دەوەســـتا ئــەو لــەنێو ئاســـتانی دەر (٣٣٠٥

ڕای وەشاند سفرە، کەنیز جا، لەو حەسار پەلکــەنانێکی بــەیات لــەو کــەو تــەخوار (٣٣٠٦

هات ڕفاندی جێ بەجێ،دیک، پەلکەنان سەگ کوتی زوڵمت لەمن کرد، ئەی فڵان (٣٣٠٧

دەنکی گەنمی تۆ دەخۆی، کوا وەک ئەتۆم؟ نــاتوانم، دەنکـــە گـــەنمێکی، بخـــۆم (٣٣٠٨

گەنمو جۆو، باقی حبووبت، دێ لەدەست گەربخۆی تۆ،نەک ئەمن،ئەی شاد ومەست (٣٣٠٩

پەلکــەنانێکی وەهــا کــەم، تــۆ، کــەهات دەی ڕفێنــی نایــەڵی، ســەگ بیخــووات (٣٣١٠

## جواب دانەوەی کەڵەباب، بەسەگ...

دیک پێیکوت، بێ سەدابە، غەم مەخۆ زۆر لــەوەی چــاتر دەدا، ڕەززاق، بــەتۆ (٣٣١١

زۆر بــەزوویی دەمــرێ کابرا،ئەســپەکەی جا، سبەی تۆ خۆت لەوی تێر تێر دەکەی (٣٣١٢

مەرگی ئەسپان جێژنەبۆ سەگ، زێدەباش زۆر دەبێ ڕۆژی، بە بێ کەسب و تەلاش (٣٣١٣

هەرکەبیســتی زووفرۆشــتی ئەوعــەجوول دیک لەلای سەگ ڕەنگ زەرد بوو،زۆرخەجوول (٣٣١٤

ڕۆژی دوایــەش دیــک ڕفانــدی پەلکــەنان سەگ وەکاری خست، ئەو چەل، لەو زبان (٣٣١٥

---

[١]- پەندی دا ، مووسا ، چەلێکی دیش، بەمیهر (مصرع اول)

[٢]- پێیدەکوت فێرم کەناکەی ، گشت ، بەگم (مصرع اول)

بەسکە، ئەی دیک، لەو فریوەو، لەو درۆ — زاڵمی هەم کازبی، بێ نووری تۆ (٣٣١٦)
ئەسپەکەی دەتکوت کەدەمرێ، کوا ئەدی؟ — کوێری ئەختەر بێژی، ڕاستیت قەت نەدی (٣٣١٧)
دیک کوتی مرد، ئەسپەکەی وی، لێرەنا — چوولەیەک جێی دی، سەری خۆی دا دەنا (٣٣١٨)
ئەسپی دەفرۆشت،تا، نەیەت، بۆ وی، زەرەر — ئێکی دیکە، ئەو زیانەی کەو تەسەر (٣٣١٩)
لێی دەبێ ئێستر، سبەینێ، زوو سەکەت — نیعمەتیکەسوود دەبا لەو، سەگ فەقەت (٣٣٢٠)
ئێستری برد و فرۆشت، کردی پەلەش — لەو زیانەش خۆی نەجات دا ئەو چەلەش (٣٣٢١)
ڕۆژی سێهەم لێی وەکارخست، سەگ، زبان — ئەی درۆزن ئەی ئەمیری کازبان (٣٣٢٢)
پێیدەکوت زوو ئێستری برد، بۆ فرۆش — هەرسبەی نۆبەی غولام دێ بێ، نەخۆش (٣٣٢٣)
گەرغولامی وی نەما لەو، هیچ نەفەس — نان دەدەن بۆ سەو، فەقیران، قەوم و کەس (٣٣٢٤)
هەر کەبیستی زوو فرۆشتی ئەو غولام — لەو زیانەش ئەو چەلەش بۆی هات، سەلام (٣٣٢٥)
شوکری خوای کرد، زێدەبوو ئەو شادمان — سێ بەلام بۆهات، نەجاتم بوو، لەوان (٣٣٢٦)
لە دەمەی فێر بووم زبانی دیک و سەگ — چی بەلا بێ، لێم بڕیوە، شا هەرەگ[1] (٣٣٢٧)
ڕۆژی دی دەیکوت بەدیک ئەو سەگ وەها — ئەی درۆزن، بێژەپێش بینیست، کوا؟ (٣٣٢٨)

**شەرمەندەبوونی کەڵەباب لەلای سەگ بە عیللەتی درۆ کوتن لەو سێ وەعدەدا ...**

ئەو هەموو کیزبو خیلافەتا کو کەی؟ — ڕۆژو شەو تۆ هەر درۆ یان چادەکەی (٣٣٢٩)
دیک بەسەی کوت ئێمەوانین وەک دەڵەی — گەر درۆم نیسبەت وەلا دەی،تۆ هەڵەی (٣٣٣٠)
ئێمەدیکان وەک موئەززین ڕاس خەبەر — مونتەزیر بۆ وەی، هەتا و کەی دیتەدەر (٣٣٣١)
ئێمەدیکان بۆ هەتاوین پاسەوان — گەرچی دانێین، ئێمەژێر تەشتی گران (٣٣٣٢)
پاسەوانی تاوی ڕوونن ئەولیبا — نێو بەشەر واقیف بەڕازی کیبریبا (٣٣٣٣)
دای خودا ئێمەبەئینسان، تا بەمە — ئەو بزانێ وەختی نوێژێ،کام دەمە (٣٣٣٤)
ئێمەبێ وەخت، ئیشتیبامان بێ، ئەگەر — بانگ ببێژین، دا دەنێین بەو بانگەسەر (٣٣٣٥)
گەر بەبێ کات بانگ بکەین بۆ لای فەلاح — خوێنمان دەڕژێت بۆ ساحەب، مەباح (٣٣٣٦)
بێ گوناهو، پاک لەئیشکالو غەڵەت — دیکەکی کەگیانی وەحیی بێ، فەقەت (٣٣٣٧)
ئەو غولامەی وی دەمرد لای موشتەری — موشتەری هات ئەو زیانەی، بۆ سەری (٣٣٣٨)
نەی دەهێشت بۆی بێ زیا ن، ئەو هیچ، بەڵام — نەیدەزانی خوێنی خۆی ڕشت ئەو نەفام (٣٣٣٩)

---

[1] - نوتقی دیک و سەم، ئەمن گەر هاتەدەست — چاوی ڕوونی گشت بەڵایانم دەبەست

یەک زیبا ن دەگرێت پێشی زۆر زیبان  جیسم ومالمان با فیدایێ، بۆ گیان (۳۳۴۰)
گەرتۆ مەحکووم بی لەلای داد گوستەری  ماڵ دەدەی تا کو سەری خۆت دەر بەری (۳۳۴۱)
چون نەزان بووی تۆ لەمەو زووعی قەزا  ماڵی خۆت نادەی چکات بۆ ڕێی خودا (۳۳۴۲)

**خەبەر دانی کەڵەباب لە مەرگی ساحەب ماڵ...**

هەرسبەینێ دەمرێ ساحەب ماڵ یەقین  گا، دەکوژن واریسان بۆ داد و شین (۳۳۴۳)
ساحەبی ماڵ دەمرێ دەڕوا، ئەو دەچێ  دێ غەزا بۆت، ئا ڕەزووی تۆ دێتەجێ (۳۳۴۴)
نان دەگەڵ بەرماوی خۆراک و تەعام  نێو مەحەللە، دێ بەدەسیان خاس و عام[1] (۳۳۴۵)
گۆشتی قوربانی دەگەڵ زۆر ناسکەنان  سووک دەڕێژن بۆ فەقیر و بۆ سەگان (۳۳۴۶)
مەرگی ئەسپ و ئێسترو مەرگی غولام  بوون بەلا گێر بۆ ئە، ئەو مەغرووری خام (۳۳۴۷)
لەوزیبانی ماڵ کەهات، خۆی دا نەجات  ماڵی زیاد کرد، خوێنی خۆی دەرژاند لەبات (۳۳۴۸)
بۆ لەبۆ دەروێش ڕیبازەت بوو بەکار؟  بەو بەلای تەن، تا ببێ گیان ماندگار (۳۳۴۹)
تا بەقای خۆی بۆ نەبێ سالیک بەیار  چۆن دەکا سالیک تەنی خۆی، دەردەدار؟ (۳۳۵۰)
کەی دەکا دەستێک ئیسارو عەمەل؟  تا نەبینێ گیان، بۆ بەخشیش بەدەل (۳۳۵۱)
ئەو کەسەی کەبێ ئومێدی سوود، دەدا  ئەو خودایە، ئەو خودایە، ئەو خودا (۳۳۵۲)
یا وەلی حەققە،کەخووی،وەک خووی حەقە  بوو بەنوورو، عەینی نووری موتلەقە (۳۳۵۳)
خوا غەنی خەڵکیش فەقیرە، وایەخۆ  بێ عیوەز ناڵی فەقیر، ها، بگرەتۆ (۳۳۵۴)
تا نەبینێ سێو، بەچاوی خۆی مناڵ  دەس لەپیوازی گەنیو ناکا بەتاڵ (۳۳۵۵)
خەڵکی بازاڕ هەر بەخاتر، ئەو غەرەز  دا دەنیشن نێو دووکان، بەس بۆ عەوەز (۳۳۵۶)
جانیشانی عام دەدەن، سەد جوور مەتاع  نێو دڵیشیان بوو، عەوەز، تەنها تەماع (۳۳۵۷)
یەک سەلام نابێ ئەتۆ، ئەی پیاوی دین  عاقیبەت نەگرێت لێت، ئەو، ئاستین (۳۳۵۸)
بێ تەماع نەم بیست لەخاسان و لەعام  هیچ سەلامێک،ئەی عەزیزم، وەسسەلام (۳۳۵۹)
هەرسەلامی خوا تەڵەب کە، وا، نییە  بێ ئەوی، هیچ ماڵ و هیچ کۆ و، جا، نییە (۳۳۶۰)
هات لەزاری شەخسی باش و خۆش مەشام  بۆم لەحەق ڕا، هەم پەیام و، هەم سەلام (۳۳۶۱)
من سەلامی موئمینانی دیش لەلام  خۆشترەزۆر زۆر لەڕووح، ئەی خۆش کەلام (۳۳۶۲)
چون سەلامی وی سەلامی خوایە، خۆ  چون بەتەوحید ئاگری بەردایەخۆ (۳۳۶۳)

---

[1]- دێ لەنێو کۆ دا، بەدەسیان خاس و عام (مصرع دوم)

ئـەو لـەخۆی مـرد، زیندووەئێسـتا، بـەرەب | بۆیەئەسـرارِی خـودای ئـەو بـوو، بەلـەب (٣٣٦٤)
مەرگی تەن،گەر بێ بـەرەنج، ئەو بوو ژیـان | رەنجـی زۆری تـەن، دەکـا رووح جاویـدان (٣٣٦٥)
لەحزەلـەحزە، مونتـەزیر بوو،ئـەو خـەبیس | تـا ببیسـێ ئـەو لـەدیکی خـۆی، حـەدیس (٣٣٦٦)

## هەڵاتنی ئەو کابرایەبۆ لای مووسا بۆ کۆ مەک ویستن چون لەکەڵەباب خەبەری مـەرگی خۆی بیست ...

وای کەبیست ئەو توندو تیژ هات، هەر بەغار | راس لەپێشی دەرکی مووسای گرت قەرار (٣٣٦٧)
رووی بەسـەرخاک دادەکێشا ئـەو، لـە، بیم | لـەو بەڵایـەم تـۆ نـەجات دەئـەی کـەلیم (٣٣٦٨)
پێیـدەکوت بفرۆشـەخۆت نـەت بـێ زەرەر | تـۆ کەئوسـتادی، لـەچاڵ خـۆت بێنیـەدەر (٣٣٦٩)
تـۆ موسـەڵمانان هـەموویان، قـرِ بکـە | کیسـەکەو هەنبانەکـەی خـۆت پـرِ بکـە (٣٣٧٠)
ئەو قەزایـەم دی لـەنێو یـەک خشـتی خـاو | تـۆ لـەنێو ئاوێنـەدیتت ئـەو بـەچاو (٣٣٧١)
عاقـڵ ئـەووەڵ دی بـەدڵ کـار، ئـاخیری | دی نـەفام ئـەمما لـەئاخیر، زاهیـری[1] (٣٣٧٢)
شـین و گریـان و فیغـانی بـوو بـەئیش | مەمکەچیدی ئەی جەوانمەرد، سەر زەنیش (٣٣٧٣)
بۆیـەوام کـرد چونکـەمن بـووم نـا سـەزا | نـا سـەزاییم،تۆ بەباشـی دە، جـەزا (٣٣٧٤)
پێیـدەکوت لێـی دەر چووەتیرێـک، کـەوان | هەر چی چوو، چوو، تازەنایەت ئەی جەوان[2] (٣٣٧٥)
مـن بـەڵام داوا دەکـەم لـەو خـوای لەسـەر | تـۆ بـەئیمان لـەو جیهانەبچیـەدەر[3] (٣٣٧٦)
چونکەزینـدووی گـەر ئـەتۆ، ئیمـان بـەری | بـەر قـەرارو جاویـدان و سـەروەری (٣٣٧٧)
حاڵی قەی، بۆ هات جەوان هەرئەو دەمی | تەشـتییان دانـا گـەلێک زوو بـەر دەمـی (٣٣٧٨)
مەرگـە، قـەی هینـا، نەبـەد هـەزمی تـەعام | سوودی قەی کوابۆت؟ئەی بەد بەختی خام (٣٣٧٩)
بردیـان ئـەو، چوارکەسـان بـۆ جێـی خـۆی | لێکی دەخشاند ئەو دووساق و، پێی خۆی (٣٣٨٠)
پەنـدی مووسات گوێ نـەدا، لـەو لا دەدەی | خـۆت بـەتیغی تیـژی ئاسـن، دا دەدەی (٣٣٨١)
هـیچ حـەیاناکا، لـەتۆ تیغـی قـەدەر | موستەحەققی گەر ئەتۆ، وات هات بەسەر (٣٣٨٢)

---

[1]- دی بەڵام نادان لەئاخیر،زاهیری (مصرع دوم)

[2]- پێیدەکوت لێی دەرچوو تیرێ تیژ،کەوان        هەرچی چوو، بۆ دوایەنایەت ، ئەی جەوان

[3]- من بەڵام داوا دەکەم لای کردگار        وەختی مردن، بی ، لەگەڵ ئیمان ، بەیار

**دوعاکردنی مووسا(ع)بۆ ئەو کابرایە،کەبەئیمان بمرێ ...**

هــات مووســا بــۆ مناجــات ئەوســەحەر | دوور لــەئیمان مەیکەلــەو دونیایــە، دەر | (٣٣٨٣)
مەرحەمــەت کە، ئــەو ببەخشــە ئــەی خــودا | خیرەســـەر بـــوو، زێـــدەکردی ئیشـــتیبا | (٣٣٨٤)
پــێم دەکــوت تــۆ لا یقــی ئــەو عیلمــەنی | هەرچی پێم کوت ئەو نەهات بۆ ڕەو شەنی | (٣٣٨٥)
دەس دەبــا بــۆ ئــەژدەها ئــەو کــەس وەهــا | بێ بە دەستی وی عەسا، یــەک ئــەژدەها | (٣٣٨٦)
سیرڕی غەیب، ئەوکەس، دەبێ فێربێ کە ئەو | قــەت نــەکا، بــەو باســەواز، ئــەولێوو دەو | (٣٣٨٧)
تـــەیری ئـــاوەلایقی دەریایـــە، بـــەس | تێبگــە، زانــای ســەواب هــەر خوایەبــەس | (٣٣٨٨)
چۆ دەدەریــا، چــون نــەبوو ئــەو تــەیری ئــاو | زوو دەخنکــا، خــوا، دە، بــەو ئیمــان تــەواو | (٣٣٨٩)

**قەبووڵ کردنی خوداوەند دوعای مووسا علیەالسلام ...**

پێیــدەکوت بــاش، مــن بــەوی ئیمــان دەدەم | بت هەوێ زینــدووی دەکــەم، بەو گیان دەدەم | (٣٣٩٠)
بەڵکــەمردووی نێــو زەمــین، زۆر،یــان کــەم | هــەر لەبــەر تــۆ، ئێســتەزیندوویان، دەکــەم | (٣٣٩١)
پێیـــدەکوت مووســـا کـــەدونیا مردنـــە | گیــان لــەدونیای دی، بــەوی، دە، ڕۆشــنە | (٣٣٩٢)
ئـــەو جیهانـــەچون دەوامـــی زۆر کەمـــە | بازگەشـــتیش بـــەو، نەتیجەهەرغەمـــە | (٣٣٩٣)
تۆ بــەوان ڕەحمــێ بکەهــەر چۆن کــە، بوون | لـــەو نیهانخانـــەی (لـــدینا محضـــرون ) | (٣٣٩٤)
تــا بزانــی تــۆ، زیبــانی جیســم و مــاڵ | ســوودەبۆ گیــان، نایــەڵێ بــۆت بــێ وەبــاڵ | (٣٣٩٥)
بــۆ ڕیبــازەت تــۆ بــەگیا ن بــە، موشــتەری | تــەن بەخزمــەت دە، هــەتا، گیــان دەر بــەری | (٣٣٩٦)
گەرلــەبۆت بــێن دەردو ڕەنــج، بــێ ئیختیــار | دابنـــێ، ســـەر، شـــوکرکە، ئـــەی کامیـــار | (٣٣٩٧)
تــۆ بــەڕەنجی،وا شــوکر کــەخوایی خــۆت | خۆت کەنەت کرد، هات لەئەمری (کن) لەبۆت | (٣٣٩٨)

**حیکایــەتی ئــەو ژنــەی کەمنــداڵی بــۆ نــەدەما، دەگریــا و دەی ناڵانــد، جــواب هــات کــە ئەوهە عیوەزی ڕەنج و ڕیازەتی تۆیە و ئەرزیشی جیهادی موجاهیدانی هەیە...**

**خولاسەی داستان**

ژنێـک بـوو کەهـەموو سـاڵێ منـداڵێکی دەبـوو وپـاش شـەش مانگـان دەمـرد..ئـەو ژنەلەغـەم ونارەحەتیان زۆر شیوەن و ناڵەی دەکرد، تاکو شـەوێک دەخـەو دا باغێکی مەلـەکووتی دی ئەو ژنەلەجوانی و خۆشی ئەو باغەسـەری سوڕ مابوو، ولەپاشـان دیتی کـەنێوی وی لەسـەر دەرکی قەسرێک لەبەهەشت نووسراوە..ژنەکەچۆ نێو ئەوقەسرەدیتی کەتـەواوی منداڵەکانی دەوێدا کۆ بوونەتەوە.. بەدیتنی ئەو حاڵەتەخۆشەلەخودای داواکرد کەهەمیشەموسیبەتانی بۆ بنێرێ تا ئەو حاڵەتەخۆشانەببینێ...

بۆ ژنێک منداڵ دەبوو، کوڕ، ساڵ بەساڵ ‌ ‌ زیاد لەشەش مانگ بۆی نەدەژیا ئەو منال[1] (٣٣٩٩)

پاشی سێ یاچوار مانگ، منداڵ دەمرد ‌ ‌ لای خودا ئەو ناڵەناڵی وا دەکرد (٣٤٠٠)

پاشی نۆ مانگ بار وسێ مانگان، فەرەح ‌ ‌ زیاد لەعمری نیعمەتم، قەو س و قوزەح (٣٤٠١)

ئەو لەلای پاکان دەیکرد ناڵەناڵ ‌ ‌ هەربەشین دەیکرد، لەبۆیان، زیکری حاڵ (٣٤٠٢)

بیس منالی چوونەگۆڕ، ئەو، هەروەسا ‌ ‌ نێو دڵی ویش ئاگری لێدا یسا (٣٤٠٣)

تا شەوێک دیتی دەخەو، یەک دانەباغ ‌ ‌ سەو زو جاوید، خۆش،لەبوخل و ئاز، ساغ (٣٤٠٤)

من موورادم بوولەباغ ئەو جوورەباغ ‌ ‌ پڕ لەشادی،پڕلەنیعمەت، بێ قەراغ (٣٤٠٥)

چۆن بەوەی چاو نەیدی باغ بێژم دەنا؟ ‌ ‌ نووری خۆشی، خوا چرای ڕوون، ناو دەنا (٣٤٠٦)

من ئەوەم کوت بۆ میسال و بۆ بەیان ‌ ‌ تا ببەن بۆن، ئەوکەسانەی مات دەمان (٣٤٠٧)

ژن کەئەو حاڵەی دەدی، زوو بوو، بەمەست ‌ ‌ ئەو لەخۆشی، عەقڵ وهۆشی چوولەدەست (٣٤٠٨)

دی لەسەرکاخ نووسرابوو، نێوی وی ‌ ‌ ئەو بەئی خۆی زانی، کاخ ونێوی وی (٣٤٠٩)

وایدەکوت بۆ شەخسێ ئەوهە، لایقە ‌ ‌ گەر لەگیان دان ئەو گەلێک زۆر سادیقە (٣٤١٠)

تۆ دەبێ زۆر زیدەخزمەتکار بێ ‌ ‌ تا کو لەو ئەنعامە، بەر خوردار بێ (٣٤١١)

چون لەتاعەت دا گەلێک زۆر سست بووی ‌ ‌ بۆ عیوەز،حەق نێو مەسائیب، خست بووی (٣٤١٢)

دەیکوت ئەی حەق زیاد لەسەت ساڵان، هەر ‌ ‌ با وەها بم، تۆ، بەڵام زۆر، بێنەسەر (٣٤١٣)

ئەو لەنێو باغ کاتێ،کەم بۆ پێش، ڕۆی ‌ ‌ دی دەوێدان گشتی منداڵانی خۆی (٣٤١٤)

ژن کوتی لێم ون بوو، لێت پنهان نەبوو ‌ ‌ بێ دووچاوی غەیب،کەس ئینسان، نەبوو (٣٤١٥)

چونکەنەت گرت خوێتی زیادی تۆ لەخۆت ‌ ‌ خوێن لەدفنت،دێ، نەبەت، تا تەب، لەبۆت[2] (٣٤١٦)

مەغزی میوان زۆر لەپێستیان چاترە ‌ ‌ ڕووح بەمەغزە، تەن بەپێست، تۆ وەر گرە (٣٤١٧)

مەغزی نەغزو باشی، ئینسان، لا،هەیە ‌ ‌ ئەو تەڵەب کە، گەر دەمت لەخوا، هەیە (٣٤١٨)

### هاتنی حەمزە بۆ جەنگ بەبێ زرێ...

وەختێ پیربوو حەمزەبۆ شەڕ وا، دەچوو ‌ ‌ بێ زرێ خۆشحاڵ، بەبێ پەروا، دەچوو (٣٤١٩)

توند دەچوو پێش، ئاوەلا، ئێقەو بەرۆک ‌ ‌ خۆی دەنێو شێران دەهاویشت، ئەو سەرۆک (٣٤٢٠)

خەڵکی کوتیان،بەوکەئەی مامی نەبی ‌ ‌ ئەی لەحاستی تۆ دلێران، گشت سەبی (٣٤٢١)

---

[1]- بۆی نەدەژیا، زیاد لەشەش مانگ ئەو منالّ (مصرع دوم)

[2]- خوێن لەدفنت دێ ، نەبێ ، تا تەب لەبۆت (مصرع دوم)

تۆ مەگـەر نـەت دی لـەقورئان خـوا دەڵـێ — تـا بـێ بـۆ خـۆی، بـۆ هیلاکەت،کـەس هـەڵێ (۴۲۲-

تـۆ لـەبۆ چـی خـۆت دەچـی بـۆ تەهلوکـە — وا بـەبێ پـەروا دەچـی، بـۆ مەعرەکـە؟ (۴۲۳-

ئەو دەمەی کەبووی جەوان هەم توند کەوان — بێ زرێ جـەنگت نـەکرد قـەت هیچ ئـەوان (۴۲۴-

تـۆ کـەپیری ئێستەپشـتت وا چـەما — لێـدەدەی ئاهـەنگی بـێ بـاکی، چ مـا؟ (۴۲۵-

زۆر بـەبێ بـاک، تـۆ بەشەمشـیر و سـینان — خۆ ت لەدەعوا و شەڕ دەکەی وا، ئیمتیحان (۴۲۶-

نـاگرێتن تیـغ هـیچ کـات قـەدری پیـر — پیـر ومنـداڵ، لـەت دەکـەن شەمشـیر و تیـر (۴۲۷-

حـەمزەیان دا پەنـد، کەسـانێک بـێ خەبـەر — زۆر بەشـەو قـو، ئـا رەزووی بوویـان، لەسـەر (۴۲۸-

## جواب دانەوەی حەمزە بە خەڵکی...

وایدەکوت حەمزەکـەچون مـن بـووم جـەوان — مـــردنم لابـــوو بەمـــەرگی جاویـــدان (۴۲۹-

کێ بەخۆشی خۆی لـەبۆ لای مـەرگ چـوو؟ — کـێ لـەبۆ لای ئـەژد ەهـا، بـێ بـەرگ چـوو (۴۳۰-

مـن بـەڵام ئێسـتا بـەنووری ئەحمـەدی — ذاری فـانیم هـیچ و پـووچ و، کـەم دەدی (۴۳۱-

خـاریجی حـیس، ئێسـتە لەشکەر گـایی شـا — پـڕ دەبیـنم، هـەر لـەنووری حـەق، سـپا (۴۳۲-

بەسـتراوون چـادران، لێـک، بـێ ژمـار — خـوا شـوکر کـردی لەخـەو مـن، هووشـیار (۴۳۳-

ئەوکەسـەی مـردن لـە بـۆ وی بـوو هـەلاک — نهیـی (لا تلقـوا)، بـەدەس دەگرێـت چـاک (۴۳۴-

ئەو کەسەی مردن لەبۆی بوو، فەتحی باب — دێـت لـەبۆ وی (سـارعوا ) وەختـی خیتـاب (۴۳۵-

مـەغفیرەت داواکـە، تـۆ ئـەی مـەرگ بـین — حەشر، بینان، لێک بکـەن سەبقەت، بەدین (۴۳۶-

بـۆ خـودا میـوان دەبـن گشـت لوتـف بـین — قـــەهر بینـــانیش دەبـــن خـــوارو غـــەمین (۴۳۷-

هـەرچی دی یووسـوف گیـانی کـرد فیـدا — هەرچی گورگی دیت نەیویست قەت هودا (۴۳۸-

مـەرگی هەرکـەس ڕەنگـی وی تێـدا، ونـە — دۆستەبۆدۆسـت، دوژمنـیش بـۆ دوژمنـە (۴۳۹-

تورک، نـەینووک لای ئـەوی،خۆش ڕەنگییـە — لای هـەچی زەنگـی بـێ، نـەینووک زەنگییـە (۴۴۰-

تـۆ لـەمردن تـرس و بیمـت بـێ ئەگـەر — هـەر لـەخۆ تـە تـۆ دەترسـی، ئەلحـەزەر (۴۴۱-

ڕوویی پیسی تۆیـە،خۆ نـەک ڕوویی مـەرگ — گیـانی تـۆ هەرچەشـنی دارە، مەرگەبـەرگ (۴۴۲-

بـاش یابـەد گشـتی هـەر خـۆت چا،دەکـەی — خۆش و ناخۆش، خـۆت، دەدڵدا، جا،دەکـەی (۴۴۳-

ئێمەچانـدن ئـەو درووی دای پـێن بـرین — گـەر لەبـەرمان بـێ حـەریر، خۆمـان، چنـین (۴۴۴-

قـەت چکـار نابێـت هـاو ڕەنگـی جـەزا — قـەت، چ خزمـەت، نـابێ هـاو ڕەنگـی عـەتا (۴۴۵-

موزدی کارگەر نابێ هیچ کات چەشنی کار — چـون عـەرەز بـوو ئـەو، بـەڵام کـار پایـەدار (۴۴۶-

کار، سەراسەر، دەرد و ڕەنجە، هەم عەرەق　　مـوزد ئـەمما زێـڕ و زێـوی سـەر تەبـەق[1] (٣٤٤٧)
گـەر لـەجێیک بـێ لـەبۆ تـۆ، تـو همـەتێک　　کـردی مـەزڵووم لێـت دوعـا، بۆمیحنـەتێک (٣٤٤٨)
تـــۆ دەڵـــەی ئازادەمـــە، بـــەخوا ئـــەمن　　نـەم دەدا، توهمـەت لەکـەس، بێجـا، ئـەمن (٣٤٤٩)
جوورەکی دیت کرد گوناه، ئەی بێ خەبەر　　تـۆوە، چانـدت، تـۆو، کـەنابێ چەشـنی بـەر (٣٤٥٠)
یـەک زینـای کـرد لێیـدرا، سـەت دانـەدار　　ئەو دەڵێ نەمدا لەکەس، من، دار، چ جار (٣٤٥١)
بۆزینـــا ســـەت دار جـــەزایان دا دەنـــا　　کـــوا شـــەبیهی یـــەکترن، دار و زینـــا؟ (٣٤٥٢)
کوا شەبیهی مار عەسا بوو ئەی کەلیم؟　　کوا شەبیهی دەردە، دەرمان، ئەی حەکیم؟ (٣٤٥٣)
تـۆ لـەباتی ئـەو عەسـا، ئـاوی مـەنی　　دا دەنێـی، پاشـان دەبـێ، شەخسـی سـەنی (٣٤٥٤)
ئاوەکـەت پاشـان دەبـێ مـار یانـە، یـار　　بـۆ دەبـێ حـەیران عەسایەک، بێ بـەمار[2] (٣٤٥٥)
چەشنی ئاو کوا، ئەومناڵ دێ، بەر نەزەر؟　　کـوا شـەباهەت بـەینی قەنـد و نەیشـەکەر (٣٤٥٦)
گەر کەسێ چاندی ڕکووعێک یا سجوود　　ئـەو سجوودەی بـۆ دەکا جەننـەت، وەدوود (٣٤٥٧)
گـەر کەسـێ حەمـدی خـودا کـا، ئاشـکار　　تـەیری جەننـەت چادەکـا، لـەو،کردگار (٣٤٥٨)
نینـەوەک یـەک، تـەیر و تەسبیح، بـۆ خـودا　　گـەرچی نوتفـەیْ تـەیر، هـەر بـا یـەو هـەوا (٣٤٥٩)
گـەر بەدەسـتی خـۆت دات مـاڵ و زەکـات　　دەسـتی تـۆ، لـەو لا دەبـێ، نـەخل و نـەبات (٣٤٦٠)
سەبری تۆ، بۆ ئاوەکەی نێو جۆی بەهەشت　　میهری تۆیە، شیرەکەی خۆش بۆی بەهەشت (٣٤٦١)
زەوقـی تاعـەت بـوو بەجۆگـەی ئەنگـەبین　　بـوو بەجۆگـەی خـەمر، شـەو قی تـۆ، بـەدین (٣٤٦٢)
وێـک نـەچوون هیچیـان، ئەسباب و ئەسـەر　　شارەزای تـەغییری وا، هـەر خـوای لەسـەر (٣٤٦٣)
چونکەئەسـباب بـوون لـەژێر فـەرمانی تـۆ　　وا لـــەژێر فـــەرمانی تـــۆدان، چـــوار جـــۆ (٣٤٦٤)
تۆ بەهەر جێت ویست بڕۆن جا، وا دەکەی　　وەسـفی وان چـۆن بـێ لـەدونیا، وا دەکـەی (٣٣٦٥)
چـون مـەنی تـۆ ئـەمری تـۆ ئیجـرا دەکـا　　نەسـلی وی، تـۆ هـەرچی ویسـتت وا دەکـا (٣٤٦٦)
دێ منـاڵی تـۆ بـەدووی ئـەمرت، بـەغار　　جـوزئی تـۆم، دامـت لـەجێی محکـەم قـەرار[3] (٣٤٦٧)
چون لەدونیا باش بوو، وەسفی ئەمری تۆ　　وان لـەژێر فـەرمانی تـۆ ئـەو چـوار جـۆ (٣٤٦٨)
دار هـەموویان، بـۆت دەبـن فـەرمان بـەر　　چـون بەوەسـفی جـوانی تـۆ، بوویـان بـەر (٣٤٦٩)
چون لەدونیا بوون لەژێر ئەمرت سیفات　　تـا بیعـی ئـەمرت دەبـێ، لـەو لا، جـەزات (٣٤٧٠)

---

[1]- کار، سەراسەر دەرد و ڕەنج و میحنەتە　　موزد، ئەمما زێڕ و زیوو ، قیمەتە

[2]- تۆ لەئاوت مار ،یا ، یارت دەدی　　بۆ ، عەسا بۆ مار ، عەجەب ماوی ئەدی؟

[3]- دێ منالّی تۆ بەدووی ئەمرت موتیع　　جوزوی توم، دات نام، لەجێی محکەم وەدیع

گەر کو مەزڵووم هات لەتۆ، بۆی دەردەسەر ئـــەو دەبێتـــەدارەکی زەققـــووم، بـــەر (۳۴۷۱)

نێـــو دڵان گـــەردابنێی ئـــاگر، بـــەکین چـا دەبـێ لـەو، ئـاگری دووزەخ، بـەتین (۳۴۷۲)

ئـــاگرت چـــون لێرەســـووتاندی بەشـــەر هـەرچی چابوو لـەو، دەسووتێ، بـەو، نەفـەر (۳۴۷۳)

ئـاگری تـۆ خـەڵکی چـون ڕیسـوا دەکـا نـار کـەچابوو لـەو، ئـەویش هـەر وا دەکـا (۳۴۷۴)

ئـەو قسـانەی تـۆ کـەپیس و نـا حـەزن دەبنـەمارو دووپشـک، جـا، دەت گـەزن (۳۴۷۵)

ئـــەولییات کـــردن لـــەبۆخۆت مونتـــەزیر مەحشـەر ئێسـتا مونتەزیرتـەو، مـونزەجیر (۳۴۷۶)

مونتەزیر ما، پاک، بەوەعدەی دات خیلاف ئێستەحەشـرەمونتەزیر، بـۆت بـێ گـەزاف (۳۴۷۷)

زۆر دەبـــێ تـــۆ، مونتـــەزیر لـــەو ڕۆژەدا بـۆ حیسـابت تـا وی گـەرمیش، لێـت دەدا (۳۴۷۸)

ئاسمانیشـــــت دەخســــــتە ئێنتیــــــزار هێنـدە دەتکوت، دێم سبەینێ، هەر بـەغار[1] (۳۴۷۹)

خەشـمی تـۆ، تـۆوی سـەعیری دوو زەخـە تـۆ ئـەوی خـامۆش بکـە، چـون ئـەو فەخـە (۳۴۸۰)

نـــاری وانـــابێ خـــەمۆ ش ئـــیللا بـــەنوور نووری تۆکردی خـەمۆش، لێن ناری سوور (۳۴۸۱)

تـۆ بـەبێ نـوور حیلمـی زۆرت بـێ ئەگـەر ئـاگرت هـــەر زینـــدووە، مشـــکی لەســـەر (۳۴۸۲)

پۆشیشـــی وا، بـــێ بـــەقا، بـــێ ئیعتیبـــار بـەس بـەنووری دیـن دەبـێ خامووش، نـار (۳۴۸۳)

بـێ ئـەمانی نـەت بـێ نـووری دیـن ئەگـەر ئـــاگری پنهـــان، ڕۆژێـــک، دێتـــەدەر (۳۴۸۴)

بگرەئـاو تـۆ، نـووربێ وەک ئـاو، لـەلات گـەر هـەبێ ئـاو، بـیم لـەنار نـابێ، چکـات[2] (۳۴۸۵)

ئـاو دەکـا خـامووش نـار، نـاریش بـەخوو پێیدەسووتێ نەسلی ئاو، یـەک یـەک، هـەموو (۳۴۸۶)

چەنـــد ڕۆژان لای مراویـــان تـــۆ بـــڕۆ تـــا ببـــەن لای ئـــاوی جاویـــدان، ئـــەتۆ (۳۴۸۷)

لێـک جییـانین تـەیری ئاوو،خـاک لـەبۆن گـەرچی زیـددی یـەکترین وەک ئـاوو ڕۆن (۳۴۸۸)

هـەردوو یـان وابەسـتەبوون، بۆ ئەسـڵی خـۆ وێـک دەچـن، جـا، ئیحتییاتـت، بـێ، ئـەتۆ (۳۴۸۹)

وەسوەسەو،وەحیی،ئەلەسـتیش، هـەر وەهـان هـەردوو مەعقوولن،بـەڵام زۆر لێـک جـودان (۳۴۹۰)

هـــەردوو دەڵلاڵـــن لـــەبازاری زەمیـــر ماڵی خۆ تەعریف دەکەن چاک، ئەی ئەمیر (۳۴۹۱)

گـەر دەناسـی فکـرو دڵ تـۆ، ئـەی هـەواڵ لێـک جـودا کـە، ئـەو دووفکرە، ئـەی دەڵاڵ (۳۴۹۲)

لەو دوو فکرەت گەر هـەبێ شـەککو گومان حـەو سـەلەت بێ،تونـد مـەڕۆ تۆ ئـەی فلان (۳۴۹۳)

---

[1]- چونکەدەت کوت دێم سبەینێ، من بەغار (مصرع دوم)

[2]- ئاو هەبێ گەر، نابێ ترسی نار، چکات (مصرع دوم)

**چارە بۆ دەفعی مەغبوون بوون لە کڕین و فرۆشتن ...**

یــەک لــەیارانی پەیامبــەر وایــدەکووت مـن لەبـەیعان، بـووم دەگـەڵ ئـەزرار، جـووت (٣٤٩٤)
هەرکەسـێکی پێـی فرۆشـتم یـاکڕی فێڵ دەکا لێم، هـەرچی بـووم، بردی، خـڕی (٣٤٩٥)
پێیـدەکوت ترسـت کـەبوو بـت بـێ غیـرار شـەرتی سـێ ڕۆژان، بکـەتۆ، ئختییـار (٣٤٩٦)
حەو سەلەت، چـون دێ لەلای ڕەحمان، یەقین دێ عەجوولیشـت، لەشـەیتانی لـەعین (٣٤٩٧)
گـەرکو بـاوێی تـۆ لـەبـۆ سـەگ پەلکـەنان بـۆن دەکـا دەیخـوا، لەپاشـان، ئـەی فـلان (٣٤٩٨)
سـەگ بـەلووتی بـۆن دەکـا، ئـەمما ئەمـە بـۆن دەکـەین بـەو عەقڵەباشـەو سـالمە (٣٤٩٩)
حەو سـەلەی بوو ئەو خودای باڵا و نـەوی چایـدەکرد شـەش ڕۆژە، ئاسـمان و زەوی (٣٥٠٠)
خـۆ دەنـا کوتبای،کـە(کـن ) ئـەو، وا دەبـوو جێ بەجێ سەت عەرد و ئاسمان، چا دەبوو[1] (٣٥٠١)
کەمکەمـە، ئینسـان دەکـا کـا میـل خـودا عـەقڵی کامیـل بـەو لـەچل سـاڵەی دەدا (٣٥٠٢)
گـەرچی لـەحزێک بـی هـەوێتن کردگـار چـا دەکـا ئینسـانی کامیـل، بـێ ژمـار (٣٥٠٣)
بـۆچی عیسـا یـەک دوعـای گـەر کردبـا گیـان وەبـەر مـردوو دەهـات، ئـەو دەم دەبـا (٣٥٠٤)
خـالقی عیسـا مەگـەر بـوو نـا تـەوان؟ چـا نـەکا، یـەک لـەحزە، ئینسـانان، سـەدان (٣٥٠٥)
سـەبری وا، تەعلیمـە، تـا نـەت بـێ پەلـە تـا تەڵـەب کـەی، بـێ وچـان، باحەوسـەلە (٣٥٠٦)
دائیمـەن بـڕوا لـەنێو،ئاو شـولکی چـووک بـۆ گـەنیو نـا بێت،ئەو،قـەت پـیس و پـووک (٣٥٠٧)
حـەو سـەلەی وا، چادەکـا خۆشـی و سـروور حەو سەلەی وا، هێلکە، خۆشی وەک تیوور (٣٥٠٨)
کـوا وەکـوو هێلکـەی دەچـن، تـەیر و تیـوور گـەرچی هێلکەهـەر لەتـەیری کـرد زهـوور (٣٥٠٩)
حەو سەلەت بێ،تاکو ئەعزات،چەشنی هێک چـا دەکـەن لێکـڕا ئەوان،تـەیرا ن گـەلێک (٣٥١٠)
چوێلەکە، هێلکـەی کەچوو، وەک هێلکەمار[2] زۆر لەڕیشـە، لێـک بـەدوورن، پێـک نـەیار (٣٥١١)
وێک دەچن گەر دەنکی هەرمێو دەنکی سێو زۆرە فـەرقـی وان کـە نـاکوترێن بـە لێـو (٣٥١٢)
بـەرگی داران بـوون بـە هاوڕەنـگ، زاهیـری میوەکانیـان بـوون خیلافـی یـەکتری (٣٥١٣)
بەرگی ئەجسام، بوون شەبیە پێک، گشتییان عیللـەتی ژینـی گیبانیـان لێـک جییـان (٣٥١٤)
خـەڵکی بۆ بازار دەچـن، یـەک جوور،بەجـەم یەک بەشادی ڕێ دەچێ، یـەک دڵ بەغـەم (٣٥١٥)

---

[1]- خۆ دەنا کوتبای کە(کن) ئەو ، بێ گومان چا، دەبوون ، سەت ، زیندە، عەردو ئاسمان
[2]- گەر دەچوو وەک هێلکەچێشکە، هێلکەمار (مصرع اول)

وەختی مەرگیش هات ئەگەر،یەک سان، دەچین نیوەمـــەغبوون، نیوەمـــان، خاقـــانی چـــین[1] (٣٥١٦)

**مردنی بیلال بەشادی، خوای لێ خۆش بێ...**

**خولاسەی داستان ...**

بیلالی حەبەشی کەلە ئەسەری زەعیف بوونی میزاج وەک مانگی نوێ لاواز ببوو، لەمردن نیزیک بوو، هاوسەری وی لەدیتنی ئەو مەنزەرەدڵ تەزێنەگریا وکوتی لەخۆم ماڵ وێرانو بەد بەختی، وەختی مەرگە..بیلال کوتی غەمێ مەخۆ ئەڵێان کاتی شادی منە، نەغەم و نارِەحەتی چونکەئەمن لەو دونیای مووەققەتی دا غەرقی دەریای ڕەنج و بەڵابووم، و ئێستا وەختی هاتووەکەقەفەسی ڕەنج و بەڵا بشکێت و باڵەندەی ڕووحم ئا سوودەو بێ غەم، بۆ عالەمی مەلەکووت پەرواز بکا، هاو سەری وی پێیکوت.. تۆ ئێستا بۆدیاری غورِبەت دەچی..بیلال جوابی داوەنەخێر وا نییەئەمن تاکو ئێستا لەدیاری غورِبەت دا بووم وئەڵێان دەچمەدیاری ویسال، لای خۆشەویستانی خودا ...

گـــەرکولاوازبوو بـــیلال چەشـــنی هـــیلال رەنگـــی مـــردن هـــاتو، کەوتەســـەر بـــیلال (٣٥١٧)
هـــات ژنـــی وی کـــردی وا وەیـــلا و داد جـا، بـیلال دەیکـوت ئـەمن ئێستامە، شـاد (٣٥١٨)
تـاکو ئێستا بـووم لەغـەم دا، جێـی پـەرۆش کـوا لـەمردن تـۆ دەزانـی عـەیش و نـۆش؟ (٣٥١٩)
کـــاتێ دەیکـــرد ئـــەو قســـانەئەو ئـــەدا وەک گـــوڵی خەمڵانـــد، ڕوویـــی وی خـــودا (٣٥٢٠)
ڕەو شـەنی ڕوو، وچـاوی پـڕ ئـەنواری وی بـوون بەشاهید، ڕاستە، گشـت گفتـاری وی (٣٥٢١)
ڕەش دڵان ڕەشیان دەدی ئـەو، خـۆ بـەڵام چـاو بـەبێ ڕەشـکێنەکەی ڕەش، نـا تـەمام (٣٥٢٢)
ئـەو کەسـانەی بـێ بەسیرەت، ڕوو ڕەشـن ڕوون دڵان ئـــا وێتـــەبۆ مـــانگی گەشـــن (٣٥٢٣)
کـــێ دەبینێـــتن لـــەتۆ ڕەشـــکێنەچاو؟ غەیری ئەو کەس ڕوونەقەلبی، چەشنی تاو (٣٥٢٤)
چونکـــەنابینێ ئـــەو ی قـــەت، دڵ زەریـــر ئـەو دەبینێـتن فەقـەت، ڕەو شـەن زەمیـر[2] (٣٥٢٥)
گشت موقەللید بوون بەغەیری ئەو ڕەسووڵ لـەو سیفاتی باش،کەبوون لای عـام قـەبووڵ (٣٥٢٦)
ژن کوتی بەو (ئەلفیراق ) ئەی خۆش خیسال ئـــەو کـــوتی نـــا، ئەلویســـال و ئەلویســـال (٣٥٢٧)
ژن کوتی ئەو شـەو دەچی بۆ جێـی غـەریب جێ دەهێڵی قـەو مـو کـەس، دۆست و حـەبیب (٣٥٢٨)
ئـەو کـوتی نـا، بەڵکەئـەو شـەو گیانەکـەم دێ لەغورِبـــەت ڕا لـــەبۆ نێـــو لانەکـــەم (٣٥٢٩)

---

[1]- نیوەغەمگین ، نیوە، هەیتی پێکەنین (مصرع دوم)

[2]- چونکەهەر ڕەشکێنەدیتی چاک بیلال یەعنی دی ، چاک ، ئەو، ڕەسوولی زولجەلال

ژن کــوتی لــەکوێت ببینـــین ئێمـــە، جـــا | ئـــەو کــوتی نێـــو جـــەمعی دۆســـتانی خـــودا (٣٥٣٠)
حەڵقەیی خاسان ئەتۆش، خۆ، یەک لەوی | گـــەر تەماشـــا کـــەی لەباڵا،نـــەک نـــەوی (٣٥٣١)
جـا لـەنێو ئـەو حەڵقـەدا، زاتـی ڕەحـیم | نـوور دەدا وەک بێ لـەنێو گوسـتیل، نـەقیم (٣٥٣٢)
ژن کـوتی ئـەو ماڵـەوێران بـوو، ئەسـەف | ئەو کوتی هەو رت نەوێ، مانگ بوو هەدەف (٣٥٣٣)
تـا کوچـاکتر کـات ئـەو،کردی خـەراو | زۆرەقـەو مـم، ماڵەکـەش زۆر نـا تـەواو (٣٥٣٤)

## حیکمەتی وێران بوونی بەدەن بە مەرگ ...

چەشنی ئادەم بووم لەئەووەڵ حەپسی کەڕب | ئێستەڕووحی من پڕی کرد،شەرق و غەرب (٣٥٣٥)
مـن گـەدا دەژیـام، لـەنێو ئـەو مـاڵی تـەنگ | بوومەشا، شاش د ەیهەوێ، قەسری قەشەنگ (٣٥٣٦)
قەســـر، بـــۆ شـــاهان هەمیشەمەئنەســـە | جێ ومەکان بۆ مردووان، یەک گۆڕ بەسە (٢٥٣٧)
ئـــەنبییا تەنگەلـــەبۆ وان،خـــۆ، جیهـــان | چەشنی شاهان، بۆ یەچوون نێو لا مەکان (٣٥٣٨)
مـــردووان دونیـــا لـــەبۆ وان پـــڕ ســـەمەر | زاهیـــرەن گـــەو رە، بـــەباتین، تەنگەبـــەر (٣٥٣٩)
گـەر نـەبا تـەنگ، بـۆ دەبـوو داد و هـەوار | بـۆ ئـەوەی زۆر مـا، وەکـو دال بـوو خـووار (٣٥٤٠)
لـەو زەمـانی خـەو کـەچون ئـازادِ بـوو | چـاک بنۆڕە،گیـان لـەوێ، چـەن، شـاد بـوو (٣٥٤١)
زاڵمـیش خـووی زوڵـم، ئـەو دەم لادەنـێ | شەخسی حەپسیش، فکری زیندا ن دا دەنێ[1] (٣٥٤٢)
ئـــەو زەمـــین و ئاســـمانی وا بـــەرین | تەنگـــەبۆ وشـــتر،کەبۆ یخـــدان بـــەرین (٣٥٤٣)
وســـعەتی دونیـــا درۆیـــە، زێـــدە تـــەنگ | پێکەنینو فەخری وی گشت شین و نەنگ (٣٥٤٤)

## بەیانی ئەو مەتڵەبە کە دونیا بەزاهیر وەسیعە، بەڵام تەنگ، و خەو نەجات بوون لەو تەنگییەیە...

وەک حـەمامێک وایەگـەو رەو زۆر بـەرین | گیـان لەگـەرمان تەنگەجێی،لەودا،غـەمین (٣٥٤٥)
گەرچی حـەممام زۆر وەسیعەو، زۆر بـەرین | تەنگـەبۆ ڕووحـت کەهـەیتی زێـدە، تـین (٣٥٤٦)
تـا لـەوێ تـۆ دەرنـەچی، ئاســوودەنی | وسـعەتی ئـەو مەنزڵـە، نـات کـا، خـەنی (٣٥٤٧)
گەر لەسەحرا کەوشی تەنگت بێ، لەبەر | با لەسەحرای زۆر وەسیعیش کەی گوزەر (٣٥٤٨)
تەنگەلات،سـەحرای وەسـیعی وا، یـەقین | حەپسـەبۆت سـەحرای وەهـا، پـانو بـەرین (٣٥٤٩)
هـەرچی لـەو سـەحرایەتۆی دی، وایـە لای | گوڵ کەپوشکوت، تۆش ئەلـەو سەحرایە، وای (٣٥٥٠)

---

[1]- شەخسی حەپسیش فکری زیندان ، ڕا دەنی (مصرع دوم)

ئـــەو کـــەنازانێ ئـــەتۆ وەک زاڵمـــان    زاهیـرەن نێـو گوڵشـەنی، گیـان نێـو فیغـان (٣٥٥١)
گـــەر کوگیانـــت دابنـــێ، لـــەو لا، تـــەنی    وەک لەخـەو دا کەوشـی وا تـەنگ، داکـەنی (٣٥٥٢)
ئـەو لیبـا، خـەو مولکـەبۆ یـان، ئـەی فـلان    چەشنی ئـەو ئەسحابی کەهفی نێـو جیهان (٣٥٥٣)
ئـــەولیبا خـــەو نـــان دەبیـــنن ناچنەخـــەو    نێـو عـەدەم،پێ، دادەنـێن، بـێ دەرکەئـەو (٣٥٥٤)
خانەتەنگـــەو گیـــان لەوێـــدا، ناتـــەوان    تێکـــدرا،تا چاکرێ،کـــاخی شـــەهان (٣٥٥٥)
نـــا تـــەوانم وەک جـــەنینی نێـــو ڕەحـــیم    بوومـــەنۆ مانـــگ، کاتـــەبۆ کـــۆچی مـــوهیم (٣٥٥٦)
دایکـی مـن نـەی بێـت ژانـی زان، ئەگـەر    دا دەنـێم لـەو بەنـدەد ا، نێـو نـار سـەر (٣٥٥٧)
دایکـــی تـــەبعم، زێـــدەدیتی ژانـــی زان    ڕێـی جـودا یـی، بـەرخ و مـەڕمان، دانیشـان (٣٥٥٨)
تـا لەدەشـت ئـەو بەرخـە، بخـوا گیـاو گـەڵا    چـون فـەڕاژ بـوو، بـۆی ڕەحیم،کـە، ئا وەڵا[1] (٣٥٥٩)
ژانـی زان گـەر بـۆ ژنـان، دەردەو، حـەنین    تێـک شـکانی بەنـد و زینـدان،بۆ جـەنین (٣٥٦٠)
حامیلـــەدەگری، دەڵـــێ (ایـــن المنـــاص )    شادو خەندان بو و جـەنین، دەی بێ خـەلاص (٣٥٦١)
هـەرچی ژێر ئـەو چەرخـەدا بن ( ا مهات )    جـا، جـەماد بـێ، یـا نـەئاژەڵ، یـا نـەبات (٣٥٦٢)
گشـت لـەدەردو ڕەنجـی یـەکتر غـافڵن    غـەیری ئـەو هانـەی بـەهۆ ش و کـاملن (٣٥٦٣)
ئـــەو شـــتەی زانـــا لەخـــەڵکی دا دەدی    ئەحمـەقی نـادان لـەخۆی دا کـوا دەدی؟ (٣٥٦٤)
ئـــەو شـــتەی عـــارف لەحاڵت،حاڵییـــە    مـەغزی تـۆ ئـەی مامـەگیان، لـەو خاڵییـە (٣٥٦٥)

**بەیانی ئەو مەتڵەبە کە هەموو غەفڵەت و تەنبەڵی و تاریکی، لە بەدەن سەرچاوە دەگرن، چونکە بەدەن خاکی و سوفلییە...**

غەفڵـــەتان، ســـەر چاوەیـــان تـــەنها، تەنـــە    سیڕ دەزانـی تـەن، کـەبۆ ڕووح، چـی هەنـە (٣٥٦٦)
گـــەر زەمـــین لاچـــێ لەجـــەووی ئاســـمان    ســێبەرو شــەو مــان، نــابێ هــیچ مــان (٣٥٦٧)
سێبەروشـەو، بـن لەهـەر جێ، بـێ گومـان    عـــەردەباعیس خـــۆ نـــەمانگ و ئاســـمان (٣٥٦٨)
هـــەر لـــەدار پەیـــدا دەبێـــتن دوودی ڕەش    دوودی ڕەش پەیدا نییە، لای ناری گەش (٣٥٦٩)
وەهمـــەکاری ئیشـــتیبایە، هـــەم غەڵـــەت    عەقڵەتـــەنها ڕاســـتەکاری وی، فەقـــەت (٣٥٧٠)
تەنبـــەڵی ســـەرچاوەکەی تـــەنها تەنـــە    گیـان کەسـووکە، کـاری پـەرواز کردنـە[2] (٣٥٧١)
ڕوو کەســـــوورە، خـــــوێتی زۆرە وادەکـــا    ڕوو کـــەزەردە، کـــاری وا ســـەفرا دەکـــا (٣٥٧٢)

---

[1]- تا لەسەحرای شین بکا ، بەرخت لەوەر    چون فەڕاژە، لێی گەڕێ با بێتەدەر
[2]- بەس بەدەن ئینسان وەها، بێ واز دەکا    گیان کەسووکە، دائیمەن پەرواز دەکا

ڕوو سبی بێ، بەڵغەمە،گەر وادەکا — ڕەشیەتی بۆ ڕوو، فەقەت، سەو دادەکا (٣٥٧٣)

خالقی ئاسار، خوداوەندی قەدیر — عالەمیش وابوون، لەدووی عیللەت ئەسیر (٣٥٧٤)

مەغزەکی کەبوو لەنێو پێستا ن غەریب — بوو نییازی وی بەعیللەت هەم تەبیب (٣٥٧٥)

جاری دوو، ئینسان کەبوو، ئەو وا دەبێ — هەرچی عیللەت بێ، لەژێر پێی، دا دەبێ (٣٥٧٦)

عیللەتی ئەووەڵ، لەبۆی نابێ بەدین — عیللەتی جوزئیش، نا ی بێ بەو، چ کین (٣٥٧٧)

نێو ئوفوق پەرواز دەکا، وەک ئافتاب — گەڵ عەرووسی سیدق، سوورەت وەک حیجاب (٣٥٧٨)

جێی دەهێشت ئەو هەم ئوفوق هەم ئاسمان — چەشنی عەقڵ و ڕووح، ئەو،بوو بێ مەکان (٣٥٧٩)

بەڵکەعەقڵی ئێمەسایەن، لای ئەوی — چەشنی سایە، دائیمەن بەدوای ئەوی (٣٥٨٠)

موجتەهید هەر کات کەبێتن نەس شناس — ئەو دەمی لای موعتەبەرنابێ قییاس (٣٥٨١)

موجتەهید نەسسی نەبێ، هیچ لا، ئەگەر — ئەو دەمی، لای وی، قییاس زۆر موعتەبەر (٣٥٨٢)

### تەشبیهی نەس بەقییاس ...

نەس بەوەحیی قودسی بگرە، ئەی دلێر — ئەو قیاسی عەقڵی جوزئی، لەو لەژێر (٣٥٨٣)

دەرک و فامی عەقڵی جوزئی هات لەگیان — چۆ ن دەبێ گیان ژێر نەزەر بێ، ئەی فلان؟ (٣٥٨٤)

گیان دەعەقڵی دا، بەڵام تەئسیردەکا — بەو ئەسەر ئەو عەقڵەجا، تەدبیر دەکا (٣٥٨٥)

چەشنی نووح گەر تۆ دەکا، تەئیید ڕووح — کوا یەم وکوا کەشتی کوا تووفانی نووح؟ (٣٥٨٦)

عەقڵ لای وی بوو ئەسەر، ڕووح خۆ بەڵام — دوورەنووری ڕۆژ لەڕۆژ، ئەی خۆش کەلام (٣٥٨٧)

بۆیەسالیک ویستی هەر یەک دانەنان — تا لەزەحمەت نوور بدا بەو،خوای جیهان (٣٥٨٨)

چونکەئەو نوورەی لەدونیای سافیلە — بێ دەوامەڕۆژو شەو ئەو ئافیلە (٣٥٨٩)

ئەو کەسەی جێی نێو هەتاو کرد ئینتیخاب — دائیمەن ئەو غەرقی نوورە، ئەی جەناب (٣٥٩٠)

کوا بەوەهەم و ژین ئەو ڕێ بەر دەدات؟ — لەو فیراقی ڕەنج هێنەر، بووی نەجات (٣٥٩١)

ئەسڵی ئەشخا سی وەها ئەفلاک بوو — یان عەوەزبوو، گەر چی ئەووەڵ، خاک بوو (٣٥٩٢)

چونکەخاکی، نیتی تاب و هەم تەوان — لەو بدا تا، پەرتەوی خۆی جاویدان (٣٥٩٣)

گەر لەخاک،تاو نووری خۆی دائیم، بدات — وا دەسووتێ، میوەنادا، قەت چ کات (٣٥٩٤)

ژین لەنێو ئاو دا لەبۆ ماسیانەکار — کوا لەدەستی دێ لەگەڵ وان بێت، مار؟ (٣٥٩٥)

خۆ بەڵام مار زۆر بەفەن هەن، نێو چییان — دێن دەکەن،لەو بەحرە،کاری ماسییان (٣٥٩٦)

گەر چی عالەم زۆر بەوان گومڕا دەبن — ئەهلی دەریا چونکەنین، ڕیسوا دەبن (٣٥٩٧)

زۆر لەنێو ئەو بەحرە، ماسی هەن، بەفەن — مار دەکەن ماسی،کەسیحری وا دەکەن (٣٥٩٨)
ماسییانی بەحری زاتی بێ هەواڵ — فێر دەبوون بەو بەحرەجا، سیحری حەلاڵ (٣٥٩٩)
غەیرەمومکین جادەبوو، مومکین بەوان — نەحس‌وپیس چوون،هات لەجێی وان،باش‌وجوان (٣٦٠٠)
تاقییامەت گەر بڵێم من لەو کەلام — سەت قیيامەت دێن، ئەوەش هەر نا تەمام (٣٦٠١)

**ئادابی گوێ دانی گوێگران وموریدان بەگوفتاری حیکمەت ئامیزی شێخ ...**

لای مەلوولان ئەو هەتیکرار کردنە — لای من ئەمما عومری زیاتر بردنە (٣٦٠٢)
وادەما، شەم،چون مەکەڕڕەڕ بوویی نوور — تاو موکەڕڕەڕ، دای لەخاک بۆ زێڕی سوور (٣٦٠٣)
گەر مەلوول بێ یەک نەفەر،تالیب هەزار — ناتوانێتن ڕەسوول بێژێت، وتار (٣٦٠٤)
گوێگری وای ویست ڕەسوولی باخەبەر — چەشنی ئیسرافیل بێ، فەرمانبەر (٣٦٠٥)
ئەو ڕەسوولان ویستییان هەر وەک شەهان — تا قەبووڵ کا، گوێگری وان، قەولی وان (٣٦٠٦)
تا نەبی نیسبەت بەوان تۆ با ئەدەب — چۆن لەوان بەهرەی دەبەی تۆ؟،ئەی عەجەب (٣٦٠٧)
تا نەکەی تەعزیم و تەکریمی ئەوان — چۆن وەدەستت دێ ئەمانەت؟، ئەی جەوان (٣٦٠٨)
کوا، بەوان لایق بوو هەرجوور ئیحتیرام؟ — چون ئەوان بوون، زۆر عەزیم عالی مەقام (٣٦٠٩)
خۆ، گەدا نین تاکو بۆ هەر خزمەتێک — ئەی ڕیبا کار، لێت قەبووڵ کەن،مییننەتێک (٣٦١٠)
گەر نەیان ویست قەو لی وان، ئەی دڵ، ئەتۆ — هەدیەیی، شا، هەر ببەخشەسەربەخۆ (٣٦١١)
لینگ دەئەسپت ئەی ڕەسوولی ئاسمان — تۆ مەلوولان لادە،هیچ مەڕ وانە، وان (٣٦١٢)
خۆش بەحاڵی جەنگجووی نێو کار زار — ئەسپەکەی پازدا، لەخەندەک، پڕ لەنار (٣٦١٣)
ئەسپەکەی وا تین دەدا، بڕوا، جەری — وەک دەڵەی دەڕواتەئاسمان، سەر سەری (٣٦١٤)
چاو لەغەیری خواوو، ئازار، بەر دەدا — وشک و تەڕ ئاگر دەدا، لەو عەردەدا (٣٦١٥)
گەرکو بێ بۆ وی پەشیمانی و نەدەم — زوو نەدەم ئاگر دەدا، دەیکا، عەدەم (٣٦١٦)
کواپەشیمانی لەشەخسێک ڕوو دەکات؟ — ئەو لەکارو باری خۆی هەیبێ سەبات (٣٦١٧)

**ناسینی هەموو حەیوانێک دوژمنی خۆی و زەرەر و زیان دیتنی ئەو کەسەی کە دەگەڵ کەسێک دوژمنایەتی دەکا، کە ناتوانێ لە بەری هەڵێ و خۆی لێ بپارێزێ و ناش توانێ موقابەلە و دەعوا بکا...**

شێر لەلای ئەسپان، بەبۆن بوون ئاشکار — گەر چی حەیوانن، مەگەر هەرجارو بار (٣٦١٨)
بەڵکەیەک یەک،دوژمنی خۆی جانەوەر — چاک دەناسن، گەرنیشان بێ، یا ئەسەر (٣٦١٩)

ڕۆژ کـەهات خوففـاش لەپـەر واز ناتـەوان    دێتـەدەر دەخـوا، شـتی، وەک دز، شـەوان (٣٦٢٠)
چەکچـەکی مـەحروومترین حـەیوان بـوو    چون بەڕۆژی ڕوونو گەش ئەو بوو عەدوو (٣٦٢١)
نـــاتوانێتن قـــەبووڵ کـــا زەربـــی وی    یـــا بەنـــەفرینان، بکـــا، ئـــەو مـــونزەوی (٣٦٢٢)
تـا نـەبێ بـۆ چەکچـەکی هـیچ دەرد و غـەم    ڕۆژ نەدا لەو، پەڕ تەوی خۆی، دەمبەدەم[1] (٣٦٢٣)
غایـــــەتی قەدرەلــــــەبۆ وی دا دەنـــــا    مـەنعی تـاو ناکـات، خوففـاش، خـۆ دەنـا (٣٦٢٤)
تـۆ مەبـەدوژمن دەگـەڵ زیـاتر لـەخـۆت    تـا کـو مـومکین بێ ئەسیر بێ ئەو لـەبۆت (٣٦٢٥)
قـەترە، گـەر دەعـوا دەگـەڵ دەریـا دەکـا    شـێتەبێخود، ئـابڕووی، بـەر بـا، دەکـا (٣٦٢٦)
مـەکری وی نـا بێ لـەخۆی خـۆ، هیچ جـودا    حەڵقـەیی حوجرەی قەمـەر کوا تێک دەدا؟ (٣٦٢٧)
هـەر کەسـێ دوژمـن ببـێ بـۆ تـاوی تـاو    ئـــەو عیتابـــەی وا، لـــەبۆ وی بوو،تـــەواو (٣٦٢٨)
ئـەی ئـەوەی دوژمـن بـەتاوی خـۆ، لـەتاو    دێنەلـــــەرزین ڕۆژ و ئەســـــتێران بـــــەتاو (٣٦٢٩)
نـی ئـەتۆ دوژ مـن بـەتاو، دوژمـن بـەخۆی    کـوا غـەمی ئـاگر، کـەتۆ دار بـی لـەبۆی؟ (٣٦٣٠)
کـــوا بەســـووتانت لـــەئاگر کـــەم دەبـــێ؟    کـوا بەناڵەت،ئـەو دڵـی پـڕ غـەم دەبـێ؟ (٣٦٣١)
ڕەحمـەتی حـەق کـوا وەکـوو، ئـی ئادەمـە؟    ڕەحمـی ئینسـان عیللـەتی وی، هـەر غەمـە (٣٦٣٢)
ڕەحمـەتی مـەخلووق دەگـەڵ غـەم تێکـەڵاو    ڕەحمـەتی یـەزدان لەغـەم پـاک بـوو تـەواو (٣٦٣٣)
بـێ نیهایـەت ڕەحمـەتی ئـەوخوای لەسـەر    لـەو دەبـوو زاهیـر بەتـەنها، هـەر ئەسـەر (٣٦٣٤)

**تەفاوەت لە نێو زانینی شتێک بە میسال و تەقلید و زانینی حەقیقەتی ئەو شتە...**

زاهیـرەن ئاسـار و میـوەی ڕەحمـی حـەق    ئەسلی وی نـازانێ غـەیری خـوای فەلـەق (٣٦٣٥)
نەیـــدەزانی ئەســـڵی وەســـفی زولجـــەلال    هـــیچ کەســـێ، ئـــیللا، بەئاســـارو میســـال (٣٦٣٦)
تیفـــڵ، خۆشـــی قورپـــەتی بـــۆ نایـــە، خـــۆ    تـا نەڵـەی بـەو، خۆشـەوەک هەڵوایـە، خـۆ (٣٦٣٧)
کـــوا دەبـــێ ماهییـــەتی زەو قـــی جیمـــاع    چەشـنی ماهییـاتی هـەڵوا، ئـەی موتـاع؟ (٣٦٣٨)
زیکـری کـرد ئـەمما لـەبۆ تـۆی وەک منـاڵ    شەخسـی عاقـڵ تـا بـەیان کـا، وەزعوحـاڵ (٣٦٣٩)
تـــێ بگـــا تـــا، لـــەو میســـالانە،مناڵ    گـەرچی نازانێـت ئـەو هـیچ ئەسـڵی حـاڵ (٣٦٤٠)
گـەر بڵـەی حـاڵی دەبـووم مـن، وایـەخۆ    گـەر بڵـەی حـاڵی نـەبووم، نـا کـەی درۆ (٣٦٤١)
وەک لەبارەی نووح بکا یەک لێت سوئال    تۆ دەناسی ئەو نەبی خوای، بێ میسال (٣٦٤٢)
گـەر بڵـەتۆ چـاک دەناسـم، مـن ئـەوی    ئـەو دەناسـن خـەڵکی ئاسـمان هـەم زەوی (٣٦٤٣)

[1]- گەر لەبەر دەرد و عەزابی چەکچەکی  ڕۆژ نەدا لەو پەڕ تەوی خۆی، قەت یەکی

هەم لەمەکتەب دا، هەموو منداڵ، بەعام — هەم لەنێو میحرابی مزگەو تان، ئیمام (٣٦٤٤)
ئا شکرا نێوی لەقورئا ن دا دەڵێن — زۆر فەسیح ئەو چی بەسەر هات، وا دەڵێن (٣٦٤٥)
ڕاستگۆ بگرەلەڕووی ئەوساف، ئەوان — گەرچی ماهییەت، لەنووح، نەکرا، بەیان (٣٦٤٦)
گەر بڵەی ناسینی نووح نایەت لەمن — وەک ئەوی باش، ئەو دەناسێ، واش کەمن (٣٦٤٧)
من کەمێرووم، کەی دەناسم، فیل، کەی؟ — کەی دەناسێ، پەششەئیسرافیل،کەی؟ (٣٦٤٨)
وەک قسەی پێش، ڕاستەئەو هەش،ئەی فلان — چونکەماهییەت لەنووح نەکرا بەیان (٣٦٤٩)
دەرکی ماهییەت، لەعام، دەرکەی گرا — لای خەواس ئەوئاشکرایە، کەی گرا[1] (٣٦٥٠)
چونکەماهیا ت هەم ئەسراڕی وان — کامیلان چاویان ئەوانیان، دی عەیان (٣٦٥١)
دوور ترین ئەشیا لەلای عەقڵ و شعوور — سیرڕوزاتی ئەو خوداوەندی غەفوور (٣٦٥٢)
چونکەنابێ ئەو نیهان لای مەحرەمان — وەسف و زات چین، بن لەلای مەحرەم نیهان (٣٦٥٣)
عەقڵی بەحسی ئەوهەلای، زۆر دوورەخۆ — قەت بەبێ تەئویل، مەبیسە، ئەو هە، تۆ (٣٦٥٤)
وا دەڵێتن پێت، قوتب،ئەی سست حاڵ — فەوقی حاڵی خۆت، مەگەر پێت بوو، محاڵ؟ (٣٦٥٥)
ئەو شتانەی دیتنت ئێستا، بەچاو — لات محاڵ بوون، تۆ لەئەووەڵ ڕا، تەواو (٣٦٥٦)
چون نەجاتی دای لەدەە زیندان،کەرەم — خۆت مەخە، سەحرای پەشیمانی و نەدەم (٣٦٥٧)

## سیحەتی نەفی وئیسبات بۆ یەک شت، بەئیعتیباری موختەلیف...

نەفی و ئیسبات بۆ شتێک ڕاستەو ڕەوا — گەر جیهەت بێ موختەلیف، نیسبەت جودا (٣٦٥٨)
(مارمیت اذ رمیت) نیسبییە — موسبەتن ئەو موسبەت و ئەو مەنفییە (٣٦٥٩)
تۆ فڕێت دا خیز، بەدەستت لای ئەوان — تۆ نەبووی ڕامی، خودا دای تۆ، تەوان (٣٦٦٠)
ئادەمیزاد قودرەتی وا نییە، دەنا — بەس بەیەک لۆچ خیز، بکا لەشکر فەنا (٣٦٦١)
لۆچ کە، ئی تۆ بوو، فڕێدان، ئی خودا — بەو دوونیسبەت، نەفی و، ئیسبات، بوون جودا (٣٦٦٢)
وەک منالی خۆ دەناسن کافران — واش دەناسن هەر ئەوان پێغەمبەران (٣٦٦٣)
وەک منالی خۆ دەناسن،خۆ ئەوان — مونکیران بوویان، سەدان، زیاتر نیشان (٣٦٦٤)
چون حەسوودن بۆیەڕاس، پنهان دەکەن — هەر بەعەمدەن، چەشنی نادانان دەکەن (٣٦٦٥)
(یعرف)وی،کوت، جارەکی دیش، وای ئەحەد — کوت کە(لایعرفهم غیری) ئەبەد (٣٦٦٦)
چون ئەوان ژێر ئاسمانی من نیهان — غەیری من مەعلووم نەبوون،بۆ کەس ئەوان (٣٦٦٧)

---

[1]- لای خەواس ئەو ئاشکرایەئەی برا (مصرع دوم)

فـەهمی مـەفهوومان بـوو، هـەر ئیعتیبـار　　تـۆبزانی یـا نـەزانـی هـیچ، لـەکار (٣٦٦٨)

**مەسئەلەی فەناو بەقای دەر وێش...**

عارفێـک دەیکـوت کـەدەروێش نێـو جیهـان　　نین، ئەگـەر بن، تینـەهیچ دەر ویش ئـەوان (٣٦٦٩)

گـەر هەیـە ئـەو، چـون بـەقای زاتـی هـەبوو　　گـەر نیـەچون وەسفی چۆ نێـو وەسفی هـوو (٣٦٧٠)

گەر چی هیچەشوعلەکەی شەم، لای هـەتاو　　خـۆ دەواقیـع دا، هەیـە، دیتەحیسـاو (٣٦٧١)

زاتی وی مەو جوودە، سـەر وی، چـون ئەگـەر　　دابنێـی پەنبەدەسـووتێ، بـەو شـەرەر (٣٦٧٢)

بـۆ عـەدەم، نـادا بـەتۆ ئـەو ڕەو شـەنی؟　　چـۆ فـەنا ئـەو، لای هـەتاوی وا، غـەنی (٣٦٧٣)

نێو دووسـەت مـەن ئەنگەبین،یەک، ئوقیە،خەل　　لێـک درێـن تـا خـەل دەبێتن،چـاک حـەل (٣٦٧٤)

دیـار ناکـا خـۆ، چ تـام و بـۆنی خـەل　　ئوقیەیـەک زیـاتر دەبـوو، وەزنـی عەسـەل (٣٦٧٥)

یـەک عـەدەد ئاهوو،لـەلای شێرچوو لـەهۆش　　ئەو لەترسان نـەی دەما هیچ جنب وجـۆش (٣٦٧٦)

ئـەو قیاسـەی ناقیسـا ن، بـۆ کـاری ڕەب　　جۆششـی عیشـقە،نەوەک، تـەرکی ئـەدەب (٣٦٧٧)

نـەبزی عاشـق، چـی ئـەدەب بێ، لا دەنـێ　　خـۆی دەنێـو لینگـەی تـەرازووی شـا، دەنـێ (٣٦٧٨)

کەس نـەبوو لەو بێ ئەدەب تر نێو جیهان　　کـەس لـەوی نـەیبوو ئـەدەب زیـاتر، نیهـان (٣٦٧٨)

جـا بەنیسـبەت کۆ دەبـن، ئـەی مونتەخـەب　　ئـەو دووزیـددە، یـا ئـەدەب یـا بێ ئـەدەب (٣٦٧٩)

گـەر بنـۆڕی، بـێ ئـەدەب بـوو زاهیـری　　چونکـەدەعوای بـوو کـەپێی ماوەسـەری[1] (٣٦٨٠)

گـەر تەماشـاکەی لـەباتین وا نییـە　　خـۆی و،دەعـوای سـەر،لەلای شـا، فانییـە[2] (٣٦٨٢)

( مـات زیـد ) زیـد، ئەگـەر چـی فاعیلـە　　خـۆ بـەڵام فاعیـل نییـە، چـون عاتیلـە (٣٦٨٣)

ئـەو لـەڕووی ئـەلفازی نـەحوی فاعیلـە　　خـۆ دەنـا مەفعوولەمـەر گـیش قاتیلـە (٣٦٨٤)

فـاعیلی چـی ئـەو کـەوا مـەقهوور بـوور　　فاعیلییـەت هـەر چـی بـوو، لـەو دوور بـوو (٣٦٨٥)

---

[1]- دای نەناوەچون لەعیشقی دا ، سەری (مصرع دوم)

[2]- خۆی و دەعوای خۆی لەلای شا ، فانییە(مصرع دوم)

**داستانی وەکیلی شای بوخارا کە موتتەهەم بوو، و لەترسی گیانی خۆی لە بوخارا هەڵات پاش ماوەیەک بە خاتری عیشقێکی کە بەشای هەبوو، گەراوە، کە لە بۆ عاشقان گیان موهیم نییە...**

**خولاسەی داستان...**

لەشاری بوخارا وەکیلی شا بەجورمێک موتتەهەم بوو، ولەشا، دوور کەو تەوە.. وما وەی دەساڵان لەشاران ئاوارەبوو،پاش دەساڵان بەسەبەبی عەلاقەوئیشتیاقێکی کەنیسبەت بەشای هەبوو تەسمیمی گرت کەبگەرێتەوە بۆ لای شا، وبەجودائی و دووری و خاتیمەبدا وەکیلی عاشق مەنزڵ بەمەنزڵ دەهات تا بگاتەبارەگای شا، لەو بەینەدا ناسیحێک پێیکوت مەگەر شێت بوویە؟ مەگەر نات هەوێ کەزیندوو بمێنی؟بۆ بۆ لای وی دەچی؟ چونکەشا، زووتوورەدەبێ وتۆڵەئەستێنە، وەکیلی عاشق بەناسیحی کوت بێ دەنگ بە،چونکەزەنجیری عیشق زۆر لەوەمحکەمترەکەبەتیغی نەسیحەتی تۆ بپسێ ..وەکیل ئەوەی کوت و بەرێی خۆی دا رۆی .. پاش تێپەر بوونی چەند رۆژ و چەند شەوان، عاقیبەت گەیشتەبوخارا هەر دەگەڵکو دۆستەکانی وی ئەو یان دی زۆر ترسان وزۆر بەدڵسۆزی پێیان کوت، زوو خۆت ون کە، چونکەشا تەسمیمی گرتووەکەئەتۆ بکوژێ، وەکیل کوتی ئەمن لەمردن مەترسێنن .. چونکەبۆخۆم مردنم دەوێ، ئەو قسەی کوت وبۆلای شا، وەرێ کەوت، خەڵکی شار هەموویان هەراسان ونیگەران بوون، وکوشتنی وەحشەتناکی ویان دەهینا بەرچاو.. وەکیل هاتەلای شا هەر دەگەڵکو ئەوی دی، لەهۆش چوو، وکەوتەعەردی، ئەو کەسانەی کەلەدەو رو بەری شا بوون، زەرفی پر ئاوو گوڵاویان هینا وبەسەر و سوورەتی ویان دا پرژاند، تا وەهۆش بێتەوە.. بەڵام دەت کوت کەباڵەندەی رووحی لەقەفەسی خاکی پەروازی کردووە، ئەوان نەیان دەزانی کەبێهۆشی وی بەسەبەب عیشقە، نەک شتی دی، شا، کەلەو مەو زووعەئاگادار بوو، زانی کەوەهۆش هینا نەوەی وی، فەقەت لەرێی عیشق و مەحەببەت دەبێ جا، مەحەببەتی دەگەڵ کرد و، وەهۆش هاتەوە...

نێو بوخارا بەندەیی سەدری جیهان — موتتەهەم بوو، جا، لەترسان، بوونیهان (٦٨٦-

موددەتی دەە ساڵ سەر گەردان دەما — جار لەشاران، جار لەبن بەردان دەما (٦٨٧-

پاشی دەە ساڵان لەزۆری ئیشتییاق — نەیدەما تا قەت، لەبەر رەنجی فیراق (٦٨٨-

ئەو کوتی دووری، بری لێم تاوو، تین — کوا سەبر دەرمان دەکا، دەردی ئەوین؟ (٦٨٩-

گـەر فیـراق بـێ، خـاک دەبێتەشـۆرەکات		ئـاو، گـەنیوو، زەردو تیرەڕەنـگ دەکـات[1]		(۳۶۹۰)

بای گیان بـەخش، پیس دەبێ، دێنێ وەبا		نـار دەبێتەمشـکی، بـا، دێ، ئـەو دەبـا		(۳۶۹۱)

بـاغی وەک جەننـەت دەبێتـەجێی غـەمان		زەر، دەبـن دەرژێـن گـەڵا، بـۆ لای نـەمان		(۳۶۹۲)

عـەقڵی دەرڕاک دوور کـەون لـەو، دۆسـتان		چەشنی تیر ئەنـدا ز، شکا بێ، لەو کەوان		(۳۶۹۳)

دێ لەفیرقـەت، سـۆزی دووزەخ، وا بـەتین		لەرزەلـەرزی پیـر، لەفیرقـەت دێ، یـەقین		(۳۶۹۴)

گـەر بڵـەم مـن لـەو فیراقـەی وەک شـەرار		تـا قیامـەت، بـوو یـەکێکی سـەت هـەزار		(۳۶۹۵)

بـەس ئەڵـەو باسەبکێشـەتۆ، نەفـەس		(رب سـلم رب سـلم ) بێژەبـەس		(۳۶۹۶)

هـەرچی دای شـادی ئەڵـەو دونیایـەپێت		بیرکەئـەو دەم، تـۆ لـەوەی، دووربێـت، لێـت		(۳۶۹۷)

زۆر کەسـی شـادکرد ئـەوەی تـۆ شـاد دەکا		عاقیبـەت ئـەو جێـی دەهێشـتن چەشـنی پـا		**(۳۶۹۸)**

تۆش دەهێڵێ قەت نەکەی بەو خۆت خۆش		لادەلـەو، پـێش وەی بـەجێ بێڵـێ، ئـەتۆش		(۳۶۹۹)

## حازربوونی ڕووح القدوس بە شکڵی ئینسان لەلای مەریەم لە حاڵەتێک دا کە مەریەم بۆ غوسڵ کردن ڕووت بوو و پەنا بردنی مەریەم بە خوداوەند...

چەشنی مەریەم پێش ئەوەی فرسەت هەڵێ		تـۆ (مـن الـدنیا اعـوذ باللـه) بڵـێ		(۳۷۰۰)

دی لەخەڵوەتگا،لـەلای خـۆی مەریەمـە		یـەک جەوان،چەنـدەی سـەنا بکرێ،کەمـە		(۳۷۰۱)

جـا لـەلای وی بـوو نومایـان، سـەر زەمـین		چەشـنی مانـگ و ڕۆژ، ئـەو ڕووح الامـین		(۳۷۰۲)

هـات لەعـەردی کـرد زهـوور ئـەو جوانـەلاو		وەک لەمەشـریق خـۆی دەکـا زاهیـر هـەتاو		(۳۷۰۳)

تـرس و لـەرزین جـا دەهـات بـۆ مەریـەمی		زۆر دەترسـا چونکـەڕووت بـوو ئـەو دەمـی		(۳۷۰۴)

سـوورەتێک یووسـوف کـەدیبای هێنـدەجوان		دەسـتی خـۆی دەبـڕی لـەتاوان،وەک ژنـان		(۳۷۰۵)

ئـەو لـەلای وی هاتـەدەر، وەک گـوڵ، لـەگڵ		وەک خـەیاڵێک سـەر کـەدەربێنێ، لـەدڵ		(۳۷۰۶)

چوو لەهۆش ئەو دەم، وەهای کوت، مەر یەمە		مـن پـەناهم خـاڵقی بـەرڕو، یەمـە		(۳۷۰۷)

چون پەنای بۆ خوا دەبرد ئەو شەخسی پاک		بـۆی دەهـات گـەر ڕەنجی سەخت و دەردنـاک		(۳۷۰۸)

چونکـەدونیای دیـت، موڵکێـک بـێ قـەرار		چـای دەکـرد بۆخـۆی لـەزاتی حـەق، حەسار		(۳۷۰۹)

تـا پـەناگای بێـت وەختـی مردنـی		ڕێـی نـەبێ تـا بێتـەلای وی دوژمنـی		(۳۷۱۰)

هـیچ پـەناگای چـاک نـەدی وەک کردگـار		بۆیـەجێگای کـرد لـەلای وی، ئیختیـار		(۳۷۱۱)

چونکـەدێ ئـەو نـازو غـەمزەی عـەقڵ بـەر		گەرکو وەک تیر دێن و، دەرژێن سەرجگەر		(۳۷۱۲)

---

[1]- گەر فیراق بێ ، خاک دەبێتەشوورەزار		ئا و دەبێتەبۆ گەنیوو ،زەردو تار

شاهو، لەشکر بۆی دەبوون، حەلقەبەگۆش — خوسرەوانی هۆش، لەبۆ وی چوون لەهۆش (۷۱۳-

سەت هەزاران،زێدەشای گرت،ئەو بەریق — سەت هەزاران بەدری لاوازکرد،بەدیق (۷۱۴-

لای ئەوی، زوهەرە، دەبەستی،زارو دەم — عەقڵی کول،لای وی،دەبینێ خۆی بەکەم (۷۱۵-

مەدحی وی بوو کردمی وا لاڵ، زبان — گفتی وی سووتاندی، هەرچی بووم بەیان (۷۱۶-

دووکەڵی ئەو ئاگرم، بۆی بووم نیشان — وەسفی ئەو شایەی نەکرد کەس ڕاس بەیان (۷۱۷-

هیچ دەلیل بۆ بوونی تاو، نەی دیوەچاو — غەیری نووری ڕەو شەنی جوانی، هەتاو (۷۱۸-

کوا دەلیل بۆ بوونی ئەو شا، سا یەیە؟ — خۆی زەلیل و،خواری دەس ئەو شایە، یە (۷۱۹-

ئەو جەلالەت بۆ دەلالەت، سادیقە — گشتی ئیدراکات لەپاش، ئەو سابیقە (۷۲۰-

گشتی ئیدراکات لەسەرکەر، لەنگ و پیر — ئەو لەسەربا، توند دەچێ جا، چەشنی تیر (۷۲۱-

کوا کەسێ ئاگا بەڕاس لەو شا، دەبێ؟ — شا لەنێو قەلبان بەڵام ئاگا دەبێ (۷۲۲-

گشتی ئیدراکات نیبانەهیچ قەر ار — وەختی جەنگەئێستەنەک بەزم و قومار (۷۲۳-

جوورەدەرکێک چەشنی باز پەر واز دەکا — جوورەکیش وەک تیر، ڕێی خۆی واز دەکا (۷۲۴-

جوورەکیش وەک کەشتی هەیتی بادبان — جوورەکیش دێ بۆ تەڕا جوع، بێ وچان (۷۲۵-

هەرکەدیتیان تاقەنەیچیرێک لەدوور — گشتییان حەملەی دەکەن بەو، ئەو تیوور (۷۲۶-

ون ببێ نەیچیر لەوان حەیران دەبن — نێو کەلاوان چەشنی کوند پنهان دەبن (۷۲۷-

وێک دەنێن یەک چاو،یەک چاو واز دەکەن — ئینتیزاری سەیدی زۆر دڵخواز دەکەن[1] (۷۲۸-

گەربێ تەئخیر، دەڵێن زۆر زۆر غەمین — سەید بوو، یا خێر خەیاڵ بوو، ئێمەدین؟ (۷۲۹-

مەسڵەحەت بوو موددەتێکی تا ئەوان — ئیستیراحەت کەن وەدەس بێنن تەوان (۷۳۰-

گەر لەژینی ئا دەمێ دا، شەو نەبا — خۆی دەسووتاند ئەو بەئاز، دەی برد، با (۷۳۱-

بۆ تەماع ئاگر دەخۆ یان بەر دەدەن — شەو کە هات ڕاحەت دەکەن، یەک دەم بەدەن (۷۳۲-

چەشنی گەنجی ڕەحمەتە، بۆوان، شەو — چون دەبن ڕاحەت، لەدەستی ئاز، بەخەو (۷۳۳-

گەر غەمێکت هاتەپێش ئەی ڕاهڕۆ — مەسڵەحەت بۆ تۆ وەهایە، غەم مەخۆ (۷۳۴-

چون لەشادی وخۆشی خەرجت بوو،زیاد — لا زیمەی خەرجە،کەدەخلت، بێ لەیاد (۷۳۵-

گەر کوهاوین بەر قەرار با گشت کات — تینی تا و بۆ باغ و بێستانان دەهات[2] (۷۳۶-

وا دەسووتا ڕیشەیان گشتیان گییا — سەو زو سوو ر کەس نەیدەدی دەشت و چییا (۷۳۷-

---

[1]- بەستبوویان چاوەک و ، یەک چاو باز    تا ببینن سەیدی ون بووی، زۆر بەناز

[2]- گەرکو هاوین بایەدائیم بەر قەرار    تینی تاو ڕێگای دەکەو تەمێرغوزار

گەرچی ڕووی زۆر گرژەزستان، موشفیقە | گەرچی هاوین شادو خەندان، موحریقە (۳۷۳۸)
نێو غەمان شادی ببینە، تۆ عەیان | شادمان بە، خۆت مەدە، غەمگین نیشان (۳۷۳۹)
شادو خەندانن مناڵ، زانا غەمین | جەر گەجێی غەم،دێ لەشۆش، شادی وکەنین (۳۷۴۰)
چەشنی کەر، چاویان لەئاو خوڕ، بوو مناڵ | ئاخیرەت، مەنزوور، بۆ ئەهلی کەماڵ (۳۷۴۱)
تیفل، نێو ئاوخوڕ دەبینێ خۆش عەلەف | لای قەساب عاقڵ دەبینێ ئەو تەلەف (۳۷۴۲)
تاڵە،زۆر ئەو گیایە، چون قەسساب دای | تا بکێشێ گۆشتمان، میزان لای (۳۷۴۳)
گیایی حیکمەت تۆ بخۆ چون ئەو خودا | بێ غەرەز دای، بەس لەبەر مەحزی عەتا (۳۶۴۴)
فەهمی نانت کردو حیکمەت نا، ئەگەر | پێت (کلوا من رزقه) ی، کوت خوای لەسەر (۳۷۴۵)
حیکمەتە، ڕزقی خودا بۆ ئادەمی | لەو کە، مەسئوول نی، بخۆی زۆر یا کەمی (۳۷۴۶)
زار ببەستەزاری باتین واز دەبێ | لوقمەبۆ ئەو زاری باتین، ڕاز دەبێ (۳۷۴۷)
گەر لەشیری دێو، وەکەی، تۆ تەن، ئەبەد | نیعمەتان بێ حەد دەنێرێ بۆ ت ئەحەد (۳۷۴۸)
ناقیسم کوت مەتڵەبی وا، مەعنەوی | کامیلی کوت بۆت حەکیمی غەزنەوی (۳۷۴۹)
نێو ئیلاهی نامە،کردی بۆن، بەیان | ئەو ئیمامی عارفان و غەیب زان (۳۷۵۰)
غەم بخۆ، نەک نانی شەخسی تەنگ نەزەر | عاقڵان چون غەم دەخۆن، منداڵ شەکەر (۳۷۵۱)
قەندی شادی میوەیی باغی غەمە | غەم نەبێ شادی نییە، نەک هەر کەمە (۳۷۵۲)
گەر غەمت بۆ هات لەلایەن عەقڵ و عیشق | تۆ لەسەر، ڕەبوە، بنۆڕە،جوان، دەمیشق (۳۷۵۳)
نێو ترێ عاقڵ دەبینێ جوان، مەی | نێو عەدەم عاشق دەبینێ جوان، شەی (۳۷۵۴)
چاو لەحەمباڵان چلۆن دەعوا دەکەن | هەلگرن تا باری زیاتر، وا دەکەن (۳۷۵۵)
چونکەلەو ڕەنجەدەبن زۆر بەهرەوەر | بار لەدەستی یەکتری، وا دێننەدەر (۳۷۵۶)
موزدی ئینسان نا بێ وەک ئی خوای عەزیز | خوا دەدا گەنج موزد پێت، ئینسان پەشیز (۳۷۵۷)
گەنجی زێڕی پاش مەرگیش هەر لەلات | ئەو کەنابێ ئیرس، بۆ قەو م و، برات (۳۷۵۸)
پێش جەنازەت ڕێ دەپێوێ، ئەو بەغار | بۆ غەریبی و گۆڕ، دەبێ ئەو بۆ ت، بەیار (۳۷۵۹)
ئیستەبمرەتۆ لەبۆ ڕۆژی نەمان | تا ببی تۆ، یاری عیشقی جاویدان (۳۷۶۰)
پشتی پەردەی ڕەنج،دیارن، بۆ سەبوور | هەردوو زولفی مەتڵەب و،ڕووی جوان وسوور[1] (۳۷۶۱)
غەم وەکوو ئاوێنەیە، لای موجتەهید | چون لەویدا دیتەبەرچاو،ڕوویی زید (۳۷۶۲)
ڕۆی کەرەنج، دێن، زیدی وی پاشان، یەنی | شادمانی و کەڕرو فەڕڕ و ڕەو شەنی (۳۷۶۳)

---

[1]- بۆ سەبوو دیارن لەپشت پەردەی جیهاد    ڕووی وەکوو گوڵنارو ، زولفەینی موراد

ئەو دوو حاڵەت، تۆ لەپەنجەی دەست دان    مستی بەستەواز دەبێتن، دوایەجوان (٣٧٦٤)
پەنجەمست بێ دائیمەن، یا ئا وەڵا    بێ گومان ئەو موبتەلای دەردو بەڵا (٣٧٦٥)
کەسبی ئینسان لەو دوو وەسفە، موتتەزیم    وەک لەبۆ تەیران دەبوو، دوو باڵ موهیم (٣٧٦٦)
زۆر دەبوو مەریەم پەرێشان ئەو دەمە    چەشنی ماسی بوو لەوشکی، مەریەمە (٣٧٦٧)

**کوتنی ڕووح القدس، بە مەریەم کە ئەمن ناردراوی خودام بۆ لای تۆ جا پەرێشان مەبە، و خۆت لەمن مەشارەوە، و فەرمانی خودات پێ ئیبلاغ دەکەم ...**

جەبرەئیل دەیکوت بەمەریەم، وا مەکە    من ئەمینی خوام، لەبەر من، ڕا مەکە (٣٧٦٨)
خۆت لەیارانی خوداوەند، ون مەکە    قەت لەوان، تۆ ئارەزووی، دوور بوون، مەکە (٣٧٦٩)
وایدەکوت،جا نووری پاک و زۆر جوان    لەو دوو لێو، یەک یەک، دەچوون بۆ ئاسمان (٣٧٧٠)
بۆچ لەبەرمن ڕادەکەی بۆ لای عەدەم    نێو عەدەم، من، پادشام، ساحەب عەلەم (٣٧٧١)
من لەنیستیم دایەجێگاو ئەسڵ و بن    نەقشی یەک سوار تۆ دەبینی ئێستەمن (٣٧٧٢)
چا و لەنەقشی موشکیلم کە،من هەمە    هەم هیلالم هەم خەیاڵ،ئەی مەریەمە (٣٧٧٣)
تۆ لەقەلبت دا خەیاڵێک بێ ئەگەر    بچیەهەرجێ هەرلەگەڵتە،ناچتەدەر (٣٧٧٤)
گەر خەیاڵ باتڵ بێ، خۆ وانییە    چەشنی سوبحی کازیب ئەو، زوو فانییە (٣٧٧٥)
سوبحی سادق بووم، بەئەنواری خودا    بۆیەتاریکایی شەو لێم لا دەدا (٣٧٧٦)
بەس بڵێ لاحەولەتۆ، ئەی مەریەمە    چون بەئەمرو قودرەتی حەق، لێرەمە (٣٧٧٧)
چون غەزای ئەسڵی لەبۆم لاحەولەبوو    نووری لا حەو لەش، لەپێش ئەو قەولەبوو (٣٧٧٨)
تۆ لەترسی من دەبەی، بۆ حەق، پەنا    من لەپێش داچاکراوی ویم، دەنا (٣٧٧٩)
ئەو پەناهەم من،کەویستت، زۆر جار    ئەو ئەعووزەم تۆ کەدەیڵەی وا بەزار (٣٧٨٠)
وەک نەزانین بەد نەبوو، ئافەت چکات    شەرتی عیشقت لا دەنا، یاریش لەلات (٣٧٨١)
یارەکەت ئەغیار دەدی تۆ دەمبەدەم    شادمانیت نێو دەنا، تۆ، دەردو غەم (٣٧٨٢)
نەخلی لوتفی زاتی پاکی کردگار    چونکەئێمەساریقین، بۆن بوو بەدار (٣٧٨٣)
زولفی جوانو ڕەش کەهەیتی، میری مە    چونکەبێ عەقڵین، بۆ زەنجیری مە (٣٧٨٤)
چەشنی نیل دەڕوات لوتفی خوای غەفوور    چونکەفیرعەو نین،بۆن بووخوێنی سوور (٣٧٨٥)
خوێن دەڵێ مەمرێژە، ئاوم، زۆر تەمیز    یوسوفم، تۆ کردمت، گورگی نەچیز (٣٧٨٦)
چاو لەیاری میهربانی بوردبار    چون دەگەڵ وی بووی بەزید، ئەو بوو، بەمار (٣٧٨٧)

لەحم و شەحمی وی نەگۆڕا، یەک نەفەس بەد نەبوو وا،چاوی تۆ پێی وایەبەس (٣٧٨٨)

**تەسمیم گرتنی ئەو وەکیلە بە سەبەبی عیشق،کە بگەڕێتەوە بۆ بوخارا، بێ تەوەججوە کردن بە ئایەندەی ئەو کارە...**

شەمعی مەریەم، با، بسووتێ، لێگەڕێ[1] ئەو ئەویندار، بۆ بوخارا، کەوتە، ڕێ (٣٧٨٩)
چون بەناری عیشق نەت ما حەو سەلە ڕووکەلای سەدری جیهان، بت بێ، پەلە (٣٧٩٠)
لەو بوخارا مەنبەعی عیلمم مەڕام هەرچی عالم بێ، بوخارا ئیە، لەلام (٣٧٩١)
تۆ کەلای شێخی، بوخارات بوو مەقام بۆ بوخارات بێ ئەتۆ زۆر، ئیحتیڕام (٣٧٩٢)
جەزرومەددی موشکیلی شێخ نایەڵی غەیری خۆ کەم بین، بێ بۆ **نێو دڵی**[2] **(٣٧٩٣)**
خۆش بەحاڵی وەی کەنەفسی کرد ئەسیر بەد بەحاڵی وەی کەنەفسی کرد ئەمیر **(٣٧٩٤)**
فیر قەتی سەدری جیهان نێو گیانی وی پارەپارەی کرد بوو، ئەڕکانی وی (٣٧٩٥)
ئەوکوتی من ڕاس دەڕۆم بۆ لایی، یار کافریش بم، دێتمەوە، ئیمان، بەغار (٣٧٩٦)
جا دەچم ئێستا ئەمن بۆلایی وی دەچمەلای ئەو سەدرە، ژێر دوو، پایی وی (٣٧٩٧)
پێیدەڵەم دامنا لەپێشت گیانەکەم هەر بەدەستی تۆیەمەرگ و ژیانەکەم (٣٧٩٨)
مەرگ و ژینی من لەلای تۆ، ئەی قەمەر خۆشترەلام، تا لەجێی دیم، تاج لەسەر (٣٧٩٩)
ئیمتیحانم کرد ئەمن خۆ زۆر جار زیندەگی بێ تۆ دەبینم ژەهری مار (٣٨٠٠)
بێژەبۆم ئاهەنگی خۆش ئەی خۆش مەرام یخ بە،ئەی وشتر،کەشادی بوو تەمام (٣٨٠١)
قووت دەئەشکم ئەی زەمین،گریان بەسە ئاو، وەخۆ ساف، نەفسەتۆ،بێ وەسوەسە (٣٨٠٢)
ئەو چەلەش، لان، هاتی ئەی عید، مەر حەبا خۆش لەبۆن هاتی ئەتۆ، ئەی بای سەبا (٣٨٠٣)
ئەو کوتی ڕۆیم، ئەمن،یاران ویداع دەچمەلای سەدرێک کەمیرە، هەم موتاع (٣٨٠٤)
بەسسەتاکەی ژەهری دووری من وەخۆم چیم بەسەر دێ، بێت با، من هەر دەڕۆم (٣٨٠٥)
با دڵیشی چەشنی بەرد، ڕەق کات یار گیان دەچێ بۆ لای بوخارا هەر بەغار (٣٨٠٦)
مەسکەنەبۆ یارو، بۆ شا، شار ئەوێ عاشقان حوببی وەتەنیان، وا دەوێ (٣٨٠٧)

---

[1]- بایسێ با ، شەمعی مەریەم لێیگەڕێ (مصرع اول)

[2]- جەزرو مەددی جوور بەجووری کامڵی نایەڵی بێن ، خود پەسەندان، نێو دڵی

**پرسیاری مەعشووقێک لە عاشقی غەریبی خۆی کە لەو شارانەی کە دیتووتن کێهەیانت خۆشتر و بەعەزەمەت تر و پڕ نیعمەتتر و با سەفاتر، دی؟**

وای بەعاشقی خۆی دەکوت، مەعشووق چەلێ | تۆ کەشارت دین، لەغوربەت دا،گەلێ (٣٨٠٨)
پێم بڵێ تۆ، خۆشترین بووکامەشار؟ | پێیدەکوت، شارێک کەتێیدا بێت، یار (٣٨٠٩)
بێ لەهەرجێگا بیساتی شایی مە | گەرچی چووکیش بێ، دەبێ سەحرایی مە (٣٨١٠)
بێ لەهەرجێ،یووسوفێک،وەک مانگ مونیر | جەننەتەئەو،گەرچی بش بێ،ژێری بیر (٣٨١١)

**مەنع کردنی دۆستان ئەو وکیلە لە گەڕانەوە بۆ بوخارا، وترساندنی وی وگوێ نەدانی وی بەپەند و تەهدیدی دۆستان ...**

ناسحێک دەیکوت بەوی،ئەی بێ خەبەر | فکری دوارۆژکە،ئەگەرهەت بێ هونەر (٣٨١٢)
چاک بنۆڕەپاش و پێشی کار ئەتۆ | چەشنی پەروانە، مەڕۆ نێو نا رئەتۆ (٣٨١٣)
بۆ بوخارا گەر بڕۆی لای میر، ئەتۆ | لایقی زیندانی هەم زەنجیر، ئەتۆ (٣٨١٤)
داغدارەلێت ئەمیری نامدار | دەیهەوێ پەیدات بکا ئەو شەهریار (٣٨١٥)
تیژدەکا بۆ کوشتنی تۆ تیغ وکارد | ئەو سەگی قاتی، ئەتۆش هەنبانی ئارد (٣٨١٦)
تۆی نەجات داو ڕێی نیشان دای، خوای لەسەر | خۆت بەرەو زیندان دەچی، شێتی مەگەر؟ (٣٨١٧)
هاتبان گەر تۆ بەرن مەئمووری شا | ڕێی عەقڵ بوو، تۆ کەخۆت ون کردبا (٣٨١٨)
نین کەمەئموورت لەسەر، ئێستاکەبۆ؟ | بەسترا ڕێگات لەپاش و پێش ئەتۆ (٣٨١٩)
عیشقی پنهان کردبووی ئەو وا ئەسیر | بوو نیهان مەئمووری مەخفی لەو نەزیر (٣٨٢٠)
هەن لەبۆ مەئموور، مەئموور، نادیار | بۆ دەنا حەملەی دەکا وەک کەلیی هار؟ (٣٨٢١)
خەشمی شای عیشق، بۆ گیانی وی دەهات | کردیەمەئموورێک ڕوو ڕەش نێو وڵات[1] (٣٨٢٢)
دەیهەوێ ئەو، هەرکەسی ویست، لێی بدا | داد لەدەس مەئمووری پنهان ئەی خودا (٣٨٢٣)
هەر کەسێکت دی دەچێ بۆ لای زییان | ئەو دەبا مەئمووری مەخفی بێ گومان (٣٨٢٤)
گەر لەوی ئاگا بیا غەو غای دەکرد | ئەو پەنای بۆشای هەموو شایان دەبرد (٣٨٢٥)
جا، بەسەر خۆی دادەکرد لای شاه،خاک | تا نەجاتی بێ لەدێوی سامناک (٣٨٢٦)
تۆ لەموور کەمتر، بەڵام پێت وایەشای | بۆیەکوێری، نەت دی مەئموور، تۆ کەلای (٣٨٢٧)
تۆی فریو دا ئەو پەڕوو باڵی درۆت | ئەو پەڕوو باڵەی عەزاب دێنێ لەبۆت (٣٨٢٨)

[1]- بوو بە مەئموورێک، ڕووڕەش نێو وڵات (مصرع دوم)

باڵ کەسووک بێ، ڕوو بەرەو باڵا دەچێ		گەر قوڕاوی بێ گرانە، کوا دەچێ؟ (٣٨٢٩)

**گوێ نەدانی عاشق بەپەندی ناسیح و لۆمە و سەرزەنیشی لائیم، لەبەر عیشق...**

دەیکوت ئەی ناسیح مەڵێ چیدیکەپەند		چون لەزیندانی ئەوین دام، سەختەبەند (٣٨٣٠)
بەندی من توند تر دەبێ بەو پەندی تۆ		عیشق، مەجهوول ما، لەدانیشمەندی تۆ[1] (٣٨٣١)
لەو عەزابەی دای ئەو ین، نێو سینەدا[2]		بوو حەنیفە، خۆ، چ کات دەرسی نەدا (٣٨٣٢)
مەمکەتەهدید تۆ بەکوشتن، چونکەمن		مردنم ئاواتە، وەک من زۆر کەمن[4] (٣٨٣٣)
زۆرکەڕەت دەمرێت عاشق،نەک چەڵێک		مەرگی عاشق خۆ، نەیەک جوور،بەل،گەلێک (٣٨٣٤)
زۆر گیانی دا بەوی زاتی خودا		ئەو هەمووی کردن لەڕێی مەعشووق، فیدا (٣٨٣٥)
دەە بەرابەر دەگرێ، بۆ هەر یەک بەها		قەولی قورئان ( عشره ا مثا لها ) (٣٨٣٦)
گەر بڕێژێ خوێنی من ئەو خۆش نیگار		من بەشادی گیان دەکەم، بۆ وی نیسار (٣٨٣٧)
لێم عەیان بوو مەرگی من بوو نێوژییان		من دەبم پاش ئەو ژیانە، جاویدان (٣٨٣٨)
بمکوژن ئەی دۆستانی با وەفا		کوشتنم تێیدایەژینی باسەفا (٣٦٣٩)
ئەی نیگارم ئەی ئەتۆ گیانی بەقا		بیبەلات، ڕووحم، عەتا کە، پێم، لیقا (٣٨٤٠)
یارەکەم سووتاندی لێم قەلب و جگەر		خۆشەلام گەر کا، بەسەر دیدەم گوزەر (٣٨٤١)
فارسی بێژە، لەتازی بەسکەتۆ		عیشق هەیتی سەت زبانی دیکەخۆ (٣٨٤٢)
بۆنی ئەو دڵبەر کەبێ، دەگرێ وڵات		ئەو زبانانەدەبن حەیران و مات (٣٨٤٣)
بەس بڵەم با، دڵبەرەم کەو تە، وتار		بگرەگوێ، زانا بەحەق، بەس کردگار[5] (٣٨٤٤)
دەس لەمەعشووق ناشوات،عاشق چکات		دەرسی عیشقن ئەو لەسەر دار بۆ دەدات[6] (٣٨٤٥)
بۆ بوخارا گەر دەچێ ئەو عاشیقە		کوا بەدەرس و،کوا بەئوستاد شایقە؟ (٣٨٤٦)
عاشقان بۆ وان، مودەرریس حوسنی یار		دەفتەر و دەرسیان ئەوان، بەس ڕووی نیگار (٣٨٤٧)

---

[1]- عیشق مەجهوول ما ، لەدانیشمەند ، خۆ (مصرع دوم)
[2]- لەو عەزابەی عیشق دای نێو سینەدا (مصرع اول)

[4]- مەرگی خۆم ئاواتەوەک من زۆر کەمن (مصرع دوم)
[5]- بەس بڵەم با، دڵبەرم کەوتەخیتاب		بگرەگوێ (والله‌اعلم بالصواب)
[6]- دەرسی فانی بوون ، لەسەر دار، ئەو دەدات (مصرع دوم)

بێ سەدانو نارەتەی تیکراریان — دەچتەسەر، تا تەخت و عەرشی یاریان (۳۸۴۸)
دەرسی وان ئاشووب و چەرخ و زەلزەلە — نەک زیادات، یا نەبابی سیلسیلە (۳۸۴۹)
سیلسیلەی ئەو قەو مەزولفی پێچ دار — دەورەئەو مەوزووعە، ئەمما دەو ری یار (۳۸۵۰)
گەر لەبارەی کیسە، لێت کەن پرسییار — بێژە نابا، کیسە گەنجی کردگار (۳۸۵۱)
گەر لەخولع و هەم موبارای کرد یاد — بەد نەبێ لات، چون بوخارای بوو مراد (۳۸۵۲)
زیکری هەرشەیئێک دەدا خاسسییەتێک — چونکەهەیتی هەرسیفەت ما هییەتێک (۳۸۵۳)
نێو بوخارا هەن هونەر، زۆر دڵخوواز — نەفسی خۆت خوارکەی، بەوان نات بێ نیياز (۳۸۵۴)
ئەو وەکیلە، نەیبوو، بۆ دانیش، چ غەم — چاکی دەنوا ری لەرۆژی دوور لەتەم (۳۸۵۵)
هەر کەسێ دیتی لەخەڵوەت، رۆژی وا — نایهەویتن ئەو لەدانیش، دەستگا (۳۸۵۶)
نوور لەدانیش خۆ گەلێک بالاترە — بۆ عەوامان ژینی دونیا چاترە (۳۸۵۸)
گەردەگەڵ جوانی گیان بوو، هەمتەراز — ئەو لەئەخبار و لەدانیش بێ نییاز (۳۸۵۷)
چون عەوام دونیای بەچاوی خۆی دە دی — وا دەزانێ قەرزەئەو دونیایی دی (۳۸۵۹)

### وەرێ کەوتنی ئەو بەندەعاشقە بۆ بوخارا ...

بۆ بو خارا کەوتەرێ، سووتاو،جگەر — دەشت و کێوی توند و تیژ نا، پشتی سەر (۳۸۶۰)
خیزی ئامووی بوو،لەژێر، پێ وەک حەریر — چۆمی جەیحوون بوو لەلای وی، جۆی، حەقیر (۳۸۶۱)
ئەو بیابان بوو بەگوڵزار لایی وی — شاد دەبوو، وەک گوڵ دەهات قا قایی وی (۳۸۶۲)
گەر چی جێگەی قەند،سەمەر قەند بوو،بەڵام — چۆ بو خارا چون لەوێ کرد قەند تام (۳۸۶۳)
ئەی بوخارا عەقڵ و عیلمت زیاد کرد — عەقڵ و دینی من ئەتۆ پاکت دەبرد (۳۸۶۴)
تالیبی بەدرم منی چەشنی هیلال — تالیبی سەدرم لەنێو سەففی نیعال (۳۸۶۵)
گەر رەشایی ئەو بوخارای، دی لەدوو ر — نێو رەشایی غەم، بەیاز کردی زهوور (۳۸۶۶)
ما وەیەک بێهۆش دەما، نەیما، چ واز — هەڵفڕی عەقڵی دەنێو بێستانی راز[1] (۳۸۶۷)
جا گوڵاویان دا لەرووی وی هەم لەسەر — لەو گوڵاوی عیشقی وی بوون بێ خەبەر (۳۸۶۸)
دیتبووی گوڵزاری پنهان زێدەخۆش — عیشقی غارەتگەر بربووی ئەو، لەخۆش (۳۸۶۹)
لایقی ئەولوتفەنی، چون نیتەحاڵ — گەر چی، نەی تۆ،بووی لەشەکری خۆش،بەتاڵ (۳۸۷۰)
عەقڵی جوزئیت لایە، هێستا عاقڵی — لەو (جنودا لم ترەوها ) غافلی (۳۸۷۱)

[1]- عەقڵی وی رۆی چوو لەبۆ بێستانی راز (مصرع دوم)

**هاتنی ئەو عاشقی لائوبالی بۆ بو خارا و ترساندنی وی تەوەسسوتی دۆستان لەخۆ ئاشکرا کردن...**

هاتـــەنێو شـــاری بوخـــارا شـــادمان ‌ ‌ هاتـەلای مەعشـووقی خـۆی، (دارالامـان ) (۳۸۷۲)

چەشنی مەستێکی کەمەی لەو کا ئەسەر ‌ ‌ دەس لەمل یەک، خۆی دەبینێ گەڵ قەمەر (۳۸۷۳)

نێـو بوخـارا هـەر کەسێک تووشـی دەبـوو ‌ ‌ پێیدەکوت خـۆت ون کە، ئێستا، زووکەزوو (۳۸۷۴)

شـــا لەمێژەدەیهـــەوێ پەیـــدا ت، بگـــا ‌ ‌ ئینتیقـــام بگرێـــت لێـــت، ڕیســـوات، بکـــا (۳۸۷۵)

خۆت نەجات دە، نەت کوژێ با، تۆ هەڵێ ‌ ‌ هیچ لەمەکرو فێڵ و حیلەی خـۆت، مەڵێ (۳۸۷۶)

شەحنەبووی بۆ شای جیهان،جێی ئیعتیماد ‌ ‌ موحتەرەم بووی هەم موهەندیس، ئوستاد (۳۸۷۷)

تـــۆ خیانـــەت کـــاربووی کـــردت فیـــرار ‌ ‌ ئێســـتەبۆچی هـــاتی خـــۆت، بـــۆ لایـــی دار؟ (۳۸۷۸)

تـــا نـــەجاتت بێـــت کـــردت زۆر حیيـــەل ‌ ‌ شـــێت یـــەتی هینایيـــەئێرە، یـــا ئەجـــەل؟ (۳۸۷۹)

ئـەی ئـەوەی عەقڵت،عوتاریـد کـەم لـەلای ‌ ‌ عـەقڵ و عاقـڵ ئەحمـەقن خـۆ، لای قـەزای (۳۸۸۰)

نەحســـەکەر وێشـــکێک بکـــاتن ڕاوی شـــێر ‌ ‌ عەقڵ و هۆش و زیرەکیت کوا، ئەی دلێر؟ (۳۸۸۱)

سـەت بەرابـەر هـەیتی مـەکر و فێـڵ قـەزا ‌ ‌ گـەر قـەزا بێـت تەنگـەبۆ ئینسـان، قـەزا (۳۸۸۲)

ڕێ لەڕاسـت و چـەپ گـەلێکن بـۆ نـەجات ‌ ‌ گشت دەبەسرێن،گەر قـەزا، یـەک لـەحزەهات (۳۸۸۳)

**جواب دانەوەی عاشق بە مەلامەتگەران و ترسێنەران...**

مـــن کەموستەســـقیم،کوتی دەمویـــت ئـــاو ‌ ‌ گـــەرچی ئـــاویش دەم کـــوژێ دەمبـــا، لـــەناو (۳۸۸۴)

قـــەت لـــەئاو ناکـــات موستســـقی فیـــرار ‌ ‌ گەرچی بش بێ ئەو بەئاو بـەد حاڵ و زار (۳۸۸۵)

دەسـت و پێشـم گـەر لـەئا و بگـرن وەرەم ‌ ‌ عیشـقی ئـاو نـابێ لـەمن یـەک زەڕڕەکـەم (۳۸۸۶)

گـــەر ببرســـن لـــەو زگـــەی کـــردی وەرەم ‌ ‌ مـــن دەڵـــەم خۆزیـــا دەوێـــدا بایـــە، یـــەم (۳۸۸۷)

مەشکی ورگم مـەو جی ئاو بیدڕێ ئەگەر ‌ ‌ مـــەرگی مـــن لـــەو کاتەپاکەو،پڕســـەمەر (۳۸۸۸)

مـــن لەهـــەر جێگـــا ببیـــنم ئـــاوی جـــۆ ‌ ‌ زوو دەڵـــێم بریـــا منـــیش بـــام وەک ئـــەتۆ[1] (۳۸۸۹)

گـــەر بـــەئاو بگـــرێ وەرەم جیســـمم تـــەواو ‌ ‌ چەشنی گوڵ هێستاش هـەر دەمویت ئاو (۳۸۹۰)

گـــەربرێژێ خـــوێنم ئـــەو ڕووحولئـــەمین ‌ ‌ من دەخۆم ئەوخوێنەقوم قوم، وەک زەمین (۳۸۹۱)

وەک زەمـین و، وەک جـەنین خوێنخوارەمـە ‌ ‌ لـــەو دەمـــەی عاشـــق دەبووم،ئەوکارەمـــە (۳۸۹۲)

---

[1]- من دەڵێم بەو ئاوی دەی بینم لەجۆ ‌ ‌ سەت بریبا من ببام لەجیاتی تۆ

شـەو دەئـاگردام دەسـووتێم چەشـنی دیـگ — ڕۆژ هەتاشـەو،خوێن دەخـۆم مـن چەشـنی ریـگ (٣٨٩٣)
زۆر پەشـــیمانم لەمـــەکر و فێڵـــی خـــۆ — مـــن لەقـــەهری وی فیـــرارم کـــرد لـــەبۆ؟ (٣٨٩٤)
بێژەئیجراکـا، لەســەر مــن قــەهری خــۆی — جێژنی قوربان ئەو، منیش وەک گا، لەبۆی (٣٨٩٥)
خزمــەتی گـا، ڕۆژو شــەو گــەر چـا دەکــەن — تـا لەعیـد، قوربـان بکـەن ئـەو، وا دەکـەن (٣٨٩٦)
چەشـــنی گـــای مووســـام بزانـــە،گیان دەدا — جـــــوزء جوزئم،گیـــــان بـــــەئازادان دەدا (٣٨٩٧)
بـوو بـەقوربان گـاوی مووسـا ئـەو زەمـان — کـەمترین ئـەعزای بـەکوژراو، دای ژیـان (٣٨٩٨)
گـــــەر خیتـــــابی (اضـــــربوه بعضـــــها ) — هـات لـەجێی خـۆی جێ بـەجێ هەستاوەجا (٣٨٩٩)
ئـەی ڕەفیقـان لێوەکـەن لـەو گایەسـەر — گـەرکو حەشـری ڕووحـی بینـا و بێ نـەزەر (٣٩٠٠)
بـووم بـەنامی مـن کەپێشـان بـووم جـەماد — بووم بەحەیوان من ( نەما) م هەرچوو لەیاد (٣٩٠١)
حـــاڵی حـــەیوانیم نـــەما ئـــادەم دەبـــووم — بـۆ بترسـێم کـوا بـەمردن کـەم دەبـووم؟ (٣٩٠٢)
جـارەکی دی جـێ دەهـێڵم مـن بەشـەر — تـا مـەقام و جێـی مـەلائیک دەچمەسـەر (٣٩٠٣)
جێ دەهـێڵم پشـتی سـەر دوایـەش مەلـەک — شت هەموو فانین ئەوەی ما، خوایە، تەک (٣٩٠٤)
لـــەو مـــەقاماتی مەلـــەک ئیمجـــا دەبـــم — ئـەو شـتەی نایـەت لـەوەهمان، وا دەبـم (٣٩٠٥)
جـا دەبـم فـانی فـەناش وەک ئەرغـەنوون — پـــێم دەڵـــێ (انـــا اليـــەراجعون ) (٣٩٠٦)
مـەرگ بـابێ، وەک دەڵـێن عالـەم لـەلات — جێگەکـەی تاریکـەزۆر ئـاوی حـەیات (٣٩٠٧)
چەشـنی نەیلوفـەر لـەجۆ دەر بێنـە بـەرگ — چەشنی موستەسقی حەریس بە، تۆ، بە مەرگ (٣٩٠٨)
ئاو کەدەخوا ئـەو، لەبۆی مەر گـەو عـەزاب — خـــۆ بـــەڵام (واللــــەاعلم بالصـــواب ) (٣٩٠٩)
زۆر بـــەزاهیر عاشـــقن ئەفســـوردەتەن — جـا، لەترسـی گیـان، لـەگیانان لا دەدەن (٣٩١٠)
دەچنەلای تیغی ئەوین ئەی شەخسی پەست — سەت هەزاران گیان بەشادی چەشنی مەست (٣٩١١)
جـــۆت کـــەدی گـــۆزەت برێژەنێـــو جـــۆ — ئـاو لەجۆگـە، قـەت فیـرار ناکـات خـۆ (٣٩١٢)
ئـــاوی گۆزەبێتـــەنێو گۆزێـــک ئەگـــەر — خـۆی دەبێتەجۆگـە، نـای مێنـێ ئەسـەر (٣٩١٣)
وەسـفی وی فـانی دەبـێ و، زاتـیش بـەقا — کـەم کـەناکا هـیچ و، نـابێ بـەد لیقـا (٣٩١٤)
چـون لەقـەهری وی ئـەمن کـردم فیـرار — نـەخلی وی بـابێ، لـەبۆ مـەرگم، بـەدار (٣٩١٥)

### گەیشتنی ئەو عاشقە بە مەعشووقی خۆی چون لە گیانی خۆی دەستی هەڵگرتبوو...

چەشنی گۆ دەیدا لەخاک ئەو ڕوو و سەر — جـــانبی ســـەدری، بـــەگریان گرتەبـــەر (٣٩١٦)
والـــە، عالـــەم گشـــت، بوویـــان ئینتیـــزار — یانەدەیســـووتێنێ، یـــا دەیـــدا لـــەدار (٣٩١٧)

ئێستەئێستە، دێ بەسەر ئەو هیچ نەزان — ئەو شتەی دەیدا بەبەد بەختان، زەمان (٣٩١٨)
وەک پەپوولەئاگری ئەو نوور دەدی — وەک نەزان چۆ نێو،لەژین، خۆی دوور دەدی (٣٩١٩)
شەمعی عیشق ئەمما وەکوو ئەو شەم نییە — ئەو لەنوورو ڕەوشەنی هیچ کەم نییە (٣٩٢٠)
ئەو بەعەکسی ئەو شەمانەی ئاگرە — زاهیری سووزانە، باتین دڵگرە (٣٩٢١)

**وەسفی ئەومزگەوتەی کەمیوانی دەکوشت و ئەو عاشقی مەرگە، کە لە مردن نە دەترسا و لەو مزگەوتەمیوان بوو ...**

**خولاسەی داستان ...**

لەدەو رو بەری شاری ڕەی، مزگەو تێک هەبوو کەدانیشتوەکانی خۆی دەکوشت هەر کەس شەوانەلەو مزگەوتەدا ما باوەلەترسان دەکەوت و دەمرد.. هیچ کەسێک لەخەڵکی ئەو شارەجورئەتی نەبوو کەشەوانەبیتەئەو مزگەوتەپڕ ئەسرارە.. کەم کەم ئەو مزگەوتەلەشارەکانی نیزیک و دوور مەشهووربوو خەڵکی دەو رو بەر زۆر لەو مزگەو تەدەترسان تاکو شەوێک لەشەوان میوانێکی غەریب و دوور وڵات هات و ئەو مزگەوتەی لەخەڵکی دەپرسی خەڵکی لەو کارەعەجیبەی وی سەرسام مابوون ولێیان دەپرسی چکارێکت لەو مزگەوتەهەیە؟ کابرای غەریب و دوور وڵات زۆر بەئارامی دەیکوت دەمهەوێ ئەو شەو لەو مزگەو تەبنووم ..خەڵکیش بەسەرسامی دەیان کوت عەقڵ شتێکی چاکە، مەگەر لەگیانی خۆت بێزاری؟ کابرای غەریب دەیکوت ئەمن ئەو قسانەم ناچتەدەگوێ ئەمن عەلاقەم بەژینی دونیایی نییەتا لەکوشتن و مردن بترسێم،خولاسەبەقەولی مەعرووف ( ئەمن سەرم بۆ ئەو جوورەکارانەدێشێ ) جارەکی دیش خەڵکی سەرزەنیش و مەلا مەتیان کرد، بەڵام هەرچەند پێیان کوت و نەسیحەتیان کرد فایدەی نەبوو، ودەت کوت کەئاسنی سارد دەکوتن، کابرای غەریب گوێی نەدا بەپەندو نەسیحەتی خەڵکی..وشەوێ چۆ ئەومزگەوتەو لەعەردی ڕاکشا تا کەمێک بنوێت ..لەو کاتەدا دەنگێکی سامناک هات دەت کوت کەسێک بەدەنگێکی بڵیند دەڵێ ..ئەی ئەو کەسەی کەواریدی مزگەوت بووی.. ئەلئان دێمەلات، ئەو دەنگەپێنج جار بیسترا بەڵام ئەو کابرای غەریب هیچ نەترسا، بەڵکەم خۆشحاڵیش بوو .. جا، هەر بۆیەبەحاڵەتێکی ئامادەوئیرادەیێکی محکەم لەجێی خۆی هەستا و بانگی کرد، هەرکەسێک هەی، وەرەچونکەئامادەی مەرگم ئەگەر جور ئەتت هەیەوەرەپێش، لەو کاتەدابوو کەبەو جواب دانەوە، تەلەسم شکا و لەهەموو لایەکەوەزێڕ، ڕژا ..وکابرای غەریب دەستی بەکۆ کردنەوەی ئەو زێڕانەکرد...

گـوێ دەداسـتانێک نـەت بـێ دەردو وەی مەسجیدێک بوو ئەو، لەنیزیک شاری ڕەی (٣٩٢٢)
نوسـتبا هـەر کـەس ئەلـەو مزگەوتەشـەو تاسـبەی بـێ بـاب دەبـوون منـداڵی ئـەو[1] (٣٩٢٣)
بـێ نـەوا دەو دا دەمـان، زۆر یـان شـەوان گەر دەبۆ ڕۆژ، گشت دەگۆڕ دەنران، ئەوان (٣٩٢٤)
جـا ئـەتۆ زۆر چـاک خـۆت ئاگـا بکـە ڕۆژ هـەڵات، تۆش خـەو لـەخۆت کۆتا بکـە (٣٩٢٥)
یـەک گرووەدەیکـوت دەوێـدا هـەن پـەری هـەرچی میـوان بـێ، بـەتیغ دەبـڕن سـەری (٣٩٢٦)
یـەک گرووەدەیکـوت کەسـیحرەو جـادووە دوژمنـی ئینسـان لـەوێ جـێ گیـر بـووە (٣٩٢٧)
یەک گرووەدەیکوت لەسەر دەر، دەن، بڵێن ئێوەمیوانـــان، لێـــرە، شـــەو هـــەڵێن (٣٩٢٨)
شـەو مـەنوو تـۆ لێرە،گـەر گیانـت دەوێ لێرەغـــەیری مردنـــت دەس ناکـــەوێ (٣٩٢٩)
یـەک گرووەدەیکـوت کـەقفڵی دەن بەشـەو غافڵێـک گـەرهات مـەدەن ڕێگـا، بەئـەو (٣٩٣٠)

**هاتنی میوان بۆ ئەو مزگەوتە...**

تـا شـەوێک هـات، دانـەمیوانێک غـەریب بیستبووی ئـەو بـاس و ئـاوازەی عـەجیب (٣٩٣١)
هـاتبوو، بـۆ ئیمتیحـان، ئـەو جـوانمێر چـون دلێـر بـوو هـەم لـەگیانی خۆشی تێـر (٣٩٣٢)
ئـەو بـەخۆی کـوت وا دەزانـم زۆر کـەمم وایـەلام، لەو بـەحری گیان دا، یـەک نـەمم (٣٩٣٣)
سـووڕەتی تـەن بێژەبـڕوا،کێم ئـەمن دا ئیمـیم، کـەم نـابێ نەقشـم، لـێم ئـەمن (٣٩٣٤)
چونکەنـەفخێک بـووم لەئـەڵتافی خـودا دەبمەنـەفخی حـەق، لـەنای تـەن بـم جـودا (٣٩٣٥)
دەنگـی نـەفخی خـوا نەیـەت تـا، بـۆ بـەدەن تـا ڕەهـابێ ڕووح لەجیسـم و هـەم لەتـەن (٣٩٣٦)
چـون (تمنـوا ) مـەوتی کـوت ئـەی سا دقین سـادقم مـن گیـان دەدەم، بـۆ ڕێـی دیـن (٣٩٣٧)

**مەلامەت کردنی خەڵکی ئەو میوانە لە شەو نوستن دەو مزگەوتەدا ...**

خـەڵکی کوتیـان مەیکـەبۆ خـەو ئێرەجێـت تـاکو عیزڕائیـل نـەگرێ، گیـان لێـت[2] (٣٩٣٨)
چـون غـەریبی تـۆ لەئـەحواڵ بـێ خەبـەر هـەر کەسـێکی لێرەنوسـت داینـاوە سـەر[3] (٣٩٣٩)
ڕاسـتەئەو هـەی ئێمـەدیمان زێـدەجار ئێمـەعاقڵ، لای عمـووم جێـی ئیعتیبـار (٣٩٤٠)
هەر چی لەو مزگەوتەنوست، تـەنها شـەوێ مـەرگی وەحشـەتناک دەهات بۆ وی، لەوێ (٣٩٤١)
ئێمـەخۆمان دیتمـان یـەک تـا کـو سـەد نـەک ببیسین، بێ بڵێ، پێن، یەک ئەحـەد (٣٩٤٢)

[1]- نیوەشەو بێ باب دەبوون منداڵی ئەو (مصرع دوم)
[2]- خەڵکی کوتیان بەو مەنوو لێرە، بڕۆ    تا کوعیزڕائیل نەگرێ گیانی تۆ
[3]- هەر کەسێکی لێرەنوست ، نەی ماوە، سەر (مصرع دوم)

وای بەئێمەکوت، کەپەندە، دین، ڕەسوول — پەند مانای وی دەبوو، زیددی غلوول (٣٩٤٣)
پەند بەمانای ڕاستی نێو دۆستی — گەر خیانەت کەی ئەتۆ، سەگ پۆستی (٣٩٤٤)
بێ خیانەت پەند دەدەم تۆ، بۆ ویداد — لا مەنێ تۆ قەت، چ کاتێک، عەقڵ و داد (٣٩٤٥)

**جواب دانەوەی عاشق بە مەلامەت گەران...**

دەیکوت ئەی ناسیح پەشیمانم ئەمن — ئەو جیهانەو ژین دەویدا، پێم کەمن (٣٩٤٦)
تەنبەڵم من دەمهەوێ جا، دەردەسەر — تۆ لەتەنبەڵ نەت هەوێ، ڕاس کا،گوزەر (٣٩٤٧)
تەنبەڵێکی والەنیمە، بەرگ، خواز — تەنبەڵێکم ( لابا لی ) مەرگ، خواز (٣٩٤٨)
تەنبەڵێک نیم پووڵ بێنمەدەستی خۆم — تەنبەڵێکم توند، بەسەر پرد، دا دەڕۆم (٣٩٤٩)
تەنبەڵێک نیم ڕا بوەستم، دەم دووکان — تەنبەڵێکم دێتەدەستم گەنج و کان (٣٩٥٠)
هێندەخۆشەلام ئەمن مردن وەکوو — تەیر،جێ بێڵێ قەفەس لەو دەر دەچوو (٣٩٥١)
ئەو قەفەس جێگای لەنێو باغ بێ ئەگەر — چاک دەبینێ تەیر، گوڵزار و شەجەر (٣٩٥٢)
هەم دەبینێ تەیری دی دەوری قەفەس — خۆشی دەخوێنن لەئازادی، قەسەس (٣٩٥٣)
ئەو پەڕەندەی نێو قەفەس لەو سەبزەزار — نەیدەما هیچ ئیشتیها و سەبرو قەرار (٣٩٥٤)
ئەو لەهەر کون دەر دەهێنێ سەر هەتا — بەندی پێ ببسێنێ، خوی کاتن ڕەها (٣٩٥٥)
ئەو بەگیان و دڵ کەوای ویست بێتەدەر — چۆ ن دەبێ دەرکەی قەفەس بشکێ ئەگەر؟ (٣٩٥٦)
نەک وەکوو تەیری قەفەس بێ نێو غەمان — بن لەدەورەی وی پشیلەی بێ ئەمان (٣٩٥٧)
کوا دەکا لەو کاتەپڕ ترس و خەتەر — ئا ڕەزوو، تا لەو قەفەس ئەو بێتەدەر؟ (٣٩٥٨)
کوا قەفەس یەک دانە ئەو ئیرزا دەکا؟ — ئەو لەسەت زیاتر، قەفەس داوادەکا (٣٩٥٩)

**عیشقی جالینووس بەو دونیایەبوو، هونەری وی هەرلەدونیادا بەکار دێ وهونەرێکی وای نەبوو کەلەئاخیرەت بەکار بێ، جا، لەدونیای دی دا، دەگەڵ عەوامان بەرا بەرە...**

والەجالینووس دەیکوت ئەو زەمان — ئەو لەبارەی حوببو دۆستایی جیهان (٣٩٦٠)
من کەڕازیم، بۆم بمێنێ نیوەگیان — جا، لەقوونی ئیسترێک، دیبام جیهان (٣٩٦١)
ئەو لەدەوری خۆی پشیلەی دین، هەزار — بۆیەناکا تەیری ڕووحی وی فیرار[1] (٣٩٦٢)
یا عەدەم بوو غەیری دونیا، لای وی — حەشری لا مەقبووڵ نەبوو، بڕوایی وی (٣٩٦٣)

---

[1]- بۆیەناتوانی کەپەرواز کا، چ جار (مصرع دوم)

وەک دەکێشــێ خوا،جــەنین، بــۆلای دەرێ | ڕا، دەکــا ئــەو بچتــەوەبۆ لای ســەرێ[1] (٣٩٦٤)

حەق دەکا ڕووی وی بـەدەر، تا دەر کـەوێ | ئـەو بـەڵام هـەر پشـتی دایکی خـۆی دەوێ (٣٩٦٥)

بێمــەدەر گــەر مــن لەشـاری وا بــەجۆش | تازەنــابینم ئــەمن جێــی والــەخۆش[2] (٣٩٦٦)

خۆزگـەبوو بـای دەرکە، ئەو شاری وەخـیم | تــا تەماشــام کردبــا، لــەو د ا، ڕەحــیم (٣٩٦٧)

یــا بەئەنــدازەی کــونی دەرزیــم هــەبا | ڕێ، لــەوێڕام، مــن ڕەحــیم دیبایــە، جــا (٣٩٦٨)

لــەو جیهانــەبێ خەبــەر بــوو ئــەو جــەنین | چەشـنی جـالینووس کەعاشـق بـوو بـەژین (٣٩٦٩)

نەیــدەزانی ئــەو غەزایــەی لایەئــەو | گشــتی بــۆ دێــتن ئەلــەو دونیایەئــەو[3] (٣٩٧٠)

هـەر وەکوو چـوار عونسوری ئەسڵی جیهان | یارمــەتی دەگــرن لەشــاری لا مــەکان (٣٩٧١)

دان و ئـاوی نێـو قەفـەس گـەر هاتـەدەس | بــاغ و ســەحرا باعیســن تــەنهاو بــەس[4] (٣٩٧٢)

بــاغ دەبیــنن گیــانی یــەک یــەک، ئــەنبیا | گــەر قەفــەس وەکـرێ، لـەدونیا بـن جیـا (٣٩٧٣)

جــا لــەجالینووس و عالــەم فــاریغن | چەشــنی مــانگی ئاســمانان، بــازیغن (٣٩٧٤)

گــەر کــو نــەیکوت بێــت حــالینووس وا | جـوا بەکـەم بـۆ وی نییـە، ئـەو جارەجـا (٣٩٧٥)

ئـەو جەوابـەم بـۆ کەسـێک وا کـرد ئـەدا | نــووری زانســت بــوو لەقــەلبی وی جــودا (٣٩٧٦)

گیانی وی بۆ مشک و بۆ لای کون هەڵات | لای پشـیلان دەنگـی (عـەرریجـو) کـەهات (٣٩٧٧)

بۆیــەگیانی وی، وەهــا گرتــی قــەرار | لەو جیهانەی وەک‌کونی مشک،تەنگ‌وتار[5] (٣٩٧٨)

ئــەو لــەنێو ئــەو لانەبــەننایی هەیــە | لایقــی ئــەو لانــە، دانــایی هەیــە (٣٩٧٩)

شــوغڵی زۆری کــرد لەلانــەئینتیحاب | کــۆ وەکــا تــا مــاڵی زۆرو بــێ حیســاب (٣٩٨٠)

چونکــەدونیابوو لــەلای وی موعتەبــەر | نــەیتوانی ڕووح لــەنێو تــەن بێتــەدەر (٣٩٨١)

عەنکـەبووت گـەر کـو، وەکوو، عـەنقا دەکـا | چــۆن لــەئاوی زار چــادر، چــا دەکــا؟ (٣٩٨٢)

چــەنگی دا نــابوو پشــیلەنێو قەفــەس | ئیسمی چەنگاڵ ئێش و سەرگێژەو مەغـەس (٣٩٨٣)

جـا پشـیلەمەر گـە، ئـێش چـەنگاڵی وی | ورد، دەکـا بـەو، تـەیرو پـەڕو بـاڵی وی (٣٩٨٤)

کــون بــەکون دەڕوا، بــەدووی دەرمــان دا | مەرگــەقازی، ئــێش، گــەواهی بــۆ دەدا (٣٩٨٥)

---

[1]- ڕا، دەکا تا بچتەوەبۆ جێی بەرێ (مصرع دوم)

[2]- کوا دەبینم تازەجێگای والەخۆش؟ (مصرع دوم)

[3]- نەیدەزانی ئەو غەزای دەیخوات ئەو          گشت ئەلەو دونیابەڕا بۆی هات ئەو

[4]- باغ و سەحرا پێیدەدەن ، تەنهاوو ، بەس (مصرع دوم)

[5]- لەو جیهانەی چەشنی لانەی مووش ، تار (مصرع دوم)

گـەر کـو هـا ت بـۆلایی قـازی ئـەو گـەواه تـا تـۆ دەعـوەت کـا، بیـا بـۆ داد گـاه (٣٩٨٦)
ئـەو دەمـی تـۆ موڵـەتێک داوا دەکـەی یـا قەبووڵیـە، یانـەچی کـوت، وادەکـەی (٣٩٨٧)
مـۆ ڵـەتی تـۆ بـۆ دەواو بـۆ چارەیـە پینەکـەی ئـەو جیسـمەکۆنەپارەیە[1] (٣٩٨٨)
عاقیبـەت ڕۆژێـک بـەکین ئـێش دێتـەلات بەسسـەمۆڵەت شـەرمەئاخر، وەختـەهات (٣٩٨٩)
ئـەی حەسـوود وەختـت لەشـا دا وا، بکـە پـێش ئـەوەی ئـەو ڕۆژەبـێ، تـۆ وا بکـە (٣٩٩٠)
ئەو کەسەی ئەسپی لەزوڵمـەت لینگ دەدا ئـەو لـەدڵ خـۆی لادەنـێ، نـووری خـودا (٣٩٩١)
ئـەو لەبـەر شـاهید کـەدەردە، ڕا دەکـا دەرد، ئـەوی بـۆ لای نـەمان داوا دەکـا (٣٩٩٢)

**چارەکی دیش مەلامەت کردنی خەڵکی ئەو میوانە غەریبە لە نوستن دەو مزگەو تەدا ...**

قـەوم کوتیـان بـەس زرەنگـی کـە، بـڕۆ خـۆت نـەجات دەتـا نـەکوژراوی ئـەتۆ (٣٩٩٣)
سـەهل و سـادەدێتەبەر چـاو ئـەو لـەدوور سـەختەئەمما وەختـی نیزیـک بـوون، عبـوور (٣٩٩٤)
وردوخـاش بووهەرکەسـێ شـەوما، لـەوێ وەختی سەخت،دەی ویست نەجاتی دەس‌کەوێ (٣٩٩٥)
پـێش وقـووع کـار دێنەبـەرچاو، زیندەسـەهل چونکەمـەعلووم نینەئـەهلن، یـآ، نەئـەهل[2] (٣٩٩٦)
هـەر کـەهات ئـەنجام بـدا ئـەو شەخسـەکار کـار دەبـێ بـۆ وی بـەزار، دەیکـا نـەزار[3] (٣٩٩٧)
تـۆ کەشـێر نـی، قـەت، مـەڕۆ ئـەو لا پـەڕە چون ئەجەل وەک گورگە، گیانی تۆش مەڕە (٣٩٩٨)
گـەر تـۆ ئەبـدالی، مەڕیشـت بـوو بەشـێر مـەرگ نـاتوانێ بکـا، تـۆ سـەر بـەژێر (٣٩٩٩)
هـەرچی ئەبدال بـوو، بەحـەق ئـەو بـوو بـەیار خـەمری وی گـۆڕی بەسـرکە،کردگار (٤٠٠٠)
تۆ کەمەستی خۆت بەشێر کوژ دی، بەوەهم نەچیـەجێی شـێران، لـەوێ، تـۆ نیتەسـەهم (٤٠٠١)
زیکری دوو ڕووی کرد خودای باڵا و نەوی خـۆ لـەنێـو خۆیـان دەزانـن زۆر قـەوی (٤٠٠٢)
خـۆ لـەلای یـەکتر دەبیـنن زۆر قـەوی وەختی جەنگیش وەک زەعیفان سەر نەوی (٤٠٠٣)
وایـدەکوت پێغەمبـەری ئـاخر زەمـان جەنگ نەبێ، نابێ شەجاعەت، ئەی جەوان (٤٠٠٤)
گەر لەشەڕ باس کەن دەکا کەف، زاریان وەک کـەفن گـەر بچتـەنێو شـەڕ کاریـان (٤٠٠٥)
تیـغ درێـژن وەختـی دەکـرێ بـاس لەشـەڕ دەچنـەنێو کـالان وەختـی کـەڕرو فـەڕ (٤٠٠٦)
تـالبی جـەنگن بەئـەفکار و خـەیاڵ مەشـکی وانـی کـرد، یـەک دەرزی، بـەتاڵ (٤٠٠٧)

---

[1]- مۆڵەتت ویست بۆ دەواو بۆ چارەتۆ تا پنوو کەی جیسمی کۆ ن و، پارەتۆ
[2]- پێش وقووع ئاسان دەبینرێن زیندەکار چون نەبوو باشی و خەرابیان ، ئاشکار
[3]- ، دەیکا هەزار (مصرع دوم)

مـن عەجـەب مـاوم لـەوەی، دەی وێ سـەفا　　وەختـی سـەیقەل، ڕادەکـا، نـای وێ جـەفا (۴۰۰۸)
عیشـق، وەک دەعـوی جـەفا بـۆی شـاهیدە　　تـۆ کـەبێ شـاهید بـی، دەعویـت فاسـیدە (۴۰۰۹)
شـاهیدی گـەر ویسـت قـازی غـەم مـەخۆ　　مـاچ کـەمار، تـا گـەنج وەدەس بێنـی ئـەتۆ (۴۰۱۰)
ئـەو جـەفا بـۆ تـۆ نـەهات خـۆ ئـەی فـلان　　بەڵکـەهات بـۆ وەسـفی پیسـت، بـێ گومـان (۴۰۱۱)
گــــەر لبـــادی دا وەبـــەر داران مـــەرد　　لـەو لبـادەی دار نـەدا ئـەو، دای لەگـەرد (۴۰۱۲)
گـەر لەئەسـپی خـۆی بەشـەللاق، دا سـەوار　　کـوا لەئەسـپی دا، لەقۆرتـەی دا، بـەغار (۴۰۱۳)
تـا لەقۆرتـەت بـێ نـەجات تـۆ وا دەکـەی　　شـیرەزیندانی دەکـەی، تـا بـێ بەمـەی (۴۰۱۴)
یـەک کـوتی تـۆ لـەو هـەتیوەت بـۆ دەدا؟　　چۆن نەترسای، بێ لـەبۆت، قەهری خودا؟ (۴۰۱۵)
پێیدەکوت نـەم دا لـەوی ئـەی خـۆش ئـەدا　　مــن لـــەدێوی نێــو وجـــوودی ویـــم دەدا (۴۰۱۶)
دایکـی تـۆ گــەر مــەرگی تـۆ داوا دەکـا　　تـا نـەمێنێ خـووی بـەدی تـۆ، وا دەکـا (۴۰۱۷)
ئەوگرووهـەی گـەر وەلایـان نـا ئـەدەب　　نـا سپاس بـوو ن بـەو تەلاشی پیاوی ڕەب (۴۰۱۸)
ئـەو لیبایـان دوور لـەخۆیان کـرد ئـەوان　　تـا وەهـا، بـێ غیرەتـو، خـوێری دەمـان (۴۰۱۹)
تۆلەقـــەولی هـــیچ و پووچیـــان لادەخـــۆ　　قـەت دەگـەڵ وان بـۆ شـەڕ و دەعـوا، مـەڕۆ (۴۰۲۰)
چونکـە(زادوکـم خبـالا ) قـەولی حـەق　　تــۆ لەدۆســتی سســت، وەر گێــرە، وەڕەق (۴۰۲۱)
چـون ئەگـەر بـێن و، دەگـەڵ تـۆ بـن ئـەوان　　سووک دەبن شەڕ کەر،وەکوو کا، بێ گومان (۴۰۲۲)
خـۆ بـەتۆ نیشـان دەدەن وەک دۆسـت و یـار　　شەڕکەهات،سـەف لێک دەدەن،هەڵدێن بـەغار[1] (۴۰۲۳)
جـا کـەوابێ لەشـکرێک بـێ وانـە، کـەم　　چاکترەلـــەو هـــەی مونـــافق بـــن، بەجـــەم (۴۰۲۴)
دەنکـی بادامـان کەکـەم بـن، خـۆش بـەڵام　　چـاکترن لـەو زۆری تێکـەڵ تـاڵ بـەتام (۴۰۲۵)
تـاڵ و شـیرین هـەڵبرێژ ڕێـن یـەک سـەدان　　نەقسـەبۆ وان چونکەیـەک دڵ نـین ئـەوان (۴۰۲۶)
کـافران دڵیـان دەترسـێ یـەک بەیـەک　　چون لەدونیای دیکەبوو یان، وەهـم وشـەک[2] (۴۰۲۷)
بــێ خەبــەر کـافر، لەمــەنزڵ دەچتــەڕێ　　دادەنــێ کــوێر دڵ، بــەترس و لــەرز پــێ (۴۰۲۸)
گـەر موسـافیر بـێ لـەڕێگا، نـا بەڵـەد　　هـەر بەشـک دەڕوا، دەترسـێ، زیـاد لەحـەد (۴۰۲۹)
هـەر کەسـێ بێـژێ کـە، هـای، ڕێ وا نییـە　　ڕا دەوەسـتێ، ئـەو لـەبیم، ئـەو سـانییە (۴۰۳۰)
گـــەر بزانـــێ ڕێ، دڵـــی باهۆشـــی وی　　کـوا دەچێـتن، هـا یـو هـوو، نێوگۆشـی وی؟ (۴۰۳۱)

---

[1]- شەڕ کەهات سەف لێک دەدەن جا ، (الفرار) (مصرع دوم)

[2]- لەو جیهانی دیکەبوویان ، چونکە، شەک (مصرع دوم)

تۆ مەبە، هاو ڕێ دەگەڵ، لەرزۆک دڵان — وەختی سەختی ون دەکەن خۆ، بێ گومان (٤٠٣٢)
تۆ دەهێڵن تەک دەکەن خۆیان فیرار — گەرچی سیحری بابلیش بن، بۆ وتار (٤٠٣٣)
نەت هەوێ تۆ شەڕ بکا بۆت، نازدار — تۆ لەتاووس نەت هەوێ، سەید و شکار (٤٠٣٤)
تۆ دەکا وەسواس وەک تاووس ئەو — تۆ دەکا پەس بەو زبانی لووس ئەو (٤٠٣٥)

**کوتنی شەیتان بە قورەیش کە وەرنە شەڕی ئەحمەدی، جا ئەمنیش یارمەتیتان دەدەم و هەڵاتنی وی لەوەختی شەڕدا ...**

وەک کوتی شەیەتان ئەمن بۆ سەت مەزن — گەر لەگەڵتان بم ئەمن، قەت نابەزن (٤٠٣٦)
جا بەقەولی وی قورەیش حازر دەبوون — هەردوولەشکر ڕوو بەڕووی یەکتر دەبوون (٤٠٣٧)
ئیبلیس دی، لەشکرێکی زۆر، مەلەک[1] — دێن لەبۆ لای موئمینان لەولای فەلەک (٤٠٣٨)
دی بەسەف دێن ئەو جنوودەی نەو دەدی — ئا گری لێ دایسا گیانی بەدی (٤٠٣٩)
جا لەبۆ لای پشتەوەی کێشاوە، پێ — من دەبینم لەشکرێکی زۆرە، دێ (٤٠٤٠)
من دەترسم چونکەنیمەڕێی نەجات — توند هەڵێن چون لەشکرێکی زۆرەهات[2] (٤٠٤١)
جا سوڕاقەی وا دەکرد حاریس خیتاب — بۆچی دۆێنێیت وا نەکوت تۆ، ئەی جەناب (٤٠٤٢)
ئەوکوتی ئێستا دەبینم مەرگی عام — پێیدەکوت دەت دی کەمێ ئەعرابی، خام (٤٠٤٣)
هەر دەبا دیبا ت وەها، خۆ، ئەی تۆ نەنگ — وەختی لاف بوو ئەو دەمی، ئێستاکەجە نگ (٤٠٤٤)
دوێ ئەتۆ دەت کوت دەبم زامین ئەمن — فاتیح و پیرۆزو سەر کەوتو، دەبن (٤٠٤٥)
ئەی لەعین دوێنێی لەبۆمان بووی بەمیر — ئێستەنامەردو نەچیزو زۆر حەقیر (٤٠٤٦)
هەر لەتۆ خواردن فریو، هاتین ئەگەر — تۆ لە بۆ توون چووی و، ئێمەش بووین شەجەر (٤٠٤٧)
چونکەحاریس وای سوڕاقەکرد، خیتاب — توورەبوو زۆر ئەو لەعینە، بەو عیتاب (٤٠٤٨)
دەستی خۆی کێشا لەدەستی وی بەکین — چون دڵی بەو گفتەئێشا، ئەو لەعین (٤٠٤٩)
مستەکیشی دا لەسینگی جا، هەڵات — جا بەخوێنی دوستی خوی سوورکرد، وڵات (٤٠٥٠)
جا،کەعالەم زۆر بەوی وێران دەبوو — پێیکوتن ( انی بریء منکم) وو (٤٠٥١)

---

[1]- دی بەچاو شەیتان سپاهێکی مەلەک (مصرع اول)

[2]- زۆر دەترسم ، بۆ نەجات چون نیمە، عەون    توند هەڵێن ( انی اری ما لا ترون )

دای لەسینگی وی بەمەست، خستیەزەوی     جا لەترسی قەهر، ڕای کرد سەر نەوی (۴۰۵۲)
نەفس و شەیتان هەردوو هەر یەک دانە بوون     بەس بەسوورەت، ئەو دوو لێک بێگانە بوون (۴۰۵۳)
وەک فریشتەو عەقڵ خۆ، یەک بوون ئەوان     ئیقتیزای حیکمەت ئەوانی کرد، دووان (۴۰۵۴)
دوژمنێکی وا، لەنێو تۆی کرد کەمین     مانعی عەقڵەو، عەدوو بۆگیان و دین (۴۰۵۵)
دەفعەیەک حەملەی دەکا وەک سوسمار     جا لەبۆ لای کون دەکا دوایەش فیرار (۴۰۵۶)
ئەو لەقەلبان ئێستەهەیتی کون هەزار     سەر لەهەرکام ویستی دەر دێنێ بەغار (۴۰۵۷)
نێوی پنهان بوونی شەیەتان لای نفووس     چوونی ویش نێو ئەوکونانە، بۆ خنووس (۴۰۵۸)
هەر وەکوو جووشک، دەکا پنهان سەر     جار و بارەش ئەو سەری دێنێتەدەر (۴۰۵۹)
وەک سەری جوشک دەچێ، هەربۆیەحەق     دی لەبۆ وی نێوی خەنناس موستەحەق (۴۰۶۰)
ون دکا جووشک گەلێک جاران سەر     چون دەترسێ ئەو ببینێ ڕاو کەر (۴۰۶۱)
دەر دەهێنێ سەر کەفرسەت هاتەدەست     وا دەکا تا مار دەکا مەجرووح و پەست (۴۰۶۲)
گەر لەداخل لێی نەگربای، نەفس ڕێ     چۆن دەیان بەست ڕێگران لێت، دەست و پێ (۴۰۶۳)
چونکەخواهیشگەر لەتۆ هەر شەهوەتە[1]     دڵ ئەسیری حیرس و ئازو ئافەتە (۴۰۶۴)
چون بەدەس مەئمووری پنهان بووی بەدز     بووی بەدەس مەئمووری زاهیر پەست وکز (۴۰۶۵)
تۆ دەقیق ئەوپەندی ئەحمەد گوێ دەیە     بەد ترین دوژمن لەنێو دڵتان هەیە (۴۰۶۶)
دوژمنی وا، لای هەڵێ بەو گوێ مەدە     چون وەکوو شەیتانە، لەجبازو بەدە (۴۰۶۷)
بەس لەبەر دونیا و جەدەڵ بوو، وا دەکا     ڕەنجی جاویدت لە لا، سانا دەکا (۴۰۶۸)
ئەو لەبۆ تۆ مردنیش ئاسان دەکا     ئەو بەجادوو، کار سەت چەندان دەکا (۴۰۶۹)
چونکەجادوو، کا، وەکوو کێوی دەکا     جارەکی دیش کێو دەگۆڕێ ئەو بەکا (۴۰۷۰)
نا حەزان جادوو دەکا شیرین بەفەن     شیرنان ناحەز دەدا نیشان، بەزەن (۴۰۷۱)
وایەکاری جادوو ئەو هەر دەمبەدەم     تێک دەدا چی بێ حەقیقەت زۆرو کەم (۴۰۷۲)
جارو بار جادوو دەکا ئادەم بەکەر     چادەکا جار جار لەکەر گەورێک، بەشەر (۴۰۷۳)
ساحری وا، قەلبی تۆ تێیدایە، خۆ     سیحری پنهانی هەیەخۆ نەفسی تۆ (۴۰۷۴)
لەو جیهانەش داگەلێک هەن وا دەکەن     سیحرو جادووی ساحیرا ن ڕیسوا دەکەن (۴۰۷۵)

---

[1]- چون تە قازا کەر لەتۆ هەر شەهوەتە(مصرع اول)

گەر ئەلەو سەحرایەشین بێ گیا، بەزار — شین دەبێ تریاک لەلای وی بێ ژمار[1] (٤٠٧٦)
پێت دەڵێ ترياک کەمن بگرەبەیار — چون لەبۆ تۆ چاترم مەن زۆر لەزار[2] (٤٠٧٧)
گفتی وی سیحرێکە، تۆ ڕیسوا دەکا — سیحری گفتم، سیحری وی ئیمحا دەکا (٤٠٧٨)

**تیکرار کردنی مەلامەتگەران پەندی خۆیان بۆ ئەو میوانەی ئەو مزگەوتەمیوان کوژە...**

قەولی ئەحمەد یەک حەقیقەت بوو عەیان — ئەو کەفەرمووی (ان سحرا فی البیان) (٤٠٧٩)
مەگرەخۆت زیرەک برۆ ئەی( بولکەڕەم) — مەسجیدو ئیمەمەکە، تۆ موتەهەم (٤٠٨٠)
تا کو دوژمنمان نەڵێ ئەو هەی بەعام — ئاگرن تێبەرنەدا، شەخسێک نەفام (٤٠٨١)
جا، بڵێ، خنکاندی یەک زاڵم، ئەوە — بۆ بەهانەچوونی مەسجید ئەو شەوە (٤٠٨٢)
تا نەجات دا خۆی دەڵێ هەر مەسجیدە — قاتلی وی، چونکەمەسجید، نێو بەدە (٤٠٨٣)
توهمەتن بۆ چا مەکە، ئەی سەخت گیان — چونکەئیمەن نین لەفێلی دوژمنان (٤٠٨٤)
زوو برۆ،خۆت زۆر مەزانە، زیروحەز — تۆ کەنەت پێواوەکەیوان خۆ بەگەز (٤٠٨٥)
چەشنی تۆ زۆر بەختی خۆیا ن لایەقەند — ڕیشی خۆیا ن دوایەیەک یەک، هەڵدەقەند[3] (٤٠٨٦)
زوو برۆ لەو قیل و قالە، بەس بڵێ — تۆ، مەهاوێ خۆت و ئێمە، نێو کڵێ (٤٠٨٧)

**جواب دانەوەی میوان بەوان و میسال هینانەوە بە دەفع کردنی پاسەوانی مەزرەعە، بە دەنگی تەپڵێکی چووک لە مەزرەعە،وشترێکی کە تەپڵیان بۆ لەشکری سوڵتان مەحموود لەسەر پشتی وی، لێدەدا ...**

دەیکوت ئەی یاران لەوان دێوانەنیم — گەر بە لاحەو لێک زەعیف بم، بم بەنیم (٤٠٨٨)
لێیدەدا تەپڵێکی زۆر چووک یەک منداڵ — تا پەڕەندا ن دەر بکا نێو کشت وکاڵ (٤٠٨٩)
تا بەدەنگی وی پەڕەندان کەن، فیرار — جا ببن مەحفووز لەتەیری بەد، سیمار (٤٠٩٠)
تا کو شا مەحموود بەوێیدا کرد گوزەر — بارەگای خۆی دا چەقاند لەودەورو بەر (٤٠٩١)
بوو لەگەڵ وی یەک سوپای زۆر، بێ ژمار — بەو سوپا، دوژمن دەبوون گشت، تار مار (٤٠٩٢)
وشترێکی بوو لەبۆ حەملی دەهۆڵ — زۆر قەوی بوو، پێش قەدەم بوو، توند و تۆڵ (٤٠٩٣)

---

[1]- بێ بژار (مصرع دوم)

[2]- پێت دەڵێ ترياک سپەر چاکەلەمن — چون بەمن دەرد یت ڕیشەی ژار، لەبن

[3]- چەشنی تۆ زۆر خۆ دەبینن خۆشبەخت — ڕیشی خۆیان دوایەهەڵقەند، زۆر بەسخت

ئەو دەهۆڵەلێیدەهات، بێ وەقفەدەنگ    بۆ ڕجووع بۆ ماڵ، یا بۆ چوونەجەنگ (۴۰۹۴)

هات ئەو وشتر دەنێو ئەو کشت و کاڵ    تا دەری کا، تەپڵی خۆی لێدا مناڵ (۴۰۹۵)

عاقڵێک پێیکوت مەدە لەو تەپڵەتۆ    خووی بەتەپڵان گرتووەئەو چونکەخۆ (۴۰۹۶)

کوا لەویدا تەپڵی تۆ تەئسیر دەکا؟    بیست ئەوەندە، حەملی تەپڵی میر، دەکا (۴۰۹۷)

عاشقم من کوشتمی تیغی فەنا    گیانی من جێگایەبۆ تەپڵی بەلا (۴۰۹۸)

تەپڵی چووکن ئەو هەمووتەهدید، تەواو    خۆ لەحاستی ئەو بەلای دیتم، بەچاو (۴۰۹۹)

نیمەخۆ من لەو کەسانە، ئەی هەواڵ    ڕا بوەستم ڕێگەبگرێ، لێم خەیاڵ (۴۱۰۰)

چەشنی ئیسماعیلیانم، بێ حەزەر    وەک سمایل بەڵکە ئازادم لەسەر (۴۱۰۱)

من لەتەشریفاتی زاهیر بووم نەجات    (قل تعالوا ) بۆگیانی من دەهات (۴۱۰۲)

دەیکوت ئەحمەد، جوود لەدونیادا دەکا    ئەو کەسەی پاداشی حەق بڕوا دەکا (۴۱۰۳)

ئەو کەسەی دیتی لەجوود، پاداش سەد    جودو بەخشیش ئەو دەکا زیاتر، لەحەد[1] (۴۱۰۴)

بۆیەدووکاندار دەکا خۆی بەن، هەتا[2]    پووڵ بدا ئەو سوود بیا جا، تا بەتا (۴۱۰۵)

زێر لەهەنبانانەئەو هەر چاوەڕێ    سوودی بۆ بێ، زێر بدا جا، جێ بەجێ (۴۱۰۶)

گەر لەکالای دیکەدی، سوودی زیاد    عیشقی کالای خۆی دەبا، زوو ئەو لەیاد (۴۱۰۷)

بۆیەکالای خۆی گەلێک، پێ چاترە    چونکەسوودی وی لەئیدی زیاترە (۴۱۰۸)

هەر وەهایەدانیش و حیرفەو هونەر    وەک ئەوانی باش، نەهاتەبەر نەزەر (۴۱۰۹)

تا لەگیان چاتر نییە،گیان بوو عەزیز    هەر لەوی چاتر کەهات، گیان بوو نەچیز (۴۱۱۰)

چەشنی ڕووح وگیان عەرووسەک،لای مناڵ    تا دەگاتەڕوشد و،دەیبێ سینوساڵ (۴۱۱۱)

هەرقومارەئەو خەیاڵەو ئەو سووەر    تا تۆ مندالْ بی، لەلای تۆ موعتەبەر (۴۱۱۲)

گەر لەتیفلیت بوو نەجات، دەت بێ ویساڵ    دوور لەحیس و،دوور لەتەسویر و خەیاڵ (۴۱۱۳)

نیمەمەحرەم تابڵێم من، بێ خەیاڵ    بۆیەماتم، هەر خودا زانای ویساڵ (۴۱۱۴)

ماڵ و تەن بەفرن، دەڕۆن تا گرن قەر ار    بۆ ئەوانیش بۆ خەریدار، کردگار (۴۱۱۵)

---

[1]- ئەوکەسەی دیتی لەبەخشیش سەد عیوەز    زوو بەزووبەخشیش دەکا، بۆ ئەو غەرەز

[2]- بۆیەدووکاندار دەکا خۆی بەند ، تا (مصرع اول)

بۆیەبەفرت لایەوالا، نەک بەها[1] | چون لەشک دای، بێ یەقینی، وای، وەها (۴۱۱۶)
من لەزەنێ تۆ عەجەب مام ئەی فلان | بۆچی ئەو باغی یەقین، ناکا مەکان؟ (۴۱۱۷)
زەن هەموو تینووی یەقینن ئەی هەواڵ | تا بگەن بەو، لێدەدەن توند،پەڕو باڵ[3] (۴۱۱۸)
گەر گەیشتەعیلم، ئەو پەڕ، پا، دەبێ | ئەو دەمی جا، بۆ یەقین، جوویا دەبێ (۴۱۱۹)
چونکەئەو ڕێگایەزۆر بوو، مومتەحەن | ژێر یەقینەعیلم و، عیلمیش فەو قی زەن (۴۱۲۰)
بۆیەقین جوویایەدانیش ئەی جەوان | جا یەقینیش تالبی دید و عەیان (۴۱۲۱)
بۆت لە(الهاکم) دەبێ ئەو باسە، ڕوون | پاشی (کلا )پاش ئەویش ( لوتعلمون ) (۴۱۲۲)
عیلمی تۆ بینادەکا تۆ، ئەی عەلیم | گەر یەقینت بێ دەبینی تۆ جەحیم (۴۱۲۳)
بینشی لێچادەبێ فەو رەن، یەقین | وەک خەیاڵان چادەکا شەخسی زەنین (۴۱۲۴)
چاک لە( الهاکم ) بنۆڕەئەی ئەمین | چۆن دەبێ ( علم الیقین، عین الیقین ) (۴۱۲۵)
من لەئەو هام و یەقین بالاترم | بادەدەم لەو کەس دەکا لۆمەم، سەرم (۴۱۲۶)
چونکەخواردی زاری من هەڵوایی وی | ڕوون دەبوو چاوم، دەبوو بینایی وی (۴۱۲۷)
دەچمەئەو. مزگەو تەهەر وەک ماڵەخۆم | زۆر بەبێ ترسی بەبێ باکی دەڕۆم (۴۱۲۸)
خوا بەگوڵ ئەو هەی کوتی و خەندانی کرد | وای بەقەلبم کوت، دوو سەت چەندانی کرد (۴۱۲۹)
چی بەسەروان دا، لەجوانی و خۆش قەدی | هەرچی بۆ نەسرین و نەرگیس هات وەدی (۴۱۳۰)
ئەو کەسەی کەکردی نەی، شیرین گیان[4] | ئەوکەسەی خاکی دەکرد نەقشێک، جووان (۴۱۳۱)
ئەو کەسەی ئەبرۆی وەها تەڕڕاڕ کرد | ڕوومەتانی وەک گوڵ و گوڵنار کرد (۴۱۳۲)
دای بەئەزمان ئەو سەدان ئەفسوونگەری | ئەو کەسەی کە دای بەکان، زێڕ،جەعفەری (۴۱۳۳)
دەرکی زەڕڕاد خانەگەڵ کو وازبوو | نازو غەمزەی چاو، تیر ئەنداز بوو (۴۱۳۴)
تیغی عیشقی خۆ ی دەقەلبم، ڕا دەکرد | جا، منی وا عاشق و شەیدا دەکرد (۴۱۳۵)

---

[1]- تۆ کەبفرت لایەوالا ، نەک بەها (مصرع اول)

[3]- زەن هەموو تالب یەقین، ئەی خۆش فەڕ    تا بگەن بەو، لێدەدەن توند، باڵ و پەڕ

[4]- ئەو کەسەی نەی ،کرد شیرین قەلب و گیان (مصرع اول)

عاشقم بەو کەس هەموو، ئان، ئانی وی — عەقڵ و گیان لێکرا لەژێر فەرمانی وی (۴۱۳۶)
من لەعیشقم سادقم، وەک ئاو، وام — پێم دەبێ خامۆش،گڕی ئەوهامی خام (۴۱۳۷)
چۆن لەگەنج بدزم؟کەحیفزی گەنج بەوی — ئەو لەپشتم، چۆن نەبم من، دڵ قەوی؟ (۴۱۳۸)
هەرکەسێک کردی هەتاو ئەو پشت گەرم — دڵ قەوی، بێ باکە، ناکا ئەو، چ شەرم (۴۱۳۹)
ئەو دەبێ، بێ ترس و بێ باک وەک هەتاو — پەردە دەد ڕێ، گڕ دەدا، دوژمن تەواو (۴۱۴۰)
زۆر قەوی بوون لەو جیهانە، ئەنبیا — حەملەیان تەنها دەبرد بۆ جەیشی شا (۴۱۴۱)
کاری خۆیان کرد بێ ترس و هەمووم — بۆ جیهانێک، دا نەیەک، دەی برد هجووم (۴۱۴۲)
زێدەسەختەبەرد، لەکەس ناکات، سڵ — ئەو کەناترسێ لەزۆری سندەگڵ (۴۱۴۳)
چون قەوی کرد سندەگڵ وا، خشتەبڕ — کاری خوایەبەر، کەڕەق بوو، توندو پڕ (۴۱۴۴)
گەر لەئەژمار و حیساب، مەڕ بن، بەدەر — کوا لەزۆری وان قەسساب دی خەتەر؟ (۴۱۴۵)
(کلکم ڕاع ) نەبی وەک ڕاعییە — خەڵق، چەشنی مێگەلە، ئەو ساعییە[1] (۴۱۴۶)
شەڕ دەگەڵ مێگەل بکا، بێ باکەشوان — بەڵکەدائیم ئەو لەبۆ وان پاسەوان (۴۱۴۷)
گەر بەڕق جار جارەمێگەڵ، دەنگ دەدا — مەسڵەحەت ئیجاب دەکا، وابێ، سەدا (۴۱۴۸)
لوتفی حەق من گاز دەکا، وا، دەمبەدەم — من ئەتۆ غەمگین دەکەم، تۆش مەگرەغەم (۴۱۴۹)
بۆیەمن وا، تۆ دەکەم غەمگین و زار — تا نەکا تەئسیر لەتۆ قەت چاوو زار (۴۱۵۰)
من بەغەم گەر تاڵ دەکەم وا،خوویی تۆ — تا نەبینێ چاوی پیس، قەت ڕوویی تۆ (۴۱۵۱)
تۆ نەبووی تالب بە من ئاخر مەگەر؟ — تۆ نەبووی بۆ ئەمری من فەرمانبەر؟ (۴۱۵۲)
بۆ ویسالم عاشق و سەودایی تۆ — بۆ فیراق و وەسڵی من، تەنهایی تۆ (۴۱۵۳)
وەسڵی من داوا دەکا خۆ، دەردی تۆ — دوێ شەوێم بیست بۆیەئاهی سەردی تۆ (۴۱۵۴)
من لەدەستم دێت، بێ ئەو ئینتیزار — پێت نیشان دەم، کوێیەڕێگای وەسڵی یار (۴۱۵۵)
تاکو ئەو گێژاوی هیجران لابنێی — پێ لەسەر گەنجی ویسالم دابنێی (۴۱۵۶)
لەززەت و خۆشی مەقەڕڕی یار، بەڵام — هەر بەقەد ڕەنجی سەفەر دەی بێت تام (۴۱۵۷)
خزم و شارت ئەو دەمەبۆ دەبنەگەنج — گەر ببینی تۆ لەغوربەت زێدەڕەنج (۴۱۵۸)

---

[1]- خەڵق ، چەشنی گەللەیە، ئەو ساعییە(مصرع دوم)

**تەشبیهی هەڵاتنی موئمین وبێ سەبری وی دەبەڵاو موسیبەتان دا بەپەرێشانی وبێ قەراری نۆک وئەمسالی وی دەنێو مەنجەڵێکی کەدەحاڵی کوڵین دایەوخۆ هەڵا ویشتنی وان تا بێنەدەر وهەڵێن ...**

چاو لەنۆکێک کە، کوڵی نێو مەنجەڵێ خۆی لەبۆ سەرداوێ، دەی وێ، تا هەڵێ (۴۱۵۹)
گەر لەنێو مەنجەڵ،کوڵی نۆک هاتەجۆش دێتەسەر جا، وا دەکا، دادو خرۆش (۴۱۶۰)
بۆچی دەمدەی تۆ وەبەر نارو گڕی تۆ لەبۆ ئاگر مەگەر ئەمنت کڕی؟ (۴۱۶۱)
لێیدەدا ئاشپەز بەکەوگیر،نا، مەکە قەت لەبەر گرماو کوڵین تۆ ڕامەکە (۴۱۶۲)
نات کوڵێنم تا نەبیسم نامی تۆ دەت کوڵێنم تاکو خۆش بێ تامی تۆ (۴۱۶۳)
تا غەزایەک بی، ئەتۆ لایق بەگیان خۆ لەبۆ خواریت نەبوو، ئەو ئیمتیحان (۴۱۶۴)
تۆ کەدەت خوارد ئا و لەبێستان سەو زو تەڕ بوو لەبەر ئەو ئاگرەی وا، پڕ شەڕەڕ (۴۱۶۵)
ڕەحمەتی حەق بوو لەپێش، قەهریش لەپاش تا بەڕەحمەت ئیمتیحان کا، شەخسی باش (۴۱۶۶)
ڕەحمەتی وی پێشی قەهری وی دەهات تا وجوود سوود دا، بەجەمعی کائینات (۴۱۶۷)
چون بەلەززەت چا دەبێتن گۆشت و پۆست گەر نەبێ وا،چی دەدا گڕ، عیشقی دۆست؟ (۴۱۶۸)
عیشق داواکا، کەبێ قەهری خودا تا بکەی تۆ گشت سەر ما یەت فیدا (۴۱۶۹)
دێ لەدووی وی، بۆت لوتفی کردگار پێت دەڵێ دەرد و غەمت بوو ن تار و مار (۴۱۷۰)
پێی دەڵێ کاتی بەهار ڕوشدت دەهات قەدری ڕەنج بگرە،کەمیوانەلەلات (۴۱۷۱)
تا کومیوان شوکر کا بۆ کاری تۆ بێتەلای شا، باس بکا، ئیسارای تۆ (۴۱۷۲)
تا کو، مونعیم بێ لەجێی ئەنعام و سوود گشتی نیعمەت بۆت دەبن ئەودەم حەسوود (۴۱۷۳)
من خەلیل تۆ کوڕ،لەژێر کارد،زێدەسووک دابنێ سەر، چون (ارانی اذ بحک ) (۴۱۷۴)
دا بنێ سەر تۆ لەبۆ قەهری خودا وەک سمایل، تا لەتۆ سەر کەم جودا (۴۱۷۵)
گەر چی دەبڕم ئەو سەرەخۆ، بێ گومان ئەو سەرەنابڕێت و نامرێت هیچ زەمان[1] (۴۱۷۶)
خۆ بەڵام تەسلیم مەڕامی خوایەبەس ئەی موسەڵمان، بگرەتەسلیم تۆ، بەدەس (۴۱۷۷)
نۆکە، تۆش چاک بێرەجۆش نێو ئیبتیلا تا وجوود و خۆت هەر دوو دەبنە( لا ) (۴۱۷۸)
تۆ ئەلەو بێستانەگەر خەندان بووی تۆ گوڵی بێستانی دیدەو گیان بووی (۴۱۷۹)
ئاوو باغ و، خاک، جودا بووی گەر لەوان بووی بەلوقمە، هاتی بۆ نێو زیندووان (۴۱۸۰)
تۆ ببەخۆراک و قووەت، فیکرو بیر ئێستەشێر بە، تۆ کەئەووەڵ بوویی شیر (۴۱۸۱)

---

[1]- گەر چی دەبڕم ئەو سەرە، خۆ زۆر یەقین ئەو سەرەدوورەلەمردن هەم بڕین

تۆ لەئەووەڵ بووی لەوەسفی وی دروست — ڕوو لەوەسفی ویکەوە، چالاک و چوست (٤١٨٢)
تۆ لە هەور و ڕۆژ و ئاسمان چادەبووی — جا دەبووی ئەوساف، لەژوور گەردوون دەچووی (٤١٨٣)
تۆ لەئەووەڵ بووی بەبارانەو بەتاو — جا دەچی بۆ نێو سیفاتی پاک، بەتاو (٤١٨٤)
جوزء بووی بۆ هەورو تاو، نەجمی مونیر — بووی بەنەفس و فیعل و قەو ل و فکرو بیر (٤١٨٥)
بوونی حەیوان دێ لەنابوودی نەبات — ڕاستەکوترا (اقتلونی یا ثقات) (٤١٨٦)
چون دەژین پاش وەی کەمردن بۆمەهات — ڕاستە کوترا (ان فی قتلی حیات) (٤١٨٧)
فیعل و قەو ل و سیدق، بوو ن قەو لی مەلەک — تا بەنەردیوانی وا، چوون سەر فەلەک (٤١٨٨)
چونکەئەو توعمەدەبۆ قووتی بەشەر — ئەو جەمادی لادەنا، بوو جا نەوەر (٤١٨٩)
شەرح و تەفسیلی دەوێ ئەو باسەجا — جێیەکی دی لێی بکوترێ ئەو هە، با (٤١٩٠)
بۆ تیجارەت دێن لەئاسمان کاروان — پاش تیجارەت دەچنەوەبۆ ئاسمان (٤١٩١)
بگرەڕێی ئاخیر بەخۆشی و ئیختیار — نەک بەترس و لەرز، وەک دز، نا لەبار (٤١٩٢)
بۆیەوا من پێت دەڵێم گوفتاری تاڵ — تا لەتاڵی و نا حەزی بت کەم بەتاڵ (٤١٩٣)
چاو، ترێی ئەفسوردە، ئاوی سار،کەهات — لادەبا ئەفسوردەگی دەیدا، نەجات (٤١٩٤)
گەر کو زۆرت بێتەپێش تۆ، دەر دو ڕەنج — ڕەنج دەڕوا، دێ لەجێی وی، دوایە،گەنج (٤١٩٥)

**تەمسیل بۆسابیر بوونی موئمین، وەختێک کەلەخێر و شەڕ و بەڵا و موسیبەت ئاگاداربێت**

تۆق لەبۆ سەی ڕاوە، نەک بۆ سەگ، بەعام — بێ کولێن خۆ دیارەنیتی، خام، تام (٤١٩٦)
نۆ ک کوتی چون وایە، ئەی ئاشپەز ئەتۆش — بم کوڵێنەوا، کەنەم مێنێ، چ هۆش[1] (٤١٩٧)
لەو کوڵینەش دا، ئەتۆ میعماری من — لێم دە کەوگیر چاک، ئەتۆ ئەی یاری من (٤١٩٨)
چەشنی فیلم، لێم دەکوتک و، بمکەداغ[2] — تا نەبینم خەونی هیندوستان و باغ (٤١٩٩)
تا کوخۆم تەسلیم کوڵینو، جۆش بکەم — تا ئەمن خواهانی خۆ م دڵخۆش بکەم (٤٢٠٠)
چونکەئینسانی غەنی تاغی دەبێ — چەشنی فیلی خەون بین، یاغی دەبێ (٤٢٠١)
چونکەفیل گەر دیتی هیندوستان لەخەو — گوێ بەئەمری فیلەوان، نادات ئەو (٤٢٠٢)

---

[1]- یارمەتیم دەتاکو بێمەجۆش، خۆش (مصرع دوم)
[2]- چەشنی فیلم لێم وەکار خە، تۆ پەیاغ (مصرع اول)

**مەعزەرەت کوتنی ئاشپەز بۆ نۆک و حیکمەت و فایدەی کوڵاندنی نۆک بەوەسیلەی ئاشپەز ...**

ڕووی لەنۆک کرد ئاشپەز، دەیکوت بەوی چەشنی تۆ بوو م خۆ منیش جوزئی زەوی (٤٢٠٣)
چون قەبوولم کرد عەزابی ئاگری بوومەلایق، بەندەبم، بۆ قادری (٤٢٠٤)
ما وەیەک بوو جێ کوڵانی من، زەمەن ما وەیێکیش مەنجەڵی من بوو، بەدەن (٤٢٠٥)
بەو کوڵینانەدەبووم نیرووی حەواس بوومەڕووح،جا،بۆتدەبووم ئوستادیخاس[1] (٤٢٠٦)
نێو جەماد دەمکوت بەخۆم تۆ ناسرەوی تاکو دێ بۆت عیلم و وەسفی مەعنەوی (٤٢٠٧)
من کەبوومەڕووحی حەیوان ئەو چەلە با تەلاش کەم بێمەدەر من، لەو، زەلە (٤٢٠٨)
جا لەحەق داوا بکەتا وا بکا لەو نوکاتانە، ئەتۆ ئا گا بکا (٤٢٠٩)
چون بەقوڕئان زۆرکەسان گومڕا دەبوون بەو تەناف قەومێک وارید چا، دەبوون (٤٢١٠)
خۆ تەناف جورم و گوناهی لا نییە تۆ کەخۆ ت مەیلت لەبۆ باڵا نییە (٤٢١١)

**پاشماوەی ئەو مزگەوتەی میوان کوژ...**

ئەو غەریبی دوور وڵاتی بێ بەدە دەیکوت ئەو شەو من دەنووم لەو مەسجیدە (٤٢١٢)
گەر ئەلەو مزگەوتەعومرم بێ تەمام ئەو لەلای من ئەو دەمی کابەی مەرام (٤٢١٣)
خۆشەلام گەر بم لەسەر داری قەنار چەشنی مەنسوورکەم، بەداوی مل، قومار[2] (٤٢١٤)
گەر لەپەند، دان ئێوەبۆم بوون جەبرەئیل نایهەوێ کۆمەک لەنێو ئاگر خەلیل (٤٢١٥)
جەبرەئیل تۆ لێم گەڕێ با بایسێم چەشنی عەنبەر، نێوی ئاگر بێ بەجێم[3] (٤٢١٦)
جەبرەئیل، گەر تۆ ئەمن یاری دەکەی وەک برا، تۆ، لێم، کەپاسداری دەکەی (٤٢١٧)
ئەی برا گیان من بەئاگر،زێدە شاد من نەئەو گیانەم کەکەم کەم، یا زیاد[4] (٤٢١٨)
زیاد دەکاتن گیانی حەیوانی گییا دەستەچیلەکوا لەنێو ئا گر ژییا[5] (٤٢١٩)
گەر نەبا وەک چیلەئەو، موسمیر دەبوو تا ئەبەد مەعموور هەم عامیر دەبوو (٤٢٢٠)

---

[1]- بەو کوڵینانەدەبوو حیسسم زیاد بووم بەڕووح،جا ،بووم لەبۆ تۆ ئوستاد
[2]- جا بکەم من ، بەو تەنافی مل ، قومار (مصرع دوم)
[3]- بایسێم با ، جەبرەئیل تۆ لێم گەڕێ چەشنی عەنبەر جێم ببێ من، نێو گڕێ
[4]- ئەی برا گیان من دەکا ، نار زێدەشاد من نەئەو ڕووحەم کەکەم کەم یا زیاد
[5]- زیاد دەکاتن ڕووحی حەیوانی عەلەف چەشنی چیلەنار کردی ئەو تەلەف

تۆ بەبای سووزان ئەو گڕ، وەر گرە    شوعلەبوو، بۆ نار، نەعەینی ئاگرە (٤٢٢١)
مەنبەعی ئاگر ئەسیر بوو، خۆ یەقین    شوعلەوو، سایەی وییە، ها ت بۆ زەمین (٤٢٢٢)
لاجەرەم نابێت شوعلەپایەدار    دەچتەوەبۆ لایی مەعدەن ئەو بەغار (٤٢٢٣)
قامەتت یەک جوور سابیت، بەر قەر ار    سێبەرت جارکورت، درێژەجارو بار (٤٢٢٤)
چون لەشوعلەقەت، چ کەس نەیدی سەبات    هەرچی فەرعەدەچتەوە لای ئوممەهات (٤٢٢٥)
بەس بڵێ چون ئاوەڵای کرد فیتنەزار    بێژەوشک، زانا بەباش بەس کردگار (٤٢٢٦)

## زیکری خەیاڵی بەد ئەندیشانی کەم فام ...

پێش ئەوەی ئەو داستانە بێتە بن    دوو کەڵی گەندی حەسوودان هاتەمن (٤٢٢٧)
من کەنارەنجم لەگفتی وا دزێو    سادەدڵ، رەنگەدڵی بێ، بەو پەشێو (٤٢٢٨)
چەندەخۆشی کوت حەکیمی غەزنەوی    بۆ نەفامان یەک میسالی مەعنەوی (٤٢٢٩)
گەر لەقورئان دا نەبینێ غەیری قال    هیچ عەجەب نابێ لەئەسحابی زەلال (٤٢٣٠)
چون لەشۆقی تاوی ڕوونی پڕ لەخێر    غەیری گەرمای بۆ نەهات، قەت چاوی کوێر (٤٢٣١)
یەک نەفەر تەعانی وەک کەر، بێ هونەر    لەو تەویلەی خۆی سەری هینایەدەر (٤٢٣٢)
وایدەکوت بێهوودەیە، زۆر مەسنەوی    داستانی ئەنبیا مەفهوومی وی (٤٢٣٣)
خۆ، چ سیرڕو ڕازی والای لا نییە    ڕووی لەجێگەی ئەو لیبایان دا نییە (٤٢٣٤)
لەو مەقاماتی تەبەتتول تا فەنا    پایەپا یەتا مولاقاتی خودا (٤٢٣٥)
شەرح و حەددی هەرمەقام و مەنزڵێ    تا، بەباڵ تێپەڕ بێ لەو ساحەب دڵێ (٤٢٣٦)
چونکەکاتێ هات قورئانی خودا    کافران وایان لەوی تەعنەدەدا (٤٢٣٧)
داستانەو باسی ڕابوردوانی کۆن    خۆ، چ نوکتەی باشی تێدا، نینە بۆن (٤٢٣٨)
تێدەگەن مەعنایی وی مندالّ هەموو    غەیری ئەمری باش و بەد، دەو دا، نەبوو (٤٢٣٩)
زیکری یوسووف زیکری زولفی پڕ خەمی    زیکری یاقووب و زولەیخاوو، غەمی (٤٢٤٠)
کام بەیانی وی نەبوو مەعلووم لەعام؟    کامەمەتڵەب بوو کەلەو، دا ماوەفام؟ (٤٢٤١)
خوا کوتی گەر سادەیەلاتان ئەوە    سوورەتێک بێنن وەکوو، وەی پێکەوە (٤٢٤٢)
بێژەهەرچی جیننو ئینسانە، بڵێن    ئایەتێک لەو ئایەئا سانە، بڵێن (٤٢٤٣)

**تەفسیری ئەو حەدیسەی حەزرەتی موحەممەد (ص) کە..(للقران ظهر و بطن و لبطنه بطن الی سبعەابطن )...**

حــەرفی قورئــان زاهیرێکــی گــەر هەیــە   ژێــری زاهیــر بــاتنێکیش هــەر هەیــە (٤٢٤٤)

بـەتنی دووەم بـەتنی سـێ ژێـر وی نـەها ن   عــاقڵان گشــتییان لەویــدا، دا دەمــان (٤٢٤٥)

بەتنی چوارەم قەت نـەبوو مـەعلووم لەکەس   عــالیم و زانــا بــەوی هــەر خوایەبــەس (٤٢٤٦)

مــەگرەتۆ قــەت زاهیــری قورئــا نــی، دوڕ   نەیـدەدی دێـو قـەت لـەئادەم غـەیری قـوڕ (٤٢٤٧)

زاهیــــری قورئــــان وەک ئینســــانییە   نەقشــی وی ئاشــکار و مــەخفی گیانییــە (٤٢٤٨)

یـەک نەفـەر دەیبینێت زۆر ساڵ، مام و خاڵ   هـیچ نـەیان زانـی لـەوی، یـەک زڕڕەحـاڵ (٤٢٤٩)

**بەیانی ئەو مەتڵەبەکەچوونی ئەنبیا و ئەولیا بۆ شاخان و ئەشکەوتان بۆ پنهان کردنی خۆیان لەترسی ئازار و ئەزیەتی خەڵق نییە بەڵکەم بۆ ئیرشاد و تەشویق کردنی وانە بۆ دوور بوون و مونقەتیع بوون لە دونیا بە ئەندازەی ئیمکان ...**

گـەر دەڵـێن پاکـان دەچـن بـۆ کێـوو، غـار   تا کو خۆ، ون کـەن لەچاوی جەم بە، غار[1] (٤٢٥٠)

گەرلــەلای خــەڵکی لەســەرکێون ئــەوان   دا دەنـێن پێـی خـۆ، لەحـەو تـەم ئاسـمان (٤٢٥١)

بــۆ پــەنا بــۆ غــار و بــۆ کێــوان بــەرن؟   زۆر لــەکێوان و لــەدەریا لــەو ســەرن (٤٢٥٢)

بــێ نییــازن گــەر لــەبۆکێو کــەن فیــرار   چون لەدووی وان دێ فەلەک، زۆر توند بەغار (٤٢٥٣)

زۆر گەڕان ئەفلاک نەیان دی گەردی گیان   بـۆ عــەزای پۆشــی کــراس جــا، ئاســمان (٤٢٥٤)

گـەر پـەری وجین، بوون لەبـەرچاوان نـەهان   ئــــادەمی پنهــــانترەخۆ، زۆر، لــــەوان (٤٢٥٥)

زۆر لــەجین پنهــانترەخۆ، ئــەی فــلان   شەخسـی ئینسـان بێ گومـان، لای عـاقڵان (٤٢٥٦)

شەخســی عاقــڵ ئــادەمی، پنهــان دەدی   چۆن دەبێ گـەر بێ سـەفی پنهان، ئەدی؟ (٤٢٥٧)

**تەشبیهی سووڕەتی ئەولیا و سووڕەتی کەلامی ئەولیا بەسووڕەتی عەسای مووسا و سووڕەتی ئەفسوون و کەلامی عیسا( علیهما السلام )...**

ئــادەمی هــەر وەک عەســایی مووســییە   ئــادەمی هــەر وەک فســوونی عیســییە (٤٢٥٨)

تــا کــو قــەلبی موئمینــان زینــەت بــدا   جـێ لـەنێو دوو قـامکی خـۆی پێـدا، خـودا (٤٢٥٩)

زاهیــــری وی تاقەیــــەک دارە، بــــەڵام   زار وەکــا دەخــوات، کائینــات تــەمام[1] (٤٢٦٠)

---

[1]- گەر دەڵێن پاکان دەچن بۆ غار و کێو   تاکو خۆ، ون کەن ، لەچاوو ، زارو لێو

لات نەبێ ئەفسوونی عیسا، حەرف و سەوت / بەڵکەلات وابێ کەبەو هەڵدێت، مەوت (۴۲۶۱)

لات نەبێ ئەفسوونی وی لەهجاتی زیشت / چاو کەچۆن مردووی هەڵستاند، دا دەنیشت (۴۲۶۲)

تۆ مەنۆڕەئەو عەسای بۆ هات، چ جوور / چاو کەچۆن لەت بوو بەوی دەریایی سوور[2] (۴۲۶۳)

چادرێکی ڕەش دەبینی تۆ لەدوور / بێرەپێش لەشکر ببینەبێ قسوور (۴۲۶۴)

تۆ لەدوور ڕاهەر دەبینی تۆزو گەرد / بێرەپێش بنوارەجا، نێو گەرد، مەرد (۴۲۶۵)

گەردی وان چاوان زۆر بینا دەکا / کێو لەبەر مەردانەگی وان، ڕا دەکا[3] (۴۲۶۶)

هەرکە مووسا هات لەدەشتێک زێدەدوور / کەوتەشادی و هەڵپەڕین جا، کێوی توور[4] (۴۲۶۷)

**تەفسیری (یاجبال اوبی معه والطیر)...**

سووڕەتی داوودی تابان کرد خودا / بۆ دوعا کێوان لەگەڵ وی هەم سەدا[5] (۴۲۶۸)

جا لەگەڵ وی کێوەکان هەمرا دەبوون / نەغمەخوان بوون هەر دووعاشق شا، دەبوون (۴۲۶۹)

(یا جبال اوبی ) ئەمری خووا / هەر دوو بوون جا، هەم سەداوو، هەم نەوا (۴۲۷۰)

خوا کوتی بەو، ژەهری هیجرت تۆ دەچێشت / تۆ لەبەر من هاو دەمی خۆ ت جێ دەهێشت (۴۲۷۱)

ئەی غەریب تۆ نیتەهاو دەم هیچ کەسێ / ئاگری شەو قەت لەدڵدا، دایسێ (۴۲۷۲)

نەغمەخوان و هاو دەمت گەر تۆ دەوێ / کێوەکان دەستوور دەدا، خوا، بێنەوێ[6] (۴۲۷۳)

بینەزوڕنا ژن لەبۆت، هەم نەغمەخوان / بێن ئەوان بۆ لات، بەڕەقس و شادمان (۴۲۷۴)

تا بزانی تۆ،کەبێ بێ، ناڵەکێو / ناڵەناڵی دێ وەلیش، بێ زارو لێو (۴۲۷۵)

نەغمەکانی کێوەکانی موعتەلی / دەمبەدەم دێن، دەچنەگوێی حیسسی وەلی (۴۲۷۶)

ئەو دەبیسێ هەر تەنێ بێ هاو دەمان / خۆش بەحاڵی وەی کەباوەڕ کا، نەهان (۴۲۷۷)

ئەو دەبیسێتن بەدڵ سەت گفتو گۆ / هاو نشینی وی کەبۆی نایەت، چ بۆ (۴۲۷۸)

چاو کەسەت جواب و سوئال دێن نێو دڵت / دێن لەدەرباری خودا تا مەنزڵت (۴۲۷۹)

تۆ دەبیسی، گوێچکەکانی دیکە، نا / گەرچی گوێی خۆیان بەجیسمی تۆ وەنا (۴۲۸۰)

---

[1]- ئەو بەزاهیربوو فەقەت یەک دانەدار        کائینات یەک لوقمەبۆی ، وەیکا ،کەزار

[2]- چاو کەچۆنی لەت دەکرد بەو ، بەحری سوور (مصرع دوم)

[3]- هیممەتی وان ڕادەدا کێو چەشنی کا (مصرع دوم)

[4]- کەو تەشادی و ، کەو تەڕەقسین کێوی توور (مصرع دوم)

[5]- بۆ نیبایش کێو لەگەڵ وی هەم نەوا (مصرع دوم)

[6]- کێووشاخان خوا لەبۆت دێنێتەوێ (مصرع دوم)

تۆ کەکەڕ بووی قەت شتی والـەت نەبیست　　خۆ میسالت دی، ئەدی بۆ چیت نەویست؟ (٤٢٨١)

**جواب دانەوەبەوکەسەی کەلەبەر نەفامی و نەزانین تەعنەلەمەسنەوی دەدا...**

ئـەی سـەگی تـاعین لـەتۆ عەوعـەو دەهـات　　دات لـەقورئان تانـە، تـا بـت بـێ، نـەجات (٤٢٨٢)

شـێرەکی وا کـــەم نییـــەخۆ، مەســـنەوی　　دین و گیان دەر چێ، لەدەستی قەهری وی (٤٢٨٣)

تـــا قییامـــەت وا دەکـــا قورئـــا ن نیـــدا　　ئـەی ئەوانـەی بـۆ نـەزانین، بـوون فیـدا (٤٢٨٤)

ئێوەلاتـــــان وابـــــوو مـــــن ئەفســـــانەمە　　لایقـی تـەو هینـی پـیس و، تـا نەمـە[1] (٤٢٨٥)

ئێوەدیـو، ئـەو هـەی کـەپێی ئەفسـانەبوو　　ئێوەبـوون ئەفسـانە، خـۆ ئـەو، وا نـەبوو[2] (٤٢٨٦)

مـــن کـــەلامی حـــەققم و، قـــائیم بـــەوی　　زێـڕی پـاکم، قـووتی حـەققم، مەعنـەوی (٤٢٨٧)

نـــووری ڕۆژی ڕوونـــم و خـــۆم، لێـــو دەدەا　　خـۆ بـەڵام نـابم لـەڕۆژ قـەت قـەت، جـودا (٤٢٨٨)

چـاو مـنم سـەر چـاوەیی ئـاوی حـەیات　　تـا نەیـەت، بـۆ عاشـقانی مـن، مـەمات (٤٢٨٩)

بـۆ گـەنیوی حیـرس و ئـاز تـان گـەر نـەبا　　یەک قومی دەڕژاند، لەسەر گۆر تان خودا (٤٢٩٠)

مـــن بەتـــەعنی تاعینـــانی دڵ ســـەقیم　　قـەت وەلانـانێم پەنـدی ئـەو حـەکیم[3] (٤٢٩١)

**میسال هینانەوە بە هەڵاتنی جانوو لەئاو خواردن بەسەبەبی فیتو و لێدانی مەیتەران .. تەمسیل ..**

ماینێک دەگەڵ جانوەکەی لەسەر کانیەک خەریکی ئاو خواردن بوون ..مەیتەران جار جار لێکرا فیتوویان لێدەدا، ودەیان ویست کەئەسپ و ماینەکان ئاو بخۆنەوە، جانوویەک کەپێش بیستنی فیتوو بەسووڕەتی مەعموولی وتەبیعی ئاوی دەخواردەوە، هەر دەگەڵکو، دەنگی فیتووی بیست بـەئیزتیراب و پەرێشانی سەری لەئا و هەڵینا وچاوی لـەدەورو بـەری خـۆی دەکـرد، دایکی پێیکوت،خۆشەویستەکەم بۆ سەرت لەئاو هەڵیناوەوپەرێشان و پەشۆکاوی؟ جانوو کوتی لەدەنگی فیتـووی ئـەو مەیتەرانەدەترسێم، دایکـی پێیکـوت خۆشەویسـتەکەم لـەوەتی دونیـا هەیەلـەو جوورەئینسـانەفزوول و موزاحیمانەهـەر بوونەوهـەر دەش بـن، ئـەتۆ سـەری خـۆت داخـەوکاری خۆت ئەنجام بدەوگوێ مەدەبەو فیتوانەچونکەفێڵی فێڵەبازانن ...

---

[1]- لایقی تەو هینی پیسی تانەمە(مصرع دوم)

[2]- خۆو ،فەناو ئەفسانەبوو ن ئەو ، وانەبوو (مصرع دوم)

[3]- من بەتانەی دڵ نەخۆشی مەعنەوی　　قەت وەلا نانێم پەندی غەزنەوی

ئـــەو حـــەکیم بۆئێمەپەنـــدی وا دەنـــارد     مـــاین و جـــانوو، پێکـــەوەئاویان، دەخـــوارد (٢٩٢ع

لەحزەلـــەحزەدەنگی فیتـــوو هـــەر دەهـــات     یـــانی ئـەی ئەسـپان، وەخـۆن ئـاوی حـەیات (٢٩٣ع

هـەر کـەجانوو، دەنگـی فیتـووی بـۆ دەهـات     قوت دەبوو ئەو جا لەخواردن هەڵدەهات[1] (٢٩٤ع

دایکـــی لێـــی پرســـی کەئـــەی جانوولـــەبۆ     سســـت و بێحـــاڵی لـــەئاو خـــواردن ئـــەتۆ؟ (٢٩٥ع

جـــا کـــوتی جـــانوو، کـــەفیتوو لێـــدەدەن     مەیتـــەران، زۆر تـــرس و لـــەرزم، پێـــدەدەن (٢٩٦ع

جـــا دەتـــر ســـێت و دەلـــەرزێتن، دڵـــم     لـەو هـەرای دەیکـەن ئـەو ان لێکـرا، سـڵم (٢٩٧ع

پێیـــدەکوت دایکـــی .. وەتـــی دونیـــا هەیـــە     شەخسی بەد کار، بەر دەوام، هەر وا هەیە (٢٩٨ع

کـاری خـۆ ت ئـەنجام بـدەتۆ ئـەی عـەزیز     کـــاری وان دەڕوات، نـــامێنێ، پەشـــێز (٢٩٩ع

تەنگـــەوەخت و، ئـــاو، دەڕوا زۆر بـــەگوڕ     پـێش ئـەوەی تـۆ لـەو جـودابی، بـی بـەقوڕ (٣٠٠ع

کـانی یـەک مەشـهوور پـڕ ئـاوی حـەیات     ئـاو هەڵێنجـە، تـا لـەتۆ شـین بـێ نـەبات[2] (٣٠١ع

ئـاوی جـۆی نـوتقی وەلیمـان کـرد نـۆش     ئـاوی ژینـە، بـێ خەبـەر، وەیخـۆ ئـەتۆش (٣٠٢ع

گەر کو نەت دی ئا و، وەکوو کوێرا ن بڕۆ     گۆزەبـــۆ لای جـــۆ بـــەرە، بیخەلـــەجۆ (٣٠٣ع

تـۆ کەبیسـتت ئـا و دەنێـو جـۆ دا هەیـە     کـوێر دەکـا تەقلیـد لـەبینا، تـا هەیـە (٣٠٤ع

بیخەجۆگەمەشـکی قـەلبی خـۆت ئـەتۆ     تـا ببینـێ، زۆر گـران، تـۆ مەشـکی خـۆ (٣٠٥ع

گەرگران بووی بۆ ت دەبێ ئەو دەم دەلیل     دڵ دەبـێ ئـازاد، نـەبۆ تەقلیـد زەلیـل (٣٠٦ع

گـەرکو نەیـدی کـوێرە، ئـاوی جـۆ عـەیان     خـۆ دەزانـێ، چونکـەگۆزەی بـوو گـران (٣٠٧ع

چـۆ دەگۆزەئـاو ی جۆگـە، بـێ گومـان     چونکەسـووک بـوو ئـەووەڵێ، ئێسـتا گـران (٣٠٨ع

چون بەهەر با یەک دەچووم، وەک پوشکەکا     ئێستەســـەنگینم، ئـــەمن نابـــات، بـــا (٣٠٩ع

سـووک مـەغزان بـا، دەیـان بـا، بـۆ حـەوا     چـون نـەبوو لایـان ئـەوان، قورسـی قـووا (٣١٠ع

شەخسی بەد کار وەک گەمی بێ لەنگەرە     بـای خـیلاف بـۆ وی گـەلێک دەردی سـەرە (٣١١ع

عـــەقڵی عاقـــڵ خـــۆ لـــەبۆ وی لەنگـــەرە     لەنگـــەرێکی تـــۆ لـــەعاقڵ وەرگـــرە (٣١٢ع

عـەقڵی وی زۆری بـەوی کـۆ مـەک دەکـرد     کۆ مەکی لەو گەنج و دەریای جوود دەبرد (٣١٣ع

کـۆ مـەکی وا بێـت، دڵ پـڕ فـەن دەبـێ     دێـن لـەدڵ بـۆ چـاو، چـاو ڕەو شـەن دەبێ (٣١٤ع

چـون لـەدڵ ڕا دێ لـەبۆ چـاوان نـوور     گەرنـەبێ دڵ، چاو لەنوور بـوو زۆر بـەدوور (٣١٥ع

گەرلـەنووری عـەقڵ، دڵ بـێ بـەهرەوەر     دڵ دەدا لـەو نوورەسـەهمی چـاوی سـەر (٣١٦ع

---

[1]- نەیدەخوارد ئاو ، قوت دەبوو ، حەیران و مات (مصرع دوم)

[2]- کانی یەک مەشهوور کەتێیدا ئاوی ژین     ئاو هەڵێنجەتا ئەتۆ بی ، سەو زو شین

لـەو موبـارەک ئـاوی ئاسـمان بـوو مـەرام		وەحـــی و ئیلهــامی دڵ و سـیدقی کــەلام (٤٣١٧)
ئێمـەوەک ئـەو جـانوو، ئـاوی جـۆ دەخـۆین		جـا فریـوی تـاعینی بـەد، بـۆ دەخـۆین؟ (٤٣١٨)
ئـەنبیات گـەر دیـن، ڕەهبـەر بـوون لـەبۆت		تـۆ لەتانــەی خــەڵق، بگرەگــوێی خــۆت (٤٣١٩)
چوون بەڕێی خۆیان ئەوان گەو ڕەو بەگان		قەت نەیان کرد گوێی خۆ شل، بۆ سەگان (٤٣٢٠)

**پاشماوەی داستانی میوانی مزگەوتی میوان کوژ...**

بــۆم بڵـــێ تـــۆ داســـتانی شـــێرەپیاو		چی لەمەسجید هات بەسەر، چی دی بەچاو؟ (٤٣٢١)
ئەو لەمەسجید نوست، نەهات ئەمما خەوی		خــۆ نەبیســـراوەغەریق، خـــەو بێتـــەوی (٤٣٢٢)
خـــەو دەبـــێ بـــۆ ماســـیان و بـــۆ تیـــوور		عاشقان غـەمگین، لـەوان، خـەو بوو بـەدوور[1] (٤٣٢٣)
نیوەشــەو دەنگێکــی ســامناک وا دەهــات		ئـەی ئـەتۆ داخـوازی سـوود، هـا، هاتمـەلات[2] (٤٣٢٤)
دەنگی وا ناخۆش دەهات جا، پێنج کەڕەت		دڵ دەبـــوو بـــەو دەنگەپیســـەلەت بەلـــەت (٤٣٢٥)

**تەفسیری ئایەتی (واجلب علیهم بخیلك و رجلك )...**

گەربکەی بۆ عـەزمی دینی خۆ ت تـەلاش		بانگ دەکا، شـەیتان تەلاشـت کا، بـەلاش[3] (٤٣٢٦)
پێــــت دەڵـــێ ڕێ وا نیـــــەتۆ وا مــــەڕۆ		چون لەسەر ڕێت فـەقرە، دەت کا ڕەنجـەڕۆ (٤٣٢٧)
تــۆ دەبــی جــا بێنــەوا، هـــەم دوور لــەیار		هـەم پەشـیمان زۆر دەبێ هـەم خـوار و زار (٤٣٢٨)
تــۆ لەترســی دەنگــی ئــەو دێــوی لــەعین		بــۆ زەلالــەت جــێ دهێڵــێ تــۆ، یــەقین (٤٣٢٩)
هـەم سبەی هـەم دوو سبەی مۆڵەت لەبۆم		چـون هەمـەمۆ ڵـەت، بـەڕێی دیـن دا دەڕۆم (٤٣٣٠)
چـاو لـەمردن کـە، چلـۆن خـۆی نا،کـەمین		گیــانی جیرانــی ســتاند، بــۆ دادو شــین (٤٣٣١)
جـا لەترسـان ئـەو چەلـەش دینـدار دەبـی		ماوەیـەک تـۆ مـەرد و، هـەم سـالار دەبـی (٤٣٣٢)
جـا سـیلاحت دێتــەدەس عـیلم و حیکـەم		مـن لەشـەیتان نیمـەباک، هـیچ زۆرو کـەم (٤٣٣٣)
ئەو چەلەش بانگت دەکا ئەو هەر بەمەکر		ژەهری فەقرت دێ دەکا، لێت تاڵ، شەکر[4] (٤٣٣٤)
ئەوچەلــەش تــۆ ڕێــی ڕوونــاک لا دەنێــی		ئـەو سـیلاحی عـیلم و حیکمـەت دا دەنێـی (٤٣٣٥)
زۆر لـــــەمێژەتۆ غـــــولامی دەنگـــــی وی[1]		تـۆ لـەبۆ فـەرمانی ویـت کـرد سـەر نـەوی (٤٣٣٦)

---

[1]- عاشق ئەمما غەرقی غەم لەو ، خەو بەدوور (مصرع دوم)

[2]- ئەی ئەتۆ خواهانی سوود ، ها ، هاتمەلات (مصرع دوم)

[3]- دەیهەوێ شەیتان تەلاشت کا بەلاش (مصرع دوم)

[4]- ئەو چەلەش بانگت دەکا، ئەو، وا بەمەکر		تۆ بترسێ بانەیەت بۆت ، تیغی فەقر

هەیبــەتی دەنگــی شــەیاتین بــوو کــەوا خــەڵق بەخســیر بــوون، گرفتــاری هــەوا (٤٣٣٧)
گیــانی خــەڵکی نائومێــدبوو،وا لــەنوور هــەر وەکووکوففــا ر لەئەســحابی قبــوور (٤٣٣٨)
دەنگــی شــەیتان وا بەهەیبــەت بــێ، ئەگــەر چۆنــەداخوا دەنگــی ئــەو خوایــەی لەســەر؟ (٤٣٣٩)
زۆردەترســــێتن لــــەدەنگی باز،کــــەو خــۆ بــەڵام ترســی نییــەهیچ مــێش لــەو (٤٣٤٠)
چونکــەباز ناکــات ڕاوی مــێش، چ کــات ڕاوی مێشــان عەنکــەبووت تــەنها دەکــات (٤٣٤١)
عەنکەبووتی دێو، لەسەر تۆی وەک زوباب هەیبەتی بوو، نەک لەسەر کەو یا عوقاب (٤٣٤٢)
دەنگــی شــەیتان، بــوو بەشــوانی ئەشــقییا دەنگــی ســوڵتان، پاســەوانی ئــەولییا (٤٣٤٣)
تــا نــەبن تێکــەڵ ســەدای وا لێــک بــە دوور چەشنی ئاوی بەحری خۆش و بەحری شوور (٤٣٤٤)

**گەیشتنی دەنگی تەلەسم، نیوەشەو بەگوێی میوانی مزگەوتی میوان کوژ...**

گوێ دەباسی ئەو سەدای وا، زێدەسەخت لەو نەترسا زەرڕەیەک ئەو خۆشبەخت (٤٣٤٥)
بــۆ بترســێم؟ تــەپڵی عیــدە، ئــەو کــوتی بــا دەهــۆڵ ترســی هــەبێ، یــەک دەیکــوتی (٤٣٤٦)
ئــەی دەهــۆڵانی کــەدڵتان، لا نییــە زەربــی دار بــەشــتان، لەعیــدی گیانییــە (٤٣٤٧)
عید، قیامەت، دوور لەدینان، بوون دەهۆڵ ئێمەئــەهلی عیــد، شــاد و تونــد و تــۆڵ (٤٣٤٨)
گوێ دە، ئێستا لەو دەهۆڵ چۆن دێ سەدا ئاشــی خۆشــبەختی چلــۆن وا، کــوڵ دەدا (٤٣٤٩)
لەو دەهۆڵەدەنگ کەهات، بۆ ئەو حەلیم دەیکوت ئەو هە، تەپڵی عیدە، نیمە، بیم (٤٣٥٠)
بــەو ســەدایەمن کــەنابم هــیچ غــەمین چونکــەمردن بــەو ســەدایە، بــێ یــەقین (٤٣٥١)
وەختی وەی هات من لەڕێی حەیدەر بڕۆم موڵــک بگــرم یــا لــەگیانم دەس بشــۆم (٤٣٥٢)
ڕاپــەڕی بــانگی دەکــرد، ئــەی ســەروەرە حــازرم مــن، تــۆ ئەگــەر مــەردی وەرە (٤٣٥٣)
ئەو تەلەسمەی وردو خاش کرد دەنگی وی بۆی ڕژا جا، جوور بەجوور،زێڕ سەر زەوی (٤٣٥٤)
هێنــدەزۆری بــۆ ڕژا بــوو زێــر، لــەوێ ترسی وەی بوو ڕێی نەبێ تا دەر کەوێ (٤٣٥٥)
جا لەجێی خۆی ڕادەبوو ئەو خۆش نەزەر تــا ســەحەر هــەر زێــڕی ئــەو کێشــاوەدەر (٤٣٥٦)
زێڕەکــانی زوو لــەبن خــاک ڕۆ دەکــرد ئــەو چەلــەش تۆربــەو جــەواڵی بــۆ دەبــرد (٤٣٥٧)
گــەنجی زۆری دا دەنــا ئــەو گیــان فیــدا کــوێر ببــێ بــا ترســەنۆکی بــەد ئــەدا (٤٣٥٨)

---

[1]- زۆر لەمێژ ساڵەغولامی دەنگی وی (مصرع اول)

زێــــڕی زاهیــــر هاتەفـــەهمی ئەوکەســـە کوێر دڵەهـەم زێـڕ پەرەسـتە، هـەم خەسـە (٤٣٥٩)
چـاو منـاڵ دڵیـان بەقاشـوول کـرد خـۆش هـەر بـەنێوی زێـڕ دەیـان کـردن، لـەکۆش (٤٣٦٠)
گەربڵـــەی زێڕ،تـــۆ لـــەنێو بـــازی منـــاڵ غـەیری قاشـوولانی خـۆی ناکـا خـەیاڵ (٤٣٦١)
بـــوو مـــەڕامم زێــــڕی زەربــــی کردگـــار کـۆن کـەناکا، تـا ئەبـەد، ئـەو ڕۆژگـار (٤١٦٢)
زێڕەکــی وایەکەگشـــت زێــــڕی جیهـــان بــەو دەبــوون تابـان و ڕوونـاک وجـوان (٤٣٦٣)
زێڕەکـــــی وایــــــەدەکاتن دڵ غــــــەنی ئـەو لـەمانگ بـاڵا تـرە، بـۆ ڕەو شـەنی (٤٣٦٤)
شـــەمع بـــوو ئـــەو مەســـجیدە، بڕوانەئـــەو خـۆی دەسـووتاند هـەر وەکـوو پەروانەئـەو (٤٣٦٥)
چـــا دەبوولـــەنوێوە، پـــاش ســـووتانی پـــەڕ بـۆی دەبـوو ئـەو سـووتمانی، خـۆش فـەڕ (٤٣٦٦)
هـەر وەکـوو مووسـا دەچـوو، ئـەو بـەختیار ئـــــاگرێکی دی،کەدیتـــــەدەر، لـــــەدار (٤٣٦٧)
چونکەشـــامیل وی بـــوو، لـــوتفی کردگـــار بـۆی بـەنوور گـۆڕا، ئـەوەی دیتـی بـەنار[١] (٤٣٦٨)
مەردی حەققت دی ئەگەر تۆ ئەی جەوان لـەو دەبینـی نـاری ئینسـان بـێ گومـان (٤٣٦٩)
تـۆ لـەخۆت، کـردت قییـاس، خـۆ، وانییـە نـارو خـارو زەننـی بـەد، لـەو دا نییـە (٤٣٧٠)
ڕوونەئەو وەک، داری مووسای کێوی توور تـۆ بـەوی ئـاگر مـەڵێ، بـەو بێژەنـوور (٤٣٧١)
تـــەرکی دونیـــا دیتەبـــەرچاوان، بـــەنار سالیکان نووریـان دەدی، نـەک نـار، چ جـار (٤٣٧٢)
شــەمعی دیــن دەڕوا لــەبۆ ژوور دەمدەمــە شـەمعی نـار بـۆ مـەحو،دەڕوا کەمکەمـە[٢] (٤٣٧٣)
شـــەمعی نـــار ئـــاگر لـــەیاران بـــەر دەدا شـەمعی دیـن بـۆ زائیـران، نـوور، بـەر دەدا (٤٣٧٤)
شـەمعی نـار سـوو تێنـەرە، بـۆ گیـان و مـاڵ شـەمعی دیـن دڵ ڕوونکـەرە، وەختـی ویسـاڵ (٤٣٧٥)
شـەمعی دیـن نوورێکـەپاک و دوور لەغـەش نوورەبـۆ یـار، بـۆ عـەدوو، ئـەو نـاری گـەش (٤٣٧٦)

**گەیشتنی ئەو عاشقە بە سەدری جیهان ...**

گەییـــەیاری خـــۆی بوخـــارائی لـــەجۆش عیشقی وی بۆی کرد ڕەنج، ئاسان و خۆش (٤٣٧٧)
ئـــاهی گـــەرمی وی دەچـــوو بـــۆ ئاســـمان میهـری هاتـەنێو دڵـی، سـەدری جیهـان (٤٣٧٨)
یەکسەحەردەیکوت ئەرێ ئەی‌خوای لەسەر چۆنـــەحاڵی وەی، لـــەبۆ ن بوودەربـــەدەر؟ (٤٣٧٩)
ئـــەو گونـــاهی کـــردو دیتمـــان خـــۆ، بـــەڵام ڕەحمـی ئێمـەی ئـەو نـەدی بۆ خـاس وعـام (٤٣٨٠)
قـــەلبی مـــوجریم ترســـی زۆر لێمـــان هـــەبوو گــەر چــی تێیــدابوو گــەلێک زۆر ئــارەزوو (٤٣٨١)

[١]- نوور بوو خۆ، ئەو هەی کەدیتی ئەو بەنار(مصرع دوم)
[٢]- شەمعی نار بۆ نیست ، دەڕوا کەمکەمە(مصرع دوم)

بێ حەیا تەهدیددەکەم هەرچەن هەبن     بۆ بترسێنم ئەوەی ترسا لەمن (٤٣٨٢)
مەنجەڵی سار، دا دەنێنەبانی نار     نەک ئەوەی کە، واکوڵی لێی هاتەخوار (٤٣٨٣)
من دەترسێنم ئەوەی مەغروور بەعیلم     لادەبەم ترسم لەخائیف من، بەحیلم (٤٣٨٤)
من پنووی هەر شت لەجێی خۆی لێدەدەم     من بەهەر کەس شەربەتی خۆی وێدەدەم (٤٣٨٥)
ڕازی ئینسان هەر وەکوو ڕیشەی درەخت     شین دەبێ بەرگ و گەڵا، لەو داری سەخت (٤٣٨٦)
لایقی ئەو ڕیشەدەر دێن بەرگ و بار     هەر وەهالەن خۆ نفووس و عەقڵ و دار (٤٣٨٧)
زۆر بڵیند بوو تا فەلەک داری وەفا[1]     ڕیشەکەی سابیت، لکی وی نێو سەما (٤٣٨٨)
گەر بەعیشق لێی شین دەبێ باڵ، ئاسمان     بۆچی لێی نەڕوێ، دڵی سەدری جیهان (٤٣٨٩)
نێو دڵی وی عەفوی وی مەو جێی دەدا     ڕێ لەدڵ بۆ دڵ هەیە، ئەی خۆش ئەدا (٤٣٩٠)
ڕێ لەدڵ بۆدڵ هەیەچون بێ گومان     نەک وەکوو دوو تەن، کەلێکتر زۆر جودان (٤٣٩١)
گەرچی لای یەک بوون، جودا بوون دوو چرا     نووری وان ئەمما دەگەڵ یەک لێک درا[3] (٤٣٩٢)
وەسڵی یاری، ئەو دەمەی عاشق، دەوێ[4]     گەرکو مەعشووق،کۆ بەکۆ، وەدوای کەوێ (٤٣٩٣)
عیشق ئەمما جیسمی عاشق کز دەکا     جیسمی مەعشووق جوان، وەکوو ما مز دەکا (٤٣٩٤)
گەر دڵێک تێداهەبێ، عیشقی کەسێ     لەو دڵەی دیش ناری عیشقی دایسێ (٤٣٩٥)
گەر دڵت تێدا هەبێ عیشقی خودا     بێ گومان لای خۆی خودا،جێی پێدەدا (٤٣٩٦)
تاقەدەستێک نایەلەو دەنگ، خۆ، چ کات     تا کو دەستی دیکەبەو کۆمەک نەکات (٤٣٩٧)
ئاودەکا داوا ئەوەی تینوویەزۆر     بانگ دەکا ئاو، کوا ئەوەی بوو ئا وخۆر؟ (٤٣٩٨)
جەزبی ئاوە، ئێمەگەر تینوو دەبین     ئا و لەئێمە، هەر وەها ئێمەش لەوین (٤٣٩٩)
وا موقەددەربوولەلایەن کردگار     ئێمەبۆ یەکتر ببینەدۆست و یار (٤٤٠٠)
ئەو جیهانەی خوا هەموو جووت چا دەکرد     جا هەموو جووت، جووتی خۆی داوا دەکرد (٤٤٠١)

---

[1]- نێو فەلەک داری وەفا کردی سەما (مصرع اول)

[3]- نووری وان تێکەڵ بەیەک بوو ن، ئەی برا (مصرع دوم)

[4]- عاشق ئەو دەم وەسڵی یاری خۆی دەوێ (مصرع اول)

تــالبی جــووتن هەمووئــەجزای جیهــان — ڕاس بەچەشــنی کارەبــاو، کــا، وان، ئــەوان (٤٤٠٢)
ئاســمان بێــژێ بەعــەردی مەرحــەبا — ئێمــەدوو وەک ئاســن و ئاهــەن ڕوبــا (٤٤٠٣)
لای عــەقڵ ژن بــو و زەوی، ئاســمانەمەرد — چــی ســەما نــاردی بــەخێوی کــرد عــەرد (٤٤٠٤)
گــەر نــەما گــەرمای، دەدا گــەرما بــەوی — ئاو دەنێرێ گــەر کــو نــەی مــا، نــەم، زەوی (٤٤٠٥)
بــورجی خــاکی کۆمــەکی خــاکی زەوی — بــورجی ئــاوێ، دای تــەڕایی خــۆی بــەوی (٤٤٠٦)
بــورجی بــا، هــەو ران لــەبۆ لای وی دەبــا — تــا وەلا بــاتن، بوخــاری ڕەنــج زا (٤٤٠٧)
بــورجی ئــاگر دای بــەڕۆژی ڕوون تــین — پشــت و ڕووی وی چەشــنی تــاوەی ئــاگرین (٤٤٠٨)
بوون بەسەرگەردان ئەفلا ک،دەوری عــەرد — وەک لــەبۆژن دەوری کەســب وکــار مــەرد (٤٤٠٩)
کــار دەکــا عــەرد، هــەر وەکوو، خانمــانی مــاڵ — هــەم دەزێ، هــەم شــیری دەخــوا، لــەو، منــاڵ (٤٤١٠)
هــەر دوو وشــیارن، زەمــین و ئاســمان — چــون ئــەوی وشــیار دەکــا، دەیکــەن ئــەوان (٤٤١١)
گــەر نــەبینن ئــەو دوو، خۆشــی هەمســەری — بۆچی وەک زەوج دەچنــەباوەش یــەکتری؟[1] (٤٤١٢)
بێ زەمــین چــۆن گــوڵ دەبێــت و ئەرغــەوان — چــین وەدەس دێــتن لــەئاوی ئاســمان؟[2] (٤٤١٣)
بۆیەمــەیلیان بــوو بەیــەکتر نێــر و مــێ — تــاکو کــاری وان، زۆر تــەکمیل بــێ (٤٤١٤)
مــەیلی دانــا حــەق لــەنێو پیــاوو ژنــان — بــەر قــەرار بێ تــا کــو بــەو مەیلــە، جیهــان (٤٤١٥)
مــەیلی بــەینی کــوللی ئــەجزا دا دەنــا — تــا نــەبێ دونیــا لــەبێ مــەیلی فــەنا (٤٤١٦)
شــەو دەگــەڵ ڕۆژ موختــەلیف بــوون زاهیــری — موتتــەفیق بــوون، وان لــەباوەش یــەکتری (٤٤١٧)
ڕۆژو شــەو زاهیــر دەبــوون، دوژمــن بــەڵام — هەر دووان بۆیەک حەقیقەت بوون غــوڵام[3] (٤٤١٨)
هــەردوو یــەکتر یــان دەویست وەک خــزم و یــار — تــا تــەواو کــەن هــەر دوو بــۆ خــۆ، کــارو بــار (٤٤١٩)
شــەو نــەبێ ئینســان، تــەوان، چــۆن کــۆ، بکــا؟[4] — تــا بــەڕۆژ ئــەو ســەرفی کــاری خــۆ، بکــا (٤٤٢٠)

---

[1]- گەر کونابەن لێک لەززەت ئەو دووە    بۆچی یەکتریان لەباوەش گرتووە

[2]- چین دەبێ حاسڵ لەئاوی ئاسمان؟(مصرع دوم)

[3]- ڕۆژو شەو زاهیر دەبوون وەک دوژ منان    یەک حەقیقەت بوو بەڵام مەقسوودی وان

[4]- گەر نەبێ شەو ، نیرو و ئەو چۆن ، کۆ بکا؟ (مصرع اول)

**جەزبی هەر عونسورێک جینسی خۆی کە لە تەرکیبی ئادەمی دا دەگەڵ غەیری جینسی خۆی زیندانییە...**

خـاک دەڵـێ تـۆ بێـرەوە، ئـەی خـاکی تـەن | بێرەلامـــان، وێلکـــەتۆ گیـــان و بـــەدەن (٤٢١ ،٤
جینســـی ئێمـــەی، بێـــرەوەلان، تـــۆ بـــەتاو | تـــا نـــەبی چیـــدی لەتـــەن دا، تـــەڕ، بـــەئاو[1] (٤٢٢ ،٤
پێیـــدەڵێ وایەبـــەڵام پـــێ بەســـــتەمە | گـەرچی وەک تۆ، من لـەهیجرا ن خەستەمە (٤٢٣ ،٤
بـــانگی ئـــاوی تـــەن دەکـــا ئـــاوی زەوی | بێرەلامـــان تـــا لەغوربـــەت دەر کـــەوی (٤٢٤ ،٤
ئـاگریش گـەرما دەکـا گـاز، بـەو دەڵـێ | نارەئەســڵت ڕوو بـــەرەو ئەســڵت هـــەڵێ (٤٢٥ ،٤
بێژمـــار عیللـــەت لـــەنێو تـــەن دا دەبـــێ | ئیختیلافـــــی عونســـــورانە، وا دەبـــــێ (٤٢٦ ،٤
دێ نەخۆشـی تـا بـەدەن لـەت لـەت بکـات | تـــا نـــەبینن عونســـوران یـــەکتر، چ کـــات (٤٢٧ ،٤
چـوار تـــەیرن ئـــەو عەناســـیر، بەســـتەپێن | واز دەبـــێ پێ،مـــەرگ و دەرد وڕەنج،کـــەبێن (٤٢٨ ،٤
گەرکوبەنـــدی لاقـــی وانیـــان هـــەڵبڕی | تـەیری هـەر عونسـور، لـەوێ، زوو هـەڵفڕی[2] (٤٢٩ ،٤
چون دەکێشێ ئەسڵ، فەرعی خۆی بەجۆش | هاتەجیســـمی ئێمـــەدەردو، بـــوو نـــەخۆش (٤٣٠ ،٤
تێـک دەچـێ تـەرکیبی ئەجزاکەمکەمـــە | دەچنـــەوەلای ئەســـڵی خـــۆ یـــان دەمدەمـــە (٤٣١ ،٤
حیکمـەتی حـەق نیتـی بـۆ تـەخریب عەجـەل | ســـاغ و ســـالمیان دەکـــا، تـــا دێ ئەجـــەل (٤٣٢ ،٤
حـــەق دەڵـــێ نادیارەئـــەی ئـــەجزا، ئەجـــەل | لێک مـەدەن باڵ، پێش ئەجـەل نـەو بێ عەجـەل (٤٣٣ ،٤
گـــەر هـــەموو ئـــەجزادەیان وێ ئیرتیفـــاق | چۆنەئـــەو گیانـــەی غـــەریبی نێـــو فیـــراق (٤٣٤ ،٤

**جەزب بوونی گیانی عالەمی ئەرواح و تەقازا و ئارەزووی وی بۆ جێگای خۆی و مونقەتیع بوون لەئەجزای ئەجسام کەلەڕووح جودابوونە...**

ڕووح بەئـــەجزای پەســـتی خـــاکی وا دەڵـــێ | مـــن غـــەریبتر، جـــێم عـــەرش بـــوو، ئـــەووەڵێ (٤٣٥ ،٤
ئـــاوی جـــاری و ســـەو زەزاری، تـــەن دەوێ | چونکەئەســـڵ و ڕیشـــەکەی وی هـــات لـــەوێ (٤٣٦ ،٤
ژینـی جاویـدان و حـەی، ویسـت بۆیـەگیان | چوونکەئەســـڵی وی بووگیـــانی لا مـــەکان (٤٣٧ ،٤
گیـان لەحیکمـەت هـەم علـوومی کرد،حـەز | تـــەن لەســـەو زەو بێســـتان و بـــاغی ڕەز (٤٣٨ ،٤
ئـارەزووی گیـان بـوو تـەڕەققی هـەم شـەڕەف | ئـارەزووی تەن،کەسـب و ئەسـبابی عەلـەف (٤٣٩ ،٤

---

[1]- تا نەبی چیدی لەتەن، تۆ تەڕ ، بەئاو (مصرع دوم)

[2]- گەر کوپێی وانیان لەیەکتر واز کرد تەیری هەر عونسور لەوێی پەرواز کرد

مـەیل و عیشـقی بـوو خـودا بـۆ لای گیـان — جـا،(یحـب ) هـەم (یحبـون ) تـۆ بـزان (٤٤٤٠)
شـەرحی ئـەو باسـەتەواو کـەم، وا دەبـێ — مەسـنەوی ئـەو دەم بـەتا، هەشـتا دەبـێ (٤٤٤١)
جـا خولاسـە، ئـەو کەسـەی تالیـب دەبـێ — گیـانی مـەتلووبیش بـەوی ڕاغیـب د ەبـێ (٤٤٤٢)
ئـا دەمـی و حـەیوان، نـەباتی هـەم جـەماد — گشـت مـورادان، عاشـقن بـۆ بـێ مـوراد (٤٤٤٣)
هـەر وەکـوو عاشـق بەمەعشـووق تالیبـە — هـەر وەهـاش مەعشـووق بەعاشـق ڕاغیبـە (٤٤٤٤)
مـەیلی عاشـق خـۆ بـەلام لاواز دەکـا — مـەیلی مەعشووق، جوان دەکا، خۆش واز دەکا (٤٤٤٥)
عیشقی مەعشووق سوور دەکا، ڕوو،وەک هـەنار — عیشـقی عاشـق گیـان دەبـا بـۆ نێـو نـار (٤٤٤٦)
عاشـــقێکی بـــێ نیبازە،کارەبـــا — تـەی دەکـا ڕێگـای درێـژ لـەو بارە،کـا (٤٤٤٧)
وێـڵ کەئەوهـە، بێژەعیشـقی ئـەو و ەکیـل — چـۆن دڵـی سـەدری جیهـانی کـرد زەلیـل؟ (٤٤٤٨)
دوو کـەڵی عیشـق و غـەمی ئـەو جێگـەنار — میهرەبـانی کـرد دڵـی ئـەو نامـدار (٤٤٤٩)
خـۆ بـەلام چـون بووگـەلێک ئـەو باویقـار — نەیدەپرسـی لـەو وەکیلـی دەر دەدار (٤٤٥٠)
مـایلی ڕەحمـەت، بەئـەو بێچـارەبوو — گـەو ڕەیـی وی، مـانعی ئـەو کـارەبوو (٤٤٥١)
مـا عەجـەب لـەو کارەعـەقڵ و فکـرو بیـر — کامـەجازب بـوو، وەکیـل یـاخێر، ئـەمیر؟ (٤٤٥٢)
لـەو مـەڵێ تـۆ، چونکـەتۆ نـاواقفی — چونکەهـەر ( اللّـەاعلم بـا لخفـی )[1] (٤٤٥٣)
ئـەو وتـارەمن لـەژێر خـاک ڕا دەکـەم — مـن بڵـەم چی؟کـاری خوایـەوا دەکـەم (٤٤٥٤)
کـێ دەکـا مـەنعت کـەبێژی وا وتـار؟ — ئـەو کەسـەی کـە، نـا یـەڵێ وەی کـەیت زار (٤٤٥٥)
تۆدەکـەی قەسـتی سـە فـەر زۆر جار،جـا — ئـەو بـەلام دێ،تـۆ لـەبۆ جێـی دی دەبـا (٤٤٥٦)
سـوار دەسـووڕێنێ بەهەرلایـەک، لغـاو — تـا خەبـەر دار بێ لەسوار کار، ئەسپی خـاو (٤٤٥٧)
ئەسـپی هوشـیار بۆیـەخۆش ڕەفتارەئـەو — چـون دەزانێـتن کەسـواری سـوارەئەو (٤٤٥٨)
نێـو دڵـت ئـەو ئـارەزووی زۆر دادەنـا — ئـەو دڵـی دەشـکاندی گشـتی لا دەنـا (٤٤٥٩)
ئەوشـکاندی بـاڵی ئـەووەڵ فکروبیـر — چۆن قەبووڵ ناکەی ئەدی ئەو خوای قـەدیر (٤٤٦٠)
گـەر پسـاندی حـەبلی تـەدبیرت قـەزا — بـۆ دەبـێ بـاوەڕ نـەکـەی حـوکمی خـودا؟ (٤٤٦١)

---

[1]- لەو مەڵێ تۆ چونکەنیتە، هیچ خەبەر عالمی ئەسرار ، فەقەت هەر خوای لەسەر

**تێک دانی عەزم و تەسمیم و ئیرادان بەو خاترەکەئینسان بزانێ کەمالیک و قاهیر هەر خودایەوجار جاریش تێک نەدان و بەجێ هینانی ئەو عەزم و تەسمیم و ئیرادانە، تا دوو بارەتەسمیم بگرێتەوە، و ئەو چەلەش خودا لێی تێک بدا تا زیاتر وشیار بێتەوە...**

عــەزم و قەســتی تــۆ، لــەبۆ ئــەنجامی کــار دێتـــەجێ، ئـــەمما نـــەدائیم، جـــارو بـــار (۴۴۶۲)

تــا دڵــت نییــەت بکــاتن ئــەو هەڵــەش نییــەتی تــۆ تێــک بدا،حــەق ئــەو چەڵــەش (۴۴۶۳)

گەرلـەتۆ تێک دات گشت عـەزم و عەمـەل کـەی دەچێنـی تـۆ لـەدڵ، تـۆوی ئەمـەل؟ (۴۴۶۴)

تێـک نـەدا گـەر ئـارەزووت قـەت کردگـار باوەڕیـت نـابێ شکەسـتی خـۆ ت، چ جـار (۴۴۶۵)

عاشـــقان چـــون قـــەت نەگەینـــەئارەزوو بـوون لەمــەو لای خـۆ خەبــەردار، والــەزوو (۴۴۶۶)

نـا مـورادی بـۆ بەهەشـت پـێش هەنگـەخۆ ( حفـــت الجنـــه) ببیســـە، جـــا ئـــەتۆ (۴۴۶۷)

زۆر کــەڕەت دەشـکی لەمەقسـوودا ن، پــێ کـوا ئەوەی،گشـت ئـارەزووی وی هاتـەجێ؟ (۴۴۶۸)

چەشـنی پێـی عاشـق شـکا، پێـی سـادقان زۆرەفـــەڕقی پـــێ شـــکانی عاشـــقان (۴۴۶۹)

عـــاقڵان پێـــی لـــێ شـــکاندن ئیزتیـــرار عاشـــقان پێـــی لـــێ شـــکاندن، ئیختییـــار (۴۴۷۰)

عـــاقڵان بـــۆ بەنـــدەگی کەوتووەنەبەنـــد عاشـقان بـۆ بەنـدەگی وەک شـەکر و قەنـد (۴۴۷۱)

(ایتیـــا کرهـــا )مـــەهاری عـــاقڵان (ایتیـــا طوعـــا ) بـــەهاری بـــێ دڵان (۴۴۷۲)

**تەماشا کردنی پێغەمبەر (ص ) لەئەسیران وبزەهاتنی وی کە(عجبت من قوم یجرون الی الجنەبالسلاسل والاغلال )...**

**خولاسەی داستان ...**

پێغەمبـەر(ص) دەستەیەکی لەئەسـیران کەبەدەسـت بەسـتراوی دەیـان بـردن تەماشـا دەکـرد وبزەی هـاتێ، ئەسیرەکان سـەبرۆکەبەیەکتریان دەکوت.. ئەوەچ جـوور پێغەمبەرێکەکەبەئەسیر بوونی ئێمەشاد دەبێ؟ وبۆچی دەمان کوژێ؟ ولەو جوورەقسانەدەیان کوت و مەخفییانەلەکاری موسـەڵمانان ئیرادیـان دەگـرت، پێغەمبـەر(ص ) بەعینایـەت و لـوتفی خـودا وعیلمـی غـەیب، قسـەکانی وانـی بیسـت، وڕووی لـەوان کـرد وفـەرمووی.. بـزەی مـن بـزەی فاتیحانەنییەبەڵکەم بۆیەبزەم دێتێ چونکەئێوەلەتاریکایی گومڕاهی بۆ لای ڕووناکی هیدایەت ڕا دەکێشم ...

یــەک گرووهــی دی ئەســیر ســالاری دیــن وەختــی بــردن،دێ لــەوان هــاوار و شــین (۴۴۷۳)

دی لــەزەنجیر دان،ئەسـیران، سـەر نــەوی جــا لــەژێر چــاوان دەیــان نــۆڕی لــەوی (۴۴۷۴)

هێنــدەزۆریان ڕق هــەبوو لــەو خــۆش نێــو ... توند دەیان گەست ئەو دەمی هەر دووک لێو (٤٤٧٥)
هــیچ نــەیان بووقــودرەتی گوفتــار ئــەوان ... بەســـترابوون چـــون بـــەزەنجیری گـــران (٤٤٧٦)
تونـد دەیـان بـردن ئـەوان، زۆر زۆر بـەکین ... لـــەو ولاتـــی کـــوفر، بـــۆلای موســـلیمین (٤٤٧٧)
نـــاگری ئـــەو هـــیچ زێـــڕ و فیدیـــە، لـــێن ... بـۆ شـەفاعەت هـیچ کەسـانێک نـین، کـەبێن (٤٤٧٨)
ڕەحمـــەتی عالـــەم دەبێـــژن بـــەو بـــەلام ... لـەت دەکـا، دەبـڕێ، لەعالـەم، سـەر، بـەعام (٤٤٧٩)
ڕێ دەچـــوون و،بـــوو لـــەدڵیان ئینزیجـــار ... تەعنـەیان دا، جـا، لەشـا، ژێـر لێـو هـەزار (٤٤٨٠)
زینـــدەکردن چـــارە، لێـــرەوا نییـــە ... دڵ ڕەقەئـــەو شەخســـە، ڕەحمـــی لا نییـــە (٤٤٨١)
ئێمـەزۆرین چەشـنی شـێرین، سـاغ بـەحال ... بووین ئەسیر بۆ عیددەیەک، ڕووت و ڕەجاڵ[1] (٤٤٨٢)
چی سـەبەب بـوو ئێمـەوابووین، سـەر نـەوی؟ ... تـالعی بـەد، سـیحر، یـاخێر کـەج ڕەوی؟ (٤٤٨٣)
بـەختی ئێمـەی چـۆن دەگـۆڕی بـەختی وی ... تـەختی ئێمـەی کـرد سـەرەو بن، تـەختی وی (٤٤٨٤)
گـــەر بـــەجادوو کـــاری وی وا چـــادەبوو ... کردمـــان جـــادوو، ئـــەدی کـــوا دەبـــوو؟ (٤٤٨٥)

**تەفسیری ئەو ئایەتە، کە(ان تستفتحوا فقدجائکم الفتح ) تاعینان دەیان کوت کەئێمەیا موحەممەد کێهەمان بەر حەق بین یارمەتی بدەوپیرۆزی بکە، وبۆیەئەو تان دەکوت تا وا خەیاڵ بکرێت کەئێوەبێ غەرەز تالبی حەققن، ئێستا موحەممەد مان یارمەتی دا وپیرۆز مان کرد تا ئێوەساحەبی حەق ببینن ...**

لـــەو خودایەهـــەم بوتـــان داوادەکـــەین ... گـەر نـەبین ڕاس، تـۆ بـەرە، ئێمەلەبـەین (٤٤٨٦)
کێهەحـــەق بـــێ، جـــا لەئێمـــەیا لـــەوی ... سـەر بڵینـدی کـە، ئـەوی دیش سـەر نـەوی (٤٤٨٧)
سـەجدەمان زۆر بـرد و کـرد ن زۆر دوعـا ... ئێمـــەلای لات و مـــەنات و، لای عـــوزا (٤٤٨٨)
ئـەو کەحـەق بـێ تـۆ ئـەوی ئاشـکار کـە ... گـەر نـەبێ حـەق ئـەو تـۆ تـارو مـار کـە (٤٤٨٩)
چونکـــەدیمان ئێمـــە، ئـــەو مەنســـووربوو ... ئێمـەتاریک بـووین، بـەلام ئـەو نـوور بـوو (٤٤٩٠)
جـــوابی ئێوەئـــەو هـــەبوو گـــەر عـــاقڵن ... بـوو عـەیان ئـەو حەققـە، ئێـوەش بـاتڵن (٤٤٩١)
جـارەکی دیکـەش دەیـان کـرد زۆر تـەلاش ... فکری بەر حەق بوونی وی کەن وردو خاش (٤٤٩٢)
چونکەشـــــانس و تـــــالعی ئێمەبـــــەدە ... ئێمـەلامان وابـوو، بـەر حـەق، ئەحمـەدە (٤٤٩٣)
غـاڵبیش بـێ گـەر لەسـەر مـان جـارو بـار ... بۆیەوایـــــە، کـــــاری وایـــــە، ڕۆژگـــــار (٤٤٩٤)
جـارو بـاریش ئێمەشانســن هاتــەدە ســت ... جـارو بـاریش ئێمەئـەو مـان دا شکەسـت (٤٤٩٥)

---

[1]- بووین ئەسیر بۆ عیددەیەک ، ماون ، بەحاڵ (مصرع دوم)

جار دەیان کوت گەرچی ئەومان دا شکەست ئەو شکەستی وی نەبوو وەک ئێمەپەست (۴۴۹۶)

چونکەشانسی باشی وی کاتی شکەست شادمانی زۆری، پنهان دایەدەست (۴۴۹۷)

چون شکەستی وی نەبووهیچ وەک شکەست غەم لەلای وی،باری خۆی ئەودەم دەبەست (۴۴۹۸)

خۆ بەلای زۆرن نیشانەی موئمینان دەو بەلایان دایە، سوودی زۆر نیهان (۴۴۹۹)

گەر ئەتۆ بشکێنی عوود و عەنبەری تۆ دەکەی بۆن خۆش، هەموو دەورو بەری (۴۵۰۰)

گەر تۆ بشکێنی لەناکاو تەرسەکەر بۆگەنیو دەگرێ مەحەللەو دەورو بەر (۴۵۰۱)

هاتنەوەگەر لەو حودەیبییە، بەشین دای بەوان ( انا فتحنا ) پێکەنین (۴۵۰۲)

**ڕازی نا مراد گەڕانەوەی ڕەسوولی خودا،(ص)لەحودەیبییەکەخودا وەند لەقەبی فەتحی پێدا، کە،( انا فتحنا ) کەبەسووڕەت و زاهیر (غلق) و لەباتین دا (فتح ) بوو .. وەک شکاندنی عەنبەر کەبەزاهیر شکاندنە، بەڵام لەباتین و مەعنا دا،دروست کردن وتەکمیل کردنی فەوایدی وییە...**

وای خودا پەیغام بەئەحمەد دا، بڕۆ لەو شکەستەش هیچ مەبە غەمگین، ئەتۆ (۴۵۰۳)

چونکەفەتحی زۆری تێدا، خواری وا زۆر قەڵایانت دەداتێ کاری وا (۴۵۰۴)

گەر گەڕاوە،چاو،کەچۆنی کرد ئەسیر ئەو قورەیزە، پێش ئەو یش قەومی نەزیر[1] (۴۵۰۵)

هەم قەڵایان هەم هەچی بوو یان زەمین بۆ غەنیمەت، بوو بەموڵکی موسلیمین (۴۵۰۶)

شاد نابن سەر کەون گەر ئەو فەریق چەشنی عارف پڕ غەم و مات و عەشیق[2] (۴۵۰۷)

ژەهری خواری هەر وەکوو شەکراو دەخۆن خاری غەم بۆ وان، بەچەشنی نان و ڕۆن (۴۵۰۸)

غەم دەخۆن بۆ غەم، نە، تا، بن، شادمان چوون لەبۆ جێی پەس، لەلای وان، پللەکان[3] (۴۵۰۹)

خۆ دەبینن وا، لەژێر بیر، خوشبەخت وەک دەترسێن بێ لەبۆیا ن تاج و تەخت (۴۵۱۰)

گەر لەهەرجێ دڵبەرت بێ هەمنشین فەو قی ئەفلاکەئەوێ، نەک ژێر زەمین (۴۵۱۱)

**تەفسیری ئەو حەدیسەکەموستەفا(ص) فەرمووی (لاتفضلونی علی یونس بن متی ) ..**

وای نەبی کوت تۆ لەلات چاتر نەبی[1] ئەو عرووجەی من لەئی یونس نەبی (۴۵۱۲)

---

[1]- چاو،کەچی کردگەر گەڕاوەلەو سەفەر چۆن قورەیزەی وەک نەزیر کرد، دەر بەدەر

[2]- چەشنی عارف ، مات و بێ دەنگ و عەشیق (مصرع دوم)

[3]- غەم د ەخۆن بۆ غەم نەوەک بن شادمان خۆ بەکەم زانین لەلای وان نەر دەوان

من لەبۆ سەر چووم و ئەو چوو بۆ خووار — چونکەبێ ئەژ مارەقوربی کردگار (٤٥١٣)
قوربی حەق کوا، چوونەبالا و پەستییە؟ — قوربی حەق دەرچوون لەحەپسی هەستییە (٤٥١٥)
بۆ فەنا فی اللە، ژێر و ژوور نییە — بۆ فەنا فی اللە، درەنگ و دوور نییە (٤٥١٥)
کار گاو وگەنجی خودا نێو نیستییە — کوا دەزانی تۆ کەهەی، نیستی چییە؟ (٤٥١٦)
گەر لەبۆ وان دێت، جارو بار شکەست — وەک شکەستی ئێمەناکا خوار و پەست (٤٥١٧)
هیندەشادن وەختی ئیدبارو تەلەف — چەشنی ئێمە، وەختی ئیقبال و شەرەف (٤٥١٨)
تەرکی دونیا مولکی باشە،گەر بدا — ئیفتیخارەفەقرەکی دەیدا خودا (٤٥١٩)
یەک کوتی گەر وەک دەلەی وایە، ئەدی — بۆ بزەی هات ئەوکەئێمەی بەستەدی؟ (٤٥٢٠)
ئەو کەدونیای نا وەپشت سەر نایەوێ — نایەوێ خۆشی لەدونیا دەس کەوێ (٤٥٢١)
بۆ شکەستی ئێمەئەو شاد وا دەکا؟ — بۆ لەشایان غەبغەبی پڕ با دەکا؟ (٤٥٢٢)
بۆیەشادەچونکەشێری دان شکەست — فەتح وپیرۆزی بەئاسان هاتەدەست (٤٥٢٣)
جا کەوایە، دیارە ئەو ئازاد نییە — غەیری دونیا ئەو بەهیچ، دلشاد نییە (٤٥٢٤)
چۆن دەنا دێ، ئەو بزەی،چون ئەهلی حەق — باش و بەد، لای وان، بەرەحمەت موستەحەق (٤٥٢٥)
بەحسی وان بوو ئەو وتارە، سەبر ونەرم — وەک ببێتەمەنعی گوفتار، ترس و شەرم (٤٥٢٦)
تا نەبیسن ئەو وتارەپاسەوان — جا ببیسێ پاشەوان، پاشای ئەوان (٤٥٢٧)

### ئاگاداربوونی پێغەمبەر(ص) لەتانەلێدانی وان لەوی ...

گەرچی نەی بیست پاسەوان هیچ ئەو وتار — خستیەنێو دوو گوێی پاشا، کردگار (٤٥٢٨)
بۆی کراسی یووسوفی، یاقووب لەدوور — کرد، نەیکرد ئەو کەسەی هینایە، ژوور (٤٥٢٩)
ئەوشەیاتینی لەدەوری ئاسمان — بێ خەبەر لەو ڕازو سیرڕی لەوح،مان (٤٥٣٠)
ئەو موحەممەد نوستبوو بێ دەرد و خەم — ڕاز لەدەوری وەک پەپوولان دەو ری شەم (٤٥٣١)
هەر چی هەلوای خوارد بەشی هەر وایەخۆ — کەس بەزۆری وقودرەتی بۆ نایەخۆ (٤٥٣٢)
نەجمی ساقیب پاسەوانی دێو برە — دز مەبە، فێر بەلەئەحمەد ئەو سورە (٤٥٣٣)
ئەی ئەوەی ڕووت کردەدووکان، هەر شەفەق — ڕووکەمەسجید، بت هەوێ، ڕزقت لەحەق (٤٥٣٤)

---

١- وایدەکوت ئەحمەد، لەلات چاتر نەبی (مصرع اول)

گفتــی وانــی بیســت کــوتی جــا، شــەهریار  لــەو بــزە، مــن نــەمبوو قەســتی کــارزار (۴۵۳۵)
چــون ئــەوان مردوونەپووســیدەی فــەنان  مەرد،کــەناکووژێت مــردوو، هــیچ زەمــان[1] (۴۵۳۶)
چین ئەوانە؟[2] مـن کەشـەڕ کەم گەڵ هەوی  هـەر بـەقامکێک مـن دەکـەم دوولـەت ئـەوی (۴۵۳۷)
ئــەو دەمــەی کــە، ئێوەئــازاد بــوون و میــر  چەشـنی ئێسـتابوو ن بــەچاوی مــن ئەسـیر (۴۵۳۸)
ئــەی ئــەوەی لا ت فــەخرەموڵک و خانــەدان  وشــتری لای عــاقڵان، ســەر نــەر دەوان (۴۵۳۹)
چونکــەدیم مــن، تــەن کــەنابێ پایــەدار  چــی لــەوەی دوا، دێ، لــەبۆم بــوو ئاشــکار (۴۵۴۰)
چــاو لــەقۆرەی کــەم دەبیــنم مــەی، عــەیان  چــاو لەنیسـتی کـەم دەبیـنم، شـەی، عـەیان (۴۵۴۱)
چـاو لـەڕاز کـەم، مـن دەبیـنم یـەک جیهـان  پــێش ئــەوەی کــە، ئــادەم و حــەووا،ژیان (۴۵۴۲)
دیــم هــەمووتان وەختــی زەڕڕاتــی ئەلەســت  دەسـت و پـێ بەستەسـەرو بـن، زۆر بەپەسـت (۴۵۴۳)
ئاســمانم بــێ ســتوون دی ئــەو دەمــی[4]  وایەئێســـتاکەش بـــەبێ زیـــادی و کـــەمی (۴۵۴۴)
جــا هــەمووتانم ســەرو بــن مــن دەدی  پــێش ئــەوەی لــەو ئــاوو قــوڕ مــن بێمــەدی (۴۵۴۵)
نــوێم نــەدیوەتا کوشــاد بــم مــن بــەوی  قــودرەتی تــۆ بــوو، کەدەمــدین ســەر نــەوی (۴۵۴۶)
بەســتراوی قــەهری خــوان ئــەمما چ قــەهر  قەنـد و دەخـوارد نێوەکـەی بـوو پـڕ لـەژەهر (۴۵۴۷)
دوژمنــت بخــوا ئەگــەر قەنــدی بــەزار  کــوا دەبــی تــۆ، بــەو حەســوود و دەردەدار؟ (۴۵۴۸)
شــادمان ئــەو زارەتــان، کــرد ئێوەنــۆش  مــردنیش مــەخفی لــەئێوەی گــرت گــۆش (۴۵۴۹)
خـۆ لەبۆیـەم مـن نـەکرد جـەنگ وجیهـاد  تــا جیهــان بگــرم وەلانــێم، عــەدڵ و داد (۴۵۵۰)
ئــەو جیهانــەوەک کــەلاکی بۆگــەنیو  چــۆن کــەلاکی وا، دەداتــن مــن فریــو[6] (۴۵۵۱)
کــوا زەعیفــان قــەت ئــەمن ئیمحادەکــەم؟  مــن کەعیســام مــردووان ئیحیــا دەکــەم (۴۵۵۲)
مــن شــکاند م لەشــکری ئێوەبــەعام  تــا نــەجاتو دەم لەبــەد بــەختی تــەمام (۴۵۵۳)
خــۆ گــەرووی خــەڵکی لــەبۆ بــەنابڕم  تــا لــەدونیا کــەڕرو فــەڕ مــن دابــڕم (۴۵۵۴)

---

[1]- ناکوژن مەردان هیچ کات مردووان (مصرع دوم)

[2]- کێن ئەوانە؟ (مصرع اول)

**[4]- ئاسمانم چۆن دەدی من ئەو دەمی (مصرع اول)**

[6]- ئەو جیهانەوەک کەلاکێک زۆر نەجیس    بەو کەلاکەچۆن دەبێ، بم، من حەریس

بۆیــەدەبرم چــەن گــەروویان مــن هــەتا عالــەمێکی لــەو گەروویان،کــەم ڕەهــا[1] (۴٥٥٥)
چـــــون نــــــەفامن ئێوەبۆیەوادەکــــــەن وەک پــەپوولان خــۆ، بــەئاگر دا دەکــەن (۴٥٥٦)
مــــن وەکـــوو مەســـتان ئێـــوەڕادەدەم جـا بــەدوو دەســتان لــەنار تــان لادەدەم (۴٥٥٧)
کــاری خۆتــان گــەر بــەپیرۆزی نوانــد تـۆ وی نـەحس و نەکبـەتی خۆتـان دەچانـد (۴٥٥٨)
زۆر بەجیــددیتان دەکــرد یــەکتر ســەدا ئەسـپی خـۆو، لای ئـەژدیهایان، لینـگ دەدا (۴٥٥٩)
گرچـــی ئێـــوەزۆر لەئێمـــەو کـــرد قـــەهر خۆ بـەڵام ئێوەی شکەسـت دا، شێری دەهر (۴٥٦٠)

**بەیانی ئەو مەتڵەبەکەئینسانی تاغی وزاڵم دەعەینی قا هیرییەت دا مەقهوورەودەعـەینی پیرۆزیدا ئەسیرە...**

دەیـدزی، دز، زێـڕ لـەماڵی یـەک نەفـەر بــێ خەبــەر بــوو، پاســەوانی گەیەســەر (۴٥٦١)
گــەر هــەڵاتبا ئــەو دزەهــەر ئــەو زەمــان کـوا دەبـوو دەسـگیر بەدەسـتی پاسـەوان؟[2] (۴٥٦٢)
قــەهری دزبــوو گــەر دزی مــەقهوور کــرد قـەهری دزبـوو گـەر سـەری لـێ دوور کـرد (۴٥٦٣)
ئـەو شکەسـتەی سـاحەبی مـاڵ، بـوو بـەدام تــا دزی گــرت پاســەوان بــۆ ئینتیقــام (۴٥٦٤)
ئەی ئەوەی خەڵکت گەلێک جاردا شکەست تۆبەخوێنی خـەڵکی سوورت کرد دوودەست[3] (۴٥٦٥)
خــوا بەدەســتی تــۆ ئــەوانی دا شکەســت تـا مـەبادا تـۆش ببـی وا، خـوار و پەسـت (۴٥٦٦)
تـۆ مەکەتـەعقیب ئـەوەی پێـت دا شکەسـت تـا بـەزەنجیر ڕات بکێشـێ خـوار و پەسـت (۴٥٦٧)
هەرکەبــەو جــوورەی ئــەتۆی کێشــایەداو[4] بۆهجوومـــت دێـــن مـــەزڵوومان تـــەواو (۴٥٦٨)
چــۆن دەبــێ عاقــڵ لەفــەتحی والەشــاد؟ چونکەفـــەتحی والەتێیـــدا، زۆر فەســـاد (۴٥٦٩)
تیــژ دەبینــێ دوور دەبینێ،چــاوی عــەقڵ خــوا لــەچاوی وا، بــەکل، دەشکێنێ،شــەقڵ (۴٥٧٠)
دەیکوت ئەحمەد ئـەهلی جەننـەت بۆ فنوون نێــو عــەداوەت،خۆ دەدەن نیشــان زەبــوون (۴٥٧١)
ئیحتیێــات و ســووئی زەننــە، وا دەکــەن نــەک لەترســی مەعرەکــەو دەعــوا دەکــەن (۴٥٧٢)
ئیمتیـــازی بۆیـــەدا، ئـــەو بـــافنوون بیســـتبووی(لـولا ڕجـال مـو ءمنـوون ) (۴٥٧٣)

---

[1]- عالەمێکی دی، لەدەس وان،کەم ڕەها (مصرع دوم)
[2]- پاسەوانی کوا دەهینان پاسەوان؟ (مصرع دوم)
[3]- ئەی ئەوەی خەڵکت شکەست دا جوور بەجوور هەر دوو دەستت کرد بەخوێنی خەڵک، سوور
[4]- ئەو کە بەو جوورەی ئەتۆی کێشایەداو (مصرع اول)

حیفزی گیانی کافرانی دوورلەدین     بوو بەواجب، بۆ نەجاتی موئمینین (۴۵۷۴)
لەو حودەیبییەت خەبەر گەرکو هەبێت     (کف ایدیکم ) یەقین مەعلوو مەلێت (۴۵۷۵)
گەر چی دەیدی خۆی بەپیرۆز ئاشکار     خۆی دەدی یەخسیری داوی کردگار (۴۵۷۶)
من بزەم نایەت کەئێوەم کرد، ئەسیر     یا بەشەو کردم هەمووتان دەستگیر (۴۵۷۷)
من بزەم دێ چون بەزەنجیری دە، مەن     ڕا دەکێشم ئێوە بۆ باغ و چەمەن (۴۵۷۸)
زۆر عەجەب نێو ئاگری زۆر بێ قەرار     ئێوەدەس بەستەدەبەم،بۆ سەبزەزار (۴۵۷۹)
من لەدووزەختان بەزەنجیری گران     ڕا دەکێشم تا بەهەشتی جاویدان (۴۵۸۰)
لەو تەریقە،گشت موقەللید، باش و بەد     ڕادەکێشی دەست بەستە، لای ئەحەد (۴۵۸۱)
گشت لەنێو زەنجیری ترس و ئیبتیلا     ڕێ دەڕۆن لەو ڕێگەغەیری ئەولیا (۴۵۸۲)
زۆر بەوەحشەت ڕێ دەڕۆن لەو ڕێگەدا     غەیری ئاگادار بەئەسراڕی خودا (۴۵۸۳)
جەهد کە، تانووری تۆ تا بان بیێ     تا سلووک و خزمەتت ئاسان بیێ (۴۵۸۴)
تۆ دەبەی منداڵ لەبۆ مەکتەب بەزۆر     چونکەنەی دی سوود،چ کەم بێ،یا نەزۆر (۴۵۸۵)
گەر خەبەر دار بێ، لەبۆ مەکتەب دەچێ     شادوخەندان،دوور لەدەردو تەب، دەچێ (۴۵۸۶)
دەچتەمەکتەب، زۆر پەرێشان حاڵ، منداڵ     چون لەوێ بۆی پڕ نەبوو جیبێ بەتاڵ[1] (۴۵۸۷)
گەر لەکیسە، دەستموزدی دیت ئەو     شەو وەکوو دز دا دەنیشێ، دوورلەخەو (۴۵۸۸)
جەهدکە، تا بێ لەتاعەت، بۆت سوود     بۆ موتیعان تۆ دەبی، ئەو دەم حەسوود (۴۵۸۹)
بۆموقەللید(ایتیا کرها )دەهات     بۆ سەفا دڵ (ایتیا طوعا) خەڵات (۴۵۹۰)
ئەهلی تەقلید دەی هەوێ خوا، بۆ عەوەز     دڵ سەفا دەیوێ خوداوەند، بێ غەرەز (۴۵۹۱)
دایەنی منداڵ، دەوێ، بۆشیر بەس     واش دەبێ یەک، غەیری یار نای وێ، چ کەس (۴۵۹۲)
هیچ لەجوانی دایەنی، ئاگا نییە     چی لەدایەن غەیری شیر، دا وا نییە (۴۵۹۳)
یەک نەفەر خۆی، عاشقی دایەن دەبێ     ئەو لەئەغڕازدوورو، بێ لایەن دەبێ (۴۵۹۴)
جا موحیببی حەق، بەئوومید و بەبیم     دەرسی تەقلید ئەو دەخوێنێ لای عەلیم (۴۵۹۵)
ئەوموحیببەی خوای دەوێ، بۆ خوا،کووا     ئەو لەئەغڕاز و لەگشت عیللەت جودا (۴۵۹۶)
هەر چلۆن بێ حەق دەبا ئەو تالیبە     چونکەحەق مەعشووقە، مەعشووق جازیبە (۴۵۹۷)
گەرخودای ویست ئەو لەبەر غەیری خودا     تا کوسوودێک ئەو خودایەبەو بدا (۴۵۹۸)
یاخودای ویست هەر بەخاتر خواو بەس     نەیدەویست دوور بێ لەوی قەت یەک نەفەس (۴۵۹۹)

---

[1]- ڕێ دەچێ منداڵ لەبۆ مەکتەب ،پەشێو     بۆی نەهات لەو ڕێگە، چونکەزێڕ و زێو

ـەنبەعی ئەو دوو تەڵەب، خوای لەو سەرە    ئەو دووعیشقەدێن، لەلای ئەو دڵبەرە (٤٦٠٠)

**مەعشووق عاشق بۆ لای خۆی دەکێشێ لە ڕێگایکەوە،کە عاشق ئێتتیلاعی لێ نییەو بەو ڕێگایە ئومێدوار نییە و بە دڵیشی ختوور ناکا و لەو ئیرتیباتەش دا هیچ ئەسەرێک لە عاشق دا زاهیر نابێ بەغەیری ترسی تێکەڵاو بە نائومێدی دەگەڵ دەوامی تەڵەب ...**

ئیمەوامان باس دەکرد سەدری جیهان[1]    گەر کو نەیبا جەزبی ئەو عاشق نیهان (٤٦٠١)
چۆن لەدوور وی نەیدەما، عاشق قەرار؟    چۆن دەهات دووبارەبۆلای وی بەغار؟ (٤٦٠٢)
ـەیلی مەعشووقان لەخەڵکی نا دیار    مەیلی عاشق بوو لەعالەم ئا شکار (٤٦٠٣)
ـەک حیکایەت لێرەدا بۆ ئیعتیبار    ئەو وەکیلُ نەیما، بەڵام هیچ ئینتیزار (٤٦٠٤)
ـەرکمان کرد ئەو وەکیل، چون دەیهەوێ    پێش لەمردن، وەسڵی یاری دەس کەوێ (٤٦٠٥)
تا لەمەرگی حەتمی ئەو بیبێ نەجات    چون ویسالی دۆستان، ئاوی حەیات (٤٦٠٦)
دیتنی ئەوکەس کەدوور ناکات مەرگ    ئەو نەدۆستە، چون نەمیوەی بوو، نەبەرگ (٤٦٠٧)
ـن ئەوەم پێ کارەئەی موشتاقی مەست    مەرگی نێو ئەو کارەخۆشت، بێتەدەست (٤٦٠٨)
بۆ نیشانەی سیدقی ئیمان ئەی بەهۆش    تۆ لەلات مردن گەلێک زۆر بێت خۆش (٤٦٠٩)
گەر نەبێ بەو جوورەئیمانت، یەقین    نەقسەئیمانت، بڕۆ تەکمیل کە، دین (٤٦١٠)
مەرگی خۆی گەر ویست کەسێ بۆ کاری تۆ    بێ کەڕاهەت، ئەو بەڕاستی یاری تۆ (٤٦١١)
گەر کەڕاهەت ڕۆی، خۆ مردن نییە    غەیری تەعویزی مەکان کردن نییە (٤٦١٢)
گەرکەڕاهەت ڕۆی، دەی بێ مەرگ، نەفع    جا لەئینسان دەکرێ ئەو دەم مەرگ، دەفع (٤٦١٣)
بەو کەسانەی دۆستی حەقن خوای جیهان    وایدەکوت، لەمنن ئەوان و، من لەوان (٤٦١٤)
گوێ دەمن، عاشق لەدوور ڕا گەییەجێ    عیشقی وی توند بەستبووی لەو، دەست و پێ (٤٦١٥)
هەرکەدیتی سووڕەتی سەدری جیهان    وای بەسەر هات، وەک لەتەن، دەرچێ گیان (٤٦١٦)
چەشنی دارێ کەوتەخوارێ خوار وپەست    حیسس و فام و دەرک و عەقلی، دا، لەدەست[2] (٤٦١٧)
گەرچی دایان لەو، گوڵاوو، هەم بخوور    هەم نەجووڵا،هەم لەگوفتار، بوو بەدوور (٤٦١٨)
شا، کەدی ڕووی زەردی بێ هەمتایی وی    زوو لەمەرکەب هاتەخوار چۆ لایی وی (٤٦١٩)
ئەو کوتی عاشق وەدەس دێنێت یار    یار کەهات،دەڕوا لەعاشق، هۆش بەغار (٤٦٢٠)

---

[1]- ئیمەباسی وەن دەکرد سەدری جیهان (مصرع اول)

[2]- حیسس وفام و دەرک و عەقلی چوو لەدەست (مصرع دوم)

عاشقی حەقی و حەق ئەو کەس بوو،گەر    خۆ نیشان دا جێ بەجێ گیان دەچتەدەر (٤٦٠١
زۆردەبن فانی وەکوو تۆ بەو نەزەر    عاشقی بۆ نەفیی خۆت، ئێستا مەگەر؟ (٤٦٠٢
تۆ بەچەشنی سێبەری عاشق بەتاو    تاو کەدێ، سێبەر دەچی ئەو دەم بەتاو (٤٦٠٣

**شکایەت کردنی مێشوولە، لە با، لەبارەگای حەزرەتی سولەیمان...**

**خولاسەی داستان ...**

مێشوولەیەک لەباغ و سەوزەزارێک هەستا وبۆ لای بارەگای سولەیمان پێغەمبەر وەڕێ کەوت ولەدەست با، شکایەتی کرد وکوتی.. با، نایەڵێ کەلەحزەیەک لەنێو باغ و سەو زەزار ئێمەئارام بین،حەزرەتی سولەیمان جێ بەجێ دەستووری بە، با، دا کەفەورەن بێتەلای وی هەر دەگەڵکومێشوولەزانی کە، با، لەحزەیەکی دیکەدەگاتەوێ، بەپەلەهەڵات، سولەیمان پێیکوت بۆ هەڵدێی؟ مێشوولەجوابی داوەئەگەر با، بێتەئێرەئەمن چۆن دەتوانم لێرەبمێنم؟ ئەوناببوودم دەکات ...

هات مێشوولەلەباغ و سەوزەزار    لای سولەیمان بۆ شکایەت هەر بەغار (٤٦٢٤
ئەی سولەیمان ئەی ئەتۆ داد گوستەری    بۆشەیاتینان و ئینسان و پەری (٤٦٢٥
بۆ، پەنا، بۆ تەیرو ماسی، دادی تۆ    کێیەنەیکرد قەت بەفەزلت یادی تۆ؟ (٤٦٢٦
بێرەفریام چونکەئێستام زۆر نەزار    بێ نەسیبم من لەباغ و، سەوزەزار (٤٦٢٧
موشکیلی بێچارەتۆ ئیمحا دەکەی    وەک ئەمن بێچارەکوا، پەیدا دەکەی؟[1] (٤٦٢٨
ئێمەمەشهوورین بەزەعف و بێ سەری    تۆش بەلوتف و، میهرو، مسکین پەر وەری[2] (٤٦٢٩
تۆ لەقودرەت تا پلەی ئاخر دەچووی    ئێمەئەمما بۆ زەعیف بوون چەشنی مووی[3] (٤٦٣٠
بێرەفریام لەو غەمەم کە،تۆ جودا    بگرەدەستم دەستی تۆ دەستی خودا (٤٦٣١
جا، سولیمان پێیدەکوت هەر جێ بەجێ    بێژە،بۆت من ئینتیقام بگرم لەکێ؟ (٤٦٣٢
کێیەئەو زاڵم کەخۆی مەغروور کرد؟    تۆی وەها ئاوارەوو مەقهوور کرد[4] (٤٦٣٣
زۆر عەجەب لەو عەسری ئێمە، زاڵمان    دوور لەزەنجیر دوور لە زینداان دەمان[5] (٤٦٣٤

---

[1]- بۆ زەعیف موشکیل بەتۆ دەکرێت حەل    بۆ زەعیف بوون پەششە،بۆ، زەرب ولمەسەل

[2]- ئێمەمەشهوورین بەزەعف و نا تەوان    تۆش کەمەشهووری بەلوتف و، میهرەبان

[3]- ناتەوانین ئێمەئەمما ، چەشنی مووی (مصرع دوم )

[4]- تۆی وەها ئاوارە، هەم مەقهوور کرد (مصرع دوم )

[5]- زۆر عەجەب زاڵم لەدەوری ئێمەیێ    دوور لەزیندان ، نەی بێ زەنجیرێک لەپێ

چـون دەگـەڵکو ئێمـەبووین، زوڵمـیش دەمـرد    جـا لـەدەوری ئێمـە، کـێ زوڵمـی دەکـرد؟ (۴۷۳۵)
نـوور کـەهات زوڵمـەت دەبـێ زوو تـارو مـار    زوڵمـــەت و تـــاری، لـــەبۆ زوڵمینـــە، یـــار (۴۶۳۶)
کـار دەکـەن ئێسـتا شـەیاتین، بۆمـە، چەنـد    قیســـمەتێکیش بـــوون بـــەزەنجیران بەنـــد (۴۶۳۷)
مەنبـــەعی زوڵمـــی شـــەیاتین زۆر و کـــەم    خۆی لەبەن دا، چۆن لەدەستی دێ ستەم؟[1] (۴۶۳۸)
بۆیـــەموڵکی وای بـــەمن دا (کـــن فکـــان)    تـــا بەشـــین کـــەس ڕوو نەکاتەئاســـمان (۴۶۳۹)
تالـەبۆلای سـەر نـەچێ قـەت، دوودی ئـاه    تانەشـــێوێن چـــەرخ وئـــەفلاکی ئـــیلاه[2] (۴۶۴۰)
تـــا نەلـــەرزێنێت عـــەرش، ناڵـــەی یـــەتیم    تـا کـو زوڵمـی کـەس نـەکا، گیانێـک سـەقیم (۴۶۴۱)
بـــۆ وڵاتـــان بۆیەمەزهـــەبمان دەدا    تـــا نـــەچێ بـــۆ ئاســـمانان (یـــا خـــودا ) (۴۶۴۲)
تـــۆ لەئاســـمانان دەنـــۆڕی ئێســـتەبۆ؟    خـــۆ لەلاتـــە، شـــای خـــودایی، ئێســـتەتۆ (۴۶۴۳)
پێشـکە پێیکـوت داد لـە دەسـتی بـا، دەکـەم    زوڵمـی زۆری کـرد لـەمن ، جـا وا دەکـەم (۴۶۴۴)
چونکـە بـێحـەد زوڵـم و زۆری بـوو لـە بـۆم    بەو دوو لێوی بەستە ئێستە ، خوێن دەخۆم (۴۶۴۵)

**دەستوور دانی حەزرەتی سولەیمان بەمێشوولە بۆ حازر کردنی تەرەفی دەعوا...**

جا، سولەیمان پێیدەکوت ئەی دەنگ خۆش    ئـەمری حـەق تـۆ چەشـنی حەڵقە، بیخـەگۆش (۴۶۴۶)
دێتـــەگوێم فـــەرمانی حـــەق، وا دەمبـــەدەم    مـــن بەیـــەک لای کێشـــە،تەنها،گوێ نـــەدەم (۴۶۴۷)
تـا نـەیان بـێ هـەر دوولای دەعـوا، حـزوور    حـــەق لـــەلای قـــازی چکـــات، ناکـــا زهـــوور (۴۶۴۸)
لایـــەکی کێشـــەبناڵێ ســـەت کـــەڕەت    بـێ ئـەوی دی لات نـەبێ مـەقبووڵ، قـەت (۴۶۴۹)
مـــن وەلا نـــانێم ئـــەمری کردگـــار    زوو بەخەســـمت بێنـــەلای مـــن، تـــۆ بـــەغار (۴۶۵۰)
پێیـدەکوت مێشـوولە، قـەو لـت وایـەخۆ    بایەخەســـمم، مـــن ئـــەوم پێنایـــەخۆ (۴۶۵۱)
ئـەو چەلـەبای بانـگ دەکـرد ئـەو داوەرە    پەششـــەناڵەی دێ لەدەســـتت، دا وەرە (۴۶۵۲)
جا بەرەو ڕووی خەسمی خۆت، جوابت بڵێ    بـا لـەتۆ غـەمگین نـەبێ قـەت، هـیچ دڵـێ (۴۶۵۳)
با، کەبیستی ئـەمری شـا، تونـد هـات، بـەغار    جـێ بـەجێ مێشـوولەگرتی ڕێـی فـەرار (۴۶۵۴)
وای ســولەیمان کــوت بەمێشــوولەمەڕۆ    تـا قـەزاوەت کـەم لەبـەینی بـاو، ئـەتۆ (۴۶۵۵)
دەیکـوت ئـەی شـا، بـا، کـەبێ مـەرگم بەشـە    مـن لـەدوودی قـەهری وی، ڕۆژم ڕەشـە (۴۶۵۶)
ئـەو کـەبێ، کوێیەکـەلێی بگـرم قـەر ار؟    چونکـەدەردێتی لـەژینی مـن دەمـار (۴۶۵۷)

---

[1]- دێوەمەنبەع ، بۆ ستەم ، کەم یانەزۆر    خۆی لەبەن ، دا، چۆن لەدەستی دێت زۆر؟
[2]- تا نەچێ بۆ ئاسمان ، ئاە، دوو کەڵی    تا نەشێوێن ، ئاسمانان ، تێکەڵی

هەر وەهایەتالیبی دەرگای خودا — خوا کەهات، تالیب دەبێ، ئەو دەم بە(لا) (۴۶۵۸)

ئەو ویسال گەرچی بەقا بوو نێو بەقا — خۆ لەئەووەڵ ئەو بەقا بوو نێو فەنا (۴۶۵۹)

سێبەرو سایەی دەبن، تالیب بەنوور — زوو دەبن فانی، ئەگەر نوور،کا، زهوور (۴۶۶۰)

چۆن دەمێنێ عەقڵ، عاشق سەر بدا — شت هەموو فانی دەبن غەیری خودا[1] (۴۶۶۱)

شت دەبن فانی هەموویان لایێ ڕەب — چون فەنا جێگای بەقایە، زۆر عەجەب (۴۶۶۲)

گەر نەبێ مات، عەقڵ لەو مەحزەر، چ کا؟ — گەییەئێرە،گەرقەڵەم، لەت بوو شکا (۴۶۶۳)

کەمکەمەدەیکرد تەلاش، سەدری جیهان — تا وەهۆش بێت و ببێژێت ئەو بەیان (۴۶۶۴)

شا، کوتی بەو، ئەی گەدا تۆ بگرەگۆش — بۆ نیسارت، زێڕە، هینام، بگرەکۆش (۴۶۶۵)

گەر لەهیجری من دەبوو گیانت پەرێش — چون ئەمانم دا بەتۆ نەت بێ، چ ئێش (۴۶۶۶)

سەردو گەرمت دی گەلێ لەدوایی من — بێرەهۆش جا، بێرەوەبۆلایی من (۴۶۶۷)

وشترێکی یەک مریشک، دەعوەت دەکرد — جا بەمیوانی ئەو ی بۆ ماڵ دەبرد (۴۶۶۸)

هەر کەوشتر پێی لەماڵ وی، دا دەنا — ماڵ دەبوو وێران و، سەقفیش چۆ فەنا[2] (۴۶۶۹)

عەقڵی ئێمەکۆخ مریشکە،چووکو پەست — عەقڵی ساڵح، ناقەتەڵلای، دێتەدەست (۴۶۷۰)

نا قەنێو ئاوو قوڕی وی، هەر چلۆن — دابنێ سەر، گیان ودڵ، قوڕ، خڕدەڕۆن[3] (۴۶۷۱)

عیشقەباعیس گەر دەبێ ئینسان، فەزوول — بۆیەئینسان هەم زەلوومە، هەم جەهوول (۴۶۷۲)

جاهیلەچون موشکلی وای بوو بەبار — وەک بکا باوەش بەشێر،کەر وێشکی ژار (۴۶۷۳)

چۆ ن دەبوو بۆ شێر، ئەوکەر وێشکەیار؟ — گەرکو ناسیبای و، دیبای شێر، چ جار (۴۶۷۴)

زاڵمەنیسبەت بەگیان و،جیسمی خۆ — چاو لەزوڵمێک چۆن لەعەدڵی ساند،گۆ (۴۶۷۵)

جەهلی وی، بۆ گشت عیلمان ئووستاد — زوڵمی وی بۆ ڕێنموونی، عەد ڵ و داد[4] (۴۶۷۶)

گرتی دەستی عاشقی بێ گیانی خۆی — تا نەدەم بەو دەم، دەمێک نایەت لەبۆی (۴۶۷۷)

گەر بەمن زیندوو وەبێ ئەو مردووە — گیانەکەی من ڕووی لەلای من کردووە (۴۶۷۸)

من کەپێم دا گیان، دەبێ ئەو دەم، عەزیم — وای کەدی جا، تێدەگا، لوتفی کەریم (۴۶۷۹)

گیانی نامەحرەم لەڕووی دۆست،بوو بەدوور — غەیری ئەو گیانەی لەکۆی وی کرد، زهوور (۴۶۸۰)

---

[1]- شت هەموو نابوود دەبن ، غەیری خودا (مصرع دوم)

[2]- هەر کەوشتر دایدەنا لەو ماڵە، پێ    ماڵ دەبوو وێران و سەقفیش، جێ بەجێ

[3]- سەر کەدانێ ناقەنێو ئاوو قوڕی    هیچ کەنامێنن دڵ و گیان، قوڕ ، خڕی

[4]- ڕەهنەمایەزوڵمی وی بۆ عەد ڵ و داد (مصرع دوم)

چەشنی قەسساب فوو دەکەم لەو دۆستەمن — تا جودا کەم مەغزی نوێ، لەو پۆستەمن (٤٦٨١)
ئەی تۆ ئەو گیانەی هەڵاتووی دەس بەڵا — دەرکی وەسڵم کرد لەبۆتۆ، ئا وەڵا (٤٦٨٢)

**لەئاخری ئەو داستانەمەعلووم دەبێ کەمەنزوور لەسەدری جیهان خودایەومەنزوو لەوەکیل بەندەگانی خودان ...**

ئەی لەئێمەبێخودی و، مەستی لەبۆت — ئەی لەهەستی ئێمەدێ، هەستی لەبۆت (٤٦٨٣)
گوێ دەمن تۆ، تا بڵەم بێ لێوو دەم — سیرڕ ورازی کۆن لەبۆ تۆ دەمبەدەم (٤٦٨٤)
چونکەئەو لێوانەلەو سوور، لا دەدەن — سور لەلێوی جۆی نیهان خۆ، بادەدەن[1] (٤٦٨٥)
تا لەرازی ( یفعل اللّٰەمایشا ) — تێبگەی،گوێی باتنت کە، ئاوەڵا (٤٦٨٦)
گەر سەدای وەسڵی دەبیست، هەر ئەو دەمە — هاتەجووڵەجووڵ مردوو کەمکەمە (٤٦٨٧)
ئەو لەخاک کەمتر نییە، عیشوەی سەبا — پاش فەنا، دەیکاتەبەر، یەک، شین عەبا (٤٦٨٨)
ئەو لەئاوی نوتفەخۆ کەمتر نەبوو — یەک خیتاب کردی بەیووسووف، ماهڕوو (٤٦٨٩)
کەم نەبوو لەو بایەچای کرد لەو، خودا — نێو ڕەحیم تاووس و تەیری خۆش ئەدا (٤٦٩٠)
کەم لەکێوی بەر، نەبوو گەر کو قەزا — خستیەدەر لەو ناقەیەک، ئەو ناقە، زا[2] (٤٦٩١)
زۆردەقیق بنوارەتۆ دونیای عەدەم — چۆن لەوێ دەردێن عالەم دەمبەدەم (٤٦٩٢)
ڕایەڕی شاد، هەر وەکوو هەستێ لەخەو — یەک دووجار سووڕاو، کەوتەسەجدەئەو (٤٦٩٣)

**وەخۆ هاتنەوەی عاشق لەبێهۆشی ودەست کردنی وی بەمەدح و سەناو سپاس گوزاری لەمەعشووق ....**

دەیکوت ئەی عەنقایی حەق، بۆ گیان مەتاف — زۆر شوکور تۆ هاتیەوەلەو کێوی قاف (٤٦٩٤)
ئەی سڕافیلی قیامەتگایی عیشق — ئەی تۆ عیشقی عیشق و، ئەی دڵخوایی عیشق (٤٦٩٥)
ئەووەڵین خەلعەت کە دەموێ، من لەتۆ — دابنێ سەر زاری من، تۆ گوێی خۆ (٤٦٩٦)

---

[1]- چونکەئەو لێوان لەبەر سور ، ڕادەکەن    سور لەلێوی جۆی نیهان جێ، چا دەکەن

[2]- کەم لەکێوی بەرد ، نەبوو گەر کو قەزا    خستیەدەر لەو، ناقە، ئەو نا قەش ، دەزا
لەو دەبوو یەک ناقەئەو ناقەش دەزا (مصرع دوم)

گــەرچی حــاڵی تــۆ لــەحاڵم، ســەر وەرم    گـوێ دەقـەو لـم، ئـەی تـۆ بەندەپـەر وەرم (٤٦٩٧)

سـەت هـەزاران جـار ئـەی سـەدری تـەلا    ئـارەزووی گوێـت، نەیدەهێشـت هۆشـم لـەلا (٤٦٩٨)

هـەم سـەمیعیت هـەر وەهـا ئیسـغایی تـۆ    زەردەخەنـدەی گیـان وگیـان ئـەفزایی تـۆ (٤٦٩٩)

بیسـتنی زۆر و کـەمی هـەم بـێ وتـار    عیشـوەیی گیـانی منـی بیـر نـا لـەبار (٤٧٠٠)

گەر چی ناسیت لێم ئەتۆ، غەششی قەبیح    لێـت قـەبووڵ کـردم وەکـوو زێـڕی سـەحیح (٤٧٠١)

تۆ کەبەخشیت جورمی زۆر بێ حەد، لەمن    دیـار دەکـا حیلمـان لەحاسـت حیلمت کـەمن (٤٧٠٢)

ئەووەڵـەن چون،چـوو لەدەسـتی مـن قـولاب    هەرچی هەم بوو چوو لەدەستم وەک حوباب (٤٧٠٣)

سـانییەن ئـەی سـەدری بـاش و میهرەبـان    زۆر گـەرام تێیـدا نـەبوو وەک تـۆ جیهـان (٤٧٠٤)

سالیسـەن گـەر تاعـەتی تـۆم لا دەنـا    وەک لـەبۆ شـیرکم، ئـەمن، سـەر دادەنـا (٤٧٠٥)

ڕابیعـەن لێمـان کەسـووتا مەزڕەعـە    نەمدەناسـی خامیسـەهەم ڕابیعـە[1] (٤٧٠٦)

قـەترەخوێنێکت لەهـەر جێگـا کـەدی    خـوێنی چـاوی مـن بـوو ئـەو، نـەک ئیدەدی (٤٧٠٧)

ڕەعـدەگفتم، هـەورەچاو، ناڵـەم لـەوی    دەبیهـەوێ بـاران بڕێـژێ سـەر زەوی (٤٧٠٨)

ئێسـتەماوم مـن لـەنێو گریـەو، وتـار    مـن بگریـەم یـا وتـار کـەم ئیختیـار؟[2] (٤٧٠٩)

گـەر وتـاربێژم، لەدەسـتم نایەشـین    چـۆن سـەنا بێـژم کـەکار م بـێ گـرین؟ (٤٧١٠)

چـاو لـەچاوم، خـوێنی چـۆن لێدێتـەدەر؟    چـاو، ئەلـەو گریانـەمن چـیم هـات بەسـەر (٤٧١١)

گـەر ئـەوەی کـوت، ئـەو گرینـی دەر بـڕی    بـۆی دەگریـان بـاش و بـەد، لێکـڕا، خـڕی (٤٧١٢)

جـا لەقـەلبی وی دەهـات وا، هـا یـو هـووی    دەوری وی خـەڵکی بوخـارا، گرتبـووی (٤٧١٣)

شین و خەنـدەو گفتـی وی بـوو، بـێ هـەدەف    خـەڵکی وێسـتابوون لـەوێ حـەیران، بەسـەف (٤٧١٤)

چەشـنی وی خـەڵکیش لەچاو،ئەشـکیان دەڕشـت    پیـاووژن تێکـەڵ وەکـوو مەحشەربەگشـت (٤٧١٥)

ئاسـمان ئـەو دەم بەعـەردی کـوت وەرە    چـاک بنۆڕەئێسـتەڕۆژی مەحشـەرە (٤٧١٦)

عەقڵ، سەرگەردان ومات لەو عیشق و حاڵ    کـام عـەجیبتربوو، فیـراق یـاخۆ ویسـاڵ؟ (٤٧١٧)

گـەر کـوتی ئاسـمان لـەبۆ مەحشـەر نیشـان    ئـەو کراسـی خـوی دڕی تـا کەهکەشـان[3] (٤٧١٨)

---

[1]- ڕابیعەن لێمان کەسووتا کیشتزار    نەمدەناسی ئەو دەمی یارو نەیار
نەمدەناسی کامەیارەکام نەیار (مصرع دوم)

[2]- من بیێژم یا بکەم گریان و زار؟ (مصرع دوم)
من بیێژم یا بگریەم زار زار؟ (مصرع دوم)

[3]- ئەو هەڵی دەدڕی کراس تا کەهکەشان (مصرع دوم)

ـیشق، بێگانەلەبۆ دوو عالەمە — شیتیەتی نێو عیشق، بێژم سەت،کەمە (٤٧١٩)
عیشق پنهان، حیرەتی وی ئاشکار — تالیبن بەو، ئەنبیایی کردگار (٤٧٢٠)
ـەیری حەفتادو دوو میللەت دینی وی — تەختی شاهان لای ئەوی پەست و نەوی (٤٧٢١)
ـوتربی عیشق، وا دەڵێ وەختی سەماع — بەندەگی بەندەو، خوداوەندیش سوداع (٤٧٢٢)
جین ئەدی عیشق و ئەوین؟ دەریای عەدەم — لێی شکا عەقڵیش لەوێ هەر دووقەدەم (٤٧٢٣)
ـەندەگی وەک سەڵتەنەت مەعلووم بوو — بەو دوو پەردە، عاشقی مەکتووم بوو (٤٧٢٤)
خۆزگە، بوون، هەیبا، زبانێک بۆ خیتاب[1] — تا لەمەوجوودات لاینابا حیجاب (٤٧٢٥)
گەرحەقیقەت تۆ بەگوفتار کەی بەیان — بوو بەیان پەردەی حەقیقەت بێ گومان (٤٧٢٦)
ـفەتی دەرکی حەقیقەت قاڵ و حاڵ — خوێن بەخوێن شوشتن محاڵەزۆر محاڵ[3] (٤٧٢٧)
ـن لەبۆ گشت عاشقی حەق مەحرەمم — زیکری ڕازی حەق دەکا، دائیم دەمم (٤٧٢٨)
ـەست وبێهۆش و پەرێش بووی، وا ئەتۆ — خەو تبووی دوێ شەو لەسەرکام لا، ئەتۆ (٤٧٢٩)
ـخەبەربە، واز نەکەی تۆ دەم، دەمێ — تا نەکەی پەیدا لەبۆ خۆت، مەحرەمێ (٤٧٣٠)
عاشق ومەستی، دەکەی جا، ڕاز بەیان — تۆ کەوای، وەک وشتری سەر ناودان (٤٧٣١)
گەرکوڕازو نازی وی بێژێ زبان — ( یاجمیل الستر ) بێژیت ئاسمان (٤٧٣٢)
چۆن دەبێ پۆشش خوری بۆ ئاوری؟ — زیاد دەبێ ئاور، کەتۆ زیاد کەی خوری (٤٧٣٣)
ـم هەوێ گەر ڕازی وی کەم من نیهان — ڕاز وەکوو ئاڵا دەدا، خۆی پێم نیشان (٤٧٣٤)
هەردووگوێم دەگرێ دەڵێ تۆ ئەی نەزان — ناتوانی دام بپۆشی هیچ زەمان (٤٧٣٥)
پێی دەڵێم تۆ لێم گەرێ ئەی پڕ خرۆش — زاهیرو پنهان وەکوو گیانی ئەتۆش (٤٧٣٦)
ـێم دەڵێ حەپسم لەنێو تەن، چا دەکەم — وەختی شادی چەشنی مەی غەو غا دەکەم (٤٧٣٧)
ـێی دەڵەم پێش وەی گرەو، بگرن ئەتۆ — تا نەیەت بۆت ئا فەتی مەستی، بڕۆ (٤٧٣٨)
ـێم دەڵێ بەو جامی جوانی خۆش بەتام — یاری ڕۆژم من هەتاکو نوێژی شام (٤٧٣٩)
ـام کەبێت بدزێت لێم جا، جامی من — بەو دەڵێم وێم دە، کەنایەت شامی من (٤٧٤٠)
گەر عەرەب نێو یان لەمەی دانا مودام — چونکەتێر ناخوا لەمەی، مەی خۆر مودام (٤٧٤١)

---

[1] - خۆزگە،هەستی، بای زبانێک بۆخیتاب (مصرع اول)

[3] - ڕووی حەقیقەت قاڵ هەم حاڵ دەی گرێ    خوێن بەخوێن شوشتن محاڵە، ناکرێ

مەی حەقیقەت، عیشق دەیهێنێتەجۆش — ئەو بەسادق،تێر دەدا، مەی زێدەخۆش (٧٤٢
گەر بەلوتفی خوا ئەتۆ، بت وێ، ئەوین — بادەئاوی زینە، زەر فیش تەن، یەقین (٧٤٣
حەق کەمەی تەو فیق،هەر دەم زیاد بکا — زەرفی مەی ئەو دەم بەقووەی مەی، شکا (٧٤٤
هەم مەی و هەم مەست و ساقی دەبنەئاو — چۆن مەڵی، چون خوا بەباش زانا، تەواو[1] (٧٤٥
شۆقی ساقی دای لەشیرەگەر وەها — شیرەجۆشی، کەو تەڕەقسین و سەما (٧٤٦
بێژە مونکیر چاو لەشیرەی وا بکات — بێژەتۆ دیتووتە، شیرەی وا، چ کات؟ (٧٤٧
بێ تەفەککور زانییان زانا، هەموو — گەر نەبا شێوێنەرێ، شێواو نەبوو (٧٤٨

**حیکایەتی عاشقێک کە هیجرانی یار و سەختی و عەزابی زۆر دیبوو...**

یەک جەوان گرتی کچێک بۆ خۆی بەیار — مەنعی وەسڵی وی بەیار بوو، ڕۆژگار[2] (٧٤٩
ئەو جەوانەی زۆر دەدا ئازار، ئەوین — بۆ ئەوین هەیتی لەئەووەڵ قەهروکین؟ (٧٥٠
هەر لەئەووەڵ کردی خوێنڕێژی، ئەوین — تا هەڵێن نامەحرەمان لەو سەر زەمین (٧٥١
لای کچەی گەر ناردبا ئەو، یەک ئەحەد — نەیدەهێشت چاکەی بڵێ، قاسید،حەسەد[3] (٧٥٢
گەر لەبۆ کچ ناردبای یەک نامەئەو — نامەکەی بۆ کچ دەخوێند قاسید، درەو (٧٥٣
ناردبای گەربای سەبا بۆ لایی یار — بای سبای تاریک دەکرد گەرد و غوبار (٧٥٤
گەر لەباڵی تەیری نا مەی بەستبا — سۆز دەیسووتاند باڵ، دەیدا، بەبا (٧٥٥
غیرەتی عیشق ڕێی عیلاجی بەست لەوی — لەشکری ئەندیشەئاڵای بوو، نەوی (٧٥٦
مونیسی وی بوو لەئەووەڵ ئینتیزار — ئینتیزار کردی لەئاخیر دەردەدار (٧٥٧
جارێ دەیکوت دەردی بێ دەرمانەئەو — جارێ دەیکوت، نا، کەمایەی مانە، ئەو (٧٥٨
جار لەبەر هەستی، فەنای ئەو لا دەنا — جارو بار دەیخوارد بەری نیستی و فەنا (٧٥٩
خەسڵەتو خووی وای دەچوو گەرئەو لەیاد — بۆی دەهاتەجۆش کانی ئیتیحاد (٧٦٠
ئارەزووی خۆی چون وەلانا ئەو تەواو — بەرگی بێ بەرگی دەهات،بۆ وی بەتاو (٧٦١
خەرمەنی ئەفکاری وی بێ،کا، بەدان — ڕەهنەمابوو چەشنی مانگ، بۆ شەو ڕەوان[4] (٧٦٢

---

[1]- چۆن مەڵی ، چون خوا دەزانی ، باش تەواو (مصرع دوم)

[2]- یەک جەوان عاشق بەیەک کچ بوو چەلێ   بۆ ویسالْ ئەو، نەی دەبوویەک چەل، هەلێ

[3]- نەیدەهێشت غەیری بەد ی بێژێ، حەسەد

[4]- خەرمەنی ئەفکاری وی نەیبوو ، چ کا   چەشنی مانگ ، بۆ شەو ڕەوان بوو ڕەهنەما

هەن گەلێک تووتی نەتووقن هەم خەمۆش     هەن گەلێک ڕوو ترش وتاڵ،ڕووح شادوخۆش (٤٧٦٣)

تۆ لەبۆ تەحقیق بۆ قەبران بڕۆ     تا ببینی ناتیق و خامۆش ئەتۆ (٤٧٦٤)

تۆکەدیتت وەک یەکن گشت خاکییان     نینەوەک یەک، حاڵەتی چالاکییان (٤٧٦٥)

شەحم و لەحمی زیندووان یەک جوورەخۆ     یەک بەلام غەمگین، یەکیش مەسروورەخۆ (٤٧٦٦)

تا نەبیسی تۆ لەوان، قەو ل و بەیان     حاڵی وان پنهانەلێت، نابێ عەیان (٤٧٦٧)

دێ لەقەولی وان هەیا هووت، بۆ گووێ     چۆن دەبینی حاڵەتێک ژێر سەت تووێ؟ (٤٧٦٨)

نەقشی ئینسان یەک، بەئەزداد موتتەسیف     جیسمی وان یەکسان، ڕەوانیان موختەلیف (٤٧٦٩)

وەک یەکن هەرچی سەداو ئاوازە، خۆ     یەک بەلام پڕ دەردە، یەک پڕ نازەخۆ (٤٧٧٠)

دەنگی ئەسپان دێتەگوێ وەختی مەساف     دەنگی تەیران دێتەگوێ وەختی تەواف (٤٧٧١)

یەک لەکین دێ،یەک لەچی دێ؟ ئیرتیبات     یەک لەڕەنج دێ،یەک لەسەرچاوەی نیشات (٤٧٧٢)

هەر کەسێکی دوور لەحاڵی وانە، خۆ     دەنگی هەموانی لەلا، یەکسانە، خۆ (٤٧٧٣)

جار دەجووڵێنێت دار، زەربی تەبەر     دەیشکێنێ دارەکی دیش بای سەحەر (٤٧٧٤)

ئیشتیبابووم من لە دیگی بەستەسەر     خۆش دەویدا دێتەجۆش یا خێر، خەتەر (٤٧٧٥)

تا لەبۆ لای خۆت بەرن لێک نین جیا     جوشی سیدق و جۆشی تەز ویرو ڕیا (٤٧٧٦)

بۆن لەگیانی ڕووشناس نەکرا، کەپێت     یەک دەماغی بۆن شناس بۆت، بێژە، بێت (٤٧٧٧)

ئەو دەماغەی جێی گەڕانی،گوڵشەنە     چاوی یەعقووبان لەوی ڕا ڕەو شەنە (٤٧٧٨)

بێژەبۆ مان حاڵی ئەو سووتاوەتۆ     لەو بوخارائی بەدوور ماین، ئێمەخۆ (٤٧٧٩)

**پەیداکردنی عاشق مەعشووقی خۆی وبەیانی ئەو مەتڵەبەکەهەرکەس وەدوای هەرچی بکەوێ عاقیبەت وەدەستی دەکەوێ (تەلاش ناچێ بەلاش ) قەت ناچێ تەلاش بێهوودە و بەلاش، (فمن یعمل مثقال ذره خیرا یره )...**

ئەو جەوانەجستوجۆی کرد حەوت ساڵ     وەک خەیاڵی لەو دەکرد، فکری ویساڵ (٤٧٨٠)

خوا لەسەر بەندان، سێبەر چادەکا     جستو جۆ کەر، عاقیبەت پەیدا دەکا (٤٧٨١)

وایدەکوت ئەحمەد، ئەگەر لێدەی، دەرێ     عاقیبەت لەو دەرکەدێتەدەر، سەرێ (٤٧٨٢)

گەرلەسەر ڕێگا کەسێک بگرێ قەرار     تۆ دەبینی عاقیبەت یەک ڕێبووار[1] (٤٧٨٣)

گەر لەچاهێک هەڵقەنی ڕۆژانەخاک     دێتەدەر لەوچاهەئاخر، ئاوی پاک (٤٧٨٤)

[1]- دابنیشی گەر لەسەر ڕێ یەک نەفەر     تۆ دەبینی عاقیبەت یەک ڕەهگوزەر

تێدەگەن خەڵکی دەزانن وایەگەر — هەرچی چاندت هەر ئەوت بۆ دێتەبەر (٤٧٨٥)

بەرد لەئاسن دەی نەتیجەی ئاگرە — هەر دەبێ وابێ، نەبێ وا، نادرە (٤٧٨٦)

ئەوکەسەی بەهرەی نەبوو بەخت و نجات — عەقڵی وی هەر ڕوو ی دەکردەنادیرات (٤٧٨٧)

چاو، فڵان چاندی بەڵام بۆی بەر، نەبوو — بۆ فلان کەس نێو سەدەف، گەو هەر نەبوو (٤٧٨٨)

بەلعەمی باعوور و ئیبلیسی لەعین — هیچ بەوانی سوود نەدا، تاعات و دین (٤٧٨٩)

سەت هەزاران ئەنبیاوو، پاکڕەوان — قەت کەناکا، ئەو بەد ئەندیش، بیر لەوان[1] (٤٧٩٠)

زێدەتا، تار بێ، دەکا ئەو دوو، سەنەد — پێیدەکا بەدبەختی، فکری والەبەد (٤٧٩١)

زۆر کەسان نانیان دەخوارد، زۆر شادمان — گیر دەبوو نان نێو گەروو، مردن نەمان (٤٧٩٢)

جا، کەوابێ تۆ لەترسان نان مەخۆ — تا نەیەت بۆت شووڕو شەڕ، وەک وی ئەتۆ (٤٧٩٣)

نان دەخۆن خۆ، سەت هەزار خەڵکی زەوی — نان دەکا، گیان، شادمان و دڵ قەوی (٤٧٩٤)

گەر لەعەقڵ و فام بەدوور نی، تۆ لەبۆ؟ — نادیراتت کردەدەستاویزی خۆ؟ (٤٧٩٥)

ئەو جیهانەی ڕوون بەنووری مانگ و تاو — جێ دەهێڵێ، سەر دەبا نێو بیر، بەتاو (٤٧٩٦)

گەر کو حەققە، جا ئەدی کوا ڕەو شەنی؟ — سەر لەنێو بیر بێنەدەر، تۆ ئەی دەنی (٤٧٩٧)

عالەمی گشت ڕوون دەکا، ئەونووری گەش — تا لەژێر بیر دای ئەتۆ لەو نیتەبەش (٤٧٩٨)

ڕوو لەکاخ و باغ کە، با، بیر، چێ، لەیاد — چونکەشوومەلێرەلەج، نەت بێ عیناد (٤٧٩٩)

تۆمەڵێ چاندی فڵان کەس، دوایە،خۆ — هیچ نەمابۆوی هەمووی لێ خوارد کلۆ (٤٨٠٠)

لێرەدا چوون زۆر هەیەترسی زەرەر — بۆبچێنم، گەنم و جۆی خۆم دەم هەدەر؟ (٤٨٠١)

ئەو کەسەی چاندی وکردی کاری خۆ — پڕ دەکا ئەنبار بەکوێری چاوی تۆ (٤٨٠٢)

لێی دەدا بۆ وەسڵ، دەرکی گشت کەس — عاقیبەت ڕۆژێک ویساڵی هاتەدەس (٤٨٠٣)

ڕای دەکرد بۆ باغ لەترسی پاسەوان — یارەکەی خۆی دی، دەوێدا، ئەو جەوان[2] (٤٨٠٤)

ئەو دەمی جا، ڕووی دەکردەئاسمان — ئەی خودا تۆ یارمەتی دە، پاسەوان (٤٨٠٥)

چادەکەی ئەسبابی نا ناسیار ئەتۆ — بردمت لای یار،کەبووم لای نار، ئەتۆ[3] (٤٨٠٦)

هەر لەبۆیەت کرد، دەگەڵ من والەکار — تا درووی چووکیش نەبێ لای من بەخوار[4] (٤٨٠٧)

---

[1]- بیر کەناکا هیچ لەوان ، ئەو بەد گومان (مصرع دوم)

[2]- یارەکەی خۆی وەک چرا دی ئەو جەوان (مصرع دوم)

[3]- بردمت بۆباغ کەبووم لای نار ئەتۆ (مصرع دوم)

[4]- بۆیەکردت تۆ لەگەڵ من والە کار — خاری چووکیش تا نەبێ لام پەست و خوار

گــەر كــو لاقێكــی شــكاند، باڵێــك دەدا     هــەم لــەژێر بیــر واز دەكـا، دەركێـك، خـودا (٤٨٠٨)
تــۆ مــەڵێ ســەر دار، یــابیر، جێمــە، مــن     تــۆ تەماشــام كــە، كلیلــی ڕێمــە، مــن (٤٨٠٩)
تــۆ ئەگــەر بــت وێـت ئــەو باســە تــەمام     چــاك بنــۆڕە دەفتــەری چــوار، ئــەی بــرام[1] (٤٨١٠)

---

**تەواو بوو جلدی سووەمی مەسنەوی شەریف بەسووڕەتی هۆنراوەی كوردی بەقەڵەمی عەبدالسلام مودەڕڕیسی (خانی ) للەالحمد والمنە.. لەتاریخی ڕۆژی هەینی ساعەتی دوازدەو نیوی پێش نیوەڕۆ، ١٣٨١/٦/٢٢كۆچی هەتاوی بەرابەر دەگەڵ پێنجەمی ڕەجەبی (١٣٧٩/٢/١٣) كۆچی مانگی ...**

---

هەر لەبۆیەت تۆ دەكرد، بەو جووره كار     تا نەبی لام ، من دڕووی چووكیش، بەخوار

[1]- چاک بنۆڕە دەفتەری چوارەم ، برام (مصرع دوم)

تۆ مەنۆڕەمن،کەگیانم چۆتەدەر حافیزی من عاشقی من، خوای لەسەر (۱۰۵۹)
من نەمردووم ئەمری شایەمن کەوام زاهیرەن مردوومەمن، زیندووم بەڵام (۱۰۶۰)
باڵ و پەڕ پێشان تەکانیان پێم دەدا پێم دەدا ئێستا تەکان دەستی خودا (۱۰۶۱)
هیچ تەکانم من نەما، نا پایەدار جونبشی جاویدی دامن کردگار (۱۰۶۲)
هەرکەسێ لای جونبشم بڕواتەخوار باقەویش بێ دەیکوژم من زار زار (۱۰۶۳)
گەر تۆ زیندووی، من بەمرددو دامەنێ من لەدەستی شا، ببینە، شا، تەنێ (۱۰۶۴)
مەیێتی زیندوو دەکرد عیسا بەدەم دەستی خوای عیسایەجێگام، دەمبەدەم (۱۰۶۵)
چۆن دەبێ بمرم لەنێو دەستی خودا؟ دەستی عیساش ژین بەمردووی کۆن دەدا؟ (۱۰۶۶)
لەو خودایەهەرکەسێ بۆی هات ژیان بێ گومان و شک دەمێنێ جاویدان (۱۰۶۷)
مردوو زیندوو بوو بەعیسا، دوایەمرد شادەئەو کەس گیانی تەسلیم خوا دەکرد (۱۰۶۸)
من بەدەس عیسام، عەسام، بێ ئیختییار نادییار موۆسایی من، خۆم ئاشکار (۱۰۶۹)
بۆ موسەڵمان پردی سەر دەریا دەبم من لەبۆ فیرعەون، ئەژدیها دەبم (۱۰۷۰)
ئەو عەسا خۆ ئەی جەوان تەنها نییە چون عەسا بێ دەستی حەق قەت وا نییە (۱۰۷۱)
مەوجی تۆ فانیش عەسابوو گەر بەئێش شەو کەتی جادوو گەرانی برد لەپێش (۱۰۷۲)
گەرکوبژمێرم عەسای پەر وەر دگار مەکری فیر عەونان دەبن گشت تارو مار (۱۰۷۳)
خۆ بەڵام لەو گیایی ژەهراوی وشین با لەوەڕ کەن چەند ڕۆژی دیش بژین (۱۰۷۴)
گەر نەیان با فیرعەونان سەروەری چۆن دەبوو پەیدا جەهەننەم پەر وەری (۱۰۷۵)
پاش قەڵەو کردن بکوژەئەی قەساب چونکەبێ تۆشەن لەدەۆزەخ دا، کیلاب (۱۰۷۶)
گەر لەدونیادا نەبان خەسم و عەد وو هەرچی ڕق یاکینەبا، نابوود دەبوو (۱۰۷۷)
خۆ جەهەننەم هەر ڕقە، دەی وێ عەدوو تا بژی،ڕەحمەت دەنا دەیکوشت زوو (۱۰۷۸)
جا دەما، ڕەحمەت بەبێ قەهر و بەدی کێ کەماڵی پادشای ئەو دەم دەدی؟ (۱۰۷۹)
مەسخەرەن بۆ ئەهلی فیسق و مونکیران قەو لو پەندی ناسیحان و زاکیران (۱۰۸۰)
مەسخەرەم کە، بت هەویتن تۆش ئەگەر ئەی نەفام تۆ چەن دەژی ئاخر مەگەر؟ (۱۰۸۱)
ئەی موحیببان شاد ببن وەختی نییاز چون دەبێ ئەوڕۆکە، ئەو دەرگایەواز (۱۰۸۲)
لێک جییان کەردوویی سەبزی جوور بەجوور وەک کەوەر هەم گێزەرو پیوازو توور (۱۰۸۳)
جا لەکەردوودا لەگەڵ هاو جنسی خۆن نەم نەمی ئاو تاکو وێڕاگەن دەخۆن (۱۰۸۴)
گەر کوکەردووی زەعفەران جێگاتەتۆ زەعفەران بە، تۆ لەگیای دی لادەخۆ (۱۰۸۵)

زەعفەران تۆ، ئا و وەخۆ تا وا دەبی    چاک دەگەی جێگات لەنێو هەڵوا دەبی (١٠٨٦)

زار مەبەبۆلایی کەردووی شەڵغەمان    چون لەگەڵ تۆ جوور نین، دێنن غەمان (١٠٨٧)

تۆ لەکەردووی خۆت و، ئەو ئی خۆی بژین    چونکەعەرزی خوا گەلێک پانەو بەرین (١٠٨٨)

خاسسەئەو عەرزەی لەبەر پەهنا وەری    ون دەبێ ڕێیان لەوێ، دێوو، پەری (١٠٨٩)

جا لەدەریاو کێوو، سەحرای ئەو جیهان    گشت خەیاڵ و فکرو ئەوهام ناتەوان (١٠٩٠)

خۆ لەحاس سەحرایی وێ سەحرایی مە    هێندەچووکە، وەک لەدەریا یەک نەمە (١٠٩١)

ئاوی ڕاوەستاوی دونیای مەعنەوی    ئاوی جاری چۆم و، جۆ، ناگا بەوی (١٠٩٢)

چون لەخۆی دا هەیتی وەک ڕووح و ڕەوان    ڕۆینەکی پنهان و دوو پێ، بۆ گەڕان (١٠٩٣)

ئەی خەتیب چون گوێ گرانت چوونەخەو    تۆ مەڵێ بێهوودەهیچ، بەو نیوەشەو (١٠٩٤)

خۆشەئەو بازاڕە بلقیس هەستەتۆ    هەر کەسێ بێنێ کەساد، لەو لادەخۆ (١٠٩٥)

هەستەبلقیس تۆ بەمەیلی خۆت زوو    پێش ئەوەی بگرێ لەتۆ مردن،گەروو (١٠٩٦)

پێش ئەوەی وات گوێ بکێشێ مەرگ و میر    وەک بچێ دز، زۆرزەلیل بۆلای ئەمیر (١٠٩٧)

تا کوکەی دەدزی ئەتۆ ناڵی کەران    گەر کو دەدزی بۆچی نادزی گەو هەران؟ (١٠٩٨)

خوشکەکانت موڵکی جاویدیان بەدەس    موڵکی تۆ ئەمما فەقەت هەر خارو خەس (١٠٩٩)

خۆش بەحاڵی وەی کەنەیکرد موتتەکا    موڵکی وا، چون مردن ئەو نابوود دەکا (١١٠٠)

هەستەبلقیس چاک بنۆڕەبۆ یەقین    جا ببینەموڵکی سوڵتانانی دین (١١٠١)

باتینەن گوڵزارە جێگایان ئەوان    زاهیرەن نێو دۆستانیان نەغمەخوان (١١٠٢)

باغ و گوڵزاران لەگەڵ وانن ڕەوان    خۆ بەڵام نا بیندرێن لای کەس ئەوان (١١٠٣)

میوەکان داوا دەکەن تێر من بخۆن    گاز دەکا ئاوی حەیات، دەی من وەخۆن (١١٠٤)

جا تەواف کەن ئاسمان بێ باڵ و پەڕ    وەک هیلال و بەدرو، تاوی خۆ ش فەڕ (١١٠٥)

جا دەڕۆی بێ پێ، بەچەشنی ڕووح بەغار    جا دەخۆی سەد جوور غەزا، بێ دان و زار (١١٠٦)

جا نەهەنگی غەم لەکەشتیت لا دەدا    میحنەتی مردن بەتۆ نادا خودا (١١٠٧)

ئەو دەمی تۆ لەشکری هەم شاهو تەخت    تۆ دەبی ئەو دەم سەعادەتمەند و بەخت (١١٠٨)

گەر چی شاهی شادمانی تۆ بەتەخت    بێ دەوامەچونکە نی، تۆ عەینی بەخت (١١٠٩)

جا دەمێنی بێ نەو ا تۆ، وەک گەدا    دەوڵەتی خۆت بە، ئەتۆ، ئەی موجتەبا (١١١٠)

گەر تۆ ببیەبەختی خۆت ئەی مەعنەوی    ون کەنابێ ئەو لەتۆ، هەم تۆش لەوی (١١١١)

تۆ لە خۆت چۆن ون دەبی ئەی خۆش خیساڵ    چونکە عەینی تۆ لەبۆ تۆ بوو بەماڵ (١١١٢)

**پاشماوەی داستانی دروست کردنی سولەیمان( علیەالسلام ) مەسجیدولئەقسا بە فەرمانی وەحیی خودا بەخاتری ئەو حیکمەتانەی کەخودا هەر بۆخۆی دەزانێ و بەیارمەتی دێو و فریشتەو پەری وئادەمی بەئاشکرا ..**

مەسجیدی ئەقسا سولەیمان، چاکەتۆ    قەومی بلقیس دێنەوێ بۆ نوێژی خۆ (١١١٣)
گەر لەبۆ ئەو مەسجیدەی دەس کرد بەکار    ئینس و جین هاتن لەبۆ کۆمەک، بەغار (١١١٤)
یەک گرووەبۆ عەیش و قەو مێک بێ موراد    ڕاس وەکوو ئەو تا عەتەی دەیکەن عیباد (١١١٥)
خەڵکی دێون شەهوەتیش زەنجیری وان    گەر دەیان کێشێ لەبۆ کار و دوکان (١١١٦)
باعیسی زەنجیری وا هەر ترسەبەس    تۆ بەبێ زەنجیر نابینی چ کەس (١١١٧)
جار دەیان کێشی لەبۆ کەسب و شکار    جار دەیان کێشی لەبۆ کان و بیحار (١١١٨)
جار دەیان کێشی لەبۆ لای باش و بەد    خوا کوتی ( فی جیدها حبل المسد) (١١١٩)
دان دەنا زەنجیر لەسەر ئەستۆیی وان    خولقی وانمان کردەزەنجیری گران (١١٢٠)
جا هەموو ئینسان چ باش بێ یا دەنی    نا مەکەی ئەعمالی خۆی نێو گەر دەنی (١١٢١)
حیرسی تۆ بۆ کاری تۆ وەک ئاتەشە    تا لەنێو ئاگربێ پۆلوو، هەر گەشە (١١٢٢)
ئەو ڕەشایی بووی ڕەژی نێو نا ڕنیهان    هەر کە ئاگر ڕۆی ڕەشایی بووعەیان (١١٢٣)
حیرسی تۆ کردی ڕەژی پۆلوویی گەش    گەر نەما حیرس، ما ڕەژی وەک پێش ڕەش (١١٢٤)
ئەو دەمەی دیمان ڕەژی ، پۆلوویی گەش    نارەوایکرد، نەک ڕەژی تاریک و ڕەش (١١٢٥)
ئازە،کارت پێدەدا نیشان زەریف    ئاز وەلاچی، کار دەمێنێ زۆر کەسیف (١١٢٦)
گەر کو قۆرەجوان نیشان دا حیلەگەر    وا دەزانێ گەیوە، خۆشە، شەخسی کەر (١١٢٧)
ئیمتیحان گەر کو بکا هەر ئەو زەمان    ئاڵ دەبن بەو ئیمتیحان لەو گشت ددان (١١٢٨)
بەس هەوەس باعیس بوو داوی دی، بەدان    میوەکاڵ بوو، ئاز بەوی دا خۆش نیشان (١١٢٩)
ئاز لەکاری دین و خێرکە، داخواز    چون جوانن، گەر وەلاش چن حیرس و ئاز (١١٣٠)
جوانەخێر بۆخۆی بەتەنها نەک بەغەیر    شۆقی حیرسیش لاچێ، هەیتی شۆق، خەیر (١١٣١)
کاری دونیا شۆقی حیرسی گەر نەما    وەک ڕەژی وایەکەنەی مێنێ دەما (١١٣٢)
حیرسەباعیس گەر فریو دەخوا مناڵ    سواری دارەشادمان و خۆشحاڵ (١١٣٣)
ئەو مناڵەگەر لەخۆی دا ئاز نەدی    پێکەنینی دێ بەمنداڵانی دی (١١٣٤)
بۆچی کردم کاری وا بۆ پێکەنین؟    پێی نیشاندام ئاز، سرکە، ئەنگەبین (١١٣٥)
چون نەبوو ئاز هیچ لەکاری ئەنبیا    وەک چرا ڕوونەو، عەزیمە وەک چیا (١١٣٦)

زۆر لەچاکان چاکیان کرد مەسجیدان — لەو بینایەی مەسجیدی ئەقسا جودان (١١٣٧)
چونکەموخلیس بوو بەکابە، زۆر خەلیل — قەدری کابەزیاد دەبێ، هەر بەو دەلیل (١١٣٨)
فەزڵی ئەو مەسجید بەخاک و بەر نییە — سازکەری وی حیرس و ئازی هەر نییە (١١٣٩)
قەت لەهیچ کار ئەنبیا وەک خەڵک نین — هەم لەمەسجید هەم کتێب هەم ماڵ و ژین (١١٤٠)
نە، ئەدەبیان، نە، غەزەبیان، نەعەزاب — نەلەخەو دا، نەقیباس و، نەجەواب (١١٤١)
بۆ هەموویان بوو جودا لێک جاهو فەڕ — گیانیان بوویان جودا لێک باڵ و پەڕ (١١٤٢)
زیکری حاڵی وان بەدڵ لەرزین دەدا — کاری وان بۆ کاری ئێمەموقتەدا (١١٤٣)
هێلکەیان زێڕە مریشکانیان ئەوان — وەختی شەو گیانیان دەبینێتن بەیان (١١٤٤)
هەرچی بێژم من بەدڵ چاکەی ئەوان — هەر کەمم کوت ناقیسم کرد من بەیان (١١٤٥)
مەسجیدی ئەقسا دروست کەن ئەی کیرام — چون سولەیمان هات لەبۆ وێ، (والسلام) (١١٤٦)
گەرپەریودێو سەرکەشی کەن یەک بەیەک — بەند،دەخەن سەرلاق وئەستۆی وان مەلەک (١١٤٧)
دێو کەکەج بڕوا بەفێڵ و مەکرو زەڕق — دێتەسەر وی تازیانە، چەشنی بەڕق (١١٤٨)
وەک سولەیمان بە، هەتا دێوانی تۆ — بەرد ببڕن، چا بکەن ئەیوانی تۆ (١١٤٩)
وەک سولەیمان بە، بەبێ حیلەگەری — تا موتیعت بن هەموو دێوو، پەری (١١٥٠)
خاتەمی تۆ ئەو دڵت ئەی هووشیار — دێو نەکا لێت خاتەمی قەلبت شکار (١١٥١)
جا دەبێ حاکم لەسەرتۆ، دائیمی — دێو بەئەنگوستیلەکەی تۆ، ئەو دەمی (١١٥٢)
ئەی دڵە، حوکمت ئەتۆ، لا، هەر هەیە — حوکمو فەرمانت لەسەر دا، هەر هەیە (١١٥٣)
جارو باریش دێو دەبێتەیەک ئەمیر — خۆ بەڵام جۆڵا هەموو ناچنن حەریر (١١٥٤)
ئەو تەکانەی بۆ حەسیرەو بۆ حەریر — لێک جودان زۆر وەک ئەسیرو وەک ئەمیر (١١٥٥)

**داستانی شاعر و هەدیەدانی شا، بەوی و دوو بەرابەر کردنی هەدیە و خەڵات بە تەقازای ئەو وەزیرەی کە نێوی ئەبولحەسەن بوو ..**

**خولاسەی داستان ..**

شاعرێک بەهیوای خەڵات و بەرات وگەیشتن بەجاەو مەقام شێعرەکی لەمەدحی شایەک کوت وچۆ بارەگای شا، شێعرەکەی بۆ شا خوێندەوەکەوەزیرو ئەترافیان لەوێ حازربوون شا، ئەوشێعرەی زۆر پێ خۆش بوو ودەستووری دا کەهەزار سکەی زێڕ بدەن بەوی .. وەزیر کەپیاوێکی خۆش ئەخلاق وبەهیممەت بوو کوتی ئەی پادشا، ئەو هەدیەو پاداشە بۆشاعرێکی وا عالی وبەئەرزیش و زانا، زۆر کەمە.. واچاکە دەهەزار سکە بەو بدەن .. دووبارەوەزیر بە

بەیانێکی جوان و بەئیستیدلال شای قانع کرد کەدەهەزار سکەش کەمە عاقیبەت شا، پاش بیستنی قسەکانی وەزیر دەستووری دا کەبێجگەلەو دەهەزار سکە خەڵاتی زۆر قابلیشی بدەنێ، شاعیر پاش وەر گرتنی ئەو هەموو هەدیەو خەڵاتە، زۆر شادمان و خۆشحاڵ بوو، و ویستی کەبزانێ باعیسی ئەوهەموو هەدیەو خەڵاتەکێ بوو؟ ئەتراڤیانی شا بەویان کوت کەباعیسی ئەو هەموو پاداش و خەڵاتەفلان وەزیرەبوو ... شاعیر کەزۆر خۆشحاڵ بوو بۆ ئیزهاری تەشەککور وسپاس لەوی چەن شێعرێکیشی بۆ وی کوت .. چەند ساڵێک لەو بەسەرهاتەگوزەرا وشاعیر دووبارەگرفتاری تەنگدەستی وفەقری ماڵی بوو و تەسمیمی گرت کەدوو بارەبچەتەوەدەرباری شا، وشێعرێکی بۆ بخوێنێتەوە وهەدیەو خەڵاتێکی باش وەر بگرێ ..وئیحتیاجاتی خۆی پێ بەر تەرەف بکا شێعرەکەی کەبۆ پاشا خوێندەوە، شا هەر وەک عادەتی دائیمی خۆی دەستووری دا کەهەزار سکەی بدەنێ بەڵام ئەو جارەوەزیرێکی دیکەلەوێ بوو و ئەو وەزیرەخۆش ئەخلاقەی پێشو زۆر لەمێژ بوو کۆچی دوایی کردبوو.. وئەو وەزیرەی کەلەجێی وی بوو بەپێچەوانەی وی پیاوێکی زۆر خەسیس و قرنیس و پەست تەبع بوو، هەرلەگەڵکو وەزیر بیستی کەشا دەیهەوێ هەزار سکەپاداش و ئەنعام بدا بەوی، زۆر بەپەرێشانی هاتەلای شا، وکوتی ئەی پادشا لەحاڵێک دا کەخەرجی دەوڵەت زۆر گرانەمەسلەحەت نییەکەهەزار سکەبدرێتەبەو شاعیرە، ئەگەر شا ئیجازەبدا، ئەمن بەبیست وپێنج سکەڕازی دەکەم، شا کوتی بۆ خۆت دەزانی، وەزیری ڕییاکار بەموقتەزای ئەو زەربو لمەسەلە( بۆ مردن دەیگرێ تا بەنۆ بەتێ ڕازی بێ) ئەوەندەی ئەو شاعیرە بێچارە لە ئینتیزار ڕا گرت و ئەو ڕوو، سبەی دەگەڵ وی کوت تا چەند مانگێک گوزەرا، بەڵام خەبەرێک لەسکە نەبوو شاعیری بێچارەکەلەو هەموو ئینتیزارەئازوردەو خەستەو نارەحەت ببوو بەوەزیری کوت ئەوەندەم ئینتیزار کێشاوەکەنیزیکە بمرم .. ئەگەر بەڕاستی هیچ خەبەرێک لەسکەنییەپێم بڵێ تا وەدوای کاری خۆم کەوم وەزیر کەدیتی مەقسوودی حاسڵ بووە، پێیکوت زۆر چاکەوەرەئەو بیست و پێنج سکەبگرەو برۆ شاعیر ئەو هەدیەکەمەو ناقابیلەی وەر گرت، بەڵام واق و وڕ مابوو، ناچار لە دەر کەوانی پرسی بۆ دەفعەی ئەووەڵ کەشێعرم کوت ئەو هەموو خەڵات و پاداشەیان دا بەمن؟ بەڵام ئەو چەلەئەو ئەندازەکەمەیان دامێ، پێیان کوت شوکری خودا بکەکەئەوەندەشت وەدەس کەوتووەهەرچی زووترە لێرە برۆ نەوەک وەزیر پەشیمان بێتەوە، چونکەئە وەندەشمان بەخواهیش و فێڵ لەوی وەر گرتووە، شاعیر کوتی نێوی ئەو وەزیرەمەلعوونەچییە؟ کوتیان.. حەسەن، کوتی زۆر عەجیبەئاخر وەزیری پێشوش نێوی حەسەن بوو،وئەوەندەی بەخشش و بڵیند هیممەتی لەخۆی نیشان دا، وئەو وەزیرەش نێوی حەسەنە، بەڵام مەزهەری شەقا وەت و پەستییە..

شێعری هینا شاعیرێک بۆ لایی شاه ‌‌ ‌ بێتەدەستی وی هەتا ئیکرام و جاه (١١٥٦)
شاکوتی زوو، بەو بدەن زێڕ یەک هەزار ‌ ‌ خەڵعەت و ئەنعامی دیش بەو کەن نیسار (١١٥٧)
جا وەزیر دەیکوت کەمە، بۆ وی هەزار ‌ ‌ دەه هەزاری وێدەتۆ ئەی شەهریار (١١٥٨)
شاعیرێک وا،تۆش کەدەستت وەک یەمە ‌ ‌ دەه هەزارم من کەکوت، بۆوی کەمە (١١٥٩)
زۆر دەلیلی کوت وەزیر بۆ شەهریار ‌ ‌ تا عەتا کا، زێڕ، بەشاعیر دەه هەزار (١١٦٠)
شا بەوی دا هەم خەڵات هەم دەه هەزار ‌ ‌ قەلبی وی بوو جێگەشوکری شەهریار (١١٦١)
ئەو لەزۆر ئەشخاس کردی پرسیار ‌ ‌ کێ ئەوی ناساند وا، لای شەهریار؟ (١١٦٢)
جا دەیان کوت بەو، فڵان شەخسی وەزیر ‌ ‌ نێو حەسەن، پاک و تەمیز خوڵق و زەمیر (١١٦٣)
یەک قەسیدەی بۆ وەزیر کوت ئەو زەمان ‌ ‌ جا، لەبۆ لای ماڵ گەڕاوەشادمان (١١٦٤)
جا، بەبێ لێوو زبان دەیکرد سەنا ‌ ‌ ئەو خەڵاتی شاهو، شاهی گیان پەنا (١١٦٥)

**هاتنەوەی شاعیر پاش چەند ساڵان بەهیوای بەخششی بەو جوورەودستوور دانی شا، تیبقی عادەتی پێشوی خۆی بەیەک هەزار دینار وکوتنی وەزیری تازەکەئەویش نێوی حەسەن بوو، بەشا، کە ئەو ئەندازە زۆرە و و دەوڵەت خەرج و هەزینەی زۆرە خەزێنەش خاڵییە، ئەمن ئەوی بەبیست و پێنج سکە ڕازی دەکەم ..**

هاتەوەشاعیر لەپاشی چەند ساڵ ‌ ‌ تا وەدەس بێنێت ڕزقێک بۆ مناڵ (١١٦٦)
ئەو کوتی هەر کات کەئینسان بوو نەدار ‌ ‌ دەرکی ئازموودان بکا، با ئیختیبار (١١٦٧)
بۆ کەڕەم گەر دەرکەکم کرد ئیمتیحان ‌ ‌ حاجەتی نوێم، لەو دەوێ گشت کات و ئان (١١٦٨)
سیبوەیە، مەعنایی ئەڵلا، وا، دەکا ‌ ‌ کێ نیبازی بێ، لەوی داوا، دەکا (١١٦٩)
ئەو کوتی من هەر لەتۆ داوا دەکەم ‌ ‌ چون لەلای تۆیەنیبازم، وا دەکەم (١١٧٠)
سەت هەزارا ن شەخسی عاقڵ وەختی دەرد ‌ ‌ گشت دەناڵێنن لەدەرگای زاتی فەرد (١١٧١)
کوا نەفامی ئەحمەقیش قەت وا دەکا ‌ ‌ شت لەقڕنیسی خەسیس داوا دەکا؟ (١١٧٢)
گەر نەیان دیبایەلوتفی کردگار ‌ ‌ چۆن دەیان کرد عاقڵان گیانیان نیسار؟ (١١٧٣)
بەڵکەگشت ماسیان لەنێو ئەمواجی یەم ‌ ‌ یا پەڕەندانی حەوا زۆر یانەکەم (١١٧٤)
فیل و گورگان، هەر وەها شێری شکار ‌ ‌ ئەژدیهای گەو ڕەو عەزیم و، موور و مار (١١٧٥)
بەڵکەخاک و ئاوو، با، هەر والە، نار ‌ ‌ لەو دەبەن سوود، هەم لەدەی دا، هەم بەهار (١١٧٦)
جا، لەحەق داوا دەکا وا ئاسمان ‌ ‌ حافیزم بە، ئەی خودا، هەر کات و ئان (١١٧٧)
عیسمەت و، حیفزت لەبۆ من بۆ عەموود ‌ ‌ ئاسمانان لوول دەدا دەستی وەدوود (١١٧٨)

جا دەڵێ عەرزیش کەبمکەبەر قەرار    ئەی خودای دات نام لەسەر ئاو، وەک سووار (١١٧٩)

جێی ئومێدی خەڵکەخوای باڵا و نەوی    فێر دەبن ڕەفعی نییاز عالەم لەوی (١١٨٠)

وا لەحەق بۆ ئەنبییا فەر مان دەهات    بگرەکۆمەک هەم بەسەبر و هەم سەلات (١١٨١)

قەت لەغەیری حەق مەکەداوا ئەتۆ    جوستو جۆکە، ئاو لەیەم نەک ئیشکەجۆ (١١٨٢)

غەیری خواش گەر پێت بدا هەر خوایەدای    چون لەدڵ وی، مەیلی بەخشش خوایەنای (١١٨٣)

ئەو کەسەی دوژمن بەزێڕان یاد دەکا    خۆی دەزانێ چەندەدۆستان شاد دەکا (١١٨٤)

ئەوچەلەش شاعیر لەبۆ لوتف و عەتا    ڕووی لەلای شا کرد، بیداتێ هەتا (١١٨٥)

هەدیەیی شاعیر فەقەت شێعری نەوە    تا خەڵات بگرێ لەدەس موحسین بەوە (١١٨٦)

موحسینان زێڕ دادەنێن زۆر بۆ عەتا    شاعیران گەربێن بەوانی دەن، هەتا (١١٨٧)

سەت بەرابەر شێعرەکی خۆش لای ئەوان    باشترەتازێڕو پارجەی زۆر جووان (١١٨٨)

تا دەمی ئەووەڵ حەریسی نانەبەس    چونکەقووت و نان ستوونی گیانەبەس (١١٨٩)

زۆر دەکا ئەو مەکرو فێڵ و غەسب و کار    بۆ تەماع گیانی دەکا، ئاسان نیسار (١١٩٠)

گەر بەنودڕەت بێ نییاز بوو ئەو لەنان    دەیهەوێ تەعریف لەوی کەن شاعیران (١١٩١)

تا کو تەعریف کەن هەموو ئەجدادی وی    بچنەسەر مینبەر بەزیکرو یادی وی (١١٩٢)

تا شکووهو عیززەتو ئیکرامی وی    بچتەگوێی ئەو کەس کەبیستی نامی وی (١١٩٣)

خەڵقی کرد خوا، ناس بەشکڵ و ڕوویی خۆی    دای بەوی حەق جا، لەخوڵق وخوویی خۆی (١١٩٤)

چونکەشوکرو حەمدی ویست خوا دائیمی    شوکرو حەمدی ویست وەکوو وی ئا دەمی (١١٩٥)

خاسسەخوا ناسێک کەفەزڵی بێ، زیاد    چەشنی هەنبانەی سەلیم پڕ بێ لەباد (١١٩٦)

گەر نەبێ لایق بەبای فەزڵ و سەنا    کون دەبێ هەنبانەدەڕوا بۆ فەنا (١١٩٧)

من لەخۆم نەم کوت میسالە واللە خۆ    سەر سەری مەگرەئەگەر هوو شیاری تۆ (١١٩٨)

گرتییان ئیراد لەئەحمەد بۆ عیناد    بۆ دەبێ ئەحمەد بەتەعریف، هێندەشاد؟ (١١٩٩)

چۆوەلای ئەو شایە شاعیر، شێعری برد    مەدحی ئیحسانی دەکرد ئیحسان نەمرد (١٢٠٠)

موحسینان مردن دەما، ئیحسان بەڵام    خۆش بەحاڵی وەی سەخای بوو بەر دەوام (١٢٠١)

زاڵمان مردن لەوان زۆر یادگار    وای بەحاڵی وەی کەهێنای فێڵ بەکار (١٢٠٢)

وای نەبی کوت خۆش بەحاڵی ئەو نەفەر    پاشی کاری باش لەدونیا ڕۆییەدەر (١٢٠٣)

مرد، موحسین چاکەکەی وی ماوەهەر    چووک نییەچاکە، لەلای خوای داد گەر (١٢٠٤)

وای لەوەی مرد و دەما عسیانی وی    مەرگ، لانابات ڕەنجی گیانی وی (١٢٠٥)

باسی شاعیرکەئەوەی لانێ کەنار    چونکەشاعیر زۆر نەدارەو، وامدار (١٢٠٦)
بردی شاعیر شێعر بۆلای شەهریار    بەو ئومێدی بەخشش و ئیحسانی پار (١٢٠٧)
شێعرەکی پڕگەو هەرو زۆر نازدار    بەو ئومێدەبیدەنێ ئیکرامی پار (١٢٠٨)
تیبقی عادەت شا بەوی کوت یەک هەزار    چونکەوابوو عادەتی ئەو شەهریار (١٢٠٩)
ئەو چەل ئەمما ئەو وەزیری باعەتا    خۆ نەمابوو، زۆر بدا زێڕ بەو هەتا (١٢١٠)
بوو لەجێی وی یەک وەزیری دی ڕەئیس    دڵ ڕەق و نا میهرەبان و زۆر خەسیس (١٢١١)
دەیکوت ئەی شا، ئێمەخەرجن زۆر دەوێ    شاعیرێک هێندەی عەتا بەر نا کەوێ (١٢١٢)
ڕوبعی عوشری وی، دەدەم بەو شاعیرە    وا دەکەم بڕوات ڕازی لەو دەرە (١٢١٣)
خەڵکی کوتیان بەو کەپێشان شەهریار    دای بەئەژمار زێڕ بەوی تا دەە هەزار (١٢١٤)
کێ لەپاشی شەکر جووتی نەی؟بڵێ    کێ گەدایی کرد کەشا بوو؟ دەی بڵێ (١٢١٥)
جا وەزیردەیکوت ئەوەن دەیدەم فشار    تا دەکا خەمبار و زار ئەو، ئینتیزار (١٢١٦)
ئەو دەمی گەر بیدەمێ خاکی زەوی    چەشنی گوڵ دەیبا، دەبێ ڕازی، بەوی (١٢١٧)
من عیلاجی کاری وا زۆر چا دەکەم    گشت تەقازاکەر، ئەمن ئیرزا دەکەم (١٢١٨)
گەر لەئا سمان هەڵفڕێ بۆ سەر زەوی    هەر چلۆن بێ من دەکەم ڕازی ئەوی (١٢١٩)
شا بەوی کوت چۆنی دەت وێ وا، بکە    چون دەکا مەدحم، ئەوی شاد چا، بکە (١٢٢٠)
پێیدەکوت ئەو، هەم دوو سەت ئومێد وار    تۆ ئەوان گشتیان بەمن کە، واگوزار (١٢٢١)
جا وەزیر ڕای گرت زۆر نێو ئینتیزار    ڕا دەبرد سێ مانگی زستان، هات بەهار (١٢٢٢)
مونتەزیر ما، هێندەشاعیر، پیربوو    بەو غەم و تەکبیرە، ئەو یەخسیر بوو (١٢٢٣)
پێیدەکوت گەر زێڕ نییەبا من بڕۆم    با لەدەس زیللەت نەجات دەم گیانی خۆم (١٢٢٤)
ئینتیزار گیانی لەمن ئەستاند، بڵێ    نات دەمێ زێڕ، خۆت نەجات دە، زوو هەڵێ (١٢٢٥)
ڕوبعی عوشری ئەو هەزارەی دایە، جا    شاعریش چۆ نێو خەیاڵات دوایە، جا (١٢٢٦)
من هەوەڵ جار بەخششی زۆرم دەدی    پاش عەزابیش نەمدی ئەو چەل، بۆ ئەدی؟ (١٢٢٧)
وای جەواب بیست ئەو وەزیری خۆش نەزەر    زۆر لە مێژە لەو جیهانە چۆتە دەر (١٢٢٨)
ئەو بوو باعیس چەن بەرابەر بوو عەتا    قەت لەبەخشش دا نەبوو، ئەوکات،خەتا (١٢٢٩)
ئێستەئەو ڕۆیشت و ئیحسانی دەبرد    ئەونەمرد، ئەلحەق، بەڵام ئیحسان دەمرد (١٢٣٠)
چوو لەدەسمان شەخسی بەخشەندەو شەریف    هاتەجێی وی یەک خەسیسی زۆرکەسیف (١٢٣١)
بگرەلەو زوو، شەو نەمێنێ جێگەپێت    تاکونەگرێ ڕێت و بستێنێت لێت (١٢٣٢)

مەکرو فێڵی زۆرمان کرد تا ئەمە ساندمان بۆ تۆ لەدەس وی، ئەو کەمە (١٢٣٣)
رووی لەوان کردوکوتی ئەی موشفیقان ئەو وەزیرە، هات لەکام جێگا و مەکان؟ (١٢٣٤)
پێم بڵێن نێوی چییەئەو بێ رەسەن؟ خەڵکی کوتیان نێوی ئەو هەش بوو،حەسەن (١٢٣٥)
جا کوتی ئەی خوایەنێوی ئەو دووان بۆ دەبێ یەک بێ؟ کەزۆر لێکتر جودان (١٢٣٦)
لەو حەسەن نێوی کەئەووەڵ بوو وەزیر حوکمی وی دەیکرد گەلێک ئەشخاس ئەمیر (١٢٣٧)
ئەو وەزیرەش نێوحەسەن، بێ حەد خەسیس چا دەبێ لەو ڕیشەپیسەی، سەت گوریس (١٢٣٨)
شا بەگفتی شەخسی وا گوێ دا، ئەگەر مەملەکەت وێران دەبێ، شاش، دەربەدەر (١٢٣٩)

**شەباهەتی ڕایی خەراپی ئـەو وەزیـرە و فاسید کردنـی جەوانمـەردی شـا، بـە وەزیـری فیرعەون یەعنی هامان و فاسید کردنی قابلییەتی فیرعەون ..**

فیرعەون دەی ویست بۆ حەق بێت ڕام ئەو دەمەی مووسای کەلیم دەیکوت کەلام (١٢٤٠)
ئەو کەلامەی خوێندبا، بۆ بەر ئەگەر هێندەخۆش بووشیر لەوی دەڕژایەدەر (١٢٤١)
گەرلەگەڵ هامان وەزیری دڵ بەکین دا دەنیشت فیرعەون، بۆ ئیسلاحی دین (١٢٤٢)
پێیدەکوت تۆ تاکو ئێستا بووی ئەمیر چۆن دەبی ئێستاکە، بەندەی یەک فەقیر؟ (١٢٤٣)
گفتی هامان چەشنی بەردی مەنجەنیق قەلبی فۆعەونی هەدەف کرد زۆر دەقیق (١٢٤٤)
کردبای مووسا ئەگەر سەت ڕۆژ تەلاش جێ بەجێ دەیکرد هەموو ئەو وردو خاش (١٢٤٥)
عەقڵی تۆ مەغلووبەبۆ نەفس و هەوا نێو وجوودت دەگرێ لێت ڕێگای خووا (١٢٤٦)
گەرکوکامیل ڕەهنەمات بێ جار و بار لادەدا ئەو گفتی کامیل بۆ کەنار (١٢٤٧)
چونکە نیتی گفتی کامیل ئیعتیبار تۆ مەڕۆ بەدوایی وی، نایەت بەکار (١٢٤٨)
وای بەحاڵ ئەو شایەبی بێ وا، وەزیر جێگەبۆ ئەو دوو، جەهەننەم، زەمهەریر (١٢٤٩)
خۆش بەحاڵ ئەو شایە، بی بێ دەستگیر وەختی کاران هەر وەکوو ئاسەف وەزیر (١٢٥٠)
شاهی عادڵ ئاسەفی گەر بێ بەیار ئەو دەمی وەک نوور لەسەر نوور بێ سووار (١٢٥١)
گەر سولەیمان شا ببێ و، ئاسەف وەزیر نوور لەسەر نوورە، عەبیریش سەر عەبیر (١٢٥٢)
شا کەفیرعەون، بێت و هامانیش وەزیر هەر دووزێر چەنگاڵی بەد بەختی ئەسیر (١٢٥٣)
جا دەبێ زوڵمەت لەسەر زوڵمەت سووار عەقڵ و دەو ڵەت دوایەنایەن، هیچ بەکار (١٢٥٤)
غەیری بەد بەختیم نەدی قەت من لەپەست تۆ سەلامم لەو بکە، گەر هاتەدەست (١٢٥٥)
شا وەکوو ڕووح و وەزیر وەک عەقڵی وی عەقڵی فاسید ڕووح دەکا پەست و نەوی (١٢٥٦)
ئەو فریشتەی ڕووح گەر هارووت بێ فێر دەبێ جادوو، هەچی تاغووت بێ (١٢٥٧)

عەقڵی جوزئی قەت مەکە، بۆخۆت وەزیر    عەقڵی کول بۆ خۆت وەزیر کە، ئەی ئەمیر (۱۲۵۸)
تۆ وەزیر مەگرەهەوا، قەت ئەی عەزیز    چون لەتاعەت دوور دەبێ گیانی تەمیز (۱۲۵۹)
چون هەوا، پڕ حیرسە، زاهیربینە بەس    عەقڵ ئەمما فکری ڕۆژی دینە بەس (۱۲۶۰)
عەقڵ بووی دووچاو لەبۆ پایانی کار    بۆ گوڵی مەقسوود دەکێشێ ڕەنجی خار (۱۲۶۱)
تا لەپائیزدا نەبێ سیس و زەلیل    ئەو بەدوور بێتن لە لووتی لووت عەلیل (۱۲۶۲)

## دانیشتنی دێو لەجێگای سولەیمان(علیەالسلام ) و ئەنجام دانی کار وەک سولەیمان و فەرقی ئاشکرا لە نێو ئەو دوو سولەیمانەدا و دیاری کردنی دێو ، نێوی سولەیمان، لەبۆ خۆی

تۆ لەخۆت دا عەقڵی زۆریشت کەدی    مەشوەرەت کە، تۆ دەگەڵ عەقڵی دەدی (۲۳۶۳)
تۆ بەدوو عەقڵان بەڵا، زۆر لا دەنێی    پێت لەسەر ئەو جی سەماوات دادەنێی (۱۲۶۴)
گەر چی بۆخۆی کرد سولەیمان، نێو، دێو    بوو بەشا،بۆ مەملەکەت، خۆی کردەخێو (۱۲۶۵)
گەرچی زاهیر وەک سولەیمان کردی کار    کاری دێو ئەمما لەزاهیر بوو دیار (۱۲۶۶)
خەڵکی کوتیان لەو سولەیمانەن ئەدی    وەک ئەوی دی، بۆ سەفا مان هیچ نەدی؟ (۱۲۶۷)
ئەو وەکوو سوودە،ئەئەو هەش هەر زیبان    هەر وەکوو ئەو دوو حەسەن زۆر لێک جییان (۱۲۶۸)
دێو کوتی وەک شکڵی ڕووی من خوای جیهان    سووڕەتێکی دا بەشەیتان زۆر جووان (۱۲۶۹)
دای بەشەیتان ڕەنگ و ڕوویی من خودا    ئێوە وشیاربن فریوتان با ، نەدا (۱۲۷۰)
گەرکو هاتو ئیددیعای کرد ئاشکار    قەت مەکەن باوەر بەوی ئێوەچ جار (۱۲۷۱)
دێو بەمەکرو فێڵ دەیکوت وا، بەناس    ئاشکرا بوو حەق بەڵام لای چاکەناس (۱۲۷۲)
نادرێت عاقڵ فریو قەت هیچ زەمان    خاسسەئەو کەس عەقڵی وی بێ رازدان (۱۲۷۳)
سیحرو جادوو مەکرو فێڵ وا، نین چ جار    پەردەدانێن سەردڵی دڵ هووشیار (۱۲۷۴)
جا دەیان کوت عاقڵان لەجوابی وی    بەسسەتاکەی ئەی درۆزن، کەج ڕەوی (۱۲۷۵)
تۆ کەگفتت گشت درۆیەو نالەبار    دەچیەدووزەخ بێ گومان لای خوار خوار (۱۲۷۶)
ئەو ئەگەر ئێستا کەمەعزوولەو فەقیر    خۆ لەنێو چاوانی دا، بەدری مونیر (۱۲۷۷)
گەرکو گوستیلەت فڕاند تۆ لەو ئەمیر    بووی بەدووزەخ تۆ، چ دووزەخ؟ زەمهەریر (۱۲۷۸)
تا لەدونیا جێگەژینمان بێ زەوی    سەر لەبۆ تەعزیمی تۆ ناکەین، نەوی (۱۲۷۹)
گەر بەغەفڵەت یەک کەڕەت دانێین سەر    پەنجەیەک مانیع لەعەرزی دێتەدەر (۱۲۸۰)
پێن دەڵێ سەجدەی مەبەن بۆ پەستی وا    سەجدەبۆ بەد بەختی وا، زۆر ناڕەوا (۱۲۸۱)
گەر ئیجازەم پێدرا بۆ لای خودا    شەرحی ئەو باسەم گەلێک جوان من دەدا (۱۲۸۲)

تۆ قەناعەت کە، بەئەو میقدارەکەم          تاکو شەرحی وی چەلێکی دی دەکەم (١٢٨٣)
نێوی خۆی دانا سولەیمان، دێو، بەڵام          حەق عەیان بوو لای عموومو، غەیری نەفام (١٢٨٤)
تۆ لەئیسم و شورەتو نێو، لادەخۆ          ڕووت وەلای مەعناو حەقیقەت، بادەتۆ (١٢٨٥)
تۆ لەحەدد و کاری وی کە، پرسیار          ئەو تەڵەب کە، جا لەنێوان حەددو کار (١٢٨٦)

**هاتنی سولەیمان (علیەالسلام) هەموو ڕۆژێ بۆ مەسجیدولئەقسا، لەپاش تەواو بوونی مەسجید بۆ عیبادەت و ڕێنموونی عابیدان و موعتەکیفان و شین بوونی گیای جوور بەجووری دەرمانی لە نێو مەسجید ..**

جا سولەیمان پێش ئەوەی ڕۆژ هەڵدەهات          خازیع ئەو بۆ مەسجیدی ئەقسا دەهات (١٢٨٧)
هەر گیای شین با ئەگەر لەو مەسجیدە          پێیدەکوت تۆ نێوو، سوودی خۆ ت بدە (١٢٨٨)
بێژەنێوت، بۆ چ شت دەرمانی تۆ؟          بۆ چ کەس نەفعی، لەبۆ کێ زیانی تۆ؟ (١٢٨٩)
کارو نێوی خۆی دەکوت گیا ئەو زەمان          بۆ ئەوەی ژینم، لەبۆ ئەو هەش نەمان (١٢٩٠)
بۆ ئەوەی ژارم لەبۆ ئەو هەش شەکەر          وای دەدا سەر لەو ح، نێوی من قەدەر (١٢٩١)
جا تەبیبان لەو سولەیمان بەو گیا          شارەزا بوون، بوون بەزاناو موقتەدا (١٢٩٢)
جا لەبۆ تیب زۆر کتێبیان چادەکرد          ڕەنجی جیسمانیان بەوان جا، لا دەبرد (١٢٩٣)
ئەو نجووم و تیب، وەحیی ئەنبیان          عەقڵ و حیس ڕێ یان نییەبۆ لا مەکان (١٢٩٤)
عەقڵی جوزئی عەقڵی ئیستیخراج نییە          ئەو بەغەیری فێر بوون، موحتاج نییە (١٢٩٥)
عەقڵی جوزئی قابلی تەعلیمەگەر          بەو بدا تەعلیم بەئیلهام، خوای لەسەر (١٢٩٦)
خۆ یەقین سەنعەت بەئیلهام بوو عەیان          عەقڵ لێی زیاد کرد پاشان، ئەی فلان (١٢٩٧)
چاک بنۆڕە عەقڵی ئێمە کوا، چ کات          فێر دەبێ گەر کو کەسێک ئەو فێر نەکات؟ (١٢٩٨)
گەر چی زۆر وشیارو زیرەک بوو بەڵام          بێ موعەللیم بۆی نەبوو هیچ پیشە، ڕام (١٢٩٩)
دانیشی فەن گەر بەدەس ئەو عەقڵەبا          کار بەبێ ئوستا د، حاسڵ با، دەبا (١٣٠٠)

**فێربوونی شوغڵی گۆڕ هەڵقەندنی قابیل لە زاغ پێش ئەوەی کە زانستی گۆر هەڵقەندن لە دونیادا پەیدابێ ..**

هەڵقەنینی گۆڕ کە کارێک زۆر کەمە          کوا لە دەستی عەقڵ و فیکران دێ ئەمە؟ (١٣٠١)
فەهمی وای قابیل نەبوو بێ شک دەنا          بۆچی هابیلی لە سەر سەر دادەنا؟ (١٣٠٢)
چۆن وُنی کەم کوشتەکەم ئەی خوا ئەمن؟          ئەو لەنێو خوێن دا شەڵا لەم،جا ئەمن (١٣٠٣)

دی کەزاغێک زاغەکی مردووی بەزار ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ لەو حەوایە، دێ لەبۆ لای وی، بەغار (١٣٠٤)
هاتەعەرزی گۆڕەکی چاکرد هەتا ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ دانشی گۆڕ ئەو بەقابیل کا، عەتا (١٣٠٥)
جا بە چەنگاڵ تۆزو خۆڵی لادەبرد ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ زاغی مردووی زوو لەنێو خۆڵ ڕا دەکرد (١٣٠٦)
خستیە نێو گۆڕ جا وەسەر وی خۆڵ دەدا ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ دانیشی گۆڕ هات لەئیلهامی خودا (١٣٠٧)
جا کوتی قابیل کەبمرم چاترە ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ چاو کەزاغێک چەن لەمن زانا ترە (١٣٠٨)
عەقڵی کول بۆی هات لە(مازاغ البصر) ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ عەقڵی جوزئی کردی بۆ هەرلا نەزەر (١٣٠٩)
عەقڵی حەق بین، نووری خاسان ئەی فلان ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ عەقڵی زاغ، ئوستادی گۆڕی مردووان (١٣١٠)
گەروەدووی زاغان کەوێتن یەک گییان ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ ئەو لەبۆلای گۆڕدەبەن نەک جێی ژییان (١٣١١)
جا مەڕۆ بەدوایی نەفسی چەشنی زاغ ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ چونکەدەت با ئەو لەبۆ قەبران، نەباغ (١٣١٢)
گەر دەڕۆی پەیڕەو بە، بۆ عەنقایی دڵ ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ ڕووکەقاف و مەسجیدی ئەقسایی دڵ (١٣١٣)
گیای جەدید هەردەم لەبیر و ڕایی تۆ ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ شین دەبێ نێو مەسجیدی ئەقسایی تۆ (١٣١٤)
حەققی وی تۆ وەک سولەیمان پێ بدە ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ ئەو بناسەنەک ئەوی ژێر پێ بدە (١٣١٥)
چونکەحاڵی ئەو زەمینەن بێ ڕییا ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ بۆ دەکەن ئاشکار، ئەنواعی گییا (١٣١٦)
نێو زەمین گەر نەیشەکەر بێ،یا نە،نەی ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ تۆ بەگیا ئەو عەردەچاک تەشخیس دەدەی (١٣١٧)
جا زەمینی دڵ کەئەفکار ، گیایی وی ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ ڕازی دڵ ڕوون بوو بەفکرو ڕایی وی (١٣١٨)
گوێ گری باشم ئەگەر کو با، ئەمن ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ سەت هەزارم شین دەکرد گوڵ، جا ئەمن (١٣١٩)
گوێ گری من گەر کو هەبێ عەقڵی کز ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ لەو دڵەم نوکتان دەڕۆن هەر چەشنی دز (١٣٢٠)
جونبشی هەر کەس لە بۆ لای جازبە ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ جەز بی سادق خۆ نەوەک ئی کازبە (١٣٢١)
جار دەڕۆی بۆ لای زەلال جار لای هودا ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ دیار نین هیچ پەتک و ، ئەو کەس تۆ دەبا (١٣٢٢)
وشتری کوێرە بەهاو سارە سەرت ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ چاو مەکە هاوسار ، بنۆڕە کێشەرت (١٣٢٣)
کێشەرو هاوسار کە هەر دوو بان دیبار ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ بۆ بە دونیایان دەکوت (دار الغرار)؟ (١٣٢٤)
کافریش دیبای ئیمامی وی سەگە ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ مەسخەرەی دێوی کەسیفی بەدڕەگە (١٣٢٥)
بۆ دەچوو بەدوایی وی وەک شەخسی پەست ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ زوو ئەلەو نامەردە، دەی کێشاوە دەست (١٣٢٦)
گا، لەقەسساب گەر کو هەیبا هیچ خەبەر ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ چۆن بەدووی وی دا دەچوو بێ دەردەسەر (١٣٢٧)
یا چلۆن دەیخوارد لەدەستی وی گیا ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ چۆن بەفێڵ شیری لەوی دەستاند،یا؟ (١٣٢٨)
خوار دباشی پێی نەدەکرا هەزم گەر ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ ئەو لەمەقسوودی گییا هەیبا خەبەر (١٣٢٩)
جا، ستوون بۆ ئەو جیهانەغەفڵەتە ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ زڵلەخواردن پاش هەڵاتن، دەو ڵەتە (١٣٣٠)

ئاخری وی زللە، غاردانی لەسەر    هەر تەلەو وێرانەدا، دێ مەرگی کەر (١٣٣١)
پاش تەلاش گرتت ئەگەر یەک دانەکار    عەیبی وی ئەو دەم لەتۆ بوو نادیار (١٣٣٢)
بۆیەپێت دەکرێ ئەتۆ ئەنجامی کار    چون دەپۆشێ عەیبی وی‌لێت کردگار (١٣٣٣)
گشتی ئەفکاری‌کەبۆت‌هەن‌هەروەهان    عەیبی ئەو فیکرانە گشت‌بوون لێت‌نیهان (١٣٣٤)
گەر کو مەعلووم بایەعەیبی وی لەتۆ    زۆر لەویت تۆ دوور دەکرد ئەو کارەخۆ (١٣٣٥)
گەر پەشیمان بی لەئا خر تۆ لەکار    کوا کەناسیبات دەچووی بەدوای، بەغار؟ (١٣٣٦)
دا دەپۆشێ لێن لەئەووەڵ کردگار    تا بکەین چۆنی قەزا، لێن ویست کار (١٣٣٧)
گەر قەزا هات حوکمی خۆی هینایەجێ    چاو وەبوو، دیتی پەشیمانی کەدێ (١٣٣٨)
ئەو پەشیمانیەش قەزایەک بوو جودا    لابەئەو تۆ جا پەرستیش کەخودا (١٣٣٩)
عادەتی تۆ گەر پەشیمان بوون بوو    ئەو پەشیمانیەش پەشیمانی لەدوو (١٣٤٠)
نیسفی عومرت جا پەر یشانی ئەتۆ    نیوەکەی دیکەش، پەشیمانی ئەتۆ (١٣٤١)
ئەو پەشیمانیەت لەلای خۆ، لابەرە    تۆ بەفیکرو کاری چاتر وا وەرە (١٣٤٢)
گەر لەلای تۆ کاری چاتر هیچ نییە    ئەو پەشیمانیەت لەبەر فەوتی چییە؟ (١٣٤٣)
خوا پەرەست بە، گەر دەزانی رێی سەحیح    گەر کونایزانی، دەزانی چۆن قەبیح؟ (١٣٤٤)
تا نەناسرێ پیس، نا ناسرێ جووان    زید بەزیدد ی خۆی دەناسرێ، ئەی جەوان (١٣٤٥)
لا ت نەنا گەر فکری بەد تۆ بۆ کەنار    بەد ئەتۆ ئەنجام دەدەی، بێ ئیختیار (١٣٤٦)
گەر کو عاجز مای* پەشیمانی لەبۆ؟    عیللەتی عەجزت ئەتۆ کەجستو جۆ (١٣٤٧)
لەو جیهانەنەیدەدی کەس بێ گومان    عاجزی بێ قادرێ قەت، هیچ زەمان (١٣٤٨)
هەر وەهان گەر ئارەزووی بۆت هاتەسەر    تۆ لەعەیبی وان حیجابت کردەبەر (١٣٤٩)
گەر بەدی ئەو ئارەزوو با، ئاشکار    نەت دەکرد تۆ، فکرو بیری وا، چ جار (١٣٥٠)
عەیبی ئەو کارت ئەگەر دیبا ئەتۆ    کەس بەزۆری نەی دەبرد، بۆ و، لا، ئەتۆ (١٣٥١)
بەو فلاّ ن کار بۆیەتۆ وا مونکیری    چونکەعەیبی ویت ئەتۆ دی زاهیری (١٣٥٢)
ئەی خودایی خالقی ئەو عالەمە    عەیبی کاری بەد مەکە، پنهان لەمە (١٣٥٣)
پێن مەدەنیشان عەیبی کاری باش    تا نەچێ عومرن بەدوور بوون لەو، بەلاش (١٣٥٤)
تیبقی عادەت، ئەو سولەیمانی بەناو    هاتەمەسجید پێش ئەوەی هەڵبێت‌تاو (١٣٥٥)
تیبقی عادەت شا هەموو رۆژ وای دەکرد    ئەو لەمەسجید، جستو جۆی لەگیای، دەکرد (١٣٥٦)
تا ببینێ دڵ بەچاوی پاک عەیان    ئەو گیایا نەی لەعالەم بوون نیهان (١٣٥٧)

**داستانی سۆفیەک کەلەنێو باغێک سەری لەسەر ئەژنۆی خۆی دانـابوو ومەشغوولی رابیتەو موراقەبەبوو، ودۆ ستەکانی پێیان کوت سەر هەڵێنەخۆشحاڵ و شادمان بـە، و تەماشاکە، ئەو گوڵانەوگیایا نەی بۆن خۆش و دەنگی خۆشی باڵندان وئاساری ڕەحمەتی خوداوەند والا مەقام ...**

**خولاسەی داستان ..**

یەکێک لەسۆفیان لەبۆ شاد بوونی ڕووحی خۆی لەباغێک دانیشت ومەشغووڵی ڕابیتەو موراقەبەبوو، کابرایەکی فزوول کەلەحاڵەتی مورا قەبەو ڕابیتەنارەحەت و دڵتەنگ بوو ڕووی لەسۆفی کرد و پێیکوت ..تۆ بۆ نوستووی؟ هەستەتەماشای داڕ و گیای سەرسەبزبکەسۆفی کوتی هەرچی جوانیەدەدڵی ئینسان دایە..و هەرچی جوانی لەدونیادایە عەکس و ئینعیکاسی ئەو جوانیانەیەکەدەدڵ دایە، بەڵام عەوام وا فکر دەکەن کەئەو جوانیانەی زاهیری دونیایەزاتین وبەهیچ شتێک وا بەستەنین جا لەبۆیەعاشق و شەیدای وان دەبن ..وەختێک کەپەردەی دونیا لەبەین لابرا، حەقیقەت دەبێ ئاشکرا ..

سۆفی یەک چۆ باغ هەتا دەر کا، کەسەر — دایدەنا سەر هەر دوو ئەژنۆی خۆیی،سەر (١٣٥٨)

چۆ دەنێو فیکر و خەیاڵاتان ئەو — بوو مەلوول یەک بولفزوول لەو جوورەخەو (١٣٥٩)

بۆچی نوستووی؟، چاو کە، سۆنعی کردگار — چاو لەداران و لەگیای نێو مێر غوزار (١٣٦٠)

گوێ دەئەمری حەق کەفەرمووی (انظروا ) — تۆ وەلای ئاساری ڕەحمەت، ڕووکەڕوو (١٣٦١)

پێیدەکوت ئاساری ڕەحمەت دڵ بوو، هەر — هەرچی زاهیر بێ ئەسەر بوو بۆ ئەسەر (١٣٦٢)

باغ و سەبزان جێگەیان نێو گیان، ئەوان — زاهیری وان عەکسەنێو ئاوی ڕەوان (١٣٦٣)

گەر کودیتت باغ لەنێو ئاو،ئەی جەناب — لوتفی ئاو بەو باغ دەداتن، ئیزتیراب (١٣٦٤)

باغ و میوان جێگەیان ڕاس نێو دڵە — عەکسی لوتفی دڵ لەسەر ئاوو، گڵە (١٣٦٥)

گەر نەبایەعەکسی ئەو سیرڕو سروور — بۆ بەدونیای خوا دەکوت ( دارالغروور )؟ (١٣٦٦)

ئەو غرووڕە، یانی گشت وەهم و گومان — ئینعیکاسی قەلبی پیاوانی خودان (١٣٦٧)

کۆ وەبوون لەو عەکسەگشت مەغروورەکان — چونکەجەننەت بوو لەلای وان ئەو مەکان (١٣٦٨)

جا لەبەر باغی حەقیقەت ڕا دەکەن — زیندەگی بێهوودەبۆخۆ چادەکەن (١٣٦٩)

گەر خەوی غەفڵەت تەواو بوو ئەو دەمی — چاک دەبینن سوودی ڕاستی بێ کەمی (١٣٧٠)

جا لەگۆ ڕستان دێ دادو فیغان — تا قیامەت بەو خەتای کردیان ئەوان (١٣٧١)

خۆش بەحاڵی وەی لەپێش مردن دەمرد — یانی لەو باغی حەقیقی بۆن دەکرد (١٣٧٢)

**داستانی شین بوونی گیای خەڕروب لەگۆشەیەکی مەسجیدی ئەقسا وغەمگین بوونی سولەیمان (علیەالسلام ) لەوی، وەختێک کەوەقسەهات وخاسسییەتی خۆی بە سولەیمان کوت ..**

ئەو سولەیمان وەک چەلان چۆ مزگەوت    گیا یەکی وەک خۆشەیەک بەر چاوکەوت (۱۳۷۳)

گیایەکی زۆر شین وجوان و کەم نەزیر    مات دەبوو دیبای ئەگەر چاوی بەسیر (۱۳۷۴)

جا سەلامی کرد لەوی گیا، بائەدەب    دای جەواب بەو، لەو جوانیەش ما عەجەب (۱۳۷۵)

پێیدەکوت نێوت بڵێ بێ لێوو، زار    ئەو کوتی خەڕرووبە، نێوم، شەهریار (۱۳۷۶)

پێیدەکوت چیت دێ لەدەس؟ تۆ بێژەبۆم    ئەوکوتی وێران دەکەم جێگایی خۆم (۱۳۷۷)

من کەخەڕرو بم دەکەم مەنزڵ خەراو    تێک دەدەم من ژێر بینای ئەو خاک و ئاو (۱۳۷۸)

جا سولەیمان تێگەیشت هەر ئەو زەمان    هات ئەجەل، بڕوا، دەبێ، بۆ لای نەمان (۱۳۷۹)

ئەو کوتی تاکو ئەمن هەم خۆ یەقین    نایەبۆ ئەو مەسجیدەڕەنجی زەمین (۱۳۸۰)

تاکوهەم بێ من، لەدونیا دا ژیبان    مەسجیدی ئەقساش دەی بێتن ئەمان (۱۳۸۱)

جا کەوابێ مەسجیدی مە، ئەو دەمە    تێک دەچێ گەر کو نەمێنێ ڕووح لەمە (۱۳۸۲)

مەسجیدەئەو دڵ کەجیسمی ساجیدە    یاری بەد وێرانکەری گشت مەسجیدە (۱۳۸۳)

شین ببێ گەرحوببێ یاری بەد لەتۆ    تۆ لەلای وی ڕا کە، نەت بێ گفتو گۆ (۱۳۸۴)

هەڵقەنەتۆ ئەو لەڕیشە، خۆ دەنا    مەسجیدت گەڵ تۆ دەبا ئەو بۆ فەنا (۱۳۸۵)

ئەی عەشیق تۆ بۆتەخەڕروبت،کەچی    گەرچی هەر بەدوای کەچی دا، تۆ دەچی (۱۳۸۶)

خۆت بەموجریم بگرەنەت بێ تۆ چ باک    تا کو نەدزێ دەرس، لێت، ئوستادی چاک (۱۳۸۷)

گەر بڵەی فێرم کەئەی ئاموزگار    چاکترە، زۆر زۆر لەکیبرو ئیفتیخار (۱۳۸۸)

تۆ لەبابت فێر ببەئەی خۆش ڕوو    (ڕبنا) ی کوت، ئەو (ظلمنا ) شی لەدوو (۱۳۸۹)

هیچ بەهانەی چا نەکرد ئەو لای خودا    پەرچەمی نەیڕەنگ و فێڵی هەڵنەدا (۱۳۹۰)

ئیبلیس ئەمما وەهای کرد گفتو گۆ    کردمت ڕوو زەرد کەبووم ڕوو سوور ئەتۆ (۱۳۹۱)

تۆ منت ڕەنگ کرد،کەسەبباغم ئەتۆی    عیللەتی جورم و، بەڵاو داغم ئەتۆی (۱۳۹۲)

چاوکەتۆ،( ڕب بما اغویتنی)    مەگرەجا، ڕێی جەبری گەر تۆ ڕەو شەنی (۱۳۹۳)

تۆ لەقوللەی جەبر گرتووتەقەر ار    بۆ وەلات نا بۆ کەنا ر، تۆ ئیختییار؟ (۱۳۹۴)

ئیبلیس چی کرد ئەتۆش هەر وا دەکەی    تۆ لەگەڵ حەق گفتو گۆو، دەعوادەکەی (۱۳۹۵)

گەرکو مەجبووری لەعسیان دا ئەتۆ    شاد بەعیسیانی ئەدی تۆ هێندەبۆ؟ (۱۳۹۶)

کێ دەدا ئەنجامی کاری خۆش بەزۆر؟    کێ دەچێ بۆ گومڕەهی خۆشحاڵ زۆر؟ (۱۳۹۷)
زۆرکەسان تۆیان دەدا پەند، خۆ بەڵام    گوێت نەدا هیچیان و، بوون لات زۆر نەفام (۱۳۹۸)
ڕێی سەحیح هەر ئەو هەیە، تەنهاو بەس    تەعنەلیم نادەن بەغەیری پەس، چ کەس (۱۳۹۹)
کوا کەسێک مەجبوور بێتن وا دەکا؟    کوا لەبۆ ڕێی گرتی وا، دەعوا دەکا؟ (۱۴۰۰)
هەرچی نەفست ویستی هەت بوو ئیختییار    هەرچی عەقڵت ویستی هەت بوو ئیزتیرار (۱۴۰۱)
تێدەگا هەرکەس کەباش و مەحرەمە    زیرەکی بۆ دێو، ئەوین بۆ ئادەمە (۱۴۰۲)
زیرەکی هەر وەک مەلەی بوو نێو بیحار    کەم کەسان بوویان نەجات، پایانی کار (۱۴۰۳)
هەم مەلە، هەم کیبرو کین، بەر هەڵدەتۆ    ئەو هەبەحرە، خۆ نەجەیحوونە، نەجۆ (۱۴۰۴)
جا ئەویش بەحرێکەقووڵ و، بێ پەنا    قووت دەدا حەو دانەبەحران چەشنی کا (۱۴۰۵)
عیشق هەر وەک کەشتییەخۆ بۆ خەواس    کەم دەبێ ئافەت، دەبێ ئەغلەب، خەلاس (۱۴۰۶)
بگرەحیرەت زیرەکی نیتی، چ سوود    زیرەکی زەننە، بەڵام حیرەت شهوود (۱۴۰۷)
عەقڵی خۆت قوربان کە، لای (طاها) ئەتۆ    ( حسبی اللّه) بێژەئەو دەم جا ئەتۆ (۱۴۰۸)
تۆ وەکوو کەنعان مەکە، کەشتیت نەوێ    زیرەکی دای ئەو فریو، تا تێکەوێ (۱۴۰۹)
دەچمەسەرکێوێک بڵێند، لەو لا ئەمن    بۆ بکێشم میننەتی نووح، جا ئەمن؟ (۱۴۱۰)
میننەتی وی چۆن قەبووڵ ناکەی نەفام؟    لای خودا مەقبوولەچاکەی وی بەعام (۱۴۱۱)
چۆن نەکێشین میننەتی وی ئێمەجا؟    خۆ بەچاکەی وی دەدا پاداش، خودا (۱۴۱۲)
چی دەزانی ئەی فریو خۆری حەسوود؟    بەو دەدا پاداشی ئیحسان خوای وەدوود (۱۴۱۳)
خۆزگەنەی با هیچ لەزانستی مەلە    تا لەبۆ لای نووح و کەشتی بای پەلە (۱۴۱۴)
خۆزگەوەک منداڵ لەفێڵ دوور بایەئەو    دەس بەدامێن دایکی خۆی با، ڕۆژو شەو (۱۴۱۵)
عیلمی نەقڵی خۆزگەنەی کرد، با، مەلی    عیلمی وەحیی دڵ، بەوی دا با، وەلی (۱۴۱۶)
گەر بڵەی لای ئەو لیا، وایکوت کیتاب    ڕووحی وەک وەحییت، دەکاتن، تۆ عیتاب (۱۴۱۷)
عیلمی نەقڵی خۆ لەحاس قوتبی زەمان    وەک تەیەمموم وایەگەر بێ، ئا و ڕەوان (۱۴۱۸)
شێت کەخۆت، تۆ جا بەدووی وی دا بڕۆ    ڕەستگاریت دێت بەو شێتیەت، ئەتۆ (۱۴۱۹)
ئەکسەری ئەهلی بەهەشت شێتن بەچاو    بۆیەفەرمووی واله، شا ی دونیا تەواو (۱۴۲۰)
زیرەکی دێنێ گەلێ،کیبرو غروور    شێت بە، تا دڵ بێ لەدەردی وا، بەدوور (۱۴۲۱)
من مورادم خۆ نەشێتی ئەحمەقە    بەڵکەقەستم من لەشێت، شەیدای حەقە (۱۴۲۲)
ئەو ژنانەی دەست بڕ، دێوانەبوون    سووڕەتی یووسوف بوو، وای کرد، وا، نەبوون (۱۴۲۳)

عەقڵی خۆ ت قوربان بکەبۆ عیشقی یار بەس لەلای یار، عەقڵ دەگریتن قەرار (۱۴۲۴)
عەقڵیان نارد عاقڵان بۆ لای حەبیب لێرەما، مەغروور، لەمەحبووب بێ نەسیب (۱۴۲۵)
گەر بەحیرەت عەقڵی سەر تۆ بێتەدەر مووی سەرت سەریان دەبێتەعەقڵ و سەر (۱۴۲۶)
ئێش بەرووح نادات بیر، هیچ لەو جیهان دەشت و باغ چون چادەکەن عەقڵ وگیان (۱۴۲۷)
بچیەهەر دەشت، نوکتەدێن بۆ گوێت بەتاو بچیەباغ نەخلت دەبێتن، تێر لەئاو (۱۴۲۸)
تۆ لەرێی وا عیززەتو، جاهت نەوێ رەهنەمات رووی کردەکوێ تۆش بۆ ئەوێ (۱۴۲۹)
کلکەهەرکەس خۆی بەبێ سەر داتەکان ئەو تەکانەش وەک تەکانی عەقرەبان (۱۴۳۰)
کەج رەوە، شەو کوێرەناحەز، ژارناک کاری وی ئازار دانی جیسمی پاک (۱۴۳۱)
گەر کودیتت، پان کە، لێی سەر ئەو دەمی چونکەئازار دانەخووی وی، دائیمی (۱۴۳۲)
بۆی سەلاحەپان کرێ لەو سەر، ئەگەر تا لەجیسمی پیسی وی رووح بێتەدەر (۱۴۳۳)
بگرەزۆر زوو تۆ لەدەستی شێت سیلاح تا لەتۆ رازی ببێ عەدڵ و سەلا ح (۱۴۳۴)
چون سیلاحی لایە، عەقڵیش هیچ کەنا بیخەدەستی بەند، زەرەر دێنێ، دەنا (۱۴۳۵)

**بەیانی ئەو مەتڵەبەکەعیلم وماڵ و مەقام بۆ ئینسانی خەراب، ناحەزە وەک شەمشیرێک وایە، کەلەدەستی رێگردایە..**

فێری عیلمی کەی ئەگەر تۆ شەخسی پەست رێگرت هیناوە شیرت دا، وەدەست (۱۴۳۶)
چاکترەتۆ شیر بەمەستی رەش بدەی نەک بەشەخسی بەد، لەعیلمت بەش بدەی (۱۴۳۷)
سەروەت و عیلم و مەقامی موعتەبەر فیتنەدێنن بچنەدەس ناکەس ئەگەر (۱۴۳۸)
بۆیەواجب بوو جیهاد بۆ موئمینان تاکو بستێنن لەدەس شێتان، سینان (۱۴۳۹)
شێتەگیانی، شیری تیژە، ئەو تەنی بگرەشەمشیر تۆ ئەلەو پەستی دەنی (۱۴۴۰)
ئەو بەڵای دێنێ مەقام، بۆ جاهیلان نایەبێ یان خۆ هەزارا ن ئەرسەلان (۱۴۴۱)
عەیبی وی پنهان بووگەر بۆ شەهریار هاتەدەر ماری لەکون، چۆ، چۆڵ، بەغار (۱۴۴۲)
پڕ دەبێ سەحرا لەدوو پشک و لەمار شەخسی جاهیل گەر ببێتەشەهریار (۱۴۴۳)
ماڵ و مەنسەب بێتەدەس ناکەس ئەگەر خۆی دەکا بەد بەخت وریسوا، خۆڵ وەسەر (۱۴۴۴)
یا خەسیسە،کەم عەتا ئیعتا دەکا یا بەبێ مەو رید عەتا ئیجرا دەکا (۱۴۴۵)
شا لەجێی سەرباز لەشەترەنج دا دەنێ کاری وا هەر کاری ئەحمەق بوو تەنێ (۱۴۴۶)
گەر حکوومەت کەوتەدەستی یەک نەفام کەوتەنێو چاڵ،گەرچی دەیدی ئەومەقام (۱۴۴۷)
رێ کەناناسێت بۆتەرەهنەما سووت جیهان بەو، رووحی پیسی وی نەما (۱۴۴۸)

تیفلی ڕێگای فەقر، گەرخۆی کردەپیر غوولی بەد بەختی دەکا پەیڕەو، ئەسیر (١٤٤٩)
بێرەلام پێت دەم نیشان مانگ چەن گەشە گەرچی مانگی قەت نەدی ئەو دڵ ڕەشە (١٤٥٠)
تۆ چلۆن دەیدەی نیشان ئەی ناتەواو عەکسی مانگت قەت نەدیوەخۆ لەئاو (١٤٥١)
بوونەسەر وەر ئەحمەقان ئەمما لەبیم عاقڵان سەریان دەبردەژێر گلیم (١٤٥٢)

**تەفسیری یا ایها المزمل ..**

ئەحمەدی گاز کرد بەموززمیل خودا ئەو پەتۆی پێچای لەخۆی،لای با، هەتا (١٤٥٣)
دامەپۆشەتۆ سەرووڕووت ژێر پەتۆ جیسمی سەر گەردان جیهان، هۆشیش ئەتۆ (١٤٥٤)
خۆت مەکەپنهان لەنەنگی موددەعی تۆ کەساحەب شەمعی وحیی، شەعشەعی (١٤٥٥)
ئەی هومام، شەمعی ئەتۆ، هەستەلەخەو چون لەسەر پێ ڕا دەوەستێ، شەم، بەشەو (١٤٥٦)
ڕۆژی ڕەو شەن بێ فرووغی تۆ شەوە بێ پەنات، یەخسیر هەڵۆی شاخ، بۆکەوە (١٤٥٧)
ناخودا بە، تۆ لەنێو دەریای سەفا تۆ کەنووحی دووەمی ئەی مستەفا (١٤٥٨)
هەرچی ڕێ یە، ڕەهنەمای زانای دەوێ خاسسەجێ یەک ڕێگەئاوی بێ لەوێ (١٤٥٩)
هەستەچاو،کاروان لەڕێگا ی لادەدا جا لەهەرلا، دز دەبوونەناخودا (١٤٦٠)
خزری وەختی غەوسی گشت کەشتی ئەتۆی تۆ وەکوو عیسا مەکەتەنها بڕۆی (١٤٦١)
تۆ لەلای ئەوجەمعەشەمعی ئاسمان بالەخەڵوەت دانەبی تۆ هیچ زەمان (١٤٦٢)
بێرەنێو جەم وەختی خەڵوەت خۆ نەما ئەی هودا،وەک کێوی قاف،تۆش وەک هوما (١٤٦٣)
مانگ لەئاسمان ڕێ دەچێ شەو بێ وچان ئەو لەڕێ ڕا ناگرێ، دەنگی سەگان (١٤٦٤)
چۆن سەگان بۆ مانگ لەکاتی شەو دەکەن تاعینانت وا،لەلات عەو عەو دەکەن (١٤٦٥)
کەڕ لەحاستی (ا نصتوا ) بوون ئەو سەگان بۆیەبۆ مانگت دەکەن عەوعەو ئەوان (١٤٦٦)
ئەی شەفابەخش، تۆ مەکەبیمار ڕەها تۆ لەحەیفی کەڕ، لەکوێر مەگرەعەسا (١٤٦٧)
خۆت کوتت هەرکەس کەکوێرێ ڕێ بەرێ بەو دەدا سەت ئەجرو پاداش خوای سەرێ (١٤٦٨)
چل قەدەم هەرکەس کەکوێرێ ڕێ ببا بەو دەدا پاداش بەهەشتی خۆش خودا (١٤٦٩)
جا، بکێشەلەو جیهانەی بێ قەرار تۆ گرووهی کوێر، قەتار بەدوای قەتار (١٤٧٠)
تۆ کەهادی ئەو هەکاری هادییە ماتەمی ئاخر لەتۆڕا شادییە (١٤٧١)
تۆ بنێرەئەی ئیمامی موتەقین ئەو خەیاڵبافانە، تاکو لای، یەقین (١٤٧٢)
بیهەوێتن فێڵ لەتۆ کا، گەر، دەنی غەم مەخۆ تۆ لێیدەدەم لەو گەردەنی (١٤٧٣)

ئەو کەکوێرە،کوێریەتی دی دێتمەسەر — بەو دەدەم زار، ئەو لەلای وایەشەکەر (١٤٧٤)
بەس لەنووری من دەبوون عەقڵان ڕوون — مەکرو فێڵانیش لەمەکرم فێر دەبوون (١٤٧٥)
کوا لەلای پێی نێرەفیلانی جیهان — قودرەتێک بۆ خێوەتانی تورکەمان؟ (١٤٧٦)
ئەو چرای فێڵان لەلای بای سەرسەرم — بێ دەوامەئەی عەزیز پێغەمبەرم (١٤٧٧)
هەستەفووکەتۆ دەسووری سامناک — بێنەدەر تا سەت هەزار مردوو لەخاک (١٤٧٨)
تۆ کەئیسرافیلی وەختی وا، بکە — پێش قیامەت قیامەتێک بەر پا، بکە (١٤٧٩)
هەر کەسێ بێژێ کەکوا قیامەت ئەدی؟ — بێژەمن، قیامەت لەمن دا هاتەدی (١٤٨٠)
چاک بنۆڕەتۆ کەکردت پرسیار — لەو قیامەت چادەبێ عالەم هەزار (١٤٨١)
گەر کوپرسیار کەر نەبێ ئەهلی قنووت — جوابی ئەحمەق خۆ نەبوو غەیری سکووت (١٤٨٢)
ئاسمانی خوا سکووتی دا جەواب — گەر دوعای داعی نەبێتن موستەجاب (١٤٨٣)
سەت ئەسەف ئێستا کە، وەختی خەرمەنە — ڕۆژ ڕۆی، شەو هات، ماوم یەک تەنە (١٤٨٤)
ئەو کەلامەبەر بڵاو، کات کەم، بەڵام — بۆ بەیانی وی کەمە، عومرێک تەمام (١٤٨٥)
نێزەبازی، بێ لەجێگای تەنگەبەر — نێزەبازان دێ لەبۆیان دەردەسەر (١٤٨٦)
کات کەتەنگەفەهمی ئەفرادی عەوام — سەت بەرابەر تەنگترەلەو، ئەی غولام (١٤٨٧)
گەرجەواب بۆ ئەحمەقان بێ دەنگییە — ئەو هەراو هوریای کەدەیکەی بۆ چییە؟ (١٤٨٨)
وادەکاتن ئیقتیزا لوتفی خودا — تا بەعەردی شۆرەکاتیش ئاو بدا (١٤٨٩)

**بەیانی ئەو مەتڵەبەکە (ترک الجواب جواب) موئەییدی ئەو قسەیەکە..(جواب الاحمق سکوت) شەرحی ئەو دوومەتڵەبانە دەو داستانەدا، دێ ..**

**خولاسەی داستان ..**

پادشایەک غولامێکی هەبوو زۆر نەفام وتەمەعکار بوو، وەزیفەکانی خۆی بەچاکی ئەنجام نەدەدا، ڕۆژێک شا لەبۆ تەنبێ کردنی وی دەستووری دا کەلەجیرەی وی کەم کەنەوەوئەگەر هەرا هەرای کرد وخۆی لەنەفامی دا، نێوی وی لەدەفتەری خزمەتکارن پاک کەنەوەوەختێک کەئەو خەبەرەبەگوێی ئەو غولامەگەیشت لەباتی وەی کەقسوورو تەقسیری خۆی پەیدا بکا، کەوتەئەو فکرەکەنامەیەکی زۆر بێ باکانەبۆ شا بنووسێ.. بەڵام پێش ئەوەکەنامەبنووسێ چۆ لای ئاشپەز وزۆر بەتووڕەیی ئاشپەزی لەکەم کردنی جیرەی خۆی بەموقەسسیر زانی بەڵام ئاشپەز پێیکوت کەئەمن مەئموورم و مەعزوور ..بڕۆ بزانەعیللەتی ئەسڵی چییەوکێیە؟ غولام بەناچار

چۆگۆشەیەک ونامەیەکی بۆشا نووسی هەر چەند نامەکەبەزاهیر مەدحی شای تێدا بوو بەڵام بۆنی ڕق و تووڕەیی لەلابەلای نامەکەدا دەر دەکەوت. غولام نامەکەی بۆ مەحزەری شا بەڕێ کرد.. بەڵام شا جوابی نا مەکەی نەداوە، غولام لەنەهاتنی جوابی نامەزۆر بێ قەرار وپەرێشان بوو، هێندێک جار خەتای شای دەگرت هێندێک جاریش خەتای ئاشپەز ونامەڕەسان، بەڵام جارێکیش فکری لەوە نەکردەوە کە ڕەنگە عیللەتی کەم بوونی جیرەو نەهاتنی جوابی نامەشەخسی خۆی بێ، جا چەند نامەی دیکەشی بەدوای ئەو نامەدا بۆ شا بەڕێ کرد، بەڵام جوابی هیچیان نەهاتەوە، دەرکەوانی شا کەلەو مەو زووعەئاگادار بوو ڕۆژێک لەشای پرسی بۆ جوابی ئەو غولامەنا دەیەوە؟شاکوتی جواب دانەوەی وی لەبۆ من زۆر ئاسانەوسەرفی نەزەرکردن لەتەقسیری وی ئاسانتریش،بەڵام لەوەدەترسم کەخولق و خووی خەراپی وی بەخزمەتکارەکانی دی سیرایەت بکا، وەئەوانیش گرفتاری نەخۆشی ئەخلاقی بن ..

پادشایەک بووکەهەیبوو یەک غولام | زۆر تەمەعکار و حەریس و زۆر نەفام (١٤٩٠)
ئەو وەزیفەو خزمەتی خۆی بەر دەدا | کاری پیس و ناحەزی خۆی باش، لەلا (١٤٩١)
شاکوتی کەم کەن لەجیرەی وی ئەگەر | کردی دەعوا ئەو لەنێو خەت بەرنەدەر (١٤٩٢)
زۆر حەریس بوو کەم شعوور،کەم عەقڵ و فام | تووڕەبوو زۆر، دی کەجیرەی نا تەمام (١٤٩٣)
عەقڵی با، دەیکرد لەدەو ری خۆی تەواف | جا کەدیبای جورمی خۆی، دەکرا مەعاف (١٤٩٤)
وەک کەرێکی بەستەبێ بێ، کەریەتی | هەردوو پێی دیشی دەخاتەنێو پەتی (١٤٩٥)
جا دەڵێ کەر تاقەبەندێکم بەسە | خۆت دەزانی هەر دوو بەند لەونا کەسە (١٤٩٦)

**تەفسیری ئەو حەدیسەی موستەفا ( علیەالسلام) کە.. ( ان اللەخلق الملائکته و رکب فیهم العقل، و خلق البهائم و رکب فیها الشهوه، وخلق بنی ئادم و رکب فیهم العقل والشهوه فمن غلب عقله شهوته فهوا علی من الملائکه و من غلب شهوته عقله فهو ادنی من البهائم)**

وایدەکوت ئەحمەد لەبۆ مان ئاشکار | عالەمی چاکرد بەسێ جوور،کردگار (١٤٩٧)
یەک گرووەسەرپاک عەقڵ وعیلم وجوود | ئەو فریشتەن،کاری وان تەنها سجوود (١٤٩٨)
هیچ لەوان مەو جوود نییەحیرس و هەوا | نووری موتڵەق، ژینی دا وان، عیشقی خوا (١٤٩٩)
یەک گرووهی دی لەدانیش بوون بەتاڵ | چەشنی حەیوان هەر بەگیا بوون خۆشحاڵ (١٥٠٠)
ئەو لەئیستەبڵان دەبینی بەس عەلەف | هیچ کەنا نا سێ شەقاوەت یا شەرەف (١٥٠١)
نەو عی سێهەم ئادەمی، ئینسانەئەو | نیو فریشتە، نیوەکیش حەیوانەئەو (١٥٠٢)

نیوەکەی حەیوان مائیل بووبەپەست — نیوەکیش مائیل کەعەقڵی بێتەدەست (١٥٠٣)

ئەو دوو دەستەبوون لەدەعوا بێ خەبەر — بەو دوو زیدانەلەدەردان دا، بەشەر (١٥٠٤)

گەر بەشەردەدرێن هەمووەک یەک نیشان — بوون بەسێ قیسمەت کەدایان ئیمتیحان (١٥٠٥)

یەک گرووەموستەغریقی موتڵەق دەبوون — چەشنی عیسا بۆ مەلەک مولحەق دەبوون (١٥٠٦)

زاهیرەن ئینسان لەباتین جەبرەئیل — دوور لەکین و کیبرو شەهوەت قال و قیل (١٥٠٧)

ڕەنج و پارسائی و جیهادی لا نەبوو — وەک دەڵەی ئەو قەت لەئینسان چا نەبوو (١٥٠٨)

یەک گرووهی دی بەکەر مولحەق دەبوون — کین و کیبرو شەهوەتی موتڵەق دەبوون (١٥٠٩)

وەسفی جەبریلی دەوانیش دابوو، ڕۆی — ئەو سیفەت زۆر گەو رە، چووک بوو جێگەبۆی (١٥١٠)

مردووەخۆ هەر کەسێک بێ گیانەئەو — دوور لەوەسفی وا،کەرەو حەیوانەئەو (١٥١١)

گیان کەنەی بێ وەسفی وا پاک پەستەپەست — گفتی وا حەق بۆی کوتین سۆفی، نەمەست (١٥١٢)

زیاد لەحەیوان دێنێ بۆخۆی ئەو فشار — چونکە دێنێ مەکری زۆر جالب بەکار (١٥١٣)

مەکرو فێڵی گەر لەوی ڕا دێنەدی — قەت زهوور ناکەن لەحەیوانی دەدی (١٥١٤)

جا کراسی زێڕ بافتی زۆر جووان — دوڕ وەدەر نا نیش لەدەریای بێ ئەمان (١٥١٥)

ریزەکاری زۆری عیلمی هەندەسە — یا نجووم و عیلمی تیبب و فەلسەفە (١٥١٦)

گشتی بەو دونیایەمەربووتن ئەوان — ناتوانن بچنەحەوتەم ئاسمان (١٥١٧)

بەو هەموو عیلمانەئاخوڕ چا دەکەن — ، وشتروگا، ژین بەوان ئیجرا دەکەن (١٥١٨)

تا کو چەند ڕۆژ عومری حەیوان بێ درێژ — ڕەمزو ڕازیان نێو لەوان نا، گێژو،وێژ (١٥١٩)

عیلمی ڕێگای حەقق و عیلمی مەنزڵی — ساحەبی دڵ لەو دەکا، ئاگا، دڵی (١٥٢٠)

جا ئەلەو تەرکیبەحەیوانێک لەتیف — خوا دروستی کرد لەگەڵ دانیش ئەلیف (١٥٢١)

نێوی ( کالانعام) ی، دانا بۆ بەد ان — چونکە وشیاربوون لەگەڵ خەو، لێک جودان (١٥٢٢)

ڕووحی حەیوانی فەقەت هەر هەیتی خەو — شت سەروبن دێتەبەرچاوانی ئەو (١٥٢٣)

هۆ ش ئەگەر هات و، خەوی غەفڵەت نەما — چی حەقیقەت بێ دەکا تن خود نەما (١٥٢٤)

وەک کەسێک دیتی گەلێک خۆشی لەخەو — هەرکەوشیار بۆوە، دیتی عەکسی ئەو (١٥٢٥)

لاجەرەم جێی بوو بەئەسفەل سافیلین — ئەو ڕەها کە (لا احب الافلین) (١٥٢٦)

**تەفسیری ئەو ئایەتەکە(و اما الذین فی قلوبهم مرض فزادتهم رجسا) وقولـه (یضل بـه کثیرا و یهدی به کثیرا )**

هەیبوو ئیستیعداد پەستی دەر بکا — وای نەویست ئەو، ویستی هەرخۆی کەر بکا (١٥٢٧)

چونکە ئیستیعداد لەحەیوان دانییە بۆ بەهیمی وی چ عوزری وا نییە (١٥٢٨)
گەر کو ئیستیعداد لەدەس وی چۆ دەرێ هەرچی بخوا زیاد دەکا مەغزی کەرێ (١٥٢٩)
گەر بەلازورِ بخوا بۆی ئەفیون دەبێ سەکتەدەگرێ کەم شعوور، مەجنوون دەبێ (١٥٣٠)
یەک گرووەدەعوا لەنێو وی بەر قەرار نیوەحەیوان، نیوەزیندووی رەستگار (١٥٣١)
شەڕ دەوێدا بەر قەرارەمەعنەوی هەر لەشەڕ دان ئەووەڵ و ئاخر لەوی (١٥٣٢)

نیزاعی عەقڵ دەگەڵ نەفس وەک نیزاعی مەجنوون دەگەڵ ناقەکەی بوو.. مەجنوون مەیلی بۆلای لەیلا بوو، و وشتر مەیلی بۆ لای دەیلاغ بوو، هەروەکوو مەجنوون کوتی(هوی ناقتی خلفی و قدامی الهوی ـ و انی وایاها لمختلفان)مانای بەیتی فەوق .. عیشقی وشترم لەپشتی سەرم وعیشقی خۆم لەپێشمە، یانی لەڕوو بەڕوو مە وبەڕاستی مەقسەدمان لێک جودان .. مەو لانا نیزاعی عەقڵ و نەفس دەقالبی حیکایەت دا بەیان دەکا، ڕۆژێک مەجنوون سواری وشتری خۆی بوو تا بۆ مەنیقەی لەیلا بڕوا مەجنوون وشترەکەی لێدەخوڕی بەڵام وشتریش بۆخۆی لەیلایەکی دیکەی هەبوو لەیلای وی دەیلاغەکەی بوو کەدەتەویلەدا مابۆ وەچونکەنەی دەتوانی بچتەسەفەر، جا هەم مەجنوون عاشق بوو هەم وشتر، وبەمیسداقی(الضدان لایجتمعان) نەیان دەتوانی کەبۆ یەکترهاوڕێ یەکی موناسب بن، جا لەبەر ئەوە هەرکات کەوشتر هاو سارەکەی خۆی سست دەدی پێی وابوو کەمەجنوون نوستووە یا غافڵە فەورەن بای دەداوە و بۆ لای دەیلاغەکەی خۆی دەگەڕاوە، مەجنوونیش پاش ئەوەکە وەخۆدەهاتەوەحاڵی دەبوو کەزۆر لەمەقسەد دوور کەوتووە.. خولاسەبۆ مەسافەتێکی سێ ڕۆژەما وەیەکی زۆر لەبیا بان دا سەر گەردان بوو.. عاقیبەت مەجنوون حاڵی بوو کەبەو وشترەناتوانێ بەمەنتیقەی لەیلا بگا .. جا خۆی لەوشترەکەهاویشتەخوار و وشترەکەشی لەدەشت و چۆڵ بەرەڵڵا کرد ...

مەنزوور لەمەجنوون عەقڵی لەتیفی نوورانییە و مەقسوود لە لەیلا حەقیقەتی خودائیە عەقڵی نوورانی هەمیشەمەست وعاشقی حەقیقەتی خودا ئیە.. تەلاش دەکا کەبەخودا بگا و مەقسوود لە وُشتر نەفسی ئەممارەیەو مەقسوود لەدەیلاغ شەهوەت و ئارەزووی نەفسانییە..نەفسی ئەممارەهەمیشەعاشقی شەهەوات و ئارەزوەکانی نەفسانییەو دەتەزاد، دان ..

هەر وەکوو مەجنوون و ناقەی وان یەقین یەک دەچێ بۆ پێش و یەک بۆ پاش، بەقین (١٥٣٣)
مەیلی مەجنوون چوونەلای لەیلایی یار مەیلی وشتر چوونەلای دەیلاغ، بەغار (١٥٣٤)

لەحزەیەک مەجنوون کەنەیبا هۆش لەخۆی ناقەبۆلای پشت دەسوورا، توند دەرۆی (١٥٣٥)
چون بەعیشقی لەیلی مەجنوون بوو، لەجۆش ناعیلاج مەجنوون دەبا چووبا لەهۆش (١٥٣٦)
عەقڵ بوو، تەنها کەئاگای لەو بیا عەقڵی وی برد عیشقی لەیلا، دای بەبا (١٥٣٧)
ناقەئەمما زیندەئاگا بوو لەحاڵ هەر کەدەیدی سست بووە، هاو سار بەحاڵ (١٥٣٨)
هەر کەدەیدی غافڵەو نیتی خەبەر زوو وەلای دەیلاغ دەی سووڕاند، سەر (١٥٣٩)
گەر دەبوو وشیار، دەیدی زۆر بەباش ڕۆیوەچەندین فەرسەخان بۆلایی پاش (١٥٤٠)
جا لەڕێی سێ ڕۆژەدا بەو جوورەحاڵ ماوەسەر گەردان مەجنوون، زۆر ساڵ (١٥٤١)
جا بەناقەی کوت من و تۆ عاشقین زیددی یەکتر، هاو دەمی نالایقین (١٥٤٢)
بەرخیلافی مەیلی من عیشق و مەهار جا جودائی چا دەکەم من ئیختیار (١٥٤٣)
ئەو دوو هاو ڕێ هەردوو بۆ یەکتر نەیار ئەوهەگومڕایە لەتەن نایەتەخوار (١٥٤٤)
ڕووح لەهیجری عەرش جێگای فاقەیە تەن لەعیشقی خار، هەروەک ناقەیە (١٥٤٥)
ڕووح لەبۆلای ڕۆژ دەکا واز، باڵی خۆی تەن لەعەرزی بردەخوار چەنگاڵی خۆی (١٥٤٦)
تا لەگەڵ من تۆ بی، ئەی مردووی وەتەن وەسڵی لەیلا کوا بەگیانی من دەدەن؟ (١٥٤٧)
ڕۆژگارم چوو لەدەس بەو جوورەحاڵ چەشنی تەیهو، قەومی مووسا زۆر ساڵ (١٥٤٨)
دوو قەدەم دوور تر نەبوو ڕێ بۆ ویساڵ من بەڵام دوور مام لەوەسڵت شەست ساڵ (١٥٤٩)
گەرچی ڕێم کەم بوو بەڵام زۆر مام لەوێ من کە لەو سواربوونە تێر بووم، نامەوێ (١٥٥٠)
ئەو لەوشتر خۆی سەروبن خستەخوار جاکوتی تاکەی غەمم بێ، من بەبار؟ (١٥٥١)
تەنگ بوو بۆوی بیابانی بەرین خۆی دەخستەبەردەڵان، ئەو نازەنین (١٥٥٢)
هێن بەشیددەت هێن بەتاو خۆی خستەژێر تێک شکا پاک، جیسمی ئەو ئازاو دلێر (١٥٥٣)
چون لەژوور ڕا خۆی فڕێدا ژێر وەها ئەزقەزا ئەو لەحزەلاقیشی شکا (١٥٥٤)
پێ یەکەی بەست وکوتی من بوومەگۆ من لەژێر گۆچانی ویم، بێ گفتو گۆ (١٥٥٥)
بۆیەبێزاربوو حەکیمی خۆش وُتار لەو کەسەی سواری تەنەو، نایەتەخوار (١٥٥٦)
عیشقی حەق کەمتر لەئی لەیلا نییە بوون بەگۆ بۆ کەس وەکوو حەق چا نییە (١٥٥٧)
تۆ ببەگۆ، بێرەژێر گۆچانی حەق جا بسووڕێ چۆنی ویست فەرمانی حەق (١٥٥٨)
بۆسەفەر بەو جوورە، جازیب خوای لەسەر ئێمەجازیب گەر بەوشتر بێ سەفەر (١٥٥٩)
جا سلووک بەو جوورەموستەسنا لەجینس زۆر لەژوور جەهد و تەلاشی جننو ئینس (١٥٦٠)
قەت وەکوو ئەو جەزبەنابێ جەزبی عام باعیسی وی فەزڵی ئەحمەد وسسەلام (١٥٦١)

**داستانی نامەنووسینی غولام بۆلای شا بەخاتری جیرەکەم بوونی ئەو غولامە..**

بۆم بڵێ تۆ داستانی ئەو غولام     گەرلەبۆ لای پادشای نووسی پەیام (١٥٦٢)

یەک پەیامی پڕ لەدەعواو پڕ لەکین     ئەو دەنێریتن لەبۆ شای نازەنین (١٥٦٣)

جیسمەنامە، لەو بنۆڕە، جا وەرە     گەر بەشا لایق بوو، ئەو بۆشا بەرە (١٥٦٤)

چاو کە، نێو نامەت، لەجێگایەک پەنا     لایقی شایا نەئاخۆ، یا نەنا؟ (١٥٦٥)

گەرنەبوو لایق ئەتۆ ئەو پارەکە     نامەیێکی دی بنووسەو، چارەکە (١٥٦٦)

نامەوازکردن مەزانەتۆ بەکەم     کەم کەبا، ڕازیان دەدی عالەم بەجەم (١٥٦٧)

سەختەنامەوازکردن ئەی هەواڵ     کاری مەردەنامەواز کا، نەک منالْ (١٥٦٨)

ئێمەڕازی بووین بەفیهرستی علووم     چونکەتێکەڵ بووین بەحیرس وئازی شووم (١٥٦٩)

بۆ عەوام فیهرستی ئەو عیلمانە، داو     چونکەمەتن و نامەلای وی یەک، بەچاو (١٥٧٠)

وازکەنامە، لامەدە، ڕووت لەو وتار     بێ گومان زانای سەواب هەر کردگار (١٥٧١)

ئەو عەناوین چەشنی ئیقراری زەبان     مەتنی نامەی دڵ کە، تۆ، چاک ئیمتیحان (١٥٧٢)

تا عەیان بێ ڕاستەئەو ئیقراری تۆ     تا نەبێتن وەک مونافیق کاری تۆ (١٥٧٣)

هەڵگری گەر تۆ، جەواڵێک زۆر گران     تۆ لەوەی تێیدا، بنۆڕەئەی فلان (١٥٧٤)

چی دەداخڵ دا جەواڵ، خۆش یانەتاڵ؟     گەرکو لایق بوو لەکۆڵ کە، تۆ جەواڵ (١٥٧٥)

وانەبێ گەر، لەو جەواڵ، هەڵڕێژەسەنگ     خۆت نەجات دە، با نەیەت بۆت عار و نەنگ (١٥٧٦)

تۆ، شتی زۆرباش بڕێژەنێو جەواڵ     تاکولایق بێ لەلای شای کەی، بەتاڵ (١٥٧٧)

**داستانی ئەو فەقیهەی بەعەمامەی گەورەیەوە، و ئەو کەسەی کە لێی ڕفاند، و فەقیە بانگی دەکرد کە بیکەوە، و چاک تەماشای بکە دوایەبیبە..**

**خولاسەی داستان ..**

یەک نەفەر بەزاهیر فەقیە بۆ ئەوەی کەعەمامەکەی گەورەنیشان بدا وخەڵکی بەشەخسێکی گەو رەوموهیم تەماشای بکەن میقدارێک کۆنەپەڕۆی دەنێو عەمامەکەی خۆی وەرپێچا وبەیانی زوو بەهەیبەت و وقارێکی مەخسووس بۆ مزگەوت وەڕێ کەوُت ئیتیفاقەن لەو کاتەدا دزێک لەتارکایی کووچەیەک دا خۆی مات کردبوو تا لەوەختی موناسب دا هجووم بەرێ بۆ سەر ڕێبواران وهەربووڵ و ماڵێکی کەلەلایان بێ بەتاڵان بیبا.. وەختێک کەئەو دزەچاوی بەعەمامەی گەورەی وی کەوت پێی وابوو کەشتێکی زۆر بەقیمەتی وەگیرکەوتووە حەملەی کردێ و عەمامەکەی لەسەری ڕفاند و هەڵات ئەو بەزاهیر فەقیهە بانگی کرد کەئەی دز تۆ کە ئەو

عەمامەی بەپەلەدەبەی لانی کەم دەستێک بەو شتانەی کەدەنێوی دایەدا بێنە، و ئیمتیحانی بکەئەگەر باش و بەقیمەت بوو لەگەڵ خۆتی ببە وحەڵاڵت بێ،بەڵام ئەو دزەکەپێی وابوو شتێکی زۆر بەقیمەتی وەگیر کەوتووەبێ وچان هەڵدەهات ولەوکاتەدا کەهەڵدەهات دیتی کەهێندک شت لەوعەمامەدەکەو نەسەرعەرزی، وەختێک کەلێیان ورد بۆ وە، چەند تیکەپارچەی کۆنی دیت، لەو دەمەدا وەخۆ هاتەوەوبەحەسرەت و نارەحەتی بەعەردی دا دا ووەدوای کاری خۆی کەوُت غەرەز لەو تەمسیلەبەیانی ئەو مەتڵەبەیەکەزۆر کەس هەن کەزاهیری خۆیان بەچەند عیلمێک دەرازێننەوە، وحەقیقەت خوازان فریو دەدەن .. مەولانا دونیای پرفریوی بەعەمامەی ئەو بەزاهیر فەقیهەتەشبیەدەکا ..

یەک فەقیەپارچەی گەلێک کۆن خڕ دەکرد نێو عەمامەی خۆی بەوی جا پڕ دەکرد (١٥٧٨)
تا عەمامەی خۆی عەزیم داتن نیشان گەر دەهات بۆ مەسجیدو بۆ مەحفیلان (١٥٧٩)
کوێی لیباسێک کۆن ببا، لێی جیا دەکرد جا بەوان مەندیلی خۆی زیبا دەکرد (١٥٨٠)
زاهیری مەندیل دەدرەوشا وەگەش باتنی وی وەک مونافیق پەست و ڕەش (١٥٨١)
ئەو عەمامەی وا بەزاهیر زۆر جووان لەتکەدەڵق و پێست و پەنبە، دەو، نیهان (١٥٨٢)
ڕۆژ دەچوو بۆ مەدرەسەزۆر باویقار تا وەدەس بێنێت میکنەت هەم عیقار (١٥٨٣)
ڕێگەیەک تاریک دزێک لێی گرت قەر ار مونتەزیر ما تاکوڕووت کا ڕێبووار (١٥٨٤)
دزعەمامەی برد و زوو کردی فیرار تاکو چاکا ئەو لەبۆخۆی کارو بار (١٥٨٥)
جا فەقیەبانگی دەکرد ئا ی ئای جەوان وەیکەئەو عەممامە، ببە ئەو زەمان (١٥٨٦)
گەر دەڕۆی تۆ وا بەتوندی وا، بەدەو بیکەوەئەو هەدیەپاشان بیبەئەو (١٥٨٧)
بیکەوەدەستێک لەوی دە، توند مەڕۆ بیبەئەو دەم من حەڵاڵم کرد لەتۆ (١٥٨٨)
کەرکو وەی کرد ئەو کەسەی دەیکرد فیرار کەو تەعەرزی کۆنەپارچە، سەت هەزار (١٥٨٩)
لەو عەمامەی زۆر زەلام وکەم بەها یەک گەزی زۆر کۆن دەدەس وی دا دەما (١٥٩٠)
دای لەعەردو پێیکوت ئەیبێ ئیعتیبار مەکری تۆ بوو مانعی من بوو لەکار (١٥٩١)

**نەسیحەت کردنی خەڵکی دونیا، تەوەسسوتی دونیـا بـەزبانی حـاڵ و نیشـان دانـی بـێ وەفایی خۆی بەوەفا، بۆ تەمەعکارانی دونیا ..**

ئەوکوتی من فێڵەبازبووم زۆر بەڵام بۆ نەسیحەت پێت دەڵێم من چەن کەلام (١٥٩٢)
گەرچی دونیا بوو بەزاهیر زۆر جووان بێ وەفایی خۆی لەبۆ عام کرد بەیان (١٥٩٣)

**بەیان کردنی ڕەسوول (ص) تەرجیح و ئیختییار کردنی ئەو هوزەیلیە، بەئەمیر .. و فەرماندە بۆ پیران و تەجرە بە دیتوان ..**

بۆ عموومەحوکم و، ئەغڵەب بوون شەریر بۆیەئەستاندیان لەڕێگر، تیر و شیر (٢١٥٩)
پێیدەکوت ئەحمەد مەنۆرەرووی وی وا مەزانەتۆ، جەوانە، خوویی وی (٢١٦٠)
زۆر جەوان و نەو جەوان هەن پیر بەئیش زۆر نەفام و بێ هونەر هەن، پیر بەڕیش (٢١٦١)
عەقڵی ویم من ئیمتیحان کرد زۆر جار ئەو جەوانەم ئیمتیحان کرد زۆر لەکار (٢١٦٢)
ئەی جەوان، پیر، یانی پیری عەقڵ و خوو نەک سپی بێتن لەسەر یا ڕیش موو (٢١٦٣)
کەس لەشەیتان پیر تر خۆ،جا نییە هیچ نییەئەو چونکەعەقڵی لا نییە (٢١٦٤)
یا مناڵ بێ گەربێ . عیسا نەفەس لادەنێ ئەو کیبرو خودخواهی هەوەس (٢١٦٥)
مووی سپی هات کردەعیللەت بۆ کەماڵ ئەو کەسەی مەغزی لەعەقڵ و فام بەتاڵ (٢١٦٦)
چون موقەللید دای بەزاهیر ئیعتیبار غەیری زاهیر بۆ دەلیل لای نا کەنار (٢١٦٧)
بۆبەکوتمان، ئەو ئەگەر تەدبیر بکا چاکەبۆ وی ئیختیباری پیر بکا (٢١٦٨)
هەر کەسێکی خۆی لەتەقلید دا نەجات ئەو بەنوور ی خوا دەبینێ کائینات (٢١٦٩)
نووری پاکی بێ دەلیل و بێ بەیان پەردە دەدڕێت و، دەبینێ حەق عەیان (٢١٧٠)
بۆ ئەوەی زاهیر دەبینێ نەک دەروون زێڕی قەلب وناب لەلای وی یەک دەبوون (٢١٧١)
ڕەش دەکەن زۆر کەس تەلای خۆیان بە دوود تاکو نەی با ئەو،دزی پیسی حەسوود (٢١٧٢)
زۆر دەقەومێ مس کەئاوەزێڕ کرا بۆ فرۆش ئەو، جا بەکەم عەقڵێک درا (٢١٧٣)
باتنی تەنمان دەدی سەر تا سەری دل دەبینین، بۆ چمانە، زاهیری؟ (٢١٧٤)
گەرکوقازی دای بەزاهیر ئیعتیبار ئەمری زاهیر حوکمی وی کرد ئاشکار (٢١٧٥)
گەر شەهادەی کرد لەگەڵ ئیمان بەیان حوکمی موئمین دێ لەبۆی، لای قازییان (٢١٧٦)
جا پەنا بۆ دین دێنن دوو ڕووان جا دەڕێژن خوێنی سەت موئمین نیهان (٢١٧٧)
تۆ تەلاش کە، پیری عەقڵ و دین بی چەشنی عەقڵی کول،تۆ باتین بین بی (٢١٧٨)
عەقڵی کوللی گەر کوچا کرد کردکار یک خەڵاتی پێدەدا، نێویش هەزار (٢١٧٩)
کەمترین نێوێک کەبووی ئەو خۆش نەفەس ئەو هەبوو، هیچ کات نەبوو موحتاجی کەس (٢١٨٠)
عەقڵی کول گەر کونیشان دا ڕوویی خۆی ڕۆژ یقین نامێنێ هیچ ڕوونی لەبۆی (٢١٨١)
گەر موجەسسەم بێ حەماقەت ئاشکار زوڵمەتی شەو ڕوون دەبێ لای وی، نەتار (٢١٨٢)
چون لەشەو تاریکترەزۆر ئەحمەقی زوڵمەتی داخوازەخوففاشی شەقی (٢١٨٣)

کەمکەمە بەو نووری ڕۆژ ، تۆ بگرە خوو　تاکو وەک خوففاش نەبی ، بێ نوور، ئەتوو (٢١٨٤)
داخوازی موشکیلات و قوژبنە　بۆ چرای ساحەبدڵانیش دوژمنە (٢١٨٥)
بۆیە ویستی زوڵمەتی ئیشکال ، دڵی　تاَ نیشان داَ زیندەتر ئەو حاسڵی (٢١٨٦)
تا خەریک بەو موشکیلات کا، ئەو نەفەر　تۆ لەفیکری پیسی خۆی کا، بێ خەبەر (٢١٨٧)

**عەلامەتی عاقڵی تەواو وعەلامەتی نیوەعاقڵ، وپیاوی تـەواو نیوەتـەواو .. و عەلامـەتی شەقی و مەغرووی لا شەیێ ..**

عاقڵ ئەو کەس‌بوو کەمەشعەلدارەئەو　ڕەهنەمای کاروانە، هەم سالارەئەو (٢١٨٨)
پەیڕەوەبۆ نووری خۆی ئەو پێشەوا　ئەو موتیعی حەق، دەحەق دا بوو فەنا (٢١٨٩)
ئەو بەخۆی موئمین بوو موئمین بە، ئەتۆش　بەس بەنووریک،گیانی وی کرد شادو خۆش (٢١٩٠)
عاقڵێکی عەقڵەکەی هەر نیوەئەو　عاقڵی وەک نووری چاو زانیوە ئەو (٢١٩١)
دەس بەوی دەگرێت هەر وەک کوێر دەلیل　تا بەوی بینا ببێ چوست و جەلیل (٢١٩٢)
ئەو کەرەی عەقڵی دەمێشکی دا نەبوو　عاقڵی لا نا،کەعەقڵی لا نەبوو (٢١٩٣)
نەیدەزانی ڕێگە، ئەو زۆرو قەلیل　وای دەزانی عارەچوون بەدوای دەلیل (٢١٩٤)
ڕێ دەچێتن ئەو لەنێو سەحراوو چۆڵ　جار شەل و مەئیووس، جار جار توندو تۆڵ (٢١٩٥)
شەمعی تامی ئەو نیبەبۆ ڕەهبەری　نیوەشەمعیشی نییە، لەو نوور بەری (٢١٩٦)
عەقڵی تامی ئەو نیبەهەبێ حەیات　نیوەعەقڵیش نا، کەخۆی تەسلیم بکات (٢١٩٧)
گەر کو بۆ عاقڵ موتیع بێ ئەو تەمام　ئەو لەپەستی دێ دەبێ عالیمەقام (٢١٩٨)
گەر کو نیتەئەی فلان عەقڵی تەمام　تۆ بڕۆ لای عاقڵێک شیرین کەلام (٢١٩٩)
مردووە، نابێت عیسا هەمدەمی　زیندووەبێ سوودەعیسا بۆی دەمی (٢٢٠٠)
گیانی کوێرە، پێ دەنێ هەرلایەئەو　هەر پەرێشانە، نەجاتی نایەئەو (٢٢٠١)

**داستانی ئەو گۆل و سەییادان وئەوسێ ماسیانەی کەیەکیان عاقڵ بوو ویەکیان نیوەعاقڵ و یەکیان مەغروور و نەفام و هیچ نەبوو، وعاقیبەتی هەرسێکیان**

**خولاسەی داستان ..**

سێ ماسی دەگۆلێک دا دەژیان ڕۆژێک سێ ماسی گر بەوێ دا ڕابردن کەچاویان بەو سێ ماسیانەکەوت هەر جێ بەجێ داوو تۆڕی خۆیان حازر کرد .. یەکێک لەو ماسیانەکەعاقڵ بوو لەو حەڕەکەتە تێگەیشت کەخەتەر لەپێش دا یە، جا فەو رەن تەسمیمی گرت کەئەو

گۆلەبەجێ بێ لێ لەهەوەڵەوە، ویستی کەدەگەڵ دوو ڕەفیقەکانی خۆی مەشوەڕەت بکا، بەڵام ئەو موتەوەججیەبوو کەئەو دوو ڕەفیقانەی وی بەئەندازەیەک لەو مەوزووعەبێ خەبەرن کەنەتەنها لەگەڵ وی هاو عەقیدەنابن بەڵکەم ئەوی لەتەسمیم و عەقیدەو ئیرادەی خۆی سست و پەشیمان دەکەنەوە جا لەبەر ئەوە، ڕێی دەریایەی گرتەبەر ورۆیشت، ماسیەکەی دیکەش کەنیوەعەقلی هەبوو لەڕۆیشتنی لەناکاوی ڕەفیقی خۆی کەو تەفکرو خەیاڵ وزانی کەبێ گومان خەتەرێک لەپێش دایەلەبۆیەئەو، مەوتەنی خۆی بەجێ هێشت .. ماسی نیوەعاقڵ لەسەر ئاو بێ حەرەکەت ما، وخۆی لەمردن دا .. کاتێ کەڕاوچیان هاتن وئەو یان بەو حاڵەدیت بەو خەیاڵەکەڕەنگەکەمێک گیانی لەبەر دا مابێ،جێ بەجێ ئەو یان گرت و هاویشتیانەسەر خیزی قەراغ چۆم، تا خواردنی گۆشتەکەی حەڵاڵ بێت، بەڵام ئەو ماسیە، بەهوشیاریەکی مەخسووس کەمکەمەخۆی دەسووڕاند.. بەو جوورەواریدی ئاوی دەریا بوو و گیانی خۆی نەجات دا ..بەڵام ماسیەکەی دی، کەهیچ فام و شعووری نەبوو فکری لەدوارۆژ نەدەکرد، کەو تەداوو، گۆشتیان لەسەر ئاور برژاند ..

مەتڵەبی پێش چەشنی گۆلێک بوو، کەلەو — سێ عەدەد ما سی هەبوون باش و قەڵەو (٢٢٠٢)
نێو کەلیلە،باس ئەلەو هە، باش کرا — باتینی وی من دەکەم بۆت، ئاشکرا (٢٢٠٣)
کردیان لای گۆل، چەن سەییاد گوزەر — سێ عەدەد ماسیان لەوێ هات بەر نەزەر (٢٢٠٤)
توندو تۆڵ چوون تاکو بێنن داو ئەوان — ماسیان زانیان کەدەکرێن ڕاو ئەوان (٢٢٠٥)
ماسییەک عاقڵ بوووبستی بچتەدەر — ڕێ یەکی دژوارو سەختی گرتەبەر (٢٢٠٦)
مەشوەڕەت ناکەم لەگەڵ وان،من چ کات — چون لەگەڵ وان مەشوەڕەت، سستم دەکات (٢٢٠٧)
عیشقی مەوتەن گیانی دەر هینان، لەبن — جەهل و سستی وان بەبێ شک دێنەمن (٢٢٠٨)
مەشوەڕەت گەڵ زیندووێکی وا دەبێ — تۆ بکا زیندوو ، کەسێک وا ، کوا دەبێ؟ (٢٢٠٩)
ئەی موسافیر گەڵ موسافیر بێت ڕات — ڕای هەوا خواز،شەل‌دەکا لێت هەردوو پات (٢٢١٠)
بەس بڵێ ( حب الوطن ) لەولادە خۆت — چون وەتەن لەولایە ، لێرە نیە لەبۆت (٢٢١١)
گەر وەتەن خوای تۆ برۆ ئەو لایی شەت — ئەو حەدیسەی ڕاس، ئەتۆ مەیڵێ غەڵەت (٢٢١٢)

**ڕازی کوتنی دوعای دەست نوێژ لەلای ئەو کەسەی کەدەست نوێژ دەشوا ..**

یەک بەیەک ئەعزای وزووو،ویردی جودا — دیار کرا بۆیان لەلای شەرعی خودا (٢٢١٣)
ئەو دەمەی تۆ ئاو و کەئیستینشاق دەکەی — داخوازی بۆی بە هەشت کە، تۆ کەحەی (٢٢١٤)

تا ببا ئەو بۆن ئەتۆ لای لالەزار بۆی گوڵان گوڵزار دەکاتن ئاشکار (٢٢١٥)
وەختی تەتهیر، ویرد و زیکرت بێ ئەوە ئەی خودایەتۆ لەپیسم پاک کەوە (٢٢١٦)
شوشتمن ئەعزای کەدەستم گەیبەوان دەستی من بۆشوشتنی گیان ناتەوان (٢٢١٧)
ئەی بەدەستی تۆ دەبێ نامەرد مەرد دەستی تۆیەپاک دەکا، قەلبان لەدەرد (٢٢١٨)
من ئەوەندەم هات لەدەس خۆم کەم تەمیز غەیری ئەو هەش تۆ تەمیز کە، ئەی عەزیز (٢٢١٩)
من هەموو پیسیم لەپێستم خستەدوور تۆش تەمیزکە، قەلبی من ئەی خوای غەفوور (٢٢٢٠)

**شەخسێک لەکاتی تەتهیر و ئیستینجا دەیکوت (اللهم ارحنی رائحەالجنە) لەجێی ( اللهم اجعلنی من التوابین واجعلنی من المتطهرین ) کەدوعای ئیستینجایە، ودوعای ئیستینجاشیلەکاتی ئیستینشاق دەکوت .. یەک نەفەربیستی و نەی توانی کەتەحەممول بکا ...**

وەختی ئیستینجا،کەسێک وای کرد دوعا بۆی بەهەشتم پێ عەتاکە، ئەی خودا (٢٢٢١)
یەک نەفەر پێیکوت دوعات چاک کرد بەیان رێی دوعات وُن کرد بەڵام تۆ ئەی فلان (٢٢٢٢)
ئەو دوعای کردت دوعای دم بوو، نە قوون تۆ لە دم، بۆ قوون، کردت، سەرنخوون (٢٢٢٣)
بۆی بەهەشت،ئازاد،لەرێگای دم دەکات بۆی بەهەشت نایەتلەرێگای قوون،چ کات (٢٢٢٤)
ئەی ئەوەی کردت تەوازوع لای لەئیم وەی ئەوەی کردت تەکەببور، لای کەریم (٢٢٢٥)
لای بەدان کیبرت هەبێ لای باش، نا عەکسی ئەو هەبۆ فەنا دەت با، دەنا (٢٢٢٦)
بۆ دمانی چا دەکرد گوڵ،کردگار غەیری دم،هیچ عوزوێ ناکا، بۆن،ڕ چ جار (٢٢٢٧)
بۆن وەزیفەی دم بوو، بیکا، ئەی دلێر نەک وەزیفەی ئەوکونەی جێگای لەژێر (٢٢٢٨)
بۆی بەهەشتت کوا لەجێی وا دێ لەبۆ؟ جستو جۆ کەبۆن لەجێگای خۆی ئەتۆ (٢٢٢٩)
هەر وەها ( حب الوطن )ڕاستەیەقین تۆ وەتەن ئەووەڵ بناسە، ئەی مەتین (٢٢٣٠)
ماسیەکەی زیرەک کوتی وا چاکەبۆم مەشوەرەت گەڵ وان نەکەم تەنها برۆم (٢٢٣١)
مەشوەرەت وەختی نیە، تۆ زوو هەڵێ وەک عەلی ئاهان لەنێو چاڵاو، بڵێ (٢٢٣٢)
مەحرەمی ئەو ئاە،کەمن، ئەی خۆش نەفەس شەو برۆ، پنهان برۆ، هەر وەک عەسەس (٢٢٣٣)
تۆ برۆ دەریا لەگەڵ خۆت بێنەدەر یەم تەڵەب کەگۆل بهاوێ پشتی سەر (٢٢٣٤)
پێی لەسینگ چاکرد پێی ڕۆی ئەو حەزوور جا بەجێی هێشت، جێی خەتەر چۆ بەحری نوور (٢٢٣٥)
چەشنی ئاسکێکی لەدووی وی سەگ هەبێ غار دەدا تا نێو تەنی یەک ڕەگ هەبێ (٢٢٣٦)
ئەو کەسەی دوژمن لەدوویتی، ڕۆژو شەو گەر بترسێ، ئیشتیبایەبۆ وی خەو (٢٢٣٧)

ماسیەکەی زیرەک لەگۆل، جا، هاتەدەر   ڕێی درێژی سەختی دەریای گرتەبەر (٢٢٣٨)
بێ ژمارو بێ حیسابی دیت ڕەنج   عاقیبەت ئەو هاتەدەستی ئەمن و گەنج (٢٢٣٩)
خۆی دەخستەبەحرەکی قووڵ، زیا د لەحەد   حەددی وی مەعلووم نەبوو لای هیچ ئەحەد (٢٢٤٠)
جا کەسەییادان هینایا ن داو   نیوەعاقڵ وای کەدی، بوو دڵ شکاو (٢٢٤١)
ئاخی هەڵکێشاو کوتی فرسەت نەما   بۆ نەچووم ئاخر لەگەڵ ئەو ڕەهنەما (٢٢٤٢)
ئەو کەڕۆیشت ناگەهان توند و قەوی   من دەبا چوو بام زوو بەدوایی وی (٢٢٤٣)
بۆ چووان حەسرەت خەتایەو ئیشتیبا   هەر چی چوو، چوو، یادی ویش با، با، ببا (٢٢٤٤)

**داستانی ئەو تەیرە گیراوەی کەوەسیەتی کرد کەلەبۆ لەدەست چووان پەرێشان و غەمگین مەبەو بەپەرێشانی و پەشیمانی وەختی خۆت تەلەف مەکە..**

**خولاسەی داستان..**

شەخسێک تەیرێکی بەداو ڕاو کرد ئەو تەیرە پێیکوت ئەی سەر وەری من ئەتۆ لەماوەی ژیانی خۆت‌دا زۆر گۆشتی گاو مەڕانت خواردووە وتێریش نەبوویە، ئێستاش بزانەبەخواردنی بەدەنێکی لاوازو کزی وەک من تێر نابی، بەڵام ئەگەر ئەمن ئازاد بکەی سێ پەندی بەسوودت پێ دەڵەم کەئەتۆ بەوان خۆشبەخت دەبی، پەندی ئەووەڵت وەختێک پێدەڵەم کەلەسەر دەستی تۆم پەندی دوو هەمت وەختێک پێدەڵەم کەلەسەربانیماڵت هەڵنیشتم، پەندی سێهەمت وەختێک پێدەڵەم کەلەسەرلکی دار جێ گیر بووم، پەندی ئەووەڵ ئەو هەیەهیچ کات لەبۆ لەدەس چووان غەم مەخۆ، ئەوەی کوت و لەدەستی ئەو کابرایە هەڵفڕی، وچۆ سەر دیوار هەڵنیشت و کوتی پەندی دوو هەم ئەو هەیە، هیچ کات شتی محاڵ و غەیرەمومکین باوەڕ مەکە، وکاتێک کەلەسەر لکی دار هەڵنیشت کوتی ئەی سەر وەری من، نێو زگی من گەو هەرێکی زۆر بەقیمەتی تێدایەبەوەزنی دەدرەم، بەڵام چ فایدەکەبەقیسمەت تۆ نەبوو دەنا ئەتۆ و خانەوادەت بەوی دەو ڵەمەند دەبوون، ئەو شەخسەخام و ساویلکەبەبیستنی ئەو خەبەرەوەها پەرێشان بوو کەدادو فەریادی لێ بڵیند بوو، جا تەیرەکەپێیکوت مەگەر پێم نەکوتی هەرچی لەدەست چوو غەمی بۆ مەخۆ؟ و لە پەندی دووەهەم دا پێم نەکوتی هیچ شتی محاڵ و غەیرەمومکین باوەڕ مەکە؟ ئەی ساویلکەی فەقیر حاڵ، تەواوی بەدەنی من سێ درەم زیاتر نییە، چۆن دەگونجێ کە، شتێکی بەوەزنی دەدرەم لەبەدەنی من پنهان بێ؟ ئەو کابرایەکوتی پەندی سێهەمت نەکوت ئەویش بڵێ تا ئیستیفادەی لێ بکەم،تەیرەکەپێیکوت دیارەدووپەندی پشێت زۆر چاک گوێ دایە بۆیەپەندی سێهەمت دەوێ ..

تەیرەکی چووکی چەلێک گرت یەک نەفەر تەیرە،پێیکوت ئەی تۆ بۆ من تاجی سەر .. (٢٢٤٥)
تۆ گەلێکت گۆشتی گاو مەڕ خواردووە وُشتریشت زۆر بەقوربان ناردووە (٢٢٤٦)
تۆ بەگۆشتی وان نەبووی هیچ کات تێر چۆن بەگۆشتی من دەبی تیر ئەی دلێر؟ (٢٢٤٧)
تۆ ڕەهام کەجا دەڵەم سێ پەند پێت تێدەگەی جا زیرەکم من یانەشێت (٢٢٤٨)
پێت دەڵەم ئەووەڵ لەسەر دەستانی تۆ دووهەمیش کاتێ کەچووم سەر بانی تۆ (٢٢٤٩)
سێهەمین پەندت لەسەر دارێ پێدەڵەم جا بەوان سێ پەند، نات مێنێ چ غەم (٢٢٥٠)
ئەو هەیەپەندی کەتۆ ئەمنت بەدەس هیچ محاڵێک تۆ، نەکەی باوەڕ بەکەس (٢٢٥١)
گەر لەسەر دەستی کوتی ئەووەڵ وتار هەڵفڕی گرتی لەسەر دیوار قەرار (٢٢٥٢)
پەندی دووهەم، بۆ چووان تۆ غەم مەخۆ بۆ لەدەس چوو، حەسرەتێ هەل مەگرەتۆ (٢٢٥٣)
جا لەپاشان پێیدەکوت ئەی موحتەڕەم گەو هەرێکم من دەزگ دا، دەە درەم (٢٢٥٤)
سوێن بەگیانت گەرکو تۆ هەتبایەئەو فەقری ماڵی تۆی دەدا، دەم بایە، ئەو (٢٢٥٥)
چوو لەدەستت دوڕ، کەڕۆزی تۆ نەبوو گەو هەرێکی وا لەدونیا خۆ نەبوو (٢٢٥٦)
ناڵەناڵی کرد کابرا ئەو چەلە وەک لەوەختی زان، دەکاتن حامیلە (٢٢٥٧)
تەیرە، پێیکوت من مەگەر نەم کوت بەتۆ؟ بۆ لەدەس چوو تۆ، چ کاتێک، غەم مەخۆ (٢٢٥٨)
بۆ لەدەس چوان غەم دەخۆی، ئەی قەندی من یا کەڕی یا گوێت نەدا تۆ، پەندی من (٢٢٥٩)
پەندی دووهەم پێت دەڵەم هەر وا بکەی غەیرەمومکین قەت نەکەی بڕوا بکەی (٢٢٦٠)
سێ درەم زیاتر نییەخۆ وەزنەکەم چۆن دەخۆم دا، دەە درەم پنهان دەکەم (٢٢٦١)
هات وەهۆش کابرا کوتی جا، ئەی ئەمین بێژە بۆ من ئێستە پەندی سێهەمین (٢٢٦٢)
پێیدەکوت نەت گرت پەندی پێش سفت پەندی سێهەم چۆن بڵەم من پێت مفت؟ (٢٢٦٣)
پەندی نادان گەر بدەی ئەی خۆش سیفات هەر وەکوو تۆو چاندنە، نێو شۆرەکات (٢٢٦٤)
پینە ناکرێ ئەحمەقی نادانی گێژ تۆوی حیکمەت بەو مەدە، ئەی پەند بێژ (٢٢٦٥)

**فکرکردنی ماسی نیوەعاقڵ بۆ نەجات دانی خۆی ..**

ماسیەکی دی وای دەکوت وەختی بەڵا گەر لەدۆستی عاقڵی خۆی بوو جودا (٢٢٦٦)
ڕووی لەدەریا کرد ڕۆی خۆی دا نەجات من لەدەستم چوو ڕەفیقی خۆش سیفات (٢٢٦٧)
خۆم تەلاش کەم فکری وی با، لا بنێم چاکەئێستا خۆم بەمردوو دا بنێم (٢٢٦٨)
ڕوو بەئاسمان پشت لەسەر ئاو، ئەو دەمە من لەسەر ئاوێ دەڕۆم جا، کەمکەمە (٢٢٦٩)

جادەڕۆم وەک پووش لەسەر ئاو ئەو چەلە　　نەک وەکوو ئەو کەس بکا نێو ئا و مەلە (٢٢٧٠)
خۆم دەکەم مردوو، دەبم تەسلیمی ئاو　　مەرگی پێش مردن دەبا دەرد و عەزاو (٢٢٧١)
مەرگی پێش مردن سەبەب بوو، بۆ ئەمان　　وای دەفەرموو بۆن نەبی ئاخر زەمان (٢٢٧٢)
ئێوەبمرن پێش ئەوەی بێتن مەمات　　جا بەفیتنەئێوەنەو مێنی حەیات (٢٢٧٣)
خۆی مراند ئەو، ڕوو بەبالا، وڕگی وی　　ئاو ئەوی برد، جار لەبۆ سەر جار نەوی (٢٢٧٤)
هەرسێ ڕاو کەر حەسرەت و ئاهیان دەکرد　　سەت ئەسەف کام ماسی چاتربوو دەمرد (٢٢٧٥)
گفتی وان شادی دەکرد ماسی فەقیر　　جا کوتی فێڵم نەجاتی دام لەشیر (٢٢٧٦)
جائەوی گرت ڕاوکەرێکی زیدەچاک　　جافڕێی دا پاش تفێک، سەر خاکی پاک (٢٢٧٧)
خۆی دەسووڕاند زۆر نهێنی چۆ دەئا و　　ما، پەرێشان ماسیەکەی بێ عەقڵ و خاو (٢٢٧٨)
دەیهەوێست ئەو ڕێگەک پەیدا بکات　　تا بەجەهدی خۆی بداتن خۆی نەجات (٢٢٧٩)
جا لەبۆیان دا دەنا داو، کەو تەداو　　ئەحمەقی بردی لەبۆ نێو نار، بەتاو (٢٢٨٠)
تاوەیەک جێی بوو کەژێر وی نا ر بوو　　چون لەبۆ جەهل و حەماقەت یار بوو (٢٢٨١)
جا لەسەر ئاگر کوڵی ماسی فەقیر　　عەقڵی وی پێیکوت مەگەر نەت بوو نەزیر؟ (٢٢٨٢)
چون عەزاب و دەردو ڕەنجی هاتەلا　　چەشنی ڕووحی کافران دەیکوت ( بلی ) (٢٢٨٣)
ئەو چەلەش دەیکوت نەجاتم بێ ئەگەر　　لەو عەزابەی سەختی دەشکێنێ کەمەر (٢٢٨٤)
غەیری دەریا، ناکەمە، مەو تەن ئەمن　　قەت چ گۆلێک ناکەمە، مەسکەن ئەمن (٢٢٨٥)
تا مەسوون بم ئاوی زۆر داوا دەکەم　　تا ئەبەد نێو ئیمەنی مەئوا دەکەم (٢٢٨٦)

**بەیانی ئەومەتڵەبەکەعەهدو پەیمانی ئەحمەقان لەکاتی گرفتاری و پەشیمانی بێ وەفایەوبێ بەقا، کە(ولوردوالعادوا لمانهوا عنەوانهم لکاذ بون ) سوبحی کازیب بێ وەفایە...**

عەقڵ پێیکوت ئەحمەقیت تۆ بوو بەیار　　ئەحمەقی نابوود دەکا عەهدو قەرار (٢٢٨٧)
عەقڵەباعیس عەهدو پەیمان دەچنەسەر　　تۆ بەبێ عەقڵان بڵێ کەر، نەک بەشەر (٢٢٨٨)
عەهد و پەیمان لای عەقڵ بوون موعتەبەر　　جێی کەلێی بێ عەقڵ، نیسیان دەچتەدەر (٢٢٨٩)
تۆ کەنیتەعەقڵ، نیسیان میری تۆ　　دوژمن و باتڵ کەری تەدبیری تۆ (٢٢٩٠)
چونکەنیتی عەقڵ پەروانەی فەقیر　　قەت لەنار و دەنگی نار ناکات بیر (٢٢٩١)
گەرکو باڵی سووت، تۆبەی دیتەبیر　　حیرس ونیسیان ئەو دەکەن بۆ نار ئەسیر (٢٢٩٢)
پێنج حەواسی باتنی سامان دەدا　　عەقڵی تەنها، جا بەوان فەرمان دەدا (٢٢٩٣)

گەر نەبێ دوڕ، نابێ بۆ پەڕ تەو مەجاڵ  بێ موزەککیر کەس وەلا نا نێ زەلال (٢٢٩٤)
ئەو وەلا نانەش لەبەربێ عەقڵییە  چونکەنازانێت حەماقەت ئەو، چییە (٢٢٩٥)
ئەو پەشیمانیەش نەتیجەی ڕەنج بوو  نەک لەعەقڵی ڕەو شەنی وەک گەنج بوو (٢٢٩٦)
گەر وەلاچوو غەم، وەلا چوو جا، نەدەم  ئەرزشی ئەو تۆ بە، خاکی ژێر قەدەم (٢٢٩٧)
زوڵمەتی غەم بوو، نەدەم، گەر هات بەغار  جا دەتارێتێ کەلامی شەو نەهار (٢٢٩٨)
گەر وەلاچوو زوڵمەتی غەم شاد بوو  تۆ بەیەک جا بوو لەغەم، بەر باد بوو (٢٢٩٩)
ئەو دەکا تەو بەو عەقڵ زار واز دەکا  ئەو بە(لو ردوا لعادوا ) گازدەکا (٢٣٠٠)

**بەیانی ئەو مەتڵەبەکەوەهم، عەقڵی تەقەللوبی وموعانید و موخـالیفی وییـە، وەک وی دەچێ ئەویش نییەوداستانی جواب دانەوەی مووسا کەساحەبی عـەقڵ بـوو، وفیرعـەون کەساحەبی وەهم بوو ..**

عەقڵە زیدی شەهوەتی حەیوانییە  هەرچی شەهوەت خوازە، عەقڵی لانییە (٢٣٠١)
هەرچی شەهوەت خوازە ساحەب وەهمە ئەو  هەرچی وەهمە غەششی عەقڵ و فەهمە ئەو (٢٣٠٢)
بێ مەحەک مەعلووم کە نابن وەهم و عەقڵ  تۆ ئەوان بۆ لای مەحەک زۆر زوو کە، نەقڵ (٢٣٠٣)
ئەنبیا حاڵیان و قورئان بوون مەحەک  بانگ دەکا غەششان مەحەک، چون یەک بەیەک (٢٣٠٤)
بێرەلام تاکو ببینی زۆر عەیان  تۆ لەلای من نی لەئەهلی ژێر و بان (٢٣٠٥)
گەر کو عەقڵی دوو لەتیش کا یەک مشار  شادوو خەندان چەشنی زێڕی نێو نار (٢٣٠٦)
وەهم بۆ فیرعەونە، دونیا تار دەکا  عەقڵ بۆ مووسا، جیهان پڕ بار دەکا (٢٣٠٧)
ڕێی فەنای مووسا لەبۆ خۆی گرتەبەر  پێیدەکوت کێیی؟ فیرعەونی خیرەسەر (٢٣٠٨)
پێیدەکوت عەقڵم، ڕەسوولی زولجەلال  حوججەتی خوام نایەبۆ من قەت زەلا ل (٢٣٠٩)
پێیدەکوت تۆ ئەو قسانەم بۆ مەڵێ  غەیری نێوو نیسبەتی خۆت تۆ مەڵێ (٢٣١٠)
پێیدەکوت من نیسبەتم هەرخاکەبەس  نێوی ئەسڵیم کەمترین ئەفراد و کەس (٢٣١١)
بەندەزادەی ئەو خوداوەندی یەکم  جا،کەنیزو بەردە، بابو دایکم (٢٣١٢)
نیسبەتی ئەسڵیم لەئاوەهەم لەخاک  دای بەئاوو خاک، دڵ و گیان، خوایی پاک (٢٣١٣)
مەرجەع و ئەسڵم ئەمن، هەر خاکەخاک  مەرجەعی تۆش خاکەخۆ، ئەی سامناک (٢٣١٤)
ئەسڵی ئێمەو ئەسڵی گشتی سەر کەشان  هەر لەخاکە، بۆ وە، زۆریش هەن نیشان (٢٣١٥)
خـاک بەجیسـمی تـۆ دەدا تـاب و تـەوان  بەو غەزای خاکی ئەتۆ دەت بێ ژیان (٢٣١٦)
ڕووح کەڕۆی تەبدیل دەبێتن تەن بەخاک  گەر کو چۆ نێو قەبری تاری سامناک (٢٣١٧)

هەم ئەتۆ هەم ئیمەهەم ئەشباهی تۆ دەبنەخاک، دەڕوا لەلات جا، جاهی تۆ (٢٣١٨)
پێیدەکوت تۆ نێوی دیشت خۆ هەیە زینەت و جوانیت بەوی زیاد تۆ هەیە (٢٣١٩)
بەندەبۆ فیرعەون و، بۆ بەندانی وی هەر بەوی مەحکەم بوو جیسم و گیانی وی (٢٣٢٠)
بەندەیێکی تۆ گەلێک تاغی و زەلووم لێرەڕۆیشتی کەکردت کاری شووم (٢٣٢١)
قاتلی هەم بێ وەفای هەم حەق نەناس چاک بناسەخۆت بەوان ئەوسافی ڕاس (٢٣٢٢)
تۆ لەغوربەت دا فەقیرو کۆن لیباس تۆ لەڕاستی حەققی من بووی ناسپاس (٢٣٢٣)
وای جەواب دا، وەک دەڵەی تۆ، وا، نییە بۆ خودایی، هیچ شەریک بۆ خوا نییە (٢٣٢٤)
بێ شەریک و بێ کەس و بێ یارەئەو بۆ عیبادیش هەر تەنێ سالارەئەو (٢٣٢٥)
بۆ عیبادیش ئەو بەتەنها مالیکە بۆشەریک بوون، موددەعی خۆ، هالیکە (٢٣٢٦)
نەقشی دونیاو من لەوی ڕا هات وەدی زاڵمەئەوکەس کەغەیری وی دەدی (٢٣٢٧)
تۆ کەناتوانی دروست کەی یەک برۆ چۆ ن لەدەستت دێ بناسی گیان، ئەتۆ (٢٣٢٨)
بەڵکەئەو غەددارەئەو تاغی ئەتۆی تۆی بەڕێگای شیرک و دوویی دا دەڕۆی (٢٣٢٩)
یەک نەفەر مەئموور من کوشتم، بەسەهوو نەک بەشەو ق و،مەیل و ڕەغبەت،یا بەلەهو (٢٣٣٠)
مستەکم لێدا لەناکا وکەو تەخوار جا، وەری گرت ڕووح لەبێ ڕووح، کردگار (٢٣٣١)
من سەگێکم کوشت بەد فەڕ، زێدەهار تۆ منا ڵت بێ گوناەکوشت، سەت هەزار (٢٣٣٢)
کەو تەئەستۆت خوێنی وانەی کوشتنت چیت بەسەر دێ تۆ ئەلەو خوێن ڕشنت؟ (٢٣٣٣)
کوشتنت زوورییەتی یەعقووب ئەتۆ تا بەقەتڵم بێتەلات مەتڵووب ئەتۆ (٢٣٣٤)
کوێر بە، جا تۆ، چون منی حەق هەڵبژارد ئارەزووی تۆی، ئەو لەبۆ نێو گۆر، دەنارد (٢٣٣٥)
پێیدەکوت تۆ لەو قسانەدوور کەخۆت بێتەبیرت چەندەچاکەم بوو لەبۆت (٢٣٣٦)
تۆ لەلای عالەم کەمن وا خوار دەکەی ڕۆژی ڕووناکم لەلای دڵ تار دەکەی (٢٣٣٧)
پێیدەکوت خواری لەمەحشەر، زێدەبەد گەر نەبێ پەیرەو ئەتۆ بۆ خوای ئەحەد (٢٣٣٨)
زەخمی کێچێک گەر دەکا تۆ بێ قەرار چۆن لەدەستت دێ قەبووڵ کەی زەخمی مار؟ (٢٣٣٩)
زاهیرەن من کاری تۆ، بەر با، دەکەم من لەیەک خار یەک گوڵستان چا دەکەم (٢٣٤٠)

**بەیانی ئەو مەتڵەبەکەچاک کردن دەخەراب کردن دایە، وئیتتیحادویەکیەتی دەبلاو بوون و پەڕاکەندەگی دایە، ودروست بوون و سالم بوون دەشکان دایە، مراد دەبێ مرادی دایە(وعلی هذا بقیە الاضداد )..**

عەردی بۆ چاندن دەکێڵا یەک نەفەر وای بەوی کوت شەخسەکی زۆر بێ خەبەر (٢٣٤١)

ئەو زەمینەی بۆ ئەتۆ ویران دەکەی؟ — بۆ هەڵی دەدری، ئەوی بێ گیان دەکەی (۲۳۴۲)
پێیدەکوت تۆ لێم گەرێ ئەی هیچ نەزان — تا نەبێ ویران نابێ ئاوەدان (۲۳۴۳)
چۆن دەبێتەمەزرەعەو گوڵزار زەوی — گەر نەکەی ویران و ناحەز تۆ، ئەوی (۲۳۴۴)
ئەو زەمینەژێرو ڕوو نەکرێ ئەگەر — چۆن لەوی پەیدا دەبن باغ و سەمەر؟ (۲۳۴۵)
نەچتەبەرنشتەرئەگەر غوددەی مەریز — چوو لەدەس وی تا ئەبەد خۆشی لەزیز (۲۳۴۶)
چڵکی نێو تەن لانەباتن گەر دەوا — چۆن دەچێتن ئیزتیراب چۆن دێ شیفا؟ (۲۳۴۷)
گەر کو خەییات پارچە، پارەپارەکات — کەس لەوی نادا بەجورمی وا، چکات (۲۳۴۸)
کەس بەوی ناڵێت بۆ وات کرد چ جار — بۆ دراندت، تازەنایەت، بۆم بەکار (۲۳۴۹)
گەر کەسێک خانوویەکی کا، ئاوەدان — تێک دەدا ئەووەڵ لەوی، دیوارو بان (۲۳۵۰)
تاکو،کار خەییات و نەججار پێش بەرن — پێش دروست کردن ئەوان وێرانکەرن (۲۳۵۱)
ئەو هەلیلەوئەوبەلیلە، ورد دەکەن — لا دەبەن ئەو دەم بەوان دوو،دەردی تەن (۲۳۵۲)
تا نەکەی گەنمی لەئاش تۆ وردو خاش — سفرەناکەی تۆ بەوی، ئاڕاستە باش (۲۳۵۳)
وای تە قازا کرد ئەو نان و نەمەک — تۆ لەتۆڕو بەن، نەجات دەم ئەی سەمەک (۲۳۵۴)
پەندی مووسا گەر ببیسی بێ گومان — تۆ لەبەندی والەبەد، دەت بێ ئەمان (۲۳۵۵)
تۆ کەکردت سەر وەرو مەو لا، هەوا — کرمەکی چووکت ئەتۆ کرد ئەژد ەها (۲۳۵۶)
ئەژدیهام هیناوەجەنگی ئەژدیها — تا لەنەفسی بەد ئەمن، بتکەم ڕەها (۲۳۵۷)
ئەژدیهام تا ئەژدیهات ورد کا بەدەم — ڕەد بکا ئەو ئەژدیژدیهای تۆ، بۆ عەدەد م (۲۳۵۸)
گەر موتیع بی ڕەنج نادەن تۆ دوومار — خۆ دەنا، دەت کات ئەو مار، تارو مار (۲۳۵۹)
پێیدەکوت ئوستادی تۆ بۆ جادوویی — لێرەچاکت کرد لەنێو مان تۆ دوویی (۲۳۶۰)
ئیتتیحادت تۆ لەعالەم خستەدەر — چون لەبەردو کێو دەکا جادوو ئەسەر (۲۳۶۱)
پێیدەکوت من غەرقی پەیغامی خودام — جا لەسیحرو مەکرو جادوو من جودام (۲۳۶۲)
کفرو غەفڵەت مایەیی جادوو گەرین — گیانی مووسا مەشعەلی ئاشکاری دین (۲۳۶۳)
کوا وەکوو جادووگەرم من ئەی وەقیح؟ — بۆ دەمی من ئارەزوو مەندە، مەسیح (۲۳۶۴)
کواوەکوو جادووگەرانم ئەی جونوب — نووری وەردەگرن لەگیانی من کوتوب (۲۳۶۵)
تۆ کەبەو باڵی هەوا پەر واز دەکەی — بۆیەفیکری والەبۆ من ساز دەکەی (۲۳۶۶)
هەرچی وەک حەیوانی وایەکاری وی — بۆ کەریمان بەد دەبێ ئەفکاری وی (۲۳۶۷)
ئەو جیهانە، تۆ کە جوزئێکی لەوی — کول وەکوو خۆت کەج دەبینی، ئەی غەوی (۲۳۶۸)

خۆت بسووڕێنی و بسووڕێ سەر ئەگەر — وا دەزانی تۆ دەسووڕێ دەورو بەر (٢٣٦٩)
گەر لەکەشتی دا بڕۆی تۆ بێ گومان — وایەلات، دەڕوات ساحیل ئەو زەمان (٢٣٧٠)
گەرکوغەم بێت و، ئەتۆ غەمگین بکات — تەنگەدونیای واعەزیم وگەورە،لات (٢٣٧١)
گەر لەلای دۆستان ئەتۆ بی شادمان — بۆت دەبێتەمەنزەرەی گوڵزار جیهان (٢٣٧٢)
زۆر کەسان ڕۆین هەتا شام و عیراق — هەر فەقەت دیتیان ئەوان کفرو نیفاق (٢٣٧٣)
زۆر کەسانیش چوون هەتا هیندو هیرا — هاتەبەر چاویان فەقەت بەیع و شیرا (٢٣٧٤)
زۆرکەسانیش چوونەتورکوستان وچین — هەر فەقەت دیتیان ئەوان مەکروکەمین (٢٣٧٥)
غەیری زاهیر خۆ، چ نابینن ئەوان — گەرچی جستوجۆش بکەن گشتی جیهان (٢٣٧٦)
گەر کو گایەک تۆ لەبۆ بەغدا بەری — لەو سەری بڕوات تاکو ئەو سەری (٢٣٧٧)
لەو هەمووخۆشیەی لەنێو ئەوشارە،ئەو — بەس دەبینێ پێلکەخرچێک دیارەئەو (٢٣٧٨)
کەو تبێ، یا پووش لەسەر ڕێگا ئەگەر — لەززەتی تێدا فەقەت بۆ گاوو کەر (٢٣٧٩)
چونکەبۆ زاهیر ئەسیربوو بەد سیفەت — زیاد ناکا گیانی وی قەت مەعریفەت (٢٣٨٠)
ئەو فەزای تێدا سەبەب نایەت بەکار — هەر بەتەنها سەر زەمینی کردگار (٢٣٨١)
دەمبەدەم تەبدیل دەبێ وەک نەقشی گیان — بۆی دەگۆڕێتن جیهان گشتکات وئان (٢٣٨٢)
گەر نەگۆڕێتن بەهەشتیش قەت چ جار — ڕەنگ و تامی بەد دەبێ لای چاوو زار (٢٣٨٣)

**بەیانی ئەو مەتڵەبەکەئەواوی حەواس، بەو شەرتەکەڕووح پاک و تەزکیەکرا، دەتوانن غەیری وەزیفەی خۆشیان ئەنجام بدەن مەسەلەن چاو دەتوانێ هەم ببینێ هەم ببیسێ گوێ دەتوانێ هەم ببیسێ هەم ببینێ ..**

وسعەتی دونیا بەقەد ئیدراکی تۆ — پەردەبۆ پاک، حیسسی زۆر ناپاکی تۆ (٢٣٨٤)
ماوەیەک حیس بێنەژێر ئاوی عەیان — وایەشوستوشۆی لیباس لای سۆفیان (٢٣٨٥)
گەر تۆ پاک بی، لادەدا پەردان خودا — گیانی پاکان خۆی نیشانی تۆ دەدا (٢٣٨٦)
گەر ببێتە نەقش و نوور دونیا تەواو — گشت حەواس لەوبێ خەبەر بوون غەیری چاو (٢٣٨٧)
گەر ببەستی چاو، گوێ بۆیێش بەری — تا نیشان دەی زولف و ڕوخساری پەری (٢٣٨٨)
گوێ دەڵێ کارم نییەدیداری ڕوو — من دەبیسم گەربڵێ گوفتاری ڕوو (٢٣٨٩)
عالمم من هەر بەکاری خۆم و بەس — کاری من هەر دەنگەگەردێ بۆ م و، بەس (٢٣٩٠)
گەربڵەی ئەی دم، نیگای ئەو جوانەکە — دم دەڵێ لێم ئینتیزاری وا نەکە (٢٣٩١)
بۆن دەکەم من گەرببن عەتر و عەبیر — فەنن وعیلمم ئەوهەیەبەس ئەی ئەمیر (٢٣٩٢)

کوا لەدەستم دێ ببینم ڕوویی جوان؟    غەیرەمومکین لێت نەوێم تۆ، ئەی فلان (٢٣٩٣)
حیسسی کەچ هەر کەج دەبینێ جا ئەتۆ    دەت هەوێ ڕاس ڕێ برۆ یا خواربڕۆ (٢٣٩٤)
شەخسی چاوخێل چاک بزانەتۆ یەقین    یەک لەلای وی دوویە،ئەی بۆ دین موعین (٢٣٩٥)
تۆ کە فیرعەونی، دەکەی هەرمەکروزەڕق    وادەزانی من دەگەڵ تۆ نیمەفەڕق (٢٣٩٦)
لێم مەنۆڕەتۆ بەچاوی خێلی خۆت    تا بەدوو تەبدیل نەبێتن یەک لەبۆت (٢٣٩٧)
چاو بەچاوی من لەمن کەساعەتێ    تا ببینی غەیری دونیا سا حەتێ (٢٣٩٨)
جا نەجاتت دێ لەتەنگی و، نێو بەدی    عیشقی نێو عیشقت ئەتۆ بۆ دێ وەدی (٢٣٩٩)
جا دەزانی تۆ ئەگەر لات نا، بەدەن    کاری چاوت،گوێ و بەدەن ئەنجام دەدەن (٢٤٠٠)
ڕاستەقەو لی ئەو شەهی شیرین کەلام    عارفان موویان دەبێتەچاو تەمام (٢٤٠١)
خۆ لەبۆ تەن چاو نەبوو ئەووەڵ یەقین    نێوڕەحیم بوو پارچەگۆشتێک ئەو جەنین (٢٤٠٢)
عیللەتی دیتن مەزانە پیوەبەس    نەیدەدی وابا، لەخەو دا قەت، چ کەس (٢٤٠٣)
هەردوو بینان، هەم جنووکە، هەم پەری    چاوەکانیشیان لەچەوری و، پیو، بەری (٢٤٠٤)
هیچ نەبوونیسبەت لەبەینی پیو، نوور    پێیدەدان نیسبەت خوداوەندی غەفوور (٢٤٠٥)
جینسی ئینسان خاکە، بۆ جین نارەجینس    نین شەبیهی جینسی خۆیان جنن و،ئینس (٢٤٠٦)
گەرچی جندووکان، ئەسڵی وانەنار    هیچ شەبیهی نا ڕنینە، ئاشکار (٢٤٠٧)
ئەسڵی تەیران بایە،کوا وەک با ن،تیوور؟    بەینی ئەزداد نیسبەتی چاکرد غەفوور (٢٤٠٨)
نیسبەتی ئەو ئەسڵ و فەرعە، بێ میسال    ئێرتیباتی دا بەوان خوای زولجەلال (٢٤٠٩)
تۆ دەزانی چادەبوو ئا دەم لەقوڕ    بێژەتۆ، بۆم نیسبەتی ئەو باب و،کوڕ (٢٤١٠)
گەر هەبێ نیسبەت لەعەقڵی مەخفییە    بێ میسالە، عەقڵ نازانێ، چییە (٢٤١١)
گەر بەبێ چاو، با، نەبا بینا، ئەدی    قەو می عادی بۆ دەکوشت، نەک ئیدەدی؟ (٢٤١٢)
موئمینی چۆن ئەو دەناسی هەم عەدوو    چۆن شەرابی ئەو دەناسی هەم کەدوو (٢٤١٣)
چاونەبا بۆ ناری نەمروودی لەئیم    بۆ خەلیل بۆچی دەبوو سەردی سەلیم؟ (٢٤١٤)
گەرکو نەیباچاوی زۆرتیژ بین نیل    چۆنفەقەت قیبتی دەگرت،دەیکوشت زەلیل (٢٤١٥)
کێو کەنەیبا چاوی دیدار قەت چ جار    چۆن لەبۆ داود دەبۆ هاوڕێ و،یار؟ (٢٤١٦)
گەرکو نەیبا چاوی گیان ودڵ زەوی    چۆنی قارِوون قووت دەدا هەم گەنجی وی؟ (٢٤١٧)
گەرکو نەیبا چاو، حەننانە، ئەدی    چۆن بوو دەیدی هیجری زاتی ئەحمەدی؟ (٢٤١٨)
ورکەبەردان گەر نەیان با چاوو زار    چۆن لەمستی ئەحمەدی کوتیان وتار؟ (٢٤١٩)

لێک دە، باڵ ئەی عەقڵی باش و پڕ بەها جا بخوێنە (زلزلت‌زلزالها) (٢٤٢٠)
ڕۆژی مەحشەرئەوزەمینەی بێ سەدا گەرکو نەی بێ چاو،گەواهی چۆن دەدا؟ (٢٤٢١)
ئەو دەکا بۆ مان بەیان ئەخباری خۆی بۆن دەکاتن ئاشکرا ئەسراری خۆی (٢٤٢٢)
خوا کەئەمنی نارد بۆلای تۆی ئەمیر بۆدەلیلی ئەوهە، مورسیل بوو خەبیر (٢٤٢٣)
چونکەناسۆر گەر وەها بێ پڕ زوخاو مەڵحەمی وای لازمە، تا بێ بڵاو (٢٤٢٤)
تۆ لەخەو دا دیتبووت پێشان ئەوا بۆ ڕیسالەت من دەکا مەئموور، خودا (٢٤٢٥)
من لەدەستم دان عەساو نوور زێدەباش جا دەکەم من شاخی پیست، وردو خاش (٢٤٢٦)
هەر لەبۆیەپێی نشان دای خوایی پاک واقیعەو خەونی گەلێک زۆر سامناک (٢٤٢٧)
**لایقی توغیان و ئەسراڕی بەدت لایقی گوفتارو کرداری بەدت** (٢٤٢٨)
تابزانی تۆ کەئەسراڕ زانەئەو موسلیحی دەردانی بێ دەر مانەئەو (٢٤٢٩)
کوێرو کەڕ بووی تۆ بەتەئویلات لەو تۆ ئەوت زانی لەسەنگین بوونی خەو (٢٤٣٠)
زانیان تەعبیر، زانایان بەعام حیرس و ئاز نەی هێشت بڵێن لەو هیچ بەلام (٢٤٣١)
جا هەموو زانا دەیان کوت وا، بەوی دوور ببێ لێت دەردی ئاسمان و زەوی (٢٤٣٢)
چون غەزای زۆر، جا، بەبێ ڕۆن، یابەڕۆن خەونی ئالۆزچادەکەن،دێن و،دەڕۆن (٢٤٣٣)
چونکەدیتیان تۆ کەناتوێتن، چ پەند بەدفەڕی، خوێنڕێژی، نەک ئارام و، مەند (٢٤٣٤)
گەرچی پاشایان دەڕێژن خوێن، چەلێ ڕەحمی وان زیاتر لەقەهری وا ن، گەلێ (٢٤٣٥)
شا دەبێ هەیبێت خوڵق وخوویی ڕەب چونکەهەیتی زێدەڕەحمەت کەم غەزەب (٢٤٣٦)
نەک غەزەب زیاترلەڕەحمەت وەک بلیس جا،بڕێژێ خوێن بەمەکروفێڵی پیس (٢٤٣٧)
نەک حەلیمێک وەک موخەنەس بێ دەنی بینەفەحشا هەم کەنیزی هەم ژنی (٢٤٣٨)
کردبووتەماڵی شەیتان سینەکەت کردبووتەڕووگەبۆ خۆت کینەکەت (٢٤٣٩)
شاخی تیژت بێ ژماری خوێن ڕژاند ئەو عەسایەم شاخی تیژی تۆی شکاند (٢٤٤٠)

**حەملەکردنی ئەهلی ئەو دونیایەبۆ سەر ئەهلی دونیای دی تا سنووری غەیب وغافڵ بوونی ئەهلی ئەو دونیایەلەکەمینی ئەهلی دونیای دی، چون ئەگەر غازی نەچێتەجەنگ،کافر حەملەدێنێ ..**

حەملەیان جیسمانیان کرد زێدە سەخت سەر قەڵای ڕووحانییانی خۆشبەخت (٢٤٤١)
تا ببەستن لەو قەڵا، ڕێگا و گوزەر تا مەبادا پاکدڵێک لەو بێتەدەر (٢٤٤٢)
غازییا ن گەرکونەکەن حەملەو هجووم حەملەدێنن کافرانی پیس و شووم (٢٤٤٣)

غازیبانی غەیب چون بوون بوردبار        هیچ نەیان کرد حەملەسەر تۆی نا لەبار (٢٤٤٤)
بۆیەکردت تۆ قەلای غەیبی حیسار        تا نەیەت بۆ ئێرەقەت کەس لەو دیبار (٢٤٤٥)
تۆ لەگەڵ سولب و ڕەحیم کردت هەرا        تاکوبگری ڕێ لەپاکانی خودا (٢٤٤٦)
کوا دەگیرێ شاهراهێک پێت، خوڵا        بۆ تەناسول کردی دائیم ئاوەڵا؟ (٢٤٤٧)
زێدەڕێگەت تۆ دەبەستن ئەی فەقیر        هات بەکوێری هەردووچاوت،یەک ئەمیر (٢٤٤٨)
ئەو ئەمیرەم من کەدەشکێنم سپات        پاک دەکەم لێت، من بەنێوی حەق وڵات (٢٤٤٩)
چی لەدەستت دێ بەدی، ئێجرا بکە        غەبغەبت تۆ ماوەیەک پڕ با، بکە (٢٤٥٠)
گەر قەدەر هات قودرتت ئیفنا دەبێ        لای قەدەر تەدبیر نابینا، دەبێ (٢٤٥١)
قودرەتی تۆ زیادەیا ئی قەومی عاد        گەر هەناسەی وان، دەی لەرزاند بیلاد (٢٤٥٢)
تۆ، لەجووجی زێدە، یا قەومی سەموود        وەک ئەوان قەت تازەنابینی وجوود (٢٤٥٣)
گەرلەوانەت پێ بڵەم،من سەت کەڕەت        وادەدەی نیشان کە نەتبیستوونەقەت (٢٤٥٤)
من لەوەی پاش لادەنێم قەو لو وتار        بێ وتار دەت کەم ئەمن دەرمان و چار (٢٤٥٥)
جا دەکەم دەرمان برینی تۆ ئەمن        یانەچابی، یا دەرێت ڕیشەت لەبن (٢٤٥٦)
تا بزانی تۆ کەئاگایەخودا        ئەو بەهەرکەس هەرچی لایق بێ دەدا (٢٤٥٧)
بێژەبۆ من کەی ئەتۆ کردت بەدی؟        جا جەزای لایق بەکاری خۆت نەدی؟ (٢٤٥٨)
کەی ئەتۆ کردووتەکاری باش ئەدی        لایقی ویت ئەجرو پاداش تۆ نەدی؟ (٢٤٥٩)
گەر موڕاقیب بی، ببی وشیار ئەتۆ        چاک دەبینی موزدی گشت کردار ئەتۆ (٢٤٦٠)
گەر موڕاقیب بی و، بەدەس بگری ڕەسەن        بێ نیبازیت تۆ لەمەحشەر پێدەدەن (٢٤٦١)
هەر کەسێک ڕەمزێک بزانێتن سەحیح        بێ نیبازەئەو لەبۆی بێژن سەریح (٢٤٦٢)
تۆ بەلای وات دێ بەسەرچون ئەحمەقی        فەهمی ڕەمزونوکتەناکەی ئەی شەقی (٢٤٦٣)
گەردڵت ڕەش بوو بەکاری بەد ئەتۆ        چاکەبۆ تۆ ئەحمەقی لادەی، لەخۆ (٢٤٦٤)
لێت دەبێتەتیر ئەو ڕەشیەدەنا        بۆ موجازات پێت دەدا ڕەنج و عەنا (٢٤٦٥)
لوتفی خوایەگەرکو تیرت بۆ نەهات        نەک بڵەی نەی دیوەئەو هیچ بەد لەلات (٢٤٦٦)
جا موڕاقیب بە، ئەگەر دڵداری تۆ        چون لەدوویان دێت کار، گشت کاری تۆ (٢٤٦٧)
هیممەتی تۆ لەو هەزیاتر بێ ئەگەر        دیتەژێر ڕوتبەت موڕاقیب، تۆش لەسەر (٢٤٦٨)

**بەیانی ئەو مەتڵەبەکەبەدەنی خاکی ئادەمی وەک ئاسنێکی ئەسڵ وایەکەلیاقەتی ئەوەی هەیەببێتەئاوێنە، تا هەر لەدونیادابەوەسیلەی وی بەهەشت ودووزەخ و قیيامەت ئاشکرا ببیندرێن نەک لەرێگای خەیاڵ ..**

گەرچی وەک ئاسن ئەتۆ تاری، وەرە | خۆت سەفاو سەیقەل دە،ژەنگت لابەرە (٢٤٦٩)
تا دڵت تەبدیل بەیەک ئاوێنەبێ | جا ڕەزا سووکان ئەوەی خاوێنە بێ (٢٤٧٠)
گەرچی ئاسن تارەنیتی قەت چ نوور | ژ ەنگ و تاری لەو دەکا سەیقەل بەدوور (٢٤٧١)
سەیقەلی، ئاسن وەها سەیقەل دەدا | سوورەتان دەو دا دەبینرێن، بێ سەدا (٢٤٧٢)
جیسمی خاکی گەر غەلیزەو زێدەتار | سەیقەلی کە، تاریەکەی دەڕوا بەغار (٢٤٧٣)
جا دەویدا، شکڵی غەیبی دیاردەبێ | عەکسی حۆریان و مەلەک ئاشکار دەبێ (٢٤٧٤)
سەیقەلی گەرکرد بەعەقڵت، خوا، عەتا | ڕوون ببێ، تابان ببێ، قەلبت هەتا (٢٤٧٥)
دەستی عەقڵی سەیقەلیت تۆ توند دەبەست | لەوهەوا، تۆ ئاوەڵات کرد هەردوودەست (٢٤٧٦)
گەر لەبەن بخرێت دوو دەستی هەوا | دەستی سەیقەل کەر، دەبێتن ئاوەڵا (٢٤٧٧)
ئاسنێک گەربێ بەئاوێنەی نیهان | بۆ هەموو سوورەت دەبێ ئەو جێی وەمەکان (٢٤٧٨)
ژ ەنگ وتاریت ویست ئەتۆ خۆت، بۆ نیهاد | ئەو هەیە(یسعون فی الارض الفساد ) (٢٤٧٩)
تاکو ئێستا وات کەکرد، ئیدی مەکە | ئاوەکەت قووڕاو کەکرد، چیدی مەکە (٢٤٨٠)
لێک مەدەقووڕاو مەکە، ئەو ئاوی ساف | چاوکەئەستێران دەکەن دەودا تەواف (٢٤٨١)
چونکەئینسان بوو شەبیهی ئاوی جۆ | گەر قوڕاو بێ، ژێر وی نابینی ئەتۆ (٢٤٨٢)
ژێری جۆگە،گەو هەری تێدا، بەبار | ئەو لەئەووەڵ سافە، مەیکەلێڵ و تار (٢٤٨٣)
گیانی ئینسان بۆمیسال هەر وەک هەوا | تێکەڵی تۆزبێ، دەبێ پەردەی سەما (٢٤٨٤)
نایەڵی ئێمەببینین نووری تاو | تۆز، کەلاچی ئەو دەبێتن ساف بەچاو (٢٤٨٥)
بەو هەموو تاریەت، خوداوەند، واقیعات | پێی نیشاندای تاکوبگری ڕێی نەجات (٢٤٨٦)

**بەیان کردنی مووسا ئەسراپو ڕازی خەونی فیرعەون لەبۆ فیرعەون تائیمان بێنێ بەوە کەخوداوەندی والا مەقام عالم و ئاگادارە..**

واقیعاتی دا نیشانی فیرعەون | قادری موتڵەق لەڕێی ڕوئیا و خەون (٢٤٨٧)
تا نەکەی چیدی ئەتۆ زوڵم و بەدی | زێدە کردت گەرچی ڕاستیت تۆ دەدی (٢٤٨٨)
نەقشی پیسی زۆر نیشان دای کردگار | نەقشی تۆ بوون تۆ لەوانت کرد فیرار (٢٤٨٩)
وەک لەنەینووک قول،لەڕووی خۆی ڕوو دەکرد | چونکەپێی پیس بوولەسەروی گوو دەکرد (٢٤٩٠)

تۆ کەپیسی لایقی بۆ ئەو هەبەس ناحەزی من ئی تووە، ئەی کوێری خەس (٢٤٩١)
گووت لەسەرڕووی ناحەزی خۆت کرد ئەتۆ نەک لەسەرمن،من کەڕوونم بێ درۆ (٢٤٩٢)
زۆر کەڕەت دەت دی لیباست لێدەسووت جار دەبەسران چاوو زاری تۆ بەجووت (٢٤٩٣)
جار سەری گرتی بەد ەندان جانەوەر جار ویستی دەد، بکا خوێنت هەدەر (٢٤٩٤)
جار دەکەوتی تۆ سەروبن نێو مەبال جار دەخنکای تۆ لەسەیلی بێ میسال (٢٤٩٥)
جار لەئاسمان ڕا لەبۆت هات وا، نیدا ئەی شەقی ئەی نالەبار ئەی بەد ئەدا (٢٤٩٦)
جار نیداهات ئاشکرا بۆت لای جیبال تۆ بڕۆ چون تۆی لەئەسحابوششیمال (٢٤٩٧)
لای جەمادجار جار دەهات بۆت وا نیدا تا ئەبەد جێت دوو زەخەئەی بەد ئەدا (٢٤٩٨)
من لەشەرمان لەو وتارەبەس دەکەم تا نەسووتێی وردەوردە،چەشنی شەم (٢٤٩٩)
پێم کوتی‌ئەی بێ گووێ،پەند،کەم،چەلێ تێدەگەی لەوکەم،کەئاگام،من گەلێ (٢٥٠٠)
خۆت لەکوێری داوو خۆت کرد گێژو مات تا نەکەی فکرێ لەخەون و، واقیعات (٢٥٠١)
بەس هەڵێ، لات هات ئەوەی نای خوازی تۆ کوێربێ با، دەرکی زۆر فێڵبازی تۆ (٢٥٠٢)

**بەیانی ئەو مەتلەبەکەدەرکی تۆبەئاوەڵایە..**

تۆ لەوەی کردت، لەوەی پاش بێنەواز چونکەڕەحمان دەرکی تۆبەی کرد واز (٢٥٠٣)
تۆبە، دەرکێکی لەڕۆژ ئاوا، هەیە وازەبۆ عام، تاقیامەت وا، هەیە (٢٥٠٤)
تا لەمەغریب ڕۆژی ڕووناک دێتەدەر وازەئەو دەر، لا مەدەلەو دەرکەسەر (٢٥٠٥)
حەودەری لوتفی خوداوەند، دابەهەشت دەرکی تۆ بەی کرد عەلاوە، بوون بەهەشت (٢٥٠٦)
ئاوەڵان هەم جارو یار بەستەن ئەوان دەرکی تۆ بەئاوەڵایەگشت زەمان (٢٥٠٧)
دەرکەوازەڕوو کەوێ، ئێستا هەلە با حەسوود کوێر بێ، بکە، جا، تۆ پەلە (٢٥٠٨)

**کوتنی مووسا بەفیرعەون کەپەندێک لەمن قەبووڵ بکە، لەعیوەز دا چوارشتی زۆر بەنرخ وەر بگرە..**

**خولاسەی داستان ..**

حەزرەتی مووسا بەفیرعەونی کوت وەرە، یەک قسەلەمن قەبووڵ بکەلەعیوەزدا چوارپاداش بەتۆ دەدەم، فیرعەون بەمووسای کوت ئەی مووسا ئەو قسەم پێ بڵێ، حەزرەتی مووسا کوتی ئەو قسەئەوەیەکەبەئاشکرابڵەی غەیری خودای واحید هیچ خودایەک نییە،فیرعەون کوتی ئەوچوارپاداشانەبەیان بکە،جا مووسا ئەو چوار پاداشانەی بەیان کردن کەعیبارەت بوون

لەسەلامەت بوون و توولی عومر وسەڵتەنەتی دونیاو ئاخیرەت وجەوانی دائیمی ..فیرعەون جێ بەجێ ئەو مەو زووعەی بەهاوسەری خۆی ئاسیەکوت و ئەویش فیرعەونی بەقەبووڵی شەرتی مووسا تەشویق کرد، بەڵام فیرعەون کوتی لازمەکەپێش قەبووڵ کردنی ئەو شەرتەلەگەڵ هامانی وەزیرم مەشوەرەت بکەم هەرچەند ئاسیەپێیکوت کەلەبارەی ئەو مەوزووعەلەگەڵ هامانی دڵ ڕەش مەشوەرەت نەکا، بەڵام فیرعەون ئەو مەو زووعەی لەگەڵ هامان مەترەح کرد، و ئەویش فیرعەونی لەو کارەپەشیمان کردەوە..

یەک نەسیحەت لێم قەبووڵ کە، دەی وەرە — بۆ عیوەز جا چوار پاداش تۆ بەرە (۲۵۰۹)

دەیکوت ئەی مووسا بڵێ پێم، ئەویەکە — شەرحی ویم زوو پێ بڵێ، تەئخیر مەکە (۲۵۱۰)

دەیکوت ئەو یەک، تۆ ببێژی ئاشکار — هیچ خودا نین غەیری زاتی کردگار (۲۵۱۱)

ئافەرینەندەی هەموونەجم و فەلەک — ئادەمی و،تەیرو،پەریو، دێو،یەک بەیەک (۲۵۱۲)

ئافەرینەندەی هەموو نەجم و زەوی — بێ نەزیرەقودرەتی بێ حەددی وی (۲۵۱۳)

دەیکوت ئەی مووسا ئەدی کوان ئەو چووار؟ — بێنەبۆ من بۆ عیوەز، وابوو قەرار (۲۵۱۴)

تا بەلوتفی وەعدەیی واجوان بەمن — کفرو عیسیانم ئەمن دەربێ لەبن (۲۵۱۵)

بەڵکەبەو وەعدەی کوتت، دێ لای خولا — قفڵی کفری سەت مەنیم بێ، ئاوەڵا (۲۵۱۶)

بەڵکەلێم تەئسیربکا جۆی ئەنگەبین — تا ببێتەئەنگەبین بۆم ژەهری کین (۲۵۱۷)

بەڵکەوا تەئسیربکا ئەو جۆگەشیر — بۆم دەمێ ئازاد ببێ عەقڵی ئەسیر (۲۵۱۸)

بەڵکەمەستم کا، وەها جۆگەی شەراب — بۆنی زەوقی ئەمری حەق بۆم بێ کەباب (۲۵۱۹)

بەڵکەجۆگەی ئاو،وەها تەئسیر بکات — جوان و شاداب کا،تەنی وەک شۆرەکات (۲۵۲۰)

شۆرەکاتم شین ببێ لێی،گیایی شین — خارزاریشم بەهەشتی دڵنشین (۲۵۲۱)

یا سەبەب بن وا، بەهەشت و چوارجۆ — گیان بەیاری حەق بکا، یار جستو جۆ (۲۵۲۲)

هەر وەکوو ئێستا، بەدووزەخ بوومەنار — غەرقی خەشم و قەهری زاتی کردگار (۲۵۲۳)

جار لەماری دووزەخی، من چەشنی مار — سەر بەهەشتیان دا،دەرێژم زیندەژار (۲۵۲۴)

جار لەتین و جۆششی ئاوی حەمیم — ئاوی زوڵمم ئێسکی خەڵکی کرد ڕەمیم (۲۵۲۵)

من لەسەرمان جار و بارەم زەمهەریر — هەم لەگەرمان جارو بارەم وەک سەعیر (۲۵۲۶)

دوو زەخم من، بۆ زەعیف و بۆ فەقیر — من زەعیف ئازار دەدەم چەشنی ئەسیر (۲۵۲۷)

**بەیان کردنی مووسا ئەو چوارشتەباشانەبەعینوانی پاداش بەفیرعەون بەخاتری ئیمـان هینانی وی ..**

پێیدەکوت مووسا کەئەووەڵ لەو چووار | تەندروستی تۆ دەبێتن پایەدار (٢٥٢٨)
ئەوهەمەموودەردەی لەتیب دا بوون بەیان | دووردەکاتن لێت هەموویان خوای جیهان (٢٥٢٩)
سانیەن دەت بێت عومرێک زۆر درێژ | جا لەحاستی تۆ ئەجەل کوێر،گێڵ و گێژ (٢٥٣٠)
جا، نەژینێکی گەلێک دڵخواز و خۆش | عاقیبەت ئەو جێ بهێڵی دڵ پەرۆش (٢٥٣١)
بەڵکەوات مردن دەوێ وەک تیفل، شیر | نەک بەئێشێکی دەکاتن تۆ ئەسیر (٢٥٣٢)
مەرگ خوازبە، نەک بەخاتر دەرد و ڕەنج | بەڵکەچون تێیدا، خەرابی خانەگەنج (٢٥٣٣)
جا بەدەس دەگری کوڵینگ و تیشەتۆ | تێک دەدەی خانەبەبێ ئەندیشەتۆ (٢٥٣٤)
تێدەگەی جا، پەردەبۆ گەنج، خا نەیە | مانعی سەت خەرمەنان یەک دانەیە (٢٥٣٥)
جا لەنێو ئاگر دەخەی ئەو دانەتۆ | جا دەڕۆی بەو ڕێگە، ڕێی مەردانەتۆ (٢٥٣٦)
ئەی ئەوەی بۆ یەک گەڵات،باغ دا کەنار | چەشنی ئەوکرمەی گەڵای ویست ئەو نەدار (٢٥٣٧)
لوتفی حەق وشیاربکا ئەو کرمەگەر | ئەژدیهای نادانی دەخوا تاکو سەر (٢٥٣٨)
کرمی باغ بۆ، باغی پڕ میوەو درەخت | وا دەگۆڕێ شەخسی باش و خۆشبەخت (٢٥٣٩)

**تەفسیری (کنت کنزاً مخفیا فاحببت ان اعرف)**

تێک دەماڵ، چون بەو عەقیقی ئەو یەمەن | سەت هەزاران زێدەماڵان چادەکەن (٢٥٤٠)
تێک دەئەوماڵەی کەگەنجی بێ لەژێر | زووخەرایکە،تۆ نەکەی یەک زەڕڕەدێر (٢٥٤١)
چون هەزاران ساختمان بێ دەردو ڕەنج | دێ لەدەستت چا بکەی،گەربێت گەنج (٢٥٤٢)
عاقیبەت ئەو ماڵەوێران هەر دەبێ | گەنجی ژێری ویش عوریان هەر دەبێ (٢٥٤٣)
موزدەئەمما بۆکەسێک ئەو جوورەگەنج | بۆ خەرابی خانەکێشای زێدەڕەنج (٢٥٤٤)
بەس بەڕەنجی زۆر،وەدەس دێ گەنجی باش | سوود بە ئینسانان دەدا، تەنها تەلاش (٢٥٤٥)
جادەبی تۆ زۆر حەزین و دڵ بەغەم | جا دەڵەی ئەو مانگەڕوونەم، کەوتەتەم (٢٥٤٦)
قەو لی پاکانم ئەمن ئەنجام نەدا | گەنج وماڵم چوو لەدەس، مام وەک گەدا (٢٥٤٧)
تۆئیجارەت کرد ماڵێک دڵنشین | ئەو نەبۆ موڵکت بەبەیعێک پاکڕین (٢٥٤٨)
ئەو ئیجارەموددەتی وی تا ئەجەل | تاکوئەنجام دەی دەوی دا، تۆ عەمەل (٢٥٤٩)
تۆ لەدووکان پینەچی خۆ، ئەی فلان | ژێر دووکانت گەرچی هەن دوودانەکان (٢٥٥٠)
چون کرێ یە، ئەو دوکانەی تۆ هەتە | زوو خەرایکە، ئەو بەپاچان و مەتە (٢٥٥١)

تا لەناکاو پاچ دەگاتەگەنج وکان لادەنێی جا، پینەچیەتی هەم دوکان (٢٥٥٢)
پینەچیەتی یانی ئەکلی ئاوو نان لێدەدەی ئەو پینەسەر دەلقی گران (٢٥٥٣)
دەڵقی تەن دەدڕێت لێت گشت کات و ئان ئەو دەکەی پینە، بەئەکلی ئاوو، نان (٢٥٥٤)
ئەی لەنەسلی پادشای زۆر کامیار پینەچێتی وات، لەلابێ، نەنگ و عار (٢٥٥٥)
قیسمەتێک لابەلەژێری ئەو دوکان تا کوئاشکاربێ لەبۆت دوو دانەکان (٢٥٥٦)
پێش ئەوەی وەختی ئیجارەت بێ تەواو تا بخۆی لەوگەنجەدووکان کەخەراو (٢٥٥٧)
جا دەخاتەدەر ئەتۆ ساحەب دوکان لا دەبا دووکان لەسەر ئەو گەنج وکان (٢٥٥٨)
جار بەحەسرەت تۆ بەسەرخۆت دادەدەی جار،ڕیشی ئەحمەقی خۆت، بادەدەی (٢٥٥٩)
سەت ئەسەف خۆ ماڵی من بووئەودوکان کۆرەبووم من، بۆیەنەمخوارد لەومەکان (٢٥٦٠)
سەت ئەسەف داڕ و نەدارمی برد با بۆ عیباد بوو، تا ئەبەد، یا حەسرەتا (٢٥٦١)

**مەغروور بوونی ئینسان بەزەکاوەت و تەسویراتی تەبعی خۆی وتەڵەب نەکردنی عیلمی غەیب کەعیلمی پێغەبەرانە..**

من لەنێو ماڵ دیتبووم نەقش و نیگار بووم لەعیشقی ماڵەکەی خۆم بێ قەرار (٢٥٦٢)
گەرکو لەو گەنجی نیهانیم با خەبەر وەک شەمامەم من دەگرتەدەس، تەبەر (٢٥٦٣)
ئاخ، ئەگەر دابام ئەمن حەققی تەبەر نەم دەبوو ئێستا لەغەم خۆ هیچ خەبەر (٢٥٦٤)
هەرلەنەقشی زاهیریم نوڕیوەبەس چەشنی تیفلان هەر دەچووم بەدوای هەوەس (٢٥٦٥)
زۆر ڕەوای کوت ئەو حەکیمی کامیار تۆ منالی، خانەپڕ نەقش و نیگار (٢٥٦٦)
نێو ئیلاهینامە، وای پەند دا بەعام خانەدانتان ئێوەوێران کەن بەعام (٢٥٦٧)
بەسکەئەی مووسا بلێ وەعدەی سووەم دڵ لەتەشویش دا، خەریکە، بێعەدەم (٢٥٦٨)
سێهەمی کرد والەمووسا بۆی بەیان بێ عەدوو دەت بێت موڵکی دوو جیهان (٢٥٦٩)
زیاد لەموڵکی ئەو جیهانەی پیس فەڕ ئەو بەئاشتی دێت، ئی دونیا، بەشەڕ (٢٥٧٠)
ئەو کەسەی پێیدای بەشەڕ موڵکی وەها وەختی ئاشتی چیت دەداتێ دا خووا؟ (٢٥٧١)
ئەو کەسەی پێیدای وەها موڵکی جەفا چیت دەداتێ داخووا وەختی وەفا؟ (٢٥٧٢)
بێژەمووسا چوارەمین بۆم، ئەو چەلە زێدەبوو حیرسم نەما بۆم، حەو سەلە (٢٥٧٣)
پێیدەکوت چوارەم دەمێنێ تۆ جەوان مووبەچەشنی قیرڕووبەچەشنی ئەرغەوان (٢٥٧٤)
ڕەنگ و بۆن لای ئێمەزۆرزۆر بێ بەها چونکەپەستی تۆ بەڵام، کوتمان وەها (٢٥٧٥)
جێ ومەکان و بۆن و ڕەنگی سەوزو سوور بۆ منالان هێنەرن شادی و سروور (٢٥٧٦)

**بەیانی ئەو حەدیسە کە(کلموا الناس علی قدرعقولهم لا علی قدرعقولکم، حتی لایکذب الله و رسوله) یانی لە گەڵ خەڵکی بە ئەندازەی عەقڵ و فامی وان قسە بکەن، نە بە ئەندازەی عەقڵ و فامی خۆتان، تا خودا و ڕەسوولی خودا ئینکار نەکرێن ...**

گەرکو بم بێ من دەگەڵ منداڵ کار　　لازمەبێژم وەکوو وی من وتار (٢٥٧٧)
پێت دەدەم تەیرێ ئەگەر مەکتەب بڕۆی　　مێوژوخورماوگوێزو فندوق تا بخۆی (٢٥٧٨)
هەرچەوانیت تۆدەویست،ئەو بگرەتۆ　　بێ تەوەققوف بگرەئەی کەر، ئێستەجۆ (٢٥٧٩)
هیچ لەڕووت نابێت گنج تاکو بژی　　جوان دەمێنێ تۆ جەوانیت، بێ دژی (٢٥٨٠)
سستی پیریت، تۆ چ کات نا یەتەلا　　ئەو قەدەی سەروت لەتۆ نابێ دولا (٢٥٨١)
قودرەتی تۆ هەر دەمێنێتن جەوان　　بۆت دەمێنێ سالم و بێ ئێش، ددان (٢٥٨٢)
بۆ ژنان تۆ شەهوەتت نابێت کەم　　تا لەزەعفی تۆ ژنان بن دڵ بەغەم (٢٥٨٣)
موژدەبێ دەت بێ جەوانی با سەفا　　وەک نەویدی دا بەعوککاش مستەفا (٢٥٨٤)

**قولەعلیەالسلام (من بشرنی بخروج صفربشرتە بالجنە )**

ڕیحلەتی پێغەمبەری ئاخر زەمان　　ئەووەڵین مانگی ڕەبیع بوو بێ گومان (٢٥٨٥)
ئەوکەوەختی مەرگی خۆی لێ بوو عەیان　　عاشقی ئەووەختەبوو بەدڵ وبەگیان (٢٥٨٦)
شادمان بوو ئەوکەهات مانگی سەفەر　　چون لەپاش ئەو مانگەمن دەچمەسەفەر (٢٥٨٧)
شەو بەشەوقی مورشیدی وا، تا بەیان　　ئەی ڕەفیقی ڕێی ئەعلات، بوو بەیان (٢٥٨٨)
هەرکەسێکی بێت پێم دا وا خەبەر　　ڕۆی لەدونیادا نەما، مانگی سەفەر (٢٥٨٩)
تێپەڕی مانگی سەفەر وا هات ڕەبیع　　من لەبۆوی هەم بەشیرم هەم شەفیع (٢٥٩٠)
پێیدەکوت عوککاشەڕۆی مانگی سەفەر　　پێیدەدا موژدەی بەهەشت خەیرولبەشەر (٢٥٩١)
هات کەسێکی تر کەڕۆی مانگی سەفەر　　پێیدەکوت عوککاش لەموژدەی برد بەر (٢٥٩٢)
ئەهلی حەق مردن دەیان کا خۆشحاڵ　　مان لەدونیادا، دەکا خۆشحاڵ مناڵ (٢٥٩٣)
چونکەنەیدی ئاوی خۆش ئەوتەیری کوێر　　چەشنی کەوسەربوو،لەبۆوی ئاوی سوێر (٢٥٩٤)
فەزڵی ئیمانی دەکرد مووسا بەیان　　تا نەبێ ئالوودەلێن بەختی جووان (٢٥٩٥)
پێیدەکوت ئەحسەن،کەچاکت کوت کەلام　　لازمە پرسێک بەیارم کەم بەڵام (٢٥٩٦)

## مەشوەرەت کردنی فیرعەون لەگەڵ ئاسیەلەبارەی ئیمان هینان بەمووسا(ع)

وای کەبیست ئەو ئاسیەی دڵ ڕوون و گەش   پێیدەکوت لێی وەرگرەئەی قەلب ڕەش (٢٥٩٧)
هەن ئەلەو گوفتارەلوتفی زۆر نیهان   تێ بگەئەی شای سیفەت باشی جیهان (٢٥٩٨)
وەختی زەرعە،بەو هەموو سوود، ئافەرین   گەر ئەوەی کوت دەستی کردەگەرمەشین (٢٥٩٩)
ڕابەری پێیکوت کەتۆ بووی بەختەوەر   ئەی کەچەڵ تۆ تاجی تاوت هاتەسەر (٢٦٠٠)
عەیبی کەچچەڵ دادەپۆشێتن کڵاو   خاسسەگەرکو بێ،کڵاو مانگ و هەتاو (٢٦٠١)
تۆ کەلەو مەجلیس دەت بیست ئەو وتار   بۆچی نەت کوت ئافەرین بۆ تۆ هەزار؟ (٢٦٠٢)
ڕۆژلەئاسمان بیستبای گەر ئەو وتار   تۆ بەچاو دەت دی سەروبن کەوتەخوار (٢٦٠٣)
وەعدەیێکی دا بەتۆ حەق بێ نەزیر   لوتفی خۆی شامیل بەشەیتان کرد، قەدیر (٢٦٠٤)
گەر ئەتۆی دەعوەت دەکرد وا شای بەناو   مام عەجەب ئێستا چلۆن ماوتە، زراو (٢٦٠٥)
چۆن نەبوو پارەزراوت؟ تا بەوی   سوودی هەر دوو عالەمت تۆ دەسکەوی (٢٦٠٦)
گەر زراو بدڕێ بەخاتر خوای لەسەر   وەک شەهید دەخوا، لەدووعالەم سەمەر (٢٦٠٧)
لازمەغەفڵەت هەبێتن بۆژیان   نەک ئەوەندەزۆر کەهەیبێتن زیان (٢٦٠٨)
غەفڵەتت هەم حیکمەتەهەم نیعمەتە   تاکوزوو نەڕوات، سەر مایەی هەتە (٢٦٠٩)
نەک وەهازۆر، بێ بەناسۆرێ گران   بۆ نەخۆشێک، بێ بەژاری عەقڵ و گیان (٢٦١٠)
باشەگەربێ چەشنی باش توججارِ ئەتۆ   گەربەیەک گوڵ بکڕی یەک گوڵزارئەتۆ (٢٦١١)
پێت دەدەن لەجیاتی دەنکێک،باغ هەزار   پیت دەدەن مەعدەن بەدەنکێک بێ ژمار (٢٦١٢)
گەربدەی ئەو دەنکەهەر بۆ خوا ئەتۆ   ئەو دەمی خوات یار دەبێتن جا ئەتۆ (٢٦١٣)
چونکەئەو هەستی زەعیفی بێ قەرار   هات لەهەستی زاتی پاکی کردگار (٢٦١٤)
هەستی فانی گەرکو خۆی ئەسپارد بەوی   قەت لەبۆ مردن سەری ناکا نەوی (٢٦١٥)
چەشنی قەترێکی بەدەستی باوو خاک   زوو دەبێ فانی دەبێ بەو دوو، هیلاک (٢٦١٦)
گەرکو چۆ ئەسڵی کەدەریابوو، بەتاو   ئەو نەجاتی بوو لەباو خاک و هەتاو (٢٦١٧)
گەر بەزاهیر، ون لەنێو دەریایەئەو   بێ زەواڵە، سابیتە، بەر پایەئەو (٢٦١٨)
زووکەقەترەخۆت وەیەم دەبێ نەدەم   بێتەدەستت تا لەجێی یەک قەترە،یەم (٢٦١٩)
خۆت وە یەم دە، تاکو بت بێ وا، شەرەف   قەت لە نێو دەریا ئەتۆ نابی تەلەف (٢٦٢٠)
شانسی وا، دا خوا دەبێتن بۆ چ کەس؟   یەم تەڵەب کا، قەترەیێکی بێتە دەس (٢٦٢١)
تۆ خودا، تۆ بێ ئەوەی بی واق و وڕ   زوو بەقەترێک، بکڕە دەریای پڕ لەدوڕ (٢٦٢٢)

تۆ خودا تەئخیر مەکەلەوئەمرو کار   چون لەبەحری ئەمری حەق هات ئەو وتار (٢٦٢٣)
لوتفی خەڵکی بێ ئەسەر لای لوتفی وا   خاکیان جار جار دەبا، حەوتەم سەما (٢٦٢٤)
هاتەپێش بۆت ئێستەکارێک زۆر عەجیب   ئەوهە، بۆ هیچ تالبێک نابێ نەسیب (٢٦٢٥)
پێیدەکوت پرسێک بە هامانیش دەکەم   ڕای وەزیر لازم بوو، بۆ شا زۆر،نەکەم (٢٦٢٦)
پێیدەکوت مەیلێ بەهامانی وەزیر   قەدری باز کوا، لای ژنێکی کوێری پیر؟ (٢٦٢٧)

**داستانی بازی شا و پیرەژن ..**

**خولاسەی داستان..**

ئەگەر ئەتۆ بازێکی سپی وجوان بەپیرەژنێکی نەفام بسپێری دەزانی چی لێدەکا؟ دەی هەوێ دەگەڵ وی چاکەبکا، بەڵام ئەوی نابوود دەکا، ئەووەڵەن تەماشا دەکا کەنینۆکی باز تیژو درێژن،پیرەژن بەخۆی دەڵێ حەتمەن دایکی مردووەویا ئەوی بەرەڵڵا کردووە، و وەدوای کاری خۆی کەوتووە، دەنا نەیدەهێشت کەنینۆکی منداڵەکەی هێندەدرێژ بێ، جا بۆ ئەوە کە خزمەتێکی پێ بکا، دێ نینۆکی بازە کەدەکاو نازانێ کەئەو نینۆکانەبۆ تەهاجوم و دیفاع لە خۆیەتی، وئەگەر بی هەوێ کەغەزا بەو بدا ئاشێکی لەئارد و ساوار بۆ چادەکا و لەپێشی دا دەنێ ونازانێ کەباز حەیوانی زیندووڕاو دەکاو ئەسڵەن ئاشی ساواری پێ خۆش نییە،باز کەزۆر برسی دەبێ دەندووک دەئاش وەر دەدا،بەڵام ناتوانێ بیخوا، عاقیبەت پیرەژن تووڕەدەبێ و بە سەر بازەکەدا دەگوڕڕێنێ ودەڵێ ئەو هەمووزەحمەتەم کێشاوەئاشێکی بەوخۆشیەم بۆ لێناوی بۆناخۆی؟ بەڕاستی کەلیاقەتی ئەوئاشەت نییەئەو چەلەش بۆ ئەوەکە خزمەت بەبازەکەبکا هەلیمی ئاشەکەی دێنێتەپێش بەڵام تەبعی مەغروورو والای باز نایەڵێ تەوەججوهێک بەوبکا لەئاخیرداوەهاتووڕەدەبێ کەقاپی کوڵاوی ئاش بەسەرئەوبازە بەد بەختەدا دەڕێژێ سەرو سووڕەتی بازدەسووتێ ولەچاوی جوانو جەززابی فرمێسک دێنەخوار..

**خۆشەویستی نەفام وەک خۆشەویستی ورچ وایە..**

یەک بەپیرێژن سپی باز، گەر کو دای   زوو دەکا نینۆکی وی، وا باشەلای (٢٦٢٨)
ئەو هەمان نینۆکی بووی بۆ کارو ڕاو   لێیدەکا، پیرێ ژنێکی ناتەواو (٢٦٢٩)
کوا لەکوێیەدایکەکەی تۆ ئەی عەزیز؟   تا بکا نینۆکی وا پیست، تەمیز (٢٦٣٠)
لێیدەکرد نینۆک دەگەڵ دەندووک و باڵ   وای ئەدا کرد خۆشەویستی، پیرەزاڵ (٢٦٣١)

گەر کو نەخوا کەم، لەئاشی پیرەزاڵ    میهری لیدەبڕێ بەباشی، پیرەزاڵ (۲۶۳۲)
ئاشی وام چاکرد بکەم ڕازی ئەتۆ    بێ ئەدەب بووی، زێدەخودخوازی ئەتۆ (۲۶۳۳)
لایقی بۆ دەرد و ڕەنجی نێو فەزا    نیعمەت و ئیقباڵ نابێ بۆت سەزا (۲۶۳۴)
ئاوی ئاشی پێدەدا، ها، ئەی ئەمیر    گەر کو ناتو ێ هیچ بخۆی تۆ لەو هەویر (۲۶۳۵)
باز بەئاوی ئاش نابێ خۆشحاڵ    خەشم و کینەی زیاد دەبێ ئەو پیرەزاڵ (۲۶۳۶)
ژن بەسەروی دا دەکا،ئەو ئاشی کەڵ    زۆر بەڕق جا لێدەکا ئەوسەرکەچەڵ (۲۶۳۷)
ئەشکی چاوی دیتەخوار جا ئەو فەقیر    لوتفی پاشای میهرەبانی دیتەبیر (۲۶۳۸)
لەو دوو چاوی نازەنین و با جەماڵ    گەرلەڕووی شای میهرەبان بووی،سەت کەماڵ (۲۶۳۹)
چاوی مازاغی دەبوو پڕ زەخمی زاغ    چاوی بەد بۆ چاو ی باش، هەر دەرد و داغ (۲۶۴۰)
چاوەکی وا باش ببینێ شت هەموو    هەر دوو دونیای بێ لەلا، یەک دا نەموو (۲۶۴۱)
گەر هەزاران ئاسمانی بێنەچاو    ون دەبن وەک بێ لەلای یەم، کانیاو (۲۶۴۲)
تێپەڕێ چاوێک لەمەحسووسا ت ئەگەر    ئەو لەبینینی نیهان بوو بەهرەوەر (۲۶۴۳)
نەمدی گوێیەک لایقی ئەسرار،ئەمن    تاکو لەو چاو بۆی بڵەم گوفتار، ئەمن (۲۶۴۴)
گەرتکابا، قەترەلەو ئاوی جەلیل    دەی ڕفاند ئەو قەترەبۆ خۆی، جەبرەئیل (۲۶۴۵)
تاکو بیدا ئەو لەنووک و باڵی خۆی    گەر لەلای ئەو پاکەدەستوور بێ لەبۆی (۲۶۴۶)
باز دەڵێتن گەرچی ئایسا خەشمی ژن    نەی دەسووتاند چاکە، عیلم و سەبری من (۲۶۴۷)
بازی گیانم دیتەبەرچاو، جوور بەجوور    دێ عەزاب بۆ ناقە، ساڵح لەو بەدوور (۲۶۴۸)
گەربکێشێ یەک نەفەس ساڵح چەلێ    دێن لەشاخ ناقەی وەها، بۆ دەر، گەلێ (۲۶۴۹)
دڵ دەڵێ بێ دەنگ بە،خۆت کە، هووشیار    تاکو نەت کا،غیرەتی حەق تارو مار (۲۶۵۰)
غیرەتی حەق هەیتی سەت حیلمی نیهان    وانەبا گەر، بەو دەسووتا سەت جیهان (۲۶۵۱)
وا غرووری شاهی گرتی جێی پەند    تا لەدڵ ئەو، بەندی پەندی، هەڵدەقەند (۲۶۵۲)
من دەگەڵ هامان دەکەم یەک پرسیار    قوتب و پشتی موڵکی من، ئەو تاقەیار (۲۶۵۳)
بۆ ڕەسوول ڕایزەن دەبوو سیدیقی ڕەب    بووجەهل شووڕای دەبووگەڵ بوولەهەب (۲۶۵۴)
خسڵەتی هاو جینسی، بۆ لای وی دەبرد    چی نەسیحەت بوو لەلای وی ساردەکرد (۲۶۵۵)
جینس، بۆ لای جینسی خۆی پەرواز دەکا    هەربەتەنها جینسی خۆی داخواز دەکا (۲۶۵۶)

**داستانی ئەو ژنـەی کەمنداڵەکـەی بەگاگۆڵـەچووبوو سەرلووسـاوک وخەتـەری کـەوتنی هەبوو ولـەحەزرەتی عەلی(کرم اللەوجهە) داوای کرد کەڕێی چارەو عیلاجی نیشان بدا ..**

**خولاسەی داستان ..**

ژنێک بەپەرێشانی هاتەلای حەزرەتی عەلی وپێیکوت کەمنداڵێکی چووکەی من چۆتە سەر لووساوک وهەرچەند بانگی دەکەم گوێم ناداتێ ..دەترسم لەوێرا بکەوێتەخوارێ .. ولەبەین بچێ، چی بکەم؟ چارەچییە؟ حەزرەتی عەلی فەرمووی منداڵێک دەگەڵ خۆت بەرەسەربانی تامنداڵی تۆ ئەوی ببینێ .. لەو حاڵەتەدا بێ هیچ خەتەرو تەهدید، منداڵی تۆ بەمەیل وئارەزووی خۆی دێ لەبۆ لای هاو جینس وئاواڵی خۆی ولە هیلاکەت نەجاتی دەبێ ئەو ژنەدەستووری حەزەتی عەلی ئیجراکرد .. ئەو منداڵە وەختێک کەمنداڵێکی دەتەمەنی خۆیدا دی، لەسەر لووساوک هاتەوەسەر بان ولە خەتەر نەجاتی بوو ..

هات لەبۆ لای مورتەزا یەک ژن بەغار ... گرتی تیفلی من لەسەر ناودان قەرار (٢٦٥٧)

گاز دەکەم، ئەو نایەبۆ لای من، لەوێ ... لێی گەڕێم، ڕەنگەسەرو بن ئەو کەوێ (٢٦٥٨)

ئەو وەکوو ئێمەی نییەعەقڵ وتەمیز ... تا بڵێم خۆت دوورلەبەد کە، ئەی عەزیز (٢٦٥٩)

هیچ ئیشارەی دەستی مەفهووم نییە، لەلا ... گەرکو بش زانێت ناکا ئیعتینا (٢٦٦٠)

شیرو مەمکم من بەوی نیشان دەدا ... زەڕڕەیەک ناکا بەمن ئەو، ئیعتینا (٢٦٦١)

بۆ ڕەزای حەق ئێوەمەردانی خودا ... ئێوەهێناتان لەبۆ عالەم هودا (٢٦٦٢)

زوو بکەن دەرمان، دەلەرزێتن دڵم ... زۆر بەئێش ڕەنگەجودابێ لێم، گوڵم (٢٦٦٣)

پێیدەکوت تۆ بێنە، بان تیفلێک لەبۆی ... تا کو ئەو منداڵ ببینێ جینسی خۆی (٢٦٦٤)

زوو لەبۆ لای جینس دێ، لەو ناودان ... عیشقی جینس، بۆ جینسی خۆی بوو جاویدان (٢٦٦٥)

ژن وەهای کرد، جینسی خۆی گەر دی، مناڵ ... ڕووی دەوی کرد شادمان و خۆشحاڵ (٢٦٦٦)

ئەو لەناو دان هاتەلای بان خۆش نەفەس ... جازبی جینسان، بەتەنها جینسەبەس (٢٦٦٧)

خۆی خزاند ئەو تیفلە بۆ لای تیفل هات ... جا لەکەوتن بۆ نەوی ئەو بووی نەجات (٢٦٦٨)

**ئەنبیا جینسیان لەئادەم بۆیە هات ... تا بەجینسییەت، لەناودان، دەن، نەجات** (٢٦٦٩)

جا کوتی وەک ئێوە ئینسانم ئەمن ... تا لەبۆ لای جینس بێن و، ون نەبن (٢٦٧٠)

چونکەجینسییەت عەجائیب جازبە ... جینسەجازب، بۆ ئەوەی گەر تالبە (٢٦٧١)

عیسیوو ئیدریس چوون بۆ ئاسمان ... گەڵ مەلائیک چون موجانیس بوون ئەوان (٢٦٧٢)

چونکە بوون هارووت و مارووت جینسی خاک ... سەرنەوی جێیان دەهێشت ئاسمانی پاک (٢٦٧٣)

کافران چون بوون لەجینسی ئیبلیس گیانیان شاگردی شەیتانانی پیس (٢٦٧٤)
سەت هەزاران زیدەخووی بەد،فێر دەبوون چاوی عەقڵ وچاوی قەلبیشیان دروون (٢٦٧٥)
کەمترین خووی ناحەزی وان بوو حەسەد بەوحەسەد ئەستۆی برا، شەیتانی بەد (٢٦٧٦)
لەو سەگان فێربوون ئەوان کینەو حەسەد ناخوازن بۆ چ کەس مولکی ئەبەد (٢٦٧٧)
گەر ببینێتن حەسوود ئەهلی کەماڵ بۆی دەبێتەدەرد و ناسۆرو، وەباڵ (٢٦٧٨)
چونکەهەرکەس گەرکو سووتا خەرمەنی نایهەوێ ببێ شەمی کەس ڕەوشەنی (٢٦٧٩)
بێنەدەستی خۆت کەماڵ ئەی موحتەرەم تا لەفەزڵی کەس نەیەت بۆت دەردوغەم (٢٦٨٠)
تۆ لەحەق داواکەدوورکا، لێت حەسەد هەم نەجاتت دا لەدەس جیسم وجەسەد (٢٦٨١)
ئەو وەها مەشغووڵ بکا تۆ، باتنی ڕوو نەکەی تۆ، هیچ وەلای دونیای دەنی (٢٦٨٢)
خوا بەجورعەی مەی وەها حاڵەت دەدات بەولەدووعالەم دەبێتن مەست نەجات (٢٦٨٣)
حاڵەتێکی وای بەتریاک دا قەدیر ماوەیەک ئینسان دەچێ بەو، خۆی لەبیر (٢٦٨٤)
بۆیەیەزدان والەچاکی کرد خەو تا لەدوو عالەم ڕەهابێ، بیر بەو (٢٦٨٥)
خوا وەهای مەجنوون عاشق کرد بەپۆست نەیدەناسی کێیەدوژمن کێیەدۆست (٢٦٨٦)
سەت هەزاران مەی وەهای ئەو لایەخۆ دادەنێ سەر دەرک و ئیدراکاتی تۆ (٢٦٨٧)
بۆئەسیری نەفس، مەی هەن بێ ژمار جا، لەڕێی ڕاس لا دەدا، ئەو نا لەبار (٢٦٨٨)
مەی گەلێک چاکرد بۆ عاقڵ وەدوود شاربی وی، جێگەکەی دارەلخلود (٢٦٨٩)
پەردەیی ئەفلاک بەمەستی لادەبا کوێیە جاوید ، خۆی لەبۆ ئەو لا دەبا (٢٦٩٠)
خۆت نەکەی عاشق بەهەرکەس مەستەتۆ مەست بووعیسا بەحەق،کەرمەستی جۆ (٢٦٩١)
تۆ لەخومرەی والە، مەی وا بێنەدەر مەستیەتی مەی زاهیری بوو زوود گوزەر (٢٦٩٢)
چونکەمەعشووقان وەک خومرانی پوڕ یەک بەخڵتەو،یەک بەمەی ساف چەشنی دوڕ (٢٦٩٣)
مەی بچێژەمەی شناس، بائیحتیات بێنەدەستت،مەی تەمیز، بێ ئیختیلات (٢٦٩٤)
ئەو مەیانە،هەردوودەتکەن مەست و شاد یەک بەڵام دەتباتەلای خوای عەدڵ وداد (٢٦٩٥)
تاکونەت بێ فکرو وەسواس وحیبەل بێ عیقال عەقڵت بکا، ڕەقسی جەمەل (٢٦٩٦)
ئەنبیا چون جینسی ڕووحن هەم مەلەک دێننەلای خۆیان فریشتانی فەلەک (٢٦٩٧)
با، لەجینسی ئاگرەخۆ بۆیەوا چەشنی یەکتر هەر دەچن بۆ لای حەوا (٢٦٩٨)
گۆزەیێکی نێو بەتاڵی بەستەسەر بیخەیەنێو حەوز، یاجۆگێک ئەگەر (٢٦٩٩)
ناچتەژێرئاو تاقیامەت وایەئەو چونکەنێوی خاڵییەو پڕ بایەئەو (٢٧٠٠)

چونکەمەیلی هەر بەرەو باڵایە، با زەرفەکەی خۆشی دەوێ بۆ وێ، ببا (٢٧٠١)
چونکەئەرواحیش لەجینسی ئەنبیان توند دەچن بەدوایی وان، وەک سایەوان (٢٧٠٢)
نەفسی وانی چون شکەست دا عەقلی وان عەقڵ، بۆ جینسی فریشتەی ئاسمان (٢٧٠٣)
نەفس غاڵب بوو بەسەر دوژمن بەدین نەفس ودوژمن هەردوو خواهانی نەوین (٢٧٠٤)
قیبتییان بوون جینسی فیرعەونی زەمیم سیبتییان بوون جینسی ئەو مووسای کەلیم (٢٧٠٥)
چون دەگەڵ فیرعەون، هامان بووجەنیس بوون لەلای یەکتر لەمەجلیس داجەلیس (٢٧٠٦)
لاجەرەم هینای لەلای سەربۆخووار جینسی دوو زەخ بوون ئەو دوو نا بەکار (٢٧٠٧)
هەردووسووزان چەشنی دووزەخ زیددی نوور هەر دوو وەک دووزەخ لەنووری دڵ نەفوور (٢٧٠٨)
چون دەڵێ دوو زەخ بەموئمین،زوو ئەتۆش تێپەڕە، نوورت کەکردی نارخەمۆش (٢٧٠٩)
زوو برۆ موئمین کەنوورت دێ، بەتاو تار دەکا نارم کەدامەن کا، بڵاو (٢٧١٠)
جا لەنوور ئەو دووزەخی، هەر ڕا دەکا تەبعی وی چون دووزەخی بوو، وا،دەکا (٢٧١١)
وەک دەکا دووزەخ لەبەر موئمین فیرار ڕادەکاموئمین لەبەر دووزەخ بەغار (٢٧١٢)
چونکەنووری وی لەجینسی نار نییە تالبی نوورقەت لەبۆ نار، یار نییە (٢٧١٣)
وا حەدیس هات بی هەوێ موئمین ئەگەر ئەو بکا مەحفووز لەدووزەخ خوای لەسەر (٢٧١٤)
دوو زەخیش داوا دەکا لەخوا ی جیهان ئەی خودایا دوور لەمن کە، تۆ فلان (٢٧١٥)
جازیبەی جینسییەتە، وا، خۆ یەقین تۆ بنۆڕەجینسی کفری یانەدین (٢٧١٦)
گەرکو هامانت بوێ هامانیی گەر کو مووسات تۆ بوێ سوبحانیی (٢٧١٧)
گەرکو هەر دووکیان بین داوایی تۆ نەفس وعەقڵن تێکەڵاون، لایی تۆ (٢٧١٨)
شەڕ لەگەڵ یەکتر دەکەن ئەو دوو،ئەتووش بت هەوێ مەعناشکەست،داتن نقووش (٢٧١٩)
نێو جیهانی جە نگ و شادی ئەو هە، بەس تۆ شکەستی دوژمنی خۆت بێتەدەس (٢٧٢٠)
عاقیبەت فیرعەونی زۆر بێ مەنفەعەت هات لەگەڵ هامان کردی مەشوەڕەت (٢٧٢١)
هەرچی وەعدەی دابوو مووسا موو بەموو ئەو بەیانی کردبۆ هامان هەموو (٢٧٢٢)

## مەشوەڕەت کردنی فیرعەون لەگەڵ هامانی وەزیر لەبارەی ئیمان هینان بەمووسا(ع)

گەر کودی هامان تەنێ، پێی ڕاگەیاند ڕاچەنی هامان، یەقەی خۆی دا دڕاند (٢٧٢٣)
دەستی کردەدادو فەریاد ئەو لەعین دای لەعەرزی توند کڵاوو، پێچ، بەکین (٢٧٢٤)
چۆنی جورئەت کرد لای پاشای جیهان بێ موبالات گفتی وا پوو چ،کا، بەیان (٢٧٢٥)

گشتی عالەم وان لەژێر فەرمانی تۆ      کار هەموو جوان بوو ن بەئەمری جوانی تۆ (٢٧٢٦)
هەر لەمەشریق تا کو مەغریب بێ لیجاج      گشتیان شایان، لەبۆت دێنن خەڕاج (٢٧٢٧)
دێن هەموو شایانی دونیا زێدەشاد      ماچ دەکەن خاکی دەرت ئەی کەی قوباد (٢٧٢٨)
ئەسپی ئێمەی گەرکو دی ئەسپی عەدوو      بێ عەسا بۆ لان دەسوورێنێت ڕوو (٢٧٢٩)
تاکو ئێستابووی خوداوەندی جیهان      ئێستەبۆ بووی کەمترینی بەندەگان؟ (٢٧٣٠)
سەت هەزار جار خۆشترەسووتان بەنار      نەک ببێتەعەبدی عەبدێک شەهریار (٢٧٣١)
گەر کو وات کرد بمکەئەووەڵ لەت بەلەت      تانەبینێ چاوی من شا، واله، قەت (٢٧٣٢)
بمکوژەزوو ئەی شەهی خۆشناوی من      تا نەبینێ زیللەتی وا، چاوی من (٢٧٣٣)
قەت نەبوو بەوجوورەخۆ ئەی شای جیهان      بێ بەئاسمان عەرزو،عەریش ئاسمان (٢٧٣٤)
بەندەگانما ن بێن ببن سەر وەر، لەبۆن      ترسنۆکمان ببنەئازاردەر لەبۆن (٢٧٣٥)
چاوی دوژمن ڕوون و، کوێر،دووچاوی یار      قەعری گۆڕ بۆمان دەبێتەلالەزار (٢٧٣٦)

**تەحقیری قسەی هامان ..**

بۆی نەبوو مەعلووم ئەو،یارو نەیار      چەشنی کوێر دەیکرد نەرد،مەعکووس قومار (٢٧٣٧)
دوژمنی تۆ هەر ئەتۆی خۆ ئەی لەعین      تۆ، بەبێ جورمان مەڵێ دوژمن، بەکین (٢٧٣٨)
تۆ لەلات ئەو حاڵەتە، بەد دەو ڵەتە      دەو دەوە، ئەووەڵ، لەئاخیردا، لەتە (٢٧٣٩)
گەرئەتۆ لەو دەوڵەتەخۆت لانەدەی      ئەو بەهارەی تۆ دەبێتەمانگی دەی (٢٧٤٠)
چەشنی تۆیان زۆردەدی خەڵکی جیهان      گەرلەتەن سەریان برا، هیچیان نەمان (٢٧٤١)
ئەو جیهانەی بێ دەوام و بێ قەر ار      چۆن دەبێ یک کەس لەویدا، پایەدار؟ (٢٧٤٢)
غەیری ئەو هەت تۆ نەبوو هیچ ئیفتیخار      چاپلووست بن لەترسان، دێ وشار (٢٧٤٣)
ئەو کەسەی تەعزیم لەوی عالەم دەکەن      گیانی وی پڕپڕ لەزاروسەم دەکەن (٢٧٤٤)
ساجیدی وی لەوکەلای داڕوویی خۆی      تێدەگا ئەو سەممی موهلیک بوو لەبۆی (٢٧٤٥)
خۆش بەحاڵی وەی کەنەفسی کردخوار      وای بەخود خواهێک کەبوو وەک کۆهسار (٢٧٤٦)
با، تەکەببور ژەهری قاتیل بێ لەلات      ئەو بەمەی پڕ ژاربوو، وا گێژومات (٢٧٤٧)
مەی بەژارتێکەڵ کەبخوا،چارەڕەش      ئەودەبێتن لەحزەیەک،خۆشحاڵ وگەش (٢٧٤٨)
لەحزەیەک پاش، ژار دەچێ بۆ گیانی وی      ژار دەکا نابوود، گیانی جوانی وی (٢٧٤٩)
گەر بەژاری کیبر نیتەئیعتیقاد      چاو، چ ژارێک هات لەبۆ نێو قەومی عاد (٢٧٥٠)

شایەکی گەرکرد شایەک دەستگیر دەیکوژێ یابەند،دەکا ئەو شای ئەسیر (٢٧٥١)
گەر ببینێ یەک برینداری نەخۆش بەحری ڕەحمی شا، لەبۆوی دێتەجۆش (٢٧٥٢)
گەر تەکەببور ژارنییەچۆن بوو ئەدی بێ گوناهی کوشت یەک شا، شایی دی؟ (٢٧٥٣)
بێ عیوەز بۆ لوتفی بوو گەڵ ئەو هەژار؟ لەو دووحاڵەچاک دەبێ مەعلووم ژار (٢٧٥٤)
ڕێ گران هیچ کات، ڕووت ناکەن،گەدا گورگ گورگی مردوو کوا ئازار دەدا؟ (٢٧٥٥)
خزر، بۆیەی کون دەکرد کەشتی هەتا دەستی فاجیر بەو نەگاتن ئەی فەتا (٢٧٥٦)
چون نەجاتی دێ شکاو بشکێنەخۆ ئیمەنی نێو فەقرە، بەو دا تۆ برۆ (٢٧٥٧)
مەعدەن و کانی کەتێدا بێت کێو زەربی پاچ ئەو لەت دەکا، دەیکا دزێو (٢٧٥٨)
گەردەنی گەردەن کەشەتیغی لەسەر زەربی تیغ ناکا لەسایە، هیچ ئەسەر (٢٧٥٩)
نەفت و ئاگر تۆ بزانەسەر وەری ئەی برا چۆن تۆ دەچی نێو ئاگری؟ (٢٧٦٠)
هەر کەسێکی ڕاکشابێ سەر زەوی بۆهەدەف نابێ،کەتیر باوێ یەوی (٢٧٦١)
گەربڵیندی کرد سەری خۆی ئەولەعەرد بۆهەدەف بۆتیرو بۆی هات ئێش ودەرد (٢٧٦٢)
نەردیوانی خەڵقە، ئەو ئێمەو ئەمن لەو دەکەونەخوار،ئاخیر دێتەبن (٢٧٦٣)
زێدەئەحمەق بوو ئەوەی زۆر سەرکەوت چون خەرابتر دەشکێ ئێسکی، گەرکەوت (٢٧٦٤)
چی کوتم لەو بارەفەرعن ئەسڵی وان کیبر، شیرکەبۆ خوداوەندی جیهان (٢٧٦٥)
گەر نەبی فانی و، نەبوو مانت بەوی خۆت شەریکی خوا دەزانی ئەی غەوی (٢٧٦٦)
ئەو بەقاوژینەی لەوی بۆ تۆ، ئەوە وەحدەتی مەحزە، نەشیرکەخۆ، ئەوە (٢٧٦٧)
شەرحی ئەوهە، هەربەدەس ئەعمالەبەس نەیدەزانی ئەو لەقیل وقالەکەس (٢٧٦٨)
من ببێژم چی لەقەلبم دا ئەگەر جێ بەجێ لەت لەت دەبن زۆریان جگەر (٢٧٦٩)
بەس دەکەم لەوباسە،بۆزیرەک بەسە دوو نیدام کرد،گەر لەنێو دێ دا،کەسە (٢٧٧٠)
ئاخری هامان بەگفتی والەپەست ڕێی وەها چاکی لەفیرعەونی دەبەست (٢٧٧١)
لوقمەیی ئیقباڵ هەتا زار هاتبوو ئەو لەناکاو هات و، لێی دەبڕی گەروو (٢٧٧٢)
خەرمەنی فیرعەونی ئەو هات دا بەبا خۆزگەهیچ شایەک وەزیری وای نەبا (٢٧٧٣)

**نائومێدبوونی مووسا (ع) لەئیمان هێنانی فیرعەون بەسەبەبی تەئسیری قسەی هامان لەدڵی فیرعەون ...**

پێیدەکوت مووسا لەبۆ تۆم ویست وجوود نەیدەکردە قیسمەتی شاهیت وەدوود (٢٧٧٤)
قودرەتێکی گەرنەبێتن پایەدار دامەنێ بۆ قودرەتی وا، ئیعتیبار (٢٧٧٥)

قودرەتێکی گەر بەناحەق بێتەدەس — بێ دڵە، بێ چاوە، بێ ڕووح ونەفەس (٢٧٧٦)
قودرەتێکی گەر بەتۆ یان دا عەوام — دێن و، دەی ئەستێننەوە، لێت، چەشنی وام (٢٧٧٧)
قودرەتی عارییەتیت دە، دەس خودا — قودرەتی دائیم هەتا ئەو، پێت بدا (٢٧٧٨)

**کێشە و نیزاعی ئەمیرانی عەرەب لە گەڵ مستەفا(علیەالسلام) کە ئەمارەت و قودرەت لەگەڵ ئێمە تەقسیم بکە، تا نیزاع و ئیختیلافێکت لە گەڵ ئێمەنەبێ، و جواب دانەوەی مستەفا (علیەالسلام ) کەلەو ئەمارەتە ئەمن مەئموورم، و باس و گفتو گۆی وان..**

**خولاسەی داستان ..**

ئەمیرانی عەرەب زۆر بەتووڕەیی هاتنەلای پێغەمبەر(ص) وپێیان کوت کەئەگەر ئەتۆ خۆت لەلای خودا ئەمیر دەزانی ئاخر ئێمەش وەک ئەتۆ ئەمیرین، جا واچاکەکەکارت بە ئەمارەتی ئێمە نەبێ، پێغەمبەر بەوانی فەرموو کە ئەمارەتی من حەقیقیە بەڵام ئەمارەتی ئێوە مەجازیە، ئەوان قانع نەبوون و دەستیان بەمونازەعە و موشاجەرەکرد تا کو لە ناکاو هەورێکی ڕەشی گران بار لەئاسمان پەیدا بوو،و بارانی باراند و سێڵاوێکی زۆر عەزیم بۆلای شار وەڕێ کەوت و خەڵکیش دەستییان کرد بە شیوەن وگریان و داد فیغان، پێغەمبەر بە وانی کوت ئێستە وەختی ناسینی حەقق و باتڵە، ئەگەر ئێوە ڕاست دەڵێن پێش ئەو سێڵاوە بگرن، ئەمیرانی عەرەب بۆ پێش گری لە سێڵاو نێزەکانی خۆیان دەنێو سێڵاو هاویشت تا بە پشتیوانی جادووی خۆیان پێش سێڵاو بگرن بەڵام نەیان توانی، عەجزی خۆیان لێ مەعلووم بوو لەو کاتەدا پێغەمبەر لکە دارێکی چووکەی دە سێڵاو هاویشت لە ناکاو سێڵاو ڕێی گۆڕی، و بۆ لای دەشت و بیابان کەوتە ڕێ، و خەڵکی شار نەجاتیان بوو ..

بۆ نیزاع هاتن ئەمیرانی عەرەب — لای موحەممەد مستەفای عالی نەسەب (٢٧٧٩)
ئێمە فەرماندە و ئەمیرین چەشنی تۆ — بەش‌کە قودرەت، بگرە جا تۆ سەهمی خۆ (٢٧٨٠)
سەهمی ئێمەبۆمەکافی بێت و بەس — تۆش نەبی تامیع بەسەهمی هیچ کەس (٢٧٨١)
دەیکوت ئەحمەد دای بەمن میری ئەحەد — سەرووەری هەم ئەمری موتڵەق تائەبەد (٢٧٨٢)
ئێستەدەوری ئەحمەدەو دەورانی وی — ئێوەبگرن زۆر قەوی فەرمانی وی (٢٧٨٣)
قەوم کوتیان وەک ئەتۆ،ئێمەش ئەمیر — دای بەئێمەش حوکمی میری خوای قەدیر (٢٧٨٤)
پێیکوتن میریم لەلایەن بارییە — دای بەئێوەبۆژییان بۆ عارییە (٢٧٨٥)
میریەتی من تا قیامەت جاریە — تێک دەچی هەر میریەتێک بێ، عاریە (٢٧٨٦)

قەوم کوتیان ئەی ئەمیر جا بەسکەتۆ عیللەتی زیاد ویستنت تۆ بێژەبۆ؟ (٢٧٨٧)
هەورەکی نارد ئەو خوداوەندی لەسەر هات سێڵاوێک،گرتی دەو رو بەر (٢٧٨٨)
هات سێڵاوێک مەهیب، بۆ لایی شار کەوتەنێو عالەم هەراو هوریاو هەوار (٢٧٨٩)
دەیکوت ئەحمەد ئێستەوەختی ئیمتیحان تا ببێ وەهم و گومان بۆ عام عەیان (٢٧٩٠)
یەک بەیەک خستیانەسێڵاو نێزەیان تاکوسێڵاو بێ تەواو، نەی بێ زییان (٢٧٩١)
جا، لکێکی خستەسێڵاومستەفا ئەو لکەبۆ حاکم و فەرمانڕەوا (٢٧٩٢)
نێزەکانی ختسرابوون نێو ئاو گشتیانی برد دەگەڵ خۆی ئاو بەتاو (٢٧٩٣)
نێزەکانیان ون لەنێو ئاو بوون، ئەوان ما بەتەنها، لک لەسەر ئاو، پاسەوان (٢٧٩٤)
هیممەتی والای، لە،لک،سێڵاوکەدی ڕووی دەسووڕاند چوولەبۆ یەک لایی دی (٢٧٩٥)
کاری وایان گەر لەوی دی بێ گەزاف کردیان میران لەترسان ئیعتیراف (٢٧٩٦)
غەیری سێ‌کەسیان کەبوون بێ‌حەد حەسوود بەو دەیان کوت ساحیرە چون بوون جەحوود (٢٧٩٧)
قودرەتی ناحەق وەهایەزۆر زەعیف قودرەتێک گەربووئەسیل وا بوو شەریف (٢٧٩٨)
نێزەکانت تۆ لەگەڵ، لک گەر نەدی چاو کەنێوی وان و، نێوی ئەحمەدی (٢٧٩٩)
سەیلی تیژی مەرگ، نێوی وانی برد نێوی ئەحمەد جاویدانە، قەت نەمرد (٢٨٠٠)
پێنج کەڕەت نێوت دەکوترێ بەردەوام گشتی ڕۆژان، تاکو دێ ڕۆژی قیام (٢٨٠١)
تێبگەی گەر، من لەبۆتۆم ویست سەفا گەر کەریش بی، بۆ کەرم هینا عەسا (٢٨٠٢)
دوور دەکەم لەوئاوخوڕەت تۆ زارو خوار بەو عەسایەم خۆێن لەسەرتۆ دێنمەخوار (٢٨٠٣)
چون لەنێو ئەو ئاخوڕە، ئینسان و کەر بوون لەئازارت هەموویان ڕەنجبەر (٢٨٠٤)
من عەسام ئێستاکەبۆیەگرتەدەست تا ئەدەب کەم بەو کەرانی زێدەپەست (٢٨٠٥)
تا تۆ نابوود کا دەبێتەئەژدیها تۆش کەئەژدیهای لەکاری خۆت وەها (٢٨٠٦)
تۆ کەحەزیای شاخ و کێوی بێ ئەمان چاک بنۆڕەتۆ لەحەزیای ئاسمان (٢٨٠٧)
ئەوعەسایەی من نموونەی دووزەخە خۆت دەلای ڕووناک،لەزووڵمەت دەربخە (٢٨٠٨)
خۆ دەنا، بۆت نێو ددانی من قەفەس چۆن لەبەندم ڕێی نەجاتت دێتەدەس؟ (٢٨٠٩)
ئەو عەسایەم دار کەبوو، ئێستاکەمار تا نەڵەی کوا دوو زەخی پەر وەر دگار (٢٨١٠)

**لە بارەی ئەو مەتڵەبە،کە هەرکەس قودرەتی خوا بناسێ پرسیار ناکا کە بەهەشت و دووزەخ لە کوێن ..**

کوێی بوێ دەیکاتەدوو زەخ کردگار ئەو دە کاتە داو، حەوا، بۆ باڵدار (٢٨١١)

تۆ ددانت جارو بار دیتی وەها    تۆ دەڵەی ئەو دوو زەخە، هەم ئەژدیها (٢٨١٢)

یا نەئاوی زاری تۆ هەنگوین دەکات    ئەو بەهەشتەهەم لیباسی جوان لەلات (٢٨١٣)

شین دەکا، ئەو بۆت، لەبن دەندان شەکەر    تا بناسی قودرەتی حوکمی قەدەر (٢٨١۴)

بێ گوناهان جا مەدە، ئازار، بەدان    بێنەبیرت زەربەتی خوای دوو جیهان (٢٨١۵)

حەق دەکاتەخوێن، نیل بۆ قیبتیان    ئەو دەکا مەحفووز لەئازار سیبتیان (٢٨١۶)

تا بزانی لێک جودان لای کردگار    غافڵانی ڕێی دروست و هووشیار (٢٨١٧)

نیل تەمیزی لای خوداوەند بۆ دەهات    ڕێی لەقیبتی بەست، سیبتی دا نەجات (٢٨١٨)

لوتفی وی، نیل عاقڵ و زانا دەکا    قەهری وی قابیل ماخولیا دەکا (٢٨١٩)

نێو جەماد عەقڵی بەڕەحمەت دادەنا    عەقڵی لای عاقڵ بەنەقمەت لادەنا (٢٨٢٠)

لوتفەباعیس بوو،جەماد بۆی هات شعوور    قەهرە، باعیس بوو لەعاقڵ عیلم دوور (٢٨٢١)

سەر جەماد عەقڵی دەباراند کردگار    عەقڵی عاقڵ قەهری خوای دی ڕۆی بەغار (٢٨٢٢)

هەو رو ڕۆژو مانگ و ئەستێران بەعام    گشتییان دێن و دەڕۆن با ئینتیزام (٢٨٢٣)

دێن لەکاتێک، بوو موعەییەن بۆ ئەوان    پاش و پێش ناکەن لەکاتی خۆ ئەوان (٢٨٢۴)

فێر نەبووی بۆ ئەو هە، لای پێغەمبەران؟    عیلمی وان هات بۆ عەسا هەم بۆ بەران (٢٨٢۵)

تا بکەی بۆ سەر عەساو بەر، تۆ قیاس    گشت جەمادی دیکە، بێ پەردەو لیباس (٢٨٢۶)

تاعەتی بەردو عەسا زاهیردەبێ    بۆ ئیتاعەی گشت، جەماد موخبیردەبێ (٢٨٢٧)

ئێمەبۆ حەق تائیعین ئاگا، لەوی    ئیتیفاقی نین لەئاسمان و زەوی (٢٨٢٨)

ئێمەوەک نیل تۆ بزانە، وەختی غەرق    چۆن لەنێو دوو میللەتانی کرد فەرق (٢٨٢٩)

وەک زەوین زانا بزانەو، هوو شیار    چۆن کەقارِوونی لەخۆی دا بردەخوار (٢٨٣٠)

ئێمەوەک مانگین کەئەمری بیست زوو    ئەولەئاسمان جێ بەجێ دوو لەت دەبوو (٢٨٣١)

ئێمەچەشنی دار و بەر بگرن بەعام    گەر لەئەحمەدیان دەکرد زاهیر سەلام (٢٨٣٢)

### جواب دانەوەبەدەهری کە مونکیری ئولووهییەتە، وعالەم بەقەدیم دەزانێ

دوێ یەکێ دەیکوت کەعالەم حادیسە    فانییەئەو چەرخە، هەر خوای واریسە (٢٨٣٣)

فەلسەفی پێیکوت مەگەرزانیت حدووس؟    کوا دەزانن حادیسی،هەوران غیووس؟ (٢٨٣۴)

تۆ لەگۆ ڕانی هەتاو زەڕڕێک،کەنی    کوا دەزانی، تۆ حدووسی ئەو سەنی (٢٨٣۵)

گەرکوکرمێک بێ لەنێو مەدفووع دەفین    کوا دەزانی ئەووەڵ ودوایی زەمین؟ (٢٨٣۶)

بۆیەوات کرد چون لەبابت بیستووە ئەحمەقی،کردت شتێک، نەتویستووە (٢٨٣٧)
گەرلەبۆعالەم حدووس دەعوادەکەی بێدەلیل، بێ‌شک‌کە خۆت ریسوادەکەی (٢٨٣٨)
پێیدەکوت دیتم لەنێو بەحری عەمیق گفتوگۆیان بوولەگەڵ یەک، دوو ڕەفیق (٢٨٣٩)
بۆجیدال ئەو دوو، لەگفتو گۆ دەبوون عالەمیش جا، لایئەوان دووکۆدەبوون (٢٨٤٠)
چووم لەبۆ لای عالەمی کۆ بوون لەوێ تا لەوانم ئیتیلاعێک دەسکەوێ (٢٨٤١)
یەک لەوان دەیکوت کەگەردوون فانییە بۆجیهان بێ شک کەیەک کەس بانییە (٢٨٤٢)
یەک کوتی عالەم قەدیمەهەر بووە خۆیەتی ساز کەر، ئەگەر سازکەر بووە (٢٨٤٣)
پێیدەکوت ئینکاردەکەی خەللاق ئەتۆ هێنەری ڕۆژو شەوو، ڕەززاق ئەتۆ (٢٨٤٤)
ئەوکوتی مەردوودە،بێ بورهان لەلام ئەوقسەی دەیڵەی لەڕووی تەقلید، نەفام (٢٨٤٥)
بێنەبۆ من هەرچی تۆ بوڕهانەلات چون بەبێ بوڕهان قەبووڵ ناکەم چ کات (٢٨٤٦)
پێیدەکوت بوڕهانی من نێو گیانمە من لەنێو گیانم نیهان، بوڕهانمە (٢٨٤٧)
تۆ کەنابینی لەزەعفی چاو، هیلال من دەبینم بۆ دەبێ تۆ لێم مەلال؟ (٢٨٤٨)
باس کرا زۆر، ڕوون نەبوو ئەو ڕازەیە چەرخی گەردوون، کۆنەیاخێر تازەیە (٢٨٤٩)
پێیدەکوت یەک حوججەتم نێو دڵ نیهان ئەو دەلیلەبۆ حدووسی ئاسمان (٢٨٥٠)
لام یەقینەمن حدووسی ئاسمان چوونەنێو نار بۆ یەقین زان، بۆ نیشان (٢٨٥١)
ئەو دەلیلەی بۆ بەیان ناکرێ زەبان چەشنی حاڵ و ڕازی عیشقی عاشقان (٢٨٥٢)
ڕازی گفتو گۆیی من پەیدایەگەر تۆ ببینی لا غەریم، هەم ڕوویی زەر (٢٨٥٣)
ئەشکی سوورم گەر لەسەر ڕووم بووقەتار عیللەتی وەی بووکەبێ حەدجوانەیار (٢٨٥٤)
ئەو کوتی ئەو هەم لەلا بوڕهان نییە لای عمووم جێی ئیعتیبار و جوان نییە (٢٨٥٥)
پێیدەکوت وایکوت بەزێڕی باش غەش نیتەوەک من تۆ لەباشی، قەت چ بەش (٢٨٥٦)
با ببێتەئیمتیحانی ئاخری با بڕۆن ئەو دوو ڕەقیب نێو ئاگری (٢٨٥٧)
عام و خاس با بن، لەحاڵیان با خەبەر نێو گومان بۆ لای یەقین با بێنەدەر (٢٨٥٨)
ئاووئاگر بوو ن وەسیلەی ئیمتیحان تا بەوان بن زێڕی باش و غەش عەیان (٢٨٥٩)
با بچین هەردووک، نێو ناری بەتین حوججەتی جاویدی حەیرانان، ببین (٢٨٦٠)
با دەنێو دەریا بخەین، خۆن ئێمەدوو چون دەلیلی ئەو گرووهەین ئەمن و توو (٢٨٦١)
جا لەبۆ نێو ئاگری چوون ئەو دووان چوونەنێو ئاگر ئەوان دوو، بێ دووان (٢٨٦٢)
ئەو خوداخوازەلەئاگر بووی نەجات مونکیری حەق مەرگ، بۆوی بۆ خەڵات (٢٨٦٣)

گوێ دەئیعلامی موئەززین ئەی جەوان　　کوێربێ با ڕووحی خام و ناتەوان (٢٨٦٤)
قەت لەگڕ نادات ئەو نێوەی ئەجەل　　چون موسەمما، سەدرە، والایەو ئەجەل (٢٨٦٥)
سەد هەزارجاران سیباقی نێو قیڕان　　پارەپارەی کرد پەردەی مونکیران (٢٨٦٦)
بۆ سیباقی موعجیزاتان و، جەواب　　غاڵب و پیرۆزەتەنها هەر سەواب (٢٨٦٧)
جا لەلام مەعلووم و ڕەوشەن بوو ئەوە　　حەق لەلای وەی بوو،کەدونیای لا،نەوە (٢٨٦٨)
حوججەتی مونکیر زەعیفەو ناتەوان　　بێژەیەک مەورید کەسادق بن ئەوان (٢٨٦٩)
مەنبەرێک کوا لەو جیهانەی وا بەرین　　گەر سەنا بکرێن لەسەر وی، مونکیرین؟ (٢٨٧٠)
کوا لەسەر مەنبەر دەکا یەک هوو شیار　　یادی عەهدی مونکیری پەروەردگار؟ (٢٨٧١)
گەر لەسەر سککان دەنووسرێ نێوی وان　　عیللەتی حەق بوونی وان دەدرێ نیشان (٢٨٧٢)
سککەیی شاهان دەبێ نابوود بەڵام　　سککەیی ئەحمەدەمێنێ تا قیام (٢٨٧٣)
نوقرەیەک یازێڕەکم نیشان دەگەر　　نێوی تەنها مونکیرێکی بێ لەسەر (٢٨٧٤)
چەشنی قورئا ن نەیدی موعجیز هیچ ئەحەد　　جاویدانە پایەدارە، تا ئەبەد (٢٨٧٥)
هیچ کەسێ ناکات جورئەت قەت چکات　　زیاد بکا حەرفێک لەوی یاکەم بکات (٢٨٧٦)
بت هەوێ غاڵب بی، بۆ غاڵب بە، یار　　یاری مەغلوو بان مەبە، ئەی نا لەبار (٢٨٧٧)
حوججەتی ئەو کەس کەکردی مونکیری　　من فەقەت دیتم لەدونیا زاهیری (٢٨٧٨)
بێ خەبەر بوو ئەو کەزاهیر، بێ گومان　　موخبیرەبۆ حیکمەتی زۆری نیهان (٢٨٧٩)
فائیدەی هەر زاهیرێکی باتینە　　هەر وەکوو سوود نێو دەوایان دا، ونە (٢٨٨٠)

**تەفسیری ئەو ئایەتەکە(ماخلقناالسموات والارض وما بینهما الا بالحق ) ئاسمان و زەوی وئەوەی لەبەینی وان دا بۆ ئەوەم دروست نەکردوونەکەفەقەت زاهیری وان ببینن بەڵکەم بۆ مەعنا و حیکمەتی باقی و پایەدارم چاکردوونەکەئێوەنایان بینن ..**

قەت چ نەققاش نەقش ناکا ئاشکار　　تا بەنەفع و سوود نەبێ ئوممێد وار (٢٨٨١)
بەڵکەتا میوان و گەوران و مناڵ　　غەم وەلانێن وببن بەو خۆشحاڵ (٢٨٨٢)
شادببن منداڵ و دۆستان، جوان و پیر　　یارو دۆستی زۆر قەدیمیان بێتەبیر (٢٨٨٣)
گۆزەچاکەر گەرکو گۆزەچا دەکا　　نەک لەبەرگۆزە، لەبەر ئاو، وا دەکا (٢٨٨٤)
کا سەکەر،چای کردئەگەرکاسەی تەمام　　چای نەکرد بۆکاسەچای کردبۆتەعام (٢٨٨٥)
گەرکوخەتتاتان دەنووسن خەت بەفەن　　بەس لەبەرخوێندن،نەخەتیان وادەکەن (٢٨٨٦)
نەقشی زاهیر هات بۆ نەقشی نیهان　　ئەونیهانەش دای نیهانی دی نیشان (٢٨٨٧)

جا لەسێ ببژێرەیەک یەک تا بەدە چۆنی فیکرت بڕ دەکا، تا ئەو حەدە (٢٨٨٨)
چی کوتم من چەشنی شەترەنج وایەئەو هەر تەکانێک، دێ نەتیجەی دوایەئەو (٢٨٨٩)
هەرتەکانێک بۆ تەکانی دوایەدێ تاکوخەتم و ئاخری ئەو کایەدێ (٢٨٩٠)
هەر وەها تۆ بێنەبەرچاو گشت جیهان تارەقیبی خۆت بکەی لەو کایەمات (٢٨٩١)
دێ لەبۆ دووهەم، هەوەڵ، وا بەر نەزەر پللەپللەی نەردیوان تۆ بچیەسەر (٢٨٩٢)
جا، پلەی دووش بۆپلەی سێ وایەخۆ تا دەچی سەربان، پایەپایە، تۆ (٢٨٩٣)
شەهوەتو خواردن لەبەرئاوی مەنی ئەو مەنی بۆ نەسلەهەم بۆ ڕەو شەنی (٢٨٩٤)
غەیری زاهیر نەیدی کەودەن چاوی وی بێ تەکان ما گیانی وی وەک گیای زەوی (٢٨٩٥)
بانگ بکەی یا بانگ نەکەی تۆ گیا ئەگەر پێی لەنێو قوڕ گیربووەکوا دێتەدەر؟ (٢٨٩٦)
گەر سەری وی با، تەکان دا جار و بار ئەو تەکانەهیچ کەنیتی ئیعتیبار (٢٨٩٧)
سەر دەڵێ بیستم ئەمن ئەی بای سەبا پا دەڵێ عاسیم دەبا بڕوات، با (٢٨٩٨)
چونکەنازانێ نەفام بڕوا لەڕێ هەر بەشانسی دادەنا وەک کوێر، پێ (٢٨٩٩)
ناعەیانەچی وەدەس دێ شانس خواز هەر وەکووشانسی کەسێکی تەختەباز (٢٩٠٠)
فیکری سالم نەک ئەوەی ئەفسوردەیە ڕێ دەچێ و دەدرێت هەرچی پەردەیە (٢٩٠١)
خۆ دەساڵ پاشان دەبینێ ئێستەئەو هەر بەچاوی زاهیری خۆی نەک بەخەو (٢٩٠٢)
بۆ هەموو ئینسان بەقەدد بیریان ئەوان غەیب و ئاتی و خێرو شەڕیان لێ عەیان (٢٩٠٣)
سەددی پاش و سەددی پێش گەر چوون نەمان لەوحی غەیبی بۆدەخوێنرێ چاو،عەیان (٢٩٠٤)
گەر لەڕابوردو بنۆڕێ بێ گومان دێتەبەرچاوی کەچۆن چا بوو جیهان (٢٩٠٥)
گفتو گۆی حەققو فریشتانی زەمین گەر لەبۆ خۆی کرد ئادەم جێ نشین (٢٩٠٦)
ویستباشی ئەو لەئایەندەی دەدی هەرشتێکی تا قیامەت دێتەدی (٢٩٠٧)
جا دەبینێ تاکوئەسڵی خۆی چووان هەرچی دەش هێت، تاقیامەت لێی عەیان (٢٩٠٨)
چەندەد ڵ ڕوون بێت وەهەیبێ سەیقەلی هێندەغەیبی بۆ دەبێتن مونجەلی (٢٩٠٩)
هەرچی زیاد سەیقەل بوو،ئەوزێدەی دەدی زێدەترسووڕەت لەبۆ وی دێتەدی (٢٩١٠)
ئەو سەفایەت فەزڵی خوابێ لا، ئەگەر کۆمەکی سەیقەل بڵەی لای داد گەر (٢٩١١)
چەندەهیممەت بێ، دەبێ کۆشش وەها ( لیس للانسان الا ما سعی ) (٢٩١٢)
واهیبی هیممەت بەتەنها خوایەبەس هیممەتی شای، قەت چ کات نابێت خەس (٢٩١٣)
ئیختیساسی خوا نەدا هیچ کەس بەکار تا کو مەنعی کا لەقەسد و ئیختیبار (٢٩١٤)

خۆ بەڵام بەد بەخت گەربۆی هات ئیش | ڕوو بەرەوکوفرانی نیعمەت دەچتەپێش (٢٩١٥)
خۆشبەختێک گەر لەحەق بۆی هات ئێش | زوو وەلای حەق زێدەتر دەڕواتەپێش (٢٩١٦)
ترسەنۆک تا وەختی شەڕخۆی دا نەجات | بۆ فیرار ئەو زۆر وەسیلان چا دەکات (٢٩١٧)
شەخسی ئازا تاکو مەحفووز کا گیبان | وەختی شەڕ حەملەی دەکا، سەردوژمنان (٢٩١٨)
ترس و غەم ئازای لەبۆلای پێش دەبرد | ترسەنۆکیش هەر لەترس و غەم دەمرد (٢٩١٩)
چون مەحەک بوو ئیبتیلاو ترسی گیبان | شەخسی ئازاو ترسەنۆ ک زۆر لێک جیبان (٢٩٢٠)

**وەحـی نـاردنی خوداوەنـد بـۆ مووسـا (ع)کەئـەی مووسـا ئـەمن خـالقی تـۆم و ئـەتۆم خۆش دەوێ..**

وەحیی بۆ مووسا خوداوەند وا دەنارد | خۆشەویستی تۆ لەبۆم، تۆم هەڵبژارد (٢٩٢١)
پێیدەکوت عیللەت چ بوو؟ ئەی کردگار | تاکوئەنجام دەم ئەوی من، بێ ژمار (٢٩٢٢)
پێیدەکوت تۆ چەشنی ئەو منداڵەوای | دایکەکەی لێشی بدا هەر ئەو پەنای (٢٩٢٣)
ئەو بەتەنها دایکی خۆی لێدیارەبەس | هەربەوی شادەوبەوی غەمبارەبەس (٢٩٢٤)
دایکی گەرلێشی بدا زللان و مست | ئەو چەلەش هەرخۆی دەباوەش وی دەخست (٢٩٢٥)
یارمەتی ناوێ لەهیچ کەس غەیری وی | دایکەتەنها گشتی شەڕڕو خەیری وی (٢٩٢٦)
خەیروشەڕڕت ویست لەمن تەنهاوبەس | غەیری من تۆ ڕووت نەکردەهیچ کەس (٢٩٢٧)
غەیری من خەڵکت وەکوو بەرد هاتەبیر | جا مناڵ بن یاجەوان بن، یا نەپیر (٢٩٢٨)
تۆ دەڵەی(ایاک نعبد )وەختی شین | من لەغەیرت بۆ بەڵا (لانستعین ) (٢٩٢٩)
حەسرەلەو (ایاک نعبد ) موستەفاد | تا ڕێیا لابەن لەتاعەتیان عیباد (٢٩٣٠)
وا دەبوو مەفهووم لە(ایاک نستعین ) | ئیستیعانەمونحەسیر لەخوای موعین (٢٩٣١)
هەرئیتاعەی تۆ دەکەین تەنهاوو بەس | هەرلەتۆکۆمەک دەکەین داواوو بەس (٢٩٣٢)

**تووڕەبوونی شا لەیەکێک لەهاو نشینانی خۆی و تکا کردنی کەسێک بـۆ وی وقـەبووڵ کردنی شا، تکای ئەو کەسەو نا ڕەحەت بوونی ئەو هاونشینەی شا، لەتکا کارکەبۆچی تکات کرد؟**

**خولاسەی داستان ..**

شایەک لەیەکێک لەهاونشینانی خۆی تووڕەبوو، و ویستی کەبەشەمشیرسەری وی لێوەکا هیچ کەس لەنیزیکانی شا جورئەتی نەکرد کەبچێتەپێش وتکای بۆ بکا، لەوبەینەدا تەنها عیمادو

لمولک کەشەخسێکی موحتەرەم و شەریف بووهاتەپێش و تکای بۆ کرد، شا لەوکاتەدا تووڕەیی نەما و شەمشیرەکەی خۆی دەکالان ناوە و لە پاشان کوتی گوناهی ئەو خەرابکارە بە ئەندازەیەک سەنگینەکە ئەگەر تەواوی دونیا تکایان کردبا لەوی خۆش نەدەبووم ..بەڵام گەورەیی مەقامی مەعنەوی عیمادولملک بەئەنازەیەکەکەناتوانم بەقسەی نەکەم، جا ئەو کابرا موجریمەی بەخشی وئازادی کرد بەڵام ئەو کابرایەهیچ لەتکای عیمادولملک خۆشحاڵ نەبوو، بەڵکەم دڵیشی لێ ئێشا، ودۆستایەتی چەند ساڵەی لەگەڵ وی قەتع کرد، تاکو ڕۆژێک یەک نەفەر ئەوی سەر زەنیش کرد وپێیکوت بۆ لەگەڵ کەسێک کەئەو هەموو چاکەی لەگەڵ تۆ کردووەخەراپەی دەکەی؟کابرای موجریم جوابی داوەئەمن لەو وەختەدا بەگیان و دڵ دەم ویست کە بەدەستی شا، فانی بم وپێم خۆش بوو کەئەوەی کەپێی خۆشەلەگەڵ من ئەنجامی بدا بەڵام عیمادولمولک مانعی ئەو فیداکاریەی من بوو و لەئاکام دا نەیهێشت کەئەو ئیفتیخارەنەسیبی من بێ ..

وا بەڕق داچوو لەدۆستێک شەهریار دەیهەویست لای با لەسەفحەی ڕۆژگار (٢٩٣٣)

شا، لەکالان شیرەکەی هینایەدەر لێ وەکاتن تا لەوی بەو جورمە، سەر (٢٩٣٤)

نەی بوو جورئەت کەس کەهەڵکێشێ نەفەس بۆ تکاکاریش نەبوو مەجوود چ کەس (٢٩٣٥)

غەیری وەی نێوی عیمادولمولک بوو بۆ تکا، مومتاز وەک ئەحمەد دەچوو (٢٩٣٦)

ڕاپەڕی زوو کەو تەتەعزیم و سەنا جێ بەجێ شا، تیغی قەهری دادەنا (٢٩٣٧)

جا کوتی دێویش کەبێ، بەخشیم ئەو هەر بەدیشی کردبێ پۆشیم ئەو (٢٩٣٨)

چون لەبۆ ئەکارەپێی تۆ هاتە نێو من لەوی ڕازیم هەشی بێ سەت دزێو (٢٩٣٩)

چونکە زۆرت تۆ هەیە فەزڵ و ویقار من بەخاتر تۆ دەبەخشم ڕق ، هەزار (٢٩٤٠)

ناتوانم ویستی تۆ بێخمە زەمین ویستی تۆیە چونکە ویستی من ، یەقین (٢٩٤١)

ئاسمان و عەردی لێک دابا ئەگەر ئینتیقامی بۆ دەهات ئەو شەخسە ، هەر (٢٩٤٢)

زەڕڕە زەڕڕە ، بۆی تکاکار بان ئەگەر هەر دەبوو دانێ لە ژێر ئەو تیغە ، سەر (٢٩٤٣)

نامهەوێ مینەت لەسەر تۆ دابنێم من حیجابی فەزڵی تۆم ویست . لابنێم (٢٩٤٤)

ئەو هەتۆ نەت‌کرد ، ئەمن کردم یەقین ئەی سیفاتت نێو سیفاتی من ، دەفین (٢٩٤٥)

پێت دەکەن ئەو کارەنەک خۆت وا دەکەی حەملی تۆم کرد،حەملی من تۆکوا دەکەی؟ (٢٩٤٦)

(ما رمیت اذ رمیت)ەت ، شامیلە تۆ کەفی دەریای مەحەببەت حامیلە (٢٩٤٧)

بگرە لای (الا) قەرار ئێستا ، کە (لا)ی زۆر عەجەب ،یەخسیری هەم فەرمانڕەوای (٢٩٤٨)

هەرچی تۆ دات، تۆ نەبووی دات، شایەدای — ئەو بەسە، بێ شک هیدایەت خوایەلای (٢٩٤٩)
ئەو کەسەی تیغی لەسەر لابرد تکا — لەو تکا کارەگەلێکی دڵ شکا (٢٩٥٠)
بۆ عەدوو، بۆ ئەکەسەی بۆی کرد تکا — رووی دەسووڕاند نەک سەلامێک لەو بکا (٢٩٥١)
لەو شەفیعەی خۆی دەبوو بێگانەئەو — مان عەجەب لەوخەڵک و،بۆ ئەفسانەئەو (٢٩٥٢)
چۆن مەگەر مەجنوونەدۆستایی بڕی — لەو کەسەی کەگیان و ژیانی وی کڕی (٢٩٥٣)
ئەو دەمەی نەی هێشت کەتیغ لا با سەری — تۆزی بەرپێی وی دەبا نابا سەری (٢٩٥٤)
وای نەکرد ئەو بەڵکەلەو بێزار بوو — زۆر بەرق داچوو لەوەی، بۆی یار بوو (٢٩٥٥)
موسلحێک پێیکوت ئەتۆ بۆ وا دەکەی؟ — بۆ جەفا بۆ ناسحت ئیجرا دەکەی؟ (٢٩٥٦)
گیانی تۆی دەکڕی لەشا، ئەو یاری خاس — ئەو دەمە،تۆی کرد لەمل لێدان خەڵاس (٢٩٥٧)
حەق نەبوو واکەی کەکردباشی بەدی — خاسسەزۆریشت لەوی تۆ چا کەدی (٢٩٥٨)
ئەوکوتی بۆ شا دەبێ گیان بێ نیسار — بۆتکا کردن، لەبۆ ئەو هات بەغار؟ (٢٩٥٩)
دەمهەویست جێم، وا، لەلای یەزڕدان هەبا — جێی نەباوە،هیچ ڕەسوولێک موجتەبا (٢٩٦٠)
ڕەحمەتم ناوێ بەغەیری زەربی شا — غەیری ئەو شایەم ئەمن ناوێ پەنا (٢٩٦١)
هەر لەبۆ یەش غەیری شام من لادەنا — چونکەتەنها شام بەدۆستم دادەنا (٢٩٦٢)
گەر بەقەهریش لێوەکاتن ئەو سەرم — شێست گیانی دی دەنێرێ بۆ بەرم (٢٩٦٣)
کاری من سەر دان و تەن بەردانەهەر — کاری شای شایانی من بەخشینی سەر (٢٩٦٤)
فەخرەبۆ ئەو سەرکەشا، بیکا فەنا — نەنگەبۆ ئەو سەرکەغەیری شای، پەنا (٢٩٦٥)
شەو کەشا کردی بەچەشنی قیری ڕەش — خۆی عیوەزناکا بەسەت ڕۆژانی گەش (٢٩٦٦)
هەرچی دەوری دا لەشا و، شا بینەئەو — فەوقی قەهرو لوتف و کفرو دینەئەو (٢٩٦٧)
هیچ عیبارەت حاڵی وی نا کا بەیان — چونکەحاڵی وی لەنێو پنهان نیهان (٢٩٦٨)
چونکەئەو ئەسمائو ئەلفازی جووان — چاکراوی فیکری ئینسانی ئەوان (٢٩٦٩)
(علم الاسما ) ئیمامی ئادەمە — خۆ نەبوو تەعلیم بەحەرفان ئەو دەمە (٢٩٧٠)
جیسمی ئینسان گەر لەقوڕ بوو ئاشکار — گشتی ئەو ئەسمای لەتیف بوون لێڵ و تار (٢٩٧١)
بۆ حەقایق بوون بەپەردەحەرف ودەم — تاکو مەعلووم بن لەبۆ ئینسان بەجەم (٢٩٧٢)
گەرلەیەک ڕێ ڕوون دەکا ئەسرارِبەیان — خۆلەزۆر ڕێی دی دەکا ئەسرارِ نیهان (٢٩٧٣)

**جواب دەانەوەی خەلیل بەجەبڕەئیل لەو کاتەدا کەلێی پرسی ( الک حاجە)جوابی داوە(اما الیک فلا )..**

من خەلیلم ئێستە، ئەو وەک جەبڕەئیل    نەمدەویست ئەو بۆ بەڵا بێ، بۆم دەلیل (٢٩٧٤)
فێر نەبووئەو هیچ ئەدەب لەو جەبڕەئیل    تا بپرسێتن لەوەی دەی ویست خەلیل (٢٩٧٥)
چیت دەوێ تۆ؟ تا ئەمن یاریت بکەم    یا دەنا ڕا کەم بکەم ئازار کەم (٢٩٧٦)
جا خەلیل پێیکوت برۆ زوو ئەی جەناب    واسیتەی (بعدا لعیان ) دێنێ عەزاب (٢٩٧٧)
ئیرتیباتی موئمینان و کردگار    بەس نەبی مورسەل دەکاتن بەر قەرار (٢٩٧٨)
بیستبایان گەردڵان وەحی نیهان    لەو جیهانەحەرف و دەنگ بێ سوود دەمان (٢٩٧٩)
گەرچی ئەو مەحوی خودایەو بێ سەرە    کاری من ناسکترەلەو سەر وەرە (٢٩٨٠)
کردەوەی وی، کردەوەی شایە، بەڵام    لای منی سست، بەدبووکاری وی تەمام (٢٩٨١)
ئەو شتەی کەعەینی لوتفەلای عەوام    قەهرەئەو لای نازەنینانی کیرام (٢٩٨٢)
عاممەدەردو میحنەتی زۆری دەوێ    تاکو فەرقی قەهرو لوتفی دەسکەوێ (٢٩٨٣)
چون حرووفی واسیتە، ئەی یاری غار    لای ئەوەی واسیل بەحەق بوو، خارەخار (٢٩٨٤)
جا دەبێ بی بێ بەڵاو دەردو شعوور    تا کوروحی ساف، حرووف دانێ لەدوور (٢٩٨٥)
قیسمەتێک بەو دەنگەکەر تر بوون بەڵام    بەعزەکی سافیش دەبوون عالیمەقام (٢٩٨٦)
چەشنی ئاوی نیلەئەو دەردی شەدید    بۆ شەقی خوێن، ئاوی سافەبۆسەعید (٢٩٨٧)
عاقیبەت بین شادە، نیتی دەردەسەر    چاک دەچێنێ هەرچی بردی زێدەبەر (٢٩٨٨)
چون دەزانێ هەرچی چاندی لێرەدا    ڕۆژی مەحشەر سوودی زۆری وێدەدا (٢٩٨٩)
چون عقوود هیچیان لەبەر خۆیان کەنین    بەڵکەبۆ قازانج و ڕیبح و سوود، چنین (٢٩٩٠)
چونکەمونکیر بەس لەبەر ئینکار ئەو    مونکیری ناکات چکات ئیزهار ئەو (٢٩٩١)
بەل عەدوو تا با حەسەد مەقهوور بکا    یا لەنێو عام فەزڵی خۆی مەشهووربکا (٢٩٩٢)
بۆ تەماع فەزڵ و هونەر بوون ئاشکار    بێ مەعانی سوورەتان نایەن بەکار (٢٩٩٣)
بۆیەپرسیت، بۆدەکەی وا،ئەی سەنی    چونکەسوورەت نەفتەمەعناش ڕەوشەنی (٢٩٩٤)
گەر کوسوورەت هەر بەخاتر سوورەتە    ئەو هەراو هوریای سوئال تۆ بۆ چتە؟ (٢٩٩٥)
ئەو سوئالەتا عەیان بێ فائیدە    وانەبێ گەر، خۆ سوئال کردن بەدە (٢٩٩٦)
تۆ لەبەرچی فائیدەی داوا دەکەی؟    لێک جودان چون فائیدەو شت، وا دەکەی (٢٩٩٧)
جا، نقووشی ئاسمانان و زەمین    سوورەت و زاهیر لەوان، مەقسوود، نین (٢٩٩٨)

ئینسیجامی وا ، لە دونیا بێ حەکیم          غەیرەمومکین ، چۆن دەبێ جا ، سوود عەدیم؟ (٢٩٩٩)
بۆ هەدەف دەکرێ حەمام نەقش و نیگار          جا، هەدەف عالی ببێ یا نا لەبار (٣٠٠٠)

**سوئال کردنی مووسا (ع) لەخودا کە( خلقت خلقا و اهلکتهم؟) وجواب دانەوەبەو ..**

**خولاسەی داستان ..**

ڕۆژێک حەزرەتی مووسا عەرزی خودای کرد کەئەی خوداوەندی حەکیم عیللەت چییەکەخەلایق چادەکەی دوایەش لەبەینیا ن دەبەی؟ ( لازمەکەئەو نوکتەبکوترێ کەسوئال کردنی مووسالەڕووی ئینکار و ئیعتیراز نەبوو بەڵکەم دەی ویست کەئەو مەتڵەبەلەعالەم مەعلووم بێ ) خوداوەندی والا مەقام فەرمووی میقدارێک گەنمی بچێنەو چاک موازەبەتی لێ بکەتا ڕازی خەڵق وفەنای خەلایق لەتۆ مەعلووم بێ، مووسا تیبقی دەستوور دەنکەگەنمەکانی چاندن وزۆر باشی ئاگا لێبوون تا کوبوون بەمەزرەعەیەکی زۆر جوان وکەمکەمەگەنمەکان گەیشتن و مەزرەعەلەژێر نووری هەتاو وەک هەریرێکی زەرکووب دەدرەو شاوە، وەختی دروون هات، مووسا داسێکی بەدەست گرت وگوڵە گەنمەکانی دەستەدەستەدەدروون ..لەو حاڵەدا لەغەیبەوەبۆ وی نیدا هات کەئەی مووسا بۆ ئەو هەموو گەنمەت چاند وئاگات لێبوووئێستاش دەی درووی؟ بەو جوورەڕازی خیلقەت وفەنای مەو جوودات لەعالەم مەعلووم بوو..

وای لەحەق مووسا دەپرسی ئەی خودا          بۆ ئەوەی چاکت دەکرد تێکت دەدا؟ (٣٠٠١)
نێرو مێی زۆر دڵپەسەن، تۆ چادەکەی          دوایەبۆچی تۆ ئەوان ئیمحا دەکەی؟ (٣٠٠٢)
حەق کوتی زانیم کەئەو پرسیاری تۆ          پێی نەکردی غەفڵەت و ئینکاری تۆ (٣٠٠٣)
من دەنا تەنبێم دەکردی هەم عیتاب          بۆ سوئالی وام، دەدا پێت من عەزاب (٣٠٠٤)
بەڵکەدەت وێ وابکەم بۆ تۆ بەیان          حیکمەت و ڕازو بەقات لێ بێ عەیان (٣٠٠٥)
تاکوئاگا کەی لەوی عالەم بەعام          تابکەی کامیل بەوی تۆ شەخسی خام (٣٠٠٦)
گەرچی ئاگای، تۆ دەکەی وا پرسیار          تا ببێ حیکمەت لەبۆ عام ئاشکار (٣٠٠٧)
نیسفی عیلمەخۆ سوئالی وا دەنا          کوا نەزان قەت پێی لەجێی وا دا دەنا؟ (٣٠٠٨)
هەرلەدانیش جواب وسوال پەیدا دەبن          وەک لەئاوو خاک دڕوو،وگوڵ چادەبن (٣٠٠٩)
دێن لەدانیش، هەم زەلالەت هەم هودا          وەک بەباران، تاڵ و شیرین خوا دەدا (٣٠١٠)
ئاشنایی، جێگەبوغزو یارییە          خۆش غەزا، جێی سیحەحەت و بیمارییە (٣٠١١)
خۆی بەنا ئاگا نیشان دا، ئەو کەلیم          تا کو نا ئاگا بکا، لەو سوڕ عەلیم (٣٠١٢)

خۆم دەدەم نیشان بەنا ئاگا، منیش   چەشنی ئەغیار جواب دەدەم بەو جا، منیش (٣٠١٣)
کەرفرۆشان زاهیرەن دەعوا دەکەن   تا کوبفرۆشن کەری خۆ، وا دەکەن (٣٠١٤)
وای بەمووسا کوت خوداوەند ی کەریم   بۆ جەوابت بگرەگوێ تۆ ئەی کەلیم (٣٠١٥)
تۆ بچێنەقیسمەتێک تۆوی لەعەرز   تا وەدەستت بێت جوابێک، جوان و تەرز (٣٠١٦)
گەرکوچاندی و پێگەیشت مەحسوولی وی   خۆشەجوان بوون وەک دەبوو مەئموولی وی (٣٠١٧)
داسی گرتەدەس درووی ئەوکشتزار   جا نیدای بۆ هات لەلایەن کردگار (٣٠١٨)
بۆ دەچێنی، باش ئاوی پێدەدەی؟   گەر گەیشت، بۆچی سەری وی لێدەدەی؟ (٣٠١٩)
دەیکوت ئەی ڕەب بۆیەمن دەبڕم ئەوە   چونکەگەنم و کا، دەبینم پێکەوە (٣٠٢٠)
نارەوایە بچتە نێو کادێن، دان   کاش لەنێو دان دا، دەچێ بۆلای نەمان (٣٠٢١)
نارەوایەتێکەڵاو بن ئەو دووان   والەچاکە، لێک جودا بکرێن ئەوان (٣٠٢٢)
حەق کوتی کێ دانیشی وای دا بەتۆ؟   تۆکەخەرمانت لەدانیش کرد، وەکۆ (٣٠٢٣)
پێیدەکوت بۆم هات لەلایەن تۆ تەمیز   حەق کوتی نەم بێ ئەدی من بۆ تەمیز؟ (٣٠٢٤)
ڕووح گەلێک هەن ساف لەدونیا بێ ژمار   ڕووحی ناپاکیش گەلێکن لێڵ و تار (٣٠٢٥)
نین سەدەف وەک یەک لە جێگاو مەرتەبە   ئێک دوڕی تێدایە ئێکیدیش شەبە (٣٠٢٦)
لازمە بکرێن بەدو باش ، لێک جودا   هەر وەکوو دەکرێن جودا لێک گەنم و کا (٣٠٢٧)
بۆیەبوون عالەم لەدونیا ئاشکار   گەنجی حیکمەت تا نەمێنێ نا دیار (٣٠٢٨)
گەنجی پنهان بووم،کوتی پەر وەر دگار   بیکەجا تۆش گەو هەری خۆت ئاشکار (٣٠٢٩)

**بەیانی ئەو مەتڵەبەکەڕووحی حەیوانی وعەقڵی جوزئی و وەهم و خەیاڵ وەک( دۆ ) وان، ڕووح کەدەو دۆیەدایەوەک ڕۆن وایەکەپنهانە..**

جەو هەری سیدقت خەفی بوو نێو درۆ   چەشنی تامی خۆشی ڕۆن، نێو تامی دۆ (٣٠٣٠)
ئەو درۆیەت ئەو تەنەی فانی تووە   ڕاستیشت گیانی ڕەببانی تووە (٣٠٣١)
زۆر لەمێژەدۆی تەنت بوو ئاشکار   ڕۆنی گیانت بوو لەنێو وی نا دیار (٣٠٣٢)
تا دەنێرێ یەک ڕەسوول لای تۆ خودا   تا تەکان بەو دۆیی نێو گۆزەت بدا (٣٠٣٣)
تا کو ئەو گۆزەی بەفەن وا، دا تەکان   تا بزانم من لەنێو من بوو نیهان (٣٠٣٤)
یا نە، یەک خواهانی وەحیی، گوێ بدا   بەو کەسەی جوزئێکەلەو شیرین ئەدا (٣٠٣٥)
وەحیی مە،مەحفووزەکەن گوێی موئمینین   گوێی وەها بۆداعییانی حەق،قەرین (٣٠٣٦)
هەروەکوو دایکێک بەگوفتار گوێی مناڵ   پڕبکا جا، دێتەگوفتار خۆشحاڵ (٣٠٣٧)

گەر نەبیسێ گوفتوگۆی دایکی منداڵ ... بێ گومان تۆ، ئەو دەبینی، دوایە، لاڵ (٣٠٣٨)
کەڕی زکماک لاڵە، دائیم بێ زەبان ... ناتیق ئەوکەس بوو لەدایکی بیست بەیان (٣٠٣٩)
لاڵ وکەڕبوون ئافەتێکەبۆ بەشەر ... هیچ وتەو تەعلیم، لەوی نا کا ئەسەر (٣٠٤٠)
بێ موعەللیم ناتیقەتەنها خودا ... گشت سیفاتی وی لەعیللەت بوون جودا (٣٠٤١)
یا وەکوو ئادەم کەدای بەو عیلم، ڕەب ... بێ حیجابی دایەنو دایک و سەبەب (٣٠٤٢)
یا وەکووعیسا بەتەعلیمی وەدوود ... هاتەگوفتار ئەو دەمەی بۆی هات وجوود (٣٠٤٣)
تا بەیان کات و بڵێ خۆ، وا نییە ... وەک دەڵێن پێم ئێوە، دایکت زانییە (٣٠٤٤)
لازمەزۆر کۆشش و ڕەنج و تەلاش ... تا لەنێو دۆ، بێتەدەر، ئەو ڕۆنی باش (٣٠٤٥)
ڕۆن لەنێو دۆ نادیارەوەک عەدەم ... پەرچەمی خۆی ڕاوەشاند، دۆ، من کەهەم (٣٠٤٦)
هەرچی پێت مەو جوودە، پێستە، وا نییە ... ئەسڵ و ڕاستیت ئەو هەیەپێت فانییە (٣٠٤٧)
دۆ،کەکۆن بوو لەو نەگیراڕۆنەکەی ... تاکو ڕۆن نەگری لەوی خەرجی نەکەی (٣٠٤٨)
دەس بەدەس کەتۆ، بەدانیش دۆی بەدەن ... تا ئەوەی پنهان بووەلێت،وێت بدەن (٣٠٤٩)
چونکەئەو فانی دەلیلی باقییە ... شیوەنی مەستان دەلیلی ساقییە (٣٠٥٠)

**میسالەکی دیکە لەو بارەدا ..**

شێر لەسەر پەرچەم تەکان بخوا ئەگەر ... ئەو دەدا بۆ مان لەبای پنهان خەبەر (٣٠٥١)
گەر نەبا لەو بای نیهانی هیچ تەکان ... لەو حەوا شێر چۆن دەجوولا، بێ گیان؟ (٣٠٥٢)
بەو دەزانی با، سەبایەیا دەبوور ... بەو تەکان مەخفی دەکا زۆر چاک زهوور (٣٠٥٣)
جیسمی ئێمەچەشنی ئەو شێرەی عەلەم ... فیکری مە،دەیدا تەکان ئەو،دەمبەدەم (٣٠٥٤)
بیر لەمەشریق بێ ئەگەر ئەوبای سەبا ... گەر لەمەغریب بێ دەبوورە، گەڵ، وەبا (٣٠٥٥)
شەرق وغەربی بایی بیرت ڕوو بەڕوون ... چەشنی غەربو شەرقی تاو،تاریک وڕوون (٣٠٥٦)
مانگ جەماد بوو مەشریقی ویش بووجەماد ... گیانی گیانی گیانە، مەشریق بۆ فوئاد (٣٠٥٧)
شەرقی ڕۆژێکی کەباتین ڕوون دەکا ... ڕۆژی ئاسمانان لەحاس وی زەڕڕەکا (٣٠٥٨)
چونکەگەرکو ڕووح لەنێو تەن هاتەدەر ... تازەناکاتن لەڕۆژو شەو نەزەر (٣٠٥٩)
گەرکو نەش بێ تەن بەڵام ڕووح بێ تەمام ... بێ شەوو، بێ ڕۆژ هەیتی ئینتیزام (٣٠٦٠)
وەک دەبینێتن لەخەو دا چاومان ... گەرچی نین مانگ و هەتاوی ئاسمان (٣٠٦١)
ئەی فلان، چون مردنەبۆ خەو برا ... لەو برایەچاک بناسەئەو برا (٣٠٦٢)

فەرعی بێداری مەزانەخەونی خۆت    تا یەقین حاسڵ نەبێ لەو بارەبۆت (٣٠٦٣)

وەختی خەو گیانت دەبینێ وەسفی حاڵ    تۆ کەنای بینی لەپاشی بیست ساڵ (٣٠٦٤)

جا بەدووی تەعبیر دەچی تۆ کۆ بەکۆ    تا بڵێن تەعبیرزانایان بەتۆ (٣٠٦٥)

بێژەپێم تەعبیری ئەو خەونەم چییە؟    هەرچی فەرعی کوت بەوەزانا نییە (٣٠٦٦)

خەونی وا موختەس عەوام بوو نەک خەواس    چون بەلوتفی خوا خەواس بوون ئیختیساس (٣٠٦٧)

لازمەفیلێک لەسەر پشت بچتەخەو    جا ببینێ خەونی هیندوستان ئەو (٣٠٦٨)

خەونی هیندوستان نابینێت کەر    چون لەهیندوستان کەر نەکراوەدەر (٣٠٦٩)

ڕووحی گەورەی فیل لازم بوو هەتا    بچتەهیند ئەو زوو لەخەو دا، ئەی فەتا (٣٠٧٠)

چون لەڕۆژدا زۆری هیندوستان دەوێ    شەو لەخەو دا زۆربەتوندی دەچتەوێ (٣٠٧١)

(اذ كروا الله ) کاری هەر ئەو باش نییە    (ارجعی ) زەنجیری پێی کەللاش نییە (٣٠٧٢)

فیل کەنی بۆخۆت لەبۆغەم دیل دەکەی؟    بت هەوێ گەر،خۆت بەفیل تەبدیل دەکەی (٣٠٧٣)

چاو لە کیمیاسازکەرانی ئاسمان    گوێ دەنەغمەی دێ لەلای مینا گەران (٣٠٧٤)

هەن گەلێک نەققاش لەجەووی ئاسمان    قەلبی ئێمەو تۆ دەنەقشێنن ئەوان (٣٠٧٥)

گەرتۆ نەت دی خەڵقی دڵ بۆن خۆش و جوان    چاوکەلەو ئاساری دێن بۆتۆ لەوان (٣٠٧٦)

دێن ئەسەردائیم بەسەر ئید ڕاکی تۆ    شین دەبن گیای زۆر جووان لەو خاکی تۆ (٣٠٧٧)

وای لەخەودی ئەدهەمی عالیجەناب    خاکی هیندوستانی دڵ، ئەو بێ حیجاب (٣٠٧٨)

جا هەمووزەنجیری کردن پارەئەو    موڵکی لانا، ون دەبو ئەو جارەئەو (٣٠٧٩)

هیند لەخەو دیتن ئەوەی نیشانەبوو    هەرچی دیتی، ڕاپەڕی و، دێوانەبوو (٣٠٨٠)

خاک بەسەرگشت عەقڵ وهۆش وبیر دەکا    لەت بەلەت ئەو هەرچی بێ،زەنجیر دەکا (٣٠٨١)

وا لەبۆمان هات وتاری ئەحمەدی    گەر لەنێو دڵ بێت نووری سەرمەدی (٣٠٨٢)

لادەنێ دڵ ئەو دەمی دارەلغروور    دەچتەوەجێی شادمانی وجێی سروور (٣٠٨٣)

تا بەیان بێ ئەو حەدیسەی ئەحمەدی    گوێ دەئەوداستانی دێ ئەی موهتەدی (٣٠٨٤)

داستان لەو قەرارە بوو کە پاشایەک کوڕێکی جوان و هونەرمەندی هەبوو.. ڕۆژێک پاشا لەخەو دا دیتی کەکوڕەکەی مردووە،بەپەرێشانی لەخەو ڕاپەڕی، کاتێک دیتی کەئەو فاجیعەلەخەو دا بووەزۆر خۆشحاڵ بوو، و تەسمیمی گرت کەلەوەی پاش ژن بۆ ئەو کوڕەجوانەی خۆی بێنێ تا لەو ئیزدیواجەمنداڵێک بێتەدونیا، تا ئەگەرکوڕەکەی بەڕاستی بمرێ یادگارێکی لەوی هەبێ پاش گەڕان وجستو جۆیەکی زۆر، عاقیبەت، شا،کچێکی جوانی بۆ لەبنەماڵە یەکی بەدین و..

پاک و ئەهلی تەقوا پەیدا کرد بەڵام کچەکەلەخانەدانێکی فەقیربوو، بەو خاترەدایکی شازادەموخالیفی ئەو ئیزدیواجەبوو، بەڵام شا زۆر بەجیددییەت ئەو کچەی لەکورەکەی خۆی مارەکرد .. لەو بەینەدا پیرەژنێک کەعاشقی کوری شا ببووبەوەسیلەی جادوو ئەحواڵی ئەو جەوانەی وەها گۆڕی کەهاو سەری جەوان وجوانی خۆی بەڕەڵلا کرد وعاشقی ژنێکی جادوو گەر بوو،وهەرچەند تەبیبان حەو لیان دا کەئەو جەوانەوەک هەوەڵ لێبکەنەوە، بۆیان نەکرا،کەنەکرا، و ئەو کورەجەوانەهەروا عاشقی ئەو پیرەژنەنەود ساڵەبوو .. شا کەلەدەرمانی تەبیبان نائومێد ببوو دەستی کرد بەدوعا کردن وبەدڵ دوعای دەکرد، چونکەبەدڵ دوعای دەکرد دوعایەکەی لێ قەبووڵ بوو، ولەناکاوپیاوێکی سیما جوانی خودایی کەبەهەموو وردەکاری سیحرو جادوو ئاشنا و وارید بوو، لەلای شا زاهیر بوو، شا بەعاجزی وناتەوانی بەوی کوت ئەی عالیجەناب بەدادم بگەکەکورم لەدەست چوو، کابرای خودایی پێیکوت نیگەران مەبەکەئەمنیش هەر لەبەر ئەوەهاتوومەئێرە، جا، بەشای کوت هەرچی ئەمن دەیڵەم موو بەموو ئەنجامی بدە..بەیانی زوو برۆ قەبرستان، قەبرێکی سپی لەقەراغ دیوارێک دەبینی و ئەوی بەپێمەڕەو پاچ بکۆڵەوە، تا بەنێکی سپی پەیدا دەکەی، ئەو بەنەزۆر گرێی لێدراون، گرێیەکان بکەوە.. شا ئەو دەستوورانەی ئەنجام دان، و هەر لەگەڵکوو گرێیەکانی کردەوە، شازادەوەخۆ هاتەوەو لەداوی جادوو نەجاتی بوو وچۆوەماڵی بابی وژیانێکی تازەی لەگەڵ هاو سەری خۆی دەست پێ کرد، و ئەو جادوو گەرەش لەنارەحەتیان مرد ... لەو داستانەدا موراد لەشازادەئینسانێکەخەلیفەتوڵلا و ئەشرەفی مەو جووداتە، و مەنزوور لەو پیرەژنەدونیایەکەئینسانان بەسیحرو جادوو عاشقی خۆی دەکا، ومەقسوود لەو پیاوەخودایییەی ئاشنا بەسیحرو جادوو مورشیدی کامیل ورەهنەمایەکی قابیلە، کەبەدەم و نەفەسی گەرم و ئیرشادو ڕێ نموونی موئەسسیری خۆی، ئینسانی فریو خواردووی دونیا لەو فریو خواردنە، نەجات دەدا ..

| | | |
|---|---|---|
| پادشایەک، بووی کورێک، نەو باوەبوو | زاهیری هەم باتینی، ڕازاوەبوو | (٣٠٨٥) |
| دی لەخەو دائەوکورەی مرد ناگەهان | شا لەدەستی چوو هەموو خۆشی جیهان | (٣٠٨٦) |
| تینی ئاگر وشکی کرد جا، مەشکی وی | تینی ئاگر نەی دەهێشت بێ ئەشکی وی | (٣٠٨٧) |
| دەردو ڕەنجی بۆ وەکۆ بوون هێندە شاه | نەی دەبوو ڕێ،خۆی کەزاهیرکات ئاه | (٣٠٨٨) |
| چی نەمابوو شا کەگیان تەسلیم بکات | بۆیەماوە، چونکەمابوو وەخت وکات | (٣٠٨٩) |
| گەرکو بێداربوو لەخەو ئەو شەهریار | هێندەشاد بوو قەت نەبوو وا شاد، چ جار | (٣٠٩٠) |

وەختبوو بمرێ کە ئەو بوو هێندە شاد — گیان و تەن بەستەن بەیەک، چون زۆر زیاد (٣٠٩١)
سەیرە،ئینسان هەم بەشادی هەم بەغەم — گیان دەدا دەمرێت و مانگی دەچتەتەم (٣٠٩٢)
ئەو لەنێوان ئەو دوو مەرگەزیندووە — سەیرەژینی وی کەبەندە، بەو دووە (٣٠٩٣)
شا بەخۆی کوت شادمانی وا عەزیم — هات لەغەم را بۆم، موسەببیب خوای ڕەحیم (٣٠٩٤)
زۆرعەجەب یەک شت لەیەک ڕێگاوەمەرگ — ئەولەیەک ڕێی دی دەداتن ژین وبەرگ (٣٠٩٥)
وا دەبێ یەک شت دەدا مەرگ وزیان — ئەو لەیەک ڕێی دی دەدا، سوودوزییان (٣٠٩٦)
بۆجیهان خواز، شادمانی تەن، کەماڵ — ئەو لەڕۆژی عاقیبەت نەقسەو زەواڵ (٣٠٩٧)
وای موعەببیر کوت لەخەو دا، پێکەنین — حەسرەتو دەرد و غەمەو گریانو شین (٣٠٩٨)
شادیەو خۆشحاڵیەشیوەن، لەخەو — وای موعەببیر کوت لەبۆن ئاشکار ئەو (٣٠٩٩)
شاکوتی من گەرچی نەم ما ئەو غەمە — ئەو پەرێشانیەی لەبۆم هات، هەر هەمە (٣١٠٠)
گەرکو خارێکم ئەمن بڕواتەپێ — گوڵ بەرێ، با، یاد گارێکم هەبێ (٣١٠١)
چونکەمردن بێ ژمار هەیتی سەبەب — کامەڕێ بگرین لەوی، نەن کا تەڵەب؟ (٣١٠٢)
گەرکو وەکرێن دەرکی لای مەرگ و نەمان — جیرەجیریان دێ دەگاتەئاسمان (٣١٠٣)
جیرەجیری تاڵی ئەو دەرکانی مەرگ — ناچتەنێو گوێچکەی تەمەعکارانی بەرگ (٣١٠٤)
بانگی دەرکی مەرگە، دەردی نێو تەنان — بانگی دەرکی مەرگەجەوری دوشمەنان (٣١٠٥)
چاو کەنێو فیهرەستی تیب ئەی با هونەر — تا ببینی ناری عیللەت شوعلەوەر (٣١٠٦)
بەو هەموو ئێشەی کەنێو ماڵی تەنە — هەردوو هەنگاو چاڵی عەقرەب پڕ هەنە (٣١٠٧)
با،گەلێک توند دێ، چراشم پڕ خەتەر — یەک چرای دی باڵەوی کەم شوعلەوەر (٣١٠٨)
تا ئەگەر خامووشببێ ئێکیان بەبا — یەک بمێنێ ڕەو شەن و ڕووناک با (٣١٠٩)
عارفان وان بەو چرای نوقسانی تەن — تاکو ڕاحەت بن چرای دڵ هەڵدەکەن (٣١١٠)
تا چرای تەن گەر خەمۆش بێ ناگەهان — ئەو چرای گیان دانێ بۆخۆی ئەو زەمان (٣١١١)
بێ خەبەربوو چونکەئەو شای خۆش ئەدا — ئەو چرای فانی بەفانی دی دەدا (٣١١٢)

## بووک هینانی شا بۆ کوڕەکەی ..

چاکەبێنم بووک ئەمن بۆ ئەو فەتا — هەر بمێنێ جاویدان نەسلم هەتا (٣١١٣)
بش مرێ ئەوچەل ئەگەربازی قەوی — جوجکەکەی پاشان دەبێ باز وەک ئەوی (٣١١٤)
زاهیری ئەو باز ئەگەر چۆ لای نەمان — باتینی وی نێو وەلەد بوو جاویدان (٣١١٥)

بۆیەفەرمووی ئەو شەهی عالیجەناب ئەحمەدی موختار، مناڵ بوو ڕازی باب (٣١١٦)
لەو جیهانەبۆیەعالەم خۆشحاڵ سەنعەتی خۆیان دەکەن فێری منال (٣١١٧)
تا بمێنی ئەو مەعانی جاویدان ئەو دەمەی تەن بێ لەنێو خاک دا نیهان (٣١١٨)
باب و مامۆستای دەکرد شاد کردگار تەربییەت کەن تا منالی هووشیار (٣١١٩)
بۆ بەقای نەسلم منیش با وا بکەم یەک کچی باش بۆ کوڕم داوا بکەم (٣١٢٠)
من لەنەسلی ساڵحان دێنم عەرووس نەک لەنەسلی پادشایانی عەبووس (٣١٢١)
شای دروست ئەو ساڵحەو ئازادەیە نەک ئەسیری حیرسی فەرج و بادەیە (٣١٢٢)
بۆ ئەسیران لەقزی پاشا نێو دەدەن وەک بێی کافوور بەنێو، بۆ ڕەش بەدەن (٣١٢٣)
بوو مەفازەنێوی سەحرای جێی هیلاک وەک بەشەخسی بەد بڵەین خۆشبەخت و پاک (٣١٢٤)
ئەوئەسیری شەهوەت وخەشم وئەمەل دێن دەڵێن عالەم بەوی سەدری ئەجەل (٣١٢٥)
بەو کەسانەی بوون لەبۆ مردن ئەسیر دای عەوام نێوی ئەجەلل و، سەدرو میر (٣١٢٦)
نێو نرا یەک پەست بەمیرو سەدرو شاه پەستەڕووحی وی بەچەشنی ماڵ و جاه (٣١٢٧)
زاهیدێکی شا کەبۆ خزمایی ویست گشت ژنانی نێو حەرەم وایان دەبیست (٣١٢٨)

**ئینتیخاب کردنی شا کچی زاهیدێکی دەروێش بۆکوڕەکەی وئیعتیڕازکردنی شابانو و بەنەنگ وعار زانینی خزمایەتی دەگەڵ ئەو دەروێشە..**

دایکی کوڕ دەیکوت کەناقیس بوو لەعەقڵ شەرتەکوفوییەت لەلایەن عەقڵ ونەقڵ (٣١٢٩)
زیرەکی تۆ هەم خەسیس وچاوچنووک بۆکوڕت تۆکیژی سواڵکەرکردەبووک (٣١٣٠)
شاکوتی نابێ بەپاک بێژی گەدا چون دڵی وی دەو لەمەند کرد، زۆر خودا (٣١٣١)
ئەو دەبوو قانع لەبەر تەقوای خودا نەک لەبەرپەستی و ڕەزالەت وەک گەدا (٣١٣٢)
فەقری قانع گەربەتەقوا بێتەدەست ئەوجودایەزۆرلەفەقری شەخسی پەست (٣١٣٣)
سەر لەبۆ یەک دانەسواڵکەر دادەنێ شەخسی ساڵح، گەنجی زێڕیش لادەنێ (٣١٣٤)
شا بەحیرس وئاز کەداخواز کا حەرام بەو دەبێژێتن گەدا، والا مەقام (٣١٣٥)
دایکی دەیکوت بۆ جیاز کوا دێ و شار؟ یا بکاتن گەو هەرو دینا ر نیسار (٣١٣٦)
شا کوتی بەس، هەر کەسێ دینی کڕی هەرچی غەم بوو خوا لەقەلبی وی سڕی (٣١٣٧)
لەو نیزاعەسەر کەوت شای عەد ڵ و داد بۆکوڕی هینا کچێکی پاک نیژاد (٣١٣٨)
هیچ مەکان نەی دی مەلیحی والەخۆ ڕوو مەتی ڕوونتر لەتاوی نیوەڕۆ (٣١٣٩)
هێندەجوان بووخوویی ئەو کیژی جووان جێی نەبوو بۆ خسڵەتی وا باش، بەیان (٣١٤٠)

بێنەدەستت دین هەتا کو پێت بدا    دوایەجوانی و جاهو، بەخت و ماڵ خودا (٣١٤١)
ئاخیرەت هەروەک قەتاری وشتران    وەک خوری‌وکشپەڵ لەدووی وی‌دا جیهان (٣١٤٢)
گەر خوریت بێ کوا تۆ ساحەب وشتری؟    وشترت گەر بێ ، بەهای زۆر کەم خوری (٣١٤٣)
گەر نیکاحی کرد تەواو، شای عەدڵ و داد    گەڵ نیژادی ساڵحانی بێ عیناد (٣١٤٤)
ئەز قەزا عاشق بەئەو شازادەبوو    ساحرێک ژن پیر و زۆر ئوفتادەبوو (٣١٤٥)
کردی سیحرێک ئەو عەجووزەی کابولی    دای دەنا سەر بۆ وی سیحری بابولی (٣١٤٦)
بەچکەشا عاشق بەپیرێژن دەبوو    لای دەنا ئەو بووکی تازەی ماهڕوو (٣١٤٧)
یەک ژنی ڕەش کابولی وەک دێو دزێو    ڕێی لەنا کاو گرت لەشازادەی بەنێو (٣١٤٨)
ئەو عەجووزەی کۆنەساڵ،بۆ گەن گەڵی    شای بەفامی کرد نەفام وەک جەنگەڵی (٣١٤٩)
ماوەئەوشازادەیە، یەک ساڵ ئەسیر    جێگەماچیش، ژێری کەو شی گەندەپیر (٣١٥٠)
هاو نشینی پیرەگەند، وای کرد ئەسەر    ئەو لەزەعفان نیوەگیانی ما، لەبەر (٣١٥١)
زەعفی وی ئەغیاری کردن ڕەنجبەر    ئەو لەبەر جادوو لەخۆی بوو بێ خەبەر (٣١٥٢)
شا و شابانو دەیان کرد گەرمەشین    کوڕبەڵام دەیکرد بە شیوەنیان، کەنین (٣١٥٣)
شاگەلێ بێچارە بوو لەو بورد و مات    ڕۆژ و شەو دەیکرد قوربانی و زەکات (٣١٥٤)
دەیهەویست باب تا عیلاج پەیدا بکا    عیشقی گەندەپیر، نەیهێشت وا بکا (٣١٥٥)
لێی یەقین بوو چارە هەر گریانە بەس    شینە، چارەی دەردی بێ دەرمانە بەس (٣١٥٦)
بردی سەجدە،ئەی خودا تۆ سەر وەری    موڵکی حەق تەنهادەبێ حەق ڕەهبەری (٣١٥٧)
چون دەسووتێ چەشنی عوود ئەو بێنەوا    بگرەدەستی، ئەو نەجات دەئەی خووا (٣١٥٨)
تا لەیاڕەب یاڕەب و گریانی شا    ساحیرێکی ماهیری شا، هاتە لا (٣١٥٩)

**قەبووڵ بوونی دوعای شا بۆ نەجات بوونی کوڕەکەی لەجادووی کابولی ..**

بیستبووی ئەو ساحیری زانا، لەدوور    پیرەژن نەیهێشت لەبۆکوڕ هیچ شعوور (٣١٦٠)
ئەو عەجووزەچون لەفەننی جادوویی    بێ نەزیربوو نەی بوو ئەو میسل و دوویی (٣١٦١)
هەن لەسەریان عالمان و زۆردار    عالم و زۆرداری دی تا کردگار (٣١٦٢)
مونتەهای گشت قودرەت و فەن خوایەبەس    مونتەهای سێڵاو وچۆم دەریایەبەس (٣١٦٣)
هەم هەور گشتیان لەدەریا چا دەبن    هەم هەموو سێڵاو بەرەو دەریا دەبن (٣١٦٤)
شاکوتی من چوو لەدەستم کوڕ هەدەر    ئەو کوتی هیناومەدەریا پڕئەسەر (٣١٦٥)

قەت چ ساحیر نین ڕەقیبی پیرەزاڵ غەیری من هاتم لەلایەن بێ هەواڵ (٣١٦٦)
وەک یەدی مووسا بەئەمری کردگار سیحروجادووی وی دەکەم من، تارومار (٣١٦٧)
چونکەئەوعیلمەی بەمن دا خوای قەدیر نەک بەشاگرد بوون،لەبۆ سیحری فەقیر (٣١٦٨)
بۆیەهاتم واز بکەم تا سیحری وی تا کوشازادەبمێنێ هەر قەوی (٣١٦٩)
ڕوو کەقەبران زوو بەیان، ئەو جارەکە ڕەنگ سپی قەبرێک، لەلای دیوارەکە (٣١٧٠)
ڕوو بەقیبلەهەڵقەنە، ئەو جێ، هەتا تۆببینی قودرەتی سونعی خودا (٣١٧١)
چون درێژەئەو وتارەو تۆش مەلوول باخولاسەئینتیخاب کەم بێ فزوول (٣١٧٢)
وەی دەکرد شا ئەو گرێ یانەی گران میحنەتی لابرد لەشازادەی جەوان (٣١٧٣)
هات وەخۆ، شازادە، جا، هات توند بەغار پاش گەلێک میحنەت لەبۆلای شەهریار (٣١٧٤)
بردی سەجدە، دایدەنا سەر خاک زەقەن بوو بەدەس شازادەجا، تیغ و کەفەن (٣١٧٥)
شار هەموو ڕازاوەئەهلی شار شاد هەم عەرووسی نا ئومێدی بێ مراد (٣١٧٦)
جارەکی دیش هاتەبەر عالەم ژیان لێک گەلێک زۆرڕۆژی شادی و غەم جییان (٣١٧٧)
گێژنەکی وای شا دروست کرد ئەو دەمی سەگ گوڵاوی شەکروقەندی پێش دەمی (٣١٧٨)
پیرەژن مرد چون گەلێکی غەم دەخوارد ڕووی و خووی پیسی بەدەس مالیک سپارد (٣١٧٩)
جا سەری سوڕ مابوو شا زادە، کەمن چۆنی ئەستاند عەقڵ وهۆش لێم، پیرەژن (٣١٨٠)
تازەبووکێکی دەدی جوان چەشنی مانگ جوان هەموویان خۆ لەلای وی نیوەدانگ (٣١٨١)
چوو لەهۆش وکەوتەعەرزی ئەو جەوان تاکو سێ ڕۆژ ما تەنی وی بێ گییان (٣١٨٢)
سێ شەووڕۆژچوولەهۆش نەیما چ تین خەڵکی لەوبێهۆشیەبوون بێ حەدغەمین (٣١٨٣)
هات وەهۆش جا ئەو بەدەرمان وگوڵاو کەمکەمەحاڵی دەبوو باش و خەراو (٣١٨٤)
پاشی ساڵێک شا دەگەڵ وی کوت وتار ئەی کوڕم تۆ بێنەبیرت کۆنەیار (٣١٨٥)
هاو نشینی و هاو سەری تۆ بێنەبیر ترش و گرژی ڕوو وەلا بە، بیخەبیر (٣١٨٦)
پێیدەکوت دەستم کەوت( دارالسروور) من نەجاتم بوو لەچای( دارالغروور) (٣١٨٧)
وایەموئمین، دی ئەگەر نووری خودا ڕوو لەتاری و زوڵمەتی بەد لا دەدا (٣١٨٨)

**بەیانی ئەو مەتڵەبە کە مەنزوور لە شازادە ئینسانە،کە خەلیفەتوڵلایە، کە بابیشی ئادەم سەفییوڵلایە و خەلیفەی خوایە،کە فریشتان سەجدەیان بۆ برد، و مەنزوور لەو پیرەژنەی کابولی دونیایە، کە بە سیحر و جادوو ئینسانی لە بابی خۆی(ئادەم) دوور کرد و ئەنبیا و ئەولیا تەبیبی موعالیجن ...**

من لەشازادەم، مەرام تۆی ئەی برا    ژیانی نوێت تۆ بێ لەدونیای کۆن درا (٣١٨٩)

ئەو عەجووزەی کابولی دونیایە، چۆن    عالەمی کردگشت ئەسیری ڕەنگ و بۆن (٣١٩٠)

گەر جیهان ئالوودەکا، تۆ ئەی فلان    ( قل أعوذ ) بخوێنەفووکە، بێ وچان (٣١٩١)

تا نەجاتت بێ لەجادوو هەم قەلەق    با پەنات تەنها ببێ ڕەببولفەلەق (٣١٩٢)

بۆیەدونیای نێو دەنا ساحیر، ڕەسووڵ    چون بەجادوو خەڵکی خستەچاڵی قووڵ (٣١٩٣)

سیحروجادووی زۆر شەدیدەپیرەگەند    بەو دەمی گەرمی دەخا،شایان دەبەند (٣١٩٤)

هەرئەوەئەفغانی نێو سینانە بەس    ئەودەکا،مەحکەم گرێی سیحران، نەکەس (٣١٩٥)

ساحیرەی دونیا ژنێکەزۆر قەوی    عامەناتوانن کەحەل کەن سیحری وی (٣١٩٦)

گەر گرێی وی واز بکا عەقڵی بەشەر    ئەنبییای بۆچی دەنا ردن خوای لەسەر؟ (٣١٩٧)

مورشیدێک داواکەخۆش دەم بێ وەها    تۆ لەبەند و داوی دونیاکا ڕەها (٣١٩٨)

تۆی وەکوو ماسی گرفتار کرد دەداو    مادەداو شازادەساڵێک، تۆ تەواو (٣١٩٩)

تۆ هەموو عومرت دەداوی وی، دەمای    دوورلەخۆشی و دوور لەڕێگای ئەنبییای (٣٢٠٠)

فاسقی بەد بەختی تۆ هەم ڕەنجبەر    لەو جیهانی دیش هەتە، تۆ دەردەسەر (٣٢٠١)

زۆر دەکا مەحکەم گرێیان فوویی وی    تۆ تەڵەب کەفووی خودای باڵاو نەوی (٣٢٠٢)

تا (نفخت فیەمن ڕوحی ) دەڵێ    بێرە زوورتر تاکو جادووگەر هەڵێ (٣٢٠٣)

بەس بەنەفخی حەق دەسووتی نەفخی سیحر    نەفخی جادووقەهرە،نەفخی خوایەمیهر (٣٢٠٤)

ڕەحمەتی حەق زۆر لەپێش قەهرو غەزەب    سەبقەتت گەر ویست بکەسابیق تەڵەب (٣٢٠٥)

واسیلان گەرکو ئەتۆ داوا بکەی    چاکەبۆخۆت قابلێک پەیدا بکەی (٣٢٠٦)

چۆن دەبێتن سیحری ئەو پیرێژنەواز؟    ئەو کەتۆی گرتۆتەباوەش وا بەناز (٣٢٠٧)

ئەوچرای عالەم کوتی خۆیەک کەڕەت    وەک هەوێ وان ئەوجیهانەوئاخیرەت (٣٢٠٨)

وەسڵی دونیابووفیراقی ئەو جیهان    سیحەتی تەن بوو بەدەردی ڕووح و گیان (٣٢٠٩)

فیرقەتی دونیات کەتۆ زۆر سەختەبۆ    فیرقەتی ئاخیر شەدید تر بگرەتۆ (٣٢١٠)

گەر فیراقی نەقش دێنێ بۆت عەزاب    دەردی دوور بوونت لەنەققاش بێ حیساب (٣٢١١)

تۆ کەبۆ دونیات نەما سەبرو قەرار — چۆن دەبێ سەبرت ئەدی بۆ کردگار؟ (٣٢١٢)
گەر بەبێ ئەو ئاوی ڕەش سەبرت نەما — چۆن دەبێ سەبرت بەبێ کانی خودا؟ (٣٢١٣)
تۆکەبێ ئەو ئاوەنیتەهیچ سکوون — چۆن دبێ دوور بی لە( ئەبرارِ یەشرەبوون؟) (٣٢١٤)
گەرببینی لەحزەیەک لوتفی وەدوود — تۆ دەنێو ئاگر دەخەی گیانو وجوود (٣٢١٥)
جا لەلات دونیا وەکوو مندار دیار — گەرتۆ دیتت فەڕڕو قوربی کردگار (٣٢١٦)
چەشنی شازادە، دەگەی بەویاری خۆت — جا لەپێ دەردێنی ئەو دەم خاری خۆت (٣٢١٧)
تاکو بێ خود بی لەخۆت زۆرکەتەلاش — بێ گومان بەس خوادەزانێ چاک و باش (٣٢١٨)
تۆ مەبەهاو دەم دەگەڵ خۆت گشت زەمان — تا دەزەلکاوگیر نەکەی تووەک کەران (٣٢١٩)
لەغزیشی وا،بۆیەبوو،چاو بووی قسوور — چونکە وەک کوێر نەیدەدی ئەو ژێر و ژوور (٣٢٢٠)
بۆی کراسی یوسوفت بابێ سەنەد — بۆنی وی بۆ ڕەو شەنی چاو بوو مەدەد (٣٢٢١)
سووڕەتی پنهان و ئەو نووری جەبین — ئەنبیا چاویان بەوان بوو دووربین (٣٢٢٢)
نووری ئەو ڕوو، تۆ دەکا ڕاحەت لەنار — تۆ نەبی قانع بەنووری موستەعار (٣٢٢٣)
نووری عارییەت دەکا چاو حاڵ بین — جیسم و عەقڵ و ڕووح دەکا بێ تاب و تین (٣٢٢٤)
ئەوبەزاهیر نوور، بەباتین ئاگرە — تۆ کەنوور خوازی لەوی دەس هەڵگرە (٣٢٢٥)
جا بەسەر چاو دا دەچن دیدەو گیان — گەر ببینن هەر زەمانی حاڵ ئەوان (٣٢٢٦)
وایەحاڵی دوور بینی بێ هونەر — وەک لەخەو دا دوور ببینێ یەک نەفەر (٣٢٢٧)
وەک بەتینوویی بنووی سەر لێوی جۆ — جا بکەی ئەودەم سەراب، تۆ جستوجۆ (٣٢٢٨)
تۆ دەچی بەدوای سەرابی دوور بەغار — بینشی خۆت ئەو دەمی تۆ بوو بەیار (٣٢٢٩)
تۆ لەخەو لای یار دەڵەی لا ف بێ حیساب — ڕوون دڵم من لادەبەم پەردەو حیجاب (٣٢٣٠)
دیم کەلەو لا ئاو، بڕۆین بۆ وێ بەتاو — جا عەیان بوو، ئەو سەراب بوو، خۆ نەئاو (٣٢٣١)
دوور دەبێ لەو ئاوەدانیی هەر قەدەم — توند دەچی بۆلای سەراب،جێگای نەدەم (٣٢٣٢)
عەینی ئەو عەزمەت حیجابی ئاوەتۆ — بێ خەبەربووی ئاو بەتۆ پەیوەندەخۆ (٣٢٣٣)
وادەبێ زۆر یەک لەجێی خۆی دوور بوو — هەر هەمان جێگایی ئەو مەنزوور بوو (٣٢٣٤)
دید ولافی نوستوو نایەن هیچ بەکار — هەر خەیاڵەئەو وەلابە، بۆ کەنار (٣٢٣٥)
گەر خەواڵووی، تۆ لەسەر ڕێگا بنوو — تۆ خودا جا، هەر لەسەرڕێی خوا بنوو (٣٢٣٦)
تا بە وێدا سالیکێک بڕوا ئەگەر — فکری وێژناکیت ئەو دەرکا لەسەر (٣٢٣٧)
شەخسی نوستوو فکری وەک مووش بێ ئەگەر — قەت حەقیقەت بۆ وی نایەت بەر نەزەر (٣٢٣٨)

فكری نوستوو هەرچلۆن بێ ئەی فلان　　هەر خەتایەو ئیشتیبایە، بێ گومان (٣٢٣٩)
مەوجی دەریا دێ دەدا لەوبێ حیساب　　ئەولەسەحرا دێ دەچێ بەدوای سەراب (٣٢٤٠)
زۆر دەبینێتن عەتەش نوستوو، لەخەو　　دوورترەحەبلولوەرید تا، ئاو، لەو (٣٢٤١)

**حیكایەتی ئەو زاهیدەی كەلەكاتی وشك سالی دا پێدەكەنی وخۆشحاڵ بوو هەرچەند كە بۆخۆی زۆر نەدار و عەیالوار بوو،وخەڵكیش لەبرسان دەمرد،بەویان دەكوت چ وەختی شادمانییە؟ئێستا وەختی شیوەن و ناڕەحەتییە، كوتی ئەمن هیچ بارێكم نییە..**

**خولاسەی داستان..**

یەكێك لەزاهیدان لەكاتی وشك سالی دا شادمان بوو دەحاڵێك دا كەهەموو عالەم نیگەران بوون و دەناڵین، عالەم لەشادی و خۆشحالی ئەو زاهیدەسەر سام مابوون پێیان كوت دەو موسیبەتەگەو رەیەدا بۆ خۆشحالی وپێدەكەنی؟ كابرای زاهید كوتی ئێستا تەواوی زەوی لەبەر چاوی ئێوەلەژێر فەرمانی قاتی ووشك سالیدایە، بەڵام لەبەر چاوی من ئێستا زەوی بەهەشتی بەرینە.. ئێوەش چاوی وەك چاوی من پەیدا بكەن تا بەهەشتێكی كەئەمن دەی بینم ئێوەش بی بینن ..

چەشنی ئەوزاهید كەهات یەك وشكەساڵ　　خەڵكی گریان ئەوبەڵام بووخۆشحاڵ (٣٢٤٢)
جا دەیانكوت بەو كەكوا جێی شادییە؟　　ئێستەكاتی شیوەن و بێ دادییە (٣٢٤٣)
چاوی خۆی ڕەحمەت لە ئێمە بەست تەواو　　ئاگری بەردا دەسەحرا، تینی تاو (٣٢٤٤)
ڕەز هەموو سووتانو زەرع و باغ هەم　　لەو زەمینە جێ نییە هەبیێت نەم (٣٢٤٥)
عالەمیش بەو قاتییە زۆر چوون لە ناو　　دەستەدەستە چەشنی ماسی دوور لە ئاو (٣٢٤٦)
تۆ مەگەر ڕەحمت نییەبۆ موئمنین؟　　موئمینان لای تۆ مەگەر یەك جیسم نین؟ (٣٢٤٧)
ڕەنجی عوزوێك ڕەنجی گشت ئەعزای بەدەن　　كاتی سوڵح و كاتی جەنگی تەن بە تەن (٣٢٤٨)
پێیكوتن قاتیەلە لای ئێوە بەڵام　　وەك بەهەشتە ئێستەئە و عەرزە لە لام (٣٢٤٩)
من دەبینم گشتی دۆڵ و دەشت و شاخ　　پڕلەمیوەن چون هەموویان بوون بەباخ (٣٢٥٠)
بای سەبا مەوجان دەدا بەوسەبزەزار　　دەشت وكێوشین بوون ومیوەش هاتنەخوار (٣٢٥١)
من دەدەم دەستم لەوان بۆ ئیمتیحان　　دەست و چاوم نین درۆزن هیچ زەمان (٣٢٥٢)
ئێوەبۆ فیرعەونی تەن بوون دۆست ویار　　بۆیەنیلتان دی بەخوێنی نالەبار (٣٢٥٣)
یاری مووسای عەقڵ و تەن بە، ئەی نەبیل　　تا نەمێنێ خوێن، ببینی ئاوی نیل (٣٢٥٤)
باب كەخوێنی ویت ئەتۆ نێو گشت ڕەگە　　گەر جەفای دەی تۆ ئەوت لا،وەك سەگە (٣٢٥٥)

سەگ نییەئەوبابە، جەورت وای ئەسەر     کرد، دەبینی تۆ بەچەشنی سەگ پدەر (٣٢٥٦)
لای برایان گورگەیوسوف دوور لەسوود     چون برایان ئەهلی کین بوون و حەسوود (٣٢٥٧)
گەر سەفاو سولحت ئەتۆ کرد ئیختییار     سەگ نییەئەو بابە، ئەو دەم، بەلکەیار (٣٢٥٨)

**بەیانی ئەو مەتەڵەبە كە تەواوی عالەم سوورەتی عەقڵی كولله، ئەگەر لە گەڵ عەقڵی كول كێشە و مونازەعەت ببێ ئەغڵەب وایە كە سوورەتی زاهیری دونیا بۆ تۆ دەبێتە باعیسی غەم و ناڕەحەتی، هەر وەكوو ئەگەر لەگەڵ بابت كێشە و ئیختیلافت ببێ سوورەتی بابت باعیسی غەم و ناڕەحتی تۆیە و پێت خۆش نییە كە ڕووی وی ببینی .. ئەگەر چی لە پێش دا لە چاو خۆشەویستتر و باعیسی ئارامیش و ڕاحەتی ڕووح و گیان بوو..**

سوورەتی عەقڵی کولە، دونیایی دوون     عەقڵی کول بۆ تالبی حەق ڕێ نموون (٣٢٥٩)
عەقڵی کول ئازار بدەی گەر یەک زەمان     تۆ دەبینی سوورەتی کول وەک سەگان (٣٢٦٠)
بێنە تۆ بۆ عەقڵی کول شادی و سروور     تا ببینی خاکی بەر پێت زێڕی سوور (٣٢٦١)
قیامەتت ئەو دەم دەبێ بۆ سازگار     چەرخ و عەردی دی دەبینی ئاشکار (٣٢٦٢)
من دەگەڵ ئەو بابەچون بووم سازگار     ئەوجیهانەم وەک بەهەشت لێ بوو دیار (٣٢٦٣)
سوورەتی نوێ و جوان دەبینم دەمبەدەم     تا لەنوێ دیتن مەلال بێتن، عەدەم (٣٢٦٤)
ئەو جیهانەم پڕ لەنیعمەت بەر نەزەر     ئاو لە کانیاوان دەبینم، دێتەدەر (٣٢٦٥)
دێتەگوێی من دەنگی ئاوی پڕخرۆش     مەست دەبن مەدهۆش دەبن لێم قەلبوهۆش (٣٢٦٦)
دێنەڕەقسین لک لەدار وەک تائیبان     لێدەدەن چەپڵان گەڵا، وەک موتریبان (٣٢٦٧)
دیارەهەێتی نێو لباد ئاوێنەنوور     چۆنەداخوا گەرلباد بخرێتەدوور؟ (٣٢٦٨)
لەو هەزاران نوکتە ناڵەم دانەیەک     چونکە پڕبوون گوێ هەموو یەک‌یەک بەشەک (٣٢٦٩)
ئەو وتانەم موژدەنەلای ئەهلی وەهم     موژدەنین بەل ڕازگوشان لای عەقڵ و فەهم (٣٢٧٠)

**داستانی منداڵانی عوزەیر(ع) كەخەبەرو سۆراغی بابیان لە بابیان دەپرسی، بابیان دەیكوت بەڵێ دیتوومە، لەدوامە، دێ، بەعزێك ناسیان و بێ هۆش بوون بەعزێك نەیان ناسی و دەیانكوت ئەو قسەهەر موژدەیە، ئەو بێ هۆشیەبۆ چییە؟**

**خولاسەی داستان ..**

کوڕانی عوزەیر(ع) لەبابیان دەگەڕان و خەبەری ویان لەهەموو ڕێبوارێک دەپرسی تاکو بابی خۆیان دیت بەڵام نەیان ناسی چون بەحوکم و ئیرادەی خوداوەند جەوان مابوو جا، لێیان پرسی ئەی ڕێبوار هیچ خەبەرێکت لەعوزەیرنییە؟ عوزەیر بۆ ئیمتیحانی هۆش وشعووری مندا لەکانی،

خۆی نەناساند، نەیکوت کەئەمن عوزەیرم بەڵام دەنێو قسان دا بەرەمزو ئیشارەکوتی بەڵێ ئەو بەدوای من دا دێ .. یەکێک لەکورەکان بەبیستنی ئەو موژدەیەخۆشحاڵ بوو بەڵام کوڕێکی دیکەی بەعەقڵ و فەراسەت حاڵی بوو کەئەو ڕێبوارەهەر بۆخۆی عوزەیرەئەوەندەشاد وخۆشحاڵ بووکەلە هۆش چوو،کەوتەعەرزی..

وەک منالانی عوزەیری نادیار — حاڵی بابیان کرد لەخەڵکی پرسیار (٣٢٧١)

پیرببون منداڵ و بابیشیان جەوان — دیتییان جارێک بابیان ناگەهان (٣٢٧٢)

پرسییان لەو ، بێژە بۆن ئەی ڕەهگوزەر — لەو عوزەیری ئێمە ، چت بوو تۆ خەبەر؟ (٣٢٧٣)

چون کوتی ئەو ڕۆکەپێن یەک موعتەبەر — دیتە لاتان پاشی مەئیووس بوون پدەر (٣٢٧٤)

پێیکوتن ئاری لەپاش من دێ، بەڵام — یەک‌دەبووخۆشحاڵ بەو موژدەوکەلام (٣٢٧٥)

پێیدەکوت هەرشاد ببی ئەی موژدەدەر — یەک بەڵام ناسی و، هۆشی چوو لەسەر (٣٢٧٦)

ئێستە کوا جێی موژدەیە ئەی خیرەسەر؟ — ئێمە ئێستا، جێن لە کانیاوی شەکەر (٣٢٧٧)

موژدەیە لای وەهم و لای عەقڵیش عەیان — چاوی وەهمان چونکە نابینن نیهان (٣٢٧٨)

دەردەبۆ کافر لەبۆ موئمین بەشیر — عەینی مەقسود بوو لەلای چاوی بەسیر (٣٢٧٩)

عاشقی گەر مەست وخۆش کرد وەسڵی یار — زۆر لەژوور ئیمان وکفری گرت قەرار (٣٢٨٠)

کفرو ئیمان هەردوویان بوون دەرکەوان — مەغزە ڕاستی کفرو دین وەک پێست وان (٣٢٨١)

کفر ، پێستێکە کە دوورە زۆر لە مەغز — پێستە ئیمان کردی تامی مە غزی نە غز (٣٢٨٢)

پێستی ئیشک و ڕەق نەسیبی ئاگرە — پێستی وەسلی مەغزە خۆشە و دڵگرە (٣٢٨٣)

جێی بڵیندە مەغز و جێی خۆشی نەوی — زۆر لەخۆش ژوورتر کە خۆشیان دێن لە وی (٣٢٨٤)

بێژە باسی پێش ، کەنیتی ئەو هەبن — تا دەرێتی تۆز لە یەم مووسایی من (٣٢٨٥)

ئەو وتارەم بۆ عەوامان کرد بەیان — مابەقی گوفتاری خۆم من کرد نیهان (٣٢٨٦)

زێری عەقڵت وردە زۆر ئەی موتتەهەم — مۆری سککە چۆن لە سەر ئەو وردە دەم (٣٢٨٧)

عەقڵی تۆ بەش بەش کرا، زۆر بێ ژمار — بۆ هەزاران ئارەزوو داخوازو کار (٣٢٨٨)

کۆ دەبێ بکرێن گشت ئەعزا بە عیشق — تا تۆ خۆش بی‌وەک سەمەرقەند و دەمیشق (٣٢٨٩)

دەنکەدەنکەی کۆکە، نەی بێ ئیشتیباە — تا تۆ لێت بدرێت سککەی پادشاە (٣٢٩٠)

گەر کو مسقاڵێک زیاد بی تۆیی خام — چا دەکا شا ، لێت یەک زێڕینە جام (٣٢٩١)

نێوی شا، هەم سووڕەتی شا،هەم لەقەب — هەن لە سەرئەو جامە ئەی وەسڵەت تەڵەب (٣٢٩٢)

جا دەبێ مەعشووقی تۆ بۆت ئاو و نان — هەم چراو نوغڵو مەیو مەحبووبی جوان (٣٢٩٣)

جەم‌کە خۆت تۆ چون جەماعەت ڕەحمەتە | تا بڵەم بۆت هەرچی هەمبێ من وتە (٣٢٩٤)
چون بەخاتر باوەڕی کوترا وتار | موشریکان ناکەن بەحەق باوەڕ چ جار (٣٢٩٥)
هەرچی گیانی بەش بوو نێو حەشوی فەلەک | ئەو لە نێو داوان ئەسیرە وەک سەمەک (٣٢٩٦)
باش لەحاستی شەخسی وا بێ‌دەنگییە | جوابی ئەحمەق غەیری بێ‌دەنگی نییە (٣٢٩٧)
من ئەوەم زانی بەڵام ، تەن مەستە وا | بێ ئیرادەم کرد ئەمن ، زار ئاوەڵا (٣٢٩٨)
وەک بە پشمینان و باوێشکان زار | واز دەبێتن بێ ئیرادە و ئیختییار (٣٢٩٩)

**تەفسیری ئەو حەدیسەکە..( انی لاستغفرالله‌فی کل یوم سبعین مره)**

چەشنی ئەحمەد من لە گوفتار مەغفیڕەت | ڕۆژ بەڕۆژ داوا دەکەم حەفتا کەڕەت (٣٣٠٠)
تۆبەدەشکێنێ بەڵام مەستی بەدەن | عەقڵوهۆش موختەل دەکا ئەو مەستی تەن (٣٣٠١)
بۆیەزانایانی کرد مەست کردگار | تاکو ڕازی کردگار کەن ئاشکار (٣٣٠٢)
ڕازوئەسراری نیهان و موکتەتەم | ئاشکرای کردن بەوان (جف القلم ) (٣٣٠٣)
ڕەحمەتی بێ حەددی حەق دائیم ڕەوان | ئێوەنوستوون، بۆیەنابینن ئەوان (٣٣٠٤)
نوستو سەر جۆگەلیباسی تەڕ دەبوو | ئەو لەخەو دا، بۆ سەراب زۆر توند دەچوو (٣٣٠٥)
دەچتەجێگایەک بەبۆنی ئاو، بەتاو | ئەو بەفکری وا، لەخۆی بەست ڕێیی ئاو (٣٣٠٦)
چون لەبەر وێ ئەو، ئەلێرەدووربوو | بۆ خەیاڵێک ئەو لەحەق مەهجوور بوو (٣٣٠٧)
دوور دەبینن، ڕووحییان نوستوەئەوان | ئێوەڕەحمی کەن بەوان ئەی ڕەهڕەوان (٣٣٠٨)
تونیەتی خەو نایەنێ بۆ عاقڵان | تونیەتی دێنێت خەو بۆ غافڵان (٣٣٠٩)
عەقڵی کامیل ئەو هەبوو هات لای خودا | عەقڵەکی وا، نا، عوتارید ئەو دەدا (٣٣١٠)

**بەیانی ئەو مەتڵەبەکەعەقڵی جوزئی هەرهەتا گۆڕ دەبینێ نەزیاد تر، لە بەقییەی ئومووری مەعنەوی، لەئەنبیاو ئەولیا تەقلید دەکا ..**

عەقڵی جوزئی چاوی تا گۆڕ کار دەکا | چاوی دڵدار، نەفخی سوور بەو دیار دەکا (٣٣١١)
تاکو گۆڕ مەو دایی عەقڵی جوزئییە | نێو عەجائیب عەقڵی جوزئی جێی نییە (٣٣١٢)
عەقڵی جوزئی تۆلەلای خۆت دەرکەدەر | تۆلەچاوی غەیبی،خۆت کە، بەهرەوەر (٣٣١٣)
کوا ئەوەی شاگردی ئوستادەوکتێب | چەشنی مووسای دیتەدەستی نوورلەجێب؟ (٣٣١٤)
عەقڵی جوزئی لابە،نایەت هیچ بەکار | ئینتیزارکە،لوتفی پاکی کردگار (٣٣١٥)
بۆ مەقام نەت بێ لەگوفتار تۆ تەماع | مونتەزیر چاکتر لەگوفتار، بۆی سەماع (٣٣١٦)

مەنسەبی تەعلیم نەوعێک شەهوەتە فیکری شەهوانی لەڕێی حەق دا، بوتە (٣٣١٧)
فەزلی حەق گەرکولەلای عام باقەبووڵ خوالەبۆهێنندەی دەناردبۆ وان ڕەسووڵ؟ (٣٣١٨)
عەقلی جوزئی وەک برووسکی ئاسمان قەت بەکەس نادات ڕێگای دوور نیشان (٣٣١٩)
خۆ برووسکان ڕەهنەمای ڕێگا کەنین بەڵکەئەمرەتا بکەن هەو ران شین (٣٣٢٠)
جا وجوودی عەقلی ئێمەش وایەتا شین لەشەو قی بوون، نەبوون کا، ئەی فەتا (٣٣٢١)
تیفلی عەقڵت پێت دەڵێ مەکتەب برۆ خۆی بەڵام ناتوانی فێر کا هیچ بەتۆ (٣٣٢٢)
عەقڵەدێنێتن نەخۆش بۆ لای تەبیب بۆ دەوای وی خۆی نەبوو ئەمما موسیب (٣٣٢٣)
دەچنەئاسمانان شەیاتین، تا ئەوان بێتەگوێیان ڕەمزو ڕازی ئاسمان (٣٣٢٤)
جا کەمێکیان ڕازی ئاسمانان دەبرد جا شەهاب هات و ئەوانی دوور دەکرد (٣٣٢٥)
بچنەعەرزی،یەک ڕەسووڵ ئێستا لەوێ دێتەدەستوو،هەرچی ڕازی بوو هەوێ (٣٣٢٦)
گەردەتان وێ ئێوەدوڕڕی پڕ بەها بچنەماڵان ئێوە( من ابوابها ) (٣٣٢٧)
لێ بدەن لەو دەر بوێستن جا، لەوێ ڕێی سەرووی ئاسمانتان دەس ناکەوێ (٣٣٢٨)
ئێوەلەو ڕێگا درێژەن بێ نییاز چونکەئاگان کرد یەک خاکی، لەڕاز (٣٣٢٩)
بچنەلای وی ئێوەخائین نین ئەگەر گەر چی نەی،بن، ئێوەدەبنەنەی شەکەر (٣٣٣٠)
شین دەکا سەو زەلەخاکت ئەو دەلیل زیاد نییەلەو، لاقی ئەسپی جەبڕەئیل (٣٣٣١)
شین دەبێ تۆجوان و تازەهەم ئەگەر بییەخۆڵ، پێی ئەسپی جەبرێلت لەسەر (٣٣٣٢)
تۆزی بەرپێی ئەسپی جەبریل، سامری خستەگوێلکی زێڕ،دەهات ڕووح بۆ بەری (٣٣٣٣)
بووبەگیاندار وایدەکرد بانگ و قریو ناکەسان بەو دەنگەخواردیان زوو فریو (٣٣٣٤)
گەر بەڕاستی بێن لەبۆ لای ئەهلی ڕاز ناو هەوێ سەر پۆش ئێوە، چەشنی باز (٣٣٣٥)
هێندەسەرپۆشێکی سەختەو ناڵەبار بەو دەبێ باز زۆر فەقیر و زۆر هەژار (٣٣٣٦)
بۆیەڕووپۆشی لەسەربوو چاوی باز چونکەجینسی خۆی فەقەت بوو داخواز (٣٣٣٧)
یاری شایەمەیلی جینسی ناوەباز بازەوان چاوی دەکا ئەو جارەباز (٣٣٣٨)
ڕایدەنا حەق دێو لەلای میرسادی خۆی عەقڵی جوزئیشی لەئیستیبدادی خۆی (٣٣٣٩)
بێ نییازنی کەمکە، بۆ جاە،تۆ تەلاش بەڵکەشاگردێکی بۆ دڵ، زێدەباش (٣٣٤٠)
تۆ برۆ لای دڵ، کەتۆ ئەهلی دڵی ئێستەبەندەو عەبدی پاشای عادڵی (٣٣٤١)
بەندەگی وی زۆر لەزوور سوڵتانییە چون (انا خیر ) قسەی شەیتانییە (٣٣٤٢)
ئینتیخاب کەپاشی ناسین ئەی حەبیس بەندەگی ئادەم لەکیبری ئیبلیس (٣٣٤٣)

وای بەئێمەکوت ڕەسوولی خوای جەلیل     خۆش بەحاڵی وەی کەنەفسی کرد زەلیل (۳۳۴۴)
سێبەری تووبا، ببینەو خۆش بنوو     سەر لەسێبەر، بێ تەکەبور، تۆش بنوو (۳۳۴۵)
زیللەت و خواری نەفس، خۆش سێبەرە     بۆ ئەوەی شایستەبێ، خۆش بستەرە (۳۳۴۶)
گەر بڕۆی لەو سێبەرەبۆ لای غروور     تۆ دەبی تاغی و گومڕا، دوور لەنوور (۳۳۴۷)

**بە یانی ئە و ئایە تە (یا ایها الذین امنوا لا تقدموا بین یدی الله ورسوله )**

جا موتیع بەبێ سەدا خۆت با مەدە     تۆ لەسایەی ئەمری شێخ قەت لا مەدە (۳۳۴۸)
موستەعیددی قابلیش بی تۆ دەنا     لافی کامیل بوون دەبا تۆ بۆ فەنا (۳۳۴۹)
هیچ لەبۆت نامێنێ ئیستیعداد ئەگەر     ڕەد بکەی تۆ حوکمی شێخی با خەبەر (۳۳۵۰)
چادەکەی چەکمان تۆسەبرت بێ ئەگەر     پینەچی تۆ،گەرکۆ سەبرت کردەدەر (۳۳۵۱)
پینەدۆزان گەرهەیان با سەبروحیلم     کەو ش وچەکمەی تازەیان دەدروو،بەعیلم (۳۳۵۲)
زۆر دەکەی کۆشش لەئاخر دێ مەلال     جادەڵەی ئەو دەم کە(العقلُ عقال ) (۳۳۵۳)
چەشنی ئەوکابرایی فیلسووف وەختی مەرگ     عەقڵی خۆی دی ڕووتە، نیتی باڵ وبەرگ (۳۳۵۴)
بێ غەرەز دەیکردئەو دەم ئیعتیراف     ئەسپی فکرم غاردەدا، نێو قیل، گەزاف (۳۳۵۵)
نەیدەهێشت من یاری مەردان بم، غروور     چوومەنێو دەریای خەیاڵات و فکوور (۳۳۵۶)
دوور لەسوودەچوونەنێو دەریایی ڕووح     بەهەرەنادا لێرە، غەیری کەشتی نووح (۳۳۵۷)
وای دەفەرموو ئەو شەهەنشاهی ڕوسول     خۆ ئەمن کەشتیم لەنێو دەریا یی کول (۳۳۵۸)
یاکەسێکی هەیبێ وەک من مەعریفەت     جێ نشینم بێ لەگوفتارو سیفەت (۳۳۵۹)
ئێمەکەشتی نووح لەنێو دەریا، هەتا     خۆت نەجات دەی تۆ، بەئێمە،ئەی فەتا (۳۳۶۰)
چەشنی کەنعان تۆ مەڕۆ ئێرەو ئەوێ     با وەگوێت( لاعاصم الیوم ) کەوێ (۳۳۶۱)
بەستەلات ئەوکەشتییەچون بووت حیجاب     کێوی فیکرت لا بڵیندەبێ حیساب (۳۳۶۲)
وا مەزانەتۆ،کەئەوکەشتی کەمە     وەسڵی فەزڵی خالقی دوو عالەمە (۳۳۶۳)
کەم بڵیندی کێوی فیکرت بێتەچاو     چونکەمەوجێک ئەو دەکا نابوود تەواو (۳۳۶۴)
نیتەتۆکەنعان بی گەر،پێم باوەڕی     گەرچی سەت پەندیش بدەم پێت وەک دوڕی (۳۳۶۵)
کوا دەبیسێ گوێی کەنعان گفتی وا؟     مۆری دانا چون لەسەر گوێی وی خووا (۳۳۶۶)
پەند لەمۆری کردگار ناکا گوزەر     بەندەپێی نابێ عیوەز حوکمی قەدەر (۳۳۶۷)
پێت دەڵەم ئەمما وتارێک خۆش بەتام     بەو ئومێدەتۆ کەکەنعان نی، لەلام (۳۳۶۸)

ئیعتیراف بەو هەی دەکەی خۆت عاقیبەت تۆ لەئەووەڵ ڕۆژ ببینەئاخیرەت (٣٣٦٩)
دێ لەدەستت عاقیبەت بینی ئەتۆ کوێر مەکەتۆ چاوی ئاخیر بینی خۆ (٣٣٧٠)
چاوی ئاخیربینی هەرکەس دەسکەوێ لەغزشی نابێ لەڕێگا، ناکەوێ (٣٣٧١)
تاکو نەخلیسکێت پێت ئەی خۆشناو تۆ بەخاکی لاقی کامیل، کل، کە، چاو (٣٣٧٢)
بیکەکل بۆ چاو، خاکی پێیی وی تا جودا کەی سەر لەبەد کاری غەوی (٣٣٧٣)
چون ئەگەروات کردوبەوبووت ئیفتیقار گەرچی دەرزیش بی،دەبی تۆ زولفەقار (٣٣٧٤)
خاکی پێی پاکان بکەکل، ئەی جەناب چاو هەتا تیژبێ، بسووتێن گشت حیجاب (٣٣٧٥)
چاوی وشتر بۆیەوا تیژ بین بوو چونکەبۆ بینایی چاو، خواردی دڕوو (٣٣٧٦)

**داستانی شکایەت کردنی ئێستر لەلای وشترکەئەمن لەکاتی ڕێ ڕۆیشتن زۆر بەسەر ڕوو دا دەکەوم بەڵام ئەتۆ بەسەرڕوو دا نا کەوی، ئەوەبۆچی وایە؟ وجواب دانەوەی وشتربەوی..**

**خولاسەی داستان**

چون ئەو داستانەلەبەیتی (١٧٤۶) و(١٧٦٢)ی دەفتەری سێهەمیش دا هاتووەتیکراری وی لازم نییە.. لێرەدا، ئێستر کینایەلەو ئینسانانەیەکەئەسیری شەهوەت و ئارەزووی نەفسانینەوبینایی باتینیان نییەوشتر کینایە لە موئمینێکی عارفەکەلەجێگایەکی زۆر بڵیند چاو لەدونیا دەکا، جا لەبەر ئەوە،لەجێگای داوی لەغزیش و خلیسکان و خەتا، مەحفووز دەبێ .. لەو داستانەدا، ئێستر بەقسوور و خەتای خۆی ئیقرادەکا وداوا لەوشتر دەکا کە کۆمەکی بکا تا ڕێ لەچاڵ تەشخیس بدا و وشتر قەبووڵ دەکا .. مەولانا لەو داستانەدا،دەڵێ ئەگەرخەتاولەغزیشی ئادەمی بەسووڕەتی مەلەکەیێکی محکەم وسابیت جێگیر نەبێ دەتوانێ کەلەژێرعینایەتو هیدایەتی هادیێکی موسلیح و مڕشیدێکی کامیل خۆی نەجات بدا

بوو لەسەر ئاوخوڕ چەلێکی ئێسترێک دی کەوێستاوەلەلای وی وشترێک (٣٣٧٧)
پێیدەکوت بۆ زۆر بەسەر ڕوو دا دەچم گەر لەهەو راز یا نەوی ڕێگا دەچم (٣٣٧٨)
بیلخسووس گەر دەچمەجێگای زێدەبەرز من دەخاتەخوار لەوێرا، ترس و لەرز (٣٣٧٩)
کەم بەسەر ڕوو دادەچی تۆ، بێژەبۆ؟ یانەبەختی یارە، ڕووحی پاکی تۆ (٣٣٨٠)
چۆکوئەژنۆم دا دەفیزین دەمبەدەم پڕ دەبن لەخوێن جا، لێم لووت و دەم (٣٣٨١)
لێم دەبێ خوار ئەو دەمی پاڵان و بار جا، موکاریش لێم دەدا شەڵلاق و دار (٣٣٨٢)
چەشنی ئەوکەس عەقڵی فاسید بێت وکەم بۆ گوناەدەشکێنێ تۆبە، دەمبەدەم (٣٣٨٣)
مەسخەرەی دێتن بەوی ئەو دەم بلیس چونکەفکری وی دەبینێ سست و سیس (٣٣٨٤)

جا بەسەررِوو دادەچێ وەک ئەسپی لەنگ    گەربێ باری گران و ڕێگەسەنگ (٣٣٨٥)
جا لەپنهان دێتەسەروی زەربی سەخت    چونشکاندی تۆبەئەوبەرگەشتەبەخت (٣٣٨٦)
ئەو چەلەش تۆبەی دەکا بەو فکری سیس    تۆبەدەشکێنێ بەئەمری دێوی پیس (٣٣٨٧)
گەرچی سستەچون غرووری بوو بەبار    واسیلانی خوا دەبینێ نا لەبار (٣٣٨٨)
ئەی شتور،تۆ بۆمیسال وەک موئمینی    ناکەوی سەررِوو، چکات، مەغروور نی (٣٣٨٩)
بێژەبۆچی هێندەئافەت دوورەلێت؟    ناکەوی سەر ڕووت و، ناخلیسکێت پێت (٣٣٩٠)
پێیدەکوت گەرچی سەعادەت خوا دەدا    زۆرەفەرِقن ئێمەزۆر لێکین جودا (٣٣٩١)
سەر بڵێندم چاو بڵێندم ئەی فلان    دیدی عالی دای لەدەردان، پێم ئەمان (٣٣٩٢)
من لەسەر کێو ڕا دەبینم ژێری کێو    دەشتی ساف و جوان و کەندالّی دزێو (٣٣٩٣)
هەروەکوو دی ئەوفلان شەخسی ئەجەل    هەرچی کاری بووی هەتارۆژی ئەجەل (٣٣٩٤)
چاک دەزانێ شەخسی پاک و پاک خوو    هەرچی پاش بیست ساڵی دیکە، دێتەرِوو (٣٣٩٥)
حاڵی خۆی تەنها نەدی ئەو موتتەقی    بەڵکەحاڵی مەغریبی هەم مەشریقی (٣٣٩٦)
نوور لەچاوو قەلبی وی دەگرێ قەرار    قەلب و چاو چون جێگەنووری کردگار (٣٣٩٧)
چەشنی یوسوف زۆرلەپێش دا،دی لەخەو    بوو بەمەسجوود بۆ هەتاوو،مانگ ئەو (٣٣٩٨)
پاش دەساڵان بەڵکەزیاترئەی ڕەفیق    هەرچی یوسوف دیتبووی هات زۆر دەقیق (٣٣٩٩)
دوور نییە(ینظربنورالله) لەسوود    ئاسمانان لەت دەکا نووری وەدوود (٣٤٠٠)
چون لەچاوت دا نییەتۆ نووری وا    بووی ئەسیری حیسسی حەیوانی و هەوا (٣٤٠١)
تۆی زەعیف چاو، بەس دەبینی پێشەخۆ    ڕەهبەریشت ناتەوانە، چەشنی تۆ (٣٤٠٢)
پێشەوایەچاو لەبۆ دەستان و پێ    چون بەوی ڕێی باش و بەد مەعلووم دەبێ (٣٤٠٣)
زۆرلەچاوت چاوی من ڕووناکترە    خیلقەتیشم زۆر لەئی تۆپاکترە (٣٤٠٤)
چون لەئەولادی حەلالّم، پاکنیژاد    نەک زینازادەو کەسیف و بەدنیهاد (٣٤٠٥)
تۆ لەئەو لادی زینای خۆ، بێ گومان    کەج دەبێ تیر، گەرکو کەج بێتن کەوان (٣٤٠٦)

**تەسدیق کردنی ئێستر جوابی وشتر وئیقرار کردن بەفەزلّی وی نیسبەت بەخۆی و کۆمەک و یارمەتی ویستن لەوی .. وپەنا بردن بۆ وی.. ودڵدانەوەی وشتر ئەو ئێسترە.. ورِێ نیشاندان و کۆمەک کردن بەوی، بابانەو شایانە..**

جا کوتی ئێستر بەچاوی پرِ لەئاو    ڕاستەئەی وشتر وتاری تۆ، تەواو (٣٤٠٧)
کەوتە سەر پێی و دەگریا زار زار    پێیدەکوت ئەی هەڵبژاردەی کردگار (٣٤٠٨)

چی دەبێ گەرگەورەیی خۆت دەی نیشان؟ من قەبووڵ کەی یەک لەجوملەی بەندەگان (٣٤٠٩)

پێیدەکوت چون لای منت ئیقرار کرد دەردو ڕەنجی ڕۆژگارت تارکرد (٣٤١٠)

چونکەبووت ئینساف، بەڵات لانا کەنار تۆ عەدوو بووی بۆمە، ئێستا بوو ی بەیار (٣٤١١)

خووی بەدت زاتی نییەئەی ئێسترە بەد کەزاتی بێت، بۆ حەق مونکیرە (٣٤١٢)

عارزی بێتن لەشەخسێک گەر بەدی ئیعتیراف و تۆبە، لەدوای، دێتەدی (٣٤١٣)

چەشنی ئا دەم عارزی بوو ئیشتیبای جی بەجێ تۆبەی دەکرد ئەو لای خودای (٣٤١٤)

چونکەئەسڵی بوو خەتای ئەو ئیبلیس ڕێی نەبوو ئەو بچتەلای تۆبەی نەفیس (٣٤١٥)

تۆ نەجاتت بوو لەخۆت هەم خوویی بەد هەم لەشوعلەی ئاگرو دەندانی دەد (٣٤١٦)

ئێستەئیقباڵت ئەتۆ بۆ هاتەدی هاتەدەستت بەختی باشی سەر مەدی (٣٤١٧)

هاتەدەستت(ادخلی) تۆ (فی عباد) (ادخلی فی جنتی ) تۆی کرد شاد (٣٤١٨)

چوویەنێو بەندانی باشی خوای جیهان بۆ بەهەشتی جاویدان چووی تۆ، نیهان (٣٤١٩)

(اهدنا) ت کوت جا، (صراط المستقیم ) دەستی تۆی گرتو، ئەتۆی برد تا نەعیم (٣٤٢٠)

تۆ کەنار بووی،بوویەنوور،ئەی نا زەنین قۆرەبووی ئێستا ترێی، وەک ئەنگەبین (٣٤٢١)

بووی بەتاو، ئەستێرەبووی تۆ، ئەی جەناب شاد ببە، بەس خوا دەزانێتن سەواب (٣٤٢٢)

ئەی زیائەلحەق حیسامەددینی میر شەهدی خۆت بڕژێنەتۆ نێو حەو زی شیر (٣٤٢٣)

تانەگۆڕێ تامی ئەو شیر قەت چ کات تا لەدەریای تام، مەزان تەکسیر بکات (٣٤٢٤)

خۆی کەبەودەریای ئەلەست واسڵ بکات چونکەبۆدەریا لەگۆڕان بووی نەجات (٣٤٢٥)

گەرکو ڕێگای کەوتەنێو دەریای عەسەل تازەناگۆڕێت ئەو،قەت هیچ عەمەل (٣٤٢٦)

نارەتەت بێ چەشنی شێر ئەی شێری حەق نارەتەت بڕوا هەتا حەو تەم تەبەق (٣٤٢٧)

بێ خەبەرلەو نارەتە،گیانی مەلوول کوا دەناسێ دەنگی شێر، مشکی زەلوول؟ (٣٤٢٨)

تۆ بنووسەحاڵی خۆت ئەی خۆش بەیان بۆ هەموو گەو هەر نیژاد و پاکد لان (٣٤٢٩)

ئاوی نیلەئەو وتارە، خۆش وجوان بیکەخوێن ئەی حەق بەچاوی قیبتییان (٣٤٣٠)

**ئیلتیماس کردنی قیبتی لەسیبتی کەبەقەست و نییەتی خۆت گۆزەیەک لەئاوی نیل پڕ کەو لەسەرلێوی منی دانێ بەخاتری ڕەفاقەت و دۆستایەتیمان، چونکەگۆزەیەکی کەئێوەسیبتییان لەنیل پڕی د ە کەن ئاوی سافەوگۆزەیەکی کەئێمەقیبتییان پڕی دە کەین خوێنی سافە.. دەو داستانەدا موراد لەقیبتی کەسێکەکەویجدانی وەخەبەر دێ و**

**دەمەرتەبەی ئیبتیدائی وپائینی تالیبی حەق قەرار دەگرێ و موراد لەسیبتی مورشیدێکی سادق و وەلیەکی فازلەکەدەستی وی دەگرێ ورێنموونی دەکا ..**

قیبتییەک چۆ ماڵی یەک سیبتی چەلێک　　تاکو ئاو وەخوات، تینوو بوو گەلێک (٣٤٣١)
پێیدەکوت من دۆست و یاری تۆمەخۆ　　ئێستەبێ حەد من نیاز مەندم بەتۆ (٣٤٣٢)
چونکەمووسا کردی یەک جادو وەفسوون　　بوو بەخوێن بۆ ئێمەئاوی نیل، پتوون (٣٤٣٣)
ئاوی ساف و خۆش دەخۆن لەو، سیبتییان　　ئەو بەجادوو خوێن دەبێ بۆ قیبتییان (٣٤٣٤)
قیبتیان دەمرن لەتینوان چون ئەوان　　بەد نیهادن یانەبەد بەختن،کە، وان (٣٤٣٥)
زەرفەکی بۆخۆت لەئاو پڕکەئەتۆ　　تاکو بیخوا بیدەیاری کۆنی خۆ (٣٤٣٦)
پڕکەزەرفێک لەو لەبۆخۆت بم دەرێ　　چون لەتینوان وەختەگیانی من دەرێ (٣٤٣٧)
من توفەیلی تۆم لەدووی تۆ ئاو دەخۆم　　من بەیاریت، دوور دەکەم دەردان لەخۆم (٣٤٣٨)
پێیکوت ئەی یاری عەزیزم گیانەکەم　　چۆن دەبێ من ئەمری تۆ ئیجرا نەکەم (٣٤٣٩)
شادمانم ئەمری تۆ ئیجرادەکەم　　هەرچلۆن فەرمان بدەی من وا دەکەم (٣٤٤٠)
پڕلەئاوی چۆمی نیلی کرد جام　　نیوەکی لەو خواردەوە، ئەو، نەک تەمام (٣٤٤١)
نیوەکەی دی هات بدا بەو کۆنەیار　　تاکو بیخوا، بوو بەخوێنێک تار تار (٣٤٤٢)
بووبەئاوخوێن گەرووەلای خۆی کردخوار　　تووڕەبووقیبتی خەمی خوارد چەشنی مار (٣٤٤٣)
ما وەیەک ما تا نەما هیچ خەشمی وی　　وایدەکوت پاشان بەیاری دڵ قەوی (٣٤٤٤)
چاری ئەو دەردەم چییەئەی• ڕاست کار؟　　پێیدەکوت دەیخوا فەقەت پەرهیزکار (٣٤٤٥)
شەخسی پەرهیزکار دیارە وایە ئەو　　لادەنێ فیرعەون، وەک مووسایەئەو (٣٤٤٦)
یار بە،بۆ مووسا وەخۆی لەو ئاوەتا　　یار بە، بۆ مانگ، مانگەشەو بڕوانەجا (٣٤٤٧)
خەشم وکینەی تۆلەبەندەی کردگار　　چای دەکرد زوڵمەت لەچاوت،سەت هەزار (٣٤٤٨)
کینەلابەچاو هەڵێنە،شاد بە　　چەشنی یارانت ئەتۆش ئوستاد بە (٣٤٤٩)
کوا وەکوو من هەڵدەکێشی ئاوی ساف؟　　تۆکەکفریکت هەیەوەک کێوی قاف (٣٤٥٠)
قەت کونی دەرزی لەوی کێو ناچتەدەر　　کێو بیێتەداوەکی باریک مەگەر (٣٤٥١)
بیکەکا،کێو،تۆ، بەئیستیغفارو خۆش　　جامی مەغفووران بگرە، بیکەنۆش (٣٤٥٢)
تۆ، بەتەزویر، نا وەخۆی، لەو ئاو، چ ئان　　چون حەرامی کرد حەق بۆ کافران (٣٤٥٣)
ئەو کەسەی کەمەکرو فێڵی کرد ساز　　ناکرێ قەت مەکری تۆ ئەی فێڵەباز (٣٤٥٤)
یار بە، بۆ موو سا، لەفێڵان لادەخۆ　　چونکەنادەن مەکرو فێڵان سوود بەتۆ (٣٤٥٥)

ئاو، وەلا نانێت ئەمری خوای جیهان — هیچ دەمێک نابێتەئاو بۆ کافران (٣٤٥٦)
وامەزانەتۆکەئێستا نان دەخۆی — بەڵکەژەهری مارو زیددی گیان دەخۆی (٣٤٥٧)
کوا دەکا ئیسلاحی گیانی واله، نان؟ — وەر بگێڕێ ڕوو لەئەمری خوای جیهان (٣٤٥٨)
یانەپێت وایەکەمانای مەسنەوی — دیتەدەس بێ ڕەنج کەبخوێنی ئەوی (٣٤٥٩)
یانەڕازو حیکمەتی وی هەم وتار — سەهل و سادەدێن، لەبۆ نێوگوێ وزار (٣٤٦٠)
دیتەگوێ ئەممابەچەشنی داستان — دیتەبەرچاو پێست فەقەت،نەک مەغزی دان (٣٤٦١)
ئەو سەرو ڕووی ناوەژێر یەک چادرێ — ڕووی دەکرد پنهان لەچاوت دڵبەرێ (٣٤٦٢)
وەک کەلیلەو شاهنامەو داستان — وایەقورئانیش لەلای گومرای نەزان (٣٤٦٣)
ئەو دەممەمەعلووم دەبێ حەقق و مەجاز — گەر کلی لوتفی خودا چاو کات واز (٣٤٦٤)
عەتروکشپەڵ لای نەداری بۆن، دەنا — وەک یەکن، چون بۆن لەلای وی چۆ فەنا (٣٤٦٥)
دەیهەوێ ئەو دوور لەخۆ کاتن مەلال — بۆیەدەخوێنێ کەلامی زولجەلال (٣٤٦٦)
تاکو ناری وەسوەسە بێنێت ئەو — بەو وتانە دابمرکێنێت ئەو (٣٤٦٧)
بۆ خەمووشی ناری وا چووک و نەچیز — هیچ نییەخۆ فەرقی،ئاوی پاک و میز (٣٤٦٨)
ناری وەسواس ئاوومیز دەیکەن خەمۆش — وەک لەخەو ئینسان کەنای مێنێ چ هۆش (٣٤٦٩)
گەر خەبەر دار بی و بزانی تۆ بەڵام — گفتی زاتی پاکی خوایەئەو کەلام (٣٤٧٠)
وەسوەسەی دڵ لادەچێ زۆرو کەمی — دیتەدەس دڵ، ڕێی گوڵستان ئەو دەمی (٣٤٧١)
چون لەباغ وجۆیبار پەروازدەکا — لەو کەلام هەرکەس کەبۆنی ڕاز دەکا (٣٤٧٢)
یانەپێت وایەکەڕووی پاکان چلۆن — بوولەواقیع، هەر وەهاش مەعلوومەبۆن (٣٤٧٣)
زۆر عەجەب مابوو ڕەسوولی خوای موبین — بۆچی نابینن ئەدی ڕووم، موئمینین؟ (٣٤٧٤)
بۆچی نابینن ئەدی ڕووی من عمووم؟ — ڕوونتری کرد خۆ لەڕۆژ ئەو خوایەڕووم (٣٤٧٥)
گەر دەبینن بۆ چی سەرسام مام ئەدی — تا لەلای حەق هات کەکەس ڕووی تۆی نەدی (٣٤٧٦)
ڕووت لەلای خۆ ت مانگەلای خەڵکیش هەور — تا نەبینن موفتەڕووی تۆ ئەهلی جەور (٣٤٧٧)
دانەلای تۆ، داوەلای خەڵکی بەڵام — تا نەنۆشن لەو شەڕابی خا س، عەوام (٣٤٧٨)
وایدەکوت یەزدان (تراهم ینظرون ) — نەقشی حەممامن ئەوان ( لایبصرون ) (٣٤٧٩)
لای کەسێکی موعتەبەر هەر زاهیرە — چاوی مردووی نەقشی دیوار، نازیرە (٣٤٨٠)
جا لەلەلای نەقشان دەدا ئەنجام ئەدەب — بۆ ئەدی لێم بێ خەبەر مان ئەی عەجەب؟ (٣٤٨١)
بۆچی نەقشی والەجوانو ڕێک وپێک — قەت چ ناڵێ بۆ سەلامی من، (عەلێک؟) (٣٤٨٢)

هیچ تەکان نادا سەر و سمبێڵ بەجوود ... گەر چی کردم من لەبۆ وی سەت سجوود (٣٤٨٣)
حەق بەزاهیرگەر چی سەر نادا تەکان ... ئەو دەدا لوتفی لەباتین دا نیشان (٣٤٨٤)
چاکترەئەوخۆ،لەدوو سەت سەرتەکان ... وادەدەن ئاخرتەکان سەر،عەقڵ وگیان (٣٤٨٥)
گەر لەبۆخزمەت بەعاقڵ کەی تەلاش ... پێت دەدا نیشان بەپاداش ڕێی باش (٣٤٨٦)
حەق بەزاهیر گەرچی سەر نادا تەکان ... ئەوبەڵام دەت کاتەسەروەر بۆ سەران (٣٤٨٧)
پێت دەدا یەک شت خوداوەند زۆر نیهان ... جا دەکەن تەعزیم لەبۆت خەڵکی جیهان (٣٤٨٨)
وەک بەبەردێک دای هونەر، وا،خوای غەفوور ... بۆ عەزیزی عام، یانی زێڕی سوور (٣٤٨٩)
قەترەئاوێک لوتفی خوای گەر لا دەبێ ... زۆر لەزێڕ چاتر، لەو ی دوڕ چادەبێ (٣٤٩٠)
تەن کەخاکە،گەربەوی دانوورغەفوور ... چەشنی مانگ دەگرێ هەمووعالەم بەنوور (٣٤٩١)
وەک تەلەسم و نەقشی بێ گیان بوو جیهان ... بۆیەدەخواتن فریو، شەخسی نەزان (٣٤٩٢)
دێنەبەرچاوان ئەوان وەک گیان لەبەر ... بوون ئەوان لای ئەحمەقان زۆرموعتەبەر (٣٤٩٣)

**داوا کردنی قیبتی دوعای خێر لەسیبتی ودوعای بەخێر کردنی سیبتی لەبۆ قیبتی وقەبووڵ بوونی ئەو دوعایەلەلایەن ( اکرم الاکرمین و ارحم الراحمین )..**

قیبتی داوای کرد دوعا، لەو کۆنەیار ... دڵ ڕەشم من بۆ دوعای وا، نیمەزار (٣٤٩٤)
بەڵکەئەو قفڵەی دڵم بکرێتەوە ... پیس لەنێو پاکان جێگای بێتەوە (٣٤٩٥)
تۆ سەبەب بی جوان بێ مەمسووخی پیس ... یا لەحەق نیزیک ببێتن یەک بلیس (٣٤٩٦)
یا بەدەستی پاکی مەریەم هاتەبەر ... یەک لکی ئیشک وڕەقوتەق، وەک حەجەر (٣٤٩٧)
کەوتەسەجدە،سیبتی دەیکوت ئەو زەمان ... ئەی خودای زانا بەئاشکارو نیهان (٣٤٩٨)
غەیری تۆلای کێ هەڵێنێ بەندەدەس؟ ... هەم ئیجابەت هەم دوعا دەس تۆنە، بەس (٣٤٩٩)
تۆ لەئەووەڵ ڕا، دەدەی مەیلی دوعا ... بۆ دوعا ئاخیر دەدەی بەس تۆ، جەزا (٣٥٠٠)
ئەووەڵ و ئاخیر ئەتۆی لەو بەینەدا ... ئێمەهیچ نین هیچ بەیان، نانکا ئەدا (٣٥٠١)
ئەو دەمەی سیبتی کەدەیکوت وا،وتار ... چوو لەهۆش ئەو،جا لەجێی خۆی کەوتەخوار (٣٥٠٢)
هات وەهۆش دەیکرد دوعا ئەوشەخسی باش ... هیچ لەبۆ ئینسان نییەغەیری تەلاش (٣٥٠٣)
ئەو دەمەی سیبتی دوعای وا کرد ئەدا ... نارەتێکی توندی قیبتی لێدەدا (٣٥٠٤)
بێنەلام، ئیمان ئەتۆ بت بێ پەلە ... لادەنێم زوونناری کۆن من ئەو چەلە (٣٥٠٥)
ئاگری ئیمان لەدڵیان بەر دەوام ... مەڕ حەمەتیان کرد دەگەڵ دێوی نەفام (٣٥٠٦)
دۆستاییت هات نەجاتی دا ئەمن ... ئینتیزارم هەر وەهابوو جا، ئەمن (٣٥٠٧)

کیمیا بوو سوحبەتی، بۆ منی هەژار    لوتفی تۆ یاخوا لەبۆم بێ، پایەدار (٣٥٠٨)
تۆ لکێکی داری جەننەت بووی یەقین    بەوکەگرتم چووم هەتا خولدی بەرین (٣٥٠٩)
هات سێلاو لێی ڕفاندم ئەو وجوود    بردمی جا، تاکو لێوی بەحری جوود (٣٥١٠)
چوومەلای سێلاو بەبۆنەی ئاو، بەغار    دیم یەم و گرتم لەوی دوڕ، سەت هەزار (٣٥١١)
جامەکی پڕ ئاوی بۆ هینا، کە، ها    پێیدەکوت ئێستاکە، ئاو لام کەم بەها (٣٥١٢)
خوا بەیەک شەربەت کەگیانی لێ کڕیم    بۆ ئەبەد ئەوتونیەتی لەدڵی سڕیم (٣٥١٣)
ئەو کەسەی دای ئاوبەجۆگەوکانیان    ئەو لەقەلبم کانیاوی کرد ڕەوان (٣٥١٤)
من کەجەرگم زۆر بەتین بوو ئاو خوواز    ئێستەنیتی هیچ بەئاوی خۆش نیاز (٣٥١٥)
کافییەئەو کافی وی بۆ گشت عیباد    ڕاستەوەعدەی(کاف ها،یا، عەین،صاد ) (٣٥١٦)
من لەبۆت کافیمەخۆ بۆ گشت خەیر    بێ وەسیلەو واسیتەو کۆمەک لەغەیر (٣٥١٧)
قادرم تێرت بکەم من، بێ چ نان    بێ سوپا، بت کەم بەیەک میری جیهان (٣٥١٨)
بێ بەهار پێت نەرگس و نەسرین بدەم    بێ موعەللیم، بێ کیتاب، تەڵقین بدەم (٣٥١٩)
بێ دەوا کافیم، کەتۆ دەرمان بکەم    قەبرو چاڵانیش لەبۆت مەیدان بکەم (٣٥٢٠)
دڵ بەمووسا دەم عەسا بگرێتەدەست    تا بەوی کا، زاڵمان زۆر خوار و پەست (٣٥٢١)
دەستی مووسا وابکەم پڕنووری ڕوون    تاوی حاسمان بێ لەحاستی وی زەبوون (٣٥٢٢)
دار،بکەم تەبدیل بەمارێک حەوت سەر    قەت لەماری مێ بەنێر، نایێتەدەر (٣٥٢٣)
خوێن بەئاوی نیل تێکەڵ کوا دەکەم؟    عەینی ئاوەخۆم بەقودرەت وا دەکەم (٣٥٢٤)
شادمانیت غەم بکەم من چەشنی نیل    جا، لەبۆ شادی و سروور نەت بێ سەبیل (٣٥٢٥)
گەر کو بت وێ ئەوچەلەش تۆ باوەڕی    گەرلەفیرعەون نفرەتی خۆت دەربڕی (٣٥٢٦)
دێتەلات مووسایی ڕەحمەت، زۆر بەتاو    نیلی خوێنیش تۆ دەبینی بوو بەئاو (٣٥٢٧)
گەر لەدڵدا باوەڕیت بێ پایەدار    نیلی زەوقت نابێ بەخوێن، قەت چ جار (٣٥٢٨)
دەمهەویست ئیمان بکەم من یاری خۆم    تاکو لەو تووفانی خوێن ئاوێ وەخۆم (٣٥٢٩)
نەو دەزانی حەق کەوا تەبدیل دەکا    باتنی من ئەو دەگۆڕێ نیل دەکا (٣٥٣٠)
خۆم وەکوونیلی ڕەوان ئێستا کەدی    بەر قەرار و سابیتم لای ئیدەدی (٣٥٣١)
بێ سەداو ساکیت لەلامان بەردو دار    لای نەبی تەسبیح دەکەن بێ لێوو، زار (٣٥٣٢)
ئەو جیهانەلای نەبی پڕ عیشق و داد    لای کەسانی دیکە، بێ ڕووحەو جەماد (٣٥٣٣)
ئەو دەبینێ توند دەڕۆن باڵاو نەوی    چاک لەسند و خشت دەبیسێ گوێی وی (٣٥٣٤)

لای عەوام دونیا هەموو، بێ ڕووح وگیان  لەوعەجیبتر نەم دی پەردەهیچ زەمان (٣٥٣٥)
ئێمەلامان وەک یەکن گۆڕ گشتییان  ڕەوزە، یاحوفرە، بەچاوی ئەو لییان (٣٥٣٦)
ترش و گرژە،ڕووی نەبی لایان عەوام  چونکەنایوێت، بێت شادی، بەر دەوام (٣٥٣٧)
خاسسەکوتیان چاوی ئێوە، وای دەدی  ترش و گرژەڕوویی شادی ئەحمەدی (٣٥٣٨)
چاو بەچاوی مە، لەوی کەن ئێوەتا  زۆر ببینن پێکەنین نێو ( هل اتی ) (٣٥٣٩)
تۆ لەسەر ئەو دارەهەرمێ، بێرەخوار  چون دەبێ سوورەت سەروو بن ئاشکار (٣٥٤٠)
دارەهەرمێ داری خود خواهی وغروور  تا لەسەر وی بی، دەبینی تار، نوور (٣٥٤١)
تا لەسەروی بی، دەبینی خارزار  پڕ لەدووپشکی بەژار و پڕ لەمار (٣٥٤٢)
تۆ دەبینی گەر لەسەروی بێیەخوار  دایەن و جوانی وەکوو گوڵ، بێ ژمار (٣٥٤٣)

**داستانی ئەو ژنە خەرابکارەکە بە مێردەکەی کوت ٠کە ئەو خەیاڵاتانە لە سەر دار هەرمێ دەبینی کە مەعموولەن لەسەر ئەو دارە هەرمێیە چاوی هەموو کەس وا دەبینێ، لەو دارە هەرمێیە وەرە خوار تاکو ئەو خەیاڵاتانە لەبەین بچن، و ئەگەر کەسێک بڵێ کە ئەوەی ئەو کابرایە دیتی خەیاڵ نەبوو، جواب دەدرێتەوە کە ئەوە میسالە نەمیسل، دەمیسال دا ئەوەندە کافییە کە بکوترێ ئەگەر نەچووبایەسەر دارە هەرمێ قەت وات نەدەدی جا خەیاڵ بێ یا حەقیقەت ..**

**خولاسەی داستان ...**

ژنێکی خەرابکار دەی ویست کەلەپێش چاوی مێردی گێژو نەفامی خۆی لەگەڵ پیاوێکی فاسق عەمەلێکی ناحەز ئەنجام بدا.. بەو خاترەبەمێردەکەی کوت دەچمە سەر ئەو دارەهەرمێیەتا میوەلێوەکەم کاتێ کەچۆ سەدار بەگریان بانگی مێردەکەی خۆی کرد کەئەی خەرابکار ئەو لۆتیەبەدکارەکێیەکەسواری تۆ بووە؟ مێردەکەی پێیکوت کەئەی ژن لێرەداغەیری من وتۆ هیچ کەس نییەبۆ قسەی بیهوودەدەڵەی؟ژن کوتی ئەدی ئەو پیاوی کڵاو بەسەر کێیە؟ کەلەسەر پشتی تۆ درێژ بووە.. مێردەکەی کەزۆر پەرێشان و موتەحەییربووپێیکوت ئەی ژن ڕەنگەبڵێندایی دار باعیس بوو بێ کەسەرت گێژبووەو دەسوورێ و بەوەهم و خەیاڵ هێندێک شتان دەبینی،پاش چەند لەحزەیەک ژن لەسەردار هاتەخوار ومێردەکەی چۆ سەردار، لەو کاتەدا ئەوژۆنەلەگەڵ پیاوێک کەلەنێوگیاوگۆڵ ولکی داران خۆی مات کردبوو مەشغووڵی کاری ناحەزونا مەشڕووع بوو،مێردەکەی لەسەردار ئەو سەحنەناحەزەی دی وبانگی کرد کەئەی ژن

ئەو پیاوەکێیە؟ کەلەگەڵ تۆ مەشغووڵی کاری ناحەزە؟ ژن پێیکوت کەقسەی بێهوودەمەڵی، غەیری من و تۆ هیچ کەس لێرەنییەحەتمەن بڵیندایی دار بۆتەباعیس کەچاوت ڕەشکەو پێشکە بکا و خەیاڵات بۆ تۆ دروست بکا، لەو سەرەوەرەخوار تا بزانی کەهیچ کەس لێرەنییە، تاکو ئەو لەسەر دار هاتەخوار ئەو پیاوەفاسقەلەخوابێ خەبەر ەی لەنێو دارو دەوەنوگیاو گۆڵ دا شاردەوە و ئەو وەختەژنەکەبەمێردەکەی کوت ..پێم نەکوتی لەدار هەرمێ وەرەخوار تا بزانی کەخەیاڵ و گومانت خەتایە؟ ..

دەیهەویست یەک ژن لەلای شووی گێژو وێژ بێ لەگەڵ یەک پیاوی زۆربەدکاردرێژ (٣٥٤٤)
جا بەشووی خۆی ژن دەکوت ئەی خۆشبەخت لێوەکەم تا میوە، دەچمەسەر درەخت (٣٥٤٥)
هەر کەچۆ سەردار ئەوژن زۆر گری گەر لەوێڕای کرد تەماشای هاو سەری (٣٥٤٦)
جا بەشووی خۆی کوت کەئەی بەدکاری گێژ کێیەئەوهەی بوولەسەرپشتت درێژ؟ (٣٥٤٧)
تۆ لەژێر وی دا،درێژبووی وەک ژنان تۆ کەخوێڕی بووی لەئەووەڵ،ئەی فلان (٣٥٤٨)
شوو،کوتی سووڕا سەرت وای تۆ، دەنا من بەتەنها لێرەمە، بێ هیچ پەنا (٣٥٤٩)
زۆرکەڕەت وای بانگی شووی خۆی کرد ژن کێیەوا؟ من ئەو دەبینم تۆی لەبن (٣٥٥٠)
دەیکوت ئەی ژن بێرەخوار لای پیاوی خۆ چون سەرت سووڕاوەزۆر،خەرفاوی تۆ (٣٥٥١)
ژن کەهاتەخوار،شوو چۆ سەردرەخت ژن حەریفی خۆی لەباوەش کرد سەخت (٣٥٥٢)
شوو کوتی کێیە؟ بڵێ ئەی نابەکار چەشنی مەیموونەو لەتۆ بوو ئەو سووار (٣٥٥٣)
ژن کوتی خۆ غەیری من کەس دیارنییە تۆ سەرت سووڕا دەنا، دەبیارنییە (٣٥٥٤)
زۆر کەڕەت شوو هەروەها کردی سەدای ژن کوتی تەقسیرلەدار هەرمێیەوای (٣٥٥٥)
تا لەسەرئەودارەبووم هەروا منیش هەر بەخوار دەمدی هەچی ڕاس با منیش (٣٥٥٦)
بێرەخوار بنوارەنابینی چ کەس ئەو خەیاڵانەلەدار هەرمێنەبەس (٣٥٥٧)
هەزل وشۆخیت تۆکەبیست چاک گوێ دەیە چون لەوان دا پەندوتەعلیم زۆرهەیە (٣٥٥٨)
هازیلان پەندیان لەلا شۆخی دەبوو عاقڵان شۆخیا ن لەلا جید بوو هەموو (٣٥٥٩)
دارەهەرمێ تالبی وین غافڵان زۆر جودا لەو دارەهەرمێی عاقڵان (٣٥٦٠)
تۆ لەسەر ئەو دارەهەرمێ بێرەخوار مای لەدوور حەیران ومات و چاو تار (٣٥٦١)
دارەهەرمێ یانی خود خواهی و غروور هەرچی چۆ سەروی لەڕاستی بوو بە دوور (٣٥٦٢)
گەر لەسەر ئەودارەهەرمێ، بێیەخوار فیکروچاوو گفتی تۆ نا بێت خوار (٣٥٦٣)
ئەو دەبێتەداری بەختت ئەو زەمان گشت لکی وی دەچنەحەوتەم ئاسمان (٣٥٦٤)

گەرلەوی تۆ بێیەخوارلەوبی بەدوور     ئەودەگۆڕێتن بەڕەحمەت، خوای غەفوور (٣٥٦٥)
گەرلەداری خود پەسەندی بێیەخوار     چاوی ڕاس بینت دەداتێ کردگار (٣٥٦٦)
ڕاست بینی گەرکو سەهل وسادەبا     چۆن لەحەق داوای دەکرد ئەو، موستەفا (٣٥٦٧)
دەیکوت ئەی حەق یەک بەیەک ئەعزای جیهان     پێم نیشان دەهەرچلۆنێک هەن ئەوان (٣٥٦٨)
جا وەسەر ئەو دارەهەرمێیەی کەوە     چاو لەئەمری (کن) کەشینی کردەوە (٣٥٦٩)
گەربێی تۆ پەیڕەوی مووسایی توور     داری تۆش وەک داری مووسا پڕ لەنوور (٣٥٧٠)
سەوزو شین و جوان دەکا ئەو دارەنار     جا دەڵێ (انی انا اللّه) لک لەدار (٣٥٧١)
حاجەتت ژێر سێبەری وی دێتەدی     ئەو هەیەکیمیای ئیلاهی سەرمەدی (٣٥٧٢)
ئەو وجوودت بۆ دەبێ ئەو دەم ڕەوا     چون دەبینی تۆ لەوی وەسفی خووا (٣٥٧٣)
ڕاس دەبێ هەم حەق نوما،جا، داری خوار     لک لەئاسمان، ڕیشەنێو خاک ئیستیوار (٣٥٧٤)

## پاشماوەی داستانی مووسا علیەالسلام ..

هات لەحەق پەیغام لەبۆ وی زۆر موهیم     ئیعویجاج وخواری لابە(فاستقم) (٣٥٧٥)
ئەود ڕەختەی تەن،عەسای مووسایەهات     ئەمروفەرمان،بۆی فڕێ دە،تۆعەسات (٣٥٧٦)
تا لەویت تۆ دێتەبەرچاو باش و بەد     هەلگرەجا ئەو بەئەمری خوای سەمەد (٣٥٧٧)
پێش فڕێدان ئەونەبووهیچ غەیری دار     ڕات کەکرد،باش بوو، بەئەمری کردگار (٣٥٧٨)
ئەوگەڵای دەرژاند، هەوەڵ بۆبەرخ ومەڕ     بووبەموعجیزدوایەبۆمەغرووری کەڕ (٣٥٧٩)
بووبەحاکم بۆ هەموو فیرعەونییان     بوو بەخوێن ئاویان، لەسەر یان دا ئەوان (٣٥٨٠)
قەحت و مردنیان دەهات بۆ کشتزار     چونکەکوللەلێی دەخوارد گشت بەرگ وبار (٣٥٨١)
تا لەمووسا هات دوعا بێ ئیختییار     چونکەدەیدی چاک لەوان پایانی کار (٣٥٨٢)
بۆچییەئیعجازی وازۆرو تەلاش؟     ئەو گروو هەخۆ، چ کات نابن بەباش (٣٥٨٣)
هات لەحەق فەرمان بەدووی نووح دا بڕۆ     عاقیبەت بینی ڕەها کە، ئێستەتۆ (٣٥٨٤)
وا مەکەچون ئێستەتۆ یەک ڕەهنەمای     ئەمری ( بلغ ) پڕلەحیکمەت خوا لەلای (٣٥٨٥)
کەمترین حیکمەت ئەلەو،ئیسراڕی تۆ     سەرکەشی و زوڵمت دەبێ مەعلووم لەبۆ (٣٥٨٦)
تا کو ئیزلال و هودای خوای دوو جیهان     بۆ هەموودەستەو گرووهان بێ عەیان (٣٥٨٧)
چونکەبۆ ئیزهار چای کرد خوا جیهان     پەند و ئیغوا لازمن بۆ ئیمتیحان (٣٥٨٨)
ئیبلیس ئیغوایی خەڵکی بوو مەرام     شێخ مەرامی بوو هیدایەت کات عام (٣٥٨٩)

چون عەزابیان بۆ دەهات زۆر جوور بەجوور    ئاوی نیل بۆ وان دەبووبەخوێنێ سوور (٣٥٩٠)
تا کوهات فیرعەون تەنها زار زار    ئیلتیماسی کرد قەدی بوو خوار خوار (٣٥٩١)
من بەدیم کرد تۆ نەکەی ئەی شەهریار    من لەحاستی تۆمەبێ حەد شەرمەزار (٣٥٩٢)
من موتیعی تۆ دەبم کەمکەم بەڵام    سەخت و محکەم مەگرەلێم تۆ، چونکەشام (٣٥٩٣)
بێژەبۆمن تۆ لەڕەحمەت ئەی ئەمین    تا ببەسرێ زاری ناری زۆر بەتین (٣٥٩٤)
دەیکوت ئەی حەق مەکرو فێڵەوادەکا    فێڵ لەسەر فێڵبازی تۆ ئیجرادەکا (٣٥٩٥)
گوێی دەمێ یافێڵ بکەم من وەک ئەوی؟    تا عەیان بێتن حەقیقەت تەک ئەوی (٣٥٩٦)
مەکروفێڵ لای ئێمەنە، خۆئەسڵی وان    ئەسڵی هەرچی خاکییە، جێی ئاسمان (٣٥٩٧)
لات نەبێ ئەوسەگ عەزیز،بێیکوت غەفوور    باوێ بۆ سەگ دانەئێسکێک تۆلەدوور (٣٥٩٨)
ئەو عەسایەت تۆ تەکان دەتا زەوی    هەرچی کوللەخواردی بێتەدەر لەوی (٣٥٩٩)
ڕەش دەبن کوللەهەموو یان ئەو زەمان    تا ببێ تەبدیلی حەق بۆ عام عەیان (٣٦٠٠)
بێ نییازم من لەئەسباب و عیلەل    بۆ حیجاب موحتاج بەئەسباب بوون میلەل (٣٦٠١)
تا تەبیعی چاو لەدەرمان کات و بەس    تا مونەججیم چاو لەئاسمان کات و بەس (٣٦٠٢)
تا مونافیق بۆ تەماع زۆر زوو بەیان    تا نەبێ نابوود دەچێ بۆ لای دوکان (٣٦٠٣)
بەندەگی ناکەی،چکات ڕۆژو شەوێ    بووی بەلوقمەی دووزەخ و،لوقمەت دەوێ (٣٦٠٤)
ئاکیل و مەئکوول لەهەرچێکی ژیبا    چەشنی ئەو بەرخەی کەدەخواتن گیبا (٣٦٠٥)
گیا کەدەخوا بەرخ، قەسساب شادمان    بۆمەدەخوا گیا و گەڵا، ئەو بەرخەمان (٣٦٠٦)
تۆ لەخواردن چەشنی دوو زەخ کار دەکەی    تۆ لەبۆ وی خۆت وەها پەروار دەکەی (٣٦٠٧)
کاری خۆت ئەنجام بدە، حیکمەت بخۆ    تا دڵت زۆر زۆر قەوی بێ و با شکۆ (٣٦٠٨)
ئەکلی تەن مانیع لەئەکلی مەعنەوی    ڕووحەتاجیر،تەن وەکوو ڕێگر لەوی (٣٦٠٩)
شەمعی تاجیر ئەو دەمەزۆر جوان دەژی    گەر بسووتێ گیانی ڕێگر وەک ڕەژی (٣٦١٠)
تۆ فەقەت هۆشی تەنت بوو هۆش پۆش    قەت نەکا تۆکۆششی بێهوودەخۆش (٣٦١١)
چەشنی خەمروبەنگەهەرچی شەهوەتە    عەقڵو هۆشی چوو،هەچی چۆ ئەوخەتە (٣٦١٢)
خۆ، بەتەنها خەمرناکا مەست هۆش    هەرچی شەهوەت بێ دەبەستێ چاووگۆش (٣٦١٣)
زۆرلەشوربی خەمر،شەیتان بووبەدوور    مەست دەبووئەمما بەخودخواهی وغروور (٣٦١٤)
ئەوکەسەی سەرخۆشومەستودڵ ڕەشە    مس لەلای وی زێڕی سووری بێ غەشە (٣٦١٥)
ئەی کەلیم ئەو باسەنیتی ئینتیها    لێو تەکان دەتاکو شین بێتن گیبا (٣٦١٦)

تیبقی مەعموول دای تەکان لێو جا زەمین   شین دەبوو لەوسونبول و دانەی سەمین (٣٦١٧)

زۆرسەریع بۆلای غەزایان چوون ئەوان   زۆر لەمێژ بوو چونکەبرسی بوون ئەوان (٣٦١٨)

لەو عەتا بوون چەند ڕۆژێک بەهرەوەر   ئادەمی تێکرا دەگەڵ گشت جانەوەر (٣٦١٩)

هەرکەتێربوون وغەزایان کەوتەدەست   بێ نییازبوون،جا دەبوون تاغی ومەست (٣٦٢٠)

تێرمەکەنەفست کەوەک فیرعەونە، ئەو   بیرنەکاتن تا لەکفری کەونە، ئەو (٣٦٢١)

چاک کەنابێ نەفس بێ ئاگر چکات   کێ لەئاسن تا نەبێ پۆلوو دەدات؟ (٣٦٢٢)

بێ مەجاعەت کەس نەچۆ لای خوای لەسەر   ئاسنی ساردی کوتا وای کرد ئەگەر (٣٦٢٣)

گەر بناڵێ یا بکا گریان و شین   نایهەوێ ئەو قەت موسەڵمان بێ یەقین (٣٦٢٤)

ئەو وەکوو فیرعەونەقاتی گەرکو هات   زوو لەبۆ مووسا دەبێ تەسلیم و مات (٣٦٢٥)

بەنیازبێ ئەو دەبێ تاغی ئەگەر   جووتەداوێ گەرکو داینا بار کەر (٣٦٢٦)

هەرلەگەڵکو مەقسەدی بوودەستگیر   هەرچی دەرد ی بووی لەپێش دا،چوولەبیر (٣٦٢٧)

یەک نەفەر زۆرما لەشارێک دوایەئەو   لەحزەیەک گەرچاوەکانی چوونەخەو (٣٦٢٨)

خۆی لەشارێ دی دەبینێ زێدەشاد   شاری ئەسڵی خۆی دەچێ ئەو دەم لەیاد (٣٦٢٩)

قەت کەناڵێ جێم ئەوێ بوو، ئێرەبۆم   جێی مووققەت بوو، دەبێ هەر لێی بڕۆم (٣٦٣٠)

وادەزانێ مەوتەنی خۆی بوو ئەوێ   ئەو لەگشت شاری دەدی خۆشتر دەوێ (٣٦٣١)

زۆرعەجەب ڕووح مەوتەن ومەئوایی خۆی   جێی وەلادەت، جێگە بۆ سوکنایی خۆی (٣٦٣٢)

چوولەیادچون ئەوجیهانەی چەشنی خەو   دادەپۆشێ وەک هەور نەجمان بەشەو (٣٦٣٣)

بیلخسووس زۆر شاری بن پێ ناوەڕووح   هێستەتۆزی زۆر لەسەر فام ماوەڕووح (٣٦٣٤)

ئادەمی ناکا تەلاش لا با غوبار   تا ببینێ دڵ، حەقیقەت ئاشکار (٣٦٣٥)

دەر بخا دڵ سەر لەنێو ئەسراڕو ڕاز   جا ببینێ ڕازو ئەسراڕ چاوی واز (٣٦٣٦)

## مەڕاحیلی خیلقەتی ئینسان ..

**ڕووح هەوەڵ جار هاتەئیقلیمی جەماد**   **هاتە مەحدوودەی نەبات ئەو، دوایە شاد** (٣٦٣٧)

ماوەیەک زۆر،نێو نەبات ئەو ماوە، شاد   چوولەبیری ئەودەمەی خۆی بووجەماد (٣٦٣٨)

گەر نەباتی هێشت و نێو حەیوان دەهات   نەیدەکرد هیچ یادی دەورانی نەبات (٣٦٣٩)

غەیری مەیلی وی بەگوڵ هەم سەوزەزار   بیلخسووس ئەودەم کەدێ فەسڵی بەهار (٣٦٤٠)

وەک مناڵ دایکی دەوێ ڕۆژو شەوێ   نەی دەزانی لێوی بۆ مەمکی دەوێ (٣٦٤١)

یا کەسێکی تازەگی هات بۆ مورید — ئەو بەپیر هەیتی عەلاقەی زۆر شەدید (٣٦٤٢)
چون لەسایەی پیری خۆی ئەو موبتەدی — شارەزابوو، ڕێی دەدی، بۆ موهتەدی (٣٦٤٣)
هەرلەوێ ڕا هات کەماڵاتی لەبۆ — جا دەزانێ ڕازی مەیلی جستو جۆ (٣٦٤٤)
چۆن مورید دەی بێ کەماڵات دەستگیر؟ — گەرنەکاتن ڕەهنەما ئەو،شەخسی پیر (٣٦٤٥)
ئەو چەلەش ئەوخالقی زانای لەسەر — ڕووح لەحەیوان ڕادەکێشێ بۆ بەشەر (٣٦٤٦)
هەر وەها ئیقلیم بەئیقلیم ڕۆیی ڕووح — تاکو بۆ زانیار و عاقڵ، پڕ فتووح (٣٦٤٧)
چوو لەیادی وی عقوولی ئەووەڵین — عەقڵی ئێستاشی دەگۆڕێتن یەقین (٣٦٤٨)
تاکو لەو عەقڵی حەریس بی بێ نەجات — سەت هەزار عەقڵی عەجیب ڕوو لەو دەکات (٣٦٤٩)
گەر فەرامۆشکارەئەو، هەم چۆ دەخەو — نایەڵن هەر بێ فەرامۆشکار ئەو (٣٦٥٠)
لەو خەوەی وشیار دەبێ ڕۆژێک یەقین — دێ بەحاڵی بووی لەپێش دا، پێکەنین (٣٦٥١)
بۆ لەخەو دا هێندەخواردم غەم بەلاش؟ — بۆ فەرامۆشم دەکرد ئەحواڵی باش؟ (٣٦٥٢)
بۆچی نەمزانی کەئەو دەردو غەمە؟ — خەونە، وەهمە، هەر خەیاڵە، من .هەمە (٣٦٥٣)
هەر وەکوو دونیا کەخەونی نائیمە — وا دەزانێ خەوتو، خەونی دائیمە (٣٦٥٤)
تا لەناکاو مەرگ ڕووی خۆی دەر دەخات — ئەو دەمی دەی بێ لەمەکرو فێڵ نەجات (٣٦٥٥)
پێکەنینی دێ کەبۆ هێندەغەمی — خوارد، کەدیتی جێی و مەکانی دائیمی (٣٦٥٦)
هەرچی دیتت تۆ لەخەو، باش یاخەراو — ڕۆژی مەحشەر تۆ دەبینی ئەو بەچاو (٣٦٥٧)
دەو خەوەی دونیا هەچی ئەنجام درا — ڕۆژی مەحشەر گشت دەبێتن ئاشکرا (٣٦٥٨)
وا مەزانەتۆ کەکردت کاری بەد — لەو خەوەی دا، ناکرێ تەعبیر ئەبەد (٣٦٥٩)
شیوەنی تەعبیرەهەم زاری و زەفیر — پێکەنینی شەخسی زاڵم سەرئەسیر (٣٦٦٠)
شیوەن و دەرد و غەم و گریان و شین — وەختی بێداری دەبێتە پێکەنین (٣٦٦١)
تۆ کەهەڵدەدڕێنی پێستی یوو سفان — گورگی تۆ، پاش ئەو خەوەی بێ حەد گران (٣٦٦٢)
دەبنە گورگی هار هەموویان خوویی تۆ — دێن و دەدڕن لێت، لەبێ تا ڕوویی تۆ (٣٦٦٣)
پاشی مەرگیش خوێن هەر هەیتی قیساس — جا مەڵێ تۆ، مردم و من بووم خەڵاس (٣٦٦٤)
ئەو قیساسەی دونیەوی کارسازییە — ئەو لەحاس ئی ئاخیرەت یەک بازییە (٣٦٦٥)
خوا جیهانی کرد بە بازیچە، بەیان — چون جەزای وی لەعبە ،لای ئی ئەو جیهان (٣٦٦٦)
لێرە کەیفەر بۆ نەمانی فیتنەیە — لەو جیهان ئیخسایە، لێرەش خەتنەیە (٣٦٦٧)

**بەیانی ئەو مەتڵەبەکەخەڵکی دوو زەخ برسین وبەناڵین لەخوا داوا دەکەن کەڕزقی ئێمەقەڵەو بکەو بەئێمەی بدە،کەسەبرو حەوسەڵەمان نەماوە..**

ئەو وتارە دوایی نایە ئەی کیبا — ئەی کەلیم وێڵ کەکەران بۆ نێو گیبا (٣٦٦٨)
تاکوبەوگیای خۆش، قەڵەو بن گشت ئەوان — ئێمەزۆرمان لایەگورگی بێ ئەمان (٣٦٦٩)
دێتەگوێمان لوورەلەوگورگانی خۆن — لوقمەبۆ وان، ئەو کەرانەن تا بخۆن (٣٦٧٠)
ئەو کەرانەی ویست کیمیای خۆش دەمی — لەو دوو لێوی تۆ، بیبان کا ئا دەمی (٣٦٧١)
تۆ بەلوتفت بووی لەبۆ وان ڕێنموون — ئەو کەران تالیب بەڕێگای حەق نەبوون (٣٦٧٢)
جا بەوان دادەئەتۆ لێفەی نەعیم — تا خەوی غەفڵەت لەبۆ وان بێ عەمیم (٣٦٧٣)
لەوخەوەتاکو ئەگەر هەستان ئەوان — شەم نەما،ساقی نەما،سەرگەشتەمان (٣٦٧٤)
تۆ لەنافەرمانی وا ن سەرسام دەمای — بوو بەپاداشیان بنۆشن ئاخ و وای (٣٦٧٥)
تاکوعەدڵی ئێمەگەرکردی زهوور — بەد نیهاد دەکرێ موجازات بێ قسوور (٣٦٧٦)
ئەو شەهەنشاهەی نەیان دی قەت ئەوان — بوولەگەڵیان دائیمەن ئەمما نیهان (٣٦٧٧)
هەر وەکوو عەقڵەکەحاکم بەر تەنە — ئەو بەڵام لای گشتی چاوی سەر ونە (٣٦٧٨)
ئەو دەبینێ چاک کەبت کا ئازموون — هەم گەڕانت، هەم قیامت، هەم سکوون (٣٦٧٩)
خالقی عەقڵی دەبێ بۆ وا نەبێ؟ — ئەو وەکوو عەقڵی لەنێو تەن، جا نەبێ (٣٦٨٠)
یەک دەبێ غافڵ لەعەقڵ وبەد دەکا — عەقڵی وی ئەوسەرزەنیش بێ حەد دەکا (٣٦٨١)
تۆ لەعەقڵت غافڵ و عەقڵت بەڵام — نێو تەنت حازر کەدەت کاتێ مەلام (٣٦٨٢)
گەرکو غافڵ بایەنەی با ئەو حزوور — بۆبەلۆمەڕووی دەکردی هێندەسوور؟ (٣٦٨٣)
گەر لەوی غافڵ نەبایەنەفسی تۆ — تۆ گوناهی وات دەدا، ئەنجام لەبۆ؟ (٣٦٨٤)
عەقڵی تۆ،جا، چەشنی ئوستوڕلابە، خۆ — بەو دەزانی قوربی تاوی بوون ئەتۆ (٣٦٨٥)
قوربی عەقڵی تۆ، بەتۆ نای کا زەبان — قەت بەپاش و پێش ڕاست و چەپ بەیان (٣٦٨٦)
بۆ ئەدی نەی بێت قوربی وا خودا؟ — ون بکەن ڕێ، عەقڵ وفام لەوباسەدا (٣٦٨٧)
بۆ تەکانی قامکی تۆ خۆ ئەی فلان — پاش و پێش یاڕاست و چەپ ناکرێ بەیان (٣٦٨٨)
بێ تەکانەوەختی مردن یانەخەو — وەختی وشیار بوون دەبێتەیاری ئەو (٣٦٨٩)
دێ لەکام ڕێگا لەبۆ قامکت تەکان؟ — ئەو نەبێ، سوودیان نییەخۆ قامکەکان (٣٦٩٠)
نووروڕەشکێنەی کەهەیتی چاوەکەت — دێن لەکام ڕێگا لەغەیری شەش جیهەت (٣٦٩١)
عالەمی جیسمەکەدەی بێتن جیهات — بێ جیهەت بوون،عالەمی ئەمرەو سیفات (٣٦٩٢)

ئەمرو فەرمان گەر نەیان بێتن جیهات    نابێ بی بێتن جیهات ئامیر، چکات (٣٦٩٣)
گەر نەیان بێتن جیهات عەقڵ و گییان    چۆن دەبێ بی بێت ( علام البیان ) (٣٦٩٤)
ئیرتیباتی هەردەبێ بەخوا جیهان    ئیرتیباتێکەبەکەس ناکرێ بەیان (٣٦٩٥)
چونکەفەسڵ و وەسڵ نابێ نێو گییان    غەیری فەسڵ و وەسڵ بیر ناکا گومان (٣٦٩٦)
تۆ بناسەغەیری ما ددە، با دەلیل    گەرچی ئەو ناسینە( لایشفی العلیل ) (٣٦٩٧)
بەر مەدە،مەتڵەب ئەگەردووری لەئەسڵ    بتگەیێنێ تا رەگی مەردیت بەوەسڵ (٣٦٩٨)
عەقڵ،ناکا رەبتی وا، قەت دەرک وفام    چونکەبەستەی وەسڵوفەسڵەعەقڵی خام (٣٦٩٩)
بۆیەدەیکوت ئەو رەسوولی نامدار    گفتو گۆ کەم کەن لەبارەی کردگار (٣٧٠٠)
هەرچی کردی بیر لەزاتی کردگار    فکری زاتی وی نەکرد، بیر بوو خەسار (٣٧٠٤)
سوود نادەن فکرو بیری بێ حیساب    سەت هەزاران زێدەتا حەق، هەن، حیجاب (٣٧٠٢)
جا لەژێر پەردەی خەیاڵ لای وایەئەو    ئەو هەمان پەردەی کەلایتی خوایەئەو (٣٧٠٣)
جا پەیامبەرلای دەبرد ئەو وەهمەلەو    تا لەبارەی حەق نەکا بیری درەو (٣٧٠٤)
ئەو کەسەی لای نا، بەبیر کردن ئەدەب    ئەودەکا ئاخیر سەروبن، دەستی رەب (٣٧٠٥)
سەر نەوی یانی دەچێ بۆلایی پەست    وادەزانێ مەتڵەبی خۆی کەوتەدەست (٣٧٠٦)
چونکەوایەئەو کەسەی مەستە، یەقین    بۆی جودا ناکرێن ئاسمان و زەمین (٣٧٠٧)
بیرلەکارو سونعی وی کە، نەک لەزات    گەو رەبی وی تاکو تۆ سەر سام نەکات (٣٧٠٨)
سەنعەتی وی چون دەبا ئینسان لەهۆش    جا دەناسی خۆت لەحاس سانیع ئەتۆش (٣٧٠٩)
قەت چ ناڵێ غەیری(لا حصی ) بەگیان    چون لەئەژمار و لەحەد زیاد ئەوبەیان (٣٧١٠)

**چوونی زولقەرنەین بۆکێوی قاف و داواکردنی وی لەکێوی قاف کەئەی کێوی قاف لە گەورەیی و عەزەمەتی خوداوەند بۆمەبڵێ وکوتنی کێوی قاف کەسیفەت وعەزەمەت وگەورەیی وی لەکوتن نایە، چون لەحاست عەزەمەتی خوداوەند دەرک وفام نابوود دەبن وئیلتیماس کردنی زولقەرنەین لەسەنایعی وی کەئەگەر لەبیرتەوکوتنی وی لەبۆ تۆ ئاسانترە، بڵێ ..**

**خولاسەی داستان ..**

زولقەرنەین بۆلای کێوی قاف وەرێ کەوت و دیتی کەئەو کێوەگەورەوەک زومرڕودێکی ساف ولەتیفەو دەوری دونیایەی داوەلەدیتنی عەزەمەتی ئەو کێوەحەیران و سەر سام ما، و کوتی ئەگەر ئەتۆ کێوی ئەدی کێوەکانی دی چنە؟ کێوی قاف جوابی داوە کە کێوەکانی دی

بە مەنزیلەی ڕەگی من بە حیساب دێن.. ئەمن لە هەموو شارێک ڕەگێکی نهێنیم هەیە و هەرکات کەخوداوەند ویستی لە شارێک زەلزەلە بێ، بەمن دەستوور دەدا کە ڕەگێکی کە بەو شارە موتتەسیلە تەکان بدەم جا ئەو شارە بە زەلزەلە وێران دەبێ .. زولقەرنەین لە کێوی داوا کرد کە چەند وتارێک لە بارەی ئەسرارِی سیفاتی خوداوەند بەیان بکا .. بەڵام کێوی قاف بەوی کوت برِۆ چونکە سیفاتی خوداوەند زۆر لەحەددی بەیان باڵاترن.. و لە بەیان دا جێگایان نابێ، و زولقەرنەین کوتی ئێستا کەبەیانی ئەو سافی خوداوەند غەیرەمومکینە،چەند وتارێک لەبارەی سەنایعی عەجیبی وی بڵێ، کێوی قاف کوتی چاو لەدەشت و بیبابان بکە، کەچۆن خوداوەند بەو بفرەزۆرەدای پۆشیون ئەگەر ئەو بەفرەزۆرانەنەبان گەرمای دوو زەخ ئێمەی نابوود دەکرد ..مەولانا لەو داستانەدا کێوەکانی پرِ لە بەفری کینایە لە غافڵان و بێگانە لە حەقیقەت زانیوە.. وکێوی قاف کینایەلەئینسانی کامیل وزولقەرنەین کینایەلەسالیک بۆلای خوداوەند وتالیبی ئەسرارِی ئیلاهی .. ئەو دەڵێ وجوودی غافڵان بۆتەباعیس کە ساحەبدڵانی موشتاق بە تەعادول زیندەگی دەکەن دەنا هەمیشە لە شیددەتی ئیشتیاقی ویسال و دیتنی تەجەللییات، قالبی خۆیان بەتاڵ و خاڵی دەکرد ..

ڕۆیی زولقەرنەین لەبۆ لای کێوی قاف — دی کەکێوێکەلەزومرِود ساف ساف (٣٧١١)
دەوری دونیای داوەوەک گوستیل نەقیم — مات و حەیران ما کەدیتی وا عەزیم (٣٧١٢)
پێیدەکوت گەر کو ئەتۆ کێوی ئەدی — چن ئەگەر بازیچەنین کێوی دەدی؟ (٣٧١٣)
پێیدەکوت بۆمن ڕەگن تۆ پێت چییان — شۆخو شەنگ نین خۆ وەکوو من، هیچییان (٣٧١٤)
من لەهەرشارێک هەمەیەک ڕەگ نیهان — بەو ڕەگانەم بەسترا دەوری جیهان (٣٧١٥)
گەرلەشارێک زەلزەلەی ویست خوای جیهان — پێم دەڵێ تامن ڕەگێکم دەم تەکان (٣٧١٦)
جا دەجووڵێنم ئەمن ئەو ڕەگ بەقار — ئەو ڕەگەی کەبوو لەمن ڕا، وەسڵی شار (٣٧١٧)
گەر بڵێ بەس ئەو ڕەگەم ناخوا تەکان — ساکینم، بی وێ دەجووڵێم بێ وچان (٣٧١٨)
ساکینم وەک مەڵحەمێکی سوود دار — ساکینم وەک عەقڵەکی لەو دێ وتار (٣٧١٩)
لای کەسێک نازانێ ئەو هەی، عەقڵی وی — بوومەلەرزەی چادەکا هەڵمی زەوی (٣٧٢٠)

**مێروولەیەک بەسەرکاغەزێک دا دەرِۆیشت، نووسینی قەڵەمێکی دی،قەڵەمەکەی مەدح و ستایش کرد، مێروولەیەکی دیکەکەچاوی تیژتر بوو کوتی مەدح و ستایشی قامکان بکەچونکەئەمن ئەو هونەرەلەقامکان دەبینم مێروو لەیەکی دیکەکەچاوی لەهەر دووکان**

**تیژ ترو ڕووناکتر بووکوتی ئەمن باسک و مەچەک مەدح و ستایش د ەکەم چونکەقامکان لک و فەرعی باسکانن هەر وەها ، الی اخره..**

خولاسەی داستان ..

مێرووولەیەک قەڵەمێکی دی کە لەسەر کاغەز حەرەکەتی دەکرد ئەو مەوزووعەی بە مێرووولەیەکی دیکەکوت و پێیکوت چاو ئەو قەڵەمە چەندە نەقشی جوان جوان دروست دەکا.. دۆستەکەی کەکەمێک لەوی زاناتربووکوتی ئەو نەقشانەخۆ قەڵەم نایان نووسێ بەڵکەم کاری قامکانەمێرووولەیەکی دیکەکەلەهەردووکیان زانا تر بوو کوتی نەخێروانییەئەو نەقشانەنەکاری قەڵەمن ونەکاری قامکان ..بەڵکەم کاری باسک و مەچەکە، هەر بەو جوورەهەر مێرووولەیەکی دەهات عیللەتێکی باڵاتری دەکوت تا لەئاخیردا مێروو لەیەک کەلەهەموان عاقڵتر بووکوتی بۆچی ئێوەهەرباسی سووڕەتو زاهیر دەکەن؟ واچاکە، کەتەوەججوەبەعەقڵوگیان بکەن بەڵام ئەویش لەحەقیقەت غافڵ بوو و نەی دەزانی کەعەقڵو گیان بێ تەسەڕڕوف و ئیرادەی خوداوەند جەمادێک زیاترنین ..

| | | |
|---|---|---|
| مێروێک دیتی لەسەرکاغەزقەڵەم | ڕووی لەمێروێک کردکوتی ئەی خۆش قەدەم | (٣٧٢١) |
| جوان دەکێشێ ئەوقەڵەم نەقش ونیگار | وەک گوڵ و وەک سوێسن و، وەک لالەزار | (٣٧٢٢) |
| پێیدەکوت ئەوموور کەقامکەوادەکا | کار لەقامکانەقەڵەم ئیجڕادەکا | (٣٧٢٣) |
| مووری سێهەم پێیکوتن ئێ باسکەکار | یارمەتی وەر گرت لەوی قامکی نەزار | (٣٧٢٤) |
| چوونەسەر لەو بارە، مێروو، بێ ژمار | تاکو هات مێریان،کەکەم بوو هوشیار | (٣٧٢٥) |
| پێیکوتن نای بێت سووڕەت واهونەر | چونکەنای بێ وەختی مەرگ وخەو،خەبەر | (٣٧٢٦) |
| وەک عەساو پۆشش بوو سووڕەت، بێ گومان | هەربەعەقڵوڕووح نقووش دەدرێن تەکان | (٣٧٢٧) |
| نەی دەزانی ئەو کەئەو عەقڵەو فوئاد | بێ تەغیردانی خوداوەندن جەماد | (٣٧٢٨) |
| گەرلەعەقڵێک لوتفی خۆی کەم کا خودا | عەقڵی زیرەک کاری شێت ئەجام دەدا | (٣٧٢٩) |
| والە، زولقەرنەین دەیکوت ئاشکار | کاتێ کێوی قافی دی، ساحەب وتار | (٣٧٣٠) |
| ئەی لەئەسرار با خەبەر ئەی خۆش وتار | بێژەبۆمن تۆ سیفاتی کردگار | (٣٧٣١) |
| پێیدەکوت ئەو سافی زاتی خوای جیهان | هێن بەسامن ناکرێن هیچ کات بەیان | (٣٧٣٢) |
| قەت قەڵەم ناکات جورئەت، سەرنەوی | کا، بنووسێ زەڕڕەیەک، ئەوسافی وی | (٣٧٣٣) |
| پێیدەکوت تۆ بێژەبۆمن موختەسەر | لەو سیفاتی زۆر عەجیبی خوای لەسەر | (٣٧٣٤) |
| پێیدەکوت بڕوانەدەشتی وا بەرین | پڕ لەکێوی بەفری کرد، ئەوخوای موبین | (٣٧٣٥) |
| کێو لەسەر کێو دادەنێ ئەو، بێ ژمار | لەحزەلەحزەبەفری تازەش دێتەخوار | (٣٧٣٦) |

ئەو بەبەفران کێو لەسەرکێو چا دەکا     ئەو بەبەفران ژێر زەوی سەرما دەکا (٣٧٣٧)
ئەو بەبەفران کێو لەسەر کێو چێ دەکا     لەحزەلەحزەبەفری دیشی تێ دەکا (٣٧٣٨)
گەر نەبایەبەفری ئەو دەشتەی بەرین     ئاگری تێ بەردەدام، دووزەخ بەتین (٣٧٣٩)
کێوی بەفران بن لەلات تۆ، غافڵان     تا نەسووتێن پەردەکانیان، عاقڵان (٣٧٤٠)
بەفری غەفڵەت ئێستەمەو جوودەدەنا     ناری شەوق، دەیکرد کێوی قاف، فەنا (٣٧٤١)
زەڕڕەیێکەنار لەقەهری کردگار     بەو دەترسێنێت شەخسی نا بەکار (٣٧٤٢)
گەرچی قەهری وی عەزیمەو فائیقە     سەردی لوتفی وی لەوی زۆر سابیقە (٣٧٤٣)
سەبقەتێک مەنزووری من بوومەعنەوی     سابیق و مەسبووق یەکن نەک دوو،لەوی (٣٧٤٤)
گەرکو پێت یەک نینەتۆ، عەقڵت کەمە     عەقڵی خەڵکی جۆگەیێکە لەو یەمە (٣٧٤٥)
خۆت عەیب داری ئەتۆ، نەک دینی دوڕ     ناچتە سەر ئاسمانی دین،قەت تەیری قوڕ (٣٧٤٦)
جێگەبۆ پەروازی تەیران بوو حەوا     چونکە ڕوشدی وان لە شەهوەت هەم هەوا (٣٧٤٧)
نا، و بەڵێ تۆ هیچ مەڵێ حەیران بە     چاو لەلوتفی خوای زەوی و ئاسمان بە (٣٧٤٨)
تۆ لەدەرکی ڕازی وا، زۆر کەودەنی     گەر بەڵێش بێژی، بەدڵ حاڵی کەنی (٣٧٤٩)
گەر بڵەی(نا) (نا) دەکالێت سەرجودا     ڕێی نەجات بەو(نا) دەبەستێ لێت خودا (٣٧٥٠)
جا کەوابێ مات و سەرگەردان بەتۆ     چاوەڕێی کۆمەک لەلای یەزدان بەتۆ (٣٧٥١)
گەرکو بووی حەیران و پەگەشتەو فەنا     بەو زەبانی حاڵ دەڵەی تۆ (اهدنا) (٣٧٥٢)
زۆر عەزیمەقەهری خوای باڵاو نەوی     نەرمەهەم هەموار، بترسێ گەر لەوی (٣٧٥٣)
چونکەبۆ مونکیر عەزیمەو سامناک     بۆ ئەوەی ترسا دەبێتە لوتفی پاک (٣٧٥٤)

**خۆ نیشاندانی جەبرەئیل بەموستەفا (صلی الله علیه وسلم ) بەسووڕەت و شکڵی واقعی خۆی و لەحەو سەت باڵی وی باڵێکی زاهیر بوو، ئو فوق تاریک بوو، وهەتاو بەو هەموو نوورو شۆقەی کەهەیتی پێشی گیرا ..**

**خولاسەی داستان ..**

ڕۆژێک حەزرەتی ڕەسوولی ئەکرەم بەجەبرەئیلی فەرموو دەمهەوێ کەسووڕەت و هەیکەلی واقیعی تۆ ببینم، جەبرەئیل جوابی داوەکەئەی موحەممەد حەواسی زاهیری بەشەرتا قەتی دیتنی واقیعی منی نییە، پێغەمبەر(ص) فەرمووی ئەتۆ خۆت نیشان بدە تا ئەو هەیکەلە خاکییە تێبگا کە چەندە زەعیف و ناتەوانە،جەبرەئیل کەمێک لە هەیبەتی خۆی نیشان دا.. و ئەو حەزرەتە لە هۆش چوو .. جەبرەئییل پێغەمبەری لە باوەش گرت و وەهۆشی هیناوە..

موستەفا دەیکوت چەلێک لای جەبرەئیل    هەرچلۆن بێ سوورەتی تۆ ئەی خەلیل (٣٧٥٥)
پێم نیشان دەئاشکرا تۆ، هەروەکوو    هەی، بەجیسم و هەیکەل و ڕوخسار و ڕوو (٣٧٥٦)
پێیدەکوت بۆت زەحمەتە، دەت بێ عەزاب    حیس زەعیفەناتەوانە، نیتەتاب (٣٧٥٧)
پێیدەکوت بنوێنەخۆت تا کو جەسەد    تێ بگا، حیس چەن زەعیفەو بێ مەدەد (٣٧٥٨)
جیسمی ئینسان هەیتی حیسسی نا تەوان    هەیتی خوڵقێک زۆر عەزیم ئەمما نیهان (٣٧٥٩)
چەشنی بەرد و چەشنی ئاسن ئەو تەنە    گشت سیفاتی بەردی چەخماغ لەو هەنە (٣٧٦٠)
بەرد و ئاسن چادەکەن خۆ ئاگری    نار لەسەر ئەو دوو دەکاتن سەر وەری (٣٧٦١)
حاڵ و وەسفی وایەتەن، چاکات نار    عاقیبەت نار، تەن دەکاتن تارو مار (٣٧٦٢)
ناری ئیبراهیم لەتەن دا، بەر قەرار    بەو دەبێ مەقهوور و نابوود بورجی نار (٣٧٦٣)
بۆیەدەیکوت ئەو ڕەسوولی بافنوون    ڕەمزی (نحن الاخرون السابقون) (٣٧٦٤)
زاهیرەن ئەو دوو بەسندانێک ئەسیر    باتینەن بۆ مەعدەنی ئاسنان، ئەمیر (٣٧٦٥)
جا، بەزاهیر ئادەمی فەرعی جیهان    باتینەن ئەسڵی جیهان بوو بێ گومان (٣٧٦٦)
زاهیری وی پێشکەیەک ئازار دەدا    دەوری حەو ئاسمان بەبەباتین غار دەدا (٣٧٦٧)
پێی نیشاندا، هەیبەتێک پاش زۆرتەلاش    هەیبەتێک کەم،کێو دەبێ بەووردو خاش (٣٧٦٨)
شەڕق وغەڕبی دا دەگرت شاباڵی وی    چوولەهۆش ئەحمەدکەوای دی حاڵی وی (٣٧٦٩)
چونکەدیتی ئەولەترسان چوولەهۆش    جەبرەئیل گرتی' لە باوەش وەک نەخۆش (٣٧٧٠)
هەیبەتی وا قیسمەتی ئەغیاری خەس    لوتفی وا، بێ موزد، بۆ دۆستانە بەس (٣٧٧١)
زۆرەسامی گەرببێتن شا، سووار    ڕادەوەستن ئامیر و خزمەتگوزار (٣٧٧٢)
جا، بەدەستیان شیرو نێزەو زولفەقار    دیتەلەرزین جا لەترسان شێری غار (٣٧٧٣)
دەنگی پێش هەنگان وهەم دارانی دەست    گیان دەلەرزێنێت دەیکا خوارو پەست (٣٧٧٤)
وادەکەن تا هەرکەسێک بێ ڕێبوار    باخەبەربێ یانی دەڕوا شەهریار (٣٧٧٥)
گەورەیی زاهیر دەکەن بۆ شەهریار    تا عەوام لانێن غروورو ئیفتیخار (٣٧٧٦)
تاکو خودخواهی وغروور بێ وردو خاش    نەفسی خودخواە،بەس بکا بۆ شەڕ،تەلاش (٣٧٧٧)
ئیمەنی بەو جوورەدەگرێ جێ لەشار    تا بزانن هەیتی قودرەت شەهریار (٣٧٧٨)
ئارەزووی بەد گشتی دەمرن نێو نفووس    هەیبەتی شا، نایەڵێ بێن، ئەو نحووس (٣٧٧٩)
گەرکو بش هێ،شا، لەبۆ لای بەزمی خاس    کەس لەوێ نابینێ هەیبەت یا قیساس (٣٧٨٠)
حیلم وسەبرو بوردباری دیتەجۆش    دیتەگوێ، هەردەنگی چەنگ و دەنگی خۆش (٣٧٨١)

دەنگی سامناکی دەهۆڵ دێ وەختی جەنگ وەختی عیشرەت گەڵ خەواس ئاوازی چەنگ (٣٧٨٢)
دێوی بەدکا رهەن لەبۆ عالەم بەعام ئەو پەری روویان بەڵام یارانی جام (٣٧٨٣)
جێی‌کڵاوخوود و، زرێ، هەرجەنگە جەنگ سایەبان جێگای هەریرەودەنگی چەنگ (٣٧٨٤)
ئەو وتارەدوایی نایەئەی جەواد بەسکەتەنها خوا دەزانێ رێی رەشاد (٣٧٨٥)
ئەوحەواسی بووی موحەممەدوەک بەشەر ئێستەنوستوون،خاکی یەسربیان لەسەر (٣٧٨٦)
سەف شکێنەهەیتی ئەو خولقی عەزیم بێ تەغەییور ئەو لەنێو سیدقە، موقیم (٣٧٨٧)
جێگەبۆ تەغییر، ئەوسافی تەنە رووحی جاوید یەک هەتاوی رەوشەنە (٣٧٨٨)
رووح نەشەرقی یانەغەربی خۆ، نییە هیچ عیوەز بوونێکی ئەسڵەن بۆ نییە (٣٧٨٩)
کەی دەبێتن زەرڕەتاو مەدهۆش بکا یا پەپوولێک بێت شەم خامۆش بکا؟ (٣٧٩٠)
جیسمی ئەحمەد بوولەهۆش چوو نەک گییان تەن هەموویان هەر دەگۆڕێن گشتییان (٣٧٩١)
وەک خەو و رەنج و نەخۆشی جوور بە جوور رووح لە ئەوسافی وەها بوو زۆر بە دوور (٣٧٩٢)
من لەدەستم نایەبێژم وەسفی گیان زەلزەلەی بۆ دێ دەنا، کەون و مەکان (٣٧٩٣)
ئەو دەمەی کە، رێوی جیسمی بوو پەرێش شێری رووحی نوستبوو، بێ دەرد و ئێش (٣٧٩٤)
نوستبوو ئەو شێرە، باتین دوو رلەخەو زۆر عەجیبە سامناک و نەرمە ئەو (٣٧٩٥)
شێر کەچۆ خەو زاهیرەن وای کردووە ئەو سەگانە وادەزانن مردووە (٣٧٩٦)
وانەبایەکێ بوو جورئەت وا بکا؟ زوڵمی خۆی نیسبەت بەکەس ئیجرا بکا (٣٧٩٧)
جیسمی ئەحمەدگەرکو دی ئەو چوو لەهۆش حوبی تەن دەریایی وی هینایە جۆش (٣٧٩٨)
مانگ وەکوو دەستە بە عالەم نوور دەدات مانگ کە نەیبێ دەس نەبێ باقەت چکات (٣٧٩٩)
ئاوەڵاکا گەر رەسوڵ باڵی جەلیل تا ئەبەد بێ هۆش دەمێنێ جەبرەئیل (٣٨٠٠)
گەرکوجێی هێشت ئەورەسوولی خوای جەلیل سیدرە هەم جێگا و مەقامی جەبرەئیل (٣٨٠١)
پێیدەکوت لەدوام برۆتۆ ئەی شەریف جەبرەئیل دەیکوت کەنا، نیم بۆت حەریف (٣٨٠٢)
پێیدەکوت ئەی لابەری پەردان وەرە من بەجێگای خۆم نەگەیوم لەو سەرە (٣٨٠٣)
پێیدەکوت لەو حەددەزیاد ئەی خۆش فەرم گەرکو لێدەم باڵ دەسووتێتن پەرم (٣٨٠٤)
زۆر عەجیب ئەو باس و داستانە و قەسەس چۆن خەواسی مات و مەدهۆش کرد ئەخەس؟ (٣٨٠٥)
لێرەدا بازیچەیە خۆ چوون لە هۆش ئێرە جێی گیان‌دانە گیانت‌دە ئەتۆش (٣٨٠٦)
گەر شەریفی هەم عەزیز ئەی جەبرەئیل نی ئەتۆ پەروانە یا شەم ئەی نەبیل (٣٨٠٧)
وەختی رەوشەن بوون کەدەعوەت کات شەم گیانی پەروانە لە گڕ، ناکات رەم (٣٨٠٨)

تۆ سەر و بن بیخە نێو گۆڕ ئەو وتار    بەرعەکس با گۆڕەخەر، شێر کا شکار (٣٨٠٩)

زاری مەشکەو زاری هەنبانەی وتار    تۆ ببەستە، با نەبن گوفتار خەسار (٣٨١٠)

لای کەسێک بۆ سەرنەچوو ،ما سەر زەوی    ئەو وتارەی من کوتم پەستە و نەوی (٣٨١١)

تۆموداراکە،لەگەڵ وان ئەی حەبیب    ئەی ئەوەی کە،بووی لەوان میوان غەریب (٣٨١٢)

جێ بەجێ کە، ویست وقەستی بەرزی وان    ئەی ڕەوەندەی ساکینی نێو عەرزی وان (٣٨١٣)

تا بەلوتفی خوابگەی ئەی نازەنین    تۆ موداراکە، دەگەڵ ئەهلی زەمین (٣٨١٤)

ئەی کەلیم لای فیرعەونی دوور لەشەرم    قەولی (لەیین) بێژەیانی گفتی نەرم (٣٨١٥)

هەرچی ئاو نێو ڕۆنی زۆر جۆشان دەکا    دیگ و دیگدان پێکەوە وێران دەکا (٣٨١٦)

بێژەڕاستی تۆ،بەنەرمی نەک وەها    شک بکا لەو نەرمییەئەهلی خەتا (٣٨١٧)

وەختی عەسرەکات کەمە، بەسکە وتار    ئەی بەگفتت عالەمت کرد هوشیار (٣٨١٨)

بێژەخۆڵ خۆر، باشە بۆت قەند، خۆڵ بەدە    تۆ بەنەرمی بەد، بەوی قەت خۆڵ مەدە (٣٨١٩)

گەر کەلام نەی بێ کەم وزۆر قیل و قال    باغی ڕووحانی دەدا بەو، زولجەلال (٣٨٢٠)

ئەو سەرەی کەر، دانراو نێو نەی شەکەر    نایەڵێتن بێتەنێو وی جا نەوەر (٣٨٢١)

ئەو لەدوور لای وایەئەو سەر گیاندار    جا دەچێ بۆ پشتەوە، وەک شەرمەزار (٣٨٢٢)

ئەو سەرەی کەر، سووڕەتی حەرفان بزان    نێو ڕەزی مەعناو بەهەشتی جاویدان (٣٨٢٣)

ئەی حیسامەددین ئەتۆ زوو بێنەدەر    بیبەئەو بێستانەجا ئەوسەلکەکەر (٣٨٢٤)

تا سەری ئەوکەر کەمرد نێو مەسلەخە    ژینی تازەی پێ بدا ئەو مەبتەخە[1] (٣٨٢٥)

سووڕەتی زاهیر لەئێمە،گیان لەتۆ    ئێشتیبام کوت بەڵکەهەردووکیان لەتۆ (٣٨٢٦)

تۆکەجێگات چەشنی ڕۆژ بوو، ئاسمان    با لەسەرعەرزیش ببی تۆ، جاویدان (٣٨٢٧)

تاکوئەهلی ئاسمان و ئەهلی گڵ    یەک ببێتن ڕووگەیان و خوو و، دڵ (٣٨٢٨)

تەفرەقەو دوویی دەڕۆن لەو حاڵەتە    نێو وجوودی مەعنەوی جێی وەحدەتە (٣٨٢٩)

گیانی من گەرگیانی تۆی ناسی زیاد    دیتەبیریان هەردوو وەختی ئیتتیحاد (٣٨٣٠)

دەبنەیەک مووساووهاڕوون سەرزەمین    خۆش دەبن شیرین دەبن وەک ئەنگەبین (٣٨٣١)

گەرکو ناسی کەم، بەڵام خۆی کرد نەناس    بۆی دەبێتەپەردە، ئینکار، ناسوپاس (٣٨٣٢)

زۆرکەسان هەن خۆ دەدەن نیشان نەناس    نووری دانیش قار دەکا لەو ناسوپاس (٣٨٣٣)

بۆیەگیانی ئەو ڕەسوولی نامدار    قەت نەناسرا لای کەسانێک نابەکار (٣٨٣٤)

---

١ - مەبتەخ= ئیسمی مەکانی بتتیخ (بەمەعنایی بێستانی شووتی و کاڵەک )

